# فەرهەنگی ڕووداوەکانی کوردستان و وڵاتانی جیهان





ڕامیاری
جوگرافی
ئابووری
مێژوویی
نوێترین ئامارەکان

ئامادەکردنی:
عەلی کەندی

چاپی یەکەم
2005

باشووری کوردستان
هەولێر

# فەرهەنگی ڕووداوەکانی کوردستان و وڵاتانی جیهان

ڕامیاری – جوگرافی – ئابووری – مێژوویی – نوێترین ئامارەکان

ئامادەکردنی
عەلی کەندی

چاپی یەکەم .

باشووری کوردستان - هەولێر

کتێب : فەرهەنگی ڕووداوەکانی کوردستان و وڵاتانی جیهان
دانەر : عەلی کەندی
تیراژ : (٣٠٠٠) دانە
کۆمپیوتەر : نووسینگەی (هیوا)
وەرگێڕانی نەخشەکان بۆ کوردی : سنور ڕەزا عەزیز
ژمارەی سپاردن : ( ٤١٩ ) ی ساڵی ٢٠٠٥ ی دراوەتێ لەکتێبخانەی گشتی / هەولێر
چاپی یەکەم / ساڵی ٢٠٠٥

**ئاگاداریەك بۆ بەڕێز هەڵگری فەرهەنگەکە**

بۆ وەرگرتنی دانەیەك لەفەرهەنگەکە پەیوەندی بکەن بە کتێبخانەی – زانیار- سلێمانی شەقامی پیرەمێرد- مۆبایل (١١٢١٧٠١ ١٧٣٠) یان کتێبخانەی ئۆکسفورد- هەولێر شەقامی باتە- مۆبایل (٤٦١٦١١٣).

پەیوەندی کردنتان بەژمارەی مۆبایلی دانەر (4548098) لەهەر رەخنەیەك یان پێشنیارێك یان هەر زانیارییەك لەهەڵەو بەسەرچوون و کەم و کوڕییەك. یان بەناونیشانی پۆستی ئەلکترۆنی Salnamaykurdistan2005@yahoo.com ئاگادارمان بکەنەوە.

# پێشەکی

خوێنەری بەڕێز : ناکرێ پێشەکیەك بۆ پەرتوکێکی ئاوا نەنوسرێت چونکە مێژوو زانستێکە لە زانستەکانی تری سروشتیو جوگرافیو گەردونیو کۆمەلایەتیو فیزیاو کیمیاو کشتوکالو ماتماتیكو میکانیكو جولانەوەو فەلسەفەو ئابوریو سایکۆلۆژیو کەشو هەواو چەندین زانستی تر کە هەمووی بەیەکەوە بەستراوەتەوەو هیچ زانستێك بەبێ ئەوی تر نابێتو تەواوکەری یەکترن، لەگەل ئەوەشدا پەرەسەندنو پێشکەوتن بەپێی قۆناخە یەك لەدوای یەکەکانی گۆرانکاریەکە هەمووی لە بازنە ڕژێژەیەکان دەخولێنەوە.

سەرەتای پێك هاتەی ئەو ئەستێرەی کە ئێمە لەسەری دەژین دەگەڕێتەوە بۆ ٧٥٠ر٦ملیار سالّ بەر لە ئێستاو سەرەتای پەیدابونی ژیان لەسەر ئەو ئەستێرەیە دەگەڕێتەوە بۆ ٣٣٠ر٤ ملیار سالّ، ئەمەش لەئەنجامی بەراورد کردنی زانستە جۆراو جۆرەکانە لەگەلّ یەکتری بەپێی پێك هاتەی شارستانیەتی شوێنەوارە جۆراو جۆرەکان لەگەل یەکتری بەپێی تێپەڕ بوونی قۆناخە یەك لەدوای یەکەکانی پەرەسەندن لە هەموو بوارە جۆراو جۆرەکان . بگرە لە گیانەوەرێك کە بەچاو نابینرێت تاکو ئاژەلێكو دوای مرۆڤایەتیو ئەمانەش هەمووی ژێر دەستەی پەرەسەندنی سروشتن بە گوێرەی ناوچە جوگرافیەکانو کەشو هەواو خاك. کە بە چەند قۆناخێکی جۆراو جۆر لە یاساکانی "یەکیەتیو دژایەتیو ناکاوی پێویستو شێوەو ناوەڕۆك". پەرەسەندنو پێشکەوتنی قۆناخە یەك لەدوای یەکەکانی مرۆڤایەتی لە مەشاعەی سەرەتاییو کۆیلایەتیو دەرەبەگو سەرمایەداریو سوشیالیستی لە پیشەسازی تاکو ئەمڕۆکە لەو پەڕی بواری تەکنەلۆژیادا خۆی دەبینێ .

جا مێژووی گەلان لەسەر خرۆکەی زەوی لە پلە یەکی زۆر مەزن دا دەخولێتەوە لە شێوەو شێوازێکی زۆر گرنگو جۆراو جۆرو ئالۆزدا. بەبەرز بونەوەی نەوەی نوێو ڕۆیشتنی نەوەی تر. بەدەر کەوتنی تیرەو هۆزوبەرز بونو لە ناوچونی هەندێکی تریان، بە پێك هاتنی ئیمپراتۆریەتو بوژانەوەو دوای لەناو چونی، بەدروستکردنو کۆکردنەوەی سامان بە هۆی کاری بێ وێنەی مرۆڤ بەتوانای هێزی بازوی لە هەموو بوارەکانی پەرەسەندنو پێشکەوتن، پەیوەندی مرۆڤو خەرج کردنی سامانی بێ وێنە لەو بڕە خرج کراوانەکە دەبێتە هۆی لەناوبردنو توانەوەی گەلان لە نەتەوەو نەژادو ڕەگەزی هەژار بەهۆی کێشەو ململانێی نێوانیان لە پێناو بە دەست هێنانی سامانو بە هێز کردنی دەسەلاتو فراوان کردنی سنوری جوگرافی لە وولاتانی جۆراو جۆرو کێشەکان لە سەردەمی پەرەسەندن کە ئەنجامەکەی دەبێتە هۆی تەقینەوەی شۆڕش لەوێو لەوێ، چونکە کارو کردەوەی ئەو چەند ملیار مرۆڤەو تێك هەلکشانەی ناو یەکتریو ڕووبەڕوو بونەوەی یەکتری لە هەستو خواستی جۆراو جۆر، کێشەی نەتەوایەتیو چینایەتی وولاتان لەهەژارو دەلەمەندو مام ناوەند، بە پیتو بەرەکەتی زەوی هەندێ ناوچە لە هەندێ ناوچەی تر لە کیشوەرەکانو ناوچە جیاجیاکان لەسەر هەسارەی زەوی .

ئەمانە هەموی لەسەر کۆمەلێك بنکەی پەرەسەندنی کۆمەلن لە پەیوەندی بەرهەم گۆڕینەوەو دابەش کردن کە ئەمەش ژێرخانی ئابوری پێك دێنێ لە پێك هاتەی کۆمەلّ، پێك هاتەی ئابوریو کۆمەلایەتی بناغەی دروست بونی قەوارەی کۆمەلایەتیە کە لێك جیاوازن هەروەها جیاوازی نێوان جیهانی ئاژەلّو جیهانی گیاوگۆر. ئەم جیاوازیە بەندە بە مەرجەکانی جیاوازی شێوەی بەرهەم کە کۆمەل ئەنجامی

دەدات لە کاتە دیار کراوەکان، بەلام ڕوداوەکانی ژیانی کۆمەڵ بە پێچەوانەی ئەو گوتانەیە . ئەمەش بەچۆنیەتی دەسەڵات لە نێوان وڵاتان و توانای ئابوریان کە ئەوە دەسەلمێنێ چ کار چ کردەوەو پەیوەنی و دژایەتی کردنی یەکتری بۆ بەرەو پێش بردنی بەرژەوەندی تایبەتی ئەو وڵاتە لەگەڵ وڵاتێکی تر چونکە پەیوەندیەکان لەسەر بنەمای بەرژەوەندی ئابورییەلە سەرەتای پەیدا بونی ژیان و کێشەیەکی نەپساوەیە لە هەموو بوارەکان و بەندە بە پەرەسەندن و پێشکەوتن و سەرکەوتن و ژێر کەوتن لە بوارەکانی ڕامیاری و ئابوری و سەربازی و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری و زمان و داب و نەریت و بونی قەبارەو پێك هاتەی دەسەلات ئەویش بەندە بە بونی توانای یەککگرتن لە ناو خۆوە. گەر یەککگرتن بونی خۆی سەلماند بوارەکانی تر هێنانە پێشەوەی ئاسانتر دەکات و سەرکەوتن مسۆگەر دەکات.

بەڵام لێرەدا چۆنیەتی مەرجەکانی جوگرافی بەشێوەیەکی بنەڕەتی و سروشتی بەندە بە جمو جۆلی مرۆڤ لە باری ئەو وڵاتەی کە دەشتاییە یاخود کەناریە یاخود چیایە یاخود دەشتایی و تایبەتمەندی کەش و هەواو بە پیتی زەویەکەو بونی ڕوبارو زێ و دەریاچەو دەریاو زەریاو ئاژەل و ڕوەك و گژوگیاو مێرگ و پێك هاتەی ناوچەکەبە کەش و هەوای گوزاری و لە سەرەوەی هەمویان بونی سامانی سروشتی ئەمانە هەمووی ڕۆلی گرنگی هەیە لە کاردانەوی بوارەکان بەتایبەتی بواری ئابوری کە سەرچاوەی پەرەسەندن و پێشکەوتنن لە پلەکانی ژیان تاکو دوا پلەی پەرەسەندن .

زۆر لە گەلان و هۆزو تیرەی وڵاتانی کەمەرەیی دواکەوتنیان بە خۆوە بینی و بونەتە نێچیری بیرو بۆچونی وڵاتانی زلهێزو چاولێبڕین و داگیر کردن و کۆسپ خستنە پێش پەرەسەندنی و بوەتە هۆی پێکهاتنی جولانەوەی ڕزگاریجوازی نیشتمانی و نەتەوەیی، لەگەڵ ئەوەشدا دەسەلاتە داگیر کەرەکان هەموو هەنگاوێکیان لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی و سود وەرگرتن بوە لە داهات و بەروبومی و لە هەمان کات سامانی وڵاتانی تری بێ تواناو دیاری کراو، زۆربەی وڵاتانی ئاسیاو ئەمریکای لاتینی و ئەفریقیا بوەتە ئامانجی شالاوبەرە یەك لە دوای یەکەکانی ئیمپراتۆریەتەکان و ئەنجامەکەی بوەتە هۆی بەدەست هێنانی سەربەخۆییان و گرتنە ڕێی تێکۆشان لە پێناو بەدەست هێنانی قەوارەی نەتەوەیی و نیشتمانی بەتایبەتی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کە کەوتۆتە کیشوەری ئاسیاو کە کوردستان دەگرێتە خۆی واتە کورد یەکێك بوە لە نەتەوە سەرەتاییەکانی پێك هاتەی و ڕۆلی گرنگی خۆی دیوە لە پەرەسەندن و پەرەپێدانی شارستانیەت و مێژووی گەلانی جیهان بە تایبەتی یەکەم نەتەوە بوە لە کیشوەری ئاسیا کە بونی نەتەوایەتی خۆی سەلماندوە لە پاراستن و بەرەو پێش بردنی ناسنامەی نەژادی کوردو داب و نەریت و مێژوو زمان و کەلتورو شوێنەوارو بەشداری تەواوی کردوە لە هەموو بوارە جۆراو جۆرەکانی پەرەسەندن هەر لەگەل پێك هاتەی نوسینی مێژوو شان بەشانی پێك هاتەی دەسەلاتی سۆمری ئەو لە باشوری ڕۆژئاوای میزۆبۆتامیا کوردیش لە ڕۆژهەلات و باکوری نێوان دوو زێ و بەلگەش ئیمپراتۆریەتی میدیا کە گەورەترین ئیمپراتۆریەت بوە لە دوای سۆمەری و بابلی و ئاشوریەکان، کورد بەشداری تەواوی کردوە لەگەڵ نەتەوەکانی تری دراوسێ و لەو بەشە خاکەی کە لەسەری بونی خۆی سەلماندوەو خاوەنی دەسەڵات و ئاینی کوردو دەسەڵاتدارەکانی دادەنرێت بەر لە هەموو ئاینەکانی تر وەك بوزی و هندۆسی و جولەکەو مەسیحی و ئیسلام بەتایبەتی پێش ئیمپراتۆریەتی میدیاو دواتریش تاکو دەسەڵاتی ئەخمینیەکان و تاکو ئێستاش ئەو ئاینە بونی خۆی پاراستوە لە هەموو لایەنەکانی ئاینی و هەلگری بیروباوەڕی ئەو ئاینەو خودی کورد خۆی بوە کە ئێستاش لە ڕووسیاو جۆرجیاو ئەرمینیاو پاکستان و هیندستان و چینی میللی پەیڕەو دەکرێت و کوردیش پەیڕەوی دەکات، کوردو

بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی‌و سەربەخۆیی‌و دیاری کردنی قەبارەی خۆی هەبوە سەرەڕای هەولی جۆراو جۆری بۆ وینەی دوژمنەکانی‌و گەمارۆدانی لە هەموو بوارەکانی کاری لە ناو بردن‌و دەربەدەر کردن‌و تواندنەوەو ڕەشکردنەوەی ئاسەواری کورد لە نەتەوەو زمان‌و داب‌و نەریت‌و ناسنامەی بەتایبەتی لەلایەن ئیمپراتۆریەتەکانی ئاشوری‌و فارس‌و عوسمانی‌و مەگۆل‌و رۆمانی‌و ڕووسی‌و ساسان‌و دواترینیان ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی کە ببوە چەکی لەناو بردن‌و داگیر کردن‌و دابەش کردنی کوردو نیشتمانەکەی لە لایەن عەرەب‌و فارس‌و تورك کە لە ناوەرۆك دا دوژمنی یەکترن‌و بران لەسەر کێشەی کوردو مافەکانی. لەگەڵ ئەوەشدا کورد بونی خۆی سەلماندوە زیاتر لە ٣٥٠٠سال بەر لە ئێستا واتە ١٥٠٠سال پێش زاینی بەلگەش گەرمیژووی کورد٢٧٠٥سال بەر لە ئێستا بێت ئەی بون‌و جولانەوەی پێك هاتەی چەندی خایاندوە کە لەو کاتە نە عەرەب‌و نە تورك‌و نە فارس بوونیان هەر نەبوە بە تایبەتی عەرەب کە لە پارچە سنورێکی تەسك لە بیابانی عەرەبی سەری هەلداوە لە ناوەڕاستی نیوەی کۆتایی بە هاتنی مەسیح عەرەب لەو ناوچەیە ناودەنگی سەری هەلداوە ئەویش لە ڕێگەی بازرگانەکانیان‌و تورکیش لە ناوەڕاستی هەرێمی مەنگۆلیا بەر لە ٩١٠سال پێش ئیستا بونی خۆی ڕاگەیاندوە ئەویش بە دزینی ووشەی زمانەکانی تری دەوراو پشت‌و بە تایبەتی لە دوای هەلگرتنی بیرو باوەڕی ئیسلام لە ڕێگەی چەند هۆزێکی بێ توانای ئەوکات یەکیان گرت‌و بەرەو پێك هێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، لە شێوەی پێك هاتەی دەولەتی ئیسرائیل چونکە دەولەتی ئیسرائیل دەولەتێکی ئاینیە نەك دەولەتێکی نەتەوەیی‌و نەبونی یەککرتوی ناوەرۆکی نەتەوەیی دەولەتی جولەکە کە لە دیانەتەوە پێك هاتوە لە وانەش کورد کە زیاتر لە ٣٦٠هەزار کورد دانیشتوی ئیسرائیلن بەهۆی ئاینەکە کۆبونەوەیان لەوێ مسۆگەر کردوە.

ئەوکێشەو ململانێیە لە سەرەتاوە بەردەوام بوە تاکو ئێستابەپێی بارو دۆخە گونجاوو نەگونجاوەکان چ لە لایەن گەلی کوردو چ لەلایەن داگیرکەرو دوژمنانی کورد، کورد خاوەنی ئیمارەتەکانی خۆی بوە بە تایبەتی لە دوای هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی میدیاو لەو کاتەی کەکەوتۆتە ژێر داگیرکردن لە لایەن ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌و فارسی‌و ڕوسی‌و تاکو دابەش کردنی یەکەمی کوردستان بە پێی پەیمانی زەهاولە ١٦٣٩/٥/٢٠لە نێوان عوسمانی تورك‌و فارس‌و دوای تاکو جەنگی یەکەمی جیهان لە ١٩١٤/٨/٣ بە پێی پەیمانی سایکس بیکۆو بە تایبەتی پەیمانی لۆزان کوردستان لە نێوان چوار دەولەت‌و نیو دابەش کراو ئەو دەولەتانەی ئێستای عێراق‌و ئێران‌و تورکیاو سوریاو ناوچەی یەریڤان کە دەولەتانی دژ بە یەکترن لە هەموو ڕوویەکەوە تەنیا لەسەر کێشەی کورد نەبێت کە کۆك بونە تاکو ئێستاش بە پێی نەخشەو پلانی ئەمریکاو بەریتانیاو هاوپەیمانانی کوردو نیشتمانەکەی لە ژێر کێشەو ململانێی ئەو وولاتانەن کە ئاسەواری ئەو تیرە ژەهراویە کاردنەوەی بەردەوامە لە هەمووبوارەکانی‌و ئالۆز کردن‌و بەرەو چارەسەر نەکردن بە هۆی بوونی خاکی بە پیت‌و بەرەکەت‌و کەش‌و هەوای گونجاو هەلکەوتەی شوێنی جوگرافی لەو کیشوەرە بە تایبەتی بونی سامانی سروشتی ژێر خاك‌وخاکێکی چیایی بێ وێنە.

دەنگ‌و باسە ڕاگەیاندراوەکان لەسەر زاری بەرپرس‌و کاربەدەستان‌و سیاسەتمەدارو زاناو پسپۆڕانی ناوچەو هەرێم‌و جیهان کە تاکوئێستا دژی چارەسەری کێشەی کوردن لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام بلاوی دەکەنەوە بەتایبەتی مامۆستاو شارەزای بواری ئابوری لە عێراق ئاشکرایان کردوە کە بەرهەم هێنانی نەوتی عێراق تا ٢٥٠سالی تر کۆتایی نایەت بە قەبارەی یەدەگی زۆری نەوت کە

خۆی لە ٣ملیۆن تا ٥ ملیۆن بەرمیل نەوت دەدات لە بەرهەمی ڕۆژانە کەنەوتی یەدەگی عێراق خۆی لە ١٢٠ملیار بەرمیل نەوت دەدات کە١٢٪ سەرکۆی یەدەگیەتی و بەرەو زیادبونیش دەڕوات تاکو دەگاتە زیاتر لە ٢٠٠ملیار بەرمیل لەگەڵ ئەو ڕێژە نەوتە کورد بێ بەشە لەو سامانە بێ وێنە کە زیاتر لە ٣/٤ ی ئەو نەوتە لە ناو خاکی کوردستانە لە ناوچە داگیر کراوەکانی نەوت لە خانەقین و کەرکوک و کەندیناوەو مەخمورو کۆیسنجق و شوێنی تری کوردستان ماوە کە یەدەگی نەوت و زێڕو ئەلماس وفۆسفات و کبریت و زیوی تیا بدۆزێتەوە. ئەمەش گرنگترین هۆکاری داگیر کردن و دابەش کردنی کوردستانە بە تایبەتی باشوری و ڕۆژهەلاتی کوردستان کە کەوتۆتە ژێر جیهانگەری ئیمپراتۆریەتەکانی ئیسلامی و تورکی و بەریتانی و ئەمریکی. نابێ نەیلێین و دەبێ هەر دوبارەو دەبارە بکرێتەوە کەخالی بنەڕەتی بۆنەگەیشتنی کورد بە ئامانجەکانی خۆی کە خودی کورد خۆیەتی لە لایەن دەسەلاتدارو سەرکردەکانی لە سەرەتاوە تاکو ئێستا بە هۆی خواست و ویستی سەرکردەکانی کوردو بەرژەوەندی خۆیان لەسەر بەرژەوەندی گشتی و بەتایبەتی گەلی کورد نەگەیشتن بە ئامانجەکانی بگرە لە ئیمارەتەکانی بابان و سۆران و بەتایبەتی کە ئەو ئیمارەتانە لەمێژ نین و مێژوو ناوەرۆکەکانی بەباشی دیار کردوە لە لاپەڕەکانی لە دوو ڕووی دژ بە یەکتری ڕووی ئاشکراو ڕووی شاراوەی، چونکە ئەو کێشەو ململانێ یەو دژایەتی کردنەی ناوخۆیی کورد لە شەڕو پێك دادان و لاواز کردنی یەکتری گەر ئەوە بەرامبەر بە دوژمن ئەنجام بدرایە کورد لە قۆناغێکی تر دادەبوو کە١٠٠٪ مافی نەتەوەیی بە دەست دەمێناو دوژمنەکانیشی لە سەنگێکی تر مامەلەی دەکرد، بە سەدان نمونە هەن بەشاهدی گەلانی دونیا نەك هەر کورد کە ئەو کێشەو ململانێ و شەڕو پێك دادانانەی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکیەتی نیشتمانی کوردستان کە یەکەم سەرهەڵدانی لە ١٩٩٤/٥/١ تاکو ١٩٩٨/٩/١٧ بەشەڕی دژواری خۆکوژی لە پێناو بەرژەوەندی دەسەڵات و گوێ ڕایەلی کردنی دوژمنانی کورد نەك گەلی کورد کە ئێستا لە قۆناغێکی تردابوو. هەرێمی کوردستان تاکو ئێستا کراوەتە دووهەرێمی دابەشکراو لەنێوان دوو ئیدارەی لێك جیاوازدا هەنگاودەنێ و شەقامی کوردی زۆر دڵگرانە بەرامبەر بەو بارو دۆخە بە تایبەتی لە قۆناغی ئێستای کورد لە دوای ڕوخانی ڕژێمی بەعسی عێراق لە ٢٠٠٣/٤/٩کە هەموو لایەنێك مافەکانی کوردیان پێشێل کردوە نەك لە لایەن دوژمنانی کورد بەڵکو لە لایەن سەرکردەکانی کورد بەتایبەتی ئەو دوو پارتە دەسەڵاتدارە لە دابەش کردنی باشوری کوردستانی لێکێندراو بە دوو دەسەڵاتی نێوان خۆیان بۆتە هۆی لە دەست دانی مافەکانی گەلی کورد لەچەندین لایەنی بەرچاوو لەدامو دەزگا نوێیەکەی دوای ڕوخانی ڕژێمی عێراق و دور لە خواست و ویستی تێکڕای کورد، چ عەرەب و چ تورك و چ فارس نیازی چارەسەر کردنی کێشەی کوردیان نیە بەلام بەهۆی ئەو بارو دۆخە نوێیە لەم لاو لەولا وتەو ڕاگەیاندن بلاودەکەنەوە ئەمەش بۆ هێور کردنەوەی گەلی کردو کەم کردنەوەیە لە هەستی نەتەوایەتی چونکە ڕاپەڕینی ئاداری ١٩٩١و ڕوخانی ڕژێمی سەدام شەقی زەمانەیە کە بۆ کورد هاتۆتە پێشەوەو دەبێ بیقۆزێنێتەوە کورد دەلێ مست لە درێشە دەگەڕێتەوە.

بۆ مێژوو دەڵێم، چ محمد خاتەمی و ئایەتولا خامەنائی و چ ئوردوگان و عەبدولا گول و سیزارو چ بەشار ئەسەدو چ غازی عجیل یاوەرو ئەیاد عەلاوی و جەعفەری و عەبدوالعزیز حەکیم و کەسانی تر وەك ئەوانیش لە بیرو بۆچون و خواست و ویست و نیاز لەگەڵ سەدام جیاوازیان نیە بەرامبەر بە کێشەی کورد بەڵام شەقی زەمانە وای کردوە بە زمانێکی تر ئاخاوتن بکەن لەگەڵ کێشەی کورد بە تایبەتی لە عێراق، خۆ ولاتەکانی تورکیاو سوریاو ئیران هەر وەك خۆیەتی و بەلکو بەرەو ئاڵۆز تر هەنگاو دەنێ لە

شێوازێکی تری ڕامیاریەتیان بەلکو تاکو جێ پێی خۆیان توند دەکەن ئەوەش بە یارمەتیو ئامۆژگاری ئەمریکاو بەریتانیا کە تاکو ئیستاش ئەو تیرە ژەهراویە لەپشت کەندوەکە دانراوە هەرکات بیانەوێ بەکاری دێنن چونکە گەر ئەمە ڕاست نەبێ لە ١٩٩٢/٥/١٩دەسەڵاتدارەو هەموو پێك هاتەی دەوڵەتی تیا مسۆگەرەو دەبوایە مافی کورد بەرچاو بوایە لە ناوچەو لە جیهان چونکە هەر نەتەوەیەك ماوەی ١٣ ساڵ دەسەڵاتی خۆی بەڕێوە ببات لە ناوەوە بەتایبەتی پەیوەندیدەرەوەی مافی تەواوی خۆی دەبێ مسۆگەر بکرێت .

مێژووی ڕووداوەکانی جیهان لە ناوەرۆکی کتێبەکە ڕوونو ئاشکرایە لە هەموو بوارە جیاجیاکانو کوردو کوردستانیش لەگەڵ ئەوەشدا چەند نمونەیەك دیاری دەکەم لە بەراورد کردن بۆ دەسەلاتدارانی کورد چ لەناوەوەی پارتو چ لە دەرەوەی پارتەکان بە تایبەتی لە دوای جەنگی یەکەمی جیهان تا کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤ ئەویش

١. ژمارەی دانیشتوانو ڕووبەری ڕۆژئاوای کوردستان کە لکێنراوە بە سوریای دروستکراو لەگەڵ ئەو وولآتانەی کە ژمارەی دانیشتوانو ڕووبەریان ئەوەندەی ڕۆژئاوای کوردستان نابێتو خاوەنی قەوارەو دەسەلاتو ئەندامن لە ڕێکخراوە جیهانیەکان بەتایبەتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانو ڕۆڵی گرنگیان هەیە لە ڕامیاریەتی هەمەلایەنەی جیهان.

| ت | ناوی وولآت | ڕووبەری بەکم٢ | ژمارەی دانیشتوانی | ڕۆژئاوای کوردستان<br>١٦ر٠٠٠ کم٢ ٢ر٢٥٠ر٠٠٠ ملیۆن کەسە |
|---|---|---|---|---|
| ١. | کۆماری گامبیا | ١١ر٣٠٠ | ١ر٤٥٦ر٠٠٠ | |
| ٢. | ئیماراتی عەرەبی | ١١ر٤٣٧ | ٧٩٤ر٠٠٠ | |
| ٣. | کۆماری لوبنان | ١٠ر٤٠٠ | ٣ر٦٧٨ر٠٠٠ | |
| ٤. | کۆماری تەیموری ڕۆژهەلات | ١٥ر٠٠٠ | ٩٥٣ر٠٠٠ | |
| ٥. | یەکیەتی دورگەکانی بەهاما | ١٣ر٩٤٠ | ٣٠٢ر٠٠٠ | |
| ٦. | جامایکا | ١٠ر٩٩١ | ٢ر٦٦٠ر٠٠٠ | |
| ٧. | ڤانواتا | ١٢ر٠٠٠ | ١٩٦ر٠٠٠ | |

٢. ژمارەی دانیشتوانوڕووبەری باشوری کوردستان کە لکێنراوە بە عێراقی دروستکراو لەگەڵ ئەو وولآتانەی کە ژمارەی دانیشتوانو ڕووبەریان ئەوەندەی باشوری کوردستان نابێتو خاوەنی قەوارەو دەسەلاتو ئەندامن لە ڕێخراوە جیهانیەکان بە تایبەتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانو ڕۆڵی گرنگیان هەیەلە ڕامیاریەتی هەمەلایەنەی جیهان.

| ت | ناوی وولات | رووبەری بەکم٢ | ژمارەی دانیشتوانی | |
|---|---|---|---|---|
| ١. | کۆماری تۆگۆ | ٥٦ر٧٨٥ | ٥ر٢٨٦ر٠٠٠ | باشووری کوردستان ٨٤ر٠٠٠ کم٢ ٦ر٨٢٥ر٠٠٠ ملیۆن کەسە |
| ٢. | کۆماری سیرالیۆن | ٧١ر٧٤٠ | ٥ر٦١٥ر٠٠٠ | |
| ٣. | کۆماری بۆسنەو هرسك | ٥١ر١٢٩ | ٣ر٩٦٥ر٠٠٠ | |
| ٤. | کۆماری چیك | ٨٧ر٨٦٦ | ١٠ر٢٦٧ر٠٠٠ | |
| ٥. | کۆماری کرواتیا | ٥٦ر٥٤٢ | ٤ر٣٩٠ر٠٠٠ | |
| ٦. | کۆماری لاتفیا | ٦٤ر٥٨٩ | ٢ر٣٦٧ر٠٠٠ | |
| ٧. | کۆماری لیتوانیا | ٦٥ر٢٠٠ | ٣ر٦٠١ر٠٠٠ | |
| ٨. | کۆماری نەمسا | ٨٣ر٨٥٨ | ٨ر١٦٩ر٩٣٠ | |
| ٩. | کۆماری ئیرلەندا | ٧٠ر٢٨٠ | ٢٧٩ر٠٠٠ | |
| ١٠. | ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو | ٨٣ر٠٠٠ | ٨ر١٦٩ر٩٣٠ | |
| ١١. | کۆماری جۆرجیا | ٦٩ر٧٠٠ | ٤ر٩٦٢ر٠٠٠ | |
| ١٢ | کۆماری پەنەما | ٧٨ر٢٠٠ | ٢ر٨٨٣ر٠٠٠ | |
| ١٣ | کۆماری کۆستاریکا | ٥١ر١٠٠ | ٣ر٨٣٥ر٠٠٠ | |

**٣. ژمارەی دانیشتوان و ڕووبەری ڕۆژهەلاتی کوردستان کە لکێنراوە بە ئێران لەگەڵ ئەو وولاتانەی کە ژمارەی دانیشتوان و ڕووبەریان ئەوەندەی ڕۆژهەلاتی کوردستان نابێت و خاوەنی قەوارەو دەسەلات و ئەندامن لە ڕێکخراوە جیهانیەکان بە تایبەتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان و ڕۆڵی گرنگیان هەیە لە ڕامیاریەتی هەمەلایەنەی جیهان**

| ت | ناوی وولات | ڕووبەری بە کم٢ | ژمارەی دانیشتوانی | |
|---|---|---|---|---|
| ١. | کۆماری ئۆرگوای | ١٧٦ر٢٠٠ | ٣ر٢٨٦ر٠٠٠ | ڕۆژهەلاتی کوردستان ١٩٥ر٠٠٠ کم٢ ١١ر٥٦٠ر٠٠٠ ملیۆن کەسە |
| ٢. | کۆماری ئەریتیریا | ١٢٠ر٣٢٠ | ٤ر٤٦٦ر٠٠٠ | |
| ٣. | کۆماری تونس | ١٦٣ر٦١٠ | ٨ر٨١٦ر٠٠٠ | |
| ٤. | کۆماری بەنین | ١١٢ر٦٢٠ | ٦ر٧٨٨ر٠٠٠ | |
| ٥. | کۆماری لیبیریا | ١١١ر٣٧٠ | ٣ر٢٨٨ر٠٠٠ | |
| ٦. | کۆماری مالاوی | ١١٨ر٨٤٠ | ٩ر٧٠٢ر٠٠٠ | |
| ٧. | کۆماری سربیا | ١٠٢ر٣٥٠ | ٩ر٦٠٠ر٠٠٠ | |
| ٨. | کۆماری سۆرینام | ١٦٣ر٢٧٠ | ٤٣٦ر٥٠٠ | |
| ٩. | تاجیکستان | ١٤٦ر١٠٠ | ٦ر٧٢٠ر٠٠٠ | |

**٤ـ ژمارەی دانیشتوان و ڕووبەری کوردستان کە دابەش کراوە لە نێوان چوار وولات و نیوی دروستکراو لەگەڵ ئەو وولاتانەی کە ژمارەی دانیشتوان و ڕووبەریان بە کیلۆمەتر دووجا ئەوەندەی کوردستان نابێت و خاوەنی قەوارەو دەسەلات و ئەندامن لە ڕێکخراوە جیهانیەکان بە تایبەتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوکان و ڕۆڵی گرنگیان هەیە لە ڕامیاریەتی هەمەلایەنەی جیهان.**

| ت | ناوی وولات | ڕووبەری بەکم٢ | ژمارەی دانیشتوانی | |
|---|---|---|---|---|
| ١. | کۆماری باراگوای | ٤٠٦ر٧٥٠ | ٥ر٨٤٤ر٠٠٠ | کوردستانی گەورە ٥١٧ر٠٠٠ کم٢ ٤٣ر٨٠٠ر٠٠٠ ملیۆن کەس |
| ٢. | کۆماری سوێد | ٤٩٩ر٩٦٤ | ٨ر٨٨٠ر٠٠٠ | |
| ٣. | ئیسپانیا | ٥٠٤ر٧٨٢ | ٤٠ر٠٧٥ر٠٠٠ | |
| ٤. | کۆماری ئۆزبەکستان | ٤٤٧ر٤٠٠ | ٢٥ر٥٦٤ر٠٠٠ | |
| ٥. | کۆماری پاپۆگینیای نوێ | ٤٦٢ر٨٤٠ | ٥ر١٧٣ر٠٠٠ | |

ئەمە چوار نمونەی زیندوە لە بەراورد کردن بەڵام گەلانی ئەو وولاتانە ئازاترو زاناترو شۆڕگێڕتر و زیاتر لە کورد خاوەنی مێژوو داب و نەریت و کەلتورن ٠٠٠٠ نەخێر

کورد ئازاترو شۆڕشگێر ترو زیاتر لەو گەلانەی ئەو وولاتانە لە هەموو بوارەکانەوە لە سەرەتای بونی کورد تاکو ئیستا شۆڕشە یەک لەدوای یەکەکانی کورد نەپچراوە بەهیچ جۆرێك وەك کوردیش توشی ئێش و ئازارو ئەشکەنجەو دەربەدەری نەبووە لە هەموو بوارە جیاکانی شۆڕش و ژیان بەلام خالێکی سەرەکی هەیەهەروەك لەناوەرۆکی پێشەکیەکە دیارم کردوە ئەویش یەکگرتن بناغەی سەرکەوتنە، گەلانی تر لە گەلی کورد یەکگرتوو تر بوە توانیویەتی بگاتە ئەنجامی هیواکان لەبەدەست هێنانی پێك هاتەی قەبارەی خۆی.

بەسەدانمونەی زیندو هەن گەر ئیسلام نەبوایە عەرەب لە بیابانی ئۆزوبای لماوی زیاتر پەرت نەدەبوون کە دوای فتوحاتی ئیسلامی عەرەب لە سنوری ئێستای خاکی عێراق نەدەبوون بەلام ئێستا عەرەب لە نیوەی باشوری کوردستان جێنشینن و تاکو تەواو کردنی ئەو پەرتوکەش بەردەوامن لە بە عەرەب کردنی کورد لە هەموو ڕوویەکەوە ئێمەش بە یەك نەگرتنی خۆمان ئاسانکاری هەمەلایەنە یان بۆ کردوەو بۆیان دەکەین بگرە لەناونانی مرۆڤەکانمان بە ناوی عەرەبی تاکو خاکەکەمان و سەرەڕای ئەوەش ڕێزیان لێ دەگرین.

خوێنەری خۆشەویست: هەر لە سەرەتای دروست بونی مرۆڤایەتی و قەوارەی جوگرافی و ڕامیاری و ئابوری و دەسەلات لە هەموو بوارە جۆراو جۆرەکان لە بچوکەوە تاکو گەورە کێشەو ململانێی شارستانیەت و شوێنەوارو بونی نەتەوایەتی زمان و کەلتورو مێژوو داهاتووە جا ئەو نەتەوە دەست خۆشی لێدەکرێ کە مافی تەواوی نەتەوەکەی بەدەست بێنێ و بەرەو لوتکەی ژیان لە هەموو بوارەکان هەنگاو بنێ و نمونەی نەتەوەو دەسەلاتەکانی بێت. . .!

**خوێنەری بەڕێز** : هەر ئەوەندەم پێکراوە لەماوەی چوار ساڵو حەوت مانگ کە توانیبم کەلێنێکم لە پەرتوکخانەی کوردیم پڕ کردبێتەوەو سوودی هەبێ بۆ نەوەکانی داهاتوو، هیوادارم یارمەتی دەرم بن لە هەر هەڵەیەك و کەم و زیادو شێوەی زمان و ڕێکخستن و رستەو ووشەو هەر کەمو کوڕیەکی ترو داوای لێبوردنتان لێدەکەم و ئاگادارم بکەنەوە بۆ ئەوەی بتوانم بە یارمەتی ئێوە ئەم پەرتوکە لە چاپکراوەکانی داهاتو جێگەی خۆی لە دەرونی خوێنەران بکاتەوە گەر تەمەن و توانا یارمەتیدەرم بێت لەگەڵ ڕێزم بۆ هەموو ئەو کەسانەی کەمەڵگری پەرتوکەکەمن و یارمەتیدەرمن لەهەموو لایەنە جۆراو جۆرەکان... جا بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندی بکەن بە ژمارەی مۆبایل (٤٥٤٨٠٩٨).

**عەلی گەندی**

**باشوری کوردستان- هەولێر**

**٢٠٠٤/١٢/٢٠**

# کێشوەری ئاسیا

# کوردستان

• ناوی ڕەسمی: کوردستان نیشتمانێکی بێ سنوورەو داگیر کراوو لەت لەت کراوە .
• پایتەختی: گەر وڵاتێك داگیر کرابێت و لەت لەت کرابێت پایتەختی چۆن دەبێت .
• ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٨٠٠ر٤٢ ملیۆن کەسەو دابەشی سەر چوار دەوڵەت کراوە.
• ڕووبەری: ٦١٦ر٣١٢ میل چوارگۆشەو ٠٠٠ر٥١٧ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
• چڕی دانیشتوانی: ١٣٦کەس لە یەك میل چوارگۆشەدا .
• شارە سەرەکیەکانی :دیاربەکر ،کەرکوك، هەولێر، سنە، مەهاباد، وان، ماردین، هەکاری، ئورمێ، قامیشلی، ئەسکەندەرۆنە.
• بەندەرە گرنگەکانی: ئەسکەندەرۆنە یەکەم دەرگای دەریایی یە لە کوردستانی گەورەو کەوتۆتە ڕۆژئاوای کوردستان.
• بوژانەوەی دانیشتوانی: ٤ر٢٪
• زمانەکانی: کوردی٩٠٪ تورکی و ئاشوری و ئەرمەنی١٠٪ .
• نەژادەکانی:کوردی ئاری، ئەرمەن و تورك و ئاشوری، بونی تورك و عەرەب لەکوردستان بەهۆی داگیر کردن بووە.
• ئاینەکانی: ئیسلام، مەسیحی، ئێزیدی، زەردەشتی.
• زانین و خوێندن و نووسین : ٦٥٪ .
• دابەشی کارگێڕی: ٣٢پارێزگایە + ١٩٥ قەزا + ٥٨٦ ناحیە.
• زەوی کشتوکاڵی : ٥ر٣٠٪ لەخاکی کوردستان.
• کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی٠٠٠٠؟.!
• بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی:٠٠٠٠؟.!
• دراوی: ٠٠٠٠؟.!.
• بەرهەمی کشتوکاڵی : گەنم، جۆ، نیسك و نۆك، توتن، برنج، گیز، هەنگوین، گوێز، گولەبەڕۆژە، دەرەزەرد "گەنمەشامی" تەڕە بەهەموو جۆرەکانی، میوەجات بە هەموو جۆرەکانی، چەندین جۆری تری بەرهەمی خۆرسکی و بەرهەمی کشتوکاڵی هەیە لە شاخەکان.
• سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٥٠٠ر١٨ ملیۆن سەر, بزن ٧٠٠ر١٢ ملیۆن سەر، چێڵ وگامێش ٦٥٠ر٥ ملیۆن سەر، پەرەور ٨٥٠ر٢٩ ملیۆن سەر .
• سامانی سروشتی: نەوت، غازی سروشتی، فۆسفات، کبریت، ئاسن، مەڕ مەڕ، بەردی چەوی، یۆرانیوم، چاوگەکانی ئاوی کبریتی، چەندین جۆری سامانی تری تیایە لە ژێر خاك و هەمووی زەوت کراوە یاخود ناتوانرێ دەربهێنرێت بە هۆی بارو دۆخی کوردستان ووڵاتانی دروستکراو لەسەر خاکی کوردستان خۆشیان نایانەوێ سودی لێ ببینن بە دامەزراندنی کارگەو پرۆژەی بەرهەم هێنەر بۆ ئەوەی گەلی کورد ژیانی بەرەو ئاڵۆزی بڕوات و دوور کەوێتەوە لە بیرو هەستی نەتەوەیی و شۆڕشگێڕی و ناچار بێت بەرەو هەندەران کۆچ بکات.
• پیشەسازی: پاڵاوتنی نەوت، پاڵاوتنی غاز, چیمەنتۆ، مەرمەڕ، ڕستن و چنین، جلو بەرگی خۆماڵی و کارگەیی، "خۆماڵی واتە ڕانك و چۆخە" پێڵاوی خۆماڵی "کلاشی پەڕۆین"، فۆسفات و کبریت، دۆشاو، گەشت وگوزار.
• بەرهەمی کارەبا : ٦٠٠ر٣٥ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر .

• بەرگری:.........؟.......!.
• سوپاکەی: .........؟..!.
• داهاتی دەرەوەی :.........؟...!
• دەرچووەکانی : ........؟...!
• هاوبەشەکانی بازرگانی: ..........؟...!
• ئاڵوگۆڕی دراو: کوردستان بە هۆی دابەش بوونی بەسەر چوار وڵاتی دژ بە یەکتری لە هەموو لایەنەکەوە تەنیا لەسەر کێشەی کورد کۆکن لەبەر ئەو هۆیە دراوی ئەو وڵاتانەی کە پێی لکێنراون بە کاری دێنن وەك" دیناری عێراقی و، تومەنی ئێرانی و، لیرەی تورکی و سوری و دۆلارو یۆرۆ"
• ڕژێمی دەسەڵات: کوردو نیشتمانی خاوەنی دەسەڵاتی تایبەت بە خۆیان نەبونە بە هۆی دابەشکراوی بەسەر چوار دەوڵەتی شۆڤێنی رەگەز پەرستی وبەکار هێنانی هەموو جۆرە کارێکی نامرۆڤایەتی و هەر کارێکی کە لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بێت . . . سەرەڕای ئەوە کورد هەوڵی داوە بە دامەزراندنی دەسەڵاتی تایبەت بە خۆی لەوانە دەسەڵاتی شێخ مەحمود ٠٠٠کۆماری مەهابادو دوایی ٠٠٠دەسەڵاتی کوردی لە باشوری کوردستان لە دوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی بە هاری ١٩٩١تاکو ئێستاش خاوەنی دەسەڵاتی خۆیەتی بە بونی پەرلەمانی کوردستان بە "١١١" ئەندامو ئەنجومەنی وەزیران. بونی پەیوەندی بە جۆرێکی نیمچە ڕەسمی لەگەڵ ووڵاتانی جیهانی لە بوارەکانی ڕامیاری و ئابوری و ڕۆشنبیری . ئەو خالەش لە ناوەرۆکی مێژوی کوردستان ڕوون کراوەتەوە لە هەموو لایەنە جۆراو جۆرەکان .
• پارتە ڕامیاریەکان: کورد خاوەنی چەندین پارتی تێکۆشەری دیارە لە سەرەتای بونیانەوە لە هەموو لایەنێکی تێکۆشان لە پێناو بەرگری کردن لە کوردو خاکی کوردستانو گەیاندنی بەئاواتەکانی بەپێی پرۆگرامەکانیان و بارو دۆخە نێو دەوڵەتی و هەرێم و ناوچەکە..

وەك: پارتی دیموکراتی کوردستان ، یەکیەتی نیشتمانی کوردستان، پارتی کۆمۆنیستی کوردستان، پارتی سۆشیالیستی دیموکراتی کوردستان، پارتی زەحمەتکێشانی کوردستان، پارتی یەکگرتوی ئیسلامی، چەندین پارتو گروپی تری هەیە، ئەم پارتانە لە باشوری کوردستانی لکێنراو بەعێراقن، پارتی دیموکراتی کوردستان، پارتی کۆمەلەی کوردستان، ئەمانەش لە ڕۆژهەلاتی کوردستانی لکینراو بە ئێرانەوە بەشداریان لە پەرلەمانی ئێران هەیە بە ناوی گروپی کوردی، پارتی کرێکارانی کوردستان " p k k"،پارتی دیموکراتی کورد، پارتی پێشکەوتن لەگەڵ چەندین پارتو گروپی تر هەن و هەندێکیان بەشداریان هەیە لە پەرلەمانی تورکی.هەروەها پارتی دیموکراتی کوردستان"کورد"چەندین پارتو گروپی تر هەیە لەڕۆژئاوای کوردستانی لکێنراو بەسوریا، ئەو پارتانە هەموویان قەدەغە کراون بەپێی یاسای دەوڵەتەکانیان تەنیا هەندێ پارت نەبێت بەتایبەتی پارتەکانی باشوری کوردستان کە لە دەسەلاتی نوێی عێراقی ئازاد کراو بەشداری بەرچاویان هەیەو ڕۆڵی سەرەکی دەبینن لە هەموو بوارەکان.

• جوگرافیای کوردستان: جوگرافیای کوردستانی ڕامیاری هەتا ئێستا ڕوونو ئاشکرا نیە بەشێوەیەکی زانستی نیشتمانی و نەتەوەیی بە هۆی گەمارۆدانی کوردو کوردستانو شێواندنی جوگرافیای کوردستانو گۆڕینی ناوی گوندو ناحیەو قەزاو شارەکان هەر وڵاتێك بە پێی خواستو ویستی بەهێز کردنی قەوارەی جوگرافی نەتەوەیی و دەسەلاتی خۆیانو بە عەرەب کردنو بەتورك کردنو بەفارس کردن تاکو ئێستاش هەر

بەردەوامەلە هەموو بوارو لایەنێکەوە، یاسا ناوخۆییەکانی ئەو وڵاتانە داڕێژراوەبە پێی ئەو یاسا نێو دەوڵەتیانەی گونجاون لەگەڵ ڕامیاریەتی تایبەتی و گشتی ئەو وڵاتەو کورد دوژمنی هەتا هەتایەی ئەووڵاتە دەسەڵاتدارانەیەکە لە وێران کردنی گوندوو شارۆچکەو شوێنەوارو بەلگەی مێژوویی و نەتەوەیی و شارستانی و بەلگە ڕاستەقینەکان و بزرکردنیان وسوتاندنیان و یاخود شاردنەوەیان. هەرچەندە ئەو دەولەتانە لە گۆڕینی دسەڵا تە یەك لەدوای یەکەکانی و هاتنی باشتر لەوانەی پێشوو بەلام هەر گورگەکەن لە پێستی مەڕ تاکوو هەڵیان بۆ دەڕەخسێ، بەهەر حال بەم شێوە جوگرافیای کوردستان دیاری دەکەم بە پێی نەخشەو بەڵگەی نوسەرە ناودارەکانی جیهان وەك نیکتین و مینۆرسکی و لازاریف و ئەرشیفەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیاو فەرەنساو بەلگەکانی کۆمەڵەی گەلان لەبەلگەنامەکانی پەیمانی لۆزان و سایکس بیکۆو سیڤەر بەڵگەنامەو نەخشەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە سنوری کوردستان لە شاری ئەسکەندەرۆنەی بەندەری ڕۆژئاوای کوردستان دەست پێ دەکات بەرەو سنوری باکوری پارێزگاکانێ مەرعەش و سیواس و ئەرزنجان و ئەرزەڕۆم و گارس و یەریڤان و ئورمێ و سنەو کرمانشاو ئیلامو بەدرەو جەسان و زنجیرە چیای حەمرین لە ڕۆژهەلات بەرەو ڕۆژئاوا کەسنوری ناحیەی سەعان یەك و بەرەو قەزای حەویجەو سنوری باشوری مەخمورو گەیارەو بەرتلەو بەرەو شێخان و سنجاروحەسەکەو بەرەو پارێزگای ئورفەو غازی عەنتاب، ئەمە بەپێی نەخشەکان بەتایبەتی نەخشەی ئێستای کوردستان بەلکو نەخشەی جوگرافیای کوردستان زۆر لەوە زیاترە بەلام بەهۆی بارو دۆخی ڕامیاری و جوگرافی و نەتەوەیی نەتوانراوە بەباشی دیاری بکرێت، بەلام ئەمڕۆ بێت یاخود بەیانی کورد نیشتمانی ڕەسەنی تەواوی خۆی دیاری دەکات بە ڕزگار کردنی چ لەڕێگەی شۆڕش چ بەڕێگای یاساکانی دادگای نێو دەولەتی ••• کوردستان کەوتۆتە باکوری کیشوەری ئاسیاو نیشتمانێکی زۆر دەولەمەندەلە سامانی سورشتی هەمەلایەنەو نیشتمانێکی ستراتیژی گرنگە لەجیهان و دەروازەی سێ لایەنە. عێراق دەکەوێتە باشوری، سوریا دەکەوێتە ڕۆژئاوای، ئێران و ئەرمینیا دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی، تورکیا دەکەوێتە باکوری ••• بۆ ئەوەی زیاتر ڕوون بێت کوردستان دەکەوێتە سەر هێلی درێژی ٣٠ـ ٤٠ی ڕۆژهەلات و هێلی پانی ٣٧ـ ٣٨ پلەی ڕۆژئاوای لەنێوان چیای قەوقاس لە ڕۆژهەلات ئەنازۆڵ و هەرێمەکانی کە دەڕواننە سەر دەریای سپی ناوەڕاست لە ڕۆژئاوا . لە کوردستان چوار زێی سەرەکی هەیە ئەویش ئاراس و قیزل ئوزان لە دەریای قەزوین دەکەنەوەو زێی دیجلەو فورات بەناو خاکی تورکیا بەرەو ڕۆژئاواو دوایی بەرەو باشورو لە دەریای بەناو عەرەبی دەکاتەوە ••• کوردستان بەوڵاتێکی چیایی بەناوبانگەو بەرزترین لوتکەی چیای ئاگریە کە بەرزیەکەی ٥١٥٨ مەترە. لوتکەی چیای ڕەشکۆ لەناوچەی چیلوداغ کە بەرزیەکەی (٤١٦٨) مەترە••• بەرزی خاکی کوردستان لەسەر ئاستی دەریا لە (١٠٠٠) مەتر بۆ (١٥٠٠) مەترە. کەش و هەوای لەناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی تر جیاوازە ناوچەکانی باشوری زستانی باران و بەفری زۆرو کەش و هەوایەکی گونجاوی هەیە لە هاوین گەرمە واتە شەش مانگی هاوینەو زستانی چوار مانگە •••بەلام لە باکورو ڕۆژهەلات زستانی ساردوو بەفرو

بـاراني زۆرو هـاويني كـەش و هەوايـەكي گونجـاوي هەيـە... لەناوەڕاسـتي خـاكي كوردستان زستاني ساردوو بەفرو باراني چڕي لێ دەبارێ هـاويني پلـەي گـەرمي لـە ٣٠ پلـە تێپەڕ ناكات ••• بە شێوەيەكي گشتي كەش و هەوايـەكي لـەباري هەيـە لـە هـەموو ڕوويەكەوە•••

- مێـژووي كوردستان: سـەرەتاي شارستانيەت و شـوێنەوارەكاني مرۆڤايـەتي لـە زانسـتەكاني سروشـت و مرۆڤايـەتي و كۆمەلايـەتي و نەتـەوەيي و زمان و كـەلتوورو ئاين لـە خۆيـەوە لەدايك نەبووەو لە بۆشايي نەهاتۆتە كايەوە.

نەتـەوە لـە لايـەن گـەلێك يـاخود دياردەيـەكي ديـاري كـراو دروست نـەبووە ..بـەلكو لەئـەنجامي بيري مرۆڤـەوە لـە سـەر زەوي بووەو بـە درێـژايي تێپـەڕبووني قۆناغـەكاني كـات و زەمەنـەكان بـە پاني و بەريني لە نەوەيەكەوە بۆ نەوەيەكي ترەوە، كـۆنترين بـيرو بۆچـونەكاني زانسـتي بـيري نەتـەوەيي و ئـايني بـووە لـە پەيوەنـدي دەوراو پـشت و گۆڕانكاريـە هەمـەجۆرەكاني سروشـتي ئەويش بە بوون و مردن و لەناوچوون

لەگەلْ ئەوەشدا مرۆڤ هـەموو تواناكاني بـەكار هێنـاوە بۆ بـووني خـۆي لەسـەر زەوي بە هـەموو جۆرێـك لەمانـەش وێنـە كـردن لەسـەر تاتـە بـەردەكان و ديـواري ئەشـكەوتەكان كـە تيايـدا دەژيـان و پەيكـەري سـەرەتايي دروسـت دەكـرا بەتايبـەتي پەيكـەرو نيگـاري ئـافرەت .. لـەزۆر زەمانەكاني جيهاني زەوي بە مێ دانراوەو ئاسمان بـە نێـر، كـە زەوي هێمـاي دايكـەو ئاسمـانيش هێماي باوكە. دۆزينەوەي شوێنەوارەكاني جيهان بـەر لـە (٥٠٠٠٠ تـا ٦٠٠٠٠) هـەزار سـالْ پـێش ئێستا بەتايبـەتي لـەخاكي كوردستان بـە شـان و بـازوي كـورد لـە ناوچـە جياجياكـاني ڕۆژهـەلات و باكورو باشورو ڕۆژئاواي كوردستان نێوەندي دوو زێ "ميزۆپۆتاميا" كە يەكەم شارستانيەتي تۆمـار كـراوي سـەر زەوييـە لـە مێـژوودا بـۆ نمونـە شوێنەواري شانەدەرو هەزار مێرد. هەلكەندراوي تابلۆي ئانۆپانينە لە سەر تاتە بەردەكاني سەرپيل زەهـاوي ڕۆژهـەلاتي كوردسـتان و لـە شـاخەكاني چـياي ئـارارات و ئـاگري و ناوچـەي سـنجارو چـەندين شـوێني تـر. پێكهاتـە سـەرەتاييەكاني گردي عەبيدە بوە بە كۆمەلە خوا نـاوي ئونوتـاكي كە سەرەتايەك بووە بۆ هەموو ئاينـە يـەك لـە دواي يەكـەكان و دروسـت بـوني شارسـتانيەت، كـوردو خـاكي كوردسـتان سەرچـاوەي پەيـدا بـووني كـشتوكالْ و پيـشەسازي و بيناسـازي و بەخێوكردني مەڕوو مالأت و ئاژەلْ بووە لە هەموو بوارە جياجياكاني لە بەرهەم هێنـاني گـەنم و جـۆو نيسك و نۆك و دانەوێلەي ترو دروستكردني جل و بـەرگ و پـێلاوو دروسـتكردني خانوبـەرەو ڕێكخستني ئەشكەوتەكان و دروستكردني چەكي ئەو كاتەي بەرگري پـێ لـەخۆكردن و هـەنگاو نـان بەرەو بازرگاني و گۆڕينەوەي كەل و پەلي پێويستي ئەوكات. سەرچاوەي يارمـەتي دانـي گـەلأني تـر بونە لە پێك هێنـاني شارستانيەت و شـوێنەواري خۆيـان كـە هـەمووي لەكوردسـتانەوە بـەرەو دەوروبەري كوردستان هەنگاوي ناوە بەلگەش بۆ ئەمـە لـەو كاتـەي كـورد لـە خـاكي ئێـستاي كوردستان خاوەني زمان و كەلتوورو داب و نەريت و مێـژوو بـووە نەعـەرەب و نـە تـورك هـەر بونيـان نـەبووەو خـاوەني هـيچ لايـەنێكي شارسـتاني نەبوونـە. دوايـي بۆتـە هـۆي ئـەوەي كـە شارسـتانيەتي سـۆمەري و ئەكـەدي و بـابلي و ئاشـوري و ميـدي لەسـەر خـاكي نێـوان دوو زێ "ميزۆپۆتاميا" بـەرەو شارستانيەتي حبسي و حوري تاكو شارسانيەتي ئەغريقي و ڕۆماني.

ئەمانە هـەمووي لـە چـەندين كـات و زەمانـدا لـە خاكي ئێستاي كوردستان بوونـە بـە تايبـەتي لـە باشـوري ڕۆژهـەلأتي ئاسـياي بـچوك و "چـياي زاگـرۆس و ئـارارات وزنجـيرە چـياي زگـروس و

درێژبونەوەی لە باکوری ڕۆژئاوا بەرەو باشوری ڕۆژهەلاّت و بەرەو ئەو کەنداوەی(کەئێستا پێی دەگوترێت کەنداوی عەرەبی لەلایەن عەرەب و یان کەنداوی فارسی لەلایەن فارسەکان)"

لەگەڵ پەرەسەندن و پێشکەوتن لە زمان و مێژوو کەلتورو داب و نەریت و نەشونماکردنی نەتەوەو بەرەو پێک هێنانی دەسەلاّت هەر یەك بەپێی توانای ئابوری و ژمارەی ئەو نەتەوە بەدی کراوە.

کورد نەتەوەیەك بووە لەپێشەوەی پەیدابوونی نەتەوەکانی تری سەر زەوی و بەشداری تەواوی کردوە لە پەرەسەندن و پیشکەوتن و بنیات نانی شارستانیەتی مرۆڤایەتی پێش سەدەکانی بەردینی نوێ و برۆنزیەکان کە زیاتر لە (٢٥٠٠ تا ٤٠٠٠) ساڵ بەر لەزاین، کورد خاوەنی زمانی سەربەخۆی خۆی بووەو بە هیچ جۆرێك ووشەی بێگانەی نەخستۆتە پیت و ڕستەکانی لە هەموو لایەنێکی پەرەسەندندا لە پاڵ داب و نەریت و کەلتورو مێژوی خۆی .کورد خاوەنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی خۆی بووە بەر لە(٧٥٠) ساڵ بەر لە زایین و نمونەی زیندووی ئاینی زەردەشتی و نوسینەوەی پەرتوکی ئاڤێستا بە زمانی زکماکی کوردی و بوە بەئاینی ڕەسمی ئیمپراتۆریەتی میدیاو نوسراوە جۆراو جۆرەکانی ڕۆژهەلاّت ناس و پرۆفیسۆرو شوێنەوارو جوگرافی ناس لەسەر کوردو ئاینی ئاڤێستاو بەشەکانی ئاڤێستاو مێژووی پێکهاتەی دەسەلاّتی میدیا لە کێشوەری ئاسیا ئەوە دەسەلمێنێ کە کورد بە دەیان هەزار ساڵ بەر لە ئێستا خاوەنی ئیماراتی بچوك بچوك بونە لە شاخ و دەشتاییەکان و هەنگاوی ناوە تاکو بەرەو پێکهێنانی دەسەلاّتی میدیا، کورد نەوەی میدیاو نەژادی ڕەسەنی ئارین کورد زیاتر لە (١٥٠) ساڵ بەر لە فارس خاوەنی دەسەلاّت و ئاین و مێژوو بووە بە پێچەوانەی ئەو بیرو بۆ چونەی کە دەلێن کورد لقێکە لە فارس بەلکو فارس لقێکە لەکورد گەر بەراورد لە زمانی فارسی ئێستاو ڕابردوی کورد بکەینەوە زمانی فارسی لە چەندین پیت و وشەی عەرەبی و کوردی پەشتونی پێکهاتووە بەلاّم زمانی ڕەسەنی کوردی زمانێکی بێگەردو سەربەخۆیە لە بوارەکانی زمانەوانی و ئەدەب و زانست و مێژوو ئەفسانە. عەرەب و تورك ئەو کاتە بونیان نەبووەو گەر هەشبوبێت لە پلەی سەرەتایی پەیدا بونیان بووە، نەتەوەی عەرەب کە لەنەژادی سامیەو هاونەژادی جولەکەیەو...بەلاّم دوای پێکهاتن و پەیدابوونی ئاینی ئیسلام و هەلسان بە کردنەوەی ئیسلامی"فتوحات الاسلامیه"عەرەب بونیان چەسپاو ئاینی ئیسلام بوە چەکێك بۆ خۆ ناساندنیان بە جیهان و فراوان کردنی سنوری جوگرافیای نیشتمانی عەرەبی و دەرچون لە دورگەی عەرەبی، بۆ نمونە زیاتر لە پەنجا سالیش دوای فتوحاتی ئیسلامی هاتونەتە ناو خاکی ئیستای عێراق کە تەنیا لەهەرێمی ڕۆژئاوای شام و دورگەی عەرەبی بوینە. گەر ئاینی ئیسلام نەبوایە بوونی عەرەب لە خاکی ئێستای عێراق جێگەیان نەدەبوو بە تایبەتی نەیدەتوانی بە ناوی ئیسلام خاکی کوردستان داگیر بکات و کاری بەعەرەب کردن ئەنجام بدات چونکە بەعەرەب کردن و داگیر کردنی خاکی کورد لەگەڵ فتوحاتی ئیسلامی دەستی پێکردوە.

لەگەڵ ئەوەشدا بەسەدان نمونەی زیندو هەن کە ئەوە دەسەلمێنن و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەو ڕاستیانە دەردەکەون، بۆ نمونە ئەو ئەسحابانەی کە لەدورگەی عەرەبی ڕویان لەکوردستان کردو شەڕیان لەگەڵ کورد دەکرد لەناو قولایی خاکی کوردستان لەگەڵ بەئیسلام کردن و لەهەمان کاتدا بەعەرەب کردن بە هێزو زەبری شمشێرو داگیرکردن تاکو ئێستاش گۆڕی عەرەبە کوژراوەکان بەئەسحابەو شەهید ناو دەبەن و گۆڕی شەهیدە کوردەکانیش لەسەر بەرگری کردن لە کوردستان بە گۆڕی کافرەکان ناو دەبەن..!..؟.

تـورك لـه ئاسـیای ناوەڕاسـتی بـچوك بـەر لە(٩١٠) ساڵ بەرەو تورکیای ئێستا هاتوون بە هۆی داگیر کردن بە پشتیوانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی و ئەلمانی کە بووە هۆی جێگیر بوونیان ئەویش ڕاستە چونکە تورك نە خاوەنی مێژوو نەخاوەنی کەلتور بوونە ئەوەی باسی لێوە دەکەن هی میدیاکان و ئەرمەنەکان وگەلانی تری هەرێم و ناوچەکان بووەو سەرەتای پێکهاتەی تورك لە چەندین نژادی جیا لەناوچەی مەنگۆلیای نیوان ڕوسیای قەیسەری و چینی میللی بووە.

کورد ئەوەی میدیاکانی ناوچەی ڕۆژئاوای ئێران و ڕۆژهەڵاتی تورکیای ئێستا نیشتەجێ بوون کە بە دەیان جار تووشی شاڵاوی درندانەی دوژمنانیان هاتوون لە لایەن ئاشوریەکان و تائەو کاتەی سەرکردەی لێهاتوو "دیاکۆ" توانی هۆزو تیرە میرنشینە کوردیەکان یەك بخات و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئاشوریەکان ڕزگار بکات و سەربەخۆیی ڕابگەیەنێ و شاری "ئەلبنان"هەمەدانی ئیستا بکاتە پایتەخت.

بەڵام دوای کۆچکردنی دیاکۆ چەندین سەرکردەی لێهاتو پەیدا بوون بەناوبانگترینیان "کیاکسار"بوو کە توانی دەسەڵاتی ولاتی میدیا فراوان بکات و سنوری بگەیەنێتە نزیك شاری ئەنقەرە بەدووری پەنجا کیلۆ مەترو دەریای قەزوین و کەنداوی خواروی تاکو پایتەختی ئاشوریەکان لە قەزای نەمرودی ئێستای سەر بە پارێزگای موصل کە زیاتر لە (١٥٠ )ساڵ دەسەڵاتدار بوو ئەمەش (٦٠٠) ساڵ پێش زاین ، واتە ئەوکات ئاینی جولەکە باس و خواسی هەر نەبوو.

دوای مردنی کیاکسار (کورشی) سەرۆکی هۆزو تیرەکانی هەخامنشی دەسەڵاتی گرتە دەست و دەولەتی ئەخمینی پێك هێنا. سەرەڕای ئەوە کورد لەژێر گۆڕانکاری ئەو بارو دۆخانە خاوەنی دەسەڵاتی خۆی بوە لەشێوەی ئیمارات بۆ نمونە محەمەدی کوری شەداد لە٩/٢/٩٥١زاینی حکومەتی دامەزراندوو دەستی کرد بە ئاوەدان کردنەوەی ناوچەی کارنو ئاران و ئەو حکومەتە زیاتر لە ١٥٠ ساڵ دەسەڵاتدار بووە لە ناوچەکانی قرپاخ و کوردستان و نەخچەوان و ئیریڤان. لەگەڵ ئەوەشدا کورد توانیویەتی بەرگری لە بونی خۆی بکات و دوای هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی میدیا کە خاوەنی دەسەڵاتی جیاجیای خۆی بوەلە ناو سنوری کوردستان لە ئیماراتی جۆراو جۆر وەك ئیماراتی مەلێن لە دیاربەکرو ئیماراتی ئێزیدیەکان لە سنجارو ئیماراتی زازا لە دەرسیم و خالیدین لەدەریای ڕەش و ئیماراتی موکری و هەرێمی خوراسان لەبەدلیس ئیماراتی پاشای کۆرەو بابان و سۆران و چەندین ئیماراتی ترو. بەردەوام بوونی پەیوەندی نێوانیان بە یارمەتی دانی یەکتری و دژایەتی یەکتری بەردەوام بە هۆی ژێر دەستەیی و گەمارۆ دانیان و کارلێکردنیان لە لایەن ئیمپراتۆریەتەکانی بیزەنتی و مەگۆڵ و ئەسکەندەری گەورەو قەیسەری ڕووسی و چەندین دەسەڵاتداری تری بەهێز لە دوای دەسەڵاتی میدیاکان تاکو شەڕی چالدێران و دوای کەوتنە ژێر دەستی ئیمپاتۆریەتی عوسمانی و فارسی و سەرەڕای ئەوەش مل کەچی خۆیان بۆ کەس قبول نەکردیە.

لە ناوچە جیاجیاکانی خاکی کوردستان و دوای بەئیسلام کردنی کورد لە ژێر شاڵاوی فتوحاتی ئیسلامی و داگیر کردنی ناوچەکان و...!... خەلیفەکانی ئیسلام نەیان توانیە دەسەڵاتی خۆیان بەسەر خاکی کوردستان بسەپێنن بە هۆی بوونی دەسەڵاتدارانی کورد لە ولایەتەکانی وەك ویلایەتی ئەردەڵان لە ساڵی ١٢٢٠ تاکو ١٥٧٢ ودەسەڵاتی مەلێن لە دیاربەکرو ئیماراتی ئێزیدیەکان لە سنجارو زازا لە دەرسیم خالدین لە کەناری دەریای ڕەش و موکریانی لەهەرێمی خوراسان وئیماراتی بەدلیس ٠٠٠!٠٠٠ بەڵام بەهۆی گرنگی ناوچەی

کوردستان‌و دڵی کێشوەری ئاسیاو دەروازەی سێ لایەن‌و بەپیت‌و بەرەکەتی خاکەکەی‌و بونی ئەو هەموو ولایەتە جیاجیایانە لەناوچەیەیەکی ستراتیژی جوگرافی گرنگ‌و یەك نەبوونی ئەو ولایەتانەو بونی مەترسی لەپێش ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تورك‌و فارس بەرامبەر بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی ئابوری‌و سەربازی‌و فراوانکردنی دەسەڵات‌و سنوری جوگرافی خۆیان‌و سود وەرگرتن لەدژایەتی کردنی ئیماراتەکان لەناو خۆیانداو نەبونی دەسەڵاتێکی یەکگرتووی کورد... هەلگیرسانی شەڕی چالدێران لە نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌و سەفەوی فارسی لە٢٣/٨/١٥١٤ لەئەنجامدا کوردستان دابەش کرا لە نێوان ئەو دوو ئیمپراتۆریەتە ، دوای ئەوە لە٩/٨/١٥١٥ میر نشینە کوردەکان پەیمانیان لەگەڵ سولتان سەلیمی تورك مۆر کرد بۆ ڕاوەستانی شەڕو دابەش نەکردنی کوردستان‌و لایەنگیری کردنی تورك بەڵام دوای ١٥ساڵ تورکەکان لەو پەیمانە پەشیمان بوونەوە، پەیمانی نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌و سەفەوی فارسی لە٢١/٣/١٥٩٠ مۆر کراکە بوە هۆی ئەوەی کەلۆرستان‌و شارەزور بکەویتە ژێر دەسەلاتی عوسمانی، لە دوای ئەوە شەڕی قەڵای دمدم لە٥/١/١٦٠٨ هەلگیرسا لەنێوان (خانی لەپ زێڕین)و سوپای عوسمانی تورك. هەر دوای ئەوە ڕێکەوتنامەی زەهاو لە نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌و سەفەوی لە ٢٠/٥/١٦٣٩ مۆر کرا کە بەیەکەم دابەش کردنی خاکی کوردستان دادەنرێت‌و ئیتر کورد کەوتە بەر شالاوی دڕندانەی تورك‌و فارس سەرەڕای ئەوە کورد توانی بەرگری لە بونی نەتەوەیی خۆی بکات لەناو جەرگەی نیشتمانەکەی.

لەپاش ئەو هەموو گۆڕانکاریە مەحمود پاشای بابان لە ١٠/٥/١٨٢٠لەگەڵ مستەر ڕیچ کۆبونەوەیەکیان لەشاری سلێمانی ئەنجامدا لە سەر کێشەو گیرو گرفتی کوردو ناوچەکە.

هەلگیرسانی شەڕی نێوان میری ڕواندزو هێزەکانی سوپای فارسی لە ١١/٥/١٨٣٢ هەر لە دوای ئەوە قەڵای سەید بەگ لە ١٣/٥/١٨٣٨ سوتێنرا لە لایەن دەسەڵاتی تۆرانیەکانی عوسمانی، سەرەڕای ئەو کردەوانە ڕێکەوتن نامەی ئاشتبونەوە لە ١٠/٢/١٨٢٨ مۆر کرا بوو بە ناوی "ئاشتی تورك جای"لە نێوان ئێران‌و ڕوسیای قەیسەری کە ئەرمەنستانی ژێر دەسەلاتی فارسی ببێتە بەشێك لە خاکی ڕوسیا بە هۆی داگیر کردنی چەندین ناوچەی کورد کە دەکەوتە سەر سنوری قرپاخ‌و نەخچەوانی کوردسەرەڕای گەمارۆی کورد‌و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کە بۆ یەکەم جار بنەمای کۆمەلەی یەککرتن لە ٢١/٥/١٨٨٩پێکهات بەناوی (الاتحاد والترقی)لە لایەن "تالب ئەلبانی" کە ناز ناوی ئیبراهیم تەیمور بوو لەباکوری کوردستان‌و وردە وردە پەرەی سەند دوایی بووە کۆمەلەی یەککرتن‌و پێشکەوتن‌و دەستی کرد بە تێکۆشان دژی دەسەلاتی سولتان عەبدولحەمید. بەڵام بەر لەوە دوو میسیۆ نێری ئەمەریکی بەناوی "ڕایس‌و بریس" لە ١٣/ ٦/١٨٤٨ چاویان کەوت بەمیر بەدرخان‌و ماوەی ٢٣ڕۆژ لای مانەوەو بەردەوام بوون لە گفتوگۆ کردن لە بارەی کوردو خاکی کوردستان‌و بەر لەوە بە چەند مانگێك پەیمانی نێوان عوسمانی‌و فارسی لە١٩/٥/١٨٤٧ مۆر کرابوو لە ئەنجامی ئەو کۆبونەوەیە چەندین ناوچەی کورد خسترایە ژێر دەسەلاتی تورك،دوای ئەو کارەساتە لە ٢/١١/١٨٥٤بەرەی قەفقاس لەگەڵ قاسم خان‌و چەند سەرۆك کوردێك کۆبونەوە لە گوندی گیزل .بۆ ئەوەی کورد یارمەتی ڕوس بدات لە جەنگ، سەرەڕای ئەو کێشەو ململانێیە یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی کوردستان لە ٢٢/٤/١٨٩٨دەرچوو لە قاهیرەی پایتەختی میسر لە لایەن مقداد مەدحەت بەدرخان کە بە ڕێگای نهێنی دەگەیشتە ناوچەکانی کوردستان، لەهەمان کات شەریف

پاشا لە ٦/ ١٩٠٨/٧دەستی لە کاری بالوێزی عوسمانی کێشاوە لە سوێندو گەڕاوە کوردستان بۆ بەرگری کردن لە مافەکانی کورد. جەنگی جیهانی یەکەم لە ١٩١٤/٨/٣ تا ١٩١٨/٨/٣٠کە ڕوداوێك بوو لە ڕوداوە مەزنەکانی پڕ لەمەرگەسات و ئێش و ئازاری گەلان لە مێژوی مرۆڤایەتی کە زۆربەی زۆری ناوچەو هەرێم و ولاتانی گرتەوە لەوانەش خاکی کوردستان. بەر لە هەلگیرسانی شەڕ ڕێکەوتننامەی نێوان تورکیای عوسمانی و ئەلمانیا لە ١٩١٤/٨/٢مۆر کرا ئەویش بە نیازی دابەش کردنی کوردستان بوو لە نێوان خۆیان دوای سەرکەوتنیان لە جەنگ بە تایبەتی ناوچە نەوتیەکان لەباشوری کوردستان، لەگەڵ ئەوەشدا هێزەکانی سوپای ڕووسیای قەیسەری ناوچەکانی شاری ورمێ و دەوروبەری لە١٩١٥/٥/١١داگیر کردوو بەرەو باشوری کوردستان هەنگاوی دەنا بەرەو ڕواندوزو لە ١٩١٦/٥/١٣ ڕواندوزی داگیر کردو دوای ٦٥ڕۆژ جێی هێشت ئەویش بەهۆی شۆڕشی بۆرژوازی لە ڕوسیا کە بەناو خاکی کوردستان گەڕاوە لەڕێگەی داگیر کردنی ڕۆژهەلاتی کوردستان بەرەو باشوری کوردستان .

دوای ئەوە بەهەوڵی ڕوسەکان توانرا لەشاری کرمانشا لە گوندی بێندار یەکەم کۆنگرەی مێژوویی لە ١٩١٧/٧/١٣لە ڕۆژهەلاتی کوردستان گرێبدات کە ماوەی سێ ڕۆژی خایاند سەرۆکی کوردەکان و نوێنەری ڕوسیا و بەریتانیاو ئێران تێیدا بەشدار بوون ئەمەش بۆ هێور کردنەوەی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازانی کوردو کردنە بەزی نێوان دەسەلاتی خۆیان ماوە نەدان بە کورد بگاتە ئاواتەکانی و خۆش باوەڕی کوردیش هۆکاریکی سەرەکی بوو لە لاوازی بەرگری کردن لە مافەکان.

دوای مۆر کردنی پەیمانی "بریست لینومیسك"لە ١٩١٨/٥/٣ لە نێوان لینین و ئەلمانیاو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئەویش هەر بووە هۆی داگیر کردنی ناوچەی کوردستان لەلایەن دەسەلاتی نوێی ڕوسیا.بەلام لە دوای کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم بووە هۆی مۆرکردنی پەیمان و ڕێکەوتن چ لە ناوەوەی شەڕو دوای شەڕ بە نهێنی و ئاشکرا لە لایەن هاوپەیمانان بە تایبەتی مۆرکردنی پەیمانی سایکس بیکۆلە ١٩١٦/٥/١٦ لە نێوان بەریتانیاو فەرەنسا لەقاهیرەی پایتەختی میسر بەلام مۆر کردنی ئەو پەیمانە نهێنیە لەلایەن ڕوسەکان ئاشکرا کراو دوای ئەوە شۆڕشی ئۆکتۆبەری بەلشەفیەکان لە١٩١٧/١٠/١٧ سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە ڕوسیا بەدامەزراندنی دەولەتی دیموکراتی سوشیالیستی و ڕامالینی دەسەلاتی قەیسەرو دابەش بونی جیهان بەدوو جەمسەری دژ بە یەکتری سۆشیالیستی و سەرمایەداری و کاردانەوەی گرنگی کردە سەر بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد، لەو کات و ساتە حکومەتی بەریتانیا لە ١٩١٩/٥/١٠فەرمانی دا بەپێك هێنانی چەندین مینشینی کوردی کە لەژێر دەسەلاتی شێخ مەحمودی نەمر بێت لەباشوری کوردستان بەلام بەمەرجێك لەژێر چاودێری و ئامۆژگاری ئەفسەری بەریتانی بێت بە هۆی بەرز بوونەوەی جموجوڵی شۆڕشگێرانی کورد بەتایبەتی لە باشوری کوردستان و ڕۆژهەلاتی لەدوای ١٩١٩/٥/٢٠ لەلایەن شێخ مەحمودو سمکۆی شکاك و ڕۆژهەلاتی تورکیا و ڕۆژهەلات و باکوری ڕوسیا کە بووە ڕاپەڕینە یەك لە دوای یەکەکان لە١٩١٩/٥/٢٣بەردەوام بوونی ولەو کات و ساتەدا "میجەرسۆن"لە١٩١٩/٦/١٤سەردانی باشوری کوردستانی کردوو لەگەڵ سەرکردە کوردەکان گفتوگۆی ئەنجامدا بەتایبەتی شێخ مەحمودی نەمر. ئەمانەو گەلێ کاری تری شۆڕشگێڕی و هاوکاری کە بوە هۆی مۆرکردنی پەیمانی سیڤەر لە١٩٢٠/٨/١٠کە چەندین خاڵ و بڕگەی باشی لەخۆوە گرتبوو بەتایبەتی بڕگەکانی ٦٢. ٦٣ـ ٦٤ لە مادەی "٣"بەدان پێدانانی مافی کورد لەتورکیاو ناوچەکانی تر بەتایبەتی "عێراقی"

بەرەو دامەزراندن لەوکات.

بڕیاردان بە دروستکردی کوردستانی سور لە ١٩٢٣/٧/٧لەلایەن دەسەلاتی نوێی سۆشیالیستی ڕوسیا، لەچەندین کۆڕو کۆبونەوە لەسەر چارەی کێشەی کورد سەرکەوتنی بەخۆوە دەبینی بەرەو قۆناخی سەرکەوتن هەنگاوی دەناو بوە مەترسی لە داهاتوی وڵاتانی هاوپەیمانو بەرژەوەندی تایبەتی و یەك نەبونی سەرکردەکانی کورد لەپێناو پاراستنی بەرژەوندی تایبەتی خۆیانو بەلاوەنانی بەرژەوەندی گشتی کوردو کوردستانو ئەنجامەکە بووە هۆی دابەش بوونی کوردستان بەسەر چوار دەوڵەتی نوێی دامەزراوی دژبە یەکتری بەپێی پەیمانی لۆزان لە١٩٢٣/٧/٢٤.

دابەش بوونی کوردستان بەتیری ژەهراوی بەبێ ڕەزامەندی کورد تەنیا ئەوانە نەبێ کە بەرژەوەندیان لەگەڵ ئەو کارە نامرۆڤانە هەبوو، چونکە٠٠!؟ گەر بمانەوێ مێژوو ڕوداوو بەسەرهاتی کوردو بەرگریو ڕاگەیاندنو شۆڕشو پەلاماردان بنوسین بەلام هەمووی بەکورتی وەك کورد دەڵێ"پێچك چوارەو بەئەژمارە ".....!.....

بۆ یەککگرتنەوەو پالپشتی یەکتریو یارمەتی شێخ مەحمودی نەمر یەکەم نامەی لە ١٩٢٢/١/٢١ ئاراستەی لینینی ڕابەری شۆڕشی (ئۆکتۆبەری ١٩١٧/١٠/١٧)کردوو داوای یارمەتیو پشتگیری لێکرد لەبەر ئەوەی ئەو کات شۆڕشی بەلشەفیەکان بلێسەی بەرپابوونی شۆڕشی نەتەوەییو چینایەتیو نیشتمانی بوو، دوای ئەوە شێخ مەحمود لە١٩٢٢/٢/١٨حکومەتی ڕاگەیاندو یەکەم ئەنجومەنی شارەوانی دامەزراندو ئالای کوردستانی بەرز کردەوە.ئەویش لەئەنجامی جێبەجێ نەکردنی بەڵێنەکانی دەسەلاتی شانشینی نوێی دامەزراوی عێراقو بەریتانیا، لە١٩٢٢/١/٢٤ڕاگەیاندنی هاوبەشی دەسەلاتی شانشینو بەریتانیا بە دان

نان بەمافی کورد لەو ناوچانەی کە زۆربەیان کورد پێك دێننو حکومەتی کوردی پێك بێت لە چوار چێوەی سنوری عێراقی بەزۆر دیاریکراو کە لەو کاتە دانیشتوانی پاریزگای موسڵ٨٠٪و کەرکوك ٨٥٪ کورد بوون بەپێی ئامارەکانی کۆمەلەی گەلانو دەسەلاتی تورکی عوسمانی، بەهۆی بارودۆخی نوێی جیهانو بوونی بە دوو بلۆکی سەرەکی سۆشیالیستیو سەرمایەداریو ڕاگەیاندنی کۆماری ئازربایجان لە١٩٢٤/٢/٩ کە پایتەختی نەخچەوان بووکە بەناوی کۆماری نەخچەوان ناوزەند کرا کە دەکەویتە سەر سنوری نێوان ئێرانو تورکیاو سەر بە کۆماری ئازربایجان بوو کە ڕوبەری ٥٢ هەزار کیلۆمەتر چوار گۆشە ژمارەی دانیشتوانی ١٢٠هەزار کەس بوو کە کەوتبوە ناوەوەی سنوری ئەرمینیاو بەشێك بو لە کوردستانی داگیر کراو.هەر لەو کاتە بوو کۆماری تورکیا لە١٩٢٤/٣/٣ڕاگەیەندرا لە لایەن کەمال ئەتاتورك بە سوتاندنی هەرچی فێرگەو یانەو نوسینی بەکوردیو سەر بەکورد بوو لەگەڵ قەدەغەکردن، لەوکاتەش هەلبژاردنی ئەنجومەنی پەرلەمانی عێراق لە ١٩٢٤/٣/١٢ئەنجام درا کە ١٧کورد بەشداری تێدا کردو تەنیا ڕۆڵی ووشەی بەڵێیان هەبوو بە پێی ئامۆژگاریەکانی دەسەلاتی شانشینیو بەریتانیای مەزن. هەر لە دوای ئەوە کەمال ئەتاتورك دەسەلاتی خەلافەتی لە١٩٢٤/٤/٣ هەلوەشاندەوەو دەسەلاتی عەلمانی ڕاگەیاند، لەگەڵ ئەو بارودۆخە شێخ سەعیدی پیران دەستی کرد بەسەرهەڵدانی شۆڕش لەباکوری کوردستان لە ١٩٢٥/٢/١٤ لەهەمان کاتا سەرەك وەزیرانی بەریتانیا "لوید جۆرج"لە ١٩٢٥/٢/٢٥لەبەر دەمی ئەنجومەنی گشتی بەریتانیا ڕایگەیاند"کە پێویستە کورد مافی چارەی خۆنوسیی هەبێ، لەدوای ئەو ڕاگەیاندنە شێخ سەعیدی پیران لە١٩٢٥/٣/٢١ سەربەخۆیی کوردستانی ڕاگەیاندوو دیاربەکری کردە پایتەختی کوردستان، لەو کاتە لەباشوری کوردستان شێخ

مەحمود لە۱۹۲٥/۷/۷ ڕاپەڕینی ڕاگەیاند. بەر لەوەش لە ۱۹۲٥/۳/۱۰شێخ سەعید ناوچەکانی سلیڤان و هازرو ئارگاوەو چولەمێرگی ڕزگار کرد لە باکوری کوردستان. لەگەڵ ئەوەشدا شێخ مەحمودی ئەمر بروسکەیەکی لە ۱۹۲٥/۳/۲۰ ئاراستەی سەرەك وەزیرانی ئێران و بالوێزی ئەمەریکاو بەریتانیاو تورکیاو ڕوسیاو فەرەنسا کرد لە ئێران بۆ جێبەجێ کردنی بەڵێن و داواکاریەکانی مافی کورد، هەر لەدوای ئەوە شێخ سەعیدی پیران و٤۷ هەڤاڵی لە ۱۹۲٥/٦/۲۹ دوای تەواو بوونی دادگایی کردنیان لە ماوەی دوو کاتژمێرو نیو لە سێدارە دران کە بووە هۆی کارەساتێکی گەورەی گەلی کوردو کاردانەوەیەکی دوولایەنەی لێ هاتە کایەوە، یەکەم زیانێکی گەورەو دووەم بەهێز بوونی هەستی نەتەوایەتی و بەرگری کردن لە مانەوەی ناسنامەی کورد، هەر لە دوای ئەوە مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی نێوان عێراق و بەریتانیاو فەرەنساو تورك لە ۱۹۲٦/۱/٥ کە تورکیا دانی بەوە نا کە ولایەتی موسڵ ببێتە بەشێك لەخاکی عێراقی نوێی ژێر دەسەڵاتی عێراق و دوای ئەوە باشوری کوردستان بە ڕەسمی لە۱۹۲٦/۱/۱۳لکێندرا بەشانشینی عێراق لە ڕێکەوتنی نێوان دەسەڵاتی عێراق و بەریتانیا بەپێی بەندەکانی پەیمانی لۆزان.

کۆمیتەی نێودەوڵەتی لێکۆڵینەوەیەکی لە ۱۹۲٥/۷/۱۱بڵاو کردەوە بەناوی ئەوەی کە ولایەتی موسڵ بکەویتە ژێر کۆنترۆڵی کۆمەڵەی گەلان بۆ ماوەی ۲٥ساڵ و زمانی کوردی ببێتە زمانی ڕەسمی و ئیدارەی ولایەتەکە کورد بەڕێوەی ببا، هەرچەندە جموجوڵ ودەنگی ناڕەزایی بەرامبەر دەسەڵاتدارانی کوردستانیان پێلکێندرابوو بەردەوام بوون لە پێك هێنانی پارت و ڕێکخراوی جۆراو جۆر بۆ ئەوەی بتوانرێ کەلەنێك دیاری بکرێت و زیاتر بزوتنەوەی ڕزگاری گەلی کورد بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێ و لەو کاتە ڕاپەڕینەکەی ئاگری داخ لە۱۹۲۷/۱/٥ بەرپابوو لە باکوری کوردستان.

لەو کاتەی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە هەموو ناوچەکانی کوردستان و دەرەوەی کوردستان بەردەوام بوو لە بەرگری و پێکهێنانی ڕێکخراوو پارت و دەستەی لێهاتووکە لە ۱۹۲۷/۱۰/٥لە هاوینە هەواری"بحمدوون"ی لوبنان هەندێ ڕۆشنبیری ناوداری کوردو چەندین ڕێکخراوی کوردی، وەك کۆمەڵەی پێشکەوتن و کۆمەڵەی کوردستان و کۆمەڵەی نەتەوەیی کوردو کۆمەڵەی سەربەخۆیی کۆبوونەوە لەئەنجامی گفتوگۆی چڕی نێوانیان کۆمەڵەی "خۆیبوون"و" دروشمەکەی ڕاگەیاندراو کاردانەوەیەکی گرنگی نواند لە ڕامیاریەتی ئەو ولاتانەی کە خاکی کوردستانیان پێوە لکێندرابوو، دوای ئەوە بەماوەیەکی کەم لە باشوری کوردستان لە ۱۹۲۷/۱۰/۱٤ یەکەم بیری نەوت لە بابە گوڕگوڕی شاری کەرکوك دۆزرایەوە بوە هۆی ئەوەی کە کێشەو ململانێ لە نێوان دەسەڵاتی عێراق و تورکیا زیاتر توندو تیژ بێت لە سەر ولایەتی موسڵ کە بە بیانووی ئەوەی بەشێکە لەخاکی تورکیا سەرەڕای ئەوەش ٦٥٪ی ولایەتی موسڵ خاکی کوردستانە.

بۆ ئەوەی دەنگی کوردو بزوتنەوەی ڕزگاریخوازیەکەی بگاتە هەموولایەك ڕۆژنامەی "ڕێیا تازە"لە ۱۹۳۰/۳/۲٥یەکەم ژمارەی لە شاری یەریڤان بڵاو کرایەوە، دوژمنانی کورد درێخیان نەکرد لە دژایەتی کردنی کوردو بزوتنەوەی ڕزگاری کوردو نیشتمانەکەی بۆ نمونە "سعد صالح" لەناو هۆڵی پەرلەمانی عێراق لە ۱۹۳۱/۳/۲۸ هاواری کردوو ووتی"یا دەبێ شێخ مەحمود لەناو ببرێت یا ئەو مافانەی داوای دەکا بۆی جێبەجێ بکرێت"، دوای ئەوە لە باکوری کوردستان ڕاپەڕینەکەی ئیحسان نوری پاشا لە ۱۳/ ٦/۱۹۳۰دەستی پێ کرد لە شاخەکانی ئارارات دژی دەسەڵاتی تورك و ئێران. هەر لەو کاتە شێخ مەحمود لە ڕاپەڕینەکانی خۆی درێخی

نەدەكردو بەردەوام بوو ئەویش لە ١٩٣١/٤/٥ كە ئەنجامی دا بە ماوە نەدان بە خواستو ویستەكانی دەسەڵاتی شانشینی عێراق دوای ئەوە بە هۆی بارو دۆخ و شكستی لە ڕاپەڕینەكە لە١٩٣١/٥/١٣خۆی دابەدەستەوە.

مۆر كردنی ڕێكەوتنامەی نێوان ئێران و توركیا لە ١٩٣٢/١/٢٣بۆ لێدانی شۆڕشی ئاراراتو هەروەها ئێران چیای ئاراراتی بچوكی دابە دەسەڵاتی تورك بۆ ئەوەی هێرش كردنە سەر شۆڕشگێرانی ئاراراتی گەورە ئاسان تر بێتو شۆڕشەكانی كورد سەركوت بكرێت، لەهەمان كات لە ١٩٣٢/٥/٥ دەسەڵاتدارانی تورك بە جێبەجێ كردنی یاسای پەرلەمانەكەیان دەستی كرد بە گواستنەوەی خێزانە كوردەكان لە شارە جیاجیاكانی باكوری كوردستان و هێنانی خێزانی تۆرانی بۆ جێگەی ئەوان واتە بە تورك كردن، لەهەمان كات لە ١٩٣٢/٥/٣٠ وەرگرتنی عێراق لە كۆمەڵەی گەلان ئەویش بە دابین كردنی مافی كورد كەلەبڕگەی (١٠)ی بڕیارەكەی وەرگرتنی هاتوە، دوای ئەوە لە ١٩٣٧/٧/٨مۆركردنی پەیمانی "سەعد ئاباد" لە نێوان عێراق و توركیاو ئێران و ئەفغانستان بۆ بەرەنگار بونەوەی دروست بونی هەر دەوڵەتێكی كوردی لە لایەن یەكێك لەو چوار پارچەیەی كوردستانی لكێنراو بە وڵاتەكانیان، هەر لەگەڵ ئەوە لە ١٩٣٧/٨/١٧مۆركردنی ڕێكەوتننامەی نێوان عێراق و ئێران بۆ لێدانی ڕاپەڕینەكانی كورد لەسەر سنورەكانیان چونكە عێراق لەوە زۆر دەترسا كە شای ئێران یارمەتی كوردی باشوری كوردستانی دەداو یارمەتیەكانی بۆ كورد ڕابگیرێ.

لەگەڵ ئەوەشدا دوای ساڵەكانی سیو بەسەرەوە چەندین پارت و ڕێكخراوی نیشتمانی و نەتەوەیی و ڕامیاری پێكهات و لە پێكهاتن بوون چ كوردی یاخود عەرەبی و یاخود توركی یاخود فارسی و بوە هۆی كێشەو ململانێی نێوانیان بەداخەوە نەم توانی ڕۆژی دەرچون و ناوی ڕۆژنامەو گۆڤارەكان دیار بكەم بە هۆی نەبونی سەرچاوەیەكی وەها كە بتوانم بە زنجیرەیەكی ڕێك و پێك لە مێژوی ڕوداوەكانی كورد و كوردستان جوتم بكردایە، بەڵام بەهەر حاڵ مێژوی ڕوداوەكان بەڵگەن بۆ ئەو مەبەستە كە ئەویش بەرەو گۆڕینكاری لە جیهان و دژوار بوونی كێشەی نێو دەوڵەتی بەرەو بۆ هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەم لە نێوان یەكیەتی سۆڤیەت و ئەڵمانیاو هاوپەیمانان لە ١٩٣٩/٩/٢ دەستی پێكردوو بارو دۆخی جیهان لە شێوازێكی نوێی لە ڕامیاریەتی جیهانگەری خۆی دەنواندو بەهێز بوونی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی میللەتان لە كێشوەرە جیاجیاكانی جیهان لەوانەش بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی كورد بە هۆی پەیدابوونی بۆشایی لە ڕامیاریەتی نێو دەوڵەتی و ئەنجامدانی كودەتای سەربازی لەلایەن ڕەشید عالی گەیلانی لە ١٩٤١/٥/١ دژی داگیر كەری بەریتانیاو ڕژێمی شانشینی عێراق و دوای بەرپا بوونی شۆڕشی مایس لە ١٩٤١/٥/٢و لە لایەكی تر هێزەكانی سوپای بەریتانیاو ڕووسیا لە١٩٤١/٨/٢٥ چونە ناو خاكی ڕۆژهەڵاتی كوردستان وەك داگیركەر مانەوەو دوای ئەوە شۆڕشەكانی بارزان لە ساڵی ١٩٤٣هەتا١٩٤٥و ڕاگەیاندنی كۆماری كوردستان لەشاری مەهاباد لە ١٩٤٦/١/٢٢ لە گۆڕەپانی چوار چرا لە لایەن پێشەوا قازی محەمەدو هەڤاڵانی كە بووە جێگەی مەترسی لە هەرێمەكەو خستنەوەگەڕی پەیمانی سەعد ئابادو كشانەوەی سوپای سوری سۆڤیەت لە ١٩٤٦/٣/٢٣ لە ماوەی ٤٥ ڕۆژو لەهەمان ڕۆژ مۆركردنی ڕێكەوتننامەی دامەزراندنی كۆمپانیای نەوتی تێكەڵاوی سۆڤیەتی ئێرانی كە ئەنجامەكەی بوە هۆی لە ناوبردنی كۆماری كوردستان لە١٩٤٧/١٢/١٧و لە سێدارەدانی پێشەوا قازی محەمەدو هەڤاڵەكانی لە١٩٤٧/٣/٣١ودوای لە سێدارەدانی چوار

ئەفسەرە کوردەکان کە بەشداری دامەزراندنی کۆماری کوردستانیان کردبوو لە ١٩٤٧/٤/٦و هەلگیرسانی شەڕی نێوان شۆڕشگێڕەکان و ئێران لە ١٩٤٧/٣/٢٤لە ناوچەکانی خانەو هەلەج و ناوچەی مەرگەوەڕو دوای ئەوە لە ١٩٤٨/١/٢٧ڕاپەڕین و خۆپیشاندان لە هەموو شارەکانی عێراق و بەتایبەتی کوردستان ئەنجام درا، لە ئەنجامی لەناو بردنی کۆماری کوردستان بارزانی لە١٩٤٧/٦/١٥بەرەو یەکیەتی سۆڤیەت کەوتە ڕێ لەگەڵ زیاتر لە ٥٠٠ شۆڕشگێڕی کورد بە ڕێگا سەختە چیاکان سنوری نێوان ئێران و تورکیا لە هەمان کاتا کوژرانی نادر شای ئەفشار لە ١٩٤٧/٦/١٩لە کاتی هێرش کردنە سەر خوراسان، واتە چ لە جەنگی جیهانی یەکەم چ لەجەنگی جیهانی دووەم کورد جگە لە ماڵ ویرانی و مەرگەسات و دەربەدەری و کپ کردنەوەی شۆڕشەکان و بەعەرەب کردن و بەفارس کردن و بە تورك کردن تاکو ئێستا زیاتر چی بۆ نەماوەتەوە. ئەمەش بە پشتگیری و یارمەتی وولاتانی هاوپەیمانانی ئەمەریکاو بەریتانیاو ڕوسیاو فەرەنساو ئەڵمانیاو دراوسێکانی ئەو وڵاتانەی کە لەسەر خاکی کورد پێکهاتبوون کە مەلوتکەی بەخێوکەری خۆیان بوون. سەرەڕای کێشەو ململانێی نێوخۆی پارت و ڕێکخراو گروپەکانی کورد کە هۆکارێکی بنەڕەتی گرنگ بوو لە یارمەتیدان و جێبەجێ کردنی رامیاریەتی ئەو وڵاتانەی کوردو خاکی کوردستانیان پێوە لکێنراوە لەگەڵ ئاسانکاری بۆیان لە جێبەجێ کردنی نیازو خواستەکانیان.

بۆ بەهێز کردنی ڕژێمە جیاجیاکانی دروستکراو لەلایەن هاوپەیمانان بەپێی پەیمانە جیاجیاکانی نێودەوڵەتی بە تایبەتی پەیمانی لۆزان چەندین ڕێکەوتن لە نێوان ئەو وڵاتانەو مۆرکردنی پەیمانی بۆرتسمۆس لە ١٩٤٨/١/١٥ لە نێوان عێراق و بەریتانیا کە بووە هۆی ئەوەی کە کاروباری عێراق زیاتر کەوتە ژێر ڕامیاریەتی بەریتانیا، لەهەمان کات گرێدانی کۆنگرەی باکوری یەکیەتی سۆڤیەتی لە ١٩٤٨/١/١٩ لەو کۆنگرەیە ڕۆشنبیرو کەسایەتی و سەرکردە کوردەکانی هەر چوار پارچەو نیوەکەی کوردستان بەشداریان تێدا کرد لەوانە بارزانی نەمر، لەو کۆنگرەیە بارزانی وتارێکی چڕو پڕی لە بارەی بارودۆخی کوردو مافەکانی خوێندەوە بەبەستنەوەی ئەو کاتەو داهاتوی کورد لە پارچەکانی و چۆنیەتی مامەلە کردن لەگەڵ کوردو بە یەك بەستنەوەی جموجۆلی شۆڕشگێڕانە کە بووە هۆی ئەوەی گەلی کورد لەباشوری کوردستان بەشداری کرد لە خۆپیشاندان و ناڕەزایی کردن لە دژی دەسەڵاتی شانشینی عێراق و رامیاریەتی چەوت لە ١٩٤٨/٢/١٣کە ئەنجام درا، بەرپابوونی شۆڕشی ١٩٥٨/٧/١٤ بە سەرکردایەتی عەبدولکەریم قاسم و ئەفسەرە ئازادەکان وبەرەی یەکیەتی نیشتمانی لە ١٩٥٧/٣/٩لە نێوان پارتە سەرەکیەکانی عیراق مۆر کرابوو، بووە هۆی بڕیاردانی دەستوری کۆماری نوێی عێراق لە١٩٥٨/٧/٢٧ودان نان بەهاوبەشی کوردو عەرەب لە خاکی عێراق لە بڕگەی (٣)ی دەستورەکەو گەڕانەوەی بارزانی و هەڤاڵەکانی لە ١٩٥٩/٤/١٦، دوای ئەوە بارودۆخی عێراق بەرەو ئاڵۆزی هەنگاوی نا بە هۆی دروست بوونی دژایەتی لە نێوان پارتە ڕامیاریەکان بە تایبەتی پارتی کۆمۆنیستی هاوپەیمانی دەسەڵات و پارتی بەعسی عەرەبی و بە تایبەتی سەرهەڵدانی کێشەی بنەڕەتی لە نێوان سەرکردایەتی دەسەلاتی نوێی عێراق و سەرکردایەتی کورد تابوە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول لە١٩٦١/٩/١١بەسەرکردایەتی بارزانی و لێك ترازانی بارودۆخی عیراق بەگشتی و کورد بەتایبەتی هەنگاونان بەرەو ئاڵۆز بوونی ناوچەکەوتوند بوونی کێشەی نێوان دەسەڵاتی عێراق و پارتی کۆمۆنیست لەگەڵپارتی بەعس تا بوە هۆی ئەنجام دانی کودەتای سەربازی

بەعسیەکان لە ١٩٦٣/٢/٨ کە بوە هۆی کەوتنە گێژاوی کارەسات و مەرگەساتی گەلانی عێراق بەتایبەتی کوردو نیشتمانەکەی کە بەر شالاوی سوتاندن و وێران کردن و دەربەدەری هاتن و بەرەو بەعەرەب کردنی ناوچەکانی کوردستان وبەهێز بوونی بیری شۆفێنی عەرەب بەتایبەتی عەرەبی هاورەی‌دورگەی عەرەبی و دروست بونی بارو دۆخێکی نالەباری کوشندە لە عێراق و بەتایبەتی باشوری کوردستان وبوە هۆی دامەزراندنی کۆمەڵەی کورد لە ١٩٦٣/٤/١٤لە لایەن کوردە پەنابەرەکانی لوبنان، دوای ئەوە بە چەند مانگێك لە ١٩٦٣/٨/١٢ مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی نیوان تورکیاو ئێران بۆ بەرەنگار بونەوەی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردو گەمارۆدان و ماوەنەدانی ڕاپەڕینەکانی کورد لەسەر سنورەکانی نێوانیان و بەتایبەتی سنوری عێراق بەهۆی شۆڕشی ئەیلول لە باشوری کوردستانی لکێندراو بەعێراق٠

مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی نێوان سوریاو عێراق لە١٩٦٣/١٠/٢٢ کە سوریا ئامادەیی خۆی بۆ عێراق نیشان دا بە ئامادە کردنی ٣٠٠٠سەرباز بە هەموو جۆرە چەکێك "ئاسمانی ودەشتایی"بەشداری سوپای عێراقی کرد بۆ پەلاماردان و بۆردومان کردنی سەنگەرەکانی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان، لەهەمان کات بەهۆی کاردانەوەی شۆڕشی ئەیلول، پارتی دیموکراتی کوردستان لە باکوری کوردستان لە ١٩٦٥/٧/١٥ دامەزرا لە لایەن فائق بوجاخ، دوای ئەوە بەرپابوونی خۆپیشاندان و ڕاپەڕین لەشارەکانی دیاربەکرو سیواس و ناوچەکانی تر لە ١٩٦٧/٨/٣.

دوای چەندین کودەتا لە نێوان سەرکردەکانی پارتی بەعسی شۆفێنی و دوا کودەتاکەی١٧/٣٠/تەموزی/١٩٦٨ بوە هۆی گۆڕینی ڕامیاریەتی بەرەو خۆ چەسپاندن و ڕوکردنە وڵاتانی سۆشیالیستی و کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ کردن لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول بە هاوکاری یەکیەتی سۆڤیەت و بوە هۆی دان نانی تەواو بە مافی کوردو بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە ١٩٧٠/٣/١١و مۆرکردنی بەرەی یەکیەتی نیشتمانی نەتەوەیی پێشکەوت و لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی عێراق لە ١٩٧٢/٧/١٧ بە مۆرکردنی لەنێوان عەزیز محمدو احمد حسن بەکر، بەلام بەر لەوە دەستوری نوێی عێراق لە ١٩٧٠/٧/١٦ ڕاگەیەندراو تەواوی دەسەلاتی بە سەرەك کۆمار دا لە هەموو بوارە جیاجیاکانی کاروباری عێراق.

لەگەڵ مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی ١٩٧٠/٣/١١ وبەرەی نیشتمانی لەگەڵ پارتی کۆمۆنیست لە ١٧/ ٧/ ١٩٧٢ و بەهێز بونی پەیوەندی نێوان دەسەلاتی عێراق لەگەڵ وڵاتانی سوشیالیستی بە تایبەتی یەکیەتی سۆفیەت و بەستنی پەیمانی دۆستایەتی و هاوکاری لە ١٩٧٢/٤/١٢، دەستپێکردن و سەرهەلدانی پاشگەز بوونەوە لە برگەکانی ڕێکەوتننامەی ١٩٧٠/٣/١١ لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول و دروستکردنی کێشەو ململانێ لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و پارتی کۆمۆنیستی عێراق. لەو کاتەش شارۆچکەی قەلادزێی بۆردومان کرد لە ١٩٧٤/٤/٢٤ کە بوە هۆی شەهید بوونی زیاتر لە (١٥٠)کەس و زامدار بوون چەندین کەس بە هۆی ڕاپەڕینی گشت گەلی کوردو ڕوکردنە شاخەکانی لەئەنجامی جێبەجێ نەکردنی برگەکانی ڕێکەوتنامەی ئادارو جێبەجێ نەکردنی مافی بریاردانی ئۆتۆنۆمی لە ماوەی دیاری کراوی خۆی و دوایی بەپێك هێنانی ئەنجومەنی یاسادانان لە لایەن بەعسی و پارتی کۆمۆنیست بە خواست و ویستی دەسەلاتی سەدام.ئەمانە هەموی بونە هۆی ئەوەی کە ڕێکەوتننامەی جەزائیری ١٩٧٥/٣/٦لە نێوان دەسەلاتی عێراق و شای ئێران مۆر بکرێت بە سەرپەرشتی "احمد بنبلە"ی سەرۆکی جەزائیر بە ئامۆژگاری

ئەمەریكاو لە ئەنجام بوە هۆی نسكۆ پێهێنانی شۆڕشی ئەیلول لە ١٩٧٥/٣/١٩ كە بووە هۆی فڕێدانی چەك كە زیاتر لە(١٠٠) هەزار چەكداری كورد لەشاخەكان چاوەڕوانی بلێسەی تەواوكردنی شۆڕشی ئەیلولیان دەكرد بەڵام بەپێچەوانە، بەهۆی پاڵپەستۆی ئەمەریكاو ئێران‌و هاوپەیمانان ئەنجامەكەی بوە هۆی دەربەدەری كورد بۆ ڕۆژهەڵاتی كوردستانی لكێندراو بەئێران‌و خۆ بەدەستەوە دانی ڕژێمی بەعسی عێراق‌و گواستنەوەیان بۆ باشوری عێراق‌و ئەوانیتر بەرەو هەندەران سەریان هەلگرت..

لەگەڵ ئەو هەموو ڕوداوو كارەساتانەی ناو خۆیی عێراق‌و بەرەو باش بردنی پەیوەندی لەگەڵ ئێران‌و توركیا بەهۆی بەرز بونەوەی هەستی نەتەوایەتی‌و سەلماندنی بونی نەتەوەیی كورد لە١٩٧٦/٦/١ یەكیەتی نیشتمانی كوردستان دامەزرا بە ڕابەرایەتی مام جەلال تالەبانی‌و نواندنی ڕۆڵی بەرچاو لەبەرەو بەهێز بون‌و فراوان بونی شۆڕشی كورد لە باشوری كوردستان‌و كاردانەوەی لەسەر بەشەكانی ترو ناوچەو هەرێم‌و جیهان‌و كەوتنە ناو ڕۆژنامەو ڕامیاریەتی چەندین وڵاتانی جیهان بە تایبەتی وڵاتانی سۆشیال دیموكرات. لەگەڵ ئەو گۆڕانكاریە مۆركردنی ڕێكەوتننامەی ١٩٧٦/٣/٢٦ی نێوان ئەمەریكاو توركیا بە یارمەتی دانی دەسەڵاتی تورك بە بەربەرەكانی‌و گەمارۆدانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی كورد بەتایبەتی لە باكوری كوردستان‌و سنوری نێوان عێراق‌و توركیا، لەو كاتەش هەڵگیرسانەوەی شۆڕش گولان لە ١٩٧٥/٥/٢٦ لە لایەن سەركردایەتی كاتی پارتی دیموكراتی كوردستان‌و بەردەوام بوونی شۆڕشی ئەیلول لەپێناو وەدی هێنانی دەسكەوتەكانی شۆڕشی ئەیلول‌و كاردانەوەی بەرچاوی لە ناوچەكەو بوە هۆی تۆقاندنی دەسەڵاتەكانی ئێران‌و توركیاو سوریاو عێراق‌و لەو كاتە سەدام حوسێنی سەرۆكی ڕژێمی بەعسی عێراق لە ئەنجومەنی نیشتمانی عێراق بڕیاریدا بە گواستنەوەی گوند نشینەكانی سەر سنورەكانی نێوان عێراق‌و توركیا لە ١٩٧٦/٨/٢١بە قوڵایی (٢٠) كیلۆمەترو كۆنترۆڵ كردنی سنور لەلایەن سوپای عێراق بە هاوكاری هێزەكانی سوپای تورك‌و ئێران‌و گەمارۆدانی جموجۆڵی شۆڕشی نوێی كورد. هەر لەو كاتە ڕژێمی بەعسی سوریا بڕیاری ژمارە(٥٨٠)لە ١٩٧٧/٥/١٨ دەركرد بە گۆڕینی ناوی كوردی لە شارو شارۆچكەو گوندو قوتابخانەو گەڕەك‌و كۆڵانەكان٠٠٠؟٠٠٠!

لەو كاتەو بارو دۆخە پارتی كرێكارانی كوردستان لە١٩٨٧/٨/١٥لە باكوری كوردستان دامەزرا لەلایەن عەبدوللا ئۆجەلان‌و بوە هۆی بەرپا بونی شۆڕشی پارتی زانی چەكداری لە باكوری كوردستان‌و لەگەل ئەو بارو دۆخە لە ١٩٧٩/٢/١"ئایەتوللا خومەینی"لەپاریس گەڕایەوە ئێران‌و شۆڕشی ئیسلامی بەرپاكرد لە١٩٧٩/٢/١١لەئێران ڕوخاندنی دەسەڵاتی شاهەنشاهی ئێران لەوكاتەش زۆربەی ناوچەكانی ڕۆژهەڵاتی كوردستان كەوتە ژێر دەستی هێزەكانی پارتی دیموكراتی كوردستانی ئێران،دوای ئەو بارو دۆخەی ئێران‌و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی كورد ڕژێمی بەعسی عێراق لە ١٩٨٠/٤/٥دەستی كردبەدەركردن‌و ئاوارەكردنی كوردە فەیلیەكان بەرەو ئێران لەشارەكانی بەغداو كوت‌و سوێرەو بەدرەوجەسان‌و عەلی شەرقی‌و عەلی غەربی‌و عمارەو كوت‌و بەسرەو چەندین جێگەی تر. ئەمەش بەتایبەتی لەدوای وەرگرتنی دەسەڵاتی تەواو لەلایەن سەدام حسێن لە١٩٧٩/٧/١٧بەدەست پێكردنی كارەساتەكە لە عێراق‌و بەتایبەتی باشوری كوردستان لەهەموو لایەنە جۆراو جۆرەكان.

لەدوای وەرگرتنی دەسەڵات لەلایەن سەدام حسێن‌و لەخۆبایی بون‌و بەرز بوونەی هەستی

شۆفینی و بەرچاوتەنگی نەتەوایەتی عەرەب بەرامبەر بەکوردو گەلان و ولاتانی تر بەناوی "بەوابەی ڕۆژهەلات" شەڕی لەگەل ئێران هەلگیرساند لە ۱۹۸۰/۹/۲۲ کە ئەو شەڕە(۸)سالی خایاند کە بوە هۆی مەرگەساتی گەلانی عێراق بەتایبەتی گەلی کورد لەباشوری کوردستان لەهەمان کات بەردەوام بوونی لەئاوارەکردن و دەربەدەرکردنی کوردە فەیلیەکان لە۱۹۸۲/۱/۲۹ کە زیاتر لە هەشت هەزار کوردی فەیلی ئاوارەکرد بەناوی "تەبعیە"ی ئێران، بەلام تەنیا بەمەوە نەوەستا، دوای ئەوە لە ۱۹۸۳/۷/۳۱ هەشت هەزار بارزانی لەشارۆچکەی قوشتەپەو بەحەرکە حەریر کە سەر بە پارێزگای هەولێر بوون ئەنفال کران تالە گۆڕە بەکۆمەلەکان بە نەناسراوی لاشەی پیاوو ئافرەت و مندالو پیر دۆزرایەوە. ڕژیمی عێراق بەوەش نەوەستا بۆردومانی ناوچەی سەردەشتی ڕۆژهەلاتی کوردستانی لە۱۹۸۷/٤/۲۸ کرد کە بووە هۆی شەهید بوونی زیاتر لە ۱۳۲ کوردو زامدار کردنی زیاتر لە ۵۰۰۰ هەزار کەس . لە لایەکی تر بەستنی یەکەم کۆبونەوەی پارتە کوردستانیەکان لە باشوری کوردستان لە ۱۹۸۷/۷/۱۷ بۆ پێک هێنانی بەرەی کوردستانی لە دوای چەندین شەڕی خۆ کوژی لە نێوانیان و کاردانەوەی خراپی بۆ سەر بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد، لە دوای ئەوە گەورەترین ڕووداوی جیهانی ئەنجام درا لە دوای جەنگی جیهانی دووەم ئەویش کیمیا بارانی شاری هەلەبجەی شەهید لە ۱۹۸۸/۳/۱٦ وجێبەجێکردنی لە لایەن "علی حسن مجید" ئاموزای سەدام حسێن بە گازی کیمیاوی کە بووە هۆی شەهید بوونی زیاترلە(۵)هەزار کورد لە مندال و ئافرەت و پیاوی گەنج و پیر خۆی خستە ناو لاپەڕەکانی مێژوو کە ئاسەواری ئەو کیمیا بارانە هەر دەمێنێ و لە بیرو هەستی مرۆڤی بەویژدانی کورد وون نابێت و لەبیر ناکرێت. دوای ئەو کارساتە سەرکردایەتی کورد هەستیان بە هەلەکانی رابردوی خۆیان کردو بەرەی کوردستانیان دامەزراند لە ۱۹۸۸/۵/۷ لە نێوان پارتی و یەکیەتی و پارتی گەل و پارتی سۆشیالیستی و لیژنەی هەرێمی پارتی کۆمۆنیستی عێراق لقی کوردستان، دوای ئەوە بەرەی تەڤگەر لە۱۹۸۸/٦/۲۲ پێکهات لە باکوری کوردستان لە ئەنجامی ڕێکەوتنی هەشت پارت و ڕێکخراوی کورد. ڕژێمی بەعسی عێراق بەردەوام بوو لە کاری جینۆساید بەرامبەر بە کورد بە هاوکاری جاشە خۆفرۆشەکانی کورد لە۱۹۸۸/٤/۱٤ کە بوە هۆی ئەنفال کردنی زیاتر لە ۱۸۲ هەزار کورد لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان بەتایبەتی ناوچەی سلێمانی . بۆ هاوکاریکردنی یەکتری لە نێوان دەسەلاتە دژ بە یەکترەکان تەنیا لەسەر کیشەی کورد نەبێت و تیرۆر کردنی دکتۆر قاسملو لە ۱۹۸۹/۷/۱۳ لە لایەن ڕژێمی بەناو ئیسلامی ئیران لەشاری ڤیەنا، بەستنی کۆنگرەی جیهانی لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا لە ۱۹۸۹/۱۰/۱٤ بۆ بەرگری کردن لە مافی کورد کە ۲۰۰ توێنەر لە ولاتانی جیهان و کوردبەشداریا تێدا کرد.

لە ۱۹۸۰/۹/۲۲ بە هەلگیرسانی شەڕی نیوان عێراق و ئێران بە پالپشتی ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانی لە ولاتانی عەرەبی بەتایبەتی سعودیەو کوێت و ئوردن بەناوی "البوابە الشرقیە" بەلام ئەنجامەکەی کۆتایی هاتنی شەڕەکەلە ۱۹۸۸/۸/۸ بە گەڕانەوە بۆ سەر ڕێکەوتننامەی جەزائیری۱۹۷۵/۳/٦ واتە لەبنەڕەتا خۆی لەخۆیدا "دیزە بەدەرخۆنە بوو" بۆ لەناو بردنی شۆڕشی ئەیلول و گەمارۆدانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد لە ئەنفال و کیمیا باران و وێران کردن زیاتر لە (٤٥۰۰)گوندو شارۆچکەو پڕکردنەوەی کانیاوەکان و سوتاندنی دارستانەکان و کوێرکردنەوەی ڕێگاوبان و پردەکان و ڕەش کردنەوەی ئاسەواری کورد لە (۵۰۰۰۰) سال پێش ئێستاو دزینی

بۆموزەخانـــەکانی خۆیـــان، خـــوای کـــورد بەپێچەوانەی هەڵگەڕانـدەوە بـووە هـۆی دروست بوونی کێشە لەنێوان عێراق و سعودیەو کوێت و ئوردن لـە ئـەنجام دا لـە٢/٨/١٩٩٠ڕژێمی عێراق کوێتی داگیر کـردو بـوە هـۆی نـاڕەزایی وڵاتـانی عەرەبی و ناوچەکەو جیهان بەتایبەتی ئەمەریکاو هاوپەیمانان کە بووە هۆی مەترسی خستنە سەر بەرژەوەندیـــەکان و دوای کۆکردنـــەوەی هێـــزی سـوپابە هـەموو جـۆرە چـەکە پێشکەوتوەکانی سەردەمی لەدوای چەندین هەول لە لایەن وڵاتانی ناوچەو جیهـان بـەڵام بـێ سـود بـوو لەئـەنجام دا هێرش کرایە سەر سوپای عێراق لە ١٧/١/١٩٩٠ لەکوێت لە لایەن هاوپەیمانانان کە پێکهاتبوو لە (٣٠) وڵات لـە گـەردەلولی بیابـان و ئەنجامەکـەی هـەرەس هێنـانی سـوپای عێراق و خۆڕانـەگرتن و کۆتـایی هـاتنی شـەڕی کەنـداوی دووەم لـە ٢٨/٢/١٩٩١ کە بووە هۆی وێران کردنی عێراق لە بوارەکانی ڕامیاری و ئابوری و سەربازی کە بوە هۆی دروست بوونی باروودۆخێکی نوێ لەعێراق و ناوچەکەو سەرهەلدانی ڕاپەڕین لە عێراق و بە تایبەتی لە باشوری کوردستان لە ٥/٣/١٩٩١ تاکو ٢١/٣/١٩٩١ کـەتوانرا ٩٥٪ی خـاکی باشـوری کوردستان ڕزگار بکرێت.

بـــەڵام پـــشت بەســـتن بەئەمـــەریکاو هاوپەیمانەکانی ئەنجامی ماڵ وێرانیەو بووە هۆی کپ کردنەوەی ئەو ڕاپەڕین و هەستە نەتەوایەتیە دژی گـەلی کـورد ئـەوە بـوو لـە ٣١/٣/١٩٩١کە بـوە هـۆی سـەرەتای دەسـت پێکردنـی کـۆڕەوە ملیۆنیەکە لە باشوری کوردستان دژی شالاوی دەسەڵاتی ترسنۆکی بەعسی بە یارمـەتی دانـی ئەمەریکا تا٢٧/٤/١٩٩١ دەسەڵاتی بەعس توانی شارو شارۆچکەکانی کوردستان داگیر بکاتـەوە. کـە چـەندین ڕوداوی تـری وەك گەڕانـەوەی جەماوەری کـورد لـە دوای کۆچڕەوەکەو دانـانی هێڵـــی (٣٦) بـــە بڕیـــاری ژمـــارە (٦٨٨)نەتەوەیـەکگرتوەکان و کـشانەوەی دام و دەزگاکانی میری لە هەر سێ پارێزگای هەولێرو دهۆك و سولێمانی و گواستنەوەی بۆ شارەکانی موسڵ و کەرکوك. ئەنجامی بوە هۆی هەلبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان لە١٩/٥/١٩٩٢و دامەزراندنی کابینەی یەکەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ٥/٧/١٩٩٢، ئەمـەش بـە هـۆی دروست بونی باروودۆخی نوێی عێراق و بەتایبەتی کوردستان. لـە دوای ئـەوە وەزیرانـی دەرەوەی ئێران و تورکیاو سوریا لە ٨/٦/١٩٩٣ کۆبونەوە بەهۆی مەترسیان لە دواڕۆژی وڵاتەکانیان لەبەر لکێنـدراوی خـاکی کـورد بـە وڵاتـەکانیان و کۆبونەوەکان بەردەوام بوونە. هەر لەو کاتە ڕژێمی بەناو ئیسلامی ئێران لە١٣/٥/١٩٩٣ نزیکـەی ١٠٠هەزارسەربازو ٥٠٠ تانك و زرێپۆشی لەسەر سنوری باشوری کوردستان مۆڵداو ناوچەکانی پێنجوێن و قەلادزێی داگیر کـردو بـەر لـەوە لە٨/٥/١٩٩٢لە کۆماری ئەرمینیا لە ناوچەی شاری شوشەئەزەری و ئەرمەن پەلاماری شارەکەو دەوروبەریان داو داگیریـان کـردو بـە سـەدان کوردیـان شـەهید کـردو بـە هـەزارانیان دەربـەدەر کردو ماڵ و سامانەکانیان سوتاندو تالانیان کرد.

لە هەمان کاتا ڕژێمی سوریا بەندیخانـەی حەسـەکەی ڕۆژئـاوای کوردستانی سـوتاند لـە ٢٤/٣/١٩٩٣ کـە بـوە هـۆی شـەهید بـوونی (٧٢) کەس .

گـەر ئاوڕێـك لـە مێـژووی بزوتنـەوەی ڕزگاریخوازی کوردو دەسەڵاتەکانی پێشوی کورد بدەینەوە هەر هەمووی مەرگەسـات بـووە چ لـە لایەن دوژمنان کە بەرامبەر گەلی کورد کراوە چ مەرگەساتی ناوخۆی بە هۆی شەڕی خۆ کوژی بگرە لە دەسەڵاتی پاشای کۆرە تاکو سەرەتای ساڵی ١٩٩٤ کە لە ١/٥/١٩٩٤ دەست پێکردنی شەڕی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە باشوری کوردستان بەردەوام بوونی تا ١٧/٩/١٩٩٨ لەئەنجامی ڕێکەوتننامەی واشنتۆن لە ئەمەریکا

مۆر کرا بەسەرپەرشتی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا "مالدین ئۆلبرایت".

سەرەڕای رامیاریەتی تورك و ناچاربوونی بەهۆی پالەپەستۆی ناوخۆو نێو دەولەتی ڕژێمی تورك لە١٩٩٤/٣/١٩ بۆ یەکەم جار لە مێژوودا دانی نا بە جەژنی نەورۆز کە جەژنی کوردو تورکمان خۆی کردە خاوەنی نەورۆز بەڵام لەو کاتەی کە جەژنی نەورۆز ئاهەنگی بۆ دەگێردرا نەك هەر نەتەوەی تورك نەبوو بەلکوو لە مێژوودا باسی لێوە نەدەکرا. دوای ئەوە فڕۆکەکانی دەسەڵاتی تورکیا ناوچەی قەڵادزێ و دەوروبەری لە١٩٩٤/٥/٧بۆردومان کردبە بیانوی لێدانی بنکەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان و لە هەمان کات ڕژێمی بەعسی سوریا لە ١٩٩٦/٤/١٠زیاتر لە(١٠٠٠٠) ناوی لە خێزانانی کوردی ڕۆژئاوای کوردستان لە تۆمارگەکانی دەوڵەت لابرد بەناوی بزر بوون بۆ ئەوەی کورد خاوەن ناسنامە نەبێت.

دوای ئەوە هێزەکانی سوپای ئێران لە کارێکی سەربازی لە١٩٩٦/٧/٢٩بە دوو هەزارسەربازو٢٠٠ماشێن و فڕۆکە هێرشی کردە سەر بازگەی سەلام لە نزیك شاری سلێمانی بۆ لێدانی بنکەکانی پارتی دیموکراتی ئێران کە بووە هۆی دەربەدەر بونی دەیان کەس لە خێزانە ئاوارەکانی کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و کاردانەوەیەکی خراپی کردە سەر پەیوەندی لەگەڵ یەکیەتی نیشتمانی و داهاتوی پارتە کوردستانیەکان و دوای ئەوەمۆرکردنی ڕێکەوتننامەی نێوان ئێران و تورکیا لە١٩٩٦/٨/٢٦بۆ وەرگرتنی زانیاری و گۆڕینەوەی سیخوڕی لەسەر بزوتنەوەی کورد بە تایبەتی پارتی کرێکارانی کوردستان.

سەرەڕای ئەو ڕوداوو کارەساتانەی کە بەرامبەر کورد دەکرا لە لایەن دەسەڵاتدارانی هەر چوار پارچەی کوردستان و بونی جیاوازی بیرو بۆچوون و چۆنیەتی سەرکردایەتی پارت و ڕێکخراوەکان ئەو بارو دۆخە لانەبارەی کە لەسەر بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو ڕێکەوتنی هەڵ زێڕین بۆ دەسەڵاتی کوردی باشوری کوردستان دەست پێکردنی شەڕی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و پارتی کرێکارانی کوردستان لە١٩٩٧/٥/١٤. لەو کاتەی کە پارتی کرێکارانی کوردستان لە دوای سالەکانی ١٩٨٥شۆڕشی چەکداری ئەنجامدابوو دژی دەسەڵاتی دژ بە کوردو کوردستان، کە بوە هۆی کاردانەوەی خراپ بۆ سەر بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو دروست بوونی بۆشایی لە پێش دوژمنانی کوردو نیشتمانەکەی و دوای ئەوە عەبدوللا ئۆجەلان لە١٩٩٩/٢/١٥دەستگیر کرا لە لایەن ڕژێمی تورکیا بە پالپشتی سیخوڕەکانی ولاتی میسرو ئیسرائیل وسوریاو بەتایبەتی ئەمەریکا لە شاری نایرۆبی پایتەختی کینیا کە کاردانەوەی دوو لایەنەی هەبوو. یەکەم کاردانەوەی باشی هەبوو بۆ بەهێز بوونی هەستی نەتەوایەتی و یەکبونی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی بەتایبەتی لە باکوری کوردستان، دووەم کاردانەوەی خراپی نواندە سەر سەرکردایەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد. بەڵام لەگەڵ ئەوەشا کورد چ لەناو خاکی کوردستان و لەباکوری کوردستان و ولاتانی جیهان جۆش و خرۆش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو بەرز بوونەوە هەنگاوی دەنا لە ڕێگەی خۆپیشان دان و کۆڕو کۆبوونەوەو ڤیستیڤاڵ و پەیوەندی لەگەڵ کەسانی بەرپرسی وولاتانی جیهان و پەرلەمانتاران و بەرپرسان.

لەدوای پرۆسەی ئازادکردنی عێراق لە٢٠٠٣/٤/٩ بەڕوخانی سەدام و ڕژێمەکەی بووە هۆی دروست بوونی بارو دۆخێکی نوێ لەعێراق و ناوچەو هەرێم و جیهان لە ڕامیاریەتی نوێی دەسەڵاتدارانی ناوچەکە بە تایبەتی دراوسێکانی عێراق وەك توکیا و ئێران و سوریاو سعودیەو پەیدابوونی مەترسی لە سەر ڕژێمەکانیان بە تایبەتی بەرامبەر بەکوردو ڕۆڵی گرنگی لە هاوکاری کردنی لەگەڵ سوپای هاوپەیمانان و

ئاسانكاری كردن بۆ ئەنجام دانی ڕوخاندنی سەدامو رزگارڕ كردنو رێگە خۆشكردن لەپێناو ئارامیو ئاسایش لە عێراقو ئاوەدان كرنەوەو ئاشت بونەوەی گشتی ئەویش بە پێك هێنانی ئەنجومەنی دەسەلاتی كاتی لە ٢٠٠٣/٤/٣٠ وبەردەوام بوونی ئەو بارو دۆخە نالەبارەی عێراقو باشوری كوردستان لە بارێكی ئارامیوڕۆلی بینی تا دامەزراندنی یەكەم كابینەی حكومەتی كاتی لە ٢٠٠٤/٦/١ بە هەلبژاردنی غازی عجیل بە سەرەك كۆمارو ئەیاد عەللاوی بەسەرەك وەزیرانو بەشداربونی كورد بە شێوەیەكی گونجاو لەگەڵ ڕەوشی بارو دۆخەكە دوای هەلبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی كاتی لە٢٠٠٤/٨/١٥ .

بە هۆی بارودۆخی كوردستانو عێراقوناوچەكەو هەڕەشەی تورك بۆ سەر كوردوو داهاتویو پڕو پاگاندەی دوور لەخواستی پەیوەندیەكانی كورد لەگەڵ دراوسێكانی دكتۆر ڕۆژ نوری شاوێس سەرۆكی ئەنجومەنی نیشتمانی كوردستان بانگەوازێكی ئاراستەی پەرلەمانتارانوڕێكخراو ئەنجومەنەكانی جیهانو تورك كرد لە ٢٠٠٢/٢/١٦لە بارەی هێرشەكانی توركیا و مەترسی ئەزمونی كوردستان بۆ سەر توركیاو دراوسێكانی، لە٢٠٠٤/٨/٣ پەرلەمانی توركیا دانی نا بە خوێندنی زمانی كوردیو پەخشی تەلەفزیۆنو ڕادیۆ ئەمەش لە٢٠٠٤/٦/٩ جێبەجێ كرا وە دوای ئەوە ئازادكردنی پەرلەمان تارانی كوردی ئەندام لە پەرلەمانی توركو ئازاد كردنی لەیلا زانا و سێ هەڤالەكەی. دوای ئەوە سەرەك وەزیرانی توركیا "ئۆردۆگان" لە ٢٠٠٤/٧/٢٨سەردانی ئێرانی كرد بە هۆی نەخۆشیە خودارەكانیان لە بارەی بارو دۆخی داهاتوی كورد.

بەر لەوە ئەنجامدانی كۆبونەوەی وەزیرەكانی دەرەوەی دراوسێی عێراق كەلە میسر ئەنجام درا لە ٢١ / ٢٠٠٤/٧كەسوریاو توركیاو ئێرانو كوێتو سعودیەو ئوردن بەشداریان تێداكردبە ئامادە بونی وەزیری دەرەوەی عێراق بەسەرپەرشتی وەزیری دەرەوەی میسر كە خالی هەرە گرنگیان لەسەر كێشەی كوردو مافی داهاتوی بوو.دوای ئەوە ڕژێمی توركیا غازی عجیلی لە ٢٠٠٤/٨/١٥ داوەت كردبو سەردانی توركیا، سەردانەكەی ئەنجامدا ئەویش بۆ گفتوگۆ لەسەر بارو دۆخی كوردو مافی توركەكانی باشوری كوردستانو شاری كەركوك بوو.

ئەمەی سەرەوە كورتەیەك بوو لە مێژووی ڕوداوەكانی كوردو كوردستانو داگیر كەرانی كوردستانو هاو پەیمانەكانیان بە ئامۆژگاری ئەمەریكاو بەریتانیا وڕوسیاو فەرەنسا كە ئەمانە سەرچاوەی دابەش بوونی خاكی كوردستان بوون لەدوای كۆتایی هاتنی جەنگی یەكەمی جیهان تاكو ئێستاش چونكە بە بوونی دەولەتی كوردی دەیان بەڵگە نامەی نهێنی ئاشكرا دەبن چ لەبارەی خاكونەتەوەو ڕامیاریو ئابوریو جوگرافیو ئاینو مێژوو شارستانیەتو كەلوپور.

بەلام ڕاستیەك هەیە دەبێ بگوترێ لە گەل كورد نەشاردرێتەوە ئەویش ڕوخانی ڕژێمی سەدامو هاتنی غازیو عەلاوی كە سەرەك كۆمارو سەرەك وەزیرانو محمد خاتەمیو رابەری ئیسلامی خامەنائیو ئوردوگانو سیزارو بەشار ئەسەدو شا عەبدوڵلاو شا فەهدو ئەمیری كوێتو هاوپەیمانەكانیان هەمویان لە یەك بازنە بیر لەكیشەی كوردو مافەر داهاتوی كورد دەكەنەوەو جیاوازیان نیە لەگەڵ سەدامو رژێمە خوێن مژەكەی گەر باشتریش بێت لەدوای ئەوانەش تەنیا گەر گۆڕانكاری لە بارو دۆخ ڕووبداتو شەقی زەمانە هەلوێست دەگۆڕێ گەرنا هەمووی دووژمنی كوردن بەتایبەتی توركو عەرەب چونكە لەسەر خاكی كورد بونەتە دەولەتو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خۆیان بەهێز دەكەن، دەسەلاتی ئێستای عێراق لاوازو بێ توانایەودوای بەهێز بوونی

دەسەڵاتیان هەمان بیرو بۆچونی سەدام ئەنجام دەدەن بەڵام بەشێوازێکی ترو بارو دۆخێکی تری بۆ دروست دەکەن. کورد ئەگەر رابردوو لەگەڵ ئێستا بەیەک نەبەستێتەوەبۆ داهاتو لەهەمان گێژاو دەخولێتەوە، کورد گەر یەکگرتوو نەبێتو هەموو توانایەک لەپێناو گەڵونیشتمان بەخت نەکات لە هەمان شەمەندەفەریش جێگەی نابێتەوە۰۰۰؟۰۰! کورد ئەندام نیە لە هیچ رێکخراوێکی جیهانی بە هۆی نەبونی دەسەڵاتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رۆڵی بەچاوی هەیە لە بەشدار کردنی کۆنگرەو کۆبونەوەو چاوپێکەوتن لەگەڵ وڵاتانی جیهانیو پارتو گروپەکان لە هەموو بوارەکانی رامیاریو ئابوریو رۆشنبیریو رێکخراوی بەتایبەتی وڵاتانی ئەمەریکاو بەریتانیاو وڵاتانی یەکیەتی ئەوروپا. لەچەندین وڵاتی جیهانی نوسینگەی تایبەت بە کورد هەیە ئەمەش بەتایبەتی لە لایەن دەسەڵاتی باشوری کوردستانی لکێنراو بە عێراق.

# عێـــراق

- ناوی رەسمی: کۆماری عێراق.
- پایتەختی: بەغدا (ژمارەی دانیشتوانی ۵ر۷۰۰ر۰۰۰ملیۆن کەسە) ژمارەی دانیشتوانی کورد لە بەغدا زیاتر لە۱ر۳۰۰ر۰۰۰ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرکیەکانی: موسل, بەسرە, کەرکوك, هەولێر (هەولێر وکەرکوك شاری کوردین ومێژووی هەولێر دەگەڕێتەوە بۆ چوار هەزار ساڵ بەر لەزاینو کەرکوکیش دوو هەزار ساڵ بەر لەزاین)
- ژمارەی دانیشتوانی:۲٦ر۹۵۰ر۰۰۰ ملیۆن کەسە بەپێی پسولەکانی خۆراکی کە (لەو ژمارەیە٦ر۸۷۵ر۰۰۰ ملیۆن کوردە کە لە ۲۸٪ی دانیشتوانی عێراقی دروستکراو کوردە).
- رووبەری: ۱٦۹ر۲۳۵ میل چوار گۆشەو ٤۳۸ر۳۲۰کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.کە ۸٤ر۰۰۰ هەزار کیلۆمەتر چوار گۆشەی خاکی کوردستانەو بە پێی پەیمانی لۆزانی ۱۹۲۳/۷/۲٤ بە عێراق لکێنراوە لەدوایی کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهان لەلایەن هاوپەیمانان.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۲ر٦٪
- چڕی دانیشتوانی: ۱۵۹ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا
- نەژادەکانی : عەرەب ٦۵٪, کورد ۲۸٪, تورکمان وئاشوریو ئەرمەنو ئارامی۷٪.
- زانینو خوێندنو نووسین: ٦۵٪
- ئاینەکانی: ئیسلام ۹۲٪, مەسیحیو ئێزیدیو سووبی ۷٪.
- دابەشی کارگێری: ۱۸ پارێزگایە، چوار پارێزگای کوردە جگە لە چەندین قەزاو ناحیەی تر کە سەر بەپارێزگاکانی صلاح الدینو دیالەو موسلو کوت کە لکێنراون بەوپارێزگایانە بە هۆی بەعەرەب کردن لەگەڵ سەرەتای فتوحاتی ئیسلامی تاکو ئێستا چونکە هۆی سەرەکی بە عەرەب کردنو بەتورك کردنو بەفارس کردن سەرەتای دەگەڕێتەوە بۆ

فتوحاتی ئیسلامی، چونکە لە ڕووی ئایینی و زمان ئەویش بە نەهێشتنی نژادی کورد لە هەموو لایەنەکانی نەتەوایەتی.

- سوپاکەی: ٠٠٠ر٣٥٠ هەزار کەس بوو لە کاتی ڕژێمی سەدام حسێن بەلام لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام لە٢٠٠٣/٤/٩ سوپای عێراق هەلوەشێندرایەوە لەگەڵ دام و دەزگا ئەمنی و سیخوڕی و ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری لە دوای دامەزراندنی دەسەلاتی کاتی عێراق دوبارە هێزی سوپاو پۆلیس و ئاسایش لە پێکهاتندایەو کورد ڕۆڵی گرنگی هەیە لەوپێکهاتەیە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٠٠٠ر٦٥ ملیار دۆلار بەلام بەهۆی ڕامیاریەتی چەوتی دەسەلاتی ڕژێمی سەدام لە دوای ساڵەکانی ١٩٨٠ ٥٪بۆ گەلانی عێراق بوو ئەویتر بۆ خۆیی و دام و دەزگا سەربازی و ئەمنی و سیخوڕی بوو لەدوای شەڕی کەنداوی یەکەم ودووەم و سێیەم و دوای ڕوخانی ئەو دەسەلاتە داهاتی عیراق بۆ گەلانی عێراق گەڕایەوە بە یارمەتی و پشتیوانی ئەمەریکاو هاوپەیمانان و ئۆپۆزسیۆنی عێراق بە تایبەتی کوردو هێزی پێشمەرگەی کوردستان.
- بەشی تاک لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١٠٠ر٢ دۆلار. بەلام دوای ڕزگار کردنی عێراق لە ژێر دەسەلاتی بەعس لە ٢٠٠٣/٤/٩ کەمترین بەشی تاک لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی ٠٠٠ر١٢دۆلارەو بەرزترین بەشی تاک لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی ٠٠٠ر٦٠دۆلارە.واتە وەرەقە لەسالێکدا و بەرەو بەرزبونەوە هەنگاو دەنێ بە پێی بارو دۆخو پەرەسەندن و پێشکەوتنی عێراق .
- بەرگری: ٥ر١٨٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی لە کاتی دەسەلاتی ڕژێمی عێراق بەلام لەدوای ڕوخان و پێک هێنانەوەی سەر لەنوێ دام و دەزگاکانی ئەمنی و سیخوڕی و سەربازی بەپێی بارو دۆخی دەسەلاتی نوێی عێراق و ناوچەکە دەبێ.
- دراوی: دیناری عێراقی بەلام لە دوای شەڕی کەنداوی دووەم وئابلوقەی ئابووری دیناری چاپی سویسری لەکار خست و دیناری چاپی بەکار خست و دوای ڕزگار بونی عێراق لەژێر دەسەلاتی ڕژێمی نوێی عێراق دیناری چاپی نوێی عێراق لە ٢٠٠٣/١٠/١٥خرا کار کە چاپی لەندەنییە.
- زەوی کشتوکاڵی:٦ر١٢٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ,نیسک و نۆك, کونجی, برنج, پەمۆ, قەسپ, فەریکە خورما, تەرە, میوەجات, چەوەندەری شەکر, توتن, گولە بەڕۆژە,دەرە زەرد"گەنمەشامی"بەرهەمی کشتوکالی لە٦٥٪لە ناوچەی کوردستان بەرهەم دەهێنرێ.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ٢٥٠ر٥ ملیۆن سەر, بزن ٦٠٠ر٣ ملیۆن سەر, چێل وگامێش ٥٠٠ر١ ملیۆن سەر, پەرەور ٥٠٠ر٢٧ ملیۆن سەر.
- داهاتی سروشتی: نەوت, غازی سورشتی, فوسفات, کبریت, ئاسن. داهاتی سورشتی٦٥٪لە خاکی کوردستانە.
- بەرهەمی کارەبا: ٧٨٠ر٢٩ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- پیشەسازی: هەلێنجان و پالاوتنی نەوت, غاز, کیمیاوی, بەرهەمی ڕستن وچنین, کەلوپەلی بیناسازی , فوسفات, کبریت, دروستکردنی ئەلەمنیۆم, ئامادەکردنی خۆراك، دروستکردنی پێلاو، پەرو چاپەمەنی، خۆشکردنی پێست، چیمەنتۆ.
- داهاتی دەرەوەی: ئوتومبێل, ئوتومبیلی گواستنەوەو بارو ماشێن, خواردەمەنی دروستکراو, داودەرمانی پزیشکی, کەلوپەلی بیناسازی, مافوروفەرش،جل و بەرگ و پێلاو.

• دەرچوەکانی: نەوتی خاو، بەرهەمی نەوت، ئامێر، کیمیاوی، فەریکە خورما، خواردەمەنی دروستکراو،داو دەرمانی پزیشکی ،گەلێ شتومەکی تری هەمەجۆر.
• هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، ئیتاڵیا، فەرەنسا، وولاتانی عەرەبی، ئەڵمانیا، بەرازیل، بەریتانیا، روسیا، چین، کوبا، تورکیا، دانیمارک، رۆمانیا، کوریای باکور، ئەمەریکا.
• پارتە رامیاریەکان: پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی کە دەسەڵاتدار بوولە ١٧ـ٣٠ تەموز ١٩٦٨ تاکو٢٠٠٣/٤/٩،حزبی شیوعی عێراق، پارتی نیشتمانی عێراق، پارتی دیموکراتی کوردستان، یەکێتی نیشتمانی کوردستان، پارتی کۆنگرەی نیشتمانی عێراق، پارتی دەعوەی ئیسلامی عێراق، ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی عێراق، بە دەیا پارتو گروپ ورێکخراوی تری تیایە بەتایبەتی لە دوای ڕوخاندنی ڕژێمی بەعس. کە پێشتر هەر هەمووی قەدەغە کراو بوو تەنیا پارتو رێکخراوی کوردی نەبێت لە هەرێمی کوردستانی لێکنەدراو بەعێراق.
• رژێمی دەسەڵات: لە دوایی کودەتای سەربازی لە ١٩٦٨/٧/١٧ پارتی بەعس بە سەرکردایەتی ئەحمەد حسن بەکرو سەدام حسێن دەسەڵاتداریەتی عراقیان کرد تاکو ڕوخاندنی لە٢٠٠٣/٤/٩بە تەنیاو دەسەڵاتێکی شۆفینی نەتەوەیی بەرچاو تەنگو داپلۆسێنەر بوو لە هەموو بوارەکانی ژیانی گەلانی عێراق بە تایبەتی گەلی کورد. ئەنجومەنی نیشتمانیو ئەنجومەنی وەزیران تەنیا سەرەك کۆمار سەرۆکایەتیو دامەزرێنەری هەموو دامو دەزگاو ئەنجومەنو دەستەیەك بوە. دوای ڕوخاندنی ئەنجومەنی وەزیران پێکهاتوە لە٣١وەزیرو سەرەك وەزیرانو دوو جێگریو دەسەڵاتی تەواوی هەیە بە ئاموژگاریو هەماهەنگی نوێنەری ئەمەریکا. ئەنجومەنی نیشتمانی کە لە١٠٠ ئەندام پێکهاتوە لە ئەنجامی کۆبونەوەی فراوانی پارتو ڕێکخراوو کەسایەتیەکانی کوردو عەرەبو تورکمانو ئاشوریو سونەو شیعە دامەزراوە، ئەنجومەنی نیشتمانیو ئەنجومەنی وەزیران کاتین تاکو هەڵبژاردنی گشتی ئەنجام دەدرێت لە ٢٠٠٥/١/٣٠ دوای هەڵبژاردن لە عێراق بەشێوەیەکی ڕێكو دیموکراتیانە ئەنجام دراو کورد لە ٢٥٪ دەنگەکانی بەدەست هێنا، (٧٧) کورسی لەکۆمەڵەی نیشتمانی عێراق مسۆگەر کردو دوای لە٢٠٠٥/٤/٣ مام جەلال بەسەرۆك کۆماری عێراق هەڵبژێردرا لەلایەن گەلو کۆمەڵەی نیشتمانی عێراق کەپێکهاتوەلە (٢٧٥)ئەندام لەپارتوگروپە رامیاریی و نەتەوەیی و نیشتمانی، ئەنجومەنی وەزیران لە (٣٢) وەزیر پێکهاتووەو کورد رۆڵی گرنگی هەیە.
• جوگرافیای عیراق: کۆماری عێراق دەکەوێتە باشووری رۆژئاوایی ئاسیا، یەکێکە لە وولاتە گەورەکانی بەرهەم هێنەری نەوت وغازی سروشتی، ئوردن وسوریا دەکەوێتە رۆژئاوای، تورکیا دەکەوێتە باکووری، ئیران دەکەوێتە رۆژهەلاتی، سعودیەو کوێت دەکەوێتە باشووری، پێکهاتەیەکی سێگۆشەییەو لە چیاو بیابان وشکانیو وبێ بارانیو دۆڵو زێیەکانی فورات ودیجلە پێکهاتووە کە ئەو دوو زێیە لە باکووری ڕۆژئاوای بەرەو باشووری رۆژهەلاتی، لەباکووری رۆژهەلاتیو باکوری ڕۆژ ئاوای هەرێمی شاخاویو دەشتایی نێوان ئاو گردۆلکەکانی پێکهاتوە ئەویش هەرێمی کوردستانە، بەلام نێوان دوو زێیەکە لە خاکێکی پتەو پێکهاتوە بە درێژایی ١٩٢کیلۆمەتر لە سەر کەنداو دوایی بەرەو کەنداو دەروات و لەوێ تێك دەکاتەوە .

زێی دیجلەو فورات سەرچاوەی کشتوکاڵیە بە تایبەتی لە ناوەڕاستو باشوری عێراقو چەندین پـڕۆژەی ئـاودێری لێ دروسـتکراوە ،لـە باشـوری چیـای حـەمرین بـەرەو بیابـان دەچـێتە خـوارێ، کـەشو هەوایـەکی گـەرمی هەیـە لـە هـاوینو بەتایبەتی وەرزی پایز کە هەموو کات ڕەشە بای خۆڵاوی لێیەو زستانی بارانی کەمەو ساردە. بەڵام لەزنجیرە چیای حەمرین بـەرەو بـاکوری ڕاستەو خۆ کـەشو هەوایـەکی گونجـاوی هەیـەو بـارانی باشـی لێ دەبـاری بـە تایبـەتی لـە ناوچـە شـاخاویەکان بـارانو بـەفری زۆر لـێ دەبـاریو لەزسـتان سـاردو هـاوین پلـەی گـەرما لـە ٤٥ پلـە تێپەڕ ناکات بە تایبەتی لـەمانگی تـەمووزو ئـاب تـاکو ٩/١٥. دەریاچـەی دوکـانو دەربـەندیخانو دەریاچەی دهۆك دەکەوێتە هـەرێمی کوردستانو دەریاچەی سەرسار دەکەوێتە ناوەڕاست.

- **مێژووی عێراق :** عێراق لە سەردەمە کۆنەکان تـاکو دامەزرانـدنی دەوڵـەتی عێـراق لـە دوای جەنگی جیهانی یەکەم ناسراو بووە بە وڵاتـی نێوان دوو زێ "میزۆپۆتامیا" کە ناوچەیەکی بـەپیتو بەرەکـەت بـووە لـە هـەموو بوارەکـانی ئـابوریو پـێش٥٤٠٠ سـاڵ بـەر لەئێـستا، کـۆنترین شـوێنەواری جیهـانی لێ دروسـتکراوە بەیـەکبوونی دەوڵەتـەکانی کوردیو سۆمەریو بابلیو میدیاو ئەکەدی بەر لە ٤٥٠٠ ساڵ تاکو ٢٢٥ ساڵ پێش زاین.

ئـەویش بـە یـەکگرتنی وڵاتـانو شـارەکانی سـۆمەریو دروسـتکردنی لەلایـەن سـەرجۆن سەرۆکی ئەکـەدی کـە بەگـەورەترین ئیمپراتۆیـەت دادەنرێـت ودوای ئـەو ئیمپراتۆریـەتی ئاشـوری پێکهات لـە باکوری ئێستای عێراق لەسـەر زێـی دیجلـەو فوراتو دوای ئەو ئیمپراتۆریـەتی بـابلی پێکهات کە مەڵبەندەکەی لە سەر زێی فورات بوو لە شاری حیللەی ئێستاو ئەو ئیمپراتۆریەتانە لە ئـەنجامی شـەپۆلی کۆچـکردنە یـەك لـە دوای یەکـەکانی ناوچـەی کوردسـتان بـوو بـەر لـەو ئیمپراتۆریەتانـە چـونکە شـوێنەوارە کۆنـەکانی مرۆڤایـەتی لـە خـاکی کوردستان بـووە بـۆ نمونـە وەك شوێنەواری هەزار مێردو شانەدەرو ناوچەی سنجار کە زیاتر لـە ٥٠ هـەزار سـاڵ بەر لـە ئیستا بوە. ئیمپراتۆریەتی میدیا دامەزراوە بەڕابەرایەتی دیاکۆ دوای کیاکسار کە توانی سنوری دەسەڵاتی فـراوان بکـاتو ئیمپراتۆریـەتی ئاشـوری لـەناو ببـاتو نـەمرودی نزیـك شـاری موسـڵ بکاتـە پایەختی ئیمپراتۆریەتەکە.

گەر عەرەب خۆی دەکاتە خاوەنی شوێنەوارو شارستانیەتی عێراقوخۆی بە دانیشتوانی نێوان دوو زێی پێش ئیسلام یاخود زاینی دادەنێ ئەوە ڕاستی تیا نیە چونکە عـەرەب بـە هـیچ جۆرێـك دانیشتوانی عێراق نەبوونە تاکو دوای فتوحاتی ئیـسلامی بـە ٥٠ سـاڵیش چـونکە عـەرەب مـەڕ لەوەڕێنو بەدوو بونەو وردە وردە بەرەو سنوری ئێستای عێـراق کۆچیان کـردوە دوای فتوحـاتی ئیـسلامی بە تایبـەتی لـەدوای ساڵەکانی ٦٥٠ی زایـن تێیـدا نیـشتەجێ بوونـەو لـەو کاتـەی " ابـو جەعفـەری مەنـسور" بەغـدای دروسـتکرد لـە ٧٦٢/٦/٢٩ زاینـی ژمـارەی دانیـشتوانی شـاری بەغدای نـوێی دامـەزراو لـە ٣ هـەزار مـاڵ زیـاتر نـەدەبوو ئـەوانیش لـە بازرگـانو کەسـانی پاشمـاوەی فتوحـاتی ئیـسلامیو پیـاوانی خەلیفـەکانی ڕاشـدینو پاسـەوانەکانو لـە٩٥٪ گەلانی تری پاشماوەی ئیمپراتۆریـەتی ئاشوریو سۆمەریو بابلیو فارسیو کورد بوونە٠٠٠٠

بە هۆی نیشتەجێ بوونی کورد لەسەر خاکی خـۆی پـێش بـوونی ئـەو ئیمپراتۆریەتانـە وەك سـۆمەریو ئاشـوریو بـابلیو ئەکـەدیو ژێـر دەسـتەی ئـەو ئیمپراتۆریەتانـە بـوە تـاکو ڕزگـار بوونیـان لـە لایـەن دیـاکۆو دوای کیاکـساری سەرکردەی میدیەکان. بەڵام بەهۆی نەرمی بیرو بۆچونو بەرگری کردن لە خاکی کوردستان کورد

لــه قۆناخــه یــەك لــەدوای یەكــەكان بــە دۆراوی ڕزگاری بوەو نەتەوەی تر جێگەی گرتۆتەوە بگرە لە فارس و تورك و عەرەب نمونەش زۆرن بۆ ئەوەی بسەلمێ لە دوای ساڵەكانی ١٩٢٠كەركوك لە ١٥٠ ماڵ عـەرەبی زیـاتر لێ نیشتەجێ نـەبوە هـەروەها شارۆچكەكانی بە تایبـەتی حەویجەو شـەرگات و سـنجارو دەوروبـەری و مـەخموورو دەوروبـەری و سامەڕاو دەڤـەری عـزێم و بـەدرەو جەسـان و عـەلی غەربی و عەلی شـەرقی جگە لـەوەش پێش جەنگی جیهانی یەكەم بە هیچ جۆرێك عەرەب نـەبووە لە ناوچــەی بــەدرەو جەســـان ،بــەڵام عــــەرەب بەشێوەیەكی زاكزیكی "حەلەزۆنی" توانیویـەتی بگاتـە قـوڵایی خـاكی كوردستان بـە خـاكی خـۆی بزانێ بە ناوی برای ئاینیەوەو ئاسانكاری تەواوی بـۆ كـراوە لـە هـەموو لایـەنێك لەلایـەن كـوردو لـە لایەكی تریش بەعەرەب كردنی ناوچەی كورد لە لایەن ڕژێمە یەك لە دوای یەكەكان، پێش ئـەوەش بەعـەرەب كـردن و بـە تـورك كردنـی ناوچـەی كوردستان لە لایەن كاربەدەستان و بەرپرسیارانی ئیمپراتۆریــەتی عوسمـانی و ئاسـانكاری كـردن لەلایــــەن ســــەرەك تــیرەو عەشــیرەتەكان و بەرپرسیارانی ئەو كاتەی كوردی لە ڕێگەی مەڕو مـاڵات بەخێو كردن و بونی خواردنگەو پاوان بۆ مـەڕو مـاڵات و نـەبونی پاوان وخواردنگـەی مـەڕو مــاڵات لــە ناوچــە وشــكانیەكانی بیابــانی عەرەبی...!

بـەڵام دەبـێ ڕۆژێـك لـە ڕۆژان مێـژوو خـۆی بگەڕێنێتـەوە بـۆ دواوەو ئەوانـەی خـاكی گـەلانیان داگـیر كـردوە بگەڕێنـەوە جێگـەی خۆیـان بـە بەردەوامی شۆڕش و ڕزگار كردنی خاكی كورد بە دەست و بازوی نـەوەكانی داهاتووی گـەلی كوردو دەركــەوتنی هــەزار بەلگەنامــەی زینــدووی مێژویی...

دوای هەرەس هێنـانی ئیمپراتۆریـەتی میدیاو دروست بونی ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی و دوای ئیمپراتۆریەتی فارس لە ساڵی ٥٢٨ پێش زاین بە داگـیر كردنـی وولاتـی نێـوان دوو زێ. لەگـەڵ پەرەسەندن و پێشكەوتنی ئەو بارو دۆخە بە ژێر كـەوتنی هەنـدێ دەسـەڵات و سـەركەوتنی هەنـدێ دەسـەڵاتی تـر بـە پێـی بـارو دۆخـی گونجـاو ئەسـكەندەری گـەورەی مەكـدۆنی لـە سـاڵی ٢٢١ پێش زایـن بـەداگیر كردنـی ناوچـەكەو دوایـش كەوتـە ژێـر داگیر كـردن لـە لایـەن ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمانی لە ساڵی ١١٤زاینی لەو گۆڕانكاریە بە داگیر كردن و ژێر دەست خستنی خاكی كوردستان بە هۆی بەپیت و بەرەكەتی ناوچەكەو باری جوگرافی گرنگ و بوونی كەش و هەوایەكی گونجاو.

دوا بــەدوای ئـەوەش كەوتـە ژێــر دەســتی ئیمپراتۆریـەتی ساسـانی و فارسـی، دوای شـەڕی قادسـیە باشـوری نێـوان دوو زێ لـە سـاڵی ٦٣٧ زاینی و شەڕی فتوحاتی ئیسلامی ولە هەمان كات داگیر كردنی خاكی گەلان و فراوان كردنی سنوری جــوگرافی عــــەرەب و زاڵ بــوونی بەســــەر ئیمپراتۆریەتی ساسانی و فارسی بوە هۆی بە زۆر بـلاو بونـەوەی ئـاینی ئیسلام و بەعـەرەب كردنـی باشوری عێراق و وردە وردە بەرەو باكور هەڵكشا كـە هـەرێمی كوردستانە بە تایبـەتی لەسـەردەمی خەلافـەتی عومـەری كـوڕی خـەتاب كـە لـەو كاتـە پایتەختی دەوڵـەتی ئیسلامی لە شاری مەدینـەی منـەوەرە بـوو لـە حیجـاز، دوایـی دروسـت بـونی شـاری بەغـدا لـە٧٦٢/٦/٢٩ پایتـەختی دەوڵـەتی ئیسلامی لە سوریا گواستراوە بەغدا بەوە سنوری نەتەوەی دواكەوتوی عەرەب فراوان بوو لە بیابانی عەرەبی بەرەو خـاكی نەتـەوەكانی تـر بە تایبـەتی خاكی كوردستان تاكو ساڵی ١٢٥٨ تا ئەو كاتـەی تەتـەر شـاری بەغدایان داگیر كـردو سـوتاندیان، دوای ئـەویش داگـیر كردنـی لـە لایـەن تـەیموری لـەنگ لـە سـاڵی ١٤٠١ز كـە بەغدای وێـران كـردو بەرەو كوردستان هەڵكشاو دوایی بەرەو باشوری ئێــستای عێــراق و دوایــی بــوە پارچــەیەك

لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ساڵی ١٥٢٣ تاکو سەرەتای هەرەس هێنانی لەگەڵ کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهان.

مۆر کردنی ڕێکەوتننامەی نێوان ئیمپراتۆریەتی فارسی و تورکی لە ساڵی ١٥٥٥ئەویش بە دابەش کردنی کوردستان دوای شەڕی چاڵدیران لە١٥١٤/٨/٢٣ کەبوە هۆی پەیدا بوونی مەترسی لەسەر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتەکەیان بە هۆی شۆڕش و ڕاپەڕینەکان و دەسەڵاتدارە میرنشینەکان لە هەر پێنج لای کوردستان لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا و باکورو باشورو باکوری ڕۆژهەڵاتی ئێران واتە ئەو ناوچەیەی کە نیوەی بەر ڕوسیای قەیسەری کەوتبوو. مۆر کردنی ڕێکەوتننامەی نێوان میر نشینە کوردەکان و سولتانی تورک لە ١٥١٥/٨/٩ بەڵام سولتان دوای١٥ ساڵ لەو ڕێکەوتننە پەشیمان بوەوە. دوای ئەو گۆڕانکاریە ڕێکەوتننامەی زەهاو لە قەسری شیرین لە ١٦٣٩/٥/٢٠مۆر کرا لە نێوان فارس و تورک کە بوە هۆی ئەوەی باشوری کوردستان کەوتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی تورک و ڕۆژهەڵاتی کەوتە ژێر دەسەڵاتی فارسی. لەگەڵ ئەوەش دا وڵاتانی داگیر کەری کوردستان نەك هەر بە داگیر کردن ئەوەستان بەڵکو ئاگاداری هەموو جموجوڵی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بوونەو بەردەوام بونە چ لە پەیوەندی کردن لەگەڵ سەرکردە کوردەکان و چ پەلامار دانی ڕاپەڕینەکانیان کە مستەر ڕیچ لە ١٨٢٠/٥/١٠ لەگەڵ محمد پاشای بابان لەشاری سلێمانی کۆبوەوەو گفتوگۆیان لەسەر بارو دۆخی کوردو هەرێمەکە کرد، دوای ئەوە هەڵگیرسانی شەڕی نێوان میری سۆران لەگەڵ سوپای فارس لە ١٨٣٢/٥/١١ کە لە ئەنجام میری سۆران هێرشی کردە سەر ناوچەکانی لاهیجان ومهاباد لە پێناو ڕزگار کردنی لە ژێر دەسەڵاتی فارسی. دوای ئەوە "کرێیلی" قونسولی ڕوسیا لە تارانی پایتەختی فارس لە ڕاپۆرتێکی نوسیویەتی لە ١٨٧٩/١٢/٢٨ دەڵێ "شێخ عوبەیدوللا نیازی وایە ڕاپەڕینێك لە شاری موسڵ و دەوروبەری ئەنجام بدات بە مەبەستی دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی و پایتەختی موسڵ بێت بە هۆی زۆری دانیشتوانی کە٩٠٪ دانیشتوانی موسڵ و دەورو بەری کورد بونە، لەگەڵ ئەوەشدا هەستی نەتەوایەتی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بە هێز ترو کێشەو ململانێی کەوتبوە ناو بۆ بەرەنگار بوونەوەی داگیرکەران وبەرگری کردن لە کوردستان سەرەڕای کێشەی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان تاکو سەرەتای سەدەی بیستەم و پەیدا بوونی جەم و جوڵ لە ناوچەکانی سەروی کوردستان یا باشورو خۆراگری دەشتی هەولێرو سلێمانی و دهۆك وموسڵ و ڕەتکردنەوەی خواستەکانی دوژمن کە بوە هۆی ئەوەی سکرتێری بەشی ڕامیاری وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا بیرخەرەوەیەك بخاتە ڕوو لە ١٩١٥/٥/١٤دژی داگیر کردنی موسڵ بە هۆی دروست بوونی گیرو گرفتی سەخت لە گەڵ کوردەکانی شاری موسڵ و دەورو بەری ئەمەش دوای هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهان لە ١٩١٤/٨/٣ و کۆتایی هاتنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تورك و دابەش کردنی کوردستان.

بەهۆی ئاڵۆز کردن و لێك ترازانی پەیوەندیەکانی کوردو بەگژ یەك وەنانی یەکتری ولاواز کردنی بزوتنەوەی ڕزگاری، هێزەکانی سوپای ڕووسیای قەیسەری لە ١٩١٦/٥/١٣شارۆچکەی ڕواندزو دەوروبەری داگیر کرد کە بەناو خاکی کوردستانەوە داهاتبوو دوای ٦٥ ڕۆژ لێی کشانەوە بە هۆی بەرپا بوونی شۆڕشی بورژوازی لە ڕووسیا لە هەمان کات مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی سایکس بیکۆ لە ١٩١٦/٥/١٦لە لایەن بەریتانیاو فەرەنسا بەشێوەیەکی نهێنی لە قاهیرەی پایتەختی میسر

له ناوەڕاستی جەنگی جیهانی یەکەم، لەو کاتەی جەنگی یەکەم بەرەو کوشندەیی هەنگاوی دەنا لە نێوان هاوپەیمانانو ئەڵمانیاو عوسمانی تورکو بەرپابوونی شۆڕشی ئۆکتۆبەری بەلشەفیەکان لە ١٩١٧/١٠/١٧ ، دوای شۆڕشی بۆرژوازی لەڕووسیا بە ڕابەرایەتی لینینو دروست بوونی بارو دۆخێکی نوێی جیهان چ لەناوەندەکانی شەڕو چ لەنێوان دروست بوونی دوو ڕژێمی دژ بە یەکتری جیهانی سەرمایەداریو سۆشیالیستیو بەرپابونی شۆڕشی جیاجیا لە جیهان، لە پێناو سەربەخۆییو ڕزگار بوون لە ژێر دەستەیی یەك لەوانە بزوتنەوەی ڕزگاری کورد بەبەرپابوونی شۆڕشی شێخ عبدالسلامو شێخ مەحموود لە دوای ئەو بارو دۆخە نوێیە . حاکمی گشتی بەریتانیا "ئارنۆلدولسن"لە ١٩١٨/١/١بە فرۆکە گەیشتە شاری سلێمانی لەگەڵ شێخ مەحمودو ژمارەیەك لە سەرکردە کوردەکان کۆبۆوە بە هۆی مەترسیان لە بەرپا بونی شۆڕش لەباشوری کوردستان بە تایبەتی ناوچەی سلێمانیو کەرکوك بە هۆی بوونی نەوت لەناوچەی کوردستان کە باشیان دەزانی ناوچەی کوردستان خەزنەی دوارۆژیانە لە بەهێز کردنی باری ئابوریو فراوانکردنی دەسەڵاتیان لەسەر ناوچەکەو جیهان.هەر لەدوای ئەو کارە هێزەکانی بەریتانیا شاری کەرکوکی لە ١٩١٨/٤/٧داگیر کرد بە سەرکردایەتی "ئارنۆلدسن"و دوایش داگیر کردنی شارۆچکەی کفریو توز خورماتو لە ١٩١٨/٤/٢٨، مۆرکردنی ڕێکەوتنامەی مۆدۆرس لە ٢٠-١٩١٨/١٠/٣٠بە کۆتا هاتنی جەنگی یەکەمی جیهان بە ڕەسمی لە نێوان بەریتانیاو دەسەڵاتی عوسمانیو کشانەوەی هێزەکانی عوسمانیو هەرەس پێ هێنراو لە شاری موسڵو دەوروبەریو کۆتایی شەڕ دوکەڵی ڕەش کوردستانی گرتەوە بەرەو دابەش کردن هەنگاوی دەنا لە ڕامیارەتی وولاتانی هاوپەیمانان بەپێی نەخشەیەکی توندو تیژی بێ وێنە بۆ دروستکردنی چەندین وولات لەسەر خاکی کوردستان کوردیش بێ ئەوەی هەست بەو کارە نامرۆڤانەیە بکاتو خۆی ڕێك خات بۆ بەرگریو بەرەنگار بونەوەی ئەو کارە ژەهراویە بە هۆی لەبارو گونجاوی بارو دۆخەکە بەڵام خۆشباوەڕی بە بەڵێنە سەرزارەکانی هاوپەیمانان هەڵخەڵەتان.
بۆ نمونە مێجەرسۆن لە١٩١٨/١١/١سەردانی سلێمانی کردو لەبەر دەرگای سەرای سلێمانی کۆبونەوەی لەگەڵ زاناکانی ئایینیو کەسایەتی ناوچەکەو شێخ مەحمود کرد بەناوی حکومەتی بەریتانیا دواو لە وتارەکەی شێخ مەحمودی بە دادوەری سلێمانیو ناوچەکەی دانا لەهەمان ڕۆژدا بەرپرسی ڕامیاری بەریتانیا لە عێراق سەردانی کەرکوکی کردبوو ئەویش کۆبونەوەیەکی لەگەڵ سەرۆك هۆزەکانو کەسایەتیە کوردەکان ئەنجام دا لە شاری کەرکوك وتی "بەریتانیا هەوڵی دامەزراندنی حکومەتی کوردی دەدات لە باشووری کوردستانو هەر دوای ئەوە لە ١٩١٨/١١/٥ هێزەکانی سوپای بەریتانیا گەیشتە شاری موسڵ بەمەش دەسەڵاتی تەواوی بەسەر هەموو عێراق دا سەپاند پێش دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقو دیاری کردنی سنوری لەبەر مەترسی بەرپابوونی شۆڕشی کوردەکانو لەهەمان کات ناوچەی بارزانی لە قەزای ئاکرێ جیا کردەوە ئەویش لەبەر ڕاپەڕینەکانی ناوچەی بارزان.
لەلایەکی تر بێ بونی دەسەڵات لە عێراقی ڕانەگەیەندراو بوونی هێزی سەربازی بەریتانیو ئاڵۆزی بارو دۆخی نێوان بەریتانیاو عەرەبی ناوچەکانو کوردو کێشەی نێوان پیاوانی بەریتانیاو هێزی میلیشیای نوێی دروستکراو ئەمانە هەمووی بارو دۆخێکی ئاڵۆزی خستبوە گۆڕەپانی ناوچەکەو بەرەو ئاڵۆز تر هەنگاوی دەنا.

لەو کاتە سەرۆکی ئەمەریکا "ویلسن" نامەیەکی ئاراستەی هیندستان کرد لە ١٩١٩/٢/٢٠کە چەندین خالی لە خۆ گرتبوو لە بارەی بارو دۆخی عێراق و سەربەخۆیی کورد لە چوار چێوەی سنوری دارێژراوی عێراقی دەستکرد کە ئەو کاتە بەریتانیا لێی بەرپرسیار بوو لە هەموو بوارە جیا جیاکانی باری کورد. دوای ئەوە کێشەی نێوان فەرەنساو بەریتانیاو ئەلمانیا بەرەو چارە سەر بیری لێکراوەو لە ١٩١٩/٤/١٨نوێنەری فەرەنسا "بیرنگەر"ونوێنەری بەریتانیا "ولتەر لونگ"رێکەوتننامەی دابەشکردنی داهاتی ناوچەکە بەتایبەتی عێراق کە لە ٢٥٪ بەشی ئەلمانیا بدرێتە فەرەنسا کە بەریتانیا دەستی بەسەردا گرتبوو، بەهۆی بارو دۆخی کوردستان و بەتایبەتی ناوچەی سلێمانی و دەوروبەری و کەرکوك و خانەقین بە هۆی شۆڕشەکانی شێخ مەحموود و لەو کاتە حکومەتی بەریتانیا لە ١٩١٩/٥/١٠ فەرمانیدا بە پێك هێنانی چەندین میر نشینی کوردی کە لەژێر دەسەلاتی شێخ مەحموود دابێت بە مەرجێك ئەو میر نشینانە بە ئامۆژگاری ئەفسەرە بەریتانیەکان هەلس و کەوت بکەن بۆ ئەوەی بارو دۆخەکە بەرەو توانەوە بەن و ماوەی کار کردنیان ئاسانتر بێت لە چەسپاندنی دەسەلاتیان و ڕێگە خۆشکەر بێت بۆ پێك هێنانی حکومەتی عێراقی نوێ، لەلایەکی تر بە هۆی ڕاپەڕین لە شارۆچکەی ئاکرێ و دەورو بەری داگیر کرد، ئەنجومەنی بالای هاوپەیمانان لە ١٩٢٠/٤/٢٥بڕیاریدا کە عێراق بچێتە ژێر ئینتدابی بەریتانی و سوریاش بچێتە ژێر ئینتدابی فەرەنسا کە هەردوولا دوو بەشی خاکی کوردستانیان داگیر کرد، لە ١٩٢٠/٦/٢٤رێکەوتنامەی "سان ڕیمۆ" مۆر کرا کە فەرەنسا بە ڕەسمی وازی لە ویلایەتی موسل هێنا بەرامبەر بەدەست هێنانی هەندێك ناوچەی ژێر دەسەلاتی بەریتانیا وەك لوبنان و فەلەستین و بوونی بەش لە کۆمپانیای نەوت لەسەر خاکی کوردستان کە لەسەردەمی سولتان عەبدولحەمید داگیر کرابوویە هاوکاری ئەلمانیا دامەزرابوو لەو کاتەی بڕیاری بەریتانیا لە ١٩٢٠/٦/١٧دەرچوبو بە پێکهێنانی حکومەتێکی عەرەبی بە ناوی عێراق و "سیربری کوکس"کرا بە نوێنەری یاسایی بەریتانیا لە بەغداو کۆکس ڕۆلی گرنگی هەبوو لە بە عەرەب کردنی عێراق بە گشتی و کوردستان بەتایبەتی بە هێنانی بە دەیا هەزار خێزانی عەرەب لە ولاتی سعودیە لە سەرەك هۆزو تیرەکان و دەست نیشان کردنی فەیسەلی سعودی بۆ شانشینی عێراق.چونکە شانشین فەیسەڵ لە دایك بوی سعودیەیە تاکو کردنی بە شانشینی عێراق خاکی عێراقی ئێستای نەدیبوو خۆیی و بنەمالەو کەس و کارو دۆست و برادەرو عەشیرەتەکەی هێنا بۆ عێراق لەگەڵ ئەوەش بە دەیا هەزار خێزانی هێنا ناو خاکی عێراق لە ناوچە جیاجیاکان بوونە خاوەن زەوی و سامان و گوند یەك لەوانە بنەماڵەی غازی عجیل یاوەر کە باوك و باپیرانی لە دایك بووی بیابانی سعودیەن و مەڕ لەوەڕێن بوونەو ئێستاش لە عێراق خاوەنی ١٠٠هەزار دۆنم زەوین کە خاکی کوردستانیشی بەر کەوتوەو مانای دیموکراتی و مافی مرۆڤ و یەکسانی نازانێ تەنیا سەرۆکایەتی بە میراتی نەبێت و چەندین سەرەك عەشیرەتەکانی تر وەك غازی عجیل یاوەرن کە لە٦٥٪دوای سالەکانی چلەکان هاتونەتە ناو خاکی ئێستای عێراق. ئەمە لە لایەك لەلایەکی تر ڕۆژنامەی دێلی دێل لە١٩٢٠/٧/١٢بلاوی کردەوە کە ئەو باجەی لە گەلانی عێراق کە ١٥٠٠٠٠٠پاوەند وەرگیراوە لە هیچ ولاتێکی تر ئەو باجە وەرنەگیراوە.

لە بەرەو پێش بردنی بارو دۆخی عێراق و هێور کردنەوەی بەدامەزراندنی حکومەت و دەسەلات و داموو دەزگاکانی لە لایەکی تریش مۆر کردنی پەیمانی سیڤەر لە ١٠ /١٩٢٠/٨ لە لایەن

هاوپەیمانان چەندین برگەری باشی لەخۆ گرتبوو بە چارە سەری کێشەی کوردو مافەکانی لەوانە خاڵەکانی ٦٢- ٦٣-٦٤ لە برگەی ٣ لەژێر ناونیشانی کوردستان. لەگەڵ ئەوەشدا راپەرینەکانی کورد بەردەوام بوو لە ١٩٢٠/٨/٢٢راپەرینی ئیبراهیم خانی دەلۆ لە شارۆچکەی کفری و دەوروبەری هەلگیرسا و رۆڵی گرنگی هەبوو بۆ پشتگیری شۆرشی شێخ مەحمود لەگەڵ ئەوەشدا ئاڵۆزیی و ناڵەباری شاری هەولێرو دەوروبەری "ئارنۆلد ولسن" جێگری دادوەری رامیاری گشتی لە عێراق سەردانی هەولێری لە ١٩٢٠/٩/٨کرد بۆ هێور کردنەوەی بارو دۆخەکە. کۆکس یەکەم ئەنجومەنی وەزیرانی لە ١٩٢٠/١٠/٢٥ لە عێراق دامەزراند بە سەرۆکایەتی "عبدالرحمن النقیب" لە ١٩٢١/١/٦دامەزراندنی سوپای عێراق و دوای ئەوە لە ١٩٢١/١/٢٣فەیسەڵی سعودی کرابەشانشینی عێراق بە مەرجێك دەسەڵاتەکە دەستوری نیابی دیموکراتی بێ بە پێی یاساو بەریتانیا و هاوپەیمانان دانیان نا بە دەسەڵاتی شانشین فەیسەڵی یەکەم کە لە بنەماڵەی هاشمیەکانی سعودیەو لە دایك بوی دورگەی عەرەبی بوو.

ئەنجومەنی وەزیرانی نوێی عێراق لە ١٩٢١/٧/١١ بریاری پشتگیری خۆی بۆ شانشین فەیسەڵ دەربری بە پادشای عێراق راگەیاندو هەروەها کورد سەربەست بێت لە بەشداری کردن لەدەسەڵاتی نوێی عێراق هەتا بە جیا بوونەوەو لەو کاتە کۆمەڵەی کوردستان بۆ یەکەم جار لەشاری سلێمانی دامەزرا لە ١٩٢٢/٧/٢١لە دوای گەرانەوەی شێخ مەحمودو هەڤالانی لە ١٩٢٢/١/١٣ لە هندستان لە رێگەی کوێت بۆ شاری سلێمانی و بەرپابوونی راپەرینەکان. کۆمەلەکە لەلایەن مستەفا پاشا کە ئامانجی یارمەتی دانی راپەرینەکانی شێخ مەحمود بوو.

راگەیاندنی هاوبەشی نێوان شانشینی عێراق و بەریتانیا لە١٩٢٢/١/٢٤بلاو کرایەوە بەدان نان بەمافی کورد لەو ناوچانەی کە زۆرینەیان کوردن بە پێك هێنانی حکومەتی کوردی لە چوار چێوەی سنوری عێراق کە لەو کاتە دانیشتوی شاری کەرکوك لە٨٥٪کورد بوون، لە ٢٣/٣/ ١٩٢٢ شێخ عەلی سلمان لەگەڵ چل کەسایەتی کورد سەردانی بەغدایان کرد بۆ چاو پێکەوتن لەگەڵ کۆکس نوێنەری بەریتانیاو شانشینی عێراق. بەڵام زۆری پێ نەچوو شاری سلێمانی لە ١٩٢٢/٥/٣١لەلایەن هێزەکانی ئاسمانی جەنگی بەریتانیا بۆردومان کرا ٠٠٠لەو بارو دۆخە نوێیە ئاڵۆزەی نێو دەوڵەتی بەتایبەتی بارو دۆخی کوردستان بەرەو تەواو کردنی دابەشی کوردستان و گەڵوسامانەکەی لە ١٩٢٣/٧/٢٤پەیمانی لۆزان لەلایەن هاو پەیمانان مۆر کرا لە شاری لۆزان کە بوە هۆی لەت لەت کردنی تەواوی خاکی کوردستان بە چوار پارچەو نیو،بەر لەوەش شێخ مەحمود لە ١٩٢٢/٨/١٤دەست نیشان کراو هەڵبژێردرا بە مەلیکی کوردستان و لە ١٩٢٢/٩/١٢شێخ مەحمود بە رەسمی بوە مەلیکی کوردستان و چاوی کەوت بە شانشینی عێراق لەبەغداو دوای ئەوە لە ١٩٢٢/٦/١٤کۆنگرەی یەکەمی کوردی بەسترا لە شاری سلێمانی بۆ پشتگیری شێخ و پەرەپێدانی شۆرشی کورد لە هەموو بوارەکان و هەر لەگەڵ پەرەسەندن و پێشکەوتنی بارو دۆخی ناوچەو هەرێمەکە شێخ مەحمود لە١٩٢٢/١٠/١٠یەکەم حکومەتی کوردی راگەیاند لەگەڵ پێك هێنانی یەکەم ئەنجومەنی شارەوانی لە شاری سلێمانی لە مێژووی کوردو کوردستان و لە دوای ئەو راگەیاندنە مۆرکردنی رێکەوتننامەی نێوان دەسەڵاتی شانشینی نوێ و بەریتانیا لە ١٩٢٢/١٢/٢٥کە ئەمەش گرنگترین بەلگە نامەی مێژووییە بە دان نان بە مافی کوردو دامەزراندنی حکومەتی کورد لە چوار چێوەی

سنوری نوێی دیاریکراوی عێراق‌و لەو کاتەش دان نرا بە حکومەتی سەربەخۆی عێراق‌و کۆتایی هاتنی ئینتدابی بەریتانی لەسەر عێراق لەدوای جێگیر کردنی تەواوی خواست‌و ویستەکانی لە عێراق بە تایبەتی لە بواری رامیاری‌و ئابوری‌و بەدەست هێنانی مافی تەواو بۆ عەرەبی هاوردە لە سعودیەو ناوچەکانی تر لەسەر خاکی عێراقی نوێ لە هەموو بوارەکانی رامیاری‌و ئابووری‌و سەربازی‌و کۆمەلایەتی‌و رۆشنبیری‌و کوردیش دابەش کراو هەر پارچەیەکی بەر ووڵاتیك کەوت یەك لەوانە عێراق.

لە دوای مەرگەساتی کوردو مافەکانی شێخ مەحمود نامەیەکی لە ١٩٢٢/١/٢١ ئاراستەی رابەری شۆرشی ئۆکتۆبەری بەلشەفی لینین کرد بۆ بەهاناهاتن‌و یارمەتی دانی شۆرشی کوردو خاکی کوردستان کە بەر شالاوی دابەش کردن‌و داگیر کردن دایە کەچی ووڵاتانی تری ژێر دەستەی ووڵاتان بەرەو ئازادی‌و سەربەخۆیی هەنگاویان دەنا کە چی وەك کورد خاوەنی خاك‌و زمان‌و کەلتوری رابردو نەبوینە هەروەهاچ لە رووی رووبەری خاك‌و زۆری ژمارەی کورد.

هێزەکانی شانشینی عێراق‌و بەریتانیا سەرەرای بریارو راگەیاندن‌و بەڵێن دان بەکوردو چارەسەر کردنی کێشەکەی بەلام بەردەام بون لە ئازاردان‌و دەربەردەر کردن‌و بۆردومان کردنی شارو شارۆچکەو لادێکان‌و ٠٠٠ لە ١٩٢٣/٣/٤فرۆکەکانی بەریتانیا شاری سلێمانیان بۆردومان کرد لەهەمان کاتا دەسەلاتی شێخ مەحمودی هەلوەشاندەوە، بۆ زیاتر مسۆگەر کردنی دەسەلاتی شانشینی‌و بەریتانیاو گەمارۆ دانی بەهێزی چەکداری‌و داموو دەزگا سیخوری‌و پۆلیس‌و سەربازی شاری سلێمانی لە١٩٢٣/٤/٣٠ کردە پارێزگا لە پاڵ پارێزگاکانی ئینتدابی بەریتانی. لە١٩٢٣/٥/١٦ هێزەکانی سوپای بەریتانی شاری سلێمانیان داگیر کردو شێخ مەحمودو شۆرشگێرەکانی ناچار کرد بەرەو شاخەکان هەڵکشێن‌و بەردەوام بون لە شۆرش‌وبردنی تەواوی پێداویستەکانی شۆرش لە راگەیاندن‌و چەك‌و خۆراك و تەقەمەنی‌و پێداویستی داموو دەزگای شۆرش‌و ٠٠٠ لەگەڵ ئەو بارو دۆخە نالەبارەی کوردو ناوچەکە شێخ مەحمود لە ١٩٢٣/٧/٢٧نامەی سێیەمی ئاراستەی لینین کرد بۆ هەمان مەبەستەکانی ناوەرۆکی نامەکانی پێشوو٠٠٠ بەلام بە هیچ جۆرێك ئەنجامی نەبوو لە یارمەتی کورد٠٠؟کە چی دەسەلاتی سۆڤیەتی نوێ‌و کۆنی ئاگاداری هەموو ئێش‌و ئازارو دەربەدەری‌و داگیر کردن بون لە هەموو ولاتانی تری جیهان ، بۆ چەسپاندنی دەسەلاتی شانشینی عێراق لەسەر رێگەی دەزگاو ئەنجومەنەکانی بۆ پالپشتی رامیاریەتی شانشینی عێراق، پەرلەمانی عێراق لە ١٩٢٤/٣/١٢ هەلبژێردراو ١٧کورد ئەندامیەتیان لەو پەرلەمانە وەرگرت وەك شاهد نەك وەك ئەندام رۆڵی خۆیان هەبێ‌و بەرگری لەمافی کورد بکەن‌و دژی بریارە چەوتەکانی رژێمی شانشینی بوەستن چونکە رژێمی شانشینی عێراق لە١٠٠٪لایەنگری عەرەب‌و بەعەرەب کردن‌وداگیر کردن بوو لە پێناو ئامانجەکانی ئومەی عەرەبی.

هێزەکانی بەریتانیا بەشێوەیەکی درندانە لە ١٩٢٤/٥/٢٠ بەیاننامەیەکی بلاو کردەوە بەسەر ناوچەکانی کوردستان‌و بریاری بۆمبا بارانی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی شێخ مەحمودی ئەمری دا ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تر بۆ دابین کردنی ئاسایشی دەسەلاتی خۆی‌و یارمەتی دان لە ١٩٢٤/٩/٣رێکەوتننامەی لەگەڵ شای ئێران مۆر کرد بۆ گەمارۆ دانی شۆرشی شێخ مەحمود کە هێزی سوپای شای ئێران پەلاماری ناوچەی پشتدەری دا لە ئەنجام هێزەکانی سوپای شای ئێران شکا...

کۆمەلەی گەلان لە ١٩٢٤/٩/٢٠لیژنەیەکی پێك

هێنا بۆ لێکۆڵینەوە لە ماف و داهاتوی کوردو کێشەی موسڵ بە هۆی ئازار دانی کوردو چارەسەرکردنی کێشەی کوردلە ڕێگەی کۆمەڵەی گەلان بەلام لەو کاتەداو دوای ئەوە لێژنەکە لە ١٩٢٤/١١/١٢ دووبارە کۆبۆوە بۆ دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەك کە نوێنەری بەریتانیاو تورکیاو نوێنەری عێراق ئامادە بوو بە هۆی بەستنی کۆبونەوەکە لەشاری بەغدا سەرەڕای ئەوە ئالای نوێی شانشینی ماوەی پێ نەدرابوو لە شاری کەرکوك بەرز بکرێتەوە تاکو١٩٢٤/١٢/٢٠کە شانشین فەیسەڵ سەردانی شاری کەرکوکی کردوئالای عێراقی دروستکراوی لە کەرکوك بەرز کردەوە٠٠٠؟

لە دوای ئەو بارو دۆخە ناهەموارەی کە کورد پێیدا تێپەڕی و بۆ داواکاری یارمەتی و بەبیر هێنانەوەی بەڵێنەکانی وولاتانی هاو پەیمانان بەتایبەتی بەریتانیا شێخ مەحمود لە ١٩٢٥/٥/٢٠بروسکەیەکی داواکاری مافی گەلی کوردی ئاراستەی سەرەك وەزیرانی ئێران و باڵوێزی ئەمەریکا لە ئێران و تورکیا و ئیتالیاو فەرەنسا کرد لەتارانی پایتەختی ئێران و دوای ئەوە کۆمیتەی نێو دەوڵەتی لە ١٩٢٥/٧/١١ ئاکامی لێکۆڵینەوەکەی بلاو کردەوە کە ولایەتی موسڵ بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی کۆمیتەی نێو دەوڵەتی بۆ ماوەی ٢٥ساڵ و لەهەمان کات زمانی کوردی ڕەسمی بێت و ولایەتی موسڵ کورد ئیدارەی بگێڕی و هەر لەدوای ئەوە ڕەشید بەگ نوێنەری تورکیا لە١٩٢٥/٧/١٦لە کۆبونەوەی کۆمەڵەی گەلان دوا راپۆرت هەلسەنگێندرا لە بارەی ولایەتی موسڵ کە ڕەشید بەگ لەو کۆبونەوەیە گوتی" تەنیا لەئێران و تورکیا کورد هەن لە عێراق کورد نیەو نەژادی جیاوازە لە تورك و عەرەب و فارس"کە چی لەو کاتە دانیشتوی کورد لە شاری موسڵ و دەوروبەری ٨٥٪ بوە، لە دوای ئەوە سکرتێری کۆمەڵەی گەلان لە١٩٢٥/٩/٢٣نامەیەکی ئاراستەی دادگای نێو دەوڵەتی کرد بە مەبەستی چارەسەر کردنی کێشەی موسڵ لە دەسەلاتی نوێی کورد ٠٠کۆمەڵەی گەلان لە ١٩٢٥/١٠/١٦بریارێکی دەرکرد بەپێی ئەو بریارە حکومەتێکی کوردی ناوخۆیی لە عێراق دابمەزرێت.

سەرەڕای ئەو بارودۆخەو کێشەو ململانێیە دەسەلاتی شانشینی عێراق خەریك بوو بەوەی دەسەلاتی زیاتر بە هێز بکات لە ڕێگەی پتەو کردنی دام و دەزگاکانی دەوڵەتی عێراقی دروستکراو لەسەر خاکی گەلانی تر بە تایبەتی کورد٠٠٠؟

هەموو هەوڵ و توانا چ لەڕێگەی بریار دەرکردن و داواکاری چ کوردو چ کۆمەڵەی گەلان بەلام لەدوایی کۆمەڵەی گەلان لە ١٩٢٥/١٢/١٦بریاریدا بە لکاندنی ولایەتی موسل بەدەسەلاتی شانشینی عێراق و سەرپەرشتی کردنی لەلایەن بەریتانیا بەمەرجێ مافەکانی کورد دابین بکرێت لەو کاتەی کە دانیشتوانی شاری موسڵ ٨٥٪کورد بوون بەپێی ئامارەکانی کۆمەڵەی گەلان و دەسەلاتی عوسمانی ڕوخاو.

هەر دوای ئەوبارو دۆخەو چارەسەر نەکردنی کێشەی کورد لە ناو بیرو بۆچەنەکانی وولاتانی هاوپەیمانان و مەلۆتکەکانیان، مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی نێوان بەریتانیاو فەرەنساو عێراق و تورکیا لە١٩٢٦/١/٥بەوەی کە تورکیا دانی بەوە دانا کە ولایەتی موسڵ سەر بەعێراق بێت و تورکیا جارێکی تر باسی ولایەتی موسڵ و داوای هیچ مافێك نەکات لەسەر ولایەتی موسڵ لە ١٩٢٦/١/١٣ باشوری کوردستان بەتەواوی لکێنرا بە شانشینی عێراقی دروستکراو لە ڕێکەوتننامەی نێوان عێراق و بەریتانیاو کۆمەڵەی گەلان ڕەزامەندی لەسەر ئەو کارە کردو وردە وردە ماف و داواکاری کوردو کێشەی نەتەوایەتی بەرەو لاوازی هەنگاوی دەنا ئەویش دوا بریاری

دەسەڵاتی شانشینی عێراق لە کۆبونەوەی ئەنجومەنی نوێنەرانی کارتۆنی عێراق لە ١٩٢٦/١/٢١کە بڕیاریدا بە ڕەسمی بوونی زمانی کوردی لەپاڵ زمانی عەرەبی لەسەرپەڕ، کەچی لەکاتی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تورك تۆمارگەو نوسین بەزمانی کوردی بوو لە ناوچەکانی کوردیو دامو دەزگاکانی بە پێی نوسینی ئەو کات،بە هۆی لاواز بوونی بزوتنەوەی گەلی کوردو یارمەتی نەدانی لەچ لایەنێکی نێو دەوڵەتیو ناوچەو هەرێمو گەمارۆدانی کورد لەلایەنهێزەکانی بەریتانیاو هاوکاری هێزی نوێی عێراقو دراوسێکانو بەرپابوونی ڕاپەڕین لەناوچەی پێنجوێنو دەوروبەریو هێزەکانی بەریتانیا لە ١٩٢٧/٤/٢٠شارەکەو دەوروبەری داگیر کردو ڕاپەڕینەکەی دامرکاندەوە٠٠٠لەگەڵ ئەو بارو دۆخەو باری ئاڵۆزی کوردو چارەسەر نەکردنی بەهۆی بەرژەوەندی بەریتانیاو ئەمەریکاو هاوپەیمانانو چاو بڕین لەخاکی بەپیتی کوردستانو دۆزینەوەی یەکەم بیری نەوت لە ١٩٢٧/١٠/١٤ لەشاری کەرکوك لە بابە گوڕگوڕ ئەمەش بوە هۆکارێکی سەرەکی بۆ زیاتر گەمارۆدانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە هەموو لایەنە جۆراو جۆرەکانی بە عەرەب کردنی ناوچە کوردیەکان بەتایبەتی شاری کەرکوكو شارۆچکەو گوندەکانو شاری موسڵو دەوروبەری ئەویش وەك"شەرگاتو سنجارو گوێڕو حەویجەو توزخورماتوو داقوقو تازەو بەدرەو جەسانو عەلی غەربیو شەرقیو بە تایبەتی زنجیرە چیای حەمرین بەسەرەوە کە سنووری باشووری کوردستانە٠٠٠!"

بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد دەست بەردار نەبوو لە ڕاپەڕینو هەوڵدان لە پێناو مافەکانی کورد کە شێخ مەحمود لەگەڵ ٢١ کەسایەتی کورد لە ١٩٣٠/٨/١ یاداشتێکیان ئاراستەی بەریتانیا کرد بۆ دامەزراندنی حکومەتی کوردو لەو کاتەش ڕاپەڕینەکەی شاری سلێمانی لە١٩٣٠/٩/٦دژی داگیر کەر ئەنجام دراو بوە هۆی شەهید بوونی٤٥ کوردوزامدار بوونی بەدەیا کەس، دوای ئەوە حکومەتی شانشینی عێراق لە ١٩٣٢/٥/٣٠لە کۆمەڵەی گەلان وەرگیراو بوە ئەندامو دەستگیر بوونی بە مەرجەکانی ڕاگەیاندن بۆ چارەسەری مافەکانی کورد کە عێراق ناتوانێ هەڵی بوەشێنێتەوە گەر بەڕەزامەندی کۆمەڵەی گەلان نەبێت بە پێی بڕگەی ١٠ لە بڕیارەکە. مۆر کردنی پەیمانی سەعد ئاباد لە نێوان ئێرانو عێراقو تورکیاو ئەفغانستان لە١٩٣٧/٧/٨بۆ ڕەتکردنەوەی دروست بوونی هەر دەوڵەتێکی کوردی لە ناوچەکەو گەمارۆدانی شۆڕشەکانی کوردو مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی یارمەتیو دۆستایەتی یەکتری نێوان عێراقو ئێران لە ١٩٣٧/٧/١٨بە پێی بڕگەکانی پەیمانی سەعد ئاباد بۆ ئەوەی دولایەنە دەسەڵاتی خۆی بەهێز بکات، لە ١٩٣٩/١/٢٩ شانشینی عێراق وێستگەی بەشی کوردی لە وێستگەی ڕادیۆی عێراق کردەوە بە پەخش کردنی ڕامیاریەتی دەسەڵاتەکەی هەر چەندە کاریگەری هەبوو بۆ بەرز کردنەوەی ڕۆشنبیریو دابو نەریتو مێژوو زمانی کوردی .

لەگەڵ ئەو بارو دۆخەی عێراقو کوردو ناوچەو هەرێمو جیهان لە ئەنجامی کێشەو ململانێی گەرمی نێو دەوڵەتیو بەتایبەتی کێشەو ململانێی نێوان یەکیەتی سۆڤیەتو ئەڵمانیاو لە لایەکی تر کێشەی ئەڵمانیاو وڵاتانی هاوپەیمان ئەمەریکاو بەریتانیاو فەرەنسا تاکو هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی لە١٩٣٩/٩/٢کە بوە هۆی دروست بوونی بارودۆخێکی نوێی جیهانو هەرێمو ناوچەو هەر وڵاتێك بە هۆی لێك ترازانی دەسەڵاتو پەیوەندی نێو دەوڵەتی بزوتنەوەی ڕزگاری نەتەوەییو نیشتمانیو چینایەتیو کۆمەڵایەتی لەوانەش بزوتنەوەی ڕزگاری کورد لەو بەشە لکێنراو بە عێراقو بەرز بوونەوەی

هەستی نەتەوایەتی لە ئەنجامی ئەو بارو دۆخە نوێیە ڕەشید عالی گەیلانی سەرەك وەزیرانی عێراق هەڵسا بە کودەتایەك لە ١٩٤١/٥/١ دژی بەریتانیاو شانشینی عێراق، لە ١٩٤١/٥/١٢حکومەتی نوێی دامەزراندو لە هەمان کات شۆڕشی مایس لە١٩٤١/٥/٢هەڵگیرساو زۆربەی زۆری گەلانی عێراق وبە تایبەتی کورد بەشداری تێیدا کرد کە ڕۆڵی سەرەکی هەبوو بۆ خزمەتی عەرەب نەك بۆ کورد، دوای بەرپابوونی ڕاپەڕینەکانی بارزان لە ١٩٤٣/٧/٢٨دژی دەسەڵاتی شانشینی عێراق و داگیرکەری بەریتانیاو دوبارە دەست پێکردنی ڕاپەڕینەکان لە بارزان لە ١٩٤٥/٩/١٠و ڕاپەڕینە مەزنەکەی گاور باخی شاری کەرکوك لە ١٩٤٦/٦/١٢کە لە لایەن کرێکارانی نەوتی باکور ئەنجام درا کە لە ٧٥٪ کرێکارو فەرمانبەری کورد بوون ڕۆڵی گرنگی هەبوو لەو ڕاپەڕینەو دامرکانەوەی داخەکانی دژی دەسەڵاتی شانشینی کە داگیرکەری کوردو نیشتمانی کورد بوو. هەر لەگەڵ ئەو بارو دۆخە بارزانی لە ١٩٤٧/١/٢٩لە تارانی پایتەختی ئێران چاوی کەوت بە کار بە دەستانی ئەمەریکاو بەریتانیا و داواکاریەکی ئاراستە کردن لە بارەی کێشەو مافەکانی کورد، دوای لەناو بردنی کۆماری کوردستان و کەوتنە بەر شاڵاوی شای ئێران و گەمارۆدانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی و لەسێدارەدانی سەرکردەو کەسایەتیەکانی کوردو پەلاماردان کە کاردانەوەی کردە سەر بەشەکانی تری کوردستان و ڕۆیشتنی بارزانی بەخۆیی و ٥٠٠لە هەڤالانی لە١٩٤٧/٦/١٥ بەرەو یەکیەتی سۆڤیەت و لەسێدارە دانی چوار ئەفسەرە کوردە کەلە ١٩٤٧/٦/١٩ لە لایەن صالح جەبری سەرەك وەزیرانی عێراق بە هۆی بەشدار بوونیان لە دامەزراندنی کۆماری کوردستان، لە دوای ئەو بارو دۆخە پەیمانی پۆرتسمۆس لە ١٩٤٨/١/١٥ لە لایەن شانشینی عێراق و بەریتانیا مۆر کرا کەبوە هۆی بەهێز بوونی دەسەڵاتی بەریتانیا لەسەر عێراق و مامەڵە کردن لەکاروباری عێراق بە تایبەتی لەبواری ڕامیاری و ئابوری کە مەبەستەکەش هەر بۆ ئەوە بوو.

هەر لەگەڵ ئەو بارو دۆخە بارزانی لە پەنابەریەتی توانی ئامادە بێت لە کۆنگرەی باکۆیی یەکیەتی سۆڤیەتی ئەو کات لە ١٩٤٨/١/١٩ ئەویش بە پێشکەش کردنی وتارێکی مێژوویی چ بۆ کۆنگرەوانان و داهاتوی کورد چ بۆکوردو شیکردنەوەی بارودۆخی کوردستان کە کوردە ئاوارەکانی ئێران و عێراق و تورکیاو سوریاو سۆڤیەت بەشداریان لەو کۆنگرەیە کرد، هەر دوای ئەوە خۆپیشاندانێکی گەورە لە هەموو شارەکانی عێراق لە١٩٤٨/١/٢٧ئەنجام درا بە تایبەتی شارەکانی کوردستان و هەوڵەکانی دژ بەدەسەڵاتی شانشینی و ڕامیاریەتی بەرامبەر بزوتنەوەی ڕزگاری کورد بەهاوکاری لەگەڵ پارت و ڕێکخراوە نیشتمانیەکان و دیموکرات خوازەکان و بەردەوام بوونی هەستی نەتەوایەتی و سەلماندنی بەبەردەوام بوونی ڕاپەڕینەکان لە ١٩٤٨/٣/٢١ گەلی کورد توانی جەژنی نەورۆز بکاتە نامەیەکی ئاراستە کراو بۆ دەسەڵاتی شانشینی و دوژمنانی کورد بە هەڵگیرساندنی ئاگری نەورۆز لە بەغداو شارو شارۆچکەو گوندو دۆڵ و شاخ بۆ یەکەم جار لە مێژووی دەسەڵاتی عێراق، دوای ئەوە وەزارەتی ئەرشەد عومەری لە١٩٥٤/٤/٢٩دامەزرا کە ڕابوردویەکی پڕ لە ئازاردانی گەلانی عێراقی هەبوو بە تایبەتی گەلی کورد، بارودۆخی نوێ لەعێراق سەرهەڵدانی بەخۆوە بینی بە لێك نزیك بونەوەی هێزە نیشتمانی و نەتەوەیی و دیموکراتی بۆ ڕزگار بوون لەو بارو دۆخە کە بوە هۆی پێك هێنانی بەرەی یەکیەتی نیشتمانی لە ١٩٥٧/٣/٩بە هاوکاری ئەفسەرە ئازادەکان.

بەڵام پارتی دیموکراتی کوردستان بەشداری

نـــەكرد كـــە نوێنەرايـــەتى كـــوردى باشـــورى كوردستانى لكێنراو بە عێراقى دەكرد بە هۆى بيرى شۆڤێنى هەندێ لە پارتە عەرەبيەكان بەلام توانرا لەگەڵ پارتى كۆمۆنيستى عێراق دولايەنە ڕێكـــەوتنێك ئـــەنجام بـــدەن لەســـەر ڕۆشـــنايى پرۆگرامى بەرەى نيشتمانى و لە هەمان كات بە هـۆى ئـەو بـارو دۆخـە نوێيـە هـەنگاوى بـەرەو پێشەوە دەنـا لـە ١٩٥٧/٧/١سـەرژمێرى گـشتى ئـەنجام درا كـە بـەئامارێكى بنـەڕەتى لـە عێـراق دادەنرێت هەر چەندە ئامارەكە زيانێكى زۆرى لە كورد دا لە ناوچەكانى كە عەرەبى بۆ هێنرابوو چـــونكە چ لەشـــارى كـــەركوك چ لەشـــارى موسڵ‌وشارۆچكەكانى لە ساڵى بيستەكان لە٨٠ هـەتا ٨٥٪ دانيـشتوانى كـورد بـوون كـە چـى لـە ئامـارى ١٩٥٧ (٤١٪) دانيـشتوانى كـورد بـوو كـە ٤٠٪ ژمـارەى كـورد لـەپارێزگاى موسڵ‌و كـەركوك كەم بوبوەوە بەهۆى بەعەرەب كردن بەپێى بەلگە نامە مێژوييـەكانى عێراق‌و عوسمانى‌و فارسى‌و بەريتانى‌و كۆمەلـەى گـەلان‌و نوێنـەرانى نيشتمان پەروەر ، بەهۆى تێك هەلكشانى جموجۆڵ‌و بيرو بۆچـونى نيـشتمانى‌و ديمـوكراتى لـە عێـراق لـە ئەنجام بوە هۆى بەرپابوونى شۆڕشى ١٤تەموزى ١٩٥٨ بە سەركردايەتى عەبدول كەريم قاسم‌و بە هاوكارى پارتە نيشتمانى‌و ديموكراتى‌و ئەفسەرە ئازادەكان،بـە لـەناو بردنـى ڕژێمـى شانـشينى عێـــراق‌و دامەزرانـــدنى ڕژێمـــى كۆمـــارى‌و هەلوەشـاندنەوەى هـەموو ياسـاو بـلاو كـراوەى دەســـەلاتى شانـــشين‌و دروســـت بـــوونى بـــارو دۆخێكى نوێى عێراق بە نەهێشتنى هـەموو جۆرە چەوسـاندنەوەيەك بـە تايبـەتى چەوسـاندنەوەى كوردو ئاواتـەكانى‌و بڕيار دانى دەستورى كـاتى عێـراق لـــە ١٩٥٨/٧/٢٧كـــە بـــۆ يەكـــەم جـــار لەدەسەلاتى عێراق لە دەستورى نوێى كۆمارى لە بڕگـەى /٣ دان دەنـێ بە هاوبەشـى كوردو عەرەب لەخاكى عێراقى بەزۆر دروستكراو .

دواى ئەو گۆڕانكاريـيە نوێيـەى كـە كەوتـە نـاو گـەلانى عێـراق‌و بـەرەو ئـازادى هـەنگاو نـان‌و لابردنـى هـەموو جـۆرە ئاسـەوارێكى خراپـەكارى دەسەلاتى شانشينى عێراق ئەوە بووبارزانى نـەمر لە دواى ١٢ساڵ لە ١٩٥٨/١٠/٦گەيشتەوە شـارى بەغـــداو لـــە ١٩٥٨/١٠/٧چـــاوى كـــەوت بـــە عەبدولكـــەريم قاســـم، دواى ماوەيـــەك كێـــشەو ململانێى شەڕە كورسى‌و دەسـەلات سـەرى هەلدا لـەنێوان پارتـەكانى بـەرەى نيـشتمانى عێـراق‌و عبـــدالكريم قاســـم‌ولە لايـــەكى تـــر لـــەنێوان عبـــدالكريم‌و پـــارتى كۆمۆنيـــست‌و لـــەنێوان سەركردايەتى كوردو دەسەلاتى عبدالكريم قاسم ئەمانە هەموى بونە هۆكارێكى چەند لايەنە ڕۆژ لە دواى ڕۆژ بارودۆخى عێراق بەرەو ئالۆزى پـەرەى دەســـەند بـــە دەســـتگير كردنـــى ســـەركردەو ئەندامـــەكانى پـــارتى بەعـــسى‌و پارتـــەكانى تـــرو پـارتى ديمـوكراتى عێراق‌وبـە تايبـەتى لـە دواى ڕاپەڕينەكەى شەواف لە مانگى /١٩٥٩/٣لە شارى موسڵ‌و دروسـت بوونى كێشەى دوژمنكـارى لـە نێوان بەعس‌و شيوعى لەو كاتە بارزانى سـەردانى يەكيـەتى سـۆڤيەتى كـرد لـە ١٩٦٠/١١/٣ چـاوى كەوت بە بريماكۆف بەهۆى ئالۆزى بارى عێراق‌و بەتايبەتى بارى كێشەى كورد .

ئەمانە لەلايەك‌و لەلايەكى تر دروست بوونى كێـــشەى نێـــوان دەســـەلاتى عبـــدالكريم‌و ســـەركردايەتى كـــورد لـــە ئـــەنجام بـــوە هـــۆى هەلگيرسـانى شۆڕشـى ئـەيلول لـە ١٩٦١/٩/١١بـە ســـەركردايەتى بـــارزانى لـــە ئـــەنجامى چـــەندين • هۆكـــارى ديـــار چ لـــە نێـــوان كـــوردو هانـــدانى ســـەركردايەتى كـــوردو چ لـــە نێـــوان دەســـەلاتى قاسم‌و سەركردايەتى كوردو مافەكانى لە هـەموو لايەنـە جـۆراو جۆرەكـان‌و بـوە هـۆى كودەتـاى سـەربازى بـەعس لـە١٩٦٣/٢/٨ ولـەناو بردنـــى دەسـەلاتى قاسـم‌و دروسـت بـوونى بـارودۆخێكى نوێى شالاو بردنە سەر گەلانى عێراق بە تايبەتى

گەلی کورد بە وێران کردن و سوتاندن و کوشتن و دەربەدەرکردن، لە ١٩٦٣/٦/١١ ڕژێمی نوێی بەعسی شۆڤێنی هێرشێکی بەر فراوانی کردە سەر ناوچەکانی کوردستان کە بوە هۆی ڕوخانی زیاتر لە ٨٧٠ گوندی سوتاندن و دەربەدەرکردنی خێزانەکانیان.

بۆ بەدەنگەوە هاتنی یەکتری هەردوو دەسەلاتی بەعسی سوریا و عێراق لە ١٩٦٣/٦/٢٠ هێزەکانی سوپای سوریا بەشداری تەواوی هێزەکانی سوپا و پاسەوانی نەتەوەیی بەعسی عێراقی کرد لە بۆردومان کردنی ناوچەکانی باشوری کوردستان بە پێی داواکاری ڕژێمی عێراق و بەرگری کردن لە یەکتری و پەلاماردانی شاری سلێمانی لە ١٩٦٣/٦/٢٩ کە بوە هۆی زیندە بەچاڵ کردنی ٨٣ هاولاتی شارەکە لەژن و منداڵ و پیرو دەربەدەر کردنی بەدەیان کەس. سەرەڕای ئەو بارو دۆخە نالەبارەی عێراق بەرامبەر بە گەلانی عێراق و بەتایبەتی گەلی کورد لەو کاتەش وێستگەی دەنگی کوردستانی عێراق لە ١٩٦٣/٩/٢٩ پەخشکرا لە کوردستان و عێراق و ناوچەکە و کاردانەوەیەکی گرنگی کردە سەر کوردو هاندانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی و بەرز کردنەوەی هەستی نەتەوەیی و تیرێکی ژەهراوی بوو بۆ دوژمنانی کوردو نیشتمانەکەی، هەر دوای ئەوە ڕژێمی عێراق و سوریا لە ١٩٦٣/١٠/٢٢ لە شارۆچکەی زاخۆ کۆبونەوە بە مەبەستی لەناو بردنی شۆڕشی ئەیلول کە ڕژێمی سوریا ٣٠٠٠ هەزار سەربازی بە هەموو جۆرە چەکێك خستە ژێر دەسەلاتی ڕژێمی عێراق بۆ لێدانی بنکەو بارەگاکانی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول و سەرکردایەتی شۆڕش، بەمەبەستی چارەسەر کردن و هێور کردنەوەی بارو دۆخی لێك ترازاوی عێراق بە تایبەتی پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی کوردو دەسەلاتی عێراق لە ١٩٦٤/٢/١٠ ڕێکەوتننامەی وەستانی شەڕ مۆر کرا لە نێوان سەرکردایەتی شۆڕش و عەبدول سلام عارف سەرەك کۆماری ئەو کاتەی عێراق بەلام ڕێکەوتننامەکە بێ سوود بوو.

لەو بارو دۆخەی عێراق شا حوسێن شانشینی ئوردن لە ١٩٦٥/٩/٢٣ سەردانی ئیرانی کردوو لەگەڵ شای ئێران کۆبونەوەی ئەنجامداو لەناو کۆبونەوەکە بە گۆڕینەوەی بەبیرو بۆچونیان ئالوگۆڕکردو داوای لە شای ئێران کرد کە یارمەتی کوردو شۆڕشی کورد نەدات بەلکو هاوکاری ڕژێمی عێراق بکات بۆ گەمارۆ دانی شۆڕشی کورد لە باشوری کوردستان، لە دوای کودەتا سەربازیەکەی بەعسی لە نێوان سەرکردەکانیان لە ١٩٦٦/٦/٢٩ ڕێکەوتننامەی وەستانی شەڕ لە لایەن سەرکردایەتی شۆڕش و عبدالرحمن عارف مۆر کراو لە هەمان ڕۆژ عبدالرزاق بەزاز سەرەك وەزیرانی دەسەلاتی بەعسی وتی مافی کورد چارەسەر دەکرێت و لە ١٩٦٦/٧/٢٩ مافی ئۆتۆنۆمی کارتۆنی لاناوەندی "لامرکزی" بلاو کردەوە. لە هەمان کات کێشەی نێوان لابالی چەپڕەو ڕاست ڕەوی بەعسی بەردەوام بوو لە پێناو لەناو بردنی یەکیان بۆ ئەوی تریان و ئامانجی شەڕە کورسی و لەناو بردنی یەکتری لەسەر بەرژەوەندی گەلانی عێراق و بە تایبەتی گەلی کوردو کێشەکەی، دوای ئەوە دوا کودەتای سەربازی لە لایەن احمد حسن البکرو لایەنگرانی لە ١٧- ٣٠ تەموزی ١٩٦٨ ئەنجام درا بە پاك کردنەوەی داموو دەزگاکان لە پیاوانی دژ بەخۆیان چ لەدەسەلات و چ لە بیرو بۆچون لە دوای بەدەست هێنانی دەسەلاتیان و گرتنە بەری ڕامیاریەتی دوولایەنە یەکەمیان بەرەو چارەسەر کردنی کێشەکان بەتایبەتی کێشەی کوردو دووەمیان ڕووکردنە ولاتانی سۆشیالیستی و جولانەوەی ڕزگاری جیهانی بۆ بەهێز کردنی جێ پێگەی خۆیان لە هەموو بوارەکانی پەرەسەندن و پێشکەوتن و دورکەوتنەوە لە ئەمەریکاو

هاوپەیمانان، ئەو ڕامیاریەتە بوو سەدام حسێن لە ١٩٧٠/١/١٠ سەردانی بارزانی کرد لەناو پردان بۆ گفتوگۆ کردن لە بارەی چارەسەر کردنی کێشەی کوردو بەردەوام بوون لەو گفتو گۆیانە بەشێوەیەکی چڕ کە یەکیەتی سۆڤیەت ئاگای لەو گفتو گۆیە هەبوو لە ڕێگەی وەزیری دەرەوە "بریماکۆف" و ئەنجامی ڕاگەیاندنی ڕێکەوتنامەی ١١ئازاری١٩٧٠ بوو لە نێوان سەرکردایەتی شۆڕش و ئەحمەد حەسەن بەکرو دروست بوونی بارو دۆخێکی نوێ لە عێراق و دەنگ دانەوەی لە ناوچەو هەرێم و جیهان بەرەو دیموکراتی و پێشکەوتن و پەرەسەندن لە هەموو بوارەکان بەتایبەتی لەهەرێمی کوردستان . لە ١٩٧٠/٧/١٦دەستوری کاتی ڕاگەیەندرا لەلایەن ڕژێمی بەعسی کە ٩٥٪دەسەڵاتی دا بە سەرۆك کۆمارو ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی بەعسی و لە ١٩٧١/١١/١٦بەلگە نامەی کاری نیشتمانی لە لایەن سەرۆك کۆمار ڕاگەیەندرا کە چەندین کێشەی تێدا چارەسەر دەکرد بۆ پێك هێنانی بەرەی نیشتمانی نەتەوەیی پێشکەوتوو کەلە ١٩٧٣/٧/١٧ بەرەی نیشتمانی پێشکەوتوو لە لایەن عەزیز محمد سکرتێری پارتی کۆمۆنیستی عێراق و ئەحمەد حەسەن بەکر ڕاگەیەندرا بێ ئەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان بەشداری تێدا بکات کە ئەمەش کاردانەوەی خراپی نواند لە داهاتوی کوردو عێراق و بەرەو هەڵدێر بردنی کە ئەمەش پارتی کۆمۆنیستی عێراق چەندین لایەنی ئەو کارەی کەوتە ئەستۆ کە نەدەبوایە هاوخەباتیەتی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان لێك بترازێنێ لەهەموو لایەنەکانی ڕامیاری و نەتەوەیی و ئابووری و بەردەوابوون لەشۆڕش و بڕوانەکرد بەرژێمی بەعس چونکە ئەو کات ئەو دوو پارتە یەك تەواوکەری ئەویتر بوون لەداهاتووی عێراق چ لەلایەنی باری نەتەوەی کوردو چ لەلایەنی باری گەلانی تری عێراق، چونکە لەگەڵ مۆر کردنی ئەو بەرەیە بوە هۆی دروست بوونی کێشەو ململانێی توندو تیژی نێوان پارتی و شیوعی کەبەعس ئاگرەکەی خۆش دەکردو پشتگیری حیزبی شیوعی دەکرد بە هەموو توانایەك تا گەیشتە قۆناغی بەرپابوونی شەڕی چەکداری و ڕاگەیاندن لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعی و پاشگەزبوونەوەی بەعس لە بڕگەکانی ڕێکەوتنامەی ئادارو پەلاماردانی شۆڕشی ئەیلول لەلایەن هێزەکانی سوپای عێراق لە ١٩٧٣/١٠/٣و بەر لەوەش پرۆژەی مافی ئۆتۆنۆمی پێشکەش بە دەسەڵاتی ناوەندی عێراق کرا لە لایەن پارتی دیموکراتی کوردستان لەسەر ڕۆشنایی بڕگەکانی ڕێکەوتنامەی ١٩٧٠/٣/١١ بەڵام ڕژێمی بەعس لە بیرو بۆچونیان ڕێکەوتننامەکە هەلوەشێترابوەوە لە ١٩٧٤/٣/١٨ کۆتایی بە گفتوگۆ هات لە نێوان سەرکردایەتی شۆڕش و دەسەڵاتی ناوەندی عێراق، لە ١٩٧٤/٤/٢٤شاری قەلادزێی بوردومان کرد کە بوە هۆی شەهید کردنی ١٥٠ کوردو زامدار کردنی بەدەیا کەس لە قوتابیان و لە هەمان کات بۆردومان کردنی شاری هەلەبجە لە ١٩٧٤/٤/٢٦کە بوە هۆی شەهید بوونی ٥٢ کوردو زامدار کردنی بە دەیا کەس و ئاڵۆز کردنی بارو دۆخی ناوچەکەو دەربەدەر بوونی بە دەیا خێزان بۆ ناوچەکانی تر، بە هۆی ئاڵۆزی بارو دۆخی کوردو و پچڕانی پەیوەندی و گفتو گۆی نێوان دەسەڵاتی ناوەندی بەعس و سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول جەماوەری شارەکانی کوردستان لە ١٩٧٤/٨/٢٢ بەرەو شاخەکان هەلکشان وەك خۆ پیشاندان دژی کردەوە نالەبارە دوژمنکاریەکانی بەعسی بەرامبەر بەکوردو نیشتمانەکەی ، مۆر کردنی ڕێکەوتننامەی دۆستایەتی و هاوکاری نێوان ڕژێمی بەعسی و یەکیەتی سۆڤیەت لە مانگی/ ١٩٧٢/٤ خۆمالی کردنی کۆمپانیەکانی نەوت لە ١٩٧٢/٦/١

گفتوگۆی نهێنی له نێوان شای ئێران‌و ڕژێمی عێراق به سەرکردایەتی ئەحمەد بن بلەی سەرۆکی جەزائیر به ئامۆژگاری ئەمەریکا که ئەنجام بوە هۆی مۆر کردنی ڕێکەوتننامەی جەزائیر لە۱۹۷٥/۳/٦ له نێوان دەسەلاتی شای ئێران‌و دەسەلاتی عێراق، لەو کاتە بارزانی سەردانی تارانی کردوو چاوی بە شای ئێران کەوت لە۱۹۷٥/۳/۱۲و پێ ڕاگەیاندنی بە کۆتایی هێنانی شۆڕش‌و بارزانی گەڕاوە کوردستان. لە ۱۹۷٥/۳/۱٥ سەعدون حەمادی وەزیری دەرەوەی عێراق لەگەڵ عەباس تەلعەت وەزیری دەرەوەی ئێران کۆبونەوە بە ئامادە بونی عەزیز بۆتەفلیقەی وەزیری دەرەوەی جەزائیر لە تاران بۆ پیادە کردنی ڕێکەوتننامەی جەزائیر.

دوای ئەو هەموو گۆڕانکاریە لە نێوان عێراق‌و ئێران‌و کوردو ڕژێمی عێراق‌و شای ئێران‌و جەزائر بوە هۆی کۆتایی پێهێنانی شۆڕشی ئەیلول لە ۱۹۷٥/٥/۱۹ کە بووە هۆی فڕێدانی چەک‌و کورد بوە چەندین بەشی سەر لێشێواو ئەوەی ئاوارەی ئێران بوو ئەوەی خۆی دا بە دەستی ڕژێمەوە بە ناوی گەڕانەوە بۆڕیزی نیشتمانی‌و گواستنەوەیان بۆ باشوری بەغداو ئەوەی گەڕاوە سەر گوندو شارو شارۆچکەکان بە هەناسەی ساردو داماو کۆکردنەوەیان لەکەمپ‌و کۆمەلگای زۆرە ملێی ژێر دەسەلاتی بەعس.

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کورد ملکەچی نەکرد بۆدوژمنی گەڵ‌و نیشتمان کە لە ۱۹۷٥/٥/۲۲بلاوکردنەوەی یەکەم بەیانی دامەزراندنی یەکیەتی نیشتمانی بە زمانی عەرەبی لە دیمەشقی پایتەختی سوریا لە۱۹۷٥/٦/۱، لە هەمان کات هەلگیرسانەوەی شۆڕشی گولان لە ۱۹۷٥/٥/۲٦لە لایەن سەرکردایەتی کاتی پارتی دیموکراتی کوردستان بۆ تەواوکردنی دەستکەوتەکانی شۆڕشی ئەیلول‌و داهاتوی کوردو شۆڕشدا. ئەمانە هەمووی بونە هۆکارێکی گرنگ لە بیری نەتەوەیی‌و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو نامەیەکی کراوە بوو بۆ دوژمنانی گەلی کورد لە هەموو لایەنەکان ئەمە لە لایەک‌و لە لایەکی تر لەخۆ بایی بونی دەسەلاتی بەعس‌ودوای ئەوە دروست بونی کێشەو ململانێی نێوان حیزبی شیوعی‌و حزبی بەعسی بەرەو دورکەتنەوەی پەیوەندی نێو دەولەتی‌و عەرەبی بە هۆی ڕامیاریەتی خۆپەرستی بەناوی ئومەی عەرەبی‌و بەرز بونەوەی بیری شۆفێنی‌و بە عەرەب کردنی ناوچەکانی کورد لە شارەکانی کەرکوک‌و هەولێرو موسڵ‌ودوروبەریان لە شارۆچکەو لادێکان و...هتد...

لە هەمان کات دروست بوونی کێشەو ململانێی نێوان دەسەلاتدارانی بەعس بە تایبەتی لە نێوان لابالّی احمد حسن بکرو لابالّی سەدام حوسێن لە بیرو بۆچون‌و چۆنیەتی دەسەلات‌و ئامانجە داهاتوەکانیان تاکو ۱۹۷۹/۷/۱۷ کەسەدام دەسەلاتی سەرۆك کۆمارو ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی وەرگرت بە لادانی احمد حسن بکرو لەناو بردنی بەکۆمەڵ لە بەرهەلستکارانی لەناو پارت‌و دەولەتو داموو دەزگاکانی سەربازی‌و ئەمنی‌و لە خۆبایی بوون بە هۆی چۆڵ بونی گۆڕەپانی ڕامیاری‌و بیر کردنەوە لە هەلوەشاندنەوەی ڕێکەوتننامەی جەزائیر بەهۆی لاواز بونی بزوتنەوەی ڕزگاری کوردو پارتی کۆمۆنیست‌و هیچ بەرهەلستکارێك لە عێراق‌و دروست بوونی کۆماری ئیسلامی لە ئێران لە ۱۹۷۹/۲/۱۱.

ئەو هۆکارانە بونە هۆی دژایەتی کردنی کۆماری ئیسلامی نوێی ئێران وداواکردن بە هەلوەشانەوەی ڕێکەوتننامەی ۱۹۷٥/٥/٦ جەزائرو ڕووبەڕو بونەوەی ڕژێمی ئیسلامی نوێی ئێران‌و هەلگیرسانی شەڕی هەشت سالەی نێوانیان لە ۱۹۸۰/۹//۲۲ تاکو ۱۹۸۸/۸/۸ .

لەو بارو دۆخە دژوارەو دروست بوونی

بەرەی جود لە ١٩٨٠/١٠/٢٨ لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و لیژنەی هەرێمی پارتی کۆمۆنیستی عێراق و پارتی سۆشیالیستی کوردستان و پارتی گەلْ جگە لە یەکیەتی نیشتمانی کوردستان.

لەگەلْ کۆتایی هاتنی شەڕی نێوان عێراق و ئێران و گەڕانەوە بۆ هەمان ڕێکەوتننامە ڕەشەکەی جەزائر . بەلاْم بە داخەوە لە دوای دامەزراندنی بەرەی جود تاکو دامەزراندنی بەرەی کوردستانی لە ١٩٨٨/٥/٧ چەندین جار شەڕی برا کوژی لە نێوان یەکیەتی و بەرەی جود ڕووی دا کە ئەمەش کاردانەوەیەکی ناهەمواری دروستکرد چ لەسەر بزوتنەوەی کورد چ لە داهاتوی کورد، هەروەها مۆر کردنی ڕێکەوتنی نێوان ڕژێمی بەعس و یەکیەتی نیشتمانی لە ١٩٨٣/١٢/٣. ڕژێمی بەعس سەرەڕای ئەو بارو دۆخە بەردەوام بوو لە کارە شۆفێنی و نامرۆڤانەی چ لە بەعەرەب کردنی ناوچە کوردیەکان چ بە دەرکردنی کوردە فەیلیەکان لە ١٩٨٢/١/٢٩ کە بوە هۆی دەربەدەر کردنی هەشت هەزار کوردی فەیلی بە ناوی "تەبەعیە" لە شارەکانی کوت و عمارەو بەغداوحیلەو سوێرەو عەلی غەربی و عەلی شەرقی و بەدرەو جەسان و ناوچەکانی تر. ئەنفال کردنی هەشت هەزار بارزانی لە ١٩٨٣/٧/٣١ لە شارۆچکەکانی قوشتەپەو هەریرو دیانە،لەگەلْ ئەوەشدا ڕژێمی بەعس درێغی نەکرد لە بۆردومان کردنی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان بە فڕۆکە جەنگیەکانی لەوانە ناوچەی سەردەشتی ڕۆژهەلاتی کوردستان لە ١٩٨٧/٦/٢٨ کە بوە هۆی کوشتنی ١٣٢کەس و زامدار بوونی زیاتر لە ٤٥٠٠هاوولاْتی کورد کە لەو هێرشە چەکی گازی کیمیاوی بەکار هێنابوو، لەلایەکی تر دەرکردنی زیاتر لە ١٤٠٠قوتابی لە١٩٨٦/١٢/١٢لە زانکۆی موسلْ بەهۆی بەشداری نەکردنیان لە ڕاهێنانی هاوینەی بەعسیەکان بۆ فێربوونی زانیاری لە سوپای میللی بەعسی، بەردەوام بوونی لەو کارە نامرۆڤانەو بەوەش نەوەستا بڕیاری بە"علی حسن مجید" دا بە کیمیا باران کردنی شاری هەلەبجە لە ١٩٨٨/٣/١٦ کە بوە هۆی شەهید بوونی زیاتر لە٥٠٠٠ هەزار مرۆڤی کورد لە پیاوو ژن و منداڵ و پیرو گەنج کە بە کارێکی دڕندانەو نامرۆڤانە ترین کار دادەنرێت لە جیهان لە دوای بۆردومانی شارەکانی ناکازاکی و هێرۆشیمای یابان و دوای ئەوە ئەنفال کردنی ١٩٥ هەزار مرۆڤی کورد لە ١٩٨٨/٨/١٤لە ژن و منداڵ و پیرو گەنج لە ناوچەکانی کوردستان بە تایبەتی ناوچەی سلێمانی .

ئەمانە هەمووی بونە هۆکارەکانی گۆڕانکاری چ لەناوەوەی عێراق و چ لەناو کوردستان و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو ئێران و ناوچەو هەرێمەکەو چاوەڕوانی وولاْتانی جیهان لە گۆڕانکاری نوێی پەیوەندی وولاْتانی عەرەبی بە تایبەتی سعودیەو کوێت بەهۆی چونە ناو یەکتری زیاد لە پێویستی و لە خۆبایی بوونی دەسەلاْتی ناوەندی عێراق بە تایبتی سەدام و بیر کردنەوەی بەوەی کە کوێت قەزایەکە لە عێراق بە بیانوی تری ناهەمواری نێوانیان بوە هۆی داگیر کردنی کوێت لە ١٩٩٠/٨/٢لە ماوەی چەند کاتژمێرێك و هەلاتنی ئەمیری کوێت و بەرپرسانی کوێت بەرەو سعودیەو تالاْن کردنی کوێت لە لایەن دەسەلاْتی بەعسی عێراق و بوە هۆی دروست بوونی بارو دۆخێکی نوێی نێوان ڕژێمی عێراق و وولاْتانی عەرەبی و عەرەب لەنێو خودی خۆیان و دروست بوونی مەترسی و بارو دۆخێکی نوێ لە ناو عێراق و بە تایبەتی کوردستان و چاوەڕوان کردنی گۆڕانکاری زیاتر بە هۆی ئاگادار کردنی دەسەلاْتی ناوەندی عێراق بە کشانەوەی لە کوێت لە ڕێگەی کەسایەتی نێو دەوڵەتی و ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان و زانکۆی عەرەبی و ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی و ڕوسیا و

فەرەنساو چەندین وولاتی تر بەلاّم لەگەڵ ڕژێمی سەدام بێ سود بوو. ئەو هەوڵو تەقەلایەو لە لایەکی تر کۆکردنەوەی هێزی هاوپەیمانان بە سەرکردایەتی ئەمەریکا کەلە ١٩٩١/١/١٧ هێزی سوپای هاو پەیمانان بە هەموو جۆرە چەکێك پەلاماری سوپای عێراقی دا بەناوی گەردە لول بیابان بە سەرکردایەتی سوارشکۆف سەرۆکی هێزی هاوپەیمانان لە ئەنجام بوە هۆی دەربەڕاندنی سوپای عێراق لە کوێتو شکانی سوپای عێراقو هەرەس هێنانیو خۆڕانەگرتنیو کشانەوەی بەرەو بەغدا کە سوپای هێزی هاوپەیمانان دوابەدوای هێزی هەلاتوی عێراق تا گەیشتنە ناو قولایی خاکی عێراق لە باشوری بەغداو لە ١٩٩١/٢/٢٨ شەڕی کەنداوی دووەم کۆتایی هاتو بوە هۆی ڕاپەڕینی گەلانی عێراق بە تایبەتی شیعە لەباشوری عێراقو کورد لەباکوری عێراق واتە باشوری کوردستان لە ١٩٩١/٣/٥ بە ڕزگار کردنی شارو شارۆچکەکانی ڕانیەو قەلادزێ بەناوی دەروازەی ڕاپەڕین دوابەدوای ئەوە ڕزگار کردنی شارەکانی هەولێر لە ١٩٩١/٣/١١سلێمانی لە ١٩٩١/٣/٧ وکەرکوك لە ١٩٩١/٣/٢٠و هەروەها دهۆكو شارۆچکەکانی تری کوردستان بە ڕامالینی دامو دەزگا سیخوڕیو سەربازیو ئەمنی ڕژێمی بەعسو تێك شکانیو ڕیسواکردنی.

دوای ئەو ڕاپەڕینە مەزنانەی کە لەباکورو باشوری عێراق ڕویدا بوە هۆی مەترسی وولاّتانی هاوپەیمانانو بەتایبەتی ئەمەریکا بەبەردەوامی ڕاپەڕینەکان لە لایەن کوردو عەرەبی شیعەو مەترسی جیابوونەوەی شیعەو ڕاگەیاندنی دەسەلاّت لەباشور بە یارمەتی دەسەلاّتی ئێرانو ڕاگەیاندنی دەسەلاّتی کوردیو مەترسی بۆ دراوسێکانو چەندین هۆکاری تری تێك هەلکشاو لەو بارو دۆخە نوێیەو بێ هێزی دەسەلاّتی ڕژێمی سەدام بوە هۆی پاشگەز بوونەوەی ڕامیاریەتی ئەمەریکاو هاوپەیمانان بە گێرانەوەی دەسەلاّتی سەدام بۆ تەواوی شارەکانی عێراقو هێور کردنەوەی بارو دۆخەکە لە هەموو لایەك ئەوە بوو دەستی کرد بەدەست بەسەرا گرتنی شارەکانی باشوری عێراق بەتایبەتی شارەکانی هەرێمی کوردستان لە١٩٩١/٣/٣٠و سەرەتای دەست پێکردنی کۆڕەوە ملیۆنیەکەی گەلی کوردو لە ١٩٩١/٣/٣١ بوە کۆڕەوی گشتی لەهەموو کورستان لەشارەکانی کەرکوكو هەولێرو سلێمانیو دهۆكو بەشێك لە دیالەو موسڵو شارۆچکەکان بەرەو سنورەکانی ئێرانو تورکیاو شاخە بەرزەکانی کوردستان کەکورد ڕۆژێکی وەك ئەم ڕۆژەی بەخۆوە نەدیبوو لە ئاوارەییو دەربەدەریو ویران کردنو ئەنفالو کیمیا باران کردنی مرۆڤی کورد بەبەکارهێنانی ڕامیاریەتی تەواوی جینۆسایدو توانەوەی نەتەوەیەکی خاوەن (٠٠٠ر٠٠٠ر٤٢) ملیۆن کەسو دابو نەریتو کەلتورو مێژوو زمان لەسەر خاکی دێرینی خۆی لە لایەن ئەو نەتەوانەی لەو هەرێمەو ناوچانەی کەهیچ باسو خواسی لێ نەدەکراو نەناسرا بوون کەنەتەوەنو خاوەنی خاکن.. !.

لەدوای ئەو کارەساتەو بەزەیی پێهاتنەوەی وولاّتانی جیهان بەگەلی کوردو ئاوارەبونی لە ڕێگەی ڕێکخراوی نەتەوە یەککگرتوەکان ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی لە ١٩٩١/٤/٥بڕیاری ژمارە ٦٨٨ی دەرکرد بۆ پاراستنی ناوچەی کوردستان لە پەلامار دانو دەست درێژی دەسەلاّتی ناوەندی بەعسی بۆ سەر کوردو ناوچەی کوردستان لە١٩٩١/٤/١٩ هاوپەیمانان بەشێکی ئاسمانی باشوری کوردستانیان لە فڕۆکەکانی عێراق قەدەغە کرد کە بەو پێیە هێلی باکوری ٣٦ی پانی بۆ سنوری هاوپەیمانان بە فڕۆکە بپاریزرێت لە فڕۆکە خانەی ئەنچەرلیکی تورکی کە ئەویش دوژمنی سەرەکی کوردە لە هەموو لایەنە جۆراو جۆرەکانو هاوپەیمانی لەگەڵ وولاّتانی دامەزراو بە لکێنرانی

خاكی كوردستان بەسەر وولاتەكەیان. دوای ئەو باروو دۆخە رژێمی دەسەلاتی ناوەندی دامو دەزگاكانی میری لە شارەكانی دهۆكو هەولێرو سلێمانیو شارۆچكەكان لە ١٩٩١/١٠/٢٣ گواستەوە بۆ پارێزگای كەركوكو موسڵ تەنیا دەزگای كارەباو ئاو نەبێت. دوای ئەو كارە داوای گفتو گۆی كرد لەگەڵ سەركردایەتی كوردو بەردەوام بوونی بە پێشكەش كردنی راپۆرتی بەرەی كوردستانیو راپۆرتی هاوبەشی پارتیو یەكیەتیو پارتە كوردستانیەكان بۆ چارەی كێشەی كورد لە چوارچێوەی سنوری عێراقی بەزۆر دروستكراو سەردانی مەسعود بارزانیو جەلال تالەبانی بۆ بەغداو چاو پێكەوتنیان بە سەدام حسێن بەلام مایەی ئەم هەولو كۆششەكە بێ سود بوو بەمەش بۆشاییەكی لەبار دروست بوو بۆ بەرەی كوردستانی وپارتە كوردستانیەكان بۆ رێكخستنی كاروباری هاوولاتیانو پاراستنی مولكو سامانیانو جێگیر كردنی ئارامیو ئاسایشو بەرەنگار بونەوەی هەر كارێكی تیرۆریستیو پەلاماردانی. سەركردایەتی بەرەی كوردستانی بریاری هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی كوردستانی داو لە ١٩٩٢/٥/١٩ هەلبژاردن لە هەموو كوردستان ئەنجام درا بە هەڵبژاردنی ١٠٥ ئەندام لەنێوان پارتیو یەكیەتیو پێنج ئەندام بۆ ئاشوریەكانو لە ١٩٩٢/٧/٥یەكەم كابینەی حكومەتی هەرێمی كوردستان دامەزرا بۆ یەكەم جار لەمێژووی باشوری كوردستان دوای كۆبونەوەی یەكەمی ئەنجومەنی نیشتمانی لە ١٩٩٢/٦/٤سوێند خواردنی ئەندامانی ئەنجومەنو دامەزراندنی دامو دەزگاكانی میری سەر لەنوێ لە جێگەی دامو دەزگای دەسەلاتی ناوەندی بەغدا. هەر لەدوای ئەوە لە ١٩٩٢/٧/١٤وەزیرەكانی دەرەوەی توركیاو سوریاو ئێران كۆبونەوە لەسەر ئەو بارو دۆخە نوێیەی عێراق بەتایبەتی هەرێمی كوردستانو دوای ئەو كارە لەبارو گونجاوانە پەرلەمانی كوردستان بڕیاری دەسەلاتی فیدرالی لە ١٩٩٢/١٠/٤ راگەیاند بە پەیوەندی دەسەلاتی كوردی لەگەڵ دەسەلاتی ناوەندی عێراق جا لەژێر هەر دەسەلاتێك بێت لە داهاتوی عێراق. ئەمەش بە ئاراستە كردنی پیرۆزبایی لە لایەن وولاتانی جیهانو رێكخراوەكان بۆ ئەو كارانە دەكرد بەتایبەتی وولاتانی ئەوروپای رۆژئاوا لە پەرلەمانتارو جێگرو نوێنەری سەرەك دەولەتانو كەسایەتی نێو دەولەتی بە رێز لێنان لەو دەسەلاتە نوێیەی كە لە كوردستان دروست بووە.

لەگەڵ دروست بوونی ئەو بارو دۆخە نوێیە دەسەلاتی ئیسلامی ئێران نزیكەی ١٠٠ هەزار سەربازی بەهەموو جۆرە چەكو تەقەمەنیو فرۆكە ناوچەكانی پێنجوینو قەلادزێی سەر سنور لە ١٩٩٣/٥/١٢ داگیر كرد، لە ١٩٩٣/٦/٨ كۆبونەوەی وەزیرەكانی سوریاو توركیاو ئێران ئەنجام درا هەر دوای ئەوە فرۆكە جەنگیەكانی تورك كە ژمارەیان ١٩ فرۆكە بوو لە ١٩٩٤/٥/١٧ ناوچەی قەلادزێی بۆردومان كرد بە ناوی لێدانی بنكەو بارەگاكانی پارتی كرێكارانی كوردستان(p-k-k) دوای ئەوە دەسەلاتی ناوەندی بەغدا شارۆچكەی مەخموری لەهەولێر دابری لە ١٩٩٤/١٢/٢و لكاندی بە پارێزگای موسڵو دوایی ناوچەی كەندیناوەی ناحیەی سەرگەڕانی بەناوی "قودس"ناوناو بەقەزای دوبزی لكاند. هێزەكانی رژێمی ئیسلامی ئێران لە ١٩٩٦/٧/٢٩ بە ٢٠٠٠هەزار سەرباز بە هەموو جۆرە چەكێكی جەنگی هێرشی كردە سەر سەربازگەی سەلام لە نزیك شاری سلێمانی بۆ لێدانی بارەگاكانی پارتی دیموكراتی كوردستانی ئێران بۆ رۆژی دوایی هێزەكانی خۆی كشاندەوە سەر سنوری نێوان خۆیو عێراق لە دوای جێ بە جێ كردنی مەرامەكانی .

دوای ئەوە حكومەتی عێراق لە١٩٩٦/٩/٢١ داوای لەرژێمی تورك كرد بۆ هاوكاری كردنی لە پێناو هێور كردنەوەی بارو دۆخی باشوری

کوردستان‌و گەمارۆدانی لە هەموو لایەنێکەوە.

سەرەڕای ئامۆژگاری وولاتانی هاو خەمان بە تایبەتی ئەمەریکاو بەریتانیاو فەرەنسا بەڵام بیری بەرژەوەنـدی تایبـەت زاڵ بـوو بەسـەر بـیری ئامۆژگاری بەرژەوەندی گەلو نیشتمان‌و دروست بـوونی چـەندین هۆکـاری ناهـەمواری دژ بەداهاتوی گەلی کورد لە نێوان یەکیەتی‌و پارتی، پـێش هـەموو شـتێك بـەرەنگار بونـەوەی پـارتی کرێکارانی کوردستان p k k وەڵگیرسانی شـەڕی کـورد کـوژی نێوانیـان کـە کـار دانـەوەی خراپـی کـردە سـەر بزوتنـەوەی ڕزگـاری‌و گـەلی کورد لە هەموو بەشە لەت لەت کراوەکانی‌و هەر ئەو شەڕە خۆی گواستەوە بۆ بەرپابونی شەڕی نێـوان پـارتی‌و یەکیـەتی کـە سـەرەتای خـولی یەکەمی شەڕی خۆ کوژی لە ١٩٩٤/٥/١دەستی پێکـردو خـولی دووەمـی شـەڕ لـە ١٩٩٥/٢/٢٨دەستی پێکردو خولی سێیەمی شەڕ لـە١٩٩٦/٨/١٧ دەسـتی پێکـرد، واتـە لـە ١٩٩٤/٥/١تـاکو ١٩٩٨/٩/١٧بـە مـۆرکردنی ڕێکەوتننامـەی واشـنتۆن کـورد بـەبارو دۆخێکی سـەخت دا تێپـەڕی کـە خـراپتر بـوو لـە ئـەنفال‌و کیمیا بارانی هەڵەبجە چونکە کارەکانی دەسەڵاتی ناوەندی عێراق بەرامبەر بە کورد کار دانەوەی باشی نواند لە دوای ڕوخانی لە ٢٠٠٣/٤/٩ کە هەموو بوە بەلگەی چارەسەری کێشەی کورد بەڵام شەڕی نێوان پارتی‌و یەکیەتی دواخستنی ماف‌و کێـشەی ڕەوای گـەل‌و نیـشتمانی کـورد بـوو سەرەڕای هەول‌و کۆشش‌و ماندو بوونی پارت‌و ڕێکخراوو کەسایەتیە کوردی‌و ناوچەو جیهانی ئـەویش بـەمۆر کردنـی ڕێکەوتننامـەی پـارتی‌و یەکیـەتی لـە ١٩٩٤/١١/٢١ لـە تورکیـاو ڕێکەوتننامـەی ١٩٩٤/٧/٢٢ بـە هاوکـاری‌و سەرپەرشتی خاتوو میتران کە لە نێوان پارتی‌و یەکیـەتی مـۆر کـرا هـەروەها مـۆرکردنی ڕێکەوتننامـەی شـاری دبلـن لـە ١٩٩٥/٨/٩. ڕێکەوتننامەی درۆیدا لە ١٩٩٥/٨/١١بەڵام ئەمانە هەر هەمووی بێ سوود بوو٠٠٠ پارتی‌و یەکیەتی دوو پـارتی سـەرەکین لـە باشـوری کوردسـتان بـە تایبەتی لە دوای ساڵەکانی هەشتا گەر ئەو هێزو تواناو ئازایەتی‌و خۆڕاگریان بەرامبەر بە دوژمن بەکار بهێنایە کورد ئێستا لە قۆناغی داواکاری فیدرالی تێپەڕی کردبوو بەرەو سەربەخۆیی. نەك بەرامبەر بە یـەکتری‌و هێزە ڕامیاریـەکانی تـری کوردستان‌و کوردو نیشتمان٠٠٠!٠٠

دەسەڵاتەکانی ئێران‌و تورکیاو سوریاو عێرق بـەردەوام بـوون لـە هاوکـاری کردنـی یـەکتری بـۆ گـەمارۆدانی بزوتنـەوەی ڕزگـاری کـوردو گـەمارۆ دانـی‌و دروسـتکردنی گـیرو گرفـت بـۆ ئـەو بـارو دۆخە نوێیەی کە لەباشوری کوردستان ڕەخساوە کـە دەسـەڵاتی ناوەنـدی عێـراق داوای لـە تورکیـا کرد لە ٢٠٠٢/١/١٤کە یارمەتی ئەمەریکا نەدا لە هـەر هێرشێك بـۆ سـەر عێـراق کـە لـەو کاتـە"بلند ئەجەویـد" سـەرەك وەزیرانـی تورکیا لە ئەمەریکا بوو بۆ گفتوگۆکردن لەسـەر بارو دۆخی عێراق‌و بونی ناوچەیەکی ئازادو بونی دەسەڵاتی کوردی‌و کـارتێکردنی لـە کوردەکـانی تـری تورکیـا و تورکیاش بەردەوام بوو لە هەڕەشە کردن بۆ سەر کوردو دەسەڵاتەکەی. لە ئەنجامی ئەو هێرشانەی تورك سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان لە٢٠٠٢/١/١٦ بانگەوازێکی ئاراستەی پەرلەمانی تورکیـا و پەرلەمانـەکانی جیهـانی‌و ڕێکخـراوو ئەنجومەنەجیهانیەکان کرد لە بارەی ئەو هێرشە ڕاگەیاندنەکەی تورکیا بۆ سەر بارودۆخ‌و ئەزمونی کوردسـتان. ئەمـە لەلایـەك‌و لەلایـەکی تـر دوای هەشـت سـاڵ دژایـەتی کردنـی یـەکتری لـەنێوان پـارتی‌و یەکیـەتی لـە٢٠٠٢/١٠/٤پەرلـەمانی کوردستانی لەت کراو لە هەنگاوێکی شکۆدار بە ئامادەبوونی کەسایەتی نێو دەوڵـەتی‌و کـوردی یەکیان گرتەوەو کاردانەوەیەکی گرنگی کردە سەر گۆڕینی بارودۆخی کوردو داهاتوی.

لـەو بـارو دۆخـەدا بـە ڕاگەیانـدن‌و ئاگـادار کردنـەوەی ڕژێمـی سـەدام لەلایـەن ئەمـەریکاو

هاوپەیمانانی و دور کەوتنەوەی لە بواری ڕامیاری هەڕەشە لێکردنی بە لەناو بردنی بە هۆی گومان لێکردنی بە بونی چەکی هەمە جۆری کیمیاوی و بەکار هێنانی دژی گەلانی عێراق و دراوسێکانی و هەڕەشەکردن لە ئاسایشی ناوچەو ئەمەریکا وچەندین هۆکاری تر کە بوە هۆی دروست بوونی ڕێکەوتنێك لە نێوان ئەمەریکاو بەریتانیا ولایەنگرانیان جگە لە فەڕەنساو ڕوسیاو ئەلمانیا کە لەگەڵ لێدانی ڕژێمی سەدام نەبوون بەهۆی بونی پەیوەندی توندی نێوانیان لەگەڵ چەندین پەیوەندی نهێنی بەتایبەتی ڕوسیاو ئەڵمانیا بەهۆی پێدانی کەرەسەی دروستکردنی چەکی ئەتۆمی لە ڕێگەی نایاسایی و کۆبونەوەی چەندین هۆکاری تر بەتایبەتی کارەساتەکەی هەردوو تاوەرەکەی بازرگانی ئابوری جیهانی لە٢٠٠١/٩/١١ولە ناوبردنی ڕژێمی تالەبان لە ئەفغانستان و بەرپابوونی شەڕی دژ بەتیرۆر عێراقیش یەکێك بوو لەو دەوڵەتانە سەرەڕای ئاگادار کردنەوەی بە بەجێ هێشتنی دەسەڵات بەڵام سەدام گوێگری هیچ لایەنێکی داوا لێکراوی نەبوو کە ئەنجامی بوە هۆی کۆکردنەوەی سوپایەك کە زیاتر لە ١٥٠هەزار سەربازو سوپای وڵاتانی تری هاوپەیمان بە هەموو جۆرە چەکێك لە نوێ ترین چەك و تەکنەلۆژیای سەربازی سەردەمی. بەڵام لەگەڵ ئەو بارو دۆخە کۆبونەوەی شەش لایەنەی وڵاتانی دراوسێی عێراق لە٢٠٠٣/١/٢٣بە ئامادەبوونی وەزیرەکانی دەرەوەی سعودیەو سوریا و تورکیا و ئێران و ئوردن لە ئەنقەرەی پایتەختی تورکیا بۆ تاوتۆکردنی بارو دۆخی عێراق و ناوچەکەو دەسەڵاتی کوردی ودروستکردنی مەترسی دواڕۆژی ناوچەکەو دوای ئەوەش کۆبونەوەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق لە مەسیف سلاحەدین لە ٢٠٠٣/٢/٢٦بەسترا بە ئامادە بونی نوێنەری کۆفی ئەنان "زەلمای خەلیل زادەو" بالیوێزی ئەمەریکا لەگەڵ ئۆپۆسۆزیۆنی عێراق، هەر لەگەڵ ئەو بارو دۆخەو کێشەی نێوان تورکیاو ئەمەریکاو بەهۆی ڕازی نەبوونی تورکیا لە بەشداری کردنی لەو هێرشەی سەر عێراق و ماوە نەدانی هێزەاکنی ئەمەریکا لەسەر خاکی تورکیا و لەلایەکی تر تورکیا هەڕەشەی هاتنە ناو خاکی کوردستانی دەکرد بەڵام ڕەتکردنەوەی ئەو هەڕەشانە لە لایەن سەرکردایەتی کوردو گەلی کوردو لە باشوری کوردستان بەڕێ پێوانێکی ٥٠٠سەدهەزار کورد لە٢٠٠٣/٣/٢ لە شاری هەولێرو شارەکانی تری کوردستان وبوە هۆی دروستکردنی بەربەستەیەك بەرامبەر بە ڕامیاریەتی تورکیاو خواستەکانی.

ئەو بارو دۆخە گونجاوە بوە هۆی لێدانی ڕژێمی عێراق لەبەرەبەیانی ڕۆژی ٢٠٠٣/٣/٢٠ بەشێوەیەکی بێ وێنە لە بۆردومان کردنی دام و دەزگا سەربازی و سیخوڕی و ئەمنی و وەزارەتە گرنگەکان لەهەموو شارو شارۆچکەو سەربازگەکان لە هەموو عێراق تەنیا کوردستان نەبێت کە سەرکردایەتی کورد ماوەی بە سوپای ئەمەریکا دا لە خاکی کوردستان بنکەکانی بکاتەوە پێشمەرگە هاوکاری یەکەمی سوپای هاوپەیمانان بوو لە عێراق بۆ ڕزگار کردنی عێراق و ڕوخاندنی ڕژێمی سەدام لە ٢٠٠٣/٤/٩بەپێی ئەوەی بەرگری لەڕژێمی سەدام بکرێت وشاری کەرکوك لە لایەن پێشمەرگە ڕزگار کرا لە ٢٠٠٣/٤/١٠بەپشتگیری سوپای هاوپەیمانان . لە دوای ڕوخانی رژێمی سەدام بۆ یەکەم جار نزیکەی ٤٠٠ کەس لە کەسایەتی و بەرپرسی پارت و ڕێکخراوەکان لە ٢٠٠٣/٤/٢٨کۆنگرەی دامەزراندنی دەسەڵاتی کاتیان ئەنجام دا لە عێراق بەئامادە بوونی نوێنەری کۆفی ئەنان ئەمیندداری نەتەوە یەککگرتوەکان دوای ئەوە لە ٢٠٠٣/٤/٣٠ ئەنجومەنی کاتی عێراق دامەزرا بەبەشداری کورد بەپێی ڕێژەی ئەندامانی لە شیعەو سونەو کوردو نەتەوەکانی تر، لە ٢٠٠٣/٥/٦پۆل بریمەر کرا

دادوەری گشتی دەسەڵاتی کاتی عێراق لە لایەن هاوپەیمانان و دەستی کرد بە دەرکردنی چەندین بڕیاری گونجاو بە هەڵوەشاندنەوەی سوپای عێراق و داموو دەزگا سیخوڕیی و ئەمنی و وەزارەتی ڕاگەیاندن و داموو دەزگاکانی ... دوای ئەوە فڕۆکە خانەی نێو دەوڵەتی لە٢٠٠٣/٧/١لە شاری هەولێر کرایەوە و دروستکردنی بە بڕی ٥٠٠ملیۆن دۆلار کە ڕۆڵی گرنگی ئابوری دەبێت بۆ بەرەو پێش بردنی باری ئابوریی و بوژانەوەی ژێر خانی کوردستان لە هەموو بوارەکان.

هەوڵ و کۆششەکان بۆ لەناو بردنی سەدام و سەرکردەکانی دەسەڵاتی سەدام لە ٢٠٠٣/٧/٢١ عەلی کیمیاوی لە شاری سامەڕای سەر بە پارێزگای تکریت دەستگیر کراو لە ٢٠٠٣/٧/٢٢ هەردوو کوڕە لە گورگ چوەکەی سەدام "عودەی و قوسەی" لەشاری موسڵ کوژران.

لە ٢٠٠٣/٨/١٩تەها یاسین ڕەمەزان لە شاری موسڵ لەلایەن یەکیەتی نیشتمانی کوردستان دەستگیر کرا .بۆ بەرەو پێش بردنی بارو دۆخی عێراق و ڕۆڵی کورد لەو بارو دۆخە ڕژێمی تورکیا هانی سیخوڕەکانی خۆی دەدا لەڕێگەی بەرەی تورکمانی لەکوردستان بە تایبەتی لە شاری کەرکوک و شارۆچکەکانی لە ئەنجام بوە هۆی بەرپا بونی شەڕی نێوان تۆرانی و کورد لەشارۆچکەی توزخورماتو لە ڕۆژی ٢٠٠٣/٨/٢٣. ئەوەش لەیاد نەکرێت و بزانرێت نەک هەر بەرەی تورکمانی بەلکو چەندین پارتی تری بەناو تورکمانی هەمووی سیخوڕی تورکیانەو لە پێناو تورکیا و تێکدانی کوردستان هەوڵ دەدەن لە پێناو بڕە پارەیەکی گونجاو بۆیان...! دوای ئەو بارو دۆخە یەکەم کابینەی حکومەتی کاتی لە ٢٠٠٣/٩/١دامەزرا بەپێی ڕێژەی نەتەوەو تایفەکانی ئاینی لە عێراق کە ١٣ شیعەو ٥ سونەو ٤ کورد ئەوانی تریش لە ئاشوری و تورکمان بوون .

لەگەڵ ئەو بارو دۆخە ئازادیەی لە عێراق بەرپا بوو لە لایەن دەسەڵاتی ئەمەریکاو هاوپەیمانان و پێشمەرگەی کوردستان کۆلن پاوڵی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا لە٢٠٠٣/٩/١٥سەردانی شاری هەڵەبجەی شەهیدی کردوو لە لایەن مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی پێشوازی لێکراو کار دانەوەیەکی باشی نواند بۆ داهاتوی کوردو ناوچەو جیهان. لە٢٠٠٣/١٢/١٣ سەدام حسێنی پاڵوانی ئوممەی عەرەبی لەشارۆچکەی دۆرەی سەر بەپارێزگای تکریت لە ژێر زەمینێکی حەوت مەتر قوڵ دەستگیر کرا لە لایەن هێزی هاوپەیمانان بە هاوکاری پێشمەرگەی یەکیەتی نیشتمانی کوردستان.دروست بوونی بارو دۆخی ئازادی و بەرەو ئارام بوونەوە بەڵام پیاوەکانی بەعسی و ڕێکخراوە تیرۆریستەکانی ئیسلامی و عەرەبی بەرەنگاری ئەو بارو دۆخە بوونەوە بۆ دروستکردنی کۆسپ وتەگەرەو ئاژاوە نانەوەلە بەرەو پێش بردن و دروستکردنی دژایەتی نێوان شیعەو سونەو کوردو عەرەب و تورکمان بە خۆتەقاندنەوەو شەهید کردنی هاو ولاتیان لەوانەش تەقینەوەکەی شاری هەولێر لە ٢٠٠٤/٢/١ کە بوە هۆی شەهید بوونی زیاترلە ١٠٧ سەرکردەو بەرپرس و لایەنی ڕامیاری و هاو وڵاتیان لە یەکیەتی و پارتی و پارتە کوردستانیەکانی گەلی کورد...سەرەڕای ئەو کارە تیرۆریستانە سەرکردایەتی کورد لەهەوڵ و کۆشش بەردەوام بوو لە بڕیار دانی یاسای دەوڵەتی عێراق کە لە ٢٠٠٤/٣/٨ ئەو یاسایە ڕاگەیەندرا بە ناو نان بە عێراقێکی فیدرالی دیموکراتی فرەلایەنی یەکگرتوو، دوای ئەوە ڕاگەیاندنی کابینەی دوەمی حکومەتی کاتی لە ٢٠٠٤/٦/١بە هەڵبژاردنی غازی عجیل بەسەرۆک کۆمارو ئەیاد عەلاوی بەسەرۆک وەزیران و٣١ وەزیرو هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی کاتی عێراق کە شەش وەزیری کورد بووجگە لە جێگری سەرەک کۆمارو سەرەک وەزیران. لە دوای ئەوە

ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی بڕیاری ١٥٤٦دەرکرد بە دیاری کردنی دەسەڵاتی عێراقی نوێ بە حکومەتی فیدرالی دیموکراتی یەکگرتوو لە عێراق و پشت گوێ خستنی یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق لەسەر داوای عەلی سستانی ڕابەری شیعەکانی عێراق کە ئەمەش بوە هۆی دروست بوونی نائومێدی لە شەقامی کوردی و بەردەوام بوونی ئەو نائومێدیە سەرەڕای چەندین بەڵێن دان و ڕاگەیاندن.

سەرەڕای ئەوە وڵاتانی دراوسێی عێراق بەردەوام بوون بەرامبەر ئەو بارو دۆخەی عێراق و دەسەڵاتی کوردی لەڕێگەی کۆبونەوە لە پایتەختی وڵاتەکانیان و دوا کۆبونەوەیان لە٢٠٠٤/٧/٢١ لە قاهیرەی پایتەختی میسر ئەنجام دا بە ئامادە بوونی وەزیرەکانی دەرەوەی تورکیاو سوریاو ئوردەن و سعودیەو ئێران و کوێت بە سەرپەرشتی وەزیری دەرەوەی میسرو ئامادەبوونی وەزیری دەرەوەی عێراق کە خاڵی بنەڕەتی پاراستنی یەك پارچەیی خاکی عێراق و ماوە نەدان بەکوردو دەرچونی لەو یەك پارچەییە.

لەو کات و ساتەدا کۆنگرەی نیشتمانی عێراق لە ٢٠٠٤/٨/١٥دەستی پێکرد. لەماوەی چوار ڕۆژ لە گفتوگۆی چڕو بەپێز توانرا ٨١ ئەندام هەڵبژێرن بۆ تەواو کردنی ١٠٠ ئەندام بە ئەندامە یەدەگەکانی ئەنجومەنی دەسەڵاتی عێراق کە مەسعود بارزانی و جەلال تالەبانی و مەحمود عوسمان بەشداری تیا بکەن. لەو کاتە غازی عجیل سەرۆك کۆماری عێراق لە ٢٠٠٤/٨/١٦سەردانی تورکیای کرد لە ئەنجامی کۆبونەوەکانی لەگەڵ دەسەڵاتی تۆرانیەکان خاڵی داوا لێکراوی ماوە نەدان بە کوردو پاراستنی شاری کەرکوك بوو لەکورد٠٠٠!٠٠سەرەڕای باری ناهەمواری عێراق بە تایبەتی باشورو ناوەڕاستی عێراق واتە "سێ گۆشەی سونی" لە دوای شەڕەکانی نەجەف و فەلوجەو دیالەو ڕومادی و سامەڕا کە بارو دۆخی عێراق بەرەو ئالۆزی دەبات سەرەڕای بەرگری کردن لەو حکومەتە کاتیەو ئارام کردنەوەی بارو دۆخەکە بۆ هەڵبژاردنی گشتی لە عێراق دوای ڕاگەیاندنی بڕیاری باری نائاسایی "ئەحکامی عورفی"لە ٢٠٠٤/١١/٧لە لایەن سەرەك وەزیران بۆ ماوەی ٦٠ ڕۆژ تەنیا هەرێمی کوردستان نەبێت.

دوای ئەوە لە ٢٠٠٤/١١/٢٢کۆنگرەی شەرمشێخی میسری ئەنجام درا لە نێوان وەزیرەکانی دەرەوەی وڵاتانی دراوسێی عێراق و چەندین وڵاتی تری جیهانی بە ئامادەبونی کۆفی ئەنان و نوێنەری یەکیەتی ئەوروپاو ئەمریکاو بەریتانیاو فەرەنساو چەندین وڵاتی تر بۆ دۆزینەوەی ڕێگە چارەی بارو دۆخی عێراق لە بوارەکانی ئارامی و ئاسایش و هەڵبژاردن و پاراستنی سنوری عێراق لەگەڵ دراوسێکان و ئاوەدانکردنەوەی عێراق، دوای ئەو هەموو کێشەو ململانێیە ناوچەو هەرێم و جیهان لەبیرو بۆچوون و لێدوان و ڕاگەیاندن لەبوارەکانی ڕامیاری و سەربازی و نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری ئەوەبوو لە ٢٠٠٥/١/٣٠ هەڵبژاردنی گشتی دیموکراتی لەعێراق و کوردستانی لکێندراو بەعێراق ئەنجام درا، بەهەڵبژاردنی کۆمەڵەی نیشتمانیی عێراق کە کورد توانی ٢٥٪ لە کۆی دەنگەکان بەدەست بێنێ و ٧٥ کورسی لە کۆمەڵەی نیشتمانیی عێراقی مسۆگەر بکات، لەهەمان کات هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان و ئەنجومەنی پارێزگاکان و لەهەمان کات ئەنجامدانی ڕاپرسی گشتیی بۆ دواڕۆژی کورد بە جیابوونەوەی لەعێراق کە زیاتر لە ٩٨٪ لەدەنگدەران لەگەڵ ئەوە بوون کە کورد سەربەخۆ بێت.

- عێراق ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە زانکۆی عەرەبی، ئەندامە لە ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی، ئەندامە لە ڕێکخراوی هەڵێنجانی نەوت "ئۆپێك"

# ســـــوریا

- ناوی رەسمی: کۆماری عەرەبی سووریا.
- پایتــەختی: دیمەشــق ژمــارەی دانیــشتوانی ١ر٧٨٠ر٠٠٠ ملیــۆن کەســــە لــــەو ژمــــارە دانیشتوانە ٥٥ر٠٠٠ هەزار کوردە.
- رووبــــەری: ٧١ر٤٩٨ میــل چــوار گۆشــەو ١٨٥ر١٨٠کیلۆمــەتر چــوار گۆشــەیەو لــەو ڕووبەرە ١٧ر٠٠٠ هەزار کیلۆمەتر چوار گۆشە خــاکی کوردســتانە بــە پێــی پــەیمانی لــۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤پێی لکێنراوەلە لایەن هاوپــەیمانان کە ڕۆژئاوای کوردستانە.
- ژمــارەی دانیــشتوانی: ١٥ر٧٩٦ر٠٠٠ملیــۆن کەســـە، لـــەو ژمارەیـــە ٢ر٢٥٠ر٠٠٠ ملیـــۆنی کوردە، بەپێی زانیاری (٢٠٠٣).
- نــژادەکانی: عـــەرەب ٨٢٪ . کـــورد ١٢ر٥٪. رەگەزەکانی تر ٥ر٥٪.
- شارە سەرەکیەکانی: حەلەب، حمس، حەما.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: لازقیە ئــەویش لە سەر دەریای سپی ناوەراستە.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٣ر٥٪
- چڕی دانیشتوانی: ٢٢١ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- ئاینیـــەکانی: ئیـــسلام ٧٥٪ . عەلــەوی ودروزو ئێزیدیو زەردەشتی ١٥٪ مەسیحی ١٠٪.
- زمانەکانی: عەرەبی "زمانی رەسمیە" کوردی، ئەرمەنی.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٨٢٪ .
- دابەشی کارگێری: ١٣ پارێزگایە.
- دراوی: لیرەی سوری یەکسانە بە١٠٠ قرش.
- کۆی دەرئــەنجامی نــاوخۆیی: ١٠٥ر٥٠٠ ملیــار دۆلارە.
- بەشــی تــاك لــە کــۆی دەرئــەنجامی نــاوخۆی: ٦٥٠٠ دۆلارە.
- بـــەرگری: ١٠ر٥٪ لــــە کـــۆی دەرئـــەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٣٢٥ ٠٠٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢٧ر٥٪ لە خاکی وولاتەکە.
- سـامانی ئــاژەڵی: مــەڕ ١٤ر٥٠٠ ملیــۆن ســەر، بــزن١ر٣٠٠ ملیــۆن ســەر، چــێل ٩٧٠ هــەزار سەر، پەرەوەر ٢٥ر٥٠٠ ملیۆن سەر.
- سامانی کشتوکاڵی: گــەنم وجــۆ، پــەمۆ، نیسك، زەیتــــون، میوەجــات، چـــەوەندەری شـــەکر، چەندین جۆری تری بەرهەمی کشتوکاڵی.
- سامانی سروشتی: کرۆم، ئەسفەلەت، ئاسنی خاو، خوێ، فوسفات، نەوت، موگناتیس.
- پیــشەسازی: رســتن وچــنین، ئامــادەکردنی خــۆراك، نــەوت، فۆسفات خۆشــکردنی پێــست، دروســتکردنی جــلو بــەرگ، دروســتکردنی پێڵاو،چاپەمەنی و پەڕ.
- بەرهـــەمی کارەبــا: ٢٢ر٧٠٠ ملیــار کیلــۆ وات کاتژمێر .
- داهــاتی دەرەوەی: کەلوپــەلی خــۆراك، بەرهــەمی کــانزایی، ماشــێنو ئۆتــۆمبێل، ســوتەمەنی، دانەوێڵە.
- دەرچوەکانی: نــەوت، بەرهــەمی رستنو چنین، پــەمۆ، میوەجات، تــەرە بــە هــەموو جۆرەکــانی، گۆشت، پێست، خوری.
- هاوبەشــەکانی بازرگـــانی: وولاتـــانی یـــەکێتی ئـــەوروپا، ئەمـــەریکا، چـــین،یابـــان، وولاتـــانی عەرەبی، ڕوسیا، ئیران، تورکیا، فەرەنسا.
- پارتــە ڕامیاریــەکان: پــارتی بەعــسی عــەرەبی سوشیالــستی کـــە دەســـەلاتدارە، پـــارتی کۆمۆنیست، پارتی دیموکراتی کوردی سوریا، چـــەندین پـــارتو گروپـــی عـــەرەبیو کـــوردیو کۆمەلایــەتیو نیشتمانیو نەتــەوەییو زانستی تیایە.
- ڕژێمـــی دەســـەلات: وولاتێکـــی کۆمـــاری نەتەوەییـــە، یـــەك ئەنجومـــەنی هەیـــە ئـــەویش ئەنجومەنی گەلە کە پارتی بەعسی لە ئاداری

/١٩٦٣ سەركردايەتی دەكا لە رێگەی كودەتای سەربازی تاكو ئێستا، سەرۆك كۆمار خۆیو جێگرەكەی دیاری دەكاو هەروەها سەرۆك وەزیرانو وەزیرەكانی دیاری دەكا واتە دەسەڵاتی تاك رەویە وەك دەسەڵاتی سەدامی لە ناو براو. بەرەی نیشتمانی پێشكەوتوی لەگەڵ پارتی كۆمۆنیست هەیە.

- جوگرافیای سوریا: سنوری سوریا درێژ دەبێتەوە لەلای باكوری رۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەراست. لوبنانو ئیسرائیل دەكەوێتە رۆژئاوای، توركیا دەكەوێتە باكوری، عێراق دەكەوێتە رۆژهەلاتی، ئوردون دەكەوێتە باشوری، زێی فورات كە سەرچاوەی لەباكوری رۆژهەڵاتی ناوچەی كوردستانی لكێنراو بە توركیا هەڵدەقوڵێ بەرەو باشوری رۆژهەڵاتی عێراق دێتە خوارێو لەگەڵ دجلە یەك دەگرێتەوە لە كەنداوی بەناو عەرەبی. زۆر جار كێشەو ململانێ لە نێوان عێراقو سوریا سەری هەڵداوە بە هۆی هاتنە خوارەوەی بە ناو خاكی سوریاو لە هەمان كاتا كێشە لەسەر زێی فوراتی هەیە لە نێوان توركیاو سوریا كە چی لە خاكی كوردستان هەڵدە قوڵێ.
- مێژووی وولات : سوریا وشەیەكی عەرەبی نیە بەلكو وشەیەكی ئاشوریەكانە كە لە وشەی "سریا، سورا، سورایا"هاتوەو وردە وردە بۆتە وشەی سوریا لە دوای جەنگی یەكەمی جیهان بەلام پێش جەنگ ناوچەی شامیان پێ دەگوت ناسراو بوو بەو ناوە تاكو ئێستا كە پێكهاتبوو لە لوبنانو سوریاو ئوردنو هەندێك لەناوچەی فەلەستین كە لە پاشماوەی ئاشوریو كلدانو فارسو قبتیەكان بوونو عەرەب بەرێژەیەكی كەم دانیشتوی ولاتی ئیستای سوریا بوون لە بیابانی "دورگەی عەرەبی" مەرِ لەوەرێنو حوشترەوانەكان "بەدو" بەرەو ئەو ناوچەیە كۆچیان كردوە بە هۆی نەبوونی خواردنگەی ئاژەڵو مەرِو ماڵاتو نەبونی بارانو وشكانی لێی نیشتەجێ بوونە.چونكە وولاتانی شامی

كۆن لە لایەن مسیریەكان كراوەتەوە پێش ١٥٠٠بەر لەزاینو دوایی لە لایەن عبرانیەكان داگیر كراوەو دوای ئەوانیش ئاشوریو كلدانیەكانو فارسەكانو دوایش یۆنانیەكان بە هۆی نەبوونی توركو عەرەب لەو ناوچەیە. لە ماوەی ساڵی ٦٤پێش زاینو تاكو هاتنی ئیسلام بۆ ئەو ناوچەیە لە ٦٣٦ زاینی هەرێمی شام پارچەیەك بوەلە ئیمپراتۆریەتی رۆمانیو چەند ماوەیەكی كورت نەبێت كە بازرگانە عەرەبەكانی دورگەی عەرەبی كردبویانە مەڵبەندی بازرگانی خۆیان. دوای سوریای ئێستا بوە دوو بەشی ژێر دەستەی ئیمپراتۆریەتی مەگۆلەكان لە ساڵی١٢٦٠ زاینی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دوای شەرِی چالدیران لە ساڵی ١٥١٦زاینی سوریا بەولاتێكی توركی مایەوە تاكو جەنگی جیهانی یەكەم. لە ماوەی دەسەڵاتی عوسمانیەكان لەشامو گرنگی دان بەئاینی ئیسلامو پشتگیری عەرەب بەهۆی ئاینی ئیسلام بوە هۆی كۆچ كردنی بە دیان هەزار خێزانی عەرەبە رەوەندەكانو بازرگانەكانو بەدوەكانی دورگەی عەرەبو نیشتەجێ بونیان بە لایەنگیری دەسەڵاتی تورك لە ناوچە جیاجیاكانی وولاتی ئێستای سوریا. ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هۆكارێكی گرنگی سەرەكی بوو بۆ كۆچكردنی عەرەب لەدورگەی عەرەب بۆ ناو سنوری ئێستای سوریاو عێراقو چەندین ناوچە لە رۆژهەڵاتی ناوەراستو پەرەپێدانیانو لەهەمان كات ژن هێنان لە هۆزو تیرە عەرەبەكانو مانەوەی جەندرمەكانی تورك لە نەتەوە جیاجیای پێكهاتەی دەسەڵاتی عوسمانیو بونیان لە ناوچەكەو هەڵبژاردنی نژادی تورك بۆ خۆیان كە ئیستا ناسراون بە نەتەوەی تورك بەلام لە راستیدا ئەو پاشماوەیە تورك نین بەلكو لە كوردو عەرەبو ئاشوریو ئەرمەنو كلدانو نەتەوەی تر پێكهاتوون بەتایبەتی ناوچە گوند نشینەكان بە هۆی دواكەوتوییو

نەبوونی ڕۆژنامەو گۆڤارو ڕادیۆ پارتو ڕێکخراوی وا کە بیتوانیایە نژادەکان لێك جیا بکاتەوە لە ڕەچەڵەکدا . ئەمەش هۆکاری سەرەکی بوون بۆ پەل هاوێشتنی عەرەب بەرەو خاکی کوردستانو ناوچەکانی ترو هەڵاتنیان لەدورگەیەکی وشکانیو بێ بارانیو نەبوونی ژیان تێیدا، سەرەڕای بوونی دەسەڵاتی ئیماراتی کوردی لە ناوچەکە بە تایبەتی ئیماراتی ئێزیدیەکانی سنجارو بە هۆی نەبوونی ئاینی ئیسلام وبوونی ئاینی ئێزیدیو زەردەشتیو مەسیحیو دروست بوونی کێشەی ئاینیو نەتەوەیی لە نێوان کوردە ئێزیدەکانو زەردەشتیەکانوئیسلامی عەرەب.

بە پێی نوسراوی "کزینفۆنی بەناوبانگ بەناوی ئاناباس"لە بارەی مێژووی کورد لە قۆناخی دەوڵەتی دۆستەکیساڵەکانی ٢٨٢ تا ١٠٨٦ کەلە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان دەسەڵاتیان هەبووە بەتایبەتی نیشتەجێی تەواوی ناوچەی کوردی لکێندراو بە سوریای ئێستاو دوای قۆناغی ئیمپراتۆریەتی ئەیوبیەکان کە ئەو دەسەڵاتە نزیکەی ٤٠٠ساڵی خایاندوە ڕۆژئاوای کوردستانی لکێنراو بەسوریا ناوچەیەکی گرنگ بوە لە لایەن ئەوان. کوردستان توشی دابەشکردنوداگیر کردن هاتوە لە ژێر دەسەڵاتی سەلجوقیەکانو مەگۆلەکانوتوشی لەناو بردنی بەکۆمەڵو سوتاندنو وێران کردن بوە لە هەموو لایەنەکانی تائەو کاتەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی جێگەی ئەوانی گرتەوەلە ساڵی ١٩١٦ کە زۆربەی کوردستانی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی تەنیا ئەو بەشە نەبێت کە کەوتە ژێر دەسەڵاتی سەفەوی فارس لەنێوان ساڵەکانی ١٥١٤ تا١٦٩٩ لە کاتی دابەشکردنی دووەمی کوردستان بە پێی ڕێکەوتننامەی پترسبۆرگی١٩١٥ لە نێوان فەرنساو بەریتانیاو ڕوسیاو دوای پەیمانی سایکس بیکۆی ١٩١٦/٥/١٦کوردستان کرا بە چوار پارچەو نیو لەبیرو بۆچوونی نەخشە دارێژراوەکانی هاوپەیمانان، لە سەرەتای سەدەی نۆزدەم بە هۆی بەرز بوونەوەی هەستی نەتەوایەتی بە تایبەتی کێشەی کوردو بزوتنەوەی نەتەوەیی ڕزگاریخوازی لە تەك ڕاست بوونەوەی لە ناوچەی بەلقانو بونیان بە خاوەن دەسەڵاتو خاوەن سنور لە دوای کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم لە١٩١٨/١١/٣٠تەنیا کورد نەبێت، لە پەیمانی سیفەر ١٩٢٠/٨/١٠بە ڕوونیو بەباشی باسی کوردو مافی کورد دەکات لەو بەشەی کە بەر وڵاتی سوریا کەوتبوو لە بەشی ٣ لەبڕگەی ٦٢وخاڵەکانی ٢٧و ١١و٣٢. لەدوای سوریاو لوبنان دەگرێتەوە بە دەرکەوتنی ناوی کوردستانی ڕۆژئاوای لکێنراو بەسوریا لە دوای مۆر کردنی پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤، کورد لە سوریا دانیشتوی کۆنی ئەو وڵاتەن لە شاخو بنارەکانی شارو شارۆچکەکانی حەلەبو حمسوناوچەی عەفرینو کرباتیەو دەشتاییەکانی ئارسور دەریاچەی باسڵو ڕۆژهەڵاتی زێی فورات،سەرەڕای ئەوەش دەسەڵاتە یەك لەدوای یەکەکانی سوریا کوردیان بە کۆچبەر ناو زەندکردوە، بەڵام بە پێی پەرەسەندنەکانو پێشکەوتن لەبوارە هەمە لایەنەکان کەئێستادانیشتوی کوردی سوریا ژمارەیان لە دوو ملیۆن زیاترە ، بەڵام بە هۆی پەرتو بڵاوە پێکردنیان بەسەر شارەکانی سوریا بە تایبەتی دیمەشق کە چڕی دانیشتوانی لە ناوچەی کوردستان بەرچاو نیەو لە هەمان کاتدا زمان ڕۆڵی گرنگی هەیە لەگەڵ جلو بەرگوقەدەغە کردنی زمانو جلوبەرگ وای کردووە کوردی ژێر دەسەڵاتی سوریا دەرخستنی بەخۆوە نەبینی هەتا لە داوو دەزگاکانی ڕژێمی بەعسی سوریاو نەبوونی ناسنامەو ڕەگەزنامەی کوردیو ماوە پێنەدانو سوتاندنو بزرکردنی بەهەزارا تۆمارگای تۆماری کورد، بۆ نمونە "ویورد ستیفن همسای لولفریك"لە پەرتوکەکەی لەلاپەڕە ٣٢١لە ڕاپۆرتی ساڵانەی ساڵی ١٩٣٧نوسیویەتی لەبارەی دابەشی دانیشتوانی

بیابان بەو شێوەیەی خوارەوە کە ٤٢٠٠٠عەرەبی ئیسلام، ٨٥٠٠٠کورد+٣٥٠٠٠کوردی ئێزیدی.

یەکسانەبە ٨٨٥٠٠کورد، ٣١٠٠٠ هەزار مەسیحی کە ئەرمەن‌و ئاشوری‌و کوردی تێدایە،١٠٠٠جولەکە ٠٠٠هتد لەزۆر نوسراوەی تر هەیە کە بەژمارە زیاتر نوسراوە٠٠ ئەمە سەرەڕای ئەوەی دەسەڵاتدارە عەرەبەکان بەهەموو توانا هەوڵی لەناوبردن‌و بزرکردن‌و سوتاندنی بەلگەنامە مێژوییەکانی کوردیان بەلاناوەو وێرانیان کردوە راستیش ئەوە دەسەلمێنێ کە ١٠٠٠گوندی کورد تەنیا لە ناوچەی حەلەب هەبوە پێش سالەکانی ١٩١٥ جگە لە ناوچەکانی تری ڕۆژئاوای کوردستان. بەڵام بە هۆی بەپیت‌و بەرەکەتی ناوچەی کوردستان لە بەرهەمی ژێر خاك وردە وردە کوردەکانی بەلاناوە لە تۆمارو زمان‌و جل‌و بەرگ ڕۆژنامەو ڕێکخراو داب‌و نەریت‌و مێژووی نەتەوەیی شوێنەوارو پەیوەندی لەگەڵ بەشەکانی تری کوردستان.

ناوی کوردو نەتەوەی کورد بە هیچ جۆرێك لە دەستورە شۆفینیەکانی سوریا نەهاتوەو زیاتر لە ڕژێمی بەعسی عێراق کوردی چەوساندۆتەوەو دەربەدەرو پەرت‌و بڵاوی پێکردوەبە لاسایی کردنەوەی دەسەڵاتی ستالینی، جێگەی بە عەرەب پڕ کردۆتەوە. لە سەردەمی ئینتدابی فەرەنسی لە سوریا کورد هەوڵ بێ وچانی داوە لە پێناو مافەکانی لە هەموو لایەنێك بەلگەش لە ١٩٢٨/٦/٢٣ سەرەك عەشیرەت‌و ڕۆشنبیرانی کورد بە ئاراستە کردنی یاداشتێك بۆ دەسەڵاتی فەرەنسا بە بۆنەی بەستنی کۆنگرەی کۆمەلەی دامەزرێنەری سوری کە داوای ڕێگا چارەی ڕزگار بونیان کردووە بە کردنی زمانی کوردی بەڕەسمی لەتەك زمانی عەرەبی لە خوێندنگاو دام‌و دەزگاکانی دەوڵەت. دوای ئەوە بەرپابوونی ڕاپەڕین دژی دەسەڵاتی فەرەنسی لە ساڵی ١٩٣٠کە کورد بەشداری تەواوی کردو فەرەنسا دانی بە سوریا نا بە سەربەخۆیی لە ژێر ئینتیدابی فەرەنسی و بەردەوام بوونی ڕاپەڕینەکان تاکو ساڵی ١٩٣٩، مەندوبی سامی فەرەنسی بڕیاریدا بە ڕاگەیاندنی دەستوری سوریا کە لەو دەستورە بڕگەیەکی دیاریکراوی تێدا تۆمار نەکرابوو لە بارەی نەتەوەکانی سوریا لەوانە گەلی کورد ولە ساڵی١٩٤١فەرەنساو بەریتانیا سوریایان داگیر کردوو حکومەتی ڤیشی فەرەنسی هاوپەیمانی ئەڵمانیا دەسەڵاتی گرتە دەست تاکو کۆتایی هاتنی جەنگی دوەمی جیهان لە ١٩٤٥/٥/٩ . سوریالە ١٩٤٦/٤/١سەربەخۆیی ڕاگەیاند لە دوای کشانەوەی هێزەکانی فەرەنسا. هێزەکانی سوریا بەشداری لە جەنگی عەرەبی ئیسرائیلی کرد لەگەڵ سوپای وڵاتانی عەرەبی لە فەلەستین کە بووە هۆی هەلاتنی گشت سوپای وڵاتانی عەرەب بەرامبەر سوپای ئیسرائیل، داوی ئەوە سوریاو میسر یەکیەتی عەرەبیان پێك هێنا لە ساڵی ١٩٥٨بەڵام سوریا لەو یەککگرتنە دەرچوو لە ١٩٦١/٩/٢١،ئەمەش بەهۆی بەردەوام بوونی ڕامیاریەتی ڕژێمی سوریا بەرامبەر بەکوردو دەزگا سیخوڕیەکانی لە ١٩٦٠/٥/٢١ سینەمای حاموردانی سوتاند کە بەسەدان قوتابی کوردی تێدابوو ئەمەش لەکاتی ڕێپێوان دژی دەسەڵاتی سوریاو پشتگیری کردنیان لە شۆڕشی جەزایر.

سەرەڕای ئەوە کورد بە هەموو شێوەیەك بەشداری لەو گۆڕانکاریانە کردووە لەژێر دەسەڵاتی داگیرکەری سوریاو بەر شاڵاوی هەمە جۆری جینۆسایدو لەناوبردن هاتوە کە لە ١٩٦١/٧/٢٠دەستی کرد بەگرتن لە شارو شارۆچکەو گوندە کوردیەکان کە لە مێژوو بێ وێنە بووە لە دەست نەپاراستن لە بەند کردنی گەورەو بچوك‌و ژن‌و پیاو لەسەر ماڵ‌و سامان‌و دوای ئەوە لە ١٩٦٢/٨/٢٣بەپێی یاسای ژمارە ٩٣کە تێیدا هاتوە کە گەلی کورد دانی پێ نەنراوە لە دەستوری سوریا بە هۆی بەعەرەب کردنی زیاتر لە ٢٦٠هەزار کورد ناویان هەر تۆمار نەکراوە لە تۆمارەکانی ناسنامەی دەزگا تایبەتیەکانیان لە هەمان کات زیاتر لە١٨٠هەزار

کورد ناویان بە تورکی دەرەکی ناوبراون بە تایبەتی لە دوای سەرکەوتنی پارتی بەعسی لە کودەتای سەربازی لە مانگی /١٩٦٣/٣/ کە لابالێکی پارتی بەعسی عێراق بووە بە هەمان شێوەو شێوازو کردەوە مامەلەی لەگەڵ کورد کردوە لە هەموو لایەنێك .

لەگەڵ ئەوەشدا ڕژێمی بەعسی سوریاو عێراق لە هەموو بوارەکان هاوکاری یەکتریان کردوە بە تایبەتی لە پێناو فراوانکردنی سنوری بەعەرەب کردن و گەمارۆدانی هەربزوتنەوەیەك بەتایبەتی بزوتنەوەی رزگاری کورد ئەویش بەبەشداری کردنی هێزی سوپای سوریا بۆ بۆردومان کردنی ناوچەکانی باشوری کوردستان لە ١٩٦٣/٦/٣٠بۆ لێدانی بنکەو بارەگاکانی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول.

هەر دوای ئەوەرژێمی بەعسی سوریاو ڕژێمی بەعسی عێراق لەشاری زاخۆ کۆبونەوەیەکیان لە ١٩٦٣/١٠/٢٢ئەنجامدا بەمەبەستی گەمارۆدان و لەناو بردنی شۆڕشی ئەیلول کە ڕژێمی سوریازیاتر لە ٣٠٠٠هەزار سەربازی بەهەموو جۆرە چەکێك خستە خزمەتی ڕژێمی عێراق بۆ لێدانی بارەگاو بنکەکانی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول. لەهەمان کات پارت و ڕێکخراوە نیشتمانی و دیموکراتی وسۆشیالیستی لە سوریا پشتگیری کوردو مافەکانی و ئێش و ئازارەکانیان نەکردوە بە تایبەتی پارتی کۆمۆنیستی سوریا کە سکرتێری پارتەکە"خالد بەگداش" کورد بوو کە لەراگەیاندنێکی ووتی" یەکیەتی عەرەب بڕبڕەی ڕامیاری کۆمۆنیستەکانە"لەگەڵ ئەوەشدا ناوی کوردو هیچ نەتەوەیەك لە پەیڕەوو پرۆگرامی پارتەکەیان نەبوە کەچی پارتەکەیان لە هەموو نەتەوەکانی سوریا پێکهاتوە .

ڕژێمی سوریا بۆ ڕەشکردنەوەی پێناسەی کوردوبەعەرەب کردنی زیاتر لە ١٠٠٠٠خێزانی کوردی لە تۆمارەکانی دەولەتی سوریا سوتاند بە ناوی ئەوەی کە تۆمارگەکان بزر بوونە.دوای ئەوە ڕژێمی سوریا کەوتە ناو گێژاوی شەڕی ڕۆژانی شەش"ستە حوزیران" لە نێوان عەرەب و ئیسرائیل کە بوە هۆی دوبارە بەزینی سوپاکانی عەرەب و داگیر کردنی ناوچەی جۆلانی سوری تاك و ئێستاش لە لایەن سوپای ئیسرائیل داگیرکراوە سەرەڕای هەول و کۆششی زۆر بۆ گێڕانەوەی ناوچەی جۆلان بۆ ژێر دەسەلاتی سوریا کە ناوچەیەکی ستراتیژیە بۆ سوریاو دوای ئەوە حافز ئەسەد دەستی کرد بە چاکسازی دەزگای حزبی و حکومی لە سوریا، لە سالی ١٩٧١ هەلبژێردرایەوە بە سەرۆك کۆماری سوریاو دوای ئەوە شەڕی نێوان عەرەب و ئیسرائیل لە ١٩٧٣/٧/٣ هەلگیرساو سێ بارە سوپای عەرەب بەزی بەرامبەر بە سوپای ئیسرائیل. لە دوای ئەوە هەولی بەهێز کردنی دەسەلاتی خۆی دا وەك پارتی بەعسی دەسەلاتدار لە عێراق هەلسا بە پێك هێنانی بەرەی نیشتمانی لەگەڵ پارت و ڕێکخراوەکانی سوریا بە تایبەتی پارتی کۆمۆنیست و بەشداری کردنی لەئەنجومەنی گەڵ لە سوریا بەلام چ گۆڕانکاریەك بەرامبەر بەکورد لە ئارادا نەبوو کە بەرچاو بێت سەرەڕای ئەوەی ماوەی بە بوونی هەندێ کاری ڕۆشنبیری و دروستبونی پارت و ڕێکخراوی کوردی نەبێت بەتایبەتی دامەزراندنی پارتی یەکیەتی میللی کوردی لە سوریا لە ١٩٥٧/٨/٥وبەستنی یەکەم کۆنگرەی.

ڕژێمی سوریا لە دوای دۆڕاندنی شەڕی چوارەمی لەگەڵ ئیسرائیل بە پێی ڕێکەوتننامە لە لایەن وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا "هنری کسنجەر"بە گەڕاندنەوەی ئەو زەویەی کە لە شەڕی چوارەم داگیر کرابوو بۆ سوریا بگەڕێتەوە لە سالی١٩٧٤، دوای ئەوە هێزەکانی سوپا کە ژمارەی٣٠٠٠٠هەزار سەرباز بووبە هەموو جۆرە چەکێك چوە ناو خاکی لوبنان کە بوە پارچەیەك لە هێزی ئاشتی پارێز لە لوبنان و کۆتایی هێنان بەشەڕی ناوخۆیی نێوان ئیسلام و مەسیحی کە تاکو ئێستاش سوپای سوریا لە خاکی لوبنان ماوەتەوە سەرەڕای کشانەوەی هێزی عەرەبی تر.

دوای ئەوە دەرچوونی بڕیاری ٥٨٠لە ١٩٧٧/٥/١٨لە لایەن ڕژێمی سوریا بە گۆڕینی ناوی شارو شارۆچکەو گوندو شاخ‌و کانیاوو دەریاچەو ڕوبارو پیشانگاو دوکان لە زمانی کوردییەوە بۆ زمانی عەرەبی دوای ئەوە قەدەغە کردنی زمان‌و جل‌وبەرگ‌و کەلتوری کوردی بە بڕیاری شۆفینیانەی لە ١٩٧٩/١٢/١٤.

سوریا هەولی گۆڕینی جێگەکانی سەربازی بوو لەناوچەی بیقاعی لوبنان‌و سەرەڕای ئەوەش هێزەکانی ئیسرائیل لە مانگی ١٩٨٢/٦/ زۆربەی زۆری خاکی لوبنانی داگیر کرد کە لەو کاتەش شەڕی نێوان ئاینە جیاجیاکانی لوبنان بەردەوام بوو دوای سوریا بووە هێزێکی دەسەڵاتداری ئەو وڵاتە دور لە خواست‌و ویستی زۆربەی زۆری گەلانی لوبنان تەنیا ئەوانە نەبێت کە سەر بەسوریا بوون‌و کارلێکردنی لە بواری ئابوری‌و سەربازی. سوریا دژی شەڕی نێوان عێراق‌و ئێران بوو سەرەڕای لایەنگیری ئێران لە ڕووی مەزهەبی‌و ئاینییەوە پێ خۆش نەبونی بە هۆی یەك نەتەوەیی‌و ئاین‌و مێژوویی لەگەڵ عێراق و لەهەمان کات دژی داگیرکردنی کوێت وەستا لە ١٩٩٠/٨/٢. سەرەڕای ئەو گۆڕانکاریە لە بارو دۆخی ناوچەکە بە هۆی شەڕی نێوان عێراق‌و داگیر کردنی کوێت‌و نە بوونی پەیوەندی لەگەڵ ڕژێمی عێراق‌وکێشەی لەگەڵ ئیسرائیل‌و فەلەستین بەردەوام بوو لە کاری دڕندانەی بەرامبەر بە نەتەوەی کوردو نیشتمانەکەی‌وبڕیار دان بە قەدەغە کردنی زمانی کوردی لە ١٩٨٦/١١/١١ بە هاو خەمی یەکتری لەگەڵ ئەو وڵاتانەی کوردیان پێ لکێنراوە کە لەهەموو لایەنە جۆراو جۆرەکانی کێشەی کورد ئاگاداری یەکتری بوون لە بیرو بۆچونیان‌و داهاتوی کورد کە لە ١٩٩١/٧/٢٠ دەستی کرد بەڕەشبگیری گەلی کورد لە شارو شارۆچکەو گوندەکان‌و ماوە نەدانی کورد هەتا لەکاری دیاری کراو زیاتر لە عەرەب‌و هەولی داوە کورد پەنابەر بێت بەرامبەر بەعەرەب.

دوای ئەوە پەرلەمانی نەمسا بڕیاریدا لە ١٩٩٢/٣/١٠کێشەی کورد بکرێتە بڕگەیەکی چارە نەکراو لە تورکیاو سوریاو عێراق‌و ئێران لە کێشەی ڕامیاری نەتەوەیی‌و پێویستە چارە بکرێت لەسەر بنەمای مەبدەئەکانی مافی چارەی خۆنوسی‌و هەولی تەواوی بۆ بڕەخسێ لە داهاتودا. پەرلەمانی ئەوروپا لە١٩٩٢/٦/١٩لە خولی ئاسایی خۆی بڕیاری‌دا بە تێکۆشانی کوردو کێشەی نەتەوەیی کە لەپلەی یەکەمی بڕیارەکانەو پێویستە بەردەوام بێت بۆ هاوکاری کردنی کوردی عێراق‌و سوریاو ئێران‌و تورکیا بۆ مافی ڕەوای لە داهاتوودا.

کۆبونەوەی وەزیرانی دەرەوەی سوریاو ئێران‌و تورکیا لە ١٩٩٢/١١/١٤لە ئەنکەرەی پایتەختی تورکیا سەبارەت بەکێشەی کوردو دەسەڵاتی لە باشوری کوردستانی لکێنراو بە عێراق پشتگیری کردن لە یەکپارچەیی خاکی عێراق بە هۆی مەترسی کارتێکردنی ناوچە کوردیە لکێنراو بە دەوڵەتەکانی خۆیان‌و گۆڕینی سنوری نێوانیان .هەروەها کۆبونەوەکان بەردەوام بور لە ١٩٩٣/٢/١٠لە ئەنکەرەی پایتەختی تورکیاو لە ١٩٩٤/٦/٢ لە تارانی پایتەختی ئێران . بەرلەوە ڕژێمی سوریا دەستی کرد بە دەرکردنی قوتابیە کوردیەکان لە قوتابخانەکان لەسەر داوای لایەنە ئەمنیەکانی ڕژێمی بەعسی سوریا، سوتاندنی بەندیخانەی حەسەکە لە ١٩٩٣/٣/٢٣ کە بوە هۆی شەهید بوونی زیاتر لە ٤٠ کوردی بەند کراو بە هۆی کوردایەتیانەوە. هەروەها کۆبونەوەی وەزیرەکانی سوریاو تورکیاو ئێران لە ١٩٩٣/٦/٨لە دیمەشقی پایتەختی سوریا . لەو کاتە پەرلەمانی یەکیەتی ئەورپا گەمارۆی چەکی هەمەجۆری لەسەر سوریا هەلگرت لە مانگی ١٩٩٤/١١/ سەرەڕای ڕازی نەبوونی ئیسرائیل.

بە هۆی بارو دۆخی کورد لە سوریا شاندێکی چاودێری مافی مرۆڤ بەشی کاروباری ڕۆژهەڵاتی

ناوەڕاست کە مەڵبەندی لە نیویۆرکەلە٣/١٣ تاکو ١٩٩٥/٥/١٩سەردانی ناوچەی کوردستانی ڕۆژئاوای کردو دەستی کرد بەلێکۆڵینەوەی تەواو لەسەر بارودۆخی نەتەوەی کوردو ژیانو کارو پەیوەندیان بە ڕاپۆرتێکی تێرو تەسەل ئاگاداری دەسەڵاتی سوریاش کرا بەو ڕاپۆرتەی کە ئامادەیان کردبوو، لە٢٣/٩/١٩٩٥ شاندێکی پەرلەمانی ئەڵمانیا بە سەرۆکایەتی "دۆسڵدۆرف"سەردانی سوریای کرد کەلە نوێنەری هەموو پارتەکان پێکهاتبوو چونە ناوچەی کوردەکانو بە هەمان شێوە ڕاپۆرتێکیان ئامادە کرد لە بارەی بارو دۆخو ژیانو کاری نەتەوەی کورد. لە داوی ئەو کارە مرۆڤایەتیەی ئەو شاندانە ڕژێمی سوریا لە بڵاو کراوەیەکی لە ٣١/١٠/١٩٩٥ ڕایگەیاند کە ژمارەی بێگانەکان واتە کورد لە سوریا ٦٧٦٦٨ کەسن، لەمانگی /١٩٩٨/١٢حافز ئەسەد بە سەرۆک کۆمار هەڵبژێردراوە تاکو ساڵی ٢٠٠٥بەڵام بەهۆی مردنی لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٠بەشار ئەسەدی کوڕی جێگەی گرتەوە کە سەرۆک کۆمار لە سوریا بەپێی دەستور جێگرەکەی سەرۆک کۆمار بە سەرەک وەزیران دادەنرێت. دوای مردنی حافز ئەسەد جێگرتنەوەی بەشار ئەسەدی کوڕیو بەردەوام بوونی لەسەر ئامۆژگاری باوکیو شۆڤینیزمەکانی عەرەب کەوتە گیانی کوردەکان کە لە ١٣/٣/٢٠٠٤لەو کاتەی کورد بەرگری لەخۆی دەکرد لە بوونی نەتەوەیی دژی دەسەڵاتی بەشار بوە هۆی شەهید بوونی ٤٠ کورد لە ناوچە جیاجیاکانی ڕۆژئاوای کوردستانی لکێنراو بە سوریاو بە تایبەتی لەشاری قامشلیو زامدار بوونی بە دەیا کەسو بەند کردنی بە سەدان کەسو دەر بەدەر کردنی بە دەیا خێزانی کورد بۆ کوردستانی باشوری لکێنراو بە عێراق کە لە شارەکانی قامشلیو حەلەبو حەسەکەو گوندەکان دەرکرانو دوای ئەوە لە١٠/٦/٢٠٠٤ لە دادگای سەربازی ڕژێمی سوریا (٧٥) کورد درانە دادگا بۆ دادگایی کردنیان لە ئەنجامی ڕوداوەکان کە لەبەندیخانەی "سیدنایا"گوازرانەوە بۆ بەندیخانەیەکی سەربازی لە دیمەشق. سوریا سەرەڕای یارمەتی دانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بە تایبەتی کورد بەپێی خواستو ویستی خۆی بووە نەک لەبەر چاوی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بە تایبەتی کورد"دیزە بەدەرخۆنەیە" چونکە ڕژێمی بەعسی لەسوریا بێ و یالە عێراق یەک بیرو بۆچونو یەک ئامانجو یەک تیئۆریان هەیەو تورکیاو ئێران هاوشانیانن لە کێشەی کوردو مافو داهاتوی کوردو نیشتمانەکەی...چونکە تورکو عەرەبو فارس لە ناوەرۆکا دوژمنی یەکترن بەڵام لەشێوازدا دژی بوونی هەر مافێکی کوردین لەئیستاو لەداهاتوو دژی هەر کارێکی خێرن بۆ کوردو نیشتمانەکەی. چونکە بوونی دەوڵەتی کوردی لە هەر پارچەیەک لەپارچە لکێنراوەکانی ئەو دەوڵەتانە لێک ترازاندنی ئەو دەولەتەو لە بار چوونی تەرازوی هێزیانو داهاتویان لە هەموبوارەکانی ڕامیاریو ئابوریو سەربازیو نەتەوەییو ئاینیو مێژوییو شوێنەوارو شارستانیەتیان، نوێنەری سوریا بەشداری کۆنگرەی شەرمشێخی میسری کردلە ٢٢/١١/٢٠٠٤ سوریا لەهەوڵە نهێنیەکانی بەردەوامە لەهەموو بوارەکان دژی ئەو بارودۆخە نوێیەی کەلەدوای پرۆسەی ئازادکردنی عێراق هاتەکایەوە بەتایبەتی بونی ڕۆڵی کورد لەدەسەڵاتی عێراقو هەرێمی کوردستان.

- سوریا ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان، ئەندامە لە زانکۆی عەرەبی ، ئەندامە لە ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی.

# ئێـــــران

- ناوی رەسمی: کۆماری ئیسلامی ئێران.
- پایتـــــەختی: تـــــاران (ژمـــــارەی دانیـــــشتوانی٠٠٠ر٥٠٠ر٦) ملیـــــۆن کەسەو٠٠٠ر٨٠٠ر١دانیشتوانی تاران کوردە.
- بەندرە سەرەکیەکانی: بەندەر عەباس، عەبادان.
- شـارە سـەرەکیەکانی: ئەسـفەهان، تـەبریز، قوم،وەرمێ، مەهاباد، کرمنشاه، شیراز.
- رووبـەری: ٢٩٣ر٦٣٦ میـل چـوار گۆشـەو ٠٠٠ر٦٤٨ر١ کیلۆمـەتر چـوار گۆشـەیە لـەو رووبەرە ٠٠٠ر١٩٥ هەزار کیلۆمەتر چوار گۆشە خـاکی کـوردە بـە پێـی پـەیمانی لـۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤ لکێنراوە بە ئێران کە رۆژهـەلاتی کوردستانی پێ دەڵێن.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ٠٠٠ر١٥٠ر٧٦ملیـۆن کەســە، لــەو ژمارەیــە ٠٠٠ر٧٣٠ر١٢ ملیـۆن کەسی کوردە کە دەکاتە ٥ر١٦٪ لە دانیشتونی گشتی ئیران بەپێی ئاماری ٢٠٠٠.
- بوژانەوەی دانیشتوانی :١ر٢٪ .
- چـری دانیـشتوانی: ١٢٠ کـەس لـە یـەك میـل چوارگۆشەدا.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٨٥٪.
- نـــژادەکانی : فارســـی ٥٣٪ . کـــورد ٥ر١٦٪ . ئازربیجان ١٨٪، عەرەب ٥٪ .تورك٢٪ .
- زمانەکانی: فارسی (زمـانی رەسمیە)، ئازەری، کـوردی، عـەرەبی، تـورکی، زمانـەکان رەسمـی نینە بەلام قەدەغەش نینە هەرنەتەوەك هەلس و کـەوت بـەزمانی خـۆی دەکـات و لـەڕووی چـاپ ونووسینی لەدوای سالەکانی ١٩٩٠ کە بەرەو باشـی هــەنگاوی دەنــا بەتایبــەتی گرنگــی بەکوردو زمان و داب ونەریت و کەلتوری کوردی دەدرێت.
- ئایینەکانی: ئیسلام کە زۆربەی زۆری شیعەیە، مەسیحی، ئێزیدی، زەردەشتی.
- دابـەش کـارگێری: ٢٥ پارێزگایـە، لەوانە چوار پارێزگـای سـەرەکی کـوردە جگـە لـەوەی کـە چـەندین قـەزاو ناحیـەو گوندی تـری هەیـە کـە لکێنــراوە بــە پارێزگــا فارســیەکان، ٤٩٩ ئەنجومەنی شارەوانی هەیە.
- بەرگری: ١٢٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر٥٢٥هەزار کەسە.
- کــۆی دەرئــەنجامی نــاوخۆیی:٣٠٠ر٧٧٢ر١ ملیار دۆلارە.
- دراوی: ریالــە، لەھــەمان کــات تومــەنی پــێ دەگوترێت.
- بەشـی تـاك لـە کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٧٥٠ر٥ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر١٠٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرھــەمی کارەبــا: ٢٠٠ر٨٥ ملیـــار کیلـــۆ وات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: کروم، خەلوز، نەوت، غازی سروشتی، فۆسفات، ئاسن، بەردی چەوی، زێڕ کە ٨٠٪ بەرھەمی زێڕ لەخاکی کوردستانە.
- سـامانی ئـاژەڵی:مـەڕ٢٠٠ر٥٣ میلـۆن سـەر، چـێڵ و گـامێش ٧٥٠ر٨ ملیـۆن سـەر،بـزن ٥٠٠ر٢٦ملیـۆن سـەر، پـەرەور ٥٠٠ر٢٣٠ ملیۆن سەر .
- بەرھــەمی کـشتوکاڵی: گــەنم و جــۆ، بــرنج، چـەوەندەری شـەکر، پـەمۆ، میوەجـات، تـەڕە، مەنگوین، گوێز، گولەبەڕۆژە .
- پیشەسازی: ھـەڵێنجان و پـاڵاوتنی نـەوت، پترۆ کیمیـاوی، چـیمەنتۆ، دروسـتکردنی شـەکر، ڕســتن و چــنین، دروســـتکردنی مــافور، دروســـتکردنی کەلوپــەلی ھەمــە جــۆری پلاسـتیکی، ھێـزی ئـەتۆمی بـۆ خزمـەتکردنی ئـابوری، خۆشـکردنی پێـست، کەلوپــەل و کەرەستەی بیناسازی، داوو دەرمانی پزیشکی، پەرو چاپەمەنی .
- داھاتی دەرەوەی: ماشێن، کەلوپەلی سەربازی،

کەلوپەلی خواردەمەنی، کیمیاوی، داوودەرمان، کەلوپەلی دروستکراو .

- دەرچوەکانی: نەوت, غازی سروشتی، مافور, خوری، ئاوریشم, کافیار, پێست, چیمەنتۆ, کەلوپەلی بەکار هێنان، پلاستیك, داوودەرمانی پزیشکی, گەلێ بەرهەمی تری بەسوود.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: فەرەنسا، چینی میللی، ڕووسیا, هۆلەندا, ئەڵمانیا, بەریتانیا, تورکیا, ئیتاڵیا, یابان، عێراق بەتایبەتی هەرێمی کوردستان، چەندین وولاتی عەرەبیو ئەفریقی.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی دیموکارتی کوردستان، پارتی تودەی ئیران (کە پارتی کۆمەنیستە) پارتی مجاهدینی ئێران"کە بەرهەلستکارەو لە خاکی عێراقە", ئەو پارتەهاوبەشی رژێمی عێراق بوە لە ئەنجام دانی کیمیا بارانی هەڵەبجەو ئەنفالەکان ویران کردنی کوردستان ، هیچ پارتێك ماوەی کارکردنی پێ نەدراوە بە هۆی ئەوەی هەموو بڕیار بە پێی دەستورەکە لەسەر بنەمایی ئاینی ئیسلامە.٠٠٠!٠٠٠؟٠
- رژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی ئیسلامیە، سەرۆکی بەرزی ڕابەری ئایینی "ئایەتوڵلا علی خامەنائیە", لەدوای روخاندندی رژێمی شاهەنشاهی لە ١٩٧٩/٢/١١ کۆماری ئیسلامی ئێران دامەزرا بەڕابەرایەتی"ئایەتوڵلا خومەینی", لە ١٩٧٩/٣/٢٠ پەسەندیان کرد لە ڕاپرسێکی گەلانی ئیرانو لەمانگی/١٢/١٩٧٩ دەستوری کۆماری ئیسلامی راگەیاندرا, ئەو دەستورە بڕیاری سێ دەسەڵاتەکەی تر دەدات، وەك دەسەڵاتی جێبەجێکردن ودەسەڵاتی یاسادانان ودەسەڵاتی قەزائی، هەریەکەیان لەوانە سەربەخۆیەکی تەواوی خۆی هەیە.

بەلام سەرۆك کۆمار بۆ ماوەی چوار ساڵ هەڵدەبژێردرێت بە پێشنیاری گشتی, ئەنجومەنی پسپۆڕان هەڵدەستێ بە هەڵبژاردنی سەرۆکی ئایینی لەدوای کۆچی دوایی خومەینی لە ١٩٧٩/٧/٣ ئەو ئەنجومەنە "عەلی خامەنائی بەڕابەری ئاینی هەڵبژێردرا" وجێگەی کۆچ کردوی گرتەوە, ئەنجومەنی پسپۆڕان لە لایەن گەلانی ئێران هەڵدەبژێردرێت. ئەنجومەنی راوێژکاری ژمارەی ٢٧٠ ئەندامە کە بە پێشنیاری گشتی لەلایەن گەلانی ئێران هەڵدەبژێردرێن .
محمد خاتەمی لە ساڵی ١٩٩٧ بە سەرۆك کۆمار هەڵبژێردرا دووبارەلە ٢٠٠١/٦/٩ هەڵبژێردرایەوە بەهۆی بوونی جەماوەرێکی زۆر کە٨٥٪دەنگی هێنا بە هۆی گرتنە بەری رامیاریەتی چاکسازی لە ئێرانو لە پەیوەندی نێو دەولەتی.

- جوگرافیایی وولات: ئێران وولاتێکە لە وولاتەکانی رۆژهەلاتی ناوەراستو دەکەوێتە باکووری کەنداو, لەباکوریەوە دەریایی قەزوینە, عێراق وتورکیا دەکەوێتە رۆژئاوای, تورکمەنستان وئەرمینیاو ئازربیجان دەکەوێتە باشووری, ئەفغانستانو پاکستان دەکەوێتە رۆژهەلاتی, بە شێوەیەکی گشتی ئێران لە گردۆلکەو تەپۆلکەی فراوان پێکهاتووە تەنیا هەرێمی کوردستانی لکێنراو بە ئێران نەبێت کە ناوچەیەکی چیاییەو دەشتایەکی بە پیت و بەرەکەتی هەیە، کەشو هەوایەکی گونجاوی هەیە بۆ کشتوکاڵ وناوچەی کوردستان نەوتی زۆری تیایەو لەباشووری چیای بۆرز دەوری داوە, لەرۆژئاواو باشووری چیایی زاگرۆس دەوری داوە, دەشتاییەکی خوێاوی فراوانی هەیەو ناوچەی باکوورو باکووری رۆژئاوای کە کوردستانە دارستانی چڕی تێدایە ولە بواری کشتوکاڵی بوژانەوەی بەرچاوی هەیە.
هەڵکەوتی سنوری وولاتی ئێران ڕۆڵی گرنگی هەیە لە کیشوەری ئاسیا کە دەروازەی نێوان ولاتانی عەرەبیو ئاسیای ناوەندیو بچوك و ئەورۆپا بەیەك دەبەستێتەوەو تاکە دولەتی فارسە لەجیهان توانیویەتی ئەو سنورەلە هەموو ڕووداو گۆڕانکاریە نێو دەولەتیەکانو جەنگە جۆراو جۆرەکان بە تایبەتی جەنگی

یەکەمو دووەمی جیهانی بپارێزێو بونی نەتەوەو نیشتمان بەرز بکاتەوەو لە هەموو بوارەکانی پەیوەندی سەرکەوتن بەدەست بێنێ کە هاو نژادی کوردەو زۆر لە یەك نزیکن لە هەموو بوارەکانی پەرەسەندنو پێشکەوتنو دابو نەریتو کەلتورو مێژوو تەنیا لەرووی ئاینی فارس شیعەو کورد سونەیە، یەکەم نەتەوە بووە کە خاوەنی ئاینی زەردەشتی بوونە لەدوای کورد.

- مێژووی وولات: ئێران وولاتێکی دەولە مەندە بە نەوتو سامانە جۆراو جۆرەکانی سروشتیو کشتوکاڵی بە تایبەتی لە هەرێمی کوردستانوجێگەیەکی جوگرافی گرنگی هەیە لەجیهان بە تایبەتی دەرگایەکی باشوریە بەرامبەر رووسیاو بەربەستەیەکی راگری دەریای هندیە. ئێران تاکو ساڵەکانی ١٩٣٥ ناسراو بووبە وولاتی فارسو لە لایەن عەرەب پێی دەگوترێ عەجەم لە کاتی جەنگا پێی دەلێن "مەجوس" واتە ئاگر پەرست.

وولاتی ئێران دانیشتوانەکەی لە هۆزو تیرە ئاریەکان بوە پێش ٤٠٠٠ساڵ، بەهێزترین هۆز هۆزی میدیا بوە کە بەشی باکوری رۆژئاوای گرتبوە خۆی، فارس لە هەرێمی باشوری ئەو ناوچەیە نیشتە جێ بوونو پێیان دەگوترا فارس ماش چونکە لە بنەرەتا کۆچبەر بوونە یاخود رەوەند لە خاکی فارسۆ کە دەکەوتە باکوری رۆژئاوای ئێرانو میدیەکان دەسەلاتی تەواویان هەبووە لە سەر فارس لە لایەن سەرکردە "سیرۆسی گەورە"پێش ٥٥٨ساڵ بەر لە زاینو دوایی زاڵ بوو بەسەر دەسەلاتی میدیاو شانشینی لیدیاو بابلی دامەزراندو دوایی دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی فارسی و هەموو ئەو ناوچانەی خستە ژێر دەسەلاتی خۆی واتە کورد زیاتر لە ١٥٠ ساڵ پێش فارس دەسەلاتدارو خاوەن زمانو کەلتورو ئاینی زەردەشتی خۆیان بوونە، دوای ئەوە خەلیفەی دووەمی میسر "قەجیز"لە ساڵی ٥٢٥ پێش زاین گەیشتە ئەو ناوچەیەو دوای ئەویش "داریوشی یەکەم" دەسەلاتی خۆی فراوان کردوو گەیشتە رۆژهەلاتی زێی ئەندەلوس لە پاکستانو دوای پردێکی دروستکرد کە زێی نیلی بەستەوە بە دەریای سوور، دوای ئەوە میسریەکان دەسەلاتیان گرتە دەست لە ناوچەی فارس لە ساڵی(٤٤٤) پێش زاین.(( ئەوەش بخەینەوە یاد دەسەلاتە جۆراو جۆرەکانی میسری ئەو کاتە عەرەب نەبوونە بەلکو بابو باپیری قبتیەکانو دانیشتوی کەنارەکانی نیل بونە)).

بە پشتگیری یۆنانیەکانو بوە هۆی لە ناو بردنی ئیمپراتۆریەتی فارسو دوای ئەوانیش ئەسکەندەری مەقدۆنی گەورە توانی بکاتە ناوچەکە کە بە شێوەیەکی نارێكو نالەبار مامەڵەی لەگەڵ گەلانی ناوچەکە دەکردو بەتایبەتی بەرامبەر بەکوردو ئاینەکەیانو سوتاندنی کتابی پیرۆزی ئاڤیستای دەستوری ئاینی زەردەشتی خۆی، دوای هەرەس هێنانی دەسەلاتی ئەسکەندەری مەقدۆنی لە ساڵی ٣٣١پێش زاینو دوای مردنی لە ساڵی ٣٢٣پێش زاین ژەنەرالی مەقدۆنی "سیلۆک"توانی سەرکەوتن بە دەست بێنێ لەسەر کورسی فارسی، دوای کردنەوەی شانشینی بابل کە دەسەلاتی بەرەو فراوانکردن هەنگاوی نا لە زێی ئەندەلوسەوە لە هەمان کاتا سوریاو ئاسیای بچوکی گرتە خۆیو بنەماڵەی سلوکیدیەی دامەزراندو حوکمرانی فارسی کرد تا ئەو کاتەی ئەرسیەکان لەناویان بردن لە سەدەی دوەمی پێش زاین ئەویش بە دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی بەر فراوان لە زێی فورات لە رۆژئاوا تاکو زێی ئەندەلوس لە رۆژهەلاتو دوای ئەوە لە ساڵی٢٢٦زاین لە سەر دەستی شانشین ئەردەشێر شانشینی فارس لە ناو چوون لە شەری هورمزو بنەماڵەی نوێی پێك هێنا بە ناوی بنەماڵەی ساسانی، دەستی کرد بە داگیر کردنی ناوچەکانی دەوراو پشتی کە ناوچەی کوردستان بوو تاکو گەیشتە ئەرمینیاو هند"زوروواشتریان کردە ئاینی

ڕەسمی" دەسەڵاتەکە.

لە ساڵی ٥٣١زاینی کەیسر ئەنۆشیروان دەسەڵاتی گرتە دەستو بەربەرەکانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی کرد کەدەسەڵاتی گەیشتە دەریای ڕەشو چیای قەوقاس وبوە بەهێزترین ئیمپراتۆریەت لەو سەردەمەداو دوای ئەو کوڕەکەی "کیسرای دووەم"دەسەڵاتی گرتە دەست لە ٥٩٠ تا٦٢٨ زاینی.

شەڕ بەردەوام بوو لە نێوان دەسەڵاتی کیسرای دووەمو دەسەڵاتدارانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی کە دەسەڵاتی بەرەو باشوری ڕۆژئاوای ئاسیاو میسر هەنگاوی دەنا بەڵام دەسەڵاتدارانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بە سەرکردایەتی "هرقل" ماوەیان پێنەدان لە بەردەوامی شەڕی نێوانیانو توانیان ئیمپراتۆریەتی فارس گەمارۆ بدەنو بیگەڕێننەوە ناو سنوری بە ناو وڵاتی خۆیان. دوای ئەوە"یەزد گردی"سێیەم دوا شانشینی ساسانیەکان بوو کە دەسەڵاتی گرتە دەست لە ساڵەکانی ٦٣٢ تا ٦٤١ لەو کاتە ئاینی ئیسلام بەرەو وڵاتی ئێران پەرەی دەسەند لە ڕێگەی شەڕی نێوان ئیسلامەکانو فارسەکان بە ناوی فتوحاتی ئیسلامی ودوایی ئیسلام بووە ئاینی ڕەسمی ئێرانو کەوتە ژێر دەستی خەلیفە دەسەڵاتدارەکانی ئیسلامو دوای ئەوە دەسەڵات کەوتە دەست تورکە سەلجوقیەکانو دوای ئەوانیش مەگۆڵەکان بە سەرکردایەتی جەنگیز خانو دوایی تەیموری لەنگو دوای ئەوانیش تورکەکان بە سەرکردایەتی ئیسماعیلی یەکەم کە چوارەم خەلیفەی ڕاشدین بوو ئەوە بوو کە بنەماڵەی سەفەوەی دامەزراند تاکو ساڵی ١٧٣٦ دەسەڵاتدار بوو. لە سەردەمی شائیسماعیل کێشەو ململانێ لەگەڵ تورکیای عوسمانی بەردەوام بوو لەگەڵ ئەوەشدا کورد بەر لەو مێژوە توانیویەتی بەرگری لە بونی خۆی بکات دوای هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی میدیا، "بەڵام بۆ مێژوو بڵێین تیرەو هۆزەکانی فارسو سەرکردەکانی توانیویانە لەسەرەتای بونیانەوە یەکگرتو بن تاکو ئیستا بەیەک پارچەیی خاکو نەتەوەو بیرو بۆ چون لە پێناو نەتەوەو نیشتمانەکەیانو فراوان کردنی سنوری جوگرافیان لەسەر خاکی کورد بە هۆی یەک نەبوونی بیرو بۆچونی کورد بەپەرتو بڵاوی هۆزو تیرە جۆراو جۆرەکانو پاراستنی بەرژەوەندی بنەماڵەکانیانو دەسەڵاتیان لەسەر بەرژەوەندی گشتی کورد بوو تاکو ئێستا...!...؟."

بەدەیان بەڵگەی جیاواز هەن لەسەر کوردو یەک نەبوونی کە دوای ئەمانی دەسەڵاتی گەورەو بەهێزو فراوانی سەرکردەکانی میری کورد خاوەنی دەسەڵاتی جیاجیای خۆیان بوونە لە ناو سنوری نیشتمانەکە لە ئیماراتی جۆراو جۆر وەک ئیماراتی مەلین لە دیار بەکرو ئیماراتی ئێزیدیەکان لە سنجارو زازا لەدەرسیمو خالدین لە دەریای ڕەشو موکریانیو هەرێمی خوراسانو ئیماراتی بەدلیسو ئیماراتی پاشای کۆرەو میری سۆران لەڕواندزو چەندین سەرۆک تیرەی تری خاوەن دەسەڵات لە نیشتمانێکی فراوان بە هۆی یەک نەبوون نەیان توانیوە وڵاتێکی یەکگرتوی سەربەخۆ پێک بێنن بە هۆی خواستو ویستی تایبەتیو دەوڵەمەندیو پاراستنی دەسەڵاتی تایبەتی کە بۆتە مایەی ملکەچیو ڕازی بوونی هەموو کارو کردەوەکانی دوژمنانی کوردو خاکی کوردستان سەرەڕای پەیوەندی دۆستایەتیو دژایەتیان لە نێوان هەمبوە بەبەردەوامی تاکو شەڕی چالدیران لە ١٥١٤/٨/٢٣دوای ئەویش ئەو ئیمارەتانە ڕویان لە توانەوەو نەمان کردوە بە هۆی ڕازی بوونیان بە ژێر دەستەیی چ ئیمپراتۆریەتی فارسی سەفەوی چ ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو کێشەو ململانێی نێوانیان، لەو کاتە گۆڕین لە بارودۆخی نوێی ناوچەکەو بەهێز بوونو فراوان بوونی دەسەڵاتی شاعەباسی سەفەوی کە بوە هۆی داگیر کردنی بەغدا لە ١٦٢٤/٦/١٤ بە تایبەتی مۆرکردنی پەیمانی زەهاو "لە قەسر شیرینی کورد"لە ١٦٣٩/٥/٢٠کە بەیەکەم دابەشکردنی کوردستان دادەنرێت،

"پێویسته کورد بەراوردی نێوان کوردو فارس بکات هۆکاره سەرەکیەکان چین کە کورد نەیتوانیوه تاکو ئێستا ببێتە خاوەن دەوڵەتی خۆی ،وەك کورد خۆی دەڵێت (جارەکت فێڵ لێکردم خوا بت گرێ دو جارت فێڵ لێکردم خوا بت گرێت، بەڵام جاری سێیەم خوا خۆمان بگرێ)"•••؟•••!•••

سەرەرای دابەش کردنی کوردستان لە رامیاریەتی ناوچەو جیهان بە تایبەتی لەلایەن فەرەنساو ئیمپراتوریەتی ڕووسی و بەریتانیاو ئەڵمانیاو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارسی وچەندین وڵاتی تری ناوچەکە ئەو بارو دۆخەو هەڵگیرسانی شەڕی نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارسی لە ١٧٢٣/١٠/٢٤لە ناوچەی لەیلانی سەر بە پارێزگای کەرکوك کە دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی . هەر دوای رێکەوتننامەی نێوان ڕووسیاو تورکیا لە نێوان ساڵەکانی ١٦٨٨تا١٧٤٧ئەویش بۆ لێدانی دەسەلاتی فارسی بوو بەڵام نادر شا توانی سوپایەکی فارسی بەهێز دروست بکاتو وڵاتی فارسی پێ ڕزگار بکات لەگەڵ بەشە کوردستانەکەی ژێردەسەلاتی خۆی لە جەنگی ڕووسیاو تورك؛ ساڵی ١٧٩٧شادەسەلاتی گرتە دەستو دوایی بەریتانیا دەسەلاتی فارسی ناچار کرد کەلە ئەفغانستان بچێتە دەرێو دان بنێ بە سەربەخۆیی ئەفغانستان. دوبارە مۆرکردنی ڕێکەتننامەی نێوان فارسو تورك لە ١٨٤٧/٥/١٩لە ئەرزەڕۆم کە بوە هۆی دانی هەندێ ناوچەی کوردستانی ژێر دەسەلاتی فارسو جێهێشتنی بۆ ژێر دەسەلاتی تورکو لەهەمان کات دەسەلاتی بەریتانیا زیاتر بوو لەسەر کاروباری بازرگانیو دارایی فارسو بەر لەوەش مۆر کردنی ڕێکەوتننامەی نێوان ئێرانو ڕوسیا بەناوی "ئاشتی تورکمان چای"لە ١٨٢٨/٢/١٠کە ئەرمەنستان ببێتە پارچەیەك لە خاکی ڕووسیای قەیسەری کە دەکەوتە سەر سنوری کوردستان لە ناوچەکانی قرباخو نەخچەوان، لە دوای ئەو کێشەو ململانێیەی نێوان وڵاتانی ناوچەکەو گەمارۆدانی بزوتنەوەی کەسایەتیە ناودارەکانی کوردکە شێخ عوبێدللا نیازی پێك هێنانی حکومەتێکی کوردی هەبوو لە دوای ڕزگار کردنی چەندین ناوچە لە ١٨٨٠/٩/٣٠و بەردەوام بون لە گەمارۆدانی کوردو داگیر کردنی نیشتمانەکەی، شای ئێران داوای لەبەریتانیا کرد لە١٨٨٠/١٠/١١کە زۆر لە تورکەکان بکات بۆ ئەوەی لەدژی کوردە ڕاپەڕیوەکان بکەوێتە کار ئەمەش لەڕێگای بالوێزی بەریتانیا لە ئێران جێبەجێ کرا کە ناوی "تومز"بوو لە هەمان کات ڕووسەکان بەوە ئەسازان کە لە دژی کورد یارمەتی ئێران بدەن ئەوەشیان سەلماند لە ڕێگەی بالوێزەکەیان لە١٨٨٠/١٠/١٨لە تورکیا بە هاندانی دەسەلاتی تورك بۆ بەشداری شەڕ دژی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو دوای ئەوە لە ١٨٨٠/١١/٢٢هێزەکانی ئیمپراتۆریەتی فارس بە هەموو توانایەك پەلاماری جەماوەری شاری ورمێو دەوروبەری دا بە سوتاندنو وێران کردن لە شارو شارۆچکەکانو گوندەکان کە بوە هۆی شەهید کردنو زامدارکردنی بەسەدا هاووڵاتیو دەربەدەرکردنیان ئەمەش بەپێی بەلگەنامەکانی بالوێزی ئێران لە ١٨٨٠/١١/٢٨کە زیاتر لە٢٠٠٠گوندیان سوتاند لەگەڵ دەربەدەر کردنی زیاتر لە ٧٠هەزار کەس لە شارەکانی سابلاغو ورمێو هەکاری کە بەرەو باکورو باشوری کوردستان کۆچیان پێکردن ئەو کارەش نزیکەی چوار مانگی خایاند.

دوای ماوەیەك لە هەوڵدانو بیرکردنەوە لەنێوان ئیمپراتۆریەتی فارسو قەیسەری ڕووسیو عوسمانی توانیان پەیمانی گولستان لە ١٨١٢/١٠/١٢مۆر بکەن کە جێگری شای ئێران عەباسی سەفەوی سەرۆکی سوپای فارس لە هەموو داواکانی خۆی خۆش بوو لە وڵایەتەکانی قەفقاسو جۆرجیاو شێروانو قەرەباخو تالش کە خرایە ژێر دەسەلاتی عوسمانیو ڕووس کە زۆرترین خاکی کوردستانی بەر کەوتبوو،

دەسەڵاتدارانی فارس هەر وەك جاران بیریان لەداگیر كردنو وێرانكردنو بەفارس كردنی كوردو نیشتمانەكەی دەكردەوەو بەردەوام بوو، لە١٨٩٢/٥/١١پەلاماری هێزەكانی میری ڕواندزی داو هێزەكانی سۆرانیش هێرشیان كردەسەر ناوچەكانی لاهیجانو مهابادو هێزەكانی فارس پاشەكشەی پێكرا. دوای ئەوە مۆركردنی ڕێكەوتننامەی نێوان ڕووسیاو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ١٨٧٨/١/٣١ئەویش لەدوای كۆتایی هاتنی شەڕی نێوانیانو یارمەتی دانی شای ئێران بۆ لێدانی شۆڕشەكانی كورد ، مۆر كردنی ڕێكەوتننامەی "سان ستیفانۆ" لە ١٨٧٨/٥/٣لە نێوان ڕووسیاو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی كە بووە هۆی سودمەندی بۆ ئەرمەنەكانو بە زیانی كورد گەڕایەوە كە كەوتبونە ژێر دەسەڵاتی ئێران.

بەهۆی ئەو بارو دۆخەی ناوچەكەو ناو دەسەڵاتی فارسو دەسەڵاتدارانی بەریتانیا توانی توانای خۆی زیاتر بەسەر ناوچەكە بەهێز بكات بەتایبەتی ناوچە نەوتیە كوردیەكان كە لەكوردستانو لەوانە قەسری شیرینو خانەقینوكەركوكو كەندیناوەو دەورو بەرەكانی تر لەناوچەی كوردستانو زیاتر لە ٦٠ ساڵ بەروبومی ئەو ناوچانەی بۆ خۆی مسۆگەر كردبوو. سەرەڕای ئەوەش بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی لە ئێران ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو بەهێز تر هەنگاوی دەنادژی داگیركەری بەریتانی هەرچەندە دەسەڵاتی ئێرانیش داگیر كەری خاكی كوردستان بوو. لە سەرەتای سەدەی بیستەم لە ساڵی ١٩٠٦دەستوری نوێی ئێران دانراو ئەویش لەلایەن شا مزەفەرەدین بە پێك هێنانی كۆمەڵەی نیشتمانی كە ئەو كۆمەڵە دەستوری نوێی بڕیاردا. بەر لە هەڵگیرسانی جەنگی یەكەمی جیهان لە ١٩١٤/٨/٣مۆركردنی ڕێكەوتننامەی نێوان توركیاو ئێران لە ١٩١١/١٠/٣١بۆ چارەسەر كردنی كێشەی سنوری نێوانیان كە كەوتۆتە سەر خاكی كوردستانی لكێنراو بە هەردوو دەوڵەت، هەرچەندە ئێران بێ لایەنی خۆی لە جەنگی یەكەمی جیهان ڕاگەیاند بەڵام خاكی ئێران بە تایبەتی زۆربەی خاكی كوردستان گۆڕەپانی شەڕی نێوان وولاتانی هاو پەیمانو ڕووسیا بوو، دوای ئەوە شەڕی نێوان شۆڕشگێڕە كوردەكانو سوپای ئێران لە ١٩١٩/١/٢١هەڵگیرسا لە شاری خویو دەورو بەری شارۆچكەی سەلماس لە ئەنجام كوردەكان سەركەوتنو لە هەمان كات شای ئێران ڕێكەوتننامەی پێدانی دەسەڵاتی زیاتر بە بەریتانیا دا لە كارو باری ناوەوەی ئێران بەڵام كۆمەڵەی نیشتمانی ئێران ئەو ڕێكەوتنەی ڕەتكردەوە.

لەگەڵ ئەو بارو دۆخەی كوردو نیشتمانی كوردو خەمخۆرەكانی بەردەوام بونە لەپەرە پێدانی ڕۆشنبیری كوردو بەرز كردنەوەی هۆشی نەتەوە ئەویش بەكردنەوەی قوتابخانەی كوردی لە ١٩١٣/١/٤لە شاری خوی لە لایەن عبدالرزاق بدرخان بە زمانی كوردی كە كاردانەوەیەكی باشی نواند لە ناوچەو كوردستان، دوای هێزەكانی عوسمانی لە ١٩١٥/١/١٣هێرشی كردە سەر ناوچەی ڕۆژهەڵاتی كوردستان تا شاری تەورێز داگیری كرد بە هاوكاری دەسەڵاتی ئێران بۆ گەمارۆی جموجوڵی شۆڕشگێڕانی كورد. لە دوای ئەوە یەكەم كۆنگرەی مێژوویی لە ١٩١٧/٧/١٣بەسترا كە سێ ڕۆژی خایاند بە بەشدار بوونی سەركردە كوردەكانونوێنەری ئێرانو بەریتانیاو ڕووسو لە ١٩١٧/٧/١٧دوبارە لەئەنجامی هەوڵەكانی "زانریچنكۆ" نزیكەی ٢٠٠٠كورد بەشداری لە كۆنگرەكە كرد بە ئامادەبوونی نوێنەری ئێرانو ڕووسیاو بەریتانیا بۆ چارەسەر كردنی كێشەو مافەكانی كوردو داهاتوی لە ناوچەكە بەڵام ئەو هەوڵانە تەنیا وەك بەڵگە لەلاپەڕەی تۆمارگەكان خۆیان پاراستوە٠٠لەو كاتەش ڕووسیا پێویستیان بە كوردو توانای كورد هەبوو بۆ كردنە بازنەی دەستی خۆیان دژی دەسەڵاتی ئێرانو لە ١٩١٧/٩/٤بە سەرپەرشتی "زاخار جفكۆ بارانۆف" كۆنفرانسێك ئەنجام درا لە شاری سنەی

ڕۆژ هەڵاتی کوردستان کە٢٧ سەرۆکی کورد ئامادەی بوون ئەویش بە ڕاگەیاندنی بەڵێن لە لایەن ڕووسەکان بۆ چارەسەری کێشەو مافەکانی کورد.

دوای کشانەوەی هێزەکانی بەریتانیا لە ئێران یەك لەئەفسەرەکانی سوپای ئێران کە ناوی "ڕەزا بەهلەوی"بوو داوای سەربەخۆیی کردو بووە وەزیری جەنگی و لەو کاتە سمکۆی شکاك لە ١٩٢١/١٠/٦هێرشی کردە سەر شاری مەهابادو ڕزگاری کرد کە لەو کاتە ٥٥٠ پۆلیسی ئێرانی تیا بوو لەوانە ٢٠٠ پۆلیسیان کوژران . بەر لەوە هێزەکانی تورکیا شاری مەهابادی داگیر کردبوو، لەسالی ١٩٢٣ڕەزا بەهلەوی بوە سەرەك وەزیران و دوای دوو ساڵ بوە شای ئێران لە ئەنجامی کۆبونەوەی کۆمەلەی نیشتمانی و کەوتە بەهێز کردنی دەسەلات لەسەر ئێران و بەتایبەتی هەرێمی کوردستانی لکێنراو بە ئێران و بەخواست و ویستی خۆی مامەڵەی لەگەڵ گەلی کورد دەکرد. مۆر کردنی ڕێکەوتننامەی دۆستایەتی لە نێوان ئێران و دەسەلاتی تورك لە ١٩٢٦/٤/٢٢ بە یارمەتی بالوێزی بەریتانیا "سیرپرس مۆرن"لە ئێران بەرامبەر دژایەتی کردنی جمو جۆلی کورد لە ڕاپەڕینەکانی سمکۆی شکاك .ڕەزاشا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەسەلاتی خۆی بەهێز دەکردو کاری خزمەتگوزاری ئەنجام دەدا لە ئێران بە ڕەزامەندی دادگای تایبەت و گواستنەوەو گەیاندن و ڕێگاوبان، دەسەلاتی شای ئێران و دارو دەستەکەی بە تایبەتی لابالی سیخوڕی لە ١٩٣٠/٦/٢١سمکۆی شکاکیان تیرۆر کرد لە ڕۆژهەلاتی کوردستان بە هۆی خۆ ڕاگری و ئازایەتی و بەرگری کردن لە کوردو نیشتمانەکەی دژی دەسەلاتی شاو پێوەندەکانی . دوای ئەوە ڕێکوتننامەی هاوکاری لەگەڵ تورکیا لە ١٩٣٢/١/٢٢ مۆر کرد بۆ گەمارۆ دانی شۆڕشەکانی ئارارات و چیای ئاراراتی بچوکی دا بە تورکیا بۆ ئەوەی هێرش کردنە سەر ئاراراتی گەورە ئاسانتر بێت بە هۆی بەردەوام بوونی ڕاپەڕینەکان لە لایەن ئیحسان نوری پاشا دژی هەردوو دەسەلات بە تایبەتی ڕژێمی تۆرانی تورکیا، ئێران تاکو ١٩٣٥/٣/٢١پێی دەگوترا وولاتی فارس بەلام لە ئەنجامی بڕیارێك لە کۆمەڵەی نیشتمانی ناوی گۆڕا بۆ وولاتی ئێران و وولاتی فارس لە ڕێو ڕەسمەکان لابرا لە نوسین و تۆمارەکان و لەمامەڵەی پەیوەندی ناوەوەو دەرەوەی وولات.

دەسەلاتی ئێران بە ڕابەرایەتی محمد ڕەزاشا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەولی بەهێز کردنی دەسەلاتەکەی دەدا چ لە ناوەوەی وولاتەکەو چ لە پەیوەندی ناوچەو هەرێم و جیهان ئەویش بەمۆر کردنی پەیمانی سەعد ئاباد لە ١٩٣٧/٧/٨لە نێوان ئێران و عێراق و تورکیا و ئەفغانستان کە ئەمەش تەواو کەری پەیمانەکانی سایکس بیکۆو لۆزان بوو چونکە لەسەر هەمان ڕێباز بوو بۆ چەوساندنەوەو ماوە نەدان بە کورد بۆ بونی هەر نیازێك بە تایبەتی پێك هێنانی دەولەتی کوردی و لێدانی بە پێی ئەو پەیمانە بە هاوکاری هاوپەیمانانیان بە پشتگیری ئەمەریکاو بەریتانیا لە هەمان کات چاو دێری کردن لە جموجۆلی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو بە هۆی یارمەتی دانی بزوتنەوەی نیشتمانی و نەتەوەیی لە جیهان.

هەر لەدوای ئەوە ڕێکەوتننامەی نێوان ئێران و شانشینی عێراق لە ١٩٣٧/٧/١٨ مۆر کرا بۆ گەمارۆدانی جمو جۆلی شۆڕشگێڕە کوردەکان لە باشوری کوردستان و سنوری نێوان عێراق و ئێران. دوای ئەوە هێزەکانی ڕووسیاو بەریتانیا لە ١٩٤١/٨/٢٥چونە ناو خاکی ڕۆژهەلاتی کوردستان وەك داگیر کەر مانەوە لەهەمان کات ڕەزا شای ئێرانیان لە سەر کورسی شایەتی هێنا خواری و محمد ڕەزا شای کوڕیان لە جێی دانا ...بە هۆی بارو دۆخی نوێی نێودەولەتی و بەردەوام بوونی جەنگی جیهانی دووەم ژێر دەستەیی خاکی کوردستان شاندێکی گەورەی کورد لە ڕۆژهەلاتی کوردستان لە ١٩٤١/١١/٢٥سەردانی شاری باکۆی یەکێتی

سۆڤیەتی پێشوویان کرد کە پێشەوا قازی محمد لەگەڵ شاندەکە بوو لەبارەی بارو دۆخی کوردو کێشەکەو ناوچەو هەرێمو جیهانو داهاتوی کورد کرد. هەر لە ناوەندی جەنگی جیهانی دووەم گۆڕینی بارو دۆخەکانی نێو دەوڵەتیو دروست بوونی قۆناخی نوێی نێو جیهانو بەرز بوونەوەی ڕۆلی ئەمەریکا لە گۆڕەپانی نێو دەوڵەتیو پەرەسەندنی ڕامیاریەتی جیهانگەری هەمەلایەنو ڕوخانی ڕژێمی فاشی ئەڵمانیا بوە هۆی دروست بوونی بارو دۆخێکی نوێی سەرهەڵدانو بە هێز بوونی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەییو نیشتمانی بەتایبەتی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو شۆڕشەکانی بارزان لە باشووری کوردستانو شۆڕشی قازی محمد لەڕۆژهەڵاتی کوردستان بووەنامانجێکی نەگۆڕ لەمافەکانی کوردو پەیوەندی نێوان کوردو یەکیەتی سۆڤیەت دوای جەنگو دەست پێکردنی شەڕی ساردئەوانە هەمووی ببونە چەندین هۆکار بەتایبەتی پەیوەندی نێوان ئێرانو یەکیەتی سۆڤیەتو تورکیا، بەرز کردنەوەی ئاڵای کوردستان لە ١٩٤٥/١٢/١٧لە لایەن شۆڕشگێرانی کورد لە ڕۆژهەلاتی کوردستان بەڕابەرایەتی قازی محەمەدو بەرپابوونی شۆڕشو دامەزراندنی کۆماری کوردستان لەمەهابادلە١٩٤٦/١/٢٢لە گۆڕەپانی چوار چرا بە یارمەتیو هاوکاری یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوودامەزراندنی حکومەتی کورد لەبوارە جیاجیاکانو کاردانەوەی گرنگی ئەو کۆمارە لە کوردستانو ناوچەو جیهانو بوونی مەترسی بۆسەر دەسەڵاتی شای ئێرانو تورکیاو عێراقو سوریا بەهۆی بارو دۆخی نوێ بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد.

بەرپابونی شەڕی ئارارات لە ناوچەکانی سەقز دژی سوپای ئێران لە ١٩٤٦/٤/٢٩ولەگەڵ ئەوە سوپای سوری سۆڤیەت بڕیاری کشانەوەی دا لە خاکی ئێران لە ١٩٤٦/٣/٢٢لە ماوەی ٤٥ ڕۆژداو لە هەمان سات دامەزراندنی کۆمپانیای نەوتی تێکەڵاو لە نێوان ئێرانو سۆڤیەت کە ئەمەش ڕێگە خۆشکەر بوو بۆ پەلاماردانی کۆماری کوردستان . لەگەڵ ئەوەشدا شەڕو پێکدادان بەردەوام بوو لە نێوان هێزەکانی ڕژێمی شاو شۆڕشگێرە کوردەکان، لەو کاتە مۆرکردنی ڕێکەوتننامە لە نێوان کۆماری کوردستانو کۆماری ئازربایجان لە ١٩٤٦/٤/٢٣لە ژێر چاودێری ڕووسەکان، دوای ئەوە پەخشکردنی ڕادیۆی دەنگی کۆماری کوردستان لەشاری مهاباد لە١٩٤٦/٥/١٠.

بەهۆی ئەو بارو دۆخەو مەترسی دەسەڵاتی ئێران بۆسەر ڕژێمەکەیو کاردانەوەی بۆ سەر وڵاتانی دروستکراو لەسەر خاکی کوردستانو هاوکاری کردنی یەکتریو پشتگیری یەکیەتی سۆڤیەت بۆ ئێرانو ئامۆژگاری ئەمەریکاو بەریتانیاو گونجانی بارو دۆخ بۆ دەسەڵاتی ئێران ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی هێزەکانی سوپای ئێران بەرەو لەناو بردنی کۆماری ئازربایجانیداو لەئەنجام لە ١٩٤٦/١٢/٧پەلامار دراو بۆ ماوەی چوار ڕۆژ ئەو کۆمارە لە ناو براو لە ١٩٤٦/١٢/١١ دوای ئەویش کۆماری کورستان پەلامار درا لە ١٩٤٦/١٢/١٧ئەم بارو دۆخە بووە هۆی هەلگیرسانی شەڕ لە نێوان شۆڕشگێرانی کوردو سوپای ئێران لە ١٩٤٧/٣/٢٤ بەهۆی پەلاماردانی کۆماری کوردستانو دژواری بارو دۆخەکە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانو دەستگیر کردنی پێشەوا قازی محەمەدو هەڤاڵانیو دادگایی کردنی کارتۆنی لە١٩٤٧/٣/٢٩لە لایەن دادگای تایبەتی ئێرانو بڕیاری لە سێدارە دانی قازی وهەڤاڵەکانیدا لە ١٩٤٧/٣/٣١لە گۆڕەپانی چوار چرا جێبەجێ کرا ٠٠٠؟ بەر لەوەش هەر بەهۆی بەردەوامی ڕاپەڕینەکانی کورد لە ١٩٤٧/٣/١٨شەڕی بەرەی شنۆو نەغەدە هەلگیرسا دژی هێزەکنی سوپای ئێران. دوای لەناوبردنی کۆماری کوردستانو ئازربایجان سەرکەوتنی ڕژێمی شای ئێران ڕێکەوتننامەی نەوت لەنێوان ئێرانو یەکیەتی سۆڤیەت لە ١٩٤٧/١٠/٢٣مۆر کرا کە ئەو کۆمپانیایە لە ١٩٤٧/٣/٢٣دامەزرابوو،

دوای ئەو بارو دۆخەو گۆڕانی بارو دۆخ لەناو ڕژێمی دەسەڵاتی ئێران لە دوای پەنجاکان بە چاکسازی داموو دەزگاکان کە چەندین گۆڕانکاری لەدەسەڵاتە جۆراو جۆرەکانی شایەتیو ئەنجامدانی خۆپیشاندانی جەماوەری ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە شاری مەهابادو شارۆچکەکانی دەورو بەری، لە ١٩٥٣/٦/١٢ دژی ڕامیاریەتی شاو دوای ئەوە لە مانگی /١٩٥٣/٨شا(زاهدی)بە سەرۆك وەزیران دامەزرا بۆ پەلاماردانی بزوتنەوەی ڕزگاری کورد، هەر لە دوای ئەوە مۆرکردنی ڕێکەوتنی نێوان ڕژێمی ئێرانو ڕژێمی تورکیا لە ١٩٦٣/٨/١٢بۆ گەمارۆدانی شۆڕشە یەك لە دوای یەکەکانی کورد بەتایبەتی شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١/٩/١١لە باشوری کوردستان کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژبەرەو بەهێز بوون هەنگاوی دەناو کاردانەوەی باشی دەنواند لە سەر هەموو کوردستانو ناوچەو جیهان بەدروست بوونی بارو دۆخی نوێی عێراق لە دوای کودەتای ١٩٦٣/٢/٨ودروست بوونی مەترسی بۆ سەر دەسەڵاتەکانیان.

دوای کودەتای بەعسیەکان لە ١٧- ٣٠ تەموز١٩٦٨گۆڕینی بارودۆخی عێراقو بە هێز بوونی شۆڕشی ئەیلولو گۆڕینی ڕامیاریەتی بەعسیەکانی عێراق بەرامبەر ناوخۆو جیهانو وەرگێڕانی پەیوەندیەکان بەرەو یەکیەتی سۆڤیەتو لە باری بارو دۆخێکی گونجاو مۆر کردنی ڕێکەوتننامەی ١٩٧٠/٣/١١لە نێوان سەرکردایەتی ڕژێمی عێراقو سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لە باشوری کوردستان بە سەرکردایەتی بارزانی و هەنگاونان بەرەو پێشەوەو بەهێز کردنی پەیوەندی لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەتو مۆر کردنی بەرەی نیشتمانی لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی عێراقو خۆماڵی کردنی نەوت. . . بەرژەوەندیەکانی بەریتانیاو ئەمەریکائەمانە هەمووی بوونە هۆکاری پاشەکشە کردن لە خاڵەکانی ڕێکەوتنامەی ١١ئازاری ١٩٧٠و ڕانەگەیاندنی مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد لەکاتی خۆیی‌ودروست بوونی کێشەو ململانێ لە نێوان دەسەڵاتی ڕژێمی عێراقو سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول ئەمە لەلایەكو لەلایەکی تر هەوڵو کۆششی نهێنی لەنێوان دەسەڵاتی عێراقو ئێران بە پێناوی هەواری بۆمیدیانی سەرۆکی جەزائیر بە ئامۆژگاری ئەمەریکاو بەریتانیا توانرا ڕێکەوتننامەی جەزائیر لە ١٩٧٥/٣/٦مۆربکرێت لە نێوان سەدام حسێنو محمد ڕەزا شای ئێران کە بووە هۆی نسکۆ پێ هێنانی شۆڕشی ئەیلولو بەردەوام بوونیان لە جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامەکەیان کە هەردوو وەزیری دەرەوە سەعدون حەمادیو عەباس گلنەەت لە ١٩٧٥/٣/١٥کۆبونەوە لەژێر چاودێری وەزیری دەرەوەی جەزائیر عبدالعزیز بۆتەفلیقە بۆ پیادە کردنی ڕێکەوتننامەکەی جەزائیر کەبووە هۆی توانەوەی شۆڕشو ئاوارە بوونی دەیا هەزار خێزانی کورد بەرەو ئێران کەچی ئێران ئەو کارەساتەی بۆ گەلی کورد ئەنجام دا.

سەرەڕای ئەوە دەسەڵاتی شا لە داموو دەزگاکانی سیخوڕیو کارگێڕی وەك تورکیاو سوریا نەبوو بەرامبەر بە کورد کە کورد لەئێران بوونی خۆی هەبووە لە ڕۆژنامەو پەخشی ڕادیۆ، هەرچەندە بۆ جێبەجێکردنو بڵاوکردنەوەی ڕامیاریەتی شا بوو، بەڵام ڕاستیەك هەیە دەبێ بیڵێین کەکاردانەوەی باشی هەبوو بۆ زمانو کەلتورو دابو نەریتو مێژووی کورد .

بە هۆی هەستی ئاینیو دوورە وڵاتی خومەینی لە ئێرانو مانەوەی چەندین ساڵ لە عێراقو دوایی لە فەرەنساو دروستکردنی پارتی ئاینی لە ئێرانو بەردەوام بوونی جموجوڵو بەهێز بوونی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ وەك شاڵاوێکی جەماوەریو ڕامیاری کاریگەری نواندە سەر دەسەڵاتی شای ئێرانو بەرەو هەردێری دەبرد، سەرەڕای ئەوە ڕژێمی شا چەندین گۆڕانکاری ئەنجام دا لە داموو دەزگاکانی بەڵام بێ سود بوو بە هۆی لێك ترازانی دەسەڵاتی شاو شاڵاوی لایەنگرانی خومەینیو دامەزراندنی شەمبور

بەختیار بە سەرۆك وەزیران لە ١٩٧٨/١٢/٢٩ كە بەرھەلستكار بوو بەلام ئەو كارەی سەری نەگرت، لە ١٩٧٩/١/١٦محمد ڕەزا شا بەناچاری ئێرانی جێھێشتو بەرەو وولاتی میسر بەڕێكەوت لە كاتی پشودا دەسەلاتی دا بەدەست ئەنجومەنی وەزیران، لە ١٩٧٩/٢/١ .

شۆڕشی ئیسلای ئێران بەرپابوو بە دامەزراندنی كۆماری ئیسلامی ئێران لە ١٩٧٩/٢/١١. دوای سەركەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێرانو دامەزراندنی دامو دەزگا جۆراو جۆرەكانی لە١٩٧٩/٤/١ لەسەر شێوازی كۆماری ئیسلامی ئێرانی نوێ بەرەو باشترو چاوەڕوانكردنی بە ڕژێمێكی دیموكراتیو چارەسەركردنی كێشە بنەڕەتیەكان بە تایبەتی كێشەی كورد بەلام ڕامیاریەتی دەسەلاتی نوێی ئیسلامی ئێران بەرامبەر بە كورد باشتر نەبوو بەلكو بەرەو زیاتر ھەولی گەمارۆی كێشەی كوردی دا بەناوی ئەوەی دەسەلاتی ئێران ئیسلامیەو لە ئاینیش مافی نەتەوەیی نیە بەلكو ھەموی لەژێر چەتری ئاینی ئیسلام بە ناوی "ئومەی ئیسلامی" بۆ نمونەش ھێزەكانی سوپای ئیسلامی ئێران لە ١٩٧٩/٤/٢١پەلاماری ناوچەی نەغەدەی دا بۆ یارمەتی دانی توركەكانو بوە ھۆی دەربەدەر بوونی سەدان كەسو گرتنو كوشتنو بریندار بوونی دەیا كەس.

لە ھەلبژاردنەكانی نوێنەرانی ئەنجومەنی ئێران لە ١٩٨٠/٣/١٤ لە ڕۆژھەلاتی كوردستان كورد بە گشتی بەشداری ئەو ھەلبژاردنەی كرد كە پارتی دیموكراتی كوردستان سەرپەرشتی كردو لە ٧٥٪ تا ٩٧٪ دەنگەكانی بەدەست ھێناو دوای ئەوە لە ١٩٨٠/٦/٥دەسەلاتی ئیسلامی ئێران ھێرشێكی بەرفراوانی كردە سەرناوچەكانی ڕۆژھەلاتی كوردستان بە خواستو ویستی خۆی مەرامەكانی جێبەجێ كرد، دوای ئەوە لە ١٩٨٠/٩/٢ئەنجام دانی قەسابخانەی گوندی قارنە كە بووە ھۆی شەھید بوونی ٦٨ كوردو گرتنو دەربەدەركردنی بە سەدان خێزان . لە ١٩٨٠/٩/٢٢ ھەلگیرسانی شەڕی كەنداوی یەكەم لە نێوان عێراقو ئێران كە ڕژێمی عێراق دەست پێشخەری ھەلگیرسانی شەڕەكە بوو بۆ ماوەی ھەشت سال لە وێران كردنی ژێرخانی ئابوریو كوژرانو زامدار كردنی بە سەدا ھەزار كەس كە كوردیش لەو شەڕە توشی ھەمان كارەسات بوو بە تایبەتی لە لایەنی عێراق كە بوە ھۆی كیمیا بارانی شاری ھەلەبجەو ئەنفالو سوتاندنو وێران كردنی زیاتر لە ٤٥٠٠ گوندو سوتاندنی دارستانەكانو كانیاو پردو شەقامەكان.

شەڕی ھەشت سالەی نێوان عێراقو ئێران كە لە ١٩٨٨/٨/٨كۆتایی پێ ھێنرا ئەوێش بە گەڕانەوە بۆ ھەمان ڕێكەوتننامەی جەزائیری ١٩٧٥/٣/٦ لە دوای گەڕانەوەی دەسەلاتی عێراق بۆ ناوچە كوردیەكان لە باشوری كوردستان لە دوای ئازاد كردنی شارو شارۆچكەكانی باشوری كوردستان زیاتر لە نیو ملیۆن خێزانی كورد ڕووی لە ئێران كردوو زۆر بەڕێكی وەرگیران لە لایەن دەسەلاتی كۆماری ئیسلامی ئێران. دوای دروست بوونی بارو دۆخی نوێی عێراق، لە ١٩٩٢/١١/١٤ وەزیرەكانی دەرەوەی ئێرانو توركیاو سوریا لە ئەنقەرەی پایتەختی توركیا كۆبونەوە بۆ تاوتۆ كردنی بارو دۆخی نوێی عێراقو بە تایبەتی بارو دۆخی ھەرێمی كوردستان. دوای ئەوە لە ١٩٩٣/٥/١٢ڕژێمی بە ناو ئیسلامی ئێران نزیكەی ١٠٠ ھەزار سەربازو ٥٠٠ تانكی لەسەر سنوری باشوری كوردستان مۆل دا لە ناوچەكانی پێنجوێنو قەلادزێ وەك داگیر كەر، ھەروەھا لە ١٩٩٣/٦/٨دوبارە كۆبونەوەی وەزیرەكانی دەرەوەی ئیرانو توركیاو سوریا لەدیمەشقی پایتەختی سوریا ئەنجام درا لە بارەی بارو دۆخی عێراقو بەتایبەتی دەسەلاتی كوردی لە باشوری كوردستانی لكێنراو بە عێراق وەھەروەھا كۆبونەوەی نێوان وەزیرەكانی دەرەوەی ئێرانو توركیا و سوریا لە دیمەشقی پایتەختی سوریا لە ١٩٩٤/٨/٢١ئەنجام درا بۆ ھەمان مەبەست.

ڕژێمی ئیسلامی ئێران لە ۱۹۹٦/۷/۲۹بەهێزی سوپای کە بە ۲۰۰۰سەربازو ۲۰۰ ماشێن وفڕۆکە هێرشی کردە سەر سەربازگەی سەلامی نزیک شاری سلێمانی بۆ لێدانی بنکەو بارەگاو خێزانەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی ڕۆژهەڵات لە پەنامەندەی باشووری کوردستان بۆ ماوەی دوو ڕۆژمانەوەو لە ۱۹۹٦/۷/۳۰ کشانەوە لە دوای ئەنجام دانی نەخشەکەیان لەو کاتەش شەڕی خۆ کوژی لە نێوان پارتی و یەکیەتی بەردەوام بوو لە پێناو دەسەڵاتیان نەك لە پێناوی کوردو داهاتوی کورد کە هەمووی بە زیانی کورد دەگەڕاوە. دوای ئەوە چوونی سەرۆك ڕەفجەنجانی بۆ تورکیا لە ۱۹۹٦/۱۲/۱۹وکۆبونەوەی لەگەڵ لێپرسراوانی تورکیا کە کێشەی کوردو دەسەڵاتی کوردو باشووری کوردستان و کوردو کوردستان یەکەم خاڵی گفتوگۆیەکانیان بوو.

لەهەلبژاردنەکانی ۱۹۹۷/٥/۲۲ محمد خاتەمی بە سەرۆك کۆمار هەلبژێردراو دوای کێشەو ململانێی نێوان دەسەڵاتی ئێران و قوتابیان ڕوویدا کە داوای گۆڕینی ڕژێمی پارێزگاران بۆ ڕژێمی دیموکراتی،لەو بارو دۆخەی ئێران لە ململانێی نێوان دوو بیرو بۆچونی چاکسازی و پارێزگاری دوبارە محمد خاتەمی لە هەلبژاردنەکانی۲۰۰۱/٦/۹هەلبژێردرایەوە بە سەرۆك کۆماری ئێران، بەڵام هیچ گۆڕانکاری لە ڕامیاریەتی خاتەمی و دەسەڵاتی ئێران نە کرا بەرامبەر بە کوردو کێشە نەتەوایەتیەکەی تەنیا ئەوە نەبێت کە گروپی کوردی بوونی هەیە لە پەرلەمانی ئێران و پەخشی تەلەفزیۆن و ڕادیۆ ئەویش لە چەند کاتژمێرێکی دیاری کراو، پەیوەندی نێوان کوردی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان بەردەوامە سەرەڕای کێشەی ڕامیاری و بیرو بۆچوون و هەلوێست نەبێت لە بارەی بزوتنەوەی کوردو داهاتوی کوردستان. بەردەوامی پەیوەندی لەنێوان حکومەتی ئیسلامی ئێران و حکومەتی هەرێمی کوردستان بە هەردوو کارگێڕیەکەی بەرەو باش هەنگاو دەنێ لە بوارەکانی بازرگانی و ئابوری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی و زمان و مێژوو ئاهەنگەکان.

بەردەوامی ئێران شان بەشانی وولاتانی تورکیاو سوریاو عێراق بۆ دروستکردنی بەربەست لە ڕێگەی مافی گشتی کوردو بەردەوام بوونی لە کۆبونەوە هاوبەشەکانیان کە دوا کۆبونەوەیان لە ۲۱/ ۷/۲۰۰٤ ئەنجام درا لە نێوان تورکیاو ئێران وئوردن و سعودیەو کوێت لە قاهرەی پایتەختی میسربە سەرپەرشتی وەزیری دەرەوەی میسرو بەشداری وەزیری دەرەوەی عێراق کە خاڵی سەرەکی ئەوە بوو بە پاراستنی یەك پارچەیی خاکی عێراق و کوردو ناوچەو هەرێمەکەو لە۲۰۰٤/۸/۲۰ محمد خاتەمی داوای لە سەرکردایەتی کۆنگرەی ئیسلامی کرد بۆ کۆبونەوەی بەپەلە لە بارەی بارو دۆخی عێراق بەتایبەتی لەشارەکانی باشوری عێراق و شاری نەجەف و هەرێمی کوردستان بەڵام داواکەی جێبەجێ نەکرا، نوێنەری ئێران بەشداری لە کۆنگرەی شەرم شێخی میسری کرد لە ۲۰۰٤/۱۱/۲۲.

- ئێران ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان ، ئەندامە لە ڕێکخراوی بەرهەم هێنانی نەوت "ئۆپێك"ئەندامە لە ڕێکخراوی
- کۆنگرەی ئیسلامی.

# تـوركـيـا

- ناوی رەسمی: کۆماری تورکیا.
- پایتەختی: ئەنکەرە، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٢٥٠ر٣ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: ئەستەمبۆل (٠٠٠ر٥٠٠ر٣ ملیۆن کەسەو لەو ژمارە٠٠٠ر٥٠٠ر٢ ملیۆن کەسی کوردە، ئەزمیر، ئەدەنە، پۆرسە، دیاربکر، وان).
- بەندەرەسەرکیەکانی: مارسین، ئەزمیر، ئەستەمبۆل، ئەسکەندەرۆنەکە شارێکی کوردیەو تاکە رێگای دەریایی رۆژئاوای کوردستانی داگیر کراوە.
- رووبەری: ٩٤٦ر٣٠٠ میل چوار گۆشە لەوە ٩١٢١ میل چوار گۆشەی کەوتۆتە کیشوەری ئەورووپاو ٤٥٠ر٧٧٩ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە ولەو خاکە ٠٠٠ر٢١٢ هەزار کیلۆمەتر چوار گۆشە خاکی کوردستانە کە بەپێی پەیمانی لۆزان وسایکس بیکۆ پێی لکێنراوە.
- ژمارەی دانیشتوانی:٠٠٠ر١٥٠ر٦٦ ملیۆن کەسە لەو ژمارەیە٠٠٠ر٨٤٠ر٢٠ ملیۆن کەسی کوردە، بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- چڕی دانیشتوانی: ٢٢٠ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- نژادەکانی: تورك ٤٨٪ . کورد ٥ر٣١٪ . نژادو رەگەزەکانی تری ١٨٪. واتە رێژەی کورد زیاترە لەتورك.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر٢٪
- ئایینەکانی: ئیسلام ٩٥٪ . ئایینەکانی تری ٥٪ کە پێکهاتوە لەمەسیحی و ئێزیدی و زەردەشتی.
- زمانەکانی: تورکی (زمانی رەسمیە) کوردی (زمانی کوردی قەغەیە، عەرەبی،چەندین زمانی تری تێدایە.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٨٥٪.
- دابەشی کارگێری: ٧٥ پارێزگایەو لەوانە ٢٤ پارێزگای کوردیەوداگیر کراوە.
- بەرگری: ١٨٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی:٢٠٠ر٢٨٨ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٢٠٠ دۆلارە.
- دراوی: لیرە
- زەوی کوشتوکاڵی: ٣٥٪لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنمو جۆ، پەمۆ، خوێ، میوەجات، چەوەندەری شەکر، زەیتون، هەنگوین،گوێز،تەرە، چەندین جۆری تر لە بەرهەمی کشتوکاڵی،ئەمەش لە٦٠٪ بەرهەمی کشتوکاڵی لەناوچەی کوردستانە.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ٢٧٠ر٢٣ملیۆن سەر، بزن ٤٥٠ر٨ ملیۆن سەر، پەرەور٥٠٠ر٦٦ ملیۆن سەر، چێل٢٥٠ر١١ملیۆن سەر، گامێش ١٥٠ هەزار سەر،٦٥٪ سامانی ئاژەڵ لەناوچەی کوردستانە.
- بەرهەمی کارەبا: ٥٠٠ر٩٩ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- پیشەسازی: دروستکردنی خۆراك، پولا، هەڵێنجان لە کانزاکان، رستن وچنین،جلو بەرگ،ئامادەکردنی گۆشت.
- داهاتی دەرەوەی: نەوتی خاو، ماشێن، ئۆتۆمبێل، سوتەمەنی، پەیینی کیمیاوی، دانەوێڵە.
- دەرچوەکانی: بەرهەمی کشتوکاڵی، بەرهەمی رستن وچنین، پێست، شوشەوات، گۆشت،

جلو بەرگ ،داوو دەرمان.

- سامانی سروشتی:ئەنیمۆنیا، نەوت، کرۆم، جیوە، نوحاس، خەلوز، کبریت، ئەمانەش هەموی لەخاکی بەپیتی کوردستان بەرهەم دەهێنرێت.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ڕوسیا، یابان، ئێران، ئیتالیا ،عێراق، بەریتانیا، ئەمەریکا، چین، ئەلمانیا، فەرەنسا.
- رژێمی دەسەلات: کۆمارێکی سەربازی بەناو دیموکراتیە، سەرۆک کۆمار بۆ ماوەی حەوت ساڵ هەڵدەبژێردرێت، ناتوانێ خۆی بۆ جاری دووەم هەڵبژێردرێت، دەسەلاتی جێبەجێکردن لە دەست سەرۆك وەزیرانە لەگەڵ ئەنجومەنی وەزیران، سەرەك کۆمار دەتوانێ رەخنە لەو یاسایانە بگرێت کە لە پەرلەمان دەردەچێت.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی نیشتمانی دایك، ئیسلامی نیشتمانی، پارتی راست رەوی ناوەند، پارتی راست کردنەوەی ڕێگا، راست رەوی ناوەندی کە لایەنگری رۆژئاوایی دەکات، پارتی کۆماری گەل، چەپڕەوی ناوەند، پارتی داد پەروەری وبوژانەوە کە ئێستاخاوەن دەسەلاتە، پارتی کۆمۆنیسی تورکیا، پارتی دیموکراتی گەل، چەندین گروپ و پارتی تری نیشتمانی و نەتەوەیی و رامیاری تری تێدایە ، چەندین پارتی کوردی وگروپی تری کوردی هەیە بەلام بەم شێوەیە ماوەیان پێنەدراوە، پارتی کرێکارانی کوردستان کە دژی تورکیا شۆرشی لە ١٩٨٥ دەست پێکردوەو سەرۆکەکەی عەبدوللا ئۆجەلان لە بەندیخانەیە.
- جوگرافایی وولات: تورکیا کەوتۆتە ئاسیای بچوك و چەند لایەنێکی خاکی ئەوروپای گرتۆتەوە لە کێشوەری ئەوروپا، دەکەوێتە لای باکووری رۆژهەلاتی دەریای سپی ناوەراست،لە باشووری رۆژهەلاتی ئەوروپا، لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست درێژ دەبێتەوە لە باشوور، کەوتۆتە سەر دەریای رەش لە باکوور، لە رۆژئاوای دەریایی ئیجەیە، لەرۆژئاوای بولگاریاو یۆنانە، لەباکووری ڕوسیا وئۆکرانیایە لەسەر دەریای رەش، لە رۆژهەلات جۆرجیاو ئازربایجان و ئێران وئەرمینیایە، لە باشووری سوریا وعێراقە، ئەو خاکەی بەر ئەوروپا کەوتووە گەروەکانی بۆسفۆرو دەریایی مەرمەرەو دردەنیلە کە بەشی ئاسیا جیای دەکاتەوە، ئەو گەروانە دەریای رەش ودەریای سپی بەیەك دەبەستێتەوە کە درێژیەکەی نزیکەی ٢٠ میل دەبێت، لە ساڵی ١٩٧٣ پردی لەسەر دروستکراوە، بەلام گەرووی دەردەنیل و دەریای مەرمەرەو دەریایی ئیجە بەیەك دەبەستێتەوە کە ئەمەش بۆتە رێگایەکی ئاوی درێژ لە دەریای رەش بۆ دەریای سپی ناوەراست، گەروی بۆرسفور گرنگیەکی ستراتیژی هەیە کە کەشتی وپاپۆرەکانی ڕوسیا دەیانگاتێ بۆبەرەو دەریای سپی و کەناڵی سوێس، درێژی گەروی دەردەنێل نزیکەی ٤٥ میل دەبێت.

بەشی ئەوروپای تورکیا هەرێمی تریسی رۆژهەلات دەکەوێتە رۆژئاوا لە یونان، بەلام بەشی ئاسیا ئەویش ئەنازۆلە. بەدرێژایی سنوری باشورو باشووری رۆژهەلات و رۆژئاوای خاکی کوردستانەو پێی لکێندراوە بەپێی پەیمانی لۆزان کە لە ١٩٢٣/٧/٢٤ مۆرکرا لەلایەن هاوپەیمانان لە دوای جەنگی یەکەمی جیهان ودابەشکردنی کوردستان بەسەر ئەو وولاتانەی کە بریاری دامەزراندنی وولاتیان بۆ دەرچوو ئەویش تورکیاو ئێران و عێراق و سوریاو هەندێکی کەنزیکەی١٢٠٠٠هەزار کیلۆمەتر دەبێت بەر کۆماری ئەرمینیا کەوتوە ئەویش پارێزگای یەریڤان و دەوروبەریەتی، تورکیا کەش و هەوایەکی گونجاوی هەیە ولاتێکی کەشت و گوزاریە بەتایبەتی هەرێمی کوردستان.

بەفرو بارانی زۆری لێ دەبارێ زستانی ساردو هاوینی فێنکە. بەهۆی کەناری دەریایی و دوو زێی سەرەکی دیجلەو فورات کە لەخاکی کوردستان هەڵدەقوڵێ لەگەڵ چەندین زێ و ڕوباری ترو دەریاچە بەتایبەتی دەریاچەی وان، زۆربەی خاکی ئێستای تورکیا شاخاویە ئەویش کەوتۆتە هەرێمی کوردستان و دەشتاییەکی زۆر بەپیت و بەرەکەتی هەیە. لە کوردستانی لکێندراو بەتورکیا چیای بەرز هەیە کە بەرزترینیان چیای ئاراراتە کەشتیەکەی پێغەمبەر نوح لەو ناوچە ئاسەواری هەیە شوێنەوارناسەکان تاکو ئێستاش بەدوایا دەگەڕێن، لە خاکی کوردستان چەندین شوێنەوار هەیە.

- مێژووی وڵات: دانیشتوانە جیاجیای نژادەکانی کۆن و ئێستای تورکیا کە پێکهاتوبوون لە چەندین نەتەوەی جیاجیا لەوانە گەلی کوردو لیدانیەکان و حتیین و فرجینەکان کە بەکاری کشتوکاڵی خەریك بوون و بەردەوام بوون لە پێك هێنانی شارستانیەت و شوێنەواری گرنگ و یەکگرتنەوەی لەگەڵ شارستانیەتی یۆنانی کۆنی ئەغریقی.

لە سەدەی یەکی پێش زاین ئاسیای بچوك بووە پارچەیەك لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دوای خاوەندیەتی ئەو ئیمپراتۆریەتە گواستراوە بۆ ئیپراتۆریەتی بیزەنتیەکان، لەو کاتە تورك بەهیچ جۆرێك بوونی نەبوو باسی لێوە نەدەکرا تاکو سەدەی شەشەمی زاینی ئەویش بەسەرهەڵدانی لەناوچەی وڵاتانی مەنگۆلیا لەناوەندی ئاسیاودەستیان کرد بەتورك کردنی کەسانی هەژارو دەربەدەری وڵاتانی دراوسێی ژێردەسلاتی ئیمپراتۆیەتە یەك لەدوای یەکەکان ئەمەش بەهۆی شەڕو ململانێی نێوانیان و دەربەدەر بوونی نەتەوە جیاجیاکان و دوابەدوای ئەوە ڕوویان لە هەرێمی تورکستان کردو ئاینی ئیسلامیان کردە ڕابەرو پۆشنبیری خۆیان و بەکارهێنانی بۆ خۆ ناساندنیان بە گەلاتی تر بە بەشداری کردن لە فتوحاتی ئیسلامی و فراوان کردنی دەسەلات و چەسپاندنی نژادی تورك... واتە پێکهاتەی تورك لە ئەنجامی دەربەدەری نەتەوەو گەلانی تری هەژار بوەو تاکو ئێستاش لەهەموو ناوچەو نوسینەکان ناوزەندن بەتۆرانی واتە نەتەوەیەکی بێ دایك و باوك ژێر نەتەوەن لە بەر ئەوە تورك یاخود تۆرانی نە خاوەنی مێژوو نە خاوەنی شارستانیەت و شوێنەوارو نە خاوەنی زمان و کەلتورو دابونەریت نەبوونە، ئەوەی هەیەتی لەڕێگەی دزین یەکی خستوە نمونەش ئەوەیە کە لەدوای ڕاگەیاندنی کۆماری تورکیا و هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی پیت و ووشەو ڕستەیان پیك هێنا لە سەر پیت و وشەی لاتینی و پیت و وشەو ڕستەی خۆیان نیە.ئەمەش لە نەتەوە جیاجیاکانی کێشوەرەکە بەتایبەتی کوردو ئەرمەن و کەلتورو داب و نەریتی عەرەب و فارس بوەچونکە بەهێزترین چەك بەدەستی تورك ئاینی ئیسلام بووەو زانیویەتی چۆنی بەکار بێنێ بۆ خزمەت و بوون و چەسپاندنی خۆی بەپێك هێنانی نژادی نەتەوەییان.

لە ساڵی ١٠٥٥ تورکە سەلجوقیەکان شاری بەغدایان داگیر کرد، بائەوەش لەیاد نەکەین کە ناوی مێژوویی ناونراوی هەرێمی درێژ بوەوەی ناوەندی ئاسیا لە دەریای قەزوین دەست پێدەکات بەرەو بیابانی مەنگۆلیا کە ئەمڕۆ کازاخستان و کیرغیسیا و تاجکستان و تورکستان و ئۆزبەگستان و ئۆکستای چینی میللی و پارچەیەك لەباکوری ڕۆژهەلاتی ئەفغانستان دەگرێتەوە.

لە دوای داگیر کردنی شاری بەغدا لە لایەن "تـوگرۆڵ" ونـاوی خـۆی نابـەناز نـاوی "سولتان".لەساڵی ١٠٧١جەنگی نێوان منزیکۆت کە تورکەکانی لەبیابانی مەنگۆلیا بوون و لە سەدەی پانزەم بەرەو سنوری هند بەڕێ کەوتن بۆ دامەزراندنی خاوەندیەتی زەوی تاکو کەنارەکانی دەریای سپی. دوای ئەوە چەندین ئیماراتی بچوکی دژ بە یەکتریان پێك هێنا کە لاواز ترینیان

سەلیبیەکان‌و مەگۆل بوون. بەڵام ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە سەرەتای پێکهاتەکەی توانی ئەو ئیمارەتانە بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی‌و بەیەک بوونی تورک بەهێز بکات کە بۆ یەکەم جار لە سەدەی سیانزەهەم دەرکەوتن لە ناوچەی ئەنازۆل لە سالی ١٢٩٩زاینی، لە ساڵی ١٣٨٩جەنگی نێوان تورک‌و کۆسۆڤۆ بەرپا بوو لە ئەنجامی سەرە ڕۆیی هێزەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌و توانی بەسەر ناوچەکە زاڵ بێت‌و زۆربەی زۆری ناوچەی بەلقان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، لەساڵی ١٤٥٣ توانیان شاری قوستەنتینە داگیر بکەن کە پایتەختی ئئمپراتۆریەتی بیزەنتی بوو دوایی بووە پایتەختی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌و ناوی گۆڕا بوە ئەستەمبۆڵ.

لە دوای ئەوە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی توانی دەسەڵاتی خۆی فراوان بکات بە سەرکردایەتی سوڵتان سلێمان بەرەو میسرو سوریاو نیمچە بیابانی عەرەبی هەنگاو بنێ‌و خاکی ئێستای عێراق‌و تەرابلوس‌و قوبرس‌وزۆربەی خاکی مەجەر داگیر بکات. لەگەڵ ئەوەشدا تۆرانیەکان وەك لە پێشەوە باسمان کرد توشی هەست‌و خواستێکی شێتانە ببوون بۆ تەواو کردنی پێکهاتەی بوونی نەتەوەی تورک‌و هەڵبژاردنی ئاینی ئیسلام بۆ جێبەجێ کردنی خواستەکانیان‌و چاو لە فتوحاتی ئیسلامی بکەنەوە کە بوە هۆی فراوان کردنی سنوری جوگرافی عەرەب .تورك بیری لە هەموو کاری داگیرکردن‌و فراوان کردنی سنوری‌و چەسپاندنی بونی خۆی دەکردەەر لەبەر ئەو هۆیانە درێخی• نەدەکرد بۆ پەلاماردانی گەلانی ناوچەکەو هەرێمەکان بەتایبەتی گەلی کوردو نیشتمانەکەی بە ئەنفالکردنی گەنجی کوردوتالانکردنی خۆراکیان‌و ناچارکرنیان بۆ بە تورك بونیان بە هەموو شێوەیەك هەر ئەوەش بوە هۆی هەلگیرساندنی شەڕی چاڵدیران لە١٥١٤/٨/٢٣لە نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌و سەفەویەکانی فارس کە بە یەکەم دابەش کردنی کوردستان دێت لە نێوان ئێران‌و تورك ئەوەش بەپشتگیری کوردە خۆفرۆشەکانی هاوپەیمانی تورك لەلایەك‌و فارس لەلایەکی ترو وەلانانی چارەسەری داهاتوی کوردو نیشتمانەکەی. لە دوای ئەو بارو دۆخەش مۆرکردنی پەیمانی نێوان میرنشینە کوردەکان‌و سولتان سەلیمی تورك لە ١٥١٥/٨/٩ بە یارمەتی مەلا ئیدریسی بەدلیسی کە هەستیان بەوە نەکرد کە تورکەکان جێگەی بڕوانین لە بەڵێن دانیان‌و هەر ئەوە بوو دوای ١٥ساڵلەو ڕێکەوتنە پەشیمان بوونەوە ٠٠٠بۆ نمونە مێژوو نوس‌و سەرکردەی یۆنانی "زینەفۆن"لە ساڵی ١٤٠٢گوتویەتی "ئەغریقیەکان کاتێك بە نێو وڵاتی کوردان تێپەڕ بوون ڕووبەڕووی شەڕێکی دژوار بوون کە لەو شەڕانە سەخت تر بوو کە دوچاری فارس بوو هەر چەندە بەسەریا دا زاڵ بون".

ئێمە باش دەزانین مێژوی کورد پڕە لە کارەسات‌و مەرگەسات‌و وێران کردن‌و دەر بەدەری‌و بە تورك‌و فارس‌و عەرەب کردن، سەرەڕای ئەوە سەرکردەکانی کورد لە سەرەتای سەرهەڵدانی بزوتنەوەی ڕزگایخوازی کوردبەر لە ٧٠٠ ساڵ پێش زاین هەردەم نەیان توانییە خواست‌و ریستی کورد بەئامانج بگەیەنن بە هۆی جیاوازی بیرو بۆچونی جەمارەرو شەقامی کوردی لەگەڵ بیرو بۆ چونی سەرکردەکانی.

دەسەڵاتی تورك هەموو جۆرە ڕێگایەکی پێش کارەکانی پاك دەکردەوە لە پێناو سەرکەوتن‌و بەردەوام بوونی لە پێناو گەمارۆ دانی هەر کارێکی شۆڕشگێڕی، ئەوەبوو لە ١٦٠٨/١/٥شەڕی قەڵای دمدمی ئەنجام دا لەگەڵ "خانی لەپ زێڕین" و دوای شەڕی چاڵدیران پەیمانی زەهاو لە١٩٣٩/٥/٢٠ لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی فارس مۆر کرد کە بووە هۆی دووبارە دابەش کردنەوەی کوردستانی

ڕۆژهەڵاتو جیا بوونەوەی لەو بەشە کوردستانەی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی، دوبارە ئیمارەتە کوردەکان نەیان توانی خۆیان یەك خەن لە پێناو بەرگری کردن لە خاكو نەتەوەکەیانو ڕووبەڕوی ئەو پەیمانو ڕێکەوتن نامانە ببنەوە. هەڵگیرسانی شەڕی نێوان توركو قەیسەری ڕووسی لە١٨٧٤/٤/٢٤ لە دەورووبەری ڕۆژهەڵاتی تورکیا کە کوردستانو قەفقاسو ناوچەی بەڵقان دەگرتەوە هەر دوای ئەوە بەچەند ساڵێك دوبارە شەڕی نیوان تورکیاو ڕووسیا لە ١٨٧٨/١٢/٣١هەڵگیرسایەوەکە کۆتایی هاتنەکەی بە یارمەتی بەریتانیا بوو کە بەریتانیا لەئەنجام قوبرسی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی. بەڵام بەر لەو شەڕانە ڕێکەوتنامەی نیوان توركو فارس لە ١٨٤٧/٥/١٩ لە ئەرزەڕۆم مۆر کرا لە ئەنجام دا هەندێ لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتو باکوری کوردستان خرایە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی، هەروەها لە ١٨٨٨/١٠/١٨ڕووسەکان بەوە سازان کە دژی کورد یارمەتی ئێران بدەنو ئەوەشیان ئەسەلماند کە بالوێزیان لە تورکیا هانی دەدا لەدژی کورد بەشداری شەڕ بکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا هێزەکانی سوپای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە١٨٤٧/٦/٢هێرشی کردە سەر میر بەدرخانو ناوچە کوردیەکان بە سەرۆکایەتی عوسمان پاشای دووەم ولە ١٨٣٨/٨/٨هیزەکانی تورك هێرشیان کردە سەر ناوچەی بۆتان لە ئەنجام کوردەکان توانیان زیاتر لە١٥٠٠سەربازی تورك بکوژنو هێرشەکە تێك بشکێنن ئەمەو جگە لە دەیان کاری هێرش بردنو پەلاَمار دانی کوردان لە ناوچە جیاجیاکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی تورك لەهەموو لایەك بۆ تواندنەوەی کوردو ڕەش کردنەوەی پێناسەی بوونی نەتەوایەتی گەلی کورد بوە.

بۆ نمونە لە ٩٥١/٢/٩ زاینی حکومەتی محمد کوڕی شەداد دامەزراو دەستی کرد بەئاوەدان کردنەوەی ناوچەی کارتۆئاران، ئەو حکومەتە زیاتر لە ١٥٠سالّ دەسەڵاتدار بووە لە ناوچەکانی "قرباغو کوردستانو نەخچەوانو یەریڤان" دوایی بەهۆی پەلاَمار دانی ئیمپراتۆریەتی قەیسەری ڕووسیو فارسی کەدوایی وردە وردەبەرەو توانەوە هەنگاوی نا ئەمەش بەهۆی پەرتو بڵاوبوونو یەك نەبونی میر نشینە کوردەکان لە کوردستانو بەیەك نەگەیشتنیان.

لەو بارو دۆخەی ناوچەو دژایەتی نێوان دەسەڵاتەکانی فارسو ڕوسوتوركو دروست بوونی کێشە لە نێوان دەسەڵاتدارانی تورك ئەنجامەکەی بوە هۆی بەرپا بوونی کودەتای کۆمەڵەی ئیتحادیەکان لە١٩٠٨/٨/٢٣لە تورکیاو بوەهۆی دامەزراندنی دەولەتی پاشایی دەستوریو کورد ڕۆڵی گرنگی نواند بۆ پالپشتی کردنی ئەو کودەتایە لە ئەنجامی چەند بەڵێنێکی دوڕویی بەرپرسانی کودەتاکەو دوای ئەوە مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی کێشەی سنوری نێوان ئێرانو تورکیا لە ١٩١١/١١/٢١کە هەموی لەسەر خاکی کوردو بەش کردنی لەنێوان خۆیان بە خواستو نیازیانو بەرژەوەندی تایبەتیانو کوردیش تەماشا کەری ئەوڕێکەوتنە نامرۆڤانەیە بوو لەسەر بەرژەوەندی کوردو خاکی کوردستان.

بەهۆی بەرەو لاواز بوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە دەسەڵاتدا توشی چەندین شەڕو ململانێی خواستو ویستی تایبەتی خۆیو فراوان بوونی دەسەڵاتو باری لێك ترازانو توشی شەڕ هاتن ئەویش لە ١٩١٢/١٠/٨شەڕی یەکەمی بەڵقانی تورك لەگەڵ ڕووسیاو سلافی هەڵگیرسا کە ڕووس پشتگیری سلافیەکانی دەکردو لە ئەنجام بەڵقانیەکان سەرکەوتن، لە ١٩١٣/٢/٣ شەڕی دووەمی بەڵقان دەستی پێکردەوە ئەمانە هەموی لەسەر خاکی کوردستانی داگیر کراو. .!

دوای ئەو بارو دۆخە پەیمانی نێوان تورکی عوسمانیو ئەڵمانیا لە ١٩١٤/٨/٢مۆر کرا بۆ خۆ

ئامادە کردنی جەنگ ئەوە بوولە ١٩١٦/٥/١٦ پەیمانی سایکس بیکۆ بە نهێنی لە نێوان فەرەنساو بەریتانیا لە قاهیرەی پایتەختی وولاتی میسر مۆرکرا.بەلام لەدوایی ڕووسەکان ئەو پەیمانەیان ئاشکرا کرد بە هۆی کێشەی نێوان ئەلمانیاو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. بەلام بەر لەوە بە هۆی بارو دۆخی ناهەمواری کوردو ئازار دانی شەریف پاشا لە١٩٠٨/٨/٦دەستی لە کاری بالوێزی عوسمانی کێشاوە لە سویدو گەڕاوە باکوری کوردستان بۆ بەرگری کردن لەکوردو خاکی کوردستان، هەر لەدوای مۆر کردنی پەیمانی سایکس بیکۆ نەخشەی نوێی جیهان دارێژرا بوولەگەڵ کۆتایی هاتنی جەنگو کارەکان چۆن ئەنجام بدرێت چ بەرامبەر بەپاشماوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو چ لە بارەی پێک هێنانی دەولەتان لە سەر خاکی کوردستانو میللەتان. هەر لەو مشتومڕەو کێشەو ململانێیە جەنگی یەکەی جیهان لە ١٩١٤/٨/٣هەلگیرسا کە بووە هۆی کۆتایی هاتنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو سەرکەوتنی شۆڕشی سۆشیالیستی بەلشەفی ڕوسیاو دابەش بوونی جیهان بە دوو بلۆکی سەرمایەداریو سۆشیالیستی دژ بە یەکتری لە بیرو بۆچونودەسەلاتو ئایدۆلۆژی .

لە دوای وەستانی جەنگی یەکەمی جیهانو هەرەس هینانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو کۆ کردنەوەیان لە سنورێکی دیاری کراو بە پێی پەیمانەکانی نێوانیان،لەو کاتو ساتە سەرۆکی ئەمەریکا ویلسن لە ١٩١٨/١/٨وتارێکی خوێندەوە کە لە چواردە بەند پێکهاتبوو لەو وتارەدا داوای کرد کەلە خالی دوازدە دەلێ " ئەو نەتەوانەی دەکەونە ژێر دەسەلاتی تورکیا بە تایبەتی گەلی کورد پێویستە بەئازادی هەلسو کەوت بکەنو مافی خۆیان بدرێتێ لە چوار چێوەی ولاتەکە"

بەلام بەداخەوە "بێ توانایيو یەک نەبوونی کوردو دڕندەیی دەسەلاتی تورکی نوێو داخ لەدل ئەو مافو داواکاریانە لە گۆڕەپانی ناوچەو هەرێمکە دەرکران"

لەگەل ئەوەش دا چاو بڕین لە خاکی کوردو نەهێشتنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو سڕینەوەی ناسنامەی کورد بوە هاوپەیمانیەتی دەولەتە پێکهاتوەکانی سەر خاکی کوردودراوسێکانیان لە هاوکاری کردنی یەکتریو نەوەستانو بەردەوام سەرەڕای دژایەتی کردنی یەکتری لە هەموو لایەنێکو بوارێک ئەوە بوومۆرکردنی ڕێکەوتنامەی دۆستایەتی نێوان دەسەلاتی نوێی ڕووسیاو تورکیا لە ١٩٢١/٣/١٦بە پاداشت دانی دەسەلاتی نوێی تورک بە ٢٩هەزار پارچە چەکو ٦٣ ملیۆن فیشەک ٥٤ تۆپ ٢٠ هەزار ماسکی دژی کیمیاوی ئەمەش بۆ دژایەتی کردنی کوردو نیشتمانەکەی. ئەمەش لە ئەنجامی مۆرکردنی پەیمانی نێوان ڕوسیاو ئەلمانیاو نەمساو مەجەرو بولگاریاو تورکیا لە پێناو دابەش کردنی کوردستانو ئۆکرانیاوپێک هێنانی ولاتانی نوێ لە سەر خاکی کوردو گەلانی تری ناوچەکەو دابەش کردنی جیهان لە نێوان فەرەنساو بەریتانیاو ئەمەریکا.

سەرەڕای ئەوە بەستنی کۆنگرەی ئاشتی لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا لە١٩١٩/١/١٨ لەو کۆنگرەیە شەریف پاشا کە نوێنەری کورد بوو داوایەکی پێشکەش بەو کۆنگرەیە کرد لەگەل هاوپێچی چەندین بەلگە نامەو نەخشەی کوردستان بەلام تەنیا لە لاپەڕەکانی مێژوو تۆمار کران وردە وردەکاردانەوەی خۆی نواندو بوە هۆی دامەزراندنی کۆماری گیلاف لە ١٩٢٠/٦/٥ لایەن میرزا کۆچەک خان لە باکوری کوردستانو دوای سالێک ئەو کۆمارە لەناو براو میرزا کوچەک لە شاخی تالش تیرۆر کرالە لایەن جەندرمەکانی تۆرانی . دوای ئەوە هەر چەند پەیمانی سیڤەر لە١٩٢٠/٨/١٠مۆرکرا کە چەندین بڕگەی باشی

تێدا دیار کرابوولە بارەی کوردو لە بڕگەکانی ٦٢- ٦٣- ٦٤لە مادەی (٣) لە ژێر ناونیشانی کوردستان بەڵام مۆرکردنی پەیمانی لۆزان لە ١٩٢٣/٧/٢٤.هێڵێکی سوور بوو بە تیرە ژەهراویەکەو کوردستانی کردە چوار لەتو نیو.

ئەمەش تادنیا ماوە لە یاد ناکرێت وەك ئاسەوارێکی شوێنەواری هەر دەمێنێ لەهەموو لایەنە چەوتەکان کە دوژمنی بنەڕەتی کوردو خاکی کوردستانە.

لەنێوان مۆرکردنی پەیمانی سیڤەرو پەیمانی لۆزان دەسەڵاتی کەمال ئەتاتورك بە شێوەیەکی دڕندانە پەلاماری کوردوو ناوچەکانی دا لە٩/٩/١٩٢٢ شاری ئەزمیری داگیر کردو دەستی کرد بە تورك کردنی کوردو خاکەکەی‌و لەهەمان کات پەلاماری سوپای یۆنان بوو، دوای ئەوە لە ١٩٢٣/١٠/٢٩ دەولەتی کۆماری تورکیا ڕاگەیەندراو پێش ئەمەش لە ١٩٢٢/١١/١٦مستەفا کەمال ئەتاترك کە ناسراو بەباوکی تورك بەڕەسمی دەسەڵاتی تورکیای گرتە دەست. بە هۆی ئەو بارو دۆخەو کارو کردەوانە گەلی کورد توانی بەرگری لەخاك‌و نەتەوە بکات بە ڕابەرایەتی شێخ سەعیدی پیران کە لە١٩٢٣/٢/٢٣سەرەتای شۆرشی دژی تورکیا ڕاگەیاندو لە لایەکی تریشەوە شەریف پاشا درێخی نەکرد بە یاداشتنامەو هەوڵدان لە کۆبونەوەکانی پاریسی پایتەختی فەرەنسا.

کۆماری تورکیا لەلایەن کەمالیەکان لە١٩٢٤/٣/٣ ڕاگەیەندراو هەرچی فێرگەو ڕۆژنامەو یانەو نوسراوی بەکوردی هەبوو قەدەغەی کردوو ئەوەی سوتاندی، بۆ ڕۆژی ١٩٢٤/٣/٢٤ مستەفا کەمال دەسەڵاتی خەلافەتی ئیسلامی هەڵوەشاندەوەو کۆماری عەلمانی تورکیای ڕاگەیاندو بەو هۆیە دەسەڵاتی تورك ماوەی بەگەلی تورك دا بە خواست‌و ویستی خۆی مامەلە بکات‌و بجولێتەوە بە تایبەتی ماوە دان بە ئافرەت، بەڵام تەنیا ماوەی بەکورد نەدا لە هەموو بوارەکان، هەر لەگەڵ ئەوە دەستی کرد بەنوسین‌و فێرکردنی تورك‌و دانانی زمانی تورکی بە پیتی لاتینی‌و دیاری کردنی داب‌و نەریت‌و کەلتوری کە ئەمەش بەلگەیەك بوە کە تورك خاوەنی هیچ نەبوونەو ئەوەی هەشیانە لە گەلانی تر دزیویانە بە تایبەتی کوردو ئەرمەن.

شۆڕشەکانی گەلی کورد لە باکوری کوردستان بە سەرکردایەتی شێخ سەعیدی پیران بەردەوام بوە لە ١٩٢٥/٢/٧ولە ١٩٢٥/٣/٢١ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی کوردستان‌و دیار بەکری کردە پایتەختی، لە ١٩٢٥/٥/٧ شۆڕشەکە زۆربەی زۆری ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە کە لەشارەکانی وان‌و دیاربەکرو قارس‌و بەتلیس‌و بانجان‌و قاژێ‌و مەلاتیەو دەرسیم‌و چەندین ناوچەی تری کوردستان لەگەڵ هەڤاڵانی بەڵام دوایی تۆرانیکان بە هاوکاری کوردە خۆفرۆشەکان توانیان شێخ سەعید لە باکوری شاری ڤاژێ دەستگیر بکەن لە گەڵ٢٧ هەڤاڵی‌و لە ١٩٢٦/٦/٢٩لە ماوەی دوو کاتژمێر هەموویا لە سێدارە دران کە شێخ سەعیدی پیران خاوەنی دروستکردنی ئەو ئاڵایەی کوردستانەکە هەموو کورد ئەمڕۆ بەرزی دەکاتەوەو بۆتە ئاڵاو دروشم‌و هێمای کوردو کوردستان .

بەر لەو کارە تیرۆستیانەی دەسەڵاتی تورك بەرامبەر بەکوردو نیشتمانەکەی مۆرکردنی پەیمان لەنێوان بەریتانیاو فەرەنساو عێراق‌و تورکیا لە ١٩٢٦/١/٥ لە ئەنجامی مۆرکردنی ئەو پەیمانە تورکیا دانی نا بەوەی کە ولایەتی موسڵ بکەوێتە سەر خاکی عێراق کە لەو کاتە ژمارەی دانیشتوانی موسڵ ٨٠٪ کورد بوون واتە موسڵیش شارێکی کوردیە لە بنەڕەتا بەپێی بەلگە مێژوویەکان بەڵام ٠٠٠؟٠٠٠

دەسەڵاتی تورك لە تورکیای فرە نەتەوەی کە هەردەم ناشیرین ترین کارو کردەوەکانی بە کار

هێناوە بۆ بە تورک کردنی خاک و گەلی کورد لە هەمو لایەنێکەوە بەگواستنەوەی خێزانی کورد بۆ ناوچەکانی دور لەخاکی کوردستان و هێنانی خێزانی تورک بۆ سەر خاکی کوردستان و خێزانە کوردەکان لە شارو شارۆچکەو لادێ کە ئێستا لەشاری ئەستەمبوڵ ٥ر٣ ملیۆن کورد زیاتر هەیەو. گواستنەوەیان بۆسەر سنوری یۆنان و قوبرس و ئەفغانستان و قەدەغەکردنی زمان و جل و بەرگ و ئاهەنگ و زەماوەندی کوردی.

تورکیا هەوڵی زۆری داوە بۆ بەردەوام بوونی پەیوەندی لەگەڵ دراوسێکانی بە تایبەتی عێراق و سوریاو ئێران بە هۆی بونی خاک و گەلێکی زۆری کورد کە لە ٢٤پاریزگا پێکهاتوە خاکێکی بە پیت و بەرەکەت و کەش و هەوایەکی بێ وێنەو بەرو بوومی زۆری کوردستانە. لەگەڵ ئەو وڵاتانە هاوپەیمانە لە بەکارهێنانی ڕامیاریەتی هاوبش لەگەڵ ئێران و سوریاو عێراق بەرامبەر بە هەرێمەکانی کوردستانی لکێندراو بە وڵاتەکانیان بەگۆڕینەوەی بیرو بۆچون و سیخوڕیکردن بۆ خزمەتی یەکتری لە هەموو لایەنێکەوە .

لە دوای ئەو بارو دۆخە شۆڕشی ئارارات لە لایەن ئیحسان نوری پاشا لە ١٩٣٠/٦/١٣بەرپا بوو کە کاردانەوەیەکی باشی نواندو بەرەو ڕۆژئاوا هەنگاوی نا تاکو سنوری سوریا لەگەڵ سوپای تورک ئەمەش بە هۆی دامەزراندنی کۆمەڵەی خۆیبون بوو کە لە١٩٢٨/٦/٢٠ ڕاگەیەندرابوو بە ڕاگەیاندنی ژمارە ٧١ کە داوای لە کوردەکانی ناوەوەو دەرەوەی خاکی کوردستان کرد بۆ خەبات لەپێناوی کوردو خاکی کوردستان. هەر لەگەڵ ئەو بارو دۆخە هێرشەکانی پێشمەرگەی کوردستان بۆ سەر هێزەکانی سوپای دەسەڵاتی تیرۆریستانی تورکیا لە١٩٣٠/٧/١٥ لە باکوری کوردستان کە ئەنجامەکەی بوە هۆی شەهید بونی ٩٠٠پێشمەرگەو زامدار بونی ٢٠٠٠ بەڵام زیانی سوپاو جاشەکانی تورکیا٢٨٠٠ کوژراو بەدیل گرتنی ١٧٠٠جەندرمەو سەرباز لەگەڵ گرتنی ٢٤ تۆپ ٦٠ مەترە لۆز ٦٠هەزار فیشەک و خستنە خوارەوەی ١٢فڕۆکەی جەنگی.

مۆر کردنی پەیمانی سەعد ئاباد لە١٩٣٧/٧/٨لە نێوان ئێران و عێراق و تورکیاو ئەفغانستان کە ئامانجەکانیان لێدانی دروست بونی هەر دەوڵەتێکی کوردی کە ئیستاش ئێران و تورکیاو سوریا بۆ قەدەغەکردنی ئەو ئاواتە شەو ڕۆژ بیری قەدەغەکردنی لێ دەکەنەوە، بەڵام هەولەکانی کوردی هەمە لایەن لە کۆنگرەی ئاشتی پاریس کە لە ١٩١٨/١/١٨بەسترا هەموی تەنیا لەلاپەرەکانی مێژوو تۆمار کراوە وەک بەڵگە نامەیەکی زیندوو بەڵام لەڕوی کار هیچی بۆ نەکراوە لە لایەن ئەو ڕژێمانە.

تورکیا ڕۆژێ لەڕۆژان بە پێی بیرکردنەوە دەست بەردار نەوەستاوە بەرامبەر ڕوداوەکانی دراوسێکانی چ لەڕوداوەکانی ئێران وسوریاو عێراق بەتایبەتی لە دوای شۆڕشەکانی شێخ مەحمودو بارزانی و شۆڕشی ١٤تەموزی ١٩٥٨بە ڕاگەیاندنی دەسەڵاتی کۆماری و لەناو بردنی ڕژێمی شانشینی و دان نان بە مافی کورد لە دەستوری عێراق کە هاوبەشی کوردو عەرەب لە خاکی عێراقی دامەزراو دوای هەڵگیرسانی بڵێسەی شۆڕشی ئەیلول لە ١٩٦١/٩/١١هەربەو هۆیەوە پەیمانی نێوان تورکیاو ئێران لە ١٩٦٣/٨/١٢مۆر کرا لە پێناو گەمارۆدانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو ماوە نەدانی جمو جۆڵی پێشمەرگەی کورد لەسەر سنورەکانی نێوانیان و سنوری عێراق کە هەموو خاکی کوردستانی لکێندراو بە وڵاتەکانیان و دوای ئەوە مۆرکردنی ڕێکەوتن نامەی نێوان تورکیاو ئەمەریکا لە١٩٧٦/٣/٢٦بە پشتگیری دەسەڵاتی تورک لە بەربەرەکانی کردنی کورد لە سەر خاکی داگیر کراوی خۆی کە لکێنراوە بە تورکیاو سوریا وعێراق و ئێران و یەریڤانی ئەرمینیای

ڕۆژهەڵاتی کوردستان‌و ئەو وڵاتانەی لەسەر خاکی کورد دامەزراون.

بەهۆی بەهێزی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە باشوری کوردستان‌و کاردانەوەی لەسەر بەشەکانی تری لکێنراو بە وڵاتەکانی باسمان کرد کەهەوڵ‌و توانایان بۆ لەناو بردنی هەر شۆڕش‌و ڕاپەڕینێك‌و بەدی هێنانی ئامانجەکانی کورد ئەوەبوو هەولەکانیان بە فیڕۆ نەداو هاو پەیمانی هەموو لایان لەپێناوی پاراستنی ووڵاتەکانیان بەئەنجام دانی ڕێکەوتنامەی جەزائر لە١٩٧٥/٣/٦ لە نێوان دەسەڵاتی عێراق‌و دەسەڵاتی ئێران بەسەرپەرشتی جەزائرو ئامۆژگاری ئەمەریکاو بەریتانیاو هاوکاری تورکیاو سوریا کە چەندین ڕێکەوتنی تر لەگەڵ عێراق مۆر کرا بۆ گەمارۆ دانی سنورەکان بەرامبەر جمو جۆڵی کورد دوای هەڵگیرسانی شەڕی هەشت ساڵەی نێوان ڕژێمی عێراق‌و دەسەڵاتی ئیسلامی نوێی ئێران لە ١٩٨٠/٩/٢٢

دوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی بەهاری ١٩٩١/٣/٥کۆبونەوەی وەزیرانی دەرەوەی‌سوریاو تورکیاو ئێران لە ١٩٩٢/٦/٨ئەنجام دراوە هەر لە دوای ئەوە ڕێکەوتننامەیەك لە نێوان تورکیاو ئیسرائیل لە ١٩٩٦/٨/٢٦مۆر کرا بۆ هاوکاری‌و گۆڕینەوەی سیخوڕی بۆ پاراستنی سنورو ئاگادار کردنەوەی یەکتری بە تایبەتی لەسەر جمو جۆڵی پارتی کرێکارانی کوردستانPKK .

بالێرە بگەڕێینەوە دواوە بۆئەوەی زیاتر کارو کردەوەکانی دەسەڵاتی تورك ڕوونتر بکەینەوە لە مێژوی دەسەڵاتیان‌و رامیاریەتی شۆڤێنی‌وبەرچاو تەنگی‌و پێکهاتەی نەتەوایەتیان. لە دوای ڕاگەیاندنی کۆماری تورکیا لە ١٩٢٣/١٠/٢٩دامەزراندنی کەمال ئەتاتورك بە سەرۆك کۆمار هەوڵ دانی بە دارشتنی پرۆگرامی علمانی دیموکراتی لەسەر شێوەی ئەوروپی، تورکیا هەموو کات خۆی دورەپەرێز دەگرت لە ڕوداوە جۆراوجۆرەکانی نێو دەوڵەتی‌و خەریك بوونی بەپتەو کردنی دەسەلات‌و نەتەوەو ئایدۆلۆژی بنەمای دەوڵەتی تورك‌و سود وەرگرتنی لە دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌و هەرەس هێنانی.

زۆر هەوڵی دا کە خۆی لە جەنگی جیهانی دووەم دورخاتەوە بە بێ لایەنی بەڵام کار لێکردنی بارو دۆخی نێو دەولەتی شەڕی لەگەڵ ئەڵمانیاو یابان لە ١٩٤٥/٢/٢٣ ڕاگەیاندو ڕۆڵی گرنگی نەبوو لە شەڕدا کە لەو کات باش دەیزانی کێ سەرکەوتن بە دەست دێنێ کێ هەلاتوو دەبێ لەشەڕەکە.دوای ئەوە تورکیا بووە ئەندامی تەواوی پەیمانی ئەتڵەسی١٩٥٢. دوای ئەوە چەندین کێشەو ململانێ‌و گۆڕینی دەسەڵاتە یەك لە دوای یەکەکان. تورکیا لە١٩٧٤/٧/٢٠پەلاماری دورگەی قوبرسی دا "بەحرا وجوا" ئەمەش لەدوای نەگەیشتنە ئامانجی گفتو گۆیەکانیان.

لە دوای ساڵەکانی هەشتا بارودۆخی تورکیا بەرەو لێك ترازان هەنگاوی دەنا بەهۆی گیرو گرفتی ئاینی‌و نەژادی‌و جمو جۆڵی چەپڕەوو ڕاستڕەوەکان بوە هۆی ئەوەی هێزی سەربازی جڵەوی دەسەڵاتی لە ١٩٨٠/٩/١٢وەرگرێت‌و یاسای عورفی دەربکەن‌و لە١٩٨٢/١١/٦دەستوری نوێ ڕاگەیەندرالە ئەنجامی ڕاپرسی گشتی.لە هەڵبژاردنەکانی کۆتایی ساڵی١٩٨٣پارتی نیشتمانی دایك بە سەرۆکایەتی تۆرگۆت ئۆزال سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە مانگی ١٩٨٧/٤دووبارە هەڵبژێردرایەوە، دوای کۆچی تۆرگۆت ئۆزال تانسۆ شیللر بە سەرەك وەزیرانی تورکیا هەڵبژێردرا کە یەکەم ئافرەت بوو لەتورکیا پۆستی سەرەك وەزیران وەربگرێت.

تورکیا لەگەڵ هاوپەیمانانی دژی داگیر کردنی کوێت وەستا لە ساڵی١٩٩١ لە١٢/١٢/١٩٩٧یەکیەتی ئەوروپا داوای تورکیای ڕەتکردەوە بە چونە ناو یەکیەتی ئەوروپا. لەهەلبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٠ کە پارتی بوژانەوەو داد پەروەری بە سەرۆکایەتی ئۆردوگان

سەرکەوتنی بەدەست هێناو ئۆردوگان پۆستی سەرۆك وەزیرانی وەرگرت.

لەگەڵ ئەو بارودۆخەی ناو خۆی تورکیاو دەسەلاتەکەی و دەسەلاتی سەربازی دوا بڕیاری لە دەستەو ماوە بە دەسەلاتی مەدەنی نادات لە سنوری دەستوری علمانی تورکی لابدات لە هەموو بوارەکان چ لە ڕامیاریەتی دەرەوە چ لە ڕامیاریەتی ناوەوەی بە پێی ڕامیاریەتی بەرژەوەندی تورکیاو هەوڵدان بۆ چونە ناو ڕێکخراوە سەربازیی و مەدەنیەکانی نێو دەوڵەتی.

لەگەڵ ئەو بارو دۆخە دەسەلاتی تورك نەوەستاوە لەداپڵۆسین و ئازاردانی کوردو قەدەغە کردنی کورد لە هەموو خواست و ویستەکانی چ لە ناوەوەی تورکیا چ لە دەرەوەی تورکیا بە هاوکاری وولاتانی دراوسێی وەك عێراق و ئێران و سوریا ئەویش لە ١٩٩٥/٣/٢٠زیاتر لە ٢٥ هەزار سەربازی بە هەموو جۆرە چەکێکی دەشتایی و ئاسمانی خستە ناو خاکی باشووری کوردستانی لکێنراو بەعێراق بە درێژایی ١٢٠ کیلۆمەترو پانی ٤٠ کیلۆمەتر بۆ لێدانی بنکەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان بەر لەوە لە ١٩٩٤/٥/١٧زیاتر لە ١٩ فڕۆکەی سوپای تورك ناوچەی قەڵادزێی بۆردومان کرد بە ناوی لێدانی بنکەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان.

لە١٩٩٤/١١/٨هەشت پەرلەمانتاری کوردی دەستگیر کرد بۆ ماوەی ١٥ساڵ بەند کران. لە ١٩٩٩/٢/١٥عەبدوللا ئۆجەلانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستانی دەستگیر کرد بە هاوکاری و یارمەتی سیخوڕەکانی سوریاو ئیسرائیل و میسرو ئەمەریکا لە نایرۆبی وولاتی کینیا.

سەرەڕای ئەوە کوردو بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بەردەوام بووە لە تێکۆشان و قوربانی دان و خەبات کردن چ لە ناوەوەی کوردستانی لکێندراو بە تورکیاو دەرەوەی کوردستان و بەرگری کردن لە مافەکانی و ناچارکردنی دەسەلاتی تورك بە دان نان بەمافی کوردو بزوتنەوەی ئەویش بەدان نان بەجەژنی نەورۆز لە ١٩٩٤/٣/١٩ماوە دان بە پەخشی تەلەفزیۆن و ڕادیۆ لە ٢٠٠٤/٦/٩بەرەدانی پەرلەمانتارانی کورد لە ئەنجامی پالە پەستۆی وڵاتانی یەکیەتی ئەوروپا.

بەڵام تۆرانیەکان هەر بەردەوام بوونە لە هەلوێستەکانیان بەرامبەر بەکورد چ لە ناو ووڵاتی تورکیا چ لەڕامیاریەتی دەرەوەی تورکیابەتایبەتی باشوری کوردستانی لکێندراو بەعێراق لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام حسێن و دارو دەستەکەی کە چەندین کۆبونەوە ئەنجام دراوە لەنێوان وەزیرەکانی دەرەوەی تورکیاو سوریاو ئێران کە دوا کۆبونەوەیان لە قاهیرەی پایتەختی میسر لە٢٠٠٤/٧/٢١ کە تورکیاو سوریاو عێراق و ئێران و سعودیەو ئوردن و کوێت ئامادەی بوون بە سەرپەرشتی وەزیری دەرەوەی میسر، لەگەڵ ئەوەشدا تورکیا درێخی نەکردووە لە هەڕشە کردنی بەرامبەر باشوری کوردستان و پارێزگای کەرکوکی کوردی کردۆتە بیانوی هەولەکانی کە شارێکە تورکی تیا دەژی کەچی موسڵ و کەرکوك جیاوازیان نیە لە فرە نەتەوەیی و داهاتی سروشتی و هەڵکەوتی جوگرافی . ئەمە کورتەیەك لە مێژووی پڕ لە کارەسات و وێران و شۆڤێنیەت و دڕندانەی دەسەلاتی تورك تاکو کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤، تورکیا بەشداری لە کۆنگرەی شەرمشێخی میسری کرد لە ٢٠٠٤/١١/٢٢.

- تورکیا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە پەیمانی ئەتڵەسی، ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاری و ئابووری و بوژانەوە، ئەندامە لە ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی.

# پاکستان

• ناوی ڕەسمی: کۆماری پاکستانی ئیسلامی.
• پایتەختی : ئیسلام ئاباد، ژمارەی دانیشتوانی ۲۸۷ هەزار کەسە.
• شارە سەرەکیەکانی: کەراتشی، لاهور، فەیسل ئاباد، کویتە.
• بەندەرە سەرەکیەکانی: کەراتشی
• ژمارەی دانیشتوانی: ۵۰۰ر۱٤۰ملیون کەسە، بەپێی ئاماری ۱۹۹۸.
• ڕووبەری: ۳۷٤ر۳۰۷ میل چوار گۆشەو (۱۰۰ر۷۹٦ کیلۆمەتر چوار گۆشە)کە ڕوبەری کشمیرو جامبۆی تیانیە.
• چڕی دانیشتوانی: ٤٥۲ کەس لە یەك میل چوارگۆشەدا
• بوژانەوەی دانیشتوانی: ۱۰ر۲٪.
• نژادەکانی : بنجای سندی، باشتون، بالوش، کورد- کوردیش کە لە ناوچەی کویتەی سەر سنووری نێوان ئەفغانستان وپاکستان دەژین کە لە ڕابردوو لەژێر زەبرو زەنگی ڕامیاریەتی جینوساید دەربەدەر کراون.
• زمانەکانی: ئوردو، ئینگلیزی (زمانی ڕەسمین) بینجای سندی، باشتو، بالوش، کوردی.
• ئاینەکانی: ئیسلام، مەسیحی، ئێزیدی، زەردەشتی.
• دابەشی کارگێری:چوار ولایەتە لەگەڵ دوو هەرێم.
• دراوی: ڕوپیە کە یەکسانە بە سەدبیا.
• کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۳٤٥ ملیار دۆلارە.
• بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۸۰۰ر۲دۆلارە.
• بەرگری: ٤ ر٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
• سوپاکەی: ۰۰۰ر٥۹۰ هەزار کەسە.
• زەوی کشتوکاڵی: ۳٥٪ لە خاکی وولاتەکە.
• بەرهەمی کشتوکاڵی: برنج، گەنم، جۆ، پەمۆ، چەوەندەری شەکر،تەرە، میوەجات.
• سامانی ئاژەڵی: مەر ۲۹،۳۰۰ ملیۆن سەر، بزن ۰۰۰ر٤٤ ملیۆن سەر، گامێش ۱۰۰ر۲۰ ملیۆن سەر، چێڵ ٦۰۰ر۱۹ ملیۆن سەر.
• سامانی سروشتی: غازی سروشتی، ئاسن، کرومیت، گەچ، بەردی چەوی، نەوت.
• بەرهەمی کارەبا: ٥۰۰ر٥۸ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
• پیشەسازی: ڕستن وچنین، ئامادەکردنی خۆراك، خواردنەوە، کەلوپەلی بیناسازی وخانوبەرە.
• داهاتی دەرەوەی: ڕۆنی خواردن، ئامێر، کیمیاوی، کەلوپەلی گواستنەوە، دانەوێڵە، سوتەمەنی.
• دەرچوەکانی: پەمۆ، برنج، بەرهەمی ڕستن وچنین، خوری، پێستی ئاژەڵی، گۆشت، ئاژەڵی زیندوو.
• هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، یەکێتی ئەورویا، یابان، هۆنگ کۆنگ، چینی میللی، سعودیە.
• ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی یەکێتیە، دەسەڵاتی پێك هاتووە لە دوو ئەنجومەن یەکەمیان ئەنجومەنی یاسا دانان بەناوی ئەنجومەنی ئومە کەپێك هاتوە لە ۲۱۷ ئەندام، دوەم ئەنجومەنی پیران پێك هاتووە لە ۸۷ ئەندامو سەرۆك وەزیران وەزیرانو وەزیرەکان. سەرەك کۆمارو سەرەك وەزیران لەرێگەی هەڵبژاردن دەسەلات وەردەگرن..
• پارتە ڕامیاریەکان: هاوپەیمانی دیموکراتی

ئیسلامی، پارتی گەلی پاکستانی، رابتەی پاکستانی ئیسلامی، بەرەی ئیسلامی پاکستان، پارتی عەوامی نیشتمانی، پارتی هاوپەیمانانی دیموکراتی نیشتمانی، چەندین پارت وگروپیی تری نەتەوەی ودیموکراتی و ئیسلامی ونیشتمانی تیایە.

• جوگرافیای ولات: ئەفغانستان وچین لە باکوور، (هیند) لە رۆژهەلات، ووشەی پاکستان دەرچوە لە دوو ووشە کوردی (پاك) یانی خاوێنی (ستان) یان راوەستان یاخود وولات، هەرچەندە فارسیش بەهەمان جۆر ئاخافتن دەکەن.

پاکستان دەکەوێتە بەشی رۆژ ئاوا لە نیمچە کێشوەری هندی ودرێژ دەبێتەوە لەسەر دەریای عەرەبی لەروی باشووری. لە رۆژهەلات دەشتایەك هەیە لە زێی ئەندسییە بەپیتەو لەرۆژئاوای گردۆلکەی وشستان، لەباکورو باکوری رۆژ ئاوای چیایە، پێنج زێی تیایە ئەویش زێی جلیم، شانیە رالفتی و سویتلج وئەندس ئەمەشیان گەورەترین زێیە کە سەرچاوەکەی لە چیای هندوکش هەلدەقولێ لەگەل چیای هەمەلایا لە باکورو نزیکەی بە درێژایی هەزار میل دێتە خوارەوە لەکۆتای لەدەریای بەناو عەرەبی دەکاتەوە.

دووەم چیای تیایە بەبەرزی لە جیهان ناسراوە بە چیای (کیەتواو) کە درێژی ٥٣ کلیۆمەتر لەسەر سنوری ئەفغانستان.

• مێژووی ولات: وولاتی پاکستان ئەمرۆ ناسراوە لە مێژوو بەنیمچە کێشوەری هیندیە کە زیاتر لە پێنج هەزار سال تەمەنیەتی لە نێوان سالانی ٤٠٠٠-٢٥٠٠ پێش زایینی کە بوژانەوەی بەرچاوی بەخۆیەوە دیوە لە رووی شارستانیەتی ئەندوس کە شاری گەورەی تیا دروستکراوە لەگەل ئاوەرۆی کشتوکالی بەلام لە سالی ١٥٠٠ پ ز ئاریەکان لە باکوری رۆژ ئاوا داگیریان کردو شارستانیەتی هندوسیان دامەزراند لە کێشوەری هیندی کە پاکستانی هیندی ئێستا دەگرێتەوە بە درێژای دوو هەزار سال.

لە سەدەی شەشی پێش زایین فارسەکان حکومرانیان تێدا کردوە دوای ئەوانیش ئەسکەندەری گەورەی مەقدۆنی دوای ئەوانیش ساسانیەکان کە ئەمەش بوە هۆی ئەوەی ناوچەکە لێك جیابێتەوە لە ناوچەکانی ترو لە گەل رۆشەنبیری هیندیەکان، لەسەدەی یەکەم ودوەمی زایینی باکووری پاکستان ئیمپراتۆریەتی کۆزانای لێ دامەزرا کە ئەمانەش لە ناوەراستی ئاسیاوە هاتوون.

لەسالی ٧١٢ لەگەل فتوحاتی ئیسلامی لە ناوچەکانی بالوشیستان وسند بوە هۆی ئەوەی کە ئیسلامەکان لەرۆژئاواوە کۆچ بەرو ئەو ناوچەیە بکەن.

لە سالی ١٢٠٦ سەلتەنەی دەلهی دامەزرا بە درێژای ناوچەکانی باکوری رۆژ ئاوای پاکستان بەرەو ناوچەی هەرێمی باکوری هیندی، لەسەدەی شانزەم ئاییینی سینج پەرەی سەند لەهەرێمی بنجاب، لەسەدەی هەڤدەم شاری لاهوری پایتەختی ئیمپراتۆریەتی مەگۆل بوو کە لەبنەرەتا دەگەرانەوە سەر ئیسلامە هندی وتورکی وفارسیەکان.

لە سالی ١٧٥٧ بەریتانیا هێزی دەسەلاتداربوو لەو هەرێمەکە لە دوای سەرکەوتنی سەربازی لە لایەن لورد کلایف، لە سالی ١٨٤٣ بەریتانیەکان هەلسان بەلکاندنی هەرێمی سندوتجیاب بە ئیمپراتۆریەتی هیندی بەریتانی و لەکۆتای سەدەی نۆزدەم دەستکرا بەپرۆژەی ئاوەرۆی کشتوکالی گەورە لە بەنجابی رۆژئاواو کەندی باکورو زێی ئەندوس لەتەك دانیشتوانەکان لە رۆژهەلات بە بەرهەم هێنانی گەنم وجۆو لۆکە.

لەسالی ١٩٠٦ پارتی ئیسلامی دامەزرا لە باکوری رۆژهەلات و لەسالی ١٩١٦ محمد علی جناح داوای دامەزراندنی دەولەتێکی ئیسلامی

کرد بەو مەرجەی کەناوچەی سندویستان وپنجاب بگرێتە خۆی لەگەڵ هەرێمی سنووری باکوری ڕۆژئاوای. لەجەنگی دوەمی جیهان محمد علی جەناح لایەنگری بەریتانیا بوو کە بوە هۆی بەدەستهێنانی سەربەخۆی لە ساڵی ١٩٤٧ بە کرومیتۆن کە وڵاتێکی سەربەخۆ بوو لەناو کۆمەنولسی بەریتانیاو دانانی دادوەرێکی بەریتانی کە فەرمان ڕەوایەتی بکات.

لە ١٩٤٧/٨/١٥ سەربەخۆی خۆی بەجیابوونەوە لەگەڵ هیند ڕاگەیاند، لەساڵی ١٩٥٦ پاکستان سەربەخۆی تەواوی بەکۆماری پاکستان ڕاگەیاند، لە ساڵی ١٩٥٨ ژەنەراڵ ئەیو خالید دەسەڵاتی سەربازی لەسەر پاکستان ڕاگەیاند، لەساڵی ١٩٦٠ بە سەرۆکی کۆمار هەڵبژێردرا، دووبارە لەساڵی ١٩٦٥ بە سەرۆك کۆمار هەڵبژێردراوە و لەهەمان ساڵ شەری نێوان پاکستان وهیند هەڵگیرسا لەسەر سنووری نێوان کەشمیری دابەشکراو بەسەریاندا، لەساڵی ١٩٦٩ دەستی لەسەرۆك کۆماری کێشایەوە دوای ئەو ژەنەراڵ یحیی خان دەسەڵاتی گرتە دەست وياسای عورفی ڕاگەیاند لە وڵات بەهۆی ئاژاوەوخۆپێشاندان وڕێپێوان.

لە ساڵی ١٩٧٠هەڵبژاردن ئەنجام دراکە پارتی ئاینی ئیسلام زۆرینەی دەنگی بەدەست هێنا لە پاکستانی ڕۆژهەلات، ئەو پارتەی کەداوای ئۆتونومی دەکرد بەسەرۆکایەتی موجیب رەحمان، بەلام لەپاکستانی ڕۆژئاوا کە زۆرینە بۆ پارتی گەلی پاکستانی بوو بەسەرۆکایەتی زولفە قار علی بۆتو کەلە ڕەسەندا کورد بوو، کە بوە هۆی شەری ناوخۆی نێوان پاکستانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات. بەلام ژەنەراڵ یحی خان لەمانگی /١٩٧١/٥ کۆمەڵەی نیشتمانی (پەرلەمان) کونگرەی بەستا، بەلام دانیشتوانی پاکستانی ڕۆژهەلات خۆیان بەبێ بەش دەزانی بەرامبەر بە زۆرینەی دەسەڵاتی پاکستانی ڕۆژئاوا کە دەسەڵاتیان بەسەر هەموو دام ودەزگاکانی دەوڵەت زاڵ بوو کە ئەمەش بوە هۆی ئەوەی موجیب ڕەحمان باج ودەرامەتی هەرێمەکەی ڕاگرت ونەیدا بەدەسەڵاتی ڕۆژئاوا، لە دوای ئەوەی کە دەسەڵاتی ناوەندی ڕۆژئاوا هێزی سوپای بۆ پاکستانی ڕۆژهەڵات ڕەوانەکردو شەری نێوان هەردوو هەرێمی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلاتی پاکستانی ڕوویدا، ئەمەش بوە هۆی ئەوەی کە ١٦ ملیون کەس کۆچیان کرد بەرەو هیند وپاکستانی ڕۆژهەلاتو پشتگیری سەربازی بۆ نەنێردرا لەلایەن هیندەوە، لە١٩٧١/١٢/٣ شەر پەرەی سەند کە بەرەی ڕۆژهەلات وبەرەی ڕۆژئاوا تووشی شەر بوون لەگەڵ هیند بەلام لە ١٩٧١/١٢/١٦ بەرەی ڕۆژهەلاتی پاکستانی خۆی بەدەستەوە دا وله ١٩٧١/١٢/١٧ بەرەی ڕۆژئاوای پاکستان وەستانی شەری ڕاگەیاند.

لە ١٩٧١/٥/٢٦ پاکستانی ڕۆژهەلات سەربەخۆی خۆی لە پاکستان ڕاگەیاند واتە لەپاکستانی ڕۆژئاواو ناوی خۆی نا بەناوی وڵاتی بەنگلادیش وپشگیری لە هیند بۆ دەهات، شیخ موجیب ڕەحمان سەرۆکایەتی وڵاتی نوێی وەرگرت کەسەرۆکی پارتی عەوامی ڕابتە بوو. لەپاکستانی ڕۆژئاوا یحیی خان لە دەسەلات کەوتو زولفە قار علی بۆتو لە ١٩٧٠/١٢/٢٠ سەرۆکی پارتی گەلی پاکستانی دەسەلاتی گرتە دەست کە لە هەڵبژاردنەکانی مانگی /١٢/ ١٩٧٠ زۆرینەی دەنگی بەدەست هێنابوو، زولفە قار علی بۆتو دانیڤا بەدەوڵەتی نوێی بەنگلادیش لە ١٩٧٢/٧/٣. هیند وپاکستان ڕێکەوتنیان مۆرکرد بە کشانەوەی هێزەکانیان لەسەر سنوورو چارەسەرکردنی هەموو کێشەکان، لەساڵی ١٩٧٦ پەیوەندی دبلو ماسی لەنێوانیان دەستی پێکرد.

لە ساڵی ١٩٧٧ یەکەم هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئەنجام درا لە پاکستان لەژێر حکومرانی مەدەنی بەلام بەرهەڵستکاران نارەزایان نیشاندا بەو

هەڵبژاردنە کە زولفە قار علی بوتۆتێیدا سەرکەوت بـە ١٥٥ کورسـی لەکورسـیەکانی کۆمەڵـەی نیشتمانی کە ژمارەی ٢٠٠ کورسی بوو. بەڵام کۆی کورسی کۆمەڵەی نیشتمانی ٢١٦ کورسی بوو لە بنەرەتا.

لە ١٩٧٧/٧/٥ زیادئەلحەق بە هێزی سوپا لە کوردەتایەکا دەسەڵاتی گرتە دەست. لەساڵی ١٩٧٩ زیاتر لە سێ ملیون ئەفغانی رویان لە پاکستان کرد بەهۆی داگیر کردنی ئەفغان لەلایەن یەکێتی سۆفیەتی پێشوو، لە ١٩٧٨/٩/١٦ زیاد ئەلحەق سەرۆکایەتی خۆی بۆ سەرەك کۆمار راگەیاند لە کۆتای ساڵی ١٩٨٨ لە هەڵبژاردندا خاتوو بەنازیر بۆتۆ کە کچی زولفەقار عەلی بۆتویە لەرەسەنا کوردە پۆستی سەرۆك وەزیرانی بە دەست هێنا لەمانگی نۆڤەمبەر نواز شەریف لە هەڵبژاردن سەرکەتنی بەدەست هێنا بە سەرۆك وەزیران.

بەهۆی کێشەو ململانێی ناوخۆی نێوان حیزب ولایەنە ئیسلامی ونەتەوەیو نیشتمانیو دیموکراتی هەڵبژاردن لە دوای هەڵبژاردن ئەنجام دەدرا هەریەکەیان ئەوەی تری تاوان بار دەکرد تاکو ئەو کاتەی کێشە لەنێوان نواز شەریف وسوپا تەشەنەی سەندو بوە هۆی ئەوەی پەروێز موشەرف لە رێگەی کوردەتای سەربازی دەسەڵات بگرتە دەست و یاسای عورفی بەسەر وڵات راگەیاندو کاری بەدەستور راگرت. تاکو ئێستاش سەرەك کۆمارەو بە هۆی سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٣ وسەرەك وەزیران لە کەسایەتیە ئیسلامیەکانە.

- پاکستان ئەندامە لە کۆمەنوولسی بەریتانیا، ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتوەکان.

# سەریلانکا

- ناوی رەسمی: کۆماری سریلانکای دیموکراتی سوشیالیستی.
- پایتەختی : کولومبۆ، ژمارەی دانیشتوانی ٨٦٣ر١ ملیون کەسە.
- شارە سەرکیەکانی: کانـدی، کورینجـالا، جاجیاها.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: کولومبۆ، ترینکومالی.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٨٥٠ر١٩ ملیۆن کەسە.
- رووبەری: ٣٣٢ر٢٥ میل چوار گۆشەو ٦١٠ر٦٢ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە.
- نـژادەکانی: سـنهالیون ٧٥٪ تامیـل ١٨٪ مەراکشی ٧٪ .
- چری دانیشتوانی: ٧٨٧ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ١ر٢٪
- زمانەکانی: سـنهای و تامیـل (رەسمیـە) ئینگلیزی.
- ئایینەکانی: بوزیەکان ٦٩٪ هنـدۆس ١٥٪ مەسیحی ٨٪ ئیسلام ٨٪
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٢٪
- دابەشی کارگێری :٨ ناوچەی پارێزگاییە.
- دراوی: روپیەی سەریلانکی کە بەرامبەر ١٠٠ سەنتە
- بەرگری:٤ر٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر ١٢٠ هەزار کەسە.

• كۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٧٢,٥٠٠ مليار دۆلار
• بەشی تاك لە كۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٩٥٠ر٢ دۆلار
• زەوی كشتوكاڵی: ٥ر١٥٪ لە خاكی وولاتەكە.
• سامانی كشتوكاڵی: چا، گيزی هندی ، برنج، چەوەندەری شەكر، تەرە، ميوەجات، گەنم وجۆ، هەندێ جۆری دانەوێڵەی تر.
• سامانی ئاژەڵی: مەر٠٠٠ر١٢٠ هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر٥٦٠ هەزار سەر، گامێش٠٠٠ر٧٥٠ هەزار سەر، چێڵ ٧٥٠ر١ مليۆن سەر، پەرەوەر ١٦٠ر١٠ مليۆن سەر.
• سامانی سروشتی: بەردی چەوی، بەردی پيرۆز، فوسفات، بەرهەمی داری زۆری تيايە بەهۆی دارستانە چڕەكان، مەتاتيشی تيايە.
• پيشەسازی: پاڵاوتنی سوتەمەنی، ئامادەكردنی جل وبەرگ، ئامادەكردنی خۆراك، رەستن وچنين.
• بەرهەمی كارەبا: ٨٠٠ر٤ مليۆن كيلۆ وات كاتژمێر.
• داهاتی دەرەوەی: سوتەمەنی، ماشێن، كەلوپەلی گواستنەوە، شەكر.
• دەرچوەكانی: بەرهەمی نەوت ، بەردی پيرۆز، مجەوهەرات، رستن وچنين، چا، مەتات.
• هاوبەشەكانی بازرگانی: يابان، ئەڵمانيا، ئيران، هيند، بەريتانيا، ئەمەريكا، بەلجيكا، چينی ميللی.
• رژێمی دەسەڵات: كۆمارێكی ديموكراتی سۆشياليستيە، يەك ئەنجومەنی ياسا دانانی هەيە كە پێك هاتيە لە ٢٢٥ كورسی ماوەی هەڵبژاردنی شەش ساڵە.
• پارتە راميارييەكان: پارتی ئازادی سەريلانكا، بەرەی نيشتمانی ديموكراتی يەكگرتوو، بەرەی رزگاری گەل، پارتی نيشتمانی يەكگرتوو، پارتی راست رەوی ناوەندی، پارتی چەپی ناوەندی، چەندين گروپ وپارتی تری نيشتمانی ونەتەوەی وراميياری تێدايە
• جوگرافيای وڵات: سەريلانكا دەكەوێتە زەريای هندی نزيك بەلايەنی باشووری رۆژهەڵاتی نيمچە دورگەی هندی كە بەندەری تەسكی بالك ليكيان جيا دەكاتەوە. زنجيرە دورگەی مێرگی هەيە كە پێی دەگوترێ "پردی ئادەم". ناوچەيەكی كەناريەو نيوەی باكوری لە دوورگەكە زەويەكی دەشتاييە.بەڵام ناوچەی ناوەڕاستیو باشوری بەچياو گردۆلكە داپۆشراوە.
• مێژووی وڵات: سەريلانكا لە كۆنەوە ناسراوە بەناوی تاروبينی (كە ووشەيەكی يۆنانيە مانای ( توماس و رەنگی) دوای ئەوە ناسرا بوە بە ناوی (سرنديب) كە لە وشەی عەرەبی وەرگيراوە بەهۆی بازرگانەكانی عەرەبی لە دوای پەيدابوونی ئيسلام، ئەم دورگەيە پێش زايين بە ٥٤٢ ساڵ دانيشتوانەكەی (قواهيون) بوينە كە ئايينيان بوزی بوە تاكو ئێستا زۆربەی زۆری دانيشتوانەكە پێك دێنن بە سينهاليتی بوزی ناسراون، بەڵام تاميلەكان كە لە باشووری هندەوە بۆ ناوچەكە كۆچيان كردوەو پێنج يەكی دانيشتوان پێكدەهێنێت.

لە ساڵی ١٥٠٥ دووبارە زانای پرتوگاڵی "لورتكودی" گەيشتە ناوچەكەو هيوايەتی بازرگانی توابل بوو واتە (حوشتر) كە عەرەب پەرەی بە بازرگانی عوشتر دەدا، دوای ئەوە لە ساڵەكانی ١٥٩٧ تاكو ١٦١٨ پرتوگاليەكان دەسەڵاتيان بەسەر زۆربەی زۆری سەريلانكا دادەشكا تەنيا لەناوچەی كاندی نەبێت، لە ساڵی ١٦٥٨ هۆڵەنديەكان ئەوناوچيەيان داگيركرد كە پرتوگاليەكان دەسەڵاتيان تيا هەبوو، دوای ئەوە لە ساڵی ١٧٩٨ بەريتانيا ئەو ناوچانەيان داگير كرد كە هۆڵنديەكان داگيريان كردبوو كە لە ژێر دەسەڵاتی پرتوگاڵی دابوو، لە ساڵی ١٨٠٢

پەیمانی ئیمیان مۆرکرد کە دورگەکە ببێتە ژێر دەستەی بەریتانیا کە بەناوی سیلان بوو، لەساڵی ١٨١٥ بەریتانیا کاندی داگیر کرد کە ئەمەش بوەهۆی داگیر کردنی تەواوی خاکی سەریلانکا، لە ساڵی ١٩١٩ رابتەی سیلان دامەزرا بۆ تێکۆشان لە پێناو وەدیهێنانی ماف ئۆتۆنومی، لە ١٩٤٨/٢/٤ سەربەخۆی وەرگرت، لەساڵی ١٩٥٦ زمانی سینهالی بووە زمانی رەسمی و سلیمان بندەر نیکە بوە سەرۆك وەزیران بەلام لەساڵی ١٩٥٩ تیرۆر کرا لەدوای ئەو خێزانەکەی سیریمافو لە ساڵی ١٩٦٠ هەڵبژێردرا بەسەرۆك وەزیران وحکومەتی لە پارتەکەی پێکهێنا، لە ساڵی ١٩٧١ قوتابیان وسوپای رزگاری مللی مارکسی توانیان دەسەلات وەرگرن وکۆماری سریلانکای سۆشیالیستی رابگەیەنن کە بوزیەکان رۆڵی گرینگیان لەو کارە بینی، لە ساڵی ١٩٧٦ بەرەی رزگاری تامیلی پێکهێنا بۆ تێکۆشان لە پێناو دامەزراندنی دەوڵەتێکی تامیلی سەربەخۆ، بەلام بەهۆی کێشەی نێوان تامیلیەکانو سینهالیەکان وگێرو گرفتی نێوانیان کە کار دانەوەی خراپی هەبوو لەسەر باری ئابووری ورامیاری تاکو ئێستاش، دوای ئەوە لەساڵی ١٩٩٤ لە هەڵبژاردنێك کچی بندرنیکە دەسەلاتی وەرگرت و کە ئەو بنەماڵە لەدەسەلاتی یەك لەدوای یەك وەرگرت وحکومرانی سەریلانکا دەکەن تاکو ئێستا.

- سەریلانکا ئەندامە لەنەتەوە یەککرتوەکان، ئەندامە لە کۆمەنوولسی بەریتانی.

# تاجیکستان

- ناوی رەسمی: کۆماری تاجیکستان
- پایتەختی: دوشەمبێ، ژمارەی دانیشتوانی ٦٥٨ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: خوزنت، کورجان، تیوب.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٦ر٥٧٨ر٠٠٠ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ٢٠٠١.
- چڕی دانیشتوانی: ١١٩ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا
- رووبەری: ٥٥ر٢٥٠ میل چوار گۆشەو ١٤٣ر١٠٠ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- نژادەکانی: تاجیك ٦٥٪، ئوزبەکی ٢٥٪، رووسی وتەتەر٩٪ و کرجیز.
- بوژانەوەی دانیشتووانی: ٢,٥٪
- زمانەکانی: زمانی تاجیکی (زمانی رەسمیە) رووسی.
- ئایینەکانی: ئیسلامی سونە.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٩٪.
- دابەشی کارگێری: ١٩ پارێزگایە، لەگەڵ یەك ئەنجومەنی شارەوانی .
- دراوی: رۆبلی تاجیکی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٤,٢٠٠ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٧٥٠ دۆلارە.
- بەرگری: ١٢٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٩٥ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٦ر٥٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، پەمۆ، دانەوێڵە، تەرە، میوەجات، چەوەندەری شەکر، کروم.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ١ر٨٥٠ ملیۆن سەر ، بزن ٧٨٠ر٠٠٠ هەزار سەر، چێل ١ر٢٠٠ ملیۆن

سەر، پەرەور ١،٥٠٠ مليۆن سەر.

- بەرهەمی کارەبا: ١٤،٠٠٠ مليار کيلۆ وات کاتژمێر.
- پيشەسازی: دروستکردنی چيمەنتۆ، ئەلەمنيۆم، قورقوشم، رۆن، ئامێری کەرت کردنی ئاسن، تەلاجەو مجەميدە وتەلەفزيۆن وکەلوپەلی تری کارەبای.
- داهاتی دەرەوەی: کەلو پەلی گواستنەوە، رستن وچنين، پێداويستی خۆراك ، ماشێن، کيمياوی.
- دەرچوەکانی: ئەلەمنيۆم، پەمۆ، ميوەجات، رۆن، رستن وچنين، گۆشت، ئاژەڵی زيندوو.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئۆکرانيا، روسيا، هەندێك لە وولاتانی يەکيەتی ئەرووپا، کازاخستان، ئۆزبەکستان، توركيا، ئيران.
- رژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی ديموکراتی پەرلەمانيە، ولاتێك بوو لە وولاتەکانی يەکێتی سۆڤيەتی پێشووی لێبێك هاتبوو ئەويش لە ٩/٩ /١٩٩١ سەربەخۆی خۆی راگەياند.
- پارتە رامياريەکان: پارتی ديموکراتی تاجيکی، پارتی يەکێتی دادوەری، بەرهەڵستکاری شوعيەکان، پارتی کۆمەنستی تاجکستان، چەندين گروپ وپارتی تری نيشتمانی ونەتەوەی ورامياری تێدايە.
- جوگرافيای ولات: تاجيکستان دەکەوێتە ناوەندی کيشوەری ئاسيا لە ٩٣٪ی خاکی تاجيکستان شاخ وبەرد وبەفرو ئاوە، گومەلەرزەی زۆری لێ روودەدات، لە رۆژهەلاتی چينی ميلليە، لە باشووری ئەفغانستانە، لە رۆژئاواو باکوری ئوزبەکستانە، لە باکوری کرجيزستانە، ياداخ شان ماف ئۆتونومی هەيە وهەرێمێکی دەوڵەمەندە بەکانی کانزای گەرم
- مێژووی ولات: لە سالی ٢٣٠زاينی پارچەيەك بوە لە ئيمپراتۆريەتی ئەسکەندەری گەورەی مەقدۆنی، لەدوای سەدەی هەشتی زاينی تاجيکيەکان وەك کۆمەڵەی نەتەوەيی سەريان هەلدا کە خاوەن زەوی بوونو نيمچە سەربەخۆيان لەدست دابوو، لە ژێر ئامۆژگاری ئۆزبەکيەکان دابوو لە رۆژئاواو دوای ئاييني ئيسلام بوە ئاييني رەسميان.

لە سەدەی سيانزەهەم جەنگيز خان ناوچەکەی داگير کردو بوە پارچەيك لە ئيمپراتۆريەتی مەگۆلەکان، بەلام لە ساڵەکانی ١٨٦٠تا ١٩٠٠ باکوری تاجيکستان کەوتە ژێر دەسەلاتی قەيسەری رووس، هەروەها ئيمارەتی بوخاريەکان کەوتبوە رۆژئاوا، لە دوای شۆرشی ئۆکتۆبەری رووسيا هەولدرا کەبکەوێتە ژێر دەسەلاتی شيوعيەکان، دوای ئەوە لە سالی ١٩٢١ تاجيکستان بوە پارچەيك لە کۆماری تورکمانستانی سۆڤيەتی سۆشياليستی بە ماف ئۆتونومی، لە سالی ١٩٢٤بوە کۆماری تاجيکی سۆڤيەتی سوشيالستی، لە سالی ١٩٢٩ بوە يەکێك لە کۆمارەکانی يەکێتی سۆڤيەتی پێشوو، بەلام لەدوای سالی ١٩٧٨ جولانەوەيەك پەيدا بوو لە تاجيکەکان دژی يەکێتی سۆڤيەت تێکوشانيان دەکرد وبوە هۆی بەرز بوونەوەی هەستی نەتەوايەتی بە هۆی گۆرينی باری رامياريەتی گورباشوف.

لە سالی ١٩٨٩ بەرەی ميللی راگەياندراو زمانی تاجی بوە زمانی رەسمی، دوای راگەياندنی سەربەخۆی لە ١٩٩١/٩/٩ بوە يەکێك لە وولاتانی کۆمەنولسی سەربەخۆ لە وولاتەکانی سۆڤيەتی پێشوو.

لە سالی ١٩٩٢ چوە رێزی رێکخراوی هاوکاری ئابووری ئيسلامی و چوە رێزی رێکخراوی ئاسايشی وهاوکاری ئەورووپا.

لە ١٩٩٩/٩/٢٦ لە ئەنجامی هەلبژاردنو راپرسی دەستوری فرە لايەنی برياری لەسەر درا کە پارتە رامياری وئيسلاميەکان ئازاد بن لە کار کردن ورامياريەتی وولاتەکە.

- تاجيکستان ئەندامە لە نەتەوە يەکگرتوەکان، ئەندامە لە رێکخراوی هاوکاریو ئابوری ئيسلامی، ئەندامە لە رێکخراوی ئاسايشو هاوکاری.

# ڤێتنام

• ناوی ڕەسمی: کۆماری ڤێتنامی سوشیالیستی.
• پایتەختی: هانۆی، ژمارەی دانیشتوانی ٣ر٣٨٠ر٠٠٠ ملیون کەسە.
• شارو بەندەرە سەرەکییەکانی: هوشی منە، دانانج، هایفونج.
• ژمارەی دانیشتوانی: ٧٨,٨٠٠ر٠٠٠ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ٢٠٠٠.
• ڕووبەری: ١٢٨ر٠٦٥ میل چوار گۆشەو ٣٣١ر٦٩٩ کیلومەتر چوار گۆشەیە.
• چڕی دانیشتوانی: ٥٦٩ کەس لەیەک میل چوار گۆشەدا.
• بوژانەوی دانیشتوانی: ٢,٥٪.
• نژادەکانی: ڤێتنامی ٩٥٪، چینی ٣٪ ماونج، خمیر، تای.
• زمانەکانی: ڤێتنامی (زمانی ڕەسمییە) فەرەنسی، چینی ، ئینگلیزی.
• ئایینەکانی: بوزی، تاویون، کاسۆلیکی ڕۆمانی، بڕوای تری تیایە.
• زانینی خوێندن ونووسین: ٩٧٪ .
• دابەشی کارگێری: ٥٧ پارێزگایە لەگەڵ سێ شارو هەرێمی پایتەختی کە ناوچەیەکی گەورەیە.
• دراوی: دونگ
• کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ١٢٨ر٥ ملیار دۆلار
• بەشی تاک لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ١ر٨٥٠ دۆلار.
• بەگری: ١٤ر٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
• سوپاکەی: ٤٩٠ر٠٠٠ هەزار کەسە.
• زەوی کشتوکاڵی: ١٧,٣٪ لە خاکی وڵاتەکە.
• بەرهەمی کشتوکاڵی: قاوە، چا، گەنمە شامی، گەنم وجۆ، دانەوێڵەی تر، برنج، میوەجات، تەرە، چەوەندەری شەکر.
• سامانی ئاژەڵی: مەر ٣٤٠ر٠٠٠ هەزار سەر، بزن ٥١٧ر٠٠٠ هەزار سەر، بەراز ١٨,٥٠٠ ملیۆن سەر، گامێش ٣ ملیۆن سەر، چێڵ ٤ ملیۆن سەر، پەڕەور ١٢٧ ملیۆن سەر.
• سامانی سروشتی: فوسفات، گاز، نەوت، خەڵوز، دار،
• پیشەسازی: دروستکردنی ئۆتۆمۆبێل‌و تایە، دروستکردنی شوشە،دروستکردنی چیمەنتۆ، ئامادەکردنی خۆراک، ڕستن وچنین، پەیینی کیمیاوی، ئامادەکردنی گۆشت..
• بەرهەمی کارەبا: ١٧,٥ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
• داهاتی دەرەوەی: نەوت، بەرهەمی ڕەقی، کەلوپەلی هێلی شەمەندەفەر، داو دەرمان، لۆکەی خاو، کیمیاوی، دانەوێڵە.
• دەرچوەکانی: بەرهەمی دەریایی، بەرهەمی کشتوکاڵی، گۆشت، ئاژەڵی زیندو، بەرهەمی سروشتی، قاوە ، نەوت، پێست.
• هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چینی میللی، ئەڵمانیا، کۆریای باشوور، تایوان، هۆنگ کۆنگ، تایلاند.
• ڕژێمی دەسەڵات: ڤێتنام وڵاتێکی کۆمارییەو یەک ئەنجومەنی یاسادانانی هەیە کە پێک هاتوە لە ٣٩٥ ئەندام، حزبی شیوعی دەسەڵات دارە.
• پارتە رامیاریەکان: یەک حیزبی هەیە ئەویش حزبی شیوعیە،
• جوگرافیای وڵات: دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، لەسەر کەناری ڕۆژهەڵاتی نیمچە دورگەی هیندی چین‌و بەدرێژی دەریای چینی باشوور بەدرێژای ١٠٠٠ میل، لە باکووری چینی میللی، لە ڕۆژ ئاوای کەمبۆدیا.
• مێژووی وڵات: وڵاتی ڤێتنام لە تونکین تۆمار کراوە کە ناوچەی دەلتای زێی سورە لە باکووری وڵات، ئەمەش پێش زایینی، ڤێتنام لە ژێر دەسەڵاتی چینیەکان بوە لەساڵی ١١١ پێش زایینی تاکو ساڵی ٩٣٩ زایینی لەو

کاتـەی (نگوفـوبین) دەسـەلاتی لـە چـین گرتـە دەست و یەکەم بنەماڵەی دەسەلاتداری لەڤێتنام دامەزراند، دوای ئەوە ئاینی بوزی بوژایەوە لە سەرەتای سەدەی پانزەھەم.

لەسەدی پانزەھەم ڤێتنام یەکی گرت بەلام لە ناوەندی ساڵی ١٤٧١ ئەو یەکگرتنە تێک شکا، لـەدوای سـەدەی نۆزدەھـەم فەرنـسا دەسـەلاتی بـەھێز کـرد لەوناوچـانە تـا سـاڵی ١٨٨٤ کـە دەسەلاتی تـەواوی بەسەر داگرت کە لەوکاتـە بۆ سێ ناوچەی دابەش کرابوو.

١. ناوچـەی کوشـین لـە ناوچـەی تیـشینا لـە باشوور .
٢. ناوچەی ئەندام لەناوەند.
٣. ناوچەی توکین لە باکوور.

لەسـاڵی ١٨٨٧ بـوە پارچـەیەك لـە یـەکێتی هینـدی چـینی. فەرەنـساو کەمبۆدیاولاوسیـشی گرتــە خــۆی. لــە ســاڵی ١٩٣٠ هۆشــی منــە تێکۆشانی دەستپێکرد کە شیوعی بوو لە پێناو سـەربەخۆی وولاتەکـە. لـە سـاڵی ١٩٤٠ یابـان دەستی بەسەر بنکەی سەربازی ڤێتنامیدا گرت

لە ساڵی ١٩٤٥ دوایی کۆتای هاتنی جەنگی دوەمـی جیهـان یابانیـەکان لـە ڤێتنـام دەرکـران. هۆشی منە دەستی بەسەر زۆربەی خاکی ڤێتنام دا دەشـــکاو دوایـــی ســـەربەخۆی راگەیانـــد لە١٩٤٥/٩/٢، لە ١٩٥٤/٥/٨ ڤێتنـام دابەشـکرا لە جنێف ئەویش لە باکووری شوعیەکان دەسەلاتدار بـوون‌و باشـووریش ئەمـەریکا پـشت گـیری لـێ دەکـردن دژی ناوچـەی بـاکور کـە شـیوعیەکان دەسەلات داربوون بوە هۆی شەرێکی خوێناوی لـە نێـوان باشـوورو بـاکوور ئـەویش هۆیەکـەی ئەمەریکا بوو، لە ١٩٦٣/١١/١ سەرۆکی دەسەلاتی باشوور لەناو برا. لە رێگەی کودەتایەك‌و بوە هۆی گـۆرینی چـەندین دەسـەلات لـە رێگـەی کودەتـای سـەربازی. لەساڵی ١٩٦٤ ئەمـەریکا دەسـتی کرد بـەبۆردەمان کردنـی ڤێتنـام بەفرۆکـەی سـەربازی‌و بـوە هـۆی شـەرێکی رووبـەڕوو لەگـەل سـوپای ئەمـەریکا، هۆشـی منـە لـە ساڵی ١٩٦٩ کۆچی دوای کـردو ئەنجومـەنێکی چوار لایەن دەسـەلاتی گرتــە دەســت، لــە ســاڵی ١٩٧٠ ئەمــەریکا کـەمبۆدیای داگیر کـرد و لەسـاڵی ١٩٧١ زۆربـەی زۆری هێزەکـانی ئەمـەریکا لـە گۆرەپـانی جـەنگ کشانەوە، لـە ١٩٧٣/٢/٢٧ لەئەنجامی گفتـو گـۆ چارەسـەری کێـشەی ئاشـتیانە کـراو دیلـەکانی ئەمـەریکا ئـازاد کـران کـە لەجـەنگا دەسـتگیر کرابوون، لە ١٩٧٥/٤/٣٠ شورشگێرەکانی باکوور توانیـان دەسـەلاتی تـەواو بەسـەر باشـوور دابگـرن وبیخەنـە ژێـر دەسـەلاتی خۆیـان، لـە ١٩٧٦/٧/٢ هــەردوو ڤێتنــامی باشــوورو بــاکور یــەکگرتنی خۆیـان راگەیانـد. لـە سـاڵی ١٩٧٧ ئەمــەریکاو ڤێتنـام دەسـتیان کـرد بـە گفتوگـۆ لـە پاریـسی پایتەختی فەرەنسا.

لە سـاڵی ١٩٨٨ ڤێتنـام هێزەکـانی خـۆی لـە کــەمبۆدیاولاویس کێـشاوە، لــە ســاڵی ١٩٩٤ ئەمەریکا گەمارۆی لەسەر ڤێتنام لابرد کە ماوەی ١٩ ساڵ گەمارۆی ھەمەلایانەی لەسەر دانابوو، لە سـاڵی ١٩٩٥ ئەمـەریکا دانـی تـەواوی بـە ڤێتنـام ناودەسـتیان کـرد بـە پەیوەنـدی نێوانیـان و گەرانـەوەی تـەرمی سـەربازە ئەمەریکیـەکان کـە لەشەری ڤێتنـام کوژرابوون، لەسـاڵی ٢٠٠٠ بیل کلنتـۆنی سـەرۆکی ئەمـەریکا سـەردانی ڤێتنـامی کـردو داوای لێبـوردنی لـەڤێتنام کـردو بـەدووبارە نـوێ کردنـەوەی پەیوەنـدی نێـوان ئەمـەریکاو ڤێتنام‌و مۆرکردنی چەندین رێکـەوتنی ئابووری‌و هاوکــاری‌و دوورکەوتنــەوە لەبیرکردنــەوەی رابردوو.

* ڤێتنام ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لــە خەزنــەی درای نێودەولـەتی، ئەندامـە لـە ریکخـراوی تەندروسـتی جیهـان، ئەندامـە لـە رابیتەی وولاتانی باشووری رۆژ ھەلاتی ئاسیا.

# کرجیزستان

- ناوی رەسمی: کۆماری کرجیزستان.
- پایتەختی: بیشکك، ژمارەی دانیشتوانی ٦٣٠ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- شارە گرنەکانی: برزفسك، توکماك، ئوش.
- بەندەرکانی: فزیك کول.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٤ر٨٦٠ر٠٠٠ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ٢٠٠٢.
- رووبەری: ٧٦ر٦٤٠ هەزار میل چوار گۆشەو ١٩٨ر٥٠٠ کلیومەتر چوار گۆشەیە.
- نژادەکانی: کرجیز٥٢٪ ، رووس ٢٢٪ ، ئوزبەگ ١٢٪.
- زمانەکانی: کرجیزی، رووسی، (هەردووکیان زمانی رەسمین).
- چری دانیشتوانی: ٦٣ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- ئایینەکانی: ئیسلام.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٨٪.
- دابەشی کارگێری: شەش هەرێم+ یەك شار.
- دراوی: مسم.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٩٧ر٥٠٠ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٢ر٢٥٠ دۆلارە.
- بەرگری: ٢,٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ١٢٥ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٧,٢٪ لە خاکی وولاتەکە .
- بەرهەمی کشتوکاڵی: پەمۆ، گەنم وجۆ، تەرە، میوەجات، چەوەندەری شەکر.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٣,٤٠ ملیۆن سەر، بزن ١٧٠ر٠٠٠ هەزار سەر، چیل٨٤٥ر٠٠٠ هەزار سەر، پەرەور٢ر٥٠٠ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: نەوت، زێر، خەلوز.
- پیشەسازی: چیمەنتۆ، ئامادەکردنی بەرهەمی سروشتی، خۆراك، ماشێن، پەر، کەلوپەلی ناو ماڵ، وزەی کارەبا. سەلاجەو مجەمدە.
- بەرهەمی کارەبا: ١٤,٥٠٠ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: دانەوێڵە، دار، سوتەمەنی، ماشێن، کانزای ئاسن، رستن وچنین.
- دەرچوەکانی: پەمۆ، خوری، پێلاو، گۆشت، ئاژەلی زیندوو، ئاسن، ماشێن
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئۆکرانیا، کازاخستان، ئۆزبەگستان، رووسیا، فنلەندا، وولاتانی یەکێتی ئەورووپا.
- رژێمی دەسەلات: وولاتێکی کۆماری دەستوری پەرلەمانیە.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی کۆمەنیستی کرجیزستان، پارتی دیموکراتی کۆمەلایەتی، پارتی نەتەوەی لایەنگری سەرۆك کۆمار، پارتی بزوتنەوەی دیموکراتی کرجیزستان، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تێدایە
- جوگرافیای ولات: دەکەوێتە ناوەندی کیشوەری ئاسیا، پێشان ناوی کۆماری کرجیزی سۆڤیەتی سوشیالیستی بوو، لە باکووری کازاخستان، لە رۆژهەتی چینی مللی، لە رۆژئاوای ئۆزبەکستان، لە باشووری تاجیکستان، لە ٩٥٪ خاکی وولاتەکە چیاییە
- مێژووی وولات: ئەم وولاتە لە سەدەی سیانزەهەم وچوەاردەمی زایینی بوە پارچەیەك لە ئیمپراتۆریەتی مەگۆلی. لە ساڵی ١٧٨٥ گەلی کرجزی کەوتە ژێر ئامۆژگاری

ئیمپراتۆریەتی چینی میللی، لە دوای ئەوە کەوتە ژێر دەستی سەربەخۆی فاقان کوکند، لە ساڵی ١٨٦٤ تا ١٨٧٦ تێکەڵاو بوو لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی قەیسەری رووس.

لە دوای ئەوە لە ساڵەکانی ١٩١٦و ١٩١٧ زۆر لە گەلی کرجیزی کۆچیان کرد بۆ چینی میللی بەهۆی جەنگی یەکەمی جیهان و بەهۆی شۆرشی ناوخۆی سوپای سوری رووسیای نوێ وزۆر لە شۆرشگێرە کرجیزیەکان روبەروی سوپای سووری روس بونەوە. دوای ئەوە لە ساڵەکانی ١٩١٧تا ١٩٢٤ بوە پارچەیەك لە کۆماری تورکمانستان ، لەساڵی ١٩٢٤ کرجیزستان بوە کۆمارێکی خاوەن ئۆتۆنۆمی، لەساڵی ١٩٣٦ کرجیزستان بووە یەکێك لەکۆمارەکانی یەکیەتی سۆڤیەت. لە ١٩٩١/٨/٣١ کرجیزستان سەربەخۆی تەواوی خۆی راگەیاند بە جیابونەوەی لە یەکێتی سۆڤیەت، لە ١٩٩١/١٢/٢١ چوە ناو کۆمەنوڵسی وولاتانی سەربەخۆ، لە ساڵی ١٩٩٩ عسکر ئەکایێن سەرۆك کۆمارە و مورانلیف سەرەك وەزیرانە.

- کرجیزستان ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە بانکی نێو دەوڵەتی، ئەندامە لە خەزنەی نێودەوڵەتی، ئەندامە لە کۆمەنوڵسی وولاتانی سەربەخۆ، ئەندامە لەرێکخراوی ئاسایش وهاوکاری ئەورووپی.

# کازاخستان

- ناوی رەمسی: کۆماری کازاخستان.
- پایتەختی: ئاستانا، ژمارەی دانیشتوانی ٢٩٥ر٥٠٠ هەزار کەسە، بەندەرەکانی: ئاکتۆ، ئالینۆ.
- شارە گرنگەکانی: ئەلماتی، کرجندا.
- ژمارەی دانیشتوانی: ١٧,٣٨٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- رووبەری: ١٥٠ر٠٤٩ر١ میل چوار گۆشەو ٣٠٠ر٧١٧ر٢ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چری دانیشتوانی: ١٦٥ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- نژادەکانی: کازاخی٤٧٪، رووس ٣٥٪، ئۆکرانی ٥٪، ئەوانی تر.
- زمانەکانی: کازاخی ، رووسی (زمانی رەسمین) نەتەوەی ناوچەکانی ترە.
- ئایینەکانی: ئورزوکسی رووسی، ئیسلام.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٨٪.
- دابەشی کارگێری: ١٤ بەشی پارێزگایە + یەك شار.
- دراوی: تنك.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٢٠٠ر٥ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ١٥٠ ر٣دۆلارە.
- بەرگری: ٢,٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر٣٥ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی:٢ر١٢٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، پەمۆ، تەرە، میوەجات، چەوەندەری شەکر، چەندین جۆری تری بەرهەمی کشتوکاڵی.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٩,١٠٠ ملیۆن سەر، بزن ٠٠٠ر٧٣٠ هەزار سەر، چێل ٤,١٥٠ ملیۆن

سەر، بەراز ٨٧٥ر٠٠٠ هەزار سەر، پەرەوەر ١٧٫٣٠٠ ملیۆن سەر.

- سامانی سروشتی: نەوت، نوحاس، خەلوز، غاز، ئاسن.
- پیشەسازی: ئامادەکردنی نەوت، ئاسن، کیمیاوی، خوری، ئامادەکردنی گۆشت، رەقی، ئامێری کارەبا، ئامادەکردنی خۆراك، کەلو پەلی بینا سازی.
- بەرهەمی کارەبا: ٥٠ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: ماشێن وئامێرو کەلوپەلەکانی، کەرستەی پیشەسازی.
- دەرچوەکانی: نەوت، ئاسن، کیمیاوی، خوری، گۆشت، ئاژەڵی زیندوو.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: وولاتانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، وولاتانی یەکێتی ئەورووپا، چینی میللی، یابان.
- رژێمی دەسەلات: کۆمارێکی دەستوری فرە لایەنیە،
- پارتە رامیاریەکان :پارتی کۆنگرەی میللی کازاخستان، پارتی کازاخستانی سۆشیالیستی، پارتی کۆماری، پارتی کۆنگرەی یەکێتی گەلی کازاخستان، هاوپەیمانانی راست رەوی ناوەند، چەندین گروپ و پارتی نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تری تێدایە.
- جوگرافیای ولات: کازاخستان دەکەوێتە ناوەندی کیشوەری ئاسیا، پێشوو یەکێك بوو لەکۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەت بەناوی کۆماری کازاخی سۆڤیەتی سوشیالستی، لە باکووری رووسیایە، لە رۆژهەلاتی چینی میللیە، لە باشووری کرجیزستان وئۆزبەکستان وتورکمانستانە، لە رۆژئاوای دەریای قەزوینە وکەنارەکانی لەسەر دەریایی قەزوین نزیکەی ١٥ هەزار میل دەبێت، دووەم دەولەتە لە گەورەی رووبەری لە وولاتانی کۆمەنولسی وولاتانی سەربەخۆ.
- مێژووی وولات: کازاخستانیەکان لە رەسەندا هۆزی ترکیکیە بووینە، لە سەدەی هەشتەمی زایینی ئایینی ئیسلامی لەباوەش گرتیە، رەوەند بوینەو لەسەرەتادا بەدوای بەخێوکردنی ئاژەلەکانیان بوینە، سەرۆك هۆزەکانیان پەیوەندیان بەهێز بوەو دوای ئەوەکەوتنە ژێر دەسەلاتی مەگۆلەکان لە سەدەی سیانزەهەم هەروەها کەوتنە ژێر دەسەلاتی تەتەرەکان تاکو سالْ ١٩٣٥ لەو کاتە روسیا داگیری کرد.

لە سالی ١٩١٦ شۆرش دەستی پێکرد لە لایەن دانیشتوانەرەسەنەکانی بەلام رووسیا توانی ئەو شۆرشە سەرکەوێنێت و زیاتر لە ١٥٠ هەزار کەس بکوژێ، دوای شۆرشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ و شەری ناوەخۆی کازاخستان، دوای کۆتای هاتنی شەر لە سالی ١٩٢٠ بوە کۆمارێکی سەربەخۆی خاوەن ئۆتۆنومی، لە سالەکانی ١٩٣٠ بە دواوە زیاتر لە یەك ملیۆن مرۆڤ مردن لە برسان و نەخۆشیە جۆراو جۆرەکان، لە سالی ١٩٣٦ کازاخستان بوە یەکیك لە کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو.

لە سالی ١٩٩٠ نازار بایێف بوە سەرۆك کۆمار، لەسالی ١٩٩١ حزبی شیوعی کازاخی هەلوەشێنرایەوەو کازاخستان چوە ناو کۆمەنولسی وولاتانی سەربەخۆ، لەسالی ١٩٩١ ئەمەریکا دانی بە کۆماری سەربەخۆی کەزاخستان نا، لە سالی ١٩٩٢ کازاخستان بوە ئەندام لە نەتەوە یەکگرتوەکان و رێکخراوی ئاسایش وهاوکاری ئەوروپی، لە سالی ١٩٩٢ بریاری دەستوری نویێ درا بە رژێمکی دەستوری فرە لایەن و نازار بایێف بە سەرۆك کۆمار هەلبژێردرا، لە ١٩٩٨/٦/٩ شاری ئاستان بوە پایتەختی وولاتەکە لە سالی ١٩٩٩ نازار بایێف بە سەرۆك کۆمار هەلبژێندراوە.

- کازاخستان ئەندامە لە نەتەوەیەکگرتوەکان، ئەندامە لە رێکخراوی ئاسایش وهاوکاری ئەورووپی.

# کەمبۆدیا

• ناوی رەسمی: شانشینی کەمبۆدیا.
• پایتەختی: فنۆمبینە، ژمارەی دانیشتوانی ۹۵۰ر۰۰۰ هەزار کەسە.
• بەندەرەکانی: کۆم بونك سۆن.
• ژمارەی دانیشتوانی: ۱۱ر۸۹۵ر۰۰۰ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ۱۹۹۸.
• رووبەری: ۶۹ر۹۰۰ میل چوار گۆشەو ۱۸۱ر۰٤۰ کیلومەتر چوار گۆشەیە.
• چڕی دانیشتوانی: ۱۷۰ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
• نژادەکانی: خەمیر ۹۲٪، ڤێتنامیەکان ۵٪، چینی ۱٪.
• زمانەکانی: خەمیر (زمانی رەسمیە) زمانی فەرەنسی.
• ئایینەکانی: بوزیە.
• زانینی خوێندن ونووسین: ۷۰٪.
• دابەشی کارگێری: ۲۰ پارێزگایە لەگەڵ دوو ئەنجومەنی شارەوانی.
• دراوی: ریال.
• کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۷ر۷۵۰ ملیار دۆلارە.
• بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۷۵۰ دۆلارە.
• بەرگری: ۷٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
• سوپاکەی: ۱٤۰ر۰۰۰ هەزار کەسە.
• زەوی کشتوکاڵی: ۱۳ر۵٪ لە خاکی وولاتەکە.
• بەرهەمی کشتوکالی: برنج، تەرە، میوەجات، پەتاتە، گەنم وجۆ، چەوەندەری شەکر.
• سامانی ئاژەڵی: مەرو بزن ۸۷٤ر۰۰۰ هەزار سەر، چێل ۲,۹۵ ملیۆن سەر، گامێش ۷۷۵ر۰۰۰ هەزار سەر. بەراز ۲,۲۵۰ ملیۆن سەر، پەرەور ۱۲ر۵۰۰ ملیۆن سەر.
• سامانی سروشتی: فۆسفات، بەردی پیرۆز، ئاسن.
• پیشەسازی: ئامادەکردنی مەتات، ئامادەکردنی داری دارستانەکان، ئامادەکردنی گۆشتی ماسی.
• بەرهەمی کارەبا: ۲۵۰ ملیون کیلۆوات کاتژمێر.
• داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی خۆراك، سوتەمەنی، کەلوپەلی بەکارهێنان، دانەوێڵە.
• دەرچوەکانی: برنج، بیبەر، دار، گۆشتی ئاژەڵ، فوسفات، بەردی پیرۆز.
• هاوبەشەکانی بازرگانی: وڵاتانی کۆمەنولسی سەربەخۆ، یابان، چینی میللی، هیند، وڵاتانی یەکێتی ئەروپا.
• رژێمی دەسەڵات: شانشینی دەستوریە وشانشینی نۆزدەم سبهاتك دەسەڵات دارە لە ساڵی ۱۹۹۳وە.
• پارتە رامیاریەکان: پارتی گەلی کەمبۆدی، پارتی چاك سازی سۆشیالیستی، پارتی یەکگرتوی نیشتمانی کەمبۆدی، جولانەوەی دیموکارتی نیشتمانی یەکگرتوو، پارتی لیبرالی دیموکراتی، بەرەی یەکگرتووی کومیودیای سەربەخۆ، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تێدایە.
• جوگرافیائی وڵات : کەمبۆدیا دەکەوێتە باشووری رۆژهەلاتی کیشوەری ئاسیا، لە نیمچە دوورگەی هندی چینییە، لە رۆژئاوای باکوری تایلاند، لە باکوری رۆژهەلاتی لاوس، لە رۆژهەلاتی باشوری ڤێتنام، لەرۆژئاوای کەنداوی سیام.
• مێژووی وڵات: مێژووی کەمبۆدیا دەگەرێتەوە

بۆ سەرەتای سەدەی یەکەمی زایینی بۆ شانشینی فونان وشنلای هندوسیەکان، کەمبۆدیا کەوتە ژێر دەسەڵاتی خومێرەیەکان لە سەدەی شەشی زایینی کە ئەو ئیمپراتۆریە خاکی لاوس و تایلاندو ڤێتنامی گرتەوە، لە ساڵی ١٤٣١ سامیەکان ناوچەکەیان داگیر کرد، لە سەدەی نۆزدەهەم ناوچەکە بوە ناوچەیەکی پارێزراوی فەرەنسی لە ساڵی ١٨٦٣، لە ساڵی ١٩٤١ هەستی نەتەوایەتی رووی لە بەرزبوونەوە بوو لە ژێر دەسەڵاتی ئەمیر نوردەم سیهانوك، لە ساڵی ١٩٤٧ سەربەخۆی وەرگرت لەناو یەکێتی دەوڵەتی فەرەنسا، لە٧/٤/١٩٥٣ کەمبۆدیا سەربەخۆیی تەواوی وەرگرت بە جیابوونەوەی لەیەکەتی دەوڵەتی فەرەنسا، کێشەو ململانێی بێ وێنەبوو لە نێوان کەمبۆدیا وڤێتنام لەهەموو لایەنێکەوە، لەساڵی ١٩٥٥ سیهانۆك لەسەر کورسی دەسەڵات هێنرا خوراریّ و کوڕەکەی جێگای گرتەوەو کە هەر لەدەسەڵات مایەوە، لەساڵی ١٩٦٣ بەڵێنی پەلامارنەدانی وەرگرت لەلایەن لایەنە شەڕکەرەکانی ڤێتنام و ئەمریکا، لەساڵی ١٩٦٥ پەیوەندی لەگەڵ ئەمەریکاپچڕاند بەهۆی هێرشی فرۆکە جەنگییەکانی ڤێتنام بۆ شەری (ڤیدکۆگ)، لەناو خاکی کەمبۆدیاو بەڵام دوایی لەساڵی ١٩٦٩ ئەو پەیوەندییە گەڕاوە بارودۆخی جاران بە تاوانبارکردنی شوعیە ڤێتنامیەکان بەچەکدارکردنی راپەڕیوە کەمبۆدیەکان. لەساڵی١٩٧٠ سەرۆك وەزیران (لۆن نۆڵ) دەسەڵاتی کردە دەست و رژێمی شانشینی هەڵوەشاندەوەو سینانۆك حکومەتی لەمەندەران پێکهێنا، هێزەکانی (خومری سوور) بەسەرکردایەتی (پۆل پۆت) شاری فنوجینەی لەساڵی ١٩٧٥ داگیرکرد کەلەبارێکی نارێك دەخولایەوە بەهۆی دەربەدەری لەلایەك و لایەنگیری هێزەکانی خومری سوور لایەکی تر.

لەساڵی ١٩٧٨ شاری نێوان هێزەکانی خومری سوورو ڤێتنام هەڵگیرساو بوە هۆی داگیرکردنی لەلایەن ڤێتنام و لەساڵی ١٩٧٩ حکومەتی نوێی لێ دامەزرا بەپشتیوانی ڤێتنام بەسەرۆکایەتی (هیگ سمرین) و بوە هۆی دەربەدەری بڵاوبوونەوەی نەخۆشی هەمەجۆر، لەساڵی ١٩٨١ دەستوری نوێی وڵات راگەیەنرا بەپێکهێنانی ئەنجومەنی دەوڵەت و ئەنجومەنی وەزیرن تاکو ساڵی ١٩٨٩ کەچەندین شەڕو پێکدەدان ئەنجام درا لەنێوان لایەنگرانی سیهانۆك و لایەنگرانی سمرین.

لە ساڵی ١٩٩٢ رێکەوتنی ئاشتی لەنێوانیان مۆرکرا بەسەپەرشتی رێکخراوە نەتەوەیەککرتووەکان کە سیهانۆك سەرۆکایەتی ئەنجومەنی بەرێوەبردنی وڵاتی گرتە دەست تاکو ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٣ بەناوی ئەنجومەنی باڵای نیشتمان، لەساڵی ١٩٩٣ هەڵبژاردن لەکەمبۆدیا ئەنجامدرا بەرێکەوتنی هەردوو پارت بەدامەزراندنی حکومەتی هاوبەش لەدەسەڵات. لە ٢١/ ٩/ ١٩٩٤ کۆمەڵەی نیشتمانی دەستوری نوێی راگەیاند بەگەڕانەوەی سیهانۆك بەشانشین لەسەروڵاتی کەمبۆدیا.

لەهەڵبژاردنەکانی ٢٦/٧/١٩٩٨ پەرلەمان کە پارتی سەرۆك وەزیران سەرکەوتنی بەدەستهێنا بەرابەرایەتی (هۆن سۆن)لە٢٠/٤/١٩٩٩ کەمبۆدیا بوە ئەندامی رەسمی لەرابیتەی وڵاتانی باشووی رۆژهەڵاتی ئاسیا.

- کەمبۆدیا ئەندامە لە نەتەوە یەککرتوەکان، ئەندامە لە رابیتەی وولاتانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا. ئەندامە لە چەندین رێکخراوی تری نێودەوڵەتی.

# لوبنان

- ناوی ڕەسمی: کۆماری لوبنان.
- پایتەخیتی: بەیروت، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۹۵۰ر۱ملیۆن کەسە.
- شارو بەندەرەکانی: بەیروت، تەرابلس، سەیدا، سور، زەحلە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۶۸۵ر۳ ملیۆن کەسە. لەو ژمارەیە ۰۰۰ر۵۰هەزار کەس کوردن. بەپێی ئاماری ۱۹۹۸ .
- ڕووبەری: ۰۱۵ر٤ میل چوار گۆشەو ٤۰۰ر۱۰ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چڕی دانیشتوانی: ۹۱۸ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- نژادەکانی: عەرەب ۹۰٪، ئەرمەنیەکان ۷٪، کورد، لە دوای قەسابخانەکەی ئەرمەنی کە تورکیا ئەنجامی دا لە کوردستانی باکووری لکاو بە تورکیا بوە هۆی کۆچ کردنی بەسەدان هەزارخێزانی کورد بەرەو وولاتی سوریا ودوای لوبنان ونیشتەجێ بوینان لە لوبنان، کە زیاتر لە پەنجا هەزار کوردی تیایەو ڕێك وپێك لەگەڵ گەلانی لوبنان دەژینو چەندین ڕێکخراو کۆمەڵەی کوردی تیایەو بەئارەزووی خۆیان کاروباری نەتەوەییو ڕامیاریو کۆمەلایەتی ئەنجام دەدەن بەلام لەگەڵ ئەوەش تاکو ئێستا کورد لە لوبنان بەپەنابەر دەژمێردرێتو هەوڵدان بەردەوامە بۆ وەدی هێنانی مافە سەرەتاییەکانیان.
- زمانەکانی: عەرەبی (زمانی ڕەسمیە) فەرەنسی، ئینگلیزی، ئەرمەنی، کوردی.
- ئایینەکانی: ئیسلام ٦۰٪، مەسیحی٤۰٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ۹۳٪ .
- دابەشی کارگێری: ٥ پارێزگایە.
- دراوی: لیرەی لوبنانی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۳۰۰ر۱٥ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥۰۰ ر٤ دۆلارە.
- بەرگری: ٥ر٤٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر٤٥ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر۲۱٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، سورایی، زەیتون، پەتاتە، کروم، چەوەندەری شەکر، تەرە، میوەجات، دانوێڵەی تر،
- سامانی ئاژەڵی: مەر ۰۰۰ر٤۰۰ هەزار سەر، بزن ۰۰۰ر٤٦۰ هەزار سەر، چێل ۰۰۰ر۲۲۰ هەزار سەر، پەرەور ۳۰ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: دروستکردنی چیمەنتۆ، پاڵاوتنی نەوت، ئامادەکردنی خۆراك، ڕستن وچنین، گۆڕینی دراوی هەمە جۆر.
- بەرهەمی کارەبا: ۱۰۰ر٦ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: کەلو پەلی بەکار هێنان، ماشێن وکەلوپەلی گواستنەوە، ئۆتۆمبیل، بەرهەمی نەوت.
- دەرچوەکانی: میوەجات، تەرە، ڕستن وچنین، کیمیاوی، مرواری، بەرهەمی مەعدەنی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، وولاتانی یەکێتی ئەوروپا، وولاتانی عەرەبی، یابان، چینی میللی، هەندێ لە وولاتانی ئەفریقی .
- ڕژێمی دەسەلات: لوبنان کۆمارێکی پەرلەمانیە وسەرۆك کۆمار بۆ ماوەی شەش ساڵ هەڵدەبژێردرێت، ئەنجومەنی وەزیران و وەزیرەکان لەلایەن سەرۆك کۆمار دادەمەزرێت و

بـــەر پرســـیارن بەرامبـــەر بـــە پەرلـــەمان، پەرلەمانیش ئەنجومەنی نوێنەرانە کە لە ١١٨ ئەنـدام پێـك هـاتوەو بـۆ مـاوەی چـوار سـاڵ هەڵدەبژێردرێت.

- پارتـە رامیاریـەکان: حزبـی شـیوعی لوبنـان، حزبی سوشیالستی لوبنان، پارتی دیموکراتی کورد، حزبی ئەللای ئیسلامی، چەندین گروپ وپـارتی تـری نیشتمانی ونەتـەوەی ورامیـاری تێدایە.
- جوگرافیای وڵات: لوبنان دەکەوێتە رۆژ هـەڵاتی دەریـای ناوەنـدی لـە باشـووری ئیسـرائیل، لـە رۆژهـەڵات وبـاکووری سـوریا، لـە باشـووری ئیسرائیل.
- کـەش هەوایـەکی زۆر لـەبارو گونجـاوی هەیـە زیـاتر لـە دراوسـێیەکانی و وڵاتێکـی گەشـت و گوزاریە.
- مێـــژووی وڵات: لوبنـــان پارچـــەیەك بـــوە لەئیمپراتۆریـــەتی فینیقیـــەکان لەرۆژهـــەڵاتی دەریـای سـپی ناوەراسـت لـە نێـوان سـەدەی پێنجـەمی پـێش زایـینی تـاکو سـەدەی یـەکی زایـینی، لەوکاتـەی کەوتـە ژێـر دەســەڵاتی ئیمپراتۆریـــەتی رۆمـــانی وئـــاییني مەســیحی گەیشتە ناوچەکە.

لە ساڵی ٦٣٠ زاینی ئاینی ئیسلام گەیشتە لوبنان لەرێگەی عەرەبە کۆچ بەرەکان لە بیابانی عەرەبی رۆیان لە باشووری لوبنان کرد، لە دوای سەدەی سیانزەهەم مەزهەبی دورزی سەری هەڵدا لە لایەن هەندێ لە ئیسلامەکانی ناوخۆی لوبنان، لـــە ســـاڵی ١٥١٦ لوبنـــان بوەپارچـــەیەك لـــە ئیمپراتۆریـــەتی عوسمـــانی تـــورکی و لـــە دوای جـــەنگی یەکـــەمی جیهـــان لـــە ژێـــر دەســـەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی رزگاری بوو، کەوتە ژێر ئینتدابی فەرەنسی بە پێی بریاری کۆمەڵەی گەلان لە ساڵی ١٩٢٠ تاکو ١٩٤٠ ئەو بریارە سوریاشی گرتـەوە بـەهۆی ئـەوەی کـە لـەکاتی ژێـر دەسـتەی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی سـوریا ولوبنـان یـەك دەوڵەت بون بەڵام لەوکاتەی کەوتنە ژێر ئینتدابی فەرەنسـی لێـك جیاکرانـەوە. لـە ٢٦/ ١١/ ١٩٤١ سەربەخۆی لوبنان راگەیاندرا ودەسەڵات لە نێوان ئیسلام ومەسیحی دابەش کرا تاکو ١٩٤٤/٢/١ کە سـەربەخۆی تـەواوی راگەیانـد، لـە سـاڵی ١٩٤٦ هێزەکـانی فەرەنـسا لوبنانیـان جـێ هێـشت، لـە ساڵی ١٩٤٥ لوبنـان چوە رێزی زانکۆی عـەرەبی، لەساڵی ١٩٥٨کێشەو ململانێ لـە نێوان ئیسلام ومەسـیحی رویـدا بوەهـۆی لـە دەسـت دانـی دەسەڵات لەنێوان کەمال جەنبلات و کمیل شمعون دوای ئـەوە ئەمـەریکا ئـەیزنهاوەری رەوان کـردو دەسەڵاتی بۆ حکومەت گەراندەوە.

لـــە ســـاڵی ١٩٦٤ رێکخـــراوی رزگـــاری فەلەستینی لـە لوبنـان دامـەزرا، لـە سـاڵی ١٩٧٥ شـــەری نـــاوخۆی نێـــوان ئیـــسلام و مەســـیحی هەڵگیرســـا ورێکخـــراوی رزگـــاری فەلەســـتینی یارمـەتی دەری ئیسلامەکان بـوو ، ئەنجامەکـەی زیـاتر لـە ٤٠ هـەزار کـەس کوژراو زیـاتر لـە ١٠٠ هـەزار برینـدار بوون، لـە دوای حـەفتاکان لوبنـان بـوە گۆرەپـانی شـەر لـە نێـوان فەلەسـتینیەکان وئیسرائیلیەکان، لـە دوای ئـەوە لـە ساڵی ١٩٧٨ ئیـسرائیل باشـووری لوبنـانی داگیـر کـرد و لـە مانگی شەشی ١٩٧٨ ئیسرائیل لە خاکی لوبنان کـــشایەوە ، لـــە ســـاڵی ١٩٧٩ یـــەکێك لـــە ئەفـسەرەکانی سـوپای لوبنـانی راسـت رەوی دەوڵەتی لوبنانی سەربەخۆی لە باشووری لوبنان راگەیاند.

لە ١٩٨٢/٦/٦ ئیسرائیل لوبنانی بە تـەواوی داگیر کرد ئەمـەش بەهۆی تیرۆر کردنی پاڵوێزی ئیسرائیل لـە لەندەن،دوای هـاتنی فلیب حـەبیب نوێنـــەری ئەمـــەریکا بـــەدەرکردنی زۆربـــەی شۆرشگێرەکانی فەلەستینی لەلوبنان و بوە هۆی کشانەوەی سوپای ئیسرائیل لە لوبنان، لەساڵی ١٩٨٥ هێزەکانی سوپای ئیسرائیل بەتـەواوی لە

خاکی لوبنان کشانەوە تەنیا چەند کیلۆمەترێك نەبێت، لەساڵی ١٩٨٧ هێزەکانی سوریا چونە ناو خاکی لوبنان بۆ کۆتای هێنانی شەری نێوان شیعەو دروزیەکان.

لە ٢٢/٧/ ١٩٩١ بەپێی مۆرکردنی پەیمانی نێوان سوریاو لبنان سوریا دانی تەواوی بە لوبنان نا کە دەوڵەتێکی سەربەخۆیە، لە مانگی پێنج وشەشی ١٩٩٨ هەڵبژاردنی ئەنجومەنەکانی شارەوانی بۆ یەکەم جار لە لوبنان ئەنجام درا لە دوای ٣٥ ساڵ لە ١٥/١٠/١٩٩٨ ئیمیل عود بە سەرۆك کۆمار هەڵبژێردرا.

لوبنان تاکو ئێستاش کێشەو مل ملانێی تیا بەردەوامە چ لە نێوان چین و توێژو بیرو را جیاجیاکانی لەلایەك چ لە نێوان لوبنان و ئیسرائیل و چ لەنێوان لوبنان وسوریا، پەرلەمانی لوبنانی لە٢/٩/٢٠٠٤ بریاری درێژ بوونەوەی دەسەڵاتی سەرەك کۆماری دا بەگوڕینی چەند برگەیەك لەدەستورەکە کەدەسەڵاتی سەرەك کۆمار بۆ ماوەی چوار ساڵ بوە ٧ ساڵ لە برگەکانی ٤٥٧/ لەمادەی ٤٩ی دەستور هەر ئەوەش بوە هۆی دروست بونی کێشە لە ناو پارت و رێکخراوەکانی لوبنان دەسەڵات و دەست کێشانەوەی (رەفیق حەریری) لەپۆستی سەرەك وەزیران و له٢٦/١٠/٢٠٠٤ حکومەتی نوێی لوبنان راگەیادرا بەسەرۆکایەتی عومەر کەرامی کەسی وەزیر بەشداری تێد دەکەن و بۆ یەکەم جارە ئافرەت پۆستی وەزیر وەردەگرن لەمێژووی لوبنان..

- لوبنان ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە زانکۆی عەرەبی.

# مەنگـۆلیـا

- ناوی رەسمی: مەنگۆلیا.
- پایتەختی: ئولان باتور، ژمارەی دانیشتوانی ٦٦٠٫٥٠٠ هەزار کەسە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٢,٨٧٠٫٠٠٠ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٦.
- رووبەری: ٨٢٦ر٦٠٤ میل چوار گۆشەو ١٠٠٠ر٥٦٦ر١ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چری دانیشتوانی: ٥ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا .
- نژادەکانی: مەنگۆلی ٩٠٪، کازاك ٤٪، چینی و رووسی ٤٪.
- زمانەکانی: زمانی خەلخا کەزمانی رەسمی مونگۆلیایە (زمانی رەسمیە).
- ئایینەکانی: بوزی تبتیە (لاجمە). ئیسلام بە رێژەیەکی زۆر کەمە.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٨٥٪.
- دابەشی کارگێری: ١٨ هەرێمە لە شێوەی پارێزگا+ دوو ئەنجومەنی شارەوانی.
- دراوی: تجریك.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٠٠٠ر٦٥٠ر٥ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٢٥٠ر٢ دۆلار.
- بەرگری: ٠٢ر٢٪لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٥٠٠ر١٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٣ر١٪ لەخاکی وولاتەکە.

• بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، تەرەو میوەجات، پەتاتە.
• سامانی ئاژەڵی: مەر ۸۰۰ر۱٤ ملیۆن سەر، بزن ۲۰۰ر۱۰ ملیۆن سەر، پەرەوور ۲۰۰ر۱۰ ملیۆن سەر.
• سامانی سروشتی: نەوت، ئاسن،خەلوز، نوحاس، زێر، فۆسفات، چەندین بەرهەمی تری سروشتی.
• پیشەسازی: دەرهێنانی سامانی سروشتیو ئامادەکردنی، کەلوپەلی بیناسازی، ئامادەکردنی خۆراك، خۆش کردنی پێست، دروستکردنی پێلاو.
• بەرهەمی کارەبا: ۲,۷٥۰ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
• داهاتی دەرەوەی: بەرهەمی خۆراك، کەلوپەلی بەکار هێنان، کیمیا، کەرستەی بیناسازی، ئۆتۆمبێل وماشێن، سوتەمەنی.
• دەرچوەکانی: نوحاس، ئاژوڵی زیندو، پێست، گۆشت، خوری.
• هاوبەشەکانی بازرگانی: وولاتانی کۆمەنولسی سەربەخۆیی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، چینی میللی، یابان، نەمسا، چەند وولاتێکی تری ئەوروپا.
• رژێمی دەسەلات: کۆمارێکی دەستوری پەرلەمانیە، پەرلەمان پێك هاتوە لە ۷٦ ئەندام، سەرۆك و جێگری هەڵدەبژێردرێت بۆ ماوەی چوار ساڵ، لە ساڵی ۱۹۹۲ پەرلەمان بریاری دەستوری نوێی دەرکرد ناوی حزبی شیوعی گۆری.
• پارتە رامیاریەکان: پارتی گەلی شۆرشگێری مەنگۆلی، پارتی سوشیالستی، پارتی نیشتمانی دیموکراتی، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تێدایە.
• ژمارەی دانیشتوانی مەنگۆلیا زۆر کەمەو ژمارەی ئاژەڵەکانی زیاترە لە ژمارەی دانیشتوانی کە رێژەی ۱٥ ئاژەڵ بەرامبەر یەك مرۆڤ کە ئەمەش بەرزترین رێژەیە لە جیهان، ژیانی رەوەندیو گەرۆکی رۆڵی گرنگی هەیەو هەوڵی کەم کردنەوەی بەردوام بۆ نیشتەجێی کردنی لە دامەزراندنی کۆمەڵگای تایبەت ورووکردنە کشتوکاڵ لە پاڵ بەخێوکردنی ئاژەڵ. چونکە ئابووری مەنگۆلیا زۆربەی زۆری لەسەر بەخێوکردنی ئاژەڵی هەمەجۆرە کە ئاژەڵی بەناوبانگ وباشی هەیە. ئەوەش لە یاد نەکرێت کە تۆرانیەکان لەو ناوچەیە نەتەوەکەیان لە چەندین پاشماوەی نەتەوە دەریەدەرەکانی ناوچەکە پێك هێناوە لە ئەنجامی پەرتو بلاو بونی نەتەوەکان بەهۆی شەری نێوان دەسەلاتدارە کۆنەکانی ناوچەکە.
• جوگرافیای مەنگولیا: وولاتێکی ناوخۆیە دەکەوێتە ناوەندی کێشوەری ئاسیاو لە باکووری روسیا، لە رۆژهەلاتی وباشووری ورۆژئاوای چینی میللیە.
• مێژووی مەنگولیا: یەکێکە لەوولاتە هەرە کۆنەکان لە جیهان هۆزو تیرەکانی یەکیان گرت بە سەرۆکایەتی جەنگیزخان لە ساڵی ۱۲۰۰، جەنگیز خان ولایەنگر وهاوپەیمانەکانی گەورەترین ئیمپراتۆریەتی سەردەمی ئەو کاتەیان پێك هێنا، لە سەدەی سیانزەم دەسەلاتی هەموو چینی ئێستای گرتەوە تاکو رۆژئاوای گەیشتە مەجەر وهۆلەندا ودوای سێ سەدە ئەو ئیمپراتۆریەتە تواوەو بنەماڵەی بانشوو کەدەسەلات داربون لە چینو دەسەلاتیان بەسەرداگرت. دوای ساڵی ۱٦۹۱ چین دەسەلاتی ئۆتونومی بە مەنگۆلیا بەخشی، لە دوای شۆرشی چین لە ساڵی ۱۹۱۱ و لەناو چوونی بنەماڵەی بانشوو لە ساڵی ۱۹۱۲ ئەمیرە مەنگۆلیەکان چینیەکانیان لە مەنگۆلیا دەرکردو لە۱۱/ ۷/ ۱۹۲۱ سەربەخۆی خۆیان راگەیاند لە ژێر دەسەلاتی (خوتوختو)ی بوزی و روسیاش

یارمەتی دان.

لە ساڵی ١٩٢١ هێزەکانی رووسیا چوە ناو مەنگۆلیا یارمەتی شۆرشگێرەکانی دا بە دامەزراندنی رژێمێکی شیوعی لە دوای مردنی دوا بوزی زیندوو، لە دوای ساڵی ١٩٤٥ لە پەیمانی نێوان روسیاو چین، چین وازی هێنا لە داواکاری مەنگولیا هەر بەناو بوە کۆمارێکی سەربەخۆ.

لە ساڵی ١٩٩٠ حزبی شیوعی وازی لە دەسەڵاتی یەکلایەنە هێناو هەڵبژاردنی ئەنجامدا، لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٩٧ شیوعیەکی کۆن بە سەرۆك کۆمار دەرچوو.

- مەنگۆلیا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە چەندین رێکخراوی تری جیهان رووڵی باشی هەیە لە رووی ئابووری ورامیاری وبەرەو پێش چونی وڵاتەکەیان.

# مالیزیا

- ناوی رەسمی: مالیزیا.
- پایتەخیتی: کولالامپور، ژمارەی دانیشتوانی (٠٠٠ر٥٣٥ر١)ملیۆن کەسە.
- بەندەرو شارە گرنگەکان: جۆرتۆن، کوانتان، کیلانج، کوتا کینا بولا.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٢١,٥٦٥ ملیۆن کەسە، بەپێی زانیارییەکانی ٢٠٠٢.
- رووبەری: ٣١٦ر١٢٧ میل چوار گۆشەو ٧٥٠ر٣٢٩ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چری دانیشتوانی: ١٦٩ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا .
- زمانەکانی: مالویە(زمانی رەسمیە) ئینگلیزی، زاراوەی چینی وهندی تیایە.
- نەژادەکانی: مالوینەکان ٥٩٪، چینی ٢٥٪، هندی ٧٪.
- ئایینەکانی: ئیسلام ئایینی دەوڵەتە، بوزی، هندۆسی.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٨٥٪.
- دابەشی کارگێری: ١٣ پارێزگایە، دوو هەرێمی فیدراڵی هەیە.
- دراوی :رینجیت.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٠٠ر٠٠٥ر٢٢٧ بلیۆن دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٢٥٠ر١١ دۆلارە
- بەرگری: ٥ر٧٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر١١٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٣ر٣٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، تەرەو میوەجات، داری زەیت مالیزیا گەروەترین بەرهەم هێنەریەتی لە جیهان، برنج، بیبەر، مەتات، چەوەندەری شەکر.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٠٠٠ر٢٦٠ هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر٣٥٠ هەزار سەر، چێل ٠٠٠ر٧٣٠ هەزار سەر، گامێش ٠٠٠ر١٤٥ هەزار سەر، بەراز ٤٠٠ر٣ ملیۆن سەر، پەرەوەر ٥٠٠ر١١٠ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: نەوت، نوحاس، داری دارستانەکان.
- پیشەسازی: ئامادەکردنی مەتات، ئامادەکردنی دار، زەیتی دار، نەوت، پیشەسازی سوك، دروستکردنی ئەلیکترۆنی.
- بەرهەمی کارەبا: ٥ر٥٤ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: پێداویستی خۆراك، نەوتی خاو، کەلەپەلی سەرمایەداری، کیمیاوی،

کەلوپەلی بەکار هێنان.

- دەرچوەکانی: مەتاتی سروشتی، زەیتی دار، نەوت، رستن و چنین، ئەلکترۆنی، داری دارستانەکان.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: وولاتانی ئەورووپای رۆژئاوا، یابان، چینی میللی، ئەڵمانیا، تایوان، چەند وولاتێکی عەرەبی.
- رژێمی دەسەڵات: مالیزیا وولاتێکی دیموکراتی پەرلەمانی یەکگرتوە، شانشینی دەرستوریە، شانیشین بەرزترین دەسەلاتە ئەویش دادوەری هەرێمەکان هەڵ دەبژێرێت، ئەویش بەپیاوانی میرات گرەکانیان لە نێوان خۆیان بۆ ماوەی پێنج ساڵ، ئەنجومەنی یاسادانان لە دوو ئەنجومەن پێك هاتوە، یەکەم ئەنجومەنی پیران کە ٦٠ ئەندامە، دووەم ئەنجومەنی نوێنەران لە ١٩٢ ئەندام پێك هاتوە. بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێت
- پارتە رامیاریەکان: پارتی کۆنگرەی مالیزی، رێکخراوی نیشتمانی یەکگرتوی مالاویەکان، پارتی نەتەوەی مالیزی، پارتی جیراکان، پارتی ئیسلامی مالوی، پارتی کاری دیموکراتی، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تێدایە
- جوگرافیای وڵات: مالیزیا دەکەوێتە سەر لایەنی باشووری رۆژهەڵاتی کیشوەری ئاسیا، پێك هاتوە لە مالیزیای رۆژئاوا لەبەشی باشووری لە نیمچە دوورگەی مالایۆ، مالیزیا رۆژهەڵاتی هەرێمی سەباح وسرواك دەگرێتە خۆی لە باکوری رۆژئاوای دورگەی بۆرینۆ، درێژی نێوان هەردوو مالیزیا ٤٠٠ میل دەبێت لە دەریای چینی باشوور، مالیزیا جێگایەکە یەکگرتنەوەی رێگەی دەریای لەباشوورو رۆژهەڵاتی ئاسیا بەو هۆیەوە بۆتە چوار جۆری دانیشتوان و دەسەڵاتی رامیاری مالویەکان لە دانیشتوانی لادێیەکان بوون بەڵام چینیەکان دانیشتوانێکی گورج وگۆڵن لە کاری ئابووری و لەهەمان کاتا گیرو گرفت لەنێوان ئەو دوو کۆمەڵە هەیە. لە باکووری رۆژئاوای تایلاندە لەگەڵ میری برونای، لە باکووری رۆژهەڵات ئەندونوسیایە.
- مێژووی وڵات: لە سەرەتای سەدەی یەکەمی زایینی رۆشنبیری هیندی وبوزی کاردانەوەیەکی باشی هەبوە لەسەر گەلانی ناوچە جیا جیاکانی مالیزیا ودوای ئەوە لەسەدەکانی هەشتەم وسیانزەم نیمچە دورگەی مالایۆ پارچەیەك بوو لەئیمپراتۆریەتی سریفیجیای بوزی کە بنکەی لە سومتەرەبوو.

لە ساڵی ١٤٠٣ بازرگانە ئیسلامەکان بەندەری ملقای بازرگانیان دروستکرد کە بوە مەڵبەندێکی بازرگانی گرنگ لەهەمان کات بوە جێگەی بڵاوبوونەوەی پەرەسەندن و بیری ئاینی ئیسلام، لەدوای ئەوە پرتوگالیەکان توانیان بەندەری مولقا داگیر بکەن بەڵام هۆڵەندیەکان بەهۆی گرنگی ناوچەی پرتوگالیەکان لەو ناوچەیە دەرکران. لە ساڵی ١٧٨١ کۆمپانیای هیندی بەریتانی رۆژهەڵات دامەزرا لە جێگای بازرگانەکان و دوای ئەوە لە ساڵی ١٨١٥ بەریتانیا ژێر دەستەکانی هۆڵندیان داگیرکرد لەو کاتەی شەری نێوان هۆڵەنداو فەرەنسا لە ئارادابوو.

لە ساڵی ١٨٤٠ میری برونای پارێزگاری سرواکی دەکرد لە باکووری رۆژئاوای بورینوی دابە جیمی بوك کە تاکو ساڵی ١٩٤١ بنەماڵەی دەسەڵاتدار بوو وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ دوای ئەوە لە ساڵی ١٨٦٧ وولاتەکە بوە پارێزراوی بەریتانی تاکو ساڵی ١٩٤١ توانی دەسەڵات لەسەر زۆربەی زۆری ناوچەکە دا بگرێت بەڵام دوای ئەوە تاکو ساڵی ١٩٤٥ بوە ژێر دەستەی یابان، لەساڵی ١٩٤٦ رێکخراوی مالایۆی نیشتمانی یەکگرتوو دامەزرا بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەخشەکانی بەریتانیا، لەساڵی ١٩٤٨ بەریتانیا توانی ناوچەکانی مالیزیا یەك بخات بەناوی یەکێتی مالایۆ، لەساڵی ١٩٤٨ تا دوای ساڵی ١٩٦٠ بەریتانیا بە هێزی سەربازی توانی شورشگێرەکان

لەناو ببات کە کۆمۆنیستەکان سەرکردایەتیان دەکرد.

لە١٩٥٧/٨/٣١ یەکێتی مالایۆ بوە وڵاتێکی سەربەخۆ، ئەمیر عبدالرحمان پۆستی سەرۆك وەزیرانی وەرگرت، کە خۆیشی سەرۆکی رێکخراوەی مالایوی نیشتمانی یەکگرتوو بوو، لەساڵی ١٩٦٣ یەکێتی مالایۆ چوە ناو سەنگافوراو سرواك وسەباح بۆ ئەوەی ببنە یەکیەتی مالیزیا، لە ساڵی ١٩٦٥ سەنگافورە لەو یەکگرتنە کشاوەو لەساڵی ١٩٦٨ فیلینش لەو یەکگرتنە دەرچوو سەربەخۆی خۆی لەناوچەی سەباح راگیاند بە جیابوونەوە، لە ساڵی ١٩٨١ مەها تیر محمد بوە سەرۆك وەزیران کە سەرۆکی رێکخراوی نیشتمانی مالایۆ بوو. دوای ئەوە بارو دۆخی مالیزیا بەهۆی کێشەو مل ملانێی رامیاری نێوان سەرکردەکانی پارتی مالایۆو نژادە جیاکان پەرەسەندنەکانی لە بەرزیو نزمیدا پەرەی دەسەند هەر ئەوەبوو لە دوای ساڵی ١٩٩٨ مەهاتیر محمد جێگرەکەی تاوانبار کردو خستیە بەندیخانە بەناوی کۆسپ خستنە پێش پەرە سەندن وچەندین تاوانی تری دژ بەیەکتری.

- مالیزیا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، هەروەها ئەندامە لە رێکخراوی خۆراك وکشتوکاڵ وبانکی دوەلی وکاری نێو دەوڵەتی وخەزنەی نێو دەوڵەتی وبازرگانی نێو دەوڵەتی وئەندامیشە لە کۆمەنولسی بەریتانیاو چەندین رێکخراوی تری جیهانی.

# میانمار

- ناوی رەسمی: یەکێتی میانمار.
- پایتەختی: بایخون (رایخون) ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٩٥٠ر٢ ملیۆن کەسە.
- شاروبەندرەکانی: بایخون، للین، مۆلین، ماندولاوی، بیجۆ .
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٢٨٠ر٤٥ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٨.
- رووبەری: ٢١٦ر٢٦١ میل چوار گۆشەو ٥٥٠ر٦٧٦کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- چری دانیشتوانی: ١٧٤ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا .
- نژادەکانی: بوریمیەکان ٦٨٪، شان، کاراخین.
- زمانەکانی: بورمی (زمانی رەسمیە).
- ئایینەکانی: بوزی ٩٠٪و مەسیحی، ئیسلام.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٨٥٪.
- دابەشی کارگێری: ٧ پارێزگایە لەگەڵ ٧ بەشی شێوەی پارێزگا.
- دراوی: کیات.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٠٠٠ر٧٥٠ر٥٥ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٠٠٠ر١٢دۆلارە.
- بەرگری: ١٥,٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر٤٣٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ١٥,٢٪ لە خاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، چەوەندەری شەکر، تەرە، میوەجات، گەنمە شامی، توێکڵی زەیت.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٠٠٠ر٩٨٥ هەزار سەر، بزن ١,٢٥٠ ملیۆن سەر، چێڵ ٩,٩٥٠ ملیۆن سەر، پەرەور ١٥,٦٠٠ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: قورقوشم، نوحاس، نەوت، بەردی بەنرخ، لەگەڵ چەندین جۆری تری سامانی سروشتی،

• پیشەسازی: پاڵاوتنی نەوت و هەڵێنجان، ڕستن وچنین، دروستکردنی پێڵاو، خۆشکردنی پێست، ئامادەکردنی داری دارستانەکان، دروستکردنی شەکر، ئامادەکردنی گۆشت.
• بەرهەمی کارەبا: ٤,٥٠٠ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
• داهاتی دەرەوەی: ئامادەکراوی گواستنەوە، بەرهەمی خۆراک، کیمیاوی، ماشێن وئۆتۆمبیل.
• دەرچوەکانی: مەتات، شەکر، گۆشت، ئاژەڵی زیندو، بەردی بەنرخ، داری دارستان، پێست.
• هاوبەشەکانی بازرگانی: یەکێتی ئەروپا، یابان، چینی میللی، سنگافورا، هند، تایلاند، مالیزیا، ئەمەریکا.
• ڕژێمی دەسەڵات: ڕژێمێکی سەربازیە سەرۆك وڵات و حکومەت ژەنەراڵ سان شوی کە لە ساڵی ١٩٩٢ دەسەڵاتدارەو هەر ئەویش سەرۆك ئەنجومەنی دەوڵەتە کە لە ٢٠ ئەندام پێك هاتووە. دەسەڵات دارێکی توندو تیژەو تاکە کەسیە.
• پارتە رامیاریەکان: پارتی سەربازی سوشیالستی، کۆمەڵەی نیشتمانی لە پێناو دیموکراتی، پارتی یەکێتی نیشتمانی، پارتی دەسەڵات دار.
• جوگرافیای وڵات: بەشی باکووری ڕۆژئاوای نیمچە دورگەی هندی چینی دەگرێتە خۆی کە درێژ دەبێتەوە لە سەر کەنداوی بەنگاڵ، لە ڕۆژئاوای بەنگلادیش و هیندە، لەرۆژهەڵات چین و لاوس تایلاندە .
• میانمار فرە نژادو فرە ئاین وزمانە لە بنەرەتا دانیشتوانەکەی لادێین بە هۆی بەپیتی خاکەکەی و دراستانی چڕی بە سودو سامانی سروشتی بەڵام بەهۆی گێژو گرفت و کێشەو ململانێی بە تایبەتی لەدوای جەنگی دووەمی جیهان وێرانی بەخۆوە بینی بەتایبەتی لەرووی ئابووری بەهۆی نەبوونی ئارامی وئاسایشی وڵاتەکە.
• مێژووی وڵات: بۆرمیەکان لە ناوچەی تبت روویان لە میانمار کرد لە دوای سەدەی نۆیەمی زایینی، لە سەدەی یانزەهەم شانشینی بوزی لێ دامەزراو پایتەختەکەشی باجان بوەو ئایینی بوزیان لە باوەش گرتبوو، لە ساڵی ١٦٧٢ مەنگولیەکان کە لە چینەوە هاتبون وڵاتەکەیان داگیر کردو تاڵانیان کرد بەتایبەتی باجانی پایتەخت و لە ژێر دەستی چینیەکان ماوە تاکو ساڵی ١٧٥٥ لەدوای ئەوە میانمار توانی یەکگرتەوەو ونجون بکاتە پایتەختی.
لە دوای سێ شەر لە ساڵەکانی ١٨٢٤-١٨٥٢- ١٨٨٦ بەریتانیا توانی هەرێمەکانی میانمار داگیر بکات ئەو کێشەوگرفتە بەردوام بوو تاکو ساڵی ١٩٣٧ کە بۆرما بوە یەکێك لە ژێردەستەکانی تاجی بەریتانی وماف ئۆتۆنۆمی پێدرا ودوای داگیرکردنی لە لایەن یابان لە کاتی جەنگی دووەمی جیهان بەڵام لە ساڵی ١٩٤٥ بەریتانیا لە ژێر دەسەڵاتی یابان رزگاری کرد، لە ٤/١/ ١٩٤٨ میانمار سەربەخۆی خۆی وەرگرت لە بەریتانیاو ناوی بوە بۆرماو دوای ئەوە لە کۆمەنولسی بەریتانیا دەرچوو حکومەتێکی فیدرالی لێپێکهات بەڵام لە دوای کودەتای سەربازی ساڵی ١٩٦٢ حکومەتی فیدراڵی هەڵوەشایەوەو بەرەو ڕژێمی سوشیالستی هەنگاوی نا، لە ساڵی ١٩٧٣ بریاری دەستوری مەدەنی درا، لەساڵی ١٩٧٥ بەرەی نیشتمانی دیموکراتی دامەزرا دژی حکومەت و تێکۆشان دەستی پێکرد، لە مانگی /٥/١٩٩٠ یەکەم هەڵبژاردنی فرەلایەنی بۆ یەکەمجار ئەنجام درا .
• میانمار ئەندامە لە نەتەوەیەکگرتوەکان، ئەندامە لەو رێکخراوە نیودەوڵەتیانە (رێکخراوی خۆراکی کشتوکاڵی، بانکی دراوی نێو دەوڵەتی، کاری نێو دەوڵەتی، تەندروستی جیهان و بازرگانی نیو دەوڵەتی).

# نیپاڵ

• ناوی ڕەسمی: شانشینی نیپاڵ.
• پایتەختی: کاتاوند، ژمارەی دانیشتوانی ٥٨٠ر٠٠٠ هەزار کەسە.
• شارە گرنگەکانی: لالینپور، بیرات، ناگار.
• ژمارەی دانیشتوانی: ٢٤ر٧٨٠ر٠٠٠ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
• ڕووبەری: ٥٤ر٣٦٣ میل چوار گۆشەو ١٤٠ر٨٠٠ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
• چڕی دانیشتوانی: ٤٥٥ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
• نژادەکانی: نیوار، هندی، تبتی، چەندین جۆر لەنژادی تر.
• زمانەکانی: نیپالی (زمانی ڕەسمیە) زاراوەی تری هەیە.
• ئایینەکانی: هندۆس ٩٢٪، بوزی٥٪، ئیسلام ٢٪.
• زانینی خوێندن ونووسین: ٢٨٪.
• دابەشی کارگێری: ١٤ پارێزگایە.
• دراوی: ڕوپیەی نیپالی.
• کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٣١ر١٥٠ ملیار دۆلار.
• بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ١ر٤٠٠ دۆلار.
• بەرگری: ١٠ر٣٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
• سوپاکەی: ٤٥ر٠٠٠ هەزار کەسە.
• زەوی کشتوکاڵی: ٣ر١٧٪ لەخاکی وولاتەکە.
• بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، چەوەندەری شەکر، تەرە میوەجات، برنج.
• سامانی ئاژەڵی: مەر ٩٠ر٠٠٠ هەزار سەر، بزن ٦,١٢٠ ملیۆن سەر، چێل ٧ر٢٥٠ ملیۆن سەر، گامێش ٢ر٥٠٠ملیۆن سەر، بەراز ٧٦٠ر٠٠٠ هەزار سەر، پەرەور ١٦ ملیۆن سەر.
• پیشەسازی: دروستکردنی شەکر: چیمەنتۆ، ئامادەکردنی گۆشت، خۆشکردنی پێست، دروستکردنی پێڵاو، ڕستن وچنین، ئامادەکردنی پێداویستی گوزار، دروستکردنی جل وبەرگ.
• بەرهەمی کارەبا: ١,٣٥٠ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
• داهاتی دەرەوەی: نەوت، پەینی کیمیاوی، ماشێن، ئۆتۆمبێل، دانەوێڵە.
• دەرچوەکانی: دانەوێڵە، پێڵاو، ڕستن وچنین، گۆشت، ئاژەڵی زیندو، پێست، جل وبەرگ.
• هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان،ئەمەریکا، یەکێتی ئەوروپا، هند، چینی میللی، پاکستان.
• ڕژێمی دەسەڵات: شانشینی دەستوری دیموکراتی فرە لایەنیە، ئەنجومەنی یاسادانان لە دوو ئەنجومەن پێك هاتووە یەکەمیان ئەنجومەنی باڵا کە لە ٦٠ ئەندام پێك هاتوە، دووەم ئەنجومەنی نزم کەلە ٢٠٥ ئەندام پێك هاتوە
• پارتە ڕامیاریەکان: پارتی کۆنگریسی نیپالی، پارتی چەپی ناوەندی، پارتی نیپالی شیوعی، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی وراڤیاری تیایە.
• جوگرافیای وڵات: وولاتێکی ناوخۆیەو درێژبوتەوە لەسەر چیای هەمەلایا لە نێوان هیند وهەرێمی تبتی چینی کەماف ئۆتونومی هەیە، لە باکووری چینە، لە باشووری هیندە.
• مێژووی وڵات: لەسەدەی هەشتی زایینی ئامیرۆنی شانشینی دۆڵی کتمەندوی داگیری کرد، ئامیرۆنیەکان کۆچبەری تبتی بوون،

بورمیەکانیش لە باکووری هیندەوە بۆی هاتبوون لە سەدەی پێنجی پێش زایین لە شاری لۆمبیتی لە دورای باشور (زمیر سید هارتا جواتاما) بوزی یەکەم لەو ولاتە لەدایك بوە کە دامەزرێنەری ئاینی بوزی بوە.

لە سەدەی سیانزەم وشانزەم بنەماڵەی (مللا) دەسەڵاتی حکومرانی وەرگرت کە لە بنەماڵەی رابەری هونەر بوون لەو سەردەمە. لە ساڵی ١٨٦٨ نیپاڵ یەکی گرت لەشانشینی یەککرتوو لە دوای داگیر کردنی دۆلی کنمەندو لە لایەك شانشینی بریتوی ناریان، لە نێوان ساڵەکانی ١٨١٥ تا ١٨١٦ شەری نێوان نیپاڵو ئینگلترا هەلگیرسا و دوای نیپاڵ بوە ژێردەستەی بەریتانیا، لە ساڵی ١٩٢٣ نیپاڵ بوە وولاتێکی سەربەخۆی تەواو لە دوای ئەو بنەماڵەی شانشینی تریبویانا بیدبیکرام دەسەڵاتی بەسەر شانشینی رانەشکا وپارتی کۆنگرەی نیپاڵ پشتگیری لێکرد.

لە ساڵی ١٩٥٩ ئەنجومەنی یاسادانا پێك هات لە رێگەی هەڵبژاردن بەلام شانشین پەرلەمانی هەلوەشاندەوە، لە ساڵی ١٩٦١ پارتە رامیاریەکانی قەدەغەکرد لەدوای کوارالا سەرۆکی پارتی گۆنگرەی سوشیالستی سەر بەمیند بوە سەرۆك وەزیران.

لە ساڵی ١٩٦٢ دەستور بریاری هەڵبژاردنی ئەنجومەنەکانی ناوخوییدا بەلام سەرەك وەزیران بە دامەزرادن دەستی بەکارکرد، لە ساڵی ١٩٦٣ لە یەك ژن هێنان زیاتر قەدەغەکرا. لە دوای ساڵی ١٩٨٠ خۆپیشاندانو نارەزایی سەری هەڵدا بە سەرکردایەتی کوارالا کە بوە هۆی ئەوەی راپرسی ئەنجام بدرێت بۆ دەستوری نوێو دەنگدەران بریاریان دا کە ئەندامانی کۆمەڵەی نیشتمانی بە هەڵبژاردنی راستەخۆبێت، لە ساڵی ١٩٨٣ سەرەك وەزیرانی سەر بەشانشین لابرا، لەساڵی ١٩٨٦ لەهەڵبژاردنی کۆمەڵەی نیشتمانی بە زۆرینەی دەنگ بەر هەڵستکاری دەسەلاتی بێ پارتایەتیان کرد، لە دوای ساڵی١٩٨٨ زۆربەی زۆری ئەندامانی پارتی کۆنگرەی نیشتمانی دەستگیر کران وچاودێری لە سەر رۆژنامەکان دانرا، لە ساڵی ١٩٩٠ خۆ پیشاندان ئەنجام درا بۆ هێنانەدی دیموکراتیو دەستوری دیموکراتی نوێ بریاری بۆ درا، دوای ئەوە پارتی کۆنگرەی نیشتمانی لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩١ دەسەڵاتی بەدەست هێنا کە یەکەم هەڵبژاردنی دیموکراتی بوو کە شیوعیەکان ژمارەیەکی بەرزیان لە دەنگ هێنا، دوای ئەوە لە هەڵبژاردنی ١٩٩٤ شیوعیەکان ٨٨ کورسیان بەدەست هێنا، سەرۆکی شیوعیەکان بوە سەرۆك وەزیران بەلام ئەنجومەنی نوێنەران بواری بە حکومەتەکەی نەدا ولە پۆستی سەرۆك وەزیران کشایەوە، لە ساڵی ١٩٩٧. حکومەتی فرە لایەنەی دامەزرا.

- نیپاڵ ئەندامە لە نەتەوە یەککرتوەکان، ئەندامە لە رێکخراوی فاو، ئەندامە لە بانکی نێو دەوڵەتی ، ئەندامە لەرێکخراوی کاری نێو دەوڵەتی، ئەندامە لە خەزنەی دراوی نێو دەوڵەتی، ئەندامە لە رێکخراوی تەندروستی جیهان.

# ئۆزبەکستان

- ناوی ڕەسمی: کۆماری ئۆزبەکستان .
- پایتەختی: تەشقەند، ژمارەی دانیشتوانی ۲ر۳۸۵ر۰۰۰ ملیۆن کەسە.
- شارە گرنگەکانی: سەمەرقەند، بخاری، نامایخان، ئەندیمان.
- بەندەرە سەرەکییەکانی: تەزمیز.
- ڕووبەری: ۱۷۲ر۷٤۰ میل چوارگۆشەو ٤٤٧ر٤۰۰ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۲٤ر۲٥٦ر۰۰۰ ملیۆن کەسە، بەپێی زانیارییەکانی ۲۰۰۱.
- چڕی دانیشتوانی: ۱٤۰ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- نژادەکانی: ئەزبێك ۷۱٪، ڕوسی ۸٪، کوردی تیایە بەرێژەیەکی کەم بەهۆی دابەش کردنی لەلایەن دەسەڵاتی ئەوکاتەی ستالین لەدوای ساڵەکانی ۱۹۲۷.
- زمانەکانی: ئۆزبەکی (زمانی ڕەسمیە) ڕوسی.
- ئاینەکانی: ئیسلام، هەندێ لە ئۆرسۆزکسی ڕۆژهەڵات.
- زانینی خوێندن و نوسین: ۹۸٪.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی دەستورییە.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی ئۆزبەکستانی دیموکراتی میللی . سۆشیالستی چاکسازی (کۆمۆنیستی پێشوو) پارتی پێشکەوتووی خاکی نیشتیمان، لایەنگیرانی ئابووری سەربەخۆ، پارتی ئەرك (پارتی ئازادی دیموکراتی) ، ئابووری تێکەڵاو، پارتی ئۆزبەکستانی کۆمەڵایەتی دیموکراتی، ئیسلامی، پارتی دیموکراتی زیندوبونەوەی نیشتیمانی، .
- دابەشی کارگێڕی: ۱۲ هەرێمە + کۆمارێکی ئۆتۆنۆمی + پایتەخت.
- سوپاکەی: ۷٥ر۰۰۰ هەزار کەسە.
- بەرگری: ۳ر۹٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆی
- دراوی: سوم.
- کۆی دەر ئەنجامی ناوخۆیی: ٦۰ر۷ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك: لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی ۲ر٥۰۰ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ۱۳٪ لەخاکی وولاتەکە..
- بەرهەمی کشتوکاڵی: تەرە بەهەموو جۆرەکانی، پەمۆ، گەنم و جۆ، چەوەندەری شەکر، گولەبەڕۆژە، گێزەر، چەندین جۆری دانەوێڵەی تر.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ۸ر۷۰۰ ملیۆن سەر، گامێش ٥ر۲۰۰ ملیۆن سەر، پەرەور ۱۲ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: غازی سروشتی، نەوت، خەڵوز، زێڕ، بۆتاسیۆم، زیوو، نوحاس، قورقوشم، زنك، مولبیدینۆم.
- بەرهەمەکانی کارەبا: ٤٥ر۱۸۰ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- پیشەسازی: ماشێن، پیشەسازی خۆراك، ڕستن و چنین، خۆشکردنی پێست، دروستکردنی پێڵاو، دروستکردنی شەکر، ئامادەکردنی گۆشت، دروستکردنی فەرش،
- دەرچووەکانی: پەمۆ، زێڕ، بەرهەمەکانی ڕستن و چنین، کیمیا، چیمەنتۆ، ڕۆنی تەرە، گۆشت، پێست، خوری، ئاژەڵی زیندوو.
- داهاتەکانی دەرەوەی : ماشێن و پێداویستیەکانی، کەلوپەلی بەکارهێنان، دانەوێڵە وخۆراك.

- هاوبەشەکانی بازرگانی: یەکێتی ڕوسیا،کۆماری تیشك، چین، هەندێ لەووڵاتانی یەکیەتی ئەوروپا، ئێران، تورکیا، یابان.
- جوگرافیای وولات: کۆماری ئۆزبەکستانی سەربەخۆدەکەوێتە ناوەندی ئاسیا، ئۆزبەکستان پێشوو ناوی (کۆماری ئۆزبەکی سۆشیالستی سۆڤیەتی بووە) کە یەکێك بوو لە کۆمارەکانی سۆڤیەتی پێشوو. کازاخستان لە باکووری و ڕۆژئاوای ، کرجیزستان و تاجاکستان لە ڕۆژهەلاتی، ئەفغانستان و تورکمانستان لە باشووری، ڕووبەری ئۆزبەکستان زۆربەی زۆری دەشتایی و بیابانیە، زەلکاوی قوڵی تیایە لە بیابانەکان، ڕوبارەکانی ، ئامۆ، داریا، سیرایا، لەباکوری ڕۆژهەلاتی دەریای ئوراله، کە ش وهەواکەی لەزستان کورت و سارده، هاوینی درێژو گەرمە.
- مێژووی وولات: خاکی ئۆزیەکستان بەشێك بوە لە ئیمپراتۆریەتی فارسی پێشوو، دوای ئەوە لەسەدەی چواری پێش زایینی ئەسکەندەری گەورەی مەکدۆنی دەستی بەسەر داگرت، لەسەدەی هەشتەمی زایینی لەدوای کردارەکانی (فتوحاتی) ئیسلامی (ترکیە کۆچبەرەکان لێی جێگیر بوون و بیرو باوەری ئیسلام بوە ئاینیان، لەسەدەی سیانزەهەم مەگۆلەکان داگیریان کرد بەسەرۆکایەتی جەنگیزخان و بوە دەسەلاتدار لە سەر ناوچەکەو لە تورکە سەلوقیەکانیانی سەندەوە، دوای ئەوە بووە پارچەیەك لە ئیمپراتۆریەتی تەیموری لەنگ و خەلیفەکانی تاکو سەدەی شانزەهەم، کە سەمەرقەندی کردە پایتەختی دەسەلاتی تەیموری لەنگ . لەسەرەتای سەدەی شانزەهەم ئۆزبك هەلسان بە داگیر کردن و تێکەلاو کردنی لە گەل دانیشتوانی خۆیان و ئیمبراتۆریەتی تەیموری لەنگیان تێکدا بۆ ئیماراتی ئۆزبكی جیا لەگەل یەکتری دا. لە سالی ١٨٦٧ هێزەکانی ڕوسیا تەشقەندیان داگیر کردو کردیانە پایتەختی دادوەری گشتی ترکستان. لە سالی ١٨٦٨ ڕوسیا لکاندی بە ولاتەکەی لەگەل شارەکانی بخاری و سەمەر قەندو خیڤاو کوکند. لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی بەلشەفیەکان لە ڕوسیا (ئەنجومەنی میللی تەشقەند)ی پێك هێنا. لە سالی ١٩٢٤ ئۆزبك بوە کۆماری ئۆزبك . لە سالی ١٩٢٥ بوە کۆمارێك لە کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو بە ناوی (کۆماری ئۆزبەکستانی سۆشیالستی سۆڤیەتی) لە سالی ١٩٨٩ جولانەوەی نەتەوەی پێك هات بەناوی (بیرلیك)و بوە هۆی شالاو بردنەسەر (مسخیتین) و ئەوانی تر لە کەمە نەتەوایەتەکان لە دۆلی فیرنمانامانەوە . لە سالی ١٩٩٠ بە سەرۆکایەتی (ئیسلام کاریموف) بە ئاشکرا کردنی جولانەوەی یەککرتوی نەتەوەیی، کەدوای بوە سەرۆکی وولات بە ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئابووری و ڕامیاری وولات. لە ٣١/ ٨/ ١٩٩١ ئۆزبەکستان سەربەخۆیی ڕاگەیاند و بوە ئەندام لە کۆمەنولسی ولاتانی سەربەخۆ (cis)، لەسالی ١٩٩٦ ئۆزبەکستان و کیزخستان و کرجیزستان ڕێکەوتن بەدامەزراندنی بازاڕی یەککرتووی ئابووری.
- ئۆزبەکستان ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەککرتووەکان.

# ئەفغانستان

- ناوی ڕەسمی: دەوڵەتی ئەفغانستانی ئیسلامی.
- پایتەختی: کابول، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ ر۱٤۳ر۲ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: قەندەهار، وەحیران، مەزار شریف، جلال ئاباد.
- ڕووبەری: ۷۷۲ر۲٥۱میل چوارگۆشەو ۰۹۰ر٦٥۲ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی:۰۰۰ر ۷٥٥ر۲۷ ملیۆن کەسە لەو ژمارەیە زیاتر لە ۲۷٥۰۰۰ هەزار کوردن کەرێژەکە دەکاتە ٥ر۱ ٪.بەپێی ئاماری ۲۰۰۰.
- نژادەکانی: ئەفغانستان ١٤ گروپی نژادی جیاوازی تێدایە لەوانەش، داری، بشتۆن، ئۆزبەکی، تورکمان، کورد، بالوش، بنجابی، چەندین نەتەوەی تری تیایە، بوونی کورد لەئەفغانستان بەهۆی داگیرکردنی کوردستان بوە لەلایەن ئیمپراتۆرە یەك لەدوای یەکەکانی ناو هەرێمەکەو جیهان و جەنگەکانی نێوان روس و تورك وتورك وفارس و فارس و رووس بونەبەتایبەتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارس و روسی کەبۆتە هۆی دەربەدەری کوردو کۆچ کردنیان لەدوای ناوەندی سەدەی هەژدەم بەرەو ئەفغانستان و پاکستان و چینی میللی و هیند کەئێستاش بونی ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیان پاراستووە لەزمان و مێژوو داب و نەریتیان.
- زمانەکانی: بۆشتۆ، داری، فارسی، ئەفغانی، (کە هەردوکیان زمانی ڕەسمین).کوردی، تورکی، ئۆزبەکی، بالوش، عەرەبی، چەندین زمانی نەتەوەیی تری تێدایە.
- ئاینەکانی: ئیسلام، ۸٥٪ سونە ١٥٪ شیعە.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٦ر۳۲٪ .
- بەرگری: ٥ر۱۲ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- دابەشی کارگێڕی: ۲۲ پارێزگایە لەشێوەی هەرێمی دابەشکراوی بەناوبانگ.
- دراوی: ئەفغانی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی:٥۰۰ر۱۹ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۸۰۰ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ۱۲٪ .لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم و جۆ ، پەمۆ، تەرەومیوەجات، خوری. چەوەندەری شەکر.
- چڕی دانیشتوانی: ۱۱۱ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٥ر١٤ ملیۆن سەر، بزن ۲۰۰ر۲ ملیۆن سەر، چێڵ ٦۰۰ر۱ ملیۆن سەر، پەرەور ٦۰۰ر۷ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی پیشەسازی: مافورو چنین، چیمەنتۆ، سابون.
- سامانی سروشتی: نەوت، غازی سروشتی، خەڵوز، نوحاس، کبریت، قورقوشم، زەنگ، ئاسن، خوێ، بەردی پیرۆز.
- بەرهەمی کارەبا: ٤٦۸ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
- دەرچووەکانی: میوەجاتی ئامادەکراو، غازی سروشتی، مافور، خوری، پێست، ئاژەڵی زیندوو.
- داهاتەکانی دەرەوەی: بەرهەمی نەوتی، کەلوپەلی خواردەمەنی، ماشین و ئۆتۆمبێل، لەگەڵ چەندین جۆری تری هێنانە ژوورەوەی پێویست.

• هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەورووپای ڕۆژهەڵات، ئەڵمانیا ، چین، یابان، ئەمەریکا، بەریتانیا، ئەلمانیا، فەرەنسا، یابان، تورکیا، ئێران.

• جوگرافیای وولات: لەباکوری کۆماری تورکمانستان و ئوزبەکستان و تاجیکستانە، لەبەری باشووری ڕۆژهەڵاتی چین، پاکستان لە ڕۆژهەڵات و باشووریەتی، ئێران لە ڕۆژئاوای، ئەفغانستان وولاتێکی شاخاویە چیای هندو کوشە لە ڕۆژهەڵاتی تاکو ڕۆژئاوای کە چیاکە دابەشی دەکات، باشووری ڕۆژئاوای دۆڵ و بیابانییە زۆربەی خاکی شاخی بەرزەو بەفراوانیەو دۆڵی قول و بەپیتی تیایە، باشوری ڕۆژئاوای دۆلی حیراشی تیایە. زستانی زۆر ساردە، هاوینی فێنکە، زۆربەی بارانی لە وەرزی پایزو بەرهارە.

• مێژووی ولات: ئەفغانستان ولاتێکی ئیستراتیژیە لەنێوان وولاتانی سۆڤیەتی پێشوو (کۆمەنولس CIS) و چین و کشمیرو پاکستان و ئێران، لەبەر ئەوەی زۆر پارمەتی پێ دراوە لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو ولایەتەکانی ئەمەریکا، ئینگلترا بەو چاوە تەماشای دەکات کە پردێکی بەستراوەی نێوان هندو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، بەلام هەرەسی هێنا بەهۆی داگیرکردنی سەرەڕای بوونی زنجیرە شەڕێکی ئەفغانی کە دوا شەڕە سالی ١٩١٩ بوو. داریوشی یەکەم و ئەسکەندەری گەورە یەکەم داگیرکەری ئەفغانستان بوون بۆ بەکار هێنانی ئەفغانستان وەك دەرگایەك بەرەو هند، لە سەدەی حەوتی زایینی کراوەکانی ئیسلامی گەیشتنە ئەفغانستان ، لەسەدەی سیانزەو چواردەم جەنگیزخان و تەیموری لەنگ بەرەو ئەفغانستان هەنگاویان نا بەنیازی داگیرکردن، لەسەدەی نۆزدەهەم ئەفغانستان بوە گۆڕەپانی کاری جەنگ لە ململانێی نێوان ئیمپراتۆریەتی بەریتانیاو ڕوسیای قەیسەری لە پێناو ژێر دەست خستنی ئاسیای بچوك. دۆست محمد و دوای ئەو کوڕی و نەوەکەی سەرکردایەتی شەڕی دژ بە بەریتانیایان دەکرد لە نیوەی سەدەی یەکەمو لە نیوەی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بوە هۆی ئەوەی کە ئەفغانستان مافی ئۆتۆنۆمی وەربگرێت بەپێی ڕێککەوتنی ئینگلیزی و ڕوسی لە سالی ١٩٠٧، دوای ئەوە سەربەخۆیی تەواوی وەرگرت بەپێی پەیمانی (الدروالیندی) لە ١٩/٨/ ١٩١٩ ی زایینی، لەسالی ١٩٣٦ ئەمیر ئەمانە الله شانشینی ئەفغانستانی دامەزراندو هەولی نوێ کردنەوەی دەداو دوای ئەویش شانشین محەمەد زاهیر شابوو کە دەسەلاتی گرتە دەست لە سالی ١٩٢٣ تاکو سالی ١٩٧٣ بەهۆی کودەتای سەربازی لەلایەن فەریق محەمەد داودخان و ڕژێمی شانشینی لەناو بردو دەولەتی کۆماری ڕاگەیاند و هەر خۆی بوە سەرەك وولات، بەلام بەهۆی کودەتای سالی ١٩٧٨ بەسەرکردایەتی نور تەراکی و بەهیوای دامەزراندنی دەولەتێکی مارکسی لە ئەفغانستان بەیارمەتی یەکێتی سۆڤیەت. بەلام بەربەرەکانی کرا لەلایەن .چەکدارە ئیسلامیە توند ڕەوەکان بەپاڵپشتو یارمەتی ئەمەریکاو هاوپەیمانانی دژی دەسەلاتی نوێ بەهۆی پەیوەندی لەگەل یەکیەتی سۆڤیت. بەوهۆیە (بابراك کارمل) دەسەلاتی گرتە دەست و داوای لەسوپای سوری سۆڤیەتی کرد بێتە ناوخاکی ئەفغانستان لە ژێر سایەی پەیمانی بەرگری هاوبەش. لەمانگی/١٢/ ١٩٧٩ یەکێتی سۆڤیەت داگیری کردو توشی ڕوبەڕو بوونەوەیەکی بێ وێنە بوو لەلایەن گەلانی ئەفغانستان کە کەس چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکردو بووە هۆی شەڕێکی خوێناوی و بەربەرەکانی کردنی سەرۆك تیرەکان بەچەکی سوك و دوایی توانیان چەکی گەورە پەیدا بکەن و یارمەتیان بدرێت

لەلایەن ئەمەریکاو بەریتانیا و ئەڵمانیاو تورکیا بۆ بەربەرەکانی کردنی سۆڤیەت و دەربەڕاندنی بەڵام شەڕەکە زیاتر لە هەشت ساڵی خایاند لەنێوان حکومەتی ئەفغانستان و یەکێتی سۆڤیەت لەگەڵ چەکدارە بەرهەڵستکارە ئیسلامیەکاٌن کە بوە هۆی ئەوەی گروپی یەکەم شارو ڕێگا سەرەکیەکان بگیرێت و گروپی دووەمیش لادێکان. ئەوەش لەبیر نەکرێت کە بەرهەڵستکارانی هێزی سۆڤیەت لەلایەن سەرکردە ئیسلامیەکان بوە وەك محەمەد مەلا عومەر (تاڵەبان) ئوسامە بن لادن کە دروستکراوی ئەمەریکاو بەریتانیاو پاکستان بوو. لەمانگی/٤/ ١٩٨٨ ڕێککەوتن نامەیەك لەنێوان یەکێتی سۆڤیەت و ئەفغانستان و ئەمەریکاو پاکستان مۆرکرا بۆ یارمەتی نەدانی هۆزە شەڕکەراەکان بەرامبەر کشانەوەی هێزەکانی سوپای سۆڤیەت لە ئەفغانستان لەماوەی ساڵی ١٩٨٩ ئەوەش جێبەجێ کرا لەمانگی/١٩٨٩/٢ . لە ساڵی ١٩٩٢ حکومەتی ئەفغانستان لەلایەن ئیسلامیە توند ڕەوەکان لەناو براو حکومەتێکی نوێ لە کابول دامەزرا. دوای ئەوە سەرۆك هۆزو تیرەکان کێشەو ململانێ کەوتە نێوانیان و بوە هۆی ئەوەی کە ئەفغانستان بکەنە چەند ناوچەیەکی کارگێڕی تایبەتمەند بە سەرۆك هۆزو تیرەکانی و دوای ئەوە تاڵەبان توانی دەسەڵات بگرێتە دەست لە ساڵی ١٩٩٦ . بەڵام دژایەتی دەسەڵاتی تاڵەبان سەری هەڵداو بوە هۆی شەڕێکی خوێناوی و کاول کردنی وڵات و بەبێ ئەوەی هیچ وڵاتێك دانیان پیا بنێت تەنیا وڵاتی سعودیە وچەند وڵاتێکی تری عەرەبی ئیسلامی نەبێت کەیارمەتی تەواویان دەدان لەئامۆژگاری تەنیا ئەمەریکا نەبێت. بەڵام تاڵەبان سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە باکوری وڵات لە مەزار شەریف و تالوقان و تاکو لە مانگی/١٩٩٨/٨، دەسەڵاتی گرتەدەست لە ٩٠٪ لەسەر خاکی ئەفغانستان. لە ١٩٩٨/٨/٢٠ دبلوماتکارانی ئێرانی تیا کوژرا کە ئەمەریکا بە موشەك باشووری ڕۆژهەڵاتی کابول بۆردمان کرد بەناوی ئەوەی کە سەربازگەی فێربوونی هێزی چەکداری ئیسلامیەکانی تیایە بەسەرکردایەتی ئوسامە بن لادن. ئەو کێشەو ململانێیە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پەرەی دەسەند لەنێوان سەرکردە ئیسلامیەکانو بووە هۆی ئەوەی کە هەرچی کاری ڕاگەیاندن هەبوو ڕاگیرا لە تەلەفزیۆن و کەرستەو ئامێری ترو بوە گۆڕەپانی چەتەو ڕێگرو تاوانەوەی گەلانی بێ دەسەڵاتی ئەفغانستانو کۆچبەران لەزیادی دابون. حکومەتی تاڵەبان و ئوسامە بن لادن لە پەیمانەکانی بەئەمەریکاو هاوپەیمانەکانی دابوو لێی هەڵگەڕانەوەودژایەتیان دەکرد. ئەوەبوو لە ٢٠٠١/٩/١١ کارەساتی واشنتون و نیویورك لە ئەمەریکا ئەنجام درا بە تەقینەوەی هەردوو تاوەری بازرگانی گشتی جیهان و بۆ تۆڵە وەرگرتنەوە لە ئەمەریکا. هێزەکانی هاوپەیمان بەسەرۆکایەتی ئەمەریکا لە ٢٠٠١/١٠/٧ فرۆکەکانی جەنگی بۆردمانی شارەکانی کابولو قەندەهارو مەزاری شەریفی کرد بەهۆی بونی دەسەڵاتی تالبیانو ئوسامە بن لادنو لەناو بردنی لە فغانستان، لە٢٠٠١/١٢/١ حکومەتی کاتی گواستنەوە دامەرزا بەحکومەتی فیدراڵی بەسەرۆکایەتی حامد کارازای و لە٢٠٠١/١٢/٢٢ بورهاندەدین رەبانی ئەفغانستانی جێهێشت.

لەدوای روخانی دەسەڵاتی تالیبانو دامەزراندنی حکومەتی فیدراڵی ئەفغانی و دروست بونی بارو دۆخی نوێی دیموکراتی و بەرز بوانەوەی هەستی نەتەواەیتی و شۆڕشگێڕی کوردەکانی نیشتەجێی ئەفغانستان لەشارەکانی داهورو کەرایو قەندەهار داوای

مافی نەتەوەیان دەکەن کەژمارەی دانیشتوانیان لە ٣٥٠ هەزار کورد زیاترە، لە٢٠٠٢/١/٤ بڕیاری دەستوری نوێی درا بەدامەزراندنی ڕژێمێکی سەرۆکایەتی لەدوای تەواو بوونی حکومەتی دوای هەڵبژاردن کە لەدوو ئەنجومەن پێك هاتووە کەبەیەکەم دەستووردادەنرێت لەدوای ١٩٦٤.

لەهەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٤/١٠/٩ کەبۆ یەکەم جارە لەمێژووی ئەفغانستان ئەنجام بدرێ کە حامد کارازای بەسەرەك کۆماری ئەفغانستان هەڵبژێردرا لەدوای سێ ساڵ لەکاری سەرەك کۆماری کاتی لەدوای روخاندنی ڕژێمی تالەبیان و ئوسامە بن لادن.

- ئەفغانستان ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی.

# ئوردن

- ناوی ڕەسمی: شانشینی ئوردنی هاشمی.
- پایتەختی: عومان، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر ٤٩٦ هەزار کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: زەرقا، ئربد، سەلت.
- بەندەرەکانی: عەقەبە.
- ڕووبەری: ٤٤٤ر٢٤ میل چوارگۆشەو ٢١٠ر٨٩ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی:٠٠٠ر٣٥٠ر٥ ملیۆن کەسە لەو ژمارەیە زیاترە لە ٢٥٠٠کەس کوردە بەپێی ئاماری ٢٠٠٢.
- چڕی دانیشتوانی: ٢١٥ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ١٠ر٤٪.
- نەژادەکانی: عەرەب ٩٥٪، ئاشووری، کلدان،درزی، کورد.
- زمانەکانی: زمانی عەرەبی(زمانی ڕەسمیە)، ئینگلیزی، زمانەکانی تری تیایە.
- ئایینەکانی: ئیسلام ٩٢٪، مەسیحی ٨ ٪ .
- زانینی نوسین و خوێندن: ٨٥٪ .
- ڕژێمی دەسەلآت: شانشینی دەستوریە. دوو ئەنجومەنی هەیە. ئەنجومەنی باڵا پێك هاتوە لە ٤٠ ئەندام کە شانشین دایان دەمەزرێنێت. ئەنجومەنی خوارو پێکهاتووە لە ٨٠ ئەندام هەڵدەبژێردرێن بە پێشنیاری گشتی، دەستوری ئوردن ماوەی بەئاین و وتارو ڕۆژنامە و کۆبونەوەو خاوەندیەتی تایبەتی داوە. یاسای ١٩٩١ ماوە بە دامەزراندنی پارتە ڕامیاریەکاندایە.
- پارتە ڕامیاریەکان: دوو کۆمەڵەی سەربەخۆی تیایە کە لایەنگیری شانشین دەکەن، پارتی بەرەی کاری ئیسلامی، توندڕەوی ئیسلامی، پارتی کۆمۆنیستی ئوردن کە مۆڵەتی پێ نەدراوە.
- دابەشی کارگێڕی: ٨ پارێزگایە.
- بەرگری: ٥ر٦ ٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٢٠٠ر١٠٤ هەزار کەسە.
- دراوی: دیناری ئوردنی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٠٨٠ر٢٠ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٨٠٠ر٤ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر٤٪ لە خاکی وولآتەکە.

- بەرهەمی کشتوکاڵی: دانەوێڵە، زەیتون، تەرە، میوەجات.
- بەرهەمی سروشتی: فوسفات، پۆتاس.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ۲ر۲۰۰ ملیۆن سەر، بزن ۷۹۸ر۰۰۰ هەزار سەر، پەرەور ۲٤ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی کارەبا: ٥ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازی: پاکردنەوەی نەوت ، چیمەنتۆ، بەرهەمی سوك، داودەرمان، جلو بەرگ.
- دەرچووەکانی: فۆسفات، میوەجات، تەرە، پێداویستی کیمیا، داودەرمان، جلو بەرگ.
- داهاتەکانی دەرەوەی: ئاژەڵی زیندوو،گۆشتی ئامادەکراو، بەروبومی نەوتی، مافورو کۆمبار، کەلوپەلی سەرمایەداری، ئۆتۆمۆبیل، کەلوپەلی خواردەمەنی، دانەوێڵە.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، یابان، سعودیە، عیراق، یەکێتی ئەوروپا، چین، چەندین وولاتانی تری عەرەبی و ئەفەریقی.
- جوگرافیای وڵات: ئوردن دەکەوێتە رۆژهەڵاتی ناوەراست، لەرۆژئاوای ئیسرائیلە، لەباشووری سعودیەیە، لە رۆژهەڵاتی عیراقە، لەباکوری سوریایە. خاکی ئوردن لە ۸۸٪ لە گردۆلکەو چیا وشکانی پێک هاتوە، بەڵام زەویە بەپیتەکانی دەکەوێتە رۆژئاوا، دۆڵی (سەدعی)بەناوبانگە، کە ئوردن دەکاتە دووبەش کە زێی ئوردنی پێدا دێتە خوارێ بە درێژی ۳۲۰ کیلۆمەتر و دەریاچەی تەبەریەو دۆڵی فۆربۆو دەریای مردو دەبرێت، کە سەرچاوەیەکی گرنگی ئاوی ناوچەکەیە. کەش و هەوای جیاوازە لەنێوان کەشی دەریای سپی ناوەراست لە لەگەڵ بەرزایەکان و کەشەکەشی نیمچە کەمەرەیی زەویە لە دۆڵی ئوردن، بەڵام لە بیابانەکەی باران بە دەگمەن دەبارێ.
- مێژوی وڵات: لە سەدەی سێیەمی پێش زاین ولایەتی ئوردن لەرۆژهەڵاتی ئوردن دامەزرا کە بەناوی بانگ بوو بە ولایەتی (جیدیوون و ئامون و موبو ئەدبوم)، لە سەدەی چوارەمی پێش زاین قیبتیەکان کە بەزمانی عەرەبی دەدوان ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئوردنیان داگیر کردو لە دوای ئەوە لە ساڵی ٦٤٥ پێش زاین رۆمانیەکان هەڵسانە بە داگیر کردنی و بووە پارچەیەك لەولایەتی نیمچە بیابانی عەرەبی سەربە ئیمپراتۆریەتی رۆمانی. لە ساڵی ٦٣٦ زاینی هێزی ئیسلامی توانیان هێزەکانی بیزەنتی دەربەرێنن لە پێکدادانی یەرموك لە باکوری ئوردن و دوای ئەوە دانیشتوانەکەی ئاینی ئیسلامیان لە باوەش گرت و بوە رێبازی خەباتیان .. لەنێوان ساڵەکانی ۱۰۹۹ تا ۱۱۸۷ ئوردن بوە پارچەیەك لە شانشینی لاتینی کە سەلیبیەکانی قودس دایان مەزراند لە قودس، بەڵام سەرکردەی کوردی موسڵمان سەلاحەدینی ئەیوبی توانی قودس رزگار بکات لەژێر دەستی سەلیبیەکان لە ساڵەکانی ۱۱۲۸ تا ۱۱۹۳، لە سەرەتای سەدەی شانزەهەم رۆژهەڵاتی ئوردن بووە پارچەیەك لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی و بەرێوەبردنەکەی لە دیمەشقی پایتەختی سوریای ئێستا بوو. دوایی ئەوە هێزە بەریتانیەکان توانیان لە جەنگی یەکی جیهان داگیری بکەن بەسەندنەوەی لە تورك و لکاندنی لەگەڵ کەرتی رۆژئاوای فەلەستین و زێی ئوردن بخرێتە ژێر کارگێری ئینتیدابی بەریتانی بە برێارێکی کۆمەڵەی گەلان ...... لە ساڵی ۱۹۲۰ بەرێوەبردنی رۆژهەڵاتی ئوردن جیاکراوە لە کارگێریەتی فەلەستین، لە ساڵی ۱۹۲۱ خرایە ژێر دەسەڵاتی ئەمیر عەبدوللای کوڕی حسین کە لەبنەڕەتا لەدایك بوی عەرەبی سعودی بوە، لە ساڵی ۱۹۲۳ بەریتانیا دانی نابەسەربەخۆی رۆژهەڵاتی ئوردن لەژێر ئینتیدابی خۆی، لە ۲۲/۳/ ۱۹۲٦ بەریتانیا دەسەڵاتی ئینتیدابی خۆی هەڵگرت لەسەر ئوردن بەهۆی لایەنگیری

ئەمیر بۆ بەریتانیا لەجەنگی دووەمی جیهان، ڕۆژهەڵاتی ئوردن سەربەخۆی خۆی وەرگرت لەبەریتانیاو ناوی گۆڕاو بوە ئوردن و ئەمیر عەبدوللا بوە شانشین. لە ساڵی ١٩٤٨ ئینتیدابی بەریتانیا لەسەر فەلەستین هەڵگیرا لەلایەن بەریتانیا بەدامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل لەفەلەستین، ئیسرائیل پەیمانی دۆستایەتی و شەڕنەکردنی لەگەڵ هەموو ولاتانی عەرەبی مۆر کرد لەگەڵ هەریەکیان بەتەنیا. لە ساڵی ١٩٥١ شانشین عەبدوللا تیرۆر کراو تەلالی کوری جێگەی گرتەوەو لە ساڵی ١٩٥٢ ئوردن دەستوری نیمچە دیموکراتی وولاتی شانشینی ڕاگەیاند، بەڵام تەلال بە هۆی نەخۆشی لەسەر کورسی عاتە خوارەوەو کوڕەکەی شانشین حوسین بوە شانشینی ئوردن تاکو کۆچ کردنی لەمانگی/٤/ ١٩٩٩ و عەبدوللای کوڕی جێی گرتەوە بە شانشین عەبدوللای دووەم...... یەکێتی فیدرالی لەنێوان ئوردن و عیراق مۆرکرا لە ساڵی ١٩٥٨ و ئەم یەکێتی هەڵوەشایەوە بەهۆی شۆڕشی ١٤/تەموزی/ ١٩٥٨، لە جەنگی ڕۆژانی شەش لە ١٩٦٧/٦/٥ ئیسرائیل کەرتی ڕۆژئاوای ئوردنی داگیر کرد لەگەڵ شاری قودس، لەمانگی /١٩٧٤/١٠ شانشین حوسین ڕازی بوو لەسەر بڕیاری کۆنگرەی لوتکەی عەرەبی بە دامەزراندنی دەوڵەتێکی فەلەستینی سەربەخۆو دانانی ڕێکخراوی ڕزگاری فەلەستین بەنوێنەری گەلی فەلەستین. لە ساڵی ١٩٧٦ شانشین حوسین ئەنجومەنی جێگرانی هەڵوەشانەوەو کاری پارتە ڕامیاریەکانی قەدەغە کرد. بەڵام لەمانگی/١٩٩١/٦ شانشین حوسین لە ئەنجامی گێرو گرفت و خۆپیشاندان و ناڕەزایی جەماوەر ڕێککەوتنێکی لەگەڵ پارتە بەرهەڵستکاران مۆر کرد بە پێکهێنانی پارتەکان و بوە هۆی ئەوەی کە یاسای ٢٤ ساڵەی عورفی هەڵوەشێتەوە.

شای ئوردن لە مانگی/٩/١٩٨٠ پشتگیری تەواوی خۆی بۆڕژێمی بەعسی عیراق ڕاگەیاند لەشەڕی هەشت ساڵەی لەگەڵ ئێران و هەموو توانای بۆ عیراق تەرخان کرد بەتایبەتی لەبەندەری عەقەبەکە ببووە بەندەرێکی عیراق بۆ هێنانی خواردەمەنی و چەك و تەقەمەنی. شای ئوردن پشتگیری تەواوی ڕژێمی عێراقی دەکرد دژی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بەهەموو جۆرێکی ئاشکراو نهێنی تاکو شەڕی کەنداوی دووەم بەهۆی داگیر کردنی کوێت لەلایەن ڕژێمی بەعسی عیراق و بەشداری کردووە لە ئەنفال و کیمیا باران و دەربەدەری گەلی کورد و داگیر کردنی کوردستان و فراوانکردنی سنووری خاکی عەرەبی. لەدوای ساڵەکانی ١٩٨٩ خۆپیشاندان و گێرو گرت و پاڵە پەستۆی جەماوەری ئوردن سەری هەڵدا بەهۆی بەرزکردنەوەی نرخی کەلوپەلی خۆراك بەڕێژەی لە ٥٠٪ لەوکاتەی داهاتی نەوتی وەرگیراوی لە عیراق بەرەو کزی دەچوو بەهۆی جەنگی نێوان عیراق و ئێران. لەدوای ٢٣ ساڵ هەڵبژاردن ئەنجام دراو ئیسلامیە توند ڕەوەکان توانیان ٢٥ کورسی وەربگرن ... لەمانگی/٧/ ١٩٩٤ ئوردن و ئیسرائیل ڕێککوتن لەسەر بارودۆخی شەڕی ناکاوی لەنێوانیان کە ٤٦ ساڵی خایاندو لە ١٩٩٤/١٠/٢٨ بەڕەسمی ڕێکەوتنەکەیان مۆرکرد. . . لەدوای گەڕانەوەی دەسەڵاتی ئەمیری کوێت و ئاڵۆز بوونی پەیوەندی ڕژێمی بەعسی عێراق و ولاتانی عەرەبی بەتایبەتی سعودیەو کوێت، ئوردن پەیوەندی خۆی لەگەڵ عێراق تێك نەدا بەشێوەیەکی ڕەسمی و بەتایبەتی لەبواری ئابوری پەیوەندیان زۆر بەهێز بوو، یەکەم بۆ یارمەتیدانی عێراق و دووەم بۆ هەرس نەهێنانی ئابووری ئوردن بەتایبەتی لەدوای دانانی گەمارۆی ئابوری تەواو لەسەر عێراق

لەبەرنامەی خۆراک بەرامبەر بەنەوت.

دوای لێدان و روخاندنی رژێمی سەدام لە ٢٠٠٣/٤/٩ لەلایەن ئەمەریکاو وڵاتانی هاوپەیمان ئوردن نیمچە بێلایەنی خۆی ئاشکرا کردو ئاسانکاری بۆ دەسەڵاتی عێراق دەکرد بەگواستنەوەی فرۆکەو موشەک و چەندین جۆری چەک و پارە بەحەشاردانی لەلای خۆی بۆ ئەگەری دوارۆژی.

بەڵام لەلایەکی تریش چاوی لەوە بوو کەدەسەڵاتی شانیشنینی بگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەکەیان لەعێراق بەهۆی لەناوبردنی بنەماڵەی شانشین فیصل لەرووخاندنی دەسەڵاتی شانشین لەعێراق و راگەیاندنی رژێمی کۆماری لە١٤/٧/ ١٩٥٨و دەربەدەربوونی بنەماڵەکە کەلەگەڵ دەمەزراندنی دەوڵەتی عێراق لەسعودیەوە هێنرابوون و کرابوونە دەستەڵاتدار لەعێراق ،دوای ئەوە لەساڵی٢٠٠٤ زۆربەی بنەماڵەو کەس و کاری سەدامی لەوڵاتەکەی جێگیر کردووە بەتایبەتی دووکچە مێرد کوژراوەکانی، ئوردن بیرو بۆچوونی راست و رێکی رەوای نەبوو بەرامبەر رووخانی سەدام تاکو تەواو بوونی ئەوپەڕتووکە ئوردن بەرژەوەندی خۆی پارستووە لەهەمووبوارەکان، یارمەتی گەلانی عێراقی نەداوە بەتایبەتی گەلی کورد لەتووشبوونی مەرگەستەکان لەلایەن سەدام..

بامێژووی کوردیش بێتە ناو مێژووی پەرەسەندن و پێشکەوتنی وولاتی ئوردن کەزیاتر لە ٣٥٠٠ کورد لەوڵاتی ئوردن دەژین وئەمەش هەر لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی ئەیوبییەکان بوە لەساڵی ١١٧٣ی زایینی کەلەلایەن سەلاحەدینی ئەیوبیەوە دامەزراوە لەکاتی جەنگکردنی لەگەڵ سەلیبیەکان بەناوی میرنشینی (کرک) ئەو میرنشینە ماوەی هەشتا ساڵ دەسەڵاتداری کردووەو شوێنەواری لەدوای خۆی بەجێ هێشووە وەک قەلای عجلوان و قەڵای سەڵت کەوتونەتە شوێنی ئێستای شانشینی ئوردن، ئەو کوردانەش لەگەڵ رزگارکردنی قودس بونە لەلایەن سەلاحەدینی ئەیوبی و نیشتەجێی قودس و دەوروبەری لەگوندو شارۆچکەکان بونە کەکاتی خۆی لەباکوری کوردستان و باشوری کوردستان بۆی چونە کەلەریزەکانی سوپای سەلاحەدین بوینەو دوای هەرەس هێنانی دەوڵەتی کەرک مارنەتەوەو لەژیان وکارکردن بەردەوام بونەو رۆڵی کاریگەریان هەبووەو هەیە تاکو ئێستاش بەتایبەتی لەدوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئوردن و بەتایبەتی لەگەڵ شانشینی ئوردن کەزۆر لەپلەو پایەی دەسەڵاتی ئوردن کاریان کردووەو کاردەکەن و جێگەی متمانەی دەسەڵاتی شانشینی ئوردنن لەهەموو بوارەکانی پەرەسەندن و پێشکەوتن لەکاروباری وڵاتی ئوردن لەپایەکانی وەزیرو سەرەک وەزیران و بالوێزو چەندین پایەی تر لەدام و دەزگاکانی دەسەڵاتی ئوردن رۆڵی کاریگەریان هەبووەو هەیە لەبوارەکانی نوسەرو رۆژنامە نووس و چاپەمەنی و بازرگانی و کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ. . . رۆڵی بەرچاویان هەبووەو هەیە لەدروستکردنی مزگەوت و فێرکەو. . . هەروەها . . کوردەکانی فەلەستین وئوردن بەر لە پێک هاتەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی نیشتەجێی ناوچەکە بونەو تاکو ئێستاش مێژوو زمان و داب و نەریت و کەلتوری کوردیان پاراستووەو بەرەو پێشەوە دەچی و پەیوەندی توندیان هەیە لەگەڵ رەچەڵەکەکانیان لەباکوری کوردستان و لەهەمان کات ژن وژن خواستنیان لەگەڵ ئوردنیەکان هەیەو بەردەوامە.

لەگەڵ ئەوەشدا کوردەکانی ئوردن و فەلەستین لەهەردوو شەری نێوان ئیسرائیل و عەرەب لەساڵەکانی ١٩٤٨و ١٩٦٧ بەشداریان کردوە،چەندەها خانەوادەی عەشیرەتی فەلەستینی کە بەرەگەز کوردن و مێژووی هاتنیان

بۆ ئوردن دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەیوبی ئەو خانەوادانەو عەشیرەتانە لەچەند شارو شارۆچکەو لادێ نیشتەجێن وەك (ئەیوبی،هەشلمون، تیرۆخ، ئەبوخەلەف، جەموری، ئەبو زوهرە، ئیمام قەیمەری، کورد، زازا، هەلیکۆی، زەلوم، شاور) چەندین بنەماڵەی تری دیار. بۆ ئەم مەبەستە بەدەیا بەڵگەو نوسراوەهەن کە ئەو راستیانە دەسەلمێنن... ئەردن بەشداری کۆبوونەوەی وەزیرەکانی دەرەوەی دراوسێکانی عێراقی کردوەلە کۆبوونەوەی قاهیرەی پایتەختی میسرلە ٢٠٠٤/٧/٢٢وبەشداری لە کۆبوونەوەی شەرم شێخی میسری کردوەکە لە ٢٢/١١/ ٢٠٠٤ گرێدراو هەمان ڕۆڵی هاوسەنگی لەگەڵ تورکیاو سوریاوئێرانو وولآتانی عەرەبی هەبووەو هەیە.

- ئوردن ئەندامە لە زانکۆی وڵاتانی عەرەبی... ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەندامە لەرێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی.

# ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو

- ناوی ڕەسمی: ئیماڕاتی عەرەبی یەکگرتوو.
- پایتەختی: ئەبوزەبی، ژمارەی دانیشتوانی ٨٣٥ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- شارە گرنگەکانی: شارقە، سەری خێمە.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: دوبەی.
- ڕووبەری: ٢٢ر٢٧٨ میل چوارگۆشەو ٨٣ر٦٠٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٢ر٤٦٠ر٠٠٠ ملیۆن کەسە. بەپێی ئاماری ٢٠٠٠.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢ر٨٪.
- چڕی دانیشتوانی: ٧٦ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- نژادەکانی: عەرەب، ئێرانی، پاکستانی، هندی.
- زمانەکانی: عەرەبی (زمانی ڕەسمیە) فارسی، ئینگلیزی.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٨٥٪.
- ئایینەکانی: ئیسلام.
- ڕژێمی دەسەلآت: ئیماڕاتی عەرەبی لە ساڵی ١٩٧١ لە حەوت ئیماراتی ئاشت بوونەوە پێك هاتووە ئەویش، ئەبوزەبی، دوبەی، شارقە، عومان، فوجیرە، سەری خێمە (راس الخیمە)، ئوم قوین. یەکێتی لەنێوان ئەو ئیماراتانە ماوەی پێ دراوە کەیەك ڕامیاریەتی هاوبەش بەکار بێنن لەپەیوەندی نێودەوڵەتی، بەرگری، بوژانەوە، لەگەڵ پاراستنی هەر ئیماراتێك کە ئەندامە لەڕژێمەکەی ناو خۆی بەسەرۆکایەتی دادوەرێك، ئەنجومەنی یاسا دانانی هەیە کە لە٤٠ ئەندام پێك هاتیە، ئەو کورسیانە بەم شێوە دابەش کراون. هەشت کورسی بۆ ئەبوزەبی و دوبەی، شەش کورسی بۆ (راس الخیمە) و شارقە، چوار کورسیش بۆ هەریەك لە سێ ئیماراتەکەی تر.
- پارتە ڕامیاریەکان: هیچ پارتێکی ڕامیاری ماوەی پێ نەدراوە.
- دابەشی کارگێڕی: حەوت ئیماڕاتە و هەر یەکێکیان مافی ئۆتۆنۆمی تەواوی خۆی هەیە.
- بەرگری: ٥ر٨٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٦٥ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- دراوی: دەرهەم.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٥ر٤٠٠ ملیار دۆلارە.

- بەشی تاک لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٢٥ر٠٠٠ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: هیچ رێژەی زەویەکی کشتوکاڵی نییە دەست نیشان بکرێت تەنیا زەویەکی کەم هەموو شتێک لە خواردەمەنی و دانەوێڵەو میوەجات و خۆراک و تەرە لە دەرەوەی وڵاتەکەیان دێنن.
- بەرهەمی کارەبا: ١ر٥٠٠ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- دەستکەوتە سەرەکیەکان: تەرە، فەریکە خورما، یان خورمای نەگەیو.
- سامانی سروشتی: نەوت، غاز، کەلوپەلی بینا سازی.
- دەرچووەکانی: نەوت، خورمای نەگەیو، ماسی، غازی سروشتی.
- داهاتەکانی دەرەوەی : کەلوپەلی بەکارهێنان و خەرجکردن، خواردەمەنی، کەلوپەلی سەرمایەداری.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، ئەورووپای رۆژئاوا، ئەمەریکا، سنگافورە، کۆریا، هیند، ئێران.
- سامانی نەوت: سامانی نەوت دەرهێنراو لە ئەبوزەبی و دوبەی و شارقە وای کردیە دەرامەتی خەڵک لەو ئیماراتانە بەرزتر بێت لە دەرامەتی وڵاتانی تری جیهان، بەتایبەتی رۆژ هەڵاتی ناوەڕاست.
- جوگرافیای وڵات: وڵاتی ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو دەوڵەندە بە نەوت، دەکەوێتە رۆژهەڵاتی نیمچە بیابانی عەرەبی لەسەر کەنداوی فارسی و کەنداوی عومان.. سعودیە دەکەوێتە رۆژئاواو باشووری، عومان لە رۆژهەڵاتی، قەتەر لە باکووری، درێژی کەنارەکانی ٤٠٠ میل و ٦٤٠ کیلۆمەترە و زۆربەی زۆری خاکەکەی بیابانیە، بەڵام لە رۆژهەڵاتی زنجیرە چیای بەپیتی هەیە کە دار خورماو دانەوێڵەی تیا دەچێنرێ و ڕاوی ماسی و ماڵاتی لێ بەخێو دەکرێ لەگەڵ بەردی مرواری، تاکو ئێستاش دوبەی مەڵبەندی بازرگانیە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئەو کەمە نەتەوایەتیانەی دەرەکین و نیشتەجێن ژمارەیان زیاترە لە دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئەم وڵاتە. کەش و هەوایەکی گەرمی هەیە لەگەڵ کەمی باران، ڕەشەبای لمی زۆرە لەبەر بیابانی خاکەکەی.
- مێژووی ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو: دانیشتوانە ڕەسەنەکەی کاری دەریاییان دەکرد بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانیان، لەسەدەی حەوتی زاینی ئاینی ئیسلامیان لە باوەش گرت و بوە پەیرەوچون ویرای ڕێکسختنی کاروباری ژیانی کۆمەڵایەتیان، لەسەدەی شانزەم پورتوگالیەکان پەیوەندی بازرگانیان بەدەست هێنا لەگەڵ دەوڵەتەکانی کەنداوی فارس و دوای ئەوە لەسەدەی هەژدەم جموجوڵی کاری بازرگانی پەرەی سەند لەگەڵ ئەو ئیماراتانەو بنەماڵەی دەسەڵاتدارەکانی ئێستای ئەو ئیماراتانە دەگەڕێتەوە بۆ ڕەگەزی ئەو گەلانە.

لەسەدەی نۆزدە بەریتانیا چەند پەیمانێکی لەگەڵ دەسەڵاتدارەکان مۆرکرد لەو ناوچانەی کە کەشتیەکانی بەریتانیای تیابوو لە دەریای فارس و پەلامار نەدرێت لەلایەن دانیشتوانی ناوچەکە و پاراستنی بەرامبەر بەوەی بەریتانیاش پارێزگاری لە دەسەڵاتداران بکات. لەگەڵ ئەوەشدا چەندین سەرۆک تیرەو هۆزەکان هەڵسان بەدورستکردنی ناوچەی شێخایەتی و بوە هۆی ئەوەی کێشەو ململانێ سەری هەڵدا، دوای ئەوە لە ساڵی ١٨٢٠ پەیمانی نیمچە چارە سەری مۆرکرا تاکو ساڵی ١٨٥٢ کەبۆ یەکجارەکی ململانێی نێوانیان کۆتایی هات.

دوای کۆتایی هاتنی شەڕی کەنداوی یەکەم لەنێوان عێراق و ئێران و داگیرکردنی کوێت لە

٢/٨/١٩٩٠ بوە هۆی لێک ترازانی پەیوەندی نێوان وعێراق و وولاتانی عەرەبی بەتایبەتی سعودیەو ئیماراتی عەربی یەکگرتوو بەپچڕانی پەیوەندی لەگەڵ عێراق و لایەنگری کردنی ئەمەریکا بۆ گەراندنەوەی دەسەلاتی ئەمیری کوێت و دوای کۆتایی هاتنی داگیرکردنی کوێت و هاندانی ئەمەریکا و هاوپەیمانان بۆ بەرگری کردن لەولاتەکانیان تاکو پێش لێدانی عێراق کەرامیاریەکی دولایەنەیان بەکاردەهێنا چ بۆ لێدانی عێراق و لێنەدان و لەدەست نەدانی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکان لەگەڵ ئەوەشدا ولاتەکانیان کردە سەرابازگەی سوپای ئەمەریکاو هەموو جۆرەکانی دەشتی و ئاسمانی و دەریای کەلە سالی ٢٠٠٣ پەلاماری عێراق دراو رژێمی بەعس روخێنرا لەدوای ئەوەش هاوکاری گەلی عێراق نەبوون بەڵکو هەموو هەولێکیان بۆ تێکدانی بارۆدۆخە کە بوە بەهۆی مەترسی دوارۆژیان لەدەسەلاتەکەیان و گۆرانکاری دراوسێکانی بە هەمووشێوەیەک لەگەڵ رژێمی عێراق هەتا بەرامبەر بەکوردو کارەساتەکان لەلایەن عێراق.

لە سالی ١٨٩٢ شێخەکانی کەناری دەریا رێکەوتنێکیان مۆرکرد لەگەڵ بەریتانیا بەتایبەتی لەپێناو لەدەست نەدانی هیچ کارو زەویەک بەهەر جۆرێك بێت.

لە سالی ١٩٥٨ نەوت لەوولاتانی ئیماراتەکە دۆزرایەوەو بووە هۆی بوژانەوەی ئابووری و پەرەسەندن و پێشکەوتنی وولاتەکانیان.

لە ٢/١٢/١٩٧١ ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو سەربەخۆیی وەرگرت لەلایەن بەریتانیا.

ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو یەکەم ولاتی دامەزرێنەری ئەنجومەنی هاوبەشی کەنداو بووە لە سالی ١٩٨١ پشتگیری عیراقیان دەکرد لەشەری نێوان ئێران و عیراق لەنێوان سالانی ١٩٨٠ – ١٩٨٨ . لە سالی ١٩٨٥ پەیوەندی ئابووری و دیبلۆماسیان لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت و چین بەست و بەرەو پەرەسەندن هەنگاوی دەنا. لە سالی ١٩٨٧ پەیوەندیان لەگەڵ میسر گەراندەوە دۆخی جاران کە پەیوەندیان پچرابوو بەهۆی پەیمانی نێوان میسرو ئیسرائیل لەلایەن محەمەد ئەنور سادات. لە سالی ١٩٩٢ کێشەو تەنگەژەی پەیوەندیان لەگەڵ ئێران پەیدابوو بەهۆی هەرسێ دوورگەکەی کەنداو تومبر کوبراو تومبر سخراو ئەبو موسا دوای وردەوردە رێککەوتن کە کێشەی دورگەکان لەرێگەی (دادگای دادی نێو دەولەتی لەلاهای چارە بکرێت). شێخ زاید ئەمیری ئیماراتی یەکگرتوو لە ٣/١٠/٢٠٠٤ کۆچی دوای کردو لە ٤/١٠/٢٠٠٤ کورە گەورەکەی خەلیفە زاید جێگەی گرتەوە کەلەهەلبژاردن بریاری بۆ دراو بەبنەمالەیەکی خەمخۆری گەلەکەو دەولەتەکەیان دادەنرێت.

- ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو ئەندامە لە زانکۆی ولاتانی عەرەبی، ئەندامە لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە رێکخراوی ولاتانی دەرهێنەری نەوت، ئەندامە لەرێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی.

# بەحرێن

- ناوی ڕەسمی: دەوڵەتی بەحرێن.
- پایتەختی: مەنامە، ئەویش بەندەرێکی گرنگە، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر١٧٥ هەزار کەسە.
- شارە گرنگەکانی: مەحرەق، جدحفس، شاری عیسی، ڕەفاعە.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: بەندەری سەلمان.
- ڕووبەری ٢٦٢ میل چوارگۆشەو ٦٧ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٦٤٥ هەزار کەسە بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- چڕی دانیشتوانی: ٢٤٦١ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- نـژادەکانی: بەحرێنیـەکان ٦٣٪ ئاسـیایەکان ١٣٪ عەرەب ١٠٪ ئێرانی ٨٪.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٩ر٢٪ .
- زمانەکانی: عەرەبی (زمانی ڕەسمیە) ئینگلیزی ، فارسی، ئوردو.
- ئایینەکانی: ئیسلامی شیعە ٧٠٪ سونە٣٠٪.
- زانینی نوسین و خوێندن:٨٥٪.
- ڕژێمی دەسەڵات: شانشینیەکی تاك ڕەویە.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی ڕامیاری قەدەغەیە.
- دابەشی کارگێڕی: ١٢ ئەنجومەنی شارەوانییە.
- بەرگری: ٥ر٦ ٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٥٠٠ر١١ هەزار کەسە.
- دراوی: دینارە.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٥٠٠ر٨ ملیـار دۆلارە.
- بەشـی تـاك لـەکۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٥٠٠ر١٤ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٣٪ لەخاکی بەحرێن.
- بەرهەمـەکانی کـشتوکاڵی: هێلکـە، تـەرە، میوەجات.
- پیـشەسازی : پـاڵاوتنی نـەوت، ئەلـەمنیۆم، چاکردنەوەی کەشتی.
- بەرهەمی سروشتی: نەوت، ماسی،غاز.
- دەرچـووەکانی: نـەوت، غـازی سروشـتی، ئەلەمنیۆم، ماسی، بەرهەمەکانی نەوت.
- داهاتـــــــەکانی دەرەوەی: ماشـــــــێن، پێداویستیەکانی بەرهـەمی نـەوت، ئۆتۆمۆبێـل، خۆراك، دانەوێڵە، پێداویستی بیناسازی.
- بەرهـــەمی کارەبـا: ٥٠٠ر٤ ملیـار کیلـۆوات کاتژمێر.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، بەریتانیا، یابان، سعودیە، وڵاتـانی تـری عـەرەب، چینی میللی، فەڕەنسا.
- جوگرافیـــای وڵات: بـــەحرێن ئەرخـــەبیل دەکەوێتە کەنداوی فارسی دوور لە کەنارەکانی شانشینی سعودیە. زەویەکە دورگەی‌و ڕاست و لمیەو بەردێنیە.

نـزیکترین دراوسـێی لـە ڕۆژ ئـاوا سـعودیە، مەنامەی پایەتەخت لەگەڵ شاری دەمامی سعودیە بەیەك دەبەستەوە بەهۆی دروستکردنی پردێك لەنێوا نیان لەسەر بەندەری کەنداو کە درێژیەکەی زیـاترە لـە ١١ کیلۆمـەترە. نـزیکترین دراوسـێی لـە ڕۆژهـەڵاتی نیمـچە بیابـان قەتـەرە، بـەحرێن گەورەترین دورگەی ئەرخەبیلەو بەزۆر دوورگەی بـچوك نوسـاوە، خاکەکـەی بەبـەردی وردە داپۆشراوە بە خۆرێکی لماوی بێ توانای مردوکە سـودی لێوەرناگیرێـت، لـەرووی کەشـوهەوای لـەوەرزەکانی گەرمـەو وڵاتێکـی شێدارە، بارانی کەمەو ڕەشەبای خۆڵاوی زۆرە بەتایبەتی لەدوای مانگی تەموزو سەرەتای مانگی ئاب.

- میژووی بەحرێن: لەسەدەی چواری زاینی بەحرێن بووە پارچەیەك لە ئیمپراتۆریەتی ساسانی فارسی، لەسەدەی حەوتەم ئایینی ئیسلام بوە ئایینی راستەقینەیان، لە سەدەی هەشتی زاینی کەوتە ژێر دەسەڵاتی عەباسیەکان. لە ساڵی ١٥٢١ پرتوگالیەکان داگیریان کرد بۆ ماوەی هەشتا ساڵ سەرەڕای گیروگرفت و کێشەی ناوخۆیی. لە ساڵی ١٦٠٢ کەوتە ژێر دەسەڵاتی فارسە شیعەکان. لە ساڵی ١٧٨٣ دەسەڵاتی فارسی شیعە لەناوبرا و بەحرێن بووە ناوچەیەکی شێخایەتی دەسەلاتداری بنەماڵەی ئال خەلیفەی سونە، ئەو بنەماڵە دەگەرێتەوە سەر بنەماڵەی تیرەی (عنزە)ی بنەماڵەی (ئال سعود) کە دەسەڵاتداری شانشینی عەرەبی سعودین.

لە ساڵی ١٨١٦ تاکو ١٨٢٠ پەیمانی هاوکاری و ئاشتی مۆرکرد لەگەڵ بەریتانیاو چاوەڕاونی نەمانی تاك ڕەوی و خۆپەرستی و کێشە نەمێنێت. لە ساڵی ١٨٦٢ بەحرێن بووە وڵاتێکی پارێزراو لەلایەن بەریتانیا کە شێخەکی عەرەب و ڕاوێژکارێکی بەریتانی دەسەڵاتی وڵاتیان گرتە دەست. لە ساڵی ١٩٢٣ دەسەڵاتی بەریتانیا بەرەو زیادی دەڕۆیشت لەسەر وڵات لەوکاتەی شێخ عیسی لە کورسی هێنرا خوارێ و بەریتانیا (تشارلز بلجریفی) کردە ڕاوێژکار لەسەر بەحرێن، لە ساڵی ١٩٢٨ ئێران داوای بەحرێنی کردەوە.

لە سیەکان نەوت لە بەحرێن دۆزرایەوە بوە سامانێکی سەرەکی وڵاتی بەحرێن. نەتەوەیە عەرەبەکان ئەنجومەنێکیان دامەزراند بەناوی ئەنجومەنی یەکێتی نیشتیمانی، بەڵام لەناوبرا بەهۆی هەڵسانیان بە خۆپیشاندان دژی بەریتانیا بەهۆی بەشداری کردن لە شەڕی سوێس (کە بەریتانیاو فەڕەنساوئیسرایل هاوکاریان کرد دژی میسر لە ئۆکتۆبەری ١٩٥٦).

لەساڵی ١٩٦٨ بەریتانیا هێزەکانی خۆی لە بەحرێن کشاندەوە. لە ساڵی ١٩٧٠ ئێران ڕەزامەندی کرد لەسەر ڕاپۆرتی نەتەوە یەکگرتووەکان بە دەرکەوتنی خواستی دانیشتوانی بەحرێن بە ڕەزامەندیان لە سەربەخۆی لە ژێر سایەی ئێران. بەحرێن لە ١٩٧١/٨/١٤ سەربەخۆیی وەرگت و شێخ سەلمان ئال خەلیفە دەسەڵاتدارە، لەساڵی ١٩٧٣ بڕیاری دەستوری نوێی وڵاتیان دا بە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی دایکی یاسا دانان دوای ئەوە نەتەوەیە چەپەکان لەئەندامانی بەرەی نەتەوەیی ڕزگاری بەحرێن دەسەڵاتیان بەسەر داشکا.

لە ساڵی ١٩٨٦ زانکۆی کەنداو لە بەحرێن دامەزرا و ئەو پردە کرایەوەکە لەنێوان بەحرێن و شانشینی سعودی دروستکرابوو.

لە ساڵی ١٩٩١ بەحرێن چووە ناو ڕێکخراوی نەتەوە یەککرتووەکان لەدوای دەکردنی عیراق لە کوێت ..... دوای لەساڵی ١٩٩٩ ڕێککەوتنامەی بەرگری هاوبەشیان لەگەڵ ئەمەریکا مۆرکرد.

- بەحرێن ئەندامە لە زانکۆی وڵاتانی عەرەبی، ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەککرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی، ئەندامە لەرێکخراوی هەڵێنجانی نەوت (ئۆبك).

# سعودیه

- ناوی ڕەسمی: شانشینی عەرەبی سعودی.
- پایتەختی: ڕیاز، ژمارەی دانیشتوانی ٢ر٣٦٠٫٠٠٠ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: مەکەی پیرۆز کە کەعبەی ماڵی خوای تیایەو قیبلەی هەموو موسڵمانانی جیهانەو هەموو ساڵ لە جەژنی قوربان ڕووی تێ دەکرێ بۆ جێبەجێ کردنی کارەکانی بوون بەحاجی ئەمەش کاتی خۆی لەلایەن ئیراهیم خەلیل دروستکراوە.، شاری مەنەوەرە کە گۆڕی پێغەمبەری تیایە لەگەڵ مزگەوتی پێغەمبەر (د.خ).
- بەندەرە گرنگەکانی: جدە لەسەر دەریای سوورە، دەمام لەسەر کەنداوە.
- ڕووبەری: ٩٩٥ر٨٢٩میل چوارکۆشەو ٦٩٠ر١٤٩ر٢ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی : ٠٠٠ر٥٥٠ر٢٦ ملیون کەسە بەپێی ئاماری ٢٠٠١.
- چڕی دانیشتوانی: ٣٢ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بووژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر٢٪.
- نەژادەکانی: عەرەب ٩٩٪ ئەفریقیایی و ئاسیای‌و نەتەوەی تریشی تیایە لەوانە کورد کە هەمووی ١٠٪ ی دانیشتوان پێك دێنێ.
- زمانەکانی: عەرەبی (زمانی ڕەسمیە).
- زانینی نوسین و خوێندن: ٦٥٪.
- دابەشی کارگێڕی: ١٣ هەرێمەو لەهەر هەرێمێك دادوەرێکی خۆی تێدا دەسەڵاتدارە بەپێی دەستووری وولاتەکە.
- سوپاکەی ٥٠٠ر١١٠ هەزار کەسە.
- بەرگری: ٧ر٨٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- دراوی: ڕیاڵی سعودی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٦٠٠ر٢١٠ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر١٠ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر٢٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، خوێ، فەریکە خورما واتە خورمای نەگەییوو.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٥٠٠ر٨ ملیۆن سەر، بزن ٦٠٠ر٤ ملیۆن سەر، بەڵام حوشتر و چێڵ هەیە ٢٥٠ هەزار سەر دەبێ، پەرەور ٩٥ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی کارەبا: ١١٠ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: نەوت، غاز، زێڕ، نوحاس، ئاسن، سعودیە وولاتێکی مەزنی بەرهەم هێنەری نەوتە و سێ یەم وولاتە لە دەرهێنانی نەوتی و یەدەگی باشی نەوتی هەیەو داهاتەکەی لە بوژانەوەو ئابووری وولات و ئاوەدان کردنەوە خەرج دەکات، سعودیە مەڵبەندێکی دارایی نێو دەوڵەتیە.
- پیشەسازی: پاك کردنەوەی نەوت، چیمەنتۆ،ڕەقی، بەرهەمی پلاستیکی.
- دەرچووەکانی: نەوت وبەرهەمەکانی نەوتی.
- داهاتەکانی دەرەوەی: کەلوپەلی خواردەمەنی، جل‌و بەرگ، دانەوێڵە،ماشێن، ئۆتۆمۆبێل، دورستکراوەکانی کارەبا، کەلوپەلی بناسازی، پەری هەموو جۆری چاپەمەنی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، ئەڵمانیا، بەریتانیا، وولاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا، کوریای باشوور، تایوان، یابان، وڵاتانی عەرەبی‌و ئەفەریقی.
- ڕژێمی دەسەلات: سعودیە وولاتێکی شانشینییەو لەسەر ڕێنمایەکانی ئاینی ئیسلامی سونەیەو لەسەر مەزهەبی وەهابیە. لە ساڵی ١٩٥٣ ئەنجومەنی وەزیران پێك هاتووە

و شانــشینی پێــشووی کۆچــکردو(فههــد) ئهنجومــهنی شــورهی دامهزرانــد بــۆ پێــشنیار کردنــی یاســاو ئهنــدامانی لهلایــهن شانــشین ههڵدهبــژێردرێن و هــهموو شتێك خۆیــهتی و بـۆ یهکهم جار له وولاّت ئهو ئهنجومهنه لهمانگی/٢/ ١٩٩٤ کۆبـۆوه چـهندین لیژنـهی جیـاوازی پێـك هێنا بۆ کاروباری ناوخۆیی وولاّت.

- پارتــه رامیاریــهکان: ڕژێمێکــی شانــشینی بۆگهنــو هــهموو شتێك بـۆ بنهماڵـهی ئهلسعود دهگهڕێتــهوه لهمــهموو لایهنــهکان. بـهلام پـارتی رامیاری و جولانـهوهی تیایه یـهك لهوانه پـارتی کۆمۆنیــستی ســعودی و پــارتی چاکــسازی کــــارگێڕی وولات و پــــارتی جولانــــهوهی دیموکراتی.
- جووگرافیــای وولاّت: زۆربــهی خــاکی وولاّت لهبیابانی عهرهبیو لهباشووری ڕۆژئاوای ئاسیا درێژدهبێتــهوه لــه دهریــای سوورو کهنــداوی عهقهبه لـهڕۆژئاوا بۆ کهنداوی بـهناو عـهرهبی.. لـهدوای ســهدهی نـۆزدهم ورده ورده ئـهو نـاوه پهیــدابوو بــهناوی کهنــداوی عــهرهبی چــونکه ئهوهی ڕاستی بێت عـهرهب لهناوچـهی کهنداو گهر ههشبوبن زۆر بهکهمی بووه ئهوهی ههشبوه مـهڕ لـهوهڕین وحوشـتر وانـهکان بـوه بـهناوی ئیسلام و بـهمۆی ئاینی ئیسلام عـهرهب خاکی دهستکهوت و وولاتـی پێك هێنا لهسـهر خـاکی نهتـهوهکانی تـر بهتایبـهتی کـورد بـهمۆی داگیر کردنـهکان بـهناوی ئیـسلام. کوێـت و عـیراق و ســوردن لهباکوریــــهتی، یهمــــهن و عومــــان لهباشــووریهتی، ئیمــاراتی عــهرهبی و قهتــهر دهکهوێته ڕۆژههلاّتی، پردی بـهحرێن بهیـهکیان دهبهستێتهوه کـه دهکهوێتـه نـاو ئـاوی کهنـداو، لـهڕۆژئاوا دهشـتایهکی کـهناری تهنگـه لهسـهر دهریای سوور ئهویش دهشتایی تههامهیهو که لێواری زنجیره چیایهو چیای حیجاز لـهباکورو چیـای عهسـیر لهباشـوور کـه درێـژ دهبێتـهوه بهدرێـژایی کـهنار و بـهرزی زیـاد دهکـات تـاکو بهرهو باشوور برۆیت. لهناوهراستی تهپۆلکهی نـهجوی وشـکانی گهورهیــه ورده ورده شــۆڕ دهبێتهوه لایـهنی کهنداو، ئهو تهپۆلکانه بـهبای لمـی دای دهپۆشـێ کـه گــهورهترین بیابانـه لهجیهاندا، بیابانی تریش ههیه لهباکور بهناوی بیابــانی تغــود، بــهلاّم ناوچــهی ڕۆژهــهلاّتی دهشـتایهکی پـڕ لهنـهوتی تیایـه کـه کانزاکـانی نـهوتی بـه درێـژایی کهنـداوه، بهلام لـهو دوایـه نهوت لهباشووری ڕیاز دۆزرایهوه.
- کهش و ههوای لهناوچهکهناریهکان شێ ی بهرزه بهلاّم لـهناوهوه پلـهی گـهرمی دهگاتـه ١٢٠ پلـهی (فرهنهایت ) که دهکاته نزیکـهی لـه ٥٠٪ پلـهی گــهرمی، بــهلام زوتــر دێتــه خــوارێ بهشــهو لــهباکورو بهرزایــهکانی، بــارانی زۆر کهمــهو بهدهگمهنه.
- مێژووی وولاّت: بیابانی عـهرهبی پـێش ئیسلام دابهشـی چـهندین تـیرهو هـۆز کرابوو، ئـهوانیش هــــهموو کاتیــــان بهشــــهڕو ململانــــێ ی ژێــــر دابونـهریتی دواپلـهی بۆگهنایـهتی بـوه، زۆر لـه پهرتوکــه مێژووییــهکانی ناوچــهکهو مێــژوو نوسـهکانی دهرهوهی ناوچـهکه دهڵێن لهمێـژوی مرۆڤایـهتی لـهداب و نـهریتی عـهرهب بۆگـهنتر نهبوه لهههموو ڕوویهکهوه بهرهلاّیـهکی بـێ وێنـه بـوهو هـهردهم شـهڕو پێکـداداان هـهبوه لـهنێوان تـیرهو هۆزهکـان بهتایبـهتی لـهنێوان بـههێزو بێهێزهکان بـهمۆی توانـای سـهربازی و ئـابووری هـهتا لـه دهرهوهی ناوچـهکه دهچـونه سـهریان و داگیریــان دهکــردن، نمونــهش ئهوهیــه کــه تاکونێـستا عـهرهب نهیتوانییـه خۆیـان یهکخـهن لهمیچ بوارێك که نهتهوهیهکی له زمـان و ئـاین و داب و نـهریت و مێـژوو خـاك هاوبهشـن. بـهلاّم عـهرهب بـهختیان بـاش بـوو بـههاتنی پێغهمبـهر (محمد. د.خ) که بۆیهکـهم جـار لـهمێـژوو تـوانی یهکیان بخات لهژێر ڕێنمایهکانی ئاینی ئیسلام لهســهدهی حهوتــهمی زاینــی. خهلیفــهکانی ئیـسلامی توانیـان هـهموو وولاّتـانی ڕۆژهـهلاّتی

خواروو باکوری ئەفریقیا بکەنەوەو ئاینی ئیسلامی بگەیەننۆ و لەسەدەی هەشت دەوڵەتی ئیسلامی فراوان بکەن لە ڕۆژهەڵاتی هند تاکو ڕۆژئاوای ئەسپانیاو لەگەڵ ئەو بڵاوبوونەوە ئاین و زمانی عەرەبیان گەیاندە ئەو وڵاتانەو پایتەختی ئەو وڵاتانە شاری (منەوەرە) بوو دوای گواستراوە بۆ دیمەشق و دوای بۆ بەغدا، بەڵام بیابانی عەرەبی هەروەك خۆی مایەوە بەهۆی جێگەی خوا پەرستییەوە. لەسەدەی دوانزە دەوڵەتی ئیسلامی لەناوچوو بیابانی عەرەبی بووە بیابانێکی داپچڕاو بەهۆی دابەش بوونی ناو خۆیی، لەسەدەی سیانزە ناوچەی حیجاز لە ڕۆژئاوای نیمچە بیابان کەوتە ژێر دەسەڵاتی دەسەڵاتدارانی خاوەندیەتیەکانی میسر، لەدوای داگیرکردنی عوسمانیەکان لە ساڵی ١٥١٧ حیجاز بەناو بوە پارچەیەك لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، لەسەدەی هەژدە محەمەدی کوڕی عبدالوهاب سەرکردایەتی جولانەوەی وەهابی کردو بنەماڵەی ئال سعودی پێك هێنا بە یەکخستنی تیرەو هۆزەکانی نەجد لەناوەڕاستی بیابانو پشتگیری کردن لەمەزهەبی وەهابی ئیسلامی، لە ساڵی ١٨٣٠ بنەماڵەی ئال السعود ڕیازیان کردە پایتەختی خۆیان. لەدوای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەسەڵاتیان بە تەواوی بەسەر حیجازو ئەحسا لەکەنداوی عەرەبی دا شکا، لە ساڵی ١٩١٣ کوڕی سعود توانی هەرێمی ئەحسا لەسەر کەنداو بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و وەریگرێتەوە لە تورکەکان و بەریتانیاش دانی نا بە ئەمیری نەجد لە ساڵی ١٩١٥.

لەماوەی ساڵەکانی ١٩١٦ تاکو ١٩١٨ شەریف حسین شۆڕشی بەرپاکردو بوە ئەمیری مەکەو بەریتانیاش پشتگیری لێ کرد دژی تورکەکان تا دەرکردنیان لە بیابانی عەرەبی لە ساڵەکانی ١٩١٩ تا ١٩٢٥ کوڕی سعود دژایەتی شەریف حسینی کردو دەریکرد لە حیجازو ناوەڕاستی هەمووی خستە ژێر دەستی خۆی، لە ساڵی ١٩٢٦ کوڕی سعود شانشینی خۆی ڕاگەیاند لەسەر حیجازو نەجد، لە ١٩٣٢/٩/٢٣ ، دوای ئەوە دووبارە ناوی حیجازو نەجدی گۆڕی بە ناوی (شانشینی عەرەبی سعودی) لە ساڵی ١٩٣٣ ماوەی کۆمپانیای (ستاندرا ئویل) ئەمریکی دا بە پشکنین و گەڕان لەدوای نەوت ئەوەبوو لەناوچەی (ئەحساو) لە ساڵی ١٩٣٨ دەست کرا بە دەرهێنانی نەوت. بەڵام بەرهەمی کەمبو بەهۆی بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانو گۆڕانی بارودۆخی نێودەوڵەتیو دوای کاری دەرهێنانی نەوت بەردەوام بوو، بوە هۆی بوژانەوەو پێشکەوتنی وڵاتی سعودیە. ئەمەش بە پشتگیری کردنی لەلایەن ئەمەریکاو بەریتانیا تاکو ئێستاش مەلۆتکەی ئەمەریکاو بەریتانیایە لەهەموو ڕویەکەوە، ئەمەش وای کرد کەسعودیە ببێتە ئەندام لە دامەزرێنەرەکانی بەڵگەنامەی نەتەوە یەککگرتووەکان، لەساڵی ١٩٤٥ چوە ناو زانکۆی وڵاتانی عەرەبی، سعودیە بەشداری شەڕی فەڵەستینی کرد لە ساڵی ١٩٤٨ لەدژی ئیسرائیل. کوڕە گەورەکەی سعود دەسەڵاتداریەتی وڵاتی سعودیەی گرتە دەست لە جێگەی باوکی. لە ساڵی ١٩٦٤ شانشین سعود لەسەر کورسی شانشینی هاتە خوارێ و براکەی فەیسل جێگەی گرتەوە. شانشین فەیسل تیرۆرکراو شانشین خالیدی برای جێگەی گرتەوە. لە ساڵی ١٩٨٢ براکەی شانشین فەهد عەبدول عەزیز جێگەی گرتەوەو بوە شانشینی سعودیە تاکو ئێستا سەرەڕای نەمانی توانای لەبەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتەکە کە ئەمیر عەبدوڵا هەڵدەستێ بەئەنجامدانی کاروباروباری دەوڵەت لە هەموو بوارەکان. دەسەڵاتی سعودیە کەبەندە بەشانشینی سعودیە بەهەموتوانایەك پشتگیری وڵاتانی عەرەبی کردیە بە ڕاگەیاندنو پارە بەتایبەتی دەسەڵاتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق بگرە لە شانشینی عێراق تاکو ڕوخانی سەدام

کەپشتگیری تەواوی رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی بەعس بوە دژی بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی و رامیاری و کۆمەلآیەتی بەتایبەتی دژی کوردو مافەکانی لەهەموو لایەنێك بەتایبەتی لەسەرەتای دەست پێکردنی شەری نێوان عێراق و ئێران لە٢٢/٩/١٩٨٠.

تاکو کۆتایی هاتنی لە ١٩٨٨/٨/٨ باشترین یارمەتی دەری عێراق بوو بەپارەو کەلوپەلی خۆراك بەپێی رێکەوتننامەکانی نێوانیان و رۆژێ لەرۆژان دژی رژێمی عێراق نەبوە لەئازاردانی گەلانی عێراق بەتایبەتی کورد چ لەئەنفال و چ کیمیابارانی ناوچەی کوردستان بەتایبەتی کیمیابارانی شاری هەڵەبجەو وێران کردنی بەهەزارا گوندی کورد سەرەرای ئەوەی شانشینی سعودیە زۆر بەباشی ئاگاداری کارو کردەوەکانی رژێمی سەدام بوو تاکو داگیرکردنی ولآتی کوێت لە ١٩٩٠/٨/٢ سەرەرای ئەوەش لەرامیاریەتەکەی کەلێنێکی هێشتبوەوە بۆ دوا رۆژی و هەتا لەگەڵ روخانی دەسەلآتی سەدام نەبووە کەلەلایەن ئەمەریکا لە٢٠/٣/ ٢٠٠٣ دەستی بەبۆردمانی شارەکانی عێراق و بەتایبەتی بەغدا کرد تاکو ٢٠٠٣/٤/٩ بەرۆژی روخانی رژێمی سەدام و دارو دەستەکەی دانراوە. . . بۆ نموونەش پیاوانی ئایینی ولآتی سعودیە کەژمارەیان (٢٦) کەس بوو لە ٢٠٠٤/١٠/٥ پشتگیری تەواوی خۆیان بۆ تیروریستانی عێراق دوویات کردەوە بەناوی بەرگری نیشتمانی و ئەو بەرگریانەیان بە بەرگیەکی یاسایی ونیشتمانی و ئایینی داناو دژی دەسەلآتی نوێی عێراق و هەلبژاردنەکان وەستان بەئامۆژگاری دەسەلآتدارانی سعودیە بەبەردەوامبونیان لە وێران کردنی عێراق و دەرکردنی هێزەکانی ئەمەریکاو هاوپەیمانانی، کەچی دەسەلآتی سعودیە خۆی مەلۆتکەو پەروەردەی رامیاریەتی ئەمەریکایە. .

- سعودیە ئەندامە لە زانکۆی وولآتانی عەرەبی، ئەندامە لە رێکخراوی هەلێنجانی نەوت، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لەرێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی.

# چینی میللی

- ناوی رەسمی: کۆماری چینی میللی.
- پایتەختی: پەکین، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٤٢٥ر١١ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: شەنگەهای، شونکین، شیشیانگ (موکدین) ووهان، نانکینگ، هەربین.
- رووبەری: ٣٨٦ر٧٠٥ر ٣ میل چوارگۆشەو ٩٦٠ر٥٩٦ر٩کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٠٠٠ر٣٠٠ر١ملیار کەسە بەپێی ئاماری ٢٠٠٤.
- چری دانیشتوانی: ٣٥١ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢ر١٪.
- نژادەکانی: هانە چینیەکان ٩٢٪، مەگۆل و تبتی و کوری و کورد ٨٪، نزیکەی ١٥٠ هەزار کورد لە چینی میللی دەژین و خاوەنی ئۆتۆنۆمین.
- زمانەکانی: زمانی چینی و زمانی مەندرین (زمانی رەسمین)، زمانی لووی کانتونی و زاراوەی تری تیایە.
- ئایینەکانی: بێ بروا رەسمیە، بوزی، تاویە، ئیسلام، مەسیحی.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٨٥٪.

• دابەشی کارگێڕی: ٢٣ پارێزگایە، پێنج هەرێمی خاوەن مافی ئۆتۆنۆمیە. لەگەڵ سێ ئەنجومەنی شارەوانی، لە ١٩٩٧/٧/١ کارگێڕیەکی تایبەت بە هەرێمی هونگ کونگ پێك هێنراوە.
• بەرگری ٥ر١١٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
• سوپاکەی: ٠٠٠ر٨٥٠ر٢ ملیۆن کەسە.
• دراوی: لیون.
• کــــۆی دەرئـــــەنجامی نـــــاوخۆیی: ٢٠ر٤ ترلیۆن و ٥ ملیار دۆلارە.
• بەشــی تــاك لــەکۆی دەرئــەنجامی نــاوخۆیی: ٦٠٠ر٢ دۆلارە.
• زەوی کشتوکاڵی: ١٢٪ لە خاکی وڵاتەکە.
• بەرهــەمی کشتوکاڵی: دانەوێڵـە، بـرنج، پـەمۆ، پەتاتـە، چایە، چینی میللی سێیەم وڵاتـە لـە بەرهـەم هێنـانی خواردەمـەنی گەرچـی زۆرجـار هەیـە بەشـی ناکـات و لـە دەرەوەش دەیهێنـێ لەبەر زۆرترین ژمارەی دانیشتوانی لەجیهاندا.
• سامانی ئاژەڵی: چێڵ و گامێش ٨٥ ملیۆن سەر، بـەراز ٣٩٥ ملیـۆن سـەر، مـەڕ ١١٢ملیـۆن سـەر، بزن ٣٥ ملیۆن سەر، پەرەور ١٢٠ر٣ ملیار سەر.
• بەرهـــەمی کارەبـا: ٣٦٥ر١ ترلیــۆن کیلــۆوات کاتژمێر.
• ســامانی سروشــتی: نــەوت، خــەڵوز، جیــوە، ئاسن، قوڕقوشم، موگناتیس، ئەلە منیۆم، غازی سروشــتی، بــەردی جــیری، مەرمــەڕ، وزەی کارەبای ئاوی، خەڵوزی بەردی.
• پیشەسازی: دروستکردنی ئاسن و پۆڵا، چەك بەهــەموو جۆرەکــانی، ڕســتن و چـنین، جـل و بەرگ، پاڵاوتنی نەوت، چەندین سامانی تـری هەیـە بۆ کاری کارەباو چەك و وزە بـەکاردێت، دروســتکردنی داو دەرمـان، چـەندین بەرهـەمی تری کارگەکانی تەقەمەنی و کەلوپەلی یاری.
• دەرچووەکانی: بەرهـەمی ڕستن و چنین، جل و بــەرگ، کەلوپــەلی پەیوەنــدی و تۆمــارکردن، نەوت و غاز، کەلوپەلی ئاسن، کاتژمێر، کەلوپەلی منـــداڵان بەهـــەموو جۆرەکـــانی فێربـــوون و یاریکردن.
• تریاکی قەدەغەکراو: ئەفیۆن بەرهەم دێنێ بەبێ مۆڵـەتی یاسـایی، زۆربـەی بەرهـەمی لەناوچـەی بونانــە، کــەخاڵی پەڕینەوەیــە بــۆ بارەکــان و بەرهەمی هیرۆینە لە سێ گۆشەی زێڕی.
• داهاتی دەرەوەی: ئامێری پیشەسازی، کیمیا، پۆڵا، کیمیاوی، کەلوپەلی دروستکراو، ماشێن و ئۆتۆمۆبێل.
• هاوبەشـەکانی بازرگانی: یابـان، هۆنـك کـۆنگ، بەریتانیا، ئەڵمانیا، تـایوان، ڕوسـیا، بەرهــەمی هەمـــەجۆری چـــینی ئێـــستا دەگاتـــە هـــەموو وڵاتانی جیهان بە تایبەتی جلوبەرگ و کەلوپەلی یاری منداڵان و خۆراك و گەلێ شتی تر.
• ڕژێمـی دەسـەڵات: کۆمـارێکی کۆمۆنیـستیە و پــارتی کۆمۆنیــست ســەرکردایەتی دەکــات. ئەنجومـــەنی یاســـادانان (ئەنجومـــەنی میللـــی نیشتیمانیە) ژمارەی ئەندامانی ٢٩٧٨ ئەندامە و بـۆ مـاوەی پێـنج سـاڵ هەڵدەبـژێردرێن بـە پێـــشنیاری گـــشتی، ســـەرۆکی وڵات و جێگرەکـەی لـە لایـەن ئەنجومـەنی میللـی هەڵدەبژێردرێ بۆ ماوەی پێنج ساڵ، سەرۆکی وڵات پلەی سکرتێری گشتی لیژنەی ناوەندی پــارتی کۆمۆنیــستی هەیــە، بــەلام ئەنجومــەنی جێبەجێکردنی لەدەست ئەنجومەنی وەزیرانە، ســەرۆك وەزیــران و جێگرەکــەی ســەرۆك کۆمــار هـــەڵیان دەبـــژێرێ و ئەنجومـــەنی میللـــی نیـشتیمانی پەسـندی دەکـات. سـەرکردایەتی پارتی کۆمۆنیست سەرکردایەتی هەموو وڵات دەکات.
• پارتـە ڕامیاریـەکان: پـارتی کۆمۆنیـستی چینی میللی پارتێکی مارکسی ماوەیەو ماوەی بەهیچ پارتێکی تر نەداوە تاکو ئێستا.
• جوگرافیــای وڵات: چــینی میللــی بەشــی ڕۆژهــەڵاتی ئاســیا دەگرێتــە خــۆی، خــاکی

گونجاوە لەھەموو ڕویەکەوە دانیشتگاکان لە ڕۆژھەلاتی کێشومرەکەیە. دەوری بە پەرژینێکی سروشتی گیراوە، دەریا لە ڕۆژھەلات و چیا و بیابانەکانی لە باشووری ڕۆژئاواو لە باکور، مەنگولیا دەکەوێتە باکوری، ڕوسیا دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای، ئەفغانستان دەکەوێتە ڕۆژئاوای لەگەڵ پاکستان و تاجاکستان و کازاغستان، لە باشووری ھندو نیپال و یۆنان و میانمار، لاوس و ڤێتنام لە باکوری ڕۆژھەلات لەگەڵ کۆریای باکور. ڕووی خاکی چینی میللی پانو فراوانە و چیا و بیابانەکانەکانی تەنیا لە ١٣٪ ی خاکەکەی بۆ کشتوکاڵ بەکاردێت، درێژی وولات لە باکور تا ڕۆژئاوا نزیکەی ١٨٦٠ میلە و لەڕۆژھەلات تا ڕۆژئاوا ٢٠٠٠ میل و نیوەی خاکەکەی لە ڕۆژھەلاتو ڕۆژ ئاوای زۆر باشە، سێ زێی گرنگی تیایەکە (زێی تشانگ، زێی ھونگو، زێی ئگزی بانگ، زێی سێ یەم درێژترین زێیە لە جیھان کە درێژیەکەی ٦٣٠٠ کیلۆمەترە لە ناوەندی نیوەی ڕۆژھەلات دێتە خوارێ)، بەلام زێیە بچوکەکەی کە ٥٤٦٤ کیلۆمەترە لە باکور دێتە خوارێ، لە حەوت ناوچە کەش و ھەوای جیاوازە لەگەڵ یەکتری، لە باکوری ڕۆژھەلاتی زستانی زۆر ساردو ڕەشەبای بەھێزی ھەیە، بەلام لە ھاوین کەشەکەی فێنك و شێ دارەو بارانی ناوناوەیە، بەلام لە باشووری کەنزیکە لە کەمەرەی زەوی ھاوینی باران و زریانی زۆرە، لە باشووری ڕۆژئاوای بەرزەو زستانی مخۆشە و پلەی لەھاوین مام ناوەندیە، بەلام ھەرێمی ئیکزیزانگ کە مافی ئۆتۆنۆمی ھەیە زستانی ساردو ناوچەیەکی بەفراویە، لە ناوچەکانی تریش لەو نێوانەیە بەردەوامە.

• مێژووی چینی میللی: چینیەکان لە گۆمی زێی بچوکی ھوانگ ھو لە ساڵی ٢٠٠٠ پێش زاینی ژیاون و سەرکەوتنیان لە شارستانیەتی پێشکەوتوو بەدەست ھێناوە لە ساڵی ١٢٠٠ پێش زاینی، لەسەردەمی بنەماڵەی (شو) کە حوکمڕای کردووە لەنێوان ساڵەکانی ١١٢٢ تاکو ٣٤٩ پێش زاینی. لەژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆر (ھوانگ تی) توانرا ھەموو وولاتە دەرەبەگە بازرگانەکان کۆبکاتەوە بۆ یەکەم جارو ھەر لەسەردەمی ئەویش (دیواری چین لە ٢٤٦ تا ٢١٠ پێش زاینی دەستی پێ کرا بەناوی (سوری چین) کە لەسەر مانگەوە زۆر بەڕوونی دیارەو جێگەی سەر سوڕمانی گەلانی جیھانە. لەسەردەمی بنەماڵەی ھان لە ساڵەکانی ٢٢٠ تاکو ٢١٠ توانرا پەیوەندی بازرگانی چین لەگەڵ ڕۆژئاوا پەرەی پێبدرێ و ببوژێتەوە، لەسەردەمی بنەماڵەی (تی ئینگ) لە ساڵی ٦١٨ تا ٩٠٧ کە بەسەردەمی زێڕینی دادەنرێت لەپەرەسەندن و پێشکەوتنی چین لەبوارەکانی ھونەرو وێنەو پەیکەرتاشی و شیعرو دەرکەوتنی چاپەمەنی بۆ یەکەم جار، ئەمەش مێژووی چینی گواستەوە بۆ قۆناغێکی پێشکەوتووتر لەھەموو بوارەکانی پەرەسەندن. بە پیداگەڕانەوەی دوا دەسەلاتە نیشتیمان پەروەرەکان لەلایەن بنەماڵەی مینگیس بوو بەلابردنی مەگول و لیوانەکان کە دەسەلاتی چینیان دەکرد لەنێوان ساڵەکانی ١٢٨٠ تا ١٣٦٨، بەلام بنەماڵەی مینگیس لە ساڵی ١٣٦٨ تاکو ١٦٤٤ بەردەوام بوو تاکو داگیرکردنی کەلەباکور ھاتبوون بەناوی (مونگون) لەدوای ئەوە جموجوڵی بازرگانی لە چین و پاراستنی توندی لە پەیوەندی کردن لەگەڵ وولاتانی تر تاکو سەدەی ھەژدەم کەتەنیا لەبەندەرەکانی کانتون و بەندەری ماکۆی پرتوگالی بەردەوام بوو. لەدوای شەڕی نێوان ئینگلیزو چین لەساڵەکانی ١٨٣٩ تا ١٨٤٢ شەڕی بەندیەتی یەکەم بووکە بوە ھۆی کردنەوەی چەندین بەندەری ترو بوە ھۆی

ئەوەی کە چین دەست لە هۆنگ کۆنگ هەڵگرێ بۆ بەریتانیا، لەدوای ئەوەش چەندین شەر هەڵگیرسا لەنێوان ساڵەکانی ١٨٥٦ تا ١٨٦٦ و بوە هۆی ئەوەی کە چەندین ڕێکەوتنامە مۆر بکرێ و دەسەڵاتی چین لاواز بکات لەسەر وڵاتەکەیان. بەڵام لەشەڕی نێوان چین و یابان لەساڵەکانی ١٨٩٤-١٨٩٥ بوە هۆی کارەسات و بەدەرکردنی چین لە کۆریاو بوە هۆی ئەوەی کە هێزەکانی ئەوروپا چەندین دەسکەوت بەدەست بێنن لەچین کە ئەڵمانیاو ڕوسیا و فەرەنسا و بەریتانیا بەندەرەکانی چین بەکرێ بگرن کە بوە هۆی بەرپابوونی شۆڕش لە بۆکسری لەساڵی ١٩٠٠، بەڵام ئەم ڕاپەڕینە لەلایەن وڵاتانی بەکرێگرتەی بەندەرەکان لەناوبرا. لە ساڵی ١٩١١ شۆڕش بەرپابوو کە هەموو چینی گرتەوە بەسەرکردایەتی دکتۆر (سەنیات سەن) پێشەوای پارتی گەلی نیشتیمانی چین و کۆماری چینی ڕاگەیاند کە بوە یەکەم سەرۆك کۆماری چینی کاتی، لەساڵی ١٩١٢ ئیمپراتۆری بنەماڵەی (مانسو) لەسەر کورسی هاتەخوارێ و لەهەمان ساڵ دکتۆر سێن دەستی لەکار کێشاوە بۆ (بوان ئیکای) کە دژایەتی کۆماریەکانی دەکردو دەیویست خۆی بکاتە ئیمپراتۆری وڵات، بەڵام شۆڕشێکی ترسناك ئەنجام درا لە ساڵەکانی ١٩١٥ و ١٩١٦ کە بووە هۆی ئەوەی ئەو نیازە وەلابنێ و دوای ئەوە لە ساڵی ١٩١٦ کۆچی دوایی کرد کە بوە هۆی بەرپابوونی چەندین شەڕ لەنێوان سەربازەکان و کۆماریەکان لە ساڵی ١٩٢١ (سەن یات سن) بەسەرۆك کۆماری چینی هەڵبژێردراو پارتی کۆمۆنیستی چینی دامەزراندو کاری هاوکاریان لەگەڵ پارتی نیشتیمانی بەناوی (کۆمینتانگ) ئەنجام دا بۆ یەکپارچەی خاکی چینی. بەڵام دکتۆر سەن لە ١٩٢٥ کۆچی دوایی کردو دەسەلات درا سەرۆکی پارتی کرمینتانگ بۆ سەرکردایەتی کردنی سەربازی (شیانگ کای شك). لەماوەی ساڵەکانی ١٩٢٦ تا ١٩٣٨ سوپای شۆڕشگێڕی چین بەسەرکردایەتی شیانگ کای شك هەوڵی یەکخستنی وڵاتیداو لەهەمان کات کۆمۆنیستەکان لەناو پارتی نیشتیمانی دوورخستەوەو بوە هۆی شەڕی نێوانیان. لە ١٩٣٧/٧/٧ یابان بەتەواوی چینی داگیرکرد بەڵام دوای لەهەموو خاکی چین کشانەوە بەهۆی سەرکەوتنیان لە جەنگی دووەمی جیهان و پەیدا بوونی کێشەو ململانێی نێوان پارتی نیشتیمانی بەسەرکردایەتی شیانگ کای شك و کۆمۆنیستەکان بەسەرکردایەتی ماوتسی تونگ سەرۆکی پارت و لە ئەنجامی کێشەو ململانێی توندو تیژ ماویەکان سەرکردایەتی پارتی (کرمینتانگ) لە چینی سەرەکی دەرکردو لە ١٩٤٩/١٠/١ کۆماری چینی میللی نوێ لەلایەن ماوتس تونگ ڕاگەیاندراو پەکین کرا پایتەختی وڵاتی چینیی نوێ، شوان لای کرا سەرۆك وەزیران لە کۆماری چینی نوێ. لە ساڵی ١٩٥٠ ڕێکەوتنامە لەنیوان سۆڤیەت و چین مۆرکرا بۆ ماوەی سی ساڵ لەهەموو بوارەکانی ڕامیاری و ئابووری و ڕۆشنبیری و پیشەسازی و چەك و تەقەمەنی، لەبەر ئەو هۆیە ئەمەریکا دانی بە چین نەنا تاکو مانگی/ ١٩٧٨/١٢ کە دانی بەچین نا.

لە ١٩٧٩/٢/١پەیوەندی نێوان ئەمەریکاو چین دەستی پێکرد بە گۆڕینەوەی پالۆێزو جیمی کارتەری سەرۆکی ئەمەریکا ئەو ڕێکەوتنە بەرگریانەی کە لەگەڵ مۆر کردبوو هەڵی وەشاندەوە. لە ساڵی ١٩٥٨ ماو هەڵسا بەدامەزراندی کۆمەڵەی هەرەوەزی جوتیاران بۆ بەرهەم هێنانی کشتوکاڵی لەناکاو کە بووەهۆی سەرنەکەوتن و دابەزینی خواردەمەنی و بڵاوبونەوەی برسیەتی و بوە هۆی مردنی زیاتر لە

٣٠ مليۆن چینیو بوه هۆی دروست بوونی بەرهەڵستکاران. لەئەنجامی ناراستی رامیاریەتی سەرکردایەتی چینو رەچاو نەکردنی باری ژیانی جونیاران، لە ساڵی ١٩٦٤ چین توانی یەکەم بۆمبی ئەتۆمی تاقی بکاتەوەو لە ساڵی ١٩٦٧ دووەم بۆمبی ئەتۆمی بەرهەم بهێنێ. لەدوای شەستەکان پەیوەندی نێوان چین و سۆڤیەت بەرەو تەنگەژە هەنگاوی نا لەسەر سنوری دەسەڵاتی سەرکردایەتی جولانەوەی کۆمۆنیستی جیهان و بوە هۆی ئەوەی یەکێتی سۆڤیەت رێکەوتنەکانی یارمەتی هەڵوەشێنێتەوە، لەدوای چین و ئەلبانیا هاوکاربوون بۆ پروپاگەندە کردن دژی یەکێتی سۆڤیەت. بەهۆی گرتنەبەری رامیاریەتی شۆرشی رۆشنبیری و گواستنەوەی دانیشتوانی شارەکان بۆ گوندەکان و دروستکردنی پاسەوانی سورو چەندین کاری تری نەگونجاو لەگەڵ بارودۆخی ناوەوەی وڵاتی چین لە پەیوەندی کۆمەڵانی خەڵکو دەسەڵات کە ئەمانە هەمووی بوە هۆی دژایەتی کردن لەلایەن گەلی چین و ئەنجامەکەی بە زیانێکی زۆر گەڕایەوە بۆسەر دەسەڵاتی ماوتس تونگ. لە ١٩٧٦/٩/٩ ماوتس تونگ کۆچی دوایی کردو زینگ لکسیاوبینگ جێگەی گرتەوە. دوای ئەوە چەندین کێشەو ململانێی ناوخۆیی دەسەڵاتی پارت و دەوڵەت و بیروبۆچوون و چەندین رێکەوتن لەگەڵ وڵاتانی جیهان بەتایەتی ئەمەریکاو گەڕانەوەی ناوچەی ماکو بۆ باوەشی خاکی چین لەلایەن پورتوگال و دوا سەرکردەی پارتی کۆمۆنیست و دەوڵەت جیانگ زیمین سەرکردایەتی وولاتی کردوە لە ساڵی ١٩٩٧ تاکو ٢٠٠٢ دوای ئەویش لە ئەنجامی کۆنگرەی پارتی کۆمۆنیستی چینی سەرکردایەتی پارت و دەوڵەت درابە (         ) بەڵام جیانگ زیمین وەك راوێژکار لە دەسەلات هەرمایەوە. چینی میللی بەهۆی خەرجیە هەمەجۆرەکان لەبوارە جیاجیاکانی ژیانو پێداویستەکانی کارگەو پرۆژەکانو بەرەو پێش چوونی پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی جیهان دەستی کرد بەپڕکردنی کۆگاکان، لەساڵەکانی ٢٠٠٢ تاکو ٢٠٠٥ کرینی نەوت بەقەبارەی زیاتر لە ٧٠٠ ملیون بەرمیل ئەویش کە ٤٠ار١ پێویستیەکان دابین دەکات جگە لەبونی نەوتو گازو غازی سروشتی کەتاکو ئێستا بەرگری لە دابەزینی پەرەسەندنی وڵاتەکە کردووەو هەوڵی بەرەو پێش چوونی داوە.رامیاریی دەسەڵاتدارانی حکومیو حزبی چینی میللی توانیەتی هەنگاوی بەرەو پێشەوە بنێ لەهەموو بوارەکان بەتایبەتی بواری پەیوەندی نێو دەوڵەتی و بەرزبوونەوەی بواری ئابوریو بەهێزکردنی جێ پێگەی خۆی لەداهاتووی نێو دەوڵەتی بەتایبەتی لەدوای ساڵەکانی ٢٠٠٠.

- چین ئەندامە لە رێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان، ئەندامە لە رێکخراوی بازرگانی جیهانی.

# فلپــیــن

- ناوی ڕەسمی: کۆماری فلپین.
- پایتــەختی: مــانێلا، ژمــارەی دانیــشتوانی ۱ر۷٤٥ر۰۰۰ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: کیزۆن، سیبۆ.
- بەندەرە گرنگەکانی: مانێلای پایتەخت، سیبۆ، دافو، زامیونگا.
- ڕووبـــەری: ۱۱٥ر۳۰۰میـــل چوارگۆشـــەو ۳۰۰ر۰۰۰ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- چـری دانیـشتوانی: ٥٩٤ کـەس لەیـەك میـل چوارگۆشەدا.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ٦٨ر٥۰۰ر۰۰۰ملیـۆن کەسە بە پێی ئاماری ۲۰۰۰.
- نـژادەکانی: زیـاتر لـە ٥۰ کۆمەڵـەی نـەژادی سـەرەڕای ئـەوەی ۹٥٪ دانیـشتوانی ناوەنـد دەکرێن بە فلیپینی کە ئەویش کۆمەڵگایەکی نەژادی هیندی پۆلیسییە.
- زمانەکانی: زمـانی فلیپینـی (لە بنەڕەتا زمانی تاجالوگـە)ە ئینگلیـزی کـە هـەردووکیان زمـانی ڕەسمی وولاتن.
- ئایینـــەکانی: کاســـۆلیکی ڕۆمـــانی ۸۲٪، پرۆتستنت۹٪ ، ئیسلام ٥٪.
- زانینی نوسین و خوێندن: ۹٦٪.
- دابەشـی کـارگێڕی: ۱٥ هەرێمـە و دابەشـی ۷۲ دەڤەر کراوە.
- بەرگری: ۷ر۸ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۱۰٥ر٥۰۰هەزار کەسە.
- دراوی: بیزۆ.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۲٤٥ ملیار دۆلارە.
- بەشـی تـاك لـەکۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ۳ر٥۰۰ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ۲۰٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: چەوەندەری شەکر، برنج، دەرە زەرد (گەنمەشـامی)، ئـەناناس، گـوێزی هیندی، مۆز،گەنمو جۆ.
- سامانی ئاژەڵی: بەراز ۸ر۹۱٥ ملیۆن سەر، بزن ۲ر۸۹۰ ملیۆن سەر، مەڕ ۱ر۷٦۰ ملیۆن سـەر، چێڵو گـامێش ۲ر۲۰۰ ملیـۆن سـەر، پـەلەوەر ۱۳٥ر۸۰۰ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: نوحاس، زێڕ، نیکل، زیوو، نەوت، دارستانی چڕی تیایە کە ٤۳٪ ڕووبەری وولاتەکە دەگرێتە خۆی.
- بەرهـــەمی کارەبـا: ۲٤ر۲۰۰ ملیـار کیلـۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازی: دروسـتکردنی خـۆراك، بەرهـەمی ڕستن و چنین، کیمیاوی، داودەرمانی پزیشکی، بەرهـــەمی دار، پـالاوتنی نـەوت، کەلوپـەلی پەیوەندی، کەلوپەلی کانزاکان.
- دەرچووەکانی: بەرهەمەکانی ئەلکترۆنی، جل و بەرگ، بەرهەمـەکانی کشتوکاڵی، بەرهەمـەکانی دار، خەڵوزی دار (ڕەژوو) ڕۆنی گوێزی هندی، کیمیا.
- داهاتـەکانی دەرەوەی : ماشـێن و کەلوپـەلی گواسـتنەوە، خواردەمـــەنی لەگـەڵ ئـاژەڵی زینـــدوو، ســـوتەمەنی، دانەوێڵـــە بەهـــەموو جۆرەکانی.
- هاوبەشـەکانی بازرگـانی: بـەریتانیا، یابـان، ئەمەریکا، ئەلمانیا، فەرەنسا، چەند وولاتێکی عەرەبی وئەفریقی.
- ڕژێمی دەسەلات: کۆمارێکی تازە پێگەیشتووە، لــە ۱۹۸۷/۲/۲ دەســتوری وولات بـــەدەنگی جەماوەری فلیپین داڕێژرا بە پێك هێنانی دوو ئەنجومەن (ئەنجومەنی پیران لە ۲٤ ئەندام پێك

هاتووه، ئەنجومەنی نوێنەران لە ٢٥٠ ئەندام پێك هاتووه) ماوەی دەسەڵاتی سەرۆك کۆمار شەش ساڵەو دوبارە هەڵنابژێردرێتەوە.

- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی خەباتی فلیپینی دیموکراتی، هاوکاری لیبراڵی دیموکراتی، ناوەندی یەکێتی نەتەوەیی ڕاست ڕەو، پارتی جولانەوەی کۆمەڵگای نوێ، پارێزگاران، بەرەی نیشتیمانی دیموکراتی، چەپ ڕەوەکان کە چەندین پارتی کۆمۆنیستی گرتۆتە خۆی، پارتی هاوپەیمانی میداناو، بنکەی دورگەی میداناو کە داوای لا ناوەندی دەکات.
- جوگرافیای وڵات: کۆماری فلیپین دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای زەریای هادی لەنێوان هێڵی کەمەرەو مەداری سەرەتان، زیاتر لە حەوت هەزار دورگە دەگرێتە خۆی ئەویش دورگەی ئەرخەبیلە کە دەکەوێتە دووری لە کەناری باشووری ڕۆژهەڵاتی کیشوەری ئاسیا لەماوەی ٨٠٥ کیلۆمەتر. لە باشووری مالیزیاو ئەندونوسیا کە دورترین دورگەی باشوورو دورگەی ملواج کە ٦٤ کیلۆمەتر دووره لە ڕۆژهەڵاتی دوورگەی بۆرنیۆ، باکوری تایوان کە دورترین دورگەیە لە باکورو دورگەی یامن کە ١٠٥ کیلۆمەتر دووره لە تایوان. درێژ بوونەوەی دوورگەکان لە باکور تا باشوور ماوەی ١٠٠ر١ میلەو پانزە دورگەی تری لە ٩٥٪ ڕووبەری وڵات دەگرێتە خۆی لەگەڵ دانیشتوانی، دورگەکان چیاین و بڵندو نوین، دەشتایەکانی ناوەڕاستی دورگەی لوزونە، گەورەترین دورگەی لە باکورکە ڕووبەری ٦٨٧ر٢٠٤ کیلۆمەترە، دورگەی میندناو لە باشوور ٩٤٦٣١ کیلۆمەترە. دوورگە گەورەکانی تر دورگەی سامار. نجروسی بالاوان، باناى، میندورو، ولیت، سیبو، کەشو هەوای لە ڕووبەرە نەویەکانی شێدارو گەرمە و لەناوچە بەرزایەکانی مام ناوەندییە.

- مێژووی وڵات: لەسەدەی چواردەم بازرگانە عەرەبەکان ڕوویان لە فلیپین کردو ئاینی ئیسلامیان گەڕاندەوە ئەو وڵاتەو دوو ئیماراتی ئیسلامیان لە مانیلاو جولو پێك هێنا. لە ساڵی ١٥٢١ (فردیناند ماجلان) کەشتیەوانی پورتگالی گەیشتە ئەو دورگەیە. بەلام لە ئەنجامی شەڕ لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکە کوژرا. لە ساڵی ١٥٢٦ ناوی نرا وڵاتی فلیپین لە سەر ناوی شانشین تشالزی پێنجەمی شانشینی ئەسپانیا. کە ناوی (فلیپ) بوو، دوای بوە شانشینی فلیپینی دووەم، لە ساڵی ١٥٦٥ سوپای ئەسپانیا بەسەرکردایەتی (میگیل لوبین) فلیپینی داگیرکردوو مانێلای کردە پایتەخت لە ساڵی ١٥٧١، لەسەدەی چواردەم زۆر لە گروپە ئەسپانیەکان ئاینی کاسۆلیکیان لە دەشتایە نزمەکان بڵاو کردەوە. لە ساڵی ١٧٦٢ بەریتانیا مانێلای پایتەختی داگیر کرد. لە ساڵی١٨٢٤ کۆتایی هاتن بوو لە داگیرکەرانی ئەسپانیا لە بازرگانی و بازرگانەکانی بەریتانیاو ئەمەریکا جێگایان گرتەوە بە بازرگانی پەتاتەو شەکر لە فلیپین. لە ساڵەکانی ١٨٩٦ تا ١٨٩٧ (ئیمیلیو ئجینلدۆ) هەڵسابە شۆڕش دژی داگیرکەرانی ئەسپانی. شەڕی ئەسپانیاو ئەمەریکا لە ساڵی ١٨٩٨ هەڵگیرساو بوە هۆی تێکشکانی پاپۆڕی ئەسپانی لەلایەن پاپۆڕی ئەمریکی لە کەنداوی مانێلا. (ئجینلدو) سەربەخۆیی فلیپینی ڕاگەیاندو ئەسپانیا دەستی لە فلیپین کێشاوە بۆ ئەمەریکا بەرامبەر ٢٠ ملیۆن دۆلار. فلیپینیەکان شۆڕشیان بەردەوام بوو لەساڵ ١٨٩٨ تا ١٩٠١ بەڵام ئەمەریکا ئەوشۆڕشەی لەناوبردو لە ئەنجام٠٠٠ر٢٠٠ هەزار فلیپینی کوژران، لە ساڵی ١٩٠٧ ئەمەریکا ئەنجومەنی یاسادانانی دامەزراند لە فلیپین. لە ساڵی ١٩١٦ پەرلەمانی دامەزراند لە دوو ئەنجومەن

لەسەر شێوازی ڕژێمی ئەمەریکی، فلیپین لە ساڵی ١٩٣٥ مافی ئۆتۆنۆمی ناوخۆیی وەرگرت و (مانویل کیزون) بوە سەرۆك کۆمار. لە ساڵی ١٩٤١ لەلایەن یابان داگیر کرا تا کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی ساڵی ١٩٤٥، فلیپین لە ١٩٤٦/٧/٤ سەربەخۆیی ڕاگەیاند بەپێی مۆڵەتی کۆنگریسی ئەمریکی. ئەمەریکا چەندین بنکەی سەربازی تیا دامەزراند و یارمەتی ئابووری فلیپینی دەدا. فلیپین لە ساڵی ١٩٥٧ تاکو ١٩٩٩ ئارامی ئاسایش بەخۆوە نەدیبوو بەهۆی کێشەو ململانێی دەسەڵات و بەرهەڵستکاران کە وولات لە بارودۆخێکی نالەبار دەخولێتەوە

- فلیپین ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

# کوێت

- ناوی ڕەسمی: دەوڵەتی کوێت.
- پایتەختی: کوێت، ژمارەی دانیشتوانی ٣٧٫٨٥٠ هەزار کەسە.
- شارە گرنگەکانی: هجرە، ئەحمەدی، فەحایل.
- بەندەرە گرنگەکانی: بەندەری ئەحمەدی.
- ڕووبەری: ٦٫٨٨٠ میل چوارگۆشەو ١٧٫٨٢٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٢٫٢٥٠٫٠٠٠ ملیۆن کەسە بە پێی ئاماری ٢٠٠١.
- چڕی دانیشتوانی:٣١٢ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- نژادەکانی: کوێتی ٤٥٪، عەرەبی وولاتانی تری عەرەبی٤٠٪، ئێرانی و هیندی و پاکستانی و کورد ١٥٪.
- زمانەکانی: عەرەبی (زمانی ڕەسمیە) کوردی، فارسی، ئینگلیزی.
- ئاینەکانی: ئیسلام.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٨٠٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٥ پارێزگایە.
- بەرگری: ١١٫٧ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ١٥٫٨٠٠ هەزار کەسە.
- دراوی: دیناری کوێتی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٤٦٫٣٥٠ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٢٢٫٥٠٠ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: زەوی کشتوکاڵی نییە تەنیا هەندێ لە بیابانەکە نەبێت کشتوکاڵی هاوینە بەرهەم دێنێت بەهۆی ئاو دێری لە کەنداو.
- سامانی سروشتی: نەوت، غازی سروشتی، کوێت یەکێکە لەو وولاتانەی بەرهەم هێنەری نەوتە لە ساڵەکانی دوای چلەکان، لە ٢٪ یەدەگی نەوتی جیهانی هەیە لەژێر خاك، لەداهاتەکانی نەوت خوێندن و تەندروستی و خانوو کارەباو ئاو پێداویستی تری دانیشتوان دابین دەکا بەخۆڕایی.
- پیشەسازی: پاڵاوتنی نەوت، پترو کیمیاوی، کەلوپەلی خانوو باڵەخانە، خوێی خواردن.
- دەرچووەکانی: نەوت لە ٩٠٪ لە دەرچووەکانی وولاتی کوێتە، پەینی کیمیاوی، کەلوپەلی بیناسازی.
- داهاتی دەرەوەی: پێداویستی خواردەمەنی، خواردەمەنی، ئۆتۆمبێل، کەلوپەلی بیناسازی، بەرهەمەکانی ڕستن و چنین، کوێت هەموو

پێداویستەکانی ژیان لەدەرەوە دەکرێ.

- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، بەریتانیا، یابان، ئیتالیا، کەنەدا، وولاتانی عەرەبی، چین.
- ڕژێمی دەسەلات: ئەمیری دەستوریە، سەرۆکی دەولەت ئەمیریە هەر ئەویش سەرۆك وەزیران دەست نیشان دەکات، سەرۆك وەزیران وەزیرەکان دەست نیشان دەکات بە ڕاوێژکاری کردن لەگەڵ ئەمیری دەولەت. ئەنجومەنی نەتەوە کە ژمارەی کورسیەکانی ٥٠ کورسیە هەڵدەبژێردرێت بە پێشنیاری گشتی نهێنی.
- پارتە ڕامیاریەکان: بە هیچ جۆرێك مۆڵەتی هیچ پارتێك نەدراوە سەرەڕای بوونی بیروبۆچونی جیاواز لەوانە پارتی کۆمۆنیستی کوێتی و بزوتنەوە ئیسلامی و نەتەوەی تر.
- جوگرافیای وولات: کوێت دەکەوێتە سەر ڕێگەی باکوری ڕۆژئاوای کەنداوی فارسی. عیراق لە ڕۆژئاواو باکوریەتی، شانشینی عەرەبی سعودی لە ڕۆژهەلات و باشووریەتی، خاکێکی بیابانی لمی وشکانییەو وشك و گەرمی هەیە، خۆ ئەگەر نەوتیان نەبوایە هەر دەبوایە خوێیان بفرۆشتایە لەگەڵ بەخێو کردنی مەڕ، حوشتر. وەك پێشوو بە پشتی حوشترەکانیان.
- مێژووی وولات: شوێنەوارەکانی کۆنی پێش دوو هەزار ساڵ پێش زایین شاهدن کە وولاتی کوێت پارچەیەك بووە لە شارستانیەتی سۆمەری و ناسراوە بە وولاتی نێوان دوو زێ، مێزۆپوتامیا، لە ساڵی ٣٢٣ داگیرکەرانی یۆنانی لە سەردەمی ئەسکەندەری گەورە سەردانی ئەو وولاتەیان کردووە بە ڕێبواریەتی لەکەنارەکانی کەنداو. لە سەدەی حەوت ئاینی ئیسلام گەیشتە ئەو ناوچەیەو لە کۆتایی سەدەی شانزەم کەوتە ژێر دەسەلاتی ئیمپراتوریەتی عوسمانی، لە ساڵی ١٧١٠ بەشێك لە هۆزی (عنزە) لە باکوری نیمچە دورگەی عەرەبی بە ئاژەڵ لەوەڕاندن گەیشتە ناوچەی کوێت و خستیانە ژێر دەسەلاتی خۆیان کە بەناوبانگ بوو بە هۆزی (عتوبە) لەوکاتەش شاری کوێت دروست دەکرا لە گوندێکی بچوك و بەخێرایش بووە شارێکی بازرگانی و بوژاوە بەهۆی کەنداوەکەو ڕووتێکردنی لەهەموو لایەکەوە. لە ساڵی ١٧٥٦ شێخ سەباحی یەکەم دەسەلاتی شێخایەتی دامەزراند و خۆی بە خۆی دەسەلاتی خۆی دەکرد، لە ساڵی ١٧٧٦ کۆمپانیای هندی ڕۆژهەلاتی بەریتانی بنکەی دامەزراند لە کەنداو. لە ساڵی ١٨٩٩ بەهۆی ترسان لە داگیرکردنی لەلایەن ئەڵمانیا و دەسەلاتی عوسمانی هەستابە مۆرکردنی پەیمان لەگەڵ بەریتانیاو بووە ناوچەیەکی پارێزراوی بەریتانیاو ماف ئۆتۆنۆمی وەرگرت لەلایەن بەریتانیاو هەموو ساڵ یارمەتی دەدرا بە مەرجێك خاوەندیەتی وولات نەگوازرێتەوە بۆ هیچ دەولەتێکی بیانی. لە ساڵی ١٩١٤ بەریتانیا دانی بە سەربەخۆی کوێت نا لە ژێر پارێزگاری خۆی، لە ساڵی ١٩٢٢ لەسەر سنور ڕێکەوتن، کە عیراق لە باکورو سعودیە لە باشووری ڕۆژئاوا. لە ساڵی ١٩٣٨ چاوگەکانی نەوت دۆزرایەوە بەتایبەتی لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی کەبوە هۆی گۆڕانکاریەکی گەورەی ئابووری، لە ساڵی ١٩٦١ بەریتانیا بەتەواوی دانی پێناو بووە وولاتێکی سەربەخۆی تەواو شێخ سەباح سالم سەباح بووە ئەمیری کوێت لە ترسی دەسەلاتی نوێی کۆماری عیراق بە سەرکردایەتی عەبدول کەریم قاسم کە داوای کوێتی دەکرد بەهۆی بوونی کوێت بە پارچەیەك لە عیراق بەپێی بەڵگەنامەکانی مێژووی کوێت کە ناوچەیەکەو بەریتانیاوهاوپەیمانان پارێزگاری تەواویان لێ دەکرد لەڕووی سەربازی و ئابووری و ڕامیاری. لە ساڵی ١٩٦٢ دەستوری وولات ڕاگەیاندرا بەناوی وولاتی ئاسودەیی ژیان و کار، لە ساڵی ١٩٦٨ دەستور جێبەجێ کرا کە ئێستاش گەلی

کوێت بەشی هەیە لە داهاتەکانی نەوتی کوێت و لەوپەڕی ژیانی خۆش و ئاسودەیی دەژین. لە ساڵی ١٩٧٧ شێخ جابر دەسەڵاتی وڵاتی گرتە دەست و ئەنجومەنی نەتەوەیی هەڵوەشاندەوە ئیتر ئەو ئەنجومەنە چەندین جار پێک دەهات و هەڵدەوەشێنرایەوە، لە ١٩٩٠/٩/٢ هێزەکانی سەربازی عیراق بە بڕیاری سەدام حسین سەرۆک کۆماری عیراق کوێتی داگیر کردو شێخ جابرو سەرکردەو بەرپرسەکانی هەڵاتن بەرەو وڵاتی سعودیە. حکومەتی کاتی لە کوێت دامەزراندن و دوای لە ١٩٩٠/٩/٢٨ سەدام حسین ڕایگەیاند کە کوێت پارێزگاری نۆزدەمە لە وڵاتی عیراق. لە دوای هەوڵی زۆر کە عیراق لە کوێت دەرچێ بەڵام بێ سود بوو تاکو ڕۆژی ١٩٩١/١/١٧/١٦ هێزەکانی ئاسمانی هاوپەیمانان لە گەردەلولی بیابان بەغداو شارەکانی تری عیراقی بۆردومان کرد. لە ١٩٩١/٢/٢٢ هێزی پیادەی سەر زەوی لەلایەن هێزی سوپای هاوپەیمانان دەستی پێ کردو لە ١٩٩١/٢/٢٧ کوێت ئازاد کراو هێزەکانی سوپای عیراق بە ڕاونان لە خاکی کوێت دەرکران کە بووە شکستیەکی گەورەی سوپای عیراق. پێش کشانەوەی سوپای عێراق لەخاکی کوێت لەئەنجامی بوردمان کردنی دەسەڵاتدارانی عێراق لەرێگەی کاربەدەستانی سوریاو عێراق ئاگریان لە ٦٤٧ کێلگەی نەوت بەردا کەبوە هۆی کارەساتێکی وێران کردنی ئابوری‌و ژینگە لەناوچەکە، کوێت زیاتر لە (٥ بلیۆن) دۆلاری خەرج کردبۆ چاکردنەوەی دام‌و دەزگای دەوڵەت‌و خانووبەرەو بیرە نەوتەکان‌و دام دەزگاکانیش لەهەموو لایەنێکەوە، لەساڵی ١٩٩٢ هەڵبژاردن ئەنجامدراو پاڵێوراوانی بەرهەڵستکارانی ئیسلامی توانیان (٣١) کورسی پەرلەمان بەدەست بێنن لەکۆی ٥٠ کورسی، لەساڵی ١٩٩٤ ڕژێمی بەعسی عێراق ڕایگەیاند بەدووبارە نەبونەوەی داواکردنی وڵاتی کوێت کە خاکی عێراقە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کێشەو گیروگرفت‌و بڕوا بەیەکتری نەبون لەنێوان کوێت‌و عێراق ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پەرەی دەسەند بەتایبەتی لەکۆنگرە عەربیەکان بەهەڕەشە لێک کردن ، کوێت ئامادە باشی خۆی نیشاندا بۆ لێدانی عێراق بە ماوەدانی سوپای ئەمەریکاو هاوپەیمانان لەسەرخاکی کوێت لەساڵی ٢٠٠٢ تاکو ساڵی ٢٠٠٣ کەرژێمی عێراق روخێندرا تاکو ئێستاش خاکی کوێت لەسەرسنوری بنکەو بارەگاکانی ئەمەریکاو هاوپەیمانانە، دەسەڵاتدارانی کوێت تاکو ئێستاش مەترسیان هەیە لە داهاتووی پەیوەندی لەگەڵ دەسەڵاتی کاتی عێراق سەرەڕای بەڵێنەکان‌و بەشداربوونی لەکۆنگرەو کۆبوونەوەکانی وەزیرەکانی دەرەوەو ناوخۆی لەگەڵ دارووسێکانی عێراق بەتایبەتی کۆبوونەوەی ٢٠٠٤/١١/٢٢ شەرمەشێخی میسری‌و ئێران لە٢٠٠٤/١١/٣٠ بەڵام هەوڵی بەرەو پاش بردنی دەکات.

- کوێت ئەندامە لەزانکۆی عەرەبی، بەشدارە لەئەنجومەنی کەنداوی بەناو عەرەبی، ئەندامە لەنەتەوە یەککرتووەکان،ئەندامە لە رێکخراوی ئۆپێک، ئەندامە لە ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی.

# مەلدیف

• ناوی ڕەسمی: کۆماری مەلدیفیا.
• پایتەختی: مالیە، کە بەندەرێکی سەرەکیە، ژمارەی دانیشتوانی ٦٥ر٠٠٠ هەزار کەسە.
• شارە سەرەکیەکانی: سینۆ.
• ڕووبەری: ١١٥ میل چوارگۆشەو ٢٩٨ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
• ژمارەی دانیشتوانی: ٣١٥ر٠٠٠ هەزار کەسە.
• چڕی دانیشتوانی: ٢٧٣٩ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
• بوژانەوەی دانیشتوانی: ٣ر٤٪.
• نەژادەکانی: چوار ڕەچەلەکی نەژادی تیایە، دەرافید لە دوورگەی باکورن، عەرەب لە دوورگەی ناوەندی، سینمالیز لە دوورگەی باشوورن، لەگەڵ زنجیەکان.
• زمانەکانی: دیڤهی (زمانی ڕەسمیە) کە زاراوەیەکی سینمالیزیە. ئینگلیزی.
• ئاینەکانی: ئیسلام.
• زانینی نوسین و خوێندن: ٩٤٪ .
• دابەشی کارگێڕی: ١٩ بەشی کارگێڕیە.
• دراوی: ڕووپیەی مەلدیفی.
• کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥١٠ ملیۆن دۆلار.
• بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١ر٨٥٠ دۆلار.
• زەوی کشتوکاڵی: ١٢٪. لە خاکی وولاتەکە.
• بەرهەمی کشتوکاڵی: گیزی هندی، گەنم، پەتاتە، دەرمزەردی باریك، سەرجوم، کاسافا.
• بەرهەمی کارەبا: ٦٥ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
• سامانی سروشتی: ماسی، گەشت و گوزار کەرتی ئابووری گرنگیەتی.
• پیشەسازی : ماسی، دروستکردنی گیزی هیندی، کاری دەستی، جلو بەرگ.
• دەرچووەکانی: جل و بەرگ، ماسی.
• داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی یارمەتی دەری سەرمایەداری، پێداویستی خەرجی و بەکار هێنان، بەرووبومی نەوتی.
• هاوبەشەکانی بازرگانی: تایلاند، ئەمەریکا، سنگافورا، چین، بەریتانیا، ئەڵمانیا، هند.
• ڕژێمی دەسەلات: ڕژێمێکی دەسەلاتی نیشتیمانیە، ئەنجومەنی وەزیرانی پێك هاتیە لە ١٥ وەزیر بە سەرۆکایەتی سەرۆك کۆمار. دەسەلاتی یاسادانانی لەیەك ئەنجومەن پێك هاتیە لە ٤٨ ئەندام و هەشت ئەندام لەلایەن سەرۆك کۆمار دادەمەزرێت و ئەوانی تریش بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێن، کە دوو ئەندام هی پایتەخت و هەریەك لە دورگەکانی دوو ئەندامیان هەیە بەپێی پارێزگاو کۆمەڵەکە.
• پارتە ڕامیاریەکان: هیچ پارتێکی ڕامیاری لە دورگەی مەلدیف نییە.
• جوگرافیای وولات: کۆماری مەلدیف لە کۆمەڵێك دورگەی مەرجانی پێك دێت لە زەریای هندی بەدوری ٦٧١ کیلۆمەتر لە باشووری ڕۆژئاوای سەریلانکا، دورگە مەرجانیەکان ژمارەیان ١ر١٩٠ دورگەیە لەبەر ڕووبەرێکی ئاوی کە ٣٥ر٢٠٠ میل چوارگۆشە پێك دێت کە دەکاتە ٩٠ر٠٠٠ کیلۆمەتر چوارگۆشە، زەویەکەی پێ گەیشتووەو نزیکەی ١٩٨ دورگەی دانیشتوانی تیایە، دانیشتوانی زۆر لەوە دەترسن کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بەهۆی تاوانەوەی بەفر لە جەمسەرەکان بەپێی پلەی گەرمی و کەوتنە ژێر لافاوی ئاو چونکە ڕووبەری مەلدیف نزیکەی شەش پێ لەسەر ڕووی دەریا بەرزە ... نزیکترین دراوسێیەکانی وولاتی هندە لە باکوری ڕۆژهەلاتی.
• مێژووی وولات: دانیشتوانی مەلدیف موسڵمانن و ناسراو بوە بە دورگەی مەلدیف لە کۆنەوەو کاری دەریاییان دەکرد بۆ پەرەسەندنی بژێوی ژیان، لەسەدەی دوانزە عەرەب ڕویان لەو دورگەیە کردو لە سەدەی

چواردەم دەسەڵاتی شێخیان لێ دامەزراند. لە ساڵی ١٥٥٨ کەوتە ژێر دەسەڵاتی پرتوگالیەکان تاکو ساڵی ١٥٧٣، لە ساڵی ١٦٦٥ بوە ژێر دەستەیەکی سیلان (سەریلانکای ئێستا) کە کەوتبوە ژێر دەسەڵاتی هۆڵەندە تاکو ساڵی ١٧٩٦، لەدوای بەریتانیا جێگەی گرتەوەو لەوکاتە ژێر دەستەی سینمالیەو هندی لێ دامەزرا. لە ساڵی ١٨٨٧ بوە ناوچەیەکی پارێزراو لە لایەن بەریتانیاو مافی ئۆتۆنۆمی وەرگرت و تا ساڵی ١٩٤٨ سەر بە سەریلانکا مایەوە. لە ساڵی ١٩٢٢ مەلدیف یەکەم دەستوری ڕاگەیاندو سەرۆکی وولات دەست نیشان کرا لە ڕێگەی هەڵبژاردن لە دوای ئەوە دەسەڵاتی شێخایەتی لەریگەی میراتی بوو. لە ساڵی ١٩٥٢ مەلدیف بوە کۆمارێکی ناو کۆمەنولسی بەریتانی و دەسەڵاتی شێخایەتی هەڵوەشێنرایەوە. بەڵام لە ساڵی ١٩٥٤ دەسەڵاتی شێخ گەڕاوە سەر وڵاتەکە. لە ساڵی ١٩٥٩ و ١٩٦٠ شۆڕشی جیا بونەوە هەڵگیرسا لە دورگەکانی (سوفادیفاو ئەوی باشوور). مەلدیف سەربەخۆی تەواوی لە ساڵی ١٩٦٥ وەرگرت لە دەرەوەی دەسەڵاتی (کۆمەنولسی بەریتانیا) لە ساڵی ١٩٦٨ ڕاپرسی جەماوەر ئەنجام دراو ئەنجامی ڕەت کردنەوەی دەسەڵاتی سوڵتان بوو ڕژێمی کۆماری گەڕاوە ووڵات و ابراهیم ناسر بوە سەرۆك کۆمار. لەدوای ساڵی ١٩٧٨ مأمون عبدالقادر بوە سەرۆك کۆمار، دوای بوژانەوەی ئابووری ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەنگاوی بەرەو پەرەسەندن و پێشکەوتن دەهاویشت. بەڵام لەدوای ساڵی ١٩٨٢ دوبارە گەڕاوە ناو کۆمەنولسی بەریتانی. لە ساڵی ١٩٨٥ بوە ئەندامی دامەزرێنەری (رابتەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بۆ هاوکاری هەرێمایەتی، لە ١٩٩٣ دوبارە مأمون عبدالقادر هەڵبژێردراوە بەسەرۆك کۆمار بۆ ماوەی پێنج ساڵو دوای سێ بارە لەساڵی ١٩٩٨ هەڵبژێردراوە بەسەرۆك کۆمار.

- مەلدیف ئەندامە لە نەتەوە یەککگرتووەکان، ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا.

## هیند

- ناوی ڕەسمی: کۆماری هیند.
- پایتەختی: نیودلهی، ژمارەی دانیشتوانی، ٠٠٠ر٥٤٦ر١٠ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: بومبای، کلکتا دیلهی، مەدراس، ئەحمەد ئاباد، بیخالور، کانپور.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: کلکتا، بومبای، کوتشی، مەدارس، فیشخابات ئام.
- ڕووبەری: ٣٣٨ر٢٦٩ر١ میل چوارگۆشەو ٠٩٠ر٢٨٧ر٣ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٩٠٠ر١١٥ر١ ملیار کەسە بەپێی ئاماری ٢٠٠١، دووەم وولاتە لەزۆری ژمارەی دانیشتوانی لەدوای چین و هەردەم داوای یارمەتی دەکات بۆ بوژانەوەی ئابووری و خۆراك‌و دابین کردنی پێداویستیەکانی بۆگەلان و وڵاتەکەی.
- چڕی دانیشتوانی: ٨٧٩ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ١٠ر١٪.
- نژادەکانی: هیندی ئاری ٧٢٪، درافیدی ٢٥٪، مەگول و ئەوانی تر ٣٪. لەناو ئەو ڕەگەزانە کوردی تیایە کە ئاینەکانیان زەردەشتیەو هەمان نژادی ئارین‌و ژمارەیان لە ٠٠٠ر٦٥٠

هەزار کەس زیاترەو بەردەوامن لەپاراستن‌و پەرەپێدانی داب‌و نەریت‌و زمان‌و مێژووکەلتوری خۆیان..

• زمانەکانی: هیندی (زمانی رەسمیە) ئینگلیزی (زمانی رەسمی دووەمە) زیاتر لەحەڤدە زمانی تری هەرێمی تیایە لەوانە زمانی کوردی.
• ئاینەکانی: هندۆس ٨٠٪، ئیسلام ١٤٪، مەسیحی ٢٪، سیخ ٢٪، لەسەدا ٢٪ وەکەی تریش ئایینی بچووکی تیایە وەك ئایینی زەردەشتی کە تەنیا کوردەکان پەیرەوی دەکەن.
• زانینی نوسین و خوێندن: ٥٥٪.
• دابەشی کارگێری: ٢٥ پارێزگایە لەگەڵ حەوت هەرێمی یەکگرتوو.
• کۆی دەر ئەنجامی ناوخۆی: ٠٠٠ر٠٠٠ر٥٢٥ر١ تریلیۆن دۆلار.
• بەرگری:٥ر١١٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی
• سوپاکەی: ٠٠٠ر١٥٠ر١ ملیۆن کەسە.
• بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٥٠ر١ دۆلار.
• زەوی کشتوکاڵی: ٥٥٪ لەخاکی وولاتەکە.
• بەرهەمی کشتوکاڵی: برنج، دانەوێڵە، چەوەندەری شەکر، چا، پەمۆ، پەتاتە، کتان، قاوە، گەلێ بەرهەمی جۆراوجۆری تری کشتوکاڵی هەیە.
• سامانی ئاژەڵی: چێل ٥٠٠ر١٩٦ ملیۆن سەر، بزن ٥٠٠ر١٢٠ ملیۆن سەر، گامێش ٢٥٠ر٨٠ ملیۆن سەر، مەر ٥٠٠ر٤٥ ملیۆن سەر، بەراز ٠٠٠ر١٢ ملیۆن سەر، پەرەوەر ٢٥٠ر٣٤٥ ملیۆن سەر.
• بەرهەمی کارەبا: ٧٠٠ر٤٢٥ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
• سامانی سروشتی: خەڵوز، ئاسن، موگناتیس، میکا، بۆکسیت، تیتانیۆم، کرومیت، ئەڵماس، غاز، نەوت، چەندین جۆری ترلە بەرهەمی سروشتی هەیە.
• پیشەسازی: رستن و چنین، پۆڵا، دروستکردنی خواردەمەنی، پەینی کیمیاوی، ماشێن، داو دەرمان، کیمیا، پالاوتن، ئۆتۆمبێل.، مافور، دروستکردنی شەکر، چەندین جۆری ترلە پیشەسازی دروستکردنی هەیە کەجێگەی سەرسورمانە لەجیهان لەنەخش‌و نیگارو شوێنەوارەکانی.
• دەرچووەکانی: چایە، هیند یەکەم وولاتە لەبەرهەم هێنانی چا لەجیهان،قاوە، ماسی، ئاسن و پۆلا، مرواری و ئەڵماس، بەرهەمی کیمیاوی، مافوری دەست، رایەلەی پەمۆ و بەرهەمەکانی، کەلوپەلی ئەندازیاری، گەلێ جۆری تری دروستکراو، دەرمانی پزیشکی.
• داهاتەکانی دەرەوەی: نەوتی خاو بەرهەمەکانی، پەینی کیمیاوی، ماشێن، دانەوێلە.
• هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، روسیا. چین، بەریتانیا، ئەڵمانیا، ئیتاڵیا، بەلجیکا، هەندێك وولاتانی عەرەبی، یابان.
• رژێمی دەسەڵات: هیند کۆمارێکی فیدرالیە. ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانی، ئەمەش دان پێ نانە بە وولاتی ئینگلترا کە سەرۆکی کۆمەنولسە بە پێی بڕیاری کۆنگرەی سەرۆك وەزیران لە لەندەن لەساڵی ١٩٤٩، بەپێی دەستوری کارپێکراوی ١٩٥٠/١/٢٦ ئەمەش کە رژێمی دەسەڵاتی هیند پەرلەمانیە. سەرۆك کۆمار سەرۆکی وولاتەو بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەرێگەی هەڵبژاردن دەست نیشان دەکرێت. ئەنجومەنی وەزیران و سەرۆك ئەنجومەنی وەزیران هەیە بەپێی وەرگرتنی زۆرینەی دەنگ لەپەرلەمان کە لەدوو ئەنجومەن پێك هاتووە، ئەنجومەنی ولایەتەکان (داجیا سەریما) ئەمەش نوێنەرایەتی دابەشی کارگێریە گشتییەکان دەکەن کە وولاتی هیندی لێ پێك هاتووە. بەلام ئەنجومەنی گەل (لوك سەیما) ئەمە لەرێگەی هەڵبژاردن دەست نیشان دەکرێت بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەپێشنیاری گشتی.
• پارتە رامیاریەکان: پارتی کۆنگرە، پارتی یەکگرتووی تاپەفەو ئایینی هەمەجۆری

هیندی، چەپی ناوەندی، جاناتا دال، هندۆسە دەمارتوندەکان، پارتی باراتیا جاناتا،راست رەوی رادیکالی، پارتی گەل، پارتی کۆمۆنیستی هیندی، چەندین گروپ و بزووتنەوەی ئاینی و نەتەوەیی و نیشتیمانی و زانستی و دیموکراتی تری تیایە.

• جوگرافیای وولات: کۆماری هیند دەکەوێتە باشووری ئاسیا، خاکی هیند درێژ دەبێتەوە لەچیاکانی هەمەلایا لە باکور بۆ کیپ کورمون لەسەر زەریای هیندی لە باشوور، هاوبەشە لەگەڵ سێ گۆشەی پاکستان لە ڕۆژئاوا کەجێگەکەی نیمچە کێشوەری هیندیە. چین و نیپال و بۆتان دەکەوێتە باکوری، میانمار (بورما) و بەنگلادش دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی، زۆربەی زۆری دوورگەکە دەگرێتە خۆی. درێژ بوونەوەی چیای هیمالایا کە بەرزترین چیایە لەجیهان بە درێژایی سنوری باکوری هیندە، لە باشووریەوە دەشتایی (جانگی) تیایە کە فراوانەو پان و بەرینەو خاکێکی بەپیت و بەرەکەتەو زۆرترین دانیشتوانی تیایە.ئەویتر لە دەشتایەکان و گردۆلکەی (دکنی) تیایەو بەشی باشووری دادەپۆشێ لە نیمچە کێشوەرەکە. بەدرێژایی سنوری پاکستان بیابانە، دۆڵی چیای کشمیری تیایە کە کێشەی هەردوو وولاتی هیندو پاکستانی لەسەرە، سێ زێی گرنگی هەیە، کە هەموو لە چیای هیمالایا هەڵدەقولێن و هەریەکیان دەشتایەکی فراوان ئاودێر دەکات. زێی جانگی لە باشووری دێتە خوارێ بەرەو ڕۆژهەلات بەدەشتایەکانی باکورو کەنداوی بەنگال ولقێکی ئەو زێیە هەر لەناو هیندە، ئەو پارچە دەست پێدەکات لەسەر درێژی ٣٥٤ کیلۆمەتر لە کەنداوی بەنگال و لەپێش زێی (ئەندلس) لەناوچەکە هەیەو دێتە خوارێ لە ڕووی باکوری ڕۆژئاوای بەچەند سەدێك میل لەهەرێمی کشمیرو هەروەها ڕووەو باشووری ڕۆژئاوای دەریای بەناو عەرەبی دەکاتەوە کە ئەمەش گرنگە بۆ ئاودێری پاکستان. زێی (براهی بوترا) کە ئەویش لەناوچەی تبت هەڵدەقوڵێ دێتە خوارێ بەرەو ڕۆژهەلاتی لە زەویەکانی هیندو دوایش بەرو باشووری لە زەویەکانی بەنگلادش دەکاتەوەو دوایی بەرەو کەنداوی بەنگال دەچێ. خاکی هیند لەچوار بەشی بەشێکی گرنگی دارستانە. خاکی هیند چەندین دوورگەی تیایە لەوانە دورگەی لاکادیف کە١٤ دورگەیە لەسەر دەریای بەناو عەرەبیە، دورگەی ئەنداماد (٢٠٤ دورگەیە) دورگەی نیکوبارز ١٩ دورگەیە.

• مێژووی کۆماری هیند: هیند لانەی یەکێك لە کۆنترین شارستانیەتە لەجیهاندا،(شەش) کاری هەڵکەناندن و پشکنین لە دۆڵی زێی ئەندلس لە ڕۆژئاوای نیمچە کێشوەر هەیە، شوێنەوارەکانی شارستانیەتی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە پێنج هەزار ساڵ بەر لەئێستا لەئەشکەوتەکانی (ئاگنتا) شوێنەواری زۆری تیایە وەك تابلۆی هەڵکەناوی بێ وێنە و تاج و گەلێ شتی تر، هۆزە ئاریەکان کە بەزمانی (سانسکریتی) ئاخاوتن دەکەن بەر لە ١٥٠٠سال پێش زاین لە باکوری ڕۆژئاوا هاتبوون و تێکەڵاوبوون لەگەڵ دانیشتوانی ڕەسەن و شارستانیەتی کۆنی هیندیان پێك هێنا. لەسەدەی شەشی پێش زاین (بوزیەت) دامەزرا لە هیند و لە باکوری وولات بڵاوبوونەوە وبەیارمەتی یەکێك لە شانشینە مەزنە کۆنەکان کە ناوی (ئاسۆکا) بووە بەڵام لە ساڵی (٢٢٢) پێش زایینی کۆچی دوای کرد کەئەو زۆربەی پارچەکانی نیمچە کێشوەری هیندی یەکخست، بەڵام لە دوای ئاینی هیندۆس بوژانەوەو دەسەلاتیان گرتە دەست. لەنێوان ساڵەکانی ٣٢٠ تا ٤٨٠ زاینی کە بنەماڵەی (گویتا) حوکمڕانی وڵاتیان دەکردو لەسەردەمی ئەو زانست و ئاداب و هونەر لەسەردەمێکی زێڕین دا دەژیا، بەڵام هۆزەکانی هۆن پەلاماری وڵاتیان دا لە ناوەڕاستی ئاسیاو بووە هۆی تێکشکانی بنەماڵەی گویتاو وێرانکردنی، ئەو

پەرەسەندنەی کە بەخۆی دەیدیت هیند بووە چەندین شانشینی شەڕکەری دژ بەیەکتر. لەسەدەی هەشتەم عەرەبەکانی بیابانی عەرەب ڕوویان لە وولاتی هیند کردو بووە هۆی دامەزراندنی بنکەیەکی ئیسلامی لە ڕۆژئاواو بۆ یەکەم جار لەشاری دەلهی بنەماڵەی دەسەلاتداری ئیسلامی دامەزرا لە ساڵی ١٢٠٦ و پەرەی سەند لەباکوری هیندو تەپۆلکەکانی (دکنی) گرتەوە بە درێژایی ماوەی سەدەی چواردە تاکو شانزەم. لە ساڵی ١٥٢٦ ئیمپراتۆریەتی مەگۆلی ئیسلامی دامەزرا لە شاری دەلهی و دەوراو پشتی کۆبوونەوەو بەردەوام بوو تا ساڵی ١٨٥٨ لەلایەن سولتانی پاپۆڕ دامەزرابوو کە لە نەوەی (تەیموری لەنگ) بوە، لە ساڵی ١٤٩٨ (فاسکو داگاما) دۆزینەرەوەی پرتوگال گەیشتە هیندو دوای ئەوە بازرگانەکانی پورتوگال و هۆڵەندی و فەرەنسی و ئینگلیز ڕوویان تێ کرد بۆ بازرگانی کردن و بەرەو ئاوەدان کردنەوەی وولاتی هیند، لەدوای پرتوگالیەکان توانیان ڕۆڵی بازرگانی خۆیان لە نیمچە کیشوەری هیندی بەهێز بکەن. لەوکاتە ئینگلیزەکان توانیان کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلات دابمەزرێنن و یەکەم کارگەی لێ دروست بکەن، لە ساڵی ١٦١٢ لە شاری (سوران) و بووە هۆی فراوان کردنی دەسەلاتی خۆیان و دژایەتی دەسەلاتدارانی هیندو بازرگانەکانی پروتگال و فەرەنسی و هۆڵەندی بکەن بۆیە هێز کردنی جێ پێگەی خۆیان، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئینگلیزەکان لە ساڵی ١٦٨٧ شاری بومبا لەدەست پرتوگالیەکان دەربێنن و بیکەنە بارەگای دەسەلاتی خۆیان لەدوای هەلاتنی سوپای فەرەنسی و ئیسلامی لەلایەن سەرکردەی ئینگلیزی (لۆرد کلایڤ) لە کۆتایی ساڵی ١٧٦٠ بە دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا لە هیندو دوایی توانیان بەتەواوی ڕاستەو خۆو ناڕاستەو خۆ دەسەلاتی خۆیان لەسەر هەموو وولاتی هیند بسەلمێنن.

لەدوای ساڵی ١٨٥٨ بووە هۆی هەلوەشاندنەوەی کۆمپانیای ڕۆژهەلاتی هیندو کەوتە ژێر دەستی تاجی بەریتانی. لە ساڵی ١٨٨٥ لە شاری بۆمبای پارتی کۆنگرەی نیشتیمانی لە هیند دامەزرا کە بوە سەرچاوەی کۆبوونەوەی نیشتیمان پەروەران لە ساڵی ١٩٠٩ لە چاك سازی (مورلی- مینتو) هیندی توانی مافی هەلبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنەکانی یاسادانان بە دەست بێنێ و دوای هیندۆس و ئیسلامەکان هەلسان بە پێکهێنانی کارگێڕی هەلبژاردنی تایبەت لەهەر گرووپێك. هێزەکانی بەریتانیا لە ساڵی ١٩١٩ زیاتر لە ٣٧٩ خۆپیشاندەری کوشت لە شاری (ئەمریتسار) ئەمەش بە سەرکردایەتی (ماهاتمای غاندی) بوو لەئەنجامدا بوە هۆی دەرچوونی یاسای پەرلەمانی هیند بەدانی مافی ئۆتۆنۆمی.

لە ساڵی ١٩٣٥ بەریتانیا ماوەی بۆ هیند ڕەخساند بە پێکهێنانی دوو ئەنجومەن بەمانەوەی کاروباری بەرگری و پەیوەندی دەرەوە لەدەست بەریتانیابێت، بەلام دوای ئەوە محمد علی جناح سەرۆکی زانکۆی ئیسلامی داوای دامەزراندی وولاتێکی ئیسلامی کرد ئەویش لەوولاتی پاکستان بوو، دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٤٠ داوای دابەش کردنی هیندیان کرد بەپێی ڕێژەی ئاینی. لە ساڵی ١٩٤٧ (لورد ماوتن باتن) نوێنەری بەریتانیا لەهیند گەیشتە ڕێکەوتن بە دابەش کردنی هیند لەسەر بنەمای ئاینی و لە ١٩٤٧/٧/١٨ هیند سەربەخۆیی وەرگرت سەرەتای دابەش کردنی هیند بوو بەدوو وولاتی سەربەخۆ یەکەمیان هیند و دووەمیان پاکستانی ئیسلام. لە ساڵی ١٩٤٨ گاندی تیرۆرکرا و نەهرۆ سەرۆکایەتی وەزیرانی گرتە دەست ئەمەش بووە هۆی کێشەو ململانێی نێوان هەردوو وولاتی دابەشکراو لەسەر ولایەتی گامۆو کشمیری گەورەو تاکو ئێستاش ئەو کێشەیە چارەسەر نەکرایە، سەرەڕای چەندین ڕێکەوتن لەئەنجامی

گفتوگۆی نێوانیـان، لـە سـاڵی ١٩٤٩ دەسـتوری وڵاتی هیند ڕاگەیاندرا لەسەر ڕۆشنایی دەستوری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. بەوە هیند بووە کۆمارێکی سەربەخۆی نێو کۆمەنولسی بەریتانی. ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ ڕۆڵـی پـارتی کـۆنگرەی نیشتمانی هیند و کاردانەوەیەکی باشی نواند لە پەیوەنـدی نێـو دەوڵـەتیو گەڕانـەوەی ئـەو زەویانەی لەدەست چوو بوون لەشەڕو کێشەکانی پێشوو. هیند لەشەڕەکانی لەگەڵ چین ئەنجامی دەدا بـەدۆڕاوی لێـی دەرچـووکە لـە سـاڵی ١٩٦٢ ئـەنجامی دابوو، لـە سـاڵی ١٩٦٤ نـەهرۆ کۆچـی دوایی کرد، لە ساڵی ١٩٦٦ ئەندیرا گاندی کچی نـەهرۆ بـوە سـەرەك وەزیرانـی هینـد ، تـاکو تیرۆرکردنـی ئەنـدیرا گانـدی لـە سـاڵی ١٩٨٤ لـەماوەی دەسـەڵاتی ئـەو چەند کێشەو ململانێـی نـاوخۆی و دەرەکـی ڕوویـدا بەتایبـەت لەگـەڵ پاکستان لەسـەر ناوچـەی کـشمیرو گـامۆو دوای تیرۆرکردنـی ئەندێرەگاندی ڕاگیـف گانـدی کـوڕی جێگەی گرتەوە بەڵام بەهۆی نەتوانین و شارەزایی نـەبوون نـەیتوانی دەسـەڵاتەکەی جێبەجێ بکـات تـاکو هەڵبژاردنـەکانی مـانگی ١٩٩٠/٥/ دوای ئەویش تیرۆر کرا. لەدوای ئەو کێشەی دەسـەڵات بەردەوام بوو لەنێوان پارتەکان، سەرەڕای ئـەوەش هینـد تـوانی بەهـەموو جۆرێـك خـۆی پێبگەیـەنێ لـەڕووی ئـابووری و سـەربازی و پـەرە سـەندنی کۆمەڵایەتی توانی چەکی ئەتۆم دروست بکاتو ببێتـە کاردانەوەیـەکی گرنگـی نێـو دەوڵـەتی بەتایبـەتی بەرامبـەر ئەمـەریکاو هاوپـەیمانان و لەلایـەکی تـریش چـینی میللی. لـە ١٩٩٨/٥/١٩ (بهاری فاجیابی) سەرۆکی هندۆسەکان دەسەلاتی گرتـە دەسـت لەئـەنجامی هەڵبـژاردنی مانگی/٤/ ١٩٩٨ تـاکو کۆتـایی سـاڵی ٢٠٠٤ لەدەسـەڵات بەردەوام بوو.

- هیند ئەندامە لەکۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

# یـــەمـــەن

- ناوی ڕەسمی: کۆماری یەمەن.
- پایتـەختی: سـەنعا، ژمـارەی دانیـشتوانی ٩٩٦ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: تەمیز، حەدید، عەدەن.
- بەندەرە گرنگەکانی: حەدید، مەکلا، عەدەن.
- ڕووبـــەری: ٢٠٢ر٨٥٠ میــل چوارگۆشـــەو ٥٢٧ر٩٧٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ١٧ر١٥٨ر٠٠٠ ملیـۆن کەسە بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- چـڕی دانیـشتوانی: ٨٤ کـەس لەیـەك میـل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٣ر٥٪.
- نژادەکانی: عەرەب، عەرەبی ئەفریقی، ئاسیاییە باشوورییەکان.
- زمانەکانی: عەرەبی (زمانی ڕەسمیە).
- ئاینەکانی: ئیسلامی (شافیعی، سونی، شیعە، وەهابی).
- زانینی خوێندن و نوسین: ٤٥٪.
- دراوی: ڕیال.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٣٢ر٢٠٠ ملیـار دۆلار.
- بەشــی تــاك لــەکۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٢ر٣٥٠ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ٧٪، لەخاکی وڵاتەکە.
- دابەشــی کــارگێڕی: ١٧ پارێزگایــە لەگــەڵ سەنعای پایتەخت.

• بەرگری: ٢ر٧٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
• سوپاکەی: ٢٠٠ر١١٥ هەزار کەسە.
• بەرهەمەکانی کشتوکاڵی: دانەوێڵە، میوەجات، پەمۆ، قات، قاوە، تەرە
• سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٨٥٠ر٣ ملیۆن سەر، بزن ٢٥٠ر٣ ملیۆن سەر، چێڵ٢٠٠ر١ ملیۆن سەر، پەرەور ٨٠٠ر١٥ ملیۆن.
• بەرهەمی کارەبا: ١٠٠ر٢ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
• بەرهەمی پیشەسازی: پاڵاوتنی نەوت، ڕستن و چنین، پیشەسازی پێست، کارگەکانی دەستی، دروستکردنی فەرش.
• دەرچووەکانی: پەمۆ، قاوە، پێست، ماسی و شك کراو، تەرەو میوەجات، خوری، ئاژەڵی زیندوو.
• داهاتەکانی دەرەوەی: ڕستن و چنین، کەلوپەلی بەکارهێنان، پێداویستیەکانی خواردەمەنی، ئۆتۆمۆبێل، کەلو پەلی بەکارهێنان، کەلوپەلی بناسازی.
• هاوبەشەکانی بازرگانی: بەریتانیا، یابان، سعودیە، چین، ئوسترالیا، ئەمەریکا، وولاتانی عەرەبی، فەرەنسا، ئەڵمانیا.
• ڕژێمی دەسەڵات: ڕژێمێکی پەرلەمانیە، دەستوری نوێی لە مانگی/ ٩/١٩٩٤ دەرچووەو بووە هۆی هەڵوەشانەوەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی.
• پارتە ڕامیاریەکان: پارتی کۆنگرەی گشتی گەل، چەپی ناوەندی، پارتی سۆشیالستی یەمەن، کۆمەڵەی چەپی چاکسازی، ڕاست ڕەوی ناوەندی، بەرەی بەرهەڵستکاری نیشتیمانی، چەندین پارت و گروپ و ڕێکخراوی هەمەجۆی تری هەیە کە نوێنەریان لە پەرلەمان هەیە.
• جوگرافیای وولات: یەمەن پێش ساڵی ١٩٩٠ دوو دەوڵەتی جیاواز لەبیرو بۆچوون بوو. یەکەمیان کۆماری یەمەنی دیموکراتی میللی، دووەمیان کۆماری یەمەنی عەرەبی بوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٩٠ یەکیان گرتەوە لەدوای چەندین ساڵ کێشەو ململانێی نێوانیان، یەمەن لایەنی باشووری ڕۆژئاوای نیمچە بیابانی عەرەبی دەگرێتە خۆی، لەڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە لەکەناری دەریای سورو لە باشووری درێژ دەبێتەوە لە کەنداوی عەدەن و دەریای عەرەبی، عەرەبی سعودی دەکەوێتە باکوریەوە، سەلتەنەی عومان دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی. خاکی یەمەن زنجیرە کەنارێکی لمی لافاویە، چیاکانی بەپیتەو ئاوی ئاودێری لەناوەوەی هەیە کە درێژی کەناری باشووری ١١٣٠ کیلۆمەترە، بەرزی هەندێ لە چیاکانی نزیکەی ٢٦٦٠ مەتر دەبێت لەناوەوە.
• مێژووی یەمەن: لەکۆنەوە خاکی یەمەن پارچەپەك بوە لە شانشینی (سەبا) ی کۆن، کە شانشینێکی بوژانەوە بووە لە بوارەکانی ئابوری و زانست و هونەر لەنێوان ئەفریقیاو هیند دا. کتابی پیرۆز باس لەوە دەکات بەسامانی زێرو بەردی پیرۆزو مرواری و مەرجان کە شانشینی (سەبا) لەبەری کردووەو هەڵیگرتووە بۆ شانشین سلێمان، قورئانیش باس لەوە دەکات کە شانشینی (سەبا) و پێغەمبەر سلێمانی کوڕی داود ئەو گفتوگۆیە لەنێوانیان هەبوە. یەمەن کەوتە جەنگی (سەبەئین) لەباکور لەسەدەی پێنجەمی پێش زاین. دوای ئەوە یەمەن بەهەموو پارچەکانی بوە پارچەیەك لە شانشینی (حەمیر) لەماوەی ساڵەکانی ١٠٠ پێش زاینی تاکو ٥٢٥ زاینی. لە ساڵی ٦٢٨ زاینی ئاینی ئیسلامی لەباوەش گرت، لە ساڵی ١١٧٤ تا ١٢٢٩ کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەیوبیەکان لە میسر بەسەرکردایەتی سەلاحەدینی ئەیوبی کە کورد بوو. کە بەسەردەمی زێڕینی ناو زەند دەکرێت لەبواری زانست و هونەر لەیەمەن ئەویش لەنێوان ساڵی ١٢٢٩ تا ١٤٥١ زاینی. لە ساڵی ١٥٣٨ یەمەنی

باكور كەوتە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، لە ساڵی ١٦٣٦ یەمەنی باکوریان جێ هێشت و کەوتە ژێر هۆزی زەیدیەکانی ناوخۆی یەمەن کە پێیان دەگوتن (الئمە) و هەروەها دەسەڵاتیان گەیشتە یەمەنی باشووریش تاکو ساڵی ١٧٢٥. بەڵام لە ساڵی ١٨٣٩ عەدەن بوە ژێر دەستەی بەریتانیاو پەرەی پێیدا تاکو بوە بەندەرێکی گرنگ بە پێدانی سوتەمەنی بۆ کەشتیەکان و پاپۆڕە جەنگیەکان و بازرگانەکان. لەدوای کردنەوەی (کەناڵی سویس لە ساڵی ١٨٦٩)، دوای وردە وردە دەسەڵاتی تەواوی بەسەر یەمەندا گرت. دووبارە عوسمانیەکان گەڕانەوە یەمەنی باکور لە حەفتاکانی سەدەی نۆزدەم. بەڵام لە ساڵی ١٩١٨ پێشەوا یحیی لە بنەماڵەی حەمیدەدین بوە شانشین لەسەر یەمەن، لە ساڵی ١٩٣٤ سەربەخۆیی لەسەر خاکی یەمەن سەپاند بەپێی پەیمان نامەکانی کە مۆر کرابوون لەگەڵ عەرەبی سعودی و بەریتانیا.

لە ساڵی ١٩٥٩ بەریتانیا یەکێتی فیدراڵی دامەزراند لەشاری عەدەن لە نێوان دەسەڵاتدارە دەرەبەگەکانی ناسراو بە (یەکێتی باشووری نیمچە بیابانی عەرەبی). لە دوای چەندین کێشەو ململانێی ناوخۆیی کە ڕویدەدا لەپێناو دەسەڵات لەڕێگەی کودەتا و هەڵبژاردن لەبەر ئەوە یەمەن تاکو ئێستاش وڵاتێکی عەشائیریە. لە ١٩٦٧/١١/٢٠ یەمەنی باشوور سەربەخۆیی تەواوی وەرگرت بەپێك هێنانی کۆماری یەمەنی میللی لەژێر دەستەی عەدەن کە لە ساڵی ١٩٧٠ پەیمانی هاوکاری لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتی مۆرکرد لەبەر ئەوەی یەکەم دەسەلاتی مارکسی – لینینی بوو لە وڵاتانی عەرەبی. یەمەنی باکور لە ساڵی ١٩٦٢ کۆماری یەمەنی عەرەبی دامەزراند لەدوای کودەتای سەربازی بەسەرکردایەتی عەبدوڵا سەلال، شەڕو پێك دادان ڕوویدا لەنێوان دەسەڵاتدارانی یەمەنی باشوورو یەمەنی باکوری، دوای هەوڵ و تەقەلای زانکۆی عەرەبی گەیشتنە ڕێککەوتنی یەکێتی نێوان هەردوو وڵات و ڕێککەوتن مۆرکرا بەلام ئەو ڕێککەوتنە جێبەجێ نەکرا. لە ساڵی ١٩٨٩ پرۆژەی دەستوری یەك یەمەنی دارێژرا لەسەر بناغەی فرە پارتی و لە ساڵی ١٩٩٠ سنوری نێوان هەردوو یەمەنی باکورو باشوور کرایەوە، لە ١٩٩٠/٥/٢٢ هەردوو وڵاتی لێك جیاواز یەکیان گرتەوەو بونە یەك دەوڵەت بەناوی کۆماری یەمەنی عەرەبی ئەمەش لەدوای سێ سەد ساڵ لێك بچڕان بەهۆی خۆپەرستی هۆزو تیرە عەرەبو داگیرکەران، پەرلەمان عەلی عبد الله سالحی هەڵبژارد بەسەرۆك کۆمارو سکرتێری گشتی پارتی سۆشیالستی یەمەن بەجێگری سەرۆك، بەڵام لەدوای ساڵی ١٩٩٤ شەڕ لەنێوان هەردوو لای یەککگرتنەوە هەڵگیرساو بەهۆی پشتگیری گرتنی علی عبد الله صالح لەلایەن ڕژێمی بەعسی عیراق و چەندین وڵاتی عەرەبی ترو بوە هۆی سەرکەوتنی بەسەر پارتی سۆشیالستی یەمەن، دووبارە دەستوری نوێ ڕاگەیاندراو لەهەڵبژاردنی ١٩٩٧/٤/١٧ پەرلەمان و علی عبد الله سالح بەسەرۆك کۆمار هەڵبژێردراوە. لە ساڵی ١٩٩٨ کێشەی نێوان یەمەن و ئەریتیریا لەسەر دورگەی خشین چارەسەر کرا لەڕێگەی یاسایی. تاکو بەچاپگەیاندنی ئەو کتابە لەکۆتایی ساڵی ٢٠٠٤ عەلی عەبدوڵڵا سالح سەرەك کۆمار بوە.

- یەمەن ئەندامە لە زانکۆی وڵاتانی عەرەبی، ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان، ئەندامە لەڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی.

# یــــابــان

- ناوی ڕەسمی: نیبۆن وولاتی ڕۆژهەلات.
- پایتــەختی: تۆکیــۆ، ژمــارەی دانیــشتوانی ۰۰۰ر۳۵٦ر۱۲ملیۆن کەسە.
- شارە گرنگەکانی: فوکوکا، کیتکیوشا، کیوتو، سەیورو.
- بەنــدەرە ســەرەکیەکانی: ئۆزاکــا، ناگویــا، یوکوهاما، کاوازاکی، ناکازاکی، هیرۆشیما.
- ڕووبـــەری: ۸٦۹ر۱٤٥ میـــل چوارگۆشــــەو ۸۰۰ر۳۷۷ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر٥۸٥ر۱۳۰ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ۲۰۰۲.
- چــڕی دانیــشتوانی: ۸۹٥ کــەس لەیــەك میـل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٤ر۰٪.
- نژادەکانی: یابانی ۹٤٪، کۆریەکان ٦٪.
- زمانــەکانی: یابــانی، کــۆری، (زمــانی ڕەسمیــە) کۆری.
- ئاینەکانی : شنتۆ، بوزی، مەسیحی.
- زانینی نوسین و خوێندن: ۱۰۰٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٤۷ پارێزگایە.
- بەرگری: ٥ر۳٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر۲٤۰ هەزارکەسە.
- دراوی: یەن یەکسان بە ۱۰۰سن.
- کــۆی دەرئــەنجامی نــاوخۆیی: ۱۸۰ر۳ ترلیــۆن دۆلار.
- بەشــی تــاك لــەکۆی دەرئــەنجامی نــاوخۆیی: ۵۰۰ر۲٥ دۆلار.
- زەوی کشتوکالّی: ١٤٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکالّی: برنج، پەتاتە، چەوەندەری شــەکر، میوەجــات، تــەرە بەهــەموو جۆرەکــانی، کرنەب، دانەوێلە
- ســامانی ئــاژەلّی: بــەراز۵۰۰ر۱۰ ملیــۆن ســەر، چێلّو گــامێش ۵۰۰ر٥ ملیــۆن ســەر، پــەرەور ۱۵۰ر۲٥ ملیۆن سەر.
- بەرهــەمی کارەبــا: ۰۰۰ر۹۷٥ ملیــار کیلــووات کاتژمێر
- ســامانی سروشــتی: خــەلّوز، ئاســن، زەنــگ (تۆتیا)، نوحاس، ماسی.
- پیشەسازی: کەلوپەلی کارەبایی ، ئەلیکترۆنی، ئۆتۆمبیـــل بەهـــەمووجۆرەکانی، ماشــێن، دەرهێنـانی کانزاکـان، کیمیـاوی، ڕاوی ماسـی، دروستکردنی کەشتی، بەرهەمی ڕستن وچنین، یابان یەکەم وولاتە لەرووی پیشە سازی.
- دەرچوەکانی: ئۆتۆمبیل، کەلوپەلی ئەلیکترۆنی و پێکهاتــەکانی، کیمیــایی، بەرهــەمی ئاســن و پــۆلا، شــتومەکی زانــستی و بیــنین، گــەلێ بەرهــەمی تــری کــە لــە کارگــەکانی دروســت دەکرێــت و یابــان ڕۆلّــی ئــابوری گرنگــی هەیــە لەسەر جیهان.
- داهاتــەکانی دەرەوەی: ســوتەمەنی، کەلوپــەلی خواردەمەنی، ئاژەلّی زیندوو، بۆکسیت، ئاسنی خاو، نوحاسی خاو، کیمیا، بەرهەمی ڕستن و چنین، دار.
- هاوبەشــەکانی بازرگــانی: ئەمــەریکا، وولاتــانی ڕۆژهــەلاتی ناوەڕاســت، یــەکێتی ئــەورووپا، باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا، فەرەنسا، روسیا، جەزائیر، چین، ولاتانی عەرەبی.
- ڕژێمــی دەســەلات: دیمــوکراتی لیبرالّیــە، دەستوری لە۲/۱۱/۱۹٤٦ دەرچوو کە جێگەی دەستوری ۱۸۸۹ ی گرتەوە کە لەژێر چاودێری ئەمــەریکا ڕاگەیانـدرا لەوکاتـەی یابـان لەلایـەن ئەمــەریکا داگــیر کرابــوو بــەگۆڕینی بنــەڕەتی لەرژێمی ڕامیاری یابان بە واز هێنانی لەمافی پیرۆزی ئیمپراتۆری یابان. (دئیت)، پەرلـەمان پێك هـاتووە لـە ئەنجومـەنی نوێنـەران کـە ۵۰۰ ئەندامەو بۆ ماوەی چوار سالّ هەلّدەبژێردرێن،

ئەنجومەنی ڕاوێژکاری ٢٥٢ ئەندامە و نیوەی ئەندامەکان بۆ ماوەی سێ ساڵ هەڵدەبژێردرێن و نوێ کردنەوەی نیوەکەی تری بەندە بەدەسەڵاتی جێبەجێکردن کە ئەنجومەنی وەزیران بە سەرۆکایەتی سەرۆك وەزیرانە دامەزراندنی لەلایەن (دئیت) ە لەنێوان ئەندامەکانی، لە ١٩٨٩/١/٧ ئیمپراتۆر (هیرۆ هیتۆ) ئیمپراتۆری یابان کۆچی کردو کورەکەی (ئاکیهیتو) جێگەی گرتەوە کە ژنەکەی لە خەڵکی یابان بوو واتە ئافرەتێکی دوور لە بنەماڵەی خۆیان.

- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی دیموکراتی لیبراڵی، ڕاست ڕەوی ناوەندی، پارتی دیموکراتی کۆمەڵایەتی یابان، پارتی سۆشیالستی پێشوو، پارتی کۆمەنیستی یابان، پارتی سۆشیالست، پارتی دیموکراتی یابان.

- جوگرافیای وڵات: یابان وڵاتێکی بیابانیەو دەکەوێتە دوری کەناری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو لە دەریای یابان جیای دەکاتەوە ئەویش ئەرخەبیلە کە لەدورگەکە نزیکەی ٣٥٠٠ دورگەیە ماوەکەی ٢٠٠٠ میل دەبێت لەسەر دەستەی کەوانەیی پێك هاتووە لە زەریای هادی، چوار دورگەی سەرەکی هەیە ئەویش: دورگەی هاوکایدو، هونشۆ، شیلکوکۆ، کیوشۆ، کە لە ٨٠٪ ڕووبەری چیاکانی خاکی یابان دادەپۆشن، کە دۆڵ و کەندی تەنگ جیای دەکاتەوە، زیاتر لە ١٩٠ جێگەی بورکانی گورجو گوڵی تیایە. زۆر جار دەبێتە هۆی گومەلەرزەو هەژانی زەوی. بەناوبانگترین بورکانەکانی لەچیای (ئاسو) روو دەدەن بەڵام بورکانی چیای فوجی کە لەسەر پولەکانی پوستە دەبینرێ کەگرجوگول نییە کۆمەڵێك لەبورکانی تری تیایە لەوانە بورکانەکانی چیای فوجی بەناوبانگ (فوجی یاما) لە نزیك تۆکیۆی پایتەختە، بەڵام زنجیرە دورگەکانی ریوکیۆ کە کەوتۆتە باشووری ڕۆژئاوای نێوان دورگەی کیوشۆو دورگەی مۆرەمۆزا کە لەژێر داگیرکەری ئەمەریکا بوو، بە دوو قۆناخ بۆ یابانی گەڕاندەوە دورگەی باکور لە ساڵی ١٩٥٣ دورگەی باشوور لە ساڵی ١٩٧٢ بەڵام دورگەی کۆریل کە کەوتۆتە نێوان باکوری یابان، نیمچە دورگەی کامشتکای روسی کە کەوتۆتە ژێر کارگێریەتی روسیا لە ساڵی ١٩٤٥ وە.

ڕوسیا دەکەوێتە باکوری، کۆریای باشوور دەکەوێتە ڕۆژئاوای، چوار دورگە گەورەکە، دورگەی هونتۆ (٨٠٥ر٨٧ میل چوارگۆشەیە) لەدوای ئەو هوکاید و هەروەها کیوشۆ و شیکوکۆ، دەشتە بڵند و نەویەکانی درێژی ١٦ر٦٥٤ میل دەبێت. زۆر پردو بەربەستی لێ دورستکراوە لەسەر زێیەکانی و زۆر بەتیژی دێنە خوارێ ئەویش بۆ بەرهەم هێنانی وزەی کارەبا زۆر بەسوودە ، دەشتایی کەمەو گەر هەشی بێت لە دەشتایەکانی کەناریەو لەنێوانیان دەشتایی کانتۆیە کە کەوتۆتە دورگەی هۆتشۆ ڕووبەرەکەی ٥ر٠٠٠ میل چوارگۆشە دەبێت، لە ٧٠٪ خاکی یابان دارستانە. کەش و هەوای وەرزیەو سوك دەبێ لەکاتی بەرز بوونەوەی دەریا، زستانی ساردێکی کوشندەیە، هاوینی گەرم و شێ دارە، زریانی کەمەرەیی زۆرەو بارانی بەرزو کەوتنەخوارەوەی بەفری زۆرە لە زستان.

- مێژووی وڵات: زنجیرەیەك لە ئەفسانەکان وای دادەنێن کە وڵاتی یابان دەگەڕێتەوە بۆ دروستکراوی خواوەندی ڕۆژەکە کە ئەو یابانی دروستکردوە، واش دەگێڕنەوە کە نەوەی قەشەکان دەیلێن کە دەگەڕێتەوە سەر ڕەچەلەکی خواوەندی ڕۆژەوە یەکەمیان کە نازی جیمونتویوە ئەو لەساڵی ٦٠٠ پێش زایینی کورسی دەسەڵاتی وەرگرتیە. لە ساڵی ٤٠٠ زایینی یەکێك لە عەشیرەتە شەڕکەرەکان یەکیان گرتوو ئەویش عەشیرەتی (یاماتو) بوو (عەشیرەتی یاماتو) کە ئەوان بەباپیرانی خێزانی ئیمپراتۆریەتەکەدا دەنێن، لەسەدەکانی پێنج و

شەش نوسین هاتە کایەوە لەو ناوچەیە، لە سەدەی حەوت دانیشتوانەکانی کۆنگۆی شوسیەو بوزیە لەچین و کوریا ڕوویان لە یابان کرد ، لە ساڵی ٦٤٦ ڕێکخستنی چین دەستی پێ کرد، لە ساڵی ٧٩٤ شاری (هییان) بوە پایتەختی ئیمپراتۆریەت و دوایی ناوی نرا (کیۆتۆ). ئیمپراتۆریەتی یابان لە ساڵی ٨٥٨ کەوتە ژێر دەسەلاتی عەشیرەتی فوجی وارا کە دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەت بەرەو لاوازی هەنگاوی نا تاگەیشتە ئەوەی هەر بەناو ئیمپراتۆر بێت لە سەدەی یانزە دەسەڵاتی ناوەندی بوە دەسەڵاتێکی بێ هێز تاکو خاوەن مولکەکان دەسەڵاتی تەواویان کەوتە دەست لە(دایمو) کە بوە هۆی دابەش بونی یابان بۆ چەند پارێزگاو بەشی بەهێز کە خاوەن زەویە گەورەکان حکومیان تێدا دەکرد بەهۆی بونی سوپای تایبەتی خۆیان بەناوی (ساموورای). لە ساڵی ١١٨٥ عەشیرەتی میناموتۆ دەسەڵاتی گرتە دەست بەسەرکردایەتی یۆرتیۆمۆ کە دەسەڵاتێکی سەربازی دامەزراند. لە ساڵی ١١٩٢ ئیمپراتۆر نازناوی (مشوجی) واتە ژەنەراڵی وەرگرت و حوکمی وولاتی دەکرد بەناوی ئیمپراتۆر. لەنێوان ساڵەکانی ١٢٧٤ تا ١٢٨١ یابان دووجار کەوتە ژێر تالان کردن لەلایەن مەگۆلەکان بەڵام لە هەردوو هەوڵ هەرەسی هێنا بەهۆی زریان، لە ساڵی ١٤٥٢ دەریاوانە پرتوگالیەکان بۆ یەکەم جار گەیشتە یابان لە ئەوروپا بەیاوەری بازرگانەکانی ئەسپانی و هۆڵەندی و ئینگلیز. لە ساڵی ١٥٤٩ پیاوە ئاینییەکانی مەسیحی ڕوویان تێ کرد بۆ بڵاو کردنەوەی ئاینی مەسیحی بە مەزهەبی کاسۆلیکی ڕۆمانی لەلایەن (فرانسیس ئەکافید).

لە ساڵی ١٥٨٥ سەرکردەی سەربازی (هیدوش) دەسەڵاتی گرتە دەست و دووجار هەوڵی داگیرکردنی کوریایدا لەساڵەکانی ١٥٩٢ و ١٥٩٧، لەدوای ئەو (توکوجادا) دەسەڵاتی نوێی دامەزراند لە ساڵی ١٦٠٣ لە ناوچەی ئیدو (تۆکیۆی ئێستا) دەستی کرد بە چاکسازی کارگێڕی، داپلۆسینی ئاینی مەسیحی. ئەمەریکا کەشتیەکی جەنگی ڕەوانەی یابان کرد لە ساڵی ١٨٥٣ بۆ ئیدۆی (تۆکیۆی ئێستا) داوای لەیابان کرد کە پەیوەندی دیبلۆماسی بازرگانی لەگەڵ ببەستێ و یابانیش ڕازی بوو بە داواکەی ئەمەریکا لە ساڵی ١٨٥٤، لە ساڵی ١٨٦٨ ئیمپراتۆر (مۆتسۆهیتۆ) هەموو دەسەڵاتی گرتە دەست ناز ناوی خۆی نابە(میجی) و پایتەختی لە کیۆتۆ گواستەوە بۆ ئیدۆ لەدوایی ناوی نرا تۆکیۆو دەستی کرد بە چاکسازی ئابووری و هەڵوەشاندنەوەی دەرەبەگی و سوپایەکی بەهێزی بەزۆر دروستکردو حکومەتی پەرلەمانی لە ساڵی ١٨٨٩ دامەزراند، کە بوە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی نێوان چین و یابان لە ساڵەکانی ١٨٩٤-١٨٩٥ کە بوە هۆی دەرکردنی چین لەکوریاو فرۆموزا (تایوان)ی داگیر کرد لەگەڵ ناوچەکانی دورگەی بسکادور و پارچەیەك لە مەنشوریای باشوور. لە ساڵی ١٩٠٢ یابان چووە ناو پەیمانی بەرگری لەگەڵ بەریتانیاو لە ساڵی ١٩٢١ کۆتایی بەو پەیمانە هات. لە ساڵەکانی ١٩٠٤و١٩٠٥ شەڕی نێوان ڕوس و یابان دەستی پێ کردو بوە هۆی دەرکردنی ڕوسەکان لە مەنشوریاو کوریاو باشووری سخالینی وەرگرت، لە ساڵی ١٩١٠ کوریای لکاند بە یابان. یابان بەشداری جەنگی یەکەمی جیهانی کرد لەساڵی ١٩١٤ لەگەڵ هاوپەیمانان و زۆر لەپاشماوەی کەلوپەلی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەستکەوت لەرۆژهەلاتی دور،دورگەی ئەڵمانی وەرگرت لەدەریای هادی بە پێی پەیمانی فرسای و دەسەلاتی ئینتدابی خستە سەر ئەلمانیا، یابان ڕازی بوو لەسەر یەکێتی چین بەپێی کۆنگرەی ساڵی ١٩٢١و١٩٢٢ی واشنتۆن لەئەمەریکا، لە ساڵی ١٩٣١ یابان منشوریای داگیر کرد و ساڵی

دوای دەوڵـەتێکی نۆکـەری لـێ دامەزراند بـەناوی (مەنشۆکۆ) لەوکاتـە کاروبـاری حکومـەت کەوتـە نێــوان دەســـەڵاتی ســـەربازەکان و نیـــشتیمان پەروەرەکانی دارایی، پەلاماری چین درا لە ساڵی ١٩٣٧، لـــەدوای شـــکانی هێزەکـــانی فەرەنـــسا بەرامبـەر ئـەڵمانیا یابان هیندی چینی فەرەنسی داگیر کرد، لە ساڵی ١٩٤١ یابان پەلاماری کەشتی سەربازی ئەمەریکایدا لە بەندەری (بێرل هاربور) لە نزیك هۆنۆلولو لە دورگەی هاوای، لەدوای ئەو پـەلامارە بـەریتانیا و ئەمـــەریکا شـەڕی دژ بـە یابانیان ڕاگەیاند، لە ساڵی ١٩٤٢ یابان پەلاماری تایلانــدی دا لەگــەڵ بۆرمـا و مـەلایۆ و دورگـەی هینـدی ڕۆژهـەلاتی هۆلەنـدی و فلیپین و باکوری گینیای نوێ، لە ١٩٤٥/٨/٦ ئەمەریکا قونبەلەی ئـەتۆمی لـە شـاری هیرۆشـیما و لـە ١٩٤٥/٨/٩ قونبەلەی دووەمی لە شاری ناکازاکی دا کە بووە هـۆی کوشتنی ٧٣٠ر٨٨٤ کەس و بریندار بونی ٣٠٤ر٠٠٠ هـەزار کـەس لـە ٤٨ چرکەدا. یابان لە ١٩٤٥/٨/٤ خۆبەدەستەوە دانی ڕاگەیاند لەسـەر پشتی باریجەی (میسوری) لە کەنداوی تۆکیۆو بوە هۆی ئەوەی کە باشووری سخالین و دورگەی کوریل بخەنە ژێر دەسەلاتی یەکێتی سۆڤیەت و هـــەروەها فۆرمـــۆزاو مەنـــشوریا بکەوێتـــە ژێـــر دەسەلاتی چین بەڵام دورگەی زەریای هادی هەر لەژێر داگیرکردنی ئەمەریکا مایەوە.

لـە سـاڵی ١٩٤٧ (مـاك ئـارپن) سەرپەرشـتی دەرچوونی دەستوری نوێی یابانی کرد کە بە دەستوری ئاشتی ناوزەنـد کـراو یابـان بـەڵێنی بەشداری هیچ شەڕێك نـەکات و (دئیب) پەرلەمان خاوەنی دەرکردنـی هـەموو یاساو بڕیارێك بێت، یابـان لـە سـاڵی ١٩٥٢ تـوانی دەسـەڵات لەسـەر تەواوی خاکی خۆی بسەلمێنێ، لە ساڵی ١٩٥٥ پـارتی دیمـوکراتی لیبڕالی دامـەزرا بـە پـشتیوانی پیـاوانی خـاوەن سـامان، یابـان بـوە ئەنـدام لـە نەتەوەیەککگرتووەکان لە ساڵی ١٩٥٦، لە سایەی ئەمـــەریکا ڕەزامەنـــدی نوانـــد بەگەڕاندنـــەوەی دورگەی ئۆکیناوا و دوورگەی ریوکۆی تر لەساڵی ١٩٧٢. هەلبژاردنەکانی ١٩٨٩ پارتی دیموکراتی لیبرلی گەورترین دۆراندنی بەخۆوە دی لە ماوەی ٣٥ ساڵدا. سـەرۆك وەزیـران (کـایفۆ) نـۆ ملیـۆن دۆلاری وەك یارمـەتی دا ئەمـەریکا بـەهۆی شـەری کەنـداوی دووەم لەســاڵی ١٩٩١ لەگــەڵ عێـراق، دووبـــارە پـــارتی دیمـــوکراتی لیبرالـــی لەهەڵبژاردنـەکانی ١٩٩٣ باشـترین سـەرکەوتنی بەدەست هێنا وکە لەساڵی ١٩٥٥ دەسـەڵاتی هـەر لەدەسـت بـوە. لەسـاڵی ١٩٩٤ سـەرەك وەزیـران هۆسۆ کاوە دەستی لەکار کێشاوەبەهۆی ناریکی دەسـەڵات لەخـەرج کردنـی داهـاتی وڵاتەکـەی. لەساڵی ١٩٩٥ گومەلەرزەی بەهێزی لێ کەوتەوەو بـوە هـۆی مردنـی زیـاتر لـە ٥٠٠٠ هـەزار کـەس. لەمانگی/٣/ ٢٠٠٠ کیزۆ ئەیۆمی جەڵتەی دەماغی لێیداو کۆچی کرد، یابان لەدوای جەنگی دووەمی جیهـان وازی لـە هـەموو کـارێکی سـەربازی هێنـا بـەپێی ڕێکەوتنـەکانی لەگـەڵ وڵاتـانی شـەر کـە مـۆری کردبـوو ڕوی لـەبوارەکانی هەمـە جـۆری پیـشەسازی و ئـابوری کـرد تـا بـووە هێزێکـی ئابوری گـەورەو یەکـەم وڵاتـی ئـابووری مـەزن لـە جیهاندا، یابان لەشەڕی نێوان عێراق و ئەمـەریکاو هاوپەیمانان بوە وڵاتێك لەوڵاتانی هاوپـەیمانان بۆ روخانی رژێمی سەدام حوسێن لەساڵی ٢٠٠٣، لەســاڵی٢٠٠٤ ســـەرەڕای چـــەند گیروگرفـــت کەلەلایـــەن تیرۆرســـتانی ئیـــسلامی توشـــی کارمەندەکانی بوو. هاوبەشی هاوپەپمانە.

- یابـــان ئەندامـــە لـــە ڕێکخـــراوی نەتـــەوە یـــەککگرتوەکان، ئەندامـــە لـــە ڕێکخـــراوی هاوکـــاریو بوژاندنـــەوەی ئـــابوری، ئەندامـــە لەرێکخراوی بازرگانی جیهانی:

# ئەندۆنوسیا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری ئەندۆنوسیا.
- پایتەختی: جاکارتا، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۲۵۰ر۹ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکییەکانی: سورابایا، میدان، باندونگ، سیمارانگ.
- بەندەرە سەرەکییەکانی: جاکارتا، سۆرابایا، بایمبانگ، سیمارانگ، ئۆجنگ بادانگ
- ڕووبەری: ۳٥٤ر۷۳٥ میل چوارگۆشەو (۵۷۰ر۹۰٤ر۱ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۳٥۰ر۲۱۸ ملیۆن کەسە بەپێی ئاماری ۲۰۰۳.
- چڕی دانیشتوانی: ۲۹۷ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٦ر۱٪.
- نژادەکانی: گاو بون ٤٥٪ سودانی ١٤٪ مادوربون ٥ر۷٪ مالایۆ ٥٪.
- زمانەکانی: بەهازای ئەندونوسی (زمانی ڕەسمیە) ئینگلیزی، هۆلەندی، گاوی.
- ئاینەکانی: ئیسلام ۸۷٪، پرۆتستانت ٦٪، ئاینی تری تیایە.
- زانینی نوسین و خوێندن: ۸٦٪.
- دراوی: ڕوپیە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۱۰۰ر۹٦۰ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۷۰۰ر٤ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر۸٪ لە خاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: برنج، کاکاو، گیزی هیندی، مەتات، تەڕەو میوەجات، گەنمو جۆ، چەوەندەری شەکر، چەندین جۆری تر.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ۷۵۰ر۷ ملیۆن سەر، بزن ۵۰۰ر١٤ ملیۆن سەر، چێڵو گامێش ۱۲ ملیۆن سەر. پەڕەور ۷۵۰ر۲۹ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی : نیکل، نەوت، بۆکسیت، نوحاس، غاز، قەسدیر.
- پیشەسازی: دروستکردنی خۆراك، پالاوتنی نەوتو غاز، بەرهەمی ڕستن و چنین، چیمەنتۆ، پیشەسازی سوك، پەینی کیمیاوی، مەتات، دار.
- بەرهەمی کارەبا: ۱٥۰ر۷۳ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- دەرچووەکانی: نەوت و غازی سروشتی، شلەکان، دار، مەتات، قاوە، بەرهەمی ڕستن و چنین.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی کیمیاوی، ئامێر، کەلوپەلی دروستکراو، ئۆتۆمبێل، دەرمانی پزیشکی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، ئەمەریکا، سنگافورە، یەکێتی ئەوروپا، هەندێ لە وڵاتانی عەرەبی، چین، هەندێ لە وڵاتانی ئەفریقی.
- دابەشی کارگێڕی: ۲٤ پارێزگایە، لەگەڵ دوو هەرێمی تایبەتو لەگەڵ کارگێڕی پایتەخت.
- بەرگری: ٥ر۳٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۵۰۰ر۲۸٤ هەزار کەسە.
- ڕژێمی دەسەلات: لە ۱۹۹۸/٥/۲۱ لە دوای کەمتر لە سێ مانگ بە هەڵبژاردنەوەی سوهارتۆ بۆ سەرۆکایەتی بۆ ماوەی حەوت ساڵ دەستی لەکار کێشاوە بەهۆی خۆپیشاندانو ئاژاوە دژی دەسەڵاتەکەی بەتەنگەژەی ئابووری و دژی داپلۆسێن و نەبوونی ماف مرۆڤ و دیموکراتیەت و لەدوای خۆی حەبیبی جێگری دەسەڵاتی وەگرت و بڕیاری هەڵبژاردنی داو لە ۱۹۹۹/۱۰/۲۰ هەڵبژاردنەکە ئەنجام دراو عبد الرحمن سەرکەوتنی بەدەست هێنا. سەرۆك کۆمار سەرۆکی وڵاتە و سەرۆك وەزیرانە لە

هەمان كاتدا. جێگری ئەنجومەنی ڕاوێژكاری هەڵدەبـژێردرێت لەگەڵ سەرۆكەكەی بە ڕەزامەندی زۆرینە بۆ ماوەی پێنج ساڵ. ئەنجومەنی یاسادانان كە ئەنجومەنی نوێنەرانە لە ٥٠٠ ئەندام پێك هاتوە و ٤٥٠ ئەندامیان بە دەنگ هەڵدەبژێردرێن ٧٥ ئەندام لە سەربازەكان دادەمەزرێن، ماوەی ئەنجومەن پێنج ساڵە. ئەنجومەنی نوێنەران كە باڵی یاسادانانە بۆ ئەنجومەنی ڕاوێژكاری گەل كۆدەبێتەوە كە هەموو یاساو نەخشەی وڵات دەست نیشان دەكات ، هەر ئەو هەڵدەستی بە هەڵبژاردنی سەرۆك و جێگرەكەی كە لەوكاتە ئەندامەكانی ئەنجومەنی نوێنەران دەچێتە پاڵی كە ٥٠٠ ئەندامن بەڵام ٥٠٠ ئەندامەكەی تر هەڵدەبژێردرێن بە پێشنیاری ڕاستەوخۆ.

- پارتە ڕامیاریەكان: پارتی جولكار، پارتی دەسەڵاتدار، پارتی دیموكراتی ئەندۆنوسیا، كە پارتە نەتەوەیەكانو لەمەسیحیەكانی پێشوە.
- جوگرافیای وڵات: ئەندۆنوسیا پارچەیەكە لە ئەرخەبیلی مالایۆ لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، وڵاتێكە زۆرترین كۆمەڵە دورگەكان دەگرێتە خۆ لە جیهاندا، ژمارەی دورگەكانی ٥٠٨ر١٧ دورگەیە كە ٦ر٠٠٠ هەزار دورگەی دانیشتوانی تیایە، دورگەی گاوە درێژترین دورگەیە لە ناوچەكانی جیهان لە چڕی دانیشتوانی كە ٢٠٠٠ كەس لەیەك میل چوارگۆشەدا دەژین، پێنج دورگەی سەرەكی هەیە ئەویش (سومترە، گاوە، كالیمنتان) كە سێ یەكی دورگەی بۆنیویەیە، بەڵام سێ دورگە بەرزەكەی هەرێمی ستوماكی تیایە كە سەر بەدەوڵەتی مالیزیایە، دەوڵەتی برونای، سولاوێزی، ئیریان، گایا ( ئەویش نیوەی دورگەی ڕۆژئاوایە لە دورگەی نیو گینیا، بەڵام نیوەی ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتی بابوانیوگینیای تیایە) لە دورگەكانی تر هیما و هیرانن لە باكورو دورگەی تەیمور لە باشوورو دورگەی فادوراو باليية كە دەكەوێتە هێلی كەمەرەی زەوی، لە باكوری وڵاتی مالیزیایە، بابوانیوگینیا لە ڕۆژهەڵاتی، زنجیرە چیای درێژی تیایە لە هەموو دورگە سەرەكیەكانی، ڕوودانی گومەلەرزەی زۆری تیایە، گڕكانی زۆری لێ ڕوودەدات.
- مێژووی وڵات: گەیشتنی شارستانیەت بۆ ناوچەی ئەندونۆسیا لەلایەن هندۆس و بوزیەكانی كە لە كێشوەری هیندەوە ڕویان تێكردبوو پێش دوو هەزارساڵ و ڕەگەكانی داكوتابوو بەتایبەتی لە ناوچەی گاوە . لەسەدەی یەكەمی سەردەمی مەسیحیەت زۆریەی دورگە ئەندونۆسیەكان كەوتنە ژێر دەستی قەشەو بازرگانە هیندۆسیەكان كە ڕۆشنبیری و ئاینەكەیان تێدا بڵاو كردەوە. لەسەدەی سیانزە ئاینی ئیسلام گەیشتە ئەو ناوچەیەو لە دواییدا بوە ئاینێكی سەرەكی وڵات، بازرگانە پرتوگالیەكان گەیشتنە ئەو وڵاتە لەسەرتای سەدەی شانزەم ، بەڵام هۆڵەندیەكان دەریان كردن و بونە هێزێكی بەهێزی بازرگانی لە ناوچەكە، لەسەدەی حەڤدەم دەسەڵاتیان بەسەر تەواوی ناوچەی جاكارتا دەڕۆیشت لە ساڵی ١٧٥٠ زاینی.

لە ساڵی ١٨١١ ئینگلز دەستی بەسەر ئەندۆنوسیا داگرت و دوای لە ساڵی ١٨١٦ بۆ هۆڵەندیەكان جێهێشت ، لە سەرەتای سەدەی بیستەم وڵاتی ئەندۆنوسیا بەتەواوی كەوتە ژێر حكومڕانی هۆڵەنداو بوە پارچەیەكی جیانەكراوە لە وڵاتی هۆڵەندا. لەجەنگی دووەمی جیهانی یابانیەكان ئەندۆنوسیایان داگیركرد و مافی ئۆتۆنۆمیان پێ داو لە ساڵی ١٩٤٢ لەدوای خۆ بەدەستەوەدانی یابان لە شەڕی دووەمی جیهان لە ساڵی ١٩٤٥ سەرۆكی ئەندۆنوسی (سوكارتۆو)و جێگرەكەی محمد سەربەخۆیی وڵاتیان لە١٧/٨/١٩٤٥ ڕاگەیاند بە دەرچونیان لە ژێردەسەڵاتی هۆڵەندا.

لە ساڵی ١٩٤٦ هۆڵەندییەکان و ئەندۆنوسییەکان گەیشتنە ڕێکەوتنی یەکێتی ئەندۆنوسی و هۆڵەندی بەڵام دوای کێشەو دوبەرەکی کەوتە نێوانیان تاساڵی ١٩٤٩ کە گەیشتنە ڕێکەوتنی یەککرتن. لە ١٩٤٩/١٢/٢٧ هۆڵەندا وازی لە ئەندۆنوسیا هێناو بوە وڵاتێکی سەربەخۆی تەواو. لە ١٩٥٠/٨/١٧ ڕژێمی کۆماری لەلایەن سوکارتۆو ڕاگەیانرا. بەڵام ئیریانی ڕۆژئاوا ئەویش پارچەیەك بوو لە دورگەی گینیای نوێ هەر لە ژێر دەسەلاتی هۆڵەندا مایەوە. لە مانگی/٢/ ١٩٥٦ یەککرتنی لەگەڵ هۆڵەندا هەڵوەشاندەوە، لە ساڵی ١٩٦٢ نەتەوە یەککرتووەکان بە ڕاوێژکاری پرۆژەی یارمەتی دانی ئەمەریکا بۆ ئیریانی ڕۆژئاوا گەڕاوە ناو خاکی ئەندۆنسیای یەککرتوو، سوکارتۆ بۆ ماوەی نیو سەدە پەرلەمانی لەکارخستو لەماوەی دەسەڵاتی سوکارتۆ کۆمەنیستەکان بەرەو بەهێزبون و فراوان بون هەنگاویان دەناو سوکارتۆش پەیوەندی بە هێز کرد لەگەڵ وڵاتە کۆمەنیستەکان. سوکارتۆ بە چەك و تەقەمەنی ڕوسەکان وڵاتی مالیزیای بۆردومان دەکرد، لە ساڵەکانی ١٩٦٤و١٩٦٥ دژی یەککرتووی مالیزیا دەجەنگا. لە ساڵی ١٩٦٦ ئەندۆنوسیا و مالیزیا ڕێکەوتن لەسەر کۆتایی هێنان بەشەڕی نێوانیان. لە ساڵی ١٩٦٥ هەوڵی کودەتایەك درا دژی سوکارتۆ کە بوە هۆی کوژرانی زۆر لە ئەفسەرە سەربازەکان و تاوانبار کردنی کۆمەنیستەکان بەو کودەتایە بەهۆی بەشداری کردنی کۆمەنیستەکان بوە هۆی کوشتن و لە سێدارەدانی زیاتر لە٢٠٠ هەزار کەس لە کۆمەنیستەکان کە سوکارتۆ سەرۆکی ئەرکانی سوپای ئەندۆنوسیا بوو تا ئەوکاتە دەسەڵاتی تەواوی بەسەر ئەندۆنوسیا سەپاند و بوە سەرۆك کۆمارو لە ساڵی ١٩٦٨ تەواوی دەسەڵاتی گرتە دەست و بوە ئیمپراتۆرێکی تەواو لەسەر گەلانی وڵاتی ئەندۆنوسیا. لەو کاتەش پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاوا بەهێز کرد بەهۆی فرۆشتنی نەوت و بوژانەوەی ئابووری وڵات کە بەرەو بەرزی هەنگاوی دەنا.

لە ساڵی ١٩٧٥ نیوەی دورگەی تەیموری داگیر کرد و لەوکاتەش بەناوی دیموکراتیەت و کەم کردنەوەی گومرگ لەسەر باجەکان و بە نیازی هەڵبژاردنەوەی بۆ جاری شەشەم، لە مانگی/٣/ ١٩٩٣ ئەنجومەنی ڕاوێژکاری کە ژمارەیان ١٠٠٠ ئەندام بوو دوبارە سوکارتۆیان هەڵبژاردەوە بۆ جاری شەشەم کە ئەو ئەنجومەنە لە ماوەی پێنج ساڵ یەك جار کۆدەبۆوە بۆ مەبەستێکی ئاوا. دوای ئەوە ماوەی کارکردنی ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسان تەنگ کردەوە و وڵاتەکەی بەرەو کارەساتی ئابووری دەبرد، لە مانگی/٩/ ١٩٩٧ ئاگرێکی گەورە بەربوە زەویەکی فراوان کە بوە هۆی هەڕەشە کردن لە وڵات و بوە کارەساتێکی بێ وێنەی گەورە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا.

جێگرو یاریدەدەرەکانی کچەکەی سوکارتۆیان هەڵبژارد بە سکرتێری پارتی دیموکراتی ئەندۆنوسی و بەرهەڵستکار لە ١٩٩٤ هەر بە هاندانی سوکارتۆ دوبەرەکی کەوتە ناو پارتەکەو لەساڵی ١٩٩٦ کەرت بوو. بۆ دووپارتی رامیاری.

بەهۆی دەسەلاتی تاك ڕەوی سوکارتۆو رامیاریەتی خۆویستی و داپڵۆسین و دورکەوتنەوەی لە پەیوەندەی و لێك ترازان بوە هۆی دەرکەوتنی خۆپیشاندان و دروستکردنی ئاژاوە لە ساڵەکانی ١٩٩٦و١٩٩٧.

لەمانگی/٣/ ١٩٩٨ پەرلەمانی ڕاوێژکاری دیسان سوکارتۆیان هەڵبژاردەوە بۆ جاری حەوتەم بە سەرۆك کۆمار لەوکاتەی تەنگەژەی ئابووری و بڵاوبوونەوەی برسیەتی و بەرزبوونەوەی نرخی کەلوپەل بەشێوەیەکی گشتی بوە هۆی ئەوەی کە سوکارتۆو محمد حبیب دەست لە کار بکێشێنەوە. لە ١٩٩٩/١٠/٢٠ عبد الرحمن واحد هەڵبژێردرا بە سەرۆك کۆمار کە سەرۆکی گەورەترین کۆمەڵەی

ئیسلامی بوو. هەر بەهۆی ڕامیاریەتی دەسەڵاتی سۆگارتۆ بەرامبەر بەگەلانی ئەندۆنوسیا نەدانی مافی تەواو لە بوارەکانی ڕامیاری و نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی لەوانەش گەلانی تەیموری ڕۆژهەڵات و تەیموری ڕۆژئاوا لەدورگەی ئەندونیسیا کە دەکەوێتە ئەرخەبیلی مەلایۆ لە باشوری ڕۆژهەلاتی ئاسیاو لە باشوری دەریای سافۆو دەریای بانداولە باشوری دەریای تەیمور کە ڕوبەرەکەی ٩١٢ر٣٣کیۆمەتر چوارگۆشەیەو ژمارەی دانیشتوانی زیاتر لە ٠٠٠ر٨٩٠ر١ ملیۆن کەس دەبێت و هەرچەند هەرێمێکی هەژارە لەبواری کشتوکالی، دانیشتوانی تەیمور لە ڕەچەلەکەکانی جۆراو جۆرە لە مەلایۆو بۆلینس یابواو ژمارەیەکی کەم لە گەڵ چینی میللی تیایە کە بەبازرگانی هەمەجۆر خەریکن و سودی باشی بۆ هەرێمە کە هەیە.

پایتەختی تەیموری ڕۆژئاوا کۆباگە پایتەختی تەیموری ڕۆژهەڵات شاری دیلیەو دانیشتوانەکەی لە ئیسلام و مەسیحی پێکهاتوە، پورتوگالیەکان هەلسان بە دورستکردنی کۆمەلگای نیشتە جێ کردن لە دورگەی تەیمور لە سەرەتای سەدەی نۆزدەم و بازرگانە هۆلەندیەکان ڕویان تێکرد بۆ یەکەم جار لە سالی ١٦١٣و بوە هۆی دورست بونی کێشەی نێوان هۆلەندیەکان و پورتوگالیەکان لەسەر ناوچەکان کە زۆرینەی دەسەلاتیان تێیدا دەڕۆیشت و بەدیاری کردنی سنوری کاری بازرگانی و بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان لە زنجیرەیەك ڕێکەوتنی نێوانیان لە سالەکانی ١٨٩٣ تاکو ١٩١٤ دوای ئەوە تەیموری هۆلەندی کە تەیموری ڕۆژئاوابوو لە لایەن هۆلەندا بەجێ ما بۆ ئەندۆنوسیا و تەیموری ڕۆژهەڵات داگیرکرا لە لایەن ڕژێمی ئەندۆنوسیا لە دوای تێك چونی بارو دۆخی وولاتی پورتوگال و سەرەڕای ناڕەزایی ئەو داگیر کردنە لە لایەن وولاتانی جیهان و دان پێ نەنانی لە لایەن نەتەوەیەککرتووەکان دوای ئەوە تەیموری ڕۆژهەلات هەلسا بە پێك هێنانی جولانەوەیەکی چەپرەوی لە پێناو بەدی هێنانی سەربەخۆیی هەرێمەکە کە لەدژایەتی و کێشەو ململانێی دژوار بەردەوام بوو لە نێوان دەسەڵاتی ناوەندی ئەندنۆسیا بەهێزی سوپا لەگەل جولانەوەی تەیموری ڕۆژهەلات، لەدوای ئەوە لەمانگی ١٩٩٩/٨/ نەتەوە یەککرتووەکان ڕاپرسیەکی ئەنجام دا بۆ دیاری کردنی بیروڕای جەماوەری هەرێمەکەو لە ڕاپرسیەکە گەلانی هەرێمی تەیموری ڕۆژهەلات داوای سەربەخۆییان کرد بەجیا بونەوە لە وولاتی ئەندۆنوسیاو بوە هۆی زیاتر بەهێز بونی کێشەو ململانێی نێوانیان و لەئەنجام نەتەوە یەککرتوەکان هێزی ئاشتی پارێزی ڕەوانەی نێوان دەسەڵاتی ناوەندی و جولانەوەی فرتیلین فۆ هێور کردنەوەی بارو دۆخەکە. لە٢٠٠١/٧/٢٤خاتو میگاواتی سۆکارتۆ دەسەلاتی وەرگرت تاکو هەلبژاردنەکانی ٢٠٠٤/٩/٢٠ کە بودۆیونۆ ژەنەرالی خانەنشین سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە ئەندۆنۆسیا کە بەیەکەم هەلبژاردنی دیموکراتی دادەنرێت لە مێژووی ئەم وڵاتە، لەئەنجامی لێك کشانی دەریاو دروست بوونی گومەلەرزە لە ٢٠٠٤/١١/٢٦ لەئەنجام بوە هۆی لەناوبردنی زیاتر (٧٧٤ر٢٤٠) هەزار کەس و دەربەدەرکردنی بەدەیان هەزار خێزان و ون بونی بەسەدا کەس.

- ئەندۆنوسیا ئەندامە لە نەتەوە یەککرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی دەرهێنەری نەوت (ئۆپك) ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری ئاسیای (باسیفیك)، ئەندامە لە ڕایەلەی وولاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا.

# بــــرونــاى

- ناوى ڕەسمى: خانوى ئاشتى (دار السلام).
- پايتــەختى: بەنــدەر ســرى بيگــاوان، ژمــارەى دانيشتوانى٠٠٥ر٨٨ هەزار كەسە.
- شارە سەرەكيەكانى: سيريا، كوالابالاى.
- ڕووبــەرى: ٢٢٨ر٢ ميــل چوارگۆشــەو ٧٧٠ر٥ كيلۆمەتر چوارگۆشەيە.
- ژمارەى دانيشتوانى: ٠٠٠ر٣٨٥ هــەزار كەسە بە پێى ئامارى ٢٠٠١.
- چــڕى دانيــشتوانى: ١٧٣كــەس لەيــەك ميــل چوارگۆشەدا.
- نــژادەكانى: مــالايۆن ٦٨٪ چــينيەكان ٢٢٪ كەمايەتى ترى تيايە.
- بوژانەوەى دانيشتوانى: ٣ر٢٪.
- زمانــەكانى: زمــانى مــالاى (زمــانى ڕەسميــە) ئينگليزى، چينى.
- ئاينــەكانى: ئيــسلام (ئــاينى دەوڵەتــە)٦٦٪. بوزى ١٤٪. مەسيحى ١٠٪.
- زانينى خوێندن و نوسين: ٩٠٪.
- دابەشــــى كــــارگێڕى: ٤ بەشــــە لەگــــەڵ ٤ ئەنجومەنى شارەوانييە.
- بەرگرى: ٣ر٦٪ لەكۆى دەرئەنجامى ناوخۆيى.
- سوپاى: ٥٠٠ر٨ هەزار كەسە.
- دراوى: دۆلارى برۆناى يەكسانە بە ١٠٠سن.
- كــۆى دەرئــەنجامى نــاوخۆيى: ٥٠٠ر٥ مليــار دۆلار.
- بەشــى تــاك لــەكۆى دەرئــەنجامى نــاوخۆيى: ٥٠٠ر١٨ دۆلار.
- زەوى كشتوكاڵى: ٥ر١٪ لەخاكى وولاتەكە.
- بەرهــەمى كــشتوكاڵى: بــرنج، بيبــەر، مــۆز، كەسفاكە جۆرە ڕوەكێكە كەلەڕەگەكەى نانى لێ دروست دەكرێ، دانەوێڵە، چەوەندەرى شەكر.
- بەرهــەمى كارەبــا: ٥٠٠ر١ مليــار كيلــۆوات كاتژمێر.
- سامانى سروشتى: نەوت، غازى سروشتى كە ٤٠٪ لــەكۆى دەرئــــەنجامى ناوخۆييــــە، لەدەرچووەكانى ترى كە دەستى دەكەوێت لەدار فرۆشتن.
- پيشەسازى: غازى سروشتى، مسال.
- داهــــاتى دەرەوەى: ماشــــێن، كەلوپــــەلى گواســتنەوە، كەلوپــەلى دروســتكراو،كەلوپەلى خواردەمەنى، كيمياوى.
- دەرچووەكانى: نەوت، غازى سروشتى،مسال.
- هاوبەشەكانى بازرگانى: يابان، چين، تايلاند، ئەمەريكا،بــەريتانيا، ســەنگافورە، كۆريــاى باشوور.
- ڕژێمى دەسەلات: شانشينى بەرەلايەو جێگرى ئەنجومــــەنى ڕاوێــــژكارى دەســــەلاتدارە، ئەنجومــەنى وەزيــران لەلايــەن شانـــشين دادەمەزرێت.
- پارتە ڕاميارەكان: پارتى بروناى نيشتيمانى ديمــوكراتى، پــارتى برونــاى نيــشتيمانى يـەكگرتوو، پارتى گەلى بروناى، ئەمانە ماوەى كـار كردنيـان پـێ نـەدراوە بەتايبـەتى لـەدواى ساڵى ١٩٧٥ تاكو كۆتايى ٢٠٠٣.
- جوگرافيــاى وڵات: برونــاى پاشــايەتيە كــى سەربەخۆيە، دەكەوێتە كەنارى باكورى دورگەى بورنيـۆو درێـژ دەبێتـەوە لەسـەر دەريـاى چينى باشــوورو پارێزگــاى ســەباح و پارێزگــاى ساراواك كە هـەردوو ماليزيا دەورى دايـە. كـەم دانيـشتوان و دارسـتانى ئيـستواى زۆرەو سـێ يـەكى وولات بارانى زۆرە، لەڕۆژهـەلاتى چياى تيايـە كـە زۆيـەكانى بميـورويـنج و نونـوينگ و

بليتی تيايە.

• مێژووی وولآت: لەسەدەی پانزەم شانشينی ئيسلامی لێ دامەزرا. کە ماليزيەکان دەسەلآتيان گرتە دەست لە وولآتی بروونای و بوورونيوی باکور، لە سالّی ١٨١٤ بروونای هەرێمی ساراوکی لەدەست دا، بەلآم لەسالّی ١٨٨٨ بوە پارێزراو لەلايەن بەريتانيا، لەسالّی ١٩٠٦ بوە ژێردەستەيەکی بەريتانيا راوێژکاری بەريتانی نيشتەجێ ولآتەکە بوو کە لەلايەن بەريتانيا دەست نيشان کرابوو، لەسالّی ١٩٢٩ نەوت دۆزرايەوە، لەسالّەکانی ١٩٤١تا ١٩٤٥ لەلايەن ياپان داگير کرا لەکاتی جەنگی دووەمی جيهان. لەسالّی ١٩٥٩ دەستور راگەياندراوبەريتانيا کاروباری بەرگری و دەرەوەی گرتە دەست . لە١/٧/١٩٦٢ پاشايەتی حوکومرانی دەکرد بەبڕيارەکانی کە بەهێزی ياسا دەردەکرا ئەمەش لەدوای هەرەس هێنانی و لکاندی بروونای بەيەکێتی ماليزيا، بروونای لەسالّی ١٩٧١ مافی ئۆتۆنۆمی ناوخۆی تەواوی وەرگرت، لەسالّی ١٩٧٥ نەتەوە يەکگرتووەکان بڕياری دەرکرد بەپێدانی سەربەخۆی بروونای بەجيابوونەوە لەبەريتانيا. لەسالّی ١٩٨٤ سەربەخۆی وەرگرت لەبەريتانيا، لەسالّی ١٩٩١ بروونای چوە ناو وولآتانی بێ لايەن.

• بروونای ئەندامە لەنەتەوە يەکگرتووەکان، ئەندامە لەکۆمەنولسی بەريتانيا، ئەندامە لەرابتەی وولآتانی باشووری ڕۆژهەلآتی ئاسيا.

# بەنگلاديش

• ناوی ڕەسمی: کۆماری ميللی بەنگلاديش.
• پايتەختی دەکا ژمارەی دانيشتوانی ٠٠٠ر٧٦٨ر٨ مليۆن کەسە.
• شارە سەرەکيەکانی شيتا، جونگە.
• بەندەرە سەرەکيەکانی دەکا، شالنا، شيتا، جونگە.
• ڕووبەری: ٥٩٨ر٥٥ ميل چوارگۆشەو ٠٠٠ر١٤٤ کيلۆمەتر چوارگۆشەيە.
• ژمارەی دانيشتوانی: ٠٠٠ر٥٨٠ر١٣٠ مليۆن کەسە بەپێی ئاماری ٢٠٠٢.
• چڕی دانيشتوانی: ٢٣٤٨ کەس لەيەك ميل چوارگۆشەدا.
• بوژانەوەی دانيشتوانی: ١ر٢٪.
• نژادەکانی: ٩٨٪ لە بنەڕەتا بەنگالی و بيهاری و چەندين کۆمەلّگای هۆزی جۆراو جۆری تری تيايە.
• ئاينەکانی ئيسلام ٨٥٪، هندۆس ١٥٪.
• زمانەکانی: بەنگالی (زمانی ڕەسميە) ئينگليزی.
• زانينی نوسين و خوێندن: ٤٣٪.
• دابەشی کارگێڕی: چوار پارێزگايە، جگە لەپايتەخت.
• کۆی دەرئەنجامی ناوخۆيی: ٥٠٠ر١٦٨ مليار دۆلار.
• بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆيی: ١٦٠ ر١ دۆلار.
• دراوی: تاکا يەکسانە بە ١٠٠ پيا.
• بەرگری: ٨ر٥٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆيی.
• سوپاکەی: ٣٠٠ر١٢٠ هەزار کەسە.
• زەوی کشتوکالّی: ٥ر٦٧٪ لە خاکی وولآتەکە.
• بەرهەمەکانی کشتوکالّی: پەتاتە،، برنج، چايە،

شەكر، تەرە، میوەجات، دانەوێڵە واتە گەنم و جۆو نۆك و نیسك و هیتر.

• سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٣٠٠ر٢ ملیۆن سەر، بزن ٥٠٠ر٣٠ ملیۆن سەر، چێڵ و گامێش ٣٥٠ر٢٤ ملیۆن سەر، پەرەوەر ٨٠٠ر٦٥ ملیۆن سەر.

• سامانی سروشتی: غازی سروشتی، یۆرانیۆم، داری دارستانەكان.

• پیشەسازی: كەلوپەلی چون، بەرهەمی ڕستن و چنین، شەكر، پەینی كیمیاوی، پەر، خواردەمەنی دروستكراو.خۆشكردنی پێست،ئامادە كردنی گۆشت.

• بەرهەمی كارەبا: ٣٠٠ر١٢ ملیار كیلۆوات كاتژمێر.

• داهاتی دەرەوەی: نەوت، خۆراك، بەرهەمی ڕستن و چنین، كەلوپەلی سەرمایەداری.

• دەرچووەكانی: پێست، جورجی دەریا، جل و بەرگ، گۆشت، ئاژەلی زیندوو.

• هاوبەشەكانی بازرگانی: یابان، چین، ئەمەریكا، بەریتانیا، هەندێك لە ولاتانی عەرەبی.

• ڕژێمی دەسەلات: پەرلەمانی دیموكراتیە، لە هەڵبژاردنەكانی ساڵی ١٩٩١ لە ڕاپرسەكە دەسەلاتی سەرۆك كۆمار كەم كرایەوە، دەسەلاتی نوێنەری بە ئیتلافی وەزیران كە زۆربەی لە پارتی بەنگلادیشی نیشتیمانییە. ئەنجومەنی وەزیران ڕۆڵی خۆی دەبینێ. لە ساڵی ١٩٩٦ كچی موجیب ڕەحمان دەسەلاتی وەرگرت كە ناوی (حسینە) بوو بەلام پارتی بەنگلادیشی نیشتیمانی بەشداری پەرلەمانی نەدەكرد.

• پارتە رامیاریەكان: پارتی بەنگلادیشی نەتەوەیی، پارتی ئیسلامی بەنگلادیش، ڕاست ڕەوی ناوەندی، پارتی ڕایەلەی جەماوەری، زانستیەكان، سۆشیالستی مام ناوەندی، پارتی جانیادای نیشتیمانی.

• جوگرافیای وولات: بەنگلادیش دەكەوێتە سەر كەناری كەنداوی بەنگال، لە باكور هیند دەكەوێتە ڕۆژئاوای و باكوری و ڕۆژهەلاتی، بەلام لە باشوری ڕۆژهەلاتی كە سنورێكی كەمی هەیە لەگەڵ میانمار (بۆرمای پێشوو) پێك هاتەی بەنگلادیش لە دەشتایەكی نەوی پێك هاتووە كە زێی جانگ و زێی براهماو بوتراو لقەكانی دەیكاتە دووبەش، هەڵكەوتنی بەنگلادیش لەڕووی كەش و هەوای بارانی زۆرە لە وەرزەكانی بەتایبەتی لە زستان و بەهاری كە دەبێتە هۆی لافاو كە ئەمەش وێران كردنی بەدواوەیە.

• مێژووی ولات: هۆزەكانی بانگە گەیشتە ناوچەی دۆڵی زێی بانگە لەوێ شانشینی بانگایان "بنگال"پێك هێنا١٠٠٠ساڵ پێش زاین ، لە نێوان سەدەی هەشتەم و دوانزەی زاینی بوزیەكان دەسەلاتیان لە بەنگال گرتە دەست، لە ساڵی ١١٩٩ ئایینی ئیسلام گەیشتە ئەو ناوچەیە كە لە ناوەڕاستی ئاسیا بۆی هاتبون. لە ساڵی١٥٧٦بۆ جاری دووەم ئیسلام گەڕاندراوە بنگال لەلایەن ئیمپراتۆری مەگۆلی عوسمانی كە كارگێڕی مزگەوت و پەرسگای باشی لێ دروستكرد لە بارەی كاروباری ئاینی. لە ساڵی ١٦٥١ كۆمپانیای هندی ڕۆژهەلات كارگەیەكی بازرگانی باشی لێ دامەزراندو بازرگانی بنگالیەكان گەیشتنە بەندەری شیتا لە ساڵی ١٥١٧، لە ساڵی ١٧٥٧ بنگال كەوتە ژێر دەستی بەریتانیا لەدوای هەلاتنی ڕوبرت كلایف كە سەركردەی هێزی بەریتانی بوو، بنگال دابەش بوو بەدوو بەش لە ماوەیەكی كەمو لەنێوان ساڵەكانی ١٩٠٥تا١٩١٢ كە بەشی ڕۆژهەلاتی ئیسلامەكان بونە دەسەلاتدارو بەشی ڕۆژئاوای هندۆسەكان بونە دەسەلاتدار، لە ساڵی ١٩٠٦ ڕابتەی ئیسلامی لەشاری دەكا دامەزرا . دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٤٧ بەریتانیا لە هند و پاكستان كشاوەو لە ١٩٧١/٣/٢٦ دانی بە سەربەخۆی نا كە لەو كاتە پاكستانی ڕۆژهەلات بنگال بو كە لە پاكستانی ڕۆژئاوا

جیا بووەوەو بووە کۆماری بەنگلادیش، لە ساڵی ١٩٥٥ ناوی بەنگال گۆڕا بۆ پاکستانی ڕۆژهەڵات لە ساڵی ١٩٦٦ مەجیب ڕەحمان پرۆگرامی مافی ئۆتۆنۆمی ڕاگەیاند بۆ پاکستانی ڕۆژهەڵات، لەدوای کێشەو ململانێی زۆر لەنێوانیان تا مانگی/٤/١٩٧٤ سەربەخۆی تەواوی وەرگرت و چەندین کودەتای یەك لەدوای یەکی لێ ئەنجام درا. لە دوای سەربەخۆیی وولآت موجیب ڕەحمان سەرۆکی ڕابیتەی گشتی پۆستی سەرەك وەزیرانی گرتە دەستودوای ئەوە بەنگلادیش کەوتە ژێر ڕەحمی هیندو یەکیەتی سۆڤیەتو ئەمەریکاش یارمەتی پاکستانی دەداو بوە هۆی خۆمالی کردنی چەندین جموجۆلی ئابوری .لەساڵی ١٩٧٥ کودەتای سەربازی ئەنجام دراو موجیب ڕەحمان تیرۆر کراو دوای ئەو زیاء ڕەحمان سەرۆکایەتی وولآتی گرتە دەست. لەساڵی ١٩٧٨ دەسەڵاتی مەدەنی گەڕاوە وولآتو هەلبژاردن ئەنجام دراو پارتی بەنگلادیشی نیشتمانی سەرکەوتنی بەدەست هێنا کە بیرو بۆچونی ئیسلامی لێ پەیڕەو دەکرا بە سەرۆکایەتی زیاء ڕەحمان بەلآم لە ساڵی ١٩٨١تیرۆر کرا لەئەنجامی کودەتایەك دوای ئەوە کودەتایەکی تر لە ساڵی ١٩٨٢ ئەنجام درا بە سەرکردایەتی ئەرشاد کە بۆ ماوەی هەشت ساڵ تاکو ١٩٩٠ دەسەلآتی وولآتی کرد.لە هەلبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩١و پێکهێنانی ئیئتلافی وەزارەتەکان لە زۆرینەی پارتی بەنگلادیشی نیشتمانیو پۆستی سەرۆکی وولآت لە لایەن خێزانی زیاء ڕەحمان بیچوم خالدە بەڕێوە چوو. لەدوای ئەو کچی موجیب ڕەحمان پۆستی سەرەك وولآتی گرتە دەستو لە ساڵی ١٩٩٨ ئاینی ئیسلام بوە ئاینی ڕەسمی وولآتەکە.. لە لافاوی ١٩٩٧ئەنجامی بوە هۆی مردنی ١٣٩،٠٠٠ هەزار کەسو دەربەدەر بونی زیاتر لە ٣٠ ملیۆن کەس..

- بەنگلادیش ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

# تـایـــوان

- ناوی ڕەسمی: کۆماری چینی نیشتمانی.
- پایتەختی: تایبی، ژمارەی دانیشتوانی ٢،٧٨٠،٠٠٠ ملیۆن کەسە.
- ڕووبەری: ١٣،٩٠٠ میل چوار گۆشەو ٣٦،٠٠٠ هەزار کیلۆمەتۆ چوار گۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٢٢،٨٦٠،٠٠٠ملیۆن کەسە بەپێی ئاماری ٢٠٠٠.
- چڕی دانیشتوانی: ١٧١٦ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- شارەسەرکیەکانی: کاوسونگ، تای شونگ، تاینان.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: کاوسونگ، کیلۆنگ.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ١٪
- زمانەکانی: مندرینی چینی (زمانی ڕسمیە) تایوانی. •
- ئایینەکانی: بوزیو تاوی وکونفوشیوسیە ٩٥٪، مەسیحی ٥٪.
- نژادەکانی: تایوانی ٨٦٪، چینەکان ١٤٪.
- زانینی نووسین وخوێندن: ٩٥٪.
- دابەشی کار گێری: ١٦ پارێزگاو پێنج ئەنجومەنی شارەوانییە، لەگەڵ تایبی وکاوسونگ.

• كۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر٣٠٨ ملیار دۆلار.
• بەشی تاك لە كۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر١٤ دۆلار.
• دراوی: دۆلاری تایوانی نویٚ یەكسانە بە ١٠٠ سەنت.
• بەرگری: ٣,٧٪ لە كۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
• سوپاكەی: ٠٠٠ر٢٨٠ هەزار كەسە.
• زەوی كشتوكاڵی: ٢٥٪ لە خاكی وولاتەكە.
• بەرهەمی كشتوكاڵی: سورایی، ئەناناس، مۆز، چەوەندەری شەكر، گەنم وجۆ، دانەوێڵەی تر، برنج، پەتاتە، تەرە، میوەجات.
• سامانی ئاژەڵی: مەر ٦٠٠ر٣ملیۆن سەر، بزن، ٨٥٠ر١ ملیۆن سەر، چێڵ وگامێش ٣٠٠ر٢ ملیۆن سەر، بەراز ٨٠٠ر١٠ ملیۆن سەر، پەرەور٥٠٠ر١٨ میلۆن سەر.
• پیشەسازی: كیمیاوی، جل‌وبەرگ، شەكر، رستن وچنین، خۆشكردنی پێست، ئامادەكردنی گۆشت.
• سامانی سروشتی: مەرمەر، بەردی چەوی، غازی سروشتی، خەلوز.
• بەرهەمی كارەبا: ١٢٣ ملیار كیلۆوات كاتژمێر.
• داهاتی دەرەوەی: نەوتی خاو، كانزا سەرەكیەكان، كیمیاوی، ماشێن.
• دەرچوەكانی: داری ساج وجاوی، بەرهەمی رستن وچنین، جل وبەرگ، ئامێری كارەبا.
• هاوبەشەكانی بازرگانی: یابان، چین، هۆنگ كۆنگ، یەكێتی ئەورووپا، ئەمەریكا، بەریتانیا.
• رژێمی دەسەلات: كۆمارێكی دیموكراتیەو سەرەك كۆمار بۆ ماوەی چوار ساڵ هەڵدەبژێردرێت بە پێشنیاری گەل، پێنج دەسەلاتی سەرەكی تیایەكە حوكومرانی وولاتەكە دەكەن ئەویش ((دەسەلاتی جێبەجێكردن، دەسەلاتی یاسادانان، دەسەلاتی قەزائی، دەسەلاتی چاودێری، دەسەلاتی پشكنین، حكومەتی تایوان كاروباری وڵاتەكە دەبا بەرێوە. بە چاودێری نوێنەرانی وولاتەكە كەلەلایەن گەلەوە هەڵدەبژێردرێن)
• پارتە رامیاریەكان: پارتی لیتنگ هۆی، پارتی كۆمینتانگ (پارتی نیشتمان) كە پارتی زۆرینەیەو سەرۆك كۆمار سەرۆكایەتی دەكات، دوو پارتی بەرهەڵستكاری سەرەكی هەن ئەویش پارتی دیموكراتی پێشكەوتن و پارتی نوێی تایوان.
• جوگرافیای وولات: كۆماری چین پێك هاتوە لەدورگەی تایوان كەدەكەوێتە سەر زەریای هادی بەدووری ١٠٠ میل لە كەناری ئاسیا، دوو دوورگەی تریش هەن ئەویش دورگەی كیمەن ودورگەی ماتسۆ، چەندین دوورگەی بچوكی تری نزیكی هەیەو ناسراوە بە كۆمەڵەی (پسكادورس) زنجیرە چیاكانی درێژ دەبنەوە لە ناوەراستی وولات لە باكووری تا باشووری كە زۆر بەرز دەبنەوە لەسەر كەناری رۆژهەلات تادەگاتە دەشتایەكانو فراوان دەبێتەوە بەرەو رۆژئاواو نزم دەبێتەوە كە بۆتە ناوچەیەكی كشتوكاڵی بەپیت. تایوان دەكەوێتە كەناری رۆژهەلاتی چین لە نێوان دەریای رۆژهەلاتی چینی ودەریای باشووری چین، نزیك ترین دراوسێی چینی مللییە.
• مێژووی وولات: دانیشتوانی رەسەنی تایوان مەلایویەكان بوە كە لەكاتی خۆی رویان لەو ناوچەیە كردیە لەسەرەتای سەدەی حەوتەمو چینیەكانیش دەستیان كرد بەنیشتە جێبوون تاكو بوونە زۆربەی دانیشتوانی ناوچەكە، دوای ئەوە پرتوگاڵیەكان لە سالی ١٥٩٠ سەردانی ناوچەكەیان كرد و ناویان نا (جوانە) كە بەزمانی خۆیان واتە بە زمانی پورتوگالیەكان پێی دەڵێن (فۆرموزا)، لەساڵی ١٦٢٤ هۆڵەندیەكان هەڵسان بە دروستكردنی قەلا لە باشوورو هەروەها ئیسپانیەكان

لەباكوری قەلاّیان لێ دروستكرد. لەساڵی ١٦٤١ هۆڵەندیەكان هەڵسان بەدەركردنی ئیسپانیەكان كە دەسەلاّتیان بەسەر دوورگەكەدا شكا تاساڵی١٦٦١ تا ئەوكاتەی چینیەكان لێی سەركەوتن بە سەركردایەتی كوكسینجاو شانشینی سەربەخۆیان لێدامەزراندو هۆڵەندیەكانیشیان دەركرد، لە ساڵی ١٦٨٣ بنەماڵەی دەسەلاّتداری چینی دەستیان بەتەواوی بەسەر دا گرت، لەساڵی ١٦٤٤ تا ١٩١٢ لە ژێر دەسەلاّتی بنەماڵەی چینیەكان دا مایەوەو لە شەری نێوان چین ویابانی یەكەم، لەكاتی جەنگی دووەمی جیهان ئەمەریكا بۆردومانی تایوانی كردو دوای كۆتای جەنگ تایوان گەراوە بۆ باوەشی چینی میللی.

لەساڵی ١٩٤٧ شۆرش بەرپابوو دژی چینیەكان بەلاّم سەركەوتو نەبوو، لەساڵی ١٩٤٩ شۆرشی كۆمەنیست لە چین ئەنجام دراو حكومەتی نیشتمانی ئەلین بە سەرۆكایەتی مشیر تشیانگ كای شك كە هەلاّتنی بەخۆیەوە دیت لەسەر دەستی كۆمەنیستەكان و بەرەو دورگەی تایوان و لە مانگی/ ١٢/ ١٩٤٩ توانی لەوێ حكومەتێكی تازە درووست بكات ولەهەمان كات سوپایەكی بەهێزی دامەزراند لە ٦٠٠ هەزار كەس بە نیازی گێرانەوەی خاكی چینی دایك و دورگەكەی پاراست بەناوی كۆماری چینی مللی، دوای ئەوە ئەمەریكاو بەریتانیاو نەتەوە یەكگرتووەكان دانیان پێدانا، بەلاّم چینیەكان ویستیان تایوان داگیر بكەن بەلاّم نەیان توانی بەهۆی بوونی كەشتی سەربازی ئەمەریكا لەناوچەكە لە گەروی فۆرمۆزا لە نێوان چین ودورگەكە، لەساڵی١٩٥٤ پەیمانی بەگری هاوبەشی لەگەڵ ئەمەریكا مۆركرد ئەویش بوە داگیر كردنی كورسی چین لە نەتەوەیەكگرەوەكان. لەساڵی ١٩٧٣ بە هۆی گۆرینی رامیاریەتی دەرەوەی ئەمەریكا دانی بە چینی میللی ناو چین بوە ئەندام لە نەتەوە یەكگرتووەكان بە دەركردنی تایوان.

لەدوای ساڵی ١٩٧٢ دەست بە سەردەمی هەڵبژاردن كرا بە پرۆگرامی گۆرین بەرەو دیموكراتی، لەساڵی ١٩٧٥ كایشك كۆچی كردوو كوورەكەی جێگەی گرتەوە، لەساڵی ١٩٧٩ ئەمەریكا پەیوەندی لەگەڵ تایوان پچراندو پەیمانی بەرگری هاوبەشی هەڵوەشاندەوە.

لەساڵی ١٩٨٦ پارتی ناوەندی پێشكەوتن دامەزرا دژی پارتی نیشتمانی دەسەلاّتدار، لەساڵی ١٩٩٣ پەیمانی هاوكاری لەگەڵ چین مۆردكرد، لەساڵی ١٩٩٤ هەڵبژاردن ئەنجام دراو پارتی پێشكەوتنی بەرهەڵستكار سەركەوتنی بەدەست هێنا بە سەرۆكی شاری كایبی پایتەخت. لەساڵی ١٩٩٦ لتونگ بە سەرۆك كۆمار هەڵبژێردرا لە یەكەم هەڵبژاردنی دیموكراتی لە مێژووی چینیدا، هەوڵی زۆر درا لە لایەن چینەكان بۆ گێرانەوەی تایوان بۆ سنوری خاكی چین سەرەرای پەیوەندی رێك وپێك بەلاّم تاكو كۆتایی ٢٠٠٤ئەو هەولاّنە بەردەوامە، تایوان توانای ئابووری باشی هەیە هەتا لەبوارەكانی تری بەهۆی بەهێزی كەرتی تایبەت وبژێوی باشی گەلەكە لە هەموو بوارەكانی ژیان.

# تـايـلانـد

• ناوی رەسمی: شانشینی تایلاند.
• پایتـەختی: بـانکوک، ژمـارەی دانیـشتوانی ٠٠٠ر٨٥٠ر٦ ملیۆن کەسە.
• رووبــەری: ١١٦ر١٩٨ میـل چـوار گۆشـەو ١٢٠ر٥١٣ هەزار کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
• ژمـارەی دانیـشتوانی: ٠٠٠ر٢٦٠ر٦٣ملیـۆن کەسە بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
• چڕی دانیشتوانی: ٣١٩ کـەس لـە یـەك میـل چوارگۆشەدا.
• شارەگرینگەکانی: شیانگ مای، هات پای،
• بەنـدەرە گرنگـەکانی: بـانکوک، نـاخون سـاوان، هەردووکیان لەسەر کەنداوی تایلاندین.
• بوژانەوەی دانیشتوانی: ٩٪.
• زمانـــەکانی: تایلانـــدی (زمـــانی رسمیـــە) ئینگلیزی، لاوی، چینی، مالیزی،
• نـــژادەکانی : تیـــون ٨٠٪، چـــینەکان ١٥٪، ئەوانی تر ٥٪.
• ئایینەکانی: بوزی ٩٥٪. ئیسلام ٤٪.
• زانینی خوێندن ونووسین: ٩٠٪.
• کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ٥٠٠ر٥٢٥ ملیـار دۆلار.
• بەشـی تـاك لـە کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ١٠٠ر٩ دۆلار.
• دراوی: بات یەکسانە بە ١٠٠ ساتانگ .
• بەرگری: ٥ر٧٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
• سوپاکەی: ٥٠٠ر٢٧٠ هەزار کەسە.
• زەوی کشتوکاڵی: ٣٥٪ لە خاکی وولاتەکە.
• بەرهـــەمی کـــشتوکاڵی: مـــەتات، چـــەوەندەری شـەکر، بـرنج، دەرەزەرد، گـیزی هینـدی، تـەرە، میوەجـات، گـەلێ جـۆری تـر لـە بەرهـــەمی کشتوکاڵی جۆراوجۆر.
• سامانی ئاژەڵی: مەر ٣٠٠ر٥ ملیۆن سەر، بزن ١٥٠ر٢ ملیۆن سەر، بەراز ٥٠٠ر٤ ملیۆن سەر، پـەرەور ٢٠٠ر٣٦ ملیـۆن سـەر، چـێڵ ١٠٠ر٨ ملیۆن سەر، گامێش ٠٥٠ر٥ ملیۆن سەر.
• پیشەسازی: رستن وچنین، ئەلیکترۆنی، ئامێری کارەبا، دروستکردنی شەکر، پاڵاوتنی نەوت، ماشـێن، چـیمەنتۆ، کەلوپـەلی پلاسـتیکی، دروستکردنی بەرهـەمی کشتوکاڵی بۆ لەقوتی نـان، دروسـتکردنی قوتـوی ماسـی، گەشـت وگوزار.
• بەرهـــەمی کارەبـا: ٣٠٠ر٧٨ ملیـار کیلـۆوات کاتژمێر.
• سامانی سروشتی: غـازی سروشـتی، نزیکـەی ٣٠٠ ملیۆن بەرمیل نەوتی یەدەگی هەیە لە ژێر خاك، مەتات، دروستکردنی تێلی هەمە جۆری کارەبا وشتی تر، راووی ماسی، بەردی پیرۆز.
• داهاتی دەرەوەی: نـەوت وبەرهەمـەکانی، ئاسن وپۆلا، کەلوپەلی کیمیاوی، ماشێن.
• دەرچووەکانی: بەرهەمی سرووشتی، کەلوپەلی ئـەلیکترۆنی، بـرنج، مـەتات، بـەردی پـیرۆز، ماسی، گۆشتی ئاژەڵ.
• هاوبەشەکانی بازرگـانی: یابـان، چـینی مللـی، ئەمەریکا، سنگافورە، تایوان، ئەڵمانیا، تورکیا، فەرەنسا، چەند ولاتێکی عەرەبی.
• رژێمـــی دەســـەڵات: شانـــشینی دەســـتوریە، دەسەڵاتداری وولات حکومەتێکی ئیئتلافیە کە لـە لایـەن پارتـەکان هەلدەبـژێردرێت، شانـشین بۆمیبۆل ئادول بادیكو جێگری کورەکەیەتی کە " ئەمیر "فاجی رالۆن کۆرن"
• پارتـە رامیاریـەکان: پـارتی پلانـگ درمـا، پـارتی بـــوزی دژی بـــێ ئـــابووری، پـــارتی کـــاری

کۆمەڵایـەتی، پـارتی بوژانـەوەی نیـشتمانی، پارتی پاریزگاران، پارتی دیموکراتی تایلاند، پارتی چەپی ناوەندی، چەندین پارت وریکخراو گروپـی تـری تیایـەو خـەباتی هاوشـانی پارتـەکانی تـر دەکـەن لـە پێنـاوی خواسـتو کەسی وولاتەکەیان.

- جوگرافیـای ولات: تایلەنـد دەکەوێتـە نیـوەی نیمـچە دورگـەی رۆژئـاوای هینـدی‌و هینـدی چـینی سـێیەکی بـاکوری نیمـچە دورگـەی مەلاییویە لە باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا، لاوی دەکەوێتە باکورو باکوری رۆژهەلات، کەمبۆدیا دەکەوێتــە رۆژهــەلات، مالیزیــا دەکەوێتــە باشووری، رووبەری خاکەکەی بەرامبەر خاکی فەرەنسایە. لـە ناوەراسـتی دەشتایەکی پـانو بەرینی بە پیتی تیایە کە زۆربەری دانیشتوانی لـەو ناوچەیە نیشتەجێن ، زێی نشاو فریادەو لقـەکانی پێـدا دەروات، لـەباکوری رۆژهــەلات تەپۆلکـەی فـراوان هەیـە کـە سـیٚ یـەکی خـاکی تایلاند دەگرێتـەوە، لـەباکوری دارستانی چری تیایــە لەگــەڵ دۆڵو کەنــدی قــوڵو باریــك، هـەروەها لـە باشـووری دارسـتانی چـری تیایـە وبارانی زۆری لیٚ دەباریٚ.
- مێژووی وولات: بەلگە نامەی جۆراو جۆر باس لـەوە دەکـەن کـە ٤٠٠٠ هـەزار سـاڵ پێش زایین برونزیـەکان نیـشتە جێـی ئـەو ناوچـەیە بوونـە، لەســەدەی شەشــی زایـنی گــەلانی (تــایون، سیامیون) لـە کێشوەری ئاسیا هاتنـە خواریٚو نیشتەجێی وولاتەکـەی ئێستا بـون. بـەکۆتایی هـاتنی سـەدەی سیانزەهەم حکومرانی زۆربـەی خــاکی رۆژئــاوایی ئــەو وولاتــەیان دەکــرد، لـەماوەی ٤٠٠ سـاڵ دوای چـەندین شـەری پـچر پـچر لـەنێوانیان روویـدا، لـە نێـوان تاییـنـەکان ونێوان کەمبۆدیەکان وبورمیەکان، لەسەدەکانی چوارده وپانزە سامیونەکان وولاتەکەیان فراوان کـرد لەسـەر بەرژەوەنـدی ئیمپراتۆریـەتی خـەمیر

که بەرو توانەوە مەنگاوی دەنا، لـە سـاڵی ١٥١١ بازرگانـە پرتوگالیـەکان بۆیەکـەم جار گەیشتنە ناوچـەی سـیام ودوای سـەدەی حەفدەم کـاری بازرگـانی پـەرەی سـەندو پێـشکەوت لەلایـەن چینیەکان ویابانیەکان وئەوروپیەکان.

له ساڵی ١٧٥٧ بۆرمیەکان شاڵاویان بردە سەر ناوچــەی ســیام وپایتــەختیان وێــران کــردو سـەرکردەو دەسـەڵاتدارەکانیان لـەناو بـرد ودوای لێـی کشانەوە، ژەنـەراڵ فـاری شـکری لـە سـاڵی ١٧٨٢ توانی ئەم وولاتە یەك بخاتەوەو پایتـەختی له بانکوك دابمەزرێنیٚو شانشینی خۆی بە نـاوی رامـایی یەکـەم ڕابگـەینیٚ، لـە نێـوان سـاڵەکانی ١٨٢٤تـا ١٨٥١ شانـشین رامـای سـێیەم تـوانی ناوچــەی ســیام بکاتــەوە لــە پــێش بازرگــان ودبلوماتکــارو بــلاو کردنــەوەی گروپــەکانی ئـەوروپی. تایلاند لـە کۆنـەوە تـاکو سـاڵی ١٩٣٩ بەوولاتی سیام ناسرا بوو کـە یەکـەم دەوڵـەت بوو لـە باشـووری رۆژهـەلاتی ئاسـیا، ئەمـەش بـەهۆی بــەردەوامی‌و زیرەکــی شانــشین (مولکــوت) کــە لەساڵی ١٨٥١ دەسەلاتی وەرگت ودوای کورەکەی شـولا لونکـورن کـە لەدەسـەلات بـەردەوام بـوون تاساڵی ١٩١٠.

لەســاڵی ١٨٩٦ لــە ئــەنجامی مــۆرکردنی ریکەوتنامـەی ئینگلیـزی- فەرەنسی کـە هـەردوو دەوڵـەت دانیـان بەسـەربەخۆی دەوڵـەتی سیام نـا، لـەدوای سـاڵی ١٩٣٢ دەسـەلاتی شانـشینی گـورا بەدەسەلاتی نوێنەرایەتی لە رێگـەی هەڵبـژاردن بە پێشنیاری نهێنی گشتی لەگەڵ مانـەوەی بەژداری کردنـی سـەربازەکان لـە دەسـەلات، لەسـاڵی ١٩٣٩ سـیام نـاوی گـۆڕا بـە نـاوی تایلانـد. بـەلام لـە سـاڵەکانی ١٩٤٥تـا١٩٤٩ لـە دوای داگیرکردنـی لـە لایـەن یابانـەوە نـاوی گـۆراوە بـۆ سـیام، کـە بـوە خـالێکی دەرچـوونی یابانیـەکان بـۆ مـالایۆ دوای تایلاند بوە هاوپەیمانی یابان، حکومـەتی تایلانـد لەساڵی ١٩٤٤ دژی یابانیەکان جەنگانو بەرگریان

کـرد لـە وولاتەکـەیان تادەرچـونی یابانیـەکان لەسـالّی ١٩٤٥ لـە دوای کۆتـای هـاتنی جـەنگی دووەمـــی جیهـــان. لـــەماوەی ســـالّەکانی ١٩٦٧تـا ١٩٧٢ تایلەندیـەکان بـەهێزی سـەربازی لەگەلّ ئەمەریکا بەژداری شەری ڤێتنامیان کرد، لە سالّی ١٩٧٤ دەستوری دیموکراتی بریاری لەسەر دراو حکومەتێکی ئیتلاف لیّ دامەزرێندرا. لەسالّی ١٩٣٢ تا سالّی ١٩٩٦ چەندین کودەتای سەربازی بەخۆوە دیت بەهۆی رامیاری چەوتی دەسەلاّتدارە یـەك لـەدوای یەکـەکان وخۆخـستنە نـاو شـەری ڤێتنـام و کـەمبۆدیاو بـەماوە نـەدانی مـافی مـرۆڤ وبـەرەلاّ کردنـی دیموکراتیـەت تـاکو لـەمانگی ١٩٩٦/١١/ بەهەلّبـژاردنی پەرلـەمانی نـویّ کـە پارتی دایك توانی زۆربەی زۆری کورسیەکان بە دەسـت بـێنی و سـەرۆکی پارتەکـە حکومـەتێکی ئیئتلافی لە شەش پارت پێکهات لە ١٩٩٧/٩/٢٧ دەســەلاّتی یاســادانان رازی بــوو بــەدەرکردنی دەستورێکی چاکسازی لەوولات لەسالّی ١٩٩٩.

- تایلانـد ئەندامـە لـە نەتـەوە یـەکگرتووەکان، ئەندامــە لــە رایەلــەی وولاّتــانی باشــووری رۆژهەلاّتی ئاسیا.

# تورکمانستان

- ناوی ڕەسمی: کۆماری تورکمانستان.
- پایتـەختی: ئیشق ئابـاد، ژمـارەی دانیشتوانی ٦٣٥,٠٠٠ هەزار کەسە.
- ڕووبـــەری: ١٨٨,٤٥٠ میـــل چوارگۆشـــەو ٤٨٨,١٠٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ٤,٨٧٥,٠٠٠ ملیـۆن کەسە. بەپێی ئاماری ٢٠٠٠.
- چـڕی دانیـشتوانی: ٢٦ کـەس لەیـەك میـل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢,٥٪.
- شارە سەرەکیەکانی: شارگو، تاشور.
- بەندەرە گرنگەکانی: تورکمنباشی.
- زمانـەکانی: تـورکی (زمـانی ڕەسمیـە) ڕوس، ئۆزبەکی.
- نـــژادەکانی: تورکمـــان ٧٣٪، ڕوســـی ١٧٪، ئۆزبەکی ١٠٪.
- ئاینـــەکانی: ئیـــسلام ٧٥٪، ئۆرسۆزکـــسی ڕۆژهەلاّت ١٥٪.
- زانینی خوێندن نوسین: ٩٥٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٥ پارێزگای هەرێمیە.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ١٢,٥٦٠ ملیـار دۆلار.
- بەشـی تـاك لـە کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ٣,٢٠٠ دۆلار.
- دراوی: مانات، یەکسانە بە ١٠٠ جابییك.
- بەرگری: ١,٣٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٢٥,٥٠٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکالّی: ٢,٥٪ لەخاکی وولاّتەکە.
- سامانی کشتوکالّی: گەنم و جۆ، دانەوێلّەی تر، تـریّ، پـەمۆ، گولەبـەڕۆژە، تـەرە، میوەجـات، چەوەندەرەی شەکر.
- سامانی ئاژەلّی: مەر ٦,٢٥٠ ملیۆن سەر، بزن ٣,١٠٠ ملیـۆن سـەر، چـێلّ و گـامێش و وشـتر ١,٥٠٠ ملیـۆن سـەر، پـەرەور ١٦,٣٠٠ملیـۆن سەر.
- پیشەسازی: نـەوت و غـازی سروشتی، پـەینی

کیمیاوی، پترۆ کیمیاوی، ئامادەکردنی خۆراک، ڕستن و چنین.

- بەرهەمی کارەبا: ٣٠٠ر١٠ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: نەوت، غازی سروشتی، پۆتاسیۆم، خوێ، کبریت، فۆسفات، ئاسن.
- داهاتی دەرەوەی: دانەوێڵە، پێداویستیەکانی خۆراک ، ماشێن و کەلوپەلی گواستنەوە، پلاستیک، مەتات.
- دەرچووەکانی: نەوت، غازی سروشتی، مافور، بەرهەمی ڕستن و چنین، پەمۆ، کیمیاوی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: تورکیا، ئەرجەنتین، ڕوسیا، ئەوروپای ڕۆژهەلات، یەکێتی ئەوروپا، ئۆکرانیا، جۆرجیا، چین.
- ڕژێمی دەسەلات: کۆمارێکی دەستوریە و سەرۆک کۆمار دەسەلاتی فراوانی هەیە، وەزیرەکان دادەمەزرێنێ‌و سەرۆکایەتیان دەکات بەلام دامەزراندنیان بە ڕەزامەندی ئەنجومەن دەبێت، ئەنجومەنەکە لە ٥٠ ئەندام پێک هاتوە، ئەنجومەنی گەلیش هەیە کە ژمارەی ئەندامانی لە ١٠٠ ئەندام زیاترە بەناوی (دروستکردنی بەرژەوەندی).
- پارتە ڕامیاریەکان: بەرەی میللی تورکمانی، پارتی نەتەوەیی، پارتی دیموکراتی تورکمانستان (کۆمەنیستی کۆن) کە لایەنگیری سەرۆک نیازۆفە.
- جوگرافیای وولات: تورکمانستان دەکەوێتە نێوان دەریای قەزوین لە ڕۆژئاواو ئۆزباکستان لە ڕۆژهەلات، کازاخستان دەکەوێتە باکوری، ئێران و ئەفغانستان دەکەوێتە باشووری، لە ٨٠٪ ڕووبەری تورکمانستان بیابانەو کارا کوم گەورەترین بیابانیەتی کە زەویەکەی لمی ڕەشەو ڕووبەرەکەی ٣٦٠ کیلۆمەتر زیاترە، ئاودێری کردنی ئەو دەشتاییە لە زێی ئاموداریاوە بۆی دەچێ‌و وزەی کارەباش لەو زێیە بەرهەم دەهێنرێ جگە لەو زێیەش چەندین زێی تری تیایە کە لە چیاکانی سەر سنوری ئێران دێنە خوارێ واتە لە چیاکانی ئاراراتی خاکی ڕۆژهەلاتی کوردستان.
- مێژووی وولات: تورکمانستان بەشێک بوە لە ئیمپراتۆریەتی فارسی لەسەردەمە کۆنەکان، تورکمانەکان ڕەوەندی مەڕ لەوەڕێن بونە تاکو سەدەی بیستەم تاکو ئێستاش هەر بەردەوامن لەبەخێو کردنی مەڕو مالات و ڕەوەندن. بەلام پێش سەدەی نۆزدەم تورکمان دوو بەش بوو یەکەمیان بەناوی (فاقان خیفا) بوە، دووەمیان بەناوی (فاقان بیخاری) بوە، بەشی فاقان بیخاری لە سالی ١٨٦٨ لکاوبوو بە ئیمپراتۆریەتی ڕوسیا، لە سالی ١٨٨١ هەردوو بەشەکەی تورک بۆتە بەشێک لە ئیمپراتۆریەتی ڕوس کە ناسراو بوو بە ترکستان، لە سالی ١٩٢٢ کۆماری تورکمانستانی سۆڤیەتی دامەزرا بە سەربەخۆیەکی ناوخۆیی، لە ١٩٢٥/٥/١٣ کۆماری تورکمانستان دامەزراوە لەناو یەکێتی سۆڤیەت

لە ١٩٩١/١٠/٢٧ تورکمانستانیش وەک کۆمارەکانی تر سەربەخۆیی ڕاگەیاند لە یەکێتی سۆڤیەت، لە مانگی/١٩٩١/١٢ بوە ئەندامێک لە کۆمەنولسی وولاتانی سەربەخۆی (cis)

تورکمانستان لەمانگی/ ١٩٩٣/١١ لەناوچەی ڕۆیل کشاوەو دراوی تایبەتی خۆی لێدا کە وێنەی سەرۆک کۆماری بەسەرەوە بوو، لە هەلبژاردنەکانی سالی ١٩٩٤ پارتی دیموکراتی گەراوە دەسەلات و سەرۆک نیازوف بوە سەرۆک کۆمار تاکۆتایی سالی ٢٠٠٢

- تورکمانستان ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

# کۆریای باشوور

• ناوی ڕەسمی: کۆماری کوریا.
• پایتەختی: سیۆل، ژمارەی دانیشتوانی ١١ر٨٦٥ر٠٠٠ ملیۆن.
• ڕووبەری: ٣٨ر٢٣٢ میل چوارگۆشەو ٩٩ر٠٢٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
• ژمارەی دانیشتوانی: ٤٩ر٨٩٥ر٠٠٠ ملیۆن کەسە بەپێی ئاماری ١٩٩٩ کەسە.
• چڕی دانیشتوانی: ١٣٠٥ کەس لەیەک میل چوارگۆشەدا.
• بوژانەوەی دانیشتوانی: ٠ر٩٪.
• شارە سەرەکیەکانی: تایجۆ، بۆسان.
• بەندەرە گرنگەکانی: بوسان، ئینشون.
• زمانەکانی: کۆری (زمانی ڕەسمیە).
• نژادەکانی: کۆری.
• ئاینەکانی: مەسیحی ٤٨٪، بوزی ٤٧٪، بیرو ڕای تر ٥٪.
• زانینی خوێندن و نوسین: ٩٥٪.
• دابەشی کارگێڕی: ٩ پارێزگا لەگەڵ ٦ شاری تایبەتە.
• دراوی: وون، یەکسانە بە ١٠٠ شوون.
• کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٦٣٢ر٥٠٠ ملیار دۆلار.
• بەشی تاک لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١٣ر٨٠٠ دۆلار.
• بەرگری: ٥ر٥٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
• سوپاکەی: ٦٧٠ر٠٠٠ هەزار کەسە.
• زەوی کشتوکاڵی: ٢٠٪ لەخاکی وڵاتەکە.
• بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم و جۆ، برنج، چەوەندەری شەکر، تەرە، میوەجات.
• سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٨٣٨ر٠٠٠ هەزار سەر، بزن ٦١٥ر٠٠٠ هەزار سەر، چێڵ ٣ر٠٥٠ ملیۆن سەر، بەراز ٦ر٧٥٠ ملیۆن سەر، پەلەوەر ٩٠ ملیۆن سەر.
• پیشەسازیەکانی: ئەلیکترۆنی، دروستکردنی ئەمانەو ڕیم، کیمیاوی، جل و بەرگ، ڕستن و چنین، دروستکردنی کەشتی، دروستکردنی پێڵاو، چەک و تەقەمەنی.
• بەرهەمی کارەبا: ٢١٥ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
• سامانی سروشتی: خەڵوز، جرافیت.
• داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی گواستنەوە، کیمیا، بەرهەمی ڕستن و چنین، پۆڵا، نەوت، دانەوێڵە، ماشێن.
• دەرچووەکانی: ئۆتۆمبێل، ئامێری ئەلیکترۆنی و کارەبایی، پێڵاو، ماسی، بەرهەمی ڕستن و چنین، کەشتی، پۆڵا.
• هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چین، ئەمەریکا، بەریتانیا، ئەڵمانیا، ولاتانی عەرەبی و ئەفریقی.
• ڕژێمی دەسەلات: وولاتێکی کۆماریە، ئەنجومەنی جێبەجێکردن دەسەلات تەواوی لەدەستە، ماوەی دەسەلاتی سەرۆک پێنج ساڵە، ئەنجومەنی ئومە لە ٢٩٩ ئەندام پێک هاتیە، هەڵبژاردن بە ڕژێمی ڕێژەییە.
• پارتەڕامیاریەکان: کونگرێسی نیشتیمانی ڕامیاری نوێ، پارتی چەپی ناوەندی، پارتی دیموکراتی، پارتی دیموکراتی نوێ، پارتی ڕاست ڕەوی ناوەندی، چەندین بیرو بۆچوونی جۆراوجۆری تر تیایە.
• جوگرافیای وڵات: نیمچە دوورگەی کۆریا دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی ئاسیا لەنێوان دەریای زەرد لە ڕۆژئاوا ئەو دەریایە چین و کوریا لێک جیا دەکاتەوە. دەریای یابان لە ڕۆژهەلاتی ئەو دەریایەش کوریاو یابان لێک جیا دەکاتەوە کە

درێژی ٩٦٦ کیلۆ مەترە،چین و ڕوسیا دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی، لە باشوری گەروی کۆریا کە جیای دەکاتەوە لە باشوری یابان، کەنارەکانی باکوری ڕۆژهەڵاتی بلندو نەویی و هەرەتێکی ترسناک و ناخۆشە. کۆریای باشوردەکەوێتە باوری ڕۆژهەلاتی ئاسیاو دراوسێ یەکەی کۆریای باکورە لە باکورەوە.

- مێژووی کوریای باشور: کوریای باشوور لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهان هاتە سەربون، لەساڵی١٩٤٥ هێلی پانی ٣٨ لەنێوان بەشی باکوری دانا کە کەوتە ژێر دەسەلاتی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو بەشی باشوری کەوتە ژێر دەسەلاتی ئەمەریکا. لە ساڵی ١٩٤٨ هەڵبژاردن ئەنجام درا بۆ دامەزراندنی ئەنجومەنی دایك لەو هەڵبژاردنە (سینجمان ری) بە سەرۆك کۆمار هەڵبژێردرا، لە ١٩٤٨/٨/٥ نەتەوەیەکگرتوەکان دانی بە دەسەلاتی یاسایی کۆریای باشور نا بە حکومەتی نوێ). لە ١٩٥٠/٦/٢٥ دەسەلاتی کۆمۆنیستەکان لەکۆریای باکور کۆریای باشوریان داگیرکرد. "دەتوانی تەماشای کۆریای باکور بکەی لەم بارەیەوە" لە ساڵی ١٩٥٣ کۆریای باشورو ئەمەریکا پەیمانی بەرگری هاوبەشیان مۆرکرد. لە ساڵی ١٩٦٠ سەرۆك سینجمان ری دەستی لەکار کێشاوە بەهۆی خۆپیشاندان و ئاژاوەی زۆر. ئەمەریکا بەهەموو توانایەك یارمەتی دارایی و سەربازی و ئابووری پێشکەش بە کۆریای باشور دەکرد تاکو توانی سوپایەك پێك بێنێ کە ژمارەی ٦٠٠ هەزار کەس بێ هەر ئەوە بوە هۆی ئەوەی کە کۆریای باشور بە ٥٠ هەزار سەرباز بەشداری شەڕی ڤێتنام بکات بەهاوکاری لەگەڵ ئەمەریکا. لە ساڵی ١٩٧٢ هەردوو دەسەلاتی کۆریای باکورو باشوور ڕێکەوتن بە یەکگرتنەوەی هەردوو کۆریا لە ڕێگەی چارەسەری ئاشتیانە ئەمەش لەبارو دوخێکی ناهەمواردا بوو تاکو ساڵی ١٩٨٥ بە گفتوگۆکردن لەسەر ئابووری. لەمانگی/١٩٨٧/٦ فەرمانبەرو خاوەن حانوتەکان و فەرمانبەری کۆمپانیاکان هەڵسان بە خۆپیشاندان و داوای چاکسازی دیموکراتیان کردو بوە هۆی دروستبوونی تەنگژەی ئابووری. دەسەلاتداران ناچار بون دەست بکەن بە چاکسازی و بریاری هەڵبژاردنی دیموکراتیان دا. ئەوە بوو لە مانگی دوانزە (روەتای وو) لە ڕێگەی هەڵبژاردن بوە سەرۆك دەوڵەت. لە ساڵی ١٩٩٠ سێ پارتی ڕامیاری یەکیان گرت و بونە یەك پارت، لە ساڵی ١٩٩٣ (کیم بونگ سام) دەسەلاتی وەرگرت کە یەکەم دەسەلاتی مەدەنی بوو لەوەتەی ساڵی ١٩٦١. لەمانگی /١٩٩٧/١٢ بەهۆی نالەباری باری ئابوورییەوە ٥٧ ملیار دۆلاری لە خەزنەی نێودەوڵەتی قەرزکرد. لە ١٩٩٧/١٢/١٨ کیم یونگ بەسەرۆك کۆمار هەڵبژێردراوە، کۆریا بەشداری لە ڕزگارکردنی کوێت کرد شان بەشانی ئەمەریکا بەتایبەتی لەروخاندنی ڕژێمی سەدام لە ساڵی ٢٠٠٣ ودوای لەساڵی ٢٠٠٤ لەهەرێمی کوردستانی لێکێندراو بەعێراق، بەشداری لەئاوەدانکردنەوەی کوردستانی دەداو بەردەوامە.

- کۆریا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لەچەندین ڕێکخراوی تری تایبەتی نێودەوڵەتی، ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری ئاسیای باسیفیکی، ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاری بوژانەوەی ئابووری.

# کۆریای باکوور

- ناوی ڕەسمی: کۆماری کۆریای دیموکراتی میللی.
- پایتەختی: پیۆنگ یانگ ،ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٩٨٦ر٢ ملیۆن کەسە.
- ڕووبەری: ٥٤٠ر٤٦ میل چوارگۆشەو ٥٤٠ر١٢٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٥٨٠ر٢٣ ملیۆن کەسە.بەپێی ئاماری ١٩٩٨.
- چڕی دانیشتوانی: ٥٠٧ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢ر١٪.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٩٧٪.
- شارە سەرەکیەکانی: شونگین، ئامیۆ، هەمۆنگ، لەهەمان کاتا بەندەری سەرەکی وولاتەکەن.
- زمانەکانی: کۆری (زمانی ڕەسمیە).
- نژادەکانی: کۆری.
- ئاینەکانی: بەکارهێنانی بڕوای ئاینی دەتوانرێ بڵێین نییە ئەوەی هەشە ئاینی بوزی و کونفوشیوسیە.
- دابەشی کارگێری: ٩ پارێزگا لەگەڵ دوو شاری تایبەت.
- دراوی: وون یەکسانە بە ١٠٠ شوون.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١٥٠ر٢٢ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١٠٠ر١ دۆلار.
- بەرگری: ٢٧٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر٩٦٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی : ٥ر١٤٪لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: پەتاتە، دانەوێڵە، دەرەزەرد، فولی سویا، برنج، تەڕە، میوەجات، لەڕووی کشتوکاڵی باری کشتوکاڵی خراپە بەهۆی لافاو یاخود وشکانی و نەبوونی باران ئەویش بەکرینی یاخود لەرێگەی یارمەتی دانی دەتوانی باری ئابووری گەلەکەی دابین بکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ٢٧٪ داهاتی وولاتەکەی بۆ کاری سەربازی خەرج دەکات بەهۆی کێشەی لەگەڵ ئەمەریکا وکۆریای باشور.ئەمەش کاردانەوەی خراپی کردۆتە سەر باری ئابوری و پەیوەندی نێو دەولەتی و هەردەم لە ئامادە باشیە بۆ جەنگ لەگەڵ کۆریای باشور بە پشتیوانی ئەمەریکا گەر توشی ببێ.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٠٠٠ر١٧٥ هەزار سەر، بزن ٢٥٠ر١ ملیۆن سەر، چێڵ و گامێش ٠٠٠ر٥٨٠ هەزار سەر، بەراز ٦٣٠ر١ ملیۆن سەر، پەرەور ٢٠٠ر١٠ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: ئامادەکردنی خۆراك، ماشێن، کیمیا، ڕستن و چنین، چەك و تەقەمەنی.
- بەرهەمی کارەبا: ٥٠٠ر٣٤ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: نوحاس، ئاسن، زەنگ، جرافیت، خەڵوز، قورقوشم، ئەنجستین.
- داهاتی دەرەوەی: دانەوێڵە بە گشتی، خەڵوز، نەوت، ماشێن، کەلوپەل.
- دەرچووەکانی: کەلوپەلی سروشتی، بەرهەمی کانزایی، بەرهەمی کشتوکاڵی، بەرهەمی پیشەسازی و چەك و تەقەمەنی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: چین، یابان، هۆنگ کۆنگ، ئەڵمانیا، سنگافورە، وولاتانی کۆمەنولسی سەربەخۆ، ئەڵمانیا.
- ڕژێمی دەسەڵات: وولاتێکی کۆمۆنیستیە،

ئەنجومەنی گەل دەسەلاتی بالایە، ئەندامەکانی هەڵدەبژێردرێن، لیژنەی جێبەجێکردن دیاری دەکات ئەویش ئەنجومەنی وەزیرانە. لەبارەی پارتە ڕامیاریەکان هیچ پارتێك نییە تەنیا پارتی کرێکاری کوریا نەبێت ئەویش پارتی کۆمۆنیستە.

- جوگرافیای کۆریای باکور: نیمچە دورگەی کۆریا دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی ئاسیا لەنێوان دەریای شین لە ڕۆژئاوا کە ئەویش لەگەڵ چینی میللی لێکیان جیادەکاتەوە، دەریای یابان لە ڕۆژهەلاتەوە ئەویش لەگەڵ یابان لێکیان جیا دەکاتەوە کە درێژی دورگەکە ٩٦٦ کیلۆمەتر، دورگەکە چین و ڕوسیا لە باکوری دەوری داوە، گەروی کۆریا دەکەوێتە باشوری کە لە باشور لەگەڵ یابان لێکیان جیا دەکاتەوە. نیمچە دورگەی ئەو دوو دەوڵەتە کۆریای باکوری کۆمۆنیستە کە دەکەوێتە باکوری هێلی پانی ٣٨ کە ئەو هێلە لە ساڵی ١٩٤٥ دیاری کراوەو بۆتە هێلێکی ڕەسمی لە ساڵی ١٩٤٨، کۆریای باشور و کۆریای باکور زنجیرە چیایەکی پڕ لە دارستانی چڕ دایپۆشیوە. لە ڕۆژئاوای دەشتاییەك لە کەنارەکان هەیەو بۆ کاری کشتوکاڵی سودمەندەو زۆربەی زێ و ڕوبارەکانی لە چیاکان هەڵدەقولێت و لە دەریای شین دەکاتەوە زێی بالۆ پارچەیەکە لە سنوری کۆریای باکورو مەنشوریا.
- مێژووی کۆریا: مێژووی نوسراوی کۆریا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی یەکەمی پێش زاین و بنەماڵەی تانگون لە ساڵی ٢٢٣٣ پێش زاین دایمەزراندوە.لە ساڵی ٦٦٨ زاینی وولاتەکە یەکیان گرت وەك شانشینیەکەی ژێر دەسەلاتی بنەماڵەی شیلای بوزی. لەسەدەی حەوتی زاینی بوە سەر بە چین و پەیوەندی بەهەموو جۆرێك لەگەڵ دونیای دەرەوە بچڕا تەنیا لە ڕێگەی چین نەبێ. ئاینی کۆنفوشیوسیە بوە بیروباوەڕێکی بالای کارپێکردن لە وولاتەکە، یابان کۆریای ناچارکرد کە پەیمانی بازرگانی لەگەڵ ببەستێت و هەر بەوهۆیەوە ڕێگە کراوە بۆ ئەمەریکا و ئەوروپا لەدوای کۆتایی هاتن بە شەڕی نیوان چین و هیند لە نێوان ساڵەکانی ١٨٩٤تا١٨٩٥و بوە هۆی دان نان بە کۆریا وەك وولاتێکی سەربەخۆ لە ئەنجامی مۆرکردنی پەیمانی نێوانیان. بەلام یابان دوایی داگیری کرد، لەساڵی ١٩١٠ ناوی گۆڕی بۆ (شوسن)لە دوای ساڵەکانی بیستی سەدەی بیستەم پیشەسازی قورس پەرەی سەند لە باکوری وولات بەهۆی بوونی خەڵوزی سروشتی. لەگەڵ ئەوەشدا یابان هەوڵی باشی دا بۆ بوژانەوەی ئابووری و ژێر خانی کۆریا بەلام لەڕووی ڕۆشنبیری ماوەی پێ نەدا پەرە بسێنی و هەر ئەوەش بوە هۆی ئەوەی کە جولانەوەی بەرگری نیشتیمانی پەرەی بسەپێنێ . لەدوای خۆبەدەستەوەدانی یابان لە جەنگی دووەمی جیهان لە ساڵی ١٩٤٥ یەکێتی سۆڤیەت و ئەمەریکا چونە ناو خاکی کۆریاو کۆریایان دابەش کرد بۆ دوو دەوڵەت یەکەمیان کۆریای باکور کە خاکەکەی دەکەوێتە باکوری هێلی ٣٨. کۆریای باشور ئەویش خاکەکەی دەکەوێتە باشوری ئەو هێلە. لەدوای داگیرکردنی کۆریای باکور لەلایەن یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٤٦ حکومەتێکی دانی لێ دامەزراند و کۆمەنیستەکان بوونە دەسەلاتدار بەیارمەتی یەکێتی سۆڤیەت لە هەموو بوارەکانی کە (کیم ئیل سونگ) کرا بەسەرۆکی وولاتەکە. لە ١٩٤٨/٩/٩ کۆماری کۆریای دیموکراتی میللی ڕاگەیاندرا ئەمەش لەدوای ڕاگەیاندنی کۆماری کۆریای باشور بە دامەزراندنی کە کۆمارێکی سەر بەئەمەریکابوو دوای ئەوە هێزەکانی یەکێتی سۆڤیەت لە

خاکی کۆریا کشاوە. لەدوای ئەویش ئەمەریکا هێزەکانی خۆی لە کۆریای باشور کشاندەوەو لەوکاتەش شەڕی سارد ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پەرەی دەسەند و پەیوەندی بازرگانی لەنێوان هەردوو کۆریا بچڕا. لە ١٩٥٠/٦/٢٥ هێزی سوپای کۆریای باکور پەلاماری کۆریای باشوری داو ڕۆژی دوای لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکان تاوانبار کراو داوای کشانەوەی هێزەکانی کردو سەرۆکی ئەمریکی هاری تورمان دەنگی دا بەهێزی ئاسمانی و دەریای بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان. لە ١٩٥٠/٩/١٥ ژەنەراڵ دوگلاسی ماك ئەبرژ سەرکردەی هێزی نەتەوە یەکگرتووەکان بەکاری هاتنە خوارەوە لە هێلی نێوان هەردوو کۆریا کە بوە هۆی هەلاتی هێزەکانی کۆریای باکورو هێزەکانی چینی میللی چوە ناو شەڕەکە و بوە هۆی پەرت و بڵاوکردنی هێزەکانی نەتەوە یەککگرتووەکان. لە ١٩٥٣/٧/٢٧ ڕێکەوتن لەنێوان هەردوو لای شەر مۆر کرا ئەنجامەکە بوە هۆی کوشتنی زیاتر لە ملیۆنێك کەس لە هەردوو لایەنی کۆریەکان. لە ساڵی ١٩٦١ پەیمانی هاوکاری و دۆستایەتی لەگەڵ چین مۆرکرا. لە ساڵی ١٩٧٢ بڕیاری دەستوری نوێ درا بە وەرگرتنی سەرۆك کۆمار بە ئەنجومەنی جێبەجێکردن، دوبارە گفتوگۆ لەگەڵ کۆریای باشور دەستی پێکردەوە بۆ ئەوەی بتوانرێ یەك بگرنەوەو لەدوای ساڵی ١٩٨٥ پەیوەندی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو بەرەو چاك بوونەوە هەنگاوی نا. لەدوای ساڵەکانی ١٩٩٠ پەیوەندی دیبلوماسی لەنێوان کۆریای باشورو یابان دەستی پێ کردەوە بۆ شکاندنی ئەو ساردیەی کە کۆریای باشور لە جیهاندا هەیبوو. لە ساڵی ١٩٩١ کۆریای باکور بوە ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان و پەیمانی شەر نەکردنی لەگەڵ کۆریای باشور مۆرکرد. لە ساڵی ١٩٩٢ پەیمانی پشکنینی چەکە ئەتۆمیەکانی لەگەڵ کۆریای باشور مۆرکرد لە نێوان هەردوو لا لەسەر یەکتری.لە ساڵی ١٩٩٣ کۆریای باشور یەکەم وولات بوو لە پەیمانی بڵاو نەبونەوەی چەکی ئەتۆم کشاوە. لە مانگی ١٩٩٤/٨/ کۆریای باکور و ئەمەریکا پەیمانی وەستانی بڵاوبونەوەی چەکی ئەتۆمیان مۆرکرد. لەمانگی /٧/ ١٩٩٤ کیم ئیل سونگ لەدوای چل ساڵ دەسەلات کۆچی دوایی کرد و کوڕەکەی (کیم یون ئیل) جێگەی گرتەوە. لە دوای تۆمەتەکانی کۆریا ئێش و ئازارێکی خراپی دیت بەهۆی تەنگەژەی ئابووری و کەم بوونەوەی خۆراك بەهۆی ڕامیاریەتی چەوتی سەرکردە کۆمۆنیستیەکان. ئەمەریکا توانی ڕێگە بکاتەوە لە ڕووی بازرگانی و کۆچکردن بۆ کۆریا لەدوای ڕازی بوونی کۆریا بە بەرهەم نەهێنانی موشەکە درێژ هاوێژەکان.سەرەڕای ئەوەش کێشەی پەیوەندی نێوان کۆریاو ئەمەریکا بەردەوامە لەسەر چەکی ئەتۆمو موشەك هەر چەند هەولی زۆر دەدرێ بۆ ئارام کردنەوەی ئەو پەیوەندیە بە هاوکاری چین و یابان و ڕوسیاو نوێنەری ئەمەریکا کەدوا کۆبونەوەیان لە مانگی ٢٠٠٤/٩/ ئەنجام دراو کێشەکە بەرەو چاکردنە بەلام لە جێگەی خۆی ماوەتەوە یاریدەکا.

- کۆریای باکور ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەندامە لەچەندین ڕێکخراوی جیهانی وەك (دەریایی و تەندروستی و کشتوکاڵی.

# لاووس

- ناوی ڕەسمی: کۆماری دیموکراتی میللی لاووس.
- پایتەختی: ڤیانتیان، ژمارەی دانیشتوانی ٥٨٠٫٠٠٠ هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ٩١٫٤٢٨ میل چوارگۆشەو ٢٣٦٫٨٠٠کیلۆ مەتر چوارگۆشەیە .
- ژمارەی دانیشتووان: ٥٫٩٨٨٫٠٠٠ ملیۆن کەسە.
- چڕی دانیشتوانی:٦٥ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- شارەسەرەکیەکانی: بیکس، سافناخت، لوانگبرایانگ ئەو شارە پێشوو پایتەختی میرنشینەکان بوە.
- نژادەکانی: لاولوم ٦٨٪، لاوسونك ٢٢٪، لاوسونگ٩٪.
- زمانەکانی: زمانی لاووس (زمانی ڕەسمیە) فەرەنسی، ئینگلیزی.
- ئایینەکانی: بوزی٦٠٪، ئەنیمیەو بڕوای تر٤٠٪.
- زانینی خوێندن و نووسین:٦٥٪ .
- دابەشی کارگێری: ١٦هەریمە + یەك ئەنجوومونی شارەوانی + ناوچەیەکی تایبەتی.
- دراوی: کیب.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٦ملیار دۆلار .
- بەشی تاك لە کۆی دەئەنجامی ناوخۆیی ١٫٢٠٠دۆلار.
- بەرگری: ٣٫٥٪لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆی .
- سوپاکەی: ٣٠٫٠٠٠هەزار کەسە .
- زەوی کشتوکاڵی:٣٫٨٪ لەخاکی وولاتەکە .
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، دانەویلە، برنج، گەنمەشامی، پەتاتە، پەمۆ، چەوەندەری شەکر، تەرە،میوەجات .
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ٢٦٠٫٠٠٠ هەزار سەر، چێڵ ١٫١١٥ملیۆن سەر، گامیش١٫٠٥٠ملیۆن سەر، بەراز ١٫٤٧٥ ملیۆن سەر، پەرەوەر١٣٫٥٠٠ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی:زێڕ، بورك وگەچ، قەلا بۆکاری لەحیم بەکاردیت، داری دارستانەکان، وزەی کارەبا،
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی گواستنەوە، سووتەمەنی، ماشێن، برنج، کەلوپەمی خۆراك، ئوتۆمبێل، کەلوپەلی بەکارهینانی هەمەجۆر .
- پیشەسازی: دەرهێنانی مەنجەمەکان، بەرهەمی داری دارستانەکان.
- بەرهەمی‌کارەبا: ٤٫٨٠٠ملیار کیلۆ وات کاتژمیر.
- دەرچووەکانی: بەرهەمی دار، وزەی کارەبا، بورك‌و گەچ، جل‌و بەرگ، ڕستن وچنین، ڕاتان، کارداموول.
- هاوبەشەکانی بازرگانی :یابان، چین، فەرەنسا، ئەمەریکا، سەنگافوورا\ە، تایلاند، مالیزیا، ڤێتنام، کۆمارەکانی یەکیەتی سۆفیەتی پێشوو، هۆنگ کۆنگ.
- ڕژێمی دەسەڵات:لاووس وولاتێکی کۆمۆنیستیە، دەسەڵاتی جێبەجێکردن لەدەست سەرەك وەزیرانە، دەسەڵاتی شانشینی لەمانگی ١٩٧٥/١٢ هەڵوەشایەوە.یەك پارتی ڕامیاری هەیە، ئەویش پارتی باتت لاو، پارتی لاووسی شۆڕشگێری میللییە)
- جوگرافیای وولات: لاووس وولاتێکی ناوخۆییەو سنوری لەسەر هیچ دەریایەکی دەریاو زەریا نیە، لاووس دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو نیمچە دوورگەی هیندی چینی. چین، مانیمار، بورما دەکەوێتە باکوری، ڤێتنام دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی، کەمبۆدیا

دەکەوێتە باشوری، تایلاند دەکەوێتە ڕۆژئاوای،لاووس وڵاتێکی چیاییە بەتایبەتی لەباکوری و دارستانێکی چڕی هەیە لە باکورو ڕۆژهەڵاتی، سەرچاوەی زێیەکان لەچیا بەرزەکانی سەرسنوری ڕۆژهەڵاتی هەڵدەقوڵێ . بەڵام زێی میکۆنگ دەکەوێتە سەرسنوری لەگەڵ بۆرماو تایلاندو کەڕێگایەکی گواستنەوەی سەرەکیە، لە کەرتی دەشتایەکان ناوچەیەکی کشتوکاڵو تایبەتە بە چاندنی برنج.

• مێژووی لاووس: شارستانیەتی بڕۆنزەکان لەنێوانساڵەکانی ٢٠٠٠ تا ٥٠٠ پێش زاین لە ناوەڕاستی زێی میکۆنگو دەشتاییەکانی ئەم وڵاتە بوە، دوای ئەوە کەوتنە ژێردەستی ئەو کۆچبەرانی کە لە چینەوە ڕوویان تێکردبوو، لەسەدەکانی دەیەم و سیانزەم بوە پارچەیەك لە ئیمپڕاتۆریەتی خەمیر کە مەڵبەندەکەیان لە کەمبۆدیا بوو. لەسەدەی دووانزە لاووس بوە چەند ئیمارەتێکی بچووكو بەناوبانگترینیان ئیمارەتی (لوانگ برایاتگ) بوو کە لەلایەن داگیرکەرە لاویەکانی کە لە تایلاند ڕوویان تێکردبوو لەگەڵ بنانو باشوری چین ودوای ئایینی بوزیان کردە باوەڕی جیهانی دووەمی خۆیان. لەسەدەی چواردەم شانشین فانگۆم یەکەم ویلایەتی سەربەخۆی پێك هێنا بەناوی دەوڵەت لان کزانگ وبۆ ماوەی چوارسەد ساڵ دەسەڵاتداریەتی کردو دوای توشی کێشەی داپلۆسینو داگیرکردن بوو لەلایەن دەسەڵاتدارانی بۆرما لە ماوەی ساڵەکانی ١٥٧٤ تا ١٦٣٧، ئەوروپیەکان بۆ یەکەم جار لە سەدەی حەڤدەهەم سەردانی ناوچەکەیان کرد. لەساڵی ١٧١٣ ئەو شانشینە دابەش کرا بۆ سێ بەشی دەسەڵاتی شانشینی بچوك ئەویش (لوانگ بیارانگ، ڤیان تیانگ، شامیساك) کە بوە سەر بە دەوڵەتی سیامی (تایلاند) ئەویش لەسەرەتای سەدەی هەژدەم. لەساڵەکانی ١٨٩٣ تا ١٩٤٥ بوە وڵاتێکی پارێزراوی فەڕەنسی کە هەرسێ ئیمارەتەکەی گرتبوە خۆ (لوانگ بیارانگ ، ڤیان تیان، شامیساك) لە ساڵی١٩٤٥ لەلایەن یابان داگیر کرا بەڵام فەڕەنسا لە ساڵی١٩٤٦ لە ژێر دەستی یابانی ڕزگار کرد سەرەڕای بەرهەڵستی لاووسیەکان ڕزگاری نەتەوەیی کە یارمەتیان لە چین وەردەگرت، لەساڵی ١٩٥٠لاووس نیمچە ئۆتۆنۆمی بەدەست هێنا، لە١٩٥٤/٧/٢١لاووس سەربەخۆی لە فەڕەنسا وەرگرت بەپێی پەیمانی جنێف. بەلام دوای ئەوە شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا لە نێوان تایفەی شانشینی مام ناوەندی بەسەرۆکایەتی ئەمیر سوفانامۆماو کۆمەڵەی باتت لاو(خاکی لاو) کۆمۆنیستی بەسەرۆکایەتی ئەمیر سوفانوفۆنگی برای لە دایکی ئەمیر سوفانا. کە چین لایەنگیری‌دەکرد. لە ساڵی ١٩٥٧ حکومەتی ئیئتیلافی دامەزرا بەسەروکایەتی سوفانامۆما ئەویش بەپێی ڕێکەوتنامەی ڤیان تیان. بەڵام لە ساڵی١٩٦٠ دەسەڵاتی ڕاستڕەو کاروباری وڵاتی گرتە دەست لە لایەن ئەمیر یونی گوم بە پشتیوانی وڵاتانی ڕۆژئاوا.

لەساڵی١٩٧٢ دووبارە ڕێکەوتن مۆرکرا بە دامەزراندنی حکومەتێکی ئیئتلافی بە پێی ڕێکەوتنەکەی جنێڤ بەسەرۆکایەتی سوفانافوما. بەلام دوبارە شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسایەوە کە کۆمەڵەی باتت لاو لەلایەن ڤێتنامی باکور یارمەتی دەدراو سوفانا فوماش لە لایەن ئەمەریکا یارمەتی دەدرا. لەساڵی١٩٧٣ گەیشتە ڕێکەوتنی ڤیان تان بۆ وەستانی شەڕو وڵات دابەش بوو لە نێوان شیوعیەکانو دەسەڵاتی سوفانافوما. هێزەکانی ئەمەریکاو تایلاندو ڤێتنامی باکور کشانەوە. لە ساڵی١٩٧٥ شیوعیەکان دەسەڵاتیان وەرگرتو ڕژێمی کۆماریان ڕاگەیاند و ئەمیر سوفانومۆنگ بوە سەرۆك دەوڵەتو سەرۆکی شیوعیەکان پۆستی سەرۆك وەزیرانی

وەرگـرت و بـوە دادوەری تـەواوی لاووس. لـە ساڵی ١٩٨٥ بواری ئابووری بەرەو ئازاد هەنگاوی نابە ئاموژگاری گۆرباتشۆفی سەرۆکی سۆڤیەتی پێـشوو، لـە دوای وەرگرتنـی دەسـەلاتی شیوعیەکان کۆماری لاووس و هێزەکانی ڤێتنام لە لاوس کشانەوە . لەساڵی ١٩٩١ ئەنجومەنی باڵای میللی بریاری دەستوری نوێی داو نیشانەکانی سوشیالیستی لابرد لەسەر وولاتی لاووس بەلام دەسەلاتی یەک پارتی هەر مایەوە. دوای ئەوە چەندین گۆرانکاری ئەنجام درا بەگەرانەوەی کۆچبەران و کردنەوەی دەرگای بازرگانی لەگەڵ تایلاندو ڤێتنام. سەرەرای ماوەی باتت لاو لەسەر دەسەلات مایەوە تاکو ساڵی ١٩٩٣ بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەنگاوی ئازاد کردنی ئابوری و بوارەکانی تر نرا. لەگەڵ ئەوەشدا پردی هاوکاری و دۆستایەتی نێوان تایلاندو لاووس کرایەوە لەسەر زێی میکۆنگ لە مانگی /٤/ ١٩٩٤ کە بەیارمەتی ئوستراڵیا دامەزراو گرنگیەکی بازرگانی تایبەتی هەبوو لەنێوان هەردوو وولات. لەساڵی ١٩٩٥ ئەمەریکا ئەو ئابلوقە ئابووریەی هەلگرت لەسەر لاووس کەماوەی بیست ساڵ بوو لەسەری دابنابوو. بەلام لەساڵی ١٩٩٦ چەند کەسانێکی سەربازی دەیووکیان خستە سەر کاروباری رامیاری وولات و لەگەڵ ئەوەشدا هانی پەرەسەندنی ئابووری و پرۆژەکانی تایبەتی و فراوانکردنی داو بوە هۆی بوژانەوەی لاووس .

- لاووس: لە ١٩٩٧/٧/٢٩ لاووس بوە ئەندام لە دەستەی وولاتانی پێشوی رۆژهەلاتی ئاسیا، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

# بـۆتـــان

- ناوی رەسمی: شانشینی بۆتان
- پایتـەختی: سـیمبۆ(تۆسـیمبۆ) ژمـارەی دانیشتوانی ٥٠٠ر٣٥ هەزار کەسە .
- رووبەری : ١٤٧ر١٨ میل چوارگۆشەو ٠٠٠ر٤٧ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠ر١٥٠ر٢ ملیۆن کەسە.
- چری دانیـشتوانی: ١١٨ کـەس لەیـەک میـل چوارگۆشەدا.
- شارە سەرەکیەکانی: بارو، بۆنافا، منگار.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٣ر١ ٪ .
- زمانـەکانی: زونگـا (زمـانی رەسمیـە) کـە لەزاراوەی تبتیەکانە، زاراوەی نیپاڵ و زمـانی ئینگلیزیشی لیٚ یە.
- نـژادەکانی: بـوت ٦٥٪ نیپـالی ٣٥٪ بۆتـەکان لەباکوورو رۆژهەلاتی نیشتەجێن، نیپاڵیـەکان دانیـشتووی باشـوورن و گواسـتنەوەیان بـۆ باکوور قەدەغەیە.
- ئاینـەکانی: بوزی لامی ئاینی رەسمییە ٧٥٪ هندۆسی ٢٥٪.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٤٥٪ .
- دابەشـی کـارگێری: ٢٠ بەشـە لـە شـێوەی کارگێری قەزا.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٥٠٠ر١ ملیـار دۆلار.
- بەشـی تـاک لـەکۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ١٥٠ر١ دۆلار.
- دراوی: نگولترۆم یەکسانە بە شتروم.
- زەوی کشتوکاڵی: ١ر٢ ٪ لەخاکی وولاتەکە.
- پیشەسازی : چیمەنتۆ، دار.
- بەرهـەمی کارەبـا: ٨٥٠ر١ ملیـار کیلـۆوات کاتژمێر.
- بەرهـەمی کشتوکاڵی : گـەنم، جـۆ، برنج، تـەرە،

میوەجات، سورایی.

- سامانی سروشتی: دارو ووزەی کارەبای ئاوی.
- داهـاتی دەرەوەی: سـووتەمەنی، ئۆتۆمۆبێـل ، ئامێرو ماشێن.
- دەرچووەکانی: جبس، دار، بەرهەمی کارەکانی دەست، چیمەنتۆ، میوەجات.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: چین، ئەمەریکا، هند، یابان، وولاتانی یەکێتی ئەورووپا.
- ڕژێمـی دەسـەلات: شانـشینی بەڕەلایـە، بـەلام دەستوری وولات یارمـەتی شانشین دەدات بۆ دەسـەلات لەڕێگـەی ئەنجومـەنی ڕاوێـژکاری شانـشینی. ئەنجومـەنی دایـك سـالی دووجـار کۆدەبێتەوە.
- پارتـە رامیاریـەکان: هـیچ پـارتێکی مۆلـەت پێـدراوی نییـە لەگـەل ئەوەشـدا دوو پـارتی سـەرەکی هەیـە ئـەویش پـارتی نیـشتیمانی دیموکراتی بۆتان، پارتی گەلی بۆتان. کە لەبنە ڕەتا هەردووکیان نیپالین.
- جوگرافیـای وولات: وولاتـی بۆتـان لـەناو یایـەکانی باشـووری ڕۆژهـەلاتی چـیای هەمەلایەیـە، تبـت دەوری داوە لـە بـاکورو ڕۆژهـەلاتی، هینـد دەوری داوە لەباشـوورو ڕۆژئـاواو ڕۆژهـەلات، بۆتـان پێـك هـاتوە لەوولاتێکی چیایی دلڕفێن لەباکوردا. لوتکەی چـیای چـنکار بنـوم کـە بلنـدترین لوتکەیـە لەجیهانا، لەناوەڕاستی دۆل و کەندی بەپیتی هەیە و زێی براهماو بوترای لێ یە، لە باشووری دارسـتانی چـڕو بەسـودی هەیـە، چـیاکان داپۆشراوە بەزۆی بەستوو بەفری زۆرو بارانی چڕو بەخوڕی زۆری لێ دەبارێ.
- مێژووی وولات: بۆتان ژێر دەستەی کارگێری هینـد بـوە تـاکو سـەدەی هەشتی زاینی، دوای کەوتـە ژێـر دەسـەلاتی تبـت لـەدوای سـەدەی شانزەهەم و دوایی گۆڕا بۆ ڕژێمی چین لە سالی ١٧٢٠ و لەسـالی ١٧٧٤ پـەیمانی کۆمپانیـای هندی ڕۆژهـەلات مۆرکرا، لەسالی ١٩٠٧ بۆتـان بوە شانشینی میراتی بۆ یەکەم جار کەدادوەر تونگـسا بـوە شانـشینی وولاتەکـە. لـە سـالی ١٩١٠ پـەیمانی تـەنگۆ بۆتـانی مـۆرکراو کاروباری دەرەوەی وولات کەوتە ژێر دەسەلاتی بـەریتانیا . لەسـالی ١٩٥٠ بۆتـان بـوە ئەنـدام لـەپرۆژەی کۆلۆمبـۆی بوژانـەوەی ئـابووری کۆمەلایەتی لەئاسیاو زەریای هیندی.

لەسالی ١٩٥٢ دورگەی ئەنگشوك دەسەلاتیان وەرگرتو بیری چاکسازی گرتە بەرو ئەنجومەنی دایکـی دامەزرانـد بـە نـاوی (تـشوگودو لەسـالی ١٩٥٣) ، لەسـالی ١٩٥٨ ڕژێمـی کۆیلایـەتی هەلوەشێنرایەوە ، لە سالی ١٩٥٦ ماوەی چوار هـەزار کەسـی دا وەك پەنابـەر بێنـە نـاو خـاکی وولاتەکە لەوکاتەی چینی میللی خاکی تبتیەکانی لکانـدە خـاکی چـین . لەسـالی ١٩٦٨ یەکـەم ئەنجومـەنی وەزیـران دامـەزرا لەلایـەن شانـشین لەمێـژووی وولاتەکـە ، لەسـالی ١٩٧٣ وولاتـی بۆتان بوە دۆستی جولانەوەی وولاتانی بێ لایەن (حرکە عدم الانحیان) ، لەسالی ١٩٨٢ بۆتان بوە ئەنـدامی دامەزرێنـەری ڕایەلـەی هاوکـاری هەرێمایەتی باشووری ئاسیا، تاکو ئێستا کێشەو ململانێی جۆراو جۆر لـەنێوان بـاکورو باشـوور هەیـە لـەنێوان تبتیـەکان و نیپالیـەکان بـەهۆی نەبوونی دیموکراتی تـەواو پێشێل کردنی مـافی مـرۆڤ. لەسـالی ١٩٨٨، شانـشینی بـوزی لەیاسـەیەکی بـاری هەلسوکەوتی قەدەغـە کـرد بەرامبـەر دابـو نـەریتی هندۆسـەکانی نیپـالی لەباشـووری وولات، لەسـالی ١٩٩٠ خۆپیـشاندان ئەنجامـدرا لـەپێناو دیموکراتیـەت کـە بەسـەدان کـەس لـەو کـارە کـوژران کە زۆریـەی کۆرچەبەرە نیپالییـەکان بـوون، کـە تـاکو ئێـستا نیپالیـەکان جێگـای مەترسـی دەسـەلاتی شانـشینن لەسـالی ١٩٩٣ تاکو کۆتایی سالی ٢٠٠٣ کە مافی مرۆڤ پێشێلدەکرێت لەهەموو بوارە جیاجیاکان.

- بۆتان ئەندامە لەنەتەوە یەککگرتوەکان.

# سەنگافوورە

- ناوی ڕەسمی: کۆماری سەنگافورە.
- پایتەختی: سەنگافورا، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۵۵۰ر۳ ملیۆن کەسە.
- ڕوبەری:۲۳۹ میل چوارگۆشەو ٦١٨ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر٦۰۰ر٤ ملیۆن کەسە، بەپێی زانیارییەکانی ۲۰۰۰.
- چڕی دانیشتوانی:١٩٢٤٦ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بەندەرە سەرەکیەکانی:سەنگافورە.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۲ر۱٪.
- زمانەکانی: چینی، تامیل، ملاوی، ئینگلیزی، (هەمویان زمانی ڕەسمیە).
- ئاینەکانی: بودیۆن، تاوبون، ئیسلام، مەسیحی، هندۆس.
- نــژادەکانی: چینیەکان ٧٧٪، مالیو ١٦٪ هندی٧٪ .
- زانینی نوسین و خوێندن: ۹۰٪.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۲۰۰ر۸۵ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۸۵۰ر۲٤ دۆلار.
- دراوی: دۆلاری سەنگافوری.
- بەرگری: ۳ر٤٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر۷۵ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ۱ر۲٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: مەتات، تەرە، میوەجات، دانەوێڵە.
- پیشەسازی: پاڵاوتنی نەوت، ئەلکترۆنی، دروستکردنی مەتات، خۆراك، چاکردنەوەی کەشتی، تەکنەلۆژیای زیندوو، گۆڕینەوەی دراوی هەمەجۆر.
- بەرهەمی کارەبا: ١٥٠ر٢٤ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- دەرچووەکانی: بەرهەمی نەوت، کەلوپەلی دروستکراو، ئامێری کارەبا، ماسی.
- داهاتی دەرەوەی: نەوت، فڕۆکە، پێداویستی خواردەمەنی، کیمیا، گەلێ شتی تر.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چین، هۆنکۆنگ، یەکێتی ئەوروپا.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی دیموکراتی سەنگافورە، پارتی کاری سۆشیالستی، پارتی کاری میللی، پارتی پارێزگاران.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی پەرلەمانیە. پەرلەمانی پێك هاتوە لە ٨١ ئەندام و هەڵدەبژێردرێن بەپێشنیاری نهێنی گشتی، ئەنجومەنی وەزیران سەرۆك وەزیران سەرۆکایەتی دەکات.
- جوگرافیای وڵات: سەنگافورە بچوکترین ووڵاتە لەجیهان. دورگەیەکە دەکەوێتە لای باشوری نیمچە دورگەی مەلایۆ. لە باشووری ڕۆژهەڵات و ئاسیا لەنێوان دەریای چینی باشوورو زەریای هندی. دوورگەکە زیاتر لەپەنجا دورگەی بچوك دەگرێتە خۆی کەبەیەکەوە بەستراون، سەنگافورە پردی تەسکی جوهور لەگەڵ مالیزیا بەیەکیان دەبەستێتەوەو لەهەمان کاتا گەروی جوهور لەیەکیان جیا دەکاتەوە لەسنوردا. مالیزیا دەکەوێتە باکوری ، ئەندۆنوسیا دەکەوێتە باشوری، زێی سلینار لەباکوری دێتەخوارێ بۆ ڕۆژهەڵات کە خاکەکە ئاو دێر دەکات.
- مێژووی وڵات: کۆماری سەنگافورە لەبنەڕەتدا

پارچەیەك بوە لەشانشینی سریفیچایای سومتەری، کۆمپانیای هندی رۆژهەڵاتی بەریتانیا بەکرێی گرتبوو لە سولتان جوهور لە سالی ۱۸۱۹ لە سەرداوای سیرستانفۆر درافلز کە ژێردەستەیەکی بەریتانی لێ دورستکردبوو تاکو ساڵی ۱۹۵۹ لەوکاتەی کەبەمافی ئۆتۆنۆمی یەدەست هێنا لەناو کۆمەنولسی بەریتانیا، لەساڵی ١٩٤٦ بوە ژێر دەستەیەکی تاجی بەریتانیا . لە ١٦/ ٩/ ١٩٦٣ سەنگافورە چوە ناو مەلایۆو ساراداك و سەبام بۆئەوەی بەیەکەوە لەگەڵ مالیزیا ببنە وولاتێکی یەکگرتوو. بەڵام بوە هۆی کێشەو ململانێ لەنێوان نژادە جیاجیاکان تاکو لە ١٩٦٥/٨/٩ بوە وڵاتێکی سەربەخۆ، سەنگافورە یەکێکە لەگەورەترین بەندەرەکانی جیهان لەئاستی دانیشتوانی زۆرو بژێوی ژیانیان باشەو گۆڕینی دراوی لەگەڵ وڵاتان بەرەو باشی هەنگاو دەنێ و حکومڕانیەتی توندی هەیەو ماوە بەکەرت بون و لێك ترازانی گەلانی نادات و ژیانیان بەیەکەوە چەسپاوەو تاکو کۆتایی ساڵی ٢٠٠٣ ئالوگۆڕە یەك لەدوای یەکەکانی بەشێوەیەکی رێك و پێك بەرچاو دەروات بەڕێوە.

- سەنگافورە ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە رایەڵەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا، ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا.

# عومان

- ناوی ڕەسمی: سەڵتەنەی عومان.
- پایتەختی: مەسقەت، ژمارەی دانیشتوانی ٦٣٠٠٠ر هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ٨٢٠٣١ر میل چوارگۆشەو ٢١٢٤٦٠ر کیلۆمەتر چوارگۆشەیەو لەناو ئەو ڕووبەرە دورگەی کورموری تیایە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٢٨٥٦٠٠٠ر٢ ملیۆن کەسە بەپێی ئاماری ٢٠٠١.
- چڕی دانیشتوانی: ٣٥ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- شارە گرنگەکانی: سەلالە، نزوی.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: مەترح، فەحەل.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٣ر٤٪.
- نژادەکانی: زۆربەی دانیشتوانی عەرەبە، ئیرانی و هیندی و پاکستانی و ئەفریقیە ڕۆژهەڵاتیەکانی تیایە .
- زمانەکانی: عەرەبی(زمانی ڕەسمیە).
- ئاینەکانی: ئیسلام.
- دابەشی کارگێڕی: ٨هەرێمی دابەش کراوە بۆ ٥٩ ولایە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١٧٥٠٠ر ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٨٢٠٠ر دۆلار.
- دراوی: ڕیالی عومانی.
- بەرگری: ١٠ر١٠٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٤٥٥٠٠ر هەزار کەسە.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٦٠٪.
- زەوی کشتوکاڵی: ١ر٢٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمەکانی کشتوکاڵی: فەریکە خورما، دانەوێڵە، گیزی هیندی، بیبەر، لەیمون، مۆز،

تەرە، میوەجات.

- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ۱٦۰ر۰۰۰ هەزار سەر، بزن ۷۵۰ر۰۰۰ هەزار سەر، چێڵ و گامێش ۲۵۳ر۰۰۰؟ هەزار سەر، پەرەور۳ر۲۰۰ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: مەرمەڕ، نوحاس، بەردی چەوی، غازی سروشتی، نەوت ۷۵٪ لەدەرچووەکانی بەرهەمی وڵاتەکەیە.
- پیشەسازی: نەوت و غاز، کۆمپانیار دامەزراوەکان.
- بەرهەمی کارەبا: ۹ر۲۰۰ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: ماشێن و کەلوپەلی گواستنەوە، پێداویستی خۆراک، کەلوپەلی دروستکراو، ئاژەڵ، بەرهەمی نەوت لە ڕۆن و گریس و جۆرەکانی تر.
- دەرچووەکانی: نەوت، نوحاس،ڕستن و چنین، ماسی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، ئیماراتی عەرەبی، سنگافورە، کۆریای باشوور، ئەمەریکا، بەریتانیا، چین.
- ڕژێمی دەسەڵات: وڵاتێکی شانشینییە، سولتان سەرۆکایەتی دەوڵەت و حکومەت دەکات، ئەنجومەنی وەزیران و حەوت ئەنجومەنی تایبەتمەندی و ئەنجومەنی ڕاوێژکاری هەیە.
- پارتە ڕامیاریەکان: مۆڵەتی هیچ پارتێک و گروپێکی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی و دیموکراتی نەدراوە.
- جوگرافیای وڵات: سەڵتەنەی عومان دەکەوێتە سەرکەناری باشوری ڕۆژهەڵاتی نیمچە دورگەی عەرەب ودرێژدەبێتەوە لە ڕۆژهەڵات لەسەر کەنداوی عومان و لەباشووری لەسەر دەریای عەرەب. کۆماری یەمەن دەکەوێتە ڕۆژئاوای لەگەڵ شانشینی عەرەبی سعودی و ئیماراتی یەککگرتووی عەرەبی.
- مێژووی وڵات: بەپێی هەڵکەندراوەکانی کۆنی شوێنەواری شارستانیەت وا دەردەکەوێت کەعومان ۳۰۰۰ هەزار ساڵ پێش زاین وڵاتێکی پەرەسەندو بوە لەکاری دەریاوانی لەوناوچەیە و لەکاتی ڕۆژەکانی شارستانیەتی نێوان دووزێی دیجلەو فوراتی ئێستای عیراق و پێش سەدەی نوێی پێش زاین عەرەبەکان لە بیابانی عەرەبی ڕوویان لەناوچەی عومان کردوە کە لە هۆزەکانی قەحتانی بوینەو لەباشوری ڕۆژئاوای نیمچە دورگەی عەرەبی و لە ئەنجامی بێزاربوون لەباکوری ڕۆژئاوا کەبوە کێشەی نێوانیان.

لەسەدەی چواری پێش زاین عومان کەوتە ژێر دەسەڵاتی فارسەکان، لەساڵی ٦۳۰ زاینی عومان ئاینی ئیسلامی کردە بڕوای خۆی لەلایەن زاناکان کەدانیشتوانی ڕەسەنی عومانن، خلیل احمد فراهیدی کەبەناوبانگترین زانای زمانی عەرەبی بوەو خاوەنی یەکەم فەرهەنگی زمانی عەرەبی بوە لەمێژوو دا ئەویش (کتابی عینی). لەساڵی ۷۵۱ عومان سعود هەڵبژێردرا بەپێشەوای ناوچەی عومانی و تاکو ساڵی ۱۱۵٤ لەژێر دەسەڵاتی لائمەکان مایەوە تائەوکاتەی بنەماڵەی ئەبهام دەسەڵاتی بنەماڵەکەی دامەزراند. لەکۆتایی سەدەی شانزەهەم کەناری ڕۆژئاوای عومان کەوتە ژێر دەسەڵاتی پرتوگالیەکان تاکو ساڵی ۱٦۵۰و دوایی دەرکردنیانی لەعومان لەلایەن گەلی عومان، لەسەرەتای سەدەی هەژدەهەم شەڕی ناوخۆ هەڵگیرا لەنێوان بنەماڵەی قەحتانیەکان و جەعفەریەکان بەڵام ئەحمەد سعود توانی سەلتەنەی سەربەخۆی عومان لەساڵی ۱۷٤۹ دابمەزرێنی و تاکو ئێستاش ئەو بنەماڵەیە دەسەڵاتدارن، لەساڵی ۱۹۵۱ عومان سەربەخۆیی تەواوی لەبەریتانیا وەرگرت و پەیمانی هاوکاری دۆستایەتی نێوانیان مۆرکرد، لەساڵی ۱۹٦٤

کانزاکانی نەوت دۆزرایەوە و وڵاتی عومان لەووڵاتێکی هەژار بوە ووڵاتێکی دەوڵەمەند. لەساڵی ١٩٧٠ سوڵتان سعید غور دەستی لەکار کێشاوەو کوڕەکەی قابوس سعیدجێگەی گرتەوەو ناوی عومانی گۆڕی بەسەڵتەنەی عومان. لەساڵی ١٩٨١ ئەنجومەنی ڕاوێژکاری دامەزراندو ڕۆڵی گرنگی هەبوو لەدامەزراندنی ئەنجومەنی کەنداوی عومان، لەساڵی ١٩٩١ عومان هاوکاری بەریتانیاو ئەمەریکای کرد دژی داگیر کردنی کوێت لەلایەن عێراق، لەمانگی /١١/ ١٩٩٤ سوڵتان دەسکاری ئەنجومەنی ڕاوێژکاری کرد لەڕێگەی هەڵبژاردنەکان، حکومەتی عومان لایەنگیریو بەشداری خۆی ڕاگەیاند لەگەڵ ئەمەریکاو هاوپەیمان بۆ لابردنی ڕژێمی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣بە پێی ئەو ڕێکەوتننامە سەربازیو ئابوریو ڕامیاریانەی کە لە نێوانیان هەیە.

- عومان ئەندامە لەئەنجومەنی هاوکاری کەنداو، ئەندامە لە زانکۆی وڵاتانی عەرەب، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

# قەتەر

- ناوی ڕەسمی: دەوڵەتی قەتەر.
- پایتەختی: دەوحە، ٥٠٠ر٤١٠ هەزار کەسە.
- شارە گرنگەکانی: دخان (مەڵبەندی بەرهەمی نەوتە).
- بەندەرە سەرەکیەکانی: دەوحە، ئوم سەعد.
- ڕووبەری: ٢٤٧ر٤ میل چوارگۆشەو ٠٠٠ر١١ هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٧٠٠ر٨٥٦ هەزار کەسە.
- چڕی دانیشتوانی ٢٠٢ کەس لە یەك میل چوارگۆشە
- نژادەکانی : عەرەب ٤٨٪ ، پاکستانی ١٨٪. هیندی ١٨٪. ئێرانی١٦٪.
- زمانەکانی: عەرەبی (زمانی ڕەسمیە) ئینگلیزی.
- ئاینەکانی: ئیسلام.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٨٠٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٩ کارگێڕی شارەوانییە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر١١ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٨٥٠ر١٦ دۆلار.
- دراوی: ڕیال.
- بەرگری: ٣ر١٤ ٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناخۆیی.
- سوپاکەی: ٥٠٠ر١٢ هەزار کەسە.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٠٠٠ر٢٥٠ هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر١٨٥ هەزار سەر، پەرەور٠٠٠ر٣٨ ملیۆن سەر، چێڵ و گامێش ٠٠٠ر٥٠ هەزار سەر.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢ر٥ ٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کارەبا: ٥٠٠ر٦ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: نەوت، غازی سروشتی بەرهەمی نەوتو داهاتەکەی باشترین بژێوی ژیانی بۆ خەڵکی قەتەر دابین کردوە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: پەمۆ، گەنم وجۆ، گەنمەشامی، تەرە، میوەجات.
- داهاتی دەرەوەی: ماشین و کەلوپەلەکان، کەلوپەلی بەکارهێنان، پێداویستیەکانی خۆراك،

کیمیاوی.

- دەرچـووەکانی: بەرهەمەکانی نـەوت، پـۆلا، پەینی کیمیاوی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چین، ئەمەریکا، بەریتانیا، فەرەنسا، ئەڵمانیا، بەرازیل.
- رژێمی دەسەلات: شانشینی بەرەلایە ، ئـەمیر حـوکمرانی وولات دەکـات و سـەرەك وەزیـران هەیە، هیچ پارتێکی رامیاری ماوەی پێ نەدراوە سەرەرای هەبوونی.
- جوگرافیـای وولات: لەوولاتـەکانی رۆژهـەلاتی ناوەراستە کەنیمـچە دوورگـەی عـەرەبی بـچوك دەگرێتە خۆیو درێژ دەبێتەوە لەناو کەنداوی عـەرەب لـەلای کـەناری رۆژئـاوای. شانـشینی سعودی دەکەوێتە رۆژئاوای، ئیماراتی عەرەبی دەکەوێتـە باشـووری . زۆربـەی خـاکی بیابـان و وشك و بێبارانە بەدەگمەن گیاو داری تیایە.
- مێژوی قەتەر: ئاینی ئیسلام لەسەدەی حەوتی زاینـی گەیـشتە ناوچـەی قەتـەر و لەسـەدەی هەشـتی زاینـی بـوە مەلبەنـدێکی بازرگـانی بەمێژو گرنگ لـەرۆژەکانی دەسەلاتی دەولـەتی عەباسـیەکان، لەسـالی ١٧٨٢ بنەمالـەی ئـال خەلیفە کە لەباکووری رۆژهەلاتی قەتەر هاتبون توانی شالاوی داگیر کردنـی ئیران لـەناوبیات و بارەگای قەتەر بگوازێتەوە بۆ دورگـەی بـەحرێن لەگـەڵ بـەردەوام بـونی لەدەسـەلات. لەسـالی ١٨٦٨ بـەریتانیا گەیـشتە ناوچـەکە محمـدی دووەمی کردە ئەمیری قەتەرو نوێنـەرێکی خۆی کـردە دادوەری قەتـەر. لـەنێوان سـالەکانی ١٨٧١تـا ١٩١٤ قەتـەر بەشـێك بـوە لـە ئیمپراتۆریـەتی تـورکی عوسمـانی بـەلام هـەر بەناوبوو، لەسالی ١٩١٦ قەتەر بوە ناوچەیەکی پارێزراو لەلایەن بەریتانیا بەپێی پەیمانی نێوان شـێخ عبـداللە ی دووەمو بـەریتانیا، لەسـالی ١٩٤٩ کانـە نەوتیـەکان دۆزرایـەوە، لەسـالی ١٩٦٠ شێخ ئەحمەدی دووەم دەسەلاتی قەتـەری گرتە دەست و لەسالی ١٩٧٠ بریاری دەستوور دراو دوپـاتی شانـشینی قەتـەری کـردەوە ، لـە ١٩٧١ /٩/٣ قەتـەر سـەربەخۆی وەرگـرت لـە بەریتانیا.لەسالی ١٩٧٢ شێخ خەلیفە حەمەد کودەتـای ئەنجامـدا دژی مـامی ئـەمیری قەتـەر ئەحمد و جێگـەی گرتـەوەو خـۆی بـوە ئـەمیری قەتەر.

لەسـالی ١٩٩١ هێزەکـانی سـەربازی قەتـەر بەشداری شـەری کەنداوی کرد دژی داگیر کـەری عێراق بۆ سەر کوێت. لەسالی ١٩٩٩ هەلبـژاردن ئەنجام درا بۆ هەلبـژاردنی ئەنجومەنی شارەوانی کـە ئـافرەتیش بەشـداری تێیـدا کـرد، قەتـەر پشتگیری تـەواوی خـۆی پێشکەش بە وولاتـانی هاوپەیمان کرد لە سالی ٢٠٠٣ بۆ لێدانی رژێمی عێراقو بنکە سەربازیەکانی خستە ژێر دەسەلاتی ئەمەریکاو هاوپەیمانان.

- قەتـەر ئەندامـە لـەزانکۆی وولاتـانی بەرهـەم هێنەری نەوت، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامـە لـەرێکخراوی ئەنجومـەنی عـەرەبی کەنداو.

# ئیســـرائیل

• ناوی رەسمی : کۆماری ئیسرائیلی یەهودی .
• پایتـــەختی: ئۆرشـــەلیم‌وقودس، ژمـــارەی دانیشتوانی٥٠٠ر٧٥ هەزار کەسە.
• شارە سەرەکیەکانی: تەل ئەبیب، حەیفا، بات یام، هولون، رامات جان، بیتاح تیکفا، .
• بەندەرە سەرەکیەکانی: تەل ئەبیب، یافا،حەیفا، ئیلات ئاکۆ.
• روبـەری: ٢٩٠ر١٠ کیلۆمـەتر چـوار گۆشـەو ٦٥٠ر٢٦ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
• ژمـارەی دانیـشتوانی: ٠٠٠ر٢٥٠ر٦ ملیـۆن کەسە، بەپێی زانیاریەکانی ١٩٩٩.
• چڕی دانیـشتوانی: ٦١٧ کـەس لـە یـەك میـل چوارگۆشەدا.
• بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر٣٪ .
• نـژادەکانی: یـەهودی ٨٥٪، عـەرەب، ١٥٪ ، لـەژمارەی دانیـشتوانی ئیـسرائیل ٠٠٠ر٣٦٠ هەزار کورد تیایە.
• زمانـەکانی: عیبری‌و عەرەبی (زمـانی رەسـمین) ئینگلیزی، ییدیش، کوردی، لەگەڵ زمـانی تـری ئەوروپی‌و رۆژئاوای ئاسیا.
• ئاینـــەکانی: یـــەهودی ٨٥٪ ،ئیـــسلام١٢٪، مەسیحی ٣٪ .
• زانینی خوێندن‌و نوسین: ٩٧٪.
• دراوی: شیکل.
• دابەشی کارگێڕی:٦ پارێزگایە.
• بەرگری: ٥ر١١٪ لە کۆی دەرمنجامی ناوخۆیی.
• سوپاکەی:٠٠٠ر١٩٥ هەزار کەسە.
• کـۆی دەرمنجـامی نـاوخۆیی: ٢٥٠ر٩٦ملیـۆن دۆلار.
• بەشـــی تـــاك لـــە کـــۆی دەر ئـــەنجامی ناوخۆیی: ٣٠٠ر١٨دۆلار.

• زەوی کشتوکالی:١٧٪ لە خاکی وولاتەکە.
• بەرهـەمی کشتوکالی: گـەنم‌و جۆ، خـوێ، پـەمۆ، تەڕەو میوەجات، زەیتون،
• سـامانی ئـاژەڵی: چـێڵ‌و گـامێش، ٠٠٠ر٣٨٥ هەزارسـەر، مـەڕو بـزن ٠٠٠ر٢٧٦هـەزار سـەر، پەڕەور ٢٤ ملیۆن سەر.
• سامانی سروشتی: فۆسفات، بۆتاس، سلسال، نوحاس، بۆرمید.
• بەرهـــەمی کارەبــا: ٥٠٠ر٣٢ ملیــار کیلــۆوات کاتژمێر.
• پیـــشەسازی: رســـتن‌و چـــنین، ئـــەلکترۆنی، ئـەلماس، ئـامێری دورسـتکردنی خـۆراك، کـەلو پەلی گواستنەوە، کارەبایی.
• داهـاتی دەرەوەی: پێداویـستی خـام، کیمیـا، نـەوت، ماشێن، ئاسن، دانەوێڵە، رستن‌وچنین، گالیسکە، کەشتی، فرۆکە، چەك‌و تەقەمەنی،
• دەرچوەکانی: ئەلماس، بەرهەمی رستن‌و چنین، میوەجـات، زەیتـون، خـۆراکی ئامـادەکراو، ئەلکتۆنی، چەك، کیمیا، پەینی کیمیاوی،
• هاوبەشـەکانی بازرگـانی: ئەمـەریکا، سویـسرا، یابان، یەکیەتی ئەوروپا، هۆنگ کۆنگ، کەنەدا، باشـوری ئـەفریقا، چـەندین وولاتـی عـەرەبی بەتایبـەتی وولاتـی میـسر٠٠٠٠٠ رێکـەوتنی سـەربازی گـەورەی ئیسرائیل لەگەڵ ئەمـەریکاو وولاتـانی تـری رۆژئاوا وایکـردوە بـاری ئـابوری ئەو وولاتە رۆژ بەرۆژ بەرەو بەهێز بوون هـەنگاو بنـێ لەهــەمان کـات قــەرەبوی جەنگــەکان بەتایبەتی قەرەبوی جەنگی ئەلمانیاو یارمـەتی ئەو جولەکانەی کە لە دەرەوەی وولاتەکە دەژین بەتایبـــەتی ئەمـــەریکاو دوای ئـــەوە هێنـــانی کەسانی پسپۆڕ لە بوارەکانی زەوی کشتوکاڵ‌و

ئابوری و پیشەسازی و بیناسازی.

• ڕژێمی دەسەڵات: کۆماری دیموکراتیە، سەرۆک وولات پەرلەمان هەلیدەبژێرێ ئەویش "کنێسەیە"کە ١٢٠ ئەندامەو هەلدەبژێردرێن بە پێشنیاری گشتی بە ڕێژەیی بۆماوەی چوار ساڵ، بەلام بەڕێوە بردنی کاروباری حکومەت ئەنجومەنی وەزیران هەلی دەسووڕێنی بەسەرۆکایەتی سەرۆک وەزیران. ڕژێمی ئیسرائیل دەستوری نیەو لەسەر بنەماکانی یاسای بنەڕەتی و ئاینی وولات دەبا بەڕێوە.

• جوگرافیای وولات: کۆماری ئیسرائیلی یەهودی لە سەر ڕۆخی ڕۆژهەلاتی دەریای سپی ناوەڕاستە، لە باکوری لوبنان، لە ڕۆژهەلاتی سوریاو ئوردن، لە باشوری ڕۆژئاوای میسرە، ئیسرائیل وولاتێکی کەناریەو درێژ دەبێتەوە لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست تا دەگاتە دەریای سور لە باشور لە ماوەی کەنداوی عەقەبە کە دەکەوێتە سەر بەندەری ئیلاتی ئیسرائیل. سێ هەرێمی هەیە ئەویش هەرێمی جەلیل بەپیتی چیایە کە لە باکورە، دەشتایی بەپیتی هەیە لە ڕۆژئاوا، هەرسێ هەرێمەکە دەکەوێتە باشوری کە بیابانێکی نەجەتی ئەویش ناوچەیەکی ڕوتەو بەرهەمی سروشتی لێ هەلدەهێنجرێ، دەریای جەلیل" دەریای تەبەریەی" لێیە لەگەل زێی ئوردن و زێی مردوو(البحر الميت) کە نزمترە لە ئاستی دەریا بە ١٢١٢پێ و جوانترین ناوچەیە، دەریای مردو ڕوبەرەکەی ١٠٢٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە و هیچ دەرگایەکی دەرچونی نیە. زێی ئوردن لە باکور هەلدەقولێ و لە دەریای مردو دەکاتەوە. خاکی ئیسرائیل لە ڕێگەی خۆشکردنی زەویەکان و ئاودێر کردن، لە ڕێگەی کاری پیشەسازی توانیویەتی وولاتەکەی بەرەو بوژانەوەی باش ببات. کەش و هەوای گەرم و وشکەو زستانی مام ناوەندییە ئەو بارانەی کەدەبارێ لە بکورەو لە باشور بێ بارانەو وشکانیە.

• مێژوی وولات: فەلەستین لانەی دوو ئاینی پیرۆز بوە، یەهودی و مەسیحی. ئەو دوو ئاینە یەك لە دوای ئەویتر هاتە کایەوەو هەریەکە ڕۆلی گرنگی خۆی هەبوەو هەیە بەتایبەتی ئاینی مەسیحی کەئێستا گەورەترین ئاینی جیهانە لەژمارە، ناوی فەلەستین لە ملستین هەلقولاوە. ئەو گەلەی کە لەڕەسەندا دانیشتوی ئەو وولاتە بوینە لە سەدەکانی دوانزەی پێش زاینی کە لەو کاتە دانیشتوانی عەرەب لەو هەریمانە زۆر کەم بوینەو بە پەنجەی دەستان دیاری دەکران ٠٠باوکی پێغەمبەران"ئیبراهیم خەلیل" لە سالی ٢٠٠٠پێش زاین سەردانی ئەو ناوچەیەی کردوە کە لە وولاتی نێوان دوو زێ" میزۆبۆتامیا"واتە هەرێمی باشوری کوردستان بۆی چوە بە هۆی دەربەدەر بونی لە لایەن نەمرود لە قەزای نەمرودی نزیك پارێزگای موسل پێش ئیمپراتۆریەکانی سۆمەری و ئاشوری و بابلی و ئەکەدی و میدیەکان. وەك مێژو ڕوونی کردۆتەوە ئیبراهیم خەلیل لە پارێزگای ئورفەی باکوری کوردستان لە دایك بووە باوکی پاسەوانی ئەو کاتەی نەمرود بوەو لە هەمان کاتا مەزارەکانی لەسەر سنوری ئێستای کوردستان و تورکیا هەیە لە بازگەی ئیبراهیم خەلیل و ناوچەی بێتواتەی بتوێن. دوای ئەوە "شائول"ی یەکەم شانشینی یەهودی لە سەدەی پانزەی پێش زاین لە فەلەستین دامەزراندو بوژانەوەو پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە لەژێر دەسەلاتی شانشین داودو کوڕەکەی سلێمان و جێگرەوەکانی لە ماوەی سالی ١٠٠٠ تاکو ٥٩٧ پێش زاین. لەو ماوەیە شانشینی یەهودی دابەشی دوو بەش بوون ئەویش یەهوزاو ئیسرائیل دوای ئەو دوو شانشینە بەرەو

توانەوە هەنگاویان نا لە لایەن شانشینی بابلی لە سالی ٥٨٦ پێش زایین بەدەربەدەر کردنی لەسەر ملك و سامانی خۆیان و پەرت و بلاو کران و دەستکرا بە کەرتبونی یەهودو دورکەوتنەوە یان لەخاکی خۆیان. دوای ئەوە ئەسکەندەری گەورە لە سالی ٣٣٣ی پێش زاین ناوچەکەی داگیر کرد ٠٠٠بەلام بەهۆی بێکاری و هەژاری لە وولاتی میسرو یەمەن و سلیسودیەکان لە ناوچەی سوریای ئێستا رویان لەو هەرێمە کردو داگیریان کرد بەلام یەهودیەکان توانیان سەربەخۆیی خۆیان بگەرێننەوە ملستین لە سالی ١٤٢پێش زاین. دوای فەلستین لەسالی ٦٣ پێش زاین لە لایەن ئیمپراتۆریەتی رۆمان داگیر کرا. دوای ئەوە دەسەلاتی یەهوزا گەراوە ناوچەکە . لە سالی ٦١٤وولاتەکە لە لایەن فارس داگیر کراو قودس لە ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی دەرهێنرا. لە دوای ئەوە بە هۆی فتوحاتی ئیسلامی لە سالی ٦١٤ زاینی عەرەب گەیشتنە ئەو وولاتەو ئاینی ئیسلام و زمانی عەرەبی تێدا بلاوکراوەو یەهودیەکان سێبارە پەرت و بلاو بونەوەو تاکو سەرهەلدانی سەلیبیەکان توانیان ئەو وولاتە بخەنە ژێر دەسەلاتی خۆیان و عەرەب و ئیسلام بەرەو هەردێر ببەن، ئەگەر سەرکردەی کوردی ئیسلام نەبوایە لە باشوری کوردستان رووی لە فەلەستین نەکردایە عەرەب توانای جەنگ کردنیان نەبوو کە سەلاحەدینی ئەیوبی توانی فەلەستین و میسرو شام رزگار بکات بە تایبەتی قودس بە پشتیوانی شۆرشگێرە کوردەکان هەر لەبەر ئەو هۆیەشە کە تاکو ئێستا کورد لە فەلەستین و ئوردن ماون و توانای باشیان هەیە لە هەموو بوارەکانی پەیوەندی و دەسەلات و رۆشنبیری و کۆمەلایەتی بگرە لە سەرەك وەزیران و پلەکانی تر ٠٠٠٠٠!٠٠٠ لە سالی ١٨٧٩" تیۆدۆر هرتزل" لە سالەکانی ١٨٦٠تاکو ١٩٠٤کە دانەرێکی نەمساوی و دانەری جولانەوەی رامیاری یەهودیە یەکەم کۆنگرەی یەهودی لە شاری بازل گرێدرا لە باکوری رۆژئاوای سویسرا لە سەر زێی راین، ئەویش بۆ پرو پاگەندە کردن و هیوای دامەزراندنی دەولەتێکی یەهودی بوو دوای ئەوە جولەکەکانی روسیا لە سالی ١٨٨٢ چەند کۆمەلگایەکی یەهودیان دامەزراند بۆ پشتگیری لێکردن بەتایبەتی لە دوای وتارەکەی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا "ارسدنلفۆر" لە ١٩١٧/١١/٢ ... لە١٩١٧/١٢/٩ بەریتانیا توانی هێزەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەو وولاتە دەر بکات و شاری قودسی داگیر کردو کۆمەلەی گەلان بریاری بە ئینتداب کردنی دا بەبەریتانیاو کۆچی یەهودیەکان دەستی پێکرد بەرەو ئیسرائیل لە هەموو جیهان و بەوە هۆی کۆچکردنی عەرەب لەو ناوچەیە بەرەو سوریا و لوبنان و وولاتانی تری عەرەب کە لەو کاتە عەرەب خاوەن دەلەت نەبون بەلکو تەنیا دەسەلاتی ئیماراتیان هەبوو لە هەمان کاتا سوریاو لوبنان و ئوردن و ئیسرائیل وولاتی شامیان پێ دەگوترا. لەو کاتە دژایەتی لە نێوان عەرەب و یەهود دەستی پێکرد ٠٠٠لە سالی ١٩٣٧بەریتانیا پێشنیاری دابەش کردنی فەلەستینی ئاشکرا کرد بۆ دامەزراندنی دوو وولاتی یەهودی و عەرەبی بەلام عەرەبەکان دژی ئەو کارە وەستان و داوای یەك دەلەتیان دەکرد کە یەهود تێیدا کەمایەتی بێت. بەریتانیا یارمەتی بریاری نەتەوە یەکگرتوەکانی نەدەکرد بۆ دابەش کردن و هێزەکانی خۆی لە ئیسرائیل کێشاوە لەگەل تەواو بوونی ماوەی ئینتیدابەکەی لە ١٩٤٨/٥/١٤ و یەهودیەکان ئەو ناوچانەیان خستە ژێر دەسەلاتی خۆیان بە پێی بریاری نەتەوە یەکگرتوەکان کە دیاری زەویەکانی کردبوو لەگەل رۆیشتنی هێزەکانی

بەریتانیا لە ١٩٤٨/٥/١٤ وئەنجومەنی نیشتمانی یەهودی سەربەخۆیی دەولەتی ئیسرائیلی ڕاگەیاند کە"حایم وایزمان"یەکەم سەرۆکی دەولەتی ئیسرائیل بوو "دیفد جۆربۆن " یەکەم سەرۆك وەیرانی بوو لە هەمان کات ئەمەریکا دانی بە دەولەتی ئیسرائیل نا بە دەولەتێکی ڕەسمی. لەوکاتە هێزەکانی سوپای سوریاو ولبنانو میسرو عەرەبی سعودی پەلاماری دەولەتی نوێی ئیسرائیلیان دا بەلام ئەو کارەیان هەرەسی هێنا، لە ١٩٤٩/٢/٧ دەولەتی نوێی ئیسرائیل هەڵسا بەفراوانکردنی سنوری جوگرافی دەسەلاتی... دوای ئەوە ئیسرائیل لە ١٩٤٩/٥/١١ بوە ئەندام لە نەتەوە یەککگرتوەکانو جێ پێگەی بەهێز بوو . لە ١٩٥٦/١٠/٢٩ خۆمالی کردنی کەناڵی سوێس لەلایەن میسر بۆ ئەوەی بتوانێ کار لەڕامیاریەتی ئیسرائیلو ولاتانی ڕۆژئاوا بکات، بەلام هێزەکانی ئەمەریکاو بەریتانیاو فەرنسا پەلاماری میسریان داو ئیسرائیلیش توانی بیابانی سینا داگیر بکاتو نیازەکانی میسر هەرەسی هێنا، لە ١٩٥٦/١١/٦شەڕ لەنێوان ئیسرائیلو ولاتانی عەرەب راوەستا بە یارمەتی نەتەوە یەککگرتوەکان. لە ١٩٦٧/٦/٥ ئیسرائیل هەلسا بەهێرش کردنە سەر ولاتەکانی میسرو سوریاو ئوردن بوە هۆی هەلاتنی هێزەکانی ولاتانی عەرەبی، لە ١٩٦٧/٦/١٠شەڕەکە ڕاوەستا. لە دوای کێشەو ململانێی توندو تیژو لەو کاتە جمال عبدالناسر لە مانگی/ ١٩٧٠/٩ کۆچی کردو ئەنوەر سادات جێگەی گرتەوە. دوبارە شەڕی نێوان عەرەبو ئیسرائیل هەلگیرساوە لە ١٩٧٣/١٠/٦ بەلام عەرەب لەو شەڕەش دۆڕاندیانو بەرەو پشتەوە کشانەوە لە دوای بارو دۆخێکی ناهەمواری نێوان ئیسرائیلو عەرەب بە تایبەتی عەرەب لە فەلەستین. ئەنوەر سادات لە ١٩٧٧/١١/٩ ڕێکەوتنی ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل مۆرکرد ئەمەش بوە هۆی گەڕاندنەوەی پەیوەندی دیبلۆماسیو سارد کردنەوەی بارو دۆخە نالەبارەکەو کردنەوەی سنوری نێوان ئیسرائیلو میسر، لە ١٩٧٩/٥/٢٩لەدوای مۆرکردنی ڕێکەوتنامەی نێوان ئیسرائیلو لوبنان لە ١٩٨٣/٧/١٧ئەویش بە کشانەوەی هێزەکانی ئیسرائیل لە لوبنانو لە دوای ئەوە ئیسرائیلو ئوردن ڕێکەوتنیان لە ١٩٩٤/٧/٢٥مۆرکرد و لە ١٩٩٥/٩/٢٨ ڕێکخراوی جولانەوەی فەلەستینو ئیسرائیل ڕێکەوتنی ئاشتیان مۆر کرد.

لە دوای هەرەس هێنانی دەسەلاتی بنیامین نەتەنیاهۆ ئەرێل شارۆن لەهەلبژاردنەکانی ٢٠٠٣ سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بۆ جاری دووەم و تاکو کۆتایی ٢٠٠٤ لەدەسەلات بەردەوامە بووە.

- ئیسرائیل ئەندامە لە نەتەوە یەککگرتووەکان.

# کێشوەری ئاسیا

# رۆمانیا

- ناوی رەسمی: کۆماری رۆمانیا.
- پایتەختی: بۆخارست، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۳۸۹ر۲ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: برازوف، گلوچ، نابوکا، تمیزورا.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: بریلا، کرنستنیا، چالانی.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۳٦٥ر۲٥ ملیۆن کەسە ، بەپێی ئاماری ۱۹۹۸.
- چڕی دانیشتوانی ۲۷۷ کەس لەیەک میل چوار گۆشە.
- رووبەری: ۷۰۰ر۹۱ میل چوار گۆشەو ۵۰۰ر۲۳۷ هەزار کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٤,۰٪.
- زمانەکانی: رومانی (زمانی رسمیە)، مەجەری، ئەڵمانی، رووسی.
- نژادەکانی: رۆمانی ۸۹٪ مەجەری ۸٪، رووسی ۳٪.
- ئاینیەکانی: ئۆرسۆزکسیەی رۆمانی ۷٥٪، کاسۆلیك ۸٪ پرۆتستنتیە ۷٪ لەگەڵ ئاینی تریش.
- زانینی خوێندن ونووسین: ۹۸٪ .
- دابەشی کارگێری: ٤۰ ناوچەیە لەگەڵ یەک شارەوانی.
- دراوی: لیو، یەکسانە بە سەد بانی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۵۰۰ر۱۱٤ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۵۰۰ر۵ دۆلار.
- بەرگری: ۵ر۲٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر ۲۲٥ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٤۲٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، دانەوێڵەی تر، گولە بەرۆژە، چەوەندەری شەکر، پەتاتە، تەرە، میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ۲۰۰ر۹ملیۆن سەر، بزن ۰۰۰ر٦۷٥ هەزار سەر ، پەرەور ۸۰۰ر٦۷ ملیۆن سەر، بەراز ۳۲۰ر۷ ملیۆن سەر، چێڵ و گامێش ۸۰۰ر۳ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: نەوت، غاز، خەلوز، ئاسن، دار، ولاتێکی گەشت وگوزرای بەرچاوە.
- پیشەسازی: مەنجەم، رێکخستنی دار، کەلوپەلی خانووبەرە، دروستکردنی ئاسن، ماشێن، بەرهەمی نەوت، کیمیاوی، ئامادەکردنی خۆراك، دروستکردنی دەراسەو پاسی گواستنەوە، تەرەکتۆر.
- بەرهەمی کارەبا: ۹۰۰ر۵۸ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: سوتەمەنی، کەلوپەلی بەکار هێنان، ماشێن، گەلێ پێویستی تر بۆ خزمەتی وولاتەکە.
- دەرچووەکانی: ئامێرو ماشێن، ئاسن، کیمیاوی، دار، کەلوپەلی ناو ماڵی هەمە جۆر، بەرهەمی رستن وچنین، کەلوپەلی خۆراك.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: روسیا، فەرنسا، ئەمەریکا، بەریتانیا، ئەڵمانیا، ئیتاڵیا، یابان.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی یەکێتی دیموکراتی کۆمەلایەتی، پارتی میساقی دیموکراتی رۆمانی، پارتی رۆمانیای دیموکراتی کۆمەلایەتی، پارتی دیموکراتی کۆمەلایەتی، پارتی یەکگرتنی نەتەوەی رۆمانیا، پارتی رۆمانیای گەورە، بەرەی دیموکراتی رزگارکردنی نیشتمانی، بەرەی پارتی مەسیحی دیموکراتی، پارتی کشتوکاڵی ... چەندین

پارت وگروپی تری رامیاریو نیشتمانی ودیموکراتی ونەتەوەی وزانستی تیایە.

- رژێمی دەسەڵات: رژێمێکی کۆماریەو فرە پارتیە، دوو ئەنجومەنی پیران و نوێنەرانی هەیە.
- جوگرافیای وڵات: رۆمانیا دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی ئەوروپا بە درێژای دەریای رەشو دەکەوێتە رۆژهەڵاتی. مۆلداڤیا دەکەوێتە رۆژهەڵاتی، لەباکوری ئۆکرانیا، یۆگسلافیاو مەجەر دەکەوێتە رۆژئاوای، بولگاریا دەکەوێتە باشوری.
- مێژووی وڵات: هەرێمی داشیا زۆربەری زۆری دەوڵەتی رۆمانیایە، ئەو هەرێمە سەر بە ئیمپراتۆریەتی رۆما بوە لە ماوەی ساڵی ١٠٠ زایینی تاکو ٢٧١ زایینی، لەنێوان سەدەی شەش وهەشت کەوتە ژێر پەلاماردانی بەربەرەکان، لەنێوان سەدەی شانزەم دوو ئیماراتی سەرەکی هەبوون لە رۆمانیا ئەویش مولدافیا وئەلیکیا بوون، ئەو دوو ئیماراتە لەگێژاوی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەسورانەوە. سەرەڕای ئەوەی کە سەربەخۆی خۆیان دەپاراست لە هەموو لایەنەکانیەوە، لەدوای شەری رووسیاو عوسمانی لە ساڵەکانی ١٨٢٨تا ١٨٢٩ بونە پارێزراوی رووسی، لەساڵی ١٨٧٨ سەربەخۆی راگەیاندو لەژێر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەرچوون.

لەساڵی ١٨٨١ لە دوای کۆنگرەی بەرلین بوە شانشین، لەساڵی ١٩١٤ شانشین فردیناند بوە خاوەنی کورسی شانشینی رۆمانیا، لە هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهان رۆمانیا بێ لایەنی خۆی راگەیاند، بەڵام بە هۆی بارودۆخی ناوچەو جیهان چوە پاڵ هاو پەیمانان. لە ساڵی ١٩١٦ جەنگی یەکەمی جیهانی راگەیاند دژێ هێزەکانی ناوەند.

بەپێی راوەستانی شەر لە ١٩١٨/١٠/١١ بوە خاوەنی زۆر لە خاکی روسیاو خستیە سەر خاکی رۆمانیا لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی نەمساو مەجەر، رۆمانیا بوەخاوەنی گەورەترین دەوڵەتی بەڵقان بە هۆی لکاندنی ناوچەکانی (بسئارابیاو هەرێمی ترانسلفانیا و هەرێمی بۆکۆڤینا)و ناوچەی باتانی مەجەریەکانی دابەش کرد لەنێوان خۆی و یۆگسلافیا.

لە ساڵی ١٩٣٨ دەستوری دیموکراتی هەڵوەشێنرایەوە کە لەساڵی ١٩٢٢ دەرچووبوو. لەساڵی ١٩٤٠ دووبارە ووڵات رێکخرایەوە بە پێی رژێمی فاشی وبوە پاسەوانی ئاسنینی فاشستی. لە ناوەراستی ١٩٤٠ روسیا ناوچەی بارایای داگیر کرد لەگەڵ باکووری بۆکڤینا، ساڵی ١٩٤١ رۆمانیا بەژداری کرد لەگەڵ ئەڵمانیا دژی یەکێتی سۆڤیەت و دووبارە بەساریای گێراوە باوەشی خۆی، لەساڵی ١٩٤٢ روسیا رۆمانیای داگیر کردو لە دوای ئەوە راوەستانی شەریان راگەیاند لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت.

لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٤٦ کۆمەنیستەکان دەسەڵاتیان بەدەست هێناو بوە هۆی دەست لەکار کێشانەوەی شانشین مایکل لەسەر کورسی شانشینی. رۆمانیا بوە کۆمارێکی میللیو لەساڵی ١٩٤٨ دووبارە دەستوری نوێی ووڵاتی دانا لەسەر شێوەی دەستورەکانی یەکێتیی سۆڤیەت وچوە ناو ئەنجومەنی (کۆمیکۆن) و دەستی کرد بەخۆماڵی کردنی زەوی و سامانو کەلوپەل خاوەندیەتی تایبەت وبەرەو دامەزراندنی رژێمی شۆشیالستی هەنگاوی نا لە رۆمانیا.

لە ساڵی ١٩٥٥ چوە رێزی پەیمانی وارشۆو بونی بە ئەندام لەنەتەوە یەککگرتوەکان ، لەساڵی ١٩٥٨ بوەیەکێك لەووڵاتە داگیر کراوەکان لەلایەن یەکێتی سۆڤیەت، لە ساڵی ١٩٦٥ نیکۆلای شاوشیسکۆ جێگەی جۆرجیۆدجی گرتەوەو بوە سکرتێری گشتی پارتی کۆمۆنیستی رۆمانیاو رامیاریەتی تایبەتی گرتە بەر لە بارەی دەرەوەو دوور لەرامیاریەتی دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت.

دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٧٥ بوە سەرۆك

کۆماری ڕۆمانیا.

لەساڵەکانی ١٩٨٥تا ١٩٨٦ بە هۆی دژواری باری ئابوری و بەرپابوونی ڕێپێوان وخۆپیشاندان دژی رامیاریەتی ئابووری ساوشیسکۆ بە توندی دژی خۆ پیشاندانی کرێکاران وەستا بەجۆرێکی درندانەو دژی بیرو رای ئازاد وەستا، لە ساڵی ١٩٨٩ لە ئەنجامی شۆرشێك لە ناو برا خۆی وخێزانەکەی برانە دادگا (لە شۆرشی کریسماس) لەئەنجامدا خۆی وخێزانەکەی لە سێدارە دران ودوای بووە شەری ناوخۆی نێوان لایەنگران ودژەکان. کە زیاترلە ٠٠٠ر١٠ هەزار کەس کوژرا.

لە ساڵی ١٩٩٠ لە هەڵبژاردنەکان (ئەلیسکۆ) سەرۆکی بەرەی رزگاری نیشتمانی بوە سەرۆك کۆمار ئەویش بوە هۆی گۆرینی پۆلیسی نهێنی بە بریکاری سیخوری ڕۆمانی وکنیسەی ئەرسۆزکسیەی ڕۆژهەلات گەرایەوە گۆرەپان، هەروەها یاسای تایبەت بە زەوی کشتوکاڵ دەرچوو. لە ساڵی ١٩٩٤ پەیمانی هاوکاری سەربازی لەگەڵ بولگاریا مۆرکرد وپارتە راسترەوەکان بەشداریان لە پێکهاتەی نیشتمان کرد کە ئەویش خەزنەی دراوی نیو دەوڵەتی ٧٠٠ ملیۆن دۆلاری بە قەرزدا ڕۆمانیا بۆ ماوەی ١٩ ساڵ.

لە ساڵی ١٩٩٦ (ئمیل کونستنیتنسکۆ) هەڵبژێردرا بەسەرۆك کۆمارو کۆمەنیستەکانی لە دەسەلات دورخستەوە.

لە ساڵی ١٩٩٧ شانشین(مایکل) لەدوای پەنجا ساڵ لە مەندەران گەرایەوە ڕۆمانیا، تاکو کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤ ئاڵوگۆڕی دەسەلات بەشێوەیەکی هێمانە بەرێوە دەچوو

- ڕۆمانیا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان.

# سلۆفاکیا

- ناوی رەسمی: کۆماری سلۆفاکیا
- پایتەختی: براتیسلافا، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ ر٧٥٠ هەزار کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: کۆشت.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: براتیسلافا، کۆمارنۆ.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٨٧٠ر٥ ملیۆن کەسە بەپێی ئاماری ١٩٩٨.
- ڕووبەری: ٩٣٢ر١٨ میل چوار گۆشە و ٠٣٥ر٤٩ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە
- چری دانیشتوانی: ٣١٠ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر٠٪ .
- نژادەکانی: سلوفاك ٧٨٪ مەجەریەکان ١٢٪ .
- زمانەکانی: زمانی سلوفاکی ( زمانی رەسمیە) زمانی مەجەری.
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی ٦٠٪ پرۆتستنت ٨٪ ئاینی جیا جیاو بێ ئاینی تیایە.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٨٪ .
- دابەشی کارگێری: چوار بەشە لە شێوەی پارێزگا.
- بەگری: ٢ر٢٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی:٠٠٠ر ٤٢ هەزار کەسە.
- دراوی: کورونای سلۆفاکی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر٤٦ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٧٥٠ر٨ دۆلارە.

● زەوی کشتوکاڵی: ٥ر٣١٪ لە خاکی وولاتەکە.
● بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، چەوەندەری شەکر، پەتاتە، میوەجات ، تەرە ، چەندین جۆری دانەوێڵەی ترو بەرهەمی کشتوکاڵی.
● سامانی ئاژەڵی: مەر ٠٠٠ر٥٠٠ هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر٣٨٠ هەزار سەر، بەراز ٠٠٠ر٨٥٠ر١ ملیۆن سەر، چێڵ ٠٠٠ر٨٥٠ هەزار سەر، پەرەور ٥٠٠ر١٤ ملیۆن سەر.
● سامانی سروشتی: ئاسن، نوحاس، خەلوز، داری دارستانەکان،
● بەرهەمی کارەبا: ٢٥ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.
● پیشەسازی: بەرهەمی کانزاکان، خۆراك، خواردنەوە، نەوت ، کیمیاوی، دروستکردنی پاپۆر، کەلوپەلی بینا سازی، ئامێری بەکار هێنان، بەرهەمی پێست.
● داهاتی دەرەوەی: ماشێن، کەلوپەلی گواستنەوە، سوتەمەنی، کیمیاوی، بەرهەمی کشتوکاڵی، پێداویستی سروشتی.
● دەرچووەکانی: سوتەمەنی، ماشێن وئامادەکراوەکانی، بەرهەمی کانزایی، بەرهەمی کشتوکاڵی، گۆشت.
● هاوبەشەکانی بازرگانی: وولاتانی سۆڤیەتی پێشوو، ئەڵمانیا، پۆلەندا، یەکێتی ئەوروپا، نەمسا، مەجەر، ئیتاڵیا، چین، سویسرا، ئەمەریکا، بەریتانیا، یابان.
● رژێمی دەسەلات: دیموکراتی پەلەمانیە، ئەنجومەنی نیشتمانی هەیە کە لە ١٥٠ کورسی پێك هاتووە، سەرۆك کۆمار بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێت.
● پارتە رامیاریەکان: یەکێتی سلوفاکیای دیموکراتی، پارتی جولانەوە لە پێناو چارەسەری سلوفاکیای دیموکراتی، پارتی چەپی ناوەندی، پارتی نیشتمانی میللی، جوڵانەوەی دیموکراتی مەسیحی، پارتی راست رەوی ناوەندی، پارتی سلۆفاکیای نیشتمانی نەتەوەی، پارتی چەپی دیموکراتی، پارتی سۆشیالیستی چارە سەری، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تێدایە .
● جوگرافیای ولات: سلۆڤاکیا دەکەوێتە ناوەندی رۆژهەلاتی ئەوروپا، لە باکوری پۆلەندا، لە باشووری مەجەر، لە رۆژئاوای نەمساو تیشك، لە رۆژهەلاتی ئۆکرانیا، دوو زێی گەورەی تیایە ئەویش زێی دانوب و هرونەوفا.
● مێژووی ولات: لە دوای سەدەی پێنجەم تیرەو هۆزەکانی سەلتی و ئەڵمانی و یونانی لە خاکی سلۆڤاکیا نیشتە جێبوون، دوای سەدەی نۆیەم یەکیان گرت لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی مۆرافیا کە لەلایەن ئەمیری سلاڤ (سڤاپا توبلك) دامەزرابوو لەرووی رامیاری هەروەها لە خاکی تیشکی لە رۆژ ئاوای سلۆڤاکیاو ئاینی مەسحیان کردە ئایینی رەسمی خۆیان، لە سەرەتای ساڵی ١٩١٧ ئەلمانیەکان و مەجەریەکان ئەو ئیمپراتۆرەیان داگیرکرد کە سلۆڤاکیا کەوتە ژێر دەسەلاتی مەجەریەکان و کاسۆلیکیان کردە رێبازی ئایینی خۆیان، بەلام دوای کەوتە ژێر دەسەلاتی خانەوادەی (هامبسبورگی) نەمسا، لە ساڵی ١٨٦٧ دوای دامەزراندنی شانشینی نەمسا - مەجەری دوولایەنە سلۆڤاکیا کەوتە ژێر دەسەلاتی مەجەر بەتەنیا، لە دوای هەرس هێنانی ئیمپراتۆریەتی نەمسا- مەجەر لەساڵی ١٩١٨، دوای جەنگی یەکەمی جیهان سلۆڤاکیا چوە ریز تیشك کە یەك دەوڵەتیان پێك هێنا بەناوی تشیکوسلوفاکیای سەربەخۆو تۆماس مازاریك بوە سەرۆکی ئەو وولاتە نوێیە لەساڵی ١٩٢٥.

لە ساڵی ١٩٢٩ ئەڵمانیا تیشکو سلوفاکیای داگیر کردو کردیە ژێر دەستەی خۆی، بەلام لە ساڵی ١٩٤٤ شۆرشێکی میللی هەڵگیرسا دژی ئەڵمانیا بەناوی شۆرشی سلۆڤاکیا، لەبەهاری ١٩٤٥ سوپای سوری سۆڤیەت توانی سلۆڤاکیا رزگار بکات لە ژێر دەسەلاتی ئەڵمانیا، سلۆڤاکیا

گەراوە بارودۆخی پێش جەنگی جیهانی دووەم.

لە ساڵی ١٩٤٨ حزبی شیوعی دەسەڵاتی تشیکوسلۆفاکیای وەرگرت و بە پێی بارودۆخی وڵاتانی سوشیالیستی هەڵسو کەوتی دەکرد بەڵام بەهۆی نا هەمواری بارودۆخی ناوەوەی وڵاتەکە لە بوارەکانی رامیاری وئابووری نەتەوەی جولانەوەیەکی چاکسازی رامیاری دروست بوو بۆ بەرهەڵستکاری دەسەڵاتی شیوعیەکان، لە٢٠/٨/١٩٦٨ هێزەکانی پەیمانی وارشۆ ئەو جولانەوەی لە ناو بردو پاشە کشەی لێکرد لە رێنمایەتی بەهاری براگ دەستی پێکرد، لە ساڵی ١٩٦٩ دەستوری فیدراڵی راگەیانرا ونیمچە دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی درا ناوچەکانی تر، لە دوای خۆپیشاندان ولێك ترازانی باری رامیاری لە ساڵی ١٩٨٩ چەندین پارتی رامیاری نوێ پێکهات و حزبی شیوعیی لە دەسەلات دوور خراوەو حکومەتێکی نوێ دامەزرا لەلایەن فاکلاف هافیل کەنووسەرو شانۆگەر بوو و کۆتای هێنا بەدەسەڵاتی حزبی شیوعی، لە دوای ئەوبارو دۆخە نوێیە نەتوانرا چارەسەری بنەرەتی کێشەی نەتەوەی بکرێت ئەویش بوە هۆی دروست بوونی کێشەو مل ملانێیەکی توندو ئەنجامەکەی بوە هۆی دروست بوونی دوو دەوڵەتی سەربەخۆی لێك جیا (کۆماری سلۆفاکیا لە ١/١/١٩٩٢ دامەزرا) و دروست بوونی کۆماری تیشك دوای ئەوە سلۆفاکیا هەوڵی زۆری دا بچێتە یەکێتی ئەوروپا، لەساڵی ٢٠٠٤ چووە رێزی یەکێتی ئەوروپا.

- سلۆفاکیا ئەندامە لە نەتەوەیەکگرتوەکان، ئەندامە لە یەکێتی ئەوروپا، ئەندامە لە چەندین رێکخراوی تری نێو دەوڵەتی.

# سلۆڤینیا

- ناوی رەسمی: کۆماری سلۆڤینیا
- پایتەختی: لیوبیلیا، ناژمارەی دانیشتوانی (٠٠٠ر٣٧٠) هەزار کەسە.
- شارو بەندەرە سەرەکیەکانی: ئیزولا، کوبر، کریبور.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ ر٣٥٠ر٢ ملیۆن کەس بەپێی ئاماری ١٩٩٨.
- رووبەری: ٨١٧ر٧ میل چوار گۆشەو ٢٥١ر٢٠ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چری دانیشتوانی: ٣٠١ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٤ر٠ ٪ .
- نژادەکانی: سلۆڤینی ٨٨٪، کروات ٥ر٢٪، سربەکان ٣ر٢٪ .
- زمانەکانی: سلۆڤینی (زمانی رەسمیە) زمانی سویسری و کروات.
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی رۆمانی ٩٦٪ .
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٩٪ .
- دابەشی کار گێری: ٦٠ وولایەتە .
- بەرگری: ٨ر١٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی .
- سوپاکەی: ٧٥٠ر١٠ هەزار کەسە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٨٠٠ر١٩ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ١٠٠ر١٠ دۆلارە.
- دراوی: دۆلار، یەکسانە بە ١٠٠ستوتین
- زەوی کشتوکاڵی: ٢ر١٠ ٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، پەتاتە،

چەوەندەری شەکر، تەرە ، میوەجات، گەلێ جۆری تر لەدانەوێڵە.

- سامانی ئاژەڵی : مەرو بزن بەرێژەیەکی کەمی تێدایە، چێڵ ۰۰۰ر۵٦۰ هەزار سەر، بەراز ۰۰۰ر٦۲ هەزار سەر، پەرەور ۰۰۰ر۷٦۰ر۸ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: جیوە، زەنگ، قورقوشم، خەلوز.
- پیشەسازی: کانزا، ئەلیکترۆنی، گالیسکەو کەلوپەلەکانی.
- بەرهەمی کارەبا: ۷۰۰ر۱۲ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: ماشێن وئامێر، کەلوپەلی گواستنەوە، کیمیاوی و کەلوپەلی دروستکراوی، سوتەمەنی، رۆن،کەلوپەلی خاو.
- دەرچوەکانی: ئامێرو ماشێن، کەلوپەلی گواستنەوە، کەلو پەلی دروستکراو، کیمیاوی، خۆراک، ئاژەڵی زیندوو.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەڵمانیا، فەرەنسا، کرواتیا، نەمسا، روسیا ، ئەمەریکا، وولاتانی یەکێتی ئەوروپا، چینی میللی.
- رژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی دیموکراتیە، دووئەنجومەنی هەیە یەکەمیان ئەنجومەنی ئومە کە لە ۹۰ کورسی پێک هاتوە، دووەم ئەنجومەنی دەوڵەت کە لە٤۰ کورسی پێک هاتووە، ئەنجومەنی جێبەجێکردنی هەیە.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی گەلی سلۆڤینی، پارتی سلۆڤینی دیموکراتی لیبرالی، پارتی سلۆڤینی نەتەوەی، پارتی دیموکراتی مەسیحی سلۆڤینی، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تێدایە.
- جوگرافیای وڵات: سلۆڤینیا دەکەوێتە باشووری رۆژهەلاتی ئەروپا وسنووری بەدرێژای رۆژئاوای دەریای ئەدریاتیکە. لە رۆژئاوای ئیتاڵیا، لە رۆژهەڵاتی مەجەر، لە باکوری نەمسا، لە باشووری رۆژهەڵاتو باشوری کرواتیا.
- مێژووی وڵات: سلۆڤینیا لە دوای ساڵی ۱۹٤۸ هەستی نەتەوایەتی بەهێز بوو دەستیان کرد بەتێکۆشان لەپێناو وەدی هێنانی ئامانجە نەتەویەکانی و یەکگرتووی رامیاری نیشتانی کە دابەش کرابوو لە زۆربەی ولایەتەکانی نەمساو دوای هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی نەمسا – مەجەر، لەدوای جەنگی یەکەمی جیهان سلۆڤینیا چوە پاڵ چیای رەش (جبل الاسود)و سربیاو کروات لە مانگی ۱۹۱۸/۱۲/ بوە دەوڵەتێکی نوێ بە ناوی شانشینی سرب و کروات وسلۆڤینی و خانەوادەی (کارا جوفینی) سربی دەسەڵاتی وەرگرت لە وڵاتەکە.

دوای ئەوە لە ساڵی ۱۹۲۹ ناوی گۆرا بوە یۆگسلافیا، لەجەنگی جیهانی دووەم لەلایەن ئەڵمانیا داگیر کراو سلۆڤینیا لە نێوان ئەڵمانیا وئیتاڵیاو مەجەر دابەشکرا، بەلام ماریشاڵ تیتۆ توانی ئەو وولاتانە هەموو بیەزێنێ و لەوڵات دەریان بکات وکۆمارێکی یۆگسلاڤیای یەکگرتووی سوشیالستی پێك بێنێ.

لە یەکەم هەڵبژاردنی پەرلەمانی فرە لایانە کە لە ساڵی ۱۹۹۰ ئەنجام درا بە یەکگرتوی ئۆپۆزسیۆنی سلۆڤینی و سەرکەوتنی بەدەست هێناو میلان کوشان کە شوعیەکی چاك سازی بوو بوە سەرۆك کۆماری سلۆڤینی وسەربەخۆی سلۆڤینیای راگەیاند بە رەزامەندی تەواوی گەلی سلۆڤینی لە ۱۹۹۱/٦/۲٥، سلۆڤینیا سەربەخۆی خۆی لەگەڵ یۆگسلافیا راگەیاند بە جیابوونەوەی بەلام سوپای یۆگسلافیا زۆرهەوڵی دا بەلام ئەنجامەکەی بوە سەرکەوتنی سلۆڤینیا. ئیستاش ئەم وولاتە هەوڵی خۆی خستە گەڕ بۆ چونە ناو رێکخراوە جیهانیەکان بە تایبەتی یەکیەتی ئەوروپا بە تایبەتی لە دوای ساڵەکانی ۲۰۰۳ . ۲۰۰٤ و هەوڵو کۆششیان بەردەوام لە بەهێز کردنی پەیوەندی نێو دەوڵەتی بە تایبەتی وولاتانی ئەوروپای رۆژئاوا.

- سلۆڤینیا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان.

# سویسرا

- ناوی ڕەسمی: یەکێتی کۆنفدرالی سویسرا.
- پایتەختی: بێرن، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر ٤٧٥ هەزار کەس، شاری لوزان پایتەختی دادگایەکانە.
- شارە سەرەکیەکانی: بازل، جنێف، لوزان، زیوریخ.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: بازل دەکەوێتە سەر زێی ڕاین کەشارێکی کەنارییە
- ژمارەی دانیشتوانی:٠٠٠ر ٨٧٠ر٧ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- ڕووبەری : ٩٤٢ر١٥ میل چوار گۆشەو ٢٩٠ر٤١ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە.
- چڕی دانیشتوانی: ٤٩٤ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- نژادەکانی: سویسری ٨٦٪ ، ئیتالی ٨٪ ، ئەڵمانی وئیسپانی وفەرەنسی ٥٪ .
- زمانەکانی: لەگەڵ زمانی سویسری زمانەکانی تریش هەموویان زمانی ڕەسمین.
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی ٥٠٪، پرۆتستنتیە ٤٥٪ .
- زانینی خوێندن ونووسین ٩٨٪ .
- دابەشی کارگێڕی: ٢٣ ناوچەیە کەهەر یەکەیان سەربەخۆی خۆی هەیەو ٣ ناوچە دابەش کراون بۆ شەش ناوچەی بچوك .
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٢٠٠ر١٧٣ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر٢٤ دۆلارە.
- دراوی: فرنکی سویسری یەکسانە بە ١٠٠ ڕاپن.
- بەرگری: ٥ر١٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپای: ٠٠٠ر٢٧ هەزار کەس.
- زەوی کشتوکاڵی: ٣ر١٠٪ لە خاکی وڵاتەکە
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، میوەجات ، تەرە، چەوەندەری شەکر، چەندین دانەوێڵەی جۆراو جۆری تری هەیە، سویسرا وڵاتێکی گەشت و گوزاریە.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٠٠٠ر٥٠٠ هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر٦٧٠ هەزار سەر، چێڵ ٠٠٠ر٥٨٠ر١ ملیۆن سەر، بەراز ٧٠٠ر١ ملیۆن سەر، پەرەور ٢٥٠ر٧ ملیۆن سەر.
- داهاتی سروشتی: داری دارستانەکان، خوێ، وزەی ئاوی.
- بەرهەمی کارەبا: ٥٠٠ ر٦٠ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.
- پیشەسازی:کەلوپەلی پێوان، کاتژمێر وکەلوپەلەکانی، کیمیاوی، داو دەرمان، دروستکردنی کەلوپەلی کارەبا، ڕستن وچنین، ئەلکترۆنی.
- داهاتی دەرەوەی: خۆراك، کیمیاوی، کەرستەی بیناسازی، ئامادەکراوی گواستنەوە.
- دەرچوەکانی: ئامێرو کەلوپەلی کارەبا، بەرهەمی ڕستن وچنین، بۆیە، داوی ڕستن وچنین، ئامادەکراوی ئاسن.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، ئەڵمانیا، ئەمەریکا،بەریتانیا، وڵاتانی یەکێتی ئەورووپا، چینی میللی.
- ڕژێمی دەسەڵات: دەوڵەتێکی یەکگرتووی فیدرالیە، ئەنجومەنی یاسادانان لە دوو ئەنجومەن پێکهاتووە، یەکەم ئەنجومەنی دەوڵەت کەلە ٤٦ ئەندام پێکهاتووە لەسەر بناغەی دوو ئەندام لە هەر ناوچەیەکا بێت.

دووەم ئەنجومەنی نەتەوەی لە ٢٠٠ ئەندام پێك هاتووە كە بۆ ماوەی چوار ساڵ هەڵدەبژێردرێت ئەنجومەنی جێبەجێكرن بەستراوەتەوە بە ئەنجومەنی فیدرالی كە پێكدێت لە ٧ كەس كە پەرلەمان دەست نیشانیان دەكات، پەرلەمان سەرۆك كۆمار هەڵدەبژێرێ.بۆ ماوەی یەك ساڵ وجێگرەكەی جێگەی دەگرێتەوە.

- پارتە رامیاریەكان: پارتی گەلی سویسری، پارتی چەپی ناوەندی، پارتی لیبرالی، راست رەوی ناوەند، پارتی دیموكراتی كۆمەڵایەتی، پارتی گەلی مەسیحی دیموكراتی، پارتی رادیكاڵی دیموكراتی، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تێدایە
- جوگرافیای وڵات: سویسرا دەكەوێتە ناوەندی ئەورووپا كە وولاتێكی ناوخۆیە لەبەر ئەوە چوار دەوری سنووورەكەی لەلایەن ئەڵمانیا وئیتاڵیا ونەمساو فەرەنساولیخشتین دەور دراوە، زۆربەی خاكی سویسرا پێكهاتەی گردۆلكەی چیایە.وولاتێكی گوزاریە كەش وهەواییەكی گونجاو لەباری هەیە.
- مێژووی وڵات: سویسرا لە دێر زەمانەوە پێی وتراوە (هلفیشیا) لە سەدەی ناوەندی یەكێتیەكی كانتوتات بوەو سەر بە ئیمپراتۆریەتی رۆمانی پیروزبوە، پێكهاتەكەی لە سێ هەرێم بوە ئەویش هەرێمی شفایز، هەرێمی ئوری ، هەرێمی ئینترۆلدن بوە، بەپێی پەیمانی ستفالیای ساڵی ١٦٤٨ سویسرا سەربەخۆی وەرگرت لە ئیمپراتۆریەتی رۆمانی، بەلام لە ساڵی ١٧٩٨ هێزی شۆرشگێری فەرەنسی داگیری كردو ناوی نا كۆماری هلفیە، ئەویش هەربە ناوبوو، بەلام دوای ناپلیون لە ساڵی ١٨٠٢ گرینگی پێدا وزیاتر لە ئۆتۆنومی دەسەلاتی پێ داو لە ساڵی ١٨١٤ دەسەلاتی فەرنسی لە سویسرا كۆتای هات، لە ساڵی ١٨٤٨ دەستوری نوێ برایاری لەسەر دراو دەسەلاتی زیاتر بۆ حكومەتی ناوەندی گەرایەوە، لەساڵی ١٨٧٤ دەستوری یەكێتی فیدرالی بریاری لەسەر دراو دەسەلاتی حكومەتی فیدرالی زیاتر بوە مەدەنی راپرسی وبوو بە بەندێك لە دەستورەكە.

لە ساڵی ١٩٢٠ شاری جنێف بوە بارەگای كۆمەڵەی گەلان و بەهۆی ئەوەی كە رامیاری بێ لایەنی گرتە بەر لە هەردوو جەنگی یەكەم ودووەمی جیهانیو تێكەلاوی كێشەو ململانێی جەنگ نەبوو، سویسرا لە ساڵی ١٥١٥ وە بوتە ناوەندی بانكەكانی جیهانو چاپكردنی دراوی زۆربەی زۆری وڵاتانی جیهان لەسویسرایە، سەرەرای ئەوە سویسرا جێگەی زۆربەی زۆری بارەگا گرنگەكانی جیهانە و لەگەڵ ئەوەشدا ئەندام نیە لەنەتەوە یەكگرتوەكان بەلام ئەندامە لە رێكخراوی هاوكاری ئابووری جیهان. بارەگای نەتەوەیەكگرتووەكان لەشاری جنێفە، لەساڵی ١٩٢٣ یەكێتی گومرگی لەگەڵ یەكختسنی پێك هێنا، لەساڵی ١٩٦٠ چوە ناو رابتەی بازرگانی ئەورووپی ئازاد (ئیفتا) گەلانی سویسرا لەراپرسییەك چونە ناو نەتەوە یەكگرتووەكان لەساڵی ١٩٨٦ رەتكردەوەو هەروەها ساڵی ١٩٩٢ دیسان لەراپرسی گەلانی سویسرا بەپێك هێنانی رابتەی بەهێزی یەكیەتی ئەورووپایان رەتكردەوە.

# فەرەنسا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری فەرەنسا.
- پایتەختی: پاریس، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ ر۸۷۵ر۲ ملیۆن کەسە بەڵام دانیشتوانی هەرێمی پاریس ۰۰۰ر۹۳۰ر۱۰ ملیۆن کەسە.
- شارە گرنگەکانی: تۆلوز، نیس، مرسیلیا، لیون، ستراسبورگ، ننت.
- بەندەرەکانی: مرسیلیا، لۆهافر، بۆردو، روان.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۵۹,۹۵۰ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ۲۰۰۲.
- ڕووبەری: ۳۸٤ر۲۱۲ میل چوار گۆشە ۵۰۰ر۵۵۱ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چڕی دانیشتوانی: ۲۸۲ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر۰ ٪ .
- نژادەکانی: سەلتی ولاتینی ۹۱٪، سلاڤ تیۆتونیون ، عەرەب، چینی، هیندی .
- زمانەکانی: فەرەنسی (زمانی ڕەسمیە) چەندین زاراوەی تری ناوخۆی تێدایە بەڵام بەرەو توانەوە دەروات.
- ئایینەکانی: مەسیحی کاسۆلیکی ڕۆمانی ۹۲٪ پرۆتستنت ٥ر۲٪ ئسلام ٥٪ .
- زانینی خوێندن ونووسین۹۹٪ .
- دابەشی کارگێری: ۲۳ هەرێمی کارگێریە کە ۹۹ بەش دەگرێتەخۆی.
- دراوی: فرەنگی فەرەنسی یەکسانە بە ۱۰۰ سنتیم.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۵۳۰ر۱ ملیۆن دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۰۰۰ر۲٤ دۆلارە.
- بەرگری: ٥ر۳٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر۳۸۵ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر۳۲٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، فاسولیا، میوەجات، تەرە، فەرەنسا گەورەترین وولاتە لە بەرهەمی خۆراك لە ئەورووپای ڕۆژ ئاوا.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ۳۸۰ر۱۰ملیۆن سەر، بزن ۱۵۰ر۱ ملیۆن سەر، چێل وگامێش ۳۰۰ر۲۰ ملیۆن سەر، بەراز۰۰٤ر۱۵ ملیۆن سەر، پەرەور ۲٤۰ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: ئاسن، خەلوز، بوکسیت، داری دارستانەکان .
- پیشەسازی: ڕەقی، کیمیاوی، ڕەستن وچنین، گوزار، خواردنەوە، (مەشروبات) بۆن ، فرۆکە، ماشێن، کەلوپەلی ئەلیکترۆنی، دروستکردنی پاپۆرو باخیرە، دروستکردنی پێلاو، داو دەرمان، گەلێ شتی تر.
- بەرهەمی کارەبا: ٤۷٥ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: ماشێن، نەوتی خاو، بەرهەمی کشتوکاڵی، ئاسن، بەرهەمی ڕەقی.
- دەرچووەکانی: جل وبەرگ، ڕستن وچنین، کیمیاوی، کەرستەی ئامادەکراوی گواستنەوە، خۆراك،
- هاوبەشەکانی بازرگانی: بەریتانیا، هۆڵەندا ، ئیسپانیا،یابان، چینی میللی، ئەمەریکا، ئیتالیا ، ئەڵمانیا، وولاتانی عەرەبی، ڕوسیا.
- ڕژێمی دەسەڵات: وولاتێکی کۆماریە سەرۆك کۆمار بۆ ماوەی حەوت ساڵ هەڵدەبژێردرێت بە پێشنیاری گشتی ڕاستەوخۆ، سەرۆك کۆمار سەرەك وەزیران دەستنیشان دەکات لە گەڵ وەزیرەکانی و بەر پرسیارە بەرامبەر بە

پەرلەمان، پەرلەمان لەدوو ئەنجومەن پێك دێت، کۆمەڵەی نیشتمانی وئەنجومەنی پیران، سەرۆك کۆمار بۆی هەیە کۆمەڵەی نیشتمانی هەڵوەشێنێتەوە.

- پارتە رامیاریەکان: یەکێتی لە پێناو دیموکراتی فەرەنسا، پارتی راست رەوی ناوەند، پارتی سوشیالستی، بزوتنەوەی رادیکالی چەپ رەو، حزبی شیوعی فرەنسی، بەرەی نیشتمانی، کۆمەڵ بوون لە پێناو کۆماری فەرەنسا، پارتی دیوگولی نوێ، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تێدایە .
- جوگرافیای وڵات: فەرەنسا دەکەوێتە رۆژئاوای ئەوروپا لە نێوان زەریای ئەتلەسی ودەریای سپی ناوەراست، لەباشووری ئەسپانیا، لە رۆژهەڵاتی ئیتاڵیا وسویسراو ئەڵمانیا، لە باکووری لوکسمبورگ وبەلجیکا. لەباکورو رۆژئاوای فەرەنسا دەشتایەکی پان و بەرین هەیە کە نیوەی زیاتر لەخاکی فەرەنسا دەگرێتە خۆی، لەنێو زێیەکان سێ زێی تیایە کەلەرۆژئاوا دێتەخوارێ ئەویش (زێی سپی کەلەکەنالی ئنجلیزی دەکاتەوە،زێی لوار لەزەریای ئەتلەس دەکاتەوە، زێی چارون لەکەنداوی بیسکار دەکاتەوە. بەڵام زێی (رون) کەلەچیای ئەلەب هەڵدەقوڵێ بەرەو باشور دەروات و لە دەریای سپی ناوەراست دەکاتەوە، لەرۆژهەڵات بەشێك لەچیای ئەلف کە چیای (مونت بلان).بەرزترین چیایە لەئەوروپای رۆژئاواو نزیك سنووری نێوان فەرەنسا وئیتالیا وسویسرا، زنجیرەیەك چیای جۆراو جۆری تیایە کەبەدارستانێکی چڕدا پۆشراوە، لەناوەراستی وڵاتی فەرەنسا گردۆلکەی چیایی تیایە کەبەگردۆلکەی سنترال بەناوباتگەو لە١٥ ٪ لەخاکی فەرەنسا دەگرێتەخۆی.

لەباشووری رۆژئاوای چیای برینز هەیە کە درێژ دەبێتەوە لەکەنداوی بیسکا لەرۆژئاواو بەرەو دەریای سپی ناوەراست لەرۆژهەڵات کەسنووری فەرەنسا لەگەڵ ئەڵمانیا لێك جیا دەکاتەوە بەدوری (١٨٥) کیلومەتر. لەباشوری رۆژهەڵات دەریای سپی ناوەراست لەشاری نیس دورگەی کورسیکا هەیە کەروبەری (٨٧٢١) کیلومەتر چوار گۆشەیەو ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٣٨٠ هەزار کەسەو پایەختی (ئەجیکۆیە) کە هەرێمێکی فەرەنسیەو دوویەشی کارگێری هەیە نوێنەریان لەپەرلەمانی فەرەنسی هەیە بەدوو ئەندام لەئەنجومەنی پیران و سێ ئەندام لەکۆمەڵەی نیشتمانی فەرەنسی.

- کەشو هەوای وڵاتی فەرەنسا بەپێی کەش و هەوای دەریای سپی ناوەراستە لەباشور کە زستان فێنك وباراناویەو هاوینی گەرم و وشکە لەرۆژهەڵات مام ناوەندیە.
- مێژووی وڵات: فەرەنسا ٦٠٠ ساڵ پێش زایین لە مێژوو تۆمار کراوە لەوکاتەی فینەقیەکان مەرسیلیایان دامەزراندودانیشتوانەکەی ناویان نا (سەلتیون) ئەوناوەش لەسەر هەموو هۆزو تیرەکانی ناوچەکەنرا. ئەوانەی کە لە ناوچەکانی زەریای ئەتلەسی وزێی راین وچیای ئەلەب ودەریای سپی ناوەراست دەژیان سەلتیەکان ناویان لە خاکەکە نا خاکی سەرکەوتوەکان. یۆلیۆس قەیسەر کە سەرکردەی رۆمان بوو لەساڵی ٥١ پێش زایینی کردیەوە تاکو هەڵوشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لە سەدەی پێنجەمی زایینی.

لە ساڵی ٤٩٦ زایینی کلۆمیسی یەکەم دامەزرێنەری بنەماڵەی میرۆفینجیان شانشینی دەسەڵاتی نواند لەسەر وڵاتەکەو ئاینی مەسیحی کردە ئایینی رەسمی، لە ساڵی ٧٤١ بیبین قەیسەری شانشین دەسەڵاتی وەرگرت بەڵام خاوەن باڵەخانەی شانشینی توانی دەستی لە کار بکێشێتەوە کە ئەمەش بوە هۆی ئەوەی کە ٢٥٠

ساڵ شانشین بێت لەسەر فەرنسا.

(بیبین) توانی ئیمپراتۆریەتی فەرنجە دابمەزرێنێتو بوە یەکەم دەوڵەت لەدوای هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی رۆما و دوای خۆی کورەکەی شارلمان دەسەڵاتی گرتە دەست تاکو ساڵی ٨١٤ کە بوە هۆی هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی فرنجەو دابەش بوونی ئەو ئیمپراتۆریەتە بۆ چەندین ناوچەی دەسەڵاتدار لە لایەن دەرەبەگو سەرۆك هۆزو تیرەکانو بونە خاوەن دەسەڵات وگوێیان بە دەسەلاتی ناوەندی فەرەنسی نەدەدا کە بوە گۆڕەپانی کێشەو ململانێ لەسەر بەرژەوەندی تایبەت تاکو ساڵی ٨٤٣ کە کۆتایی بە کێشەکە هات لە پەیمانی فیزدان کە ماف درابە تشالزی یەکەم لە بەشی رۆژئاوای ئیمپراتۆریەتەکە کە ئەمرۆ ناسراوە بە فەرەنسا.

ئەو هۆکارانە بونە هۆی لاواز بوونی دەسەڵاتی ناوەندی لەسەدەکانی نۆیەمو دەیەمو بوە هۆی ئەوەی کە دەرەبەگو یاریدەدەرەکانیان دان بە دەسەڵاتی ناوەند نەنێنو سەربەخۆی تەواویان هەبێت لەگەڵ ناوەند. لە ساڵی ١٣٣٧ جەنگی سەد ساڵە دەستی پێکرد، دوای چەندین گۆڕانکاری لەدەسەڵاتی شانشینی تاکو ساڵی ١٤٢٩ کچە فەرەنسی (جان دارك) توانی گەمارۆ لەسەر ئورلیانز هەڵگرێو بوە پاڵەوانی مێژووی فەرەنسا، لەساڵی ١٤٥٣ جەنگی سەد ساڵە کۆتایی هات بەدەرکردنی ئینگلیز لەفەرەنسا لەسەر دەستی شانشین تشالزی حەوتەم، دوای ئەوە شانشین لویسی یانزەم توانی لەساڵی ١٤٨٣ زەویەکانی هەرێمی برجندی لەرۆژهەڵاتی فەرەنساو هەرێمی بریتنی لەباکوری رۆژئاوای فەرەنسا بخاتەوە سەرخاکی فەرەنسا.

لەنێوان ساڵەکانی ١٥٦٣تا١٥٩٨ جەنگی ناوخۆ هەڵگیرسا لەنێوان دەربەگەکان لەژێر دروشمی ئایینی کاسۆلیکەکان دژی پرۆتستەنتیەکان جەنگان و بەردەوام بوو تاکو ساڵی ١٦٤٨ کەسەرەك وەزیران (ریشیلیۆوماوکارەکەی مازارین توانیان جەنگی سی ساڵە کۆتایی پێ بێنن بەلکاندنی زۆر لەناوچەکانی (ئەلزاس) لەخاکی لۆریەکانو فەرەنسا توانی دەسەڵات لەسەر ئەوروبا بچەسپێنێ لەدوای مۆرکردنی پەیمانی ستفالیا. لەو چابونەوە فەرەنسا دانی بەو دەوڵەتانە نا کەلەناو ئیمپراتۆریەتی رۆمانی بوون چونکە ئمپراتۆریەتی رۆمانی هەر بەناو ئیمپراتۆریەت بوو. ئەو جەنگە سی ساڵیە بوە هۆی کۆتایی هاتن بەجەنگی ئایینی لەئەوروپا.

لەجەنگی حەوت ساڵەی ١٧٥٦تا١٧٦٣ فەرەنسا زۆربەی زۆری ژێر دەستەکانی لەهندو کەنەدا لەدەستدا بۆ بەرژەوەندی بەریتانیا لەشۆڕشی فەرەنسی ١٧٨٩ یەك لەهەنگاوەکانی هەڵوەشانەوەی خاوەندیەتی تایبەتی دەرەبەگی بوو، راگەیاندنی یەکەم کۆماری فەرەنسی و دوای ئەوە جەنگی شۆڕشەکان دەستی پێ کردو ناپلیۆن لەساڵی ١٧٩٩ دەسەڵاتی گرتە دەست لەکودەتایەك وخۆی کردە ئیمپراتۆر، لە ساڵی ١٨٠٤ زۆر لەخاکی ئەوروپای داگیرکرد. لە١٨٧١/٣/١٨ راپەرینەکەی کۆمۆنەی پاریس ئەنجام درا کەبۆ ماوەی ٧٢ رۆژ دەسەڵاتی گرتە دەست وئەنجومەنی کۆمۆنە پێك هات لە ٦٤ ئەندام، لەساڵەکانی ١٨٧٠تا١٨٧١ جەنگی نێوان فەرەنساو روسیا هەڵگیرسا بە هەڵاتنی هێزەکانی فەرەنسا ئەمەش بەهۆی بەرهەڵستکاری ناپلیۆنی سێیەمو بوەهۆی لەدەست دانی فەرەنسا لەهەرێمەکانی (ئەلزاسو للورین)و بوە هۆی هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەتی دووەمو دامەزراندنی سێیەم کۆماری فەرەنسی، لەسەدەی نۆزدەم فەرەنسا ناوچەکانی هیندی چینیو زۆر لەخاکی ئەفەریقیای باشوورو زەریای هادی داگیرکرد.

فەڕەنسا لەمێژووی رابردووی تووشی سەدان کێشەو گیروگرفت بوە بەهۆی چاوتێبڕینی لەخاکی وڵاتان‌و کێشەی بەرژەوەندی تایبەتی ناو خۆی لەنێوان دەرەبەگ‌و سەرمایەدارەکان، دوای ئەو هەموو کێشەیە بلێسەی تەقینەوەی شەڕی یەکەمی جیهانی بەرەو رووی وڵاتانی ئەوروپا هەنگاوی دەنا لەو کاتەی هاووڵاتیەکی سربی جێگری شانیشنی نەمساى تیرۆرکرد لە١٩١٤/٦/٢٨ لەسرایڤۆری پایتەختیی بۆسنەو هرسك. کەبوە هۆی هەرەس هێنانی دیلۆماسیەتی ئەوروپی بۆ گەمارۆدان‌و بەرپا نەبونی جەنگ‌و بوە هۆی خۆ ئامادەکردنی وڵاتانی ئەلمانیاو روسیاو فەڕەنسا ونەمساو بەریتایناو چەندین وڵاتی تر بۆ جەنگ و کۆتایی هێنان بەئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌و دابەش کردنی پاشماوەی کەلەپەل‌و دابەشکردنی جیهان لەنەخشەیەکی نوێی جیهان. فەڕەنسا لەجەنگی یەکەمی جیهان بەسەرکەوتوویی دەرچوو بەڵام لەدوای وێران بوون لەبوارەکانی مرۆڤایەتی‌و رامیاری‌و ئابووری کە ٧٣ ٪ لەسوپا کەی‌و گەلی فەڕەنسا کوژران‌و ٠٠ ٤ر٨ ملیۆن بریندار بوون‌و ٢٠٠ر١ ملیۆن کەس کوژران، کێشەو ململانێی فەڕەنسا لەگەڵ ئەڵمانیا وچەندین وڵاتی تر بەردەوام بوو تاکو جەنگی دووەمی جیهان کەلەساڵی ١٩٤٠ ئەڵمانیا باکوری فەڕنسای داگیرکردوو بوە هۆی دەست لەکارکێشانەوەی حکومەتی فەڕەنسا، دوای ئەوە مارشال بیتان حکومەتێکی پێك هێنا لەشاری ڤیشی لەناوەندی فەڕەنسا، دوای ئەوە ئەلمانیا لە ساڵی ١٩٤٢ فەڕەنسای بەتەواوی داگیرکرد تاکو رزگارکردنی فەڕەنسا لەمانگی /١٩٤٤/٨ لەلایەن هاوپەیمانان‌و شۆڕشگێرانی فەڕەنسی. لە١٩٤٤/٥/١٥ دیگۆل حکومەتی کاتی راگەیاندو لەلایەن بەریتانیا ئەمەریکاو یەکیەتی سوڤیەت دانی پی‌دانرا. لەساڵی ١٩٤٤ پەیمانی لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەت مۆرکرد ، لەمانگی/٦/ ١٩٤٥ بەڵگە نامەی نەتەوە یەککگراووەکانی مۆرکرد. دوای کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهان فەڕەنسا پەیمانی لەگەڵ وڵاتانی هاوپەیمانان مۆرکردو بەشداری دامەزراندنی پەیمانی باکووری ئەتڵەسی مۆرکرد لە٤/٤/١٩٤٩ کەناسراوە بەناوی ناتۆ.

لەساڵی ١٩٥٤ هێزەکانی فەڕەنسا لەهیندی چینی کشانەوە بەهۆی بەزینی سوپای فەڕەنسا بەرامبەر شۆڕشگێرە کۆمۆنیستەکان لە (دیانبیان فو) لەباکوری ڤێتنام، لەدوای چەندین ساڵ بەداگیرکردنی جەزائیر وهەشت ساڵ شەر لەنێوان گەلی جەزائیرو فەڕەنسا کۆتایی هات لەمانگی /١٩٦٢/٣ بەدان نان بەسەر بەخۆی جەزائیر لە ١٩٦٢/٧/٥.

فەڕەنسا رۆڵی گرنگی دیوە لەهەموو لایەنە جۆراو جۆرەکانی رامیاریەتی نێو دەوڵەتی تاکو ئێستاش کەدژی ئەمەریکاو بەریتانیا وەستا بەرامبەر جەنگ بۆ سەر عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣ بەهاوکاری ئەڵمانیاو روسیا کە چاك شیراك سەرکردایەتی فەرەنسا دەکات. فەرەنسا وڵاتێکی عەلمانی بەهێزەو دەسگیرە بە دەستورو رێنماییەکانی بەرەو پێش بردنی وڵاتەکەیان‌و ماوە نەدان بەسەرپێچی کردن لەسەر یاساو لەگەل ئەوەشدا لە ساڵی ٢٠٠٣ یاسای قەدەغە کردنی پۆشینی دەرکردو لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٤ جێبەجێ کرا لەسەر هەموو ئاینە جۆراو جۆرەکان سەرەڕای نارەزایی ئاینی بەتایبەتی زانایانی ئاینی ئیسلام بەلام کارەکە سەری گرت‌و بەردەوامە.

- فەڕەنسا ئەندامی هەمیشەیی نەتەوەیەککگرتووەکانە، ئەندامە لە پەیمانی ناتۆ، ئەندامە لەبازرگانی نیودەوڵەتی، ئەندامە لەیەکیەتی ئەوروپا، ئەندامە لە چەندین رێکخراوی تری جیهان‌و ئەندامی دامەزرێنەر بووە.

# فـــنلەنـــدا

- ناوی رەسمی: کۆماری فنلەندا.
- پایتـەختی: هلـسنکی، ژمـارەی دانیـشتوانی ۰۰۰ر ۱٦٧ر۱ ملیۆن کەسە.
- شارە گرنگەکانی: فنتا، ئاسبۆ، تمبیری.
- بەندەرکانی: سۆرکۆ، ئۆلۆ.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ۰۰۰ر٦٥٠ ر٥ ملیـۆن کەسە، بەپێی ئاماری ۱۹۹۸.
- رووبـەری: ٥٥٢ ر۱۳۰ میـل چـوار گۆشـەو ٤۳٠ر ۳۸۱ر۲ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چڕی دانیشتوانی: ٤۳ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥٪.
- نـژادەکانی: فنلەندیـەکان ٩٥٪، سـویدی ولایەنی تریش هەن.
- زمانـەکانی: فنلەنـدی وسـویدی (زمـانی رەسمین).
- ئاییەنەکانی: لۆسەری ٩٠٪، ئۆرسۆزکسی.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٩٪.
- دابەشی کارگێری: ٦ ناوچەی پارێزگاییە.
- دراوی: مەرکا.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۱۰۳ ملیار دۆلارە.
- بەشـی تـاك لـەکۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ۲۰۰ر۲۰ دۆلارە.
- بەرگری: ٥ر۱٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر۳۰ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ۸٫۳٪ لە خاکی وولاتەکە
- بەرهـەمی کـشتوکاڵی: گـەنم وجـۆ، پەتاتـە، میوەجات، تـەرە، چەوەندەری شـەکر، چەندین جۆری دانەوێڵەی تر ، دار ، بەرهەمی شیر،
- سـامانی ئـاژەڵی: مـەروبزن ۰۰۰ر۱۱۰ هـەزار سـەر، چێڵ ۱٫۲۰۰ ملیـۆن سـەر، بـەراز ۱٫٥۰۰ ملیۆن سەر، پەرەور ٥٫۲٥۰ ملیۆن سەر.
- سـامانی مەنجـەمی: ئاسـن، زیـوو، زەنـگ، نوحاس،
- پیـــشەسازی: دروســـتکردنی کەشـــتی، دروسـتکردنی دارو ئامـادەکردنی، کیمیـاوی، دروستکردنی پێلاو، خۆشکردنی پێست، رستن وچنین، بەرهەمی کانزایی.
- بەرهەمی کارەبا: ٦۲ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: نەوت وبەرهەمەکانی، دەزوو، پێویـستیەکانی خـۆراك، ئالیـك، ئاسـن ورەقـی، کەلوپەلی گواستنەوە، ماشێن، کیمیاوی.
- دەرچووەکانی: کەشـتی، ماشـێن، جـل وبـەرگ، پێلاو، کیمیاوی، پەر، داری دارستانەکان، داو دەرمان، گۆشت، پێست، چەندین کەلوپەلی تر.
- هاوبەشـەکانی بازرگـانی: فەرەنـسا، روسـیا ، ئەڵمانیا، سوید، ئەمەریکا، بەریتانیا، نەرویج، دانیمارك، هۆڵەندا، لەگەڵ چەندین وولاتی تری عەرەبی و ئەفریقی.
- رژێمـــی دەســـەلات: فنلەنـــدە کۆمـــارێکی دیموکراتیـە، سـەرۆك کۆمـار بـۆ مـاوەی شـەش ساڵ هەڵدەبـژێردرێت لـە رێگـەی پێـشنیاری گـشتی، سـەرۆك کۆمـار ئەنجومـەنی وەزیـران دەست نیشان دەکات، یەك پەرلەمانی هەیە کە لـە ۲۰۰ ئەندام پێـك هـاتوە و بـۆ مـاوەی چـوار ساڵ هەڵدەبژێردرێن بە رژێمی رێژەیی.
- پارتـــە رامیاریـــەکان: پـــارتی رێکـــەوتنی نیـشتمانی، پـارتی دیمـوکراتی کۆمەلایـەتی فنلەندی، پارتی ناوەندی فنلەندی، پارتی گەلی سویدی، پـارتی گونـدی فنلەنـدی، هاوپـەیمان لابالی چەپ رەوان، چەندین گروپ وپارتی تـری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تێدایە

- جوگرافیای وڵات: فنلەندا دەکەوێتە باکووری ئەوروپا کە لابالی دەریایی بەلتیق لە خۆ دەگرێ لەرۆژئاواو باشووری رۆژئاوا، لە رۆژهەلاتی روسیایە، لە باکوری نەرویجە، لە رۆژئاوای سویدە. کەش و هەوایەکی مام ناوەندی هەیە بەهۆی کارتێکردنی کەش و هەوای دەریای بەلتیق زۆربەی زۆری بەفروبارانە، لەهاوین رۆژئاوا نابێت لەماوەی ٧٢ رۆژ بەبێ پچڕان.
- مێژووی وڵات: دانیشتوانی ناوچەی ڤۆلگەی روسییە کە لە نەتەوەی فنلەندی بوینەو لە سەدەی حەفتەمی زایینی رویان کردۆتە فنلەنداو بوینە نیشتەجێی ناوچەکەو دەستیان بەسەر داگرت و لە ژێر دەستی خاوەنە رەسەنەکانیان دەرهێنا کە (لابیونیان) پێ دەگوترا، لە سەدەکانی شانزەهەم وحەڤدەهەم قەزایەك بوە لە سوید کە نیمچە مافی ئۆتونومیان هەبوە، ناوی فنلەندە لە ساڵی ١٦٢٤ بە تەواوی تێکەڵاوی شانشینی سوید بوو، بەڵام لە جەنگی نێوان سویدوو روسیا لە ساڵی ١٧٠٠ تاکو ١٧٢١ بوە هۆی مردنی نیوەی دانیشتوانی فنلەندە بەهۆی برسیەتی ونەخۆشی ئەو جۆرە جەنگانە کە سێ جار رویان دا لە نێوان ساڵەکانی ١٧٤١ تاکو ١٧٩٠ کە ئەوجەنگانە لەسەر خاکی فنلەندە بوە، لەساڵی ١٨٠٨ روسیا سویدی داگیر کرد بەهاوکاری ناپلیۆن، تا ئەوکاتەی سویدەستی لە فنلەندە کێشاوەو بوە ناوچەیەکی سەر بەرووسیا، لە دوای سەکەوتنی شۆرشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ی بەلشەڤی رووسیاو بەهۆی ئێش وئازاردانیان لەلایەن رووسیا لە ١٩١٧/٧/٢٠ سەربەخۆی خۆیان راگەیاندو کارلوستالیرج بوە سەرۆك کۆمار کە یەکەم سەرۆك کۆمار بوو، شەری زستانی ١٩٢٩ هەڵگیرسا لەنێوان روسیاو فنلەندا بەهۆی رازی نەبوونی حکومەتی فنلەندا بەدامەزراند بنکەی سەربازی روسیا لە فنلەندا، رووسیا لە ٢٠/ ١١/ ١٩٢٩ پەلاماری فنلەندای دا بەڵام بە پێی پەیمانی مۆسکۆ رووسیا وازی لە فنلەندا هێنا بەرامبەر ١٤٤٠، ٤کیلۆمەتر چوار گۆشە لەخاکەکەی بۆ رووسیا.

فنلەندا لەساڵی ١٩٤١ چوە پاڵ ئەڵمانیا، بەهۆی جەنگی دووەمی جیهان و هەرەس هێنانی ئەڵمانیای نازی بەپێی پەیمانی ئاشتی نێوانیان ١٢٪ لە خاکی فنلەندا بوە خاکی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، لەساڵی ١٩٥٥ فنلەندە لەنەتەوە یەککگرتووەکان بوە ئەندام، لە ساڵی ١٩٩٥ فنلەندا بوە ئەندام لە یەکێتی ئەوروپا، پارتی دیموکراتی کۆمەڵایەتی لە هەڵبژاردنەکان سەرکەوت وبەردەوامە لە دەسەڵات تاکو دوای ساڵی ٢٠٠٤ بە هۆی سەرکەوتنیان لە هەڵبژاردنەکان.

- فنلەندا ئەندامە لە نەتەوە یەککگرتوەکان، ئەندامە لە یەکێتی ئەوروپا، ئەندامە لەرێکخراوی هاوکاری ئابووری وبوژانەوە.

# قوبرس- باشووری یۆنان

- ناوی رەسمی: کۆماری قوبرس
- پایتەختی: نیقۆسیا، ژمارەی دانیشتوانی (٠٠٠ر٢٢٠ هەزار کەسە).ئەمەش دابەش کراون لەنێوان قبرس ویۆنانیەکان کە پێیان دەگوترێت لفکوسا، قوبرسیە تورکەکان پێیان دەگوترێت لفکوشا.
- بەندەر سەرەکیەکانی: لیماسول، لارناکا کە یۆنانیی تەواوە کیرینیا، فاماو جۆستا تورکین.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٨٥٠هەزار کەسە لەو ژمارەیە ٠٠٠ر١٥٤ هەزاری کەسی تورکن.
- رووبەری: ٥٧١ر٣ میل چوار گۆشەو٢٥٠ر٩٢ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە بەلام تورکەکان ٣٣٥ر٣ کیلۆمەتر چوار گۆشەیان داگیر کردووە.
- چڕی دانیشتوانی: ٢٢٨ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- نژادەکانی: ٨٥٪ یۆنانی، ١٥٪ تورکن.
- زمانەکانی: یۆنانی، تورکی.
- ئاینەکانی: مەسیحی ئۆرسۆزکسیە، ئسلام.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٧٪.
- دابەشی کارگێری: ٦ بەشە لەشێوەی قەزا.
- دراوی: جونەی قوبرسی یەکسانە بە١٠٠٠میل.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٩,٨٥٠ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر١٥ دۆلاری ئەمەریکی، ئەمە تورکەکان ناگرێتەوە.
- بەرگری:٥ر٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر١٠ هەزار کەسە، بێجگە لە تورکەکان.
- زەوی کشتوکالی: ٣ر١٢٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکالی: گەنم وجۆ، تەرە، میوەجات، پەتاتە، زیتون، سورایی.
- سامانی ئاژەلی: مەر ٠٠٠ر٢٨٥ هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر٢٦٠ هەزار سەر، بەراز ٠٠٠ر٤١٨ هەزار سەر، چێل ٠٠٠ر٢٥٠ هەزار سەر، پەرەور ٦٠٠ر٣ ملیۆن سەر .
- پیشەسازی: ئامادەکردنی خۆراك، خواردنەوە (مەشروبات)، رستن وچنین، داوو دەرمان.
- بەرهەمی کارەبا: ٢,٨٠٠ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: کەلەو پەلی بەکار هێنان، نەوت، رۆن، گریز، دانەوێڵە، ماشێن.
- دەرچوەکانی: سورایی، پەتاتە، خوارنەوە، چیمەنتۆ، جل وبەرگ، پێلاو.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: لوبنان، ئەلمانیا، ئیتالیا، یابان، بەریتانیا، وولاتانی یەکێتی ئەورووپا.
- رژێمی دەسەلات: وولاتێکی کۆماریە، دوو ئەنجومەنی هەیە، یەکەمیان ئەنجومەنی نوێنەرانە کە لە٨٠ ئەندام پێك هاتوە، سەرۆك کۆمار بۆ ماوەی پێنج سال هەلدەبژێردرێت. ئەویش سەرۆك وەزیران دەستنیشان دەکات، ئەنجومەنی نوێنەران کە لە٨٠ ئەندام پێکهاتوە لەوانە ٥٦ ئەندام یونانی قوبرسی و ٢٤ ئەندامیش تورکی قوبرسین ئەمەش لەسالی ١٩٦٣ ئەوکورسیانە بەچۆلی ماوەتەوە بەهۆی داگیرکردنی قوبرسی باکور لەلایەن دەسەلاتی تورکیا، ئەنجومەنی یاسادانان بەو ٥٦ ئەندامەو کەمە نەتەوایەتیەکان لەهەلبژاردن نوێنەری خۆیان دەستنیشان دەکەن وەك مارۆنو ئەرمەنو لاتینی بەشێوەی چاودێری.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی دیموکراتی، پارتی پێشکەوتنی چینی کرێکاران، پارتی

سۆشیالیستی، کۆمەڵەی دیموکراتی، ناوەندی یەکێتی پارتی سوشیالیستی، پارتی دیموکراتی نیشتمانی، ئەمە لە قوبرسی یۆنانە، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تێدایە، بەڵام پارتی ناوچەی تورکەکان، پارتی یەکێتی نیشتمانی، پارتی رزگاری، پارتی تورکی کۆماری، پارتی بەریتانی نوێ.

- جوگرافیای وڵات: دورگەکە دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاستو سێیەم دورگەیە لەدوای دورگەکانی سقلیەو سردینیا، دورە لەکەناری باشوری تورکیا بە٤٠ میل، لەرۆژهەڵاتی کەناری سوریایە. لە باکوری تورکیایە، لە رۆژهەڵات لوبنان وسوریا، دوو زنجیرە چیای هەیە، کە درێژ دەبنەوە لە رۆژهەڵاتی تاکو رۆژئاوای یەکیان لە باکور ئەویتریان لەرۆژئاوا، دەشتایەکی پانو بە پیتی لە نێوان دا هەیە.
- مێژووی وڵات: لە ماوەی سەدەکانی چواردە تاکو سەدەی یانزەی پێش زایین لە لایەن ئەخیون ومیسینیون ژێر دەستە کرابوو کە لە یۆنان هاتبونو لە سەدەی نۆیەمی پێش زایینی فینەقیەکان نیشتە جێ بوون، لە سەدەی حەوتی پێش زایین کەوتە ژێر چاودێری ئاشووریەکان، لەماوەی ساڵەکانی ٤١٤ تا ٣٧٤ پێش زایینی قوبرس بوە وڵاتێکی یەککرتوی رۆشەنبیری ئەغریقیو بوە پرۆگرامی پەروەردەیان ، دوای بوە پارچەیەك لە دەوڵەتی یۆنانی هللینیە، لە نێوان ساڵەکانی ٢٩٤ تا ٥٨ پێش زاین بوە پارچەیەك لە ئیمپراتۆریەتی بتلمیە کە میسریەکان سەرکردایەتیان دەکرد، لە ساڵی ٥٨ پێش زاین ئیمپرتۆریەتی رۆمانی خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆی. لەساڵی ٤٥ زایینی ئایینی مەسیحی گەیشتە ناوچەیکە، لەدوای دابەش بوونی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لەساڵی ٢٩٥ قوبرس کەوتە ژێر دەسەڵات بیزنتی وبوە شەری نێوان عەرەبە ئیسلامە کۆچپەرەکانو بیزەنتیەکان لەسەدەی حەوتەم تاکو سەدەی دەیەم لەپێناو داگیرکردنو مانەوەی قوبری لەژێر دەستیان.

لە ساڵی ١١٩١ شانشینی بەریتانیا قوبرسی داگیر کرد، لە ساڵی ١٤٩٨ ئیتاڵیا دەسەڵاتی خستە سەر قوبرس، لە ساڵی ١٥٧١ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی داگیری کردو هەر ئەوە بوو تورکی هێنا لە ناوچەکە نیشتەجێی کردن وتاکو ئێستا گیرو گرفتی ئەو زۆر داریە ماوەتەوەو ناوچەکەی نا ئارام کردوە، لەساڵی ١٩١٤ بەریتانیا خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆی لە دوای ئەوە تورکیا بەژداری جەنگی جیهانی یەکەمی کرد لە١٦/٨/ ١٩٦٠ قوبرس بوە وڵاتێکی سەربەخۆ و ئەسقف مەکاریوس بوە سەرۆکی کۆمار، لە ساڵی ١٩٧٥ قوبرسی باکووری ژێر دەسەڵاتی تورکەکان دەوڵەتی قوبرسی تورکیا رایگەیاند بە پشتیوانی هێزی سەربازی تورکیان، لە ساڵی ١٩٨٣ تورکەکان کۆماری قوبرسی تورکیان راگەیاندو هیچ دەوڵەتێکیش تاکو ئێستا دانی بەو دەوڵەتە نەهێناوە تەنیا تورکیا نەبێت.

کێشەی نێوان قوبرسی باکوری تورك لەگەڵ قوبرسی باشووری یۆنان بەردەوامە تاکو ئێستاش چارەسەر نەکراوە بەهۆی هەڵوێستی شۆفینی تورکەکان و دەوڵەتی تورك، سەرەڕای ئەوەی کەسکرتێری گشتی نەتەوە یەککرووەکان لەساڵی ٢٠٠٣ پێشنیاری ئاراستەی هەردوو لا کرد بەتایبەتی تورکیا بۆ چارەسەری کێشەکە بەڵام هەروەك خۆی ماوەتەوە بەهۆی بەرژەوەندی دەسەڵاتی تورکیا.

- قوبرس ئەندامە لە نەتەوە یەککرتوەکان، ئەندامە لە کۆمەنوڵسی بەریتانیا، ئەندامە لە رێکخراوی ئاسایش وهاوکاری ئەورووپی.

# كـــرواتيـــا

● ناوی ڕەسمی: کۆماری کرواتیا.

● پایتـــــەختی: زگـــــرب، ژمـــــارەی دانیشتوانی۰۰ر۰٤٥ر۱ ملیۆن کەسە.

● شـاروبەندەرە سـەرەکیەکانی: ڕیجیکـا، زادار، سیبنیك.

● ژمـارەی دانیـشتوانی: ۰۰۰ر۸۷٥ر٤ ملیـۆن کەسە، بەپێی ئاماری ۲۰۰۰.

● ڕووبەری: ۸۲٤ر۲۱ میل چوار گۆشەو ٥۳۸ر٥٦ کیلومەتر چوار گۆشەیە.

● چڕی دانیـشتوانی: ۲۳۳ کـەس لـە میل یـەك چوار گۆشەدا.

● نژادەکانی: کروات ۷۸٪، سرب ۱۲٪.

● زمانەکانی: کرواتی وسربی (زمانی ڕەسمین).

● ئایینـەکانی: کرواتـی کاسـۆلیکی ۷۹٪، سـربی ئۆرزکس ۱۰٪.

● زانینی خوێندن ونووسین: ۹۸٪ .

● دابەشی کارگێڕی: ۲۱ ناوچەی کارگێڕیە.

● دراوی: کونا.

● کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ۵۰۰ر۲۲ ملیـار دۆلارە.

● بەشـی تـاك لـە کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ٥٥۰ر٤ دۆلارە.

● بەرگری: ٥,٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.

● سوپاکەی: ۰۰۰ر٥٥ هەزار کەسە.

● زەوی کشتوکاڵی: ۳۱,۳٪ لە خاکی وولاتەکە.

● بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، زیتون، گەنمـە شـامی، تـەرە، میوەجات، چەوەندەری شـەکر، پەتاتە.

● سـامانی ئـاژەڵی: مـەر ۰۰۰ر٤٥۰ هـەزار سـەر، بزن ۰۰۰ر٤٤٥ هەزار سەر، بەراز ۲۰۰ر۱ ملیۆن سەر، پەلەوەر ۵۰۰ر۱۰ ملیۆن سەر.

● سـامانی سروشـتی: نـەوت ، ئاسـن، بۆکسـیت، خەلوز، شـاری ئادریانیك ناوچەیەکی گوزاری بەمێژەو نـاو بـانگی لـە هـەمووجیهان دەرکـردوە لەهەموو لایەك رووی تێدەکەن.

● پیشەسازی: ئەلەمنیۆم، ڕەقی، پەڕ، کیمیـاوی، نایلۆن، ماشێن، دروستکردنی شەکر.

● بەرهـەمی کارەبـا: ۵۰۰ر۱۰ ملیـار کیلـۆ وات کاتژمێر.

● داهـــاتی دەرەوەی: دانەوێلـــە، ســـوتەمەنی، ماشـێن، پێداویـستیەکانی خـۆراك، چـەندین پێداویستی تری وولاتەکە بە پێی پێویست.

● هاوبەشـەکانی بازرگـانی: ئـەڵمانیا، سـلۆڤینیا، ئیتاڵیـا، هەنـدێك لـە وولاتـانی یـەکیتی ئـەوروپا، چینی میللی.

● ڕژێمـــی دەســـەڵات: وولاتێکـــی دیمـــوکراتی پەرلەمانیـــە، ئەنجومـــەنی یاســـادانان لـــە دوو ئەنجومـەن پێکهـاتووە. یەکـەمیان ئەنجومـەنی نیشتمانی، دووەم ئەنجومەنی نوێنەران.

● پارتـــە ڕامیاریـــەکان: پـــارتی دیمـــوکراتی مەسیحی، ڕاست ڕەوی ناوەندی، پارتی لیبرالی سوشیالیستی، یـەکێتی کرواتیـای دیمـوکراتی، پارتی کۆمەڵایـەتی دیموکراتی لـەپێناو گـۆڕین، سوشیالستی چاکسازی، پـارتی مـافی کرواتـی، پـارتی جوتیـارانی کرواتـی، پـارتی نیـشتمانی سـربی، چـەندین گـروپ وپـارتی نیـشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تری تێدایە

● جوگرافیـــای وولات: کرواتیـــا کۆمـــارێکی ســەربەخۆیە، دەکەوێتــە باشــووری ڕۆژهــەڵاتی ئەوروپا لە نیمچە دوورگەی بەلقان، پێشوو یەکێك بــوە لــە شــەش کۆمارەکــەی یوگــسلافیا، لــە بــاکوری ســلۆڤینیاو مەجــەر، لــە ڕۆژهــەڵاتی

یۆگسلافیا، لە باکوری بۆسنەو هرسك، لەرۆژئاوای دەریای ئەدریاتیك.

- مێژووی وڵات : دانیشتوانە رەسەنەکانی لە بنەرتا سلافیەکان بونەو پارچەیەك بوە لە کۆماری ئۆکرانیا، لەسەدەی شەشەمی زایینی چەندین هۆزو تیرە رووی تێکردوە.

کرواتیا لەو کاتەی پارچەك بوە لە ناوچەی باتونیای رۆمانی، کرواتیەکان ئایینی مەسیحیان دەست نیشان کرد بۆ بیروباوەری خوای خۆیان، لە ساڵی ٩٢٥ کرواتیەکان توانیان داگیرکەرانی بیزەنتی و فرنجیەکان بیەزێنن و دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان دابمەزرێنن، لە ساڵی ١٠٨٩ شەری ناوخۆی نێوانیان هەڵگیرسا بوە هۆی ئەوەی مەجەریەکان وڵاتەکە داگیر بکەن، لەساڵی ١٠٩١ دوا بەدوای ئەو کارە توانرا رێکەون بەپێی پەیمانی پاکتاکورتفنتا لە لایەن سەرۆك هۆز و تیرەکانی کروات وشانشینی مەجەر مۆربکرێت، لەساڵی ١١٠٢ هەوڵیاندا بەیەك خستنەوەی وڵات لەژێر دەسەڵاتی شانشینی مەجەر.

لە ساڵی ١٥٢٦ کرواتیا کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تاکۆتایی سەدەی هەڤدەم.

لە ١٩١٨/١٠/٢٩ کرواتیا سەربەخۆی خۆی راگەیاند چوە ناو یەکیەتی لەگەڵ چیای رەش (جبل الاسود) لەساڵی ١٩٢٩ لەگەڵ هەرێمەکانی تری ناوچەکەیەکیان گرت وەك سربیا وسلۆڤینیا وکروات و دەوڵەتی یۆگسلافیان پێك هێنا.

لەوکاتەی ئەڵمانیا یۆگسلافیای لەساڵی ١٩٤١ داگیر کردو دەوڵەتی کرواتیا سەربەخۆی خۆی راگەیاند لە ژێر ئامۆژگاری بەریتانیا، کرواتیا بوە یەکێك لە کۆمارەکانی یەکێتی یۆگسلافیا لە دوای جەنگی دووەمی جیهان کە مار شال جوزیف تیتوا دای مەزراندن بە حکومەتی کاتی لە ساڵی ١٩٤٢ کە هاوپەیمانان دانیان پێنا، لە ساڵی ١٩٤٤ بوە سەرۆك وەزیران لە ساڵی ١٩٤٥ تاکو ١٩٥٣، دوای بوە سەرۆك کۆمار لە ساڵی ١٩٧٤ لە هەڵبژاردنی هەتا هەتایە، بەڵام لە ساڵی ١٩٨٠ تیتۆ کۆچی دوای کرد کە چارەسەری کێشەی نەتەوایەتی کرد بوو لە ژێر دەسەڵاتی فیدراڵی یۆگسلافیا.

لە ساڵی ١٩٨٦ ماوەی دروست بوونی پارتی رامیاری راگەیانرا لە هەڵبژاردنێکی دیموکراتی، لە ساڵی ١٩٩٠ شوعیەکان لەو هەڵبژاردنە بەزین بەرامبەر نەتەوەیە پارێزگارەکان بە سەرکردایەتی فرانکو توچمان، هەرێمی کرواتیا کە زۆربەری دانیشتوانی سربی بوون لە باشووری وڵات، لە ١٩٩١/٦/١٥ سەربەخۆیان لە کرواتیا راگەیاند، دوای ئەوە بوە شەرێکی خیوێناوی لە نێوان سرب وکرواتیەکان و توانیان تەواوی خاکی خۆیان بگەرێنەوە ورزگاری بکەن لە ژێر دەسەڵاتی یۆگسلافیا، لە ساڵی ١٩٩٧ دوبارە فرانکو توچمان هەڵبژێردرا بە سەرۆك کۆمار.

- کرواتیا ئەندامە لە نەتەوە یەککرتوەکان، ئەندامە لە رێکخراوی ئاسایش وهاوکاری ئەوروپی.

# مـۆلداڤیــا

- ناو رەسمی: کۆماری مۆلداڤیا.
- پایتــەختی: شــیزینۆ، (کیــشینیڤی پێــشوو). ژمارەی دانیشتوانی ٦٧٥٠٠٠ هەزار کەسە.
- شارەسەرەکیەکانی: بلسی، بندری، تیراسپۆل.
- ژمــارەی دانیــشتوانی: ٤٨٦٠٠٠٠ ملیــۆن کەسە بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- رووبەری: ١٣٠١٠ میل چوار گۆشەو ٣٣٧٠٠ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چری دانیشتوانی: ٣٧٤ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- نـژادەکانی: مۆلـداڤ ورۆمـانی ٦٥ ٪، ئـۆکرانی ١٤٪. رووسی ١٣٪ قەوقازی ٤٫١.
- زمانـەکانی: مۆلـداڤ (زمـانی رەسمیـە) زمـانی رووسی.
- ئاینـەکانی: مەسیحی ئۆرسۆزکسی رۆژهـەلات ٩٩٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٥٪.
- دابەشـی کـارگێری: ٢١ شـارە+ ٤٨ کۆمـەڵگای سەردەمیە.
- دراوی: لیو یەکسانە بە١٠٠بانی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٩ ملیار دۆلار.
- بەشـی تـاك لـە کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ٢٥٠٠ دۆلارە.
- بەرگری: ٤٫٢٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ١١,٥٠٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥٥٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهــەمی کــشتوکاڵی: گــەنم وجــۆ، تــەرەو میوەجات، چەوەندەری شەکر.
- سامانی سروشتی: فۆسفات، خەلوز، گەچ
- سامانی ئاژەڵی: مەرو بزن ٢٥٠٠ ملیۆن سەر، چێل ٥١٠٠٠٠ هـەزار سـەر، بـەراز ٧٦٥٠٠٠ هەزار سەر، پەرەور ١٢٥٠٠ ملیۆن سەر.
- پیــشەسازی:ئامــادەکردنی خــۆراك، ماشــێن، ئەنــدازیاری ووزەی کارەبـــا، کەرســـتەری بیناســازی، کەلوپــەلی کارەبـا، رســتن وچــنین، دروستکردنی شەکر، دروستکردنی پێلاو..
- بەرهــەمی کارەبـا: ٥٫٨٠٠ ملیــار کیلــۆ وات کاتژمێر.
- داهــاتی دەرەوەی: نــەوت، غــاز، ئــامێری دروســتکراو، رەقــی، ئوتۆمبێــل، پێداویــستی خۆراك، دانەوێڵە.
- دەرچــوەکانی: ماشــێن، کیمیــاوی، پــێلاو، گۆشت، پێست، کەلوپەلی خۆراك.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەڵمانیا، یابان، چینی میللی، کۆمارەکانی سۆڤیەتی پێشوو، رووسیا.
- رژێمــی دەســەلات: کۆمــارێکی دیموکراتیــە، ئەنجومــەنی یاســادانانی لــە ١٠١ ئەنـدام پێـك هاتیە، ئەنجومەنی وەزیران و سەرۆکی هەیە.
- پارتـە رامیاریـەکان: بـەرەی میللـی دیمـوکراتی مەســیحی، پــارتی چاکــسازی کــشتوکاڵی دیمــوکراتی، پــارتی سوشیالــستی، چــەندین گــروپ وپــارتی تــری نیــشتمانی ونەتــەوەی ورامیاری تێدایە.
- جوگرافیـــای وولات: وولاتێکـــی ناوخۆییـــە ودەکەوێتە بەشی باشووری رۆژئاوای یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو لە نێوان زێی بروت ودینستر کـەزێی بـروت سـنوری لەگـەڵ رۆمانیـا جیـا داکاتـەوە لەلایـەنی رۆژئـاوای. ئۆکرانیـادەوری داوە لە باشوورو رۆژهەلات وباکوور.
- مێـژووی ولات: لـە کـۆن ناسـرابوو بـە نـاوی ئارابیا بە هۆی کەوتنە نێوان زێی بروت وزێ دینـستر، هـەر لـە کۆنـەوە ئـەمیرە مۆلدڤایـەکان حوکمرانی ناوچەکەیان کردوە بە زمانی رۆمای ئاخاوتنیان دەکرد، دوای لـە سـەدەی شـانزەم کەوتـە ژێـر چەپۆکی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی تاکو ساڵی ١٨١٢ لەوکاتەی هێزەکانی رووسیا

دەری پەراندن لە ناوچەکە، لە ساڵی ١٩٢٤ روسیا مۆلدفیای کردە کۆماری مۆلدفیای سوشیالستی سۆڤیەتی و مافی تەواوی ئۆتونۆمی پێدرا لەسەر کەناری رۆژهەڵاتی زێی دانیستر، لە دوای جەنگی دووەمی جیهان دووبارە مۆلدافیا هاتەوە سەر گۆرەپانی رامیاری و بوە کۆماری مۆلدافیای سوڤیەتی سوشیالستی.

لە دوای ساڵی ١٩٨٩ هەستی نەتەوایەتی پەرەی سەندو بەرەی میللی مۆلدافیا دامەزراو زمانی مۆلدافیا کرا بە زمانی رەسمی، لە ساڵی ١٩٩٠ بەرەی میللی دەنگی باشی هێنا لە هەڵبژاردنی پەرلەمان و مرکیا سنجیور کە کۆنە شیوعی بوو بوە سەرۆك کۆمار.

لە ساڵی ١٩٩١ مۆلدافیا بوە وولاتێکی سەربەخۆی تەواو بە جیابوونەوەی لە یەکێتی سۆڤیەتی هەڵوەشاوە.

لە ٦/٥/١٩٩٤ دەنگدەرانی راپرسی گەلی مۆلدافیا رازی نەبوون بەیەکگرتنیان لەگەڵ رۆمانیا، لە ساڵی ١٩٩٨ شیوعیەکان لە هەڵبژاردنی پەرلەمان زۆربەی زۆری کورسیەکانیانە بە دەست هێناو حکومەتێکی فەرەلایەنەیان دامەزراند.

- مۆلدافیا ئەندامە لە نەتەوەیەکگرتوەکان، ئەندامە لەرێکخراوی کشتوکاڵی وخۆراك، ئەندامە لە رێکخراوی بانکی نێوە دەوڵەتی ، هەروەها لەخەزنەی دراوی نێودەوڵەتی لە رێکخراوی تەندروستی جیهان، ئەندامە لە چەندین رێکخراوی تری نێو دەوڵەتی.

# هۆڵەندە

- ناوی رەسمی: شانشینی هۆڵەندە.
- پایتەختی: ئەمستردام، ژمارەی دانیشتوانی (٧٥٠ر٠٠٠ هەزار کەسە).
- شارو بەندەرە گرنگەکانی: شاری رۆتردام، لاهای و بەندەری رۆتردام وئەمستردام.
- ژمارەی دانیشتوانی:٠٠٠ر١٥٠ر١٦ ملیۆن کەسە بەپێی ئاماری ١٩٩٨.
- رووبەری: ١٦٣ر١٦ میل چوار گۆشەو ٨٦٣ر٤١ هەزار کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چڕی دانیشتوانی: ٩٩٩ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا، هۆڵەندا یەکەم وولاتە بەزۆری دانیشتوان بەپێی رووبەری خاکەکەی و نیوەی زیاتری دانیشتوانی لە دەروبەری شارە گەورەکان دەژین.
- نژادەکانی: هۆڵەندی٩٧٪، چەندین نەژادی تری تێدایە بە هۆی کۆچکردنیان بۆ ئەو وولاتە، لەوانە کورد.
- زمانەکانی: زمانی هۆڵەندی (رەسمیە).
- ئاینەکانی: مەسیحی کاسۆلیکی رۆمانی ٤٥٪، پرۆتستنت ٣٥٪ ، بروای تری ئاینی تیایە.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٨٪ لە هۆڵەندا خوێندن ئیلزامیە لە پێنج ساڵ تاکو هەژدە ساڵ و حکومەت یارمەتیدەریانە.
- دابەشی کارگێری: ١٢ پارێزگایە.
- دراوی: جیلدەر یەکسنە بە١٠٠ سنت.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٣٤٤ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر٢٢دۆلارە.
- بەرگری: ٥ر٢٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٥٠٠ر٥٧ هەزار کەسە.

- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر٢٧٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، تەرەو میوەجات، پەتاتە، چەوەندەری شەکر، بەرهەمی شیری، گوڵی باخەکان، چەندین جۆری ترلە دانەوێڵە.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٧٣٠ر١٠ ملیۆن سەر، چێل ٢٠٠ر٤ ملیۆن سەر ، بزن ٠٠٠ر٦٥٠ هەزار سەر، بەراز ٥٠٠ر١١ ملیۆن سەر، پەرەور ٥٠٠ر٨٠٠ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: نەوت، غاز، ئەڵماس، گوزار.
- پیشەسازی: دروستکرنی ئامێر، پاڵاوتنی نەوت، ئامادەکردنی ئەڵماس، دروستکردنی ئەلیکترۆنی، ئامادەکردنی پێداویسیتەکانی گەشت وگوزار، کیمیاوی، ئامادەکردنی گۆشت، خۆشکردنی پێست، ئامادەکردنی بەرهەمی شیر.
- بەرهەمی کارەبا: ٥٠٠ر١٨ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی خاو، کەلوپەلی بەکارهێنان، کەلوپەلی گواستنەوە، بەرهەمی خۆراک، نەوتی خاو، دانەوێڵە.
- دەرچوەکانی: خۆراک ، غازی سروشتی، رستن وچنین، بەرهەمی کشتوکاڵی، گۆشت، بەرهەمی شیر.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، بەریتانیا، بەلجیکا ،فەرەنسا، نیوزلندە، چەندین وولاتی تری عەرەبی.
- رژێمی دەسەڵات: هوڵندە وولاتێکی دیموکراتی پەرلەمانیە لە ژێر دەستوری شانشینی (شانێن بیاتریس شانشینی وولاتە)، دوو پەرلەمانی هەیە یەکەمیان ئەنجومنی باڵا کە لە ٧٥ ئەندام پێک هاتوە بۆ ماوەی شەش ساڵ هەڵدەبژێردرێت، ئەنجومەنی نزم کە لە ١٥٠ ئەندام پێک هاتووە بۆ ماوەی چوار ساڵ هەڵدەبژێردرێت، هەردوو ئەنجومەن توانای پرسیارو وەڵام وپاسادانان وگورینن هەیە بە پێی باودۆخی وولاتەکە.
- پارتە رامیاییەکان: پارتی کاری هۆڵەندی، پارتی بانگی مەسحی دیموکراتی، پارتی سوشیالستی دیموکراتی، راستڕەوی ناوەندی، چەپی ناوەند، پارتی گەل لە پێناو ئازادی دیموکراتی، پارتی دیموکراتیخوازان، پارتی یەکیتی ئینجیلی رامیاری کالفینی رارایی، رابتەی چاکسازی دیموکراتی، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تیایە.
- جوگرافیای وڵات: هۆڵەندە دەکەوێتە باکووری رۆژئاوا لەسەر کەناری دەریای باکور، لە رۆژهەڵاتی ئەڵمانیا، لە باشووری بەلجیکا، هۆڵەندا لە ٣٨٪ زەیەکەی لە ئاستی دەریا نزمترە بەڵام پاراستنی وولات لە دەریا بەپەرژینێکی لمی تەنگ لەسەر کەناری دەریای باکوور و کۆمەڵە بەنداوی تیایە بەدرێژی ٢٤٠٠ کیلومەتر ئەمەش بۆ پاراستنی زەویەکەو بەکارهێنانی بۆ کاری کشتوکاڵی، لە هۆڵەندا پرۆژەی دەڵتا کە بە گەورەترین پرۆژە دادەنرێت بۆ رێگە گرتن لە لافاوەکانی باران، کە ئەمەش یەکێکە لەکاری ئەندازیاری مەزن لە مێژوودا.
- مێژووی وڵات: لە ساڵی ٥٥ پێش زاین بۆلس قەیسەر ناوچەکەی داگیر کرد کە لەو کاتە دانیشتوانەکەی لە هۆزەکانی سەلتی و گرمان پێك هاتبوون، لەسەدەی چواری زایینی فرنجە وسکسوفیەکان داگیریان کرد کە پارچەیەك بوو لەئیمپراتۆریەتی شارلمان، لە ساڵی ٨٤٣ هۆڵەندا چەندین جار دابەشی بە خۆیەوە دیوە جارێك لەلایەن فەرنسیەکان و جارێکی تر لەلایەن ئەلمانیەکان.

لەسەدەکانی دوازدەهەم وچوار دەهەم چەند

دەرەبەگێکی ناوخۆی هۆڵەندی دەسەڵاتی تەواویان هەبوو لەسەر هۆڵەندا کە بوە هۆی بوژانەوەی بازرگانەکان.

لەساڵی ١٦٠٢ کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی هۆڵەندە دامەزرا، هۆڵەندا لە دوای سەدەی هەڤدەم بوە یەکەم وڵاتی ئەورووپی ئیستعماری دەریای مەزن، لە ساڵی ١٦٤٨ بەتەوای دانی پێدانرا بە ولایەتی هۆڵەندی یەککرتوو بەناوی کۆماری هۆڵەندی سەربەخۆ، لەدوای ساڵەکانی ١٦٥٢تا ١٦٥٤ کێشەو ململانێی بازرگانی سەری هەڵدا کە بوەهۆی بەرپا بوونی سێ شەڕی دژوار لەنێوان هۆڵەندەو ئینگلترا ئەویش لە ساڵی ١٦٦٥ تا ساڵی ١٦٧٢.

لەهەمان ساڵ ولیام ئورانگ بوە دادوەری سەرۆکی هۆڵەندا کە ئەو پایەی بوەپایەکی میراتی لە بنەماڵەی ئورانگ، هەرلەدوای ئەوە لە ناوەوەی کێشەو ململانێ فەرەنسا توانی خاکی هۆڵەندە داگیر بکات و کۆماری یاتامیا دادەمەزرێنێت، دوای ئەوە ناپلیۆن براکەی بەناوی لویس کردە شانشینی هۆڵەندە ودوای ئەوە لە ساڵی ١٨١٠ هولەندە خرا سەر وڵاتی فەرەنسا.

لەساڵی ١٨١٥ هۆڵەندەی باشوورو باکور یەکیان گرت کە هۆڵەندەی ئێستاو بەلجیکا بەناوی شانشینی هۆڵەندە بە سەرۆکایەتی ولیامی یەکەم، لە ساڵی ١٨٣٠ هۆڵەندەی باشور کە بەلجیکابوو سەربەخۆی خۆی لە هۆڵەندا راگەیاند.

لە ساڵی ١٨٤٩ بریاری دەستوری لیبرالی دراو هۆڵەندە بێلایەنی خۆی لەجەنگی یەکەمی جیهان راگەیاند و هەروەها لە جەنگی دووەمی جیهانیش بەڵام ئەڵمانیای نازی پەلاماری داو داگیری کرد لە مانگی /٥/١٩٤٠.

لە ساڵی ١٩٤٩ لە دوای شەرێکی چوار ساڵ هولەندا سەربەخۆی دا بەهیندی رۆژهەڵاتەکە بوە کۆماری ئەندۆنەسیا، لەساڵی ١٩٤٩ هۆڵەندا ئەندامێکی سەرەکی بوو لە پێك هێنانی پەیمانی باکوری ئەتلەسی، لەساڵی ١٩٥٨ هۆڵەندە بوە ئەندامێکی دامەزرێنەری بازاری ئەورووپای هاوبەش، لە ساڵی ١٩٨٠ شانشین جولیانا کورسی شانشیتی جێهێشت بۆ کچەکەی بیاتریس، لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٤ ئەنجامی هەڵبژاردن بە باشی بەریوە نەچوو دوای حکومەتێکی ئیتلاف پێك هێنرا لە سێ پارت بەسەرۆکایەتی ولیم کوك سەرۆکی پارتی کاری هولەندی.

- مولەندە ئەندامەلە نەتەوەیەککرتوەکان، ئەندامە لەپەیمانی باکوروی ئەتلەسی، ئەندامە لەبازاڕی ئەورووپی، ئەندامە لە یەکێتی ئەروپا، ئەندامە لە رێکخراوی ئاسایش وهاوکاری ئەورووپی، ئەندامە لەچەندنین رێکخراوی تری جیهانی.

# یۆگسلافیا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری یۆگسلافیای یەکگرتوو.
- پایەتەختی: بلگراد، ژمارەی دانیشتوانی (٠٠٠ر٣٢٥ر١) ملیۆن کەسە.
- شارە گرنگەکانی: نوڤی ساد، نیس، بریستینا، سبۆتیکا.
- بەندەرەکانی: نۆڤی ساد، بار.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٦٧٥ر١١ملیۆن کەسە.
- ڕووبەری: ٤٤٩ر٣٩ میل چوار گۆشەو ١٦٩ر١٠٢ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چڕی دانیشتوانی: ٢٩٦ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- نژادەکانی: سرب ٦٤٪ ئەلبانی ١٧٪ مونتجریون ئەمانەش بۆ چیای ڕەش دەگەڕێنەوە کە ٦٪ .
- زمانەکانی: سربی کروات (زمانی ڕەسمیە) ئەلبان.
- ئایینەکانی: ئۆرسزکسیە ٦٧٪ کاسۆلیکی ڕۆمانی ٥٪ ، ئیسلام ١٥٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٨٪.
- دابەشی کارگێڕی: دوو کۆمارە ئەوانیش کۆماری سربیاو جەبل ئەسود "مۆنت نجرۆ"، لەناو سربیا دووهەرێمی ئۆتۆنۆمی هەیە کە هەرێمی ڤۆڤۆدیناو هەرێمی کۆسۆڤۆیە.
- دراوی: دینار. یەکسانە بە ١٠٠ یارا.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٣٢٠ر٢٣ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٢٣٠٠ دۆلارە.
- بەرگری: ٧,٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ١١٤,٥٠٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٣,٣٪ لە خاکی وولاتەکە
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، چەوەندەری شەکر، تەڕەو میوەجات، پەتاتە، گێزەر، برنج، گەنمە شامی.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٥٠٠ر٢ ملیۆن سەر، بزن ٠٠٠ر٢٥٠ هەزار سەر، چێل ٩٦٠ر١ ملیۆن سەر، بەراز ١٩٠ر٤ ملیۆن سەر، پەرەوەر ٥٠٠ر٢٤ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: نەوت، نوحاس، کروم.
- پیشەسازی: سامانی سروشتی، ڕەقی، ماشێن، کەلوپەلی بەکار هێنان، ئەلکترۆن، دروستکردنی خۆراك، ئامادەکردنی گۆشت، خۆشکردنی پێست.
- بەرهەمی کارەبا: ٣٨,٨٠٠ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: ماشێن و کەلو پەلی ئامادەکراوی گواستنەوە، سوتەمەنی و بەرهەمەکانی، کیمیاوی، کەلوپەلی خاو، خۆراك،
- دەرچووەکانی: گۆشت، ئاژەڵی زیندو، کەلوپەلی پیشەسازی، کەلوپەلی گواستنەوە، خۆراك، کیمیاوی، پێست، خوری.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: وولاتانی پێشووی یەکیەتی سۆڤیەت، یەکێتی ئەوروپا، ئەمەریکا، وولاتانی ئەوروپای ڕۆژهەلات، وولاتانی عەرەبی، تورکیا.
- ڕژێمی دەسەلات: کۆمارێکی فیدرالیە، پەرلەمان دووئەنجوومەنە یەکەم ئەنجومەنی کۆمارەکان، دووەم ئەنجومەنی نوێنەران.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی سربیای سوشیالستی، پارتی دیموکراتی کۆمەڵایەتی،

پارتی سوشیالستی چاکسازی، پارتی سربیای رادیکالی، پارتی دیموکراتی، پارتی ئەلبانی دیموکراتی، پارتی کاری دیموکراتی، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تێدایە .

- جوگرافیای وڵات: یۆگسلافیا ئەو وڵاتەیە کە ناوی هەر بەو ناوە بوە لە دوای لێك بوونەوەی یۆگسلافیای پێشوو لە ساڵی ۱۹۹۱ کۆماری یۆگسلافیای یەکگرتوو دامەزرا لە مانگی /۲/ ۱۹۹۲ لە سربیاو جەبل ئەسود کە ئەویش دەکەوێتە نیمچە دوورگەی بەلقان لە باشووری رۆژهەڵاتی ئەوروپا، لە رووژئاوای کرواتیاو بوسنەو هرسکە، لە باکووری وڵاتی مەجەرە، لە رۆژهەڵاتی رۆمانیا وبولگاریا، لە باشووری ئەلبانیا ومەکدونیایە، بەشێکی لە جەبل ئەسودەدە لەسەر دەریای ئەدریانیکی رۆژئاوا.
- مێژووی وڵات: لە سەدەی سێ‌ی پێش زایین رۆمانەکان هەرێمی سربیان داگیرکرد و دوای ئەوە ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لە نشونماو پەرەسەندن دابوو تا گەیشتە بەلگرادو پەریەوە بەرەو هۆزەکانی سلاف ودوای سرب وکروات بەرەو زێی دانوب و جێگربوون لە نیمچە دورگەی بەلقان ئەمەش لەسەرتای سەدەی شەشی زایینی بوو، لە ساڵی ۱۸۷۹ ئاینی مەسیحیان گرتە باوەش بە مەزهەبی ئۆرسۆزکسی مەسیحی لەسەر دەستی قەشە سیریل ومیسۆدیۆس، لەسەدەی دەیەم سربەکان جیابونەوە لە ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی و بوە وڵاتێکی سەربەخۆ بۆ ماوەیەکی.کورت، بەڵام لەدوای ساڵی ۱۲۱۷ دووبارەسەربەخۆی راگەیاند بە ناوی شانشینی سربیا لە نەشونمایەکی باش ولەباری بۆ گونجا بەتایبەتی بە سەرکردایەتی شانشین ستیفان دوشان لەوکاتەی زۆربەی دەسەڵاتی بەسەر ئەلبانیا ویۆنان دادەشکا، لە ساڵی ۱۳۸۹ سوپای سربیا شکا بەرامبەر سوپای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە شەری کوسوفۆو بوە هەرێمێك لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، بەڵام جەبل ئەسود هەر بە ئیمارەتی سەربەخۆ مایەوە.

بەڵام کرواتیا وسلوفینیا لە باکوری رۆژئاوا بونە پارچەیەك لە ئیمپراتۆریەتی بنەماڵەی هامبسبۆرگ، لە ساڵی ۱۸۷۸ شانشینی سربیا سەربەخۆی وەرگرت لە دوای هەڵاتنی سوپای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە شەر بەرامبەر رووسەکان لە سەر بولگاریا، لەدوای ساڵەکانی ۱۹۱۲ تا ۱۹۱۳ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی زۆربەی زۆری لەدەستدا لەئەوروپا وسربیاو توانی سنوورەکەی فراوان بکات لە بەرژەوەندی تورکیا وبولگاریا.

لەساڵی ۱۹۱۸ شانیشنی سرب وکروات وسلۆفینی پێك هات و شانشینەکەیان بترسی یەکەم بوو لەسربەکان، لە ساڵی ۱۹۲۹ ناوی شانشینەکە گۆرا بۆ یۆگسلافیا.

لە ساڵی ۱۹۲٤ یەکێك لە هاوڵاتیە سربیەکان ئەسکەندەری یەکەمی تیرۆرکرد، لە ۱۹٤۱ /۳/۲٥ بەرهەلستکاران هەڵسان بە رووخاندنی حکومەتی لایەنگری ئەڵمانیای نازی، لە دوای رووخانی حکومەتی ئەڵمانیا پەلاماری یۆگسلافیای داو راگیری کرد لە ۱۹٤۱/٤/٦.

لە ساڵی ۱۹٤۳ جوزیف تیتۆ هەڵسابە دامەزراندنی لیژنەی رزگاری نیشتمانی جێبەجێکردنی حکومەتی کاتی لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی ۱۹٤٥ کە تیتۆ توانی دەنگەکان بەدەست بێنێ بە رایگەیاندنی کۆماری یۆگسلافیاو هەڵوەشاندنەوەی رژێمی شانشینی، لەدوای ساڵی ۱۹٤۸ تیتۆ پەیوەندی لەگەڵ سۆڤیەت تێکچوو بەهۆی بیرو بۆچون و رامیاری مام ناوەندی کە یۆگسلافیا گرتبویەبەر، لە ساڵی ۱۹٥۳ تیتۆ بوە سەرۆکی یۆگسلافیا، لە ساڵی ۱۹٦۱ جولانەوەی

بێ لایەنی بەسەرۆکایەتی تیتۆ دامەزرا (حرکە عدم الانحیان)، لەسالی ١٩٨٠ جۆزیف تیتۆ کۆچی دوای کرد و سەرکردایەتی وولات بوە سەرگردایەتی بەکۆمەڵ، لە سالی ١٩٨٦ سلۆبۆدان میلۆسۆفیتیش بوەسەرۆکی حزبی شیوعی لە کۆماری سربیا کە شیوعیەکی نەتەوەی سۆڤیەتی بوو، لە سالی ١٩٩٢ کۆماری بۆسنەوهرسك و کۆماری مەکدۆنیا سەربەخۆیان راگەیاند لە ١٩٩٢/٤/١٧، سربیاش کۆماری سربیاو جەبل ئەسوەدیش سەربەخۆیان راگەیاندو دوای یەکیان گرت بە ناوی کۆماری یۆگسلافیای یەکگرتوو بەسەرۆکایەتی میلۆسۆفیتش، دوای ئەوە لە ١٩٩٧/٧/٢٣ میلۆسۆفیتش بوە سەرۆکی یۆگسلافیا، یۆگسلافیای یەکگرتوو چەندین کێشەو گیروگرفت و کوشت وبری لێ ئەنجام درا لە کۆتایی بوە هۆی ئەوەی کە ئەو یەکگرتنە لێك جیا بێتەوەو وڵات بەرەو وێرانکردن ببات.

بەجیابوونەوەی ئەلبانیەکانو راگەیاندنی کۆماری کوسۆڤۆی سەربەخۆ لە مانگی/١٩٩٠/٧ دوای ئەوە سوپای رزگاری کۆسۆڤۆ دەستی بەهێرشکردن کرد لە ١٩٩٧ دژی حکومەت بەلام دەسەلاتی سربیا بەشێوەیەکی درندانە وەلامی ئەو هێرشەی دایەوەو دەستیان کرد بەلەناوبردنی نژادی نەتەوەیی کەلە بۆسنە ئەنجام دراو بوە هۆی داواکردن لەدەسەلاتی یۆگسلافیا بەوازهێنانی لەوکارە نامرۆڤایەتیە بەرامبەر بە گەلانی ناوچەکە. بەلام سەرەك کۆماری یۆگسلافیا میلۆسۆفیتش گوێ ی بەو داوایانە نەداو بوە هۆی بۆ ردمان کردنی دامو دەزگا سیخوری‌و سەربازی دەسەلاتی میلۆسۆفیتش لەسەرتای مانگی ئادار تاکو مانگی /٦/ ١٩٩٩ لەمانگی /١٩٩٩/٧ هێزی فرە نژادی گەیشتە ناو یۆگسلافیا بۆ ئارام کردنەوەی بارودۆخەکەو گەراندنەوەی ئاوارەبوەکان بۆ جێگەو شوێنی خۆیان‌و پارمەتی دانیان ولابردنی هەموو جۆرە کردارێکی شۆڤێنی‌و رەگەز بەرستو بەرەو هەلبژاردنی دیموکراتی‌و فرە لایەنی کەله١٩٩٩/٩/١ زۆریەی زۆری ئاوارەو دەربەدەرەکان گەرانەوە جێگەی خۆیان دوای ئەوە لە ٢٠٠٠/٤/١ سەرۆك کۆماری پێشوو روخاو سلۆڤۆدان میلۆسۆدۆڤیتش خۆی دابەدەست دەسەلاتی نوێی یۆگسلافیا، دوای ئەوە گواستراوە بۆدادگای نێودەولەتی لەشاری لاهای تاکو سالی ٢٠٠٤ یش دادگایی کردنەکەی هەر بەردەوامبوو.؟

- یۆگسلافیا ئەندامە لەنەتەوەیەکگرتووەکان ،ئەندامە لەچەندین رێکخراوی تری جیهانی.

# ئەرمینیا

- ناوی رەسمی: کۆماری ئەرمینیا .... کەیەکێك بوو لەکۆمارە بچوکەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو کە بچوکترین کۆماری بوو.
- پایتەختی: یەریڤان ژمارەی دانیشتوانی ١٬٥٧٨٬٠٠٠ ،ملیۆن کەسە.پاریزگای یەریڤان شارێکی کوردیەو خاکی کوردستانە لە سەروی باکوری رۆژهەلاتی ئێرانە.
- شارە گرنگەکانی: جۆمری– ڤاناژور.
- بەندەرەکانی: وولاتێکی ناوخۆییەو هیچ دەرگایەکی دەریایی نییە لەسەر دەریا.

- پووبەری: ٥٠٠ر١١ میل چوار گۆشەو (٢٩٫٨٠٠ کیلومەتر چوار گۆشەیە). لەو پوبەرە ١٢ر٠٠٠هەزار کیلۆمەتر خاکی کوردستانە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٣ر٨٩٥ر٠٠٠ ملیۆن کەسە. لە ژمارەی دانیشتوانی ١ر٦٥٠ر٠٠٠ ملیۆن کوردن لەکاتی دەسەلاتی ستالین هەمووی پەرتو بلاو پێکرد بۆ کۆمارەکانی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو
- چڕی دانیشتوانی: ١٣٠ هەزار کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا..
- نژادەکانی: ئەرمینیەکان ٩٦٪ کورد ٢٪ رووس و نەتەوەیی تریش هەیە.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ١ر٥٪.
- زمانەکانی: ئەرمەنی (زمانی ڕەسمییە)، رووسی، کوردی.
- ئاینەکانی: ئەرسۆزکسی ئەرمەنی، ئیسلام، ئێزیدی، زەردەشتی .
- زانینی خوێندن و نوسین: ٩٩٪.
- ڕژێمی دەسەلات: دەسەلاتی نەتەوەیی (موتلەقە)
- دابەشی کارگێڕی: ١٠ ناوچەیە لەشێوەی پارێزگا.
- پارتە ڕامیاریەکان: جولانەوەی نەتەوەیی ئەرمەنی، نەتەوەیی، پارتی چەپی ناوەندی، یەکێتی شۆڕشگێڕی ئەرمەنی، پارتی ئەرمینیای کۆمۆنیست، پارتی یەکێتی نیشتیمانی، ئۆپۆزسیۆنی هاوپەیمان.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٩ر٨٠٠ ملیار دۆلار.
- بەرگری: ٩ر٤٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی : ٦٠ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- دراوی: درام (جێگەی ڕۆبلی ڕوسی گرتەوە لە ساڵی ١٩٩٣ ).
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٢ر٧٥٠ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ١٨٪ لەخاکی وڵاتەکە..
- بەرهەمی کشتوکاڵی: خوێ ، پەمۆ،تەرەو میوجات، گەنمو جۆ، پەتاتە، چەوەندەری شەکر. (ئەوەی لەشیر دروست دەکرێ) هەنجیر، کشمش.
- بەرهەمی پیشەسازی: نوحاس، ئاسن، زێر، زەنگ، فلین، مولیدریۆم ڕەگەزێکە زۆر بەکار دەهێنرێ لەپیشەسازی سبائك.
- بەرهەمی کارەبا: ٥ر٦٠٠ ملیار کیلۆوات کاتژمێر. پڕۆژەی وزەی کارەبا موملیدەیە لەکاتی هاتنە خوارەوەی ئاو لەئاستی خۆی بەتایبەتی لەدەریاچەی سیڤان. کە هۆکاریەکی گرنگەو بنەڕەتیە لەبوژانەوەی ئابووری لەئەرمینیا ئەو دەریاچە سەرچاوەی سەرەکیە بۆ ئاودێری خاکی وڵاتەکە.
- دەرچووەکانی: ماشێن و پێداویستیەکانی گواستنەوە، بەرهەمەکانی پیشەسازی سوك، خواردەمەنی دروستکراو.
- داهاتی دەرەوەی: ماشێنەکانی هەمە جۆر، وزە، کەلوپەلی بەکارهێنان.
- پیشەسازی: دەرهێنان، رکاز لەمەنجەمەکانی کە گرنگترین پیشەسازین، کیمیا، ماشێن.
- ئەرمینیا یەکێکە لەو وڵاتانەکە (حەشیشە) بەرهەم دێنێ و ڕەوانەی ئەوروپای ڕۆژئاوای دەکات لەڕێگەی نایاسایی.
- جوگرافیای وڵات: ئەرمینیا دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای ئاسیا، باشووری شاخی قەوقازە، جۆرجیا دەکەوێتە باکووری، تورکیا دەکەوێتە ڕۆژئاوای، ئێران لەباشووری، ئازربایجان لەڕۆژهەلات. زۆر لوتکەی بەرزی چیای لێیە لەوانە لوتکەی چیای ئارارات کەناوچەیەکی کوردستانیە. بەدرێژ بوونەوەی زنجیرە چیاکانی لەڕۆژهەلات بۆ ڕۆژئاوا، لەوچیایانە چەند چاوگەی لێ هەڵدەقوڵێ وەك زێی دجلەو فورات و کیۆس و ئەرکسیز. کەش و هەوای لەزستان پلەی ساردی لەژێر پلەکانی کەشە بە ٤٠ پلەی سەدی لەرێژەی

گەرمی لە یەریڤان پلەی٢ لەمانگی حەوت و هەشتدا.

- میژووی وولات: لەبنەڕەتا ئەرمینیا پارچەك بوە لەئیمبراتۆڕیەتی فارسی لەو كاتەی كە گەلی ئەرمینیا گواستیانەوە لەسەدەی شەشی پێش زاینی، ئەرمینیا بەدرێژایی میژوو گۆڕەپانی ململانێ بووە لەگەڵ یۆنان و ڕۆمان و مەگۆل و تورك، ئەسكەندەری مەكدۆنی گەورە لە سالی ٣٢٨ پێش زاینی داگیری كرد، لە سالی ٦٦ پێش زاینی ڕۆمانیا داگیری كردوە لەماوەی سالەكانی ٩٤ بۆ ٥٦ پێش زاینی بەهێزترین ناوچەبوو لەئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی كە دەسەلاتی بەسەر ناوچەكانی چیای قەوقازو دەریای سپی ناوەڕاست دا دەشكا.

لە سالی ٣٠٢ زاینی ئەرمینیابووە یەكەم دەوڵەت كە ئاینیی عیسای كردە ئاینیی ڕەسمی دەوڵەت. لەسالی ٣٩٠ئەرمینیا دابەش كرا لەنێوان بێزەنتیەكان و فارسەكان، لە سالی ٨٨٦ تاكو ١٠٤٥ ئەرمینیا دەوڵەتێكی شانشینی سەربەخۆ بوە.

لەسەدەی سیانزەهەم لەدوای داگیركردنی لەلایەن مەگۆل و ڕزگار بوون لە دەستیان بووە ولاتێكی سەربەخۆ تاكو سالی ١٨٧٥.

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەسەرەتای سەدەی شانزەهەم داگیری كردوو لەماوەی ١٨١٢ تاكو ١٨٢٨ ڕوسیا دەستی بەسەر ڕۆژهەلاتی ئەرمینیا داسەپاند. لەكۆتایی سەدەی نۆزدەهەم هەستی نەتەوایەتی و ڕۆژشنبیری ئەرمەنی پەرەی سەندو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی مەترسی لیّ پەیدابوو كەوتە پەلاماردان و ئێش و ئازاری ئەرمەنیەكان بووە هۆی نارەزایی وولاتانی ناوچە و جیهان و ناسراو بەكێشەی ئەرمەنەكان، لەسالی ١٨٩٤تا ١٨٩٦جەندرمەكانی تورك هەلسان بە كەپ كردنەوەی ڕاپەڕینەكانی ئەرمەن، لە ١٩١٥/٤/٢٤ عوسمانیەكان ترسان لەوەی كە ئەرمەنەكان هاوكاریان نەكەن ولەوترسە هەلسان بەكوشتن و لەناو بردنی زیاتر لە ٥ر١ ملیۆن ئەرمەنی و ئەوەی ماوە سیّ بەشی دانیشتوانی ئەرمەن دەربەدەری سوریاو فەلەستین كردو لەڕێگا زۆریان لیّ مردن و ئەوانەی مانەوە لە وولاتانی جیهان هەولی زاوزێ كردنیان بەزۆری دەدا بۆ ئەوەی ژمارەیان زۆر بێتەوە.

لە سالی ١٩١٦ ڕوسیا هەلسابە بەداگیركردنی و بووە پارچەیەك لە پەیمانی قەوقاز لەگەڵ جورجیاو ئازربایجان. لە سالی ١٩١٨ بووە كۆمارێكی سەرەبەخۆ. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا سوپای سوری سۆڤیەت داگیری كردەوە لە سالی ١٩٢٠ و ئەرمینیای ڕۆژئاوا پارچەیەك بوو لە توركیاو باكوری ڕۆژئاوای ئێران. لە سالی ١٩٢٢ سۆڤیەت هەلسا بەلكاندنی جۆرجیاو ئەرمینیاو ئازربایجان بۆ ئەوەی ببنە سیّ كۆماری قەوقازی سۆڤیەتی سۆشیالستی و پارچەیەك بن لە یەكێتی سۆڤیەت. بەلام لەدوای ڕێكخستنەوەی دەوڵەتی سۆڤیەت لە سالی ١٩٢٦ بۆ ئەوەی ئەرمینیا ببێتە كۆمارێكی جیا لە جۆرجیا و ئازربایجان كە مایەوە بەیەكێك لە كۆمارەكانی یەكێتی سۆڤیەت. لەدوای سالەكانی ١٩٨٠ هەستی نەتەوایەتیان بەرەو بەرز بوونەوە هەنگاوی دەنا لەنێوان ئەرمەنەكان و هاندانی ڕامیارییەتی نوێی سەرۆكی سۆڤیەت (میخائیل گورباتشۆف) بە ڕاگەیاندنی (گلاسنوس) . بەلام لە سالی ١٩٨٣ ئەرمینیا توشی چەندین تەنگەژەو ململانێی هەرێمی بوەوە لەگەڵ ئازربایجان لەبارەی ناوچەی ناگۆرنا كارایاخ كە دەكەوێتە ناو خاكی ئازربایجان بەلام هەموویان ئەرمەنی بوون و داوای جیابوونەوەیان لە ئازربایجان دەكردوچونە ناو ئەرمینیا كەچی هەر دوو دەوڵەت داوای مافی ئۆتۆنۆمیان بۆ دەكردن، بەهۆی بەرز بوونەوەی بیرو هەستی نەتەوایەتی لەدوای ١٩٩٠و بەدەست هێنانی نەتەوەیەكان لە زۆربەی كورسی پەرلەمان و سەركەوتنیان لە هەلبژاردن لە ١٩٩٠/٨/٢٣ سەربەخۆییان ڕاگەیاند بەلام

مۆســـــكۆو وولاتــــانی ناوچــــەو جیهــــان ڕاگەیاندنەکـەیان پـشت گـوێ خـست. بـەڵام بـۆ جـاری دووەم لـــە ١٩٩١/٩/٢٦ ســـەربەخۆی یەکجارەکیان ڕاگەیاند بەجیابوونەوەیان لەیەکێتی سۆڤیەت، لە ساڵی ١٩٩٢ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دانی بە کۆماری ئەرمینیا ناو چووە ناو ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، لەدوای ساڵی ١٩٩٥ دەســتکرا بـەگۆڕانکاری بـەرەو کـەرتی تایبـەتو پرگـۆڕەمی رزگـاری نرخـەکانو دوای پارتی بزتنەوەی نەتەوەیی ئەرمەنی دەسەڵاتدارو بـۆ حـوکمرانی کردنـەوەی خـۆی، دەنگـدەران لەراپرسـی دەسـتوور لـە ١٩٩٥/٧/٥ رازی بـوون بەدستوری نوێ بۆ پاڵپشتی سەرەك کۆمار، لە ١٩٩٦/٩/٢٢ دووبارە ترینزورسیان بەسەرك کۆمار هەڵبـژێردراوەو دوای لـــە١٩٩٨/٢/٣ دەســتی لەکارکێـــشاوەبەهۆی کێــــشەی نایاســــایی لەهەڵبژاردنەکان. لە٣٠/٥/١٩٩٨ رۆبرت کوشریان سـەرکەوتنی بەدەست هێنا بۆ پۆستی سـەرەك کۆمار.

ئەرمینیا ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتووەکان.

# ئـازربـایجـان

- ناوی ڕەسمی: کۆماری ئازربایجان.
- پایتـەختی: بـاکو ، ئـەویش بەندەرێکـە لەسـەر دەریـــای قـــەزوینو ژمـــارەی (دانیــشتوانی ٠٠٠ر٩٥٣ر١ ملیۆن کەسە).
- شارە سەرەکیەکان: جانبا، سوجمیت.
- ڕووبـــەری: ٤٠٠ر٣٣ میـــل چوارگۆشـــەو ٦٠٠ ر٨٦ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ٠٠٠ر٩٦٨ر٧ ملیـۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- چـڕی دانیـشتوانی: ٢٣٩ کـەس لەیـەك میـل چوارگۆشەدا.
- نـژادەکانی: ئـەزیری ٩٠٪ ، گـەلانی داغـستانی ٣٪ ،ڕوسی ٥ر٢٪ ، ئەرمەنی ٢٪ .
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٣ر١٪ .
- زمانەکانی: ئەزیری (زمانی ڕەسمیە)، ڕوسی، ئەرمەنی .
- ئاینـەکانی: موسـڵمانەکان ٩٣٪ ، شـیعە ٦٤٪، سونی ٢٩٪ ، مەسیحی ئورسوزکسی ٥٪ .
- زانینی خوێندن و نوسین: ٩٨٪ .
- ڕژێمـــی دەســـەڵات: کۆمـــارێکی دەســـتوری گواستنەوەیە و دەسەڵاتی کەمایەتی توندڕەوە.
- دابەشـــی کـــارگێڕی : دوو هـــەرێمی مـــافی ئۆتۆنۆمیو ٩ شارو ٥٤ بەشە.
- پارتە ڕامیاریەکان: بەرەی ئازربایجانی میللی ، نەتـەوەیی دیموکراتی، گـەلی ئازربایجـانی نـوێ (کۆمۆنیـستی پێـشوو) پـارتی ئازربایجـانی کۆمۆنیـست قەدەغەیـە، پـارتی دیمـوکراتی ئیـسلامی ، ئیـسلامی یـەکگرتووی گـەلانی کەبەزمانی تەرکیك ئاخاوتن دەکەن.
- بەرگری: ٥٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- دراوی: مانات.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٠٠٠ر٩٠٠ر١١ ملیار دۆلار.
- بەشـی تـاك لـە کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ٤٦٠ر١ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ١٨٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهـەمی کـشتوکاڵی: گـەنم و جـۆو دانەوێڵـە، پەمۆ، توتن، ترێ، پەتاتە، چەوەندەری شەکر.

- سامانی ئاژەڵ: مەڕ ٤٠٠ر٤ ملیۆن سەر، چێڵ و گامێش ٧٠٠ر١ ملیۆن سەر، پەرەوەر ١٣ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی کارەبا: ١٠ر١٦ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: نەوت، غاز، ئاسن، چەندین جۆری تری سامانی سروشتی تیایە.
- پیشەسازیەکانی: پالاوتنی نەوت، پێداویستیەکانی دەرهێنانی نەوت، ئاسن، چیمەنتۆ، کیمیاوی، ڕستن و چنینی هەمە جۆر، دروستکردنی شەکر، خۆشکردنی پێست، پێڵاو، ئامادەکردنی گۆشت،
- دەرچووەکانی: نەوت و غاز ، کیمیایی، بەرهەمی پەمۆ، خوری، پێست، ئاژەڵی زیندوو.
- بەرهەم هێنانی حەشیشەو جۆرەکانی تری تریاك ئەویش لە وولاتەکانی کۆمەنولس بەکاردێ و دەنێردرێتە دەرەوەی وولات بۆ ئەورووپای ڕۆژئاوا.
- داهاتی دەرەوەی : ماشێن و پێداویستیەکانی ، کەلوپەلی بەکارهێنان، خواردەمەنی، دروستکراوەکانی ڕستن.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: لەگەڵ هەموو وولاتانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو ، یەکیەتی ئەورووپا، یابان، چینی میللی.
- جوگرافیای وولات: ئازربایجان دەکەوێتە سەر کەنارەکانی ڕۆژئاوای دەریای قەزوین لەلای باشووری ڕۆژهەلاتی چیای قەوقاز. دۆڵەکانی زنجی کوراهۆکە ناوچەیەکی سەرەکی کشتوکاڵیە. ڕوسیا لە باکوری، دەریای قەزوین لە ڕۆژئاوای، سنوری لەگەڵ تورکیا ١٠ میل درێژیەتی.
- کەشوهەوای مام ناوەندییەو کەم بارانە، گەرمو وشکانییە، ڕێژەی پلەی گەرمی لەمانگی حوزیران و تموز دەگاتە ٢٧ پلە.
- مێژووی وولات: لەسەدەی چواری زاینی (ئەنروفیتس) کە یەکێك بوو لە هەڤاڵەکانی ئەسکەندەری مەکدونی سێ پەم هەڵسایە ڕاگەیاندنی دەوڵەتی سەربەخۆی ئازربایجان بۆ یەکەم جار. ئیسلام لەسەدەی حەوتەم لەناوچەکە بلاو بووەوە. مەگۆلەکان لەسەدەی سیانزەهەم لەگەڵ ئیمپراتۆریەتەکە تێکەڵاوی یەك بوو. بەلام تورکە عوسمانیەکان لەسەدەی شانزەهەم داگیری کردو تێکەڵاوی ئیمبراتۆیەتی خۆیان کرد. لەدوای ئازربایجان بوە مەڵبەندی ڕۆشنبیری ئیسلام و مەزهەبی شیعی. بەلام دوای ئەوە ئازربایجان کەوتە ژێر دەسەلاتی فارسەکان بەهۆی جەنگی نێوان ڕوسیا و ئێرانی یەکەم لە ساڵەکانی ١٨٠٤تا١٨١٢ کۆتایی هات ودەسەلاتی ڕوسیا لەسەر ئازربایجان چەسپاو بوە پارێزگاری لێ کردنی. دوای ئەوە جەنگی دووەمی نێوان ئێران و ڕوسیا هەڵگیرسایەوەو لە ساڵی ١٨٢٦ کۆتایی هات بە مسۆگەر کردنی دەسەلاتی فارس لەسەر باشووری ئازربایجان و دەسەلاتی ڕوسیا لەسەر باکوور . لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم پیشەسازی نەوت پەرەی سەندو زۆر لە خێزانانی ناوچەکە کۆچیان کرد بۆ باکۆی پایتەختی ئازربایجان کە ئەوکاتە نیوەی پێویستیەکانی ڕوسیای چارەسەر دەکردو لە ساڵی ١٩٠٦ پارتی هیمە پێکهات کە بەستترابوو بە پارتی کاری دیموکراتی کۆمەلایەتی (بەلشەڤ) لە ڕوسیا. بەلام دوای قەدەغە کرا لە ساڵی ١٩١٢، لەهەمان ساڵ پارتی یەکساتی نیشتیمانی لە شاری باکۆ دامەزرا. لە ساڵەکانی ١٩١٧و١٩١٨ ئازربایجان بوە ئەندام لەیەکێتی باشووری قەوقازی دژ بە بەلشەفیەت و بوە کۆمارێکی سەربەخۆ لە ساڵی ١٩١٨ بەلام سوپای سوری سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٢٠ داگیری کردو ناچاری کرد لەسەر گۆڕینی ڕامیاری بەرەو زانستیەت، لەساڵەکانی ١٩٢٢

تاکو ١٩٣٦ ئازربایجان پارچەیەک بوو لە کۆماری باشووری قەوقازی یەکێتی سۆڤیەتی و هەروەها لکاندنی بەئەرمینیاو جورجیا، بەڵام لە ساڵی ١٩٣٦ بووە یەکێك لە کۆمارەکانی دامەزرێنەری یەکێتی سۆڤیەت و لەدوای ساڵەکانی سی دژایەتی یاسای کشتوکاڵیان دەکردو دژی بیری ڕاست ڕەوی ستالین بەرامبەر بەرهەڵستەکانی . لە ساڵی ١٩٨٨ هەرێمی ناگوڕنا- کارباخ کە دانیشتوانەکەی ئەرمەنی و کورد بوون کە دەکەوێتە ناو دەوڵەتی ئازربایجان، هەوڵدرا بۆ ئەوەی ببێتە سەر بەئەرمینیاو بووە هۆی خۆپیشاندان و دروست بوونی گیروگرفت بەڵام مۆسکۆ خستیە ژێر چاودێری خۆی لە ١٩٨٩ و بووە هۆی شەڕی ناوخۆی دانیشتوانی لەگەڵ ئەرمەنیەکان لەسەر ئەو ناوچەی کە زۆربەی دانیشتوانی ئەرمەنی بوون و داوای جیابوونەوەیان لە ئازربایجان دەکرد کە زۆربەی دانیشتوانە موسڵمانەکان چوونە ناو ئەرمینیا. لە ساڵی ١٩٩٠ مۆسکۆ هێزی سەربازی ڕەوانەی باکوری کرد بۆ چەسپاندنی دەسەڵات بەڵام لە ١٩٩١/٨/٣٠ ئازربایجان سەربەخۆی ڕاگەیاند لەدوای کودەتا هەرەس هێنراوەکەی دژ بەمیخائیل گورباتشۆف لە مۆسکۆ بە پشتیوانی سەرکردەکانی پارتی کۆمۆنیستی ئازربایجان. ئازربایجان بووە دەوڵەتێکی سەربەخۆ لەدوای هەرەس هێنانی یەکێتی سۆڤیەتی لە ١٩٩١/١٢/٢٦ لەهەمان ساڵ ئازربایجان بووە ئەندام لە رابتەی وولاتانی سەربەخۆی کۆمەنولس (C L S) و ناگورنۆ- کارەباخ سەربەخۆی ڕاگەیاند.

لە ساڵی ١٩٩٢ ئازربایجان بووە ئەندام لە ڕێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان و دانی پێنرا. دوای پرۆگرامی چاکسازی ئابووری دەستی پێ کرد لەسەر بناغەی ئابووری بازرگانی ئازاد. دوای بووە هۆی هەڵاتنی شیبی سەرەك کۆمار لەئەنجامی کودەتای سەربازی لەلایەن گیرار ئالییف لەساڵی ١٩٩٣ دوای بوە سەرەك کۆمارو لەو کاتە سوپای ئەرمینیا دەستی بەسەرناگۆرنۆ کەرەباخ داگرت. لەدوای ساڵی١٩٩٥ ئەنجومەنی یاسادانان هەڵبژێردراو بەردەوامە لەچاکسازی ئابوری. ولەدوای ساڵی ٢٠٠٣ ئازربانجان هەوڵی چونە ناویەکیەتی ئەوروپای داو بەردەوامە لەهەوڵەکانی .

- ئازربایجان : ئەندامە لە نەتەوە یەککگرتوەکان، ئەندامە لەکۆمەنولسی وڵاتانی سەربەخۆ.

•

# ئەسپانیا

- ناوی ڕەسمی: شانشینی ئەسپانیا.
- پایتەختی: مەدرید، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۹۱۵ر۳ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: بەرشلۆنە، فالنسیا، سیفیل.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: برشلۆنە، بیلباو، فالنسیا، قرتاجتە، ماجا، کادیۆ.
- ڕووبەری : ۸۹۶ر۱۹٤ میل چوارگۆشەو ۷۸۰ر۵۰٤ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە ڕووبەری هەموو دورگەی بالیریك و کەناری خاکی دایك ڕووبەری ۰۷۸ر۱۹۰ میل چوارگۆشەو (٤۳۱ر٤۹۲ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە) .
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۳٦۰ر٤۲ ملیۆن کەسە. بەپێی ئاماری ۱۹۹۹
- چڕی دانیشتوانی: ۲۱۷ کس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۰ر۳٪ .
- نژادەکانی: تێکەڵاوە لە تیپەکانی دەریای سپی ناوەڕاست (کەبەژەن کورت و سەر درێژۆکانین) تیپەکانی نوردیە (درێژی بەژن و درێژی سەرو پیستی ئەسمەر)، ئەویش ئەسپان ۷۳٪،کاتالان ۱٦٪، گالیسیە۸٪.
- زمانەکانی: ئەسپانی کستیلیە ( زمانی ڕەسمیە) کتلانیە، گالیسیە، باسك.
- ئاینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی ۹۹٪ .
- زانینی نوسین و خوێندن: ۹۹٪ .
- ڕژێمی دەسەڵات: شانشینی دەستوریە، پێك هاتوە لە کورتیس (پەرلەمان) کە لەدوو ئەنجومەن پێك هاتوە ئەنجومەنی نوێنەران کە ۳۵ ئەندامن و. ئەنجومەنی پیران ۲۰۸ ئەندامن، هەڵبژاردن بە پێشنیاری گشتیە.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی کرێکاری سوشیالستی، سوشیالستی دیموکراتی، پارتی میللی ، چەپ ڕەوی ناوەندی.
- دابەشی کارگێری: ۱۷ هەرێمی ئۆتۆنۆمیە.
- بەرگری: ٦ر٥ ٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۸۰۰ر۲۰٦ هەزار کەسە.
- ئابووری: گەشتوگوزار سەرچاوەی یەکەمە لە بەرهەم و دوای ئەویش پیشەسازی و کشتووکاڵ.
- دراوی: بیزیتا.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٤۰۰ر٦٤۲ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٤۰۰ر۱٦ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ۳۲٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: دانەوێڵە، زەیتون، ترێ ، ترشیات، تەرە بەهەموو جۆرەکانیەوە، چەوەندەری شەکر، میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ۰۰ ۳ر۲۱ ملیۆن سەر ، بەراز ۱۸ ملیۆن سەر ، چێڵو گامێش ۵۰۰ر۷۰۰ر۵ ملیۆن سەر ، بزن ۵ر۲ ملیۆن سەر، پەرەور ۸۰۰ر۳۱ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی کارەبا: ۸۰۰ر۱٦٤ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: لیجینت (خەلوز یۆرانیۆم، قورقوشم ، ئاسن. نوحاس، زەنگ، کەلوپەلی سروشتی تر، دارستان، وزەی ئاو، گەچ، (ملورۆسیار. کەبۆ دروستکردنی شوشە بەکاردێت).
- پیشەسازی: ماشێن ، ئاسن، بەرهەمی ڕستن و چنین. پێڵاو، گالیسکە، خۆراکی دروستکراو، گەشت و گوزار، ئامادەکردنی گۆشت، خوری.
- دەرچووەکانی: ئۆتۆمبێلو تەرەکتۆر، کەلوپەلی نیوە تەواوکراو، کەلوپەلی خۆراك، بەتایبەتی

ڕۆنـــی زەیتـــون ، پۆرتـــەقال، ماشـــێن و پێداویستیەکانی کارەبایی، گەلێ کەلوپەلی تر.

- داهاتـــەکانی دەرەوەی : ماشـــێن و کەلوپـــەلی گواسـتنەوە، کیمیا،بەرهـەمی نـەوت، کەلوپـەلی بەکارهێنان.
- هاوبەشـەکانی بازرگـانی: ئـەڵمانیا، ئیتاڵیـا، ئەمەریکا، یابان، بەریتانیا، چینی میللی
- جوگرافیـای وڵات: ئەسـپانیا لـە٨٥٪ ڕوبـەڕی نیمچە بیابانی ئیبیریایە کە باشووری ڕۆژئاوای ئەوروپا دەگرێتە خۆی . بەڵام پورتوگال هـەموو ماوەکـەی لـە نیمـچە بیابانەکـە بـەکاردێنێ، فەرەنـــسا دەکەوێتـــە بـــاکوری ڕۆژهـــەڵاتی ئەسپانیاکە چیای برنیز لێکیانی جیا دەکاتـەوە کە درێژیـە کـەی ٣٠٠ میل و ٤٨٠ کیلۆمـەترە، کەنـــداوی بیـسکی لـە بـاکوری کەدەکەوێتـە ڕۆژئـاوای فەرەنـسا ئـەویش پارچـەیەکە لـە زەریـــای ئەتڵەســی،لە ڕۆژئـــاوای پورتوگالـــە، ئەتڵەسـی لـەباکوری ڕۆژئاوایـە، چـیای تـارق لەکێـشوەری ئـەفریقیای جیـا دەکاتـــەوە لـە باشووری ڕۆژئاوا کـە درێژی گەروەکە کەمترە لە ١٦ کیلۆمەتر، گردۆڵکەی ناوەندی پانی هەیە بەرەو خوارو لەدوو لایەنی باشوورو ڕۆژهەڵات، زنجیرە چیایەك لێکیان جیا دەکاتەوە. سێ زێی سەرەکی تیایە ئەویش " زێی ئیرۆ لە باکوری ڕۆژهەڵات و زێی تابۆ لە ناوچەی ناوەندیو زێی چـــوارکەفیر لـــە باشـــوری کـــە ئـــاودێری دەشتاییەکان دەکات. ئەو کەش و هەوایەی کە هەیە وشکانیە، لە زستاندا ساردە، گەرمە لە هاوین، لە باکوور کەش و هەوای مام ناوەندیە ،لە کەنارەکانی باشوورو ڕۆژهـەڵاتی بە پـێی کەش و هەوای دەریای سپی ناوەڕاستە.
- مێژووی وڵات: دانیشتوانی ڕەسەنی ئەسپانیا لە (سلتین و ئیبریانیەکانو باسك پێکهاتووە . ئەسـپانیا پارچـەیەك بـوو لـە ئیمبراتۆریـەتی ڕۆمـانی لـە سـاڵی ٢٠٦ی پێش زاینـی کـە لـەو کاتە (سکیبیو ئەفریکانوس) کردیەوە. لە ساڵی ٤٦٢ پێش زاینـی سـەرکردە (ئـەلفیزیجوتیکی بەربـەری ، ئـەتولف) پەڕیـەوە بـەرەو چیاکانی ئەلبرنیزو دەسـەڵاتی لـە ئەسپانیا گرتە دەست بـەناوی ئیمبراتۆریـەتی ڕۆمـانی یەکـەم، بـەڵام دوای ئـەوە سـەربە خـۆیی وەرگـرت. هێـزی ئیسلام بە سەرکردایەتی تارقی کوڕی زیاد لە سـاڵی ٧١١ زایـنی هەڵسا بە پەڕینـەوەی ئـەو بەنـدەرە تەنگـەی کـە کەوتۆتـە دووری لایـەنی ڕۆژئـاوای دەریـای سپی ناوەڕاست کـە جیـای دەکاتـەوە لـە بـاکوری ئـەفریقیاو باشـووری ئەوروپا کـە نـاوی نـرا بـە نـاوی گـەروی چیای تارق لەلایـەن ئەو موسڵمانانەی کە لە باکوری ئەفریقیا هاتبوون بە کردنەوەی (فتح) ئەسپانیا لەســەر شانـشینی (فیزیجوتیـك). کـە چـەند ساڵێکی کەم مانەوە لەسەر دەریاو ناچار کردنی وڵاتــی ئەسـپانیا بـەدرژێرە دانــی دەسـەڵاتی خۆیـان لـە وڵاتەکـە . بـەڵام بەشـی باشـووری ئەسپانیا لەماوەی دەسەڵاتی ئیسلامی ناوزەند بوبوو بە ئەندەلوس کە ماوە لەژێر دەسەڵاتی ئیـسلام لـە سـەدەی هەشـتەمی زاینـی تـاکو ســـەدەی پانزەهـــەم بـــە دروســـتکردنی شارســـتانیەت و ڕۆشـنبیریەکی دەوڵەمەنـد، بەبەردەوامی ئەو ماوەیە لە باشووری ئەوروپا کـە لەسـنووری شـاری بوانیـەو لـە ناوەڕاسـتی ڕۆژئـاوای فەرەنـسا ڕاوەسـتا تـا ئەوکاتـەی سوپای فرنجە توانی سوپای ئیسلام لە ساڵی ٧٢٢ زاینی دەریکات.

لەسەدەی نۆی زاینی مەسیحیەکان توانیان لە بـاکوری ئەسـپانیا چـەند شانـشینیەك پێك بێـنن وەك (ئەستۆریاس، ئاراگۆن، نافارۆلیۆن، ناوچەی کاسـتیل) ، عەبـدول ڕەحمـانی سـێیەم تـوانی لـە سەدەی دەی زاینی خۆی بکاتە خەلیفەی ئیسلام لــە شــاری قرتبــە، کــەبوە هــۆی بــەهێزبون و بەرزبونـــەوەی شارســـتانیەت و ڕۆشـــنبیری لـــەو کاتەدا، لە ساڵی ١٢٣٠ زاینی لە ئیسپانیا هەردوو شانـشینەکانی لیـون و ناوچـەی کاسـتیل یـەکیان

گرت و بوە هۆی دەرکردنی ئیسلامەکان لە زۆربەی باشووری ئەسپانیاو بوە پارمەتی دەری پەرت و بڵاو بون و کەرت بون لەنێوان دەسەڵاتدارانی ئیسلامی و بەردەوامی لە داگیر کردن و تاڵان کردنی لەلایەن مەسیحیەکان لە باکوردا.

لەسەدەی چواری زاینی لە ئیسپانیا شانشین پێك هات لە ناوچەکانی کاستیل و ئاراگۆن و قافار، ئیماراتی ئیسلامی لە غرناتە، بەڵام شانشینی ئارگوان و کاستیل کە گرنگترین شانشینی بون لە ساڵی ١٤٦٩ زاینی فردیناند دادوەری ئارگۆن بوە هاوسەری (ئیزابلای) ئەمیری کاستیل و هەردوو شانشینکە یەکیان گرت لە ساڵی ١٤٧٩ی زاینی، لە ساڵی ١٤٩٢ غرناتە داگیرکراو بوە کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتی ئیسلامی لە ئەسپانیا بوە هۆی ئەوەی کە کاسۆلیکی ڕۆمانی ببێتە ئاینی ڕەسمی دەوڵەت بەدەرکردنی جولەکە لە وڵات و دەرکردنی ئیسلام لە ساڵی ١٥٠٢ زاینی.

لە ساڵی ١٤٩٤ پەیمانی (تۆردسیلاس) لەنێوان ئەسپانیاو پرتوگال مۆرکرا بە دیاری کردنی ئەو شوێنانەی کە بۆیان هەیە بپیشکنن بەدۆزینەوەی ناوچەی تر ، لە ساڵی ١٤٩٣ زاینی مەرسومی بابەوی دەرچوو بەدانی جیهانی نوێ (هەردوو ئەمەریکا) بۆ ئەسپانیا و تایبەتمەند کردنی ئەفریقیا بۆ پورتگال بۆ دەرامەتی پورتوگال، لە کاتی دۆزینەرەوەی ئیستیعماری فراوان (کۆلۆمبس) توانی ئەمەریکا بدۆزێتەوە لە ساڵی ١٤٩٢ زاینی و بیزار توانی پیرۆ داگیر بکات لە ساڵی ١٥٣٢ زاینی، کۆرنس مەکسیکی لە ساڵی ١٥١٩زاینی داگیر کرد، ئەسپانیا بوە هێزێکی نێو دەوڵەتی و بنەماڵەی هامبسبۆرگ شانشینی ئەسپانیا بوە بەهێزترین بنەماڵەی دەسەڵات لە هەموو جیهان.

هۆڵەندیەکان بەنیازی تۆڵە سەندنەوە بون لە ئەسپانیا بەڵام ئەسپانیا دانی بەهۆڵەندا دانەدەنا بەکۆماری هۆڵەندا تاکو ساڵی ١٦٤٨ ی زاینی

دوای ئەوە لە ساڵی ١٥٨٠ فلیپی دووەم بوە میرات گری کوڕی شانشینی حشقە لە سەر پرتوگال و بەردەوام بوو لە دەسەڵاتەکەی تاکو ساڵی ١٦٤٠ ی زاینی، فلیپی دووەمی شانشینی ئەسپانیا لە ساڵی ١٥٨٨ ی زاینی (کەشتیە جەنگیەکەی ئەمرادا)ی ڕەوانەی ناوچەی ئینگلترا کرد بۆ داگیرکردن کە بووە هۆی ویران کردنی کە، ئەمەش کاردانەوەیەکی زۆر خراپی کردە سەر ئەسپانیا و دەسەڵاتداریەکەی کە بوە هۆی لەدەست دانی سەربەخۆیی لەدەریاو ڕیگە خۆش کردن بوو بۆ ئینگلترا بە داگیر کردنی ئەمەریکا ، ئەمەش بوە هۆی ئەوەی کە ئەسپانیا ببێتە هێزی دووەم لە جیهان و توانای ئەوەی نەما بەکار لێککردنی لە ڕامیاریەتی ئەورووپا، لەسەدەی هەژدەهەم ئەسپانیا هێزەکەی بەرەو توانەوە هەنگاوی نا لەناوەندی جەنگی و بێ ئەقلانی بەهێز بوونی دیموکراتی و شارستانی و دینی لە ماوەی ساڵەکانی ١٧٠١ تاکو ١٧١٤ کە چەندین جەنگی خەلافەتایەتی ئەسپانی ڕووی دا لە نێوان هاوپەمانان (ئەویش بەریتانیا ، نەمسا، هۆڵەندا، پرتوگال،دانیمارك) لەنێوان (فەرەنسالە لایەك، ئەسپانیاو بافاریا لەلایەکی تر، هاوپەیمانانی فەرەنسا دژایەتی ئەمیر فلیپ لویسی چوارەمیان دەکرد شانشینی کوڕی لویسی چواردەهەمی شانشینی فەرەنسا بوو بە شانشینی ئەسپانیا. بەڵام بەهۆی مۆرکردنی دووپەیمانی (ئوترخت و راستات)، لە ساڵی ١٧١٣ تا ١٧١٤ ی زاینی هاوپەیمانان دانیان نا بە ئەمیر فلیب بە شانشینی ئەسپانیا..

بەڵام ئەسپانیا دەستی هەڵگرت لە چیای تارق و مینۆرکلو نۆفاسکۆشیا بۆ بەریتانیا، دەست هەڵگرتنی لە ئیتاڵیاو بەلجیکا لە باشوور بۆ نەمسا. لە ساڵی ١٧٩٣ ئەسپانیا جەنگی ڕاگەیاند دژی فەرەنسای شۆڕش بەڵام دوایی گۆڕا بە دەولەتێکی سەربە فەرەنسا لە ساڵی ١٧٩٥ ی زاینی. لە ساڵی ١٨٠٨ ناپلیۆن چاوی

بریە ئەسپانیاو یوسفی کردە شانشین لەسەر ئەسپانیا. لە ساڵی ١٨٠٨تاکو ١٨١٤ لە نیمچە بیابانی ئەیبیری شەڕ هەڵگیرسا لەوکاتەی کە ناپلیۆن فەرەنساو ئەسپانیای داگیر کردو بوە هۆی ئەوەی کە ئەسپانیا ڕزگاری بێت لە ژێر دەستی فەرەنسا لەلایەن سەرکردەی ئینگلیزی (ویلنجتۆن)، لە ماوەی ساڵەکانی ١٨١٠تا١٨٣٠ ئەسپانیا دەسەڵاتی لەسەر ناوچە ژێر دەستەکانی خۆی لە ئەمەریکای باشوور نەما، لەساڵەکانی ١٨٧٣ تاکو ١٨٧٤ یەکەم کۆماری ڕاگەیاند لە مێژووی وولات. بەڵام لە ئەنجامی کودەتای سەربازی لەلایەن (فونسی دوانزەهەم)و دەسەڵاتی لە ئەسپانیا گرتە دەست. لە جەنگی یەکەمی جیهان ئەسپانیا خۆی بێ لایەن گرت، لە ساڵی ١٩٢٣ (بریمۆدی ریفیرا) بوە دکتاتۆری ئەسپانیا. لەساڵی ١٩٣٠ شانشین (فونسوی سیانزەهەم) ئەو دکتاتۆریـــەی هەڵوەشـــاندەوە بـــەهۆی ئـــەو گۆڕانکاریانەو جولانەوەیەکی بەهێز دروست بوو لە دژی ڕژێمی شانشین و بوە هۆی ئەوەی کە لە ئەسپانیا دەربکرێت، لە ساڵی ١٩٣١ ڕاگەیاندنی دەستووری نوێی ئەسپانیا بە کۆماری کرێکاری بە جیا کردنەوەی ئایین لە دەوڵەت هەتا لە خوێندنگاکانی هەمەجۆر بەڵام دوای ئەوە لایەنی مام ناوەندی و کاسۆلیکیەکان لە هەڵبـژاردنی ساڵی ١٩٣٣ سەرکەوتنیان بەدەست هێنا ، بەڵام سۆشیالستەکان و کاتالاو نیوتیەکان لە ساڵی ١٩٣٤ هەڵسان بە یاخی بوون. لە ساڵی ١٩٣٦ هەڵبژاردنی نوێ ئەنجام درا، بەرەی میللی چەپ سەرکەوتنی بەدەست هێنا. بەڵام ئەفسەرێکی پارێزەر لەسوپا بە ناوی (فرانسسکو فرانکۆ) سەرکردایەتی ئەو ڕاپەڕینەی کرد کە لە ١٩٣٦/٧/١٨ دژی حکومەتی هەڵبـژێردراو هەر لەوکاتە شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا لەنێوان نەتەوەیەکان بە سەرۆکایەتی فرانکۆ بە پشتیوانی گەورە ریتالیەت و ئەڵمانیەکان، کۆماریە چەپڕەوەکان بۆ ماوەی سێ ساڵ کە بوە هۆی کارەساتێکی گەورە لەسەر ئەسپانیاو بوە هۆی کوژرانی نزیکەی یەك ملیۆن مرۆڤ و کۆتایی هاتن بە هەڵاتنی کۆماریەکان و فرانکۆلە١٩٣٩/٥/٢٨ دەسەڵاتی وەرگرت لە مەدرید.

هەر چەندە ئەسپانیا بێ لایەنی خۆی لە جەنگی دووەمی جیهان ڕاگەیاند لە ساڵی ١٩٤١ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێزێکی چل هەزار کەسی ڕەوانەی بەرەکانی جەنگ کرد بۆ دژایەتی کردنی سوپای سووری سۆڤیەت و فرانکۆ بوە سەرۆکی دەوڵەت کە سەرۆکێکی نەتەوەیی پارتی فالانج کە پارتی دەسەڵاتداربوو بوە سەرۆك وەزیران . لەو دەنگدانەی کە ئەنجام درا لە ساڵی ١٩٤٧ زاینی کە گەل ئەسپانیا ڕازی بوو لەسەر ئەو یاسایەی کە فرانکۆ داینا بەنۆبەی دەسەڵات و ڕایگەیاندنی دەوڵەتی شانشینی لە ئەسپانیا بۆ جاری دووەم فرانکۆ بەردەوام بوو لە سەرۆکایەتی دەولەت . بەڵام ئەو پەیوەندیەی کە ئیسپانیا هەیبوو لەگەڵ وولاتە فاشیەکانی (ئیتاڵیاو ئەڵمانیا) بوە هۆی نەچونە ناو ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان تاکو ساڵی ١٩٥٥ لەوکاتە ڕازی بوون لەسەر بونی بە ئەندام لە نەتەوە یەکگرتوەکان. پەرلەمانی ئەسپانیالە ساڵی ١٩٣٦ (فرانکۆ و کورنین) ئەمیر خوان کارلوسیان کردە شانشینی ئەسپانیا لە دوای کۆتایی هاتنی حکومەتەکانیان، لە ١٩٧٥/١١/٢٠ فرانکۆ کۆچی کرد لەدوای ئەو خوان کارلوسی یەکەم سەرۆکایەتی لێژنەکانی لەناو بردنی دژی فرانکۆی گرتە دەست لەدام و دەزگاکانی وولات. لە هەڵبژاردنە ئازادەکانی مانگی تەموزی ١٩٧٧ پارتی مام ناوەندی سۆشیالستی و دیموکراتی سەرکەوتن کە پارتی گەورە بوون. لە ساڵی ١٩٧٨ گەل ڕازی بوو لەسەر ئەوەی دەنگدانێکی گشتی بکرێت لەسەر دەستورێکی دیموکراتی. بەهۆی پاڵە پەستۆی گەلانی ناوچەی کاتالونیاو باسك (ئەدولفۆ سوارێز) سەرۆك وەزیران ڕازی بوو بەوەی ئۆتۆنۆمیان پێ بدرێ . لە ١٩٨٢/١٠/٢٠ پارتی

کرێکـــاری سۆشیالـــست لـــە هەڵبژاردنـــەکانی پەرلەمان سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێنا بە سـەرۆکایەتی فلیـپ گـونزالیز و لەهـەمان ساڵ ئەسپانیا چووە نـاو پـەیمانی ئەتڵەسـی. لەگـەڵ ئەوەشـــدا ڕێکخـــراوی ئیتـــا لـــە ١٩٩٨/٩/١٨ وەسـتانی شـەڕی یـەك لایەنـەی ڕاگەیانـد. لـە ولایـەتی ئەسـپانیا (دوورگـەی بالیریـك) کـە دەکەوێتـە ڕۆژئـاوای دەریـای سپی ناوەڕاستەو ڕووبەرەکـەی ١٩٢٧ کیلۆمـەتر چوارگۆشـەیە و دورگـەی ماجورکـا دەگرێتـە خـۆی و پایتـەختی (جلمـادی مالۆرکـا، هینۆرکـا، کـریرا، ئـەبیزا، فۆرینترا) بەڵام دورگەی کانـاری دوو ولایـەت پێك دێـنن کـە ڕووبـەری ئـەو دوورگەیـە ٢٨٠٧ میـل چوارگۆشـــەو دەکەوێتـــە دەریـــای ئەتڵەســـی لەڕۆژئاوای مەڕاکش، دوورگـەی پتزیف و تلماو، جـوهرا، هیـرۆ کانـاری گـەورە ،فـورتی فننـورا لانـزروت دەگرێتـە خـۆی لـەو دوورگەیـەدا دوو بەنـدەری بوژانـەوە هەیـە ئـەویش، بەنـدەری لاس بلمـــاس و بەنـــدەری ســـانتا کروزکەســـەر بەئەسـپانیان، کوتـاو هیلليـا لەسـەر کـەناری ڕۆژاوای دەریـای سـپی ناوەڕاسـتی کـە مـافی ئۆتۆنۆمیان لە مانگی ١٩٩٤/٩ وەرگرت.

- ئەسپانیا لە ساڵی ١٩٩٦ چووە ناو ئەندامیەتی یەکێتی ئەورویا.. ئەندامە لە یەکێتی ئەوروپا، لـە ڕێکخـراوی هاوکـاری بوژانـەوەی ئـابووری ، ئەندامە لە پەیمانی باکوری ئەتڵەسی، ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەککرتووەکان.

# بـەلـجیکـا

- ناوی ڕەسمی: شانشینی بەلجیکا.
- پایتـەختی: برۆکـسل، ژمـارەی دانیـشتوانی ٩٩٥ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- شارە سـەرەکیەکانی: ئـەنتورب، گنت، ئەمـەش هەردووکی بەندەری سەرەکی وولاتەکەن.
- ڕووبەری: ١١ر٧٨٠ میل چوارگۆشەو ٣٠ر٥١٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ١٠ر٥٨٥ر٠٠٠ملیـۆن کەسە بەپێی ئاماری ٢٠٠٠.
- چـڕی دانیـشتوانی: ٨٩٩ کـەس لەیـەك میـل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٤ر٠٪.
- نژادەکانی: فلیمینگ ٥٥٪ لەباکور ، ولۆن ٣٣٪ لەباشوور .
- زمانـــەکانی: فلمـــیش "هۆلەنـــدی" (زمـــانی ڕەسمیە) لـەباکور ، زمـانی فەرەنسی لەباشوور ڕەسمیـە، دوو زمـانی تـری تیایـە کەلـە شـاری بروکسل ڕەسمین و زمانی ئەڵمانیش هەیە.
- ئاینـــەکانی: کاســـۆلیکی ڕۆمـــانی ٧٥٪. پرۆتستنت ٢٥٪.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٩٩٪.
- دابەشـی کـارگێڕی: ١٠ ناوچـەیە لەشـێوەی پارێزگا.
- بەرگری: ١ر٨٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٢٣٦ر٥٠٠ ملیار دۆلار.
- سوپاکەی : ٦٠ر٠٠٠هەزار کەسە.
- بەشـی تـاك لـەکۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٢٣ر٥٠٠ دۆلار.
- دراوی: فرەنگــی بـــەلجیکی یەکـــسانە بـــە ١٠٠سنتیم.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢٤ر٥٪ لەخاکی وولاتەکە.

- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، پەتاتە، قاوە، تەڕەو میوەجات ،گیای جوانی ناوماڵ و دام و دەزگاکان، چەوەندەری شەکر، بەرهەمی شیری.
- سامانی ئاژەڵی: بەراز ٥٥٠ر٧ ملیۆن سەر، چێڵوگامێش ٤٥٠ر٣ ملیۆن سەر، مەڕ ٧٥٠ر٢ ملیۆن سەر، بزن ٨٧٠ر١ ملیۆن سەر، پەرەوەر٦٠٠ر١٨ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی کارەبا: ٢٠٠ر٧ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازی: بەلجیکا یەکەم وڵاتی ئەوروپیە کەهەڵسابە شۆڕشی پیشەسازی بە بەکارهێنراوی ژێرخاکی لەخەڵوزو ئەردینزو هەروەها دروستکردنی مافوورو جل و بەرگ کە بەناوبانگە لەو کارە جۆراوجۆرانە لەسەر دەمەکانی کۆنەوە، بەرهەم هێنانی ئاسن و پۆلا، کەپیشەسازی سەرەکین، بەرهەمی کانزاکان، بەرهەمی شوشە، ئۆتۆمبێل، کیمیاوی گەلێ کاری تری هەمەجۆری پیشەسازی.
- دەرچووەکانی: ئاسن و پۆلا، بەرهەمەکانی نەوت، تەرەکتۆر، ئەڵماس، کەلوپەلی گواستنەوە.
- داهاتی دەرەوەی: سووتەمەنی، کەلوپەلی خواردەمەنی، کیمیاوی،دانەوێڵە.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەورووپای ڕۆژهەلات، یابان، چین، هند،هەندێ لە وڵاتانی عەرەبی، وڵاتانی یەکێتی ئەوروپا.
- ڕژێمی دەسەلات: ڕژێمێکی دیموکراتی پەرلەمانیەئەویش لەژێر دەسەلاتی شانشین و دەستوردایە، بەپێی دەستوری نوێی ساڵی ١٩٨٩ کە بڕیاری بۆ دراوە بەدابەشی سێ هەرێم کە هەر یەکێکیان مافی ئۆتۆنۆمی هەیە، ئەویش، فلاندرۆز لە باکور، والوینا لەباشووری، بروکسل، دەسەلاتی یاسا دانانی لە دوو ئەنجومەن پێک هاتوە ئەویش ئەنجومەنی پیران کە ژمارەی ئەندامانی ١٨٤ ئەندامە بۆ ماوەی چوار ساڵ هەڵدەبژێردرێن .
ئەنجومەنی نوێنەران لە ٢١٢ ئەندام پێک هاتوە کە بۆماوەی چوار ساڵ هەڵدەبژێردرێن بەرێژەی نوێنەری و ئەنجومەنی وەزیرانی هەیە.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی مەسیحی کۆمەلایەتی فلمیشی، پارتی چەپی ناوەند، پارتی مەسیحی کۆمەلایەتی فەرەنسی، پارتی سۆشیالستی فلمیشی، پارتی سەوزی فلمیشی، پارتی سەوزی فەرەنسی، پارتی چاکسازی فەرەنسی لیبڕالی، پارتی سۆشیالستی فەرەنسی، پارتی گەلی فلمیشی، چەندین بیرو بۆچوونی تری تیایە کەهەریەک لەو پارت و گروپانە لەپێناو خزمەت کردنی گەل و نیشتیمانەکەیانن.
- جوگرافیای وڵات: بەلجیکا دەکەوێتە ڕۆژئاوای ئەوروپا لەسەر دەریای باکور، لوکسمبوگ دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەلات، فەرەنسا دەکەوێتە ڕۆژئاواو باشووری، هۆڵەندا دەکەوێتە باکوری، ئەڵمانیا دەکەوێتە ڕۆژهەلات، خاکی بەلجیکا خاکێکی گەیی و بەپیتە، دووزێیەکەی شلدات و میز کەرتی دەکات، لەهەرێمی باشوری ڕۆژهەلاتی گردو بەرزایی تیایە کە بە دارستان داپۆشراوە. بەلام کەنارەکانی سەر دەریای باکور درێژی ٤٠ میل دەبێ تا دەگاتە گەروی دۆفەر، بەلام بەشی باکوری لە دەشتاییەکانی درێژ دەبێتەوە لە کەنارەکانی بۆ باکور، لە باکوری ڕۆژئاوای دەشتایی کەنارەکان بەپیتە، هێلێکی درێژی لەڕۆژهەلات بۆ ڕۆژئاوای باشوری بروکسل ڕاستەوخۆ وڵات دەکاتە دووبەش لەڕوی ڕەگەزو زمان کە لەباکور بە فلمینگۆن ناسراوە. کە لە ڕەسەندا نیوتونن و بە زمانی فلمیش ئاخاوتن دەکەن، بەلام لە باشور و لۆنیۆن کە بەلاتینی ئاخاوتن بە زمانی فەرەنسی دەکەن. کەش و هەوای بەگشتی مام ناوەندیە لەوەرزەکانی ساڵدا.

- میێژووی وڵات: ڕۆمانییەکان بەسەرکردایەتی یۆلیوس قەیسەر لە ساڵی ٥٧ی پێش زایین وڵاتی بەلجیکای داگیر کردوو ولایەتی بەلجیکای لێ دروستکرد، ناویان بەناوی ڕەسەنی دانیشتوانەکە کرد کە بەلجای پێ دەگوترا، دوای لە سەدەی پێنجەمی زایینی (فرنگە)یەکان گەماڕۆیان داو هەوڵیاندا بە چەسپاندنی ڕژێمی ئاشتی کە توانیان بوژانەوە لە ناو شارەکانی بروگ و گینت و بروکسل پەرەی پێ بدەن. لەسەدەی هەشتەم بوە پارچەیەك لە ئیمپراتۆریەتی شارلمان ، لەدوای بوە پارچەیەك لە لۆسارینگیاو کەوتە ژێر دەست لورینی خواروو، لەساڵی ١٥٥٥ بەلجیکاو زۆربەی وڵاتانی دەوروبەری یەکیان گرت لەگەڵ ئەسپانیا ئەمەش لەدوای دابەش کردنی کەلوپەلەکانی بنەماڵەی هامبسبۆرگ، لەساڵی ١٧١٢ گۆڕا بۆ دەسەڵاتداریەتی نەمسا بەپێی پەیمانی ئۆترخت، لەدوای شەڕو پێك دادانەکان بەلجیکا داگیرکرا لەلایەن فەڕەنسا بەڵام لەدوای کەوتنی ناپلیۆن لە کۆنگرەی فیتیای ١٨١٥ بەلجیکا درا بەهۆڵەندە، لە٤/٢/١٨٣٠ بەلجیکیەکان لە پێناو تۆڵە وەرگرتنەوە سەربەخۆیان ڕاگەیاند، لیوبولد بوە یەکەم شانشینی وڵات، لە پەیمانی لەندەنی ١٨٣٩ دانی بە سەربەخۆی بەلجیکا ناو بێ لایەنی چەسپاندرا. لە ساڵی ١٩١٤ ئەڵمانیا داگیری کرد کە بوە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهان و هێزەکانی بەلجیکا بەسەر کردایەتی شانشین (ئەلبرتی یەکەم) چوە ڕیزی هاوپەیمانان لەدژی ئەڵمانیا لەدوای کۆتایی هاتنی شەڕ بەلجیکا بە پێی پەیمانی فرسای ١٩١٤ هەرێمی یۆبینی بەرکەوت لەگەڵ هالمیدی لە خاکی ئەڵمانیا، لەساڵی ١٩٤٠ ئەڵمانیا هەڵسا بەداگیر کردنی بەلجیکا بۆ جاری دووەم وشانشین لیوبولدی سێیەمی بەدیل گرت و داوای لە سوپاکەی کرد بە خۆبەدەستەوەدانی، لەساڵی ١٩٤٥ بەلجیکا ڕزگار بوو لەژێر داگیرکردنی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٥٠ لیۆبۆلدی سێیەم داوای گەڕانەوەی کرد بۆ دەسەڵاتی بەڵام سۆشیالیستەکان و ئازادیخوازەکان ماوەیان پێ نەداو دەستی لەدەسەڵات هەڵگرت و لە ١٩٥١/٧/١٦ کوڕەکەی بۆ ڕۆژی دوای بوە شانشینی بەلجیکا.

لە ساڵی ١٩٤٨ بەلجیکا یەکێتی گومرگی دامەزراند لەگەڵ هۆڵەندەو لوکسمبورگ کە ناسراوبوو بەناوی بنلکس، لەساڵی ١٩٤٩ بەلجیکا بوە ئەندامی دامەزرێنەری ڕێکخراوی پەیمانی باکوری ئەتڵەسی ، لەساڵی ١٩٥٨ بەلجیکا بوە دامەزرێنەری کۆمەڵەی ئابووری ئەوروپی کە بارگاکەی لەبروکسل بوو، هەروەها پەیمانی ئەتڵەسی لە ساڵی ١٩٦٧ بروکسلی کردە بارەگای خۆی ، لەشەڕی دووەمی جیهانی تاکو ساڵی ١٩٨١ /٢٢ حکومەت دەسەڵاتی یەك لەدوای یەکیان وەرگرت بەهۆی لێك ترازانی باوەری زمان و نەژادی لەنێوان ملیمین و لونین . هەر بەهۆی ئەو بیروبۆچون و ململانێیەی نژادی و زمان لەساڵی ١٩٩٣ بڕیاری دەستوری نوێی فیدراڵی دەرچوو بەلجیکای کردە سێ هەرێمی لێك جیاواز کەهەر یەکیان ماڤ ئۆتۆنۆمی هەیە بە پێی دەستوری فیدراڵی دەسەڵاتی گوازراوە بۆ هەرسێ هەرێمەکەو بوە وڵاتێکی فیدراڵی، تاکو کۆتایی ٢٠٠٤ دەسەڵاتی گۆڕین لەکاروباری وڵات بەرێکی هەنگاودەنێ لەهەموو بوارەکان.

- بەلجیکا ئەندامە لە یەکێتی ئەوروپا، ئەندامە لەپەیمانی باکوری ئەتڵەسی، ئەندامە لەڕێکخراوی هاوکاری بوژانەوەی ئابوری، ئەندامە لە نەتەوە یەککرتووەکان.

# بولگاریا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری بولگاریا.
- پایتەختی: سۆفیا، ژمارەی دانیشتوانی٠٠٠ر٣٩٠ر١ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: بلوف دیف، ریس.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: بیرگاس، فارنا کە دەکەوێتە سەر دەریای ڕەش.
- ڕووبەری: ٨٢٢ر٢٤ میل چوارگۆشەو ٩١٠ر١١٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی:٠٠٠ر٨٥٠ر٩ ملیۆن کەسە بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- چڕی دانیشتوانی: ٤٠٨ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٣٪.
- نژادەکانی: بولگاریا ٥ر٨٧٪ تورك ١١٪.
- ئایینەکانی: ئۆرسۆزکس ٨٧٪، ئیسلام ١٣٪.
- زانینی نوسین وخوێندن: ٩٩٪.
- دابەشی کارگێری: ٩ هەرێمە لەشێوەی پارێزگا.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر٣٦ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٢٥٠ر٤دۆلار.
- دراوی: لیڤ یەکسانە بە ١٠٠ستوتینك
- بەرگری:٥ر٢٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٨٠٠ر٩٥ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٣٥٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم و جۆ، نیسك و نۆك، چەوەندەری شەکر، تەباق، تەرە، میوەجات،دەرمزەرد،چەندین جۆری تر لەبەرهەمی کشتوکاڵی.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٣٥٠ر٣ ملیۆن سەر، بزن ٠٠٠ر٨١٠ هەزار سەر، چێڵ و گامێش٠٠٠ر٦٥٤ هەزار سەر، بەراز ١٥٠ر٢ ملیۆن سەر، پەرەور٥٠٠ر٨ملیۆن سەر
- پیشەسازی: بەرهەمەکانی دروستکراوی کشتوکاڵ (معلبات)، ماشێن، ئەلکترۆن، کیمیاوی، ئۆتۆمۆبێل، کەلوپەلی گواستنەوە، داودەرمانی پزیشکی.
- بەرهەمەکانی سروشتی: ئەلەمنیۆم، زەنگ، توتیا، قورقوشم، نوحاس، خەڵوز،دار.
- بەرهەمی کارەبا: ١٠٠ر٤٢ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: ماشێن و کەلوپەلی گواستنەوە، کانزاکان، کەلوپەلی خاو، سوتەمەنی، دانەوێڵە، ئۆتۆمۆبێل، داودەرمانی پزیشکی.
- دەرچووەکانی: بەرهەمی کشتوکاڵی، کەلوپەلی گواستنەوە، کەلوپەلی ئاسن، کەلوپەلی خاو (خام) ، ئاوی کانزایی.
- بولگاریا وڵاتێکی گەشتوگوزاریە بەهۆی ناوچەی چیاکان و سەرچاوەی کانیە جوانەکان و سەرچاوەکانی ئاوی کانزاو کەش و هەوای گونجاوو دڵرفێنی هەیە.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یەکێتی ئەوروپا، چین، وڵاتانی سەربەخۆی کۆمەنولس، ئەوروپای ڕۆژهەڵات، ئەمەریکا، تورکیا، یابان، ئەڵمانیا.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی دیموکراتی تازە پێگەیشتوە، ئەنجومەنی یاسا دانان پێك هاتوە لە ٢٥٠ ئەندام، بەڵام سەرۆك کۆمارو جێگیرەکەی لە ڕێگەی دەنگدەران هەڵدەبژێردرێن بۆ ماوەی چوار ساڵ.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی سۆشیالستی بولگاریا، بزوتنەوەی مافە ئازادیەکان، یەکێتی هێزەکانی دیموکراتی، پارتی چەپ (کۆمۆنیست)، پارتی ڕاست ڕەوی بولگاری، چەندین بیرو بۆچونی تری نەتەوەی و دیموکراتی و سۆشیالیستی وکۆمەڵایەتی تیایە

لەپێناو خزمەتکردنی وڵاتەکە.

● جوگرافیای وڵات: بولگاریا دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا، لەڕۆژهەڵاتی نیمچە دورگەی بەلقانی سەر دەریای ڕەش، ڕۆمانیا دەکەوێتە باکوری، یوگوسلافیاو (سربیا) و مەکدۆنیا دەکەوێتە ڕۆژئاوای، تورکیا و یۆنان دەکەوێتە باشووری، دەریای ڕەش لەڕۆژهەڵاتی، چیاکانی بەلقان لەڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوای درێژ دەبێتەوە لەناوەڕاستی بولگاریا. ڕووی بولگاریا لەدوو زنجیرە چیای سەرەکی پێك هاتیە لەچیاو کەندە. قوڵەکان ئەویش زێی ماریتاو زێی دانوب کە دەکەوێتە باکوری وڵاتو زۆریەی سنوری لەگەڵ ڕۆمانیا پێك دێنێ، دەشتایەکانی دانوب دەکەوێتە باکوری . چیاکانی رودوب دەکەوێتە باشوری ڕۆژئاوای. دەشتایەکانی تراسان دەکەوێتە باشوری ڕۆژهەلات. کەش و هەوای لە زستان ساردو لە هاوین گەرمە بەڵام بەشێوەیەکی گشتی کەش و هەوایەکی گونجاوی هەیە لەوەرزەکانی ساڵ.

● مێژووی وڵات: پێکهاتەی کۆمەڵگای (تراسی) بەر لە ٢٥٠٠ساڵ لەو کۆچبەرانەی کە لە ئاسیای ناوەندی ڕویان لە ناوچەکە کردبوو دوای دەوڵەتی تراس پێك هات لەسەدەی پێنجەمی پێش زاین و ناوچەکانی بولگاریاو باکوری یونان و باکوری تورکیای ئێستای گرتەوە کە ئیمپراتۆریەتی تراسی لێ پێك هاتبوو، لەگەڵ ئەمەشدا فلیپی دووەم و ئەسکەندەری گەورە لەدوای ساڵەکانی ٥٠ زاینی چەندین جار پەلاماری ئەو ئیمپراتۆرییەیاندا بەڵام بێ سوود بوو. لەدوای ئەوە ئیمپراتۆریەتی تراسی چوە پاڵ ئیمپراتۆریەتی ڕۆما، لە دوای هەڕەشەکانی فلیپو ئەسسکەندەری گەورە ئەمەش لەدوای کێشەو ململانێی نێوان داگیر کەران و دانیشتوانی ناوچەکە تا دوای ساڵەکانی ٦٨١زایینی بەدامەزراندنی دەوڵەتی بولگاریا لەباشوری زێی دانوب کە پایتەختەکەی لە پلیسگابو لەناوچەی بەلقان، لە ساڵی ٨٦٤ بۆریسی یەکەم ئایینی ئۆرسۆزکسی مەسیحی کردە باوەڕی خۆی، لە ساڵی ١٠١٨ بێزەنتیەکان جیابونەوە لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ڕۆژهەڵات و بولگاریایان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و ئەستەمبۆلیان کردە پایتەختی خۆیان و کەنیسەی بولگاریان لە کەنیسەی ڕۆماجیا کردەوە لە ساڵی ١٠٤٥. لە ساڵی ١١٨٥ شانشینی بولگاریا سەربەخۆیی دووەمی بولگاریای ڕاگەیاند لە ناوەڕاستی وڵاتەکە. لە سەدەی سیانزەهەم مەگۆلەکان توانیان شانشینی بولگار کاول بکەنو دوای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی گەیشتە ناوچەکە لە ساڵی ١٣٩٦ کە یەکەم وڵاتی دورگەی بەلقان بوو بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی و نزیکەی ٥٠٠ ساڵ لەژێر دەسەڵاتی ئەو ئیمپراتۆریەتە مایەوە، لە ساڵی ١٨٧٨ شۆڕشگێڕانی بولگاریا بەشداریان کرد لەگەڵ ڕوسەکان بۆ ناچار کردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دان دانان بە مافی سەربەخۆی بولگاریا، بەڵام هێزە گەورەکانی ئەوروپا ڕازی نەبوون لەسەر ئەوەی کە بولگاریا ببێتە وڵاتێکی ئینتدابی ڕوسی لەو ناوچەیە. لەدوای ئەوە لەهەمان ساڵ مافی ئۆتۆنۆمی وەرگرت لە ژێر سەبەرخۆیی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. لە ١٩٠٨/١٠/٥ بولگاریا سەربەخۆیی تەواوی وەرگرت لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ژێر سەرکردایەتی ئەمیر فردینانلدو دوای سەر بەخۆیی ناز ناوی خۆی کردە قەیسەر، لە شەڕی بەلقانی دووەم بولگاریا هەلات و قەیسەری یەکەم مریتاند دەستی لە دەسەلات کێشاوەو کوڕەکەی بۆریسی سێ یەم جێگەی گرتەوە. لەجەنگی یەکەمی جیهان بولگاریا چوە پاڵ ئەڵمانیاو هەربەخۆی کەنارە

دەریایەکانی ئیجەی لەدەستدا، لە ١٩٤٥/٩/٥ ڕوسیا پەلاماری بولگاریای داو دوای سێ ڕۆژ شەڕی نێوانیان وەستا بەپێی ئەو ڕێکەوتنەی لەگەڵ یەکیان مۆرکرد بوو، لەدوای ئەوە بولگاریا شەڕی لە دژی ئەڵمانیا ڕاگەیاند. بەڵام دوای ڕۆژێک روسیا پەلاماری بولگاریای داو داگیری کرد کە لەوکاتەی لەژێر دەسەڵاتی داگیرکەری ئەڵمانیادا بوو، کۆمۆنیستەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست بە یارمەتی ڕوسەکان لە ١٩٤٦/٩/٨ ڕژێمی شانشینی هەلوەشایەوە لە بولگاریە، لە دوای ڕاپرسی گەلانی بولگاریا ڕازی بونیان لەسەر پێك هێنانی کۆماری میللی بولگاریاو کۆمۆنیستەکان بەتەواوی دەسەلاتیان گرتە دەست و دور لە نۆکەری بۆ مۆسکۆ؛ لە ساڵی ١٩٥٤ جیکۆڤ هەڵبژێردرا بە سکرتێری گشتی پارتی کۆمۆنیستی بولگاری، لە ساڵی ١٩٦٨ بەشداری داگیر کردنی چیکسلۆفاکیای کرد لە پاڵ یەکێتی سۆڤیەت. لە ساڵی ١٩٧١ جیکۆڤ بووە سەرۆکی بولگاریا بەپێی دەستووری نوێ. لە ساڵی ١٩٩٠ پارتی کۆمۆنیستی بولگاریا بەناوی چاکسازی ئەو پارتەو ناوی پارتەکەی گۆڕی بۆ پارتی سۆشیالستی بولگاری، لە ساڵی ١٩٩١ دەستوری نوێی بولگاریا دەرچوو لە هەڵبژاردنەکانی گشتی و یەکێتی هێزی دیموکراتی و پارتی سۆشیالستی و سەرنەکەوتنیان ئەویش بە پێکهێنانی یەکەم حکومەتی دور لە کۆمەنیستیەت لە ساڵی ١٩٩٧ پارتی یەکێتی هێزی دیموکراتی لە هەڵبژاردنەکان سەرکەوتنی بەدەست هێناو ئیفان کوستوف بوە سەرۆك وەزیران بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەدەسەلات.

● بولگاریا ئەندامە لە نەتەوە یەککگرتووەکان

# ئیتاڵیا

● ناوی رسمی: کۆماری ئیتاڵیا.

● پایتەختی: رۆما، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٩٥٠ر٢ملیۆن کەسە

● ڕووبەری : ٣٢٠ر١١٦میل چوار گۆشەو ٢٧٠ر٢٠١ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.

● ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٩٧٥ر٥٨ ملیۆن کەسە بەپێی ئاماری ١٩٩٨.

● چڕی دانیشتوانی: ٥٠٧ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.

● شارە گرنگەکانی: گنۆەە، فلۆرنسا، تۆرین، بلرمۆ، نابۆلی، میلان.

● بەندەرە سەرەکیەکانی: تریستا، نابۆلی، لاسبیزیا، مینیسیا، بلرمۆ.

● بوژانەوەی دانیشتوانی٢ر٠٪.

● زمانەکانی: ئیتاڵی (زمانی رسمیە) ئەڵمانی، فەرمنسی، سلۆفانی.

● نژادەکانی: ئیتاڵی، چەندین نژادی تری بچوکی تێدایە وەك یۆنانی وفەرەنسی وئەڵمانی وسلۆفانی وئەلبانی.

● ئاینەکانی: کاسۆلیکی رۆمانی ٩٨٪.

● زانینی خوێندن ونووسین ٩٥٪.

● دابەشی کار گێڕی: ٢٠ هەرێمە ونیمچەمافی ئۆتۆنۆمیان هەیە کە دابەشی ٩٥ ناوچەی پارێزگای کراوە.

● کۆی دەر ئەنجامی ناوخۆی: ٢٥٠ر١ بلیۆن دۆلار.

● بەشی تاک لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٣٠٠ر٢٢ دۆلار.
● دراوی: لیرە.
● بەرگری: ١٠ر٧٪ لە کۆی دەر ئەنجامی ناوخۆی.
● سوپاکەی: ٠٠٠ر٣٢٠ هەزار کەسە.
● زەوی کشتوکاڵی: ٥ر٣٢٪لە خاکی وولاتەکە.
● بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، دانەوێڵە، زەیتون، ترێ، خوێ، تەرە بەهەموو جۆرەکانی، میوەجات،چەوەندەری شەکر، برنج، چەندین جۆری تری بەرهەمی کشتوکاڵی هەیە .
● سامانی ئاژەڵی: چێڵ وگامێش ١٨٥ر٧ ملیۆن سەر، بەراز ١٠٠ر٨ملیۆن سەر، مەر ١٥٠ر١١ ملیۆن سەر، بزن ٧٥٠ر١ ملیۆن سەر،پەرەور ١٤٠ ملیۆن سەر.
● سامانی سورشتی: مەرمەر، غازی سروشتی، کبریت، بۆتاسیۆم، جیوە.
● پیشەسازی: گەشت وگوزار، پولا، ماشێن، ئۆتۆمبێل، بەرهەمی رستن وچنین، کیمیا، جل وبەرگ، پێلاو، داوو دەرمان، ئامادەکردنی خۆراک، ئیتالیا بەناو بانگە لەئامادە کردنی کاری جۆراو جۆری گەشتو گوزاری لە هەموو بوارەکان.
● بەرهەمی کارەبا: ٣٥٠ر٢ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
● داهاتی دەرەوەی: نەوتو بەرهەمەکانی، ئامێری پیشەسازی، کیمیاوی، خواردەمەنی، کانزاکان.
● دەرچووەکانی : جل وبەرگ، کانزاکان، کەل وپەلی گواستنەوە، کیمیا، بەرهەمی رستن وچنین، ئۆتۆمبێل، کەلو پەلی گوزاری،داوو دەرمان، گەلێ پێداویستی تری بەکار هێنان.
● هاوبەشەکانی بازرگانی: وولاتانی بەرهەم هێنەری نەوت (ئوپیک)، ئەمەریکا، چین، وولاتانی یەکێتی ئەوروپا،چەندین وولاتی عەرەبی و ئەفریقی.
● ئیتاڵیا شارستانیەتەکی هۆنەری ومێژووی زۆرمەزنی هەیە لە شوێنەوارو ئاسەواری شارستانیەت لە دوای جەنگی دووەمی جیهان بوژانەوەیەکی نائاسای بەخۆوە دیت لەبوارەکانی رامیاری وئابووری وکۆمەلایەتی ورۆشەنبیری وداب ونەریت پەرەیسەندن.
● رژێمی دەسەلات: کۆمارێکی دیموکراتیە، پەرلەمان سەرۆک کۆمار هەڵدەبژێرێ. لەکۆبوونەوەی هاوبەشی ئەنجومەنی پیران ونوێنەران بۆ ماوەی حەوت ساڵ، سەرۆک کۆمارو سەرۆک وەزیران هەڵدەبژێرێ. پەرلەمان لەدوو ئەنجومەن پێک هاتووە ئەویش ئەنجومەنی پیران وئەنجومەنی نوێنەران، ئەنجومەنی پیران لە ٣١٥ ئەندام پێک هاتوە بە پیشنیاری گشتی هەڵدەبژێردرێن، ئەنجەمەنی نوێنەران لە ٦٣٠ ئەندام پێک هاتوەو گەل بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵیاندەبژێرێ.
● پارتە رامیاریەکان: پارتی چەپی دیموکراتی، پارتی سۆشیالستی ئیتالی، پارتی کۆماری ئیتاڵی، پارتی دیموکراتی کۆمەلایەتی، پارتی مەسیحی دیموکراتی ناوەندی، هاوپەیمان لە پێناو ئیتاڵیا، پارتی گێرانەوەی دامەزراندنی کۆمۆنیستی، پارتی مارکسی ئیتاڵی، پارتی میللی ئیتاڵیا، چەندین بیرو بۆچونی تری پارت و گروپ وبزوتنەوەی نەتەوەی سوشیالستی و دیموکراتی وکۆمەلایەتی وئابووری تێدایە.
● جوگرافیای ولات: ئیتاڵیا دەکەوێتە باشووری ئەورووپا، لەباشووری رۆژهەلاتی دورگەیەکی درێژەی هەیە لەچیاکانی ئەلەب، لە رۆژهەلاتی دەریای ئەدریاتیک. لەرۆژئاوای دەریای تورینیانی، فەرەنسا دەکەوێتە رۆژ ئاوای، سویسرا ونەمسا دەکەوێتە باکووری، سلۆفینیا دەکەوێتە رۆژهەلاتی، دۆڵەکانی زێی ئەلیۆ زۆربەی ناوچەکانی باکوری وولات

دەگرێتەوە کە دۆڵێکی بە پیتە. زێی بوهۆ گەورەترین ڕێگەی ئاوی سروشتیە لە ئیتاڵیا کە سەرچاوەکەی لە چیای ئەلەب هەڵدەقوڵێ لەسەر سنوری ڕۆژئاوی دێتە خواری بەرو ڕۆژهەلات ولە دەریای ئەدریانیك دەکاتەوە، بەڵام زێی ئارنۆو زێی تیر کە هەڵدە قوڵێت لە چیای ئەبنینز بەرو ڕۆژئاوی ویەکەمیان لە دەریای لیجوریان دەکاتەوەوە دوەمیان لە دەریای ترینیان دەکاتەوە، ئیتاڵیا چیای زۆر مەزنی هەیە جگە لە وەش چەندین نیمچە دورگەی هەیە لەوانە دورگەی (سەقلیە کە ٢٥ر٧٠٨ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە).

● مێژووی وڵات: ٥٠٠ ساڵ پێش زاین ڕۆما دەرکەوت وەك هێزێکی مەزنی ئیتاڵیا، بەسەرکەوتنیان بەسەر تروسکانز کە دانیشتوانی هەرێمی توسکانیا بون لە باکوری ڕۆژئاوای ئیتالیاو یۆنانیەکان لە باشور، لەسەدەی چوارەمو سێیەمی پێش زاین نیمچە دورگەی ئیتاڵیا یەکیان گرت لەژێر دەسەلاتی وڵاتەکەو لەلایەن ڕۆما قرتاجیەیان کردیانەوە لە باشووری ئەفریقیا کە دەوڵەتێکی مەدەنی بوو لە نزیك شاری تونس وبەرەو فراوانی هەنگاوی نا بەرەو یۆنان وئاسیای بچوك وسوریا وفەڵەستین ومیسرو ئەو وڵاتانەش خرانە ژێر دەوڵەتی ڕۆما لە نێوان ساڵەکانی٢٥٠ تا ٣٠ پێش زاین ، دوای ئەوە فەرنساو بەلجیکاو باشووری هۆڵەندا وسویسراو ڕۆژئاوای زێی ڕاین لە ئەڵمانیا وباشووری بەریتانیا وئسپانیاو پورتۆگاڵی خستە ژێر دەسەلاتی خۆی لە نێوان ساڵەکانی ٢٥٨ تا ٥١ پێش زاین ، لەدوایی ساڵی ٤٣ی زاینیی ئینگلتەرا خرا پاڵ ئیمپراتۆریەتی ڕۆما، دوای ئەو فراوان بونە شەڕی ناوخۆو کێشەو ململانێ دەستی پێکرد بەهۆی دکتاتۆری ئیمپراتۆریەتی ڕۆماو داگیر کردنی وڵاتان.لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردەی سوپا دەرکەوتن ئەویش کە بۆمبی و یۆلیۆس قەیسەر لەگەڵ کراسوس بوو بەپێکهێنانی یەکەم حکومەتی سێلایەنە، بەڵام قەیسەر تیرۆر کرا، لەدوای ئەو حکومەتە دەوڵەتی ڕۆما دەسەلاتی گرتە دەست لەدەسەلاتی سێ لایەنە بۆ حکومەتی دوولایەنە لەلایەن مارك ئەنتۆنیۆ ئۆکتافیوس ولیبرۆس کە ساڵی ٤٣ی پێش زاین دەوڵەتیان لە نێوان خۆیان دابەش بە سێ بەش کرد، ئەنتۆنیۆ دەسەلاتی لە بەشی ڕۆژ هەلات گرتە دەست لەزێی ئەدریانیك بۆ زێی فورات. بەڵام ئۆکتافیۆس زۆری لە ئای ئەنتۆنیۆ کرد بە هۆی حەز لێکردنی لە کلیۆبا ترای شانشینی میسر وئوکتانۆس شاڵاوی بردە سەر ئەنتۆنیۆ کە لەشەری ئەکتیۆم هەلات لە ساڵی ٣١ پێش زایین ، لەدوای ئەو کێشەو ململانێ یە توکتانیۆس بوە سەرۆکی وڵاتەکەو هەڵسا بە چاك کردنەوەی ئەو وێرانکاریەی کە لەماوەی ٥٠ساڵی پێشوو لە ئەنجامی شەڕوململانێ وێران کرابوو، هەڵسا بەچاکسازی کار گێری و یاسای و ئاینی وداب ونەریتی هونەری ودارای دەوڵەت بەهێزی سوپاو بوە یەکەم ئیمپراتۆریەتی ڕۆما بەنازناوی (ئۆگستی) ، لەماوەی ساڵەکانی ٢٧ پێش زاینی تاساڵی ١٨٠ زاینی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما توانی ئاشتی وئارامی ویاسا بچەسپێنێ بەکردنەوەی هێڵی گەیاندن وبوژاندنەوەی بازرگانی وبڵاو کردنەوی بیری نوێی ئایینی مەسیحی کە هەڵقوڵاوی ڕۆشەنبیری هللنیە بوو واتە (ئەغریقی) بەڵام دوای ڕۆمانیەکان سەرکەوتن بەسەر ئەغریقیەکان لە بوارەکانی زانست وکاری یاسایی بە دانانی بنەماکانی یاسای مەدەنی و ئەندازیاری مەدەنی و لێدانی دراو دەرکەوتنی شاعیر ونوسەر ورۆژنامە نووس وشانۆو هونەر ئەمەش لەسەر دەمی ئیمپراتۆر (تراجان) بوو بەڵام دوای ئەو بەرو توانەوە ڕۆیشت بەهۆی شاڵاوەکانی هێزی گوتەکان.

لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی یوکلیشن کە دەسەلاتی گرتە دەست ئیمپراتۆریەتی رۆما دابەش بوو بەدووبەش لەنێوان ساڵەکانی٢٨٤ تا ٣٠٥ زاینی بۆ ئیمپراتۆریەتی رۆژ هەلات و رۆژئاوا، لەساڵی ٣١٢ قستەنتینیەکان بوونە یەکەم ئمپراتۆریەتی رۆمای رۆژ ئاوا، لە ساڵی ٣١٣ دانی بە ئایینی مەسیحی ناو کردیە ئایینی ڕەسمی دەوڵەتەکە. بەلام لە دوای ساڵی ٣٢٤ بوە ئیمپراتۆریەتی هەردوو بەشەکەی رۆژ ئاواو رۆژ هەلات لە دوای هەلاتنی ئیمپراتۆری رۆژهەلات وهەردوو ئیمپراتۆریەتی یەك خست و سەرۆکایەتی یەکەم ئەنجومەنی کەنیسەی مەسیحی کرد. پایتەختی گواستەوە بۆ بیزەنتە لەسەر گەرووی بۆسفۆر لەساڵی ٣٣٠ ناوی گۆری بە قستەنتینیا کە ئێستاکە ئەستەمبوڵی پێ دەڵێن لەتورکیاو هەلسا بەجیاکردنەوەی سوپا لەگەڵ حکومەتی مەدەنی و چاکسازی یاسای زۆری ئەنجامدا ، بەلام یەکبوونی هەردوو ئیمپراتۆریەتی رۆژئاواو رۆژهەلاتی کاتی بوو دووبارە توشی دابەش بوون بوەوە دوبارە ئیمپراتۆریەتی رۆژئاوا کۆتایی پێهات لەساڵی٤٧٦زایینی، بەلام ئیمپراتۆریەتی رۆمانی رۆژهەلات بەردەوام بوو تاکو ساڵی ١٤٥٣ لە قوستەنتینیە، لە ساڵی ٨٠٠زاینی شارلمان هەڵسا بەیەکخستنی ئیتاڵیاو ئەڵمانیا کە ناسرابوو بە ناوی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی پیرۆز. کە پاپا لیۆی سێیەم بوە ئیمپراتۆر لەسەر وولات.لە سەدەی دوانزەهەم وسێنزەهەم، کێشەو ململانێ گەیشتە ئەو ئاستە کە لەنێوان دەسەلاتداران و پاپاو پیاوانی ئایینی و نۆرمەندیەکان کە هەریەکێکیان دەیان ویست دەسەلاتیان هەبێت لەبەشێکی جیاوازو جۆری ئیمپراتۆریەتەکە لەدورگەی ئیتاڵیا. لەساڵی ١٤٩٤ تشارلزی هەشتەم شانشینی فەرەنسا هەستا بە داگیرکردنی ئیتاڵیا، لە ساڵەکانی ١٥٢٩ تا ١٥٥٩ بنەماڵەی هامبۆرگ هەستا بەداگیرکردنی ئیتاڵیا و ئیتاڵیا بوە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی ئسپانیاو بوە هۆی تەنگەژەی ئابووری. بەلام پەیمانی (ئۆترخت) کە لەساڵی ١٧١٣ مۆر کرا ماوەی بە بنەماڵەکەی هامبۆرگ دا بەدەسەلاتی تەواو لەسەر زۆربەی ئیتاڵیا.

لە دوای ئەوە ناپلیۆن داگیری کرد لە ساڵی ١٧٩٦ تا ١٨١٤ و ئیتاڵیای یەکخست و خۆی کردە شانشین. لە دوای شکاندنی هێزی ناپلیۆن بە پێی پەیمانی ڤینای ساڵی ١٨١٥ ماوەی بە ئیتاڵیەکاندا دوبارە دەسەلاتی کۆنی خۆیان ببوژێنەوەو ئیتاڵیا دابەشکرا لە نێوان نەمساو دەوڵەتی پاپاو ناپولی سردینیاو چوار دوقیاتەکە. سوپای نەمسا ئەو راپەرین و شۆڕشانەی لەناو دەبرد کە لەلایەن ئیتاڵیەکان ئەنجام دەدرا ئەویش لەساڵەکانی ١٨٢٠ تا ١٨٣٠ و لە هەمان کاتدا (جوزیی مزنی) حکومەتێکی دامەزراند بە نیازی دامەزراندنی کۆماری ئیتاڵیای یەککرتوو بوو کە پیاوێکی نیشتمانپەروەر بوو، شۆڕشی رزگاری لەهەموو ئیتاڵیا دەستی پێکردو هەمووی لەناو برا تەنیا سردینیا نەبێت کە بوە مەڵبەندی جموجوڵی نیشتمانی بەسەرکردایەتی (کۆنت کافور) سەرۆك وەزیرانی سردینیا لە ساڵی ١٨٥٢و ئەندازیاری یەکێتی ئیتاڵیابوو کە چوە پاڵ ئینگلتەراو فەرنسا لە شەری ناوچەی قرم و یارمەتی فەرەنسای دا دژی نەمسا بەرامبەر بە هەرێمی لومیاریا، لە راپرسی جەماوەری ساڵی١٨٦٠ کە لەبەرژەوەندی سردینیا بوو، لەساڵی ١٨٦٠ گماریبالدی هەلسابە کردنەوەی سقلیەو ناپولی وخستنە پاڵ سردینیا، لەساڵی ١٨٦١ نوری بیفیکتۆر ئەمانۆئیلی دوەمی شانشینی سردینیا بوە شانشینی ئیتاڵیای یەککرتوو. لەساڵی ١٨٦٦ کۆمیۆن ومانتواش خرانەپاڵ ئەو یەککرتنەی هەرێمی لۆمبار دیای باکووری ئیتاڵیا وناوچەی ڤنیشیا لە باکووری رۆژهەلاتی وولاتەکە کەیەکەم هۆکارەکانی شەری

نێوان نەمسا وبروسیا بوو، بەڵام شاری ڤاتیکان لە ١١/ ٤/ ١٩٢٩ دانی پیانرا لەلایەن ئیتاڵیا. لەساڵی ١٨٨٢ ئیتاڵیا هاوکاری بەست لەگەڵ ئەڵمانیا ونەمسا بەهاوکاری سێلایەنە بەناوبانگ بوو. بەڵام لە دوای داگیر کردنی وولاتی لیبیا لە ساڵەکانی ١٩١١ تا ١٩١٢ بێ لایەنی خۆی راگەیاند لە کاتی هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهان لەسەر بنەرەتی ئەوەی کە ئەڵمانیا شاڵاوی جەنگی ئەنجام داوە، ئیتاڵیا بەشداری شەری کرد لە پاڵ هاوپەیمانان لە ساڵی ١٩١٥، لە ساڵی ١٩١٩ بنیتو مۆسۆلینی سۆشیالستی پارتی فاشی دامەزراند دژبە سۆڤیەتو بەلشەفیەکان شانشینی ئیتاڵیا داوای لێکردو کردیە سەرۆك وەزیرانی ئیتاڵیا لە ١٩٢٢/١٠/٢٨ وگۆرا لە مرۆڤێکی سۆشیالستی ودیموکراتی بۆ مرۆڤێکی دیکتاتۆری درندەو رامیاریەتی فراوان بونی ئیتاڵیای گرتەبەر، لەساڵی ١٩٣٥ ئەسیوپیای داگیر کرد، لەدوای هاوکاری‌و دۆستایەتی لە گەل هتلر مۆرکرد لە ساڵی ١٩٤٠، لەساڵی ١٩٣٩ ئەلبانیای داگیرکرد. ئیتاڵیا بەشداری جەنگی دووەمی جیهانی کرد لە پاڵ ئەڵمانیا. لەساڵی ١٩٤٣ هاوپەیمانان باشووری ئیتالیایان داگیر کردو موسولینی لەسەر دەسەلات لابرا وفاشیەت لەناوبراو مۆسۆلین دەست گیرکرا لە دوای دۆراندنی زۆر لەناوچەکانی ئیتاڵیا. لەدوای روخاندنی ئەڵمانیا لە جەنگی دووەمی جیهانی ساڵی ١٩٤٥ مۆسۆلین هەلات بەلام لە لایەن شۆرشگێران دەستگیر کرا لەگەڵ خۆشەویستەکەی کلارا وهەردوکیان کوژران؟ لە ١٩٤٣/٩/٣ ئیتاڵیا راگرتنی شەری لەگەڵ هاوپەیمانان مۆرکرد ولەهەمان ساڵ شەری دژ بەئەڵمانیاو یابان راگەیاند بوە هۆی سەرکەوتنی هاوپەیمانان لەجەنگ. لە ساڵی ١٩٤٦ ئیمانویلی سێیەم کورسی بۆ کورەکەی جێهێشت هەمیرتی دووەم کە لەدەسەلات مایەوە تاکو ١٩٤٦/٦/١٠ ولەسەر کورسی هاتە خوارەوە بە هۆی راگەیاندنی کۆماری ئیتاڵیا لە رێگەی راپرسی گەلانی ئیتاڵیا. لە دوای ئەوە ئیتاڵیا بوژانەوەیەکی خێرای بەخۆیەوە دیت لەبوارەکانی رامیاری وئابوری وکۆمەلایەتی رۆشەنبیری‌و شارستانیەت تاکو لە ساڵی ١٩٤٨ دەستوری نوێی ئیتالیا راگەیەندرا بەدەرکەوتنی پارتی دیموکراتی مەسیحی کە پارتێکی سەرەکی بوولە ئیتاڵیا.

ئیتاڵیا ئەندامی دامەزرێنەری کۆمەڵەی ئەوروپای ئابوری بوو کە ئێستا بە یەکێتی ئەوروپا ناسراوە ئەویش لەساڵی ١٩٥٧. بتینۆ کراکس یەکەم سۆشیالستی بوو بوە سەرۆك وەزیران لە ئیتاڵیا بەهاوکاری پارتەکانی تر بوە هۆی بوژانەوەی ئابووری لەدوای ١٩٩٣ بە هۆی دزی‌و تارانو ریگران‌و مافیا ئەویش بەهۆی سەرکردەکانی ئێستا لەگەڵ مافیەکانی وولاتەکەی بەرەو تەنگژەی ئابوری هەنگاوی نا. لەساڵی ١٩٩٦ لە هەڵبژاردنەکانی مانگی/ ٤/١٩٩٦ حکومەتی ئیئتلافی دامەزرا لە پارتە چەپەکان وسۆشیالستەکان، ئیتالیا یەکێك بوو لەدروستکردنی دراوی یۆرۆو کار پیکردنی لەژێر سیاسەتی یەکێتی ئەوروپا. ئیتاڵیا بەشداری شەرەکانی کۆسۆڤۆو یۆگسلاڤیای کرد لەگەڵ پشتگیری کردنی ئەمەریکا بۆ لێدانی عێراق لەکاتی داگیر کردنی کوێت. لە ١٩٩٠/٨/٢و دوای رزگار کردنی کوێت،هاوکاری ئەمەریکاو بەریتانیاو هاوپەیمانانانی کرد لەروخاندنی رژێمی سەدام حسێن لە ٢٠٠٣/٣/٢٠تاکو ئێستاش هێزەکانی ئیتالیا بەشداری پاراستنی گەلانی عێراق دەکەن لە رێزی سوپای فرە رەگەزی لە عێراق تاکو کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤.

- ئیتاڵیا ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە یەکێتی ئەوروپا، ئەندامە لە رێکخراوی هاوکاری ئاسایشی ئەوروپا، ئەندامە لە رێکخراوی هاوکاری بوژانەوەی ئابووری.

# پۆڵەندا

● ناوی ڕەسمی:کۆماری پۆڵەندا.
● پایتەختی: وارشۆ، ژمارەی دانیشتوانی۰۰۰ر۸۵٦ر۱ملیۆن کەسە.
● ڕووبەری: ۷۲٦ر۱۲۰ میل چوار گۆشەو ۰٦۸۰ر۳۱۲کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
● ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۹٦٥ر۳۹ ملیۆن کەسە بەپێی ئاماری ۲۰۰۰ .
● چڕی دانیشتوانی: ۳۱۰ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
● شارە سەرەکیەکانی:کاتۆفیتی،لۆدز.
● بەندەرە سەرەکیەکانی: کدانسك(دانزیگ) گدینیا، شتسین.
● نژادەکانی : پۆلەندیەکان۹٥٪،ئەویتر ئۆکرانیو ڕووسی سپی پێستەکان و ئەڵمانن.
● زمانەکانی: پۆلەندی (زمانی ڕەسمیە) ڕوسی ،ئۆکرانی.
● ئاینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی۹٥٪.
● زانینی خوێندن نوسین ۹٥٪.
● دابەشی کارگێری: ٤۹ پارێزگایە.
● کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی:۹۲۰ر۲۸ ملیار دۆلار.
● بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۰۰٥ر۷ دۆلار.
● دراوی: زلوتی کە یەکسانە بە ۱۰۰ گروتزی .
● بەرگری: ٥ر۲ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
● سوپاکەی:۰۰۰ر۲٤۰ هەزار کەسە .
● زەوی کشتوکاڵی: ۲ر٤۸٪ لەخاکی وڵاتەکە .
● بەرهەمەکانی کشتوکاڵی: گەنم ،جۆ، نیسك ،نۆك، فاسۆلیا ،پەتاتە ، چەوەندەری شەکر ،پەمۆ، گێزەر، برنج تەرەو میوەجات.
● سامانی ئاژەڵی: مەر۰۰٦ر۳ملیۆن سەر، بزن۰۰۸ر۲ملیۆن سەر، بەراز ۲۰۰ر۱۹ملیۆن سەر، چێڵ وگامێش۰۰٥ر۷ملیۆن سەر ، پەرەوەر۰۰٤٥ر۰٥ملیۆن سەر.
● پیشەسازی: دروستکردنی کەشتی، کانزاکان، ماشێن، کیمیا، دروستکردنی خۆراك، جل وبەرگ، ڕستن وچنین.
● بەرهەمی کارەبا: ۳۰۰ر۱٤۰ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر .
● سامانی سروشتی: غازی سروشتی، خەڵوز، قورقوشم، زیوو، کبریت، نوحاس، نیکل .
● داهاتی دەرەوەی: سوتەمەنی، بەرهەمەکانی کشتوکاڵی، خۆراك، کیمیا، ماشێن و کەلوپەلەکان، ئۆتۆمۆبێل .
● دەرچووەکانی: سوتەمەنی، بەرهەمەکانی پیشەسازی، کانزای، کیمیا، خەڵووز، ئاژەڵی زیندوو، پێست، ماشێن
● هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەڵمانیا، ڕوسیا، چین، یابان، ئیتاڵیا، بەریتانیا، هۆڵەندا، ئەمەریکا، کۆمارە سەربەخۆیەکانی سۆڤیەتی پێشوو، هەندێ لە وڵاتانی عەرەبی
● ڕژێمی دەسەلات: لەساڵی۱۹۹۲دەستوری کاتی ڕاگەیاندرا، لەگەڵ ئەوەشدا کار بەردەوامە بۆ دەستوری هەمیشەیی، .دەسەڵاتی باڵای وڵات پەرلەمانە کە لە دووئەنجومەن پێك هاتوە، ئەنجومەنی پیران پێك هاتوەلە۱۰۰ئەندام و ئەنجومەنی نوێنەران پێکهاتووە لە٤٦۰ ئەندام کە هەردووکیان لەلایەن گەل هەڵدەبژێردرێت بۆ ماوەی چوار ساڵ .
● پارتە ڕامیاریەکان: پارتی سۆشیالیستی چاکسازی (کۆمۆنیستی پێشوو)، پارتی ئازادی ویەکێتی، پارتی یەکێتی کار، هاوکاری چەپی دیموکراتی، پارتی کشتوکاڵی پۆلەندی ،پارتی یەکێتی سەر بەخۆی پۆلەندی، چەندین پارت وڕێکخراو گروپی تری نەتەوەیی و دیموکراتی و کۆمەڵایەتی و ئابووریو سۆشیالیستی تیایە

- جوگرافیای وڵات: پۆڵەندە دەکەوێتە باکوری ناوەراستی ئەوروپابە درێژی دەریای بەلتیق کە دەسورێتەوەلە سنوری لای باکوری، کۆماری تشیك و سلۆڤاکیا دەکەوێتە باشووری، ئەلمانیا دەکەوێتە رۆژئاوای، کۆماری لتوانیاو بیلاروسیاو ئۆکرانیادەکەوێتە رۆژهەڵات، روسیا دەکەوێتەباکوری. زۆربەی خاکی پۆڵەندا دەشتاییەو هیچ سنوری سروشتی نییە تەنیا چیاکانی کریاسیان نەبێت لە باشووری زێی ئۆدرۆنیس لە رۆژئاوای، زێیە گرنگەکانی تری ڤستولاوو ئەرتاو تیگە.
- مێژووی وڵات: گۆرانی هۆزەکانی سلاڤی بە هەڵگرتنی بروای ئاینی مەسیحی کاسۆلیکی رۆمانی لەسەدەی دەیەمی زایینی، لەسەدەی یانزەم بۆلسلۆی یەکەم توانی دەسەلاّتی تەواو لەسەرناوچەکانی بۆهیمیاو سکۆنیاو مۆرافیا بگرێتە دەست کە لەو کاتە تیونونیە روسەکان توانیان بەشێك لە پۆڵەندا داگیربکەن ورێگەیان لێبگرن بۆئەوەی نەتوانن بێنە سەر دەریای بەلتیق ، بەلاّم پۆڵەندیەکان بەرگریان لە وڵاتەکەیان کردوو روسەکانیان دەرکرد بە سەر کردایەتی ملادیسلۆی دووەم لە تانتبۆرگ، لە ساڵی ١٤١٠ پشتگیری خۆیان بۆ شانشین دوبارە کردەوە. لەهەمان کات پۆڵەندا کەنارەکەی گەراندەوە سەر دەریای بەلتیق. پۆڵەندیەکان توانیان سەرکەوتن بە دەست بێنن دژی رووس و تورکەکان لەسەدەی چواردەو شانزەدا، بەلاّم دوای ماوەیەك شانشینی پۆڵەندا بە هۆی لاواز بوونی هێزی سەربازی باری ئابووری بوە هۆی دابەش بوونی پۆڵەندا لە نێوان رووسیاو نەمسا لەساڵی١٧٧٢، کەپۆڵەندا گەیشتە قۆناغی نەمان لە دوای ساڵەکانی١٧٩٥ بەلاّم گەلی پۆڵەندا درێغی نەکردلە خەبات کردن لەپێناو گەرانەوەی سەر بەخۆی پۆڵەندا بەو ئاواتە خەباتیان دەکرد

تاکو ساڵی١٩١٨، پۆڵەندیەکان توانیان بونی خۆیان بە شێوەیەکی رەسمی پێکبێننەوە لە دەولەتێکی رەسمی بەپێی پەیمانی فرسای مانگی/٦/ ١٩١٩و راگەیاندنی سەربەخۆی کە لێدەری پیانۆی نیشتمان پەروەر (ئیگناس پادرومسکی)بوە یەکەم سەرەك وەزیران لە ساڵی١٩١٩، بەلاّم (بلسودسکی)لە کودەتایەك توانی دەسەلاّتی تەواو وەربگرێت لە پۆڵەندا لە ساڵی١٩١٩ بە رژێمێکی دکتاتۆری تاکو مردنی لەساڵی ١٩٣٥دوای ئەو مارشال ئدوارد سمیجلی جێگەی گرتەوە، ئەمەش سەرەرای مۆرکردنی پەیمانی نێوان ئەڵمانیاو پۆڵەندا بە پەلامار نەدانی یەکتری لە ساڵی١٩٣٤ بۆ ماوەی دە ساڵ بەلاّم هتلرلە ١٩٣٩/٩/١پەلاماری پۆڵەندایدا، لە ١٩٣٩/٩/١٧ روسیاش پەلاماری پۆڵەندایدا ، لە٩/٢٨ روسیاو ئەڵمانیا رێکەوتن بە دابەشکردنی پۆڵەندا لە نێوانیان بەلاّم دوای ساڵی ١٩٤٠ پۆڵەندا بە تەواوی لە لایەن ئەڵمانیا داگیرکرا. دوای ئەوەلە ساڵی١٩٤٥پۆڵەندا لەلایەن سوپای سوری سۆڤیەت لەژێر چەنگی ئەڵمانیا رزگار کرا بەپێی رێنمایەکانی کۆنگرەی بۆتسدامی مانگی /١٩٤٥/٧ کە بوە هۆی دیاریکردنی سنوری پۆڵەندا کە نوێنەرانی ئەمەریکاو بەریتانیاو سۆڤیەت تێدا بەشداربوون. بەوهۆیە پۆڵەندا زیاترلە ١٨٠ هەزار کیلۆمەتر چوار گۆشەی لە خاکەکەی لەدەست دا. لەساڵی١٩٥٢دەستوری نوێی وڵات راگەیاندراو پۆڵەندا بوە وڵاتێکی دیموکراتی میللی لەسەر شێوازی دەسەلاّتی سۆڤیەت، لە ساڵی١٩٥٥پۆڵەندا بوە ئەندام لە پەیمانی وارشۆو رامیاریەتی دەرەوەی لە سەر شێوازی رامیاریەتی سۆڤیەتی بوو، دەسەلاّتی پۆڵەندا دەستی کرد بە دەرکردنی کنێسەی کاسۆلیك بەناوی ئەوەی کە دژی وڵاتی پۆڵەندیە، لەساڵی ١٩٥٦جومولکا سەرکردەی پارتی کرێکاری یەککرتوو هەڵبژێردرا

بەسەرۆك و دژی رامیاریەتی ستالین وەستاو دەستی کرد بە دەرکردنی ئەو کەسانەی بیری ستالینیان جێبەجێدەکرد، لە دوای ئەوە جموجۆڵی کرێکاران سەری هەڵداو وولات بەرەو تەنگەژەی رامیاری و ئابووری هەنگاوی دەنا بەهۆی راپەرینەکانی کرێکاران و داواکردنەکانیان بە پێك هێنانی سەندیکاو گۆڕینی رژێمی کۆمۆنیستی بە رژێمێکی دیموکراتی . لە دوای سالی ١٩٨٠ حکومەت ناچاربوو ماوەی بە داواکانی کرێکاران بدا، بەلام سەرەرای ئەوەش رێکخراوی (یەکگرتن)ی کرێکاران بەرەو زیاد بون دەرۆیشت و وولات لەبارێکی نارێك دەژیا بەهۆی لێك ترازانی بنەمای پەیوەندی کۆمەلایەتی لەپۆلەندا.

لەدوای سالی١٩٨٠ لەئەنجامی هەلبژاردن سەندیکای کرێکاران توانیان کورسیەکانی پەرلەمان بەدەست بێنن کە ١٦٩کورسی بوو، لەهەلبژاردنەکانی١٩٩٠لەخولی دووەم ڤالیسنا سەرۆکی سەندیکای کرێکاران ٧٤٪ لەدەنگەکانی بە دەست هێناو بوە سەرۆکی پۆلەندا. لە یەکەم هەلبژاردنی ئازاد لە سالی ١٩٩١ کە ٢٩ پارت وگروپ بەژداریان تێدا کرد، لەهەلبژاردنەکانی سالی ١٩٩٣ دووبارە کۆمۆنیستەکان گەرانەوە سەر دەسەلات بە وەرگرتنی زۆربەی کورسیەکان. هەروەها لە هەلبژاردنی سەرۆکی ولات لە سالی ١٩٩٥ دووبارە لە بەرژوەندی کۆمۆنیستەکان بوو، لە ١٩٩٧/٥/٢٥ دەستوری نوێی پۆلەندا راگەیاندرا لە راپرسی گەل. لەمانگی حەوتی هەمان سال پۆلەندە بوە ئەندام لە پەیمانی باکوری ئەتلەسی.

- پۆلەندە ئەندامە لە نەتەوەیەکگرتووەکان، ئەندامە لە پەیمانی باکوری ئەتلەسی، ئەندامە لە رێکخراوی بوژانەوەی ئابووری.

# بیلا رِوسیا (رِوسیای سپی)

- ناوی رەسمی: کۆماری بیلاروس.
- پایتەختی: مینسك، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٩٧٠ر١ ملیۆن کەسە.
- رووبەری: ١٥٤ر٨٠ میل چوار گۆشەو ٦٠٠ر٢٠٧ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٨٩٦ر١٠ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٨.
- چری دانیشتوانی: ١٣٦ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی:٣ر٠ ٪.
- شارە سەرەکیەکانی: جویل، بۆبرۆسك، گرۆدنۆ، فینیسك، مۆجیلیف.
- بەندەرە گرنگەکانی: مازیر.
- نەژادەکانی : بیلاروس ٨٠٪، رووس ١٣٪. پۆلەندی ٤٪ ئۆکرانی٣٪.
- زمانەکانی: بیلاروس (زمانی رسمیە)، رووس، زمانی رسمیە، پۆلەندی، ئۆکرانی.
- ئاینیەکانی: ئۆرسۆزکسی رۆژهەلات ٦٥٪، کاسۆلیکی رۆمانی ٢٥٪. ئیسلام ١٠٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٩٪.
- دابەشی کارگێری: ٦ پارێزگای هەرێمیە، ئەنجومەنی شارەوانی لەپایتەختی مینسکە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر٥٠ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٠٠٠ر٥ دۆلار.

● دراوی: روبلی بیلاروس.
● بەرگری: ٥ر٧٪ لە كۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
● سوپاكەی: ٥٠٠ر٨٥ هەزار كەسە.
● زەوی كشتوكاڵی: ٣٠٪ لە خاكی وولاتەكە.
● بەرهەمی كشتوكاڵی: گەنم وجۆ، دانەوێڵە، پەتاتە، كتان، توفان، چەوەندەری شەكر، شیرو بەرهەمەكانی، هێلكە، تەرە، میوەجات.
● پیشەسازی: تەركتۆر، ماشێنی گواستنەوە، ئامێری كشتوكاڵی، حاسبە، بەرهەمی كیمیاوی، پەینی كیمیاوی، سەلاجەو تەلەفزیۆن، دروستكردنی خۆراك، دارو بەرهەمەكانی دار.
● سامانی ئاژەڵی: مەروبزن ٧٥٠ر٦ ملیۆن سەر، بەراز ٠٥٠ر٤ ملیۆن سەر، چێل وگامێش ٣٠٠ر٥ ملیۆن سەر، پەرەوەر ٦٠٠ر٨ ملیۆن سەر.
● بەرهەماكانی كارەبا: ٢٠٠ر٢٥ ملیار كیلۆ وات كاتژمێر.
● سامانی سروشتی: بیت، جۆرە دارێكە بۆسوتەمەنی بەكاردێت، بیلاروسیا ئەفیونی ترسناك بە شێوەیەكی زۆر بەرهەم دێنیو زۆری لەناو وولاتەكە بەكار دەهێنرێت ئەوی تر بۆ دەرچونە بەرەو ئەوروپای رۆژئاوا.
● هاوبەشەكانی بازرگانی: كۆمارەكانی پێشووی یەكێتی سۆڤیەت، یەكێتی ئەوروپا، چینی میللی.
● رژێمی دەسەڵات: كۆمارێكی دەستوری پەرلەمانیە، پەرلەمانی بیلاروسیاپێك هاتوە لە ٣٥٠ ئەندامو بە پێشنیاری گشتی هەلدەبژێردرێن بۆ ماوەی چوار ساڵ.
● پارتە رامیاریەكان: پارتی بەرەی میللی بیلاروسیا، پارتی كۆمۆنیستی بیلاروس، پارتی جولانەوەی نیشتمانی بیلاروسیا، یەكێتی دیموكراتی مەسیحی بیلاروسیا، پارتی سۆشیالستی بیلاروسیا، چەندین بیرو بۆچونی نەتەوەییو رامیاریو سۆشیالیستی دیموكراتیو كۆمەڵایەتی تری تیایە.
● جوگرافیای وڵات: بیلاروس دەكەوێتە رۆژهەڵاتی ئەوروپا، لاتیڤیاو لتوانیا دەكەوێتە باكوری، ئوكرانیا دەكەوێتە باشووری، روسیا دەكەوێتە رۆژهەڵاتی، پۆلەندە دەكەوێتە رۆژئاوای، زۆربەی خاكی بیلاروسیا دارستان وزەلكاوە، چەندین زێو دەریاچەی تێدایە، چەندین زێو رووباری تری تێدایە كە لە دەریای بەلتیقو دەریای رەش دەكاتەوە، سێ یەكی خاكی بیلاروسیا دارستانی چڕەو گەورەترین دەریاچە دەریاچەی (ئاراتشە) كە درێژی ٧٩,٥ كیلۆمەتر چوار گۆشەیە، گرنگترین زێیەكانی زێی دڤیناو زێی دنبیرو لقەكانیەتی.
● مێژووی وڵات: لەسەدەی پێنجەمی زاینی هۆزەكانی سلافیا لەرۆژهەڵاتی بیلاروسیا نیشتەجێی ئەو ناوچەیە بوون كە لەكۆنەوەش پیان دەگوت، روسیای سپی، كە كەوتبوە ژێر ركێفی پایتەختی ئۆكرانیا لەنێوان سەدەكانی نۆو دوانزە، لەسەدەی سیانزە مەگۆلەكان كیفیان وێران كرد، ئیماراتی ئۆكارنیا هەڵسا بە داگیركردنی بیلاروسیاو بوە ئیماراتێكی لیتوانیای گەورە، لەساڵی ١٥٦٩ هەردوو وولات چونە ناو پۆلەندە، لەسەدەی هەژدەم بیلاروسیا لكێندرا بە دەسەڵاتی روسیای قەیسەری لە دوای دابەشكردنی پۆلەندا لە نێوان روسیا وبیلاروسیا ونەمسا، لەساڵی ١٨٣٩ بە زۆری كەنیسەی كاسۆلیكی رۆمانی هەڵوەشێنرایەوە، لە جەنگی یەكەمی جیهان پۆلەندا بوە گۆرەپانی جەنگی نێوان ئەڵمانیاو روسیا ، لە ساڵەكانی ١٩١٨تا ١٩١٩بیلاروسیا سەربەخۆیەكی تەمەن كورتی بەخۆوە دیت، لەساڵی ١٩٢١ بیلاروسیا بوە دوو بەش بیلاروسیای رۆژئاوا كە كەوتە ژێردەستی

پۆڵەنداو بیلاروسیای رۆژهەلات بوە کۆمارێك لە کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو.

لەساڵی ١٩٣٩ بەزۆری یەکێتی سۆڤیەت بیلاروسیای رۆژئاوایی گێراوە ژێر دەسەڵاتی روسیا بەپێی رێکەوتنامەی نهێنی نێوانیان، لەجەنگی دووەمی جیهان ئەڵمانیای فاشی بیلاروسیای داگیر کرد ومینیسکی وێران کردو ئەنجامی بوە هۆی کوشتنی زیاتر لە ١٫٣٠٠ ملیۆن کەس، دوای کۆتای هاتنی جەنگی دووەمی جیهان بیلاروسیا یەکێك بوو لەدامەزرێنەری نەتەوە یەکگرتوەکان، لەساڵی ١٩٨٦ بەهۆی تەقینەوەی وێستگەی تشرنۆبیلی ئەتۆمی کە بوە هۆی پیس بوونی پێنج یەکی خاکی وڵاتەکەو بە کەڵکی کشتوکاڵی نایەت تاکو ئێستاکەش، لەساڵی ١٩٨٩ بەرەی میللی بیلاروسیا دامەزراو بوە هێزێکی بەتوانا لە دوای دەرچوونی گلاسنۆستی گۆرباتشوف، لەساڵی ١٩٩١ زمانی بیلاروسیا بوە زمانی رسمی، سەربەخۆی بیلاروسیا راگەیەندرا لە ١٩٩١/٨/٢٥ بیلاروسیا سەربەخۆیی تەواوی ڕاگەیاند بە جیابوونەوەی لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، دوای ئەوە بیلاروسیا یەکێك بوو لەدامەزرێنەرانی کۆمەنولسی وولاتانی سەربەخۆی سۆڤیەتی پێشوو کە مینسك بوە بارەگای ئەو کۆمەنولسە. لە ١٩٩٥/٣/١٥ دەستوری وولات راگەیاندرا. لە ١٩٩٦/٤/٢ روسیاو بیلاروسیا رێکەوتن لەسەر بەستنەوەی یەکتری لەبواری رامیاری و ئابووری، لە ١٩٩٧/٥/٢٣ رێکەوتنی هاوکاری دۆستایەتی زیاتر لە نێوان روسیاو بیلاروسیا مۆرکرا.

- بیلاروسیا ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لەوولاتانی کۆمەنولسی سەربەخۆ.

# مۆناکۆ

- ناوی ڕەسمی: ئیماراتی مۆناکۆ.
- پایتەختی: مۆناکۆو ژمارەی دانیشتوانی ١٥٫٠٠٠هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ٧٣ میل چوارگۆشەو (٤٦٥ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دایشتنوانی: ٥٠٫٠٠٠ هەزار کەسە.
- چڕی دانیشتوانی:٦٢٣ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- نەژادەکانی: فەڕەنسی ٥٨٪، ئیتالی ١٦٪، دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ١٩٪.
- زمانەکانی: فەڕەنسی (زمانی ڕەسمیە) ئینگلیزی، ئیتالی، مۆنجسگ ئەویش تێکەڵاوە لە زمانەکانی فەڕەنسی و ئیتالی.
- ئاینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٩٨٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٤ گەڕەکی کارگێڕیە+دوو شارۆچکە لە شێوەی ناحیە. . . .
- گەڕەکەکانی ئەویش شاری مۆناکۆ، فیلکۆن بارەگای (کۆشکی شانشینە) مۆنتیکارلۆ مەڵبەندێکی سەرەکی گەشت و گوزاریە، لاکونداجن ناوچەیەکی بەندەریە ، فۆنتفیل بەشی پیشەسازیە.
- دراوی: فرەنکی فەڕەنسیە، یان فرنك مون گسك.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٨٥٠ ملیۆن دۆلارە.

- بەشی تاك لەكۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٢٥٫٥٠٠ دۆلارە ئەوەش بڵێین کە ئێستا ٧٥٪ دەرامەتی موناکۆ لە باجەکان و نرخی زیاد لەسەر ئوتێلەکان و بانکەکان و کەرتی تایبەتی و گۆڕینەوەی دراوە، ئەوی تر ٢٥٪ لەداهاتی گەشت و گوزار.
- ڕژێمی دەسەڵات: شانشینی دەستوریە، حکومەتی لەسێ ڕاوێژکار پێك هاتوە کە وەزیر سەرۆکایەتی دوڵەت دەکا ئەویش دەبێ فەڕەنسی بێ. ئەنجومەنی نیشتیمانی لە ١٨ ئەندام پێك هاتووە کە هەڵدەبژێردرێن بۆ ماوەی پێنج ساڵ بە پێشنیاری گشتی. دەسەڵاتەکە بە هاوبەشیە لەگەڵ ئەمیر لە دەسەڵاتی یاسادانان. بەڵام کاروباری دەرەوەی حکومەتی فەڕەنسا ڕێکی دەخات. هیچ پارتێکی ڕامیاری تێدانییە تەنیا پارتی دیموکراتی نیشتیمانی نەبێت.
- جوگرافیای مۆناکۆ: مونکۆ دەکەوێتە سەر کەناری باکوری ڕۆژئاوای دەریای سپی ناوەڕاست . ئەویش پێك هاتەیەکی ئیمارەتی بچووکە لە کەناری باشووری ڕۆژهەڵاتی فەرەنسا بە دوری ٩میل لە ڕۆژهەلاتی بەندەری نیسی فەرەنسی،فەرەنسا دەکەوێتە ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتی و باشوریەوە، مەڵبەندێکی گەشت و گوزاریە و دەزگایەکی پاپۆڕ و کەشتی و یەختەکانە. هەر ئەمەش بوە هۆی بەرزبوونەوە لە بوژانەوەی باری ئابووری و بژێوی ژیانی دانیشتوانەکە. موناکۆ دووەم وڵاتە لە بچووکی لەدوای دەوڵەتی فاتیکان.
- مێژووی موناکۆ: ئیماراتی موناکۆ بەناوی (هرقل) موناکۆی کراوە بە هۆی تواناو بەهێزی ئەو مرۆڤە لەکارە چیرۆکەکانی لەدوای ئەفەریقی و فینەقیەکان، مۆناکۆ بە ئیمارەتێکی سەربەخۆ ماوەتەوە دوای سێ سەد ساڵ تا ئەو کاتەی بۆتە خاوەندیەتی بنەماڵەی کریملدی دادوەری لەشێن ئیتاڵیا لە ساڵی ١٢٩٧ زاینی. دوای ئەوە فەڕەنسا و ئەسپانیا و سردینیا خستیانە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. لە ساڵی ١٧٩٣ کەوتە ژێر دەستی فەڕەنسا لەدوای شەڕی ناپلیۆنیەکان و هەڵاتنی فەڕەنسا موناکۆ بوە ژێر دەستەی سردینیا لە ساڵی ١٨١٥. لە ساڵی ١٨٦١ مافی ئۆتۆنۆمی وەرگرت بە پێی پەیمانی فەڕەنسا(رمون گسك). لە ساڵی ١٩١٨ پەیمانێکی تر مۆرکرا کە موناکۆ ببێتە دوورگەیەکی پارێزراوی فەڕەنسا و لەگەڵ ئەوەشدا مافی ئەوەی دا کە هەر کەسێك بەرهەڵستکاری خۆ پاڵاوتنی هەبێت لە دەسەڵاتداریەتی ئیمارەتەکە. ئەمیر ڕینیە لە دوای کۆچی دوایی باوکی لە ١٩٤٩/٥/٩بوە ئەمیری مۆناکۆی سێیەم، لە ٢٠٠٥/٤/٦ ئەمیر ڕینیە کۆچی دوایی کردو کوڕەکەی ئەلبیر جێگەی گرتەوە ... ئەو بنەماڵەیە زیاتر لە ٧٠٠ ساڵ دەسەڵاتیان لەسەر ئەو ناوچە بچوکە هەیە.
- موناکۆ لە ساڵی ١٩٩٣ بوە ئەندامە لە نەتەوە یەککگرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپی.

# مالتە

● ناوی ڕەسمی: کۆماری مالتە.
● پایتەختی: مالتا، ژمارەی دانیشتوانی ١٠٢ر٠٠٠ هەزار کەسە.
● شارە گرنگەکانی: سەلیمە، فالتە. لەهەمان کاتا فالتە بەندەرێکی سەرەکیە.
● ڕووبەری: ١٢٢ میل چوارگۆشەو ٣١٦ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
● ژمارەی دانیشتوانی: ٥٦٨ر٠٠٠ هەزار کەسە.
● چڕی دانیشتوانی: ٤٦٥٥ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
● نژادەکانی: مالتیەکان تێکەڵاون لەگەڵ عەرەب و سقلی و ئەسپانی و ئیتالی و ئینگلیزی.
● زمانەکانی: مالتی و ئینگلیزی (هەردوکیان زمانی ڕەسمین) ئیتالی.
● ئاینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی.
● زانینی خوێندن و نوسین: ٩٥٪.
● دابەشی کارگێڕی: ٣ هەرێمەولە ٦٧ ئەنجومەنی ناوخۆیی پێك هاتیە.
● کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥ر٠٢٥ ملیار دۆلار.
● بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١٢ر٥٠٠ دۆلار.
● دراوی: لیرە.
● بەرگری: ١ر١٠٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
● سوپاکەی: ١٢ر٠٠٠ هەزار کەسە.
● زەوی کشتوکاڵی: ٤٠٪ لەخاکی وڵاتەکە.
● بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، پەتاتە، چەوەندەری شەکر، تەڕە، میوەجات.
● سامانی ئاژەڵی: مەڕ و مالاتی هەیە بەلام ڕێژەکەم بەشێوەیەکی باش نەزانی و نەم توانی دیاری بکەم تەنیاپەرەور نەبێت کە ٨٥٠ر٠٠٠ هەزار سەر بەرهەم دێنێ.
● پیشەسازی: گەشت و گوزار، ڕستن و چنین، پێلاو، کەشتی، خواردەمەنی، خواردنەوە، ئەلیکترۆنی.
● سامانی سروشتی: بەردی چەو، خوێ.
● داهاتی دەرەوەی: نەوت، خۆراك، ماشێن، کەلوپەلی دروستکراو.
● دەرچووەکانی: جل و بەرگ، پێلاو، کەشتی.
● هاوبەشەکانی بازرگانی: ئیتالیا، یابان، چین، بەریتانیا، ئەمەریکا، ئەلمانیا، فەرەنسا.
● ڕژێمی دەسەلات: پەرلەمانی دیموکراتیە. ئەنجومەنی نوێنەرانی لە ٦٥ ئەندام پێکهاتووەو هەڵدەبژێردرێن بە پێشنیاری گشتی، سەرۆك کۆماری هەیە، ئەنجومەنی وەزیران بەرپرسیارە بەرامبەر بە ئەنجومەنی نوێنەران.
● پارتە ڕامیاریەکان: پارتی لایەنگیری ڕوەو ئەوروپا، پارتی نەتەوەیی، پارتی کاری مالتی، پارتی ڕاست ڕەوی ناوەند، پارتی مەسیحی مالتی، چەندین پارت و بزوتنەوەی بچووکی تری تیایە.
● جوگرافیای وڵات: دورگەی مالتا دەکەوێتە ناو جەرگەی دەریای سپی ناوەڕاست بە دوری ٦٠ میل لەلای باشوری ڕۆژهەلاتی دورگەی سقلیە. کە هەڵکەوتەیەکی جوگرافی ستراتیژی لەنێوان ئەوروپا و ئەفریقیا هەیە کە بەشی مالتاو جۆزۆ کۆمیتۆ کە دوو دورگەکەش دەگرێتە خۆی کە دانیشتوانی تیا نییە. ئیتالیا دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی، کەنارێکی بڵند و نەوی ناخۆشی تیایە لە ناوەڕاستی و گردۆلکەی نەوی و زەویەکی بێ پیتی تیایە. بەلام لەدوای کردنەوەی کەنالی سویس لە ساڵی ١٨٦٩ مالتە

بوە جێگایەکی سەربازی گرنگ لەلایەن هێزەکانی بێگانە.

- مێژووی وڵات: بەهۆی گرنگی ئیستراتیژی دورگەی ماڵتا فەینیقیەکان یەکەم کەس بوون کردیانە جێنشینگەی خۆیان لەدوای ئەوانیش ئەغریقی و قرتاجیەکان بۆی هاتن لەنێوان ساڵەکانی ١٠٠و٦٠٠ی پێش زاینی. بەڵام دوای بوە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی رۆمانی دوایش ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی. لەدوای ئەوانیش لەلایەن عەرەب و نۆرمەندیەکانو چەندین کەسایەتی دەرەبەگ حکومڕانی دەکرا. لە ساڵی ٥٨ زاینی پاپۆری قەدیس پۆڵس لەسەر دورگەکە تێك شکا. لەسەدەی شانزەم (شارلی پێنجەم) ئیمپراتۆریی رۆمانی پیرۆز دەستی لە ماڵتە کێشاوە بوە یەکێ لە تائفەکانی کەنیسەی کاسۆلیکی رۆمانی. کە ئەوانیش تائفەی فرسانای پیرۆزی یوحەنا بوو. تاکو لەلایەن ناپلیۆن داگیر کرا لە ساڵی ١٧٩٦،دانیشتوانەکە بەرگریان لە ماڵتا کرد دژی داگیر کەری فەرەنسا وەستان. لە ساڵی ١٨١٤ ماڵتا چوە ناو بەریتانیا بەپێی پەیمانی پاریس بە مەرجێ کیانی کنیسەی کاسۆلیك مافەکانی بپارێزرێت، لە کۆتایەکانی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم ماڵتا بوە بنکەیەکی سەربازی دەریای زینەدووی بەریتانیا، لەکاتی شەڕی دووەمی جیهان ببوە دورگەی شاڵاوەکانی فرۆکەوانی ئەڵمانی و ئیتاڵی بەڵام گەلانی ماڵتا بەهەموو توانا بەرگری و خۆڕاگری خۆیان بۆ وڵاتەکە لەخەبات بەردەوام بوون. ماڵتا لە ساڵی ١٩٤٢ نیشانەی خراپی لەلایەن جورج وەرگرت بەهۆی خۆگری و خەباتگێریان. لە ساڵی ١٩٤٧ ماڵتا مافی ئۆتۆنۆمی وەرگرت. لە ساڵی ١٩٥٥ دۆم مینتۆف لە پارتی کاری ماڵتی پۆستی سەرۆك وەزیرانی وەرگرت. لە٢١/٩/١٩٦٤ماڵتە سەربەخۆی خۆی لە بەریتانیا وەرگرت لە ناو کۆمەنولسی بەریتانیا، لە ساڵی ١٩٦٤ پەیمانی بەرگری و یارمەتی ئابووری لەگەڵ بەریتانیا مۆرکرد بۆ ماوەی دە ساڵ، لە ساڵی ١٩٧١ دوم مینتوف ئەو پەیمانەی کە لە ساڵی ١٩٦٤ مۆرکرا بوو هەڵی وەشاندەوە. لە ساڵی ١٩٧٢ لە ئەنجامی گفتوگۆی مینتوف لەگەڵ پەیمانی ئەتڵەسی بنکەی ماڵتای سەربازی بۆ ماوەی حەوت ساڵ بە کرێدا، لە ساڵی ١٩٧٤ ماڵتا رژێمی کۆماری راگەیاند، لە ساڵی ١٩٧٩ بنکەی سەربازی بەریتانی داخست و پەیوەندی لەگەڵ وڵاتە شیوعیەکان بەهێزکرد لەوانە لیبیا، لەدوای مانگی/٤/١٩٧٩ دوا سەربازی بەریتانی لە خاکی ماڵتا کشایەوە، لە ساڵی ١٩٨٤ دوم مینتۆف خانە نشین بوو (کار منۆبۆتشی) جێگەی گرتەوە چ لەسەرۆك وەزیران و چ لە سەرکردەی پارتی کاری ماڵتی. لە ساڵی ١٩٩٠ ماڵتا داوایەکی ئاراستەی یەکێتی ئەوروپا کرد بۆ چوونە ناویەکیەتی ئەوروپا، لە ساڵی ١٩٩٦ پارتی کاری سۆشیالستی دەسەڵاتی وەرگرتەوە. ماڵتا لە ١٧/٤/٢٠٠٣ لە یەکێتی ئەوروپا وەرگیرا لەگەڵ چەندین وڵاتی تری سەربەخۆی لەدوای هەرەس هێنانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو.

- ماڵتا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە یەکێتی ئەوروپا، ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە رێکخراوی هاوکاری ئاسایشی ئەوروپی،ئەندامە لە چەندین رێکخراوی تایبەتی تری کشتوکاڵی و بەنکی دوەلی و کاری دوەلی و خەزنەی دراوی دوەلی و تەندروستی جیهان.

# لیکتنشتین

- ناوی ڕسمی: ئیمارەتی لیکتنشتین.
- پایتەختی: ڤادۆز، ژمارەی دانیشتوانی ٥٠٠ر١٥ هەزار کەسە و دوورگەی بچوکی بەرهەمهێنەری گەشت وگوزاریەو بوژێنەری ئیماراتەکەیە.
- ڕووبەری: ٦١ میل چوارگۆشەو ١٥٧ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٨٠٠ر٥٠ هەزار کەسە.
- چڕی دانیشتوانی: ٧٥٠ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- نژادەکانی: ئەڵمانی٩٥٪ .
- ئاینەکانی: کاسۆلیکی رۆمانی ٨٨٪، پرۆتستانت ٨٪، ئاینەکانی تر ٤٪.
- زمانەکانی: ئەڵمانی(زمانی ڕەسمییە).
- زانینی خوێندن و نوسین: ٩٥٪.
- دابەشی کارگێڕی: ١١ کۆمیۆنە (هەرکۆمیۆنێك یەکەیەکی ناوخۆی بچوکە).
- دراوی: فەرنگی سویسری.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٧٢٠ ملیۆن دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر٢٣دۆلارە.
- بەرگری: وولآتی سویسرا بەرپرسیاریەتی بەرگری لێکردنی لە ئەستۆیە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر٢٤٪ لەخاکی ئیماراتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم و جۆ، دانەوێڵەی تر، پەتاتە، گەنمەشامی، تەرە، میوەجات، چەوندەری شەکر.
- پیشەسازی: ئامێری ڕێکخستن، سیرامیك، ئەلکترۆنی، ڕستن وچنین، کیمیاوی، داودەرمانی پزیشکی، بەرهەمی خۆراك.
- سامانی سروشتی: بەرهەمی وزەی کارەبا.
- داهاتی دەرەوەی: ئۆتومبێل، کەلوپەلی گواستنەوە، ئامێری دروستکردنی خۆراك، کەلوپەلی کانزایی، بەرهەمی ڕستن وچنین.
- دەرچووەکانی: بەرهەمی پزیشکی ددان، ئامێری کۆمپیوتەر، کەلوپەلی سیرامیکی، ماشێنی بچووکی تایبەتمەند.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: وولاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا، سویسرا، یابان، لیکتشتین بارەگایەکی ئاسایی هەزار کۆمپانیای نیودەوڵەتیە و گۆڕینەوەی دراو نزیکەی سێیەکی دانیشتوانی ئەم کارە دەکەن.
- ڕژێمی دەسەڵات: شانشینی دەستوری میراتیە، سەرۆکی وولاتەکە ئەمیر هانز ئادەمی دووەمە، سەرۆك وەزیران ماریو فرنکە، ئەنجومەنی یاسادانانی (لاند تاج) پێك هاتوە لە ٢٥ ئەندام و هەڵدەبژێردرێ بە پێشنیاری ڕاستە و خۆ و تەمەنی پێشنیاری کراوی ٢٠ ساڵ. لەساڵی ١٩٨٦ ئافرەت مافی خۆ هەڵبژاردن و دەنگدانی پێ دراوە.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی هاولاتیانی پێشکەوتوو، یەکێتی نیشتیمانی، پارتی پارێزگاران.
- جوگرافیای ئیماراتەکە: لیکتنشتین ئیماراتێکی بچووکەو کەوتۆتە ناو جەرگەی ئەورووپا لە چیاکانی (ئەلەبە) لەنێوان سویسرا لە ڕۆژئاواو ئەمسا لە ڕۆژهەلاتی، دۆڵی (راین) سێیەکی وولاتەکە دەگرێتەوە لەگەڵ ئەوەشدا چیای ئەلەب سێیەکی تری دەکەوێتە سەرکەرتی ڕۆژهەلاتی زێی راین و لە باشوری دەریاچەی کونستنسە.
- مێژووی ولات : لیکتنشتین لە ساڵی ١٧١٩

ئەندامە لە یەکێتی کونفدرالی ئەڵمانیا، لە ساڵی ١٨١٥ تاکو ١٨٦٦ تا ئەوکاتەی بوە ئیماراتێکی سەربەخۆ. لە ساڵی ١٨٦٨ سوپای پێك هێناو بێلایەن وەستا لەهەموو شەڕە جۆراو جۆرەکانی جیهان. پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ نەمسا هەبوو بەهۆی بەکار هێنانی بەندەرەکانی تاکو ساڵی ١٩٢٠، دوای لەگەڵ سویسرا هەموو هەڵسورانی کاروباری پۆستە و دوای بەستنەوەی بەهۆی یەکێتی گومرگی و دراوی.

لە ساڵی ١٩٩٣ پارتی یەکێتی نیشتیمانی سەرکەوتنی پەرلەمانی بەدەست هێنا، لە مانگی/١٢/ ١٩٩٣ دەنگدەران ڕازی بوون لەسەر پەیمانی بەستراوی رایەڵەی ئەورووپی یەکێتی ئەروپا.

● لیکتنشتین ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە رایەڵەی بازرگانی ئازادی ئەورووپی، ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاری ئاسایی ئەورووپی.

# لیتوانیا

● ناوی ڕەسمی: کۆماری لیتوانیا.
● پایتەختی: فیلنیس، ژمارەی دانیشتوانی٠٠٠ر٧٢٥ هەزار کەسە.
● ڕووبەری: ٢٠٠ر٢٥ میل چوارگۆشە و٢٠٠ر٦٥ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
● ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٢٩٥ر٤ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ٢٠٠٠.
● چڕی دانیشتوانی: ١٧٠ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
● شارە گرنگەکانی: کۆناس ..
● بەندەرە سەرەکیەکانی: کلایبیدا.
● زمانەکانی:لتوانی(زمانی ڕەسمیە) ڕووسی، پۆلەندی.
● ئاینەکانی: زۆربەی هەرە زۆری کاسۆلیکی ڕۆمانین.
● نـژادەکانی: لتوانی ٨١٪ ڕوسی ١٠٪، پۆڵەندی ٧٪.
● دابەشی کارگێڕی: ٤٤ هەرێمەو ١١ ئەنجومەنی شارەوانییە.
● دراوی: لیتاس.
● کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر١٥ ملیار دۆلار.
● بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر٤ دۆلار.
● بەرگری: ٠٥ر٥٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
● سوپاکەی: ٠٠٠ر٦٠ هەزار کەسە.
● زەوی کشتوکاڵی:٥ر٣٥٪لە خاکی وولاتەکە.
● بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، دانەوێڵەی تر، چەوەندەری شەکر، گێزەر، پەتاتە، تەڕە، میوەجات.
● سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٠٠٠ر٦١٥ هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر٤٦٠ هەزار سەر، چێڵ ٠١٠ر١ ملیۆن سەر، بەراز ٢١٠ر١ ملیۆن سەر، پەڕەوەر ٥٠٠ر٧ ملیۆن سەر.
● سامانی سروشتی: لم، بیت، کوانز، گەچ، دولۆمیت، سلسال، بەردی چەوی، ئاوی کانزایی.
● پیشەسازی: پاڵاوتنی نەوت، حاسبات و ئەلیکترۆنی، سارد کەرو بەفرگر، ئامێری تەلەفزیۆن، ماشێنی کارەبای، دروستکردنی

کەشتی، ڕستن و چنین، چەندین دروستکراوی تر.

- بەرهەمی کارەبا: ۱۲٫۹۰۰ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی گواستنەوە، کانزاکان، کەلوپەلی کارەبایی، ماشێن و ئامێری جۆراو جۆر.
- دەرچووەکانی: بەرهەمی کانزاکان، ماشێن، کەلوپەلی کارەبایی، کەلوپەلی ئەلیکترۆنی، کیمیاوی، گۆشت، بەرهەمی شیری، هێلکە.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: وولاتانی کۆمەنولسی سەربەخۆ. یەکێتی ئەوروپا، چین، یابان.
- ڕژێمی دەسەلات: کۆمارێکی دیموکراتیە. سەرۆک کۆمار ڕاستەوخۆ هەلدەبژێردرێت کە ئەویش سەرۆک وەزیران دادەمەزرێنێ دەبێ پەرلەمان ڕەزامەندی لەسەر بکات.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی دیموکراتی مەسیحی لیتوانی، پارتی کۆمەلایەتی دیموکراتی لیتوانی، پارتی کاری دیموکراتی لیتوانی، پارتی پارێزگارانی یەکگرتووی لیتوانیەکان، پارتی ڕاست ڕەوی ناوەندی، چەندین پارت و ڕێکخراوی تر تیایە.
- جوگرافیای ولات: لتوانیا دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەلاتی ئەوروپا لەسەر کەناری باشوری ڕۆژهەلاتی دەریای بەلتیق. گەورەترین کۆماری سێیەمی ناوچەی بەلتیقە. لە سالەکانی ۱۹٤۰ تاکو ۱۹۹۱ یەکێك بوە لە کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو. لاتیفیا دەکەوێتە باکوری بیلاڕوس (ڕوسیای سپی) دەکەوێتە ڕۆژئاوای. خاکەکەی زۆربەی دارستان و دەریاچەو ئاوەڕۆی ئاو زۆی تیایە گەورەترینیان زۆی نیمان. زەوی کشتوکالی سەرچاوەی بەرهەمی سەرەکی سروشتیە.
- مێژووی ولات: لتوانیا لەسەردەمە کۆنەکان ئیمارەتێکی گەورە بوە بەهۆی ژن خواستن لەگەل شانشینی پۆلەندا بەیەك بەسترابونەوە. هێزەکانی لتوانیا و پۆلەندا چونە ناو یەکتری کە هێزەکانی ئەلمانیای تیوتونیەکان لە پێك دادانی تانتیبرگی سالی ۱٤۱۰ ڕاونران. هێزەکانی هەردوو دەولەت توانیان دەسەلاتی خۆیان فراوان بکەن تاکو قولایی خاکی ڕووسیا. بەلام لتوانیا ژێر کەوت لەسەر دەستی ڕوسەکان لە سالی ۱۷۹۵ لەوکاتەی کە پۆلەندا دابەش بوو. لتوانیا نەی توانی سەربەخۆی بەدەست بێنێ تاکو سالی ۱۹۱۸. نزیك کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهان، لتوانیا لە سالی ۱۹٤۰ لەلاین یەکێتی سۆڤیەت داگیر کرا. لە مانگی/۸/۱۹٤۰ لکاندیە خاکی خۆی بەلام ئەلمانیا لە سالی ۱۹٤۱ داگیری کردو دوای دووبارە ڕوسیا داگیری کردەوە، لە سالی ۱۹٤٤ وولاتانی ڕۆژئاوا بەتایبەتی ئەمەریکا بەڕازی نەبوونی لەسەر ئەوەی کە ڕوسیا لتوانیا داگیر بکات. لە سالی ۱۹۸۸ جولانەوەی ڕزگاری لتوانیای سەربەخۆ سەری هەلداو لە مانگی/۲/۱۹۹۰ هەلبژاردن ئەنجام دراو لاندس بیرجیس سەرۆکی جولانەوەی ساجودیس سەرکەوتنی بەدەست هێناو بوە سەرۆك کۆمار. لە ۱۹۹۰/۳/۱۱ ئەنجومەنی بالا بڕیاری جیابونەوەی دا لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو. سەربەخۆی گەڕاندەوە کە یەکەم وولات بوو لە ناوچەی بەلتیق ئەو کارەی ئەنجام دا. لە ۱۹۹۱/۹/۲ سەرۆکی ئەمریکی بۆشی باوك دانی بە سەربەخۆی لتوانیا ناو دوای ئەویش بەچەند ڕۆژێك یەکێتی سۆڤیەت دانی بەسەر بەخۆی لتوانیا نا، لە ۱۹۹۱/۹/۱۷ لە نەتەوە یەکگرتووەکان بە ئەندام وەرگیرا. لە سالی ۱۹۹۲ پارتی کاری دیموکراتی لتوانیا (شیوعی پێشوو) سەرکەوتنی لە هەلبژاردن بەدەست هێنا لە پەرلەمان و لە سالی ۱۹۹۳ برازوسکای سەرۆکی پارتی کار بەسەرۆك کۆمار هەلبژێردرا

و پەیمانی بازرگانی ئازادی لەگەڵ وڵاتانی بەلتیق مۆرکرد ، دوای هێزەکانی ڕووسیا لە خاکی لتوانیا بە تەواوی کشانەوە. لە ساڵی ١٩٩٤ پەیمانی هاوکاری لەگەڵ پۆڵەندا مۆرکرد دوایش لەگەڵ یەکێتی ئەورووپا. لە مانگی/١٢/ ١٩٩٥ داوای لە یەکێتی ئەورووپا کرد بۆ بوونی بە ئەندام ، لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٩٦/١٠/٢٠ و ١٠/نۆڤەمبەر/١٩٩٦ پارتی یەکێتی نیشتیمانی سەرکەوتنی بەدەست هێنا. لە ١٩٩٨/١/٤ (ڤلدس ئەدمکوس) بە سەرۆك کۆمار هەڵبژێردرا.

● لتوانیا: ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی ئاسایشی و هاوکاری ئەورووپی، ئەندامە لە ڕێکخراوی (فاو، بەنکی نێو دەوڵەتی و ڕێکخراوی نێودەوڵەتی و خەزنەی دراوی نێو دەوڵەتی و ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی).

# لاتیڤیا

● ناوی ڕەسمی: کۆماری لاتیڤیا.

● پایتەختی: ریگا، ژمارەی دانیشتوانی٠٠٠ر١٦٠ر١ملیۆن کەسە.

● ڕووبەری: ٤٠٠ر٢٤ میل چوارگۆشەو ١٠٠ر٦٣ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.

● ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٩٧٥ر٢ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٧.

● چڕی دانیشتوانی: ١٢١ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.

● بوژانەوەی دانیشتوانی: ١٪.

● شارە سەرەکیەکانی: دوو جافیل، لیباجا لەهەمان کاتا بەندەرێکی سەرەکی وڵاتەکەیە.

● زمانەکانی: تیشیە (زمانی ڕەسمیە) لیتوانی، روسی .

● ئاینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی، ئۆرسۆزکسی روسی.

● نەژادەکانی: لاتیڤی٦٠٪، ڕووسی٣٠٪، لتوانی١٠٪.

● زانینی خوێندن و نوسین: ٩٨٪.

● دابەشی کارگێڕی: ٢٦ هەرێمە + ٧ ئەنجومەنی شارەوانی.

● دراوی: لاتسن.

● کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر١٠ ملیار دۆلار.

● بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٣٠٠ر٤ دۆلار.

● بەرگری: ٥ر٤٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.

● سوپاکەی:٠٠٠ر٦٠ هەزار کەسە.

● زەوی کشتوکاڵی: ٢٧٪ لەخاکی وڵاتەکە.

● سامانی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، پەتاتە، چەوەندەری شەکر، تەرە ، میوەجات.

● سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٠٠٠ر٣٦٨ هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر٤٣٥ هەزار سەر، چێڵ ٠٠٠ر٤٣٥ هەزار سەر، بەراز ٠٠٠ر٤٣٠ هەزار سەر،پەرەور ١٠٠ر٣ ملیۆن سەر.

● پیشەسازی: ڕیم، شەمەندەفەر، ئۆتۆمبێل، خۆراکی ئاژەڵی، ئامێری کشتوکاڵی، پەینی کیمیاوی، ئەلیکترۆنی هەمە جۆر، ڕستن و چنین، ساردکەرو بەفرگر، ئامێری ڕادیۆ، داودەرمانی پزیشکی.

● بەرهـەمی کارەبـا: ٧٠٠ر٣ ملیـار کیلـۆوات کاتژمێر.

● سامانی سروشتی: پیت، دار، بەردی چەوی، (حجر جیری) دۆلۆمیت، سابوویل، سلسال.

● داهـاتی دەرەوەی: نـەوت، ئـامێرو ماشـێن، کیمیاوی.

● دەرچـووەکانی: بەرهـەمی کـانزای، ئـامێرو ماشێن، کەلوپەلی کارەبایی، تەلەفزیۆن و سارد کەرو ڕادیۆ، گۆشت، بەرهەمی شیری، هێلکە.

● هاوبەشـەکانی بازرگـانی: پۆڵەنـدە، ئـەڵمانیا، چـین، یابـان، ئەمـەریکا، تـشیلی، ڕوسـیا، ئۆکرانیـا، سـوید، کۆمارەکـانی پێـشووی سۆڤیەت.

● ڕژێمـی دەسـەڵات: کۆمـارێکی دیمـوکراتی پەرلەمانیە. سەرۆك کۆمار و سەرۆك وەزیران سەرۆکایەتی حکومەت دەکەن لەگەڵ پەرلـەمانی وولاتەکە.

● پارتە ڕامیاریەکان: پارتی ڕێگای لاتیڤی، پارتی ڕاسـت ڕەوی ناوەنـدی، پـارتی نیـشتیمانی پارێزگـارانی لاتیڤـی، پـارتی یـەکێتی ڕامیـاری ئـابووری، پـارتی یەکـسانی لـەماف، پـارتی یـەکێتی کـشتوکاڵی لاتیڤـی، پـارتی یـەکێتی دیمـوکراتی مەسـیحی، پـارتی دیمـوکراتی ناوەنـد، پـارتی جولانـەوە لـە پێنـاو لاتیڤیـا. چەندین پارت و ڕێکخراوی تری تیایە.

● جوگرافیـای وڵات: لاتیڤیـا دەکەوێتـە بـاکوری ڕۆژهەڵاتی ئەورووپاو دەکەوێتە ناوەندی هەرسێ کۆمارەکانی بەلتیق. لە ماوەی ساڵی ١٩٤٠ تا ١٩٩١ یـەکێك بـوو لـە کۆمارەکـانی یـەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، دەریـای بەلتیق و کەنداوی ڕێگـا دەکەوێتـە ڕۆژئـاوای. ئیـستوانیا لـە باکوری، لتوانیاو بیلاروسیا (ڕوسیای سپی) لە باشـوری، ڕووسـیا لـە ڕۆژهـەڵاتی. خاکەکـەی نەویایـە و بەپیتـە لـە ڕۆژهـەڵاتی و چـەندین دەریاچەو گردو دۆڵی بەسوودی تیایە.

● مێژووی وڵات: لاتیڤیەکان لە ڕەچەڵەکدا ئارین و لـە سـەردەمەکانی کـۆن نیـشتەجێی ئـەو ناوچەیەی بەلتیق بوونەو لە چ کاتێکدا خاوەن حکومەت نەبوونە بۆیە هەردەم نێچیری وولاتی تری بەهێز بونە. سوارە تیوتیونیە ئەڵمانەکان یەکـەم نەتـەوە بوونـە ئـەو ناوچـەیان داگـیر کـردووە، لەسـەدەی سـیانزەهەم حوکمڕانیـان تێداکردوە تـا سـاڵی ١٥٦٢ کـە هـەرێمی تـەواو بوو و هـەرێمی کورلانـدی گرتبوە خۆی. دوای ئەوە پۆڵەندە ئەو هەرێمەی داگر کردو کورلاندە کەوتـە ژێـر دەسـەڵاتی تـا سـاڵی ١٧٩٥. بـەڵام هەرێمی تەواو بوو هەردەم کێشەی نێوان سوید و پۆڵەندە بوە. لە ساڵی ١٥٦٢ تا ساڵی ١٦٢٩ دوای سوید لاتڤیای خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی لـە سـاڵی ١٦٢٩تـا١٧٣١ تـا ئەوکاتـەی ڕوسـیا داگیری کرد، هـەروەها کورلاندەشی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی لەدوای سێیەم دابەش کردنی پۆڵەندە لە ساڵی ١٧٩٥ و هەر لـەژێر چاودێری ڕووسـی مایـەوە تـاکو سـاڵی ١٩١٨سـەرەڕای ئەوەی کەلاتیڤیەکان بەرگری تـەواویان لـەبوونی نەتـەوەیی و زمـان و مێـژو و داب و نـەریتی خۆیان دەکرد.

لە ساڵی ١٩١٧ دوای شۆڕشی ئۆکتۆبرو ماوە پـێ دانیـان توانیـان لـە ١٩١٨/١١/١٨ سەربەخۆی کۆمـاری لاتیڤیـا ڕاگەیـەنن و لـە سـاڵی ١٩٣٩ هێزەکانی ڕوسیا لاتڤیای داگیری کردو لکاندیە ژێر دەسەڵاتی یەکێتی سۆڤیەت ئەویش لە ساڵی ١٩٤٠. ئـەڵمانیا لـە سـاڵی ١٩٤١ داگـیری کـرد لەکاتی شەڕی دووەمی جیهانی تاکو ساڵی ١٩٤٤ کە ڕوسیا ئەڵمانـەکانی لەو هەرێمە دەرکرد بەڵام زۆربـەی وولاتـانی ڕۆژئاواو ئەمەریکا دانیـان بەو لکاندنە نەنا. لەوکاتە کودەتاکەی سەر کورباتشۆڤ و دروسـت بـوونی هـەل زێـرین بـۆ وولاتـەکانی بەلتیق و ڕزگار بونیان لـەژێر دەسـەڵاتی سۆڤیەت ئـەوەبوو لاتیڤیـا و ئیـستیوانیاو لیتوانیـا لـە

١٩٩١/٨/٢١ سەربەخۆی خۆیان بەجیا بوونەوە لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو ڕاگەیاند. زۆربەی زۆری وڵاتانی ڕۆژئاواو جۆرج بۆشی باوک سەرۆکی ئەمەریکا دانی نا بەو سێ وڵاتە بەلتیقیە. لە ١٩٩١/٩/٦ یەکێتی سۆڤیەتیش دانی بەسەربەخۆیی ئەم وڵاتانە نا. لە ١٩٩١/٩/١٧ بوە ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان. لەمانگی/١٩٩٣/٦ یەکەم هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئەنجام درا. لە مانگی/١٩٩٤/٨ دوا سەربازی ڕوسیا لە کۆماری لاتیڤیا کشاوە.

لە سالی ١٩٩٥ مۆرکردنی ڕێکەوتنامەی هاوکاری بازرگانی لەگەڵ یەکێتی ئەورووپا.

((ئەندریس سکیل بۆجاری دووەم هەلبژێردرا بەسەرەك وەزیران لە سالی ١٩٩٩ لە سیاسەت مەدارێکی بێ لایەن بوو، لە مانگی/١٩٩٩/٦ ئەنجوومەنی یاسادانان ((ڤیك فریبگای)) بەسەرەك کۆمار هەلبژارد.

● لاتڤیا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاریو ئاسایشی ئەورووپی.

# لاکسمبۆرگ

● ناوی ڕەسمی: ئیماراتی لاکسمبۆرگی مەزن

● پایتەختی: لۆکسمبۆرگ، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر١٣٥ هەزارکەسە.

● ڕووبەری: ٠٠٠ر١میل چوارگۆشەو ٥٩٠ر٢کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.

● ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٥٢٥ هەزارکەسە.

● چڕی دانیشتوانی: ٥٢٥ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.

● بەندەرەسەرەکیەکانی: مرترت.

● نژادەکانی: لۆکسمبۆرگی ٧١٪، پورتوگالی١٠٪، ئیتالی ٥٪، فەرەنسی٣٪، ئەڵمانی٢٪، سەرەڕایئەوەش دانیشتوانی لۆکسمبۆرگ تێکەڵاون لە ڕەچەڵەکەکانی ئەلمانیو فەرەنسیوسەلتی. سەرەڕای ئەو تێکەڵاو بونە دانیشتوانی لۆکسمبۆرگ کەسایەتیەکی تایبەتی خۆیان هەیە نیشانەی بیانیان پێوە دیارنیە.

● زمانەکانی: فەرەنسی (زمانی ڕەسمیە) زمانی لۆکسمبۆرگو زاراوەی ئەڵمانی ناوخۆییە.

● ئایینەکانی: کاسۆلیکی ڕومانی.

● زانینی خوێندن ونوسین: ٩٨٪

● دابەشی کارگێڕی: سێ گەرەکی کارگێڕیە.

● کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر١٣ ملیار دۆلار.

● بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٧٥٠ر٣٣دۆلار.

● دراوی: فرنکی لۆکسمبۆرگی.

● بەرگری: ١٠ر٢ ٪ لەکۆی دەرئەجامی ناوخۆی.

● سوپاکەی: ٥٠٠ر٢٥هەزار کەسە ئەویش پۆلیسی چەکدارن.

● زەوی کشتوکالی: ٥ر٢٤٪ لەخاکی وڵاتەکە.

● بەرهەمی کشتوکالی: گەنم، جۆ، دانەوێڵەی تر، پەتاتە، کرۆم، تەرە، میوەجات، چەوەندەری شەکر.

● پیشەسازی: ئاسنی خاو، پۆڵا، دروستکردنی تایە، پیشەسازی ئەندازیاری، درووستکردنی شووشە، بەرهەم هێنانی ئەلەمنیۆم.

● بەرهەمی کارەبا: ٤٢٠ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.

● سامانی سروشتی: ئاسن، ئەلەمنیۆم، پۆڵا، کیمیا، گەشتو گوزار.

● داهاتی دەرەوەی: نەوت، پێداویستی خۆراك، کەل وپەلی بەکارهێنان.

- دەرچووەكانی: ئەلەمنیۆم، شووشە، تایەی ئوتۆمبێل، پۆڵا، كیمیا.
- هاوبەشەكانی بازرگانی: وڵاتانی یەكێتی ئەورووپا، یابان، چین .
- ڕژێمی دەسەڵات: وڵاتێكی شانشینی دەستوریە. یەك ئەنجوومەنی نوێنەرانی هەیە كە پێكهاتوە لە ٦٠ئەندام وبۆماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێن، سەرۆكی دەوڵەت ئەمیری مەزنە. ئەمیری ئێستا ((جان)) لەدەسەڵاتە لەساڵی١٩٦٤، سەرۆك وەزیرانی هەیە .
- پارتە ڕامیاریەكەكان: پارتی لۆكسمبۆرگی سوشیالیستی كرێكاری، پارتی مەسیحی. كۆمەڵایەتی، پارتی چەپی ناوەند، پارتی سوشیالیستی، پارتی دیموكراتی، پارتی كۆمۆنیستی لۆكسمبۆرگی، چەپەرەوی ئەورووپی.
- جوگرافیای ئیمارەتەكە: لۆكسمبۆرگ دەكەوێتە ڕۆژئاوای ئەورووپاو وڵاتێكی ناوخۆییە. بەلجیكا دەكەوێتە ڕۆژئاوای، فەرەنسا دەكەوێتە باشوری ، ئەڵمانیا دەكەوێتە ڕۆژهەڵاتی. لەباشوری وڵات دارستانی چڕی هەیەو ناوی دارستانەكە ئەردینە كە لەسەر چیاكانە و بەناوبانگە بەهەمان ناو درێژ دەبێتەوە لەسەر سنوری بەلجیكا، لەباشوری خاكێكی بەپیتی كشتوكاڵی تیایە. بەڵام لەباشوری ڕۆژئاوای دەوڵەمەندە بەئاسنی خاو كە هەرێمێكی پیشەسازیە .
- مێژووی وڵات: كونت ئەردین لەساڵی ١٠٦٠ سیگفراید سەربەخۆ بووكە لەڕەچەلەكی شارلمان بوو، لەساڵی١٠٦٣ حوكمڕانی لوكسمبۆرگی كرد دوای ناوی خۆی نا بە كۆنت لوكسمبۆرگ. لە سەدەكانی پانزەم تاسەدەی هەژدەم كەوتە ژێر دەسەڵاتی یەك لەدوای یەكی ئیسپانیاو فەرەنساو نەمسا. لەساڵی ١٨١٥ بوە ئیماڕاتی گەورەو خستیە سەر دەسەڵاتی ویلیامی یەكەمی شانشینی هۆڵەندا بەپێی كۆنگرەی ڤیینا. لەساڵی ١٨٢٩ بەپێی پەیمانی لەندەن بەشی ڕۆژئاوای لۆكسمبۆرگ خرایە سەر وڵاتی بەلجیكا. لە ساڵی ١٨٤٨ بەشی ڕۆژئاوایی مایەوە لەیەكێتی كەسی لەگەڵ هۆڵەنداو ئەندام بوو لەیەكیەتی كۆنفدرالی ئەلمانیاو مافی ئوتۆنۆمی خۆی هەبوو. لەساڵی ١٨٦٧ بەپێی كۆنگرەی لەندەن بوە خاڵێكی بێلایەن لەژێر دەسەڵاتی ئیماڕاتی مەزن ولە ١٨٩٠/١١/١٣سەربەخۆیی ئیمارەتەكەی ڕاگەیاند، لوكسمبۆرگ لەهەردوو جەنگی یەكەم و دووهەمی جیهان لەلایەن ئەڵمانیا داگیركرا. لەساڵی ١٩٤٤ هێزەكانی هاوپەیمانان لۆكسمبۆرگیان لەژێر دەسەڵاتی ئەلمانیای نازی ڕزگاركرد . لە١٩٢٢/٥/١ دەست كرا بەكار كردنی یەكیەتی گومرگ لەنێوان بەلجیكاو لۆكسمبۆرگ .لە ١٩٤٨/١/١ یەكیەتی گومرگی دامەزرا لەنێوان بەلجیكاو هۆڵەندا و لۆكسمبۆرگ بەناوی((بنیلكس)) لەساڵی ١٩٤٩ لۆكسمبۆرگ بوە ئەندامی دامەزرێنەری ڕێكخراوی پەیمانی باكوری ئەتڵەسی. ((ناتۆ)) لەساڵی ١٩٥٨ بوە ئەندامی دامەزرێنەری بازاڕی هاوبەشی ئەورووپا. لەساڵی ١٩٦٤ ئەمیر شارلوت لەسەركورسی هاتەخواریێو كوڕەكەی جیگەی گرتەوە. لەساڵی ١٩٩٢ پەرلەمانی لۆكسمبۆرگ ڕێكەوتنی ماستریختی بڕیار دا. لەمانگی/ ٦ /١٩٩٤ ئینتلافی دەسەڵاتدار لەهەڵبژاردنەكان سەركەوتنی بەدەست هێنا بەمانەوەی لەسەر پۆستی سەرەك وەزیران.
- لۆكسمبۆرگ ئەندامە لەنەتەوە یەكگرتووەكان، ئەندام لە ڕێخراوەكانی خۆراك وكشتوكاڵ وبانكی دەوڵەتی بۆئاوەدان كردنەوەو بوژاندنەوەو كاری نێو دەوڵەتی و خەزنەی نێو دەوڵەتی و دەریاوانی جیهانی و بازرگانی جیهانی و یەكێتی ئەورووپاو ڕێكخراوی ئاسایش و هاوكاری ئەورووپی .

# مەگــــدۆنیــا

● ناوی ڕەسمی: کۆماری مەگدۆنیا.
● پایەتــــەختی: ســــکۆبی، ژمــــارەی دانیشتوانی٥٠٠ر٤٦٥ هەزارکەسە.
● ڕووبــــەری: ٧٨١ر٩میــــل چوارگۆشــــەو ٣٣٣ر٢٥کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
● ژمــارەی دانیــشتووانی: ٠٠٠ر٥٨٦ر٢ملیــۆن کەسە، بەپێی زانیاری ڕۆژنامەکانی ٢٠٠١ .
● چڕی دانیــشتووانی: ٢٦٤ کــەس لەیــەك میـل چوارگوشەدا.
● بوژانەوەی دانیشتووانی:٥ر١٪ .
● شارەسەرەکیەکانی: برلیب، بێتولا، کۆمانۆفۆ.
● نــژادەکانی : مەگــدۆنی٧٠٪. ئــەلمانی٢٢٪، سرب و کروات٨٪.
● ئایینەکانی: ئۆرسوزۆکس٧٠٪،ئیسلام٢٧٪ .
● زمانەکانی: مەگدۆنی( زمانی ڕەسمیە) ئەلمانی، سرب، کروات.
● زانینی خوێندن ونوسین:٩٣٪.
● دابەشــی کــارگێری: ٣٤بەشــە کــە لــە ١٢٣ئەنجوومەنی شارەوانی پێکهاتووە.
● دراوی: دیناری مەگدۆنی
● کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی:٠٥٠ر١ملیار دۆلار.
● بەشــی تــاك لــەکۆی دەرئــەنجامی نــاوخۆیی: ١٠٠ر١دۆلار.
● بەرگری:١٠٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
● سوپاکەی:٥٠٠ر١٥هەزار کەسە.
● زەوی کشتوکاڵی:٥ر٢٤٪ لەخاکی وولاتەکە.
● بەرهەمی کشتوکاڵی: گــەنم، جۆ، پــەمۆ، بـرنج، گەنمەشـامی، تــەڕە، میوەجــات، چــەوەندەری شەکر .
● سامانی ئاژەڵی: مــەڕ٨٥٠ر١ملیـۆن سـەر، بـزن ٩٦٠,٠٠٠ر٩٦٠ هــەزار ســەر، چــێل ٠٠٠ر٣١٨ هەزارســەر، بــەراز٠٠٠ر٢٢٥هــەزار ســەر، پەرەور٦٠٠ر٣ملیۆن سەر.
● پیــشەسازی: دروســتکردنی پیــشەسازی مەنجەمی ،ڕستن وچنین، بەرهەمی دار.
● بەرهــەمی کارەبــا:١٣٦ر٦ملیــار کیلــۆوات کاتژمێر.
● سـامانی سروشـتی: کـرۆم، زەنـگ((تۆتیـا))، قوڕقوشم..
● داهــاتی دەرەوەی: بەرهەمــەکانی نــەوت، پێداویـستی خـۆراك، کـەلو پـەلی خـاو، ماشـێن کــەل و پــەلی گواســتنەوە، کــەل و پــەلی کیمیاوی،کەل و پەلی دروستکراو.
● دەرچووەکانی: کەل و پەلی دروستکراو، ماشێن وکەل وپەلی گواستنەوە. برنج، ئاژەڵی زیندوو، خواردنەوە، تباق. چەندین کەل وپەلی تر.
● هاوبەشەکانی بازرگانی: مەگدۆنیا هەژارترین کۆمارەکانی یۆگسلافیای پێشوو بوە. ئەلمانیا، چین، پورتوگال، یۆنان، تورکیا، رووسیا.
● ڕژێمی دەسەلأت: کۆمارێکی دیموکراتیە، دوو ئەنجوومــەنی یاســادانانی هەیــە ((کۆمەڵــەی نیشتمان کەپێك هاتووە لە١٢٠ئەندام، ماوەی هــەر ئەنجومــەنێك چوارساڵە. سـەرۆك کۆمـارو سەرۆك وەزیرانی هەیە.
● پارتە ڕامیاریەکان: پارتی هاوکاری دیموکراتی کۆمەلأیەتی. پارتی لیبراڵی. پارتی ئاسوودەیی، پـارتی دیمـوکراتی مەگـدۆنی، چـەند پـارت و ڕێکخراوی بچووکی تری تیایە.
● جوگرافیــای وولأت: کۆمــاری مەگــدۆنیای ســـەربەخۆ دەکەوێتــە ناوچــەی باشــووری ڕۆژهــەڵاتی ئــەوروپا، خـاکی چیاییەو وولأتێکی ناوخۆییــە دەکەوێتــە ناوجەرگــەی نیمــچە

دوورگەی بەلقان. گۆمە ئاوی بچووك جێ دیلێو خاکەکەی کشتوکالیەو زێ یەکانی بە یەك دەبەستێتەوەو سێ زێی سەرەکی هەیە ئەویش زێی فادار کەگەورەترینیانەو زێی ئەلیاك مۆنو زێی سترایمون. بولگاریا لە ڕۆژهەلات، یۆنان لە باشووری، ئەلمانیا لەڕۆژئاوای، سربیا لە باکووری.

- مێژووی ولات: کۆماری مەگدۆنیا نیوەی ڕۆژئاوای شانشینی مەگدۆنیای کۆن دەگرێتەوە، یەکێك بوو لە هێزە گەورەکانی جیهانی کۆن، کە ئەسکەندەری گەورە حوکمڕانی دەکرد. لەساڵی ١٤٦پێش زایین ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی شکاندو بوە وولایەتێك لە ڕۆمانیا. لەدوای دابەش بوونی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەساڵی٣٩٥ زایینی مەگدۆنیا هەردەم ژێر دەستەی نێوان ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بوە ناوە ناوە، تورکە ئیسلامیەکان حوکمڕانیان دەکرد لەساڵی١٣٨٩ تاکو ساڵی ١٩١٣ زایینی. لەماوەی سەدەکانی نۆزدەمو بیستەم هێزە دەسەلاتدارەکانی بەلقان کێشەیان لەنێوان هەبوو بۆ داگیرکردنی مەگدۆنیا بە هۆی بونی ڕێگای ئابووریو سەربازیو ناوچەیەکی ئیستراتیژی گرنگ بوە. بەهۆی پەیمانی سان ستیڤانۆی ١٨٧٨ کە کۆتایی هێنان بوو بەشەڕی نێوان ڕوسیاو تورکیا وزۆربەی بەشە گەورەکەی لەمەگدۆنیا درا بولگاریا و دوای لە شەڕی بەلقان لەساڵی ١٩١٣بولگاریا ئەو زەویانەی وەرگرتبوو لەدەستی داو کەوتە ژێر دەسەلاتی سربیاو ئەوەی تر کە مایەوە لەنێوان یۆنان وبولگاریا دابەش کرا، لەساڵی ١٩١٨ سربیا چوە ناو ولاتی سربیا کە پێك هاتبوو لەکرواتو سلوڤینیا، دوای ساڵی ١٩٢٩ وولاتی یوگسلافیای لێپێك هات، لەجەنگی دووەمی جیهان بولگاریا چوە ناو هێزەکانی تەوەرو چەند بەشێکی یوگسلافیای داگیر کرد لەگەل مەگدۆنیا لەساڵی١٩٤١، بەلام پیاوە بەرگریەکان مەگدۆنیا دەستیان کرد بەشەڕی پارتیزانی توند دژی هێزەکانی داگیرکەر.دوای بەزینی ئەلمانیا لەجەنگی دووەمی جیهان دووبارە کۆماری یۆگسلافیا دامەزراوەو مەگدۆنیای جیاکردەوە لە سربیا بووە کۆمارێکی یۆگسلافیا و مافی ئۆتۆنۆمی پێدرا، سەرۆك تیتۆ دانی بەمەگدۆنیا نا کە نەتەوەیەکی جیاوازەو هەولی پەرەسەندنی ڕۆشنبیریو زمانو کەلتوری خۆیان داوە دور لە بولگاریاو سربیا. لە ١٩٩١/٩/٢٥مەگدۆنیا سەربەخۆی ڕاگەیاند بەلام یۆگسلافیا نارەزایی دەربڕی. لەمانگی ١٩٩٢/٤/ماوەی درا بۆ چونە ناو نەتەوە یەکگرتووەکان وشەش وولاتی ئەورووپی دانیان بەسەربەخۆی مەگدۆنیا ناو هێزی نەتەوە یەکگرتووەکان لە سەر خاکی مەگدۆنیا بلاو بونەوە بۆ ماوەنەدان بە بەرپابوونی شەڕ لە بۆسنەو نیمچە دوورگەی بەلقان. لە مانگی ١٩٩٤/١/ ڕوسیاو ئەمەریکا دانیان بەسەربەخۆی مەگدۆنیا نا بەلام یۆنان نارەزایی دەربڕی بۆ بەکارهێنانی ناو دروشمی بەهۆی بونی ڕەچەلەکی هێللین لەمەگدۆنیاو ئابلوقەی ئابووری خستە سەر کە هیچ دەرگایەکی ئاوی نەبوو تەنیا لە ڕێگەی بەندەری سالۆنیکای یۆنان نەبێت بەلام لە مانگی١٩٩٥/٩/ڕێکەوتن لەسەرهاوکاریو جێبەجێکردنی پەیوەندیەکانیان. لەساڵی١٩٩٦مەگدۆنیاو یۆگسلافیا پەیمانی هاوکاریو پەیوەندیان مۆرکرد.

- مەگدۆنیا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەندامە لە ڕێکخراوی تەندرووستی جیهان ودەریای نێودەولەتی وخۆراك وکشتوکالی جیهانیو بەنکی خەزنەی نێو دەولەتی.

# جـۆرجیـــا

- ناوی ڕسمی: کۆماری جۆرجیا.
- پایەتـەختی: تبـیلس، ژمـارەی دانیـشتوانی ۰۰۰ر۲٤٥ر۱ملیۆن کەسە.
- ڕووبـــەر: ۹۰۰ر۲٦میـــل چوارگۆشــەو ۷۰۰ر٦۹کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ۰۰۰ر۸۷٥ر٥ملیـۆن کەسە، بەپێی ئاماری ۱۹۹۹.
- چـڕی دانیـشتوانی: ۲۱۸ کـەس لەیـەک میـل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەیدانیشتوانی: ٤٪.
- شارەسـەرەکیەکانی: سـۆفۆمی، بـاتۆمی، کوینس.
- بەندەرەگرنگەکانی: بۆنی، باتۆمی، سۆفۆمی.
- نژادەکانی: جۆرجی ڕەسـەن ۷٥٪، ئەرمەن۱۰٪ کـە لـە ڕەسـەندا ڕووسـین ، ئـەزیری۲٪، ئەنجازی۲٪ ، یۆنانی۳٪ ، کورد۳٪ .
- زمانـەکانی: جـۆرجی (زمـانی ڕەسمیـە) زمـانی ڕووسـی، چـەندین زمـانی تـر لەوانـە زمـانی کوردی.
- ئایینـەکانی: ئۆرسۆزکـسی جـۆرجی ٦٥٪. ئیـسلام۱۰٪،ئۆرسۆزکـسی ڕووسـی۱۲٪، ئۆرسۆزکسی ئەرمەنی۸٪.
- زانینی خوێندن ونووسین:۹٥٪.
- دابەشـی کـارگێڕی: ۹هەرێمـە + دوو کۆمـاری خـاوەن ئۆتۆنـۆمی + بەشـی تـر کـە خـاوەن ئۆتۆنۆمین.
- دراوی:لاری.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ۱٥۰ر۸ ملیـار دۆلار.
- بەشـی تـاک لـەکۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ٦٥۰ر۱دۆلار.
- بەرگری:٥ر۲٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناو خۆی.
- سووپاکەی:۰۰۰ر۳٥هەزار کەس.
- زەوی کشتوکالی:٥ر۹٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکالی: گەنم، جۆ، دانەویلەی تر، چایە، ترێ، پەتاتە، گێزەر، چەوەندەریشەکر، میوەجات، تەڕە.
- سـامانی ئـاژەلی: مـەڕ۰۰۰ر٥٥۰ هەزارسـەر . بـزن۰۰۰ر٥۱۰ هەزارسـەر، چـێڵ ۰۰۰ر۰۳۰ر۱ ملیـۆن سـەر، بـەراز۳٥۰هـەزار سـەر، پـەرەوەر ٥۰۰ر۱۳ملیۆن سەر.
- سـامانی سروشـتی : ئاسـن، نوحـاس، خـەلوز، موگناتیس.
- بەرهـــەمی کارەبـا: ۱۰۰ر۷ملیـــار کیلـــۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازی: پیشەسازی گران، پۆلا، چیمەنتۆ، ڕاکێشەری کارەبایی، کەل وپەلی تـاوەری لـەحیم کردن ، ئامادەکردنی گۆشت، بەرهەمی شیری، ڕاوی ماسی، ماشێنی کشتوکالی ((تراکتۆر)).
- داهـاتی دەرەوەی: ماشێن، یـەدەگی کـەل وپـەلی ڕستن وچنین، سووتەمەنی.
- دەرچووەکانی: بەرهەمی چایە، کشتوکالی تـر. ماشـێن ((تراکتـۆر))، کـانزای ئاسـن، ڕسـتن وچنین.
- هاوبەشـەکانی بازرگـانی: تورکیـا، ئازربایجـان، ڕووسـیا، ئۆرانیـا، ئـەلمانیا، یابـان، چـین، ئەمەریکا.
- ڕژێمـی دەسـەلات: کۆمـارێکی پەرلـەمانی دیموکراتیـە، پەرلـەمانی پێـک هـاتووە لـە۲۳٤ ئەندام، ئەنجوومـەنی وەزیـران هەیـە کەسـەرۆک کۆمارسەرکردایەتی دەکات. جۆرجیا کۆمارێک بوو لەکۆمارەکانی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشووی هەلوەشاوە لە۱۰/۳/۱۹۹۲.
- پارتـە ڕامیاریـەکان: پـارتی نیـشتمانی دیمـوکراتی جۆرجیـا، بـەرەی میللـی جـۆرجی، ،پـارتی کۆمۆنیـستی جـۆرجی، پـارتی

سەربەخۆی نیشتمانی، یەکێتی هاوڵاتیانی جۆرجیا، چەندین پارت و ڕێکخراوی تری ڕامیاری و ئابووری و دیموکراتی و کۆمەڵایەتی تیایە.

● جوگرافیای ووڵات: جۆرجیا دەکەوێتە باشوری ڕۆژئاوای ئاسیا لەسەر کەناری ڕۆژهەڵاتی دەریای ڕەش. ڕوسیا لەباکوری و باکوری ڕۆژهەڵاتی، ئەرمینیاو تورکیا لەباشوری، ئازربایجان لەباشووری ڕۆژهەڵاتی. زنجیرە چیاکانی قەوقاز لەڕوسیای جیادەکاتەوە، خاکی جۆرجیا شاخاوی بەفریە. زێیەکانی ترسناکە، جۆرجیا دارستانی چڕو دۆڵ وکەندی بەپیتی تیایە. بەرزترین چیای (کازین)ە زێیە سەرەکیەکانی زێی کۆڕامکڤاری وزێی ڕیۆنی و لقەکانی و چەندین بەربەستی ئاوی تیایە کە هۆکارێکی گرنگ بوونە لە بەرهەمی وزەی کارەبا، جۆرجیا دووکۆماری خاوەن ئۆتۆنۆمی تەواوی گرتۆتە خۆی ئەویش (ئەنجازی وئەجاریە) هەروەها ئۆسیتیا کە خاوەنی ئۆتۆنۆمیە.

● مێژووی ولات: جۆرجیا دوو ناوچەی کۆنی گرتۆتە خۆی ئەویش مەملەکەتی کۆلشیس و سیبیریایە لەناوچە کۆنەکان دەژمێردرین ولەسەدەی چواری زایینی ئاینی مەسیحی لەباوەش گرتوە. لەسەدەی هەشتەم بەهۆی شالاوەکانی عەرەب بەناوی ئیسلام داگیریان کردو لەو پەڕی خراپی بوون، لەسەدەی دووانزەهەم سنوری درێژ دەبوەوە لەناوچەکانی دەریای ڕەش تاکو دەریای قەزوێن و چەندین پارچە لەخاکی ئەرمینیای فارسی گرتبوە خۆ ئەمەش پێش هەڵوەشاندنەوەو داگیرکردنی مەگۆلەکان بوو لەسەدەی یانزەم و چواردەم. لەساڵی١٥٥٥ جۆرجیای ڕۆژئاوا کەوتە ژێردەستی توورکیاو ڕۆژهەڵاتیشی کەوتە ژێردەستی فارسی ئێرانی ئیستا لەوکاتەوە خاکی جۆرجیاو دەوروبەری بوە گۆڕەپانی ململانێ و پێکدادانی شەڕکەران لەنێوان هەردوو دەوڵەتی فارس وعوسمانی. بەپێی پەیمانی جۆرجیفسکی ساڵی١٧٨٣ بوە ووڵاتێکی پارێزراوی رووسیا بەمەرجێ بەرگری لێ بکات بەرامبەر هێزکانی عوسمانی، هەڵگیرسانی شەڕی نێوان ڕووسیاو ئێران لە ساڵەکانی ١٨٠٤ تا١٨١٢هۆکارەکەی لەسەر ناوچەی جۆرجیا بوو کە ڕووسیا لەساڵی١٨٠١خستیە ژێر دەسەلاتی خۆی.

لەساڵی ١٩١٧جۆرجیا چوە ناو ئازربایجان و ئەرمینیا بەپێکهێنانی یەکێتی لەڕێگەی قەوقاز کە دژی دەسەلاتی بەلشەفیەکان بوون و لە دوای هەڵوەشاندنەوەی ئەو یەکێتیەو دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ڕووسی، جۆرجیا سەربەخۆی خۆی لەساڵی ١٩١٨ڕاگەیاند بەلام لەساڵی١٩٢٢ڕوسییا داگیری کردو حکومەتێکی سۆڤیەتی لێ دامەزراند، دوای ئەویش ئەرمینیاو ئازربێجانی خستە ژێردەسەلاتی خۆی. لەساڵی١٩٣٦جۆرجیا بوە ووڵاتێکی سەربەخۆ لەناو یەکیەتی سۆڤیەت ودوای ئەوە لەساڵی١٩٤٠بەفەرمانی ستالین زیاتر لە دووسەد هەزار مەسیحی لەباشووری جۆرجیا دەرکرا بۆ ناوەڕاستی ئاسیا. شیڤرنادزە سەرۆکی پارتی کۆمۆنیست هەوڵیدا بەلەناوبردنی و بەرگری کردن لەدژی بەرتیل ونالەباری کاروباری کۆمارەکە. لەساڵی١٩٧٧ ((زیادجامسا خوردیا)) کە مرۆڤێکی نیشتمان پەروەرمو بیرکەرەوەیەکی نیشتمانی بوو یەکێك بوو لەبەرگریکردن لە مافەکانی مرۆڤ ، لە ساڵی١٩٧٨نیشتمان پەروەران هەڵسان بەخۆ پیشاندانی توند لە تەبلیسی پایتەخت.

لەساڵی١٩٨٩بەرەی میللی جۆرجی پێکهات لەکەمایەتیە ئەنجازەکانی باکوری ڕۆژئاوا ، ئۆسیتیای باکووری ناوەند داوای جیابونەوەی کرد بە هۆی پێکدادانی نژادی ، پەرلەمانی جۆرجیا لە ١٩٩٠/١١/٢٠ سەربەخۆی ڕاگەیاند

لەهەمان ساڵ هاوپەیمانانی نیشتمانی لەهەڵبژاردنەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێناو جامسکا خوردیا بوە سەرۆک کۆمارو پارتی کۆمۆنیستی جۆرجیا جیا بوەوە لەپارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی.لە ٩/٤/١٩٩١جۆرجیا سەربەخۆی ڕاگەیاند بەڵام ڕاگەیاندنی تەواوی سەربەخۆی لە٢٦/١٢/١٩٩١بوو لەوکاتەی یەکیەتی سۆڤیەت هەڵوەشاوە. دوای ئەوە جامسکا خوردیا ڕووی لەدەسەڵاتی دیکتاتۆری کردوو بوە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆی و لەساڵی١٩٩٢جامسکا خوردیا هەڵات بۆ ئەرمینیاو ئەدوارد شیڤرنادزە بوە سەرۆکی کۆماری کاتی کە کاتی خۆی وەزیری دەرەوەی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو بوو. لەهەمان ساڵ جۆرجیا چوە ناو نەتەوەیەکگرتووەکان دوای ئەوە شیڤرنادزە بوە سەرۆک کۆمار لە هەڵبژاردن.جۆرجیا چوە ناو وولآتانی کۆمەنولسی وولآتانی سەربەخۆی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو. هاوپەیمانی سەربازی لەگەڵ ڕوسییا مۆرکرد وڕیکەوتنی لەگەڵ جیاخوازەکانی ئەنجاز مۆرکرد، لەدوای سەرنەکەوتنی کودەتا دژی شیڤرنادزە لەساڵی١٩٩٦ دووبارە بەسەرۆک کۆمار هەڵبژێردراوەو ڕووی کردە کەرتی تایبەتی بۆ بە هێزکردنی ئابووری جۆرجیا. لەساڵی ١٩٩٨ پەیمانی هاوکاری لەگەل یەکیەتی ئەوروپا مۆرکرد، دوای ئەوە کێشەو ململانێو باری خراپی جۆرجیا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەنگاوی بەرەو زیاتر دەنا، لەساڵی ٢٠٠٣لەئەنجامی ناڕەزایی و خۆپیشاندان دژی ئەدوارد شیڤەرنادزێ لە ئەنجام لەدەسەڵات لادراوحکومەتێکی نیشتمانی لێ دامەزرا، کەجۆرجیا دوای ساڵێ ٢٠٠٤ بەرەو باری دیموکراتی هەمەلایەنە هەنگاو دەنێ.

● جۆرجیا ئەندامە لەنەتەوەیەکگرتووەکان.

# ڕووسیای یەکگرتوو

● ناوی ڕەسمی: یەکێتی ڕووسیا.

● پایتەختی: مۆسکۆ، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٥٦٠ر١١)ملیۆن کەسە.

● ڕووبەری: ٨٠٠ر٥٩٢ر٦ میل چوارگۆشەو(٤٠٠ر٠٧٥ر١٧)کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.

● ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٣٨٧ر١٥٨ ملیۆن کەسە، بەپێی زانیاری ڕۆژنامەکانی ٢٠٠٠.

● چڕی دانیشتوانی: ٢٤٠ کەس لەیەک میل چوارگۆشەدا.

● شارە گرنگەکانی: کازان، قرم، ئۆفا، سامارا، شلیا بنسک، سان پترسپۆرگ (لینینگرادی پێشوو)نوفۆسپیدسک، ئۆسک....

● بەندەرە سەرەکیەکانی: سان پترسپورگ، مۆرمسک.

● بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢٨ر٠٪.

● زمانەکانی: ڕوسی (زمانی ڕەسمییە) نزیکەی ٧٠ زمانی تری تیایە کە لەزۆربەی نەتەوەکانی پێک هاتوە، هەرزمانێك لەکۆمارەکان و ڕێژمە ئۆتۆنۆمیەکان زمانی ڕەسمین لەگەڵ ئەوەشدا زمانی ڕوسی لەهەموو ڕووسیا دەخوێندرێ.

● نژادەکانی : ڕووسی ٨٥٪ ، تەتەر ٥٪ ، ئۆکرانی، بشکیر، مۆلدافی، نژادەکانی تر ١٠٪.

● ئاینیەکانی: ئۆرسۆزکسی ڕوسی، ئیسلام، چەندین ئاینی تر.

● زانینی خوێندن ونوسین، ٩٥٪.

- دابەشی کارگێڕی: ٨٩ بەشی کارگێڕی کە پێك هاتووە لە ٢١ کۆمار، شەش ناوچەیە، ٤٩ پارێزگایە، ١٠ دەڤەری ئۆتۆنۆمیە، دووشاری فیدرالیەو هەرێمی ئۆتۆنۆمی هەیە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر٦٩٣ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥ر٠٠٠ دۆلار.
- دراوی: رۆبل.
- بەرگری: ٥٠٠ر٣٥ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ١ر١٢٠ر٠٠٠ ملیۆن کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر٨٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: دانەوێڵە، گوڵە بەڕۆژە، بەرهەمی شیری، چەوەندەری شەکر، پەتاتە، گێزەر، تەرە، میوەجات، چەندین بەرهەمی تری کشتوکاڵی هەیە لەوانەش هەنگوین.
- سامانی ئاژەڵ: مەڕ ٢٤ر١٥٠ ملیۆن سەر، بزن ٢ر١٠٠ ملیۆن سەر، بەراز ٢٢ر٦٥٠ ملیۆن سەر. چێڵ و گامێش ٣٠ر٠٠٠ ملیۆن سەر، پەرەور٤١٥ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: نەوت و غازی سروشتی (ڕوسیا زۆرترین یەدەگی نەوت و غازی هەیە لەجیهاندا) خەڵوز، خەڵوزی فۆسفات، نوحاس، چوارەم دەوڵەتە لەدەرهێنانی نوحاس لەجیهاندا، ئاسن، قورقوشم، ئەلەمنیۆم، فۆسفات، موگناتیس، زێڕ، پلاتین، سێ یەکی بەرهەمی سروشتی لەسیبریایە لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی دوور.
- بەرهەمەکانی کارەبا: ٧٩٢ر٩٣٥ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازیەکانی: ئاسن، پۆڵا، سلیلۆس، سابون، بەری هەمەجۆر، چیمەنتۆ، ماشێن، کەلوپەلی گواستنەوە، دروستکردنی شوشە، دروستکردنی خواردەمەنی هەمەجۆر، چەك و تەقەمەنی، فڕۆکە، ئۆتۆمبێل، کەشتی و پاپۆڕو غەواسە ، دروستکردنی چەکی هەمە جۆری ئەتۆمی کە دووەم وڵاتە لە بواری سەربازی لەگەڵ هاوسەنگی ئەمەریکا.
- داهاتی دەرەوەی: ماشێن و کەلوپەلی گواستنەوە، پێداویستی خۆراك، بەرهەمی کیمیاوی، ڕستن و چنین، جل و بەرگ، پێڵاو، کانزایی، ئاسن،چەك و تەقەمەنی.
- دەرچووەکانی: نەوت و غازی سروشتی و بەرهەمەکانی، دارو بەرهەمی دار، خەڵوز، کیمیا، چەك و تەقەمەنی، کەلوپەلی کارەبایی، فڕۆکە، چەندین ئامێرو ماشێنو کەلوپەلی جۆراوجۆری تر.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەورووپا، ئەمەریکای باکوور، یابان، چین، وڵاتانی جیهانی سێیەم، کوبا، ئەڵمانیا، فەرەنسا، ئێران، عێراق، تورکیا، هیند، چەند وڵاتی عەرەبی ئەفریقی.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی دەستوریە ، لە ١٩٩٣/١٢/١٢ دەستوری ڕوسیا بڕیاری لەسەردرا کەزۆربەی دەسەڵات دەداتە سەرۆك کۆمار کە سەربەخۆیی لەپەرلەمان هەیە. دەسەڵاتی یاسادانان لەدوو ئەنجومەن پێك هاتوە، ئەنجومەنی یەکێتی کە ئەنجومەنی باڵایەو لە ١٧٨ ئەندام پێك هاتوە و هەڵدەبژێردرێن لەسەر بنەمای هەردوو ئەندام بۆهەرێمێك لەهەرێمەکانی ٨٩ کەڕوسیای لێ پێك هاتوە و بۆماوەی چوار ساڵ. ئەنجومەنی (دۆما) کە ئەنجومەنی نزمە لە ٤٥٠ ئەندام پێك هاتوە و بەپێشنیاری ڕاستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن بۆ ماوەی چوار ساڵ .

سەرۆك کۆمار بەپێشنیاری گشتی هەڵدەبژێردرێت بۆماوەی چوار ساڵ و نابێت لەدووجار زیاتر خۆی بپاڵێورێت بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار ، هەروەها بوجێگری سەرۆك کۆمار، لەدوای مردنی سەرۆك کۆمار یاخود

نەبونی توانای کارکردنی سەرۆك وەزیران جێگەی دەگرێتەوە تاکو سەرۆك کۆمار هەڵدەبژێرن ئەویش لەماوەی سێ ساڵ سەرۆك کۆمار سەرۆك وەزیران و جێگرەکانی هەڵدەبژێردرێ بەڕەزامەندی ئەنجومەنی دوّما.

- پارتە رامیاریەکان: پارتی ڕوسیای نیشتیمانی ، پارتی ناوەندی، پارتی چاکسازی ناوەندی، پارتی کۆمۆنیستی ڕوسیای یەکگرتوو، پارتی چاکسازی کشتوکاڵی، پارتی ئازادی دیموکراتی، پارتی ڕاست ڕەوی ڕاپایی، پارتی نیشتیمانی چاوبەرتەنگ، پارتی کۆنگرەی کۆمەڵایەتی ڕوسیا، پارتی ڕەزامەندی ڕوسیا، پارتی دیموکراتی سۆشیالستی ڕوسی، پارتی یەکێتی ڕووسیای میللی نیشتیمانی.
- جوگرافیای وڵات : گەورەترین وڵاتە لەڕوی ڕووبەری خاك لەجیهان کە لەڕۆژهەڵاتی ئەورووپاو باکوری ئاسیاو درێژ دەبێتەوە لەدەریای بەلتیق لەڕۆژهەڵاتی ئەورووپا بۆ زەریای هادی لەڕۆژهەڵاتو درێژ دەبێتەوە لەزەریای جەمسەری لەباکوور بۆ دەریای ڕەش، چیاکانی قەوقاز و ئەلتاس و سایان، زنی ئامورونوسوری لەباشوور، لەباکوری ڕۆژئاوای دەڵتای نەرویج و فنلەندە، لە ڕۆژئاوای وڵاتانی ئیستونیا، لاتیفیا، بیلاڕوسیا (ڕوسیای سپی) ئۆکرانیا، لە باشووری ڕۆژئاوای جۆرجیاو ئازەربایجان، لەسەر سنوری باشووری کازاخستان و مەنگۆلیا و چین، لەباکوری کۆریا. بەشی ئەورووپای دەشتایەکی نزمو داپۆشراوە بەگژوگیاو ڕوەكو لەباشوور بەدارستانی چڕ داپۆشراوە لەباکورەوە، لەڕۆژهەڵاتی چیای ئورالە کە هەردوو کیشوەری ئەورووپاو ئاسیا لێك جیا دەکاتەوەو کەدرێژی ٥٠٠ر٢ میلە لەباکور بۆ باشوور .
- مێژوری وڵات: لەسەدەی پێنجەمی زاینی کۆچبەرە سلافیەکان ڕوویان لەڕوسیا کرد، لەسەدەی نۆیەم هۆزە ئەسکەندەنافیەکان هەڵسان بەدامەزراندنی یەکەم دەوڵەتی ڕەسمی لەشاری نۆفیگورد کورودوشاری کیف، ئاینی ڕەسمی ئاینی مەسیحی بوو، لەسەدەکانی دەیەمو یازدەم یەکیان گرت، بەڵام مەگۆلەکان لەسەدەی سیانزەهەم داگیریان کردوشاری کیفیان وێران کرد، خاکی ڕوسیا دابەش کرا لەسەر چەندین ویلایەتی بچوك و دوای ماوەیەك ڕوسیا توانی بگەڕێتەوە بۆ باری جارانی بەهۆی دانیشتوانی ڕوسە کۆنەکان، لەساڵی ١٤٨٠ڕوسیا ڕزگاری بوو لەدەست داگیرکەرانی مەگۆل. لەساڵی ١٥٢٣ ئیڤانی چوارەم حوکمرانی ڕوسیای گرتە دەست دوایی بوە قەیسەری یەکەم لەمۆسکۆ، دامەزرێنەری دەوڵەتی ڕوسیا بوەو توانی هەموو ئەوکەسانەی کە دژی وەستان لەناویان ببات و پیاوانی خاوەن دەسەلات و خاوەن زەویەکان لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە کە بەپیاوێکی تاکرەو توندو تیژ لەدەسەلات ناوزەد بوو. لەدوای وەرگرتنی دەسەلات لەلایەن پەترۆسی مەزن لەنێوان ساڵەکانی ١٦٨٩تا١٧٢٥ توانی چاکسازیەکی فراوان لەوڵات ئەنجام بدات و سنوری ڕوسیا فراوان بکات لەڕۆژئاوا لەدوای هەڵاتنی تشارلزی دەیەمی شانشینی سوید لەجەنگی بۆلتافا لەساڵی ١٧٠٩، لەنێوان ساڵەکانی ١٧٦٢ تا ١٧٩٦ ئیمپراتۆر کاترینی مەزن هەمان رامیاریەتی پەترۆسی گرتەبەر بۆ فراوان کردن و نوێ کردنەوەی وڵاتی ڕووسیاو بەرەو دەریای ڕەش لەباشورو دوای لکاندنی قرم و هەروەها بەخاوەندیەتی کردنی پارچەیەك لەخاکی هۆڵەندا، بەڵام لەساڵی ١٧٧٤ شۆڕشی مللی هەڵگیرسا بەسەرکردایەتی بۆگاشیف بەڵام ئەوشۆڕشە لەناوبرا ، لەدوای هەڵاتنی ناپلیۆن توانی سنووری ڕوسیا فراوان بکات بەلکاندنی

پۆڵەنــــدا و بیــــسائارابیا، ئەســـــکەندەر هاوپەیمانیەکی پیرۆزی پێك هێناکە بوە هۆی لەناوبردنی جولانـەوەی لیبرالیـەکان کەبـەرەو بەرزبوونــەوە هــەنگاوی دەنــا لــە ئــەوروپا، ئەســـکەندەری دووەم لەســاڵەکانی ١٨٥٥ تــا ١٨٨١ تـوانی سنووری پوسیا فراوان بکـات هـەنگاو لـەدوای هـەنگاو تـا گەیشتە زەریـای هادی بەرەو ناوەراستی ئاسیا ، لەساڵی ١٨٦١ تـــوانی پژێمـــی کۆیلایــــەتی جوتیــــاران هەڵوەشـــێنێتەوەو جوتیـــاران پزگـــار بکـــات، لـەدوای سـەرنەکەوتنی پوسیا لەشەڕی نێوان خۆی و یابان لەساڵی ١٩٠٥ ئیمپراتۆر نیقولای دووەم ناچـاربوو لـەنێوان ساڵەکانی ١٨٩٤ تـا ١٩١٧ ئەنجومـەنی (دۆمـا) دابمـەزرێنێ بـەهۆی هـەلاَتنی لەشـەڕ لەگـەڵ یابـان و لێـك ترازانـی بــارودۆخی نــاوخۆی پوســیاو چەوســانەوەو بەهێزبوونی دەسەڵاتی دەرەبەگایـەتی و قەشـەو پیــاوانی ئــاینی و دزی و کوشــتن و تێکــدان ، دوای هەڵگیرســانی جــەنگی یەکــەمی جیهــان لەساڵی ١٩١٤ تا ١٩١٨ ، سەرەڕای بارو دۆخی نـوێی پرووسیای قەیسەری‌و ناوچـەو هـەرێم‌و وولاَتـانی تـری جیهان لـەدوای جەنگی جیهانی یەکـەم دوژمنــانی کــوردو خــاکی کوردســتان درێخیـــان نــەکردبوو بــۆ شــێواندن‌و ئــاڵۆزو ناڵەباری‌و داگیر کردن‌و دابـەش کردنـی خـاکی کوردستان وەك پەرێکی ئامادەکراو بۆ نوسینی نیازەکانی خۆیان ئەویش لە١١/٥/١٩١٥سوپای پرووسیا ناوچەی ورمێ‌و دەوروبەری داگیر کـرد بـە هـۆی شـەڕی نێـوان کـوردو فـارس‌و تـورك‌و پەلاماردانی کوردو نیشتمانەکەیان. هەروەها لە ١٣/٥/١٩١٦سوپای پوسیا شارۆچکەی پواندزو دەوروبــەری داگــیر کــرد کــە بــەمناو خــاکی کوردستاندا گەیشتبوە ناوچەکەو دوای ٦٥ پۆژ لێـی کـشاوە بـە هـۆی شۆڕشـی بـۆرژوازی لەپوسـیا، دوای ئـەوە لـە ٥/٣/١٩١٨پـەیمانی نێـوان پووسـیاو ئـەلمانیاو مەجـەرو نەمـساو بولگاریـاو تورکیـا مـۆر کـرا لـە پێنـاو دابـەش کردنـی کوردسـتان بـە هـۆی بـوونی زیـاتر لـە ١٢ر٠٠٠هـەزار کیلۆمـەتر چـوار گۆشـە لـە نـاو کۆمــاری ئـــەرمینیا لەشـــاری یـــەریڤان‌و دەوروبـەری. بـەرپابوونی شـۆڕش لەشـاری پترسـبۆرگی پایتـەختی ئەوکاتـەی پوسـیا و کـــەرتبوونی ســـوپای قەیـــسەری پوس‌و بەرزبوونـەوەی هەسـتی کرێکـارانی کارگـەو پرۆژەکانی میری کە بوە هۆی دەستبەڵگرتنی نیقـۆلای دووەم لەدەسـەلاَت لـە ١٥/٣/١٩١٧ و کوشـــتنی لـــە ١٦/٧/١٩١٧ و بـــوە هـــۆی دامەزرانـدنی دەسـەڵاتداریەتی دیموکراتی کـاتی بەسـەرۆکایەتی ئـەمیر لڤـۆڤ بـەلاَم لـەدوای ماوەیـەکی کـەم ئـەویش کـەوت و دەسـەڵاتی دووەم بەسەرۆکایەتی ئەسکەندەر کیرنیسکی و هەڵبـژاردنی ئـازاد ئـەنجام درا بـەپێك هێنـانی کۆمەڵەی دامەزرێنەر بەلاَم زۆری نەبرد شۆڕشی ئۆکتۆبـــەر بـــەرپابوو لـــە ٧/١١/١٩١٧ بەسەرکردایەتی لینین و ترۆتسکی کە دەسەلاَت درا بەئەنجومـەنی نەتـەوەکان و گـەل کـە لیـنین سـەرۆکایەتی ئەنجومـەنی وەزیرانـی دەکـرد، لینین پەیمانی بریست بتۆلسکی لەگەڵ ئەڵمانیا مۆر کردو شەڕ کۆتایی پێ هێنرا لەگەڵ ئەلمانیا لـە٣/٣/١٩١٨ئـەم مۆرکردنـەش نـەك لەلایـەن پوسیابوو لەگەڵ ئەڵمانیا و نەمسای هاوپـەیمان ، کۆمۆنیـستەکان توانیـان دەسـەلاَت بەتـەواوی بەسـەر هـەموو پوسیا دابگـرن لەسـاڵی ١٩٢٠ ، لەو کاتە پەیمانی "بریست بتۆفسك" مۆر کرا لە ٣/٥/١٩١٨لـــە نێـــوان لیـــنین‌و ئـــەلمانیاو ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی بەهۆی ناسکی بارو دۆخـی نـوێی پوسـیاو بـەرپابوونی شۆڕشـی ئۆکتۆبەر بەلاَم بەزیانی کورد هەڵگەڕاوە چونکە مۆر کردنی ئەو پەیمانە بوە هۆی داگیر کردنی چەندین ناوچەی کورد لە باکوری پۆژ هـەلاتی

کوردستان ، له١٩٢١/٥/١٦ پەیمانی ڕێکەوتنی هاوکاری لەنێوان ڕوسیاو تورکیا مۆر کرا بەدانی چەند ناوچەیەك لەهەرێمی قەوقازی کوردستان بە تورکیا بۆ بەرەو باش کردنی بەرژەوەندیەکانیان، یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤیەتی سۆشیالیستی لە ١٩٢٢/١٢/٣٠ دامەزرا، بەکۆچی دوای لینین لە ١٩٢٤/٤/٢١ کێشەو ململانێ لەناو دەسەلاتدارانی سەرکردایەتی سۆڤیەتی نوێ سەریهەلدا بەتایبەتی لەنێوان ستالین و ترۆتسکی کە بوەهۆی لابردنی ترۆتسکی لەدەسەلات و دوور خستنەوەی لەڕوسیای سۆڤیەتی و دوای کوشتنی لەلایەن پیاوەکانی ستالین لە ١٩٤٠/٨/٢١ لەشاری مەکسیکۆ سیتی و ریکۆف بووە سەرۆك وەزیران، ستالین دەستیکرد بەپاککردنەوەی سەرکردایەتی دەولەت و پارت لەوانەی کەدژایەتیان دەکرد تائەوکاتەی ستالین خۆی بوە سەرۆك وەزیران لە ١٩٤١/٥/٦، لەسەرەتای رامیاریەتی ستالین بەرامبەر بە ئەلمانیا هەنگاوی نا بەرەو هاوکاری یەکتری بەدژیەتی کردنی بەریتانیاو فەرەنسا بەلام لەدوای وەرگرتنی دەسەلاتی ئەلمانیا لەلایەن هیتلەر لە ١٩٣٣ بووە هۆی گۆرینی رامیاریەتی ستالین دژی فاشیەت بە پشتگیری کردنی کۆمەلەی گەلان، ستالین لەناکاو پەیمانی دەست درێژی نەکردنە سەر ئەلمانیای مۆرکرد لە ١٩٣٩/٨/٢٤، بەلام هێرشی ئەلمانیا بۆسەر پۆلەندا مۆسکۆ بەشداری تێدا کردو خاکی هۆلەندای داگیر کردو دوای لکێندرا بەکۆمارەکانی ئۆکرانیاو بیلاڕوسیای سۆڤیەتی، شەڕ لەگەل فینلەندا کۆتای هات لە ١٩٤٠ ، لەمانگی /٨/ ١٩٤٠ هەرێمی بیارابیاو هەرێمی بۆکۆڤینا بچرێندرا لەڕۆمانیا و لکاندرا بەکۆمارەکانی بەلتیق کەلەسێ کۆماری ئیستونیاو لاتیڤیاو لیتوانیا پێکهاتبوو.

لەسالی ١٩٤٠ بونە کۆماری ژمارە ١٤-١٥-١٦، لەدوای ئەمەریکا دژایەتی ئەو کارەی ڕاگەیاند تائەوکاتەی یەکێتی سۆڤیەت دانی بەسێ کۆمارەکە نا لە ١٩٩١/٩/٦ ئەویش لەدوای هەرەس هێنانی یەکێتی سۆڤیەت، لە ١٩٤١/٦/٢٢ هیتلر لەناکاو پەلاماری یەکێتی سۆڤیەتی داو زیاتر لە ٥٠٠ هەزار میل لەخاکی سۆڤیەتی داگیرکرد لە گەورەترین شالاوی سەربازیو پێکدادانی جەنگی لەشاری پترۆسبۆرگی ئیستاو دەوروبەری لەجەنگی دووەمی جیهان کە ئەلمانەکان زیاتر لە ٧٠ر٠٠٠ هەزار سەربازی کوژراو بوەهۆی هەرەس هێنانی توانای سەربازی سوپای ئەلمانیاو بەرزبوونەوەی گیانی چەکداری سوپای سۆڤیەت و هەرئەوەش بوو کە یەکێتی سۆڤیەت توانی لەشەڕی دووەمی جیهان سەرکەوێت بەسەر ئەلمانیا بەهاوکاری ولاتانی تەوەرو هاوپەیمانان لە دوای ڕوخانی ڕژێمی نازی ئەلمانیا، لە ١٩٤٥/٥/١دوو کورد کەناویان بفرۆف کانتاریا بوو لە بەرلینی ئەلمانیا ئالای سۆڤیەتیان لەسەر تەلاری ڕایخشتاخ بەرز کردەوە ، لەدوای کوتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهان ستالین و دەسەلاتدارانی سۆڤیەت پەرژینێکیان دروستکرد بەناوی (کۆردۆنا) لەوولاتانی کۆمۆنیست لەپۆلەندا لەباکور بۆ ئەلمانیاو بولگاریا لەباشوور و ئەلمانیای ڕۆژهەلات و چیکۆسلۆفاکیا و مەجەڕو ڕۆمانیا کە ئەو وولاتانە بوو یەکێتی سۆڤیەت لەجەنگی دووەمی جیهان ڕزگاری کردبون، ستالین هەلسا بەدژایەتی کردنی ئەو وولاتانەی کە کومۆنیست نەبون بەتایبەتی ئەمەریکاو لایەنگیرەکانی، لەگەل ئەوەشدا ستالین لە ١٩٤٦/٣/٢٣بڕیاری کشانەوەی هێزی سوپای سوری دا لە ئێران بۆ ماوەی ٤٥ ڕۆژ بەمەلە چونی ستالین بەرامبەر بەبەلێنەکانی

ڕژێمی شایەتی ئێران کە بوە هۆی چۆل کردنی گۆڕەپانی ناوچەکەو ماوە دان بە دەسەلاتی ئەمەریکاو بەریتانیا کە بوە هۆی لەناو بردنی یەکەم کۆماری ئازربایجان دوایی لە ناو بردنی کۆماری کوردستان لە شاری مەهاباد. ئەمە چەند کارێکە کە لە لایەن ڕوسیا ئەنجام دەدرێ بەرامبەر بە کورد، بەلام بەدیا بەلگەنامەی تر هەیە کە ئەنجام دراوە بەرامبەر بەکوردو کوردستان سەرەڕای ئەوە چەندین کاری باش کراوە بۆ کورد لەلایەن ڕووسیاو دوایی یەکیەتی سۆڤیەت لەوانە دامەزراندنی کۆماری کوردستانی سور لە لایەن لینین لە ١٩٢٣/٧/٧ بەلام لەسالی ١٩٢٩لەلایەن ستالین ئەو کۆمارە هەلوەشێنرایەوە دوای ئەوە کورد لە ناوچەکانی خۆی پەرت و بلاو پێ کران بەسەر کۆمارەکانی یەکیەتی سۆڤیەت بەبێ بەزەییانە کە دەبوایە دەسەلاتی سۆڤیەت ئەم کوردستانە بەرەو باشتر ببات بە هۆی ڕابەرایەتی کردنیان لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی و کرێکاری لە جیهان. لە ١٩٥٣/٣/٦ ستالین کۆچی دوای کرد ڕۆژی دوایی مالتکۆف بوە سەرۆك وەزیران بەلام لەهەلبژاردنی لێژنەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیست نیکیتا خرۆشۆف بەسکرتێری گشتی یەکەمی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت هەلبژێردرا. یەکێتی سۆڤیەت بۆمبی هایدرۆجینی لەسالی ١٩٥٣ تەقاندەوە و لەسالی ١٩٥٧ توانی موشەکی بالیستی بەرهەم بهێنێ کەلەکێشومرێك بۆکێشومرێکی تر بیگوازێتەوە، مانگی دەستکردی بۆیەکەم جار لەجیهان ئەنجامدرا کە یوری گاگارین پێی چوە ئاسمان لەسالی ١٩٦١. لە ١٩٧٩/٦/١٨ سەرۆکی ئەمەریکا جیمی کارترو برێجنێف سکرتێری یەکەمی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت پەیمانی دوولایەنەیان مۆرکرد بەسنور دانان لە دروستکردنی چەکی ئەتۆمی بەناوی (سەلت) لەشاری فینیا، لە ١٩٧٩/١٢/٢٧ یەکێتی سۆڤیەت ئەفغانستانی داگیرکرد بوە هۆی دوودلی لەنێوان ئەمەریکاو یەکێتی سۆڤیەت لەبارەی مۆرکردنی پەیمانەکە. لەمانگی /٤/ ١٩٨٨ یەکێتی سۆڤیەت هێزی سوپای لەئەفغانستان کشاندەوە لەدوای سەرنەکەوتنی . لەدوای مردنی سەرکردەکانی سۆڤیەت و وەرگرتنی دەسەلات لەلایەن گۆرباتشۆف لەسالی ١٩٨٥ چوارجار لەگەل ڕیگانی سەرۆکی ئەمەریکا کۆبۆوە و لەسالی ١٩٨٧ پەیمانی لەناوبردنی هەموو موشەکەکانی ئەتۆمی درێژهاوێژی و مام ناوەندی لەئەوروپا مۆرکرد، لە ١٩٨٦/٤/٢٤ تەقینەوەی وێستەگەی تشێرنۆبل بۆ وزەی کارەبا بوە کارەساتێکی ئەتۆمی لەجیهاندا. گۆرباتشۆڤ لەسالی ١٩٨٧ دەستی کرد بە پڕۆگرامی چاکسازی لە پڕۆگرامی (گلاسنۆست)و دوای پڕۆگرامی (بیرسترۆیکا) لەسالی ١٩٨٧، لێژنەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیست ڕەزامەندی نواند لەسەر ئەو چاکسازیە بەکەم کردنەوەی دەسەلاتی دەولەت لەسەر ئابووری و هەروەها کۆنگرەی پارتی کۆمۆنیست ئەویش ڕەزامەندی کرد لەسەر گۆڕانکاری لەدەسەلاتی دەولەت و هەرەمی دەولەت، لەدوای ئەو بارودۆخەو دروست بونی کێشەو ململانێی ناوخۆیی یەکیەتی سۆڤیەت لەلایەن بیروبۆچونەکانی ڕاست ڕەو چەپ ڕەو لەسەرکردایەتی پارتی کۆمۆنیست و دووەم بەرزبوونەوەی بیری نەتەوەی و سەربەخۆی لەنێوان کۆمارەکان بوە هۆی نیمچە کودەتایەك لەلایەن هەندێك لە سەرکردەکانی کۆمۆنیست و ئەندامانی پەرلەمان دژی گۆرباتشۆڤ و هەرس هێنانی کودەتایە کە لە مانگی/٨/١٩٩١ بەلام یلسن سەرۆکی کۆماری ڕوسیای یەکگرتوو پشتگیری گۆرباتشۆڤی کرد. ئەمەش بوەهۆی دەست کشانەوەی گۆرباتشۆڤ لەهەموو

دەسەڵاتەکانی لە ١٩٩١/٨/٢٤ وەهەر دوای ئەو ڕوداوە زۆربەی کۆمارەکان سەربەخۆیی خۆیان لەیەکیەتی سۆڤیەت ڕاگەیاند، لە ١٩٩١/٨/٢٩ پەرلەمانی یەکیەتی سۆڤیەت بڕیاری دا بەوەستانی هەموو جموجۆڵی پارتی کۆمۆنیست و لەمانگی ١٢/١٩٩١ یلسن و گۆرباتشۆڤ ڕێکەوتن لەسەر هەڵوەشاندنەوەی یەکیەتی سۆڤیەت لە ١٩٩٢/١/١. بەشێوەی ڕەسمی یەکیەتی سۆڤیەت هەرەسی هێنا لە ١٩٩١/١٢/٢٦. ئاڵای چەکوش و داس لەسەر باڵەخانەی کرملن هێنرا خوارەوە و ئاڵای ڕوسیا جێگەی گرتەوە، لەسەر داوای یلسن پەرلەمانی ڕوسیا بڕیاریدا بەپێك هێنانی کۆمەنولس لە ١٩٩١/١٢/١٢ لە وڵاتانی سەربەخۆ ئەوەبوو ئەوکۆمەنولسە لەلایەن ڕوسیاو ئۆکرانیا و ڕوسیای سپی دامەزراو دوایی فراوان بوو تاکو گەیەشتە پانزە وڵات لەوڵاتە جیابوونەوەکانی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو. لەدوای وازهێنانی یلسن لەدەسەڵات بەهۆی نەخۆشی لە مانگی /٤/ ٢٠٠٠ ڤلادیمر پوتین لەهەڵبژاردن سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەسەرۆکی ڕوسیای یەککرتوو.لە دوای ئەو گۆڕانکاریە گەورانەوکۆتایی هاتنی شەڕی ساردو یەکلابونەوەی یەك جەمسەری دەسەڵات لەسەر جیهان بە کاردانەوەیەکی باش بۆ ئەمەریکاو کارتێکردن لە بارو دۆخی ناوەوەی ڕووسیای یەککرتوو لە بوارە جیاجیاکان بەتایبەتی لە بواری ڕامیاری و ئابوری و کۆمەلایەتی وبلاوبونەوەی باری ناهەموارێ بژێوی ژیانی گەلانی ڕووسیاو کەم بونەوەی ڕۆڵی پێشوی و بەردەوام بوونی شەڕی شیشان و چارەسەر نەکردنی کێشە سەرەکیەکان بە تایبەتی کێشەی نەتەوایەتی ئەمانە هەموو کاردانەوەی خراپ بوون بۆ داهاتوی ڕوسیاو نەمانی ڕۆڵی نێودەولەتی وەك جاران. سەرەڕای ئەو بارو دۆخەش پوتین لە هەلبژاردنەکانی ٢٠٠٤ دووبارە بە سەرۆکی ڕووسیای یەککرتوو هەلبژێردرایەوە.

لە ٣ر٨/٢٠٠٤ تیرۆریستانی ئیسلامی شیشان توانیان گەمارۆی دوو قوتابخانەی منداڵان بدەن لە ئۆسیتیای باکور لە شاری بسلان لە ئەنجام دا بوە هۆی شەهید بونی زیاتر لە ٥٠٠ منداڵ و زامدار بونی زیاتر لە٧٠٠منداڵ و کوژرانی چەند کەس لە تیرۆریستەکان و بەر لەوەش بە ماوەیەکی کورت دوو فڕۆکەی گواستنەوە کەوتە خوارەوە بوە هۆی کوژرانی زیاتر لە ٩٠سوار بوی فڕۆکەکان.

- ڕووسیا ئەندامی هەمیشەیی ڕێکخراوی نەتەوە یەککرتوەکانە، ئەندامە لە ڕێکخراوی کاری نێو دەولەتی.ئەندامە لە بانکی نێو دەولەتی، ئەندامە لە خەزنەی دراوی نێو دەولەتی، ئەندامە لە کۆمەنولسی وڵاتانی سەربەخۆی پێشوی یەکیەتی سۆڤیەت. ئەندامە لە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی، ئەندامە لە ڕێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەوروپی. ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاری و ئابوری ئاسیا "باسیفیکی". ئەندامە لە چەندین ڕێکخراوی تری جیهانی.

# سان مارینۆ

- ناوی ڕەسمی: کۆماری سان مارینۆ.
- پایتەختی: سان مارینۆ، ژمارەی دانیشتوانی ٨٩٥ر٣ هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ٢٤میل چوارگۆشەو ٦١ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە بچوکترین دەوڵەتە لەجیهاندا.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٢٥ هەزار کەسە.
- چڕی دانیشتوانی: ١٢٠٢ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- زمانەکانی: ئیتاڵی (زمانی ڕەسمیە).
- نژادەکانی: سان مارینز ٧٦٪. ئیتاڵی ٢٤٪.
- ئاینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٧ر٠٪.
- زانینی خوێندن و نوسین٩٦٪.
- دابەشی کارگێڕی: ١٠ ئەنجومەنی شارەوانیە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥١٦ ملیۆن دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٢٠٠ر٢٠ دۆلار.
- دراوی: لیرەی ئیتاڵی.
- بەرگری: ٢ر١٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- زەوی کشتوکاڵ: ٤ر١٧٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، گەنمەشامی، کروم، تەرە، میوەجات.
- پیشەسازی: دروستکردنی جلوبەرگ، گۆڕینی دراو، خواردنەوە، چیمەنتۆ، سیرامیك، ئەلکترۆن، بەرهەمی ڕستن و چنین، گەشت و گوزار، پێست، زەیتون.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی دروستکراو، سوتەمەنی، جلوبەرگ.
- دەرچووەکانی: خشتی دروستکراو، چەو، بوندق، دانەوێڵە، پێست، سیرامیك.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕو بزن و چێڵ و پەرەوەری تیایە بەڕێژەیەکی کە دانیشتوانی گیروگرفتیان بۆ دروست نابێ.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئیتاڵیا، وڵاتانی یەکێتی ئەوروپی، بەریتانیا، چین.
- جوگرافیای وڵات: ئیتاڵیا لەهەموو لایەکی سنوریەتی، دەکەوێتە بلندو نەویەکانی بەشی چیای تیتانۆ، وڵاتێکی ناوخۆییە. سان مارینۆ دەکەوێتە باکووری ناوەڕاستی ئیتاڵیا لەنزیك کەناری دەریای ئریانیك. کەش و هەوای مام ناوەندییە زستانی ساردو هاوینی فێنکە.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی پێشکەوتووی دیموکراتی، پارتی سۆشیالیستی، پارتی دیموکراتی مەسیحی.
- ڕژێمی دەسەڵات: دوو دادوەری هەیە، دەسەڵاتی جێبەجێکردن (١٠) وەزیر کاروبارەکەی ئەنجام دەدەن.
- مێژووی وڵات: کۆنترین کۆمارە لەجیهان، لەساڵی ٢٥٠ ی زاینی دامەزراوە. بەختی سپی خۆی دوور بووە لەهەموو لایەنێکی ئەو کێشەو ململانێیەو شەڕو پێکدادانە نێودەوڵەتیە لەهەمووبوارەکان. ئەو دەوڵەتە لەسەدەی چوارەم دامەزراوە بە هۆی لەباری ناوچە جوگرافیەکەی سەربەخۆیی خۆی پاراستووە لەهەموو کاتێك سەرەڕای هەوڵەکانی داگیر کەران، بەڵام خاکە چیاییەکەی بونی خۆی پاراستووە. لەسەدەی چواردە بۆتە وڵاتێکی کۆماری. پاپا دانی بەسەربەخۆیی نا لەساڵی ١٦٣١. پەیمانی هاوکاریو برایەتی لەگەڵ ئیتالیا مۆر کرد لە ساڵی ١٨٦٢، لەنێوان ساڵەکانی ١٩٤٧تا١٩٥٧ دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکان حوکمی وڵاتەکەیان کردووەو دووبارە دەسەڵاتیان گرتەوە دەست تاکو ساڵی ١٩٨٦. لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٣ ئەنجومەنی باڵاو گشت دیموکراتیە سۆشیالیستە مەسیحیەکان سەرکەوتن تاکو کۆتایی ٢٠٠٣ باری دەسەڵات لەبواری جیاجیا بەرێکی بەرێوەدەچوو.
- سان مارینۆ: ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتووەکان. ئەندامە لەکۆنگرەی ئاسایشن و هاوکاری لەئەوروپا.

# ئیستیوانیا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری ئیستیوانیا.
- پایتـەختی: تـەللین، ژمـارەی دانیـشتوانی ۰۰۰ر۵۹۸ هەزار کەسە.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: تەلینی پایتەخت
- شارە سەرەکیەکانی: تارتۆ، تارفا، بارنۆ.
- ڕووبەری: ۳۰۰ر۱۷ میل چوارگۆشەو ۷۰۰ر٤٤ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ۰۰۰ر۷۸۵ر۱ میلـۆن کەسە بەپێی بڵاوکراوەکانی ساڵی ۲۰۰۱.
- چـڕی دانیـشتوانی: ۱۰۳ کـەس لەیـەك میـل چوارگۆشە.
- بوژانەوەی دانیشتوانی:۷ر۰ ٪ .
- زمانەکانی: ئیستۆنی (زمانی ڕەسمییە)، لیانی بوە لە زمانی فیلەندی، لاتفی، لتوانی و ڕوسی.
- نژادەکانی: ئیستۆنیەکان ٦٣٪، ڕووسی ۳۰٪، ئۆکرانی و ڕوسیای سپی و فلەندی٧٪ .
- ئایینـەکانی: پرۆتستنتیە لوتری ، کاسۆلیکی رۆمانی.
- زانینی خوێندن و نوسین: ۹۹٪.
- ڕژێمـی دەسـەڵات: پەرلـەمانی دیموکراتیـە، پەرلەمان لە ۱۰۱ ئەندام پێك هاتیە ئەنجومەنی وەزیرانی هەیە بەپێی ژمارەی وەزیرەکان.
- پارتـە ڕامیاریـەکان: پـارتی ڕێکـەوتن، "کۆمۆنیستی پێشوو" چەپی ناوەنـدی، پارتی ئسما، پارتی خاکی نیشتمانی نەتەوەیی ڕاست ڕەو، بازاڕی ئازاد، پارتی چاکسازی ئەستوانی، پارتی ناوەند، مام ناوەندی، پارتی سەربەخۆی نیـشتیمانی نەتـەوەیی رادیکـاڵی، پـارتی ئیستیوانی کۆمۆنیست.
- دابەشـی کـارگێری: ۱۵ هەرێمـە لـە شـێوەی پارێزگا.
- بەرگری : ٥ر۳٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر۳۵هەزار کەسە.
- دراوی: کرۆن.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ۲٤۰ر۹ ملیـار دۆلار.
- بەشـی تـاك لـەکۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٤٥۰ر٦ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ۲۲٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمـەکانی کـشتوکاڵی: پەتاتـە، میوەجـات، تـەرە بەهـەموو جۆرەکـانی، شـیر، چـەوەندری شەکر، دانەوێڵەی هەمە جۆر.
- سامانی ئاژەڵی: بـەراز ۰۰۰ر٤٨۰ هـەزار سـەر، چێڵ و گامیش ۰۰۰ر٤١٥ هـەزار سـەر، پـەرەور ۷۰۰ر۲ ملیۆن سەر.
- بەرهـەمی کارەبـا: ۷۰۰ر٨ ملیـار کیلـۆوات کاتژمێر.
- پیـشەسازی: ماشـێنی جولێنـەری کارەبـایی، چیمەنتۆ، دروستکردنی شەکر.
- سامانی سروشتی: نەوت، فۆسفات.
- دەرچـووەکانی: ئـاژەڵ و بەرهەمـەکانی ئـاژەڵ، خـۆراك، خواردنـەوەکان، بەرهـەمی ڕسـتن و چنین، ماشـێن، کەلوپـەلی کارەبـایی، ئاسـنی خاوی بنەڕەتی.
- داهـاتی دەرەوەی: خـۆراك، خواردنـەوەکان، بەرهەمی ڕستن و چنین، ئۆتۆمۆبێل.
- هاوبەشەکانی بازرگـانی: ڕوسـیا، کۆمارەکـانی پێشووی یـەکێتی سـۆفیەت، فلەنـدا، وڵاتـانی ڕۆژئاوا، چینی میللی، یابان.
- جوگرافیـای وولات: کۆمـاری ئیـستیوانیا دەکەوێتـە ڕۆژهـەڵاتی ئـەوروپا، لـەنێوان سـاڵەکانی ۱۹٤۰ تـاکو ۱۹۹۱ یـەکێك بـوە لەکۆمارەکانی پێشووی یەکێتی سۆفیەت. کە نـاوی کۆمـاری ئیـستیوانیای سـۆفیەتی

سۆشیالستی بوو، بچوکترین کۆماری ناوچەی بەلتیقی سێیەم بەدووری لەباکور دوای وولاتانی لاتیفیاو لیتوانیا. لە باکوری کەنداوی فنلەندا، لەڕۆژئاوا دەریای بەلتیق، لەباشوور لاتیفیا، لە ڕۆژهەلاتی ڕوسیا، لە باکوری ڕۆژئاوای کەنداوی ڕێگا. ئیستیوانیا زۆربەی خاکی نزمە و چەندین دەریاچەی تیایە. گەورەترین دەریاچەی (بیسیس) کە گرنگیەکی باشی هەیە بۆ دروستکردنی کەشتی و ڕاوی ماسی، ئەو دەریاچە لەگەڵ زێی زارفا سنوری لەگەڵ روسیا لێك جیادەکاتەوە، درێژی کەنارەکە (٧٧٤) کیلومەترە، دروگەی بەلتیق کەوتۆتە رۆژهەلاتی وڵات لەدەریاچەی بەلتیق، ئیستیوانیەکان لە ڕەگەزو زمان بەسترایەنەوە بە فنلەندیەکان،ئاو و هەواکەی مام ناوەندیە لەوەرزەکانی بەهارو پایزو هاوین.

● مێژووی وولات: ئەو وڵاتە بەلتیقیە بچوکە لە جەنگی یەکەمی جیهان لەدایك بووە، هیچ سەربەخۆی بە خۆیەوە نەدیوە تەنیا لە دوومارەی کورت نەبێت بەهۆی بەهێزی دراوسێکەی ڕوسیا کە هەردەم پەلاماری دەدا. لە سەدەی یەکەمی زاینی یەکەم ولاتی سەربەخۆی ئیستیوانی پێك هێنا. دوای ئەوە لەلایەن (فایکینج) لەسەدەی نۆیەم داگیرکرا. لەسەدەی سیانزدەم لەلایەن سوارەکانی ئەلمانیا (تیوتونیەکان) داگیکراو. خەڵکەکەی کردە دیلی ئاینی مەسیحیو ئاینی مەسیحیان کردە ئایینی ڕەسمی، لە ساڵی ١٥٦١ سویدییەکان دەستیان بەسەر باشووری ئیستیوانیا داگرت و بوە ژێر دەستەی خاوەندیەتی زەوی ئەڵمانیەکان، لەساڵی ١٦٢٩ سویدیەکان باشووری ئیستیوانیاشیان داگیر کردو لە ژێر دەستی پۆلەندیەکانیان دەرهێنا. لە ساڵی ١٧٢١ سویدییەکان لە خاکی ئیستیوانیا دەستیان هەڵگرت بۆ ڕوسیای قەیسەریان جێ هێشت، ئیستیوانیەکان بونە دیلی دولایەنەی نێوان چینی دەرەبەگ، بەلام لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بزوتنەوەی نەتەوەیەتی ئیستیوانی بەرهەڵستکار دروست بوو دژی داپلۆسینی ڕوسەکان، ئەڵمانیا توانی خۆی زاڵ بکات لە ڕووی ئابووری بەسەر ئیستیوانیا، لە ساڵی ١٩١٤ ئیستیوانیا لەلایەن ئەڵمانیا داگیر کرا. لەدوای جەنگی یەکەمی جیهان نەتەوەکانی ئیستیوانیا توانیان سەربەخۆیی ئەنجام بدەن بە سەرۆکایەتی (قستەنتین یانس) سەرەڕای هەوڵی سوپای ڕوسی بە داگیر کردنەوەی. لە ساڵی ١٩٤٠ ئیستیوانیا چووە پاڵ یەکێتی سۆڤیەتو بوە کۆماری سۆڤیەتی شەشەم، ئەمەش بوە هۆی ئەوەی کە زیاتر لە ١٠٠ هەزار ئیستیوانی دەربەدەریکەنو بکوژن، دوریان بخەنەوە بۆ سیبیریا، دووبارە ئەڵمانیا ئیستیوانیای داگیر کردەوە لەنێوان ساڵی ١٩٤١ تا ١٩٤٤ بەلام لە ساڵی ١٩٤٤ یەکێتی سۆڤیەت بەهێزی سەربازی ئیستیوانیای لە ئەڵمانیا وەرگرتەوە.

لەدوای ئەو هەموو کارەسات و گیرو گرفت و دەربەدەر بوون لەنێوان ئەڵمانیاو روسیاو دەوروبەری ئیستیوانیا، لە ١٩٩١/٨/٢٠ سەربەخۆی خۆی ڕاگەیاند،لە ١٩٩١/٩/٦یەکیەتی سۆڤیەت دانی بە سەربەخۆیی ئیستوانیا نا. لەساڵی ١٩٩٣ڕێکەوتنی بازاڕی ئازادی لەگەڵ لاتڤیاو لیتوانیا مۆر کرد.

لەساڵی ١٩٩٤ دوا سەربازی ڕوسیا لە وولات دەرچوو. لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٥دووپارتە چەپڕەوەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا بە ٤١ کورسی. لەهەڵبژاردنەکانی١٩٩٩ پارتە ڕاستڕەوەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. لە ١٩٩١/٩/١٧ بوە ئەندام لە ڕێکخراوی نەتەوە یەککگرتوەکان.

● ئیستوانیا ئەندامە لە نەتەوە یەککگرتوەکان.

# ئۆكرانيا

- ناوی ڕەسمی: كۆماری ئۆكرانيا.
- پايتەختی: كيف، ژمارەی دانيشتوانی ٢٫٥٦٥٫٠٠٠ مليۆن كەسە.
- شارە سەرەكيەكانی: خاركوف، دوسك، ئودينا، لفيف.
- بەندەرە سەرەكيەكانی: ئوديسا، كيف، برديانيسك.
- ڕووبەری: ٢٣٣٫١٠٠ ميل چوارگۆشەو ٦٠٣٫٧٠٠ كيلۆمەتر چوارگۆشەيە.
- ژمارەی دانيشتوانی: ٥٥٫٣٦٥٫٠٠٠ مليۆن كەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- چڕی دانيشتوانی: ٢٣٧ كەس لەيەك ميل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانيشتوانی: ٠٫٥٪.
- نەژادەكانی: ئۆكرانی ٧٣٪ ، ڕوسی ٢٢٪، جولەكە ١٪ ڕوسی سپی ١٪.
- زمانەكانی: زمانی ئۆكرانی (زمانی ڕەسميە) زمانی سلافونی ڕوسی.
- ئايينەكانی: زۆربەی دانيشتوانی ئۆرسۆزكسی ئۆكرانين ، هەندێكيان كاسۆليكی ئۆكرانين.
- زانينی نوسين و خوێندن ٩٩٪ .
- ڕژێمی دەسەڵات: كۆمارێكی دەستوريە، پەرلەمانی لەيەك ئەنجومەن پێك هاتيە كە ئەنجومەنی بەرزی وولاتەو ٤٥٠ ئەندامەو ڕۆڵی ياسايی گرنگی هەيە، لەگەڵ ئەنجومەنی وەزيران.
- پارتە راميارييەكان: پارتی كۆمۆنيستی ئۆكرانی، پارتی كۆنگرەی نەتەوەيی ئۆكرانی، پارتی ئۆكرانيای ديموكراتی، ئەم چوار پارتە هەموو نەتەوەيی مام ناوەندين. پارتی ئۆكرانيای ديموكراتی كۆمەڵايەتی، يەكێتی.
- دابەشی كارگێری: ٢٤ پارێزگايە ، يەك هەرێم مافی نيمچە ئۆتۆنۆمی هەيە ئەويش هەرێمی قرمی سەر سنووری ئێرانە بەرامبەر شاری قرمی ئێران كە مەڵبەندی ئاينی شيعەكانی ئێرانە.
- بەرگری: ٥٫٦٪ لەكۆی دەرئەنجامی ناوخۆيی.
- سوپاكەی: ٣٨٥٫٠٠٠هەزار كەسە.
- دراوی: هريفنا.
- كۆی دەرئەنجامی ناوخۆيی ١٢٥٫٩٠٠ مليار دۆلارە.
- بەشی تاك لەكۆی دەرئەنجامی ناوخۆيی: ٢٫٥٠٠ دۆلار.
- زەوی كشتوكاڵی: ٥٧ ٪ لە خاكی وولاتەكە.
- بەرهەمی كشتوكاڵی: دانەوێڵە، چەوەندەری شەكر، تەرە بەهەموو جۆرەكانی. گێزەر. بەتاتە.
- سامانی ئاژەڵی: چێڵو گامێش١٥٫٧٠٠ مليۆن سەر ، بەراز ١٢٫٥٠٠ مليۆن سەر، مەڕ ٢٫٣٠٠ مليۆن سەر ، پەرەور ١٠٣ مليۆن سەر.
- بەرهەمی كارەبا: ١٧٥٫٣٠٠ مليار كيلۆ وات كاتژمێر.
- سامانی سروشتی: ئاسن، موگناتيس، خەڵوز، غاز، نەوت، كبريت، نيكل، جيوە، خوێ، داری دارستانەكان.
- پيشەسازی: كيميا، ماشێن، دروستكردنی خواردەمەنی، ئامادەكردنی گۆشت، دروستكردنی پێڵاو، ڕستن و چنين، چەندين جۆری تر لە دروستكراوەكانی پيشەسازی هەيە.
- دەرچووەكانی: خەڵوز، وزەی كارەبا، ئاسن، كيميا، كەلوپەل گواستنەوە،دانەوێڵە، گۆشت.

- داهاتەکانی دەرەوەی: ماشێن و پێداویستیەکانی، کەلوپەلی گواستنەوە، کیمیا، ڕستن و چنین.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ڕوسیا، ڕوسیای سپی، کازاخستان، ئەڵمانیا، چین، نەمسا، ئێران، هەندێك لە وولاتانی یەکیەتی ئەوروپا.
- جوگرافیای وولات: بێلە ڕوسیا (ڕوسیای سپی) لە باکوور، ڕوسیای یەکگرتوو لە باکوری ڕۆژهەلاتی، لە ڕۆژهەلاتی مۆلدافیاو ڕۆمانیا، لە باشووری ڕۆژئاوای مەجەڕ و سلۆفاکیاو پۆڵەندا، دەریای ڕەش و دەریای شین لە باشوور. خاکی ئۆکرانیا زۆربەی خۆلێکی ڕەشی بەپیتە، بەلام ناوچەی چیاکانی چیای فریاتیان لە باشووری ڕۆژئاوای و زنجیرە چیای قرم لە باشوور پێك دێنن، زێی دۆنتزو زێی بج و دنیر، زەلکاوەکانی بەلیسی دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای.
- مێژووی ولات: تاکو سەدەی شانزەهەم ئوکرانیا دەناسرا بە ناوی (روس) ئەم وشەیە لە ڕوسیاوە دەرچووە، ئۆکرانیا سەبەتەیەکی نان بوە بۆ ئیمپراتۆریەتی ڕوسیا . لە سەدەی نۆیەم شاری کیفی پایتەخت مەڵبەندی ڕامیاری و ڕۆشنبیری سەرەکی بووە لە ڕۆژهەلاتی ئەوروپا. ئاینی مەسیحی لەو ماوەیە لە بارەش گرتووە، لە ساڵی ١٢٤٠ ی زاینی مەگۆلەکان دەستیان لە داگیر کردنی کییف هەڵگرت. لە ماوەی نێوان سەدەی سیانزەو شانزە کییف کەوتە ژێر دەسەلاتی پۆلەنداو ئەوروپای ڕۆژئاوا . ئۆکرانیا لە ساڵی ١٦٥٤ داوای لە ڕوسیای قەیسەر کرد کە بیخاتە ژێر پاراستنی دەسەلاتی خۆی لە دژی پۆڵەندا. ئۆکرانیا کەوتە ژێر سەربەخۆی ڕوسیا بەپێی پەیمانی بیریاساف بەلام دوای ئەوە ڕوسیای قەیسەری ئوکرانیای خستە ژێر دەسەلاتی خۆی وەك داگیر کردن. لەداوی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ڕوسیا لەساڵی ١٩١٧ ئۆکرانیا سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند لە ڕوسیا لە ١٩١٨/٦/٢٨ . دوای ئەوە چەندین شە ڕ هەڵگیرسا ئەویش بوە هۆی ئەوەی کە سوپای سور سەرکەوێت لە کیێف. لەساڵی ١٩٢٠ کییف بوە کۆمارێکی سۆڤیەتی، لە ساڵی ١٩٢٢ ئۆکرانیا بوە یەکێك لە کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی (CCCP).

لەنێوان ساڵەکانی ١٩٣٢ تا ١٩٣٣ ڕۆژهەلاتی ئۆکرانیا توشی مەرگەساتی برسیەتی بوو بە پیلانی حکومەتی سۆڤیەت کە بووە هۆی مردنی زیاتر لە ٥٠٠ر١٠ ملیۆن کەسی ئۆکرانی. لە ساڵی ١٩٣٩ ئۆکرانیا یەکەم ولات بوو ئەڵمانەکان هێرشیان کردە سەر لە ناوچەکە، لە شەڕی دووەمی جیهان هێزی نیشتیمانی ئۆکرانی نهێنی دژایەتی داگیرکەرانی کرد و بەرگری لەخۆ کرد دژی یەکێتی سۆڤیەت و ئەڵمانیا. لە٢٠/٧/١٩٤١ سەربەخۆیی ئۆکرانیا دووبارە ڕاگەیاندرا، کە لەشەری جیهانی دووەم زیاتر لە ٥ ملیۆن ئۆکرانی کوژران. بەلام لە ساڵی ١٩٤٤ دووبارە سوپای سوری سۆڤیەت داگیری کردەوەو بوە هۆی کوشتن و بزرکردن و لەسێدارە دان و دورخستنەوەیان لەسەر ماڵ حاڵی خۆیان لەلایەن دەسەلاتی سۆڤیەت بەسەر کردایەتی ستالین.

لە ١٥/٤/١٩٨٦ ڕوودانی کارەساتی سروشتی بەهۆی تەقینەوەی وێستگەی ئەتۆمی (تشێرنۆبیل) لە باکوری کییف، لە ٢٩/١٠/ ١٩٩١ پەرلەمان دەنگی دا بە پێوەرانی وێستگەکەو داوای یارمەتی لە دەوڵەتان کرد بۆ هەلوەشاندنەوە. لەدوای هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت ئۆکرانیا بە یەکجارەکی سەربەخۆی ڕاگەیاند لە ٢٤/٨/١٩٩١ . سەرکردەکانی ئۆکرانیاو ڕوسیاو ڕوسیای سپی یەکیان گرت لە (کۆمەنولس) لە ٢٤/١٢/١٩٩١ کەپایتەختی کۆمەنولس مینسك بێت لە ڕوسیای سپی و دوای ئەوە ١٠ کۆماری تری یەکێتی

سۆڤیەتی پێشوو چونە ناو ئەو یەکگرتنە .... ڕوسیاو ئۆکرانیاو ئەمەریکا ڕێککەوتن بۆ تێك دانی ورده‌ورده‌ی وێستگەی تشیرنۆبیل لە مانگی ١٩٩٤/٦/ . لەمانگی ١٩٩٧/٥/ ڕوسیاو ئۆکرانیا ڕێککەوتن لەسەر کۆتایی هێنانی کێشەی نێوانیان لەسەر کەشتی جەنگی دەریای ڕەش و داهاتوی بەندەری سڤستۆپۆل .لە دوای چەندین کێشەو گیرو گرفت کە بەسەر ئۆکرانیا دا تێپەڕی بەڵام لە دوای هەڵبژاردنەکانی خولی دوەم لە ٢٠٠٤/١٠/٢٢کە فکتۆر یانکۆفیتش سەرکەوتنی بەدەست هێناو بەرهەڵستکار فکتۆر یۆشینکا سەرکەوتنی بەدەست نەهێناو ئەنجامەکەی بووە گیرو گرفتێکی نەك هەر ناوخۆیی بە ترس بەڵکو بووە کێشەیەکی نێو دەوڵەتی بەهۆی پالپشتی ئەمەریکا بۆ یۆشینکاو پالپشتی ڕووسیاش بۆ یانکۆفیتش‌و لە دوای یارمەتی دانی گەلانی ئۆکرانیاو ڕزگار کردنی لەو کێشە ترسناکە نوێنەری یەکێتی ئەوروپاو چەندین وڵات ئەنجامەکەی گەیشتنە ڕێکەوتن بەپێی یاسای ئۆکرانیاو بڕیاری هەڵوەشانەوەی هەڵبژاردنەکانیان داو بڕیاری هەڵبژاردنی نوێیان دەرکرد لە داهاتوو دەرکرد کەئەنجامەکەی فکتۆر یانکۆفیتش سەرکەوتنی بەدەست هێناو بوە سەرۆکی ئۆکرانیا.

- ئۆکرانیا ئەندام لە وڵاتانی (کۆمونولس)، ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

# پورتوگال

- ناوی ڕەسمی:کۆماری پورتوگال
- پایتەختی: لشبۆنە، ژمارەی دانیشتوانی ٢٫٦٣٥٫٠٠٠ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکییەکانی: کوامیرا، ئامادورا.
- بەندەرە سەرەکییەکانی: بۆرتۆ، ئامادورا.
- ڕووبەری: ٣٥٫٦٧٢ میل چوارگۆشەو ٩٢٫٣٩٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ١٠٫٩٨٥٫٠٠٠ملیۆن کەسە، بەپێی زانیاری ڕۆژنامەکانی ٢٠٠٢.
- چڕی دانیشتوانی: ٣٠٨ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٠٫٢ ٪.
- نژادەکانی: زۆربەی دانیشتوانی ڕەچەڵەکی گەلانی قەوقازین کەلە هەموو نیمچە بیابانی ئیبیریا نیشتەجێ ببون لە سەردەمەکانی کۆن، پێش کونیش، کەمایەتی ئەفریقیەکان لە دواوەی دەریاکان بوون.
- زمانەکانی: پورتوگالی (زمانی ڕەسمیە).
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی ٩٧٪.
- زانینی نوسین وخوێندن: ٩٢٪.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی دیموکراتیە، سەرۆکیان بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێت، دەسەڵاتی یاسایی یەك ئەنجومەنە، ئەویش ئەنجومەنی کۆماریە، هەڵدەبژێردرێت بۆ ماوەی چوار ساڵ.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی دیموکراتی کۆمەڵایەتی. مام ناوەندی، چەپی ناوەند، پارتی سۆشیالستی. پارتی ڕاست ڕەو بەرهەڵستی بۆ یەکگرتنی لەگەڵ ئەوروپا. پارتی گەل.
- دابەشی کارگێری: ١٨ بەشە، دووهەرێمی ئۆتۆنۆمی تیایە.
- بەرگری: ٥٫٦٠٠ ٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.

● سوپاکەی: ٥٠٠ر٥٩ هەزار کەسە.

● دراوی: ئەسکیدۆ.

● کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥ر١٥٠ ملیار دۆلار.

● بەشی تاک لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٣٠٠ر١٠ دۆلار.

● زەوی کشتوکاڵی: ٢٢ ٪ لە خاکی وولاتەکە.

● سامانی ئاژەڵی: مەر ٣٥٠ر٦ ملیۆن سەر، بزن ٦٧٠ر١ ملیۆن سەر، چێڵو گامێش ٤٠٠ر١ ملیۆن سەر، بەراز٥٠٠ر٢ ملیۆن سەر.

● بەرهەمی کشتوکاڵی: دانەوێڵە، پەتاتە، ترێ، زەیتون، میوەجات، تەرە، چەوەندەری شەکر، چەندین جۆری تر لە بەرهەمی کشتوکاڵی .

● سامانی سروشتی: تەنجستین، یۆرانیۆم، ئاسن، داری دارستانەکان، گەورەترین دەوڵەتە لە بەرهەمی فلینە لەجیهان.

● بەرهەمی کارەبا: ٧٠٠ر٣٢ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.

● پیشەسازی: ڕستن و چنین، گۆریەو پێڵاو، فلین، کیمیا، پەڕ، ماسی، بەرهەمی شیر، بادەم. ئامادە کردنی گۆشت، داو دەرمانی پزیشکی .

● دەرچووەکانی: پەمۆ، بادەم، مافور، فلین و بەرهەمەکانی، ماسی، ماست و پەنیرو کەرەو ڕۆن، دارو بەرهەمەکانی.

● داهاتەکانی دەرەوەی: ماشێن و پێداویستیەکانی گواستنەوە، بەرهەمی کشتوکاڵی، کیمیا، نەوت، بەرهەمی ڕستن و چنین، دانەوێڵە.

● هاوبەشەکانی بازرگانی: وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا، ئەمەریکا، چینی میللی ، یابان، چەند وڵاتێکی عەرەبو ئەفریقی.

● جوگرافیای وڵات: پورتوگال دەکەوێتە ڕۆژئاوای نیمچە بیابانی ئیبیریا لەنێوان ئەسپانیا لە باکوری ڕۆژهەڵات و زەریای ئەتڵەسی لە ڕۆژئاوا. کەنداوی کادیر لە باشوور. دورگەی ئزورو مادیرا دەگرێتە خۆی، پورتوگال لەلایەنی باشووری ڕۆژئاوای کیشەوەری ئەورووپا دەگرێتە خۆی، نیوەی لە باکوری وولات لەچیاو گردۆلکەی بەرز پێک دێنێ. بەڵام نیوەکەی تری دەشتایی و زەوی کشتوکاڵییە لە باشوور، پرتوگال دووزێی گەورەی تیایە ئەویش زێی تاجوس، دوو کەرتی دەکات هەروەها زێی میتهوش کە پارچەیەکە لە سنوری باکوری وولات، ئەو سێ زێیە سەرچاوەکەی لە ئەسپانیا هەڵدەقوڵێ و دەچێتەوە ناو زەریای ئەتڵەسی، بەڵام زێی تری بچوکی هەیە، دورگەی ئزور ژمارەی نۆ دورگەیەو دەکەوێتە زەریای ئەتڵەسی بە دوری ١٤٤٨ کیلۆمەتر لە ڕۆژئاوای (کیب داروکا) لە پورتوگال، ئەویش وێستگەیەکی گرنگە بۆ ڕێگەی گواستنەوەی ئاسمانی لە زەریای ئەتڵەسی. لە جەنگی دووەمی جیهان بەریتانیاو ئەمەریکا بنکەی ئاسمانیان لێ دامەزراندبوو. کۆی ڕووبەرەکەی ٢٢٣٥ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە ... بەڵام دورگەی (مادیرا) پێک دێت لەدوو بیابانی دانیشتگە، دورگەی ترەیە کە دانیشتوانی لێی نییەو دەکەوێتە سەر زەریای ئەتڵەسی بەدرێژایی ٨٦١ کیلۆمەتر لە ڕۆژئاوای باشووری لشبۆنە کە ڕووبەرەکەی ٧٩٦ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، کەش و هەوای مام ناوەندی و شێدارە لەزستان، فێنک و وشکانیە لە هاوین.

● مێژووی وڵات: لەسەدەی دووەمی پێش زاین نیمچە بیابانی ئیبیریا لەلایەن ڕۆمانەکان داگیرکرا. لەسەدەی پێنجەمی زاینی و لەدوای کەوتنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دەستی بەسەردا گیرا لەلایەن (فندال و فیزیوگوتیەکان).

لە ساڵی ٧١١ شانشینی فیزیوگوتیەکان لەناوبران لەلایەن ئەو موسڵمانانەی کە لە باکوری ئەفریقیا ڕوویان تێکردبوو لەماوەی ساڵەکانی ٩٩٧ تا ١٠٦٤ زاینی مەسیحیەکان کردیانە جێ نشینگەی خۆیان لەناوچەی باکوور کە لەوکاتە

دەسەڵاتی لیۆن و کاستیل دەسەڵاتداریەتیانی دەکرد.

پورتوگال بوە شانشینێکی سەربەخۆ لەساڵی ١١٤٣ لەژێر دەسەڵاتی شانشین فۆنسۆی یەکەم، لە ساڵی ١٣٧٣ ڕێکەوتننامەی هاوکاری ئینگلیزو پرتوگال مۆرکرا، لە ساڵی ١٣٨٥ یوحنای یەکەم بنەماڵەی ئەفیزی دامەزراندو حوکمی پرتوگالیەکانی کرد. لەسەردەمی ئەودەسەلاتی ئیستیعمارفراوان بوو دەستکرا بەسەردەمی دۆزینەوەو پشکنینی جوگرافیای جیهان لەژێر سەرکردایەتی ئەمیر هنری مەلاح کوڕی شانشین یوحنا، لە ساڵی ١٤٨٨ پشکێنەری پارتولومو دیاز شەری داواکاری ئاشتبونەوەی دڵنیا کردەوە کە لە ڕۆژهەڵاتی دور دەتوانرێ بەڕێگەی دەریا بیگەیەنێ، لە ساڵی ١٤٩٨ فاسکۆ داجاما گەیشتە کەناری ڕۆژئاوای هیند، لە لایەکی تر بدورکابرال گەیشتە بەڕازیل، ڕەنجی سەدەی شانزە لەوە دەرکەوت و دیار دەکرا کە ئیمپراتۆریەتی پورتوگال زۆر جێگەی خستە ژێر ڕکێفی خۆی لە ئەمەریکای باشوورو ئەفریقیاو باشووری ئاسیاو باشووری ڕۆژئاوای، هەروەها ئەو سەردەمە زێڕینە پرتوگالی بوژاندەوەو بوە هێزێکی بازرگانی و ئیستیعماری.

لە ساڵی ١٥٨١ فلیپی دووەمی شانشینی ئیسپانیا هەڵسا بە داگیر کردنی پورتوگال بۆ ماوەی شەست ساڵ و بوە هۆی تواندنەوەی بازرگانی پورتوگاڵ و کۆکردنەوەی. لە ساڵی ١٦٤٠ بوە هۆی بەرپابوونی شۆڕشێکی سەرکەوتوو بەسەرکردایەتی بنەماڵەی براجنزا کە دەسەڵاتی ئەسپانیای لەناو بردوو بوە هۆی ئەوەی کە پورتوگال زۆر لە دەسەڵاتداریەتی لەدەست بدات بەتایبەتی لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی دورو سەرهەلدانی ململانێی نێوان هۆڵەنداو فەڕەنساو ئینگلیزو وەرگرتنی دەسەڵاتیان، بەردەوام بوونی لەسەر بەدەستهێنانی بەشی زۆربەی ژێر دەستە کردن و بازرگانی. بەڵام پورتوگال بانجولاو موزمبیقی لە ئەفریقیاو بەرازیل لە ئەمەریکای باشوور پاراست لەژێر دەسەڵاتی خۆی. ناپلیۆن پۆناپارت لە ساڵی ١٨٠٧ پرتوگالی داگیر کردو بەڵام دوایی شانشین خۆیی و کورسیەکەی هەلاتن بۆ بەڕازیل، بەڵام لەشەڕی نیمچە بیابان ئەیبیری ساڵی ١٨٠٧ تاکو ١٨١١ هێزی بەریتانیا توانی ڕۆڵی سەرەکی بگێڕی لە ڕزگار کردنی پورتوگال لە ژێر دەسەڵاتی فەڕەنسا، لە ساڵی ١٨٢٠ شۆڕشێکی لیبراڵی ئەنجام دراو شانشین ناچار کرا بگەڕێتەوە بەڕازیل و ڕەزامەندی بکات لەسەر حکومەتێکی دەستوری لە وولات .. لە ساڵی ١٨٢٢ بەڕازیل سەر بەخۆیی ڕاگەیاند بە جیابوونەوەی لە پرتوگال و بڕیاری یەکەم دەستوریان دا بۆ وڵات و دوایی گوڕا بەدەستوری هەمەلایەنی پارێزگاری لە ساڵی ١٨٢٦؛ لە ساڵی ١٨٢٨ دۆم میجل کچی برای شانشینە ماریای قەدەغە کرد بەجێگرتنەوەی باوکی لەسەر کورسی . لەدوای کێشەی نێوان لیبڕاڵییەکان و پارێزگاران لەسەر دەستورەکانی ١٨٢٢ و ١٨٢٦ بەهۆی ئەو بارودۆخە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم لەپورتوگال پارتی سۆشیالستی و پارتی کۆماری و ئاژاوە چی پەیدابوون، لە ساڵی ١٩٠٨ شانشین کارلوس تیرۆرکرا کە لە دواپلەی خراپی و بۆگەنایەتی بوو لە دەسەڵات .

لە ساڵی ١٩١٠ شۆڕشێکی سێ ڕۆژە ئەنجام دراو بوە هۆی هەڵاتنی شانشین لە وڵات و پورتوگال بوە وڵاتێکی کۆماری بەڵام ئارامی تێدا نەبوو بەهۆی دزی و ئاژاوەو ئەشکەنجەدانی جەماوەر هەرچەندە دەستورێکی لیبڕاڵی کۆماری پەسندکرابوو.

بەهۆی پەیوەندی هاوکاری و برایەتی کۆن لەنێوان پورتوگال و بەریتانیا، پورتوگال پشتگیری خۆی بۆ بەریتانیا دوپات کردەوە لە جەنگی یەکەمی جیهان لە ئەفریقیاو لەبەرەی ڕۆژئاواو بوە هۆی لاواز بوونی دەسەلات و

ئەنجامەکەی کودتایەکی سەربازی لە ١٩٢٦ ئەنجام درا بەسەرکردایەتی ژەنەڕاڵ کرمۆناو بووە سەرۆك کۆماری پورتوگال کە بوە هۆی ئەوەی کە دەستورێکی یاسایی بەهێز دابڕێژرێت و مل کەچی بەگەلانی پورتوگال بکات لە چەوسانەوەو داپلۆسێن، پرتوگال یەکێك بوو لە دەوڵەتە دامەزرێنەرەکانی پەیمانی باکوری ئەتڵەسی لە ساڵی ١٩٤٩ (ناتۆ)و بوە هۆی دامەزراندنی بنکەی سەربازی و ئاسمانی لە ساڵی ١٩٤٣ سەرەڕای ئەوەی کەخۆی بێ لایەن گرت لەجەنگی دووەمی جیهان. پورتوگال دەسەڵاتی زۆری لەدەست دا لە ئیمپراتۆریەتەکەی لەسەر خاکی هیند وەك شارەکانی جاواو دامان و دیۆ بەداگیر کردنی لەلایەن هیند لەو کاتەش لە ساڵی ١٩٦١ لەو ساڵەی کە یاخی بوون لە ئەنگۆلا دەستی پێ کرد.

لەمانگی /١٩٧٤/٤ چەپ ڕەوەکان هەڵسان بەشۆڕشێکی سەرکەوتوو کۆتایی هێنان بەباری نائارامی و داخراو لە چەنگی ژێر دەستەیی کە ژەنەڕاڵ سینۆلاو بوە سەرۆك کۆمارو کۆتایی پێ هێنان بەڕژێمی دکتاتۆری کە ماوەی چل ساڵ بوو حوکمڕانی دەرکرد، سەرۆکی نوێ دانی بەسەربەخۆیی گینابیساو ئەنگۆلاو مۆزەمبیق و سۆتۆمیەو ئیرنسیب راس الاخضر هێنا لە ساڵی ١٩٧٥، لە ساڵی ١٩٨٦ سواریز بوە یەکەم سەرۆك وڵات و کۆتایی بەسەرۆك ژەنەڕاڵەکان هێناو لەهەمان ساڵدا پورتوگال چوە ناو یەکێتی ئەوروپا، لە ساڵی ١٩٨٧ پارتی کۆمەڵایەتی دیموکراتی لەهەڵبژاردن سەرکەوت و یەکەم حکومەتی زۆرینەی پێك هێناو وڵات بەرەو بوژانەوەیەکی بەرچاو پەرەی سەند لە بوارەکانی ئابووری و کۆمەلایەتی و ڕامیاری و ڕۆشەنبیری و ژیان و گوزەران و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو پەرەسەندن هەنگاوی دەنا، لە ساڵەکان ١٩٨٦ تا ١٩٩٦ کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی فراوان بوو گەیشتە ٦ر٤٪ لەدەرامەتی تاك سێ جار بەقەدەی پێشوو زیادی کردبوو، بەڵام لەدوای ساڵی ١٩٨٩ ئابووری سۆشیالستی هەڵوەشێنرایەوەو کەرتی گشتی گۆڕا بۆ کەرتی تایبەتی، لە ساڵی ١٩٩٦ جۆرج سامبایۆ هەڵبژێردرا بەسەرۆك کۆمار لە جیاتی سواریز.

گوتمان کە گینیابیساو ئەنگۆلاو مۆزەمبیق سەربەخۆیان وەرگرت و هیچ ناوچەیەك لەژێر دەسەڵاتی ئیمبراتۆریەتی پێشووی پورتوگال نەما تەنیا تەیموور ماکۆ نەبێت بەڵام هەرێمی تەیمور ئەندۆنوسیا لکاندی بە دەسەڵاتی خۆی سەرەڕای بەرهەڵستی لشیۆنە. واتە ماکۆ مایەوە.

ماکۆش پێکهاتووە لە نیمچە بیابانی ماکۆو دوو بیابانی بچوك ئەوانیش (تابیاو کۆلۆن) لەسەر کەناری چینی باشوور بە درێژی ٥٣ کیلۆمەتر لە هۆنگ کۆنگ، پورتوگالیەکان لە ساڵی ١٥٥٧ ئەو جێگەیان دامەزراند کە کۆنترین جێگایە لە بازرگانی پێکردن لەئەوروپا لە ڕێگەی بازرگانی چینی و مافی پورتوگال لە بەدەسەڵات بوونی لەسەری هەرچەندە چین دانی پیانەنابوو، چ جیاوازیەك لەنێوان ماکۆو هۆنگ کۆنگ نیە لە ئاستی گرنگیان لە بازرگانی و جموجۆڵی پیشەسازی ماسی. بەپێی ڕێککەوتنی چین و پورتوگال لە ساڵی ١٩٨٧ کە ماکۆ بگەڕێتەوە بۆ چین بەڵام بەمەرجێ کە ماکۆ بۆ ماوەی ٥٠ ساڵ سەربە خۆبێت لە سەر ڕژێمی سەرمایەداری و کاروباری ژیانیەوە کەژمارەی دانیشتوانی ٥٣٢,٩٢٥ هەزار کەسە، کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی ٣٨ر٦ ملیار دۆلارە و بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی ٩٧٠ر١٤ دۆلارە. توانای دەرچووەکان و داهاتەکانی زۆر باشەو لە پەرەسەندن دایە لە هەموو ڕویەکەوە.

- پورتوگال ئەندامە لە یەکێتی ئەوروپا ، ئەندامە لە پەیمانی باکوری ئەتلەسی، ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری بوژانەوە، ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان.

# بۆسنەو هرسك

- ناوی ڕەسمی: كۆماری بۆسنەو هرسك.
- پایتــەختی: ســارایيفۆ (لەبۆســنە) ژمــارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۲٥ هەزار كەسە.
- شــارە گرنگــەكانی: تــەنجالوكا (لەبۆســنە) موستار پایتەختی هرسكە.
- بەندەرە سەرەكیەكانی: بۆسانسكی برۆد.
- ڕووبەری: ۷۸۱ر۱۹ میل چوارگۆشەو ۲۳۳ر٥۱ كیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمــارەی دانیــشتوانی: ۰۰۰ر۹۸٥ر۳ ملیــۆن كەسە، بەپێی ئاماری ۲۰۰۱.
- چـڕی دانیـشتوانی: ۲۰۲ كــەس لەیــەك میــل چوارگۆشەدا.
- نــژادەكانی: ئیــسلام ٤۲٪ ســـربەكان ۳۲٪ كرواتـــەكان ۱۸٪ ئـــەوانی تـــر ۸٪ زۆربـــەی كرواتـەكان كۆبوینـەوە لـە باشـووری ڕۆژئـاوای بۆسنەو لە ڕۆژئاوای هیرتسن و جۆڤیتیا، بـەڵام سـربەكان لـە ڕۆژهـەلات و ڕۆژئـاوای بۆسـنە لـەدوای شـەڕی نـاوخۆیی لـە سـاڵی ۱۹۹۲ كـە لـــەوێ جوڵانـــەوەی دانیـــشتوان هـــەبوو بەشـێوەیەكی زۆر،زۆر لـە كرواتـەكان هـەڵاتن و ئیـــسلامە كۆچـــبەرەكانیش بـــۆ وڵاتـــانی دەوروپشتی ناوچەكە.
- بوژانـەوەی دانیشتوانی: ٥ر۰٪ ئەو زانیاریانـە تایبەتیانـەی بەرامبـەر بـە دانیـشتوانی هـەبوو زۆریـان هەڵـە بوون بەهۆی شـەڕو وێرانكـاری و چەوسانەوەو لەناوبردنی ڕەگەزی.
- زمانەكانی: بۆسنەكان بەپیتی لاتینی سیریلیك دەنوسن كە لـە سـەدەی نۆیـەم ئەبجـەدی سلاف دەركەوت و تاكو ئێستاش بەكاردێت لـە زمـانی ڕوسیاو بولگاریاو وڵاتانی تری سلافی).
- ئایینـــــەكانی: ئیـــــسلامی ســـــلاف ٤۰٪، ئۆرسۆزكسی ۳۱٪ كاسۆلیك ۱٥٪ .
- زانینی نوسین و خوێندن: ۸۷٪.
- ڕژێمــی دەســەڵات: كۆمــارێكی دیموكراتیــە دەســەڵاتی یاسـادانانی تێیدایـەو ئەنجومـەنی بەنۆبەیـە، سـێ كۆمـەڵی ڕەگـەزی دەسـەڵاتیان لەنێوان دابەش دەكرێت، سەرۆكایەتی دەوڵـەت كە سێ كەسن یەكیان ئیسلام و یەكیان سربی و ئەویتریان كرواتی.
- دابەشی كارگێری: ۱۰۹ بەشی كارگێریە.
- پارتـە ڕامیاریـەكان: پـارتی كـاری دیمـوكراتی، بیروبۆچوونی ئیسلامی، بزوتنـەوەی هەڵسانی سربی، یـەكێتی بۆسـنەو هرسكی دیمـوكراتی، مەســیحی كرواتــی، نیــشتیمانی كرواتــی، كۆمەڵــەی كۆمۆنیــستەكان، پــارتی هاوكــاری سۆشیالستی، چەپ ڕەوەكان، پارتی نیشتمانی سربی..
- بەرگری: ٥٪ لەكۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاكەی: ۰۰۰ر٤۲ هەزار كەسە.
- دراوی: دیناری یۆگسلافی نوێ.
- كـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٤٥۰ر٤ ملیــار دۆلار.
- بەشــی تــاك لــەكۆی دەرئــەنجامی نــاوخۆیی: ۷۹٥ر۱ دۆلارە.
- زەوی كشتوكاڵی: ۲۳٪ لە خاكی وڵاتەكە.
- بەرهەمی كشتوكاڵی: گێز، گەنمەشامی، گـەنم، كروم، چەوەندەری شەكر، گێزەر، پەتاتە، تەرەو میوەجات بەهەمووجۆرەكانی.
- سـامانی ئـاژەڵی: مـەڕ، بـزن، چـێڵ، بـەراز، پەرەور، بەهۆی باروئۆخی نالەباری و نەبوونی سەرچاوە نـەتونرا ڕێژەكان دیار بكرێت، بـەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ٦٥٪ی پێداویستیەكانی وڵات

دابین دەکات.

- سامانی سروشتی: خەڵوزی بەردی: ئاسن، قورقوشم، زەنك، موگناتیس، ئەلەمنیوم.
- پیشەسازی: دەرهێنانی ئاسن لەمەنجەمەکان، بەرهەمی رقی (صلب)، لێکدانی ئۆتۆمۆبێل، ڕستن و چنین، دار، پاك كردنەوەی نەوت.
- بەرهەمی کارەبا: ٥ر٢ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- دەرچوووەکانی: میوەجات و تەرە، ئاسن و رەقی، بەرهەمەکانی ڕستن و چنین ، پێست.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: لەدوای ئارام بوونەوەی بارودۆخی ناوچەی بەلقان وردە وردە پەیوەندی بازرگانی بەرەو پەرەسەندن هەنگاوی دەنا بەلام لە پێش هەموو ولاتێك کۆمارەکانی یوگسلافیای پێشوو ئەڵمانیاو چین و یابان.
- جوگرافیای وولات: کۆماری بۆسنەو هرسك دەکەوێتە نیمچە بیابانی بەلقان لە باشووری ڕۆژهەلاتی ئەوروپا، ئەویش نزیکە لەسێ گۆشەکە، هەرێمی بۆسنە لە باشووری چیایە و داپۆشراوە بە دارستانێکی چڕ، بەلام هەرێمی هرسك لەباشوور زیاتر زەوی کشتوکاڵین لەڕۆژهەلات وولاتی سربیا، لە باشووری ڕۆژهەلاتی چیای ڕەشە، لە باکورو ڕۆژئاوای کۆماری کرواتیایە، لەسەر دەریای ئەردینیاك دەشتایەکی کەناری تەنگی هەیە بەدرێژایی ١٣کیلۆمەتر، هیچ بەندەرێکی سروشتی نیە. زێی سافاو زێی درینا، زۆری سنوری باکورو ڕۆژهەلاتی لەسەر سنووری کرواتیاو سربیا کە زێی سافاو ڕوبارەکان زێیە سەرەکیەکانی وولاتەکەیە.
- مێژووی ولات: کۆماری بۆسنەو هرسك لە ڕابردوو پارچەیەك بوە لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، لەسەدەی حەوتی زاینی بۆ یەکەم جار سربەکان تێیدا نیشتەجێ بوونە، لە کۆتایی سەدەی دەیەم بۆسنە بوە وولاتێکی سەربەخۆ، بەلام لەناوەڕاستی سەدەی دوانزەهەم کەوتە ژێر دەسەلاتی مەجەر (هنگاریا) بەلام بۆسنە لەسەردەمی ناوەڕاست و لەسەدەی چواردەم بوە ولاتێکی پێشکەوت بەهۆی لکاندنی ناوچەکانی دەوروبەری لەوانەش هرسك کە لەوکاتە ململانێی ئاینی لەنێوان کاسۆلیکی ڕۆمانی و ئۆرسۆزکسی پەیدابوو لەگەڵ دانیشتوانە موسڵمانەکان و بوە هۆی لاواز کردنی باری وولاتەکە،. لە ساڵی ١٤٦٢ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی داگیر کرد کە لەوکاتە ولات لێك ترازابوو بوە ولایەتێکی عوسمانی تورك. لەدوای کۆتایی هاتنی شەڕی نێوان تورکیاو ڕوسیا لە ساڵی ١٨٧٨ ی زایینی لە کۆنگرەی بەرلین، نەمسا قەرەبووی داگیرکردنی بۆسنەو هرسکی گێراوە کە دەسەلاتی دەگێرا. هەرچەندە ولایەتی کانتا لەژێر دەسەلاتی عوسمانی مابوەوە بەلام ئیمپراتۆریەتی نەمسا خستیە ژێر دەسەلاتی خۆی لە ١٩٠٨/١١/٧، لە ئەنجامی پەیوەندی نێوان ئیمپراتۆریەتی نەمساو سربیا بارودۆخەکە بەرەو ئالۆزی پەرەی سەند لەبەر ئەوەی سربیا داوای خاوەندیەتی بۆسنەو هرسکی دەکردو چاویان بریبووە ئیمپراتۆریەتی نەمساو مەجەرو دوژمنکاریەکە گەیشتە ئاستی ئەوەی کە پارێزگاری سربیا هەڵسابە تیرۆرکردنی (ئەرشدیف فرانسیس فردیناند)میراتگری کوڕی نەمسای مەجەڕی لەشاری سەرایفۆ لە ١٩١٤/٦/٢٨ کە بوە هۆی پەلە کردن لە هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی ساڵی ١٩١٤ تا ١٩١٨ زاینی و بوە هۆی ڕوخانی ئیمپراتۆریەتی نەمسا لە ساڵی ١٩١٨، بۆسنەو هرسك بونە پارچەیەك لە سربیاو کروات و سلۆڤینیا. کە ناسرابوو بە سەرەتای وولاتی یوگسلافیا لە ساڵی ١٩٤٩، ئەڵمانیای نازی لەساڵی ١٩٤١ داگیری کردو کراوتیا بوە دەوڵەتێکی مەزنی فاشی لەدەست ئەڵمانەکان لەهەمان کات بوە گۆڕەپانی شەڕو پێك دادن لەنێوان شۆڕشگێڕانی بۆسنەو هرسك و

ئەڵمانیای فاشی و دەسەڵاتدارانی کرواتیای سەر بەئەڵمانیاو فاشی ئیتاڵیا. لە ساڵی ١٩٤٤ ڕزگار کرا لەلایەن سەرکردەی شیوعی بەناوبانگ مارشال تیتو، لە ساڵی ١٩٤٥ بوە کۆمارێکی ناو یەکێتی یۆگوسلافیای سۆشیالستی کە پێك هاتبوو لەشەش کۆمار. لەدوای ساڵی ١٩٨٠ ڕاپەڕین و خۆپیشاندانی ئیسلامەکان ڕوویداو لە ساڵی ١٩٩٠ داپلۆسینی ڕەگەزی بەرپابوو لەنێوان ئیسلامیەکان و پارتە سربەکان و کۆمۆنیستەکان کە لەهەڵبژاردن سەرنەکەوتن و هەموو پارتە ڕامیاریەکان بەشداریان تێیدا کردبوو، کە بوە هۆی ئەوەی کە پارتەکانی سرب و ئیسلامی و کرواتی یەکگرتنێك ئەنجام بدەن و عزەت بیچۆفیتشی ئیسلامی بکەنە سەرۆك کۆمار. شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا لەنێوان سرب و کرۆات لە ساڵی ١٩٩١ بوە هۆی دروست بوونی ئاژاوە لەهەمان کات بوە هۆی ئەوەی کە لە١٩٩١/١٠/١٥ پەرلەمان سەربەخۆیی بۆسنەو هرسك ڕابگەیەنێ بە جیابوونەوەی لە یۆگسلافیا و داوای لە یەکێتی ئەوروپا کرد کە دانیان پێ بنێن، بەڵام یەکێتی ئەوروپا داوای ئەوەی لێکردن کە پێویستە گەلانی بۆسنەو هرسك ڕازی بوونیان ئاشکرا بکەن بە دەنگدان بۆ سەربەخۆییان. بەڵام سربەکانی ناوبۆسنە هێزێکیان بۆ خۆیان پێك هێناو دەسەڵاتی خۆیان لەناو خۆیاندا بەڕێوە دەبرد. لە ساڵی ١٩٩٢ پێشنیاری گشتی کرا لەلایەن گەلانی بۆسنەو هرسك بۆ سەربەخۆیی وڵات بەڵام سربەکان بەشداریان تێدا نەکرد تەنیا کرواتەکان و موسڵمانەکان دەنگیان دا ، بۆ جاری دووەم عزەت بیچوفیتش سەربەخۆیی ڕاگەیاندو ئەمەریکاو یەکێتی ئەوروپا دانیان پێناو ڕێگەیاندا ببێتە ئەندام لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان. لەوکاتەش شەڕی توندو دژواری ناوخۆیی هەڵگیرسا. لەوکاتەش میلیشیا سربەکانی بۆسنە بەسەرۆکایەتی ڕادوفان کرادوڤیتش کۆماری بۆسنەو هرسکی سربی ڕاگەیاند لەبەشەکانی ڕۆژهەڵاتی بۆسنەو ڕۆژئاوای هرسك پێك بێنێ و لەوکارە کۆماری سربیا پشتیوانی لێ دەکردن. بەڵام سربەکان بەهەموو توانا پەلاماری ناوچەکانی بۆسنەو هرسکیان داو ئەنجام بوە هۆی کوشتنی زۆر لە موسڵمانەکان و داگیر کردنی، زیاتر لە ٦٠٪ لەزەوی بۆسنەو تالان کردنی، هێزەکانی ئەمەریکا چونە سەرایڤۆ بۆ شکاندنی گەمارۆی سربەکان کە سربەکان بەهەموو توانایەك ئیسلامەکانیان لەناودەبرد. لە ساڵی ١٩٩٢ پلانی ئاشتی هەرەسی هێنا کە لەلایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و یەکێتی ئەوروپا دیاری کرابوو، شەڕ بەردەوام بوو لەلایەن هەرسێ لایەن سربەکان و کروات و ئیسلامەکان و هێزەکانی چەکداری سرب بەهەزاران لە ئیسلامەکانی بۆسنییان سەربڕیو لە کاری تواندنەوەی ڕەگەزیان ئەنجام دەدا، لە ١٩٩٤/٢/٢٣ ئیسلامەکان و کرۆات لە بۆسنە گەیشتنە ڕێککەوتنی وەستانی شەڕ و لەهەمان کات لە ١٩٩٤/٣/١٨ یەکێتی ئیسلامی و کرواتیان پێك هێنا لە (یەکێتی کۆنفیدرالی) لە بۆسنە، بەڵام لەنیوەی ساڵی ١٩٩٤ سربەکان زیاتر لە ٧٠٪ ی وڵاتیان کەوتە ژێر دەست . گەمارۆی سربەکان لەسەر سرایڤۆ هەڵگیرا لەدوای ئاگادار کردنیان لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکان و پەیمانی باکوری ئەتڵەسی و دیبلۆماسیەکانی ڕوسیش لەلایەکی تر هاتن. لەناو گەرمەی کێشەکە جیمی کارتری سەرۆکی پێشووی ئەمەریکاش هاتە ناو کێشەکە کەهەموو لایەك بەردەوام بوون بۆ وەستانی شەڕ. بەڵام لە ساڵی ١٩٩٥ دووبارە شەڕ دەستی پێکردەوەو بوە هۆی ئەوەی کە سربەکان دووناوچە داگیربکەن (ناوچەی سربرنیکا کە زیاتر لە ٤٠٠٠ هەزار ئیسلامیان لێ سەربڕی) و

ناوچەی زیبا، بەڵام کرواتەکان توانیان هێرشی سربەکان بوەستێنن لە نزیک شاری بیهاك و بوە هۆی گۆڕینی تەرازووی هێز لە بەرژەوەندی موسڵمانەکانی کروات و پەیمانی ئەتڵەسی دەستی کرد بە بۆمبا بارانی ناوچەی سربەکان لە ١٩٩٥/٨/٣٠ و بوە هۆی دووبارە دەست پێ کردنەوەی گفتوگۆی ئاشتی و لە ١٩٩٥/٩/١٥ گەمارۆ لە سەرایڤۆ لابردرا و هەوڵی بەرەوپێش بردنی بارودۆخەکە درا، موسڵمان و کرواتەکان لە هێرشێکیان توانیان ناوچەکان ئازاد بکەنەوە ئەوەی لەبەردەستی سربەکان بوو گەڕاندیانەوە، لە ١٩٩٥/١١/٢١ ڕێککەوتنی ئاشتی مۆرکرا لە شاری دایتۆن لە ولایەتی ئارەهیوی ئەمەریکی لە ١٩٩٥/١٢/١٤ لە پارس مۆرکردنی ئاشتی ئەنجام درا لەنێوان سەرکردەکانی بۆسنەو کروات و سربیاو بوە هۆی گواستنەوەی ٦٠٠٠٠ هەزار سەربازی پەیمانی ئەتڵەسی بۆ سەرپەرشتی کردنی ڕێککەوتنەکە، دادگای نەتەوە یەکگرتووەکان دەستی کرد بە دادگای کردنی تاوانبارانی جەنگ یەکێك لەوانە دادرەخان کارادنیش کە تاوانبار کرا بە کوشتنی بەکۆمەڵ و لە ١٩٩٦/٦/٣٠ دەستی لەکار کێشاوە بەڵام دەستگیر نەکرا. لە ١٩٩٦/٩/١٤ هەڵبژاردن ئەنجام درا بە دەست نیشان کردنی سێ سەرکردە بۆ سەرکردایەتی کردنی وولات و دەست نیشان کردنی ئەندامانی پەرلەمانی فیدراڵی.

- بۆسنەو هرسك ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

# ئەلبانیا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری ئەلبانیا.
- پایتەختی: تیرانا، ژمارەی دانیشتوانی ٣٢٥ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ١١ر١٠٠ میل چوارگۆشەو ٢٨ر٧٥٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٣ر٣٢٥ر٠٠٠ ملیۆن کەسە. بەپێی ئاداری ١٩٩٩.
- چڕی دانیشتوانی: ٣١٧ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- نژادەکانی: ئەلبانیەکان ٩٨٪، ئەوانیش دوو ڕەگەزن جیج لەباکور، گروك لە باشوور، ٢٠٪ یۆنانیەکان.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٩٨٪.
- زمانەکانی: زمانی ئەلبانی (زمانی ڕەسمیە)، گروك زاراوەی ڕەسمیە، یۆنانی.
- ئایینەکانی: ئیسلام ٧٠٪، ئەرسۆزکسی یۆنانی ٢٠٪،کاسۆلیکی ڕۆمانی ١٠٪.
- دراوی: لیك.
- ڕژێمی دەسەڵات: دیموکراتی پەرلەمانی فرە پارتیە، ئەو ڕژێمە لە ساڵی ١٩٩١ دامەزرا، سەرۆك کۆمار بەزۆرینەی دەنگی ئەندامانی پەرلەمان هەڵدەبژێردرێ.
- دابەشی کارگێری: ٢٦ هەرێمە.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی دیموکراتی ئەلبانی، مام ناوەندی کەپشتگیری ئابووری بازاڕی ئازاد دەکات، پارتی سۆشیالستی ئەلبانی، کە ئەویش پارتی کۆمۆنیستی پێشوو بوە، یەکێتی ماف پەروەرانی مرۆڤ، پارتی کەمایەتی یۆنانیەکان.
- بەرگری: ٧ر٢٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.

- سوپاکەی: ٥٠٠ر٥٤ هەزار کەسە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٧٥٠ر٤ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاک لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١٫٤٧٥ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢٢٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، گەنمەشامی، پەتاتە، چەوەندەری شەکر، پەمۆ.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٠٠٠ر٥٣٥ هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر٣٤٠ هەزار سەر، چێڵ و کامێش ٠٠٠ر٨١٠ هەزار سەر ، پەرەور ٨٧٠ر١٥ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: ڕستن و چنین، دار، کەلوپەلی بیناسازی، ئاسنی دروستکراو، ئاسن، کروم، نیکل، خەڵوز، نەوت.
- دەرچووەکانی: بەرهەمی نەوتی، ئاسن، نەوتی خاو، تەرە، میوەجات.
- داهاتەکانی دەرەوەی: ماشێن، کەلوپەلی بەکارهێنان، دانەوێڵە، گەلێ شمکی تر.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئیتاڵیا، مەگدۆنیا، ئەڵمانیا، تیشك، سلۆڤاکیا، ڕۆمانیا، پۆڵەندا، مەجڕ، بولگاریا، یۆنان.
- تریاکی قەدەغەکراو: بەشێکی بازرگانی پێوە کردنە لەخاڵی پەڕینەوەی بارەکانی کە لە باشووری ڕۆژئاوای ئاسیا دێن.
- جوگرافیای وولات: ئەلبانیا وولاتێکی بچوکە لە وڵاتانی بەلقان، دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا، لەباکوریەوە کۆماری چیای ڕەش، لەباکوری ڕۆژهەڵاتی سربیا، لەباشوورو باشووری ڕۆژهەڵاتی یۆنانە، دەریای ئەدریانیك لەڕۆژئاوای، زەوییەکەی زۆربەی چیایەو دەشتایی و کەناری تەنگی تێدایە، هەندێ زێی تیایە وەك زێی درین و زێی میجۆز، دانیشتوانەکان کە کۆبونەوەو نیشتەجێیان لە تەپۆلکەکانی ناوخۆی دەریاچەی زێیەکانیەتی، کەش و هەوای لەهاوین گەرم و وشکە، لەزستان مام ناوەندی و شێ دارە.
- مێژووی وڵات: لە ساڵی ٢٠٠ پێش زایین ئەلبانیا تووشی داگیر کردن بوە لەلایەن یۆنان و ڕۆمان و بیزەنتیەکان لەماوەی ساڵی ٢٠٠ تاکو ١١٠٠ زایینی کەوتە ژێر دەسەلاتی گۆن و بولگار و سلاف و نۆرمەندیەکان، لەکۆتایی سەدەی پانزە دەسەلاتی عوسمانی داگیری کردو ئاینی ئیسلامی تیا بڵاوکردەوە. لە ساڵی ١٩١٢ یەکەم شەڕی بەلقان ڕووی دا، لە٢٨/١١/١٩١٢ ئەلبانیاسەربەخۆی ڕاگەیاند. لەجەنگی یەکەمی جیهان بوە گۆڕەپانی کاری جەنگی لەنێوان شەڕکەران، لەدوای جەنگی یەکەمی جیهان ئەحمەد زوگۆ سەرکردایەتی وڵاتی گرتە دەست کە دەرەبەگێکی خاوەن زەوی زۆر بوو، ئەحمەد زوگۆ لە ساڵی ١٩٢٨ ڕژێمی کۆماری گۆڕی بۆڕژێمی شانشین و خۆی بوە شانشینی ئەلبانیا، بەلام لە ساڵی ١٩٣٩ ئیتالیا خستیە ژێر دەسەلاتی خۆی، دوای شیوعیەکان بەسەرکردایەتی ئنفرهۆکشا کە توانی دەسەلات بگرتە دەست و جەنگیش بەرەو کۆتایی دەچوو، لە ساڵی ١٩٤٤ ئەلبانیا لەبیرو بۆچون جیاواز بوو لەگەڵ ڕوسیا بەتایبەتی لەدوای ساڵی ١٩٦١، لەگەڵ چینی میللی لەهەموو بوارەکان هاوکاری کرد. لە دوای کۆچی دوایی ماوتس تونگ جیاوازی کەوتە نێوانیان، ئەلبانیا هەژارترین و بچوکترین دەوڵەت بوو لە ئەورووپای ڕۆژهەلات ، لەدوای کۆچی هوکشا ئەلبانیا بەشێوەیەکی گشتی بەرەو پێشکەوتن و بوژانەوە پەرەی سەند، بەلام لەدوای هەڵبژاردن حکومەتی نوێ لە ساڵی ١٩٩٢ ڕامیارو بیرو بۆچوونی بەرەو سۆشیالستی مام ناوەندی هەنگاوی نا. کە یەکەم کەس سەرکردایەتی وڵاتی کرد کۆمۆنیست نەبوو ئەویش (هۆبریشا)بوو، لە

سـالی ١٩٩٥ بریـارێکی دەرکـرد بـە قەدەغـە کردنـی ئەنـدامانی پەرلـەمانی کۆمۆنیـستەکان بەکارکردن، ماوەی بە کۆمۆنیستەکان دا بچنە ناو هەڵبـژاردن تـاکو سـاڵی ٢٠٠٢ . لـە سـاڵی ١٩٩٦ هەڵبژاردنێکی پاك و خاوێن ئەنجام درا پارتی بریش سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنـا. بـەڵام بـەهۆی لێـك ترازانـی بـارودۆخی ئەلبانیاو چەوتی لە رامیاریەتی دەسەڵات بووە هۆی شۆرشـی چەکداری و پەیـدابوونی ئاژاوە ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٩٧ نەتەوە یـەکگرتووەکان نزیکـەی ٧٠٠٠ هـەزار سـەربازی نـارد بـۆ گەرانـەوەی بارودۆخەکـەو لـەمانگی/١٩٩٧/٧ هەڵبـــژاردن ئــــەنجام درا و لەئەنجامـــــدا سۆشیالستەکان و هاوپـەیمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێنـا. لـەمانگی /٨/ ١٩٩٨ هێزەکـانی نەتـەوە یـەکگرتووەکان لـە ئـەلبانیا کـشانەوە. بەهۆی ئارامبوونەوەی بارودۆخەکە.

- ئـەلبانیا ئەندامـە لـە رێکخـــراوی نەتـــەوە یەکگرتووەکان.

## تشـــیك

- ناوی رەسمی: کۆماری تشیك.
- پایتــەختی: بــراگ، ژمــارەی دانیــشتوانی ١,٥٨٥,٠٠٠ملیۆن کەسە.
- شارە گرنگـەکانی: برنۆ، ئۆستراڤا، ئۆلۆمۆك، لیبرك، بلازنی.
- رووبەری: ٣٠,٤٤٩ میل چوارگۆشەو ٧٨,٨٦٤ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: براگ، دیکین، ئوستیناد لایم.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ١١,٤٣٦,٠٠٠ ملیـۆن کەسە، بەپێی ئاماری ٢٠٠١.
- چـری دانیـشتوانی: ٣٧٦ کـەس لەیـەك میـل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ١,٥٪.
- نژادەکانی: تشیکیەکان ٩٥ ٪ سلۆفاك ٥٪.
- زمانەکانی: تشیك (زمانی رەسمیە) سلۆفاکی.
- ئایینـەکانی: بـێ باوەرەکـان ٣٩ ٪ ،کاسـۆلیکی رۆمـانی ٣٩ ٪، پرۆتـستنت ٦٪ ، ئۆرسۆزکسی ٤,٥٪.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٩٩٪.
- رژێمـی دەسـەڵات: کۆمـارێکی دیمـوکراتی پەرلەمانیە، سەرکردایەتی وڵات سەرۆك کۆمار دەیکـا، پەرلـەمان پێکهـاتووە لـەدوو ئەنجومـەن (ئەنجومـەنی نوێنـەران لـە ٢٠٠ ئەنـدام پێـك هاتووە) بۆ ماوەی چوار ساڵ هەڵدەبژێردرێن، (ئەنجومەنی پیران پێك هاتووە لە ٨١ ئەندام بۆ مـاوەی شـەش سـاڵ هەڵدەبـژێردرێن) بـەڵام سەرۆك کۆمار ماوەی دەستوری پێنج ساڵە کە ئەنجومەنـەکانی پەرلـەمان دەسـت نیـشانی دەکات.
- پارتــە رامیاریــەکان: پـــارتی شارســـتانی دیمـوکراتی، راسـترەوی ناوەنـدی کـە داوای بـازاری ئـازاد دەکـات، هاوکـاری شارسـتانی دیموکراتی، بزوتنـەوەی شارسـتانی، لیبرالـی، چەپی ناوەنـدی، پـارتی بۆهیمیـاو مۆرافیمـای کۆمۆنیستی، سۆشیالستی کە داوای چاکسازی دەکـات، پـارتی کـشتوکاڵی، پـارتی کۆمەڵایـەتی نیـشتیمانی لیبرالـــی، پـــارتی دیمـــوکراتی

کۆمەڵایەتی تشیکی، جولانەوە لەپێناو دیموکراتی ئۆتۆنۆمی بۆ مۆرافیاو سیلیسیا، پارتی کۆماری تشیک.

- دابەشی کارگێڕی: ٨ هەرێمە لەشێوەی پارێزگا.
- بەرگری: ٥ر٥٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی ٧٠٠ر٦٢ هەزار کەسە.
- دراوی: کورونا.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر١١٢ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناخۆیی: ٨٥٠ر١٠ دۆلارە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، چەوەندەری شەکر، پەتاتە، جۆ، میوەجاتو تەرە، شێلم.
- بەرهەمی کارەبا: ٧٥٠ر٦٥ کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی ئاژەڵی: بەراز ١٠٠ر٤ ملیۆن سەر، چێڵ وگامیش ١٥٠ر٢ ملیۆن سەر، پەرەور ٨٥ر٣٩ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: خەڵوز، کاولین جۆرە ڕوەکێکە کە بۆ دروستکردنی کاغەزو مەتات و داودەرمانی سك چوو بەکاردێت. داری دارستانەکانی زۆر هەیە.
- پیشەسازی: سوتەمەنی، کانزای ئاسن، ماشێن و پێداویستیەکانی، ئۆتۆمبێل، شوشە، چەك. کۆماری تشیك لایەنێکی پیشەسازی بەهێزی هەبوو بەڵام لەم دواییە بەرەو کزبوون دەچوو بەهۆی کۆنی کەلوپەلی کارگەکان.
- دەرچووەکانی: کەلوپەلی دروستکراو، ئامێرو کەلوپەلی گواستنەوە، کیمیا، سوتەمەنی، کانزایی، سیرامیك، جل و بەرگ، گۆشتی ئامادەکراو، پێست ،خوری.
- داهاتەکانی دەرەوەی: سوتەمەنی و ڕون، ئامێرو کەلوپەلی گواستنەوە، کەلوپەلی خاو، کیمیا،بەرهەمی کشتوکاڵی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: وڵاتانی کۆمەنولسی سەربەخۆی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، سلۆفاکیا، ئەڵمانیا،هەنگاریا، پۆڵەندا، نەمسا، سوید، چینی میللی، یابان.
- جوگرافیای وڵات: کۆماری تشیك دەکەوێتە ناوەڕاستی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا. دراوسێکانی لە باکوری پۆڵەندا، ئەڵمانیا لە باکور و ڕۆژئاوای ، لە باشووری نەمسا، سلۆفاکیا لە ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات. کۆماری تشیك سێ هەرێمی گرنگ دەگرێتە خۆی کە ناوچەی ستراتیژین (بۆهیمیاو مۆرافیاو چیاکانی کاریاسیان) بۆهیمیا دەکەوێتە ڕۆژئاوا بە تەبۆڵکە دەورردران کە لەچیاکانی زێی (فلقافای لێ دێتە خوارێ براگی پایتەخت دەبڕێ بەرەو زێی (ئەلبە)، مۆرافیا دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی بۆهیمیاو گردان و خاکی بەپیتەو بەزێی مۆرافیاو ڕوبارەکانی زێی ئودر ئاودێر دەکرێت. زێیەکان گرنگی تایبەتی خۆیان هەیە بۆ گواستنەوەی بازرگانی لە ڕۆژهەڵاتی زنجیرە چیای کاریاپیانە. کەش و هەوای هاوینی گەرم و شێ دارە و زستانی ساردو وشکە.
- مێژووی وڵات: لەسەدەی پێنجی زاینی تیرەکانی سلافیا کە لە گۆماوەکانی دەوروبەری زێی فستوڵا هاتبوون و کردیانە نیشتەجێی خۆیان لە ناوچەی بۆهیمیاو مۆرافیاو سیلیسیان کە ئەمانەش خاکی تشیکی ئاسایی خۆیان بوو. لەسەدەی هەشتەم تشیك پارچەیەك بوو لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز کە شارلمان دایمەزراندبوو، تشیکیەکان شانشینی بوهیمیایان دامەزراندو دەسەڵاتیان لە بۆهیمیاو مۆرافیاش هەبوو لەسەدەی دەیەم تاکو سەدەی شانزەهەم. لە ساڵی ١٣٥٥ تشارلزی چوارەم بوە شانشینی بۆهیمیاو دوایی بوە ئیمپراتۆر لەسەر ئیمپراتۆری ڕۆمانی پیرۆز، براگی کردە پایتەختی ئەو ئیمپراتۆریەتەو بوە مەڵبەندی ڕۆشنبیری و زانستی لاتینی، لەسەرەتای

سەدەی پانزە (جان هۆز) جولانەوەی (هوزی) دامەزراندو سلافیەکان بە جولانەوەی چاکسازی ئاینی بەستاوەو نەتەوەی تشیکی لەخۆ کۆکردەوە بۆ سەرهەڵدانەوەی کەچی لەکاتی دەسەڵاتی ئاینی ئەڵمانیا نەتەوەی تشیك بەرەو نەمان توانەوە هەنگاوی نا، لە ساڵی ١٥٢٦ فردینالندی یەکەم دەسەڵاتی لێ وەرگیراوە لەلایەن بنەماڵەی شانشینی هاسبورگ بەوە وولآت کەوتە ژێر دەسەڵاتی بێگانەی دەرەکی کە لەلایەن بنەماڵەی هاسبورگ بۆ تۆڵە وەرگرتنەوەی تشیکیەکان لەو بنەماڵەیە، لە ساڵی ١٦١٨ بوە هۆی پەلەکردن لە هەڵگیرسانی جەنگی سیی ساڵە، لەگەڵ ئەوەشدا تشیکیەکان بەلاوندران، لە ساڵی ١٦٢٠ بوە هۆی کەوتنە ژێر چەپۆکی دەسەڵاتی نەمسا لەسەر وولآت و بوە هۆی دامەزراندنی رژێمی شانشینی نەمسا لە ساڵی ١٨٦٧ زاینی و دەسەڵاتی دولایەنەی نێوان نەمساو مەجەرو بۆهیمیانی ولآتی (تشیك) تەنیا وەك ناوچەیەکی نەمساوی ماوە، ئەمەش بوە هۆی بەهێز بوونی هۆشی نەتەوەی گەرچی ماوەی سێ سەد ساڵ وولآتی تشیك لەژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری نەمسا مایەوە تاکو ساڵی ١٩١٨ لەوکاتەی جەنگی یەکەمی جیهان کۆتایی پێهات بە هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی نەمساوی – مەجەر، کە بوە هۆی ئەوەی کە تشیك سەربەخۆیی وولآتەکەی لە ١٩١٨/١٠/١٢راگەیەنن، لە ١٩١٨/١١/١٤ تشیکیەکان لەگەڵ سلۆفاکیا لە شاری براگ یەکگرتووی وولآتەکانیان راگەیاند و تشیك بوە یەکێك لە ئەندامە بەهێزەکانی دەوڵەتی تشیکو سلوفاکیای نوێ، لە ساڵی ١٩٣٨ بەپێی پەیمانی میونخ تشیکو سلۆفاکیا ناچار کرا ناوچەی سۆدیلاند بگەڕێننەوە بۆ ئەڵمانیا گەرچی ئەڵمانیا بە وەش نەوەستا هەڵسا بەداگیری کردنی (بۆهیمیاو مۆرافیای) تشیکی لە ئاداری ١٩٣٩ کە بوە ناوچەیەکی ژێر پاراستنی ئەڵمانیا تاکو جەنگی دووەمی جیهان کۆتایی هات. بەڵام ئیدوارود بینز حکومەتێکی لە هەندەران دامەزراند لە شاری لەندەن و لەو کاتەش ئەڵمانیا درێخی نەکرد بەو تاوانەی کەبەرامبەر بەو کەسانەی هەڵگری بیرکەرەوەو رۆشنبیر بوون، لە ساڵی ١٩٤٥ هێزەکانی سۆڤیەت و ئەمەریکا هەڵسان بە رزگار کردنی وولآتی تشیك و گەڕاندنەوەی بۆ سنوری پێش ساڵی ١٩٣٨ و ئەدوارد بینز حکومەتێکی یەکگرتووی نیشتیمانی پێك هێناو کۆمۆنیستەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست.. لە ساڵی ١٩٤٨ ئەدوارد بینز لە دەسەلآت دەرکراو کۆمەنیستەکان بەتەواوی دەسەڵاتیان گرتە دەست لە وولآت. لەژێر دەستوری یەك دەوڵەتدا وەك بیرو بۆچونی دەسەڵاتی سۆڤیەتی. لەپەنجاکان هەوڵدرا بە لەناوبردنی بەرهەڵستکارانی رامیاری و خۆماڵی پیشەسازی کردن لە ساڵی ١٩٦٨ ئەلسکەندەر دوبتشیك پرۆگرامی (بەهاری براگی) دیموکراتی پێشکەش کرد بۆ رزگاری رامیاری (بەڵام ئەلسکندر دوبتشیك) پشتگیری چاکسازی دەیموکراتی دەرکرد، دوای ئەوە هێزەکانی پەیمانی وارشۆ هەڵسان بەداگیر کردنی وولآت بەگەڕانەوەی هێڵی کۆمۆنیستی راست کە ئەوانیش لەکۆنە کۆمۆنیستە پاریزگارەکان بوون و لەسەر هێڵی بەرنامەی سۆڤیەتی دەڕۆیشتن، لە ١٩٦٩/٤/١٧ ئەلسکندر دوبتشیك دەستی لەسەر کردایەتی پارتی کۆمۆنیست کێشاوە هوزال جێگەی گرتەوە و بوە هۆی دەرکردنی زیاتر لە سێ یەکی ئەندامانی پارتەکەو گەمارۆدانی رۆژنامەکان. لە ساڵی ١٩٧٣ لێبوردن راگەیاندرا لەلایەن سەرکردایەتی پارتی کۆمۆنیست بۆ

ئەوانەی لە وولات هەلاتوون کە ژمارەیان زیاتر بوو لە ٤٠ هەزار کەس بەهۆی داپلۆسینەکانی ساڵی ١٩٦٨بەئاوارە پێکردنیان ، بەلام لە ساڵی ١٩٧٧ زیاتر لە حەودسەد کەس لە گەورە رۆشنبیرانی هەلاتووی تشیك و سلۆفاکیا و سەرکردەکانی پێشووی پارتی کۆمۆنیست بەپێشکەش کردنی پرۆگرامی چاکسازی بەناوی (راگەیاندنی مافی مرۆڤ بەناوی (بروانامەی ٧٧) ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە رژێم زیاتر بیری دیموکراتی و چاکسازی لەریشە دەربهێنێ)، لە ساڵی ١٩٨٧ میلۆس جاکتش لەسەرکردایەتی کردنی پارتی کۆمۆنیست جێگەی هوزاکی کردتەوەو پرۆگرامێکی لەسەر شێوازی گەرانەوەی بیناسازی بۆرستروێکاراگەیاند ، کە ئەم پرۆگرامە لەلایەن گۆرباتشۆفی سکرتێری گشتی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی دەرچوو بوو. ئەمەش بوە هۆی پەیدابوونی گیرو گرفت و تەنگەژەی بارودۆخی رامیاری و ئابووری لەوولات تاکو خۆپیشاندانی مەزن لە رۆژی ١٩٨٩/١١/١٧ کە پۆلیس بەشێوەیەکی درندانە ئەو خۆپیشاندانەی دامرکاندەوەو بوە هۆی ئەوەی کە سەرکردایەتی پارتی کۆمۆنیست دەست لەکار بکێشێتەوە لە ١٩٨٩/١١/٢٤ و داواکرا هەڵبژاردنی ئازاد ئەنجام بدرێت، لە رۆژی ١٩٨٩/١١/٢٧ گەورەترین خۆپیشاندان ئەنجام درا لەلایەن کرێکارو فەرمانبەران و بوە هۆی دروست بوونی چەندین پارتی رامیاری و نەتەوەیی نوێ و حکومەتێکی فرە لایەنی دابمەزرێت لە ١٩٨٩/١٢/٢٨ کە هافل بوە سەرۆك کۆمارو بەراگەیاندنی لێبوردنی گشتی بۆ زیاتر لە ٢٢٠٠٠ هەزار بەندکراو. لە ساڵی ١٩٩٠ هەڵبژاردن ئەنجام دراو (پارتی بانگهێشتی شارستانی) سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەلام ئەو پارتە لە ساڵی ١٩٩١ کەرت بوو بۆ دوو بەش کە پارتی دیموکراتی شارستانی (راست رەوی ناوەندی) و پارتی جولانەوەی شارستانی (چەپی ناوەندی) لەگەڵ گەرانەوەی چاکسازی رامیاری دیموکراتی بیری نەتەوەیی نیشتیمانی سلۆفاکیا دەرکەوت و داوای سەربەخۆی سلۆفاکیای کردو نیشانەی جیابوونەوە سەریهەڵدا، لە ١٩٩٢/٧/٢ هەڵبژاردنی هافل هەرەسی هێنا بۆ جاری دووەم بەهۆی دژایەتی کردنی لەلایەن سلۆفاکیەکان بە جیابوونەوەی دەوڵەتەکەیان بەشێوەی پرۆگرامی ئاشتیانە بۆ هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی تشیك و سلۆفاکیا لە رۆژی ١٩٩٢/٤/١ رایگەیاندرا بەدوو دەوڵەتی سەربەخۆ (دەوڵەتی تشیك و دەوڵەت سلۆفاکیا)، لە ١٩٩٣/٤/٢٦ پەرلەمانی تشیکی هافلیان هەڵبژارد بەسەرۆك کۆمار بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە ١٩٩٧/٧/٨. لە ساڵی ١٩٩٤ کۆماری تشیك چووە ناو پرۆگرامی پەیمانی باکوری ئەتلەسی بەناوی (بەشداری لەپێناو ئاشتی) ،لە ١٩٩٧/٧/٨ پەیمانی باکوری ئەتلەسی داوای لە تشیك کرد کە پاش دوو ساڵی تر ئەندامی تەواوی دەبێ لە پەیمانەکە،

- کۆماری تشیك ئەندامە لە پەیمانی باکوری ئەتلەسی، ئەندامە لە رێکخراوی هاوکاری ئابووری و بوژانەوە، ئەندامە لە رێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان.

# دانیمـــارك

● ناوی ڕەسمی: شانشینی دانیمارك.
● پایتـەختی: کۆبنهـانگن، ژمـارەی دانیـشتوانی ٠٠٠ر٥٦٠ر١ملیۆن کەسە.
● شارە گرنگەکانی: ئارنۆس، ئۆدنس، ئەلبۆرگ، ئـەو شـارانە و پایتـەخت هـەمووی بەنـدەری سەرەکین.
● ڕووبەری: ٦٢٩ر١٦ میل چوارگۆشـەو٠٧٥ر٤٣ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
● ژمـارەی دانیـشتوانی: ٠٠٠ر٥٧٥ر٥ ملیـۆن کەسە. بەپێی ئاماری ٢٠٠١.
● چـڕی دانیـشتوانی: ٣٢٥ کـەس لەیـەك میـل چوارگۆشەدا.
● بوژانەوەی دانیشتوانی: ٣٪.
● نژادەکانی: ئەسکەندینافیەکان، ئەسکیمۆ.
● زمانەکانی: دانیمارکی (زمانی ڕەسمیە) زمانی فرویزیـــە، گرمـــانی بـــاکوری، گیرینلندیـــە، کەمایەتی بچوك هەن بەزمانی ئەڵمانی ئاخاوتن دەکەن.
● ئایینـەکانی: ٩١٪ لـە مەزهـەبی پرۆتـستنتی لوتریە.
● زانینی نوسین و خوێندن: ٩٩٪.
● دابەشی کارگێڕی: ١٤ هەرێم و یەك شارە.
● بەرگری: ٨ر٢٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
● سوپاکەی: ٩٠٠ر٣٣هەزار کەسە.
● دراوی: کرۆن.
● کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٥٠٠ر١٢٥ ملیـار دۆلارە.
● بەشـی تـاك لـەکۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٦٠٠ر٢٣دۆلارە.
● زەوی کشتوکاڵی: ٦٣٪ لە خاکی وولاتەکە.
● بەرهەمی کشتوکاڵی: دانەوێڵە، پەتاتە، تـەرەو میوەجات، چەوەندەری شەکر.
● سامانی ئاژەڵی: چێڵو گامیش٩٠٠ر١٠ ملیـۆن سـەر، بـەراز ٣٠٠ر٢ ملیـۆن سـەر، پـەرەور ٥٠٠ر١٩ ملیـۆن سـەر، مـەڕو بزنـی هەیـە بـەلام بەرێژەیەکی کەم.
● بەرهـەمی کارەبـا: ٦٠٠ر٣٤ ملیـار کیلـۆوات کاتژمێر.
● سامانی سروشـتی: نـەوت، غـازی سروشـتی، خـــوێ، بـــەردی چـــەوی، ماســـی، داری دارستانەکان.
● پیـــشەسازی: دروســـتکردنی خواردەمـــەنی، دروسـتکردنی کەشـتی، زیـوی دروسـتکراو، پێـست، ماشـێن، ڕسـتن و چـنین، ئـەلکترۆنی، دروستکردنی پێداویستی ناوماڵ، داودەرمان.
● دەرچووەکانی: گۆشت، بەرهەمی شیر، ماسی، ماشـێن، بەرهـــەمی کیمیـــاوی، کەلوپـــەلی گواستنەوە.
● داهاتـەکانی دەرەوەی: ئـامێرو کەلوپەلـەکانی، کەلوپەلی گواستنەوە، نەوت، کیمیا، دانەوێڵە، کەلوپەلی خواردەمەنی، بەرهەمی ڕستن و چنین، پەڕ.
● هاوبەشـەکانی بازرگـانی: وولاتـانی یـەکێتی ئەورووپا، سوید، یابان، ئەمەریکا،چینی میللی.
● ڕژێمی دەسەلات: وولاتی دانیمارك شانشینێکی دەستوریە، شانشین لە ساڵی ١٨٤٩ بەشداری دەســەلاتی یاســادانی پەرلـەمان دەکـات. لـە دەستوری ١٩٥٣ داهاتیە کە یەك ئەنجومەن بێت ئـەویش ئەنجومـەنی (فـۆلکتینج) و مـاوەی دەسـەلاتی چـوار سـاڵە، ئەنجومـەنی وەزیـران شانشین دەستنیشانیان دەکات بەدامەزراندنیان و ئـەویش سـەرۆکایەتی دەکـات، لـە دەسـتوری

ساڵی ١٩٥٣ هاتیە گەر شانشین کۆچی کرد نەوەکانی لەدوای خۆی جێگەی دەگرنەوە بەڵام لەوکاتەی گەر کوڕی نەبوو ئەوا یەکێك لەکچەکانی جێگەی دەگرێتەوە.

● پارتە رامیاریەکان: دیموکراتیە کۆمەڵایەتیەکان، چەپی ناوەندی، پارتی گەلی پارێزگاران، راست رەوی ناوەندی، پارتی لیبراڵی (پارتی ئازاد)، پارتی سۆشیالستی گەل، چەپی ئازادی رادیکالی، پارتی ناوەندی دیموکراتی، پارتی پێشکەوتن، پارتی بەرهەڵستکاری بیروڕای رادیکاڵی، پارتی گەلی مەسیحی کەداوای پاراستنی دابونەریتی خێزانی دەکات کە مەزهەبە هەمەجۆرەکانی ئاینی گرتۆتە خۆی.

● جوگرافیای وڵات: دانیمارك بچوکترین وڵاتی ئەسکەندەنافییە لە ڕووی ڕووبەری، لەنیمچە دورگەی جوتلاند پێکهاتووە و کەوتۆتە نێوان دەریای بەتلیق و دەریای باکور لە باشووری ڕۆژئاوای ئەوروپا، لە ٤٨٢ دورگە پێکهاتووەو دەکەوێتە سەر ڕووبەڕووی کەناری نیمچە دورگەکە، گەورەترین دورگە کە دورگەی (فۆنە) دورگەی فیرۆو بیابانی گرینلاند کە دانیشتوانی ئەو دورگانە لەروبەری ١٠٠ دورگە نیشتەجێن.

بەڵام سنوری دەشتایی لەگەڵ ئەڵمانیا هاوبەشە کە درێژیەکەی ٦٧ کیلۆمەترە، نەرویج لەباکوری ڕۆژئاوایەتی، لەباکوری ڕۆژهەڵاتی سوید، خاکەکەی پێك هاتووە لەدەشتایی و بڵندو نەوی کە بەکەلکی کشتوکاڵی دێت. نیوەی خاکی ڕۆژئاوای پێکهاتووە لە دەریاچەو دەشتایی بەپیتی دیاریکراو، بەڵام نیوەکەی تری کە ڕۆژهەڵاتیەتی خاکێکی بەپیتی هەیەو زێی گەورەی تیایە، زێی بچوکی کەم هەیە. دانیمارك وڵاتێکی دەوڵەمەندو پێشکەوتووە، کەش و هەوای لە زستان ساردو ئاسمانی داپۆشراوە بەهەورو تەم. هاوینی فێنك و ڕۆژ لەدەرە. کەش و هەوایەکی خۆش و خواستیاری ژیانە.

● مێژووی وڵات: بوونی دانیمارك لەوکات بنەماڵەی (یلج لینجر) ی نەرویجی پێکهات کە دەسەڵاتداربوون لە هەرێمی گوتلاند ئەویش لەکۆتایی سەدەی هەشتی زاینی. دەریاوانەکانی دانیمارك ڕۆڵی سەرەکیان گێڕا لە شاڵاوەکانی (فایکینج کە هەڵسان پێی).

لەسەدەی دەیەم دانیمارك ئاینی مەسیحی گرتە باوەش لەسەر دەستی (قەشە ئەنسجارو شانشین هارالد)خاوەنی کەلیەی شین بوو، لە ساڵی ١٠١٣ شانشین سوین کوڕی شانشین هارالد هەڵسابە داگیرکردنی ئینگلترا بەڵام کوڕەکەی (کانوتی مەزن) دەسەڵاتی گرتە دەست لەسەر وڵاتانی دانیمارك و ئینگلترا و نەرویجی یەکخستن تاکو سەدەی هەڤدەم. بەڵام شەڕی ناوخۆ بوە هۆی ئەوەی کە ئەو یەکێتیە پارچەپارچە بکات و شانشین (فالدیماری) یەکەم توانی سەربەخۆیی دانیمارك بگەڕێنێتەوە سەر باکوری وولات لەساڵەکانی ١١٥٧تا ١١٨٢ زاینی. بەڵام دروستکردنی شاری (کۆپنهاکن) کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمە کۆنەکانی کاتی (قەشە ئەبسالۆن) کە یەکەم دامەزرێنەری ئەو شارە بوە لەساڵەکانی ١١٢٨تا١٢٠١ کە ئەنجامی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ گرنگی جێگەی لەڕووی کەناری دەریا کە ڕاوی ماسی و بازرگانی باشی لێ دەکرا. لە ساڵی ١٣٩٧ کچی شانشین فالدیمار توانی دانیمارك و نەرویج و سوید بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، بەڵام دوای سوید توانی سەربەخۆیی ئۆتۆنۆمی وەربگرێت. لە ١٥٢٣ دانیمارك دانی بەسەربەخۆیی سوید ناو بوە وڵاتێکی سەربخۆ. لە ساڵی ١٥٣٦ ئاینی پرۆتستنتی بوە ئاینی ڕەسمی دانیمارك و شەڕی سێ ساڵەی نێوان پرۆتستنتی و کاسۆلیکی بەردەوام بوو لە دژایەتی کردنی یەکتری.

لەدوای هەوڵێکی زۆر لەلایەن دانیمارك بەگێرانەوەی سوید لەساڵەکانی ١٥٦٣ تاکو ساڵی ١٦٥٧ ئەو هەموو هەولانە لەئەنجامدا هەرەسی هێنا، بەڵام هەرێمی گرینلاند بوە هەرێمێکی دانیمارکی لە ساڵی ١٧٢٩ بەسەرکردایەتی شانشین (فرید ریکی سێ یەم کە دەسەڵاتدارێکی تاك ڕەوبوو).

لە ساڵی ١٧٨٠ تا١٧٨١ دانیمارك و ڕوسیا و سوید ڕێککەوتن لەسەر (بێ لایەنی چەکداری) بۆ پاراستنی کەشتیە بێ لایەنەکانی کاتی جەنگی سەربەخۆی ئەمەریکا، لە ساڵی ١٧٨٨ لەدانیمارك ڕژێمی کۆیلایەتی هەڵوەشێنرایەوە، لە ساڵی ١٨٠١ بەریتانیا هەموو پارچە کەشتیە جەنگیەکانی دانیمارکی تێکشکاند لە پێکدادانی کوبنهاگنی یەکەم، بەڵام دووبارە بەریتانیا هەموو ئەو کەشتیانەی دانیمارکی تێکشکاندەوە لە ئەنجامی چاکردنەوە لە ساڵی ١٨٠٧ بەهۆی یارمەتی دانی هێزی داگیرکەری نابلیۆنیەکان. لەجەنگی یەکەمی جیهان دانیمارك توانی خۆی بێ لایەن بگرێت، ئیسلندا توانی مافی ئۆتۆنۆمی وەربگرێت لە ساڵی ١٩١٨، لە ساڵی ١٩١٩ دانیمارك توانی هەرێمی (شلۆزفیج) بگەڕێنێتەوە بەبێ کۆتایی پێ هێنانی ئاشتیانەی دوای جەنگی یەکەمی جیهان، لەژێر سایەی دەسەڵاتی حکومەتی ئیتلافی بەسەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کۆمەڵایەتی دانیمارك توانی ئارامی و دیموکراتی و بوژانەوە بەدەست بێهنێ. بەڵام ئەڵمانیای فاشی لە ساڵی ١٩٤٠ توانی دانیمارك داگیربکات سەرەڕای بەرگری کردن، لە ساڵی ١٩٤٤ ئسلندا سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند بە جیابوونەوە لە دانیمارك. هێزەکانی بەریتانیا لە ساڵی ١٩٤٥ توانی دانیمارك لەژێر دەسەڵاتی فاشی ئەڵمانیا ڕزگار بکات. دانیمارك لە ساڵی ١٩٦٠ چوە ناو ڕایەڵی بازرگانی ئەوروپی (ئیفتا) بەڵام لە ساڵی ١٩٧٣ لێی کشاوەو چوە ناو (یەکێتی ئەوروپا) گرینلاند لە ساڵی ١٩٨١ مافی ئۆتۆنۆمی بەدەست هێنا. لەڕاپرسیەکی ساڵی١٩٩٢ دانیمارکیەکان پەیمانی ماستریختیان ڕەتکردەوە کە بەڵگەنامەیەکی بنەڕەتی و دراوی کاتی و ڕامیاری بوو، بەڵام لە ڕاپرسی دوەم لە ساڵی ١٩٩٣ ڕەزامەندیان لەسەر کرد ئیتر دانیمارك تاکو تەواو بونی ئەو کتێبە لەکۆتایی ٢٠٠٤بەقۆناغەکانی دەسەڵاتی فرە پارتی و دیموکراتی و ژیانی پڕلە ئاسوودەی دەژین و ڕۆڵی خۆی دەگێڕی لە بارو دۆخە گۆڕاوە جیاجیاکانی نێودەوڵەتی.

- دانیمارك ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەککرتووەکان، ئەندامە لە پەیمانی باکوری ئەتڵەسی، ئەندامە لەیەکێتی ئەوروپا، ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری و بوژانەوە.

# سـوید

● ناوی ڕەسمی: شانشینی سویید.
● پایتەختی: ستۆكهۆڵم، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٧٥٨ر١ملیۆن كەسە.
● شارە سەرەكیەكانی: ئۆپسالا، نۆر كۆپینگ، ڤاسترۆس.
● بەندەرە گرنگەكانی: گۆتبۆرگ، هیلسنبۆرگ.
● ڕووبەری: ٧٣٠ر١٧٣ میل چوارگۆشەو ٩٦٠ر٤٤٩ كیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
● ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٥٢٠ر٩ ملیۆن كەسە، بەپێی ئاماری ٢٠٠٤.
● چڕی دانیشتوانی: ٥٥ كەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
● نـژادەكانی: سوویدیەكان ٩٣٪: فنیون ٢٪: كۆچبەرانی ئەورووپی و كوردو لایبۆن ٦٪.
● بوژانەوەی دانیشتوانی: ٨ر٠٪.
● زمانەكانی: سویدی، ئینگلیزی ، چەندین زمانی تری هەمەلایەنی كۆچبەران.
● ئایینەكانی: لوتریەی ئینجلیی ٩٤٪.
● زانینی نوسین و خوێندن: ٩٩٪.
● دابەشی كارگێڕی: ٢٤ ناوچە لەشێوەی پارێزگایە.
● بەرگری: ٥ر٢٪ لەكۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
● سوپاكەی: ٣٠٠ر٥٤ هەزار كەس.
● دراوی: كرۆنا.
● كۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر١٧٦ ملیار دۆلار.
● بەشی تاك لەكۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٢٠٠ر٢٠ دۆلار.
● زەوی كشتوكاڵی: ٨٪ لەخاكی وولاتەكە.
● بەرهەمەكانی كشتوكاڵی: دانەوێڵە، پەتاتە، چەوەندەری شەكر، بەرووبوومی شیر، تەڕەو میوەجات، چەوەندری شەكر.
● سامانی ئاژەڵی: چێڵ ٨٥٠ر١ ملیۆن سەر، بەراز ٤٠٠ر٢ ملیۆن سەر، پەرەور ٢٠٠ر٧ ملیۆن سەر.
● بەرهەمی كارەبا: ١٠٠ر١٤٤ ملیار كیلۆ وات كاتژمێر.
● سامانی سروشتی: زەنگ، تۆتیا، ئاسن، قوڕقوشم، نوحاس، زیوو، دار، لە دارستانە چڕەكانی كە نیوەی وولاتەكە دارستانەو ١٦٪ بەرهەمی وولاتە بۆ ناردنە دەرەوەی. وزەی كارەبای ئاوی.
● پیشەسازیەكانی: پۆڵا، ماشێن، كەلوپەلی چەسپاندن، گالیسكە، دروستكردنی كەشتی، پەڕ، ڕستن و چنین،ئامادەكردنی خۆراك، ئۆتۆتۆمبیلی هەمەجۆر .
● داهاتەكانی دەرەوەی: ماشێن، جل و بەرگ، نەوت و بەرهەمەكانی، كەرستەی خواردەمەنی، ئاسن و پۆڵا، كیمیایی.
● دەرچووەكانی: ماشێن، ئۆتۆمبێل، دار، بەروبوومی كاغەز، كیمیا، بەرهەمەكانی ئاسن و پۆڵا، گەلێ شمكی تر لەدەرچووەكان.
● هاوبەشەكانی بازرگانی: نەرویج، ئەڵمانیا، بەریتانیا، دانیمارك، ئەمەریكا، فەڕەنسا، فلەندا.
● ڕژێمی دەسەلات: شانشینیەكی دەستوریە، یەك پەرلەمانی هەیەو ناوی (ریكسداگە)و لە ساڵی ١٩٧٥ دامەزراوەو ژمارەی كورسیەكانی ٣٤٩ كورسیە، بەدەنگی گەل هەڵدەبژێردرێت بۆ ماوەی سێ ساڵ، سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران بەرپرسی جێبەجێ كەری یەكەمە. بەلام كورسی شانشینی میراتیەو نەوەكان وەری

دەگرن لەلایەن یەکەم کوڕی یا کچی گەورە.

- پارتــە رامیاریــەکان: پــارتی دیمــوکراتی مەسـیحی، مەسـیحی ناوەنـد، پـارتی چەپی سویدی، پارتی ئەوروپی مارکسی، پارتی کاری کۆمەڵایەتی، پارتی مام ناوەندی چەپ ، ڕاست ڕەوی ناوەنــدی، پــارتی ئــازادی، پــارتی پەیوەندی ژینگە، پارتی سـەوزی سویدی. کە ئەمانە بەرگری لەپاك و خاوێنی ژینگە دەکەن.
- جوگرافیـای وولات: وولاتـی سوید پارچەیەکی نیمچە بیابانی ئەکسەندافیا دەگریتـەوە، لەرۆژ هــەلاتی نــەرویج و کەنــداوی (بۆڤینــا)، لەباشووری دانیمارك و دەریای بەلتیقە، سوید چوارەم وولاتی ئەوروپییە لە گەورەیی.

زنجیرە چیاکانی شـولات درێـژ دەبێتـەوە بە درێــژایی ســنوری بــاکوری ڕۆژئــاوای لەگــەڵ نەرویج،لـەباکور دەریاچـەی زۆرە، لـە باشـوور و ڕۆژهــەلاتی زەویــەکانی نزمــەو دەوروبــەری ڕوبەرێکی بەپیتی هەیە بەدۆڵو کەندو دارستانی چـری بەدرێـژایی کـەناری بـەردێنی سـوید کـە دووکەنــداو دەبــڕێ و دورگــەی زۆری هەیــە گـەورەترینیان دورگـەکانی (جۆتلانـدو ئۆلانـدە)، کـەش و هـەوای وولات سـاردە لەزسـتانو پلـەی کەش و هەوای لەنێوان (١٤)پلە لـەباکور و(١ )پلـە لەباشــوور، لـە هــاوین پلــەی گــەرمی لــەنێوان ١٣تا١٧ پلەیە.

- مێژووی وولات: گەلی سوید ژیاون لەسەر خاکی وولاتی خۆیان زیاتر لە پێنج هـەزار سـاڵ پێش ئێـستاو کـونترین گــەلن لــەنێو گــەلانی تــری ئەوروپا، تیرەکانی گۆت کە لەسویدەوە هـاتبون ڕۆڵی سـەرەکیان هــەبوو لــە هەلوەشـاندنەوەی ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمـانی و سـویدیەکانی تـریش ڕۆڵی گرنگیـان هــەبوە لــە دامەزرانـدنی یەکـەم دەوڵـەتی ڕوسی لەسـەدەی نۆیـەم. لەسـەرەتای ســەدەی دەیــەم (ئــۆلاف ســکۆت کــۆنتج) پەرستگایەکی ئاینی مەسیحی دروستکرد تاکو هـەموو گـەلی سوید بوونـە مەسـیحی. لـە سـاڵی ١٣٨٩ سوید لەگەڵ دانیمارك و نەرویج یـەکیان گرت لەژێر سەرکردایەتی دانیمارك بەلام بەهۆی زیرەکـی و ئازایـەتی توانیـان یەکـەم پەرلـەمان لەمێـژووی کێـشوەری ئـەوروپا گـرێ بـدەن ئەویش پەرلـەمانی (ریکسداگ) بوو کە هـەموو نوێنەرایـەتی چـین و توێـژەکانی گـەلی سـوید بەشـداریان تێـداکرد کـە تـاکو ئێـستا نـاوی پەرلەمانەکەیان نەگۆڕاوە لەماوەی زیاتر لە ١٠٤ ســاڵە، لەســاڵی ١٥٢٠ شانــشینی دانیمــارك سـویدی داگیرکـردو سـتۆکهولمی کـردە گـۆمی خوێن بە لەسێدارەدانی پیاوانی گەورەو زاناو زیرەکـەکان. بەلام شانشینی سـوید (گۆسـتازی یەکەم) توانی سوید جیا بکاتەوە لە دانیمـارك لەســاڵی ١٥٢٣و ســەربەخۆیی راگەیانــد بــە دامەزرانـــدنی حکومـــەتێکی نـــوێ بـــە جیابوونــەوەی لــە شانــشینی دانیمــارك و سـوپایەکی بەهێزوبـەتواناى پێـك هێنـا لەگـەڵ دامەزراندنی کنیسەیەکی (لوثریە) تاکو گەیشتە ئەو ئاستەی کە سوید بوە یەکێك لە بەهێزترین وولات لــە ئــەوروپاو ڕۆڵی ســەرەکی هــەبوو لەشەڕی سی ساڵەی ١٦١٨تا١٦٤٨ و بوە هـۆی ئەوەی کە زۆربەی زەویەکانی کەناری دەریـای بـەلتیق بخاتـە ژێـر دەسـەلاتی خـۆی بـەپێی پەیمانی (ستفالیای ١٦٤٨).

لـە سـاڵی ١٧٠٠ ڕوسـیاو پۆلەنـداو دانیمـارك ڕێکەوتن دژی وولاتی سوید کە ئەو سێ وولاتـە سـویدیان ناچـارکرد کـەواز لـە هەرێمـەکانی لیفۆنیـاو ئیگۆیـاو ئـستوانیاو چـەند پارچـەیەك لەخاکی فنلەندە بێنێ. لەشـەڕەکانی ناپلیۆن لە ساڵەکانی ١٧٩٩ تا ١٨١٥ سوید توانی نـەرویج لە دانیمـارك وەربگرێـت و بیخاتـە ژێر دەسـەلاتی خـۆی، لەنــەرویج بنەماڵــەی نـوێی شانـشینی دامەزراند بە سەرۆکایەتی شانشینی چواردەم و بـەردەوام بـوو لـە دەسـەلات لـەنێوان سـاڵەکانی

١٨١٨ تاكو ١٨٤٤ بەلام ئەو يەككرتنەی نێوان سویدو نەرویج بوە هۆی هەڵوەشانەوەی لە ساڵی ١٩٠٥. سوید توانی بێ لایەنی خۆی ڕابگرێ لە جەنگی یەکەم و دووەمی جیهان و توانی چەندین یاساو ڕێنمای دەربکات لەپێناو ئارمی و خۆشی ژیان و دابین کردنی ژیان و برینەوەی موچە بۆ کەسانی تەمەن گەورە. ئەمەش کاردانەوەیەکی باشی کردەسەر وولاتانی تر بە تایبەتی نەرویج بە مسۆگەرکردنی دادوەری کۆمەلایەتی و ژیانی ئاسوودەیی بە نەهێشتنی بێکاری و دابین کردنی خانوو خوێندن و تەندروستی بەخۆڕاو ئەمەش بوەهۆی بوژانەوەی وولات لەهەموو لایەنەکانی ئابووری و ڕامیاری و ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی

لە ساڵی ١٩٠٧ بڕیاریدا بە مافی بەشداربوون لە هەڵبژاردنەکان بە بێ جیاوازی نێرومێ بە ڕژێمی ڕێژەیی، دوای ئەوە وولاتی سوید توانی لە وولاتێکی کشتوکاڵ بگۆڕێ بۆ وولاتێکی پیشەسازی. لە ساڵی ١٩٣٢ دیموکراتە سوشیالەکان دەسەلاتیان گرتە دەست و دژی تەنگەژەی ئابووری وەستان. سوید لە ساڵی ١٩٣٢ تاکو ئێستاش توانیویەتی بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێ سەرەڕای گۆڕینی دەسەلاتە یەك لە دوای یەکەکان بەڕێگەی هەڵبژاردنەکان بەلام هەر هەموو پارتەکان توانیویانە خزمەتی وولاتەکەیان و گەلەکەیان وئەو گەلانەی ڕووی تێ کردووە بکرێت و بە ئاسوودەی بژین لەڕووی ژیان و کارو ڕۆشنبیری‌و بوارە جیاجیاکانی تر . لەنێوان ساڵەکانی ١٩٤٠تا ١٩٣٤سوێد لە بارودۆخێکی نالەبار دەخولایەوە بەهۆی ملکەچی بۆ داواکانی ئەڵمانیا، لەنێوان ساڵەکانی ١٩٤٥تا ١٩٧٠حکومەتی ئێرلەندی دیموکراتی سۆشیالیستی دامەزرالەپێناو حکومەتی ئارامی‌و ئاشتی‌و ئاسودەیی لەژیان.لەساڵی ١٩٥٩سوێد چوە ناو ڕابتەی بازرگانی ئازادی ئەورویی لەساڵی ١٩٧١دەستور هەموار کرا بەلام دەستوری ١٩٧٥بوە دەستورێکی کارپێکردنی بنەڕەتی. لەنێوان ساڵەکانی ١٩٧٦تاکو ١٩٩٤بەچەندین قۆناغی دەسەلات تێپەڕ بوو بەهۆی وەرگرتنی دەسەلات لەنێوان پارت‌و ڕێکخراوەکان، لە١٩٩٥/١/١سوێد بوە ئەندام لەیەکیەتی ئەورویا لەڕێگەی ڕاپرسی گەلی سوێد لەهەڵبژاردنەکانی ١٩٩٨، حکومەتی ئیئتلافی دامەزرا لەنێوان پارتەکانی سۆشیال دیموکراتی سویدی. دەسەلاتدارانی سوێدو گەلانی سوێد ڕۆڵی گرنگیان هەیە لە بوارەکانی ئابوری‌و ڕامیاری‌و ڕۆڵی ڕۆشنبیری‌و پەیوەندی نێو دەولەتی بە تایبەتی لە دوای ساڵەکانی ٢٠٠٠ تاکو ئێستاش، ڕێکخراوە حکومیەکان‌و ناحکومیەکان دۆستی گەلانی ماف لێ زەوت کراون بە تایبەتی مافی گەلی کورد لە هەموو پارچەکان بە تایبەتی باشوری کوردستانی لێکێندراو بەعێراق‌و پارچکانی تری کوردستان.

- سوید ئەندامە لە یەکێتی ئەورویا، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری و بوژانەوە.

# فـــاتيكـــان

● نـاوی ڕەسمـی: دەوڵـەتی شـاری فاتیکـان. دەکەوێتە ناو شاری ڕۆمای پایتەختی ئیتاڵیا.

● ڕووبەری: ١٧ میل چوارگۆشەو (٤٤ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە).

● ژمارەی دانیشتوانی: ١١٥٥ کەسە کە ئەمانە لە پیـاوە ئاینیـەکان و پاسـەوان پێـك هـاتوون، ٢٠٠٠ کرێکاریش بێجگە لە پیاوانی ئاینی لە دەرەوەی فاتیکان دەژین.

● چـڕی دانیـشتوانی: ٦٨ کـەس لەیـەك میـل چوارگۆشەدا.

● بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر١٪.

● نژادەکانی: ئیتاڵی، سویسری.

● زمانەکانی: لاتینی (زمانی ڕەسمیە) ئیتاڵی و زمانی تر.

● ئاینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی.

● دراوی: لیرەی فاتیکان. کە لەگەڵ لیرەی ئیتاڵی هاوسانن. دەوڵـەتی فاتیکـان خـاوەنی پـول و ویـستگەی ڕادیـۆو تەلـەفزیۆنی سـەربەخۆی خۆیـەتی لەگـەڵ هێلـی شـەمەندەفەرو بانـك و ڕۆژنامـە. سـوپای سـەربەخۆی هەیـە کـە پاسـەوانی سویـسرین. لـە دەوڵـەتی فاتیکـان باجی دەرامەت لەسەر هیچ خانوبەرەو بازرگانی دەرەوەو ناوەوە نیە.

● ڕژێمی دەسەڵات: سەرۆکی دەوڵەت پاپایوحنا پۆلیـسی دوەمـە، لـە سـاڵی ١٩٧٨ هـەموو دەسـەڵاتێکی یاسایی و جێبەجێکردنی هەیە، لیژنەی (کەرادلە)کە پێك هاتیە لە ١١٥ کەرادیلە وەك ئەنجومـەنی یاسـادانانو ڕێنمـایی ئـاینی مەسـیحیەتی هـەموو جیهانـە تایبەتمەندیـە بەدەسـەڵاتی جێبـەجێکردن کەئـەویش پاپـا دایدەمـەزرێنێ، لیژنـەی کـەردار کـە ئـەویش دەستەی ڕاوێژکاری سەرۆکی پاپایە. لە کاتی کۆچی دوایـی پاپا (کەرادلە) یـەکێکی تـر لـە جێگری ئەو هەڵدەبژێردرێن بە درێژایی ژیانی. بـەڵام (کەرادلـە) پاپـا دایـان دەمـەزرێنێ بـە درێـژایی ژیانیـان. لـە فاتیکـان کارگێڕیـەکی ناوەندی هەیە بۆ کەنیسەی کاسۆلیکی ڕۆمانی لەهەموو جیهـان، کـە ئـەویش بارەگـای پاپایـە. ئـەو کارگێڕیـەش سـکرتاریەتی دەوڵەتـە (کـە وەزیری دەرەوە دەبیا بڕیوە) نۆ لیژنەی کەرادلە هەیە لەگەڵ شەش لیژنە و سێ دەستەو پانزە ئەنجومەن و پێنج نوسینگە. بەڵام لـە پەیوەندی دیبلۆماسـی بارەگـای پاپـا وەزیـری دەرەوە نوێنەرایەتی دەکا. دەوڵەتی فاتیکان پەیوەندی لەگەڵ زۆر دەوڵەت هەیە لەڕێگەی باڵوێزەکانی فاتیکان.

● جوگرافیـای فاتیکان: دەوڵـەتی شـاری فاتیکـان بـچوکترین دەوڵـەتی سـەربەخۆیە لـە جیهـان ، لەناوەڕاسـتی شـاری ڕۆمایـە، کـە دەکەوێتـە کـەرتی لای ڕاستی زێی تیبر لـەناو کۆمیـۆنی ڕۆما. کۆشکی فاتیکانی تیایە کە گەورەترین کۆشـکە لـە جیهـانو بـە جـوانترین شـێوە ڕازاوەتـەوە لەسـەر شـێوازی نـوێی جیهـان و بەنرخترین دەستنوس و پـەرتوك و پاشماوەی شارستانیەتی کۆنی تیایە.

● مێژووی فاتیکان: لە ساڵی ٦٤ زاینی (قەدیس پـەترۆس) کۆچـی دوای کـرد کـە شـەهیدی مەسیحەو دەگێڕنەوە کە لەڕۆما کوژراوە، لە ساڵی ٧٥٦ پاپا بوە دادوەری دنیای وڵایەتی پاپایی. کە درێژ دەبوەوە لە ناوەڕاستی ئیتالیا لەدەوروبـەری مەڵبەنـدی ڕۆمـا. ڕووبەرەکـەی ١٧ر٠٠٠ هـەزار میـل چوارگۆشـە دەبـوو

(٤٤ر٠٣٠ کیلۆمەتر بوو) دانیشتوانی زیاتر لە ٣٠ ملیۆن کەس دەبوو لەسەدەی نۆزدەم. بەڵام لەدوای ڕوداو کێشە بارەگای پاپا گۆزرایەوە بۆ (ئەفنیون لە پاریس) مایەوە بۆ ماوەی حەفتا ساڵ لەسەدەی چواردەم تاکو ساڵی ١٣٧٧ دوبارە گەڕاوە ئیتالیاو شاری ڕۆما بوە بارەگای سەرۆکی پاپا. لەکاتی خەباتی گەل ئیتالیا لەپێناو جێبەجێکردنی یەکێتی خاکی ئیتالیا لە ساڵی ١٨٦٠ تا ١٨٧٠ دەوڵەتی ئیتالیا هەڵسا بە گێڕانەوەی ئەو زەویانەی کەخرابوونە سەر خاکی ئیتاڵیا. لە ١٨١٧/٥/١٢ یاسای دەسەڵاتی دنیای پاپای هەڵوەشاندەوە لە سەر ئەو دەوڵەتە پاپا بوە یەکەم کردنەوەی سەربەخۆیی پاپا لەسەر کۆشکی فاتیکان تیران لە ڕۆماو ڤیللای کاستك جاندۆلفۆ، ئەو یاسایە قەرەبووی پاپای بە ٦٢٠٠٠٠ هەزار دۆلار کردەوە. بەلام دەسەلاتی فاتیکان ئەو قەرەبوەی وەرنەگرت و دانیان بەو یاسایە نەنا تاکو ١٩٢٩/٢/١١ لەوکاتە پەیمانی لاتیران مۆرکرا بەناوی (کونکوردات) لەنێوان فاتیکان و شانشینی ئیتالیا کەبە تەواوی دانی نا بە فاتیکان بە دەسەڵاتی پاپای گەورە لەسەر فاتیکان، پەیمانی کادینالی چەسپاوی سەر فاتیکان لەسەر ئیتالیای مۆسیلینی سەرۆك وەزیران کە. بوە هۆی بەهێزبوونی دەولەتی شاری فاتیکان و ئاینی کاسۆلیکی گرنگ‌و تایبەتی پێدان کە پەیمانی لاتیران بوە خاڵێکی گرنگ لە دەستوری ئیتالیا لە (بڕگەی حەوتی دەستورەکە کە لە ١٩٤٧ دەرچوە) یەکەم کۆبوونەوەی ئەنجومەنی فاتیکان لە ساڵی ١٨٧٠ بوە کە دەسەلاتی بەرزی پاپای لەهەموو بوارەکانی بڕواو ئابرو کاری ئاینی پێدرا، فەڕەنسا لە ساڵی ١٨٧١ دەستی کێشاوە لە ئیتالیاو هێزی نیشتیمانی ئیتالیاو ڕۆمای خستەوە ژێر دەسەلاتی خۆی و کردیە پایتەختی ئیتالیا). لە ١٩٧٨/١٠/١٦ یوحنا پۆلسی دووەم بوە پاپای فاتیکان (پاپا یوحنا پولسی لەدایك بوی پۆڵەندیە) کە یەکەم پاپا بوە ئیتال نەبێ، ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٨٤ پەیوەندی خۆی لەگەڵ دەسەلاتی فاتیکان نوێ کردەوە. کە کۆنگرێسی ئەمەریکا لە ساڵی ١٨٦٧ پەیوەندی لەگەڵ فاتیکان بچڕاندبوو. لەدوای هەرەس هێنانی یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتانی تری سۆشیالستی پەیوەندی فاتیکان لەگەڵ وڵاتەکان دەستی پێ کردەوە. پەیوەندی فاتیکان دەستی پێکرد لەگەڵ ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٩٤ لەدوای گۆڕینەوە دانیان نا بەیەکتری. دەولەتی فاتیکان ئەندام نیە لە هیچ ڕێکخراوەیەکی جیهانی. بەڵکو دەزگایەکی ئاینی مەسیحی خێرخوازە لە ڕاگەیاندنەکان بەرامبەر کارەساتەکانی وڵاتانی جیهان بەتایبەتی لەدوای لێدانی دەسەڵاتی تالیبان لە ئەفغنستان‌و عێراق‌و بەتایبەت چەوسانەوەو ئازاردانی کورد لەدوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی بەهاری ١٩٩١ تاکو ساڵی دوای ڕووخاندنی سەدام لە ٢٠٠٣/٤/٩. پاپا یوحنا بەردەوام بەرگری لەنەتەوەو گەلانی چەوساوە دەکردو داوای بەیەکەوە ژیانی ئاشتیانە دەکات لەهەموو جیهان بەتایبەتی لە سەدەی بیست‌و یەکدا، پاپا یۆحنا پۆلسی دوەم بەهۆی نەخۆشیە کوشندەکەی لە٢٠٠٥/٤/٣ کۆچی دوایی کرد لەڕێو ڕەسمێکی بێ وێنەی جیهان لەسەردابی کۆشکی فاتیکان بەخاك سپێردرا . دەنگدان بۆ هەلبژاردنی پاپا نهێنی ترین کارە لەناو جیهانی کەنیسە کە بەڕێوە دەچێت، کاردینالەکان پێش ئەوەی بچنە ژووری دەنگدان دەبێ ماوەیان پێبدرێت بۆ ئەوەی یەکتر بناسن بیروڕا ئاڵو گۆڕ بکەن سەبارەت بە دەستنیشان کردنی ئەو کەسەی کە شایانی ئەو پۆستەیە،بەپێی

دەستوری فاتیکان هەموو مرۆڤێکی کاسۆلیکی بۆی هەیە ببێ بەپاپا. هەڵبژاردنی پاپا لەسەدەکانی ڕابردوو کاتێکی درێژی دەخایاند تاپاپایان هەڵدەبژارد... لەسەدەی دواتر ماوەی هەڵبژاردنی پاپا ماوەی ساڵێکی خایاند، بەڵام دوایی بەهۆی پەرەسەندنو پێشکەوتنی قۆناخەکانی مێژوی ڕووداوەکانو کێشەو ململانێی ئاینیو کەلەپورو شارستانیەت بەتایبەتی لەنێوان ئاینی ئیسلامو ئاینی مەسیحی ماوەی دەستنیشانکردن کورت کراوە بۆ ماوەی ١٥ تا ٢٠ ڕۆژلەدوای بەخاك سپاردنی پاپای کۆچکردوو. خاڵێکی گرنگ ئەویش لەدوای چونە ژووری داخراوی دەنگدان لەدوای ماوەیەکی دیاری کراو پاپادەستنیشان کرا ئەوا دووکەڵی سپی لەسەر باڵەخانەی پاپاوی بەرز دەکرێتەوە گەر پاپاش هەڵنەبژێردرا ئەوا دوکەڵی ڕەش بەرز دەکرێتەوە، دوای کۆچی دوایی پاپا یوحنا پۆلسی دووەم لەڕۆژی ١٩/٤/٢٠٠٥جوزیف ڕاتزنگەر بەپاپا هەڵبژێردرا بەناوی پاپا بەندەکتی شانزەهەم کە لەدایك بوی ئەڵمانیەو کاسۆلیکەو لەلابالی پاریزگاکانی فاتیکانە.

# مەجەر- هەنگاریا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری مەجەر .
- پایتەختی: بۆدابست، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٩٣٥ر٢ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: دبرتسن، میشکۆلتس، سیجد.
- ڕووبەری : ٩١٩ر٣٥ میل چوار گەشەو ٠٣٠ر٩٣ کیلومەتر چوا رگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٨٢٥ر١٠ ملیۆن کەسە، بەپێی زانیاری ڕۆژنامەکانی ٢٠٠٣.
- چڕی دانیشتوانی: ٢٨٧ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٧ر٠ ٪ .
- نژادەکانی: هنگاری " مەجەری " ٩٠٪ غەجەر ٤٪ ئەلبان ٦ر٢٪ نژادی تری تیایەکە ٤ر٢٪.
- زمانەکانی: هنگاری (مەجەری) زمانی رسمیە.
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی ٥ر٦٧٪ کالفینیە٢٠٪، لۆتریە ٥٪.
- زانینی خوێندنو نووسین: ٩٩٪.
- دابەش کارگێری: ٢٨ناوچەیە +پایتەختی.
- بەرگری: ٥ر٥ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر٥٥ هەزار کەسە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی:٥ر٧٢ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر٧دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر٥١٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمەکانی کشتوکاڵی: گەنم، گەنمە شامی، گوڵەبەرۆژە، پەتاتە، چەوەندەری شەکر دانەوێلە.
- سامانی ئاژەڵی: بەراز ٥ ملیۆن سەر، مەڕ ٠٥٠ر١ ملیۆن سەر، چێڵو گامێش ٠٠٠ر٩٦٥ هەزار سەر، پەرەور ٥٠٠ر٣١ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: بۆکسیت،خەلوز، غازی سروشتی.
- بەرهەمی کارەبا: ٧٠٠ر٢٢ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- پیشەسازی: ئاسنو پۆلا، کەلوپەلی بناسازی،

خواردەمەنی دروستکراو، داو دەرمانی پزیشکی، تەرەکتۆر،رستن و چنین.

- دەرچووەکانی: کەلوپەلی خاو، کەلوپەلی نیوە دروستکراو، کیمیا، ماشێن، خواردەمەنی، بەرهەمی کشتوکاڵی، سوتەمەنی و وزە.
- داهاتی دەرەوەی: سوتەمەنی و وزە، کەلوپەلی خواردن، کەلوپەلی گواستنەوە، کیمیا،ئامێر، کەلوپەلی خاو.
- هاوبەشەکان بازرگانی: وولاتانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، ئەورووپای رۆژهەلات. ئەلمانیا، چین، یابان، نەمسا، فەرەنسا.
- رژێمی دەسەلات: کۆمارێکی دیموکراتیە، ئەنجومەنی یاسادانان لە ٣٨٦ ئەندام پێك هاتووە هەلدە بژێدرێن بە پێشنیاری راستەوخۆ بۆ ماوەی چوار ساڵ. ئەنجومەنی ئومە سەرەك کۆمار هەلدەبژێرێ.
- پارتە رامیاریەکان: زیاتر لەپەنجا پارتی جۆراو جۆری تیایە، پارتە گرنگەکانی، پارتی سوشیالیستی مەجەر، سوشیالیستی چاکسازی وهاوکاری دیموکراتی ئازاد دەکات، پارتی گەلی دیموکراتی مەسیحی، راست رەوی ناوەندی، یەکیەتی دیموکراتی شیانك ، لیبرالی دژ بە کۆمۆنیستەکان.
- جوگرافیای وولات: کۆماری هەنگاریا (مەجەر) دەکەوێتە رۆژهەلاتی ناوەراستی ئەورووپا.. لە باکور سلۆفاکیاو ئۆکرانیا، لە رۆژئاوای نەمسا، لە باشووری سلۆفینیاو یۆگسلافیاو کرواتیا، لە رۆژهەلاتی رۆمانیا، لەهەنگاریا زێی دانوب سنوریەتی لە باکوری رۆژئاوای لەگەڵ سلۆفاکیاو دەسوورێتەوە بەرەو باشووری وولات، لە بەشی رۆژهەلاتی مەجەر دەشتایەکی مەزنی بەپیتی هەیە کە دەشتایی (ناجیال فۆلد)ی پێ دەلێن. لەرۆژئاوای دەشتایەکی بچوکی تیایە کە (کیسەل فولد)ی پێ دەلێن. زێی تیسۆ خاکی وولات دەبرێ کە لە چیاکانی (کرپاتیا) دێتە خوارێ. لە رۆژئاواو باشووری رۆژئاوای دەشتایی (میزفۆلد) ی تیایە، لە باشووری دارستانێکی زۆر چری تیایە. لە مەجەر دەریاچەی (بالاتون)ی تیایە کە ٦٤٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیەو گەورەترین دەریاچەیە لە ئەورووپا. چەندین ناوچەی گردۆلکەی تیایە کە زیاتر لە ٥٠ سەرچاوەی کانیاوی ئاوی گەرمی تیایە، کەش و هەوای زستانی ساردو هاوینی گەرمە و وشکە، بارانی لە رۆژئاوا زیاترە لە ناوچەکانی تری. لە بەهاران لافاوی زۆری هەیە سەرەرای ئەوەی کە باشوورو رۆژهەلاتی توشی وشکایی و نەبوونی باران دەبێ لە هاویندا.
- مێژووی وولات: لەسەدەی یەکەمی زاینی مەجەر پارچەیەك بوە لە ناوچەی ناتۆنیاو داتشای سەر بە ئیمپراتۆریەتی رۆمانی، لە سەدەی چوارەمی زاینی تیرەکانی (گرمان) رویان لە ناوەراستی ئەورووپا کرد کە مەجەریان گەمارۆدا .لە ساڵی ٤٤٥ زاینی (ئتیلاهۆنی) ئیمپراتۆریەتی دامەزراند لەرۆژهەلاتی هەنگاریاو نیشتەجێی بوون و خستیە ژێر دەسەلاتی خۆی بەلام ئەو ئیمپراتۆریەتە تەمەنی کورت بوو. لە ساڵی ٦٨٠ هەنگاریەکان لەنێوان زێی (دون) و زێی (دنیبر) ئارام بونەوە، لەسەدەی نۆیەم هەنگاری (مەجەر)ی هەلسان بە داگیرکردنی ئەورووپای ناوەندو یەکیان گرت بە سەرۆکایەتی (ئارباد) و ئەو ناوچەیان کردەوە کە ئێستا پێی دەگوترێ (مەجەر)، لە ساڵی ٨٩٦ شانشینی لێدامەزراند. لە سەردەمی (شانشین ستیڤنی یەکەم) (قەشە ستیڤن) لەساڵی ٩٩٧ تا ١٠٣٨ ئایینی مەسیحی لەناویان بلاوبووەوە، ستیڤن شانشینی مەجەری پێك هێناو جێگەی رێکخراوەکانی تیرەگەریان گرتەوە. لەسەدەی دوانزە مەجەر بوە هێزێکی گەورە کە لەوکاتە

شانشین بیلای سێ یەم دەسەلاتی لەسەر ناوچەی بەلقان دەرێشت و بەرەو بەهێزی هەنگاوی دەنا لەبەناوبانگی و پەرە سەندنی لەوکاتە شانشین (لویسی یەکەم دەسەلاتی گرتە دەست لە ساڵی ۱۳٤۲ تا ۱۳۸۲ کە دەسەلاتی شانشینەکەی گەیشتە دەوروبەری دەریای بەلتیق و دەریای ڕەش و دەریای سپی ناوەراست. لە ساڵی ۱۳۷۸ شەر هەڵگیرسا لەگەڵ تورکەکان و سەرکەوتن بەرەو وڵاتی بەلقان لەماوەی ۱۰۰ ساڵ دەسەلاتدار بوو. لەئەنجامی شەرێکی خوێناوی لەساڵی۱۵۲٦ سوپای مەجەر تێك شکاو مەجەر دابەش کرا لەنێوان نەمساو تورکیا کە نەمسا ڕۆژئاواو باکوری وڵاتی خستە ژێر دەسەلاتی خۆی، تورکیا باشوورو ڕۆژهەلاتی خستە ژێر دەسەلاتی خۆی، بەلام هەرێمی (ترانسلفانیا) مافی ئۆتۆنۆمی بەدەست هێنا. لەگەڵ ئەوەشدا شەر ناوە ناوە لەگەڵ تورك دەکرا تا ئەوکاتەی پەیمانی (کارلرۆینز) لە ساڵی ۱٦۹۹ مۆرکراو تورك لەمەجەر دەرکراو دووبارە مەجەر یەکخراوە لە ژێر دەسەلاتی بنەماڵەی (هامبۆرگ)ی ئەوروپی کە دەسەلاتی نەمساو مەجەری کەوتە دەست، لە ساڵی ۱۷۰۷ مەجەرییەکان شۆرشیان بەرپاکرد دژی دەسەلاتدارانی نەمساو بوە هۆی ئەوەی کە نەمسا ناچار بێت ڕێز لە دەستوری مەجەر بگرێت لە ساڵی ۱۷۱۱، لەنێوان ساڵەکانی ۱۷۸۰ تا۱۷۹۰ جۆزێفی دووەم ئیمپراتۆری نەمسا هەوڵیدا بەزۆر کارگێرییەکی یەکگرتوو لەسەر هەموو ئیمپراتۆریەتی نەمسا بچەسپێنێ ئەمەش بووە هۆی تورەیی هەستی نەتەوەیی لەلایەن مەجەرییەکان لەسەرەتای سەدەی نۆزدەم بزوتنەوەی (نوێ بونەوەی نەتەوەیی) هەڵسا بە جموجوڵ دژی نەمسا تا ساڵی ۱۸٤۸ کە بڵێسەی شۆرشی مەجەری گری سەندو مەجەرییەکان داوای مافی ئۆتۆنۆمیان کرد بەلام ئەم داوایە لەلایەن (کۆسۆس) سەرۆکی شۆرشەکە راگەیاندرا. بنەماڵەی هامبسبۆرگ ئەم داوایەی رەت کردەوە بە پاڵپشتی ڕوسیاو دوایی شۆرشەکە لەناوبرا. لە ساڵی ۱۸٦۷ مەجەر سەربەخۆی ناوخۆی وەرگرت بە مەرجێك کە ئیمپراتۆریەتی نەمساو شانشین بێت لەسەر مەجەر بە وڵاتی دووەمو بە خاوەندیەتی نەمسا یەك ڕێگەی دیبلۆماسی هەبێت. جەنگی یەکەمی جیهان بووە هۆی لێك ترازانی پەیوەندی نێوان دوژمنکاران و هەلاتنی هەندێکیان و سەرکەوتنی هەندێکیان بە تایبەتی ئیمپراتۆریەتی نەمسا و ئەڵمانیا و تورکیا و بولگاریا، لە ساڵی ۱۹۱۸ ڕژێمی کۆماری لە مەجەر راگەیاندرا، بەلام ماوەی کورت بوو کە بووە هۆی ئەوەی کە کۆمەنیستەکان دەسەلات وەربگرن لەمەجەر بەسەرۆکایەتی (بیلاکۆن) بەلام دوای ڕۆمانیەکان شاری بۆدابستیان داگیرکرد لە ۱۹۱۹/۸/٤ و بووە هۆی کۆتایی هێنان بە ڕژێمی کۆمۆنیستەکان. لەوکاتە ڕۆمانیەکان مەجەریان جێهێشت و (ئەدمیرال هورس) بەخۆی و سوپای نیشتیمانی چووە ناو پایتەخت، لە ساڵی ۱۹۲۰ پەیمانی (تریاتۆنی) بەستراو بووە هۆی لەدەست دانی ۷۲٪ی خاکەکەی. ناوچەی (ترانسلفانیا) بەر ڕۆمانیا کەوت، کرواتیا و باشکا بەر یۆگسلافیا کەوت، هەروەها سلۆفاکیا و رۆزینیا بەر تیشکو سلۆفاکیا کەوت، لەدەست دانی ئەو ناوچانەش بووە هۆی گەرانەوەی شانشینی کۆنی مەجەر، لە ۱۹۲۰/۳/۱ (ئەدمیرال هۆرس) هەڵبژێردرا بە شانشینی مەجەر و (کونت ئستفان بیتلن) بووە سەرۆك وەزیرانی ڕژێمی تاکرەوی توندڕەو دژ بە هەموو بیرو بۆچوونو جولانەوەییەکی نیشتیمانی. لەنێوان ساڵەکانی ۱۹۳۸ تا ۱۹٤۱

توانرا پەیوەندی مەجەر لەگەڵ ئەڵمانیا بەهێز بکرێت کە بووە هۆی ئەوەی مەجەر بتوانی ئەو زەویانەی کە لە دەستی دابوو بیگەڕێنێتەوە، مەجەر شەری دژ بەیەکێتی سۆڤیەت راگەیاند لە ساڵی ١٩٤١، پشتگیری ئەڵمانیای کرد سەرەڕای ئەوە ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٤٤ مەجەری داگیر کردوو ڕژێمی فاشی لێ دامەزراند بەلام لە ماوەیەکی کورت یەکێتی سۆڤیەت توانی مەجەر ڕزگار بکات و خاوەن موڵکە بچوکەکان دەسەلات وەربگرن، دوای ئەوە کۆمەنیستەکان بە سەرکردایەتی (ماتلیس راکۆس) دەسەڵاتی وەرگرت و بەچەند قۆناغێکی یەك لەدوای یەك کە بووە هۆی وەستانی شەر لەنێوان سۆڤیەت و مەجەر لە ١٩٤٥/٢/٢٠، لە ساڵی ١٩٤٦ ڕژێمی شانشین لەدوای (١٠٠٠) ساڵ لەتەمەن دەسەڵاتی هەڵوەشێنرایەوە، لە ساڵی ١٩٤٨ کۆمەنیستەکان بەتەواوی لەمەجەر دەسەڵاتیان وەرگرت بە پشتگیری سۆڤیەت، لە ساڵی ١٩٤٩ دەسەڵاتی تاکرەوی لە ڕژێمی مەجەری ڕاگەیاندراو دام و دەزگا پیشەسازی و زەوی و کشتوکاڵ خۆماڵی کراو کۆمەڵەی هەرەوەزی پێك هێنراو هەمان بیرو بۆچوونی ستالینیەت جێبەجێ دەکرا. لە ١٩٥٦/١٠/٢٢ مەجەر هەڵسا بە بەرپا کردنی شۆڕش لە بۆدابستی پایتەخت دژی کردارەکانی دەسەلاتی کۆمۆنیستیەت بە داواکردنی دیموکراسی و فرە لایەنی و چاکسازی و گرنگی دان بە ژیانی جەماوەر، بەلام سوپای سوری یەکێتی سۆڤیەت توانی ئەو شۆڕشە لەناو ببات و دوبارە پشتگیری لێکرا لەهەمان دەسەلات. لە ساڵی ١٩٨٩ ڕژێمی کۆمۆنیستی هەڵوەشێنرایەوەو دەستوری گواستنەوە ڕاگەیاندرا بە گێڕانەوەی دیموکراتیەت و فرە پارتایەتی لە دەسەڵاتداو کردنەوەی سنوری نێوان مەجەرونەمسا کە ئەمەش کردارێکی گرنگ بوو وەك هەڵوەشاندنەوەی دیواری نێوان هەردوو بەرلینی ئەڵمانیا. لە ساڵی ١٩٩١هێزەکانی سوپای ڕوسیا لە مەجەر کشانەوە لە پاش ٤٧ ساڵ داگیرکردن لەلایەن سۆڤیەت، لە ساڵی ١٩٩٦ پەیمانی دوستایەتی لەگەڵ کۆماری سلوفاك و ڕۆمانیا مۆرکرد، لە ١٩٩٩/٧/٨ بووە ئەندامی تەواوی پەیمانی ئەتڵەسی.

- مەجەر ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری و بوژانەوە، ئەندامە لە پەیمانی ئەتڵەسی، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

# ئەڵمانیا

- ناوی ڕەسمی: ئەڵمانیای یەکگرتوو.
- پایتەختی: بەرلین، ژمارەی دانیشتوانی ۳ر۶۳۵ر۰۰۰ ملیۆن کەسە، بەڵام تاکو ئێستاش شاری بۆن بارەگای چەندین وەزارەتەکانی تیایە، کە پایتەختی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بوو پێش یەکگرتنەوەی لەگەڵ ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات).
- شارە سەرەکییەکانی: کۆلون، میونیخ، ئیسن، فرانکفۆرت، ئاممین، شتۆتگارت، دورتمۆند، دوسلدۆرف، لیبزیگ، درسدن، برمین، هانفۆر،.
- بەندەرە سەرەکییەکانی: هامبۆرگ، کییل، برمنهاڤن،.
- ڕووبەری: ۱۳۷ر۸۰۳ میل چوارگۆشەو ۳۵۶ر۹۱۰ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۸۵ر۸۵۶ر۰۰۰ ملیۆن کەسە بەپێی ئاماری ۲۰۰۲.
- چڕی دانیشتوانی: ۶۲۳ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۰ر۷٪.
- نژادەکانی: ڕەگەزی ئەڵمانی ۹۴٪، کورد ۵ر۱٪، تورك ۵ر۱٪، یۆنانی و ئیتالی ۲٪.
- زمانەکانی: زمانی ئەڵمانی (زمانی ڕەسمییە). چەندین زمانی تری تیایەو خوێندن و نوسینی پێ دەکرێت بەتایبەتی کوردو تورك و هی تر.
- ئاینەکانی: پرۆتستنتی لایەنگیری لوتری زۆربەن، کاسۆلیکی ڕۆمانی، ئیسلام ئەمەش ئەو کۆچبەرانەی ڕوویان لە ئەڵمانیا کردووە وەك کورد و تورك و وڵاتانی تری عەرەبی و ئیسلامی و ئەفریقی.
- زانینی خوێندن و نوسین: ۹۹٪.
- دابەشی کارگێڕی: ۱۶ پارێزگایەو هەریەك لەو پارێزگایانە دەسەڵاتی گەورەی هەیە.
- بەرگری: ۷ر۱۰٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۴۹۵ر۰۰۰هەزار کەسە.
- دراوی: مارکی ئەڵمانی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۱ر۵۵۰ ترلیۆن دۆلار کە دەکاتە (ملیۆن × ملیۆن) کە ملیارێك هەزار ملیۆنە.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۲۰ر۹۵۰ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ۱۵٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: دانەوێڵە، پەتاتە، چەوەندەری شەکر، میوەجات، تەڕە، کروم.
- سامانی ئاژەڵی: بەراز ۲۴ر۰۰۰ ملیۆن سەر، چێڵو گامێش۱۶ر۰۰۰ ملیۆن سەر، مەڕ ۲ر۵۰۰ ملیۆن سەر، پەرەور ۱۰۵ر۰۰۰ ملیۆن سەر، بزن ۱ر۶۵۰ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: ئاسنی خاو، خەڵوز، بۆتاس، دار، یۆرانیۆم، نوحاس، غازی سروشتی، خوێ، نیکل، کبریت، گەلێ شمکی تر.
- بەرهەمی کارەبا: ۴۹۶ر۵۰۰ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازی: پۆڵا، کەشتی، ئۆتۆمبێل، ئامێری ئەلکترۆنی، کیمیا، ڕستن و چنین، پاڵاوتنی نەوت، ئاسن، چیمەنتۆ، ئامێرو ماشێنی گەورە، خواردەمەنی هەمە جۆر، داو دەرمان.
- دەرچووەکانی: ئۆتۆمبێل، بەرهەمی ئاسن و پۆڵا، ماشێن، کەلوپەلی ئەلیکترۆنی زانستی، کیمیا، بەرهەمی ڕستن و چنین.
- داهاتی دەرەوەی: ئۆتۆمبێل، ئامێری کارەبا،

ئاژەڵی زیندو، نەوتی خاو و بەرهەمەکانی، جل و بەرگ.

● هاوبەشەکانی بازرگانی: فەرەنسا، هۆڵەندا، ئیتالیا، بەلجیکا، ئەمەریکا، بەریتانیا، یابان، ڕوسیا، وولآتانی عەرەبی. ئەڵمانیا مەزنترین وولآتە لە رووی بەرهەمی پیشەسازی لە دروستکردنی ئۆتۆمبێلی هەمە جۆر (ئۆتۆمبێلی نەفەر هەڵگر، ئۆتۆمبێلی بار، ئۆتۆمبێلی گواستنەوە) یەکەم وولآتە لە دروستکردنی ئامێری پزیشکی، ئەمەش بەهۆی بوونی خەڵوز کە پاڵپشتێکی گرنگە بۆ بواری پیشەسازی لەئەڵمانیا.

● ڕژێمی دەسەلآت: ئەلمانیا کۆمارێکی یەکگرتووی دیموکراتی لیبرالیە، پەرلەمان پێك هاتووە لە دوو ئەنجومەن: ئەنجومەنی بالآ کە پێی دەگوترێ "بۆندسرات" نوێنەرایەتی هەموو پارێزگاو ناوچەکان دەکات کە ئەوان ئەندامەکان هەڵدەبژێرن، ئەنجومەنی نزم پێی دەگوترێ ئەنجومەنی "بۆندستاگ" ئەندامەکان بە پێشنیاری گشتی و نهێنی هەڵدەبژردرێن بۆ ماوەی چوار ساڵ.

بەلآم سەرەك کۆماری ئەنجومەنی بالآی یەکگرتوو و ئەنجومەنی نزم هەڵدەبژێردرێ بۆ ماوەی پێنج ساڵ، سەرەك وەزیران کە ڕاوێژکاری پێ دەوترێ دەست نیشان دەکرێت لەلایەن ئەنجومەنی "بۆندستگ" کە لە هەر ولایەتێك شەش ئەنجومەنی تایبەتی یاساداناني هەیە کە ئەندامەکان هەڵدەبژێردرێن بەپێشنیاری گشتی بۆ ماوەی چوار ساڵ یان پێنج ساڵ یان زیاتر بەپێی دەستەلآتی هەر یەك لە ولایەتەکان.

● پارتە ڕامیاریەکان: یەکێتی دیموکراتی مەسیحی، ڕاست ڕەوی ناوەندی،یەکێتی مەسیحی کۆمەلآیەتی، پارتی دیموکراتی کۆمەلآیەتی، چەپی ناوەندی، پارتی دیموکراتی ئازاد، لیبرالی، پارتی سەوز، پارتی دیموکراتی سۆسیالیستی، پارتی چاکسازی سۆسیالیست.

● جوگرافیای وولآت: ئەلمانیا دەکەوێتە ڕۆژئاوای ئەوروپا کە ناوچەیەکی گرنگی زیندوە لەڕوی ستراتیژی و جوگرافی. دانیمارك لە باکوریەتی، هۆڵەندا و بەلجیکا و لوکسمبورگ و فەرەنسا دەکەوێتە ڕۆژئاوای، سویسراو نەمسا دەکەوێتە باشووری، کۆماری تشیك و پولندا دەکەوێتە ڕۆژهەلآتی. زەویەکی پێکەیشتووی هەیە لەباکور، لەناوەڕاست و ڕۆژئاوای کردۆلکەیە، بەلآم باڤاریا ناوچەی شاخاویە، لە باشوورو ڕۆژهەلآت و ڕۆژئاوای دارستانی چڕی تیایە. زێیەکانی بۆ دەریاوانی و پاپۆرو کەشتیەکانی بازرگانی و سەربازی بەکار دەهێنرێ و گرنگی زۆری هەیە ئەویش زێی (دانوب) کەهەڵدەقوڵێ لە دارستانە ڕەشاویەکانی باشووری ڕۆژئاواو دیتە خوارێ بەرەو ڕۆژهەلآتی بەپەڕینەوەی لە باڤاریا بۆ نەمسا، زێی (راین) هەڵدەقوڵێ لە خاکی سویسراو دێتەخوارێ بەرەو باکوری بۆ هۆڵەندا کە لەدوو کەنار دەکاتەوە لە دەریای باکور کە بەسودن بۆ دەریاوانی کەشتی و پاپۆری زەریاکان کە لە ماوەیەکی زۆر دەگاتە شاری (کۆلۆن)، چەندین زێ و دەریاچەو ڕوباری گرنگی تیایەو زۆر سودمەندە بۆ ئابووری و سەربازی و ستراتیژی ئەڵمانیاو سەرچاوەی بوژانەوەی ئابوریەتی.. ئەڵمانیا کەش و هەوایەکی مام ناوەندی خۆشی هەیە، لەهاوین خۆشە زستانی ساردە، بارانی مام ناوەندیە لەهەموو وەرزەکانی ساڵدا.

● مێژووی وولآت: ئەڵمانیا لە بنەرەتا پێك هاتوە لەچەند وولآیەتێکی هاوبەش لەزمان و داب و نەریت، لە ساڵی ١٨٧١ لەیەك وولآت پێکهاتبوو بەلآم بوە دوو دەولەتی دژ بەیەکتری لەدوای جەنگی جیهانی دووەم بە دابەش بوونی بۆ ئەڵمانیای ڕۆژهەلآت کە کۆمەنیستیەکان حوکمڕانیان تێدا دەکرد، ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کە

سەرمایەدارەکان حوکمڕانیان تێدا دەکرد.

ئەم دوو وڵاتە دابەشکراوە لەدژایەتی کردنی یەکترو بەردەوام بوو تاکو ساڵی ١٩٩٠ کە دووبارە سەر لەنوێ یەکیان گرتەوە، پێش دەرکەوتنی ئاپینی مەسیحی هۆزەکانی ناوەڕاستی ئاسیا کە کۆچیان کرد بەرەو ئەوناوچەیە لەنێوان سەدەی شەشەم و چوارەدەمی پێش زاین، لەشەڕەکانی (گمال) سەرکردەی ڕۆمانی (بۆلیۆس) هۆزەکانی ئەڵمانیای دەرپەڕاندو توانی دەسەڵاتی فراوان بکات تاکو زێی (راین) بەڵام ڕۆمانیەکان نەیانتوانی پێشکەون بەرەو باکوری زێی (راین). لەسەدەی پێنجی زاینی هۆزە (گرمانیەکان) توانیان ڕۆما تالان بکەن و داگیری بکەن و بەرەو ڕۆژئاوای ئەوروپا هەنگاو بنێن بۆ دابەشکردنی چەندین هۆزو یەکێك لەو هۆزانە کە هۆزی (فرنگین) بوو بە سەرکردایەتی (شارلمان) کە توانی دەسەڵاتی تەواو لەسەر ئەوروپای ڕۆژئاوا مسۆگەر بکات بەهۆی چەندین شەڕی درەندەیی بەردەوام، لە ساڵی ٧٧٢ تاکو ٨٠٤ ناوچەکانی (سکۆنیاو باڤاریا و هەرێمی راین و هەرێمی فرمنکیەو هی تر یەك بخات و خۆی بکاتە ئیمپراتۆر لە سەر ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پێشکەوتوو، دوای ئەوە ئاینی مەسیحی توانی خۆی لەگۆرەپانەکە جێگر بکات بەشێوەیەکی ڕەسمی). لە ساڵی ٨٤٣ بەپێی پەیمانی (ڤیردان) کۆتایی بەشەڕ هێنرا لەنێوان نەوەکانی شارلمان و دابەشی ئیمپراتۆریەکە، یەکێك لەوان (لویس ئەڵمانیی) کە بەشی ڕۆژهەڵاتی وەرگرت لە ئیمپراتۆریەتەکە بەرامبەر ئەڵمانیای نوێی ئێستا بوو. بەڵام میرەکانی ناوخۆیی بوونە میری سەربەخۆی تەواو. دوای ئەوە (هنری زەمۆلر) دەسەڵاتی ناوەندی گەڕاندەوە بۆ بنەماڵەی ساکۆنیو خاوەندیەتی دەسەڵاتی پێکهێنا لە ساڵی١٩١٩ زاینی. لەسەدەی سیانزەو چواردە لەدوای یەکخستنەوەی شارەکان بوە شاری ئەڵمانیای یەکگرتووی بەهێزی بازرگانی و جەنگی مەزن لەناوچەکەدا. هەروەها شەڕی سی ساڵەی نێوان ١٦١٨ تا ١٦٤٨ لەناوەڕاستی ئەوروپا بوە هۆی ململانێی نێوان پرۆتستانت و کاسۆلیك. ئەمەش وردە وردە گۆڕا بەرەو ململانێی چارەسەرکردنی کێشەکەو سەرکەوتنی بنەماڵەی (هامبسبۆرگی) نەمسا لەسەر هەموو ئەڵمانیا. بەڵام مۆرکردنی پەیمانی (وێستفالیا) لە ساڵی ١٦٤٠ چارەسەری کێشەکەی کرد بەسەربەخۆیی وڵایەتەکانی ئەڵمانیاو مانەوەی ئیمپراتۆریەتی نەمسا لەسەر ئەڵمانیا هەربەناو، لە کۆتایی سەدەی هەژدەم پۆڵەندا دابەش کرا لەنێوان بروسیاو نەمساو ڕوسیا، کە بروسیا پارچەی ڕۆژئاوای بەرکەوت. لە ساڵی ١٧٩٢ شۆڕشی فەرەنسا هەڵگیرسا کە ئەڵمانیاش توشی گێژاوی ئەو شۆڕشە بوو بەهۆی بوونی شۆڕشەکە لەسەر لایەنێکی خاکی ئەڵمانیا، لە ساڵی ١٨٠٦ ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز هەڵوەشایەوە، فەرەنسا یەکێتی نۆکەری بۆخۆی دامەزراند لە ڕۆژئاوای ئەڵمانیا بەناوی یەکێتی داین، بروسیاش لەشەڕی گنیا هەڵات. لەنێوان ساڵەکانی ١٨١٢تا١٨١٥، جولانەوەی زیندوبوونەوەی نیشتیمانی لە بروسیا هەڵسا بەبەشداریکردن لەدەرپەڕاندنی ناپلیۆن لەشەرەکانی لیبزیج و مترلۆو پاداشتی وەرگرت لە کۆنگرەی ڤینیا کە لەکۆتایی ساڵەکانی ١٨١٤تا١٨١٥ بەسترا بە پێدانی زەویەکانی ناوچەی راین و ستفالیاو زۆریش لەخاکی سکۆنیا کە بوە هۆی دروست بوونی یەکێتی فیدرالی ئەڵمانیای پەرت و بڵاوی سەربەخۆ کە لە ٢٩ پارێزگا پێك هاتبوو. چەندین کێشەو ململانێی تری توندو تیژ ڕووی دەدا چ لەبارەی دابەشی ناوچەو خۆسەپاندن و دەسەڵات تاکو ساڵی ١٨٧١ کە یەکگرتووی ئەڵمانیا جێبەجێکرا لەلایەن (ئەندازیارەکەی بیسمارك) کە ئۆستقراطیەکی بروسی پارێزگار بوو کە هەمووکات حەزی بەکاری سەربازی دەکرد لەگەڵ

ڕژێمی شانشینی ئەوە بوو لە ساڵی ١٨٦٢ تاکو ساڵی ١٨٩٠ توانی لە گۆڕەپانی ڕوداوەکان سەرکەوێت نەك هەر لە ئەڵمانیا بەڵکو لەهەموو ئەڵمانیا کە سێ شەڕی دژی دانیمارك کرد لە ساڵی ١٨٦٤، نەمسا لە ساڵی ١٨٦٦ دژی فەڕەنسا لەساڵی ١٨٧١ ئەو شەڕانە بەیاوەری نوسەرو ڕۆناکبیرو زاناکان بوو کە بیسمارك هۆکاری شەڕەکان بوەو ئاواتی دامەزراندنی دەوڵەت بوو بە ئاگرو ئاسن و خوێن.

لە ١٨٧١/١/١٨ شانشین ویلهامی یەکەمی بروسیا بووە ئیمپراتۆر لە سەر ئەڵمانیا لەهۆڵی مرایا لە فرسای کە بوە هۆی هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی باکوری ئەڵمانیا کە لە ساڵی ١٨٦٧ دامەزرابوو. لەدوای هێنانە خوارەوەی (ویلهامی) دووەم لە ئیمپراتۆریەت و دامەزراندنی بسمارك بە سەرەك وەزیران بوە هۆی گرتنەبەری ڕامیاریەکی تری داگیر کەرانەو فراوان کردنی دەوڵەتی ئەڵمانیا کە بوە هۆی داپچڕانی لە گۆڕەپانی ناوچەو هەرێم و نیو دەوڵەتی.

لە ١٩١٤/٦/٢٨ جێگری شای نەمسا بەدەستی هاوولاتیەکی سربی لەبۆسنە کوژرا لەوکاتە کێشەی بازرگانی بەرەو تەنگەژەی هەنگاوی دەنا لەنێو ڕامیاریەتی ولاتانی جیهان بە تایبەتی ناوچەکەو ژێر دەستەیی و داگیرکردن کەبوە هۆی دەرکەوتنی بیری شۆڤێتی نەتەوەیی و پەیدابوونی تەنگەژەی پەیوەندی نێو ولاتانی یەکگرتوو وەك فەڕەنسا و وولاتانی هەمەجۆر لەڕەگەزنامە وەك ئیمپراتۆریەتی نەمساو ئەڵمانیاکە لۆمەی نەمسایان دەکرد بەهۆی داماڵینی سربەکان لەسەرەتای جەنگی یەکەمی جیهان کە زیاتر لە ١٠ ملیۆن کەس کوژراو زیاتر لە٢٠ ملیۆن کەس زامدار بوون. لەوکاتە ئەڵمانیا بەلجیکا و فەڕەنسای داگیرکردو جەنگ بەرەو کۆتایی دەهات تاکو ساڵی ١٩١٨ ئەمەش بوە هۆی هەلاتنی ئەڵمانیا لە جەنگدا.

بەهۆی شکانی ئەڵمانیا لەجەنگ و لەدەست دانی هەرێمی (ئلزاس-لۆرین) بۆ فەڕەنسا ، بروسیای ڕۆژئاواو هەرێمی بۆزنان بۆ پۆڵەندا، پارچەیەك لە شلۆزفیج بۆ دانیمارك. هەموو ژێر دەستەکانی لە دەستدا لەگەڵ بەندەرەکانی (دانزیج) بەپێی پەیمانی فرسای وناچارکردنی بە داماڵینی چەك و دانەوەی زیانەکان. ئەمەش بوە هۆی هەلاتنی ئیمپراتۆر (ویلهام) بۆ هۆڵەنداو بەرپابوونی شۆڕش بە لەناوبردنی ڕژێمی شانشینی ئەمەش لە لایەن پارتی دیموکراتی کۆمەلایەتی بە سەرۆکایەتی (ئیبرت و شایدمان) ئەنجامدرا بەلەناوبردنی کۆمۆنیستەکان و پەلاماردانیان و ڕاگەیاندنی کۆماری مام ناوەندی بەسەرکردایەتی (ئیبرت) بەدارشتنی دەستوری فیمار لە ساڵی ١٩١٩ بە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار لەحەوت ساڵ جارێك و دامەزراندنی پەرلەمان لەدوو ئەنجومەن (ئەنجومەنی رایخسرات و ایخستاگ) بەلام سەرۆك کۆمار دەسەلاتی دەرکردنی بڕیارو یاسای بەهێزی هەبوو ئەمەش بوە هۆی ئەوەی ڕۆڵی پەرلەمانەکان بێ هێزبێت، ئەڵمانیا گەیشتە ئەو قۆناخەی کە مارکی ئەڵمانی هیچ بەهایەکی نەبوو بەرامبەر دۆلاری ئەمریکی بەهۆی چەوتی ڕامیاریەتی لەدروستکردنی کێشەو ململانێ و چەوسانەوەی گەلی ئەڵمانی لەلایەن سەرۆکەکان، لەوکاتە (هتلەر) دەرکەوت کە شۆڕشگێڕێکی نەمساوی کۆن بوو (هتلەر جێگری عەریف بوو لە سوپای نەمسا لەجەنگی یەکەمی جیهان) نیشتیمان پەروەرێکی شۆڤێنی توند ڕەو بوو. هانی جەماوەری دەدا بە هۆی برسیەتی و نەبوونی ئارامی و ئاسایش و بەڵێنی دەدا کە گەلی ئەڵمانیا دامەزرێنەری ئەڵمانیای مەزن بێت بە هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی فرسای بە گێڕانەوەی ژێر دەستەکانی کە بەر ولاتانی تری ناوچەکە کەوتبوو لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهان، وەك فەڕەنسار نەمساو پۆڵەنداو تێکشکانی جولەکەکان کە ئەو هۆکارە بوە شلەژان و هەلاتنی ئەڵمانیا، لەو کاتەش پارتی فاشی بەناوی (پارتی

کرێکارانی ئەڵمانی سۆشیالستی نیشتیمانی) دامەزاند. لەوکاتە پارتی دیموکراتی کۆمەڵایەتی و پارتی کۆمەنیستی ئەڵمانی دژی یەکگرتن بوون لە دژی فاشی ئەڵمانیا، هەر لەوکاتە سەرۆك (هند نبورج) هیتلری کردە ڕاوێژکاری ئەڵمانیا لە ١٩٣٣/١/٣٠ و لە ١٩٣٣/٣/٢١ هیتلەر ڕانجی سێیەمی لە شاری بۆتسدام لە باشووری ڕۆژئاوای بەرلین ڕایگەیاند، (هندنیورج) لە مانگی /١٩٣٤/٨ کۆچی دوای کرد و هیتلەر پەیمانی فرسای هەڵوەشاندەوەو دەستی کردبە بوژاندنەوەی کارگەو پرۆژەکانی چەك دروستکردن کە بوە هۆی نەمانی بێکاری و بەرهەڵستکارانی لەناوبردو دەوڵەتی یەك پارتی دەمەزراند بە هەڵبژاردنی ئایدۆلۆژیای شۆڤێنی لەسەر بنەمای بەهێزکردنی نژادی ئاری ئەڵمانی لەسەر هەموو نژادەکانی تری جیهان و بەهێزکردنی چەکی هەمەجۆری جەنگ و بەهێزبوونی لە هەموو بوارەکان، لە ساڵی ١٩٣٥ هیتلەر ئەڵمانیای لە کۆمەڵەی گەلان دەرهێنا و دوای خاکی راینی داگیرکرد لەگەڵ یابان و ئیتاڵیا پەیمانی دژایەتی کردنی کۆمۆنیستیەکانی مۆرکرد، لە ساڵی ١٩٣٨ خاکی نەمسای لکاند بە ئەڵمانیا، لە مانگی نۆی هەمان ساڵ بەپێی پەیماننامەی میونخ خاکی سۆدتلاندی لکاند بەخاکی ئەڵمانیا لە تشیکوسلوفاکیا، لە مانگی /١٩٣٩/٣ تەواوی وڵاتی تشیکسلوفاکیای داگیرکردو دەستگیر نەبوونی بەرێکەوتننامەی میونخ، لە هەمان ساڵ پەیمانی هاوکاری و پەلامار نەدانی یەکتریان لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت مۆرکرد. بەڵام داگیرکردنی پوڵەندا لە ١٩٣٩/٩/١ بوە هۆی خێراکردن لە بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانی لەنێوان ئەڵمانیاو ئیتاڵیا و یابان (وڵاتانی محور) ئەمە لەلایەك و لەنێوان بەریتانیاو کۆمەنولس، فەرەنساو ئەمەریکاو یەکێتی سۆڤیەت و چین (هاوپەیمانان) لەلایەکی ترەوە، لە دوای داگیرکردنی پۆڵەندا لەلایەن ئەڵمانیا، فەڕەنساو بەریتانیا جەنگیان دژی ئەڵمانیا ڕاگەیاند. لە ٩/١٧ هێزەکانی سۆڤیەت بەرەو ڕۆژهەڵاتی پوڵەندا بەڕێ کەوتن بەپێی ئەو بەندە نهێنیەی کە لە بەڵگەنامەی نێوان (ریبنتوب وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیاو مۆلۆتوف وەزیری دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت هەبوو کە ئەویش دابەش کردنی پۆڵەندا بوو لەنێوان هەر دوو لایەن. لە مانگی /١٩٤٠/٤ ئەڵمانیا دانیمارکی داگیرکرد لەگەڵ نەرویج و هۆڵەندا و بەلجیکا و لوکسمبورگ، لە بەریتانیا حکومەتێکی فرە لایەنی دامەزرا بەسەرۆکایەتی (تشرشل) لەمانگی شەشی هەمان ساڵ هێزەکانی ئەڵمانیا چوونە ناو خاکی فەڕەنساو بووە هۆی مۆرکردنی وەستانی شەڕو بارەگای میری گواستراوە بۆ (ڤیشی)). لە مانگی/١٩٤٠/٧ پێکدادانی ئاسمانی لەنێوان ئەلمانیاو بەریتانیا دەستی پێکردو بەردەوام بوو تاکو مانگی ئۆکتۆبەری هەمان ساڵ، ئیتر بەم شێوەیە ئەو پێکدادان لەنێوان یەکیەتی سۆڤیەتو ئەڵمانیا بەردەوام بوو، داگیرکردنی خاکی یەکتری و هەڵاتن و سەرکەوتن لەنێوانیان لە ئەنجام ئەڵمانیا تێکشکاو یەکێتی سۆڤیەت و لایەنگیرەکانی سەرکەوتنو ئەڵمانیا بووە دوو وڵاتی دەسەڵاتداری دژ بە یەکتری ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات لە ئەنجام ٥٥ ملیۆن کەس کوژرا و ٦٠ ملیۆن کەسیش دەربەدەر بوون بەهۆی بۆردومان کردن بە موشەك و بۆردومانی فڕۆکەکان کە زەریای ئەتلەسی و هادی لەژێر پێکدادانی شەڕ بوو. لە ١٩٤٩/٥/٢٣ کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتوو ڕاگەیاندراو بۆن بوە پایتەختی، لە ١٩٩٠/١٠/٣ هەردوو بەشە ئەڵمانیەکەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا یەکیان گرتەوەو دیواری بەرلین ڕوخێنرا. لەهەڵبژاردنەکانی ١٩٩٨/٩/١٧ گیر های شرۆیدەر سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەرامبەر هلمت کول راوێژکاری پێشووی ئەڵمانیا، لەدوای سەرکەوتنی شریۆدەرو خانەنشین کردنی هلمەت کول، راوێژکاری نوێی ئەڵمانیا هەرچی

کـەموکوڕیو ناڵـەباری رامیاریـەتی چـەوتی پێشووی هلمـەت کـول هـەبو شـرۆیدەر هـەمووی دەرخست بەتایبـەتی لـەبواری ئـابوریو قـەرزە زۆرەکـانی ئـەلمانیا لـەپێناو بـاش کردنـی بـژێوی گـەلانی ئـەڵمانیا بـەڵام ئەنجامەکـەی بـوە هـۆی ئەوەیکەئـەڵمانیا لـەدوای هلمـەت کـول تووشـی تەنگـــژەی ئـــابوری بێـــت بەتایـــبەتی لـــەدوای ساڵەکانی ٢٠٠٢ و بەرزبووانـەوەی نرخـی کـەلو پـەلو پێداویـستەکانی گـەلانی ئـەڵمانیا بـەهۆی قەرزاری ئەڵمانیا بۆ وڵاتانی تری هاوپەیمانانو وڵاتـــانی ناوپەکیـــەتی ئـــەورووپا کەئـــەلمانیا گەورەترین بەشی لەدارایی یەکیەتی ئەورووپا هەیە ئەڵمانیا رۆڵی گرنگی لەرامیاریەتی جیهان هەیە بـۆ یەکـەم جـار هاوکـاری هاوپـەیمانان بکـات لەئەفغانستان لەدوای روخانی دەسەڵاتی تالەبانو بـــن لادن لـــەدوای ســـاڵی ٢٠٠١، ئـــەلمانیا بەرهەڵستکاری بڕیارەکـانی ئەمـەریکاو بـەریتانیا بوو بۆ لێدانی رژێمی عێراق لە٢٠٠٣ بەهاوکاری رووســـیاو فەرەنـــسا بـــەڵام لـــەو هاوکاریـــە سـەرنەکەوتوو بوونو دوای رامیاریـەتی نـەرمیان بەکارهێنا بەرامبەر بەئەمەریکا هاوپەیمانان و بوە هـــۆی دورکەوتنـــەوەیان لەبەشـــداری کـــردن لـەئاوەدان کردنـەوەی عێـراق لـە دوای روخـانی دەسەڵاتی سەدام لەساڵی ٢٠٠٤.

- ئـەڵمانیا ئەندامـە لـە نەتـەوە یـەکگرتووەکان، ئەندامە لە یەکێتی ئەورووپا، ئەندامە لە پەیمانی بـاکوری ئەتڵەســی، ئەندامـە لـە رێکخـراوی هاوکاری بوژانەوەی ئابووری.

# نـــەرویـــج

- ناوی ڕەسمی: شانشینی نەرویج.
- پایتـەختی: ئۆسـلۆ، ژمـارەی دانیـشتوانی، ٠٠٠ر١٩٨ر١ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: بیرجین، ترۆندهایم.
- بەندەرە گرنگەکانی: بیرجین، سنافگیر، ئۆسلۆ، کریستیان ساند.
- ڕووبـــەری: ٠٥٠ر١٢٥ میـــل چوارگۆشـــەو ٩٠٠ر٣٢٣ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ٠٠٠ر٦٥٠ر٤ ملیـۆن کەسە، بەپێی زانیاریەکانی ٢٠٠١.
- چـڕی دانیـشتوانی: ٣٧ کـەس لـە یـەك میـل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٦٪.
- نـژادەکانی: گرمـانی (نـۆردی، ئـەلبی، بـەلتیقی) لاب کەمایەیتیـە. کـوردی کۆچـبەری تیایـە کـە زیاتر لە ٣ هەزار کەسە.
- زمانەکانی: نەرویجی (زمانی ڕەسمیە).
- ئاینـەکانی: لوتـەری ئنجیلـی ٨٨٪ ئاینـەکانی تریشی تیایە.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٩٩٪.
- دابەشی کارگێڕی: ١٩ پارێزگایە.
- بەرگری: ٨ر٤٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- ســوپاکەی: ٠٠٠ر٣٥ هـــەزار کەســـە. بـــەڵام پاسەوانی نیشتیمانی ٥٩ هەزارەو ٢٨٥ هەزار یەدەگی ئامادەکاری خێرای هەیە.
- دراوی: کرۆنی نەرویجی.
- کۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٦٠٠ر١٢١ ملیـار دۆلار.
- بەشـــی تـــاك لـــەکۆی دەرئـــەنجامی نـــاوخۆیی: ٥٠٠ر٢٧ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر٣٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهـــەمی کـــشتوکاڵی: دانەوێڵـــە، پەتاتـــە،

بەرهەمی شیر، تەرەومیوەجات، کێڵگەی ماسی، چەوەندەری شەکر.

- سامانی سروشتی: نەوت، غاز، نوحاس، بیریت، نیکل، ئاسن، زەنگ (توتیا) قورقوشم، دار، ماسی، وزەی کارەبا، چەند کاری تر.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٥٠٠ر٢ ملیۆن سەر، چێڵو گامێش ١٠٠ر١ ملیۆن سەر، بەراز ٧٥٠ر٠٠٠ هەزار سەر، بزن ٦٥٠ر٠٠٠ هەزار سەر، پەرەور ٧٥٠ر١٦ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی کارەبا: ٢٥٠ر١١٠ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازیەکانی: پەرو کاکلی پەڕ، ئەلەمنیۆم، ئاسن و پۆڵا، نیکل، پەینی کیمیا، کەلوپەلی گواستنەوە، پترۆ کیمیاوی، خووری، دروستکردنی خۆراك، دروستکردنی کەشتی، رستن و چنین، داو دەرمان.
- دەرچووەکانی: نەوت، غازی سروشتی، بەرهەمی ماسی، کەشتی، پەرو کالکی پەڕ، ئەلەمنیۆم، چەند جۆری تر لەبەرهەمەکان.
- داهاتەکانی دەرەوەی: سوتەمەنی، رۆن، کەلوپەلی گواستنەوە، جل و بەرگ، کیمیا، ئامێر.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: بەریتانیا، سوید، ئەڵمانیا، ئەمەریکا، دانیمارك، چین، هۆڵەندا، یابان.
- رژێمی دەسەڵات: شانشینی میراتی دەستوریە، دەسەڵاتی جێبەجێکردنی بەندە بە شانشین و ئەنجومەنی وەزیران کە پێك هاتووە لە سەرەك وەزیران کە لە حەوت ئەندام پێك هاتووە. بەڵام دەسەڵاتی یاسادانانی بەدەست پەرلەمانەو ناوی ئەنجومەنی (ستۆرینگ) کە پێك هاتوە لە ١٦٥ ئەندام کە لەلایەن گەل هەڵدەبژێردرێن بەرێژەی نوێنەری، شانشین ناتوانێ لەماوەی هەڵبژاردنی ئەنجومەن هەڵی بوەشێنێتەوە.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی کاری نەرویجی، پارتی مام ناوەندی، پارتی چەپی ناوەندی، پارتی پارێزگاران، پارتی پێشکەوتن، راست رەوی ناوەندی، پارتی گەلی مەسیحی، چەندین بیرو بۆچوونی چەپ و راست و نەتەوەیی و نیشتیمانی و چینایەتی تری تیایە.
- جوگرافیای وڵات: وڵاتی نەرویج بەشی رۆژئاوای نیمچە دورگەی ئەسکەندەنافیا دەگرێتە خۆی کە دەکەوێتە باکوری رۆژئاوای ئەوروپا. زۆرترین خاکی ئەوروپای لە درێژی گرتۆتەوە لەلایەنی باکور، خاکەکەی درێژدەبێتەوە لە باکوری لەشێوەی بازنەی جەمسەری، سوید دراوسێیەتی بەدرێژایی زۆربەی سنوری رۆژهەڵاتی، فنلەندا و روسیا لە باکوری رۆژهەڵات. چواریەکی خاکی نەرویج دارستانەو پێکهاتووە لەکەندو دۆڵی بەپیتی گرنگ، زۆر دەریاچەی قوڵی هەیە لەگەڵ زێی خێرا کە بەناوبانگە بە (فیۆردات) کە باڵێکی دەریایی درێژە لەنێوان بەردی بڵند. لە ٧٠٪ خاکی نەرویج دانیشتوانی تیانیە بەهۆی ئاوی زۆرو بڵندو نەوی، کەناری گرنگی بەسوودی تیایە.
- مێژووی وڵات: لەسەدەی پێنج گۆتەکان شانشینی بچوکیان لە نەرویج پێکهێنا. لە ساڵی ٨٧٢ شاعیری نەرویجی (هارلۆ) خاوەنی شعری شانشینی نەرویجی دارشت لەدوای یەکخستنەوەی وڵاتو یەکەم شانشین بوو، بەڵام لەدوای مردنی ئەو شانشینە هەڵوەشایەوە، لەماوەی ساڵەکانی ٨٠٠ تا ١٠٠٠ هۆزەکانی باکور کە ناسراو بوون بەناوی (فایکینج) شاڵاویان بردە سەر کەنارەکانی ئەوروپای رۆژئاواو باکورو بەداگیری کردنی ناوچە جیاجیاکانی ئەوروپا.

لە ساڵی ١٠١٦ تا ١٠٢٨ شانشین (ئۆلاف)ی دووەم توانی وڵاتی نەرویج یەکخاتەوە و ئاینی مەسیحی بخاتە ناو گەلانی نەرویج، لەدوای ئەوە

لەسەدەی سیانزەهەم شانشین (هاکۆنی) شەشەم توانی دەسەڵاتی بخاتە سەر دەرەبەگەکان و کنیسەو ڕژێمی شانشینی میراتی دامەزرێنێ، لە ساڵی ١٢٦٣ هەوڵی دا ئیسلەنداش بخاتە ژێر دەسەڵاتی شانشینی نەرویج. لە ساڵی ١٣٩٧ نەرویج و دانیمارك و سوید توانیان یەکگرن لە یەك شانشین بەڵام ئەو یەکگرتنە بوە هۆی لاوازی و لێك ترازان لە نێوانیان کە سوید لە ساڵی ١٥٢٣ لەو یەکگرتنە دەرچێ، لەدوای سەدەی شانزە بەرەو بوژانەوە هەنگاوی نابە هۆی پیشەسازی دار ڕەوانە کردنی بۆ دەرەوە، بەڵام لە ساڵی ١٦٦١ دانیمارك گەڕاوە بۆ نەرویج وا تەماشا دەکران وەك جمکەیەکی لەدایك بوو، لەسەدەی هەژدەم بازرگانە نەرویجیەکان سودمەند بوون لە جەنگەکانی بێگانە کە بوە هۆی پەرەسەندنی داواکاری لەسەر یارمەتی دەریایی، بەڵام لە ساڵی ١٨١٤ دانیمارك وازی لە نەرویج هێنا بەپێی پەیمانی (کییل) بەبێ ئیسلەندا، لە ساڵی ١٨٣٧ ڕژێمی دیموکراتی ناوخۆیی کەوتە ناو وڵات، لە ساڵی ١٨٨٤ نەرویج ئۆتۆنۆمی وەرگرت لەوکاتەی شانشینی سوید ئەنجومەنی وەزیرانی کردە بەر پرسیار بەرامبەر بە پەرلەمانی نەرویجی، لە ساڵی ١٨٩٥ کێشە دەستی پێ کردە لەسەر دەستور لەبارەی پەیوەندی نێودەوڵەتی، نەرویج لە ١٩٠٥/١٠/٢٧ سەربەخۆی ڕاگەیاندو دوای ئەوە سوید داواکاری نەرویجی رەتکردەوە تەنیا بەبوونی نوسینگەیەکی تایبەتی نەبێت لەو کاتە جەنگی یەکەمی جیهان هەڵگیرساو نەرویج توانی لەگەڵ سویدو دانیمارك بڕیاریان وەرگرت بەبێ لایەنیان لەجەنگ و هەوڵی بەرەوپێش بردنی بەرژەوەندی وڵاتەکانیان بدەن و ڕامیاریەتی ئاشتی بگرنەبەر، یەکەم حکومەتی کرێکاری لە ساڵی ١٩٣٥ دامەزرا، لەجەنگی دووەم نەرویج داگیرکرا لەلایەن فاشیەکانی ئەڵمانی لە ١٩٤٠/٤/٩، لەماوەی ساڵەکانی ١٩٤٥تا ١٩٦٥ حکومەتی کرێکاری دەسەڵاتی گرتەوە دەست ئەویش بە دانانی ئەخشەو پلانی ئابووری و چاودێری نرخەکان، لە ساڵی ١٩٤٩ وولاتی نەرویج وازی لەبێ لایەنی هێناو بوە وولاتێکی بنەڕەت لە دامەزراندنی پەیمانی باکوری ئەتڵەسی، لە ساڵی ١٩٥٢ نەرویج چووە ڕێزی ئەنجومەنی وولاتانی باکور، لە ساڵی ١٩٥٧ شانشین هاکونی حەوتەم جێگەی شانشینی ئۆلافی باوکی گرتە دەست لەسەر وڵات.

لەساڵی ١٩٧٥ وولاتی نەرویج دەستی کرد بەناردنە دەرەوەی نەوت و بەرهەمەکان و بوە یەکێك لە وڵاتە مەزنەکانی دەرهێنەری نەوت لە جیهان، لە ساڵی ١٩٨٢ بۆ یەکەمجار پارێزگاران توانیان حکومەت پێك بێنن لەوەتەی ساڵی ١٩٢٨، لە ڕاپرسی میللی ١٩٩٤/١١/٢٨ دەنگ دەران نارەزاییان دەربڕی بۆ ئەندامەتی یەکێتی ئەوروپا. تاکو ئێستاش نەرویج وولاتێکی پڕ لە ئاسوودەو ئارام و ژیانی خۆشی داد پەروەرانەی تیایە و سەرەڕای ئەوەش کۆچبەران ڕووی تێ دەکات لەوپەڕی ژیانی پڕ لەخۆشیدا دەژین بێ ئەوەی کاریکەن، تاکو کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤ ئاڵوگۆڕی دەسەڵات لەنێوان پارت و ڕێکخراوەکانی نەرویج بەڕێنمایەکی دیموکراتیانە بەڕێوە دەچێت.

- نەرویج ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەندامە لە پەیمانی باکوری ئەتڵەسی، ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاری بوژانەوەی ئابووری، ئەندامە لە رایەڵەی ئەورووپی بازرگانی ئازاد.

# نەمسا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری نەمسا.
- پایتەختی: ڤیینا، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۸٦٥ر۱ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکییەکانی: گراتس، لینز، سالزبۆرگ، ئنزوبرۆك.
- ڕووبەری: ۳۷٤ر۳۲ میل چوارگۆشەو ۸۵۰ر۸۳ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر٦٤٥ر۸ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ۱۹۹۹.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۷ر٪.
- چڕی دانیشتوانی: ۲٦۷ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- نژادەکانی: ئەڵمانی ۹۵٪ هەندێ لە کروات و سلۆفینی تیایە.
- زانینی خوێندن و نوسین: ۹۹٪.
- زمانەکانی: ئەڵمانی (زمانی ڕەسمیە).
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی ۸۵٪. پرۆتستنتی٦٪.
- دابەشی کارگێڕی: نەمسا کۆمارێکی فیدرالیە، پێکهاتووە لە نۆ پارێزگا و هەر پارێزگایەك ئەنجومەنی یاسادانانی تایبەتی خۆی هەیە.
- بەرگری: ۸ر۲٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۷۰۰ر۱۳ هەزار کەسە.
- دراوی: شلن.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۳۰۰ر۱٤۷ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۱۰۰ر۲۲ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر۱۷٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- سامانی ئاژەڵی: بەراز ۸۵۰ر۳ ملیۆن سەر، چێڵ ۵۰۰ر۲ ملیۆن سەر، پەرەوەر ۲۰۰ر۱٤ ملیۆن سەر، مەڕو بزنی هەیە بەڵام ڕێژەکەی بەباشی نەزاندراوە.
- بەرهەمی کارەبا: ۵۰۰ر٥٤ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: دارستان، دانەوێڵە، چەوەندەری شەکر. پەتاتە، تەڕەو میوەجات.
- بەرهەمی پیشەسازی: ئاسن و پۆڵا، کیمیا، ئامێر، پەڕ، دروستکردنی شەکر. پێڵاو، جلو بەرگ.
- داهاتی سروشتی: ئاسنی خاو، نەوت، نوحاس، وزەی ئاوی.
- دەرچووەکانی: بەرهەمی ئاسن و پۆڵا، داری دارستان، پەڕ، ڕستن و چنین، بەرهەمی کیمیا، تریاکی قەدەغە کراو خاڵی بەرهەمهێنانە بۆ داهاتی هاوڵاتیان و بازرگانی پێ کردنی کە لە باشووری ڕۆژئاوای بەلقان دەپەڕێتەوەو بازرگانیەکی گرنگی پێ دەکرێ.
- داهاتەکانی دەرەوەی: ماشێن، کەلوپەلی کیمیاوی، کەلوپەلی خۆراك، ڕستن و چنین، نەوت و بەرهەمەکانی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەڵمانیا، یەکێتی ئەوروپا، ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا، ئەمەریکا، یابان، وڵاتانی رایەڵەی بازرگانی ئازاد، چین، فەرەنسا، ئەڵمانیا.
- ڕژێمی دەسەڵات: دیموکراتی پەرلەمانیە، سەرۆك کۆمار گەل هەڵی دەبژێرێ بۆ ماوەی شەش ساڵ، ئەنجومەنی یاسادانان دوو ئەنجومەنە بۆندزارت کە ۵۸ ئەندامەو ئەنجومەنی یاسادانانی پارێزگاکانی دەستنیشان دەکەن. ئەنجومەنی دووەم (ناشیونال دان) کە ۱۸۳ ئەندامەو گەل هەڵیان دەبژێرێ بۆ ماوەی چوار ساڵ و بەنۆبە سەرۆکایەتی دەکەن هەریەك بۆ ماوەی شەش

مانگو سەرۆکایەتی دەچێتە پارێزگاکانی بەپێی پیتی ئەبجەدی ناوەکان لەئەندامەکانی پەرلەمان.

● پارتە رامیاریەکان: پارتی دیموکراتی کۆمەڵایەتی نەمسا، پارتی سۆشیالستی دیموکراتی، پارتی گەلی نەمسا، پارتی ئازاد، پارتی سەوزی نەمسا، چەندین پارت و بزووتنەوەی تر هەیە لە بیرو بۆچوونی جیاواز لە بوارەکانی رامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی.

● جوگرافیای وولات: وولاتی نەمسا دەکەوێتە باکوری ناوەندی ئەوروپا. لە رۆژئاوای سویسرا لەگەل لبنشتین، لە باکوری ئەڵمانیاو کۆماری تشیك، لە رۆژهەلاتی سلۆفاکیاو مەجەر، لە باشووری سلۆڤینیا و ئیتاڵیا، نەمسا وولاتێکی چیایەو چیاکانی ئەلەب و لێوارەکانی گردۆلکەکانی پارێزگاکانی رۆژئاوای و باشووریەوە، بەلام پارێزگاکانی رۆژهەلاتی ڤینا لە گۆماوەکانی زۆی دانوبە، لە ٤٠٪ دارستانەکانی ولات دادەپۆشێت.

● مێژووی وولات: پێش مێژووی مرۆڤایەتی وولاتی نەمسا دانیشتوانێکی چری تیابوە لەسەردەمەکانی پێش ئیمپراتۆریەتی رۆمانیش هۆزە جۆراوجۆرەکان داگیریان کردبوو لەوانە هۆزی (سەلتی) لە ساڵی ٧٨٨ زاینی ناوچەکە لەلایەن شارلمان مالاتی کراوەو هانی ئاوەدان کردنەوەو بلاوکردنەوەی ئاینی مەسیحی تیا ئەنجامدا، لە ساڵی ١٢٧٨ ئیمپراتۆریەتی رۆمانی دەستی بەسەر دا گرت بە سەرۆکایەتی ئیمپراتۆر (رۆلدف) کە حکومرانی نەمسای کرد تاکو جەنگی یەکەمی جیهان. نەمسا بەشداری کرد لە دابەش کردنی پۆلەندا لە ساڵی ١٧٧٢، لە ساڵی ١٧٩٢ لەگەڵ فەرەنسا چونە ناو شار، لە ساڵی ١٨٠٦ ئیمپراتۆریەتی پیرۆزی رۆمانی هەلوەشێنرایەوە. لە ساڵی ١٦٩٩ وولاتی نەمسا بوە ئیمپراتۆریەتی نەمسا- مەجەر، لە ساڵی ١٨٧٨ بۆسنەو هرسکی خستە ژێر دەسەلاتی خۆی، لە ١٩١٤/٦/٢٨ هاوولاتیەکی سربی (ئەرشیدوف فرانز فردینالد)ی تیرۆر کرد کە جێگری ئیمپراتۆری نەمسا بوو ئەمەش بوە هۆی داگیرکردنی سربیاو ئەنجامەکەی هەلگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهان بوو بەهەرەس پێ هێنانی ئیمپراتۆریەتی نەمسا لە ساڵی ١٩١٨و لێك ترازانی باری رامیاری و ئابووری و ئاژاوەی جەماوەری و وێرانبوونی ئابووری و جیابوونەوەی مەجەر لە نەمسا راگەیانراو کۆماری نەمسا لەهەمان ساڵدا، لە مانگی ١٩٢٠/١١/ دەستوری وولاتی راگەیاند بە رژێمی دیموکراتی پەرلەمانی، بەلام راوێژکار (دۆلفس) لە ساڵی ١٩٣٣ هەڵسابە دامەزراندنی رژێمێکی دکتاتۆری دژ بە نازیەکانو داوای یەکبوونی لەگەڵ ئەڵمانیاش دەکرد. بەلام نازیەکان تیرۆریان کرد لەمانگی ١٩٣٤/٧/ دوای ئەوە فاشیەکانی ئەڵمانیا لە مانگی ١٩٣٨/٣/ نەمسایان داگیر کرد و هیتلەر لکاندنی نەمسای بە ئەڵمانیا راگەیاند. لەجەنگی دووەمی جیهان هاوپەیمانان نەمسایان دابەشی چواربەش کرد ئەویش لەنێوان (ئەمەریکاو بەریتانیا و فەرەنسا و سۆڤیەت) بەلام دوای بەریتانیا و ئەمەریکا رایان گەیاند کە گەلی نەمسا گەلێکی ئازادە. لە ١٩/دیسمبری/١٩٤٥ رژێمی کۆماری دووەمی نەمسا راگەیاندرا لە سەر بناغەی دەستوری ١٩٢٠و لە ١٩٥٥/٥/١٥ پەیمانی دەوڵەتی نەمسا مۆرکرا لەگەڵ ئەو چوار دەوڵەتەی دابەشیان کرد لەنێوان خۆیانو لێی چوونە دەرەوە. نەمسا لە ژێر سایەی رژێمێکی سۆشیالستی مام ناوەندی هەنگاوی باشی نا لە بوژانەوەی ئابووری، لە ١٩٩٥ نەمسا بوە ئەندامی تەواوی یەکێتی ئەوروپا.

● نەمسا ئەندامە لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە یەکێتی ئەوروپا، ئەندامە لە رێکخراوی هاوکاری بوژانەوەی ئابووری.

# یۆنـــــان

● ناوی ڕەسمی: کۆماری هللینیە.
● پایتـــەختی: ئەســـینا، ژمـــارەی دانیـــشتوانی ۳٫۵۸۷٫۰۰۰ملیۆن کەسە.
● شارە سەرەکیەکانی: سالۆنیکا، سیسالۆنیکی، باتراس، ئـەو شـارانەو شـاری تـریش لەسـەر کەنارەکانی دەریای ئیجەن‌و بەندەرن.
● ڕووبەری: ٥٠٫٩٦١ میل چوارگۆشەو ۱۳۱٫۹۹۰ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
● ژمـارەی دانیـشتوانی: ۱۱٫۲٥۷٫۰۰۰ ملیـۆن کەسە، بەپێی زانیاریەکانی ۲۰۰۲.
● چـڕی دانیـشتوانی: ۲۲٥ کـەس لەیـەك میـل چوارگۆشەدا.
● بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥٫۰٪.
● نژادەکانی: یۆنانی (۹۸٪ کەمایەتیەکانی تـر، تورك و سلاف و ئەلبانی).
● زمانەکانی: یۆنانی (زمانی ڕەسمیە) ئینگلیزی، فەرەنسی.
● ئاینەکانی: ئۆرسۆزکسی یۆنانی ۹۸٪ .
● زانینی نوسین و خوێندن: ۹۸٪.
● دابەشـی کـارگێڕی: ۱۳ هەرێمـە، دابەشـی ٥۱ بەش کراوە.
● بەرگری: ۷٫۷٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
● سوپاکەی: ۱۷٥٫۰۰۰هەزار کەسە.
● دراوی: دارخمە.
● کۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ۱۳۷٫٥٥۰ ملیـار دۆلارە.
● بەشـی تـاك لـەکۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ۱۳٫۲۰۰ دۆلار.
● زەوی کشتوکاڵی: ۲٥٪ لە خاکی وولاتەکە.
● بەرهـــەمی کـــشتوکاڵی: دانەوێڵـــە بەهـــەموو جۆرەکـــــانی، دەرە زەرد (گەنمەشــــامی) چەوەندەری شەکر، پەمۆ، زەیتون، تەباك، تریێ، خۆێ، چەندین تەڕەو میوەجاتی تری تیایە.
● ســـامانی سروشـــتی: بۆکـــسیت، لجنیـــت، موگناتیس، نەوت.
● سامانی ئاژەڵی: مەڕ ۹٫۷٥۰ ملیۆن سەر، بزن ٦٫۳۲۰ ملیۆن سەر، بەراز ۱٫۱٥۰ ملیۆن سەر، پەرەور ۱٥٫۲۰۰ ملیۆن سەر.
● بەرهەمـەکانی کارەبا: ٤۱٫٥٤۰ ملیـار کیلـۆوات کاتژمێر.
● پیـشەسازی: گەشـت و گـوزار، ڕسـتن و چـنین، کیمیـاوی، ئاسـنگەری، نبیـز، دروسـتکردنی خۆراك، دروستکردنی کەشتی و گەمی و پاپۆڕ، داو دەرمان ،پێڵاو
● دەرچووەکانی: کەلوپـەلی دروسـتکراو، خۆراك، ئـاژەڵی زینـدو، سـوتەمەنی، ڕۆن و بـەنزین، کەلوپەلی خاو.
● داهاتـــەکانی دەرەوەی: ماشـــێن و کەلوپـــەلی، نـــەوت، کەلوپـــەلی بـــەکارهێنان، کیمیـــاوی، کەلوپەلی خواردەمەنی.
● هاوبەشـــەکانی بازرگـــانی: ئـــەڵمانیا، یابـــان، ئیتاڵیا، بەریتانیا، ئەمەریکا، هۆڵندا، وولاتانی یەکێتی ئەوروپا، چین، چەندین وولاتانی تر.
● ڕژێمـــی دەســـەلات: کۆمـــارێکی پەرلەمانیـــە، ئەمـــەش لـــەدوای کۆتـــایی هێنـــانی ڕژێمـــی دکتاتۆری سەربازی لە ساڵی ۱۹۷٤. لە ڕاپرسی گەلی یۆنـان و ڕەزامەندی بەکۆتایی پـێ هێنـانی ڕژێمـی شانـشینی لـە وولات و دامەزرانـدنی ڕژێمـی کۆمـاری و دامەزرانـدنی دەسـەلاتی جێبـەجێکردن کـە لـەڕووی ڕەسمـی سـەرۆك کۆمار سەرپەرشتی دەکات، بەلام سەرۆکایەتی حکومـــەت ســـەرۆك وەزیـــران هەڵدەبـــژێرێ‌و

سەرۆکایەتی دەکات کە بەپرسیارە بەرامبەر بەپەرلەمان، پەرلەمان لە ۳۰۰ ئەندام پێک هاتووە.

- پارتە رامیاریەکان: بزوتنەوەی هللینی سۆشیالستی نیشتیمانی، سۆشسیالستی دیموکراتی، پارتی دیموکراتی نوێی راست ڕەوی ناوەندی، پارتی نوێ کردنەوەی دیموکراتی، پارتی کۆمەنیست، لابالی چەپ، پارتی بەهاری رامیاری.
- جوگرافیای وولات: یۆنان بەشی باشووری لە نیمچە دورگەی بەلقان و دورگەکانی دەوردراوە بە بەشەکەی کە دەریای ئەیونی دەگرێتە خۆی، دەریای سپی و دەریای ئیجە، لە ۲۰٪ دورگەکە رووبەری وولات دەگرێتە خۆی، لەو دورگانە، کۆرفو، کرین، سیۆرادیس، دۆدیکانیس، وسیکلادیس، لە باکوری ئەلبانیاو مەگدۆنیا و بولگاریا، لە ڕۆژئاوای دەریای ئەیونیە، لەباشوور دەریای سپی ناوەڕاست، لەڕۆژهەڵاتی دەریای ئیجەو تورکیانا. زیاتر لە ۷۵٪ خاکی یۆنان چیاییەو زنجیرە چیای بیندۆس کە ئیبرۆس لە دەشتایی سیسلیا جیا دەکاتەوە. لەباکوری نزیك دەریای ئیجە چیای ئۆلیمپە، بەڵام ناوچەی تریس ئەویش لەزۆربەی زەویەکانی نەوییاین و زێی ئفرۆس لە بەشی تورکیای ئەورووپای جیادەکاتەوەو کەناری بلندو نەوی سەختی تیایە کە درێژی ۹۱۵۸ میل دەبێ. بەڵام دورگەکان زیاتر لەهەزار دورگە دەبێ کە دانیشتوانی چڕی تیایە. کە ۱٦۹ دورگەیە، کۆمەڵێ دورگەی ئەیونیە دەکەوێتەوە دور لە کەناری ڕۆژئاوای، کۆمەڵەی سیکلاس دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵات، کۆمەڵەی سێیەم لە ڕۆژهەڵاتی دەریای ئیجەیە ئەویش دورگەی، یۆبیا، لیسبۆس، سامۆس، کیۆس، دۆدیکانیزە، دورگەی کرین کە چوارەم دورگەیە لە گەورەیی لەدەریای سپی یۆنان. کەش و هەوای لەباشوورو ناوچەی کەناریەکانی گەرمە لەهاوین و مام ناوەندیە لەزستان، بەڵام ناوچە شاخاویەکانی ساردە، باران لە زۆربەی ناوچەکان لە ۱۵ ئینج زیاتر نابارێت.
- مێژووی وڵات: یۆنان لەساڵەکانی ۱۰۰۰ تا ۵۰۰ پێش زاین لە وولاتی یۆنان شارو وولات دەرکەوتن، ژێر دەستەی یۆنانی دامەزران لە چوار دەوری دەریای سپی ناوەڕاست، مێژووی نوسراوی لە تۆمارەکانی یۆنان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ۷٦٦ پێش زاین. دەستکەوتەکانی یۆنانی کۆن لە بوارەکانی هونەرو بیناسازی و زانست و ماتماتیك و فەلسەفەو شانۆو ئاداب و دیموکراتیەت بێ وێنە بووەو هەموو شارستانیەت و شوێنەوارەکانی لەسەردەمەکانی یەك لەدوای یەکەکانی بووەو یۆنانی کۆن گەیشتە قۆناغی سەرفرازی دەسەڵاتداریەتی لە ئەسینا شاری وولات لەسەدەی پێنجی (٤٩٠و٤٠٤ پێش زاین) لەماوەی ساڵی ۳۵۷ تا ۳۳۸ پێش زاین (فلیپی دوەم) شانشینی مەگدۆنیا توانی لەباکوری ڕۆژهەڵاتی یۆنان سەرکەوێت بەسەر یۆنان، بەڵام شارە - دەوڵەتەکە توانی تێکۆشێ تاکو سەربەخۆی بگەڕێنێتەوەو پارێزگاری لێ بکات، لەساڵی ۱٤٦ پێش زایین ئمیراتۆریەتی رۆمان توانی مەگدۆنیا داگیر بکات و وولاتانی یونانیش بلکێنێ بە خاکی ئیمپراتۆریەتەکەو یۆنان بوە ولایەتێك لەرۆمان، لەدوای ساڵی ٤٧٦ زاینی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمان تواوەو نەما بەڵام یۆنان لەسەدەی چوارەمی زاینی بووە پارچەیەك لە ئیمپراتۆریەتی (بیزەنتی) ئەویش هەر دەناسرا بەئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ڕۆژهەڵات کە پایتەختی (قستەنتینیە) بوو (کە ئێستا ئەستەمبوڵی تورکیایە) ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی تەواوکەری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بوە لە ڕۆژهەڵات و میراتگەری بوە لە زۆر داب و

نەریت و دام و دەزگاکانی. مانەوەی یۆنان لەژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ڕۆژهەڵات تاکو ساڵی ١٢٠٤ لەوکاتەی قستنتینیە کەوتە ژێر دەست سەلیبییەکان، ئەسینا و ئەکیا لەباشووری یۆنان و ئیسالۆنیکی و سالۆنیکا لەباکوری یۆنان کەوتە ژێر حکومڕانی فرنجە. لە ساڵی ١٤٥٣ قوستەنتینیە کەوتە دەست تورکە عوسمانیەکان لەکاتی داگیرکردنی خاکی یۆنان لەکۆتایەکانی سەدەی چواردەم یۆنان بوە پارچەیەك لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەڵام سەرەڕای داگیر کردنەکەش کنیسەی ئۆرسۆزکسیە توانی زمانی ڕەسەنی خۆی بپارێزێ لەدەسەڵاتی داگیرکەری تورانیەکانی عوسمانی و داب و نەریت و ڕۆشنبیری، سەرەڕای بەربەرەکانی کردن و تۆڵە وەرگرتن بەڵام یۆنان ژێر دەستەی عوسمانی بوو تاکو ساڵی ١٨٢٩، لەدوای سەدەی هەژدەم سەرەتای دەرکەوتنی جولانەوەی نیشتیمانی یۆنانیەکان بوو لەوانەی کە کوچبەر بوون لە بازرگانەکان کە بوە هۆی ئەوەی لە ساڵی ١٨١٤ کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی یۆنانی پێك بێنن لە شاری ئۆدیاو بوە هۆی تەقینەوەی شۆڕش دژی تورکەکان لە نیمچە دورگەی بیلۆیۆنیز و بەرپابوونی شەڕ لەپێناوی سەربەخۆیی، لە ساڵی ١٨٢٧ پێك دادانی نافاریتۆ ئەنجام دراو بوە هۆی ئەوەی کە کەشتی ڕوسی و بەریتانی و فەڕەنسی دژی تورك بوەستن و بوە هۆی تێك شکانی کەشتی جەنگی تورك و یۆنان، لەساڵی ١٨٣٠سەربەخۆیی وەرگرت و هەرسێ لە ئەو دەوڵەتانە دانیان بەسەربەخۆیی یۆنان ناو پارێزگاریان لێ کرد.

لە ساڵی ١٨٢٩ تورکیاش دانی نابە سەربەخۆیی یۆنان بەپێی پەیمانی ئەدریانۆیل بەزۆر لێ کردنی لەلایەن ڕوسیا. لە ساڵی ١٨٣٢ هێزە زل هێزەکان دەستنیشانی شانشینی یۆنانیان کرد ئەویش (ئەمیر ئۆتۆ) بوو لە باڤاریا و بوە هۆی کودەتا لە وڵات بەناچار کردنی شانشین بە ڕاگەیاندنی دەستوری ڕژێم لە ساڵی ١٨٦٢ لەلایەن شۆڕشگێڕان و شانشین، ناچارکرا واز لە کورسی بهێنێت و وڵاتی مەزن (جورجی یەکەمیان) کردە شانشین کە دانیمارکی بوو ، لەماوەی ٥٧ ساڵ لەدەسەڵات توانی ئارامی و ئاسایش و دیموکراتی بخاتە ناو وڵات و ئەو زەویانەی کە لەلایەن ئیمپراتۆریەتەکانی ڕۆمان و بیزەنتی و عوسمانیەکان داگیر کرابوو بیگەڕێنێتەوە ژێر سنوری بنەڕەتی یۆنان.

لەشەڕی یەکەمی جیهان یۆنان بەشداری شەڕی کرد لەپاڵ هاوپەیمانان، لە ساڵی ١٩١٩ یۆنان ئاسیای بچوکی داگیر کرد، بەڵام لەو داگیرکردنە سەرنەکەوت و بوە هۆی دەربەدەربوونی زیاتر لە ملیۆنێك کۆچبەر بۆ یۆنان و هەر لەوکاتە ڕژێمی شانشین لەناوبراو ڕژێمی کۆماری ڕاگەیاندرا لە ساڵی ١٩٢٤. لەدوای چەندین کێشەو ململانێی ناوخۆیی لەسەر دەسەڵات و دژایەتی ڕژێمی دکتاتۆری شانشین و شەڕی پارتی زانی کۆمەنیستەکان تاکو ساڵی ١٩٤٦ کە شەڕی ناوخۆیی هەڵگیرسا و ئەمەریکا پشتگیری دۆستەکانی خۆی کردو بوە هۆی ئەوەی کە یۆنان ببێتە ئەندام لە پەیمانی باکوری ئەتلەسی.

لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٨١ پارتی سۆشیالستی هەللینیە سەرکەوتنی بەدەست هێنا بە سەرۆکایەتی (ئەندریاس باباندریۆ) و زۆر گۆڕانکاری لە ڕامیاریەتی ناوەوەو دەرەوەی یۆنان کردو کردیە ئەندام لەیەکێتی ئەوروپای ئێستا بەڵام دوای ئەوە بەهۆی لێك ترازانی دام و دەزگاکانی کارگێڕی وڵات لەدژی تاڵان و بێ ئابووری و بەرەو ڕوخانی باباندریۆ سەرکەوتنەکەی هەرەسی هێنا لە هەڵبژاردنەکان

لەساڵی ١٩٩٠ پارتی دیموکراتی نوێ سەرکەوتنی بەدەست هێنا. دوبارە پارتی سوشیالستی بەسەرۆکایەتی باباندریۆ لەهەڵبژاردنەکان لەمانگی/١٠/ ١٩٩٢ سەرکەوتنی بەدەست هێنا. لە ساڵی ١٩٩٩ گومەلەرزە یۆنانی گرتەوە کە بوە هۆی دەربەدەری زیاتر لە ٦٥ هەزار کەس و کوژرانی ١٤٢ کەس.

دوای ئەوە لێژنەی ئۆڵەمپی دەوڵی یۆنانی دەست نیشان کرد کە لە ساڵی ٢٠٠٤ خانەخێیەتی تۆپی پێ بکات.

- یۆنان ئەندامە لە یەکێتی ئەوروپا، ئەندامە لە پەیمانی باکوری ئەتڵەسی، ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاری بوژانەوەی ئابووری، ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

# ئینگلتەرا

- ناوی ڕەسمی: وڵاتە یەکگرتووەکان. بەریتانیای مەزن ئیرلەندە دەگرێتە خۆی، هەروەها بەریتانیای مەزن ئینگلترا و سکوتلەندا و ویلزیش دەگرێتە خۆی، ڕامیاریەتی بەوە ناسرا لە ساڵی ١٧٠٧ بەریتانیا ئەو دورگەی کە کەوتۆتە باکوری ڕۆژئاوای ئەوروپا و لێی جیا دەکاتەوە لە کەناڵی ئینگلیزی و دەریای باکور، ئیرلەندەی باکور بەشی باکوری ڕۆژهەڵات دەگرێتە خۆی لە دورگەی ئیرلەندە کە کەوتۆتە ڕۆژئاوای دورگەی بەریتانیای مەزن، بەڵام لەکاتی خۆی وولایەتە یەکگرتوەکان لەماوەی ساڵەکانی ١٨٠١ تا ١٩٢٢ هەموو دورگەی ئیرلەندەی گرتبوە خۆی، ناسرابوو بە وولایەتە یەکگرتووەکانی ئینگلترا، لەوانەیە ئێستا ئینگلترا گەورەترین بەشی وڵات بێت.
- پایتەختی: لەندەن ( ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٥٥٠ر٧) ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: بیرمینگهام، لیدز، ، گلاسگۆ، لیڤەرپۆل، برادفۆرد، مانشستر، ئدینبرە.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: لەندەن، لیڤەرپۆل، گلاسگۆ، سوپها مبتۆن، کاردیف، بلفاست.
- ڕووبەری: ٢٠٢ر٩٤ میل چوارگۆشەو ٣٦٨ر٢٤٣ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٨٧٥ر٥٩ ملیۆن کەسە، بەپێی زانیاری ڕۆژنامەکانی ٢٠٠١.
- چڕی دانیشتوانی: ٦٣٦ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٤ر٠٪.
- نژادەکانی: ئینگلیز ٥ر٨١٪ . ئیسکوتلەندی ٦ر٩٪ ، ئیرلەندی ٤ر٢٪، ویلزی ٩ر١٪، ستر ٨ر١٪، لە دوورگەی هیندی ڕۆژئاواو لە هیند و پاکستان ونەوانی تر ٨ر٢٪.
- زمانەکانی: ئینگلیزی، ئیوش، ئیسکوتلەندی، جیلیك لە زمانەکانی سەلتییە کە دانیشتوانی ئیرلەندا و دورگەی مان ئاخاوتنی پێ دەکەن.
- ئایینەکانی: پرۆتستنتی ئنجلیکانی، کاسۆلیکی ڕۆمانی، مەزهەبی مەسیحی تر، ئیسلام، دوو ئایینی هەیە ئەویش (کانتربری، ویۆرك کە هەریەك لەو ئاینانە قەشەیەك سەرۆکایەتیان دەکات ، بەناو بانگترین کەنیسەیان (ونت مینستر)ە ئابی یتوگ شانشینی تیایە، گۆڕی شانیشینەکان و شاعیر و کۆڕەپانی سەربازی نەناسراوی تیایە).

● زانینی نوسین و خوێندن: ٩٩٪ بەناوبانگترین زانکۆی (ئۆکسفۆرد و کمبریدج) کە مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سیانزەهەم، نزیکەی هەفتا زانکۆی تری تیایە.

● دابەشی کارگێڕی: ئینگلتەراو ویلز: ٤٧ هەرێمە + ٧ هەرێمی سەربە پایتەختە، سکوتلەندە ٩ هەرێم و ٣ ناوچەیە، ئیرلەندەی باکور ٢٦ پارچەیە.

● بەرگری: ١٠ر١٢ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.

● سوپاکەی: ٨٠٠ر٢١٥ هەزار کەسە.

● کۆی دەرئەنجانی ناوخۆیی: ٠٠٠ر٢٤٣ر١ ترلیۆن دۆلارە.

● بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر٢١ دۆلارە.

● دراوی: جونەیهی ئیسترلینی یەکسانە بە ١٠٠ بینی.

● زەوی کشتوکاڵی: ٣٠٪ لە خاکی وڵاتەکە.

● بەرهەمی کشتوکاڵی: دانەوێڵە، چەوەندەری شەکر، پەتاتە، تەرە، میوەجات.

● سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٢٩ ملیۆن سەر، چێڵ ٧٥٠ر١١ ملیۆن سەر، بەراز ٥٠٠ر٧ ملیۆن سەر، پەرەور ١٥٥ ملیۆن سەر.

● بەرهەمی کارەبا: ٥٢٠ر٣١٥ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.

● پیشەسازی: پۆڵا، کانزاکان، گالیسکە، دروستکردنی کەشتی، گۆڕینەوەی دراو، ڕستن و چنین، کیمیا، ئەلیکترۆنی، فڕۆکە، ماشێن، دروستکردنی خواردنەوە، داوو دەرمان، شەمەندەفەر، گەلێ شەمکی تر.

● دەرچوەکانی: ماشێن، کەلوپەلی گواستنەوە، کیمیا، ئاسن، پۆڵا، دەرمانی پزیشکی، بەرهەمی ڕستن و چنین، خوری، شەمەندەرفەر، کەشتی، ئامێری کشتوکاڵی، کەلوپەلی زانست، چەك و تەقەمەنی، خواردنەوە، فڕۆکەی نەفاسە، کەلوپەلی دەریاوانی، نەوت، کەلوپەلی دروستکراو.

● داهاتی دەرەوەی: پێداویستیەکانی خواردەمەنی، ئامێر، کەلوپەلی دروستکراو، کەلوپەلی بەکارهێنان.

● هاوبەشەکانی بازرگانی: وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا، ئەمەریکا، وڵاتانی یەکگرتوو شانۆی یەکەم شۆڕشی پیشەسازی بوو لە جیهان لەسەدەی هەژدەم بە بوژانەوەی ئابووری دەستی پێ کردووە و خەڵوزو ئاسنی هەبوە، لەم دواییانە نەوت و غازی سروشتی دۆزرایەوە لە دەریای باکور و بە ڕێژەیەکی زۆر دەردەهێنرێ بەڵام تاکو ئێستاش نەوت و غاز لە دەرەوە دەهێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا وڵاتێکی کشتوکاڵی ڕێکە لە هەموو بوارەکانی کشتوکاڵی بەڵام بەشی نیوەی دانیشتوانی دەکات و لە دەرەوە دەکڕێ بۆ دابین کردنی خۆراك لە ٥٠٪ دەرچوەکانی بەرهەمی کانزاکانە، ١٨ ملیۆن دۆنم لەزەوی کشتوکاڵی هەیە، لە ٨٠٪ داهاتی دەرەوەی لە پەمۆ و مەتان و کبریت دەکڕێ هەروەها لە خوری و کەلوپەلی خۆراك و ئاسنی خاو پەڕو توتن و کیمیاوی هەر لەو کەل و پەلانەش دوبارە کەلوپەلی لێ دروست دەکات و ڕەوانەی دەرەوەی دەکاتەوە.

● ڕژێمی دەسەڵات: ولایەتە یەکگرتوەکان شانشینی دەستووریە، شانشین دەسەڵاتداریەتی وڵات دەکات و پەرلەمانی هەیە کە لە دوو ئەنجومەن پێك هاتووە.

ئەویش ئەنجومەنی لوردات کە ئەنجومەنی بەرزیەتی لە ١١٠٠ ئەندام پێك هاتووەو هەموویان لە کۆبوونەوە ریکەکان بەشداری ناکەن تەنیا ٢٠٠ ئەندام نەبێت و لورداتی دنیای هەیە. ئەو لوردانەی کە میراتی کردنی بە درێژایی ژیانیان هەر بە ئەندام دەمێننەوە، هەندێ لە لوردەکانی تر بە کاروباری فەرمانبەریەتی و کاروباری دارای

خەریکن ، هەروەها ئەنجومەنی لۆردات ئەویش دادگای ئیستئنافی بالآی لە وولاتە یەکگرتووەکان .
بەلام ئەنجومەنی گشتی (ئەنجومەنی خوارەوەیە) پێکهاتوە لە ٦٥٩ ئەندام و بە پێشنیاری گشتی هەڵدەبـژێردرێت بـە دەنگـی زۆرینـە لـە لقـە کارگێرییـەکان کـە بـۆ مـاوەی پێـنج سـاڵ هەلدەبژێردرێن. بەلام دەسەلاتی جێبەجێکردنی بەنـدە بـە ئەنجومـەنی وەزیـران کـە زۆرینـە لەئەنجومەنی گشتی و دەبێ زۆربەی وەزیرەکان ئەنـدام بـن لـە یـەکێك لـەو ئەنجومەنانـە ، بـەر پرسـیاریەتی تـاك و کۆمـەلیان هەیـە بەرامبـەر بەشانـشین و پەرلـەمان ، ئەنجومـەنی وەزیـران پێشنیاری یاسایی دەکات، بەپێی یاسای یەکێتی دەرچوی ساڵی ١٧٠٧ پەرلەمانی ئەسکۆتلەندە تێکـەلاوی پەرلـەمانی ئینـگلترا بـوو، ئێـستا ئـسکوتلەندە ٧١ ئەنـدامی هەیـە لـە ئەنجومـەنی گشتی و وەزیـری کاروباری ئسکوتلەندە ئەندامە لە ئەنجومەنی وەزیران و بەر پرسیارە لە کاروباری ئسکوتلەندە.

- پارتـە رامیاریـەکان: پـارتی پارێزگـاران و یەکێتیـەکان، راسـت رەوی ناوەنـد، پـارتی نیشتیمانی ئسکۆتلەندە، مام ناوەندی چەپ، پـارتی دیمـوکراتی کۆمەلایـەتی، لیبرالیـەکان، پارتی نیشتیمانی ئسکوتلەندە، پارتی سەوز، پارتی کۆمۆنیستی بەریتانی، چەندین پارت و رێکخـراوی نەتـەوەیی و نیشتمانی و کرێکـاری تری هەیە بەئازادانە لە کاروبارو بیرو بۆچونی دەولەت بەشداری دەکەن، پارتی کرێکاران کە ئێستا دەسەلاتدارە لە بەریتانیا.
- ئیرلندای باکور: باری یاسایی. پارچەیەکە لە وولایەتە یەککگرتووەکان و دەکەوێتە مەلبەندی باکوری رۆژهەلاتی دورگەی ئیرلەندا، رووبەری ٤٥٢ر٥ میـل چوارگۆشـە و ١٢١ر٤ کیلۆمـەتر چوارگۆشـەیە. ژمـارەی دانیـشتوانی ٧٧٥ر١ملیۆن کەسە. رژێمی دەسەلاتی بنەرەتی ئیرلەندەی باکور پارچەیەکی رامیاریە لە وولاتە یـەکگرتووەکان، ١٨ ئەنـدامی لـە ئەنجومـەنی گشتی بەریتانی هەیە.

لە ساڵی ١٩٢٠ ئیرلەندەی باکور جیابوەوە لە ئیرلەندای باشوور بە پێی دەرکردنی یاسای بەریتانیا بۆ هەر بەشێك پەرلـەمان و حکومـەتی خۆیـان هەیـە، لەوکاتە ئیرلەنـدەی باشـوور بـوە کۆمـارێکی سـەربەخۆ لـە ٦/٢/ ١٩٢١ بـەلام ئیرلەنـدای بـاکور مایـەوە لـە ژێـر وولاتـە یەکگرتووەکان بە ڕەزامەندی خۆی.

* * * * *

- **دورگەی ئەنگۆلا**: یەکێکە لە دورگەی هیندی رۆژئـاوای سـەر بـە بـەریتانیا و دەکەوێتـە رۆژئاوای سانت کینس. رۆژهەلاتی کاریبی.
- رووبـەری: ٩١ کیلۆمـەترەو ژمـارەی دانیشتوانی ٥٤٥ر٧ هەزار کەسە.
- پایەتەختی: زفیللی، دراوی دۆلاری رۆژهەلاتی کاریبیە.
- زانـسینی خوێنـدن و نوسـین: ٩٧٪.

پیشەسازیەکانی گەشت و گوزار، دروستکردنی کەشتی، خوێ، راوی جورجی دەریا.

* * * * *

- **بەرمۆدا**: بەرمۆدای ئەرخەبیل دورگەیەکە کەلە ٢٦ دورگە پێك هاتوە و دەکەوێتە سەر دووری ٩٣٤ کیلۆمەتر لە رۆژهەلاتی وولایەتی نۆریس کارۆلینا لە رۆژهەلاتی وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، (کربها) دورگەی برمودا (ئۆلـۆمگ ئیلنـد) و خـاوەنی ئۆتۆنۆمیـە، رووبـەری ٥٢ کیلۆمـەتر چوارگۆشـەیە، ژمارەی دانیـشتوانی ٥٧٥ر٦٨٥ هەزار کەسە.
- پایتەختی: هامیلتۆن. دراوی دۆلاری برمودیە.

- زانینی خوێندن و نوسین: ٩٩٪.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: مۆز، تەرە بەهەموو جۆرەکانیەوە، میوەجات، خوێ، بەرهەمی شیری.
- پیشەسازی: بۆیات، کیمیا، داو دەرمان.

* * * * *

- **هەرێمی جەمسەری باشووری بەریتانی**: ئەو هەرێمە پێك هاتووە لە سێ دوورگە ئەویش دوورگەی شتلاندی باشوور و دورگەی ئەرکنی باشوور و زەویەکانی گراهام لە کێشوەری جەمسەری باشوور، زۆربەیان دانیشتوانی تیا نییە و خۆیان لە دورگەی موکلاند دەگرن و نوێنەری سامی بەریتانی دەسەڵاتدارە.
- ڕووبەری: ٣٩٥ر١ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە و دانیشتوانی هەمیشەیی تیا نییە.

* * * * *

- **هەرێمی دەریای هیندی بەریتانی**: بارەگای کارگێڕیە، فکتۆریا لە دورگەی سیشل، ئەو لایەنگیریە لە ساڵی ١٩٦٥ بە ڕێکەوتن لەگەڵ مۆریشیۆسن وسیشل، پێك هاتوو لە ئەرخەبیل شاگوش کۆمەڵێك دورگەی تری بچووك و دانیشتوانی هەمیشەی تیا نییە.

* * * * *

- **دورگەی ڤیرجینی بەریتانی**: نزیکەی ٢٦ دورگەیەو دەکەوێتە دەریای کاریبی لەباکوری ڕۆژهەڵاتی بۆرتریکۆ.
- ڕووبەری: ١٥٢ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٨٦٥ر١٥ هەزار کەسە.
- پایتەختی: رۆد تۆن.

- دراوی: دۆلاری ئەمەریکی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٨٠٠ر١٠ ملیۆن دۆلارە.
- دورگەی کایمان: سێ دورگەیە و دەکەوێتە دوری ٢٩٠ کیلۆمەتر لە باکوری ڕۆژئاوای جامایکا ئەویش لە دورگەی هیندی ڕۆژئاوایە.
- ڕووبەری: ٢٥٩ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٦٥٠ر٣٧ هەزار کەسە.
- پایتەختی: جۆرج تۆن (لە دوورگەی کاریمانی گەورەیە).
- دراوی: دۆلاری دورگەی کایمانە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٨٥٠ ملیۆن دۆلارە.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر٢٣ دۆلارە.

* * * * *

- **دورگەی مۆکلاند**: کۆمەڵێك دورگەن و دانیشتوانی کەمەو دەکەوێتە زەریای ئەتلەسی باشوور بەدووری ٤٠٢ کیلۆمەتر لە ڕۆژهەڵاتی زەویەکانی ئەمەریکای باشوورە.
- ڕووبەری: ١٧٣ر١٢ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٥٦٥ر١٥ هەزار کەسە.
- پایتەختی: ستانلی دەکەوێتە دورگەی فۆکلاندی ڕۆژهەڵات.
- دراوی: جونەی دورگەی مۆکلاندی ڕۆژهەڵات.
- پیشەی سەرەکی: خەریکن بە بەخێوکردنی ئاژەڵ و بەرهەمی خوری و پێست کە سەرچاوەی سەرەکی دەرچووەکانیەتی.
- چیای تاریق: دەکەوێتە لایەنی باشووری نیمچە دورگەی ئیبیریا، کە شاخێکی بەردییە لەناو دەریا، لە دەروازەی ڕۆژئاوای دەریای سپی ناوەراستە، سەرەرای ئەوەش گرنگیەکی

تایبەتی هەیە، بەندەرێکی ئازادە، بنکەیەکی جەنگیە، وێستگەیەکی پیدانی سوتەمەنیە.

● ڕووبەری: ٥ر٨ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
● ژمارەی دانیشتوانی: ٨٥٠ر٣٥ هەزار کەسە.
● دراوی: جونەی چیای تارقە.
● زانینی خوێندن و نوسین: ٩٩٪.
● کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر١٨٥ ملیۆن دۆلارە.

* * * * *

● **دورگەی نیل**: دەکەوێتە دەریای ئیرلەندی، بە دوری یەکسانی لە هەموو ئسکەتلەندەو ئیرلەندە و ئینگتەرا، ماف ئۆتۆنۆمی هەیە، سەرۆکی حکومەتی هەیە کە دامەزراوە لەلایەن تاجی بەریتانی و ئەنجومەنی یاسادانانی هەیە کە یەکێکە لە کۆنترین ئەمجومەنەکانی یاسادانان لەجیهاندا.
● ڕووبەری: ٥٧٢ کیلۆمەتر چوارگۆشە.
● ژمارەی دانیشتوانی: ٧٥٠ر٩٥ هەزار کەسە.
● پایتەختی: دۆگلاس.
● دراوی: جونەی ئیبل.
● دەرچووە سەرەکیەکانی: گۆشتی چێڵ و ماسی و ورچ، چەندین جۆری گیانەوەری تری دەریا.

* * * * *

● **مونت سرات**: یەکێکە لە دورگەی هیندی ڕۆژئاوای سەر بە بەریتانیا، دەکەوێتە ژێر دورگەی ئەنتریلی بچووک.
● ڕووبەری: ٩٨ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
● ژمارەی دانیشتوانی: ٨٢٥ر١٦ هەزار کەسە.
● پایتەختی: بلایمۆس.
● دراوی: دۆلاری ڕۆژهەلاتی کاریبی.
● کۆی دەرئەنجامی ناو خۆیی: ٥٠٠ر٥٥ ملیۆن دۆلار.
● بەشی تاک لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر٤ دۆلار.
● دەرچووەکانی: کەلوپەلی کارەبایی، جانتای پلاستیکی، بیبەر، گیای زیندوو، ڕەشەوولاغ، پەتاتە،پەمۆ، تەماتە.

* * * * *

● **دورگەی بیت گیرن**: دەکەوێتە باشووری دەریای هادی لە نیوەی ڕێگای نێوان ئوستراليا و ئەمەریکای باشووری.
● ڕووبەری: ٥٠٠ر٤ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
● ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٨٥ هەزار کەسە.
● پایتەختی: ئادمزتۆن، حوکمی ژێر دەستەی ئەنجومەنێکی ١٠ ئەندامیە بە سەرۆکایەتی دادوەرێکی دەرگەکەیە کە بۆ ماوەی سێ ساڵ هەڵدەبژێردرێت.

* * * * *

● **دورگەی سانت هیلانە**: دورگەیەکی گرکانیەو دەکەوێتە زەریای ئەتڵەسی باشوور لەسەر دوری ٧٧٠ر١ کیلۆمەتر لە کەناری ئەفریقیای ڕۆژئاوا. بەناوبانگە بە خۆشاردنەوەی ناپلیۆن لە نێوان ساڵەکانی ١٨١٥تا١٨٢١.
● ڕووبەری: ٣١٠ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
● ژمارەی دانیشتوانی: ٨٥٠ر١٠ هەزار کەسە.
● پایتەختی: جیمس تۆن.
● دراوی: جونەی ئیسترلینی.
● جوگرافیای بەریتانیا: ئینگلترا دەکەوێتە بەشی باشووری ڕۆژهەلاتی دورگەکەو ئسکۆتلەندە دەکەوێتە باشووری و گردو بەرزاییەکانی

شیفیۆتی دراوسێیەتی کە جیای دەکاتەوە، لەو گردە بڵندو نەویەکانی بینین کە درێژ دەبێتەوە لە ناوەڕاستی ئینگلترا دەگاتە بەرزایەکانی ناوچەی لیك دیسترکیت بۆ ڕۆژئاوا بە درێژایی سنووری نێوان ئینگلترا و ویڵز کە چیای کامیریان لەوێیە، لەگەڵ ئەوەشدا چیای کۆتس وڵدس کە درێژ دەبێتەوە لە بەشی جلۆستر، بەلاّم ئەوی تری لە باشووری ڕۆژئاوای، ئینگلترا دەشتاییە لە باشوور و باکوری ڕۆژهەلاّتی گردەکانی کیابیە، لە ناوچەی ڕۆژهەلاّتی زلکاوین بەرەو زەویە بە پیتەکان هەلدەکشێ و بەرەو سکۆتلەندە کە دابەشی سێ هەرێمی سروشتی دەکات لە بەرزاییەکان، بەلاّم کەناری ڕۆژئاوای متتخللە فیۆردات درێژیەکەی تەنگە. سکۆتلەندە دورگەی هیربدز و دورگەی ئۆرکنی وشتلاند دەگرێتە خۆی لە باکوردا. لەدوای ئەوانە بەشی سێیەمە ئەویش ویلزە کە لە کۆمەلێك گردو چیای ستونی پێك هاتیە و بەرزترین چیایە لە ئینگلتراو ویلز، لەچیای ویلز زێی زۆری لێ هەلدەقولێت لەوانە زێی (سڤرن) کە درێژترین زێی وولاتەکەیە کە درێژی (٣٥٢ کیلۆمەترە) ئەو زێیە زێی وای پێ دەلێن کە لە کەنالی بریستۆل دەکاتەوەو هەردووکیان بۆ کەشتیوانییەکان بەکەلکن، زێی گرنگی تری لێ یە کە لەدەریای باکور دەکەونەوە ئەویش زێی (تمیز،هەمبر، بیزوالتاین) بەلاّم لە ئیرلەندای باکور دەریاچەی وای هەیە کە گەورەترین دەریاچەیە لە دورگەی بەریتانیا و زێی ئیرینی لێیە. کەش و هەوای دورگەی بەریتانیا زۆربەی مام ناوەندیە لەکەش و هەوای ئەورووپا دەچێت بەهۆی تەزووی کەنداو بارانی زۆری ئەویش زۆر چڕە لە ڕۆژئاواو چیاکانی پلەی گەرمی مام ناوەندیە لە زستان. بە شێوەی گشتی کەش و هەوایەکی خۆش و دلگیری هەیە لە وەرزەکانی سال.

- مێژووی بەریتانیا: دورگەی بەریتانیا پارچەیەك بووە لە کیشوەری ئەورووپا، لە سالی ٦٠٠٠ پێش زاینیو دوایی لێ ی جیابۆتەوە ، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا گەلانی کۆچبەر ماوەیەکی زۆر بەردەوام بون لە ڕێگەی بەندەری ئینگلیزی نزیکەی ٣٠٠٠ سال پێش ئێستا سەلتیەکان ڕویان تێ کردو تاکو ئێستا زمان و داب و نەریتیان پارێزراوە لە لابالی ویلز و جیلیە. هەولی داگیرکردنی لەلایەن ڕۆمانیەکان بەردەوام بووە بەهۆی سەرکەوتنی پەیوەندیان لە نێوان خۆیان و کیشوەری ئەورووپا، لە سالی ٤٢ زاینی ئینگلترا لکاندرا بەئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەدوای کشانەوەی هێزەکانی ڕۆمانی لە وولاّت لە کۆتایەکانی سەدەی پێنجەمی زاینی، هەر لەگەڵ ئەوەشدا ناوچەی بەریتانیا وەك نێچیرێکی بە نرخ بوە لە پێش هۆزە فاشیەکانی ئەلمانیا کە بەرەو ڕووی ئینگلترا دەهاتن ئەویش هۆزەکانی ئینگلیزو سکۆن (ئینگۆسلۆن) بوون لەگەڵ گوتەکان کە حەوت شانشینی گەورەیان لێ دامەزراند. بەریتانیاودۆستەکانی ناچار کران لە ویلز و ئسکۆتلەندە مل کەچ بکەن بەهۆی ئەو شالاّوەو ڕووتێکردنی کۆچبەرانی ولاّتی ئەلمانیا. بەریتانیا نەیتوانی بەککرتووی خۆی ئەنجام بدات تاکو سەدەی دەیەمی زاینی کەلە ژێر دەسەلاّتی شانشینەکانی وسکی بوو لەباشووری ئینگترا لەدوای کۆچی ئدوارد لە سەدەی پانزەو بوە هۆی تۆلە وەرگرتن دوای ئەو هارۆلدی دووەم جێگەی گرتەوە و لەهەمان سال ئەو نۆرمەنێیانەی کە لەناوچەی نورمەندی فەرەنسی ڕوویان لە ناوچەی بەریتانیا کرد بوو بە سەرکردایەتی ویلیەم کە بوە هۆی دەرپەڕاندنی شانشینی (هارۆلدی دووەم) لە سکۆتی لە پێك دادانی هاستینگز لە سالی ١٠٦٦ نورمەندیەکان توانیان یاسای دەرەبەگی

له ئینگلترا بسەلمێنن. له ساڵی ١١٥٤ بنەماڵەی پلانتاگنتی ئینگلیزی دادوەرایەتی وەرگرت لەسەردەمی (شانشینی هنری دووەم) کە یەکەم شانشینی دامەزراند بە دەسەڵاتی شانشینی لەسەر بەرژەوەندی پیاوە خاوەن سامانەکان لە خاوەندیەتی زەوی، لەدوای ئەوە شانشین یوحنا لە ساڵی ١٢١٥ ناچار کرا ڕێکەوتن مۆر بکات بە دانی هەندێ لە مافە جۆراو جۆرەکانی گەل بەتایبەتی خاوەن زەویە زۆرەکان. ئەمە و چەندین کرداری تری دیموکراتی ماوە دان لە دەربڕینی بیرو بۆچوون و ڕێزگرتن لەمافەکانی مرۆڤ کە بوە هۆی ئەوەی شانشین بەرەو دەسەڵاتی دەستوری ببات، لە ساڵی ١٢٦٥ (سیمۆن دی مۆنتفۆرت) داوای یەکەم دانیشتنی پەرلەمانی ئینگلیزی شلت بکات لە نوێنەری شارەکان بۆ بەشداری کردن. شانشین (ئدواردی یەکەم) هەڵسا بە داگیر کردنی ئیرلەندە لە ساڵی ١٣١٤و١٣٧٢ و ویلزی داگیر کردو بەرەو ئسکۆتلەندە هەنگاوی نا بەلام ئسکۆتلەندیەکان توانیان ئەو پەلامارە تێك شکێنن لە شەڕی ستیر لینگ بریدج لە ساڵی ١٢٩٧ و توانیان لە ساڵی ١٣١٤ ئینگلتەرەیەکان لە وڵاتەکەیان دەربکەن، لە ساڵی ١٣٢٨ ئینگترا دانی نا بە سەربەخۆی ئسکۆتلەندە، لە ساڵەکانی کۆتایی سەدەی سیانزەم و سەرەتای سەدەی چواردەم پەرەسەندنی بەدەست هێناو ئەنجومەنی گشتی بەریتانیا دامەزراو دەسەڵاتی کۆکردنەوەی باجی دەرامەتی پێکهات. شانشین ئدواردی سێیەم داوای کرد کە ببێتە شانشین لەسەر فەرەنساو ئەنجامەکەی بوە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی سەد ساڵەی نێوانیان لەساڵی ١٣٢٨ تا ١٤٥٢ کە بوە هۆی لەدەست دانی ئەو زەویانەی کە داگیری کردبوو بەهۆی هەڵاتنی لە شەڕداو بوە هۆی برسیەتی و بێزاری گەلانی ئینگلتراو بڵاوبونەوەی نەخۆشی تاعون کە سێ‌یەکی دانیشتوانی مردن و بوە هۆی شەڕی ناوخۆیی دوور و درێژی نێوان ساڵەکانی ١٤٥٥تا١٤٨٥ بەهۆی کێشەی سەرکورسی لە نێوان بنەماڵەی یورك و بنەماڵەی لانکتر، ئەمەش کۆتایی هات بە سەرکەوتنی هنری نیو دور (هنری حەوتەم)کەبنەماڵەیەکی فراوان و بە هێزی پێك هێناوبوە هۆی بوژانەوەوبەرەو پێش بردنی بواری ئابووری و ئاشتی وئارامی لە بەریتانیاوسەربەخۆیان بۆ ئینگلیز بە دەست هێنالە بواری ئاینی کە لەو کاتە کنێسەی ئینگلترا جیابوەوە لە کنێسەی کاسۆلیکی ڕۆمانی.

لەماوەی ساڵەکانی ١٥٣٦ تا١٥٤٣ چەندین یاسای یەککگرتوو دەرچوو کەبوە هۆی یەککگرتنی ویلز لەگەڵ ئینگلترا بەیەك یاساو یەك پەرلەمان و یەك زمانی ڕەسمی، لەساڵی ١٥٤١ پەرلەمانی ئیرلەندی دانی نا بە هنری هەشتەم بە شانشینی ئینگلیزا و بوونی بە شانشینی ئیرلەندا لە هەمان کاتا، لە ساڵی ١٥٥٧ پڕۆتستەنتیە دامەزراو بوە مەزهەبی دینی لە ئەسکۆتلەندا . لە ساڵی ١٥٥٨ ئلیزابیتی یەکەم دەسەڵاتی وڵاتی گرتە دەست و ئاینی پروتستنتیەی کردە ئاینی ڕەسمی لە وڵات، لەسەردەمی ئەو ئینگلترا بوە هێزێکی دەریای بەهێز تاکو ساڵی ١٦٠٣، بە دامەزراندنی ژێر دەستەی جیهانی نوێ لە کێشوەری ئەمەریکا و پەرەسەندنی بازرگانی لەگەڵ ئەوروپای ڕۆژهەڵات لەدوای مردنی ئلیزابیت لە ساڵی ١٦٠٣ هەردوو تاجەکە یەکیان گرت تاجی ئسکۆتلەندا کە شانشین جیمسی شەشەم حکومڕانی تیا دەکرد لەگەڵ تاجی ئینگلترا کە شانشینەکەی مرد کە مێردی نەکردبوو هیچ کوڕێکی لەدوای خۆی جێ نەهێشت ، (جیمسی شەشەمی شانشینی ئەسکۆتلەندا بوە شانشینی ئینگلتراو ئسکۆتلەندە بە ناوی جیمسی یەکەم لە بنەماڵەی (ستیوارت)بوو حکومڕانی کرد تاکو ساڵی ١٦٢٥، بنەماڵەی ستیوارت بەهۆی قەرزاری زۆری بوە هۆی ئەوەی کە باج لە خەڵك وەربگرێ

له ڕێگەی پەرلەمان بە دەرکردنی یاسای تایبەت بەڵام پەرلەمان ئەوەی ڕەت کردەوە دژی شانشین (تشارلزی یەکەم) وەستان و بوە هۆی ڕاگەیاندنی شەڕ لەسەر پەرلەمان و ململانێ بەردەوام بوو لە نێوان شانشین و پەرلەمان و ئسکۆتلەندە خۆی خستە نێوانیان بوە هۆی بەرپابوونی شۆڕش لە ئیرلەندا بوە هۆی گۆڕینی ململانێکە بۆ شەڕی ناوخۆیی لە ساڵی ١٦٤٢، شانشین تشالز هەڵات، لە ساڵی ١٦٤٩ لە سێدارە درا و ڕژێمی شانشینی هەڵوەشایەوە و ڕژێمی کۆماری ڕاگەیاندرا بە سەرۆکایەتی (ئۆلیفر کرۆمۆل) لە یەکگرتنی (کۆمەنولس) لە ساڵی ١٦٤٩ بوە لێبووردنی ئاینی و بەستنی پەیمان لەگەڵ فەرەنسا دژی ئەسپانیا لە ساڵی ١٦٥٨ ئولیفەر کرمول کۆچی کردو لەدوای ئەو تشارلزی دووەم دەسەڵاتی گرتە دەست و ڕژێمی شانشینی دامەزراندەوە، لە بنەماڵەی (ستیورات) دووبارە کێشە لەگەڵ پەرلەمان سەریهەڵداوە بەڵام جۆن توانی چارەی کێشەکان بکات، شۆڕشی نوێ بەرپابوو لەساڵی ١٦٨٨ ، شانشین دەرکراو دەسەلات کەوتە دەست پەرلەمان و بەڵگەنامەی مافی مرۆڤی دەرکرد لە ساڵی ١٦٨٩. لە ساڵی ١٧٠٧ یاسای یەکگرتن دەر چوو لە نێوان ئینگلترا و ئسکۆتلەندا بەپێك هێنانی شانشینی وڵاتە یەکگرتووەکانی بەریتانیای مەزن لە ژێرحوکمڕانی یەك پەرلەمان. شانشین (ڤان) کۆچی دوایی کرد لە ١٧١٤ و حوکمڕانی وولات بۆ شانشینەکانی هانفۆر لە مۆندیکاریان لە سەر حوکم لێ دەدا ئەنجومەنی وەزیران پێك هات لەلایەن شانشین و سەرۆك وەزیران دانراو کاروباری وولاتیان بەراوێژکاری شانشین دەرکرد بەم جۆرە حکومەت و ئەنجومەنی وەزیران دەرکەوت و حکومەت بوژایەوە لە ژێر دەسەڵاتی ڕۆبرت و بۆل لە ساڵەکانی ١٦٧٦-١٧٥٠کە یەکەم سەرۆك وەزیران بوو لە بەریتانیا، بەڵام لە دەرەوەی وولات شەڕ بەردەوام بوو لەگەڵ فەرەنسا و نیازی داگیرکردنی هەموو جیهانی هەبوو بۆ بەهێزکردنی خاکی بەریتانیا لە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیای مەزن بەتایبەت بەرەو ئەمەریکای باکور و کێشوەری هیندی. بەڵام ئەو فراوانە بوونە بەرپەرچدراوە لەلایەن ڕاپەڕینی گەلانی ژێر دەستەکانی ئەمەریکا بە سەرکەوتنیان لەهەر سیانزە وڵایەتەکە بووە وڵایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەنێوان ساڵەکانی ١٧٧٥-١٧٨١ سەرەڕای لەدەست چوونی ئەو ژێر دەستانە بەڵام هەر بەردەوام بوو لە فراوانکردن لەکەنەداوی هیندو ئوسترالیا. لەدوای شۆڕشی پیشەسازی بەرپابوو لە بەریتانیا تا بووە یەکەم وڵاتی پیشەسازی لە جیهان. لە بەر ئەوە بوە هۆی بەزاندنی شاڵاوی ناپلیۆن پۆناپارت لە ساڵی ١٨١٥و بووە گەورەترین هێزی جیهان لەوکاتەدا.

لە ساڵی ١٨٠٠ یاسای یەکگرتن دەرچوو بە دامەزراندنی شانشینی یەکگرتووی بەریتانیای مەزن و ئیرلەنداش لەژێر دەسەڵاتی یەك پەرلەمان مایەوە دوای ئەوە شانشینی فکتۆریا دەسەڵاتی وەرگرت تا ساڵی ١٩٠١، لە سەردەمی ئەو ناوی نرا بە سەردەمی یاسای فراوان بوونی مافی هەڵبژاردن لە ساڵی ١٨٢٢، لە ساڵی ١٨٤٦ دوو ڕوداو دەرکەوت یەك لەبەرهەڵوەشاندنەوەی کاری داپلوسین ئەمەش بووە هۆی گواستنەوەی دەسەڵات لە دەست خاوەن زەوی بۆ پیاوانی پیشەسازی، دووەم دامەزراندنی پارتی ڕژێمی ناوخۆیی کە تێکۆشا لە پێناو جیاکردنەوەی پەرلەمانی ئیرلەندە لە پەرلەمانی بەریتانی، لە ساڵی ١٩٠٦تا ساڵی ١٩١٤دەسەڵاتی پەرلەمانی لوردات بەهێزکرا. لەمانگی ١٩١٤/٩/ هێزەکانی فەرەنساو بەریتانیا هاوبەش بوون لە بەر پەرچدانەوەی هێزەکانی ئەلمانیا کە بەرەو فەرەنسا دەهاتن، لەمانگی یانزە بەریتانیا شەڕی دژی تورکیا ڕاگەیاند، لە ساڵی ١٩١٧ بەریتانیا بەغدای داگیرکرد لەگەڵ وولاتی فارس، بەریتانیا بەسەرکەوتویی لەشەڕی یەکەمی جیهان دەرچوو

لەدوای کوژران و برینداربوونی زۆر لەهێزەکانی سەربازی. لەدوای ئەوە شەڕ لەنێوان ئینگلیزو ئیرلەندا بەرپابوو لە ساڵی ١٩١٩ و بووە هۆی جیابوونەوەی باشووری ئیرلەندا لە وڵاتە یەکگرتووەکان و بەش بوو بە ئیرلەندەی ئازاد، یەکەم دەسەڵاتی کرێکاری لە بەریتانیا دامەزرا لە ساڵی ١٩٢٤ لەلایەن رمزی ماکدونالد و بووە هۆی خۆپیشاندانی گشتی بەهۆی ئاژاوەی کرێکاران. لە ١٩٣٩/٩/١ بریتانیا و فەرنسا شەڕیان دژی ئەڵمانیا ڕاگەیاند لە دوای داگیرکردنی پۆڵەندا لەلایەن ئەڵمانیا، لە ١٩٣٩/٩/٣ بووە هۆی بەرپابوونی شەڕی جیهانی دووەم لە نێوان ئەڵمانیا ئیتالیا و یابان ئەمە لەلایەك ، لەنێوان بەیتانیا و وڵاتانی کۆمەنولس، فەرنساو (هاوپەیمانان) لەدوای ئەوانەش ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤیەت چونە ڕیزەکانی. لەلاپەڕەکانی پێشوو باسی شەڕی دووەمی جیهان کرایە کە بە چ شێوەیەك بوە.

لەساڵی ١٩٥١ پارتی پارێزگاران لە هەڵبژاردن سەرکەوتن‌و تشرشل حکومەتی پێك هێنا، لە سەرۆکایەتی لە مانگی / ١٩٥٢/٢ شانشین جورجی شەشەم کۆچی دوایی کردو دوای شانشین ئەلیزابیت جێگەی گرتەوە تاکو ئێستاش، بەردەوام بونی کێشەی دەسەڵاتی نێوان پارتی پارێزگاران و کرێکاران لە سەر دەسەڵات تاکو ئێستاش هەر بەردەوامە، بەڵام لەدوای ساڵەکانی ١٩٤٧ وەردە وەردە ئەو وڵاتانەی ژێر دەستەی بەریتانیا بوون سەربەخۆییان وەرگرت و لە ژێر ئیمپراتۆری دەرچوو درا وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە ئێستاش هەموو هەوڵی ئەوە ئەدەن دەسەڵاتی تەواویان هەبێت لەسەر جیهان بە تایبەتی لەدوای کۆتایی هاتنی شەڕی سارد، بۆ یەکەم جار لە مێژووی بەریتانیا مارگرێت تاتشەر لە ١٩٧٩/٥/٣ بووە سەرۆك وەزیران، لەدوا هەڵبژاردنی ١٩٩٧/٥/١ تۆنی بلێر سەرۆکی پارتی کرێکاران دەسەڵاتی سەرۆك وەزیرانی وەرگرت و بۆ جاری دوەم هەڵبژێردرایەوە، بەریتانیا تاکو ئێستاش نەیتوانیوە کێشەی ئیرلەندا چارەسەر بکات. بەریتانیا هاوپەیمانی بنەڕەتی ئەمەریکایە لە هەموو کێشەو ململانێی نێو دەوڵەتی لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بگرە چ لە کێشەی ئیسرائیل و ئێران و یوگسلافیا و ئەفغانستان وەەتا عیراقیش بەنیازی دابەش کردنی جیهانە لە نێوانیان و هاوپەیمانەکان.

لە پاش ئەو مێژوە پڕ لە کێشەو ململانێیەی نێوان وڵاتان‌و کێشەو ململانێی ناوخۆی نێوان پارت‌و گروپە ڕامیاریەکان‌و شانشین بە تایبەتی ململانێی سەردەسەڵات لە نێوان پارتی کرێکاراران‌و پارتی پارێزگاران، لە هەمان کاتا بە هێز بوونی پەیوەندی نێوان ئەمەریکاو بەریتانیا‌و هاوپەیمانەکانیان‌و دوای کارەساتی واشنتۆن‌و نیویۆرك لە ٢٠٠١/٩/١١ و ڕاگەیاندنی بڕیاری شەڕی دژ بە تیرۆر لە جیهانداو پەلاماردانی دەسەلاتی تالبان‌و بن لادن‌و ڕوخاندنیان بەپێك هێنانی حکومەتی کاتی ئەفغانی بە سەرۆکایەتی حمید کارازای، دوای ئەو هێرش کردنە سەر ڕژێمی عێراق‌و سەرکردایەتیەکەی سەدام حسێن لە دوای هەوڵ‌و توانایەکی زۆر لەگەڵ ڕژێمی سەدام حسێن لەدوای کۆتایی هاتنی شەڕی کەنداو ئەمەریکا بە هاوکاری بەریتانیا لە ٢٠٠٣/٣/٢٠ بۆردومانی شارەکانی عێراقیان کرد بە تایبەتی بەغداو بوە هۆی ڕوخاندنی ڕژێمی سەدام لە ٢٠٠٣/٤/٩ هەر لەسەر داواو پێشنیاری ئەو دوو وڵاتە زەبەلاحە حکومەتی کاتی لە ٢٠٠٤/٦/٣٠ دامەزرا.

بەردەوام بوونی هێزەکانی سوپای بەریتانیاو ئەمەریکا لە عێراق بەرگری کردنی یەکەم لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان‌و دووەم بەرگری کردن لە گەلانی عێراق بە تایبەتی کوردو هەولی بەرەو باش بردنی بارو دۆخی عێراق بەردەوامە.

خوێنەری بەڕێز : مـن زۆر بە ڕێکی مێژوی

تاوانەکانی دەسەڵاتی بەریتانیاو ئەمەریکاو ڕووسیای قەیسەری و سەردەمی سۆڤیەت و ئەلمانیاو فەرەنساو هەردوو ئیمپراتۆریەتەکانی تورک و فارس و ئیسلام و چەندین لایەنی بەباشی دیار کردوە لە مێژووی کورد لەگەڵ وڵاتانی کە پێی لکێنراوە بەتایبەتی لە مێژوی کوردستان، بۆیە هەر یەك لەو وڵاتانە پێویست نەبوو ڕووداوەکانی بەسەرهاتی کوردلە لایەن ئەو وڵاتانە دوبارە بکەمەوە بەلام بێ شك هەمووی بەلگەی مێژوویی زیندون لەو وڵاتانەو دەبێ ڕۆژێك بێت خۆی دوبارە کاتەوەو کورد ببێتە خاوەنی دەسەڵاتی خۆی لەسەر خاکی کوردستانی یەکگرتوو لە هەموو بوارە جۆراو جۆرەکان.

- بەریتانیا ئەندامی هەمیشەیی نەتەوە یەکگرتووەکانە، ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە یەکێتی ئەورووپا، ئەندامە لە پەیمانی باکوری ئەتڵەسی، ئەندامە لە ڕێکخراوی بوژانەوەی ئابووری، ئەندامە لە ڕێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپی.

# ئەنـــدۆرا

- ناوی ڕەسمی: ئیمارەتی ئەندۆرا، لە کۆنترین دەوڵەتە کۆنەکانی ئەورووپایە.
- پایتەختی: ئەنـدورا، لافـیلا، ژمارەی دانیشتوانی ٨٥٠ر٢٥ هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ١٧٥ میل چوارگۆشەو ٥٤٣ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٧٧هەزار کەسە.
- چڕی دانیشتوانی: ٤٣٠ کەسە لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- نژادەکانی ئەندۆری ٢٥٪. کۆچبەری ئەسپانی ٧٥٪.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٦ر٥٪.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٩٩٪.
- دراوی: فرنگی فەرەنسی ، بیزیتای ئەسپانی.
- زمانەکانی: زمانی کاتالانی (زمانی ڕەسمیە) فەرەنسی ، ئەسپانی.
- ئاینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی.
- دابەشـــی کـــارگێری: ٧ ئەبریـــشیەیە کەکارگێڕیەکەی لە شێوەی قەزایە.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٥٠٠ر١ ملیـار دۆلارە، ٠٠٠ر١٨٥ هەزاردۆلار بەرهەمی گەشت و گوزاریـەتی بەهۆی وەرزش لەسـەر بـەفر کـە بەنـدەرێکی ئـازادەو بۆتـە هـۆی مەڵبەنـدێکی بازرگانی گورج و گۆڵ، کە دوانزە ملیۆن کەس ساڵانە بۆ گەشت و گوزار ڕووی تێ دەکەن.
- بەشـی تـاك لـەکۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٥٠٠ر٢٨ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢٪ لە خاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، ترێ، پەتاتە، تەرە بە هەموو جۆرەکانی و میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ و بزن وچێڵ بەخێوکردن هەیە بەلام ڕێژەی بەباشی دیار نییە.
- کانزاکانی: قوڕقوشم، ئاسن.
- سامانی سروشتی: وزەی ئاوی، ئاسن.
- دەرچـووەکانی: کارەبـا، بەرهـەمی تـەباق، کەلوپەلی ناوماڵ.
- داهـاتی دەرەوەی: کەلوپـەلی بـەکارهێنان، پێداویـستی خـۆراك، قاچـاغی پیـشەیەکی لەباوە، ماشێن و ئۆتۆمبێل.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەسپانیا، فەرەنسا. لە مـانگی/٦/١٩٩٠ ئەنـدۆرا پـەیمانی لەگـەڵ یەکێتی ئـەورووپا مۆرکرد بە بەشداری کردنی

لەگەڵ یەکێتی گومرگی نێودەوڵەتی و یەکیەتی ئەوروپا کە یەکەم پەیمانی نێودەوڵەتییە مۆربکرێت لەنێوانیان.

- ڕژێمی دەسەڵات: ئیمارەتێکی هاوبەشی پەرلەمانیەو بەشداری ئیماراتەکان لەسەر یا لە لایەن سەرۆك کۆماری فەڕەنسا، ئەو ئیماراتە لەلایەن فەڕەنسا و ئەسپانیا پارێزگاری لێ دەکرێ لە ساڵی ١٢٧٨ تاکو ١٩٩٣ لەوکاتە کە دەنگدەران داوای هەڵوەشاندنەوەی ڕژێمی دەرەبەگیان کرد کە ٧١٥ ساڵی خایاند. لە ساڵی ١٩٩٣ دەستور ڕاگەیاندرا بە بڕیاری هاوبەشی ئەندورای پەرلەمان. سێ دەسەڵاتی لێك جیا کراوەیە کە ئەنجومەنی گشتی سەرۆکی حکومەت دادەمەزرێنێ.
- پارتە ڕامیاریەکان: کۆمەڵەی نیشتیمانی دیموکراتی، پارتی ناوەندی، پارتی دەست پێشخەری نیشتیمانی دیموکراتی، پارتی چەپی ناوەند، پارتی دیموکراتی نوێ، پارتی یەکێتی لیبراڵی، ڕاست ڕەوی ناوەندی.
- جوگرافیای وڵات: ئەندورا دەکەوێتە لوتکە چیاکانی لیرنیز (لەسەر سنوری نێوان فەڕەنساو ئەسپانیا) بەوهۆیە بۆتە جێگەی خۆ خلیسکان لەسەر بەفر، زۆی ڤالیرا هەموو ئاوەکانی ڕووی وڵات ئاودێر دەکات، لەو وڵاتە چەندین دۆڵ و کەندی قوڵ و تەنگی تیایە.. کەش و هەوای ساردو وشکە، زستانی ڕۆژ لە دەرە.
- مێژووی وڵات: ئیمارەتێکی هاوبەشی نیمچە سەربەخۆیەو مافی ئۆتۆنۆمی هەیە، لە ساڵی ١٢٧٨ مل کەچی وڵاتی فەڕەنسایەولەگەل قەشەکانی شاری ئۆرهلی ئەسپانیە. لە ساڵی ١٩٩٠ ڕازی بوو بەچونە ناو پەیمانی یەکێتی گومرگی لەگەڵ ئەوروپا (کە ئێستا ناسراوە لە یەکێتی ئەوروپا).
- ئەندۆرا ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

# ئیرلەندە

- ناوی ڕەسمی: ئیرلەندە.
- پایتەختی: دەبلن، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٢٠٠هەزارکەسە).
- شارە سەرەکیەکانی: کۆرك، لیمریك، ووتر،فۆرد.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: دبلن، کۆرك، گال وای، دەن لۆگ هیر.
- ڕووبەری: ١٣٦ر٢٧ میل چوارگۆشەو ٢٨٠ر٧٠کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر١٥٠ر٤ملیۆن کەسە.
- چڕی دانیشتوانی: ١٥٢کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- نژادەکانی: سەلتیەکان، کەمایەتی ئینگلیزی تیایە.
- زمانەکانی: زمانی ئینگلیزی ، ئیرلەندی (جیلیك) کە هەردووکیان زمانی ڕەسمین.
- ئاینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی ٩٣٪، ئەنجیلکانی کنیسەی ئینگلیزی ٣٪، ئەداتر، ئاینی بچوکی تری تیایە.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٩٩٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٢٦ هەرێمە.
- بەرگری: ٥ر١٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٧٥٠ر١٢ هەزار کەسە.
- دراوی: جونەی.

● کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٦٠ ملیار دۆلار.
● بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١٦ر٨٥٠ دۆلارە.
● زەوی کشتوکاڵی: ٧ر١٤٪ لەخاکی وولاتەکە.
● بەرهەمی کشتوکاڵی: پەتاتە، دانەوێڵە، چەوەندەری شەکر، جۆ، گەنم، تەرەو میوەجات.
● سامانی ئاژەڵی: چێڵ و گامێش ٦ر٥٠٠ ملیۆن سەر، مەڕ ٥ر٨٥٠ ملیۆن سەر، بەراز ١ر٦٠٠ ملیۆن سەر، پەرەوەر ١٢ر١٥٠ ملیۆن سەر.
● سامانی سروشتی: زەنگ (توتیا) قورقوشم، غاز، نەوت، نوحاس، بەردی چەوی، دۆلومیت، زیوو، پۆلا.
● بەرهەمی کارەبا: ١٨ر٩٠٠ ملیار کۆلۆوات کاتژمێر.
● پیشەسازیەکانی: ڕستن و چنین، کیمیاوی، دروستکردنی خۆراك، ماشێن، گەشت و گوزار، خواردنەوە بە هەموو جۆرەکان .
● دەرچووەکانی: چێڵ و گامێش، بەرهەمی شیر، ماشێن، کیمیاوی، کەلوپەلی چارەسەرکردنی ڕونکردنەوەکان (ڕاگەیاندن).
● داهاتی دەرەوەی: خواردەمەنی، کیمیاوی، بەرهەمی نەوت، ماشێن، ڕستن و چنین.
● هاوبەشەکانی بازرگانی: بەریتانیا، وولاتانی ڕۆژئاوای ئەوروپا، ئەمەریکا، چین، یابان، ئەڵمانیا، لەگەڵ چەندین ولاتی تر.
● ڕژێمی دەسەلات: کۆمارێکی پەرلەمانییە، پەرلەمان لە دوو ئەنجومەن پێك هاتوە، ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی پیران. ئەندامەکانی بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێن. ئەنجومەنی نوێنەران لە١٦٦ ئەندام پێك هاتوە بە ڕژێمی ڕێژەیی هەڵدەبژێردرێن، ئەنجومەنی پیران پێك هاتوە لە ٦٠ ئەندام و سەرۆك وەزیران دادەمەزرێنێ، لەوانە ١١ ئەندام وەزیرەکانن، ٦ ئەندام لە زانکۆکانو ٤٣ ئەندامەکەی تر لە سەندیگای پیشەی دادەمەزرێن. بەلام دامەزراندنی سەرۆك وەزیران لەلایەن سەرۆك کۆمار کە بەداوای ئەنجومەنی نوێنەران دیاری دەکرێت و بەرپرسیارە بەرامبەر بە ئەنجومەن.
● پارتە رامیاریەکان: پارتی مام ناوەندی ڕاست ڕەو، پارتی ئیرلەندی یەکگرتوو، پارتی چەپی مام ناوەندی، پارتی کار، پارتی دیموکراتی پێشکەوتوو کە داوای بازاڕی ئازاد دەکا، چەندین بیرو بۆچونی تر هەیە کە هەموو داوای یەکگرتوی ئیرلەندە دەکەن لە پێناوی بەرەو پێش بردنی وولاتەکەیان .
● جوگرافیای ولات: سروشتی سەرەکی لە دەشتێکی ناوەڕاستی فراوان و خاکێکی بەردێنی پێك هاتوە (واتەچەو ) جیاوازی ئەو دەشتاییە بە چەندین دەریاچە و زەلکاوی ماڵی گەورەی تێدایە و لەگەڵ ئەوەشدا گرد و چیای گەورەی تیایە لەوانە چیای ویکلۆکە لە ڕۆژهەلاتە و زێی سەرەکی زێی شنۆنە کە درێژیەکەی ٢٤٠ میلەو درێژترین زێیە لە دورگەی بەریتانی کە هەڵدەقوڵێ لەناوچەی باکورو دێتە خوارێ بەرەو باشوور وباشووری ڕۆژئاواو لە زەریای ئەتڵەسی دەکاتەوە، زێی لیفی و زێی بوینی لێیە. ئیرلەندە دەکەوێتە سەر زەریای ئەتڵەسی لەڕۆژئاوای بەریتانیای مەزن و ڕاستەوخۆ دەریای ئیرلەندی لێکیان جیا دەکاتەوە، ئیرلەندەی باکور دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی.
● مێژووی ولات: هۆزە سەلتیەکان هەڵسان بە داگیرکردنی دورگە کە لە سەدەی چواری پێش زاین و بەرەو بوژانەوە هەنگاوی نا لە بوارەکانی ڕۆشنبیری و داب و نەریتی جیلیەکان و بەرەو فراوانکردن درێژ بوەوە تاکو سکۆتلەندا، لە سەدەی هەشت ئەسکەندەنافیەکان دەستیان کرد بە داگیرکردنی ئیرلەندە بەلام دانیمارکیەکان دەرکران لەلایەن (بریانی بورۆ)

شانشینی ئیرلەندە لە ساڵی ١٠١٤ ، لە سەدەی دوانزەهەم ئینگلیزەکان دەستیان کرد بە داگیر کردنی دورگەکە بۆ ماوەی ٧٠٠ ساڵ بەلام خەباتی ئیرلەندیەکان بێ پسانەوە بوو دژی داگیرکەری ئینگلیزی و ئەم خەباتە بەردەوام بوو تاکو سەدەکانی چواردەو پانزە بە گێرانەوەی زۆربەی خاکی ئیرلەندە لە ژێر دەستی ئینگلیزیەکان هەتا شاری دبلن. لە ساڵی ١٥٣٦ هنری هەشتەم شانشینی ئینگلترا هەوڵی زۆری دا بەلام هەوڵەکانی بێ سوود بوو بۆ ئەوەی چاکسازی ئاینی بکات بە بلاوکردنەوەی برۆتستنت لە ئیرلەندە. لە ساڵی ١٥٤١ پەرلەمانی ئیرلەندە دانی نا بە هنری هەشتەم و بونی بە شانشینی ئیرلەندەو شانشین ماوەی بە هۆزەکان دا بە پلەی دەرەکی خاوەن زەوی و دەسەلاتدار. لە ساڵی ١٥٧٩ ئینگلیزەکان شۆرشی درمۆندیان لەناو بردو زەوی شۆرشگێرەکانیان داگیرکردو کردیە جێنشینی ئینگلیزەکان، لە ساڵی ١٦٩٥ یاسای کەنتانی دەرکرد بە قەدەغەکردنی کاسۆلیك لەسەر خاوەندیەتی سامان و دەسەلات. لە ساڵی ١٧٢٠ یاسای مافی ئیرلەندەی دا کە یاسا دابرێژێت لە رێگەی پەرلەمانی بەریتانی، لە ساڵەکانی ١٧٣٩تا١٧٤١ برسیەتی ئیرلەندی گرتەوە کە بوە هۆی مردنی سێ یەکی خەڵکی ئیرلەندە لە ساڵی ١٧٩٨ بەریتانیا شۆرشی کۆمەڵەی ئیرلەندی لەناوبرد کە بە سەرکردایەتی وولف تون بوو کە فەرەنسا پشتیوانی لێ دەکرد.

لە ساڵی ١٨٠٠ دەرچوونی یاسایەکی تایبەت بە هەڵوەشانەوەی پەرلەمانی ئیرلەندەو دامەزراندنی وولاتی یەکگرتوو لە بەریتانیای مەزن، لە ساڵی ١٨٢٩ دانیال ئۆکۆنل توانی کاسۆلیك رزگار بکات بە دەرکردنی یاسایەك بەیاسای ماوەدانی کاسۆلیك بە چونە ناو پەرلەمان. لە ساڵی ١٩٠٥ ئارثر جریفث جولانەوەی نیشتیمانی دامەزراند بە ناوی (شین فین) کە داوای هەڵسانەوەی ئیرلەندەی دەکرد بەپێی بنەماکانی نیشتیمانی بە جیابوونەوەی رامیاری لە بەریتانیای مەزن. لە ساڵی ١٩١٩ ئەندامانی پەرلەمانی سەر بە جولانەوەی شین فین پەرلەمانێکی ئیرلەندیان پێك هێنا لە دبلن دژی حکومەتی بەریتانیا و لەهەمان کاتدا سوپای کۆماری ئیرلەندە دەستی کرد بە شەری پارتی زانی دژی بەریتانیا. لە ساڵی ١٩٢١ پەیمانی ئەنگلۆ ئیرلەندی مۆرکرا بە دابەش کردنی ئیرلەندە بۆ ئیرلەندی باکور (ئەلزە) کە لە ژێر دەسەلاتی بەریتانیا مایەوە بەلام ئیرلەندی باشوور مافی ئۆتۆنۆمی ناوخۆی تەواوی بە دەست هێنا.

لە ساڵی ١٩٢٢ دەوڵەتی ئیرلەندە ئازادی راگەیاند، سوپای کۆماری ئیرلەندە دابەش بوو بە پێی پەیمانی ئەنگلۆ ئیرلەندی کە بوە هۆی هەڵگیرسانی شەری ناوخۆیی لە ساڵی ١٩٢٢ تا ١٩٢٣، لە ساڵی ١٩٧٣ لە راپرسی گەلی ئیرلەندە بریاری دەستور دراو ناوی وولات کرا ئیرۆ بەدامەزراندنی دەوڵەتی دیموکراتی سەربەخۆو بێ لایەنی خۆی لە جەنگی دووەمی جیهان راگەیاند. لە ١٩٤٨/١٢/٢١ یاسای ئیرلەندە دەرچوو کە کۆماری ئیرلەندە نەك دۆمنیۆن لە کۆمەنولس کە بەریتانیا رەزامەندی خۆی بۆ هەردوو کارەکە دەربری لە ساڵی ١٩٤٩. لە ساڵی ١٩٨٥ ئیرلەندە چوە ناو کۆمەڵەی ئابووری ئەورووپی (یەکێتی ئەورووپای ئێستا) لە ساڵی ١٩٨٥ رێکەوتنی ئەنگلۆ ئیرلەندەی دەرچوو کە کۆماری ئیرلەندە رۆڵی راوێژکاری هەبێت لە دەسەلاتی ئیرلەندەی باکور، بەلام دەسەلاتی تەواوی لەو بارەوە پێ نەدرا. لە ١٩٩٣/١٢/١٥ ئیرلەندە و بەریتانیا رێکەوتن لەسەر نەخشەی فراوان لەپێناو ئاشتی کێە کێشەی ئیرلەندەی

باكور كۆتایی پێ بێت. لە ١٩٩٤/٨/٢١ سوپای ئیرلەندە وەستانی شەڕی ڕاگەیاند بەڵام بێ سود بوو کە بوە هۆی ئاژاوە و پێکدان لە ساڵی ١٩٩٦. لەمانگی /٧/١٩٩٧ دووبارە وەستانی شەڕی ڕاگەیاند و گفتوگۆ دەستی پی کرد.

- ئیرلەندە ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە یەکێتی ئەورووپا، ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاری بوژانەوەی ئابووری، ئەندامە لە ڕێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپی.

# ئیسلەندا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری ئیسلەندا.
- پایتەختی: رکیافیل ، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر١٢٥ هەزار کەسە، هەروەها بەندەرێکی سەرەکیە.
- ڕووبەری: ٧٦٨ر٣٩ میل چوارگۆشەو ٠٠٠ر١٠٣ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە چەند دوورگە دەگرێتە خۆی.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٢٨٥هەزار کەسە.
- چڕی دانیشتوانی: ٩ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر١٪.
- نەژادەکانی: لە ڕەچەڵەکی نەرویجی یە، سەلتیەکان.
- زمانەکانی: ئیسلەندی (زمانی ڕەسمیە) زیاتر لە ١٠٠٠ ساڵ دەبێ ئەو زمانە پارێزراوە بە پاك و خاوێنی.
- ئاینەکانی: لوتەری ئنجیلکی.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٩٩٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٢٣ ناوچە + ١٤ شاری سەربەخۆ.
- بەرگری: هێزێکی ئەمریکی پارێزگاریان دەکات.
- دراوی: کرونا.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٨٥٠ر٥ ملیۆن دۆلارە.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر٢١ هەزار دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر١٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: پەتاتە، کرنب، چەندین جۆری تر لە تەڕو میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٠٠٠ر٤٦٥ هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر٢٥٠ هەزار سەر، چێڵ ٠٠٠ر١٢٥ هەزار سەر، ٧٥٠ر١ ملیۆن تەن بەرهەمی ماسی هەیە لە ڕێگەی ڕاو کردنو ئامادەکردنی لە قوتیدا.
- سامانی سروشتی: ماسی، وزەی کارەبا، وزەی پلەی گەرمی زەوی.
- بەرهەمی کارەبا: ٦٠٠ر٥ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازی: دروستکردنی ئەلەمنیۆم، دروستکردنی قوتی ماسی.
- دەرچووەکانی: ماسی و بەرهەمی ماسی، بەرهەمی ئاژەڵی، ئەلەمنیۆم، فرۆسلیکۆن، دیاتۆمیت.
- داهاتی دەرەوەی: بەرهەمی نەوت، ماشێن و کەلوپەل، ئۆتۆمبێل، خواردەمەنی، بەرهەمی ڕستن و چنین.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: وڵاتانی یەکێتی

ئەورووپا، رایەڵەی وڵاتانی ئەورووپی بۆ بازرگانی ئازاد، ئەمەریکا، یابان، چین، دانیمارك .. دانیشتوانی ئیسلەندە زۆربەیان بە بازرگانی خەریکن کە ٦٠٪ ئەمەش سەرچاوەی سەرەکی دەرامەتی وڵاتەکەیە.

- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی دەستورییە، گەل سەرۆك کۆمار هەڵدەبژێرێت بۆ ماوەی پێنج ساڵ، دەسەڵاتی جێبەجێکردنی بەندە بە سەرۆك وەزیران و ئەنجومەنی وەزیران، بەڵام پەرلەمان کە ناوی (ئیپینك) ە پێك هاتوە لە ٦٣ ئەندام کە کۆنترین پەرلەمانە لە جیهان.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی سەربەخۆ، ڕاست ڕەوی ناوەندی، پارتی دیموکراتی کۆمەڵایەتی مام ناوەندی، پارتی جەماوەری، پارتی ئافرەتان، چەندین بیرو بۆچونی تر هەیە لە ڕووی ڕامیاری و ئابووری و دیموکراتی و ئافرەتان و نەتەوەی و دادپەروەری.
- جوگرافیای وڵات: ئیسلەندە دەکەوێتە لایەنی باکوری زەریای ئەتڵەسی لەڕۆژهەڵاتی دورگەی گریلانەدە، بازنەی جەمسەری باکور پێوەی نوساوە، یەکێکە لە ناوچەکانی گرکانی جیهان، نزیکترین دراوسێی دورگەی گرنلاندە لەبەردواوەی، دانیمارك لە ڕۆژئاوا، سێ چارەگی زەویەکەی خراپەو بونی زۆی بەفری هەیە کە بەستنی بەردەوامە، دەریاچەی بیابانی گرکانی تیایە وهەروەها دورگەی بچوکی تیایە کە ئاوەکەی ناسازن، چەندین کانیاوی گەرمی تیایە لەگەڵ باران بارین و پارچە کبریت و زۆی تیژ و لە ٧٪ دانیشتوانی لە کەنارە بەپیتەکانی دەژین.
- مێژووی وڵات: یەکەم نیشتەجێکان لە ئەسکەندە ناویەکانن کە ٩٠٠ ساڵ پێش ئێستا ڕویان تێ کردووە، لە ساڵی ٩٣٠ دەستوریان دارشتووە بۆ خۆیان ئەویش بە شێوەیەك بوە لە دیموکراتیەت و ئەنجومەنی بۆ دامەزراوە بە پێی دەستورەکە بە ناوی (پینك)، لە ساڵی ١٢٦٤ ئیسلەندە کەوتە ژێر دەسەڵاتی نەرویج و دوای کەوتە ژێر دەسەڵاتی دانیمارك، لە ساڵی ١٤٨٣، ئیسلەندیەکان لە ساڵی ١٨٧٦ بونە خاوەن دەستوری تایبەتی خۆیان و لە ساڵی ١٩١٨ دانیمارك دانی بە ئیسلەندە نا بە بوونی دەوڵەتی سەربەخۆیی بێ کەمو کوڕی، بەڵام هەر بەناو لە ژێر ئامۆژگاری دانیمارك مایەوە.

لە ١٩٤٤/٦/١٧ لە ڕێگەی ڕاپرسی گەل ئەنجومەنی پینكو کۆماری سەربەخۆی ئیسلەندە ڕاگەیاندرا، لە ساڵی ١٩٤٩ ئسلەندە چوە ناو ڕێکخراوی پەیانی باکوری ئەتڵەسی، لە ساڵی ١٩٧٢ ئیسلەندە بەیەك لایەنە سنوری دەریای لە هەرێمەکەی کردە ٥٠ میل بۆ دەریاوانی لە جیاتی ١٢ میل. کە بوە هۆی کێشە لەگەڵ بەریتانیاو لە ساڵی ١٩٩٥ حکومەتێکی فیدرالی لە پارتی سەربەخۆیی و پارتی پێشکەوتن پێکهێندرا.

- ئیسلەندە ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە پەیمانی باکوری ئەتڵەسی، ئەندامە لە ڕێکخراوی بوژانەوەی ئابوری، ئەندامە لە ڕێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپی، ئەندامە لە ڕابتەی بازرگانی ئازادی ئەورووپی.

# کێشوەری ئەفەریقیا

# بابوانیوگینیا

- ناوی رەسمی: وولاتی بابوانیوگینیای سەربەخۆ.
- پایتەختی: بۆرت مۆرزبی، ژمارەی دانیشتوانی (٢٠٨ر٠٠٠) هەزار کەسە.
- شارە گرنگەکانی: لاری، مادانج.
- بەندەرەکانی: رابوول.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٤ر٦٤٠ر٠٠٠ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- رووبەری: ١٨٧ر٧٠٣ میل چوار گۆشە و٤٦٢ر٨٤٠ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە.
- چڕی دانیشتوانی: ٢٦ کەس لە یەك میل چوار گۆشە.
- نـژادەکانی: بـابوان (لەباشـوورو ناوخۆیـە) میلانیزیا لە باکورو رۆژهەلات .
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢٪.
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی رەسمیە) زاراوەی نیشتمانی تری تیایە.
- ئایینـەکانی: پرۆتـستنتات ٤٣٪، کاسـۆلیك ٢٣٪، ئایینی ناوخۆیی ٣٤٪.
- دابەشی کارگێری: ٢٠ پارێزگایە.
- بەگری: ٣ر٨٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٣٥ر٨٠٠ کارمەندی چەك داریە.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٧٥٪.
- دراوی: کیتا یەکسانە بە ١٠٠ تویا.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ١١ر٨٧٠ ملیـار دۆلار.
- بەشـی تـاك لـە کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ٣ر٠٠٠ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: زەوی کشتوکاڵی زۆر کەمە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: قاوە، کاکلەی گیز، زەیتی دار، کەکاو، چای، گیزی هینـدی، گەنمو جۆ، گولە بەڕۆژە، تەڕمو میوەجات.
- سـامانی ئـاژەڵی: بـەراز ١ر٥٠٠ ملیـۆن سـەر، ئاژەڵی تری وەك مەڕو بزن و چێڵی هەیە بەڵام بەرێژەیەکی زۆر کەم.
- سـامانی سروشـتی: زێـر، نوحـاس، زیـوو، مەتات، دار، گازی سروشتی.
- بەرهـەمی کارەبـا: ١ر٩٥٠ ملیـار کیلـۆ وات کاتژمێر.
- داهـاتی دەرەوەی: خـۆراك، ماشـێن، کەلوپـەلی گواستنەوە، سوتەمەنی، کیمیاوی، کەلوپـەلی بەکار هێنان.
- دەرچوەکانی: زێڕ، نوحاس، قاوە، زەیت، گیزی هیندی، بەرهەمی دار.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئوستراليا، بەریتانیا، یابـان، سـنگافورا، نیوزیلەنـدە، ئەمـەریکا، کۆریای باشوور.
- رژێمی دەسـەڵات: سـەرۆکی دەوڵـەت (شـانشین ئەلیزابیتی دووەمی شانشینی بەریتانیایـە) کە دادوەرێکـی گـشتی نوێنەرایـەتی دەکـات لەووڵاتەکـە. بـابوا نیوگینیـا سـەربەخۆی لـە ١٦/٩/ ١٩٧٥ وەرگـرت لـە دوای سـەربەخۆی حکومەتێکی دیموکراتی پەرلـەمانی دەستوری تێدا بەرقەرار بوو بە دەسەڵاتی نیشتمانی کە لە ئەنجومەنێکی یاسا دانـان پێك هـاتوە لـە ١٠٩ ئەندام.
- پارتـە رامیاریـەکان: پـارتی بابوانیوگینیـا، بزوتنـەوەی گـەلی دیمـوکراتی، پـارتی نیشتمانی، پارێزگـارن کەبنکـەی لـە چیاکانە، هاو پەیمان ومیلانیزی کە لایەنگیری ئۆتۆنۆمی دەکـات، پـارتی پێـشکەوتنی میللـی، پـارتی راسترەوی ناوەندی، چەندین پارتو گروپی تری چەپ رەوو نیشتمانی تیایە.
- جوگرافیـای ووڵات: بابوانیوگینیـا دەکەوێتـە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا وباکوری ئوستراليا راستەوخۆ.

ئەندەنۆسـیا (ئیریـانی رۆژئـاوا) لـە رۆژئـاوا، ئوسـترالیا لـە باشـوور، چـەندین دورگـە دەگرێتـە خۆی، کۆمەڵەی (سلێمان) وەك دورگـەی مـانۆس، نیوبریتون، نیوئیرلاندا بۆجنگیل، رووی وولات بە چیای زۆرو پـڕ لەدارسـتانی چـڕ داپۆشـراوە لـە ناوەراست لەکەناری خاکی ئەوییای هەیە لەگەڵ ئەوەشدا دوو زێی سەرەکی هەیە وەك زێی سیپك وفـلای کـە هـەردوکیان بـۆ کـاری دەریـاوانی بەسـودن، دۆڵ وکەنـدی زۆری تێدایـە. کـەش وهەوایەکی مام ناوەندی هەیە لە گردو لکەکانی بەلام لەکەنارەکان و دەشتایی کەش وهەوای هێلی کەمەرەییە لەوەرزکان.

• مێژووی وولات: دەریاوانی پورتوگالی (جۆرج دل منزیـسی) لـە سـاڵی ١٥٢٦ سـەردانی ئـەو دورگەیـەی کـردو نـاوی نـا (بـابوا)، لـە سـاڵی ١٥٤٥ دەریـاوانی ئەسپانی (ئـورتیز دی دیـتـز) نـاوی نـا (بابوانیوگینیـای) نـویّ بـە هـۆی لێـك چونی. لەسەدەی هەڤدەم سەرانی بازرگانەکانی هۆڵەندی بەردەوام بوون بۆ بەرەو دورگەکە بەلام خاوەندیـەتی پاوەند بوو تاکو سەدەی نۆزدەم کـە لەوکاتـە هۆڵەندیـەکان دەسـەلاتیان بەسـەر نیوەی رۆژئاوای دورگە کە داگرتبوو خستیانە ژێـر کۆمپانیـای هینـدی رۆژهـەلات وهۆلەندی و خاوەندیەتی لە ئەندەنۆسیا.

بەلام نیوەی دورگەکـەی رۆژهـەلات کـە بەناوی بابوانیوگینیا بوو، ئەڵمانیا بەشی باکوری خستە ژێر کۆنترۆڵی خـۆی بەریتانیاش بەشـی باشوری خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆی لە ساڵی ١٨٨٤.

لــە سـاڵی ١٩٠٦ بــەریتانیا خاوەندیــەتی یەکەمی گواستەوە بۆ ئوسترالیا کە ناوزەند کرا بەناوی (بابوا)، لەساڵی ١٩١٤ لەو کاتە جـەنگی یەکـەمی جیهـان دەسـتی پێکـرد ئوسـترالیا هەڵـسا بـەداگیر کردنـی بەشـەکەی تری بە ناوی بابوانیوگینیا بە نـاوی (گینیـای نویّ) کـە ئـەڵمانیا خـستبویە ژێـر دەسـەلاتی خۆی ئەمەش بـوە هـۆی یەکخـستنی هـەردوو بەشەکەو بوە دەوڵەتی بابوانیوگینیا.

لە ماوەی ١٩٢٠ تاکو ١٩٤٢ لە ژێـر ئینتـدابی ئوسـترالی دابـو بـەبریاری کۆمەڵـەی گـەلان، دوای ئـەوە کەوتـە ژێـر داگـیر کردنـی یابـان لـە نێـوان ساڵەکانی ١٩٤٢ تـاکو ١٩٤٥، دووبـار چـوە ژێـر ئامۆژگاری ئوسترالیا، لـە سـاڵی ١٩٤٧ بە بریـاری نەتەوە یەکگرتوەکان، لە ساڵی ١٩٦٤ ئەنجومـەنی یاسـا دانـان هەڵبـژێردرا، لەسـاڵی ١٩٦٧ پـارتی بـابوخوا دامـەزرا کـە داوای دەسـەلاتی نـاوخۆی دەکرد، لـە١٥/٩/١٩٧٥ سـەربەخۆی لـە ئوسـترالیا وەرگـرت کـە مایکل سۆمار لە پـارتی بـابخوا بـوە سەرۆك وەزیران.

لەســـاڵی ١٩٨٠ ســـیرجۆلیۆس پۆســـتی ســـەرۆکایەتی وەزیرانـــی وەرگـــرت لـــە پـــارتی پێـشکەوتنی گـەڵ بـەلام سـۆمار گـەراوە سـەر دەســـەلات لـــە ســـاڵی ١٩٨٢ لـــە دوای ئـــەوە بزوتنـەوەی دیمـوکراتی میللـی پێـك هێنـا دژی جێگرەکەی و بوە سەرۆکی حکومەتی ئینتلافی کە لـەپێنج پـارت پێـك هـاتبوو. لـە سـاڵی ١٩٨٩ جولانـەوەی سـەربەخۆی دەرکـەوت لـە دورگـەی بۆجنفیـل کـە بـەنوحاس دەوڵەمەنـدەو بـوە هـۆی راگەیانـدنی کـاتی ناکـاوی. بـەلام سـوپای بـۆ جنفیلـی شورشـگێر سـەربەخۆی لـە سـاڵی ١٩٩٠ بەیەك لایەنا راگەیاند.

لە ساڵی ١٩٩١ وولات بەرو بوژانـەوە هـەنگاوی نـا بـەهۆی دۆزینـەوەی زێـر هـەنگاوی نـا کـاوی دەماویـشت بەلام لـە سـاڵی ١٩٩٤ یـاخی بوەکـان بـەهۆی پـەلاماری سـوپای حکومـەت توانیـان ناوچەکە بگەرێنەوە ژێر دەسەلاتی خۆیان

• بابوانیوگینیا ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتوەکان.

# ئەفەریقیای باشوری

- ناوی رەسمی: کۆماری باشووری ئەفەریقیا.
- پایتەختی: شاری کاپ پایتەختی یاساییە کە ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٠٥٧ر٢ ملیۆن کەسە، شاری بریتۆریا پایتەختی کار گێریە کە ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٣٩٠ر١ ملیۆن کەسە ، شاری بلومن فۆتین پایتەختی قەزائیە.
- شارە سەرەکیەکانی: خۆهاسبۆرگە.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: دیربان، بورت ئەلیزابیت، ئیستلەندی،
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٨٧٥ر٤٥ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری بلاوکراوە لەرۆژمەکانی ٢٠٠٣.
- رووبەری: ٤٤٤ر٤٧١ میل چوار گۆشەیەو ٤٢٠ر٢١٠ر١٢ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- چڕی دانیشتوانی: ٩٧کەس لە یەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی:٥ر٢٪.
- نژادەکانی: رەش پێست ٧٥٪، سپی پێست ١٤٪ رەنگاو رەنگەکان ٩٪.
- زمانەکانی: ١١ زمانی رسمیە لەگەڵ ئەوەشدا زمانی ئەفەریقیا، ئینگلیزی، ئەلهلوسا، ئەلزولو، سیزۆتۆ.
- ئایینەکانی: مەسیحی (کەنیسەی هۆڵەندی) ٦٨٪، هندۆس، ئیسلام ٢٥٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٨٥٪.
- دابەشی کارگێری: ٩ ناوچەی پارێزگایی هەرێمە.
- بەرگری: ٥ر٧٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر٨٥ هەزار کەسە.
- دراوی: راند یەکسانە بە ١٠٠ سەنت.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر٢٧١ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر٦ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ١٢٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، چەوەندەری شەکر، گەنمە شامی، لۆکە، تەرە، میوەجات، چەندین جۆر لەدانەویلەی تر.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٥٠٠ر٢١ ملیۆن سەر، بزن ٨٠٠ر٧ ملیۆن سەر، بەراز ٨٠٠ر١ ملیۆن سەر، پەرەور ٠٠٠ر٦٤ ملیۆن سەر، چێڵو گامێش ١٠٠ر١٤ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: ئەفەریقیا گەورەترین وڵاتە لەبەرهەمی زێڕ کەلە٣٠٪ داهاتی لە زێرە. پلاتینیۆم، فۆسفات، خەلوز، ئاسن، قورقوشم، یۆرانیوم ئەڵماس، فانادیۆم. لەگەڵ گەڵێ سامانی تری سروشتی.
- پیشەسازی: دروستکردنی ئاسن، رەقی، کیمیاوی، ماشێن، ئامێری رستن وچنین، زێر، ئەڵماس، کروم، خوری، خۆشکردنی پێست، شیر.
- بەرهەمی کارەبا: ١٠٠ر١٩٨ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: پارچەکانی ئۆتومبیل، ماشێن، کەلوپەلی کیمیاوی، کەلوپەلی زانستی.
- دەرچوەکانی: زێر ،ئەڵماس، ئاسنی خاو، خۆراك، کیمیاوی، خوری، پێست، بەرهەمەکانی شیر، گۆشت، ئاژەڵی زیندوو.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، یەکێتی ئەورویا، ئەڵمانیا، یابان، هۆنگ کۆنگ، کینیا، چەندین وڵاتی عەرەبی جگە لەووڵاتی

ئەفەریقی.

- پارتە رامیاریەکان: پارتی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی، چەپی ناوەند، پارتی نیشتمانی، راست رەوی ناوەند، پارتی ئینای ئازاد، پارتی دیموکراتی، پارتی کۆنگرەی هەموو ئەفریقیا، پارتی پێست رەش، پارتی دیموکراتی مەسیحی ئەفریقی، چەندین پارت وگرووپی تری نەتەوەی ونیشتمانی ودیموکراتی تیایە.
- رژێمی دەسەلات: لە ساڵی ١٩٩٦ دەستوری نوێی وولات بریار درا کە لەساڵی ١٩٩٧ کەوتە کار پێکردن، ئەنجومەنی یاسادانانی دوولایەنەیە ئەویش لەئەنجومەنی نوەو ئەنجومەنی نیشتمانی هەرێمەکانی (پێشتر ئەنجومەنی پیران بووە) هەڵبژاردنی ئەنکجومەنی نومە بە پێشنیاری گشتی دەبێت بە رێکخستنی رێژەی، کە ژمارەی کروسیەکانی لە نێوان ٣٥٠تا ٤٠٠ کورسی دەبێت، بەلام ئەنجومەنی نیشتمانی لە هەرێمەکان پێك دێت لە ٩٠ ئەندام کە شەش ئەندام هەمیشەین و چوار نوێنەری تایبەت لە هەموو ئەنجومەنی یاسادانان لەئەنجومەنی نۆ هەرێمەکان. سەرۆك کۆمار ئەنجومەنی نومە هەڵیدەبژێرێت لە نێوان ئەندامەکانی لەلایەن جێبەجێکردن دەبێت بەراوێژکردن لەگەڵ ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران. هەر پارتێك هەشت کورسی هەیە لە ئەنجومەنی نومە کە دەبێ جێگرەکەی بۆ خۆی هەڵبژێری. لەساڵی ١٩٩٩ زایو مبیکی بوە سەرۆك کۆمار، هەر پارتێك ٣٠ ئەندامی هەیە لە ئەنجومەنی نومە، هەر هەرێمێکی وولات ئەنجومەنێکی یاسادانانی هەیە کە سەرۆکی ئەنجومەنی جێبەجێکردن هەڵدەبژێرێ.
- جوگرافیای باشووری ئەفەریقیا: دەکەوێتە ئەوپەری باشووری کیشوەری ئەفریقیا، دەریای ئەتلەسی دەروی داوە، لە لای رۆژئاوای زەریای هادی لە باشووری و رۆژهەلات. نامیبیا لەباکووری رۆژ ئاوای، زیمبابۆو بۆتسوانا لە باکوری، مۆزەمبیق وسوویزلەندا لە باکوری رۆژهەلاتی، شانشینی لیزۆتۆکجیب کەوتۆتە بەشی باشووری رۆژهەلاتی کۆماری باشووری ئەفریقیا، لەناو وولاتەکە گردۆلکەی بەرز هەیە کە پرە لەدارستان، ئەویش کە کەنارەکانی جومقی مەزن لە یەکیان جیا دەکاتەوە لەرۆژهەلاتی چیای دەرکن سبیرج، زێی سەرەکی ئورانجە، کەش وهەوای فێنکە لە زۆر کاتا، لە رۆژئاوا وشکانیە، لەباشوورو رۆژهەلات بارانی لێدەبارێت بەکەمی.
- مێژووی باشووری ئەفەریقیا: تیرەکانی هینتۆن دانیشتوانی رەشی ئەم وولاتەبوون کە لە ناوچە دارستانەکان نیشتەجێ بوون، پێش سەدەی هەڤدەم تیرەکانی (زولۆو هوساو وازیو سوتۆ) کە ناسرابوون بە بانتۆ لە ناوچەی باکووری رۆژهەلات تاکو باشووریان داگیر کردبوو.

لە ساڵی ١٦٥٢ کۆمپانیای هیندی رۆژهەلاتی هۆلەندی گەیشتنە ئەو ناوچەیەو توانیان رۆڵی گرنگی خۆیان تێدا بگێرنو دەسەلاتی خۆیان تێدا زیاد بکەن ئەوانیش هەوڵیان دا بە دامەزراندنی کۆمارێکی سەربەخۆ لەناوچەی (کاب) کە ناسرابوو بە ناوی (بوێریان ئەمزیکانزیون کە زمانی هۆلەندیان دەزانی) لە ساڵی ١٨٠٦ بەریتانیەکان ژێر دەستەکەی کامبیان داگیر کردو کردیانە ناوەندیەتی هەمیشەی خۆیان، لە ساڵی ١٨١٤ لە دوای جەنگی ناپلۆنیەکان کە پێنج هەزار نیشتە جێی نوێ نیشتەجێبوون بوونە حکومەتی ئینگلیزی وکۆیلەکان رۆزگار کران لە ساڵی ١٨٣٣ ، دوای ئەوە هۆلەندیەکانیان کۆچ پێکردن لەلایەن دانیشتوانی باکوری رۆژهەلات بۆ قولای وولات، تیرە ئەفریقیەکان کۆماری ترانسخالیان پێك هێنا لەگەڵ دەوڵەتی ئورانجی ئازاد.

لە ساڵی ١٨٤٣ بەریتانیا ژێر دەستەی ناتالی

دروستکرد لەسەر کەناری ڕۆژهەڵاتی، لەساڵی ١٨٥٢تا ١٨٥٤ بەریتانیا دانی نا بەکۆمارەکانی بوێرو ترانسڤال و دەوڵەتی ئۆرانجی ئازاد، لەساڵی ١٨٧٢ ژێر دەستەی کایەبوە خاوەنی ئۆتۆنۆمی لەناو ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا، بەڵام لەساڵی ١٨٧٧ بەریتانیا کۆماری تراسنڤالی لکاندە خۆی، لە ساڵی ١٨٧٦ شەری زوالوا هەڵگیرسا کە گەلی ناتالی پێ دەگوترا بەڵام بەریتانیا توانی لەناوی ببات، دوای ئەوە لە ساڵی ١٨٨١ جەنگی بوێری یەکەم هەڵگیرسا بوە هۆی بەزاندنی هێزەکانی بەریتانیا و سەبەرخۆیان گێراوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان.

لەساڵی ١٨٦٧ زێرو ئەڵماس دۆزرایەوە ئەمەش بوەهۆی بەرزبونەوەی ئاستی ئابوری ئەم وڵاتە بەرامبەر بەجیهان و گۆڕینی باری ژیان ودروست بوونی بازرگانی.

لە ساڵی ١٩٠٧ بەریتانیا دانی نابەماف ئۆتۆنۆمی بۆ هەردوو دەوڵەت بوێر (ترانسڤال وئۆرانج) بە ماف هەڵبژاردن تەنیا بۆ سپی پێستەکان کە ئەمەش بوە سەرەتای دەست پێکردنی رامیاریەتی شۆڤێنی و رەگەز پەرستی لەوکێشوەرە.

لە ٣١/٥/ ١٩١٠ سەربەخۆیی وەرگرت و لەهەمان کاتا پارتی نیشتمانی دامەزرا کە زمان حالی تیرەی بوێر بوو لەهەمان کاتا پارتی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بۆ بەرگری لە ماف زۆرینەی پێست رەشەکان دامەزرا، لەجەنگی یەکەمی جیهان هێزەکانی باشووری ئەفریقیا لەریزەکانی سوپای بەریتانی جەنگا دژی شەر، لەساڵی ١٩١٩ باشووری رۆژئاوای ئەفریقیا کە ناسرابوو بەناوی نامیبیا کەوتە ژێر ئینتدابی باشووری ئەفریقیا.

لە ساڵی ١٩٢٤ (هیرتزویج) سەرۆکی پارتی نیشتمانی بوێری سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی وەرگرت. ئەویش بەئامانجی زیاد کردنی دژایەتی رەگەز پەرستی و کەم کردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا.

لەجەنگی دووەمی جیهان سوپای باشووری ئەفریقیا لەتەك سوپای هاوپەیمانان بەشداری جەنگی کرد لە رۆژهەڵاتی ناوەراست ورۆژهەڵاتی ئەفریقیاو ئیتاڵیا بەوهۆیە باشوری ئەفریقیا بوە یەکێك لەدامەزرێنەری نەتەوە یەکگرتوەکان لە ساڵی ١٩٤٥، بەڵام مۆرکردنی لەسەر ماف مرۆڤی رەش کردوەکە کۆمەڵەی گشتی نەتەوەیەکگرتوەکان دایرشتبوو لە ساڵی ١٩٤٨.

لە ساڵی ١٩٤٨ پارتی نیشتمانی بوێر دەسەڵاتی گرتە دەست کە پارتی سپی پێستەکان بوو بوە هۆی دەسەڵات وەرگرتنی یەك لە دوای یەکی سپی پێستەکان و بوە هۆی توند کردنی رامیاریەتی رەگەز پەرستی بەرامبەر رەش پێستەکان (پانتۆ)، لەساڵی ١٩٩٤ ئەمەش مێژووی کارکردن بوو بەدەستووری نوێی باشووری ئەفریقیابە هەڵوەشاندنەوەی جیاوازی رەگەزەو رەگەز پەرستی، لەهەڵبژاردنەکانی ١٩٩٤ پارتی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بە زۆرینەی ٦٢٪ دەنگ سەرکەوتنی بەدەست هێناو پارتی نیشتمانی ٢٠٪ی دەنگ وپارتی ئەنکاتای ئازاد ٥ر١٠٪ی دەنگ، پارتی کۆنگرەی نیشتمانی بەسەرۆکایەتی نلسۆن ماندیلا زۆرینەی کورسی بەدەست هێنا لە پەرلەمان و بوە هۆی رەشکردنەوەی ئاسەواری رەگەز پەرستی و جیاوازی رەگەز، سەرکردەی لێهاتوو تێکۆشەر نیلسۆن ماندیلا بوە سەرۆکی وڵاتەکەو بوە هۆی گێرانەوەی باشووری ئەفریقیا بۆ کۆمەنولسی بەریتانیا.

لەهەڵبژاردنەکانی ١٩٩٩ پابۆجیکی جێگری ماندیلاو سەرۆکی پارتی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی بوە سەرۆکی وڵات و تاکو کۆتایی ٢٠٠٤ لەدەسەڵات بەردەوام بوو.

- باشووری ئەفریقیا ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لەرێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان.

# رواندا

- ناوی رەسمی: کۆماری رواندا.
- پایتەختی: کیمبالا، ٠٠٠ر٤٦٠ هەزار کەسە.
- شارە سەرکیەکانی: رۆهنجیری، بۆتاری.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٩٦٠ر٨ ملیۆن کەسە، بەپێی زانیاری ٢٠٠١.
- رووبەری : ١٧٠ر١٠ میل چوار گۆشەو ٢٦٢ر٣٣٨ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە.
- چڕی دانیشتوانی: ٨٨١ کەس لەیەک میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوی دانیشتوانی: ٥ر٢٪.
- نـژادەکانی: ٨٥٪ دەگەرێتەوە بۆ تیرەکانی هۆتو، زۆربەری زۆری تری دەگەرێتەوە بۆ تیرەکانی توتسی، کەمایەتی تر هەیە بەناوی بیجیمی.
- ئایینەکانی: مەسیحی کاسۆلیکی ٦٧٪ بروایەکانی تری ناوخۆی وئیسلام ٢٥٪.
- زمانەکانی: فەرەنسی، کینیا وندیە، هەردووکیان زمانی رسمین.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٦٥٪.
- دراوی: فرنکی رواندی کە یەکسانەبە ١٠٠ سنێج.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٢٠٠ر٣ ملیار دۆلارە.
- بەرگری: ٥ر٨٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر٦٠ هەزار کەسە.
- بەشی تاک لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٥٠ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢٩٪ لە خاکی وولاتەکە.
- دابەشی کارگێری: ١٢ پارێزگایە دابەش کراوە بەسەر ١٥٥ کمیۆن لەشێوەی کۆمەڵگا.
- داهاتی کشتوکاڵی: چایە، قاوە، مۆز، گەنم، جۆ، دانەوێڵەی تر، تەرە، میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٠٠٠ر٣٢٠ هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر١٠٠ر١ ملیۆن سەر، چێل ٠٠٠ر٦٧٠ هەزار سەر، پەرەور ٠٠٠ر٧٥٠ر١ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: زێر، فرامیت.
- بەرهەمی کارەبا: ١٨٠ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.
- پیشەسازی: مەنجەمی، چیمەنتۆ، کەلوپەلی بەکارهێنان، خۆراک، ئامادەکرنی خۆراک،
- دەرچوەکانی: چایە، قاوە.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی رستن وچنین، خۆراک، ماشێن وئامادەکراوەکان، کەلوپەلی سەرمایەداری، ئاسنی رەق.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: بەریتانیا، ئیتاڵیا، ئەمەریکا، بەلجیکیا، کینیا، فەرنسا، یابان، ، ئەڵمانیا، چەندین وولاتی تری جیهان.
- رژێمی دەسەڵات: کۆماریە،
- پارتە رامیاریەکان: پارتی دیموکراتی کۆمەڵایەتی، چەپی مام ناوەندی، پارتی مەسیحی دیموکراتی، پارتی دیموکراتی کۆماری ، پارتی لیبرالی ناوەندی، جولانەوەی بوژانەوەی شۆرشگێری نیشتمانی، چەندین گروپ وپارتی تری نەتەوەیی و عەشائیری ونیشتمانی تیایە.
- جوگرافیای رواندا: رواندا کۆمارێکی بچوکی سەربەخۆی ناوخۆیە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی

ئەفریقیا، ئۆگەندا لە باکووری، کۆنگو لە رۆژئاوای، بۆرەندی لە باشوور، تەنزانیا لەرۆژهەلاتی.

• مێژووی رواندا: لەسەرتای سەدەی دەیەمی زایینی عەشیرەتی هۆتۆ رویان تێکردو نیشتە جێی ناوچەکەبوون و دەستیان کرد بەکاری جوتیاری، بەلام پێش ئەوانە عەشیرەتی توابیجیز نیشتەجێی ئەو وولاتە بون کە بەراوی ماسی وبارزگانی خەریك بوون . لە سەدەی پانزەم لە لایەن (رۆجنزۆ بۆیمبا) شانشین لەنزیك کیجالی دامەزراند، لە سەدەی حەڤدەم شانشینی توتسیەکان بوو مل کەچییان بۆکرد بەهۆی توانای دارای وخاوەندیەتی زەوی، لە کۆتای سەدەی نۆزدەهەم دەولەتێکی سەربازی ناوەندی یەکگرتویان پێکهێنا کە لە ژێر دەسەلاتی توتسیەکان بوو بەناوی (کیجیری روابویجیری). لە سالی ١٨٩٠ شانشینی توتسی کەناسراو بوو بەناوی رواندی لەگەل دەولەتی بۆرندی دراوسێی بونە ژێر دەستەی ئەلمانیا، لە سالی ١٩١٦ لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهان کەوتە ژێر دەستی بەلجیکا لە دوای کۆتای جەنگ کۆمەلەی گەلان بە رسمی خستیە ژێر ئینتدابی بەلجیکا کە هەردوو وولات لەژێر ناوی رواندا و ئۆرەندی بوون، بەلام ئۆرەندیَ لەسالی ١٩٦٠ سەر بەخۆی بەدەست هێنا دوای شەری ناوخۆی لەنێوان تیرەو هۆزەکان، لەسالی ١٩٥٩ ئەویش بەناچارکردنی شانشین کە ولاتەکە جێبهێلێن. لە سالی ١٩٦١ رژێمی کۆماری راگەیاندرا ودەسەلاتی توتسی کۆتایی هات، لە ١٩٦٢/٧/١ سەربەخۆی تەواوی لەبەلجیکا وەرگرت لە ژێر ناوی رواندا و سەرۆکایەتی کۆمار لەلایەن تیرەی هۆتۆ وەرگیرا.

لە سالی ١٩٧٣ کودەتایەکی سەربازی لە لایەن (جۆفنیال هیباری) ئەنجام دراو دەسەلاتی گرتە دەست، لەسالی ١٩٨١ هەلبژاردن ئەنجام دراو حکومەتی مەدەنی دەسەلاتی وەرگرت بەلام لە لایەن یەك پارت ئەویش جولانەوەی بوژانەوەی شۆرشگێری نیشتمانی سۆشیالستی کە لەلایەن ئەوەکانی هۆتۆ پێك هاتبوو.

لەدوای ئەوکێشەو گرفتانەی نێوان تیرەو هۆزەکان رۆژ لەدوای رۆژ پەرەی دەسەندو شەری ناوخۆی نێوانیان هەلگیرساو بوە هۆی کوشتنی دەیان هەزار کەس لە نێوانیان بەتایبەتی کەسانی بێ لایەن، لە ١٩٩٤/٤/٦ (هابیاری نتابامیرا) سەرۆکی رواندا و بۆرندی لە کارەساتێکی فرۆکە کوژران ئەمەش کارێکی ئەنجام دەربوو لەلایەن تیرەی هۆتۆ، رواندا مێژوویەکی رەشی بەخۆیەوە دیوە ئەویش بەکێشەی نێوان توتسی وهۆتویەکان.

• رواندا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە یەکێتی رێکخراوی ئەفریقی.

# زامبيا

- ناوی رەسمی: کۆماری زامبیا، رۆدیسای باکوری پێشوو، ژمارەی دانیشتوانی.
- پایتەختی: لۆناکا، ۰۰۰ر۸۹۰ر۱ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرکیەکانی: کیتوی، مۆفۆلیدا، کایوی، ندولا.
- بەندەرە سەرکیەکانی: میۆلۆنگۆ.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۶۷۰ر۱۰ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ساڵی ۱۹۹۹.
- رووبەری: ۵۸۶ر۲۹۰ میل چوار گۆشەو ۶۱۴ر۷۵۲ کیلۆمەتر چوار گۆشە.
- نژادەکانی: ئەفریقیەکان ۹۹٪ ئەورووپی ۱٪.
- چری دانیشتوانی: ۳۷ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوی دانیشتوانی: ۳,۱۰٪.
- ئایینەکانی: مەسیحی ۷۵٪، هندو ئیسلام ۲٤٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ۷۵٪.
- دابەشی کارگێری: ۹ هەرێمە.
- دراوی: کواتشا.
- بەرگری: ۹ر۳٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر۲۲ هەزار کەسە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۱۰۰ر۹ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۱۰۰ر۱ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ۱۰ر۸٪ لە خاکی وولاتەکە.
- سامانی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، چەوەندەری شەکر، تەرە، میوەجات، دانەوێڵە.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ۰۰۰ر۲۵۰ هەزار سەر، بزن ۰۰۰ر۷۳۰ هەزار سەر، بەراز ۰۰۰ر۳۸۰ هەزار سەر، چێل ۰۰۰ر۸۰۰ر۲ ملیۆن سەر، پەرەور ۰۰۰ر۲۷ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: زێر، قورقوشم، زیوو، خەلوز، نوحاس، زەنگ.
- پیشەسازی: کەلوپەلی خۆراك، کیمیاوی، دەرهێنانی سامانی مەنجەمی، بیناسازی، کەلوپەلی بیناسازی.
- بەرهەمی کارەبا: ۵۰۰ر۸ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی دروستکراو، کەلوپەلی ماشێنی گواستنەوە، کەلوپەلی خۆراك، سوتەمەنی.
- دەرچوەکانی: نوحاس، قورقوشم، زەنگ.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: سعودیە، یابان. باشوری ئەفریقیا، ئەمەریکا، چینی میللی. هەندێ لەووڵاتانی یەکێتی ئەوروپا،
- رژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی دیموکراتی تازە پێگەیشتوە، پێك هاتەی لەسەر فرەلایانەیە، هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار لەرێگەی پێشنیاری نهێنی گشتیە، ئەنجومەنی یاسادانان لە ۱۵۰ ئەندام پێك هاتوە ئەویش بەپێشنیاری گشتی نهێنی هەڵدەبژێردرێن.
- پارتە رامیاریەکان: جولانەوە لە پێناو دیموکراتی فرەلایەنی زیاتر، چەپی ناوەندی، پارتی سەربەخۆی نیشتمانی یەکگرتوو، دیموکراتی نیشتمانی ئەفریقی، پارتی فرە رەگەزی، پارتی هاوکاری دیموکراتی نیشتمانی، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانیو نەتەوەی ورامیاری تری تیایە.
- جوگرافیای ولات: زامبیا وولاتێکی ناوخۆیە دەکەوێتە باشوری ناوەندی کیشوەری ئەفریقیا، لە باکوری کۆنگۆ، لە رۆژهەلاتی تەنزانیاو مالاویو مۆزەمبیق، لە باشووری زمبابۆیو نامیبیا، لە رۆژئاوای ئەنگۆلا،

سەرەرای ئەوە زامبیا دەکەوێتە هێڵی کەمەرەی زەوی لەگەڵ ئەوەشدا کەش وهەوایەکی مام ناوەندی هەیە بە هۆی بەرزی خاکە کە لەسەر لەئاستی دەریا.

• مێژووی وڵات: لە سەدەی شانزەهەم گەلانی ناوچەی زائیر لە ئیمپراتۆریەتی لۆیا ولواندا کۆچیان کرد بەرەو لایەنی باکووری رۆژئاوای ئەو وولاتە میرنشینیان لێپێکهێنا لە کۆتای سەدەی هەژدەم، پرتوگالیەکان سەردانی ناوچەکەیان کرد بەهۆی رووتێکردنی زۆری کۆچ بەران رۆلی پرتوگال و عەرەب بەبازرگانی بەندایەتی ناوچەکە پەرەی سەند کە لەرۆژهەڵاتی ئەفریقیا رویان تێکردبوو بەهۆی هەژاری .

لە ساڵی ١٨٥١ زانای بەریتانی (دیفید لیفنجتون) سەردانی ناوچەی کرد، لە ساڵی ١٨٨٩ (سیسیل رودی) ئیمپراتۆریەتی لێ دامەزراندو دەستی کرد بەدەرهێنانی بەرهەمی سروشتی ولە هەمان ساڵ کۆمپانیای باشووری ئەفریقی بەریتانی دامەزراند بەهۆی داگیر کردنی لەلایەن (ماشۆنالاند) رۆدیسای باکور ناوی گۆرا لە ئیستاب بۆ زامبیا، لاند ناوی گۆرا بۆ زیمبابۆی ئەمەش بوە هۆی ئەوەی کە کۆمپانیای ناو براو دەست بکات بەدەرهێنانی نوحاس و پەرەی سەند بەتایبەتی لە ساڵی بیستەکانی سەدەی بیستەم، لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٤ بەریتانیا بوە پارێزەری وولاتەکە. لە ساڵی ١٩٤٨ پارتی رۆدیسای نیشتمانی باکووری ئەفریقی دامەزرا لە پێست رەشەکان بۆ تێکۆشان لە پێناو وەدی هێنانی ئۆتونۆمی لەهەرێمەکە .

لە ساڵی ١٩٥٢ رۆدیسیای باشور بوە بەشێك لە یەکێتی ناوەندی ئەفریقیا، لە ساڵی ١٩٦٠ (کینس کاوەندە) سەرۆکی زامبی و پارتی سەربەخۆی نیشتمانی یەکگرتوی دامەزراند، کە پارتێکی سۆشیالستی ئەفریقی بوو بۆ تێکۆشان لە پێناو سەربەخۆی و هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی ناوەندی ئەفریقی کە کەمایەتی پێست سپیەکان سەکردایەتیان دەکرد لەرۆدیسیایی باشوور، لە ساڵی ١٩٦٣ ئەو یەکیتیە هەڵوەشاوەو ماف ئۆتونۆمی بەدەست هێنا.

لە ١٩٦٤/١٠/٢٤ سەبەرخۆی وەرگرت لەناو کۆمەنولسی بەریتانیا لە ژێر ناوی زامبیا بەسەرۆکایەتی کنس کاوەندە، دوای ئەوە بەریتانیا بەهۆی باری ناهەمواری ئابووری دەستی کرد بە یارمەتی دانی زامبیا بە کردنەوەی رێگاو بان و هەروەها هاوکاری چینی میللی بە دروستکردنی رێگایەك بەدرێژای ١٦٠٠ کیلۆمتر بۆ بازرگانی و راکشانی بۆری نەوت و راست بوونەوەی باری ئابوری زامبیا.

لە ساڵی ١٩٦٩ کاوەندە بریاری خۆماڵی کردنی پیشەسازی دەرکرد بە دەرهێنانی نوحاس و بەرهەمی سورشتی راگەیاند کە خاوەندیەتی بۆ کەسانی دەرەکی دەگەراوە کە زامبیا ٥١٪ سەهمەکانی ببات بۆ وڵاتەکەی.

لە ساڵی ١٩٩١ بریاری دەستوری نوێ درا کە فرە لایەنی بوە بەندیکی سەرەکی، لە ئۆکتۆبەری هەمان ساڵ هەڵبژاردن ئەنجام درا (شیلۆیا) بە سەرۆك کۆمار هەڵبژێردراو کاوەندە لە سەر دەسەڵات لابرا کە ماوەیەکی زۆر دەسەڵاتی بەدەستەوە بوو. لە ساڵی ١٩٩٦ دووبارە شیلۆیا بە سەرۆك کۆمارهەڵبژێردراوە سەرەرای توند رەوی لە دەسەڵات. لە دوای ئەوە لە مانگی ١٠/ ١٩٩٧لەهەولێکی کودەتا رزگاری بوو کە لێچونەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان لەبارەی نەخۆشی ئایدز گەیشتە پلەی ترسناك لەساڵی ١٩٩٩ کە زیاتر لە ٥٠٠ هەزار کەس توشی ئەو نەخۆشیە بوونەسەرەرای ئەوە سەرۆك شیلۆیا بەردەوام بوو لەدەسەڵات.

*زامبیا ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لەرێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا.

# زمبابــوێ

- ناوی ڕەسمی: کۆماری زمبابۆی (ڕۆدیسیای پێشوو).
- پایتەختی: هەراری، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٥٧٠ر١ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرکیەکانی: شیتۆنگ، ویزا، بۆلاوابۆ.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٨٥٠ر١١ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- ڕووبەری: ٨٧٣ر١٥٠ میل چوار گۆشەو ٥٧٩ر٢٩٠ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- بوژانەی دانیشتوانی: ٥ر٢٪.
- چڕی دانیشتوانی: ٧٩ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا
- نەژادەکانی: ئەفریقیە ڕەسەنەکان ٩٥٪ ئەوروپیو بەریتانی ٥ر٣٪ ئەفریقیەکان ٥ر٠٪ ئاسیایەکان ٥ر٠٪ .
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی ڕەسمیە) زمانی شۆنا، زمانی سندیبیل .
- ئایینەکانی: سنکریتیە کە لەمەسیحی وبڕاوی تری ناوخۆ پێکهاتیە ٥٥٪ مەسیحی وئیسلامی هیندی وئەنیمۆن ٤٠٪.
- زانینی خوێندن ونووسین :٩٠٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٨ پارێزگایە+ دووشار.
- دراوی: دۆلاری زمبابۆی.
- بەرگری: ٥ر٤ ٪لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی
- سوپاکەی: ٠٠٠ر٤٠ هەزار کەسە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ١٠٠ر٢٥ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر٢٣ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر٧٪ لە خاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، چەوەندەری شەکر، قاوە، گەنمە شامی، تەرە، میوەجات،
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٠٠٠ر٦٣٠ هەزار سەر، بزن ٨٧٠ر٢ ملیۆن سەر، چێڵو گامێش ٦٥٠ر٥ ملیۆن سەر، بەراز ٠٠٠ر٣٠٠ هەزار سەر ، پەرەور ٧٠٠ر١٦ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی : زێڕ، نیکل، نوحاس، ئاسن، خەلوز، کروم،
- پیشەسازی: ئامادەکردنی جل وبەرگ، بەرهەمی سروشتی، ڕەقی، کیمیاوی. دروستکردنی شەکر
- بەرهەمی کارەبا: ٣٠٠ر٨ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی ئامێر، بەرهەمی سوتەمەنی، کەلوپەلی گواستنەوە.
- دەرچوەکانی: زێڕ، نوحاس، خەڵوز، کروم، نیکل، گەنمەشامی، شەکر.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یەکێتی ئەوروپا، ئەمەریکا، یابان، چینی میللی، باشووری ئەفریقیا.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی دیموکراتی پەرلەمانیە، یەك ئەنجومەنی یاسادانانی هەیە کە لە ١٥٠ ئەندام پێك هاتوە، سەرۆك کۆمار دەسەڵات دارە
- پارتە رامیاریەکان: پارتی سۆشیالیستی ئەفریقی، پارتی یەکێتی زمبابۆی نیشتمانی ئەفریقی، پارتی بەرەی نیشتمانی، چەندین گروپ وپارت ولایەنی تری نیشتمانیو نەتەوەی ورامیاری وکۆمەڵایەتی تیایە کە نەگەیشتونە پلەی دامەزراندنی پارتی گونجاو.
- جوگرافیا وڵات: لە باکوری زامبیا، لەرۆژئاوای بۆتسوانا، لە باشووری باشوری ئەرفیقیا ،لە

رۆژهەلاتی مۆزەمبیق.

- مێژووی ولات: لە سەدەکانی ناوەند بانتۆیەکان نیشتەجێی ئەوناوچەیەبوون بە دامەزراندنی شانشینی بانتۆکە پایتەختی زمبابۆی بوو، لە سالّی ١٨٨٨ کۆمپانیای باشوری ئەفریقی بەریتانی دەستی بەسەر داگرت، لە سالّی ١٩١١ ناوچەکە بوبە دووبەش یەکەمیان رۆدیسیای باکور کە بوە زامبیا، دووەم رۆدیسیای باشوور کە بوە زمبابۆی لە سالّی ١٩٧٩، لە سالّی ١٩٥٣ رۆدیسای باشوور چوە ناو یەکێتی فەرە رەگەزی لەگەلّ رۆدیسیای باکوور ونیاسلاندا (مالاوی لە دوای) لە سالّی ١٩٦٣ رۆدیسیای باشوور بەرەزامەندی مانەوەی خۆیان لەژێر چاودێری بەریتانیا بمێنێتەوە و ناوی بومرۆدیسیا. لە ١٩٧٠/٥/١ بەرەی رژێمی کۆماری رایگەیاند کە دژایەتی زۆر هەبوو بۆ ئەو راگەیاندنە کە نۆ وولاتی فۆنسیلیەی خۆی داخست لەوانە ئەمەریکاش. لە دوایّ کێشەو ململانێیە توندو تیژی نێوان سپی پێستو رەش پێستەکان لەسەر دەسەلات دژی ئایان سمیتی سەرۆك کۆمار لە ئەنجام لە ١٩٧٩/١٢/٣٠ دەنگ دەرانی سپی پێست دەستوری نوێیان راگەیاند کە مافی هەلّبژاردن بۆ هەموو رەش پێستەکانیدا بە گۆرینی ناوی وولاتەکە لە رۆدیسیا بۆ زیمبابۆی، لە ١٩٨٠/٤/١٨ بەرسمی دان بە سەربەخۆی زمبیابۆی نرا مۆجیابی بوە یەکەم سەرۆك وەزیران کە لە رەش پێستەکان بوو. دوبارە موجابی لە هەلّبژاردنەکانی ١٩٩٠ بەسەرۆك کۆمار هەلبژێردراوە، لەمانگی /٦/ ١٩٩٠ بەهۆی پا لەپەستۆی بەرهەلّستکاران و پارتی زانۆی دەسەلاتدار هەلسا بەرەشکردنەوەی هەموو هێمای مەبدەئەکانی مارکسی- لینینی سۆشیالیستی زانستی، لەسالّی ١٩٩٣ دەست کرا بەگۆرینی چۆنیەتی خاوەندێتی زەوی. لەهەلبژاردنەکانی مانگی/ ١٩٩٦/٤پارتی مۆگای بە ٦٥کورسی سەرکەوتنی بەدەست هێنا . هەروەها موجابی لە هەلبژاردنەکانی سالّی ١٩٩٧ سەرکەوتنی بەدەست هێنا تاکو کۆتایی ٢٠٠٤ لەدەسەلات بەردەوام بوو.
- زمبابۆی ئەندامە لەنەتەوە یەککرتوەکان، ئەندامە لە رابیتە ی کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە رێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا.

# ساتومیە وبرنسیب

- ناوی رەسمی: کۆماری ساتومیە وبرنسیبی دیموکراتی.
- پایتەختی: ساتۆمیە، ژمارەی دانیشتوانی ٨٠٠ر٥ ٦هەزار کەسە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٢١٥ هەزار کەسە، .
- رووبەری: ٧٢ر٣ میل چوار گۆشەو ٣٦٤ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە.
- چڕی دانیشتوانی: ٥٧٧ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- نژادەکانی: مستیکۆز کە ئەمانەی تێکەڵاون لە ئەفریقی وپرتوگالی.
- زمانەکانی: پرتوگالی"زمانی رەسمیە".
- زانینی خوێندن ونووسین: ٧٥٪.
- دابەشی کارگێری: حەوت ناوچەیە لەشێوەی ناحیە.
- دراوی: دوبرا.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ١٥٠ر١٥٤ ملیۆن دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ١٥٠ر١ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٣ر١٪ لە خاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: قاوە، رۆنی دار، مۆز، گەنم وجۆ، کاکاو، گیزی هیندی ، تەرە ، میوەجات.
- پیشەسازی: ئامادەکردنی گۆشتی ماسی، خواردنەوە (بیرە)، دروستکردنی سابون، دروستکردنی جل وبەرگ، دروستکردنی زەیتی دار.
- سامانی ئاژەڵی: ئاژەڵی جۆراو جۆری هەیە وەك مەرو بزن چێل وگامێش و پەرەوەر بەڵام بەرێژەیەکی کەم
- داهاتی دەرەوەی: رستن وچنین، ماشێن، سوتەمەنی، خۆراك، کەلوپەلی کارەبایی.
- دەرچوەکانی: قاوە، گۆشتی ماسی، کاکاو، زەیتی دار.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەڵمانیا، چینی میللی، ئەنگۆلا، هۆلەندا ، پورتوگال، چەندین وڵاتی تر لەجیهان.
- رژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی دەستوریە دەسەڵاتی بەرز بۆ ئەنجومەنی یاسادانان دەگەرێتەوە کە لە ٥٥ ئەندام پێکهاتووە، هەڵدەبژێردرێن بۆ ماوەی چوار ساڵ، کۆمارێکی دەستوری فرە لایەنیە و سەرۆك کۆمارو سەرۆك وەزیرانی هەیە.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی کاری دیموکراتی سەربەخۆ، جولانەوە لە پێناو رزگاربوون، کۆمەڵەی کۆمیۆن وبیر کردنەوەی دیموکراتی.
- جوگرافیای وڵات: دوو دورگەی بچوکی بورکانیەلەکەنداوی گینیا بە دوری ٢٤٠ کیلۆمەتر لەکەناری ئەفریقیالە رۆژ ئاوا، دورگەی سان تومیە رووبەرەکەی نزیکەی ٨٥٩ کیلۆمەترەو چیاکانی بەدارستان داپۆشراوە، بەڵام دورگەی برنسیب رووبەری ١٤٢ کیلۆمەترە کە لە چیای بەرز پێکهاتوەو هەڵدێری ناخۆش لە لای رۆژهەڵاتی گابۆن وگینیای ئیستوائی هەیە، کەش وهەوایەکی لەبار وفێنك و گونجاوی هەیە.
- مێژووی وڵات: دەریاوانە پرتوگالیەکان لە ساڵی ١٤٧١ سەرادانی ئەو دورگەیان کردوەو دوای نیشتەجێی ناوچەکە بوون، تاکو ساڵی ١٥٢٢ ژێر دەستەی پرتوگال بوو، کە

دورگەیەکی بەپیت بوو لە بارەی بەرهەم هێنانی شەکر، لە سالی ١٩٠٨ وولاتەکە بووە گەورەترین بەرهەمهێنەری کەکاو لە جیهان، لە سالی ١٩٥٢ جولانەوەی رزگاری لە هەندەران پێك هات ، لەسالّی ١٩٧٤ سوپای پورتوگال هەلّسا بە شۆرشێکی سەرکەوتوو لە ولاتەکە دژی دەسەلاّتی ئیمپراتۆریەتی پورتوگالی وحکومەتی نوێی پورتوگالی بووە هۆی بەرپابوونی جولانەوەیەکی رزگار کەری وولاتەکە، لە ١٩٧٥/٧/١٢ وولاتەکە سەربەخۆی وەرگرت، لەهەلّبژاردنەکانی سالّی ١٩٩٦ ترۆفودا علی داکۆستا بە سەرۆك کۆمار هەلّبژێردرا دوبارە لە سالی ١٩٩٩بە سەرۆك کۆمار هەلبژێردرایەوە.

- ساتومیەو برنسیب ئەندامەلە رێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتوەکان.

# سیشل

- ناوی رەسمی: کۆماری سیشل.
- پایتەختی: فکتۆریا ٥٠٠ر٣٥ هەزار کەسە.
- بەندەرەکانی: فیکتۆریا.
- ژمارەی دانیشتوانی:٠٠٠ر١١٠ هەزار کەسە.
- رووبەری: ١٧٦ میل چوار گۆشەو ٦٢٥کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چری دانیشتوانی: ٤٨٢ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- نژادەکانی: دانیشتوانەکە پێك هاتوە لەئاسیایەکان وئەفریقیەکان وفەرەنسیەکان.
- زمانەکانی: ئینگلیزی وفەرەنسی (زمانی رەسمین).
- ئاینەکانی:کاسۆلیکی رۆمانی ٩٢٪، ئینجلیکانیەکان.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٨٥٪ .
- دابەشی کارگێری: ٢٣کەرتی کارگێری ناوخۆیە.
- دراوی: روپیە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٥٦ ملیۆن دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر٧ دۆلارە.
- بەرگری: ٥ر٢٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپای: ٥٠٠ر١٠ هەزار کەسە.
- بەرهەمی کشتوکالّی: گەنم وجۆ، تەرەو میوەجات، گیزی هیندی.
- سامانی ئاژەلّی: مەرو بزن، چێل، پەرەور٠٠٠ر٦٥٠ هەزار سەر .
- پیشەسازی: گەشت وگوزار، ئامادەکردنی خۆراك، راوی ماسی و ئامادەکردنی.
- بەرهەمی کارەبا: ١٢٥ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: خۆراك، کەلوپەلی دروستکراو ، ماشێن، بەرهەمی نەوت، کەلو پەلی گواستنەوە.
- دەرچوەکانی: گۆشتی ماسی، قرفە، فانیلیا.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، فەرنسا، باشووری ئەفریقیا، پاکستان، بەریتانیا، هەندێك لەوولاّتانی یەکێتی ئەوروپا.
- رژێمی دەسەلاّت: وولاّتێکی کۆماریەو ئەلبرت رینیە لە سالّی ١٩٧٧ سەرۆك کۆمارە، ئەنجومەنی یاسادانان لە ٢٣ ئەندام پێك هاتوە.
- پارتە رامیاریەکان: بەرەی پێشکەوتنی میللی، پارتی دیموکراتی سیشلی.
- جوگرافیای وولاّت: سیشل پێك هاتووە لە

کۆمەڵە دورگەی ئەرخەبیل کە نزیکەی سەد دورگە دەبێت و دەکەوێتە زەریای هیندی وباکووری رۆژهەڵاتی مەدەغەشقەر بە دوری ٧٠٠ کیلۆمەتر، لەباشووری رۆژئاوای مەدەغەشقەر، لە باکوری سۆمال.

• مێژووی سیشل: لە سەدەی شانزەهەم پرتوگالیەکان سەردانی ناوچەکەیان کردوە کە دانیشتوانەکەی چری پێوە دیار نەبوو، لە ساڵی ١٧٥٦ فەرەنسا خۆی بە خاوەندیەتی دورگەکە دەزانی، دوای سەدەی هەژدەم پێست سپیەکان وئەفریقیەکان رویان لەناوچەکەکردو بونە دانیشتوانی ناوچەکە، لە٢٦/٦/ ١٩٧٦ بوە وڵاتێکی سەربەخۆ لە ناوکۆمەنوڵسی بەریتانیا، لە ساڵی ١٩٩٣ بریاری دەستور درا لە رێگەی راپرسی کە ٧٣٪ دەنگی درا بە دەستوور کە دەستورێکی دیموکراتی فرە لایەنی بوو، دوای ئەوە سیشل یارمەتی باشی لەئەوروپا وەرگرت بۆ پتەو کردنی باری ئابوری لەدوای ساڵی ١٩٩٤، هەروەها لە بواری گەشت و گوزاری هەنگاوی باشی بەرەو بوژانەوە هاوێشت.

• سیشل: ئەندامە لەکۆمەنوڵسی بەریتانیا، ئەندامە لەرێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان.

# کینیا

• ناوی رەسمی: کۆماری کینیا.
• پایتەختی: نایرۆبی، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٩٥٠ر١ ملیۆن کەسە.
• شارو بەندەرە سەرکیەکانی: مۆمباسا، کیسۆمۆ، لامۆ.
• ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٩٠٠ر٢٩ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ٢٠٠٠.
• رووبەری: ٠٨١ر٢٤٤ میل چوار گۆشەو ٥٨٠ر٢٧٠ کیلومەتر چوار گۆشەیە.
• چری دانیشتوانی: ١٣٣ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
• نژادەکانی: لۆهیا، لوو، کیکۆیۆ، کەمیا. •
• زمانەکانی: کەناری و ئینگلیزی (هەردووکیان زمانی رەسمین) زمانی تری ناوخۆی تیایە.
• ئاینەکانی: مەسیحی پرۆتستنت و کاسۆلیکی رۆمانی، چەندین بروای تری تیایە.
• زانینی خوێندن ونووسین: ٨٠٪.
• دابەشی کارگێری: ٧ هەرێمە + ئەنجوومەنی شارەوانی نایرۆبی.
• دراوی: شلنی کینی.
• کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٢٥٠ر٤٥ ملیار دۆلارە.
• بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٧٥٠ر١ دۆلارە.
• بەرگری: ٥ر٢٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
• سوپاکەی: ٠٠٠ر٢٥هەزار کەسە.
• زەوی کشتوکاڵی: ٣ر٧٪ لە خاکی وولاتەکە.
• بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، تەرە، میوەجات، قاوە، گەنمە شامی، چایە، چەوەندەری شەکر.
• سامانی ئاژەڵی: مەر ٥٠٠ر٥ ملیۆن سەر، بزن ٦٠٠ر١ ملیۆن سەر، چێل ٥٠٠ر١٤ ملیۆن سەر، بەراز ٠٠٠ر١١٥ هەزار سەر، پەرەور ٣٠ ملیۆن سەر.
• سامانی سروشتی: بەردی چەوی، خوێ، زێر، یاقووت، بەردی بە نرخ.
• پیشەسازی: پالاوتنی نەوت، پیشەسازی سوك، خۆشکردنی پێست، بەرهەمی شیری.

- بەرهەمی کارەبا: ٣ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: ئامێر وماشێن، کەلوپەلی گواستنەوە ، نەوتی خاو ، بەرهەمی ئاسن ورەقی.
- دەرچوەکانی: چایە، قاوە، گۆشت، پێست، نەوتی ئامادەکراو وەك بەنزین وگازو غاز ورۆنی ئۆتۆمبیل.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، بەریتانیا، ئەڵمانیا، فەرەنسا، وولاتی ئەفریقیا، چەندین وولاتی عەرەبی، چینی میللی ، یابان.
- رژێمی دەسەڵات: وولاتێکی کۆماری دەستوریە، ئەنجومەنی یاسادانان پێك هاتیە لە ١٨٨ ئەندام، سەرۆك کۆمار لە رێگەی هەڵبژاردنی گشتی دەنگی بۆ دەدرێت.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی دیموکراتی، یەکێتی کینیای ئەفریقی نیشتمانی، پارتی نەتەوەی کینی، پارتی سافینا، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تێدایە .
- جوگرافیای وڵات: دەکەوێتە سەر هێڵی کەمەرەی زەوی لە رۆژهەلاتی ناوەندی ئەفریقیا بەدرێژای کەناری زەریای هندی، لە رۆژئاوای ئۆگەندا، لە باشووری تەنزانیا، لە رۆژهەلاتی سۆماڵ، لە باکووری ئەسیوبیا، لە باکوری رۆژئاوای سودان.
- مێژووی وڵات: لە سەرەتای سەدەی هەشتەمی زاییینی بازرگانە عەرەبەکان دەستیان کرد بە نیشتە جێبوون لە کەنارەکانی رۆژهەلاتی ئەفریقیا، پرتوگالیەکان لە سەدەی شانزەهەم ئەو نیشتە جێ بونەی لەو لاولەم لا هاتبوون هەمووی دەرکردن، دوای. ئەوە لە سەدەی هەژدەم سولتانی عومان دەسەڵاتی خستە سەر ئەو کەنارە ئەفریقیەو کردیە سەربەوولاتی زنزیبار، لەسەدەی نۆزدەم ئەوروپیەکان دەستیان کرد بە دۆزینەوەی ناوچەی ناوەوەی وولاتەکە، لە سالی ١٨٨٧ کۆمپانیای ئەفریقیای رۆژهەلاتی بەریتانی لێدامەزراند بە کرێ گرتنی بەشێك لە زەوی کەنارەکە لە سولتانی زنزیبار، لە سالی ١٩٠٢ هێلی ئاسنی شەمەندەفەری لێ دامەزرا لە نێوان مۆمباساو ئۆگەندە بە یارمەتی کرێکارانی هندی کە زۆربەیان لە ناوچەکە نیشتەجێ بوون، لەسالی ١٩٢٠ بوە پارێزراوی رۆژهەلاتی ئەفریقیا کەناسرابوو بەناوی ژێر دەستەی کینیا، لە سالی ١٩٤٢ یەکێتی ئەفریقیای کینی دامەزرا. لە پێناو ماف مرۆڤی ئەفریقی، لە ١٩٦٣/١٢/١٢ کینیا سەربەخۆی تەواوی وەرگرت کە کنیاتا بوە سەرۆك وەزیران،لەدوای کێشەو مل ملانێیەکی توندو تیژ لە نێوان پارتەو گروپەکان لە لایەك وکۆمپانیا بیانیەکان لە لایەکی تر تاکو سالی ١٩٩٢، مۆی دوبارە بەسەرۆکی کینیا هەڵبژێردراوە. لە سالی ١٩٩٥ ریتشارد لیکی پارتێکی مام ناوەندی دامەزراند بەهۆی گومان کردن لە هەلبژاردنەکان بەناوی پارتی سافینا.

لە مانگی/١٩٩٨/٨ سەیارەکی مین رێژ کراو لە بالوێزی ئەمەریکا تەقیەوە کە بوە هۆی کوشتنی ٢٠٠ کەس وبریندا کردنی زیاتر لە٥٫٠٠٠ هەزار کەس.

- کینیا ئەندامە لە نەتەوەیەکگرتوەکان، ئەندامە لە کۆمەنولسی بریتانیا، ئەندامە لە رێکخراوی یەکێتی ئەفریقی.

# میسر

- ناوی رەسمی: کۆماری میسری عەرەبی.
- پایتەختی: قاهیرە، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر ۳۵۰ر۸ ملیۆن کەسە.
- شارەسەرکیەکانی: مەنسورە، ئەسکەندەریە، سوێس، تەنتا، جیزە، مینا، ئەسیوت، ئەسوان.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: پۆرسەعید، ئەسکەندەریە، سوێس.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۵۸۰ر٦۸ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ۲۰۰۲.
- رووبەری: ٦٦۰ر۳۸٦ هەزار میل چوار گۆشەو ٤٥۰ر۰۰۱ر۱ ملیۆن کیلومەتر چوار گۆشەیە.
- چری دانیشتوانی: ۱۷۸ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا .
- نژادەکانی: رەچەلەکی حامیەی رۆژهەلات ۹۹٪. مەسیحی.
- زمانەکانی: عەرەبی (زمانی رەسمیە) ئینگلیزی، فەرەنسی.
- ئایینەکانی: ئیسلام ۹۲٪، مەسیحی ۸٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٥۰٪.
- دراوی: جنەیهی میسری.
- دابەشی کارگێری: ۱۱ پارێزگای گەورەیە ئەمەش کەوتونەتە سەر کەنارەکانی زێی نیل.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۲٦۷,۲۰۰ ملیار دۆلارەو بەرەو بەرزبوونەوە هەنگاو دەنێ.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٤٥۰ر٤ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥۰ر۲٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، تەرە، میوەجات، گەنمە شامی، پەمۆ، گوڵە پەرۆژە.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ۳۰۰ر٤ ملیۆن سەر، بزن ۲٥۰ر۲ ملیۆن سەر، چێل ۳ ملیۆن سەر، گامێش ۱۰۰ر۳ ملیۆن سەر، پەلەور ٥۰۰ر۸٦ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: نەوت ، غاز، فۆسفات، گەچ، ئاسن، قورقوشم، برونز.
- پیشەسازی: پالاوتنی نەوت، رستن وچنین، گوزار، چیمەنتۆ، دروستکردنی پێلاو، خۆراك،
- بەرهەمی کارەبا: ۸۰۰ر٥٤ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی خۆراك، کەلوپەلی سەرمایەداری، ماشێن، ئۆتۆمبێل، پەینی کیمیاوی ، داری دارستانەکان.
- دەرچوەکانی: دەزووی پەمۆ، پەمۆ، بەرهەمی رستن وچنین، نەوت، غازی سروشتی، کیمیاوی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، بەریتانیا، یابان، چینی میللی، وولاتانی ئەورووپای رۆژهەلات، وولاتانی عەرەبی، وولاتانی ئەفەریقی.
- رژێمی دەسەلات: کۆمارێکی سەرۆکیە، سەرۆك کۆمار سەرۆکایەتی ئەنجومەنی جێبەجێکردن دەکات هەر ئەویش سەرۆك وەزیران و وەزیر دادەمەزرێنێت و جێگری سەرۆك وەزیران و جێگری وەزیرەکان دایدەمەزرێنێت.
- جوگرافیای ولات: میسر دەکەوێتە سوچی باکوری رۆژهەلاتی کیشوەری ئەفەریقیا لە ناوەراستی وولاتانی عەرەبی لە نێوان وولاتانی ئاسیا لە رۆژهەلات و ولاتانی ئەفریقیا لە رۆژئاوا، لە رۆژئاوای لیبیا، لە باشووری سودان، لە رۆژهەلاتی دەریای سوور و ئیسرائیلە، لە باکووری دەریای سپیە، وولاتی میسر بەیەك گەیشتنی کیشوەرە کۆنەکانی

جیهانە، ئاسیا، ئەفریقیا، ئەوروپا، کە جێگەی پەرینەوەی بازرگانی نێو دەوڵەتی بوە لە دوای کردنەوەی بەندەری سوێس زیاتر بۆ گەشتیارانی بازرگانی جیهان ئاسانکاری بەسوود هاتە کایەوەو رۆڵی گرنگی ئابوری ورامیاری بۆ وڵاتی میسر هەیە. وڵاتی میسر دابەش دەکرێت بەچەند بەشێك وەك دۆل یاخود کەندی دەلتا کەروبەری ٣٫٥٪ لە خاکی وولاتەکەیەو زەویەکی بە پیتی هەیە، کەندی نیل کە لە باشوری میسر دەست پێ دەکات بەنداوی بەرزی لێیە کە لەشاری قاهرە کۆتایی دێت. .نەرییایەکانی ڤیوم کە پارچەیەك لەزێی نیلە سەرەڕای جێگەکە کە کەتۆتە بیابانی رۆژئاوا بەگەیشتنی ئاوی نیل بۆ ناوچەکە. بیابانی رۆژئاوا لەکەندی نیل درێژ دەبێتەوە لە رۆژهەڵاتی تاکو سنوری لیبیا، لەرۆژئاوا لەدەریای ناوند لە باکورو تاکو سنوری سودان لەباشور و روبەری ٦٦٪ لەخاکی میسرە. . لەگەڵ ئەوەشدا خاکی لمی وڵاتی میسر ٤٠٪ پێکدێنێ لەخاکی میسر، بیابانی رۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە لەنێوان کەندی نیل لە رۆژئاوا تاکو دەریای سورو بەندەری سویس لەرۆژهەڵاتو روبەرەی ٢٢٪ لەخاکی میسرە.

- مێژوی وڵات: میسر وڵاتێکە کە بەیەکێك لەشوێنەوارە کۆنەکانی جیهان دادەنرێ پێش حەوت هەزار ساڵ و مێژووی جیاوازو لەکۆنو کاتەکانی بوونەو سەرچاوەی تۆمارکراوی بەبوونی ناوەندیەتی پەیوەندی لەگەڵ بازنەکانی شوێنەواری شارستانیەتو پاراستنی ئەوسامانە گرنگە بوە بەپێی پەرەسەندنی مێژور بەتایبەتمەندیەتی هەرێمایەتیو کردنەوەی بەرەو جیهانی دەرەوەو تێکەڵاو بوونی بەکاریگەریەتی مرۆڤایەتی لەکەندی نیل کەزەویەکی بەپیت و گرنگەو بونی زۆر لەلافاو بەرزبوونەوەی ئاوی ئەو زێیە بەپیت کردنی خاکەکە شوێنی جوگرافییو کەشو هەوایەکی مام ناوەندی، بەیەك گەیشتنی دەریای سپیو دەریای سورو کێشوەرەکانی ئەفەریقیاو ئاسیاو ئەوروپا بە سنورێکی بیابانی پارێزراو، یەك بوونی زمان ونەژادەکەیان بەپێی مێژووی پەرەسەندنی مرۆڤایەتی کەلەبنەرەتا میسر لەنەژادی عەرەب نەبوونەو نەژادی قبتی بوونە واتە لە لەنژادەکانی فرعەونەکانن کە عەرەب لەو ناوچە بەرفراوانە نەبوە کە بەهۆی بازرگانی هەمەجۆر رەوەندەکان روویان لەوناوچەیە کردووە بەپێی پەرەسەندنی مێژووی پەیوەندی و گواستنەوەو دەریە دەر بوونی گەلان بەرەو ناوچەکە کۆچیان کردووە بەتایبەتی لەدوای سەرهەڵدانی ئایینی مەسیح وکێشەو ململانێی نێوان هەڵگری ئاینی موساو عەرەب چونکە جولەکەو عەرەب یەك نژادن، دانیشتوانی وڵاتەکە بەکاری بەخێوکردنی ئاژەڵو کشتوکاڵ خەریك بوون چ لەکاتەکانی سەرەتای پێش دەرکەوتنی نووسینو خوێندن چ لەکاتەکانی بەردینی کۆنو سەردەمی نوێ.

لە دوای سەرهەڵدانی هەستی زانیاری و پەیدا بوونی مێژوو بەرەو جێبەجێکردنی یەکیەتی رامیاری هەنگاوی نا لەپارچە جیاجیاکانی ئەوناوچە گەورەیە بەرێکخستنی پارچەکانی تری میسری کۆن لەدەوڵەتێکی یەککگرتوو ئەمەش لەدوای قۆناغەکانی یەك لەدوای یەك بەسەرکەوتنو هەرەس هێنان، دوای ئەوە پەیدابوونی لەکەنارەکانی زێی نیل بەهەستی رامیاریو کۆ بونەوەیان لە دوو میر نشین یەکەمیان لە ڕۆژهەڵاتی دەلتاو پایتەختی شاری (عنجە) بووە نزیك شارۆچکەی سمفودی ئێستا، دووەم لەرۆژئاوای دەلتاو پایتەتی (حورحورس)بوە . کە بەناوی خوای گەورە بوو بەڵام لەراستیدا پایتەختی لەشاری (مهون)ی

ئێستا بوە، دوای هەردوو میرنیشین یەکیان گرت لەیەك دەوڵەت وپایتەختەکەیان بووە (ساو) کە بەرامبەر یەك بوون ئەو میرنیشنانە دەوڵەتێکی تری دامەزراند لەشاری (نوبت) لە کەنال و دان نرا بەسەربەخۆیی و شەش پەیکەرەکە. بەڵام دوای (ربوبیە- ئوزبرس) کەیەکەم کەس بوو توانی ئەو میرنشینانە یەك بخات لەمێژووی رامیاری میسر، بەڵام ئەوکارو هەوڵدانە لەمەرەس هێنان و پێك هاتە بوون بەهۆی جێگیرنەبوونیان .

پەرەسەندن و پێشکەوتنی مێژووی شارستانیەت و شوێنەواری میسر بەچەندین قۆناغی لێك ترازاو ئالۆزی هەمەلایەن تێپەربوە لەلایەن چەندین بنەماڵەی لێهاتووی یەك نەگرتوو لەهەموو لایەنە جۆراو جۆرەکان ئەویش لەکێشەو ململانێ و شەرو پێکدادان بەردەوام بوە تاکو دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لەناوچەکەو دوای ئەویش بەچەندین دەسەڵاتی جۆراو جۆر تێپەر بووە، وەك دەوڵەتی تۆلۆینەو دەوڵەتی قاسمیە و دەوڵەتی ئەیوبیەو دەوڵەتی شانشینەکان لەگەڵ ئەوەشدا میسر لەژێر دەسەڵاتی رۆم بون وحوکمرانیان دەکرد لەوکاتە عومەری کوڕی عاس بەئامۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب بەرەو وڵاتی میسر بەرێ کەوت، لەساڵی ٦٣٩ زایینی شەر لەنێوان رۆمەکان وئیسلامەکان بەناوی فتوحاتی ئیسلامی هەڵگیرساو دوای ماوەیەك توانیان بەسە رۆمەکان زاڵ بن و ناچاریان بکەن کە باج بدەن گەر نەبنە ئیسلام، دوای ئەوە لەساڵی ١٥١٧تاکو ١٧٦٩ وڵاتی میسر ژێر دەستەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بوو کەبوە هۆی ئەوەی گەلێ سامانی بەنرخی میسریان گواستەوە بۆ شاری قوستەنتنیەی تورکی بەتایبەت گەلێ لەسامانی شارستانیەت و شوێنەواری میسر، دووبارە میرنشین و شانشینەکان لە ساڵی ١٧٦٩ گەڕانەوە سەر دەسەڵات و حوکمرانیان کرد تاکو ساڵی ١٧٧٣، بەهۆی لاواز بوونی دەسەڵاتی عوسمانی تورك و دوای لەساڵەکانی ١٧٩٨ تا ١٨٠١ لەوکاتەی شۆڕشی فەرەنسا دەستی پێ کرد لەگەڵ ئەوەشدا فەرەنسا چاوی لەناوچەی میسر کرد بوو بۆ بەدەست هێنانی بەربوومی هەمە جۆری کەنارەکانی نیل و دەلتا، سوپای فەرنسا لەرێگای دەریا رووەو میسر بەرێکەوت بەسەرکردایەتی ناپلیۆن لە بەندەری تۆلۆن ، لە ١٧٩٨/٧/١گەیشتە ئەسکەندەریەو دوایی زۆربەی زۆری شارەکانی داگیرکردو دوای ناپلیۆن کۆبوونەوەی ئەنجام دا لەگەڵ مامۆستایانی زانکۆی ئەزهەرو رێکەوت کە شەرنەکەن وبوە هۆی ئەوەی ناپلیۆن لە٢٧/٧/ ١٧٩٨بگاتە قاهیرەی پایتەختی میسر.

بەڵام لە دوای یەك مانگ باخیرەکانی ئینگلیزی زۆربەی زۆری پاپۆرەکانی فەرەنسی تێکشکاندو بوە هۆی ئەوەی پەیوەندی نێوان سوپای فەرەنسا لەمیسر لەگەڵ فەرەنسا بپچرێن و بوە هۆی ئەوەی کەئینگلیز هانی سولتانی تورك و هاوپەیمانەکان بدا بۆ دەرکردنی هێزکانی فەرەنسا لەمیسر کەبوە هۆی شەڕی نێوان هێزەکانی نابلیۆن لەگەڵ هێزەکانی ئینگیزو تورکی و روسیا . ناپلیۆن توانی وڵاتانی شام بخاتە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی، بەڵام بەهۆی سەرنەکەوتنی بەرەو میسر گەڕاوەو بوە شەڕێکی توند لەنێوان تورکەکان و هێزەکانی ناپلیۆن بەهاوکاری هێزەکانی ئینگلیز بووە هۆی شکانی هێزەکانی فەرەنسا.

دوای ئەوە محمد علی توانی حکومەتی ناوەندی پێك بێنی لەقاهرەو میسری کردە حەوت بەرێوەبەرو ئەو بەرێوەبەرانەش بکاتە چەند بەشێك و پێك هێنانی مەلبەندی کارکردن و دوایش پێك هێنانی مەڵبەندی گوندەکان وتوانی دەسەڵاتی بەهێز بکات بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی میسرو گونجان لەگەڵ داب و نەریتی ناوچەکە. دوای ئەوە توانی سوپایەکی بەهێز پێك بێنێ و دەستی کرد

بە ئاوەدان کردنەوە لەبوارەکانی رامیاری و ئابووری‌و رۆشنبیری وکۆمەلایەتی وشوێنەوار دوای ئەو بنەماڵەیە ئیسماعیل پاشا دەسەلاتی گرتە دەست بەهۆی پەرەسەندن‌و پێشکەوتنی میسرو بەهۆی لاوازی دەسەلاتی بنەماڵەی محمد علی پاشا.

ئەویش بەپێی تواناو بارو دۆخی ئەوکاتە توانی هەنگاوی باش بنێت بۆ بەرەو پێش بردنی ولاتی میسر لەهەموو بوارە جیاجیاکان، لەسەردەمی ئەو کەنالی سوێس لە١٧/ ١١/ ١٨٦٩ کرایەوە کەرۆلی گرنگی بینی لە بوژانەوەی ئابووری ورامیاری و رۆشنبیری میسر دوای ئەوە لە ٩/١٤/ ١٨٨٢ ئینگلیز توانی قاهرە داگیر بکات‌و بوە هۆی داگیر کردنی میسر، بەتەواوی ،دەسەلاتە یەك لەدوای یەکەکانی میسر تاکو سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهان‌و کۆتایی هاتنی میسر نەیتوانی خۆی رزگار بکات بەلام لەسەرەتای ١٩١٩ شۆرشی میسر هەلگیرسا کەهەموو چین‌و توێژەکانی میسری لەئیسلام ومەسیحی بەشداریان تێدا کردوبوە هۆی ئەوەی کە لە٢٧ /٢/ ١٩٢٢ سەربەخۆی بەدەست بێنێ لەژێر پارێزگاری بەریتانیا دەرچێت.

لە١٥/٣/ ١٩٢٣ میسر بوە ولاتێکی شانشینی‌و شانشین فوئاد دەسەلاتی گرتەدەست وحکومەتی پێك هێناو لیژنەی دەستووری دامەزراند بۆ نووسینەوەی رەنوسی دەستوورو لەمانگی /١٩٢٣/٤ دەستور راگەیاندراو هەلبژاردن ئەنجام درا کەسعد زغلول بەسەرك وەزیران هەلبژێردرا ئەمەش یەکەمجار بوو لەمێژووی میسر، دوای ئەویش اسماعیل سدقی دەسەلاتی گرتەدەست‌و دەستووری لەکار وەستاند، بەلام شانشین دەستوورەکەی خستە وەکار بەهۆی پالەپەستۆی جەماوەری میسر. لەکاتی جەنگی جیهانی دووەم لە سالی ١٩٣٩ میسر پەیوەندی لەگەل ئەلمانیا وهاوپەیمانەکان پچراند، ئەلماینا پەلاماری میسریدا. دوای کۆتایی هاتنی جەنگ دووەمی جیهان میسر داوای لەهێزەکانی ئینگلیز کرد لەمیسر بچنە دەرەوە، دوای ئەوە نارەزایی زۆر سەری هەلدا دژی هێزەکانی بەریتانیاو هاوپەیمانەکان‌و چەندین جار شەر لەنێوانیان روویدامەر لەو کات‌وساتە شۆرشی میسر لە٢٣/٧/ ١٩٥٢ بەسەرکردایەتی محمد نجیب ئەنجامدرا ئەمەش بەداوا کردنی چونە دەرەوەی شانشین لەدەسەلاتدا، لە١٨/ ٦/ ١٩٥٢ دەسەلاتی شانشینی هەلوەشاندەوەو رژێمی کۆماری راگەیاند، لە ١٩٥٦/٧/٢٦ جمال عبدالناصر کەنالی سوێسی خۆمالی کردو بەوهۆیە هێرشی سێ لایەنە کرا سەر لەلایەن بەریتانیاو فەرەنساو ئیسرائیل.

دوای ئەوەش جەنگی ٥/ ١٩٦٧/٦ ئەنجام دراو هەروەها جەنگی ١٩٧٣/١٠/٦ ،لەکاتی دەسەلاتی جمال عبدالناصر لەسالی ١٩٥٨ یەکێتی عەرەبی لەنێوان میسرو سوریای راگەیاندرا و زۆری نەبرد ئەو یەکیەتیە هەلوەشاوە بەهۆی کودەتای بەعسیەکان لەسوریا لە١٩٦٧/٩/٢٨، لەمانگی/٩ / ١٩٧٠ جمال عبدالناصر کوچی دوایی کرد ئەنور سادات جێگەی گرتەوە و لە١٩٧٤/١٠/١٨ شەری یەکجارەکی لەگەل ئیسرئیل راگرت ولە٣/٢٦/ ١٩٧٦ ئیسرائیل ومیسر رێکەوتنی ئاشتیان لەنێوان خۆیان مۆرکرد. لە١٩٨١/١٠/٦ ئەنور سەدات تیرۆر کراو محمد حوسنی مبارك جێگەی گرتەوەو تاکو ئێستاش سەرۆك کۆمارو دەسەلاتدارە لەمیسر. لە١٩٩٩/٩/٢٦ لەراپرسی گەل محمد حوسنی مبارك دوبارە بە سەرۆك کۆمار هەلبژێردراوە.

- میسر ئەندامی دامەزرێنەری نەتەوەیەککرتووەکانە، دامەزرێنەری زانکۆی عەرەبیە، ئەندامە لەرێکخراوی یەکێتی ئەفەریقیا، ئەندامە لەچەندین رێکخراوی تری نێو دەولەتی.

# مـۆزەمبیـق

- ناوی رەسمی: کۆماری مۆزەمبیق.
- پایتــەختیتی: مۆبۆتــۆ، ژمــارەی دانیــشتوانی ۱ر٥٧٠ر٠٠٠ ملیۆن کەسە.
- شـارو بەنـدەرە سـەرکیەکانی: مۆبۆتــۆ، بـیرا، ناکالا، ئیهامبین.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ١٩ر٧٣٥ر٠٠٠ ملیـۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- رووبــەری: ٣٠٩ر٤٩٤ میـل چـوار گۆشــەو ٨٠١ر٥٩٠ کیلومەتر چوار گۆشەیە.
- چری دانیشتوانی: ٦٤ کـەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- نـژادەکانی: کۆمەڵـە هێزێکـی یـەکگرتون وەك (شۆبی، ماکوا، لۆمی، ماکۆندی، نۆنگا).
- ئاینـەکانی: بـروای نـاوخۆی ٥٢٪، مەسـیحی ٣٣٪، ئیسلام ١٥٪.
- زمانەکانی: پرتوگـالی (زمانی رەسمیە) زمـانی بانتۆ.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٤٢٪.
- دابەشی کارگێری: ١٠ پارێزگایە.
- دراوی: مسقال.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ١٤ر٦٥٠ ملیـار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٨٥٠ دۆلارە.
- بەرگری: ٥ر٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٦ر٥٠٠ ١٠ هەزارکەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ١ر٤٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهــەمی کـشتوکاڵی: گـەنم وجـۆ، پـەمۆ، چەوەندەرەی شەکر، تەروە میوەجات، چای.
- سامانی ئـاژەڵی: مـەرو بـزن ٧٥٥ر٠٠٠ هـەزار سـەر، چـێل ١ر٣٥٠ ملیـۆن سـەر، بـەراز ١٨٠ر٠٠٠ هەزار سەر، پەرەور ٢٤ ملیۆن سەر.
- پیـشەسازی: بەرهــەمی نـەوت، ئامـادەکردنی خۆراك، خواردنـەوە، کیمیـاوی، دروسـتکردنی شەکر.
- بەرهــەمی کارەبــا: ٥٦٠ ملیــار کیلــۆ وات کاتژمێر.
- داهـاتی دەرەوەی: خۆراك، جل وبەرگ، نەوت، کەلوپەلی کشتوکاڵی.
- دەر چوەکانی: شـەکر، خـوێ، ماسـی، گۆشت، ئاژەڵی زیندو.
- هاوبەشـەکانی بازرگـانی: یابـان: ئەمـەریکا، وولاتانی پێشووی یەکێتی سۆڤیەت، وولاتانی رۆژئاوای ئەرووپا، چینی میللی.
- رژێمی دەسەلاَت: وولاتێکی کۆماریە.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی بەرگری نیشتمانی ، یەکێتی دیموکراتی، بەرەی رزگاری مۆزەمبیق.
- جوگرافیــای ولاَت: مـاوەی درێــژ بوونــەوەی ٢٤٧٠ کیلۆمــەترە لــە کــەناری باشــووری رۆژهـەلاَتی ئـەفریقیا، لـە بـاکوری تـەنزانیا، لـە رۆژئــاوای مــالاوی وزامبیــاو زیمبــابۆ، لــە باشوری باشووری ئەفریقیا و سویزلەندا.
- مێژووی ولاَت: گـەلانی نیشتەجێی ئـەو وولاَتـە کــە بــە زمــانی بــانتۆ گفتوگۆیــان دەکــرد دانیـشتوانی رەسـمنی وولاَتەکـەن، دوای ئـەوە لەسەدەی نۆیـەمی زایینی بازرگانە عەرەبەکان روویـان لـەو ناوچـەیە کـرد، لـە سـاڵی ١٤٩٨ زایینی (ڤاسکۆدی جامای) پرتوگالی سەردانی ناوچەکەی کـردو دوای کردیانـە ژێـر دەسـتەی خۆیان، لە ساڵی ١٥٠٥ تا١٥١٠ پرتوگالیەکان ئـەو ناوچـانەی دەسـلاتی میریــان هــەبوو هەموویان خستە ژێر دەسەلاَتی خۆیان، دوای

ئەوە بەرەی رزگاری مۆزەمبیق پێك هات كە كۆمەڵێكی نەتەوەیی ماركسی بوون دەستیان كرد بە تێكۆشانی چەكداری دژی پرتوگالیەكان دوای دە ساڵ شەری پورتوگالی نزیكەی ٤٠ هەزار سەربازی هێنا وولات بۆ لەناو بردنی ئەو شۆرشە بەڵام پورتوگال ناچار بوو لە ساڵی ١٩٧٤ لەگەڵ شۆرشگێرەكان رێككەوێت بە راوەستانی شەرو دانی نا بە ماف سەربەخۆی مۆزەمبیق، بەڵام شۆرشی پورتوگال لە ساڵی ١٩٧٤ رێگە خۆشكەر بوو بۆ ئەو رێكەوتنەو بەرەی رزگاری مۆزەمبیق دەسەڵاتی وەرگرت ، لە ١٩٧٥/٦/٢٥ سەربەخۆی تەواوی خۆی راگەیاند، لە دوای شەرێكی خوێناوی لەنێوان حكومەتی سوشیالستی و بەرهەڵستكاران و لە دوای سەرۆك كۆمار بریاری دا واز لە رژێمی ماركسی للینینی بێنێ لە ساڵی ١٩٨٩ دەستوری نوێی راگەیاند بەكۆمارێكی فرە لایەنەی ئابووری ئازاد، لە ساڵی ١٩٩٢ مۆركردنی پەیمانی شەر وەستان لە نێوان حكومەتی مۆزەمبیق و بەرەی مۆزەمبیق .لەمانگی /١٠/١٩٩٤ هەلبژاردن ئەنجامدرا سەرەرای سەرنەكەوتن، دوای ئەوە لەساڵی ١٩٩٥زیاتر لە ٥ر١ ملیۆن پەنابەری وولاتەكە گەراوە بۆ نیشتەجێ كردنەوەیان، لەمانگی /٣/١٩٩٩كارەساتی لافاو رویدا كەبوە هۆی كوشتنی زیاتر لە ٢٠٠هەزار كەس.

- مۆزەمبیق ئەندامە لە نەتەوە یەككگرتوەكان، ئەندامە لە كۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە رێكخراوی یەكێتی ئەفریقیا.

# نامیبیا

- ناوی رەسمی: كۆماری نامیبیا.
- پایتەختی: ویندهۆك، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر١٩٨ هەزار كەسە.
- شارو بەندەرەكانی: رۆندو، لۆردینز، لفیس بای، دیهۆیۆت.
- رووبەری: ٢٥٨ر٢١٨ میل چوار گۆشە ٢٩٠ر٨٢٤ كیلومەتر چوار گۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٣٨٠ر٢ ملیۆن كەسە، بەپێی ئاماری ٢٠٠٠.
- چری دانیشتوانی: ١١ كەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- نژادەكانی: ئۆفۆمبۆ٥٥٪، كفنجۆ ١٠٪، هیریرۆ ٧٪، دەمراو قەوقازی ١٥٪.
- زمانەكانی: ئەفریقی وئینگلیزی( هەردووكیان زمانی رەسمین) ئەڵمانی، زمانەكانی ناوخۆی.
- ئایینەكانی: مەسیحی لۆتەری.
- دابەشی كارگێری: ١٣ پارێزگای هەرێمیە.
- دراوی: دۆلاری نامیبی.
- كۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٠٠٠ر٢٥٠ر٦ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە كۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٨٥٠ر٣ دۆلار.
- بەرگری: ٥ر٢٪ لە كۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاكەی: ٠٠٠ر٦٥ هەزار كەسە.
- زەوی كشتوكاڵی: ٥ر١٪ لە خاكی وولاتەكە
- بەرهەمی كشتوكاڵی: گەنم وجۆ، گەنمە شامی، سورجوم، تەرەو میوەجات، چەندین جۆری بەرهەمی كشتوكاڵی بەلام بەشێوەیەكی كەم.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ١٢٠ر٣ ملیۆن سەر، بزن ٥٠٠ر٧ ملیۆن سەر، چێل ١٩٠ر٢ ملیۆن سەر،

پەرەور ٥ر٢ مليۆن سەر.

- سامانی سروشتی: نوحاس، ئەلماس، زێر، قورقوشم، یۆرانیۆم.
- پیشەسازی: دەرهێنانی سامانی سروشتی، دروستکردنی پێلاو، خۆشکردنی پێست، ئامادەکردنی گۆشت.
- داهاتی دەرەوەی: پەینی کیمیاوی، دانەوێلە، کەلوپەلی خۆراك، بەرهەمی نەوتی، سوتەمەنی، کەلوپەلی بیناسازی.
- دەرچوەکانی: زێر، نوحاس، ئەلماس، گۆشتی ئاژەلْ، ئاژەلی زیندو، یۆرانیۆم. پێست، قورقوشم.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: فەرنسا، ئەلمانیا، سویسرا، ئەمەریکا، بەریتانیا، چینی میللی، یابان، کۆماری باشووری ئەفریقیا.
- رژێمی دەسەلات: کۆمارێکی دەستوری فرە لایەنی دیموکراتیە دادگا سەربەخۆیە، ئەنجومەنی یاسادانان لە دووئەنجومەن پێك هاتووە، یەکەمیان ئەنجومەنی نیشتمانی لە ٢٦ ئەندام پێکهاتووە، دووەم ئەنجومەنی ئومە لە ٧٢ ئەندام پێك هاتوە
- پارتە رامیاریەکان: پارتی سوادیۆ (ریکخراوی باشووری رۆژئاوای ئەفریقیای میللی)پارتی دیموکارتی، بەرەی دیموکراتی یەککگرتوو، پارتی کاری مەسیحی، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تێدایە
- جوگرافای ولات: دەکەوێتە باشووری کیشوەری ئەفریقیا، سنووری درێژ دەبێتەوە لەسەر کەناری زەریای ئەتلەسی، لە باکووری ئەنگۆلا، لە رۆژهەلاتی بوتسوانا، لە باشووری کۆماری باشووری ئەفریقیا.
- مێژووی ولات: لە سەدەی شانزەم هۆزەکانی هیربرۆ کە بەزمانی بانتۆ ئاخاوتنیان دەکرد روویان لە باکوری رۆژئاوای ناوچەکە کردو هۆزەکانی ئۆفمیۆ رویان لەباکور کرد. بەلام لەدوای سەدەی نۆزدەم کۆمەلەی دیتیس زۆربەیان لایەنگیری ئەلمانیا بوون، لە وولاتەکە، لە سالی ١٨٩٢ کرێکارە کشتوکالیەکان جێگیربوون لە ناوچەکە؛ لەدوای بوە ژێردەستەی ئەلمانیا وناوی رەسمی بوە باشووری رۆژئاوای ئەفریقیا، لە سالی ١٩١٥ هێزی باشووری ئەفریقیا دەسەلاتیان بەسەر وولاتەکەدا گرتو بوە ئینتداب، لە سالی ١٩٢٠ بە پێی پەیمانی فەرەسای لە سالی ١٩٦٦ رێکخراوی سوابۆی مارکسی دەستی کرد بە شۆرشی چەکداری لە پێناو سەربەخۆی، لە سالی ١٩٦٨ لەسەر داوای کۆمەلەی گشتی نەتەوە یەککگرتوەکان ناوی بوە نامیبیا لەبەر هەلکەوتی ناوچەکە، لەسالی ١٩٧٤ نەتەوەیەککگرتووەکان داوای لەباشووری ئەفەریقیا کرد کە دەسەلات بدرێتە نامیبیەکان...

لە ١٩٨٨/٩/٢٢ لە دوای کێشەو ململانێی نێوان شۆرشگێران ودەسەلاتی باشووری ئەفریقیا بە چاودێری نەتەوە یەککگرتوەکان وچەندین لایەنی تر توانرا سەربەخۆی نامبیا رابگەیەنرێت، لە ١٩٩٠/٢/٩ دەستوری نوێ راگەیەندرا بە دامەزراندنی حکومەتی فەرەلایەنی، لە ١٩٩٠/٥/٢١ نامیبیا سەربەخۆی تەواوی خۆی راگەیاند، لە سالی ١٩٩٤ رێکخراوی سوابۆ سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنا لە هەلبژاردن بە سەرۆکایەتی وولاتو پەرلەمان، تاکو دوای سالی ٢٠٠٠ گۆرینی دەسەلات بەپێی هەلبژاردنەکان ئەنجام ئەدرا.

- نامیبیا ئەندامە لە نەتەوە یەککگرتوەکان، ئەندامە لە رێکخراوی فاو، بانکی نێو دەولەتی، رێکخراوی کاری نیودەولەتی، خەزنەی نێودەولەتی، رێکخراوی تەندروستی نێو دەولەتی، چەندین رێکخراوی تری جیهانی.

# ئەسیوبیا

- ناوی رەسمی: کۆماری ئەسیوبیای دیموکراتی یەکگرتوو.
- پایتەختی: ئەدیس ئەبابا، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٥٥٠ر٢ ملیۆن کەسە.
- شارە گرنگەکانی: جیما، دیر داوا، هارار نزریت، دیسی.
- رووبەری: ٣٢١ر٤٣٥میل چوار گۆشەو٠٠٠ر١٢٨ر١ کیلومەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٧٠٠ر٥٩ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ٢٠٠١.
- چری دانیشتوانی: ٥٣ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٤٪.
- نژادەکانی: زیاتر لە ٧٠ کۆمەڵەی نژادەیە، دوو کۆمەڵەیان سەرەکین ئەویش کۆمەڵەی جەلا (کۆبوونەتەوە لەناوچەی رۆژهەڵات و باشووری گردۆلکانی ناوەندی) کەلە ٤٠٪ دانیشتوان پێك دێنن.
- زمانەکانی: ئەمهەری (رەسمیە) تیجیرینیا، ئورومینجا، عەرەبی.
- ئاینەکانی: موسڵمان ٤٨٪. ئۆرسۆزکسی ئەسیوبی ٣٧٪. ئەنیمیۆن.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٥ر٣٦٪.
- رژێمی دەسەڵات: لەقۆناخی گواستنەوە بۆ کۆماری دیموکراتی فیدرالی، دەستوریان پێشکەش بەکۆمەڵەی دامەزرێنەر کراو هەڵبژێردرا لەمانگی /٧/ ١٩٩٤ . ژمارەی کورسی پەرلەمانی نوێ ٥٤٨ کورسیە. هەڵبژاردن لەمانگی/١٩٩٥/٥ ئەنجام دراو پارتی هاوپەیمانی دەسەڵاتدار سەرکەوت (ناسراو بەپارتی دیموکراتی شۆڕشگێری گەلی ئەسیوپی بۆماوەی پێنج ساڵ.
- پارتە رامیاریەکان: بەرەی دیموکراتی شۆڕشگێری گەلی ئەسیوبی، پارتی نەتەوەیی.چەپی ناوەندی، بەرەی رزگاری گەلی بتجریە، جولانەوەی دیموکراتی گەلی ئەسیوپی. بەرەی رزگاری ئۆرومۆی یەکگرتوو. پارتی ئیسلامی نەتەوەیی.
- دابەشی کارگێری: ٩ هەرێمی کارگێریە + پایتەختی یەکگرتوو.
- بەرگری: ٧ر٢٪ لە لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر١٢٠هەزار کەسە.
- دراوی: بیر یەکسانە بە ١٠٠ سەنت.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٢٩ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٣٠ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ١٢٪ لەخاکە وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنمو جۆ، چەوندەرەی شەکر. پەمۆ، تەرەو میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: چێڵ٩٠٠ر٢٩ ملیۆن سەر، مەڕ ٧٠٠ر٢١ ملیۆن سەر، بزن ٧٠٠ر١٦ ملیۆن سەر، پەرەور ٥٥ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی کارەبا: ٨٠٠ر١ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: پلاتینیۆم، زێڕ، نوحاس، بۆتاس.
- پیشەسازی: ئامادەکردنی خۆراك، کیمیاوی، بەرهەمی شیری، نەوت، دروستکردنی پێڵاو، خۆشکردنی پێست، ئامادەکردنی گۆشت.
- دەرچوەکانی: بەرهەمی شیر، بەرهەمی پێست، زێڕ، بەرهەمی نەوت، ئاژەڵی زیندو، گۆشت.
- داهاتی دەرەوەی: ئامێرو ماشێن، هێنانە ناوەوەی پیشەسازی، داودەرمان، کیمیایی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: شانشینی سعودی، ئەڵمانیا، یابان، جیۆبۆتی، ئەمەریکا، ئیتالیا.
- جوگرافیای وڵات: ئەسیوبیا دەکەوێتە

ڕۆژهەڵاتی ناوەندی ئەفریقیا، سودان دەکەوێتە ڕۆژئاوای ، سۆماڵ و جیۆبۆتی لەڕۆژهەڵاتی، کینیا لەباشوور. ئەریتیریا لەباکووری ڕۆژهەڵاتی.

ئەسیوبیا وولاتێکی گردۆلکەیە، چەندین چیای بەرزی تێدایە. بەرزترین چیای داتشا کە بەرزی ٤ر٦٢٠ مەترە، زێی نیلی شین لێی هەڵدەقوڵێ (زێی ئابالی) لەباکووری ڕۆژئاوا دێتە خوارێ لەشێوەی نیو بازنەی مەزن بەرەو ڕۆژهەڵات و دوای بەرەو باشوورو دوایی بەرەو باکووری ڕژئاوای پێش ئەوەی بچێتە ناو خاکی سودان کەخۆی لە زێی ئەمباری دەکاتەوەو دەریاچەی (تانایە) لەبەشی باکووری ڕۆژئاوای گردۆلکەکانی سەرەکیەو لەسودان دەگەنە یەکتر لەنزیك شاری خەرتوم لەگەڵ زێی نیل بەرەو میسر دەچێت. لەوێ ڕووباری تر هەیە. لەباکووری ڕۆژهەڵاتی سودان نەویایەکی تیایە کە نزمیەکەی دەکاتە ١١٦ مەتر لەژێر ئاستی ڕووی دەریا، کەش و هەوای لە هاوین و بەهار گەرمەو بارانی لێ دەبارێ لەمانگی ئادارو نیسان تاکو مانگی ئەیلول، لە نزمایەکانی باکووری ڕۆهەلات و باشووری ڕۆژئاوا کەش و هەوا گەرمەو نیمچە وشکانیە.

- مێژووی ولات: ئەسیوبیا کۆنترین دەوڵەتە لەئەفریقیای ڕەش. ئەگەر بەدوای مێژوو بگەڕێین و بەراوردی تۆمارەکان بکەین ڕابردووی دوو هەزار ساڵ پێش ئێستایە. دەسەڵاتداریەتی دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی (شانشینی یەکەم). بڕوا وایە کەدەگەڕێتەوە بۆ کوڕی شاژن (سەباو شانشین سلیمان) بەلام وولات بە شێوەی ئێستای نەبوە ئەویش بە یەکگرتووی چەند شانشینێکی بچوك کەدژایەتی و لایەنگیرانی دەرەبەگ و ئیمبراتۆریەتی ئەسیوبیان دەکرد.

گەلانی هەمە لایەن لەئاسیای بچوك کۆچیان کردوە بەرەو ئەسیوبیا پێش مێژوو. بەپەڕینەوەی بازرگانە سامیەکانی عەرەب کە لەبیابانی عەرەبی ڕویان تێکردبوو لەسەدەی حەوتەمی پێش زایین. بەندەرەکانی لەسەر دەریای سوور بوو گرنگیەکی تایبەتی هەبوو بۆ ئیمپراتۆریەتەکانی ڕۆمانی و بیزەنتیەکان. بەلام مەسیحیەکانی قبتی رویان لەم وولاتە کرد لە ساڵی ٢٤١ زاینی. دەوڵەتی ئەسیوبیا یەك لەو مەزهەبە مەسیحیە قبتیانەی کردە ئایینی ڕەسمی خۆیان.

ئەسیوبیای کۆن گەیشتە ئەوپەڕی مەزنی لەسەدەی پێنجەمدا ، بەلام جەنگی دەرەبەگایەتی لاوازی کرد . لە ساڵی ١٨٩٦ لەسەر دەستی شانشین مینلیهکی دووەم ئەسیوبیا هاتەوە گۆڕەپان و سەربەخۆی چەسپاند بەسەر کەوتنی بەسەر داگیر کەرانی ئیتاڵی ، لەدوای مردنی شانشین ئاژاوەو کێشە دەستی پێکردو کچی کورەکەی دەسەڵاتی وەرگرت لە ساڵی ١٩١٧ ، تافاری ماکۆنیش کوڕی مامی بوە وەلی لەسەر کورسی وەك وەلی سەردەم .

لەدوای مردنی ئیمبراتۆرەکە تافاری تاجی ئیمبراتۆری لەسەر کرد بەناوی ئیمبراتۆر هیلا سیلاسی یەکەم. دەستی کرد بەقەدەغە کردنی بەندایەتی و هەمووی خستە ژێر دەسەڵاتی ناوەندی خۆی کۆکردنەوەو دەستی کرد بەچاکسازی.

لە ساڵی ١٩٣١ دەستوری نوێی بۆ وولات دانا، لە ساڵی ١٩٥٥ دوبارە پێداچوونەوە بە دەستورو پەرلەمانی دامەزراند لەئەنجومەنی پیران و ئەنجومەنی نوێنەران، ڕژێمی بۆدادەکان دانا بەلام دەسەلاتە سەرەکیەکان لەژێر دەستی خۆی بوو. ئیتاڵیا سوور بوو لەسەر پێك هێنانی ئیمبراتۆریەتی ئیستیعماری کە هەڵسا بەداگیرکردنی ئەسیوبیا لە ٣/١٠/ ١٩٣٥ و هیلا سیلاسی ناچار کرد کەکۆچ بکات بەرەو هەندەران لەمانگی /١٩٣٦/٢. ئەسیوبیاش خرایە پاڵ ئەریتیریای ژێر دەستەی ئیتاڵیاو هەردووکی کردە سومالی ئیتاڵی، ئەسیوبیا بۆیەکەم جار لەمێژوودا سەربەخۆی لەدەستدا، لە ساڵی ١٩٤١ بەریتانیا

تـوانی ئیتالیـەکان لەئەسـیوبیا دەربکـات و هـیلا سیلاسی بگەڕێنێتەوە ئەدیس ئەبابا.

لـە مـانگی /٩/١٩٤٧ هـیلا سیلاسـی لەسـەر کورسی هێندرایە خوارەوە بەهۆی خۆپیشاندان و گیرو گرفتو برسیەتی و وشکانی ناوچەکە کە بوە هـۆی مردنـی بـە دەیـا هـەزار کـەس، هیلاسلاسـی زیـاتر لـە ٥٨ سـاڵ حـوکمڕانی کـردو جەنـەڕاڵی سـەربازی (نیفـی بنتـی) دەسـەڵاتی وەرگـرت و کۆشـکی هـیلا سیلاسـی خۆمـاڵی کـردو بڕیـاری دەرنەچـوونی لەئـەدیس ئەبابایـدا، پەرلـەمانی هەڵوەشـاندەوە و دەسـتوری لـەکار وەسـتاند، دەستی کـرد بـەگۆڕینی ڕژێمـی دەسـەڵات بـەرەو بردنی ئەسیوبیا بۆ دەوڵـەتێکی سۆشیالستی، لـە ساڵی ١٩٧٥ هـیلا سیلاسی کۆچی دوایی کرد. ماوە بۆ سـەربازە دەسەڵاتدارەکان خۆشتر بوو بۆ دامەزرانـدی دەوڵـەتی تاکـە پـارتی بـە جێبـەجێ کردنـــی پڕۆگرامێکـــی ســـەرکەوتوو لـــەبواری کـــشتوکاڵی، بەرهەڵـــستکارانی دەســـەڵاتی لـــەناوبردوو شانـــشینی لـــە ســـاڵی ١٩٧٥ هەڵوەشـاندەوە، لـە سـاڵی ١٩٧٧ نیفـری تیتـی کـوژراو عەقیـد منجـستو هـیلا مریـام جێگـەی گرتـەوە، لـەماوەی ١٩٧٧ تـاکو ١٩٧٩ بـەماوەی تـیرۆری سـوور نـاوبرا کـە بەهـەزارا بـێ تـاوانی کوشـت و پـاڵی بەخـەلکی وەدەنـا کەکـشتوکاڵ بەکۆمەڵی بکەن لەسەر شێوازی سۆڤیەتی. لەدوای ئـەو بارودۆخـە نالـەبارە و سـەرهەڵدانی چـەندین گروپـی نـوێی دژ بـەڕژێمی نـوێ و تێـك چوونی پەیوەنـــدی لەگـــەڵ ئەمـــەریکاو مـــۆرکردنی ڕێکەوتننامـە لەگـەڵ یـەکێتی سـۆڤیەت لەسـاڵی ١٩٧٧. بەســـەرهەڵدانی بـــیری نەتـــەوەیی و تیرمگەری بەپاڵپشتی سودان و سۆماڵ، لە ساڵی ١٩٧٨ ڕاوێژکارانی سۆڤیەت و هێزی کوبا هێزی سـۆماڵیان دەرپەڕانـد. دوایـی لـە سـاڵی١٩٨٨ ئەســـیوبیا و ســـۆماڵ ڕێککـــەوتنی ئاشـــتیان مۆردکرد. لە ساڵی ١٩٨٤ ڕژێمی منجستو هیلا مریـام پـارتی کۆمۆنیـستی دامەزرانـدو بـووە سـەرۆکی پارتەکـە، لـەدوای ئـەوە وولات توشـی گـەورەترین کارەسـاتی برسـیەتی بـوەوە بـەهۆی نـەبوونی بـاران و وشـکانی. دوای ئـەوە بـەهێزی چـەکداری پڕۆگرامـی نیـشتەجێکردنی بـەزۆر لەئـەریتیریاو نیجیریـا لـەباکورو لەوبارودۆخـە وشکانیە زیاتر لەملیۆنێك کەس لەبرسان مردن، لە ساڵی ١٩٨٨ هەوڵی کودەتایەکیان دامرکاندەوە لەدژی منجستۆو لەهەمان کاتاسەرۆکی پێشووی ئەمـەریکا جیمـی کـارتر هەڵـسا بەڕێکخـستنی گفتوگۆی ئاشتی لەگەل شۆڕشگێڕانی ئەریتیریا، لەمانگی /٢/١٩٩١ بەرەی دیموکراتی شۆڕشگێڕی گـەلی ئەسـیوپی شـالاویان بـردە سـەر هێـزی حکومـەت، منجستۆ لەدەسـەڵات لابـراو بـەرەی شۆشـــگێری دیمـــوکراتی گـــەلی ئەســـیوبیا حکومـــەتێکی گواســـتنەوەیان پێـــك هێنـــا بەسـەرۆکایەتی (میلـیس زینـاوی)، لـەمانگی/٢/ ١٩٩٤ بڕیـــار لەســـەر دەســـتور دراو یەکـــەم هەڵبـژاردنی فـرە لایـەنی گـشتی ئـەنجام درا لـە مێـژووی ئەسیوبیا ئـەویش لـە سـاڵی ١٩٩٥. کـە پـارتی دەسـەڵاتدار سـەرکەوتنی باشـی بەدەسـت هێنـا بەهەڵبـژاردنی بنجاسـۆ بەسـەرۆك کۆمـارو زیناوی بەسەرۆك وەزیـران. حکومـەتی نوێ هـانی کەرتی تایبەتی دا لەکشتوکاڵ و ئابووری.

لـەمانگی/٥/ ١٩٩١ بـەرەی ڕزگـاری گـەلی ئـەریتیریا کـە ڕێکخراوێکـی جیاکـەرەوە بـوو دەسـەڵاتی لـە ناوچـەی ئـەریتیریا گرتـە دەسـت. دوای ئەوە هەردوو کۆمەڵەی ئەریتیریا و ئەسیوبیا ڕازی بوون لەسـەر ئـەوەی کـە دواڕۆژی ئـەریتیریا بخرێتـە ژێـر دەنگـدان لـەبارەی سـەربەخۆیی ئـەریتیریا بەچـاودێری نێودەوڵـەتی. دەنگـدان ئـەنجام درا لـەمانگی/٤/ ١٩٩٣ و ئەریتیریـەکان بـەڕازی بـوونی تـەواو دەنگیـان بـۆ سـەربەخۆی ئـەنجام داو ئەسـیوبیا دانـی بەسـەربەخۆیی ئەریتیریا نـا لـە ١٩٩٣/٥/٢٤، تـا کۆتـایی ٢٠٠٤ زیناوی بەردەوام بوو لەدەسەڵات سەرەڕای کێشەو گیروگرفتی سنووری لەگەڵ ئەریتریا.

- ئەسـیوبیا ئەندامـە لەنەتـەوە یـەککرتووەکان، ئەندامە لەڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا.

# ئـەريتـــيريا

- ناوی ڕەسمی: دەوڵەتی ئەریتیریا.
- پایتـەختی: ئەسمـەرە، ژمـارەی دانیـشتوانی ۰۰۰ر٤٥٧هەزار کەسە.
- شارە گرنگەکانی: کیرین، ئادیجرات .
- بەندەرەکانی: عەسەبە، مەسارە.
- ڕووبـــەری: ٧٥٤ر٤٥ میـــل چـــوار گۆشەو ۳۰۰ر۱۲۲کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- ژمـارەی دانیـشتوانی:۰۰۰ر٥٠٠ر٤ ملیـۆن کەسە، بەپێی ئاماری بڵاوکراوەی ساڵی ۲۰۰۰.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٩ر٢٪ .
- چڕی دانیشتوانی: ۹۸ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا .
- نژادەکانی: کۆمەڵێك تیرەی هەمەجۆرە لەوانە ئەمهارا، تیجریس.
- زمانەکانی: ئەمهریە (زمانی ڕەسمیە) تیجوینیا (ڕەسمیە) عەرەبی، ئافار، بیلین و زمانی تر.
- ئاینەکانی: موسڵمان، مەسیحی، قبتی.
- زانینی نوسین و خوێندن: ۲۰٪ .
- ڕژێمی دەسەڵات: حکومەتێکی گواستنەوەیە ، دەستوری ڕاگەیاند بەڕژێمی دیموکراتی.
- پارتـە ڕامیاریـەکان: بـەرەی میللـی دیمکراتـی دادوەری (بـەرەی ڕزگـاری ئـەریتیری– پێشوو) چـەپی ناوەنـد، هاوپـەیمانی نیـشتیمانی ئـەریتیری، پـارتی مـام ناوەنـدی، پـارتی ناوەندی،.
- دابەشی کارگێڕی: ٨ هەرێمە.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر٥٥ هەزار کەسە.
- بەرگـــەری : ٣ر٨ لـــەکۆی دەرئـــەنجامی ناوخۆیی.
- دراوی :بیری ئەسیوپی کـە یەکسانە بـە ۱۰۰ سنت.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥ر٢ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆی ٦٠٠ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ۱۳٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهـەمی کـشتوکاڵی: پـەمۆ، ماسـت و شـیر، نیسك، سۆدیۆم، تباق، گەنموجۆ، چەوەندەری شەکر، تەڕەو میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ۰۰ ٥ر١ ملیۆن سەر، بزن ٤٠٠ر١ ملیۆن، سەر، چێڵ ۳۲۰ر۱ ملیۆن سەر، پەرەور ۳۰۰ر٤ ملیۆن سەر.
- سـامانی سروشـتی: زێـڕ، بۆتـاس، نوحـاس، زەنگ.
- پیـشەسازی: ئامـــادە کردنـــی خـــۆراك، خۆشکردنی پێست، دروستکردنی خواردنەوە، ئامادەکردنی گۆشت..
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەسیوبیا. سعودیە، یەمـەن، ئیتالیا، ئـەڵمانیا، ئەمـەریکا. ئـابووری وڵاتەکـەیان زیـانی زۆری پـێ کـەوت بـەهۆی جەنگـــەکانی ســـەربەخۆو کارەســـاتەکانی سروشـتی دوورو درێـژ. میراتگـەری ئەریتیریاکـە هـەمووی لـە شـارەکانی ئەسیوبیاو داهـاتووی درێـژی لەپێـشە لەجێبـەجێکردنی داهاتـەکان بەپەرەسەندن و بوژانەوەی چاوگە نەوتیەکانی دەریاو ڕاوی ماسی و گەشت و گوزار.
- جوگرافیـــای وڵات: دەکەوێتـــە ڕۆژهـــەڵاتی ئـەفریقیاو کـەنارەکانی باشـووری ڕۆژئـاوای دەریای سوور ، ئەسیوبیا لـە باشوور، جیبۆتی لـە باشـووری ڕۆژهـەڵات، سـودان لـەڕۆژئاوا، ئەریتیریا چەندین دورگـەی هەیـە لـە ئەرخـەبیل دەملەك، لەباشوور دەشتایی کەنارە نزمەکانە، لە باکور زنجیرە چیای تیایە، کەنارێکی تەسکی

له سەر دەریای سوورو لەزۆربەی ناوچەکانی ئەفریقیا گەرمو وشکانیە، بەلام بەرزایەکانی ناوەندی زیاتر ساردن کە کەندو دۆڵو دشتایی بەپیتی هەیە بۆ کشتوکاڵ.

- مێژووی وڵات: ئەریتیریا پارچەیەك بووە لە شانشینی (ئەسکۆمی ئەسیوبی یەکەم تاکو کاتی ڕوخانی لەسەدەی هەشتی زاینیی. دوای کەوتە ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەسەدەی شانزەهەم، دوای کەوتە ژێر دەسەلاتی میسریەکانو دوای کەوتە ژێر دەسەلاتی ئیتالیەکانو لە سالی ١٨٨٥ ناوچەی کەنارەکانی داگیرکرد، بەپێی پەیمانی (ئۆکیالی) لە ١٨٨٩/٥/٢ ئیتالیا مافی سەر بەخۆیی دا بەئەریتیریا لەسەر بەشێکی خاکی ئەریتیریا، ئیتالیەکان ناویان نا بە ناوی ڕۆمانی دەریای سوور. ئەویش (میر ئریپریۆم) کە دەسەلاتی گرتە دەست تاکو جەنگی دووەمی جیهان.

لە سالی ١٩٤١ بەریتانیا پەلاماری داو داگیری کردو سەرپەرشتی دەکرد وەك هەرێمێك لە ژێر ئامۆژگاری نەتەوە یەکگرتووەکان تائەو کاتەی یەکیان گرت لەگەل ئەسیوبیا. لە ١٩٥٢/٩/١٥، لە ١٩٦٢/١١/١٤ بوە هەرێمێك لە ئەسیوبیا. لەدوای سێ سال تێکۆشانو خەبات کردن و قوربانیدان زیاتر لە ١٥٠،٠٠٠ هەزار کەس کوژران تاکو لابردنی (ئیمپراتۆر هیلا سیلاسی) بەرەی ڕزگاری گەلی ئەریتیریا کە پێك هاتبوو لە سالی ١٩٥٨ لەتێکۆشان بەردەوام بوولە پێناو سەربەخۆیی وولاتەکەو . لەبەردەوامی ململانێی خوێناوی بەدرێژایی هەفدە سال دژی دەسەلاتی مەنجستوی کۆمۆنیستی توندڕەو .. لە سالەکانی ١٩٧٧و١٩٧٨ بەرەی ڕزگاری ئەریتیریا خاکی ئەریتیریای پاککردەوە لەهێزەکانی ئەسیوبیا. بەلام بارودۆخ بە پێچەوانە هەلگەڕاوە بەهۆی پشتگیری سۆڤیەت لەدەسەلاتی کۆمۆنیستی ئەسیوبیا. لە ناوەڕاستی هەشتاکان برسیەتی و مردن و دەربەدەری و وشکانی و نەبوونی باران لە ئەریتیریا و نالەباری کۆچبەران و لەوکاتەش حکومەت هەلسا بەجێنشین کردنی بەزۆر وبێ ڕەزامەندی خەلك.

لە سالی ١٩٩٠ شۆڕشگێڕە ئەریتیریەکان بەندەری مەسوای ستراتیژیان داگیرکرد. لەمانگی/٣/ ١٩٩١ مەنجستو مریام لابراو بەرەی ڕزگاری گەلی ئەریتیریا لەسەر خاکی ئەریتیریا دەسەلاتیان سەپاند. هەردوو لایەنی ئەسیوپی و ئەریتیری ڕازی بوون بەوەی کەسەربەخۆیی ئەریتیریا بخرێتە دەنگ دان ئەوەبوو لە ١٩٩٣/٤/٢٥/٢٣ دەنگدەران ڕەزامەندیان لەسەر سەربەخۆیی بنچینەی ئەریتیریا کرد. لە ١٩٩٣/٥/٣ ئەسیوبیا دانی نابە سەربەخۆیی ئەریتیریاو سەردەمێکی نوێ لەبارو دۆخێکی نوێی ناوچە هاتەکایەوە، سەرەڕای تەنگەژەی سنوروو دەست تێوەردانی دراوسێکانی بەلام توانیان ئارامی تا ڕادەیەك جێگربکەن، لەمانگی /١٢/ ١٩٩٤ ئەریتریا پەیوەندی خۆی لەگەل سودان پچڕاند بەهۆی دەست تێوەردان لەکارو باری ناوخۆی ئەریتریا لەڕێگەی ئیسلامە ڕادیکالەکان... دوای ئەوە (ئەفرۆق) بەسەرۆك کۆمار هەلبژێردراو مانەوەی تا کۆتایی سالی ٢٠٠٢لەدەسەلات.

- ئەریتیریا ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا..

# ئەفریقیای ناوەندی

- ناوی ڕەسمی: کۆماری ئەفریقیای ناوەندی.
- پایتەختی: بەنجی، ژمارەی دانیشتوانی ۵۷۹ر۰۰۰ هەزار کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: بربیراتی، بوار، بۆسیخۆ.
- ڕووبەری: ۵۳۳ر۲٤۰ میل چوار گۆشەو ۶۲۲ر۹۸۰کیلۆمەتر چوارگۆشەیە .
- ژمارەی دانیشتوانی: ۳ر۹٦٤ر۰۰۰ ملیۆن کەسە، بەپێی زانیاریەکانی ۱۹۹۹.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۲ر۷ ٪ .
- چڕی دانیشتوانی: ۱٦ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- نژادەکانی: بایا ۳٤ ٪ باندا ۲۷ ٪ مەنجیا ۲۱ ٪ سارا ۱۰ ٪ .
- زمانەکانی: فەڕەنسی (زمانی ڕەسمیە) سیخۆ (نیشتیمانیە) عەرەبی، هۆنسا، کەناریەکان.
- ئاینەکانی: پرۆتستنت ۲۵ ٪ کاسۆلیکی ڕۆمانی ۲۵ ٪ بیروڕای ناوخۆیی ۲٤ ٪ ئیسلام ۱۵ ٪ .
- زانینی خوێندن و نوسین: ٦۵ ٪ .
- ڕژێمی دەسەلات: کۆمارێکی دیموکراتی تازە پێگەیشتووە. لە ساڵی ۱۹۹۱ یاسای پارتە ڕامیاریەکان دەرچوو کە ئێستا پانزە پارتی رامیاری تیایەو ناویان لە تۆمارەکانی وەزارەتی ناوخۆ تۆمار کراوە. پێشبڕکێی نێوان پارتەکان بەردەوامە بۆ دەسەلات وەرگرتن لە ڕێگەی هەڵبژاردنی سەرۆك و ئەنجومەنی یاسا دانان و جێبەجێکردن.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی ڕزگاری گەلی ئەفریقیا، چەپی ناوەندی، نەتەوەیی، ڕاست ڕەوی ناوەند.
- دابەشی کارگێری: ۱٦ پارێزگایە.لە گەل یەك ئەنجومەن.
- بەرگری ٤٪ . لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٤۷ر۰۰۰ هەزار کەسە.
- دراوی: فرنك سیعا.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۲ر۸۰۰ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۱ر۰۰۰ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ٤٪، لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵ: پەمۆ، شیر، گەنمەشامی (دەرزەرد) فولی سودانی، کەسافە دانەوێڵەیەکە کە تۆیەکەی بۆ نان بەکاردێت، ئەلیام جۆرێکە لە پەتاتە دەچێت، گەنمو جۆ، تەرەومیوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: چێڵو گامێش۲ر۸۰۰ ملیۆن سەر، بزن ۱ر۲۵۰ ملیۆن سەر، پەرەور ۳ر۸۷۰ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی کارەبا: ۱۰۵ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- سامان سروشتی: ئەڵماس (گرنگترین بەرهەمە بۆ ناردنە دەرەوە) یۆرانیۆم، دار.
- پیشەسازی: دار، بەرهەمی ڕستن و چنین، سابون، جگەرە، ئەڵماس، ئامادە کردنی خۆراك، خۆشکردنی پێست..
- دەرچوەکانی: ئەڵماس، پەمۆ، دار، شیر، توتن، خوری، ئاژەڵی زیندوو.
- داهاتەکانی دەرەوەی: ئامێرو کەلوپەلی کارەبا، بەرهەمی نەوتی، بەرهەمی ڕستن و چنین، خۆراك: ئۆتۆمۆبێل، کیمیا، داو دەرمان، کەلوپەلی بەکارهێنان، کەلوپەلی پیشەسازی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: فەڕەنسا، بەلجیکا، ئیتالیا، یابان، ئەمەریکا، ئەورووپای ڕۆژئاوا،

جەزائیر، یۆگسلافیا، وولاّتانی ئەفەریقی.

- جوگرافیای وولاّت: ئەفەریقای ناوەندی کۆمارێکی سەربەخۆیەو هیچ کەنارێکی ناوخۆیی نییە، دراوسێکانی تشاد لە باکور، کامیرۆن لە ڕۆژئاوا، کونگۆو بەرازافیل و کۆنگۆکینشاسا (زائیری پێشوو) لە باشوور، سودان لە ڕۆژهەلاّت، لەباشوور دارستانی بارانەیی هەیە، زەویەکەی نیمچە بیابانیە لە ڕۆژهەلاّت، ڕوباری تیایەو دێتە خوارێ لەلایەنی باشوور و بەرەو کۆنگۆو ئەریتریاو بەرەو باکورو دەریاچەی تشاد دەڕوات ، گرنگترین زێیەکانی ئۆینجی و زێی شاری ، گیاو ڕوەك زۆربەی وولاّتی داپۆشیوە، لە باکور بارانی هەیە، بەلاّم لە باشوور کەشوهەوای نزیکە لەمێلی کەمەرەی زەوی.
- مێژووی ئەفەریقای ناوەندی: سەعدانیەکان لەسەدەی دەی زاینی کۆچیان کرد بەرەو ڕۆژهەلاّتی ولاّت و کامیرۆنیەکانیش بەرەو ڕۆژئاوا، لەسەدەی شانزەهەم بوە پارچەیەك لەئیمپراتۆریەتی جۆرجیا، بەلاّم بەهۆی چەوسانەوەی دیلایەتی گەلانی ئەفریقیای ناوەندی لەلایەن دەرەبەگە خاوەن زەویەکان‌و دوبەرەکی و دابەش کردن سەری هەلّدا لەگەلّ ئەوەشدا تیرە بانتۆنیەکان بەرەو ولاّت کۆچیان دەکرد پێش ئەوەی فەڕەنسا دەسەلاّتی بەسەردا بگرێت لەناوچەکەو لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم هەولّی دامرکاندنەوەی جولانەوەی بەرهەلّستکارانیداو. لەئەنجامی ئەو گیروگرفتانە ژێردەستەی فەڕەنسا دروست بوو بەناوی ئۆینجی – شاری، بەدابەش کردنی لەنێوان بازرگانە خاوەن بەرژەوەند دارەکان. لە سالّی ١٩٠٥ ئەفریقیای ناوەندی لەگەلّ تشادیەکیان گرت بەچونە ناو گابۆن و کۆنگۆی ناوەندی، لە دوای سالّی ١٩١٠ ناسرا بە ئەفریقیای مێلی کەمەرەی زەوی فەرەنسی (افریقیا الاستوائیه الفرنسیه) لەدوای ئەوە زنجیرەیەك لە شۆڕش بەرپابوو بەلاّم فەڕەنسیەکان شۆڕشەکانی لەناو برد، لەدوای جەنگی دووەمی جیهان لەسالّی ١٩٤٦ مافی ئۆتۆنۆمیان پێدراو نوێنەریان مۆسگەر بوولەپەرلەمانی فەرەنسا . لەدوای ئەوە جولانەوەی پەرەسەندنی کۆمەلاّیەتی دروست بوو دارای سەربەخۆیی تەواوی دەرکرد.

لە١٩٦٠/٨/١٢ ئەفەریقیای ناوەندی سەربەخۆی تەواوی وەرگرت. دوای ئەوە ئەفەریقیا لەنێوان سالّەکانی١٩٦٠ تاکو مانگی /١٩٩٩/٩ بە چەندین گیروگرفت‌و ڕەگەز پەرستی تێپەریوە بەهۆی تاك ڕەوی سەرکردە دەسەلاّتدارەکان‌و پارتە خۆپەرستەکان‌و شۆڤینیەکان و پاراستنی بەرژەوەندی تەسکی پارتایەتی خۆیان لەپێناو دەسەلاّت، گەلانی کۆماری ئەفەریقای ناوەندی لەقوتی ژیان بێبەش کرابوون. سەرەڕای چەندین کاری ترو بە بۆچونی لەپێناو چارەسەر کردنی کێشەو گیرو گرفتەکان لە دوای دامرکانەوەی ڕاپەڕینەکانی سالی ١٩٩٦لە مانگی /٦ی هەمان سالّ حکومەتی یەکیەتی نیشتمانی پێك هات لە ٢١ ئەندام‌و لە هەلبژاردنەکانی ئەنجومەنی یاسادانان لە مانگی ١٩٩٨/١٢/١١ لایەنگرانی سەرۆك "باتسیە"بە زۆرینە دەنگیان بەدەست هێنا. بەلام هەر باتسیە دوبارە لە مانگی /١٩٩٩/٩بە سەرۆك کۆمار هەلبژێردراوە بۆ ماوەی ٦ سالّ.

- کۆماری ئەفریقیای ناوەند ئەندامە لە ڕێکخراوەی یەکیەتی ئەفریقیا، ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەککگرتوەکان.

# جەزائیر

- ناوی ڕەسمی: کۆماری جەزائیری دیموکراتی میللی.
- پایتەختی: جەزائیر، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٨٥٤ر٣ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکییەکانی: ئۆران، عەنابە، قوستەنتینە.
- بەندەرە سەرەکییەکانی: جەزائیر، عەنابە، ئۆران.
- ڕووبەری: ٥٩٠ر٩١٩ میل چوارگۆشەو ٧٠٠ر١٨٢ر٢ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر١١٥ر٣٢ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ٢٠٠١.
- چڕی دانیشتوانی: ٣٥ کەس لەیەک میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٤ر٢٪.
- نژادەکانی: عەرەبی بەربەر ٩٩٪.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٦٣٪.
- زمانەکانی: عەرەبی (زمانی ڕەسمییە) ئینگلیزی، فەرەنسی.
- ئایینەکانی: ئیسلامی سونە ٩٩٪ کە ئایینی دەوڵەتە.
- ڕژێمی دەسەڵات: حکومەتێکە کە هێزی سەربازی پشتگیری دەکات. لەبەر ئەوەش ناسراوە بە حکومەتێکی سەربازی سەرەڕای هەوڵدان بۆ بەرەو پێش بردنی بەرەو مەدەنیەت، لەهەموو بوارەکان.
- دابەشی کارگێڕی: ٤٨ پارێزگایە.
- پارتە ڕامیاریەکان: بەرەی ڕزگاری نیشتیمانی، نەتەوەیی سۆشیالستی، بەرەی هێزی سۆشیالستی، چەپڕەوی ناوەندی، بەرەی ئیسلامی ڕزگاری، ئیسلامە توند ڕەوەکان کە قەدەغە کراوە لەدوای ساڵەکانی ١٩٩٠ تاکو ئێستا.
- بەرگری: ٨ر٦٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی ٠٠٠ر١٣٥هەزار کەسە.
- دراوی: دینارە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر١٢١ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاک لەکۆی دەرئەنجامی ناخۆیی: ١٠٠ر٤ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٩٠٠ر١٦ ملیۆن سەر، بزن ١٥٠ر٣ ملیۆن سەر، چێل ٢٧٠ر١ ملیۆن سەر، پەرەوور ٥ر١٣٥ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، شێلم، ترشاتی، تەرەو میوەجات، زەیتون، هێلکە، چەوەندەری شەکر.
- سامانی سروشتی: نەوت، غاز، جەزائیر یەکێکە لەوڵاتە گرنگەکان لە دەرهێنانی نەوت و غاز و ناردنی بۆ دەرەوەی وڵات، ئاسنی خاو، فۆسفات، قورقوشم، زەنگ، جیوە، یۆرانیۆم.
- دەرچووەکانی: نەوت، غازی سروشتی.
- داهاتەکانی دەرەوەی: کەلوپەلی سەرمایەداری، خواردەمەنی، خواردنەوە، کەلوپەلی بەکارهێنان، ئۆتۆمۆبێل.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: فەرەنسا، ئەڵمانیا، ئیتاڵیا، ئەسپانیا، ئەمەریکا، یابان، چەندین

ولاّتانی عەرەبیو ئەفریقی.

- جوگرافیای وولاّت: مەڕاکش و بیابانی ڕۆژئاوا دەکەوێتــە ڕۆژئــاوا، لەڕۆژهــەلاّتی تــوونس و لیبیـا، لەباشووری مۆریتانیـاو مـالی و نیجیریا، لە ٦٨٪ ڕوبەری وولاّت تەپولکەی بەرزن لەسەر ئاستی دەریـا لـەنێوان ٨٠٠ تـاكو ١٦٠٠ مـەتر بەرزایی لـە ٩١٪ دانیشتوانی لـە دەشتایەكانی كــەناری بــەپیتی تەنگیــە كەیــەتی، كــەش و هەواكەی هـی دەریـای سپی ناوەڕاستە لەسەر كەنارەكانی باكورو بارانی لـەمانگی یـانزە تاكو مــانگی چــوارە، بــەلاّم لەناوچــە بیابانــەكانی وشكانیەو بارانی نییە.
- مێــژووی وولاّت: فینیقیــەكان لــە ســالّی ١٢٠٠ پێش زاینی ئارامگیربوون لەباكوری جەزائیر، لە سالّی ٤٤٠ زاینـی جـەزائیر بووە پارچەیەك لـە ئیمپراتۆریـــەتی ڕۆمـــانی ناســـراوبوو بـــە (نۆمیــدیا)بــەلاّم لــەدوای ئــەوان فندالیــەكان (ئەمانە هەمەج) یان داگیر كرد، لـە سـالّی ٥٣٤ زاینــی بیزەنتیــەكان (ئیمپراتۆریــەتی ڕۆمـانی ڕۆژهــەلاّتی) خستتە ژێــر دەســتی خــۆی، لــەو ماوەیــە جــەزائیر لــەدوا پلــەی گــیرو گرفــت و تەنگەژەی ژیان و چەوسانەوەو دەربەدەری بوو تــاكو كردنــەوەی (فتحــی) ئیـسلامی لــە سـالّی ٦٥٠ زاینــی، هــەر ئــەو جولەكەی مەڕاكشی لـە ئیــسپانیا دەركردبــوو، كــە لــە ســالّی ١٤٩٢ لەجەزائیر جێگیربوون، لەسالّی ١٥١٨ جەزائیر كەوتە ژێر دەسەلاّتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و بوە بارەگای تالاّن وداپلۆسین و چەوسانەوەو دەربــەدەری تــاكو ســالّی ١٨٣٠ لــەو كاتــەش فەڕەنسیەكان داگیریـان كرد لـە سـالّی ١٨٤٨و كردیانە پارچەیەك لە فەڕەنسا، لـە سالّی ١٩٥٤ شۆڕشی نیشتیمانی بەرپابوو دژی داگیركەری فەڕەنساكە ئەو شۆڕشە بەردەوام بوو بۆ ماوەی هەشـت سـالّ ونزیكـەی یـەك ملیـۆن جـەزائیری شـەهیدكرا تـا ئەوكاتـەی فەڕەنسای ناچاركرد

دان بەســـەر بـــەخۆیی جـــەزائیر بێنـــێ، لـــە ١٩٦٢/٧/٥ جەزائیر سەربەخۆیی ڕاگەیاندو لـە ئۆكتۆبـەری ١٩٦٣ ئەحمـەد بن بلا بوە سـەرەك كۆمار لەرێگەی هەلّبـژێراردن وئەویش دەستی كرد بە خۆمالّی كردنی كەلوپەلەكانی بێگانە، بەرهەلّستكاران هەلّسان بە تۆلّەسەندنەوە لێی تـاكو لـە ١٩٦٥/٦/١٩ دەستگیركرا و خستیانە بەندیخانــە بــۆ مــاوەی ١٥ ســالّ ئــەویش لەئەنجامی كودەتای سەربازی كەلایـەن (عەقید هەواری بۆ مدیەن) ئەنجامدراو دەستوری لەكار وەستاند و نیازی ئارامی بوونـەوەی ولاّت بوو. (هەواری بۆمدیەن، ئەو كەسەبوو كە ناوبژیوانی نێـوان شـای ئێـران و سـەدام حسێن جێگـری ســەرۆكی ڕژێمــی عیراقــی كــرد بەپــشتیوانی ئەمـەریكاو بـەریتانیاو ئەنجامەكـەی بـوە هـۆی مــۆركردنی ڕێكەوتننامـــەی جـــەزائیر لـــە ١٩٧٥/٣/٦ كە بووە هۆی هەرەسی پـێ هێنانی شۆڕشی ئەیلولی مەزن لەكوردستانی باشووری لكێنراو بەعێراق) ، هەواری بۆ مدیـەن لـەمانگی /١٢/ ١٩٧٨ كۆچـی دوایـی كـردو (شـازلی بـن جدیـد) جێگـەی گرتـەوە كـە سكێرتێری بـەرەی نەتەوەیی ڕزگاری بوو، لـەكاتی سەركردایەتی شازلی جەزائیر ڕۆلّـی سـەركردایەتی كاروباری بــاكوری ئــەفریقیای دەكــرد، بــەلاّم لــە سـالّی ١٩٨٨ تەنگوچــەلّەمەی تونــدی كۆمەلاّیــەتی و ئابووری پەیدابوو بەهۆی ڕوخانی نرخی نـەوت و خراپی كاروباری وولاّت و بووە هۆی مردنـی زیــاتر لــە ٥٠٠ كــەس لــە خۆپیــشاندەران، لــە ســالّی ١٩٨٩ دەنگــدەران ڕازی بــوون لەســـەر دەستوری نوێی وولاّت و خۆشكردنی ڕێگە بۆ ڕژێمی فرە پارتی، لەمانگی /١٩٩١/١٢ بۆ یەكەم جار لە مێژووی جەزائیر هەلّبژاردنی پەرلـەمانی ئــەنجام درا، پـــارتی ئیـــسلامی تونـــدڕەو ســەركەوتنی بەدەســت هێنـا (بــەرەی ڕزگــاری كردنی ئیسلامی) بەلاّم هێزی سوپا ماوەی پـێ نــەداو كودەتایــەكی ســەربازی ئــەنجام داو

ئیسلامیەکانی ناچارکرد دەسەڵاتیان بوستێنن. ئیتر ئەو کێشەو ململانێیە بەردەوام بوو لەسەر دەسەڵات و گیروگرفت و تەنگوچەڵەمەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و رامیاری تاکو مانگی ١٩٩٩/٤/ کە عبدوالعزیز بۆتەفلیقە بەسەرۆك کۆمار هەڵبژێردراو تاکو کۆتایی ساڵی٢٠٠٤ لەدەسەڵات بەردەوام بوو کە بارودۆخی جەزائیر ئارامی بەخۆیەوە نەدیوە بەهۆی جیاوازی رەگەزی و بیرو بۆچوونی رامیاری و لەلایەکی تر کرداره نارەواکانی ئیسلامیە توندرەوەکان، عبدالعزیز بوتەفلیقە لەکاتی دەسەڵاتی هەواری بۆمیدیەن وەزیری دەرەوەی جەزائیر بوو رۆڵی گرنگی هەبوو لەرێکەوتنامەی نێوان دەسەڵاتی بەعسی لە عێراق وشای ئێران لەپێناو هەرەس پێهێنانی شۆرشی ئەیلول.

- جەزائیر ئەندامە لە زانکۆی عەرەبی، ئەندامە لە رێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە رێکخراوی وولاتانی دەرهێنەری نەوت، ئەندامە لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

# گابۆن

- ناوی رەسمی: کۆماری گابۆن.
- پایتەختی: لیبرفیك، ژمارەی دانیشتوانی ٣١٥ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- شارە گرنگەکانی: ماسکۆ (فرانس – فیل).
- بەندەرە گرنگەکانی: بۆرت جنتیك، ئۆندۆ.
- رووبەری: ١٠٣ر٣٤٦ میل چوارگۆشەو ٢٦٧ر٦٦٧ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ١ر٥٢٥ر٠٠٠ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٨.
- چری دانیشتوانی: ١٥کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢ر٩٪.
- نژادەکانی: شعوبە، فانج، عەشیرە، بایۆنۆ، باتیك، زۆر لەگەلانی بانتوو ئەفریقین و ١٠٪ ئەورووپین و زۆربەیان فەرەنسین.
- زمانەکانی: فەرەنسی (زمانی رەسمیە) زاراەی بانتو و هی تر.
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی رۆمانی، ئیسلام، ئەینمیۆن.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٦٤٪.
- دابەشی کاگێری: ٩ پارێزگایە و دابەشی ٢٧ بەش کراوە.
- بەرگری: ٣ر٥٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی:
- سوپاکەی: ٤٧ر٥٠٠هەزار کەسە.
- دراوی: فرنك سیفا.
- کۆی دەرئەنجامی ناخۆیی: ٦ر١٠٠ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥ر١٠٠ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: کاکاو، بەرهەمی دارخورما، بۆن، تەرەو میوەجیات، گەنمو جۆ، چەوەندەری شەکر.
- بەرهەمی سروشتی: نەوت، موگناتیس، یۆرانیۆم، ئاسن، زێر، دار.
- بەرهەمی کارەبا: ٩٨٦ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازی: نەوت و غازی سروشتی،

دروستکردنی دار، موگناتیس.

- دەرچوەکانی: نەوت، دار، یۆرانیۆم.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: فەرەنسا، ئەمەریکا، ئەڵمانیا، یابان، ووڵاتانی ئەفریقیا، ووڵاتانی عەرەبی. وڵاتی گابۆن یەکێکە لە ووڵاتە هەرە زۆرەکانی ئەفریقیای رەش لە بوژانەوەدا بەهۆی بەرهەمی سروشت و کۆمپانیەکانی بێگانەو پرۆگرامی بوژانەوەی وڵاتەکە.
- رژێمی دەسەڵات: دیموکراتی دەرکەوتوە، سەرۆك کۆمار بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێت، بەڵام دەسەڵاتی یاسادانان تەنیا ئەنجومەنی ئومەیە کە ١٢٠ ئەندامە و بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێت، لەدوای ئەوەی کە یۆنجۆ لەساڵی ١٩٧٣بووە ئیسلام ناوی خۆی گۆری کردیە (عومەر)و دووبارە هەڵبژێردراوە بەبێ هیچ بەرهەڵستکاریەك لە ساڵەکانی ١٩٧٣ - ١٩٨٠ - ١٩٩٣.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی کۆگردی دیموکراتی کۆمەڵایەتی گابۆنی نەتەوەیی، پارتی پێشکەوتنی گابۆن، چەپی ناوەندی، کۆگری نیشتیمانی بۆ برینی دار.
- جوگرافیای ووڵات: کۆماری گابۆن دەکەوێتە سەر کەناری ئەتڵەسی لە ناوەراستی رۆژئاوای ئەفریقیا. گینیای ئیستیوائی و کامیرۆن دەکەوێتە باکوری، کۆنگۆ لە رۆژهەڵات و باشووری، گابۆن دەکەوێتە هێڵی کەمەرەی زەوی. دارستانێکی زۆری هەیە و ووڵاتی داپۆشیوە. بەڵام کەنارێکی دەشتایی تەنگی هەیە، لە باکورو رۆژهەڵات و باشوور گردۆلکەییە، لەناوەندی و باشووری رۆژهەڵاتی چیاییە، لە گابۆن زێی ئوجیەو لقەکانی زۆریەی ناوچەکانی ووڵات ئاودێر دەکەن، کەش و هەوای گەرم و شێ دارەو بارانی چری لێ دەبارێ.
- مێژووی وڵات: ووڵاتی گابۆن زۆر ناسراو نییە لەناو مێژوودا، بەڵام وا مەزندە دەکرێت کە (بیجمی کورتە باڵا) ئەوان دانیشتوانی رەسەنی گابۆنن، ئێستا زۆر تیرە هەیە گەورەترینیان تیرەی (شعب وفانگە) کە سێ یەکی دانیشتوانی ووڵات پێك دێنن. دیگۆکام یەکەم پورتوگالی بوە کە لەسەدەی پانزە سەردانی کردیە. فەرەنسیەکان لە ساڵی ١٨٣٩ یەکەم دانیشتگایان لێ دروستکردوە لەکەرتی ئەلیسری لە کەنداوی گابۆن و وردە وردە توانیان خاکی ووڵاتەکە داگیر بکەن لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم.

پورتوگالیەکان ناویان نابو (گابۆ) کە وشەیەکی پرتوگالیەو مانای (ماندووبونە)، لەسەدەی هەژدەم و هەژدەم (شعبو فانگە) کامیرۆنیەکان بەرەو گابۆن هاتنو لەباکوری شعوب ئومین ناوچەکەیان ئاوەدان کردەوە، ئەوروپیەکان بازرگانیان بەکۆیلایەتی تیا بەهێز دەکرد. لە ساڵی ١٨٤٠ زاینی سەرۆك تیرەکان پشتگیری خۆیان بۆ فەرەنسا ئاشکراکرد بوە هۆی بڵاوبونەوەی ئاینی مەسیحی (مەزهەبی کاسۆلیکی و برۆتستنتیە) لەناوچەکەدا، لە ساڵی ١٨٤٩ بەندەکان لە لایەن فەرەنسا رزگار کران، دامەزراندنی کەشتیەکی ناسك لەشاری (لیبرفیل) (فرمی تۆن) لە ساڵی ١٨٥٩ گابۆن بووە پارچەیەك لە کۆنگۆی فەرەنسا، لە ساڵی ١٩١٠ بووە پارچەیەك لە ئەفریقیای کەمەرەی فەرەنسی و هەروەها کۆنگۆو تشاد کۆماری ئەفریقیای ناوەندی پێوەلکێندران. کە بوە هۆی بەهێزبونی جموجۆڵی بازرگانی و دامەزراندنی کۆمپانیای تایبەتی بە دەرهێنانی بەرهەمی سروشتی، لەجەنگی دووەمی جیهانیشدا پشتگیری لێکردنی فەرەنسا بووە هۆی ئازادکردنو دوای گابۆن بوە کۆمارێکی ئۆتۆنۆمی سەربەخۆ لەناو یەکێتی فەرەنسا و کۆمەڵەی نیشتیمانی تایبەت بەخۆی هەبوو.

لـه ١٩٦٠/٨/١٧ گـابۆن بـوه كۆمـارێكى سەربەخۆ و (ليۆن ميا) بوه يەكەم سەرۆك كۆمار كە لەلايەن ديموكراتى خوازەكانى سەربە فەرەنسا بـوون، لـەدواى ئـەو بارودۆخـەو تێپـەڕبوونى بەچـەندين گۆڕانكـارى رامـيارى و ئـابوورى و ڕاگەيانـدنى دەسـتورو مـاوەدانى پارتـەكان و هەڵبژاردن و دوا هەڵبژاردنيش لەمانگى /١/١٩٩٦ ئەنجام درا لەسەر دەستورى پەرلەمان.

- گابۆن ئەندامە لە ڕێكخراوى يەكێتى ئەفريقيا، ئەندامە لە ڕێكخراوەى نەتەوە يەكگرتوەكان.

# الرأس الاخضر (سەرى سەوز)

- ناوى ڕەسمى: سەرى سەوز (الراس الاخضر).
- پايتـەختى: برايـا، ژمـارەى دانيـشتوانى ٠٠٠ر٧٥ هەزار كەسە لە بيابانى ساونياكۆ كە يەكێكە لە دوورگەكانى باكور.
- بەندەرە گرنگەكانى: ميندێلۆ.
- ڕووبـەرى: ٥٥٧ر١ ميـل چوارگۆشـەو ٠٣٣ر٤ كيلۆمەتر چوارگۆشەيە.
- ژمارەى دانيشوانى: ٧٥٠ر٤٣٥ هـەزار كەسـەو نيـوەى دانيـشتوانى لـەبيابانى سـاونياكۆ نيشتەجێن.
- چـڕى دانيـشتوانى: ٢٨٠ كـەس لەيـەك ميـل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەى دانيشتوانى: ١٠ر٢٪.
- نژادەكانى: كريـۆل (مۆلتۆ) ٧١٪، ئەفريقيـەكان ٢٨٪، ئەورووپى ١٪.
- زمانـەكانى: پورتوگـالى (زمـانى ڕەسميـە) كريۆلۆ.
- ئاينەكانى: كاسۆليكى ڕۆمانى تێكەڵاوە بەبيرو باوەڕى ناوخۆيى.
- زانينى نوسين و خوێندن: ٧٥٪.
- دابەشـى كـارگێڕى: دوو بەشـەو هـەر بەشـێك دابەش بووە بۆ حەوت ئەنجومەن.
- بەرگرى ٣ر٢٪ لەكۆى دەرئەنجامى ناوخۆيى.
- سوپاكەى: ٠٠٠ر١٥هەزار كەسە.
- دراوى: ئەسكيدۆ.
- كۆى دەرئەنجامى ناوخۆيى: ٥٤٣ مليۆن دۆلار.
- بەشـى تـاك لـەكۆى دەرئـەنجامى نـاوخۆيى: ٢٧٥ر١ دۆلار.
- زەوى كشتوكاڵى: ١٠٪ لەخاكى وولاتەكە.
- بەرهەمى كشتوكاڵى: مۆز، بۆن، پەتاتە، گەنم، فول، تەرەو ميوە جات، چەوەندەرى شەكر.
- سامانى ئاژەڵى: بزن ٠٠٠ر١١٥ هـەزار سـەر، بەراز ٠٠٠ر٦٤٠ هەزار سەر، پەرەور ٠٠٠ر٤٣٥ هەزار سەر.
- بەرهەمى كارەبا: ٤٥ مليۆن كيلۆوات كاتژمێر.
- داهاتى سروشتى: خوێ، بەردى سنى.
- پيشەسازى: دەرهێنانى خوێ، ڕاوى ماسى.
- داهاتـەكانى دەرەوەى: نـەوت، كەرسـتەى خواردمـەنى، كەلوپـەلى بـەكارهێنان، بەرهەمەكانى دروستكراو، دانەوێڵە.
- دەرچووەكانى: ماسى، مۆز، خوێ.
- هاوبەشـەكانى بازرگـانى: پرتوگـال، ئـەنگۆلا، جەزائير، ئيتاليا، هۆڵندا، ئەسپانيا، فەرەنسا، ئەمەريكا، ئەڵمانيا، سويد.
- ڕژێمى دەسەڵات: ڕژێمێكى ديموكراتى كۆمارى تازەيە، پەرلـەمان پێك هاتووە لە ٧٩ كورسى، يەكـەم هەڵبـژاردنى ديمـوكراتى ئـەنجام درا لـە مـانگى /٢/١٩٩١ كـە پـارتى دەسـەڵاتدار دۆڕاندى، پارتى ئەفريقى لەپێناو سەربەخۆيى (الـراس الاخـضر)كـە زۆرينـەى لەپەرلـەمان بەدەست هێنا بوو، بەڵام پارتى سەركەوتوو لە هەڵبژاردنەكـە بزوتنـەوە لـە پێنـاوى ديموكراتيـەت بـوو، سـەرۆك كۆمـار لـەكاتى

هەڵبژاردنـــەکانی پەرلـــەمان پـــاڵێوراوی بزوتنەوەکـەی (ئـەنتۆنیۆ مـۆنتیرۆ) بـوو بـە سەرۆك کۆمار هەڵبژێردا.

- پارتـە ڕامیاریـەکان: پـارتی ئـەفریقیا لـەپێناو سـەربەخۆیی سـەری سـپی (الـراس الاخـضر)، پـارتی ئـەفریقی نیشتیمانی، پـارتی بزوتنـەوە لەپێناو دیموکراتیەت، پارتی مام ناوەندی.
- جووگرافیـای وولات: سـەری سـەوز (الـراس الاخـضر) وولاتێکـی سـەربەخۆ، ئـەویش پێـك هـاتووە لـە ئـەرخبیل لـەو دوورگـەی دەکەوێتـە زەریای ئەتلەسی بە درێژایی ٦٢٠ کیلۆمەتر لە ڕۆژئـاوای داکـار، پایتـەختی سـەنیگالە، دورگەکە دابەشی دوو کۆمەڵە دەکرێ، کۆمەڵەی پـارلافنتۆ لەباشـوورو چـوار دورگـە دەگرێتـە خۆی. ئەوانیش دورگەی گرکانێن لە بنەڕەتدا، دورگەی فۆگۆ لەباشووری گرکانیکی گرجۆگۆڵی تیایـە، زۆربـەی دورگـەکان بەچیا داپۆشراوە، زەویەکـەی دەشـتایی قـوڵی تیایـە، هـەموو دورگەکـە دانیـشتوانی تیایـە تـەنیا دورگـەی سانتا لۆزیا نەبێت لەباکور، کەناری لمی جوانی تیایـە لـە زۆربـەی دورگـەکان سـەوزن لـە دولـەکانی نـاوخۆیی، سەنیگال و مۆریتانیا لـە ڕۆژهـەلاتی، جیـاوازی لەپلـەی گـەرمی هەیـە بەدرێژایی وەرزەکانی و کەمە.
- مێـژووی وولات: وولاتەکـە دانیـشتوانی تیانـەبووە تـاکو پورتوگالیـەکان کردیانـە وولاتێکـی نیـشتەجێ کـردن لـە سـاڵی ١٤٦٢ و کۆیلەکانیان هێنا بۆ کار پێ کردن لە ڕۆژئاوای پورتوگال، لەکۆتایی سەدەی نۆزدەم بوژانەوەی ئـابووری دەسـتی پـێ کـرد بـەهۆی لابردنـی بازرگـانی بەکۆیلـە کـردن، لەسـاڵی پـەنجاکان جولانەوەی ڕزگاری نشونمای کرد لە دورگەی سەری سپی (الراس الاخضر) لەژێر دەستەی گینیابیساوی پورتوگالی لە کێشوەری ئەفریقیا لە(باشووری سەنیگال لەسەر کەناری ڕۆژئاوا) لە ساڵی ١٩٥١ (الراس الاخضر) بوە یـەکێك لـە هەرێمـەکانی دواوەی دەریـا پورتوگالیـەکان. لـە سـاڵی ١٩٧٥ سـەربەخۆیی بەدەسـت هێنـا و هەڵبـژاردنی ئەنجومـەنی گـەل ئـەنجام درا کـە (ئەریستیدن) سەرۆکی پارتی ئـەفریقی لـەپێناو سـەربەخۆیی سـەری سـەوز (الـراس الاخـضر) سەرۆکایەتی وولاتی گرتە دەستو ڕامیاریـەتی بێ لایەنی گرتەبەر، لە ساڵی ١٩٨١ دەسەلاتی وولاتـی گرتـە دەسـت بـەرەو یـەکبونی لەگـەڵ گینیابیـساو هـەڵگرت و بـووە وولاتێکـی تاکەپارتی لە دەسەلاتدا. لە ساڵی ١٩٩١ یەکەم هەڵبژاردنی فرە پارتی دیموکراتی ئەنجام دراو دووبـارە هـەمان پـارتی نـاوبراو سـەرکەوتنی بەدەســت هێنــاو دوای وەرگرتنـــی دووەم دەسـەلاتی و رووبـەرکردە چاکسازی ئـابووری و بازاڕی ئازادی، لە ساڵی ١٩٩٢ لـە وولات پلانی چوار ساڵی ڕاگەیانـدرا بـە پەرەپێدانی کـەرتی تایبەت و ڕزگارکردنی ئابووری.
- الراس الاخضر ئەندامە لە ڕێکخراوی یـەکێتی ئـەفریقیا، ئەندامـە لـە ڕێکخـراوی نەتـەوە یەکگرتووەکان.

# سەنیگال

- ناوی ڕەسمی: کۆماری سەنیگال.
- پایتەختی: داکار، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۷۳۰ر۱ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: کۆلاك، تاییە.
- بەندەرە گرنگەکانی: داکار، سانت لویسە.
- ڕووبەری: ۹۵٤ر۷۵ میل چوار گۆشەو ۷۲۰ر۱۹٦ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر٦۳۵ر۱۰ ملیۆن کەسە بەپێی زانیاری ۱۹۹۹.
- چڕی دانیشتوانی: ۱٤۰ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۷ر۲٪.
- نژادەکانی: ئەلوف ۳٦٪، فولانی ۱۷٪، سریر ۱۷٪، دیۆلا ۹٪، تۆکۆلیۆ ۹٪، مندینگیۆ ۹٪.
- ئاینەکانی: ئیسلام ۹۲٪، بیروباوەڕی ناوخۆیی ٦٪، مەسیحی ۲٪.
- زانینی نوسین و خوێندن: ۲۵٪.
- دابەشی کارگێڕی: ۱۰ هەرێمە.
- بەرگری: ٥ر۷٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر۱۳۵ هەزار کەسە.
- دراوی: فرنگی سیڤا.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۲۰۰ر۱٦ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۹۰۰ر۱دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ۲۸٪ لە خاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: فولی سودانی، گەنمەشامی، برنج، دار، سرجیم، گەنمو جۆ، چەوەندەری شەکر، تەرەو میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ۹۰۳ر٤ ملیۆن سەر، بزن ۵۰۰ر۳ ملیۆن سەر، چێڵو گامێش ۹۵۰ر۲ ملیۆن سەر، پەرەور ۵۰۰ر٤٤ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی کارەبا: ۷۳۵ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: فۆسفات، ئاسن یەکێکە لە داهاتەکانی سروشتی، ماسی.
- پیشەسازی: ئامادەکردنی خۆراك، فۆسفات، پالاوتنی نەوت، چیمەنتۆ، ماسی، بەرهەمەکانی نەوت، خوشکردنی پێست، دروستکردنی پێڵاو، ئامادە کردنی گۆشت، دروستکردنی جل‌و بەرگ..
- دەرچووەکانی: فۆلی سودانی، بەرد، فۆسفات، ماسی، بەرهەمەکانی نەوت، ئاژەڵی زیندوو، خوری،پێست
- داهاتەکانی دەرەوەی: خواردەمەنی، کەرستەی بەکارهێنان، ماشێن و کەلوپەلی گواستنەوە، نەوت.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: بەریتانیا، وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا، وڵاتانی دراوسێ، یابان، چینی میللی.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی دیموکراتی تازەیە، ئەنجومەنی (ئومە) پێك هاتووە لە ۱۲۰ ئەندام و پێنج ساڵ جارێك هەڵدەبژێردرێن. هەموو هاوڵاتیەك مافی پێشنیاری گشتی هەیە، دەستور مافی مرۆڤی دابین کردیە بەرامبەر یاسا.
- جوگرافیای وڵات: سەنیگال دەکەوێتە بەرزاییەکانی کەناری ڕۆژئاوای ئەفریقیا، لە باکور مۆریتانیا، لە ڕۆژهەڵات مالی، لە باشوور گینیاو گینیابیساو، لەسێ لاوە کەوتۆتە سەر وڵاتی گامبیا، لە ڕۆژئاوای زەریای ئەتڵەسی باکور، زۆربەی خاکی وڵات دەشتایەکی نزمەو تۆزێك لە باشووری ڕۆژهەڵاتی بەرز دەبێتەوە،

بەلام لە باشووری ڕۆژئاوای زلکاو دارستانی چڕو باراناویە، لەباکورو باکوری ڕۆژهەلاتی نیمچە بیابانیە، چوار زێی گەورەی تیایە ئەوانیش زێی سەنیگال لە باکورو زێی کازامنس لەناوچەی باشوور و زێی گامبیا.
کەش و هەوای هەمەجۆرە، لە کەنارەکانی سارده و له ناوەوەی گەرمە.

- مێژووی وولات: لە سەدەکانی (١٠تا١٢)، پەیوەندی لەنێوان سەنیگال و باشووری ئەفریقیا پەرەی سەندو دوای گەلی نۆکۆلۆر ئاینی ئیسلامیان کردە بیروباوەڕی خۆیان و بوونە ئیسلام. لەسەدەی پانزە بۆ یەکەم جار پرتوگالیەکان گەیشتنە سەنیگال و چەندین وێستگەیان لێ دامەزراند لە سەرلێوارەکانی زێی سەنیگال، لە سالی ١٦٥٠ بۆ یەکەم جار فەرەنسیەکان نیشتگایەکیان لێ دروستکرد لە سانت لویس، لەسەدەی هەژدەم و هەژدەهەم بازرگانی ناردنە دەرەوەی زێڕو کەلوپەلی تری بەرهەمهێنان بە یارمەتی بازرگانانی ئەوروپا دەستی پێکرد، بەریتانیەکان زۆر ناوچەیان خستە ژێر دەسەلاتی خۆیان بەلام لە سالی ١٨٤٠فەرەنسیەکان سەنیگالیان خستە ژێر دەسەلاتی خاوەندیەتی خۆیان. لە سالی ١٨٦٠ شاری داکار دروستکرا. لە سالی ١٩٠٢ بوە پارچەیەك لە ئەفریقیای ڕۆژئاوای فەرەنسا کە داکار پایتەختی بوو، بەلام لێرەدا یەکێتیەکی فیدرالی لەهەشت خاکی دوارەی دەریاکان پێك هات کە سەر بە فەرەنسا بوون ئەویش (داهومی) بنینی ئێستا، گینیا، ساحل حاج، مۆریتانیا، نیجیریا، سەنیگال، سودانی فەرەنسی (مالی ئێستا) فولتای بەرز (بورکینای ئێستا) ئەو یەکگرتنە بەردەوام بوو لە سالی ١٨٩٥ تاکو سالی ١٩٥٨. لە سالی ١٩٤٦ بوە خاوەن ئەنجومەنی یاسا دانانی تایبەت بە خۆیان و نوێنەریان هەبوو لە پەرلەمانی فەرەنسی، لە سالی ١٩٤٨ دا (لیۆبۆلد سینگۆ) گروپی دیموکراتی سەنیگالی دامەزراند بۆ تێکۆشان لە پێناوی سەربەخۆیی. لە ١٩٦٠/٤/٤ سەربەخۆیی سەنیگالی ڕاگەیاند لەناو یەکێتی مالی فیدرالی، بەلام دوای دوومانگ لەو یەکێتیە کشاوەو بوە سەرۆکی پارتی یەککرتووی پێشکەوتنی سەنیگالی سۆشیالستی و سەرۆکی وولات، دوای ئەوە سەنیگال پەرەی سەند لە بوارەکانی ئابووری و ڕامیاری بەرەو ڕژێمی دیموکراتی.

لە ١٩٨١/١٢/١٧ سەنیگال و گامبیا ڕێکەوتنی کۆنفدرالیان مۆرکرد بە مەرجێ هەر دەولەتێك مافی پاراستنی سەربەخۆی هەبێت و ناوی نرا (یەکێتی سینگامبیا)، لە سالی ١٩٨٩ ئەو یەکێتییە هەرسی هێناو لەهەلبژاردنەکان ١٩٩٣/٢/٢١.بۆ جاری سێیەم (چیۆف) هەلبژێردراوە بە سەرۆك کۆمار.

- سەنیگال ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەککرتووەکان.

# ســــودان

- ناوی ڕەسمی: کۆماری سودان.
- پایتــەختی: خــەرتوم، ژمــارەی دانیــشتوانی ۰۰۰ر۹۸۰ هەزار کەسە.
- شارە ســەرەکیەکانی: ئــوم درمــان، پۆرسودان، حویا، وادی مەدەنی، ئەبیز، کسلا، عەتیرە.
- بەندەرە گرنگەکانی: پۆر سودان.
- ڕووبـــەری: ۴۹۲ر۹۶۷ میـــل چوارگۆشـــەو ۸۱۰ر۵۰۵ر۲ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمــارەی دانیــشتوانی: ۰۰۰ر۷۹۴ر۳۲ ملیــۆن کەسە، بەپێی بڵاوکراوەکانی ۲۰۰۳.
- چڕی دانیشتوانی: ۳۴ کەس لەیەک میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۷ر۲٪ .
- نژادەکانی: زیاتر لە ۵۰ کۆمەڵی نژادی تیایە کە هەمووی لە باکوری ڕۆژئاواو لە باشووری ئەفریقیە پێست ڕەشەکانن. لە سودان کورد هەیــە لەناوچــەی کوردڤــان کــە کەوتۆتــە سەرسنووری دایفورو لەوێ دەژین کەژمارەیان زیاتر لە ۰۰۰ر۵۰ هەزار کەسە و تاکو ئێستا داب و نەریت و زمانی خۆیان پاراستووە.
- زمانــەکانی: عــەرەبی (زمانی ڕەسمیــە) نۆبیــە، ئینگلیزی، زاراوەی تری تیرەکان لە وانە زمانی کوردیە کەبەزاراوەی کرمانجی باکور ئاخاوتن دەکەن..
- ئاینــــەکانی: ئیــــسلام ۷۰٪ ، بیروبــــاوەڕی ناوخۆیی ۲۵٪، مەسیحی ۵٪.
- زانینی نوسین و خوێندن: ۴۸٪.
- دابەشی کارگێڕی: ۲۶ پارێزگایە.
- بەرگری: ۴ر۸٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر۹۳هەزار کەسە.
- کــۆی دەرئــەنجامی نــاوخۆیی: ۵۰۰ر۲۵ ملیــار دۆلار.
- دراوی: جونــەی ســـودانی بەرامبـــەر ۱۰۰ قورشە..
- زەوی کشتوکاڵی: ٦٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: سمغی عەرەبی، سەرجوم، پــەمۆ، گــەنمو جــۆ، دانەوێڵــەی ڕۆنــی، دەرەی باریــك، فــولی ســودانی، کــونجی، چــەوەندەری شەکر، تەرەومیوەجات..
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ۲۳ ملیۆن سەر، چێڵ و گامێش ۲۲ ملیۆن سەر، بزن ۱۰۰ر۱۷ ملیۆن ســــەر، حوشـــــتر ۵۰۰ر۲ ملیــــۆن ســــەر، پەرەور ۳۲ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشــتی: کــروم، نوحــاس، ئاســنی خاو، نەوت و بەرهەمەکانی
- پیشەسازی: دروستکردنی چیمەنتۆ، ڕستن و چنین، داودەرمــان، پێڵاو، سابوون، پــاڵاوتنی نەوت، زێڕ، خۆشکردنی پێست.
- دەرچوووەکانی: پــەمۆ، فــولی ســودانی، سمغــی عــەرەبی، کــونجی، پێــست،خوری، ئــاژەڵی زیندوو..
- داهاتی دەرەوەی: بەرهەمەکانی نەوت، ماشێن و کەلوپەلەکانی، داودەرمان، ئۆتۆمۆبێل.
- هاوبەشــەکانی بازرگــانی: ئــەورووپای ڕۆژئــاوا، سعودیە، ئەورووپای ڕۆژهەڵات، یابان، فەرەنسا، وولاتــانی عــەرەبی، یابــان، چــینی میللــی، وولاتانی ئەفریقی.
- جوگرافیای وولات: سودان گــەورەترین وولاتــی کیــشوەری ئەفریقیایــە، بــەڵام کــەنارەکانی دەریایی دەکەوێتە سەر دەریای سور لە باکوری ڕۆژهەڵاتی ، سودان دەکەوێتە لایەنی ڕۆژهەڵات لــە بیابــانی گــەورە. لــە بــاکوری میــسر، لیبیــاو

تشادو کۆماری ئەفریقیای ناوەندی لە ڕۆژئاوای، کۆنگۆو ئۆگەندەو کینیا لە باشوور، ئەسیوبیاو ئەریتیریا لە ڕۆژهەلاتی. درێژی سودان لە باکور تا ڕۆژئاوا ١٩٣١ کیلۆمەترە، لە ڕۆژئاوا تاکو ڕۆژهەلات نزیکەی ١٦٠٩ کیلۆمەترە، زێی نیل لە باشوور بۆ باکوری وولات دەبڕێ کە لە باکور دێتە خوارێ بەرەو میسرو لە دەریای سپی ناوەڕاست دەکاتەوە، زێی نیلی شین چەندین لقی هەیە کە چاوگەکانی لە حەبەشەی ئەسیوبیا دەردەچێت بەلاّم بەشی گەورەی دێتە خوارێ بەناو خاکی سودان بۆ خرتومی پایتەخت و لەوێش لەگەلّ نیلی سپی بەیەك دەگەن کە هەلّدەقولّی لە گردۆلکەکانی ناوەندی ئەفریقیا، کەش و هەوای گەرمە، بارانی کەمەو جیاوازی بارینی لەناوچەکان هەیە بەهۆی نزیکی لەهێلی کەمەرەی زەوەی.

- ڕژێمی دەسەلاّت: کۆمارییە و لە ١٩٩١/٨/٣١ شەریعەتی ئیسلام بوە یاسای وولات.
- پارتە ڕامیاریەکان: کاری پارتایەتی لە سالّی ١٩٨٩ قەدەغەکراوە تەنیا بەرەی ئیسلامی نەبێت کە ئەویش بنکەی جەماوەری بەهێزی هەیەو کاردانەوەی کردۆتە سەر دەسەلاّت.
- مێژووی وولات: لەماوەی سالّی ٦٠٠ پێش زاینی تاکو ٢٥٠ پێش زاینی دەسەلاّتی ئیمپراتۆریەتی (نوبیە) حوکمرانیان دەکرد کە زۆربەی لە باشووری میسرو باکوری سودانی گرتبوە خۆیو پایتەختی (دەنقەلە) بوو. لە سەدەی شەشی زاینی ئاینی مەسیحی (قبتیان) لە باوەش کردو کردیانە ئاینی ڕەسمی وولاّتەکە.

لەسەدەی حەوتی زایینی ئاینی ئیسلام گەیشتە سودان بەجۆرێکی زۆر کەم تاکو سەدەی پانزەم کە زۆربەی وولاتی گرتەوە، لەماوەی سەدەی شانزەم و هەژدەم لە ناوەڕاستی سودان ئیمپراتۆریەتی (فیر) دامەزرا،دوایی لە باکوری سودان ئیمپراتۆریەتی (فنبج) دامەزرا کە هەردووکیان ئیمپراتۆریەتی عەرەبی ئەفریقی بوون و دوای لێك ترازان بونە وولاّتی بچوك، محمد علی پاشا دادوەری میسر هەلّسابە داگیرکردنی سودان و خستیە ژێر دەسەلاّتی میسر. لە سالّی ١٨٨١ محمد احمد مهدی بەیارمەتی لایەنگرەکانی لە گەل دەروێشەکان هەلّسان بە شۆڕش لە سودان و دەستیان بەسەر خرتوم داگرت لە ئەنجامدا ژەنەرالێکی ئینگلیز بەناوی (جۆردن) کوژرا، لە سالّی ١٨٩٨ شالاّوێکی ئینگلیزی میسری هاوبەش کرایە سەر ئەو شۆڕشەو لەناوبرا لە پێکدادانی (ئوم درمان) کە زیاتر لە ٢٠ر٠٠٠ هەزار کەس کوژران. لە سالّی ١٨٩٩ سودان بوە وولاّتێك کە دوو ولات دەسەلاّتیان تێدا دەگێڕا ئەویش میسرو ئینگلترا، ئەمەش بوە هۆی مسۆگەر کردنەوەی پەیمانی ١٩٣٦ ی میسر و ئینگلیزی هاوبەش، بەلام پەرلەمانی میسر پەیمانی ١٨٩٩ و ١٩٣٦ هەلّوەشاندەوە لەگەلّ بەریتانیا، لە سالّی ١٩٥٢ میسرو بەریتانیا ڕازی بوون لەسەر ئەوەی کە ئۆتۆنۆمی بدرێتە سودان، لەمانگی /١٩٥٣/١٢ پەرلەمانی نیشتیمانی سودان هەلّبژێردرا، لەدوای گفتوگۆیەکی زۆر ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە سودان هەلّسێ بە ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی لە١/ ١٩٥٦/١، لەدوای ئەوە وولات بە کێشەیەکی ناهەوار هەنگاوی دەنا بەکودەتای سەربازی یەك لەدوای یەك تاکو کودەتای سەربازی سالّی ١٩٦٩ بەسەرکردایەتی جەعفەر نومەیری کە هەموو دام و دەزگاکانی هەلّوەشاندەوەو ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی چەپی پێك هێناو جەعفەر نومەیری بوە سەرۆك ئەنجومەنی وەزیران ، لە سالّی ١٩٧١ لە هەلّبژاردن سەرکەوتنی بەدەست هێناو بوە سەرۆك کۆمارو دەستوری نوێی ڕاگەیاند کە لەدەستورەکە دیارکرابوو بەوەی کە

یەکێتی سۆشیالستی سودان پارتێکی سەرەکیە. لە ساڵی ١٩٧٢ هەوڵی دامەزراندنی یەکێتی کۆمارە عەرەبیەکان درا لەلایەن میسرو سوریاو سودان بەڵام سەرکەوتوو نەبوو بەهۆی پاڵەپەستۆی جەماوەری، لە ١٩٨٥/٤/٦ لەوکاتەی جەعفەر نومەیری لە دەرەوەی وڵات بوو لەسەردانەکەی بۆ ئەمەریکا عبدالرحمن سوار زەهەب وەزیری بەرگری هەڵسا بە کودەتایەکی سەربازی و لەوکاتە خۆپیشاندانی کرێکاری لەکارگەکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پەرەی دەسەند.

لەباکوری وڵات باری ناکاوی ڕاگەیاندرا. لە ساڵی ١٩٨٧ شەڕی ناوخۆیی هەڵگیرسا لەگەڵ سوپای ڕزگاری گەلی سودان لایەنی سەربازی لە بزووتنەوەی ڕزگاری گەلی سودان کە بوە هۆی دروست بوونی تەنگوچەڵەمەی ئابووری و برسیەتی بەهۆی وشکانی و نەبوونی باران و شەڕی ناوخۆیی لە باشوور بوە هۆی کۆچکردنی خەڵکی ناوچەکە بەرەو ئەسیوبیا و تشاد، لە٣٠/٦/١٩٨٩ کودەتای ئاشتی ئەنجام درا لەلایەن عومەر حەسن بەشیر بەحکومەتی مەهدی. لە ساڵی ١٩٩١ ڕژێمی فیدراڵی خستە ناو وڵات و بوە ٩ پارێزگا لەگەڵ ئەوەشدا شەڕی ناوخۆ هەر بەردەوام بوو. لە ساڵی ١٩٩٦ یەکەم هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی و پەرلەمانی ئەنجام درا. بەڵام تاکو ئێستاش شەڕی ناوخۆ هەر بەردەوامە و چارەی کێشەکە نەکراوە سەرەڕای ئەوەی ڕێکەوتن ئەنجام دەدرێت و هەرەس دێنێ بەهۆی چەوتی ڕامیاریەتی هەردوولا بەتایبەتی دەسەڵاتی ناوەندی سەرەڕای ئەوە سودان لەدوای سەربەخۆی وەرگرتن لە ساڵی ١٩٩٦ میلیشا خێڵەکیەکانی بەکارهێناوە بۆ مەبەستی خۆی بەهۆی بوونی سودان بەوڵاتێکی خێڵەکی بەرفراوان بۆیە ناتوانرێ کوتنرۆڵی ئەو میلیشیانە بکرێت لەرێگەی سەربازی و دکتاتۆری ڕژێمی سودان چونکە میلیشیای جەنجەوید لەسە ردەستی علی عوسمانی جێگری سەرۆکی سودان دامەزراوە کەدامو دەزگاکانی ئاسایشی سودان سەرپەرشتی دەکات. بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی سودان لە مانگی /٤/ ٢٠٠٣ هێرشیان کردە سەر فرۆکەخانەی الفاشد لەهەرێمی دارفور لەئەنجام چەندین فرۆکە تێک شکێندران، هەروەک لەناوەڕۆکی کورتەی مێژووی سودان هاتوە دوایش لەکاتی هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهان سوڵتانی عوسمانی ئەوکاتە لەفتوایەکی کەلە ١٩١٤/٢/١١ دەرچوودواوای کرد کەدژی بەریتانیا جیهاد بکرێت ئەو فتوایەش بەشێوەیەکی گشتی تاردەیەک کاریگەری بەسەر ژمارەی دانیشتوانی هەرێمەکە هەبوو کەرووبەرەکەی لەرووبەری فەرەنسا زیاترە نزیکەی شەش ملیۆن کەسەو چەندین خێڵی بەناوبانگی تیایە ئەوخێڵانەش خێڵە ئەفریقیەکانن کە لەم هەرێمە دەژین وەك ئەلفۆر، ئەلزەغادە، ئەلمەساکیشەو ئەلبەرتی و ئەلنامەو ئەلبەو حەق و ئەلفەلاتن وخێڵە عەرەبەکانیش وەك خێڵی ئەلرزیقات وئەلتەعایشەو ئەلحەسیریەو بنی هەلبەوئەلماعالیەو ئەلسەلامات، هۆکاری هەرە سەرەکی ژینگەشە ڕۆڵی خۆی هەیە لەکێشەو ململانێ لەنێوان هەردوولاو وشکە سالیەکان وا لەخێڵە ئەفەریقەکان دەکات بەرگری لەزەویە کانیان بکەن کە مەردارە عەرەبەکان پەنا دەبنە بەر زەویە سەوزایەکانی کە خێڵە ئەفریقیەکان لێی نیشتە جێن.

ئەمەلەلایەك لەلایەکی تر ئەوکوردانەی کەلە ناوچەی کوردفان نیشتەجێن ئەویش لەئەنجامی شەڕی نێوان روسیای قەیسەری و ئیمراپتۆریەتی عوسمانی و شەڕی نێوان روسیاو فارس و شەڕی نێوان تورکیاو فارس بەتایبەتی شاڵاوە بەدانەوەکەی ئیمپرتۆریەتی عوسمانی بۆ سەر ئەرمەنیەکان لەباشووری ڕۆژهەڵاتی واتە باکوری کورستانی لێکێندراو بە تورکیا لە ١٩١٥/٤/٢٤کە بوە هۆی کوشتنی زیاتر لە ملیۆن و نیوێك ئەرمەن و لەهەمان کات بوە هۆی ئەوەی کوردی

باكوری كوردستان پەرگەندەی وڵاتانی دراوسێكانی سەر سنووری دوركەوتنەوەیان بەرەو وڵاتانی تری وەك ئەفغانستان و چینی میللیو سودانو گەلێ وڵاتی تریش بېن ،بەڵام كورد سەرەڕای بێ هێزیو پەرتو بڵاو دەربەدەری توانیویانە ناسنامەی نەتەوەیی بپارێزێن لەمێژوو زمانو دابو نەریتی نەتەوەیی.

بزوتنەوەی ڕزگاری سودان لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٣ گەیشتنە چەندین ڕێكەوتنو مۆركردنی پرۆتۆكۆڵەكانی دابەشكردنی دەسەڵاتو سامانی وڵاتەكە بەتایبەتی نەوت و ئەنجام دانی هەڵبژاردنو فراوانكردنی بواری دیموكراسی بەئازادی بیروڕاو دروستكردنی پەیوەندییەكی ڕێكی رامیاریو هێوركردنەوەی بارودۆخەكە بەڵام سەرەڕای ئەوە كێشەی دارفوری هاتەسەر كەئاڵۆزترین كێشەیە لەناوچەی دارفور لەنێوان دەسەڵاتی ناوەندیو چەكدارە جەنجەویدە عەرەبەكانی هاوپەیمانی دەسەڵاتی ناوەندیو بەرهەستكارانو ئاوارەو دەربەدەربوونی زیاتر لەملیۆنێك هاووڵاتی بێ تاوان بەپێی ڕاپۆرتی نەتەوەیەكگرتوەكان لە ٢٠٠٤/٨/٣ كە ئەوپەنابەرانە ڕووبەڕووی ناشیرنترین كاری نامرۆڤانە دەبونەوە لەهەموو لایەنێك بەتایبەتی لایەنی ئابرو بردنو فراندنی ئافرەتو كوشتنی كەسانی پەنابەر بەجۆرێكی نامرۆڤانە.

بەڵام لەدواقۆناغیش بێت دەبێ بە ئاشتیانە كێشەكە چارەسەر بكرێت، لە ٢٠٠٢/٧/٢١ حكومەتی سودانو جولانەوەی ڕزگاری ڕێكەوتنامەی ئاشتبونەوەیان مۆركرد بەپێك هێنانی حكومەتێكی فیدراڵی بەجیا كردنەوەی ئاین لەدەوڵەتو سودان بەرەو دەوڵەتی فیدراڵی هەنگاو دەنێ بەهۆی كێشەو ململانێی دژواری نێوان پارتو گروپ ونەتەوەكان بەتایبەتی لەدوای سەرەتای ساڵی ٢٠٠٤.

- سودان ئەندامە لە زانكۆی وڵاتانی عەرەبی، ئەندامە لە ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان، ئەندامە لە ڕێكخراوی یەكیەتی وڵاتانی ئەفریقیا.

# بیابانی ڕۆژئاوا (الصحراء الغربية)

- بیابانی ڕۆژئاوا دەكەوێتە باكوری ڕۆژئاوای ئەفریقیا، وڵاتی مەغرب لە باكوریەتی، لەڕۆژهەلات و باشووری موریتانیا، لەڕۆژئاوای زەریای ئەتڵەسی. بیابانی ڕۆژئاوا كێشەو ململانێی لەسەرەو تاكو ئێستاش چارەسەر نەكراوە،لەلایەن دەسەڵاتداری شانشینی مەغریب.
- پایتەختی: عیون. ژمارەی دانیشتوانی (١٧٥٠٠٠) هەزار كەسە.
- شارەگرنگەكانی: زقلە.
- ڕووبەری: ١٠٢٠١١ر١٠٢ میل چوارگۆشەو (٦٦٨٠٠ر) كیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٢٥٤ر٠٠٠ هەزار كەسە.
- چڕی دانیشتوانی: ٣ كەس لەیەك میل چوارگۆشەدا. لەگەڵ ئەوەشدا نزیكەی ١٩٥ر٠٠٠ هەزار كەس كۆچبەرن لە كۆمەڵگەكانی نزیك ئەندۆف دەژین لە باشووری ڕۆژئاوای جەزائیر، دانیشتوانی بەرەوندی دەژین.
- دراوی: درهەم.

- زمانەکانی: عەرەبی(زمانی رەسمیە).
- ئاینەکانی: ئیسلام.
- زەوی کشتوکاڵی: خاکی بیابانەو دەوڵەمەندە بە فۆسفات کە لەمەنجەمەکان دەردەهێنرێ و دەوری بەپەرژینێکی تەلی کارەبی گیراوە بەناوی (حەسبتە). فۆسفات گرنگترین داهات و دەرچووەکانییەتی بۆ دەرەوەی بیابانەکە.
- رژێمی دەسەلات: شانشینی مەغرب کاروباری دەبا بەرێوە.
- مێژووی بیابانی رۆژئاوا: ئەو هەرێمە بیابانیە درێژی هەزار کیلۆمەترە لەگەڵ درێژایی کەنارەکە، دانیشتوانی ناوچەکە سەربە ئەسپانیا بوە لەساڵی ١٨٨٤ چونکە کەوتبوە روبەرو دورگەی (عناری) کە ئیسپانیەکان تێیدا دەسەلات دار بوون، لەوکاتەی مەغرب لە ساڵی ١٩٥٦ سەربەخۆیی وەرگرت داوای ئەو بیابانەی کردەوەو هەڵسابە داگیرکردنی، بەلام لە ساڵی ١٩٥٨ بیابانی رۆژئاوای سەر بە ئەسپانیا بووە ژێر دەستەی ئەسپانیەکان لەدوای دۆزینەوەی فۆسفات لەناوچەی (بۆکراغ) لە ساڵی ١٩٧٣ جولانەوەی نەتەوەیی سەری هەڵدا لەپێناو سەربەخۆیی بەناوی بەرەی پولیساریۆ (بەرەی میللی رزگاری کردن) لەدوای مردنی (ژەنەراڵ فرانکۆ) دادوەری ئەسپانیا لەساڵی (١٩٧٥) لە هەرێمەکە کشاوەو بوە هۆی دابەش کردنی خاکی بیابانی رۆژئاوا لەنێوان مۆریتانیاو مەغرب، لە ١٩٧٦/٢/٢٧ بەرەی میللی پۆلیساریۆ دژی ئەو دابەش کردنە وەستاو کۆماری دیموکراتی عەرەبی بیابانی سەربەخۆیی راگەیاند، بە شەری پارتی زانی کە جەزائرو لیبیا لەژێرەوە پشتگیریان لێ دەکرد، لەدوای سەرکەوتنی بەرەی پۆلیساریۆ لە شەرەکان بوە هۆی کشانەوەی مۆریتانیا لەو بەشەی کە کەوتبوە ژێر دەسەلاتی لە باشووری ولاتەکە، لە ساڵی ١٩٨٢ رێکەوتنامەی ئاشتیان لەگەڵ یەکتر مۆرکردو رازی بوون بەو کۆمارەکە بوە ئەندامی تەواوی رێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا. بەلام شانشینی مەغرب بەردەوام بوو لە دەسەلاتەکەی لەسەر ئەو بیابانە بەتایبەتی لەدوای دۆزینەوەی فۆسفات، شارە گرنگەکانی جگە لە ولاتەکە شانشینی مەغریب هەڵسابە دروستکردنی دیوارێکی ئەلکترۆنی بەدرێژایی ٢٥٠٠ کیلۆمەترو لە ساڵی ١٩٨٧ تەواوی کرد، دەسەلاتی مەغریب بەردەوام بوو لەدرێژکردنی ئەو دیوارە لەگەڵ ئەوەشدا لیبیاو جەزائیر پشتگیریان کەم کردەوەو بە نزیک بوونەوە یان لەمەغرب. لە ساڵی ١٩٨٨ شانشینی مەغرب و بەرەی پۆلیساریۆ رێکەوتن لەسەر چارەسەری کێشەی بیابانی رۆژئاوا بە دەنگدانی گەلی بیابانەکە بێت بە سەرپەرشتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانو راوەستانی شەر لەنێوانیان. بەلام دوبەرەکی بوە هۆی ئەوەی ئەو رێکەوتنە پێ شێل بکرێت و شەر بەردەوام بێت.

# سـۆماڵ

- ناوی ڕەسمی: کۆماری دیموکراتی سۆماڵ.
- پایتـەختی: مەقادیـشۆ، ژمـارەی دانیـشتوانی ۰۰۰ر۱۵٤ر۱ ملیۆن کەسە.
- شارە گرنگەکانی: هەرجزا، بیدوا.
- بەنـــدەرە گرنگـــەکانی: بەربەـــرە، مـــەرکا، شیزیمابۆ.
- ڕووبـــەی: ۲۰۱ر۲٤٦ میـــل چوارگۆشـــەو ٦٦٠ر٦۳۷ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ۰۰۰ر۱۱٥ر۱۰ ملیـۆن کەسە بەپێ بڵاوکراوەکانی ۲۰۰۳.
- چـڕی دانیـشتوانی: ۲۹ کـەس لەیـەك میـل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر۱٪.
- نـــژادەکانی: ســـۆماڵە ڕەســـەنەکان ۹۸٪، دانیشتوانی سۆماڵ دابەش دەبن بەسەر ۱۰۰ خێڵ زیاتر لەنێوان باشورو باکور.
- زمانـەکانی: عـەرەبی و سـۆماڵی (هـەردوکیان ڕەسمین) ئیتاڵی ،ئینگلیزی.
- ئایینەکانی: ئیسلام.
- زانینی نوسین و خوێندن: ۲٥٪.
- دابەشی کارگێری: ۱۸ پارێزگایە.
- بەرگری: ٥ر٥٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر۲۳۰ هەزار کەسە.
- دراوی: شلن سۆماڵی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥ر٤ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی نـاوخۆیی: ٦٥۰ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ۲٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: چەوەندەری شـەکر، مۆز، سـرجوم، دانەوێڵـە، گەنمەشـامی (دەرە زەرد)، تەرەو میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ۸۰۰ر۱۳ ملیۆن سەر، بزن ۷۰۰ر۱۲ ملیـۆن سـەر، حوشـتر ۳۰۰ر٦ ملیـۆن سـەر، چـێڵوگامێش ۳۰۰ر٥ ملیـۆن سـەر، پەرەور ۰۰۰ر۲۲ ملیۆن سەر.
- سـامانی سروشـتی: یۆرانیـۆم، ئاسـن، گـەچ، بۆکسیت.
- بەرهـەمی کارەبـا: ۲۷۸ ملیـۆن کیلـۆ وات کاتژمێر.
- پیـشەسازی: دروسـتکردنی شـەکر، پـالاوتنی نـەوت، ڕسـتن و چـنین. لـەڕووی پیـشەسازی توانای ئەوتۆی نییە.
- دەرچـووەکانی: ئـاژەڵی زینـدو، پێـست، مـۆز، خوری.
- داهـــاتی دەرەوەی: ڕســـتن و چـــنین، پێداویستیەکانی خۆراك، کەلوپەلی بیناسازی، بەروبوومی نەوت، دانەوێلە،ئۆتۆمبێل .
- هاوبەشـەکانی بازرگـانی: سـعودیە، ئیتالیـا، ئەمـــەریکا، بـــەریتانیا، ئـەڵمانیا. بـــەهۆی بڵاوبوونـەوەی برسـیەتی و کێـشەو ململانـێ و شـەڕی نـاوخۆیی بـوە هـۆی کـەم بوونـەوەی بەرهەمی هەمەلایەن لەهەموو بوارەکان.
- ڕژێمی دەسەلات: سـەرۆك کۆماری کاتی هەیە لـەدوای سـاڵی ۱۹۹٦ بەهۆی ململانێ و شەڕی نێوان تیپە شەرکەرەکان کە بوە هۆی دەرکردنی محمد سیادبەری سەرۆك کۆمار لە ساڵی ۱۹۹۱.
- پارتـە ڕامیاریـەکان: پارتەڕامیاریـەکان لەسـەر بنەماڵـەی هـۆزو تـیرەو خێڵـەکان پێـك هـاتووە، پـارتی کـۆنگرەی سـۆماڵی یـەکگرتوو، هـۆزی دارود، بـەرەی دیمـوکراتی باشـووری سۆماڵ، هـــۆزی ماجرتـــاین، هاوکـــاری دیمـــوکراتی سۆماڵی، هۆزی جادابۆرسی، هۆزی عیسا.

• جوگرافیای وولات: سۆماڵ پێك هاتووه له دوو ژێر دهستهی پێشووی بهریتانی و ئیتاڵی که ههردووکیان سهربهخۆییان به دهست هێنا له ۱۹٦۰/۷/۱ دوای ئهوه ههردوو بهش یهکیان گرت له باکوری کهنداوی عهدهن، لهرۆژههڵاتی زهریای هندی. جیبۆتی له باکوری رۆژئاوای، ئهسیوبیا له رۆژئاوای، کینیا له باشووری رۆژئاوای، دهشتایی کهنارهکانی ۱۷۰۰ میل درێژ دهبێتهوه. له باکور گردۆلکهیهو له ناوهراست و باشووری زهویهکی راسته، زۆربهی زهویهکانی وشکانییهو بارانی کهمه، زهویه بهپیتهکانی دهکهوێته باشووری نێوان زێی شیلی و زێی گۆیا، کهش و ههوای گهرمه و بارانی کهمه لهنێوان ۳ ئینج له باکورو ۲۰ ئینج له باشوور بهدرێژایی ساڵ.

• مێژووی ولات: عهرهبهکانی بیابانی عهرهبی لهسهدهی ههشت بهرهو سۆماڵ کۆچیان کرد تاکو سهدهی دهیهم و باوباپیرانی ئێستای سۆماڵ و ئاینی ئیسلامیان گهیانده ناوهوهی ناوچهکهو دهستیان کرد بهدروستکردنی شاری مهقادیشۆی پایتهختی ئێستا، کهبوه مهڵبهندێکی بازرگانی، ئهو مهڵبهندانهش بوون بهمهڵبهندی دهسهلات، لهسهدهی پانزه بۆ سهدهی چوارده سۆماڵیهکان رویان کرده باشوورو رۆژئاواو داوایان له دانیشتوانهکه کرد واز له ئاینی مهسیحی بێنن و ببنه ئیسلام لهوانهش له ناوهراستی ئهسیوبیا، لهسهدهی شانزهههم دهسهلاتی تورك گهیشته کهناری باکور و دهسهلاتیان بهسهردا سهپاند له باشوور، لهههمان کات پهیوهندی لهنێوان رهوهندهکانی پرتوگال دهستی پێ کرد لهکهناری سۆماڵ. له سالی ۱۸۳۹ بهریتانیا عهدهنی داگیرکردو کهناری سوماڵ بوه سهرچاوهی پهیداکردنی خۆراك، له سالی ۱۸٦۲ فهرهنسیهکان وێستگهی خهڵوزی کهشتیان لێ دروستکرد لهو جێگهیهی که ئێستا پێی دهڵێن جیبۆتی. دوای ئهویش ئیتالیهکان کۆمهڵگای نیشتهجێ بونیان له ئهریتیریا دروستکرد. له سالی ۱۸۸۷ بهریتانیهکان سهربازگهی پاراستنی سوماڵیان له باکور دروستکردو له باشووریش ئیتالیهکان سهربازگهی پاراستنی سۆماڵیان دروستکرد، له سالی ۱۹۲۰ بهریتانیا ئهو ههرێمهی ئیتالیا پارێزگاری دهکرد داگیری کرد. له سالی ۱۹٤۲ کۆمهڵهی گهنجان له سۆماڵ وهك پارتێکی نهتهوهیی دامهزرا. له سالی ۱۹٦۰ ئیتالیا بوه راوێژکاری نهتهوه یهکگرتووهکان لهسهر ئهو ههرێمهی که کاتی خۆی ژێر دهستهی بوو. بههۆی کێشهو ململانێ لهنێوان هۆزو تیرهکانی سۆماڵ کهگهلانی سۆماڵ ئارامی و ئاسودهیان بهخۆوه نهدیوه سهرهرای کودهتاو گۆرینی دهسهلات له وولاتدا. لهسالی ۱۹۹۹ دوا ههنگاوی پێك هێنانی هێزێکی پۆلیسی بوو بۆ پاراستنی ئاسایشی وولات بهتایبهتی له پایتهختدا سهرهرای ئهوه کۆنگره عهبدول قاسم سهلاتی ههڵبژارد به سهرۆکی سۆماڵ و دان پێ نانی لهلایهن وولاتانی جیهان، بهلام کێشهو ململانێو گیروگرفت کۆتایی نههاتووه، عبدالله یوسف احمد له ۲۰۰٤/۱۰/۱٤ بهسهرهك کۆماری سوماڵ ههڵبژێردرا ئهویش لهدوای کێشهو ململانێیهکی توندی ناوخۆیی لهنێوان هۆزو تیرهکان ئهمهش لهلایهن چهندین ولاتی ئهفریقیو عهرهبی ههولی یارمهتیدانیان دراوه بۆ بهرهو باش بردنی بارودۆخی ناخۆیی سۆماڵو پێك هێنانی حکومهتێکی فرهلایهنی لهنێوان هۆزو تیرهو نهتهوه جیاجیاکان وپاراستنی ئاشتیو ئارامی لهناوسۆماڵو پهیوهندی لهگهڵ دراوسێکانی

• سۆماڵ ئهندامه له زانکۆی وولاتانی عهرهبی، ئهندامه له رێکخراوی یهکێتی ئهفریقیا، ئهندامه له نهتهوه یهکگرتووهکان.

# کـامیـــرۆن

- ناوی ڕەسمی: کۆماری کامیرۆن.
- پایتــەختی: یاوەنــدی، ژمــارەی دانیــشتوانی ٠٠٠ر١٨٥ر١ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: جەروا، مەروا، بامندا.
- بەندەرە گرنگەکانی: دوالا.
- ڕووبـــەری: ٥٦٧ر١٨٣ میـــل چوارگۆشــــەو ٤٤٠ر١٧٥ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ٠٠٠ر٨٧٥ر١٥ ملیـۆن کەسە بەپێی ئاماری ٢٠٠٠.
- چـڕی دانیـشتوانی: ٨٧ کەسـە لەیـەك میـل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٩ر٢٪.
- نژادەکانی: کـامیرۆنی ٣١٪، بنتۆی ئیستوائی ١٩٪، کــیردی ١١٪، فــولانی ١٠٪، بــەنتۆی باکوری ڕۆژئاوا ٨٪.
- زمانـەکانی: ئینگلیـزی و فەڕەنسی هـەردوکیان (زمانی ڕەسمیە). زمانی تری ناوخۆیی تیایە.
- ئایینـەکانی: بـروای نـاوخۆیی ٥١٪، مەسـیحی ٣٣٪، ئیسلام ١٦٪.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٦٥٪.
- دابەشی کارگێڕی: ١٠ پارێزگایە.
- بەرگری: ١٠ر٥٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر١٣٥ هەزارکەسە.
- دراوی: فرنگ سیفا.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥ر٣١ ملیار دۆلار.
- بەشـی تـاك لـەکۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٥٠٠ر٢٢ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ١٤٪. لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: کاکاو، قاوە، پەمۆ، گەنمو جـۆ، فـولی سـودانی، مـۆز، دانەوێڵـەی ڕۆنـی، مەتات، چەوەندری شەکر.
- سامانی ئاژەڵی: چێڵو گامێش٥٠٠ر٥ ملیۆن سـەر، مـەڕ ٨٥٠ر٣ ملیـۆن سـەر، بـزن ٩٥٠ر٣ ملیۆن سەر، بەراز ٥٠٠ر١ ملیـۆن سـەر، پەرەور ٥٠٠ر٢١ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشـتی: هەندێ نـەوت، بۆکسیۆن، هێزی کارەبا، دار.
- بەرهـــەمی کارەبـا: ٧٥٠ر٢ ملیـــار کیلـــۆوات کاتژمێر.
- پیـــشەسازی: بەرهـــەمی نـــەوت و چارەســـەر کردنی، دروسـتکردنی خواردەمـەنی، کەلوپـەلی بـەکارهێنانی سـوك، ڕسـتن و چـنین. ئـامێری ڕێکخستنی دار و درەخت.
- داهاتـــەکانی دەرەوەی: ئـــامێرو کەلوپـــەلی کارەبـایی، کەلوپــەلی گواســتنەوە، کەلوپــەلی بەکارهێنان.
- دەرچـــووەکانی: کاکـــاو، قـــاوە، دار، نـــەوت، بەرهەمی ئەلەمنیۆم.
- هاوبەشـەکانی بازرگـانی: فەڕەنسا، ئەمـەریکا، هۆڵندا، یابان، چین، ئەڵمانیا.
- پارتـــە ڕامیاریـــەکان: پـــارتی بزوتنـــەوەی دیموکراتی گـەلی کـامیرۆن، پارتی نیشتیمانی، پـارتی چـەپی ناوەنـدی، بـەرەی هاوکـاری لـە پێناو گۆڕانکاری.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی دیموکراتی تازەیە لـەدوای ڕاپرسـی ١٩٧٢ دەوڵـەتێکی یـەکگرتوو پێك هات لە ڕۆژهەڵاتی کامیرۆن و ڕۆژئاوای لە جێگـەی کۆمـاری فیـدراڵی پێـشوو، ئێـستاش کۆمارێکی دیموکراتی فرە پارتیە، دەسـەڵاتی یاسادانانی یەك ئەنجومەنەو لە١٨٠ ئەندام پێك هاتوە، لەگەڵ ئەنجومەنی وەزیران.
- جوگرافیـــای وڵات: کـــامیرۆن دەکەوێتـــە

ڕۆژئاوای ئەفریقیا لەسەر کەنداوی گینیا، نیجیریا دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی، کۆنگۆو گابۆن و گینیای ئیستوائی دەکەوێتە باشووری ئیستوائی.

• مێژووی وڵات: دانیشتوانی کامیرۆن هەرەمی گەشت و گوزاریە لە باکوری، بانتۆنیەکان لە ناوەراست و باشووردان کە بڕوای (ئەنیمی تیایە) پرتوگالیەکان یەکەم کەس بوون سەردانی ئەو وڵاتەیان کرد لە ساڵی ١٤٧٢ ناویان نا (ریۆ دۆس کامارۆس) ئەو وشەیە پورتوگالیەو مانای زێی جرجی دەریا، کە لە تێکردنی زێی ووری لەدەریا دیتویانە کە لەشی زۆر گەورە بوە. لەسەدەی حەڤدەم گەلی دوالا کۆچیان کرد لە باکورەوە بۆ ناوچە کەناریەکان و دەستیان کرد بە یارمەتی دان لەنێوان بازرگانەکانی پرتوگال و هۆڵەندی و ئینگلیزو دانیشتوانی، ڕەگەزی فولانی لە ساڵەکانی ١٨٠٩تا١٨٤٨ ئەوانیش هاتنە ناو ئەو وڵاتە کە دوای مەڕ لەوەڕێن و ئیسلامی بوون، لە باشوور بیابانی گەورەی تیایە لە باکوری ئەو وڵاتە، لە ساڵی ١٨٥٦ شێخەکانی تیرەی دوالا پەیمانی بازرگانی لەگەڵ بەریتانیا مۆرکرد و داوای پارێزگاری لێکردن لەبەریتانیا. لە ساڵی ١٨٨٤ پەیمانێکی تری مۆرکرد کە کامیرۆن بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ئەڵمانیا و ببێتە وڵاتێکی پارێزراو لەلایەن ئەڵمانیا تاکو ساڵی ١٩١٦ لەوکاتە بوژانەوەی کشتوکاڵی پەرەی سەند لە بەرهەم هێنانی؛ کاکاو مۆز وقاوە، لەدوای جەنگی یەکەمی جیهان کەوتە ژێر دەسەڵاتی هاوپەیمانان، لە ساڵی ١٩١٩ کۆمەڵەی گەلان باشووری ڕۆژئاوای کامیرۆن و باکوری دراوسێ ی نیجیریای خستە ژێر ئینتدابی بەریتانیا کە ٢٠٪ ڕوبەری خاکی کامیرۆن بوو. لەڕۆژهەلات و باشووری کە پێنج یەکی ڕوبەری کامیرۆن بوو کەوتە ژێر ئینتدابی فەرەنسا. لەوکاتەش دارخورماو کاکاو مۆز بەخێرا پەرەی دەسەند، لە ساڵی ١٩٤٦ بەبڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان وڵاتی کامیرۆن کەوتو ژێر ئامۆژگاری بەریتانیاو فەرەنسا. لە ساڵی ١٩٦٠ ئەو بەشەی کەوتبووە بەر ئینتدابی فەرەنسا سەربەخۆیی وەرگرت و بوە کۆماری کامیرۆن بەسەرۆکایەتی (ئەحمەد ئەجیمۆ) کە لە ئیسلامەکانی باکور بوو، بەڵام لە باشووری ڕۆژئاوا یاخی بوەکان لەناوبران کە پارتی یەکگرتوی گەلی کامیرۆن پێی هەڵسابوو. کە بوە هۆی دروست بونی کێشەو تەنگەژە لەوڵات. لە ساڵی ١٩٦٠ دوای ڕاپرس کە نەتەوە یەکگرتووەکان ئەنجامی دابەشکردنی باکوری تێکەڵ کرد لەگەڵ وڵاتی نیجیریا و بەشی باشووری لەگەڵ کۆماری کامیرۆن. لە ساڵی ١٩٧٢ دەستوری نوێ دەرچوو بە یەکگرتنی کامیرۆن کە پێشوو وڵاتێکی فیدراڵی بوو. لە ١٩٩٧/٥/١٧ هەڵبژاردنی یاسا دانان ئەنجام درا کە پارتی بایای ناوەند سەرکەوتنی بەدەست هێنا سەرەرای تاوانبارکردنی هەڵبژاردنەکە.

• کامیرۆن ئەندامە لە ڕێکخراوی کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

# کۆنگۆ برازافیل

• ناوی ڕەسمی: کۆماری کۆنگۆ، هەروەها ناسراوە بە کۆنگۆ. بە ناوی کۆنگۆ، برازافیل، پێویستە کۆماری کۆنگۆی دیموکراتی (زائیری پێشوو) تێکەڵاو نەکرێت لەگەڵ کۆنگۆ، کە ناسراوە بە ناوی کۆنگۆ- کینشاسا.
• پایتەختی: برازافیل، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۰٦٥ر١ ملیۆن کەسە.
• شارە گرنگەکانی: نکای، لۆبۆمۆ.
• بەندەرە سەرەکییەکانی: بوانت، نوار.
• ڕووبەری: ۰٤٦ر١٣٢ میل چوارگۆشەو ۰۰۰ر٣٤٢ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
• ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر٩٩٥ر٢ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٧.
• چڕی دانیشتوانی: ٢٣ کەس لەیەک میل چوارگۆشەدا.
• بوژانەوەی دانیشتوانی: ٤٪.
• نژادەکانی: کۆنگۆلی ٤٨٪، سنگا ٢٠٪، تیک ١٧٪، میۆشی ١٢٪.
• زمانەکانی: فەرەنسی (زمانی ڕەسمیە) لینگالا، کیلۆنگو، زمانی تری ئەفریقی تیایە.
• ئایینەکانی: مەسیحی ٥٠٪، بڕوای نیشتیشمانی ٤٨٪، ئیسلام ٢٪.
• زانینی نوسین و خوێندن: ٨٠٪.
• دابەشی کارگێڕی: ٩ هەرێمەو یەک کۆمیۆنە.
• بەرگری: ٦ر٢٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
• سوپاکەی: ۰۰۰ر١٢ هەزار کەسە.
• دراوی: فرنگ سیفا.
• کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٢۰۰ر٥ ملیار دۆلار.
• بەشی تاک لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١۰۰ر٢ دۆلار.
• زەوی کشتوکاڵی: ٣٪، لەخاکی وولاتەکە.
• بەرهەمەکانی کشتوکاڵی: کەسافا (گیایەکەرەگەکانی دەشێ بۆ دروستکردنی نان) برنج، گەنمو جۆ، فولی سودانی، قاوە، کاکاو، چەوەندەری شەکر، دانەوێڵە، تووتن.
• سامانی ئاژەڵی: مەڕ ۰۰۰ر١١٥ هەزار سەر، بزن ۰۰۰ر٢٨٥ هەزار سەر، پەرەوەر ٨٥۰ر١ ملیۆن سەر.
• سامانی سروشتی: دار، بۆتاس، نەوت، غاز، نوحاس، قورقوشم، زەنگ، تۆتیا.
• بەرهەمی کارەبا: ٥۰۰ر٤٥٥ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
• پیشەسازی: نەوت، چیمەنتۆ، جگەرە، خواردنەوە (عەرەق)، شەکر.
• دەرچووەکانی: نەوت، خەڵوزی دار (ڕەژوو)، قاوە، کاکاو، شەکر، ئەڵماس.
• داهاتی دەرەوەی: پێداویستیەکانی خۆراک، کەلوپەلی بەکارهێنان، کەلوپەلی سەرمایەداری.
• هاوبەشەکانی بازرگانی: فەرەنسا، ئەمەریکا، ئیتالیا، ولاتانی یەکێتی ئەوروپا، بەرازیل، یابان.
• ڕژێمی دەسەلات: کۆمارێکی دیموکراتی تازەیە.
• پارتە رامیاریەکان: یەکێتی کۆمەلایەتی ئەفریقیا، پارتی مام ناوەندی، چەپی ناوەند، پارتی جولانەوەی کۆنگۆی دیموکراتی بوژانەوەی بنەرەتی، پارتی کاری کۆنگۆلی، چەندین ڕێکخراو بزوتنەوەی تری چەپ و ڕاست و نەتەوەیی تیایە.
• جوگرافیای وولات: کۆنگۆ برازافیل دەکەوێتە ناوەندی ڕۆژئاوای ئەفریقیا، گابۆن و کامیرۆن

دەکەوێتە ڕۆژئاوای، کۆماری ئەفەریقیای ناوەندی دەکەوێتە باکوری، کۆنگۆ کینشاسا (زائیری پێشوو) دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی، ئەنگۆلا دەکەوێتە باشوری ڕۆژ ئاوای، زۆربەی زۆری خاکی وڵاتەکە بە دارستانی چڕ داپۆشراوەو زێی (نیارس) زۆر بەپیت و بەرەکەتە، دەشتایەکی بەپیتی هەیە کە ماوەی کورتە لەسەر کەناری دەریای ئەتڵەسی، زێی نیاری دەشتایی کەنارەکە جیادەکاتەوە لەگەڵ تەپۆلکەکانی ناوندی، بەلام ناوچە دارستانەکان زۆر ڕووباری تیایە لەوانە زێی زائیر کە دێتە خواری بەرەو باشوور بە درێژایی سنوری ڕۆژهەڵاتی وڵات لەگەڵ کۆنگۆ کینشاسا بەرەو دەریاچەی ستانلی دەڕوات، کەش و هەوایەکی شێدارو گەرمی کەمەرەیی هەیە.

- مێژووی وڵات: زۆرترین دانیشتوانی کۆنگۆ برزافیل لەگەل (بانتۆن) هۆزی (بیگمە) لە باکور، لەسەدەی پانزە شانشین (لوانگۆو شانشین ئنزیکۆ) دامەزرێنەری هۆزەکانی بانتۆ بوون، بەلام لەسەدەی هەڤدەم بەرەو لاوازی چوو، لە ساڵی ١٨٨٠ (بیر سافورنان دی برازرا) پەیمانی لەگەڵ دادوەری گەلی (پاتیك ئاری) مۆرکرد بەپێی ئەو پەیمانە کەوتە ژێر دەسەلاتی فەڕەنسا کە لەوکاتە پێی دەگوترا (کۆنگۆی ناوەڕاست). لە ساڵی ١٩١٠ ژێردەستەی ئەفریقی ئیستوائی فەڕەنسی پێك هات لە کۆنگۆو گابۆن و کۆماری ئەفریقیای ناوەندی، ئەو ژێر دەستانە چونە ناو تشاد بۆ پشتگیری کێشەی فەڕەنسای ئازاد لە جەنگی دووەمی جیهان دژی نازیەکانی ئەڵمانی و هۆزەکان ژەنەرال دیگۆل بەرازافیلیای کردە پایتەختی خۆیان، لە ساڵەکانی بیستی سەدەی بیست زیاتر لە هەڤدە هەزار کرێکار گیانیان لەدەستدا بە هۆی بەزۆر کار پێ کردنیان لە دروستکردنی هێلی شەمەندەفەر لەنێوان کۆنگۆو زەریا لەوکاتەش یەکەم ڕێکخراوی ڕامیاری لە وڵات پێك هێنرا. لە ساڵی ١٩٤٦ مافی ئۆتۆنۆمی وەرگرت و ئەنجومەنی یاسادانانی پێك هێناو نوێنەری لە پەرلەمانی فەرەنسا مسۆگەر کرد. لە ١٩٦٠/٨/١٥ سەربەخۆیی وەرگرت کە یەکەم سەرۆك کۆماری قەشەیەکی کاسۆلیکی بوو بەناوی (ئابیە فۆلبیریۆلۆ) ، لە ساڵی ١٩٦٨ کودەتایەکی سەربازی ئەنجام درا لەلایەن (نەقیبی سەربازی ماریانگۆی)، لە ساڵی ١٩٧٠ ڕژێمێکی میللی مارکسی ڕێکخرا پارتی کاری کونگۆلی کە پارتێکی یاسایی بوو لە وڵات ڕۆڵی گرنگی هەبوو، لە ساڵی ١٩٧٧ تیرۆرکرا لەلایەن (ماسمیا دیبا) و لە سێدارەدرا. لەدوای ساڵەکانی هەشتا بەرهەمی نەوت بەرەو زیادبوون دەچوو. لەگەڵ هەرەس هێنانی یەکیەتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٩٠ پارتی کاری کۆنگۆلی وازی لەبیری مارکسیەت هێناو ڕامیاریەتی فرەلایەنی گرتە بەرو هەوڵی چاکسازی ئابووری بازاڕیدا بەهۆی لێك ترازانی باری ئابووری و قەرزاری بۆ وڵاتانی دەرەوە، لەساڵی ١٩٩٢ لەئەنجامی هەلبژاردنی فرە لایەنی پارتی یەکیەتی ئەفریقی بەسەرۆکایەتی باسکال لیۆسبا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، لەئەنجومەنی یاسادانان. دوبارە هەمان پارت سەرکەوتنی بەدەست هێنا لەئەنجامی هەلبژاردن بەچاودێری دەستەی نێو دەوڵەتی، لەساڵی ١٩٩٥ حکومەتی ئیئتیلافی دامەزرا لەپێناو بوژانەوەی ئابوری وڵات، لە٦/٥/ ١٩٩٧ ڕوداوو کێشەو گرفت زیاتر بوو ... لەمانگی ١٩٩٧/١٠/ هێزەکانی لایەنگیری بنیس ساسۆ دەسەلاتیان خستە سەر شارەکە.

- کۆماری کۆنگۆ ئەندامە لە ڕێکخراوەی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

# کۆنگۆ کینشاسا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری کۆنگۆی دیموکراتی. ناسراوە بەناوی کۆنگۆ کینشاسا. نابی کۆنگۆ کینشاسا تێکەڵاو بکرێت لەگەڵ کۆنگۆ برازافیل لەبەر ئەوەی هەریەك ولا تێکی سەربەخۆی جیان..
- پایتەختی: کینشاسا (ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۳۸٦ر٤ ملیۆن کەسە).
- شارە سەرەکیەکانی: لۆمۆمباشی، مبۆگی، مابیی، کاتگا.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: ماتادی، کالیمی.
- ڕووبەری: ۳٦٥ر۹۰٥ میل چوارگۆشەو (۸۸٥ر۳٤٤ر۲) کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۲۷٥ر٥۸ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ۲۰۰۲ کە لەئەنتەرنێت بڵاوکراوەتەوە.
- چڕی دانیشتوانی: ٦٥ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر۳٪.
- نژادەکانی: زیاتر لە دووسەد هۆزو خێڵو تیرەیە کە زۆربەیان لە تیرەو هۆمکانی بانتۆیە.
- زمانەکانی: فەرەنسی (زمانی ڕەسمیە) زیاتر لە ٤۰۰ زاراوەی تیایە.
- ئاینەکانی: مەسیحی ۷٥٪، ئیسلام ۱٥٪، کیمیالگویست ۱٥٪.
- زانینی خوێندن و نوسین: ۸۰٪.
- دابەشی کارگێڕی: ۱۰ هەرێمە لە شێوەی پارێزگا.
- بەرگری: ٤ر٥ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر٤٥ هەزار کەسە.
- دراوی: فرنگی کۆنگۆلی (لە ساڵی ۱۹۹۷ ڕاگەیاندراوە).
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۲۰۰ر۱۸ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٤٥۰ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ۲ر۳٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمەکانی کشتوکاڵی: چەوەندەری شەکر، برنج، دەرە (گەنمەشامی) مۆز، قاوە، زیت، زیتی خورما، تەپەدۆر، کینین (گیایەکە بۆ دەرمانی مەلاریا بەکاردێت) تەرە، میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: بزن ۳۰۰ر٤ ملیۆن سەر، مەڕ ۱۰۰ر۱ ملیۆن سەر، چێڵو گامێش ٥۰۰ر۱ ملیۆن سەر،بەراز ۳۰۰ر۱ملیۆن سەر، پەرەور ۲۰۰ر۲٥ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: نوحاس، کۆبالت، تۆتیا، ئەڵماسی دروستکراو، موگناتیس، زێڕ، زیوو، بۆکسیت، (خامی ئەلەمنیۆم) ئاسن، خەڵوز، نەوت، وزەی کارەبا.
- بەرهەمەکانی کارەبا: ٥٥۰ر٦ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازی: بە ئاسنکردنی مەنجەمەکان، بەرهەمی خەرجکردن، بەرهەمی خواردەمەنی.
- دەرچووەکانی: نوحاس، کۆبالت، ئەڵماس، نەوت، قاوە.
- داهاتەکانی دەرەوەی: کەلوپەلی خواردەمەنی، کەلوپەلی بەکارهێنان، کەلوپەلی گواستنەوە، ئامێری بەکارهێنان لە مەنجەمەکان، سوتەمەنی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: بەلجیکا، فەرەنسا، ئەمەریکا، ئەڵمانیا، باشووری ئەفریقیا، ئیتالیا، یابان، بەریتانیا، چین، وولاتانی یەکێتی ئەورووپا.

- ڕژێمی دەسەڵات: لە قۆناغی گواستنەوەیە، بەڵام سەرۆك كۆمار دەسەڵاتی بەهێزی هەیە، ڕژێمی كۆماریە بە فرەلایەنی پارتایەتی، یەك ئەنجومەنی یاسادانانی هەیە، سەرۆك كۆمارو ئەندامانی ئەنجومەن بۆماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرین بە پێشنیاری گشتی.
- پارتە ڕامیاریەكان: پارتی بزوتنەوەی میللی شۆڕشگێڕ، سۆشیالستی ئەفریقی، پارتی هێزەكانی دیموكراتی كۆنگۆ كینشاسا (كە لە ١٢٠ كۆمەڵی بیرو بۆچوونی جیاوازدا یەكیانی گرتووە) پارتی یەكێتی لە پێناو دیموكراتیەتو پێشكەوتنی كۆمەلایەتی لەگەڵ پێك هاتەی چەندین بیرو بۆچوونی ڕێكخراو بزوتنەوەی تری ڕاسترەو و چەپرەو و مام ناوەندی.
- جوگرافیای وولات: كۆنگۆ كینشاسا دەكەوێتە ناوەڕاستی ڕۆژئاوای ئەفریقیا، كە سێیەم وولاتە لە ئەفریقیا، پێشوو ناسراو بوو بە كۆنگۆی بەلجیكا، لەدوای بەدەست هێنانی سەربەخۆی لە٢٠/٦/١٩٦٠ ناوی گۆڕا بوە كۆماری كۆنگۆی دیموكراتی، لە ساڵی ١٩٧١ دووبارە گۆراوە بۆ كۆماری زائیر. لە ڕۆژئاوای كۆنگۆ برازافیلە، لە باكوری كۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست و سودان، لەڕۆژهەڵاتی ئۆگەنداو ڕواندەو بۆرەندی و تەنزانیا، لە باشووری زامبیار ئەنگۆلا. كەنداوەكانی زێی كۆنگۆ زۆربەی خاكەكە دەگرێتەوە لەناو دێر كردنی، لە ناوەڕاست تەپۆلكەی گەورە داپۆشیوە بە دارستانی چڕی بارانـاوی، لە ڕۆژئاوای زەویەكەی چیاییە، لە ڕۆژهەلات و باشووری ناوچەیەكی دارستانیە، دەشتایەكی مێرگی پڕ لە ڕووەك و گیایی هەیە لە باكوری، لە ڕۆژهەڵاتی چیای ڕوانزوری بەرزە بەدرێژی زێی كۆنگۆ كە ٤٢٤٨ كیلۆمەترە كە لەڕۆژئاوای دێتە خوارێ و لەزەریای ئەتڵەسی دەكاتەوە، لە باكوری دوو زێی سەرەكی هەیە ئەویش زێی (ئۆینگی و بۆمۆیە) لە وولاتەكە تافگەی فكتۆریای تیایە، دەریاچەی (ئیدواردی) تیایە لەگەڵ دەریاچەی (تەنگیكا) كە درێژیەكەی جیا كەرەوەی نێوان كۆنگۆ لە ڕۆژئاواو تەنزانیاو بۆروندی لە باكورەوە. كەش و هەوایەكی گەرمو شێداری هەیە.
- مێژووی وولات: لەوانەیە دانیشتوانی پێشووی كۆنگۆ كینشاسا لە هۆزو تیرەكانی بیگین پێك هاتبن لەگەڵ بەدوا داچوونەكانی هۆزی بانتۆ لە ڕۆژهەلات و هۆزەكانی (نیلۆنیك) لە باكوور كە لەوكاتە خاكی كۆنگۆو ئەنگۆلا لەژێر دەسەلاتی شانشینە بانتۆو بانگۆی گەورە بوون، لەوكاتە پورتوگالیەكان سەردانی كۆنگۆیان كرد لەسەدەی پانزەم. لە ساڵی ١٨٧٦ شانشینی (لیۆبۆلدی دووەم) شانشینی بەلجیكا كۆمەڵێك دەوڵەتی ژێر دەستەی لەناوچەی كۆنگۆ دامەزراند، لە ساڵی ١٨٧٧ (هنری ستانلی) دۆزینەرەوەی بەریتانیا كۆنگۆی دۆزیەوە ، لە ساڵی ١٨٧٨ چەندین كەس و كۆمەڵ لەلایەن شانشینی بەلجیكا دووبارە ڕەوانەی ناوچەكە كران. لە كۆنگرەی بەلێنی ساڵی ١٨٨٤تا١٨٨٥ دەوڵەتی كۆنگۆی ئازاد ڕێكخراو (لیۆبۆلدی) بەلجیكی كردە شانشین و خاوەندیەتی بەوەرگرتن دەسەڵات بەپێی ڕێكەوتنەكە یارمەتی و هاوكاری سەرۆكە نیشتیمانپەروەرەكانی كرد لەجیاتی پشتگیری لێ كردنیان. ئەمەش بوە هۆی چەوسانەوەی كرێكارانی نیشتیمانپەروەر بەكار پێكردنیان لە كێلگەكانی كشتوكاڵی هەمە جۆر بەزۆرو بێ موچەو كرێی ڕۆژانە و بوە هۆی نارەزایی وولاتانی دژ بەو ڕامیاریەتە، لە ساڵی ١٩٠٨ (لیۆبۆند) ناچاركرا لە سەر كورسیەكەی بێتە خوارێ و دەسەڵاتی لەسەر كۆنگۆی ئازاد نەمێنێ و بوە ژێر دەستەیەكی بەلجیكا بەناوی كۆنگۆی بەلجیكی و بوە سەرچاوەیەكی

سەرەکی لەدەرهێنانی بەرهەمی سروشتی، لە ساڵی ١٩٥٩ مانگرتن و خۆپیشاندانی کرێکاران لە شاری کینشاسا ئەنجام درا لەوکاتە پێی دەگوترا (لیۆبۆلد فیل) لەدوای کێشەیەکی توندو تیژ لەنێوان سەرکردەکانی بەلجیکاو کۆنگۆلیەکان ئەنجامەکەی ڕێکەوتن بەدانانی سەربەخۆیی کۆنگۆ لە ١٩٦٠/٢/١٧ بەمەرجێك کە سەربەخۆی تەواوی هەبێت لە ٢٠/ ٦/ ١٩٦٠ و یەکەم هەڵبژاردن ئەنجام درا لە ١٩٦٠/٥/٣١ ئەویش بە سەرکەوتنی پارتی بزوتنەوەی کۆنگۆی نیشتیمانی بە سەرکردایەتی (پاتریس لۆمۆمبا) کە ٣٥ کورسی بەدەست هێنا لەکۆی ١٣٧ کورسی، پاتریس لۆمۆمبا بوە سەرۆك وەزیران، لە٢٠/٦/١٩٦٠ حکومەتی فرەلایەنی پێك هێناو ڕژێمی کۆماری ڕاگەیاند، بەڵام لە دوای ئەو کارانە شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا لەنێوان دەسەلاتی ناوەندی بە سەرۆکایەتی (جۆزیف کازامۆیۆ) لە کینشاسا (لیۆبۆلد فیل) لەنێوان ناوچەی کاتنگای دەوڵەمەند بە سامانی سروشتی، لە ١٩٦٠/٧/١١ دوای چەند ڕۆژێك سەربەخۆیی وولات بەرژێمی کۆماری (مۆیس تشۆمی) سەرۆك وەزیرانی ئەو ناوچەیەو ناوچەیەکی تر دەوڵەمەند بە سامانی سروشتی ناوچەی کاسیای باشوور بوە هۆی هەڵگیرسانی تەنگەژەی پێك دادان و لێکدان و گرتن و کوشتن و بوە هۆی هەڵاتنی ئەوروپیەکان لە وولات. بەلجیکا هێزی سەربازی ڕەوانەی کۆنگۆ کرد بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخەکەو کۆتایی پێ هێنانی شەڕی ناوخۆ لەوکاتەی کێشە لەنێوان سەرۆك کۆمارو سەرۆك وەزیران دەستی پێ کردو دوای ئەوە پاتریس لۆمبۆمبا تیرۆرکرا لەلایەن یەکێك لە تاوانبارەکانی بەلجیکا بە ئامادەبوونی تشۆمی لە مانگی/٢/١٩٦٠، دوای ئەوە نەتەوە یەکگرتووەکان هێزی پاراستنی ڕەوانە کردوو بوە هۆی کێشە لەنێوان تاوانبارانی تشۆمی و هێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٩٦١/٩/١٧ (داج همر سۆلد) سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان کۆچی دوایی کرد لە ڕوودانی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکە بۆ بەشداری کردنی لە کۆنگرەی ئاشتی لەگەڵ (مۆیس نشۆمی)، لەدوای وەرگرتنی دەسەلات لەلایەن مۆبۆتۆ لە کودەتای ١٩٦٥ و بەردەوام بوونی لە دەسەلات سەرەڕای کێشەو ململانێی ناو خۆو بوونی چەندین بیرو بۆچوونی جیاواز تاکو ١٩٩٧/٥/١٧ بە سەرکەوتنی هێزی کابیلا و هەڵاتنی موبۆتۆ و چونە ناو شاری کینشاسا (لۆران کابیلا) سەرۆکایەتی وولاتی خۆی ڕاگەیاند و دووبارە ناوی وولاتی گۆڕی بۆ کۆماری کۆنگۆی دیموکراتی کابیلا بەتەنیا دەسەلاتی گرتە دەست بێ ئەوەی پرسوڕابەکەس بکات کە دەسەلاتێکی تاك ڕەوی بوو، لە ١٩٩٩/٨/٢١ سەرکردایەتی حکومەتی ناوەندی و شۆڕشگێڕان بڕیاری وەستانی شەڕی ناوخۆیان ڕاگەیاند.

- کۆنگۆ کینشاسا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان ، ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا.

# مەغرب

- ناوی ڕەسمی: شانشینی مەغرب.
- پایتەختی: ربات، ژمارەی دانیشتوانی (٠٠٠ر٢٥٠ر١ ملیۆن کەسە).
- شارە سەرەکیەکانی: مەراکش، فاس، مەکناس.
- بەندەرە گرنگەکانی: کازابلنکا (الدار البیضاء) تەنجە، ئەنمادیر.
- ڕووبەری: ٤١٣ر١٧٢ میل چوارگۆشەو ٥٥٠ر٤٤٦ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٨٧٦ر٢٩ ملیۆن کەسە، بەپێی زانیاری ڕۆژنامەکانی ٢٠٠٣.
- چڕی دانیشتوانی: ١٧٣ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢ر٢٪.
- نژادەکانی: عەرەبی بەربەر ٩٩٪.
- زمانەکانی: عەرەبی (زمانی ڕەسمیە) بەربەری، فەرەنسی، ئەسپانی،ئەمازیغی.
- ئاینەکانی: ئیسلام.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٤٥٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٣٦ پارێزگایە لەگەڵ پێنج ئەنجومەنی شارەوانی.
- بەرگری: ٣ر٧٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٥٠٠ر١٩٧هەزار کەسە.
- دراوی: درهەم.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١٠٧ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر٣ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢١٪ لە خاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، خوێ، ترێ، زەیتون، چەوندەری شەکر، گەڵێ بەرهەمی تر.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ١٠٠ر١٦ ملیۆن سەر، بزن ٨٠٠ر٤ ملیۆن سەر، چێڵ و گامێش ٤٥٠ر٢ ملیۆن سەر، پەلەوەر ٠٠٠ر١٠٥ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی کارەبا: ٥٠٠ر١١٠ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: فۆسفات، ئاسنی خاو، موگناتیس، قوڕقوشم، تۆتیا، لەگەڵ ئەوەشدا بەرهەمی ماسی هەیە.
- پیشەسازی: مافور، جل و بەرگ، پیشەسازی پێست، مەنجەم، گەشت و گوزار، پیشەسازی خواردەمەنی.
- داهاتەکانی دەرەوەی: کەلوپەلی سەرمایەداری، سوتەمەنی، پێداویستیەکانی خۆراك، کەلوپەلی خاو، کەلوپەلی بەکارهێنان.
- دەرچووەکانی: خۆراك، خواردنەوە، کەلوپەلی نیمچە دروستکراو، کەلوپەلی بەکارهێنان، فۆسفات.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یەکێتی ئەوروپا، کۆمەنولسی وڵاتانی سەربەخۆی سۆڤیەتی پێشوو، یابان، ئەمەریکا، چین، هند، عیراق و چەندین وڵاتانی عەرەبی و ئەرفەریقی .
- ڕژێمی دەسەلات: شانشینی دەستوریە، یەکەم دەستور لە ساڵی ١٩٦٢ دەرچوو، لە ساڵی ١٩٧٢ دەستوری دووەم دەرچوو بەلام بڕیارو یاسا جیا جیاکان لەلایەن شانشین دەر دەچێ، لە دوای گەڕانەوەی ڕاپرسی جەماوەر کە لە ساڵی ١٩٩٢ ئەنجامدرا گۆڕانکاری لە دەستور کراو هەڵبژاردن ئەنجام درا بە ئەنجومەنێکی ٢٠٦ کورسی کە هەشت پارتی هەمەلایەن

نوێنەرایان لە پەرلەماندا هەیە.

- پارتە رامیاریەکان: پارتی یەکێتی دەستوری، کۆمەڵی نیشتیمانی سەربەخۆکان، شانشینی، بزووتنەوەی میللی، پارتی سەربەخۆیی، نەتەوەیی، یەکێتی سۆشیالستی هێزی میللی، سۆشیالستی پێشکەوتوو، پارتی نیشتیمانی دیموکراتی.

- جوگرافیای وولات: مەغرب دەکەوێتە سەر کەناری باکوری رۆژئاوای ئەفریقیا، درێژ دەبێتەوە لەسەر زەریای ئەتلەسی لە رۆژئاوا، لەسەر دەریای سپی ناوەراست لە باکور، کە چیای ناکاشە لە ئەسپانیاو لە کیشوەری ئەوروپا جیای دەکاتەوە تەنیا گەروی چیای تارق نەبێت کە (پانی ١٣ر٦ کیلۆمەترە) کە رێچکەیکی ئاوی سروشتیە یەکێکە لەنێوان دەریای سپی لە باشووری بیابانی رۆژئاوا، کۆماری جەزائیر لە رۆژهەلاتی. مەغرب لە پێنج هەرێم پێك دێت کە زنجیرە چیایەکە (بە درێژایی دەریای سپی ناوەراست و گوندنشینەکان لە باکور، لەگەڵ چیاکانی ئەتلەسی ناوەراست و چیا بەرزو نزمەکان، دەشتایی بەپیتی لە رۆژئاوا هەیە، دەشتایی گرینیە لە باشووری رۆژئاوای، گردۆلکەی کشتوکاڵی باشی هەیە لە ناوەراست بەڵام ناوچەی باشووری رۆژهەلات بیابانێکی وشك و بێ بارانە.

- مێژووی وولات: فەنیقیەکان لە سورەوە هاتنە ناوچەی مەغرب لەنێوان سەدەکانی دەو سێی پێش زاین و تێیدا نیشتەجێ بوون. لە سەدەی یەکەمی زاینی باکوری رۆژئاوای ئەفریقیا گۆڕا بوە ناوچەیەکی رۆمانی، لەسەدەی پێنجەم و شەشەم (فندالی و فین بگۆس) لەیەکەمەکانی ئەڵمانیا بوون کە داگیریان کردو ئەوانی تریش لە باشووری فەرەنسا. لە ساڵی ٦٨٢ کردنەوەی (فتح) عەرەبی بە ناوی ئیسلام عەرەبەکان لە رۆژهەلاتی بۆ باکوری ئەفریقیا هاتن و دانیشتوانی وولاتیان کردە ئیسلام و بە هاوکاری ئەوان توانیان وولاتی ئیسپانیا بکەنەوە لە سەدەی هەشتی زاینی بەناوی کردنیان بە ئیسلام. لە ماوەی ساڵەکانی ١٠٥٦ تا ١١٤٦ دانیشتوانەکان بەزۆر لێ کردنی هاتوەکان توانیان ئیمپراتۆریەتی گەورە دابمەزرێنن کە هەموو باکوری رۆژئاوای ئەفریقیاو زۆربەی خاکی ئەسپانیاو چەند پارچەیەك لە خاکی جەزائیر بگرێتە خۆی و شاری مەراکش بکەنە پایتەختی ئەو ئیمپراتۆریەتە. لەدوای ئەمە کێشەو ململانێی بەهێز پەیدابوو لە بوارەکانی هەمەلایەنی داگیرکردن و فراوانکردنی خاك و دەسەلات تاکو ساڵی ١٤١٥ کە ئەسپانیەکان و پرتوگالیەکان توانیان بەندەرەکانی مەغرب داگیر بکەن و ئیسلام لە ئەسپانیا دەربکرێن. بەلام لەسەدەی شازادە بنەماڵەی سعدیەکان توانیان مەغرب یەکخەنەوەو بەرگری لە وولاتەکەیان بکەن دژی داگیرکەرە عوسمانیەکان. لە ساڵی ١٦٤٩ بنەماڵەکە توانیان دەسەلاتی شانشین دابمەزرێنن دور لە وولاتانی تر. لە ساڵی ١٨٦٠ ئەسپانیا مەغربی داگیر کردو ناچاری کرد کە واز لە ناوچەی باشووری رۆژئاوا بێنێ کە ناسراوبوو بە (ئفنی) هەروەها دەسەلاتی فەرەنساش بەسەر مەغرب داشکاو کێشە لەنێوان ئەلمانیاو فەرەنسا پەیدابوو بەهۆی بەرژەوەندی ئابووری و داگیرکردن، لە ساڵی ١٩١١ دووبارە کێشەی ئەغادر پەیدا بووەوە. هەروەها کێشەی ئەڵمانیا دژی فەرەنسا سەری هەڵدایەوە لە مەغرب لە ئەنجام بوە هۆی ئەوەی فەرەنسا واز لە هەندێ خاك بهێنێ بۆ ئەڵمانیا. لە ساڵی ١٩١٢ مەغرب دابەش کرا بەدوو بەشی پارێزراوی فەرەنسی و ئەسپانیا کە دادوەرەکە تەنیا وەك سەرکارێك

دانرابوو. لە سالی ١٩٢٦ بەسەرکردایەتی عەبدل رحمن ختابی شۆرش بەرپابوو لەلادیٚ کە بوە هۆی ناچارکردنی ئەسپانیا بەوازهێنانی لەناوچەی (ئەنوال)، لە سالی ١٩٤٤ لە مەغرب پارتی نەتەوەیی پێك هات کە داوای سەربەخۆی وولاتی دەکرد، لە سالی ١٩٤٨ ئەنجومەنی گفتوگۆ دامەزرا، لە سالی ١٩٥٦ هێزەکانی فەرەنساو ئەسپانیا لە مەغرب کشانەوە لەدوای توند بوونی کێشەو ململانێی جەماوەر لەگەل داگیر کەرانی فەرەنساو ئەسپانیا. کە بوە هۆی وەدەست هێنانی سەربەخۆی تەواو، فەرەنسا و ئەسپانیا دانیان نابە سەربەخۆی ولات بەبونی محەمەدی پێنجەم بە شانشینی مەغرب، لە سالی ١٩٥٧ لەدوای کۆچی شانیشن محمدی پێنجەم کورەکەی شانشین حەسەن بوە شانشینی مەغریب لەسالی ١٩٦١ دەستوری راگرت و هەمووبریارو یاسایەکی لەلایەن خۆی دەردەکرد، لەسالی ١٩٥٧ ئەسپانیا لە بیابانی رۆژئاوا کشاوە. بەلام بەرەی پۆلیساریۆ دەستی کرد بە کاری پارتی زانی لە بیابانی رۆژئاوا. لە سالی ١٩٧٦ بەناوی جێبەجێکردنی سەربەخۆیی لەژێر ناوی کۆماری دیموکراتی عەرەبی بیابان. لە سالی ١٩٧٩ موریتانیا لەو ناوچەی کە لە بیابانی رۆژئاوا بەری کەوتبوو لیٚ ی کشاوە. بەلام دەسەلاتی مەغریب بەهێزی سوپا توانی ئەو ناچەیە بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی لەگەل بەرەی بۆلیساریۆ، لە سالی ١٩٨٠ شەر لەنێوان بەرەی بۆلیساریۆ و شانشینی مەغرب راوەستا بە مەرجێك راپرسی گشتی بکرێت، بەداهاتوویان لە ناوچەکە بەلام ئەو راپرسە ئەنجام نەدرا. لە سالی ١٩٩٢ دەستکاری لە دەستور کرا بە زیاد کردنی دەسەلاتی پەرلەمان، لە سالی ١٩٩٣ بەرهەلستکارانی مەغرب لە هەلبژاردنی پەرلەمان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا بەلام چاودێران بروایان بەو کارە نەدەکرد بەهۆی گەمارۆدانی پەرلەمان لەلایەن دەسەلاتی شانشین حەسەن.

لە سالی ١٩٩٦ رەزامەندی کرا لەسەر دوو ئەنجومەن لە وولاتی مەغریب. مەغرب لە دوای سالی ١٩٩٦ پەیوەندی لەگەل ئیسرائیل بەست. شانشین حەسەن لە ١٩٩٩/٧/٢٣ کۆچی دوایی کردو ئەمیر محمدی شەشەم بوە شانشینی مەغریب، لە دوای باوکی راستەوخۆ بەردەوامە لە دەسەلات سەرەرای چەندین کێشە بەتایبەتی کێشەی پۆلیساریۆو هەژاریو ئالۆزی باری ئابووری.

- مەغرب ئەندامە لە زانکۆی ولاتانی عەرەبی، ئەندامە لە رێکخراوی نەتەوە یەککرتووەکان. ئەندامە لە رێکخراوی یەکێتی ئەفریقی، ئەندامە لە رێخراوی کۆنگرەی ئیسلامی.

# نیجیر

• ناوی ڕەسمی: کۆماری نیجیر.
• پایتەختی: نیامی، ژمارەی دانیشتوانی ٥٦٧ر٠٠٠ هەزار کەسە.
• شارە سەرەکیەکانی: زیندر، مارادی، تهوی، ئەگادیز.
• ڕووبەری: ٤٨٩ر٢٠٦ میل چوارگۆشەو ١ر٢٦٧ر٠٤٤ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
• ژمارەی دانیشتوانی: ١٠ر٣٦٥ر٠٠٠ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٨.
• چڕی دانیشتوانی: ٢١ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
• بوژانەوەی دانیشتوانی: ٣ر٥٪.
• نژادەکانی: هۆسا ٥٦٪، گرما ٢٢٪، فولا ٩٪. تۆراف ٨٪.
• زمانەکانی: فەرەنسی (زمانی ڕەسمیە) هۆسا، گرما.
• ئاینیەکانی: ئیسلام ٨٠٪، ئەنیمیون و مەسیحی ٢٠٪.
• زانینی نوسین و خوێندن: ٤٥٪
• دابەشی کارگێری: ٧ بەشە + ناوچەی پایتەخت.
• سوپاکەی: ٥٥ر٥٠٠هەزار کەسە.
• بەرگری: ١ر٥ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
• دراوی: فرنك سیفا.
• کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٦ر٥٠٠ ملیار دۆلارە.
• بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٦٧٥ دۆلارە.
• زەوی کشتوکاڵی: ٢ر٣٪ لەخاکی وڵاتەکە.
• بەرهەمی کشتووکاڵی: فولی سودانی، پەمۆ، لۆبیا، گەنمەشامی باریك، برنج، سورجوم، دانەوێڵە، تەرو میوەجات، چەوەندەری شەکر..
• سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٣ر٨٥٠ ملیۆن سەر، بزن ٥ر٩٣٠ ملیۆن سەر، چێڵو گامێش ٢ر٥٠٠ ملیۆن سەر، پەرەور ٢٠ ملیۆن سەر.
• بەرهەمی کارەبا: ١٧٥ر٥٠٠ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
• سامانی سروشتی: یۆرانیۆم، خەڵوز، ئاسن، فۆسفات.
• پیشەسازیەکانی: یۆرانیۆم، پەینی کیمیاوی، خشتی خانوو، بەرهەمی دروستکراوی سووك.
• دەرچووەکانی: یۆرانیۆم، لۆبیا، ئاژەڵ، پێست،خوری.
• داهاتەکانی دەرەوەی: سوتەمەنی، ماشێن، کەلوپەلی گواستنەوە، پێداویستی خواردەمەنی، داو دەرمانی پزیشکی، بەرهەمی کیمیاوی.
• هاوبەشەکانی بازرگانی: فەرەنسا، نێجیریا، جەزائیر، ئەمەریکا، ئیتاڵیا، ساحل العاج، چین، ئەڵمانیا.
• ڕژێمی دەسەڵات: وڵاتی نیجیریا یەکەم هەڵبژاردنی دیموکراتی لەمانگی ١٩٩٣/٤/ ئەنجام داو حکومەتێکی ئیتلافی پێك هێناوە لە٨٣ ئەندامی پەرلەمانەکە لە هەموو حیزبو لایەنە هەمە جۆرەکان بەشداریان تێدا کردووە لەکۆمەڵەی نیشتیمانی، ئەمەریکا پشتگیری دەکات.
• پارتە ڕامیاریەکان: بزوتنەوەی نیشتیمانی بۆ کۆمەڵەی بوژانەوە، چەپی ناوەندیو هاوکاری هێزی گۆڕین، پارتی دیموکراتی سۆشیالستی، چەندین بیرو بۆچوونی تر لە بزووتنەوەو گرویی ڕامیاری و نەتەوەی و نیشتیمانی دیموکراتی.

- جوگرافیای وولآت: نیجیر گەورەترین وولآتە لە ڕۆژئاوای ئەفریقیا لە ڕووبەردا کە وڵاتێکی ناوخۆیە.. لیبیاو جەزائیر دەکەوێتە باکوری، مالی و بۆرکینا فاسۆ دەکەوێتە ڕۆژئاوای، بنین و نێجیریا دەکەوێتە باشووری، تشاد دەکەوێتە ڕۆژهەلآتی.
- مێژووی وولآت: بوژانەوەی شارستانیەتەکەی بەناوی شارستانی (قانم بۆرنۆ) بوو لە نزیك دەریاچەی تشاد لە باشووری ڕۆژهەلآتی وولآت، ئاینی ئیسلام لە سەدەی پانزەهەم تێیدا بلآوبوەوە، لەسەدەی پانزەم و حەڤدەم هۆزەکانی گرما ئیمپراتۆریەتیان پێك هێنا لەسەر کەنارەکانی زێی نیجیر لە باشووری ڕۆژئاوی، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم فەڕەنسیەکان ناوچەکەیان داگیر کردو بازرگانی کردن بەکۆیلایەتی تێدا هەلوەشاندەوەو بوە پارەچەیەك لە ئەفریقیای ڕۆژئاوای فەڕەنسی لە ساڵی ١٩٠٤. بەلآم هۆزەکانی تەوارق بەردەوام بوون لە دژایەتی کردنی فەڕەنسا تاکو ساڵی ١٩٢٢ تا ئەوکاتەی فەڕەنسا نیجیری کردە ژێر دەستەی خۆی. نیجیر بوە یەکێك لەهەرێمەکانی دواوەی دەریاکانی فەڕەنسا لە ساڵی ١٩٤٦، ئەنجومەنی یاسادانانی تایبەتی خۆی هەبوو بەنوێنەر لە پەرلەمانی فەڕەنسا ، لە ساڵی ١٩٥٨ بوە کۆمارێکی خاوەن ئۆتۆنۆمی لەناو کۆمەڵەی فەڕەنسا، نیجیر لە٣/٨/١٩٦٠ سەربەخۆیی تەواری بەدەست هێنا کە هامانی بوری هەلبژێردرا بە سەرۆك کۆمارو پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ فەڕەنسا نەبڕی، لە ساڵی ١٩٧١ دەست کرابە دەرهێنانی یۆرانیۆم. لە ساڵی ١٩٧٧ ڕێکەوتنی هاوکاری لەگەڵ فەڕەنسا مۆرکرد. لەدوای ساڵەکانی ١٩٨٤ دەست کرا بەماوەدانی کەرتی تایبەتی لەو کەرتە گشتیانە بەشێوەیەکی کەم ئەمەش بەهۆی دابەزینی نرخی یۆرانیۆم لەجیهاندا. لەدوای تەنگەژەی ئابووری و دەسەلآت و کێشەو ململانێی پارتی هاوکاری بەهێزی گۆرنگا سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە ساڵی ١٩٩٣، ماهامان عوسمان بوە سەرۆك کۆمار کە موسلمان و لەهۆزی (هۆسا) بوو، لە ساڵی ١٩٩٤ ڕێکەوتنامەی لەگەڵ تەوارقەکانی باکور مۆرکردو مافی ئۆتۆنۆمیان پێدرا. لە ١٩٩٦ سەرۆك کۆمار ماهامان عوسمان لەسەرۆك کۆماریەتی هێنرا خوارێ بەهۆی کودەتای سەربازی بەسەرکردایەتی ئیبراهیم مناسرەوە دەسەلاتی مەدەنی گێڕاوە وولآت. لەمانگی/٤/ ١٩٩٩ ئیبراهیم مناسرە تیرۆرکرا لەلایەن پاسەوانەکانی و ئەحمەد بوبکر هەر بەسەرۆك کۆمار مایەوەو لە ١٨/٧/١٩٩٩ دەستوری نوێی دەسەلآتی مەدەنی ڕاگەیاندرا لە ڕێگەی ڕاپرسی گەلانی نیجیر.
- نیجیر ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا.

# ئەنگـــۆلا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری ئەنگۆلای میللی.
- پایتـــــەختی: لوانـــــدا، ژمـــــارەی دانیشتوانی٠٠٠ر٢٨٥ر٢ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: لۆبیتۆ، بنگوێلا، هوامبۆ، لوبنگۆ.
- بەنـدەرە سـەرەکیەکانی: هوامبـۆ، لوبنگـۆ، مالنگی.
- ڕووبـــەری: ٣٥٠ر٤٨١ میـــل چوارگۆشــــەو ٦٧٠٠ر١٢٤ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ٥٠٠ر٥٢٥ر١١ ملیـۆن کەسە، بەپێی زانیاریەکانی ٢٠٠١.
- چـڕی دانیـشتوانی: ٢٤ کـەس لەیـەك میـل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر٣٪.
- زمانــەکانی: بــەهازی ئەندەنوســی(زمــانی ڕەسمیە) لەگەل زمانی ئینگلیزی، هۆلەندی، جاوی.
- نـژادەکانی: هەشت ڕەگـەزی سـەرەکیە لـە ١٠٠ سکە. واتە نەوەکانی لەدایکە نەك لە باوك.
- ئایینـەکانی: ئاینـە ناوخۆیـەکانی تایبـەتن بـە بڕوای گیانی ٤٧٪. کاسۆلیکی ڕۆمانی ٣٨٪، برۆتستنتیە ١٥٪.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٣٢٪.
- دراوی. کوانزا.
- دابەشی کارگێڕی: ١٨ پارێزگایە.
- بەرگری: ٥ر٨٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٥٠٠ر١١٢ هەزار کەسە .
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٥٠٠ر٨ ملیـار دۆلارە.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی نـاوخۆیی: ٨٥٠ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٣٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهـــەمی کـــشتوکاڵی: قـــاوە، سیـــسل، گەنمەشامی، پـەمۆ، چـەوەندەری شـەکر، مۆز، چـەندین جـۆری تـر لـە بەرهـەمی کـشتوکاڵی، تەڕەو میوەجات .
- سامانی ئاژەڵی: چێڵ و گامێش ٣٥٠ر٣ ملیۆن سـەر، مـەڕ ١٠٠ر٢ ملیـۆن سـەر، بـزن ٦٥٠ر١ ملیـۆن سـەر، بـەراز ٠٠٠ر٨٢٥ هـەزار سـەر ، پەرەور ٧٠٠ر٦ ملیۆن سەر.
- سـامانی سروشـتی: ئاسـن، ئـەڵماس، زێـڕ، نەوت.
- بەرهـــەمی کارەبـا: ١٥٠ر٢ ملیـار کیلـۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازی: ئـەڵماس، ئامـادەکردنی ماسـی، پاڵاوتنی نەوت، توتن، ڕستن و چنین، چیمەنتۆ، بیرە، شەکر، لە ئەنگۆلا بوژانەوەی پیشەسازی نەوت بەوە چاوەڕوان دەکرێ کە ببێتە یەکێك لە وولاتە گەورەکانی دەرهێنەری نەوت.
- دەرچووەکانی: نـەوت، قـاوە، ئەڵماس،ماسـی، ئاسنی خاو، دار.
- داهاتی دەرەوەی: ماشێن، کەلوپەلی کارەبایی، ئاسن، پۆڵا، بەرهـەمی ڕستن و چنین، خـۆراك، چەك و تەقەمەنی، جل و بەرگ.
- هاوبەشـەکانی بازرگـانی: ئەمـەریکا، فەڕەنـسا، ئـــەڵمانیا، هۆڵەنـــدا، بـــەڕازیل، پورتوگـــال، ئەسپانیا، چینی میللی.
- ڕژێمی دەسەڵات: سەرۆك جوزێ ئەردوارد دۆی سانتوس سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنا لە هەڵبژاردنـەکانی مـانگی ١٩٩٢/٩ بـە چاودێری نەتـەوە یـەکگرتووەکان ، سـەرۆك سانتۆس ئـەو سەرۆکەی جولانەوەی میللی ڕزگاری ئەنگۆلای پێك هێنا کـە•جولانەوەکـەش پـارتی کرێکـاری بوو، سانتۆس ئەو هەڵبژاردنەی ئەنجام دا دژی پــارتی مۆنیتــا بــوو بــە ســەرۆکایەتی جۆناســـافینکی. ڕێکخـــراوی نەتـــەوە یەکگرتووەکان دانی بە حکومـەتی دیموکراتی ئەنگۆلای نوێ تا لەمانگی/٥/ ١٩٩٣.

- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی بزوتنەوەی ڕزگاری میللی ئەنگۆلا (پارتی مارکسی لینینیە) پارتی مۆنیتا (یەکێتی نیشتیمانی سەربەخۆیی ئەنگۆلا) بەرەی نەتەوەیی بۆ ڕزگارکردنی ئەنگۆلا.
- جوگرافیای وولات: ئەنگۆلا دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای ئەفریقیا، لەسەر کەنارەکانی زەریای ئەتڵەسی باشوور، درێژی کەنارەکە زیاترە لە ١٦٠٩ کیلۆمەترە، نامیبیا دەکەوێتە باشووری، زامبیا دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی، کۆنگۆ کینشاسا (زائر) لە باکورو ڕۆژهەلاتی، هەرێمی کابیدا کە لابالێکی چیایە لە ولاتو دەکەوێتە نێوان کۆنگۆ کینشاسا و کۆنگو برازافیلیا، ئەنگۆلا وولاتێکی گردۆلکەی بەرزە بە بەرزاییەکی بێ بڵندو نەوی، دوای ئەو نەویایە لە کەنارەکانی دەریا، هەموو خاکی وولات بیابانیە یان دارستانو ڕوەكو گیایە لە باکوری ڕۆژهەلاتی دارو دارستانێکی زۆری تیایە، کەش و هەوای لە باکور فێنك و باراناویە بەلام لە گردۆلکەکانی سارد و وشکانیە.
- مێژووی وولات: شانشینی ناوچەی باکوری ڕۆژئاوای ئەنگۆلا کە شانشینیەتی بانتۆو باکۆنگوی دەکرد لەوکاتە دەریاوانەکانی پورتوگال (دیۆگۆکا) سەردانی ئەو ناوچەی کرد لە سالی ١٤٨٢ کاری دەسەلاتداریەتی لەسەر ئەنگۆلا بەکار دەهێنا، لە سالی ١٥٧٦ ئەنگۆلا بوە بازنەیەکی بازرگانی پەیوەندی لەگەڵ هیند و ڕۆژهەلاتی دور، دوای ئەوە بوە سەرچاوەی بنەڕەتی دەرچوونی کۆیلایەتی بەرەو بەڕازیل، ئەو ژێر دەستەی کە پورتوگال دایمەزراندبوو لە ئەمەریکای باشوور (جیهانی نوێ هەروەك ئەمریکیەکان ناویان نابوو). لەدوای پەیمانی بەرلین لە سالی ١٨٨٥ ئەنگۆلا بوژانەوەی بەخۆوە دیت بەهۆی کردنەوەی پرۆژەو کۆمپانیا لە لایەن بەریتانیا و پورتوگال لەبەرهەم هێنانی سروشتی و دروستکردنی هێلی شەمەندەفەرو کاری کشتوکالی. لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانی جولانەوەی داواکاری سەربەخۆیی سەری هەلدا بەلام دوایی لەناوبرا بە هێزی سەربازی و دوای ئەنجامەکەی شۆڕشی نیسانی ١٩٧٤ لێکەوتەوە کە بوە هۆی گۆڕینی ڕامیاریەتی پورتوگال، دوای لە ١١/١١/ ١٩٧٥ سەرۆك فرانسیسکۆ داکۆستا ڕێکەوتنی مۆرکرد بە پێدانی سەربەخۆیی، پرۆژەی سەربەخۆیی لەسەر هەلبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرایەتی دەستوری لەسەر کۆتایی هێنانی ناکۆکی لە نێوان جولانەوەی ڕزگاری میللی ئەنگۆلا و بەرەی لە پێناو سەربەخۆیی ئەنگۆلا مۆر کرا. کۆباو یەکێتی سۆڤیەت پشتگیری جولانەوەی ڕزگاری میللی لە پێناو ڕزگاری ئەنگۆلای دەکردو بوە هۆی سەرکەتنیان بەپێك هێنانی حکومەتێکی مارکسیو پارێزگاری کردنی لە لایەن کوبا بە پشتیوانی سۆڤیەت توانرا بگەنە ڕێکەوتن لەنێوان ئەنگۆلاو باکوری ئەفریقیا و کوبا، کوبا هێزەکانی کشاندەوە لە ئەنگۆلاو بوە هۆی نەمانی داگیرکردنی نامیبیا لە کاتی خۆی لە مانگی ٦/١٩٩١و بوە هۆی سەربەخۆیی نامیبیا، لە سالی ١٩٩٧حکومەتێکی یەکێتی نیشتمانی پێك هێنرا، یەکێتی ئەفریقیاش دانی بەو حکومەتە مارکسیە نا لە سالی ١٩٧٦، ئەنگۆلا بوە ئەندامی چل و حەوتەمین لەو ڕێکخراوەیە بەلام بە پشتیوانی ئەمەریکا بزووتنەوەی یۆنیتا دژی ئەو حکومەتە وەستان و هەولی لەناوبردنیان دا لە دوای کێشەو ململانێیەکی زۆر تاکو ١٩٨٨. لە ٢٨/ ٨/ ١٩٩٧ ئەنجومەنی ئاسایشی نیو دەولەتی دەنگی دا بە سزادانی یۆنیتا، لە مانگی /٨/ ١٩٩٨ ئەنگۆلا بەسەدان سەربازی نارده کۆنگۆ کینشاسا بۆ پشتگیری ڕژێمی لۆران کابیلا تاکو کۆتایی سالی ٢٠٠٤ لە دەسەلات بەردەوام بوو .
- ئەنگۆلا ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

# ئۆگەندا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری ئۆگەندا.
- پایتەختی: کەمبالا، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر١٥٠ر١ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکییەکانی :جینمگا، مبالا ،عەنتیبی، مەسکا.
- بەندەرە سەرەکییەکانی: عەنتیبی، جینمگا.
- ڕووبەری: ٧٣ر٩١٠ میل چوار گۆشەو ٨٨٠ر٢٣٥کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر١٥٠ر٢٣ ملیۆن کەسە، بەپێی زانیاری ٢٠٠٢.
- چڕی دانیشتوانی: ٢٥٣ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر٣٪.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٦٥٪.
- نەژادەکانی: بانتۆ، نیلۆتیك، نیلۆهامیتیك، لەگەڵ هۆزەکانی سودانی.
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی ڕەسمییە) ئۆگندی، کەناری.
- ئاینەکانی: مەسیحی ٦٦٪ .بڕواکانی ناوخۆیی ١٨٪، ئیسلام ١٦٪.
- دابەشی کارگێری: ١٠ هەرێمە و دابەشی ٢٨ ناوچەی جیاجیا کرایە.
- بەرگری: ٥ر٢٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر٥٥ هەزار کەسە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٠٠٠ر٢٥ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٧٥٠ر١ دۆلار.
- دراوی: شلنی ئۆگەندی.
- زەوی کشتوکاڵی:٥ر٢٢٪لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: قاوە، پەمۆ، چایە، گەنمەشامی، تەباق ،گەنمو جۆ، تەرەو میوە جات، چەوەندەری شەکر.
- سامانی ئاژەڵی:چێڵو گامێش ٣٠٠ر٥ ملیۆن سەر ،بزن ٧٥٠ر٣ ملیۆن سەر، مەر ٠٥٠ر٢ ملیۆن سەر ، بەراز ٠٠٠ر٩٧٥هەزار سەر، پەرەور٥٠٠ر٢٣ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی کارەبا: ٠٠٠ر٧٨٧ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازی: پیشەسازی جمە، بەرهەمی ڕستن وچنین، چیمەنتۆ،دروستکردنی شەکر، خۆشکردنی پێست، دروستکردنی پێلاو، ئامادەکردنی گۆشت.
- سامانی سروشتی:نوحاس، کۆبالف، بەردی چەوی، خوێ.
- دەرچووەکانی: قاوە، پەمۆ، چا.
- داهاتی دەرەوەی: بەرهەمەکانی نەوت، ماشێن، ئۆتۆمبێلی هەمەجۆر، کانزا، پێلاو.
- هاوبەشەکانی بازرگانی:ئەمەریکا، بەریتانیا، کینیا، ئیتالیا، فەرەنسا، ئەسپانیا، باشووری ئەفریقیا
- ڕژێمی دەسەڵات: دیموکراتی تازە پێگەیشتووە.
- پارتە رامیاریەکان:بزوتنەوەی بەرگری نیشتمانی،پارتی پارێزگاران، ڕاست ڕەوی ناوەندی، پارتی کۆنگرەی گەلی ئۆگەندا، چەپی ناوەندی، پارتی ئازادی ئۆگەندا، بەڵام پارتەکان جموجۆڵیان وەستێنراوە لە ساڵی١٩٨٦ .
- جوگرافیای وولات: ئۆگەندە وولاتێکی ناوخۆیەو کەوتۆتە ناوەڕاستی ئەفەریقیا، سودان دەکەوێتە باکوری، کۆنگۆ (زائیری

پێشوو) دەکەوێتە ڕۆژئاوای، تەنزانیا دەکەوێتە باشووری، کینیا دەکەوێتە ڕۆژهەلأت .ئۆگەندە دەکەوێتە سەر هێڵی کەمەرەی زەوی، ئۆگەندە زۆربەی پێکهاتەکانی لە گردۆلکەی بە پیتە (بەرزی ناوەندی۰۰۰ر٤پێیە) لەڕۆژئاواوە دۆڵی سەدەی مەزنە ، چیای بەرزی هەیە لەڕۆژهەلأت، زێی نیلی سپی کە هەڵدەقوڵێ لە دەریاچەی فیکتۆریا لەباشووری ڕۆژهەلأت، لەنزیك تاڤگەی ئۆنز، بەنداوی گرنگی هەیە بۆ دروستکردنی وزەی کارەبا، باشووری ڕۆژئاوای گرکانییە، لە باکوری ڕۆژهەلأتی وشکانییە، بەلأم لە ڕۆژئاواو باشووری ڕۆژئاوای بارانأویە. زۆربەی خاکەکە کژۆگیاو ڕوەك دای پۆشییوە، لە ١٨٪ ڕووبەری وولأت زێ و ڕووبارەو گرنگترین دەریاچەی دەریاچەی فکتۆریایە لە باشووری ڕۆژهەلأت، دەریاچەی ئەلبرت و ئدوارد لە ڕۆژئاوایەتی.

- مێژووی ولأت: کۆچبەرەکان لەباشووری ڕۆژهەلأتی سودانەوە ڕوەو ناوچەکە هاتبون، شانشینی بۆتۆرۆبان لە سەدەی شانزەهەم لێی دامەزراند، لەسەدەی حەڤدەهەم شانشینی ئۆگەندا بوە شانشینێکی بەهێز، لە سەدەی نۆزدەهەم عەرەب گەیشتنە ئەوناچەیە بۆبازرگانی عاج و ڕەقیق ، هەروەها شەپۆلە یەکەمەکانی جوگرافی ناسی ئەورووپی و گروپەکان هەوڵیاندا بەبلأوکردنەوەی ئاینی مەسیحی و گەیشتە وولأتەکە، لەساڵی١٨٨٥ کۆمپانیای ڕۆژهەلأتی بەریتانی گەیشتە ئۆگەنداو کۆمپانیای بازرگانی بەهێز بوو لەڕێگەی بریکارەکانی (فریدریك لۆگارد)، مۆرکردنی پەیمانی لەگەڵ دەسەلأتدارانی ناوخۆ ئەنجامدا، لەگەڵ ئەوەشدا دادوەری ئۆگەندا لە دادوەرەکانی پارێزگای ئەنگۆل و نورووی ئەفریقی بوو. لە ساڵی ١٨٩٤ بەریتانیا ولأتەکەی کردە ناوچەیەکی پارێزراو مافی ئۆتۆنۆمی پێدا لە ژێر چاودێری ئەمەریکا (کاباکا) لە ساڵی ١٩٠٤ کاری کشتوکاڵی پەمۆ لەلایەن جوتیاران دەستی پێکرد ، لە ساڵی ١٩٥٨ ئۆگەندا مافی ئۆتۆنۆمی ناوخۆیی وەرگرت و لە٩/١٠/١٩٦٢ سەربەخۆیی لە بەریتانیا وەرگرت بەلأم لەناو ڕابتەی وولأتانی کۆمەنولس، یملتۆن ئۆبرت بوە سەرەك وەزیرانی ئۆگەندا کە لە پارتی کۆنگرەی گەلی ئۆگەندا بوو. لە ساڵی ١٩٦٣ ئۆگەندا ڕژێمی کۆماری ڕاگەیاند بە سەرۆکی یەکگرتوو شانشینی ئۆگەنداو شانشینی مۆنیای دووەم کە مۆبۆتی بوە سەرۆك وەزیران. لە ساڵی ١٩٦٩ ماوەی پارتەکان نەدرا بۆ کارکردن کە ببونە ئۆپۆزیسیۆن لەدوای تیرۆرکردنی ئۆپرتی و دەستی کرد بە خۆماڵی کردنی کۆمپانیە گرنگەکان ، لە ساڵی ١٩٧١ لە کودەتایەکی سەربازی ئۆپرتی لە دەسەلأت لادراو عیدی ئەمین بوە سەرۆك کۆمارو دەستوری لەکار وەستاند و ڕژێمی دکتاتۆری دامەزراند کە بوە هۆی دەرکردنی زیاتر لە ٤٩٫٠٠٠ هەزار ئۆگەندی لەولأت کە لە بنەڕەتا ئاسیای بوون و کوشتنی زیاتر لە ٣٠٠٫٠٠٠ هەزار بەرهەڵستکاری ڕژێمەکە ، لە ساڵی ١٩٧٦ ئاڵۆزبوونی پەیوەندی لەگەڵ کینیا دەستی پێکرد بەداواکردنی چەند پارچەیەك لە خاکی کینیا لەدوای داگیرکردنی خاکی تەنزانیاو بوە هۆی بەرپابونی شەڕ لەگەڵ تەنزانیا بەلأم بەرهەڵستکاران ناچاریان کرد کە لە وولأت دەرچێ لە ساڵی ١٩٧٩ بە پیشتیوانی تەنزانیاو لەدوای ڕۆیشتنی حکومەتێکی کاتی دامەزرا بە سەرۆکایەتی یوسف لۆکاو دوای لە دەسەلأت لابرا ئەویش لەڕێگەی کودەتایەکی سەربازی بە سەرۆکایەتی جۆفری بنیا لە ساڵی ١٩٨٠ و هەڵبژاردن ئەنجام درا و دووبارە ئۆپرتی دەسەلأتی وەرگرتەوە ، لە ساڵی ١٩٨٦

مۆسیفینی بوە سەرۆك كۆمار لەسەر حكومەتێكی فرەلایەن و هاوكاری كردن لەسەر بنەمای بنكەیەكی فراوان.

لە سالّی ١٩٩٢ ئۆگەندا دووبارە گەڕایەوە و دەسەلاّتی وەرگرتەوە بە شێوەیەكی ڕەسمی كە ئەویش شانشین ڕۆنالد مۆندامریتیی دووەم بوو لە ئاهەنگێكی قەشەنگدا. بەلاّم لە هەلّبژاردنەكانی ١٩٩٦ مۆسیفیتی سەركەوتنی بەدەست هێنا لە یەكەم هەلّبژاردنی سەرۆكایەتی، لەهەلّبژاردنەكانی ١٩٩٧ ئەوە نەبوو كە پارتەكانی بەشداری تێیدا بكەن و یارمەتی ئۆگەندا بدەن كە لوڕان كابیلا بگاتە دەسەلاّت لە كۆنگۆ بۆ یارمەتی دانی یاخی بووەكان.

- ئۆگەندا ئەندامە لە نەتەوە یەكگرتووەكان، ئەندامە لە كۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە یەكێتی ئەفریقیا.

# بەنین

- ناوی ڕەسمی: كۆماری بەنین.
- پایتەختی: كۆتۆنۆ، ژمارەی دانیشتوانی ١٫١٣٨٫٠٠٠ ملیۆن كەسە.
- شارە سەرەكیەكانی: ئابۆمی، ناتیتنگۆ، باراكۆ، كاندی.
- بەندەرە گرنگەكانی: كۆتۆنۆ.
- ڕووبەری: ٤٣٫٤٨٣ میل چوارگۆشەو ١١٢٫٦٢٢ كیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٦٫٥٤٦٫٠٠٠ ملیۆن كەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٨.
- چڕی دانیشتوانی: ١٥١ كەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢٫٥٪.
- زمانەكانی: فەڕەنسی (زمانی ڕەسمیە) فۆن یۆروبا.
- نژادەكانی: ئەفریقیەكان ٩٨٪، زیاتر لە ٤٠ نژادی تری جۆراو جۆری تیایە ئەویش (ئاجا، یۆروبا، بریبا، هەندێ دانیشتوانی ئەورووپین كە زۆربەیان فەڕەنسین).
- ئاینەكانی: باوەڕە ناوخۆیەكان ٧٠٪، ئیسلام ١٥٪، مەسیحی ١٥٪.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٤٠٪.
- دابەشی كارگێڕی: ٦ پارێزگایەو دابەشی ٧٨ بەش كراوە.
- كۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١١٫٥٠٠ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەكۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٢٫١٠٠ دۆلار.
- بەرگری: ٢٫٥٪ لەكۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاكەی: ٥٢٫٠٠٠ هەزار كەسە.
- زەوی كشتوكالّی: ١٢٫٣٪ لەخاكی وولاّتەكە.
- بەرهەمەكانی كشتوكالّی: گەنم، جۆ، برنج، قاوە، بەرهەمەكانی خورما، بیبەری سودانی،.
- سامانی ئاژەلّی: مەڕ ٦٣٥٫٠٠٠ هەزار سەر. بزن ١٫٠٥٠ ملیۆن سەر، چێڵو گامێش ١٫٨٥٠ ملیۆن سەر، پەرەور ١٥٫٣٠٠ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: نەوت، بەردی جیری،"چەو".
- پیشەسازی: ڕۆنی خورما، خواردنەوە، بەرهەمی ڕستن و چنین.
- بەرهەمی كارەبا: ٦٫٣٥٠ ملیار كیلۆوات كاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: كەلوپەلی بەكارهێنان، خواردنەوە، بەرهەمەكانی نەوت،

پێداویستیەکانی خۆراك.

- دەرچووەکانی: نەوتی خاو، پەمۆ، بەرهەمی خورما، کۆکا.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چین، فەڕەنسا، وولاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا، ئەمەریکا، ئەڵمانیا. بەنین یەکێکە لە هەژارترین وولات لە وڵاتانی جیهان. سەرچاوە گرنگەکانی ڕۆنی خورمایە، ئەو وڵاتە لەسەر یارمەتی وولاتانی بێگانە دەژی. ئەو وولاتە نە بەندەرو نە کەناری دەریایی هەیە.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی سۆشیالستی فرلایەنی پارتیە. یەك ئەنجومەنی هەیە ئەویش ئەنجومەنی یاسادانانە. لە کۆنگرەی هێزە ڕامیاریەکان لە ١٩/٢٨/٢/١٩٩٠ دەسەڵاتی مارکسی– لینینی هەڵوەشێنرایەوە لە جێگەی ئەو ڕژێمی فرە پارتی پەیڕەو کراو هەموو زیندانیە ڕامیاریەکان ئازاد کران.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی نویێ کردنەوەی دیموکراتی، پارتی سۆشیالستی دیموکراتی، یەکێتی نیشتیمانی هاوکاری و پێشکەوتن، پارتی یەکێتی دیموکراتی بۆ نویێ کردنەوەی سەرکەوتن. پارتی دیموکراتی نیشتیمانی و بوژانەوە، پارتی چەپی ناوەندی.
- جوگرافیای وولات: بەنین دەکەوێتە ڕۆژئاوای ئەفریقیا لەسەر کەنداوی گینیا. وولاتێکی درێژو باریکەو درێژ دەبێتەوە لەناوەوەو ماوەی ٤٥٠ میلە لە کەنداوی گینیا تا دەگاتە سنوری نیجیریا، نیجیریا دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی، تۆگۆ دەکەوێتە ڕۆژئاوای ، دارستانی چڕی هەیەو لەباکوری ڕوبارەکانی دەچێتەوە ناو زێی فۆلتاو نێجیریا، لەباکوری ڕۆژئاوای چیاکانی ئەتاکورایە. بۆرکینا فاسۆ دەکەوێتە باکوری.
- مێژووی وولات: پێش ئیستعمار کردنی بەنین چەند کۆمەڵەی ئیماراتی بچوکی دژ بەیەکتر بوون. لەسەدەی حەڤدەم هۆزەکانی فۆن شانشینی داهۆمیان لە باشور دەمەزراند.

لەنێوان ساڵەکانی ١٨٠٠ تا ١٨٥٠ شانشینی داهۆمی چەند پەلێکی چەکداری لە کچان پێك هێنا بۆ دژایەتی کردنی شانشینی یۆروبا لە ڕۆژهەڵاتی بەنین، لەباشوری ڕۆژئاوای بەهێنانی کۆیلەکان (عەبید) بۆ کارپێکردن لەوکاتە بازرگانی ڕۆنی دارخورما پەرەی سەندو پێشکەوت. لە ساڵی ١٨٩٢ شەڕ لەنێوان بەنین و داهۆمی هەڵگیرسا بەسەرکەوتنی داهۆمی کە بوە پارێزراوی فەڕەنسا لە ساڵی ١٨٩٣، لە ساڵی ١٩١٤ هێزەکانی سوپای فەڕەنسا بەشداری لەگەڵ داهۆمی کرد بۆ داگیرکردنی خاکی تۆگۆدف لە ڕۆژئاوا کەژێر دەستەی ئەلمانیای فاشی بوو، لەکاتی جەنگی دووەمی جیهان لە ساڵەکانی ١٩٤٠ تا ١٩٤٤ داهۆمی لەگەڵ هەموو وڵاتانی ئەفریقای ڕۆژئاوا ڕاوەستان بەدژیەتی کردنی ئەڵمانیای فاشی. لە ساڵی ١٩٥٨ بەنین مافی ئۆتۆنۆمی وەرگرت لەناو کۆمەڵەی فەڕەنسا.

لە ١٩٦٠/٨/١ داهۆمی سەربەخۆی وەرگرت و دوای ئەوە زنجیرە کودەتای لێ ئەنجام درا، لە ساڵی ١٩٧٠ ئەنجومەنی سەرۆکایەتی لەسێ ئەندام هەڵبژێردرا بۆ ماوەی شەش ساڵ. بەڵام بەهۆی کودەتای سەربازی لەلایەن ماسیۆ کریکۆ لە ساڵی ١٩٧٢ دەسەڵاتەکە لەناوبراو دەسەڵاتی سەربازی دامەزرا، بڕیاری ڕژێمی سۆشیالستی درا، لەساڵی ١٩٨٠ ناوی داهۆمی گۆڕا بۆ ناوی بەنین و دەسەڵات درا ئەنجومەنی یاسادانان، بەنین بیروڕای مارکسی گرتەبەر لە ساڵەکانی دوای حەفتاکان ، لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٩٦ کریکۆ سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە هەڵبژاردنەکان و گەڕاوە بۆ سەرۆکایەتی کۆمار و بۆ جاری دوەمیش لەساڵی ١٩٩٩هەڵبژێردراوە بە سەرۆك کۆماری بەنین، تا کۆتایی ٢٠٠٤ لە دەسەڵات بەردەوام بوو.

- بەنین ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە نەتەوە یەککگرتووەکان.

# بوتسوانا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری بوتسوانا.
- پایتەختی: گابۆرۆن، ژمارەی دانیشتوانی٠٠٠ر١٩٥ هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ٦٠٦ر٢٢٤ میل چوارگۆشەو ٧٣٠ر٥٨١ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٩٢٥ر١ ملیۆن کەسە بەپێی ئاماری ١٩٩٧.
- چڕی دانیشتوانی: ٩ کەس لەیەک میل چوارگۆشەدا.
- شارە سەرەکییەکانی: ماهۆلا، سیرۆ،نۆنۆم.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ١ر٣٪.
- نژادەکانی: بوتسوانا ٩٠٪. کالنگا، باساروا، کالاگادی ١٠٪.
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی ڕەسمیە) ستوانا (زمانی نیشتیمانیە).
- ئایینەکانی: مەسیحی ٥٠٪ ئەنعیون دبهائیون، ئیسلام، هندوسن٥٠٪.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٧٥٪.
- دابەشی کارگێڕی: ١٠ ولایەتە لەگەڵ چوار ئەنجومەنی شارەوانی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١٥٠ر٥ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاک لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر٣ دۆلار.
- دراوی: پۆلا.
- بەرگری: ٥ر٣٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر١٨ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢ر٣٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٣٠٠ر١ ملیۆن سەر، بزن ٩٥٠ر١ ملیۆن سەر، چێڵ و گامێش ٦٥٠ر٢ ملیۆن سەر، پەرەور ٣٥٠ر٥ ملیۆن سەر.
- بەرهەمەکانی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، برنج، کونجی، چەندین دانەوێڵەی تر.
- سامانی سروشتی: نیکل، خوێ، ئەڵماس، نوحاس، بۆتاس، خەڵوز، غازی سروشتی.
- پیشەسازی: ئەڵماس، نوحاس، خوێ، سۆدە، پۆتاس، خەڵوز، گۆشتی بەستراو.
- بەرهەمی کارەبا: ٦٠٠ر١ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: پێداویستی خۆراک، ئۆتۆمبێل، بەرهەمی ڕستن و چنین، سوتەمەنی.
- دەرچووەکانی: ئاژەڵی زیندوو، ئەڵماس، گۆشت، نوحاس، نیکل.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: بەریتانیا، سویسرا، وڵاتانی یەکێتی گومرگی، ئەمەریکا، یابان، چین، ئەڵمانیا.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی پەرلەمانیە، دەستوری بوتسوانا بڕیاری یەک ئەنجومەنی داوە ئەویش ئەنجومەنی یاسادانانەو ژمارەی ئەندامەکانی ٣٦ ئەندامە.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی بەرەی نیشتیمانی، پارتی دیموکراتی کە ٣١ کورسی هەیە لە پەرلەمان لەکۆی کۆمەڵەی یاسادانان کە پێک هاتووە لە ٣٦ کورسی کە پارتی وکوت ماسیری سەرۆک کۆمارو سەرۆکایەتی دەکات. پارتی گەل ١ کورسی هەیەو پارتی بەرەی نیشتیمانی ٣ کورسی هەیە.
- جوگرافیایی وڵات: بوتسوانا دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەفریقیای باشوور، نامیبیا دەکەوێتە باکورو ڕۆژئاوای. باشوری ئەفریقیا دەکەوێتە باشووری، زمبابۆی دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای، بوتسوانا داوای ئەو

دورگەیە دەکات کە لە نامیبیا جیای دەکاتەوە، لە باکوری کالاماری کە دورگەی ڕۆژئاوای وڵاتەکەیەو مەڕ لەوەڕێنەرەکانی تیانیشتەجێن، دوو زێی گرنگی تیایە ئەویش زێی لیمیۆیۆو زێی زمبیزی.

- مێژووی وڵات: دانیشتوانی ئەم وولاتە لەڕەسەندا دەشتەکیەکان بون هەمووکات بەراو خەریك بون لەسەدەکانی حەڤدەو هەژدە کە لەهەشت ڕەچەلەك پێك هاتبون. خامای سێیەم کە ئاینی مەسیحی کردبوە بڕوای خۆی لە ساڵی ١٨٧٢ و سەرۆکی کۆمەڵەی بامانواتو کە گەورەترین کۆمەڵەی تسوانا بوو سوپایەکی بەهێزی دروستکردو یەکێتی پتەوی دروستکرد لەو کۆمەڵانە. لە ساڵی ١٨٨٥ ترسانیان لە دانیشتوانی باشووری ئەفریقیا بوو کە لە ڕەسەندا دەگەڕانەوە سەر ڕەچەلەکی هۆڵەندیەکان کە لە هەرێمی ترانسفال بون‌و داوایان لە بەریتانیا کرد بیان پارێزێت کە لەوکاتە ناوی (نیسوانا لاند) بوو. بەم جۆرە بوتسوانا بوە ناوچەیەکی پارێزراوی بەریتانیا و لەهەمان کاتا زێر دۆزرایەوە و هەر بەوهۆیە لە ساڵی ١٨٩٥ ژێر دەستەی کاب (لەباشوری ئەفریقیا) چوە پاڵ بوتسوان لاند.

لەساڵی ١٩٦٠ دەستورێکی نوی دەرچوو بەپێك هێنانی ئەنجومەنێکی یاسادانان کە لەو کاتە ئەم وولاتە لەژێر دەسەڵاتی دادوەرێکی سامی بەریتانی بوو. لە ساڵی ١٩٦٥ پایتەختی لە (میلکینگ) گوازراوە بۆ (گابۆرون) و مافی ئۆتۆنۆمی وەرگرت لەناوەوەی کۆمەنولسی بەریتانی‌و سیریتس خامای نەتەوەی خامای سێ یەم هەڵبژێردرا بەسەرۆك حکومەت کە ڕابەری پارتی دیموکرات بوو. لە ١٩٦٦/٩/٣٠ بوتسوانا سەربەخۆی وەرگرت لەبەریتانیاو ناوی لە نیسوانا لاند گۆڕا بۆ کۆماری بوتسواناو سیرتیس خاما بەتەواوی هەڵبژێردرا بەسەرۆك کۆمار لەژێر دەستورێکی سەرۆکایەتی نوێ. لە دوای ساڵەکانی حەفتا ئەم وڵاتە لەڕووی ئابووری بەرەو بوژانەوە هەنگاوی نا بەهۆی دۆزینەوەی زۆر لەئەڵماس و زێر. لە ساڵی ١٩٨٠ سیرتس خاما کۆچی کردو جێگرەکەی کوت ماسیر جێگەی گرتەوە، لە ساڵی ١٩٨٥ هێزە سەربازەکانی ئەفریقیا چەندین جار پەلاماری جیابوونیان دا بەڵام لە ساڵی ١٩٩٣ توانیان ئەو کێشە لە ناوبەرن و پەیوەندی دۆستایەتی بەهێز بکەنەوە ئەمەش لەدوای نەهێشتنی بیری ڕەگەز پەرستی و جیاوازی ڕەگەزەکان لە دامەزراندنی حکومەتی فرە لایەنی ، ئابووری ئەم وڵاتە بەستراوەتەوە بە ئابووری ئەفریقیای باشوور، دانیشتوانی بوتسوانا لە بژێوی ژیانی بەرەو باش بوون دادەڕێ‌و هەنگاو دەنێ بەهۆی باش‌و لەباری ئابووری و دیموکراتی‌و جێگیری ئارامی، تاکو ساڵی ٢٠٠٤ دەسەڵات بەشێوەیەکی ڕێك بەڕێوە چوەو بەردەوامە بە گۆڕینەوەی دەسەڵاتی دیموکراتی.

- بوتسوانا ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە نەتەوە یەککگرتەوەکان.

# بۆرکینا فاسۆ

- ناوی رسمی: کۆماری بۆرکینا فاسۆ.
- پایتەختی: واگادوگۆ، ژمارەی دانیشتوانی٠٠٠ر٩٢٨ هەزار کەسە.
- بەندەرە گرنگەکانی: ئەبیدگان، کە لە کۆن ناوی دیگواربوە.
- رووبەری: ٨٦٩ر١٠٥ میل چوار گۆشەو ٢٠٠ر٢٨٤ کیلو مەتر چوار گۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوان: ٠٠٠ر٨٩٥ر١١ملیۆن کەسە، بەپێی زانیاری رۆژنامەکانی ٢٠٠١.
- چری دانیشتوانی: ١١٢ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- شارە سەرەکیەکانی: بۆبۆ، کۆدوگۆ، دیولاسۆ.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٦ر٠٪.
- زمانەکانی: فەرەنسی (زمانی رسمیە) نزیکەی پەنجا زمانی هۆزەکانی سۆرانی تێدایە کە ٩٠٪ی دانیشتوانی ئاخاوتنی پێدەکەن.
- نەژادەکانی: زیاتر لە ٥٠ نەژادی تێدایە، موسیرەمڵ ٤٨٪، مولادنی ١٠٪، جورما ٥٪ زۆر لە هۆزەکانی نیشتە جێبوونە لە باکوری وولات وەك (لۆبی، داگاری، مەندی) لەباشووری رۆژهەلاتی (بویسۆ)یە، لەباشووری رۆژئاوای (سنوفۆ، جوروۆنزی،) چەندین تیرەو نەژادی جیاجیای تری تێدایە.
- ئایینەکانی: بروای ناوخوی ٤٠٪. ئیسلام ٤٩٪ مسیحی ١٠٪.
- زانینی نوسین وخوێندن: ٢٣٪.
- دابەشی کار گێری: ٣٠ پارێزگایە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٤٥٠ر١٠ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٦٥٠ر٩دۆلار.
- دراوی: مزنگ سیفا.
- بەرگری: ٥ر٦٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر٦١هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ١٠,٣٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمەکانی کشتوکاڵی: پەمۆ، چەوەندەری شەکر، برنج، گەنمە شامی، فولی سودانی، سەرجوم، گەنم، جۆ، دانەوێڵەی تر.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٨٠٠ر٥ملیۆن سەر، بزن ٣٥٠ر٧ ملیۆن سەر، چێڵ وگامێش ٢٠٠ر٤ ملیۆن سەر، پەرەور٩٠٠ر١٨ملیۆن سەر.
- پیشەسازیەکانی: خشتی خان وبەرە، بەرهەمی رستن وچنین، ئامادە کردنی خواردەمەنی،
- بەرهەمی کارەبا: ٢٨٥ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.
- سامانی سرووشتی: زێر، مەرمەر، بەردی جیری (چەو) موگناتیس، بۆتاسیۆم، بۆکسیت، نوحاس، نیکل.
- داهاتی دەرەوەی: دانەوێڵە، بەرهەمی شیری، ماشێن، نزیکەی ٥٠٠ر١ملیۆن مرۆڤی ئەو وولاتە لە دەرەوەی ولات دژین، گرینگیەکی باش بە داهاتی دراوی وولاتەکە دەدەن کە بۆتە بوژانەوەیەکی باشی گەلانی وولاتەکە.
- دەرچووەکانی: دروستکراوەکانی کشتوکاڵی، خوێ، زەیتون، پەمۆ، ئاژەڵی زیندو، زێر، نوحاس، مەرمەر.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: چین، یابان، ئەمەریکا، یەکێتی ئەوڕوپا، تایوان، ئەفریقیا.
- رژێمی دەسەلات: دیموکراتی تازە پێگەیشتوە، لە مانگی/ ٦/١٩٩١ دەنگدەران رازی بون لەسەر دەرکردنی پرۆژەی دەستور لەسەر پێکهێنانی سێ دەسەلات ودەست پێکردنی هەڵبژاردن بۆ

دیاری کردنی سەرۆك کۆمار بۆ ماوەی حەوت ساڵ، ئەم پارتانەی کە نوێنەریان هەیە لە پەرلەمان هەڤدە پارتن.

- پارتە رامیاریەکان: پارتی بەرەی میللی، پارتی چەپ رەوی ناوەندی، پارتی سۆشیالستی دیموکراتی، پارتی مافی نیشتمان، چەندین پارت ورێکخراوی تر هەن کە هەموویان مۆڵەتی کارکردنیان هەیەو بەشدارن لەکاروباری وولات لە رێگەی پەرلەمانەکەیان.
- جوگرافیای وولات: بۆرکینا فاسۆ لە پێشوو ناسرابوە بە (فۆلتی بالا) بە هۆی بوونی زێی فۆلتا، لەرۆژئاواو باشووری رۆژهەلات زەویەکەی گردۆڵکەییەو نیمچە ووشکانیەو دانیشتوانی تیایە ؛ لەباشووری دارستانی چڕی تیایە لە زەویە کشتوکاڵیەکان. بۆرکینا فاسۆ وولاتێکی ناوخۆیە. لەوولاتەکانی رۆژئاوای ئەفریقیا کە کەوتۆتە باشووری بیابانی گەورە، وولاتی مالی دەکەوێتە رۆژئاوای، نێجیریا دەکەوێتە باکوری رۆژهەلاتی، بەنین وتۆگۆ گاناوکوت دیفوار دەکەوێتە باشووری، لەبەر ئەوەی وولاتێکی ناوخۆیە گرنگی داوە بەهێلی شەمەندەفەر بۆبەستانەوەی بەندەری ئەبیدگان لەگەل کوت دیفوار بۆ گواستنەوەی دەرچوەکانو داهاتەکانی دەرەوەی کە یەکەم دەرگایەتی لەسەر کەنارەکانی دەریا.
- مێژووی ولات: دانیشتوانی ئەم وولاتە لە بنەرەتا لەگەڵ بوبوەو لۆبیو جرونزی• پێکهاتون، لە سەدەکانی سیانزەو چواردە گەلانی موساو جورما هەلسان بەداگیرکردنی رۆژهەلاتی ناوەراستی ولاتەکەو شانشینی شەروایان لێ دامەزراند تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم هەر مابوونەوە، لەساڵەکانی ١٨٩٥-١٩٠٣ فەرەنسا دەسەلاتی خۆی خستە سەر وولاتەکە بۆ پارێزگاری لێکردنی شانشینی موسیو هەرێمەکانی تری گۆرما، خاکی بوبولوبی خستە پاڵ ئەو شانشینە سەرەرای بەرگری لێکردن لەلایەن گەلانی ئەو ناوچانەس.

لەساڵی ١٩٠٤ فەرەنسا ئەو ناوچەیەی ناونا بە (فۆلتای بالا) کە لەروی کار گێری بەستیەوە بە سوودانی فەرەنسی (مالی) لەساڵی ١٩١٩ فولتای بالا بوە ژێردەستەی فەرەنسا، بەلام لە ساڵی ١٩٣٣ کردیە دوو بەش لە نێوان سودانی فەرەنسی (ماڵی)و ساحلی حاج و نیجر.

لەساڵی ١٩٤٧ بوە یەکێك لە هەرێمەکانی فەرەنسا لەدواوەی دەریاکان. لەساڵی ١٩٥٩ یەکێك بوو لە ئەندامە دامەزرێنەرەکانی ئەنجومەنی وفاقی لەگەڵ بەنینو ساحل عاج ونیجر، ئەمە لەپێناو بەهێزکردنی پەیوەندی دۆستایەتیو ئابووریی لە نێوان ئەندامەکان. لە٥/٨/ ١٩٦٠ سەربەخۆی وەرگرت کە موریس یامۆگۆی یەکەم سەرۆك کۆماری بوو لەدوای ئەوە وولات چەندین کودەتای سەربازی بەخۆە دیت، لە ساڵی ١٩٧٥چوە رێزی کۆمەڵەی ئابووری لە رۆژ ئاوای ئەفریقیا، ئەو وولاتە هەر بەردەوام بووە لە ئەنجامدانی کودەتا یەك لەدوای یەکەکان، لە ٣/٨/١٩٨٤ ناوی وولات لە فولتای بالا گۆرا بۆ ناوی بۆرکینافاسۆ، لە ساڵی ١٩٨٧ بلیز کومبۆر کودەتایەکی سەربازی ئەنجامدا، لەساڵی ١٩٩١ بریاری دەستوری نویٚ دراو دوبارە بلیز کومبۆر بە سەرۆك کۆمار هەلبژێردراوە، لەساڵی ١٩٩٢ هەلبژاردنی فرە لایەنی پارتی ئەنجام دراو پارتی بەرەی میللی سەرکەوتنی بەدەست هێنا کە لایەنگیری سەرۆك بلیز کومیۆر بوو، دوای ئەوە بانکی نێودەوڵەتی (خەزنەی دراوی دەوڵەتی)وسەرچاوەی تر بوونە یارمەتیدەری ئەو وولاتە لەهەموو بوارەکان بۆ بەرەو باش بردنی باریئابوری ئابوریو کارگێری وولاتەکە.

- بۆریکنا فاسۆ ئەندامە لە رێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە نەتەوە یەککرتووەکان.

# بۆرندی

- ناوی رسمی: كۆماری بۆرندی.
- پایتەختی: بۆگۆمبورا، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٢٥٠ هەزار كەسە بەندەرەكی گرنگەو كەوتۆتە لای باكوری دەریاچەی تەنجنیقا.
- رووبەری: ٧٤٥ر١٠ میل چوار گۆشەو ٨٣٠ر٢٧ كیلۆ مەتر چوارە گۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٧٣٥ر٦ ملیۆن كەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- چڕی دانیشتوانی: ٦٢٧ كەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- شارە گرنگەكانی: كینگیا، بۆروری، نگۆزی.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٣ر١٪.
- زمانەكانی: كیرۆندی (زمانی رەسمیە) زمانی ئینگلیزیش هەر رەسمیە، چەندین زمانی تری كەنارەكانی تیایە.
- نەژادەكانی: هۆتو ٨٥٪، توتسی ١٤٪، بیگی ١٪.
- ئاینەكانی: كاسۆلیكی رۆمانی ٦٣٪ بڕوای ناوخۆی ٣٢٪ برۆتستانت ٥٪.
- زانینی خوێندن نووسین: ٤٠٪.
- دابەشی كارگێری: ١٥ پارێزگایە.
- كۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٤ر١١٠ ملیار دۆلار
- بەشی تاك لە كۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٧٥٠ دۆلار.
- دراوی: فرەنكی بۆرندی.
- بەرگری: ٢ر٣٪ لە كۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاكەی: ٥٠٠ر٢٣ هەزار كەسە.
- بەرهەمەكانی كشتوكاڵی: گەنم، جۆ، تەرە، میوەجات، برنج، چا، قاوە، لە ٨١٪ دەرچووەكان قاوەو قاوەی نەگەیە، پەمۆ، پێست.
- سامانی سروشتی: یۆرانیۆم، نیكل، نوحاس، كۆبالت، پلاتین.
- بەرهەمی كارەبا: ٢١٠ ملیۆن كیلووات كاتژمێر.
- سامانی ئاژەڵی: چێل ٠٠٠ر٥١٥ هەزار سەر، مەر ٠٠٠ر٨٤٠ هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر٦١٠ هەزار سەر، پەرەور ٠٠٠ر٦ر٣ ملیۆن سەر.
- داهاتی دەرەوەی: خواردەمەنی، سوتەمەنی، كەلوپەلی سەرمایەداری، پێداویستیەكانی بەكارهێنان.
- دەرچووەكانی: قاوە، چایە، پەمۆ، پێست، ئاژەڵی زیندوو.
- هاوبەشەكانی بازرگانی: ئەمەریكا، یابان، فەرەنسا، وولاتانی عەرەبی، ئەڵمانیا، چین، هەندێك لەوولاتانی ئەوروپای رۆژ ئاوا.
- رژێمی دەسەڵات: حكومەتێكی گواستنەوەیە، كۆمارێكی دەسەڵاتداری یاسادانان وجێ بە جێكردنەو بەندن بە سەرۆك كۆماری هەڵبژێردراو، دەستوری نوێ لە ساڵی ١٩٩٢ بریاری بۆ درا بەدەسەڵاتی فرە پارتایەتی.
- پارتە رامیارییەكان: پارتی یەكێتی لە پێناو پێشكەوتنی نیشتمان، پارتی چەپی ناوەندی، پارتی نەتەوەی سۆشیالستی، پارتی بەرە لە پێناو دیمو كراتیەت بۆ بۆرندی.
- جوگرافیای وولات: بۆرەندی دەكەوێتە باكوری رۆژهەڵاتی دەریاچەی تەنگنیقا، ئەویش پێكهاتەیەكەی تەپۆلكییە ودەوری باكوری سنوری رواندەیە، تەنزانیا دەكەوێتە باكوری رۆژهەڵاتی، زائیر دەكەوێتە رۆژئاوای، چەندین دۆل وكەندی قوڵی تیایە، زۆربەی خاكی

وولاتەکــــە بــــەگیاو ڕوەکو دارو درەخـــــت داپۆشراوە، سەرچاوەی نیلی سپی لەبۆرنـدی هەڵـدەقوڵێ بـەڵام دەریاچـەی تـەنگنیقا کـە دەریاچـــــەیەکی دووەمـــــە لـــــە قـــــوڵی لەدەریاچەکانی جیهانە.

• مێـژووی وڵات: لـە سـەدەی دەیـەمی زایـنی گـەلانی هۆتـۆ بونـە دانیـشتوانی ناوچـەکەو خەریك بون بە کاروباری کشتوکاڵی لە لادێکان لەنێوان سەدەی یـانزە تـاکو سەدەی حەڤدەم، کـە دوای هـۆزو تیرەکـان بونـە ژێـر دەسـتەی گـەلانی توتـسی خـاوەن مـەرو مـاڵات کـە لەرۆژهەلاتـەوە بـۆی هـاتبونو بونـە خـاوەن دسـەلات لـە شـێوەی ئوسـتقرات ودەرەبـەگ لـەبواری ڕێکخـستنی بـونی خاوەندیـەتی کـە ناوی (مواحی)بوو، میرە ناوخۆییەکان (گانوا) کە دەسـەڵاتیان بەسـەر وولاتەکـەدا شـکابوو. لـە ساڵی ۱۸۹۰ شانشینی توتسی کە ناسرابوو بە ناوی ئۆرندیو لەگەڵ ڕواندا بونە ژێر دەستەی ئەڵمانیا لە ژێر ناوی (ڕواندا – بۆرندی) بەڵام لەساڵی ۱۹۱٦لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەم بـەلجیکا هـەردوو وولاتـی داگیر کـرد. لەسـاڵی ۱۹۲۳کۆمەلـەی گـەڵان هـەردوو وولاتـی ژێـر دەسـتەی کـردە ئینتـدابی بـەلجیکا لـە ڕێگـەی سەرۆك هۆزەکانی توتسی وهۆزەکانی هۆتۆ، لە ۱۹٦۲/۷/۱ ڕوانداو بۆرندی لێکجیابونەوە ناوی بـوە بۆرنـدیو سـەربەخۆیی وەرگـرت لـە شانـشینی بـەلجیکا. لەسـاڵی ۱۹٦٥ شانـشین موامبۆتسای چوارەم ڕازی نەبو بەدامەزراندنی سەرۆك وەزیران لـە هۆتیەکان سەرەرای ئـەوەی کە لـە هەڵبژاردنـەکان سـەرکەوتنیان بەدەسـت هێنـاو دوایـی بـوە کێـشەو گیـورگرفتێکی زۆر لەنێوان هۆزەکـان کە توتسیەکان بەشێوەیکی دڕندانە هەوڵەکانی هۆتۆی لەناو برد، لەدوای ئەوە لە سـاڵی ۱۹٦٦ شانـشین موادیۆتـسا لـە لایــەن کورەکــەی لەســەر کورســی هێنرایــە خوارێودوای خۆشی لەسەر کورسـی لادرا لـە ڕێگـەی کودەتایـەکی سـەربازی لـەبار لەلایـەن هۆزەکانی توتسیو نـاوی وولات لـە شانشینی گـۆڕا بـۆ ڕژێمـی کۆمـاری بۆرنـدی بەسـەر کردایەتی پارتی یەکێتی لە پێناو پێشکەوتنی نیشتمان، لەسـاڵی ۱۹۷۲ شۆرشـێك لـە لایـەن هۆتیـەکان بـەرپابوو دژی توتـسیەکان بـەڵام سـەرنەکەوتنو بـوە هـۆی کوشـتنی زیـاتر لـە ۱٥۰ر۰۰۰ هەزار کەس لە هۆتیەکان وزیـاتر لە (۱۰ر۰۰۰) هـــەزار کـــەس لـــە توتـــسیەکان ودەربـەدەر بـوونی زیـاتر لـە ۱۰۰ر۰۰۰ هـەزار کـەس لـە وولاتەکـە بـەرەو وولاتـانی تـەنزانیاو زائیرو (کۆنگۆی ئێستا) ئیتر کێشەو ململانێ لە نێوان دوو نەتـەوەی دژی بـە یـەکتری بـەردەوام بوو لـە ڕێگـەی کودەتـا یـەك لـەدوای یەکـەکان تـاکو سـاڵی ۱۹۹۲ کـە بڕیـاری دەسـتوری نـوێ درا بە پێك هێنانی دەسەڵاتی فرەلایـەن ئـەویش لە ڕێگەی ڕاپرسی گشتی گەلانی وڵاتەکە.

لەساڵی ۱۹۹۳ یەکەم هەڵبژاردنی دیموکراتی لـە وولات ئـەنجام درا بـۆ هەڵبـژاردنی سـەرۆکێکی دیمکراتـی، کـە پـالێوراوێکی هۆتـۆ سـەرکەوتنی بەدەست هێنـا ئـەویش (هۆنـدادای) بـوو بـەڵام لـە هـەولێکی کـودە تـا کـوژرا لـەدوای ئەوکێـشەو ململانێیە نوێ بوەوە لـە نێوان توتسی وهۆتـۆ کە نزیکـــەی ۱٥ر۰۰۰ هـــەزار کـــەس کـــوژران، لەمانگی/۱/ ۱۹۹٤ (تنـارا بـامیرا) لـە هەڵبـژاردن سەرکەوتنی بەدەست هێنا کە لەنژادی هۆتۆ بوو، بـەڵام لـەمانگی /٤/۱۹۹٤ کـوژرا لەکارەسـاتی فڕۆکە. لەساڵی ۱۹۹٦ (بابویا) دەسەڵاتی وەرگرت کـە لـەهۆزی توتـسی بـوو لەڕێگـەی کودەتـای سـەربازی وئەنجامەکـەی بـوە دامەزرانـدنی دەوڵـەتێکی ئـەفریقیو بەسـەر سـەپاندنی ئابلوقەی ئابووری.

• بۆرندی ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

# تـــۆگـــۆ

- ناوی رسمی: کۆماری تۆگۆ.
- پایتـــــەختی: لـــــۆمی، ژمـــــارەی دانیشتوانی٠٠٠ر٦٣٥ هـەزار کەسە لەهەمان کات بەندەرێکی سەرەکیە.
- رووبەری: ٩٢٧ر٢١ میل چوار گۆشەو ٧٩٠ر٥٦ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە.
- ژمـــارەی دانیـــشتوانی: ٠٠٠ر٣٦٧ر٥ ملیـــۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٧ .
- چری دانیشتوانی: ٢٤٥ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ١,٣٪.
- نژادەکانی: ئیو، مینا، کایی، زیاتر لە ٢٠هۆزی تری تیایە.
- ئاینینەکانی: بروای جۆراو جۆر ٧٠٪، مەسیحی ٢٠٪. ئیسلام ١٠٪.
- زمانـەکانی: فەرەنسی (زمانی رسمیە) ئیوی، مینا، داگۆمیا، کایی، چەندین زمانو زاراوەی جۆرا وجۆری تری تیایە.
- دابەشـی کـار گێـری: ٥ هەرێمـە، لەشـێوەی پارێزگا،
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ٣٥٠ر٦ ملیـار دۆلار.
- بەشـــی تـــاك لـــە کـــۆی دەرئـــەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر١ دۆلار.
- دراوی: فرنگی سیڤا.
- بەرگری: ٢,٣٪. لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر٧٣ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر٣٨٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، دانەوێڵەی تر، پەمۆ، برنج، کاکاو، قاوە، پەتاتـە، دەرە زەردی باریك، تەرە، میوەجات.
- سامانی ئـاژەڵی: مـەر ٠٠٠ر٧٦٠ هـەزار سـەر. بەراز ٣٥٠ر٧ ملیـۆن سـەر، بزن ٣٠٠ر١ ملیـۆن سـەر، چێل وگـامێش، ٠٠٠ر٢٧٥ هـەزار سـەر، پەرەور٣٠٠ر٨ ملیۆن سەر.
- پیـشەسازی: ئامادەکراوەکـانی کـشتوکاڵی، پیشەسازی دەست، رستن وچنین،
- سـامانی سروشـتی: بـەردی جیری، فۆسـفات، مەرمەر.
- بەرهـەمی کارەبـا: ٣٠٠ر٩٥ ملیـۆن کیلـۆ وات کاتژمێر.
- داهاتەکانی دەرەوەی: سوتەمەنی، پێداویستی خـــۆراك، بەرهـــەمی کیمیـــاوی، کەلوپـــەلی بەکارهێنان، ماشێن، کەلوپەلی گواستنەوە.
- دەرچووەکانی: قـاوە، کاکـاو، پـەمۆ، فۆسـفات، مەرمەر.
- هاوبەشـەکانی بازرگـانی: یابـان، چینـی میللـی، یەکێتی ئەوروپا، ئەمەریکا، ئەفریقیا،
- رژێمـــی دەســـەڵات: کۆمـــارێکی دیمـــوکراتی پەرلەمانی فرەلایەنیە، کۆمەڵەی نیشتمانی پێك هـاتوە لـە ٦٧ئەنـدام، هەڵبـژاردنی کۆمەڵـەی نیشتمانی لەلایەن گەلانی تۆگۆ ئەنجام دەدرێ بە پێشنیاری گشتی راستەوخۆ بۆ ماوەی چوار ساڵ.
- پارتـە رامیاریـەکان: پـارتی کۆمـەڵی میللـی، لیژنـەی کـار لـەپێناوی نوێکردنـەوە، چـەندین بیرو بۆچونی تـری پـارتو گـروپ وبزوتنـەوەی جۆراوجـــۆری نیـــشتمانی و دیمـــوکراتی وکۆمەلایەتی ورامیاری تێدایە .
- جوگرافیای ولاَت: تۆگۆ دەکەوێتە سەر کـەناری باشـووری رۆژئـاوای ئەفـەریقیا، گانـا دەکەوێتـە رۆژئـاوای ، بۆرکینافاسـۆ دەکەوێتـە بـاکوری،

وولاتی بنین دەکەوێتە رۆژهەلاتی، درێژی لەنێوان باشوورو کەنداوی گینیا ٥١ کیلومەترەو دەشتاییەکی لمیە، بەلام بەشی ناوەراستی چیای تۆگۆ کەرتی دەکات و درێژ دەبێتەوە لە باشووری رۆژ ئاوا تاکو باکوری رۆژهەلات، تۆگۆ کراوەتە دوو هەرێم لە دەشتاییەکان کە دەشتاییەکی پڕ لە گژو گیاو روەکەو دوو زێی سەرەکی تیایە ئەویش زێی مۆتۆ وئۆتییە کە خاکی ولات ئاودێر دەکەن.

- مێژوی وولات: چەندین سەدە پێش ئێستا هۆزی ئیوی بەرەو باشووری تۆگو کۆچیان کردو نیشتەجێبون کە ئەویش سەرچاوەی کرین وفرۆشتنی کۆیلە بوە (عبید). لەسالی ١٨٨٤ تۆگۆ بوە ژێر دەستەی ئەلمانیابە ناوی تۆگۆلاند، بەلام لەدوای بەزینی ئەلمانیا ناوچەکە دابەش بوو لە جەنگی یەکەمی جیهان لەنێوان فەرەنساو بەریتانیا بوە وولاتێکی ئینتدابی ئەو دوو دەولەتە بە بریاری کۆمەلەی گەلان ، دوای جەنگی جیهانی دووەمیش هەر بەئینتدابی لەژێر ئامۆژگاری ئەو دوو دەولەتە مانەوە بەبریاری نەتەوە یەککرتووەکان، دوای ئەوبەشەی کە لەژێر دەسەلاتی بەریتانیابوو لە گەل ولاتی گانا یەکیان گرت. بەلام ئەو بەشەی لە ژێر دەسەلاتی فەرەنسا بوو بوە دەولەتێکی سەربەخۆ لە ١٩٦٠/٤/٢٧، دانیشتوانی تۆگۆ دوو بەشن یەکەم هۆزەکانی بانتۆ دووەم هۆزەکانی مامینیە، بانتۆیەکان کەوتبونە باشووری وولاتو مامینیەکان کەوتبونە باکور، لە دوای ماوەیەك بەهاوکاری و یەکبونی ئەو دوو هۆزە ئابووری وولات بوژانەوەی بەرچاوی بەخۆوە دەدیت.

سەرەرای ماوەو مولەت دان و بوونی پارتە رامیاریەکان لە سالی ١٩٩١ بەلام دژایەتی حکومەت هەر بەردەوام بوو، لەسالی ١٩٩٤ هەلبژاردن ئەنجامدرا لەپێناو دامەزراندنی کۆمەلەی نیشتمانی کە یەکەم هەلبژاردنی یاسادانان بوو بە رژێمی فرە لایەنی کە ئۆپۆزیسیۆن زۆربەی کورسیەکانی کۆمەلەی بەدەست هێنا لە مانگی/٦ هەمان سال و یەکەم حکومەتی فیدرالی پێك هێنرا سەرەرای ئەوە زۆربەی سەرۆك وەزیرەکان لایەنگیری سەرەك کۆمار بون کە چی لەگەل بنەمای ڕینمایەکانی کۆمەلەی نیشتمانی هەلبژاردن نەدەگونجا کەپارتی بەرهەلستکار دەستی لە حکومەت کێشایەوە. (ئیمادیما)ی سەرۆك کۆمار هەر بەردەوام بوو لەسەر دەسەلاتەکەی، لەسالی ١٩٩٧ دوبارە هەلبژێردراوە بەسەرۆك کۆمار لە سالی ١٩٩٨ سەرەرای نارەزای پارت وجەماوەری تۆگۆ.

- تۆگۆ ئەندامە لەنەتەوە یەککرتوەکان، ئەندامە لەرێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا.

# تـــوونـــس

- ناوی ڕەسمی: کۆماری توونس.
- پایتـــــەختی: تـــــوونس، ژمـــــارەی دانیشتوانی٠٠٠ر٧٦٥ر١ ملیۆن کەسە.
- ڕووبـــــەری: ١٧٠ر٦٣ میـــل چـــوار گۆشەو ٦١٠ر ١٦٣ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- ژمارەی دانیـشتوانی:٠٠٠ر١٦٠ر١٠ ملیـۆن کەسە، بەپێی ئاماری ٢٠٠١.
- چڕی دانیـشتوانی: ١٦٠ کـەس لـە یـەك میـل چوار گۆشەدا.
- بەندەرە گرنگەکانی: توونس، سویس، بیزوت، سەفاقس.
- بوژانەوەی دانیشتوانی:.٥ر٣ ٪.
- زمانەکانی: عەرەبی (زمانی رسمیە) فەرەنسی.
- ئاینەکانی: ئیسلام ٩٨٪.
- نژادەکانی: عەرەب، بەربەر ٩٩٪.
- زانینی نوسین وخوێندن: ٧٠٪.
- دابەشی کار گێری: ٦ پارێزگایە.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ٢٠٠ر٥٦٥ ملیار دۆلار.
- بەشـی تـاك لـە کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ٥٠٠ر٦ دۆلار.
- دراوی: دیناری توونسی.
- زەوی کشتوکاڵی: ٣ر٢٠٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: کروم، چەوەندەری شەکر، گـەنم وجـۆ، دانەوێلـەی تـر ، فەریکـە خورمـا، زەیتون، تەرە، میوجات.
- سـامانی ئـاژەڵی: مـەر ٧٠٠ر٦ملیـۆن سـەر، پەرەور١٥٠ر٣٦ ملیۆن سەر، بزن ٣٥٠ر١ ملیۆن سەر، چێڵو گامێش ٠٠٠ر٨٦٥ هەزار سەر.
- پیـــشەسازی: نـــەوت، گەشـــت و گـــوزار، ئامـادەکردنی خـۆراك، پـەڕ، رسـتن وچـنین، دروستکردنی روونی زەیتون، چاپەمەنی.
- بەرهـــەمی کارەبـا: ٥٠٠ر٧ ملیـار کیلـۆ وات کاتژمێر.
- سـامانی سروشـتی: نـەوت، زەنـگ (تۆتیـا)، فۆسفات،، ئاسن، قورقوشم، کبریت.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی خاو، پێداویستی خۆراك، ماشێن وکلوپەلەکانی. کەلوپەلی بەکار هێنان.
- دەرچـوەکانی: نـەوتی خـاو، ڕۆنـی زەیتـون، بەرهـەرمی رستن وچنین، ترشیاتی، فۆسفات، پـەینی کیمیـاوی، فۆسـفاتی سـوبەر، ماسـی، فەریکە خورما،پەڕی چاپەمەنی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چینی میللـی، ئـەڵمانیا، ئەمـــریکا، بـەریتانیا، ئیتالیـا، ئەسپانیا، بەلجیکا، چەند وولاتێکی یەکیەتی ئەوروپا،ولاتانی عەرەبی و ئەفریقی.
- ڕژێمـی دەسـەڵات: کۆمـارێکی دیمـوکراتی دەستوریە، دەسەڵاتی جێبەجێکردن بەدەست سـەرۆك کۆمـارە کـە بۆمـاوەی پێـنج سـاڵ هەڵدەبـژێردرێت ودەتـوانی دوجـاری ترخـۆی هەڵبژێرێتـەوە، بـەڵام دەسـەڵاتی یاسـانان بەدەسـت ئەنجومـەنی نوێنەرانـە کـە لـە ١٦٣ ئەنـدام پێکهـاتووە بـۆ مـاوەی پێـنج سـاڵ هەڵدەبـژێردێن. لـە سـاڵی ١٩٧٥ دەسـتوری توونس دەستکاری کرا بەوەی کەسەرۆك کۆمار هـەتا دەمـرێ هـەر دەبـێ سـەرۆك کۆمـار بێـت ئەمەش لەکاتی (حەبیب بورقیبە) بوو کە کرا بە سەرۆك کۆمـار، بەڵام لەو کاتـەی زەیـن عابدین دەسـەڵاتی وەرگـرت لـە سـاڵی ١٩٨٧ بـە پێـی دەسـتور کـە حـەبیب بورقیبـە بـە هـۆی تەمـەنی ئـەی دەتـوانی کاروبـاری وولات بـەڕێوە ببـات، پارتە بەرهەڵستکارەکان بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٩٩٤ بەشداری هەڵبژاردنەکانیان کرد.
- پارتـە رامیاریـەکان: پـارتی کۆبونـەوەی دیموکراتی دەستووری، ئەمەش چەندین پارت وڕێکخراوگروپی یەکگرتووی تیا کۆکردبۆتەوە.
- جوگرافیـای وڵات: تـوونس دەکەوێتـە ئەوپـەری

باکووری کیشوەری ئەفریقیا لەسەر دەریای سپی ناوەراست، روەو دوورگەی سەقلیا دوردەبێتەوە بەماوەی سنوری هاوبەشی دەریای سپی ناوەراست بۆ رۆژهەلات و رۆژ ئاوای، جەزائیر دەکەوێتە رۆژ ئاوای، لیبیا دەکەویتە باشووری رۆژهەلاتی. بە درێژی ٦٣٩ میل کەنارەکانی کەوتۆتە سەر دەریای سپی ناوەراست و چەندین بەندەرو دەرگای ئاوی بەسوودی تیایە لە باکورو خاکێکی بە سودی کشتوکالی لێ هەلکەوتوەو دارستانی چری تیایە بەرەو باشوورو دوایی بەرەو بیابانەکان ، لەباکوری رۆژ ئاوایی چیاکانی ئەتلەسی کەداپۆشراوە بەدارستانی چڕ، تاکە زێی هەیە لەباکوری ئەویش زێی (مبجردا)یە کە رووبەرێکی فراوان لە خاکی توونس ئاودێر دەکات، لەناوەراستی کێلگەو رەوندە مەر لەوەرێنەکانی تیایە، لە باشووری کەنداوی جریدی لێیەو دوای بیابانی گەورە درووست دەکات. لەسەر دەریای سپی ناوەراست دورگەی جریدا کە کەوتۆتە باشووری رۆژهەلاتی لە دەرگای کەنداوی جیبسەو بەنیشتمانی دایك ناسراوە کە پردێکی بەرز بەیەکی بەستۆتەوە .

- مێژووی ولات: شاری (قرتاج) لە لایەن ئەو فەینەقیانە درووستکرا کە لەشاری سووری لوبنانی بۆی هاتبون ئەمەش لە سەدەی نۆیەمی پێش زایینی بوو بۆ ئەوەی ئەو شارە دروستکراوە ببێتە مەلبەندی بازرگانی، لەسەدەی شەشەمی پێش زایین شانشینی قرتاجە دەسەلاتی بە تەواوی بەسەر رۆژئاوی دەریای سپی ناوەراست دادەشکا. لەسالی ٢٦٤ پێش زایین شەرەکانی نێوان بونیەکان (قرتاجە) کە سێ شەری گەورەی بە خۆوە دیت لەگەلْ کۆنە رۆمەکان کە هەریەکەیان مەبەستی داگیر کردنی خاك و فراوان کردنی سنوری خۆیان بوو لە ناوچەی رۆژئاوایی دەریای سپی ناوەراست، شەری سێیەمیش کۆتای هات بە کەوتنی قرتاجەو بوە بەشێك لە ولایەتی رۆمانی ئەفریقی.

دوای ئەوە توونس کەوتە ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی لە سالی ٥٣٣ زایینی، لە سالی ٦٤٨ ئاینی ئیسلام گەیشتە توونس و دەورو بەری بە دروستکردنی بنەمالەی ئیسلامی دەسەلاتدار واتە دەولەتی (ئەغلبە)و لەسەدەی نۆیەم بەدامەزراندنی دەولەتی فاتیحیەکان و لەسەدەی دەیەم دامەزراندنی دەولەتی یەککگرتنەکان.

لە سالی ١٥٧٤ توونس بوە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. لەسالی ١٧٠٥ حسن بگ (یای) بنەمالەی شانشینی ناوخۆی دامەزراندو بوە خاوەن دەسەلات لە ژێر رژێمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.

لە سالی ١٨٨١ فەرەنسیەکان داگیریان کردو بنەمالەی (یای) بە پێی پەیمان بوونە پارێزراو لە ژێر دەسەلاتی فەرەنسا، لەسالی ١٩٣٠ پارتی دەستوری توونس دامەزرا بەپێی دەستوری رەسەنی توونس کە لەسالی ١٨٦١ دەرچووبوو. ئەویش لەپێناو هاوبەشی و یەکسانی لە ژیان ودەسەلات، لە سالی ١٩٣٤ حەبیب برقێبە پارتی دەستوری نوێی دامەزراند کە لەپارتی دەستوری پێشوو جیا ببوەوە بوە سەرۆکی خەباتی نەتەوەی توونس. توونس کەوتە ژێر داگیرکەرانی ئەلمانیا لە سالەکانی ١٩٤٢تا ١٩٤٣ لە کاتی جەنگی دووەمی جیهان، بەهۆی خەبات و خۆ پیشاندان و راپەرینی توونسیەکان سەربەخۆی ناوخۆیان وەرگرت لە فەرەنسا لە٢٠/٣/ ١٩٥٦ دوای سەربەخۆی وەرگرتن بنەمالەی (یای) کە حەبیب برقێبە بوە سەرەك وەزیران، لە ٢٥/٧/١٩٥٧ کۆمەلەی دامەزرێنەری حەبیب برقێبە بوە سەرۆك کۆمارو بنەمالەی (یای) لە دەسەلات دەرکران ، لە سالی ١٩٧٩ زانکۆی وولاتانی عەرەبی گوازریاوە توونس کە پێشوو بارەگای سەرەکی لەقاهیرەی پایتەختی وولاتی میسر بوو ئەویش بەهۆی مۆرکردنی

پەیمانی کامدێڤت لەگەڵ ئیسرائیل ودروست بوونی کێشە لەنێوان وڵاتانی عەرەبی و میسر، لــە هەڵبژاردنــەکانی ســاڵی ١٩٨١ پــارتی سوشیالیستی دەستوری سەرکەوتنی بەدەست هێنا کە حەبیب برقێبە سەرکردایەتی دەکرد، لە ساڵی ١٩٨٢ ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین بارەگــای ســەرەکی گواســتەوە تــوونس، لــە ساڵی١٩٨٥ توونس پەیوەندی خۆی لە گەڵ لیبیا بــچڕان ولەهــەمان ســاڵ ئیــسرائیل بۆردمــانی بارەگــای ســەرەکی ڕێکخــراوی ڕزگــاریخوازی فەلەستینی کرد.

لــە ١٩٨٧/١١/٧ زە یــن عابــدین هەڵــسا بــە کودەتایەکی ئاشتی بە لابردنی حەبیب برقێبە لە سەرۆکایەتی توونس و لەجێگەی ئەو بوە سەرەك کۆمــاری تــوونس. لــە ســاڵی ١٩٨٨ بەنــدە ڕامیاریەکانی ئازاد کردو دەستی کرد بەگۆڕینی ئــابووری وڵاتو هــەنگاونان بــەرەو کــەرتی تایبــەتو نــاوی پارتەکــەی گــۆڕی لــە پــارتی سوشیالیــستی دەســتوری بــۆ پــارتی کۆمــەڵی دیمـوکراتی دەسـتوری . لەسـاڵی ١٩٩٠ زانکـۆی وڵاتــانی عــەرەبی لــە تــوونس گــوازراوە قــاهیرەی پایتــەختی میــسر، لــە هەڵبژاردنــەکانی ١٩٩٩ دووبــارە زەیــن عابدین بەســەرەك وڵاتــی تــوونس هەڵبژێردرایــەوەو تــاکو ئێــستا لــە ســەرۆکایەتی کردنی توونس بەردەوام بوو تاکو هەلبژاردنەکانی ٢٠٠٤/١٠/٢٤ پەرلەمانو سەرەك کۆمار دوبارە بۆ جـاری چـوارەم زەیـن عابـدین هەلبـژێردراوە بـە ســەرەك کۆمــار هەرچــەندە بەرهەلــستکارانی دەسەڵات بەو هەلبژاردنە ڕازی نەبوون.

- توونس ئەندامە لە زانکۆی وڵاتانی عەرەبی، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا.

# دورگەی مانگ (کۆماری قەمەڕ)

- نــاوی ڕسمــی: کۆمــاری قەمــەڕی ئیــسلامی یەکگرتوو.
- پایتــەختی: مــۆرۆنی، ژمــارەی دانیــشتوانی ٤٥ر٠٠٠ هــەزار کەسـە، کـە دەکەوێتـە دورگـەی قەمەڕی گەورە.
- ڕووبەری: ٨٦١ میل چوار گۆشەو ٢٣٠ر٢کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٧٣٥ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- چڕی دانیـشتوانی: ٨٥٤ کـەس لـە یـەك میـل چوارگۆشەدا.
- بەنـدەرە سـەرەکیەکانی: مۆتـسا. فومبـۆنیش، مودۆ، دومۆنی، ئەمانەش لەهـەمان کاتـدا شـارە سەرەکیەکانیەتی.
- زمانــەکانی: عــەرەبی، فەرەنــسی، قەمــەری، هەمویان زمانی ڕسمین.
- نـژادەکانی: عـەرەبی، ئەفـەریقیایی، مـالیزی، بەڵام نژادی سەرەکی (ئەنتا لۆتەرە)یە.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٦ر٣٪.
- ئاینیــــەکانی: ئیــــسلام ٨٦٪، کاســــۆلیکی رۆمانی ١٤٪.
- زانینی خوێندن ونوسین: ٦٤٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٤ ئەنجومەنی شارەوانیە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٤٢٥ ملیۆن دۆلار.
- بەشــی تــاك لــەکۆی دەرئــەنجامی نــاوخۆی: ٧٥٠ر٨ دۆلار.
- دراوی: فرەنگی قەمەری.
- زەوی کشتوکاڵی: ٣٥ر٥٪ لەخاکی وڵاتەکە .
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، دانەوێڵەی تر، مۆز، قەنەفر، گیزی هندی، تەڕە، میوەجات.
- سـامانی ئـاژەڵی: مـەڕو بـزن ٦٢٥ر٠٠٠ هـەزار

سەر، چێڵ و گامێش ۰۰۰ر۳۱۸هەزار سەر ، پەرەوور ۳۰۰ر۲ ملیۆن سەر.

- پیشەسازی: دروستکردنی بۆنی هەمە جۆر.
- بەرهەمی کارەبا: ۳۰۰ر۲ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی بەکارهێنان، ماشێن وئۆتۆمۆبیل، سوتەمەنی ، چیمەنتۆ، پێداویستییەکانی خۆراك.
- دەرچووەکانی: کۆبرا، بەرهەمەکانی بۆن، فانیلیا، قەنەفر.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەڵمانیا، چین، فەرەنسا، پاکستان، ئەمەریکا، وولاتانی ئەفەریقیا.
- ڕژێمی دەسەلات: تاکو ئیستاش کۆماری قەمەر بە قۆناغی گواستنەوە تێدەپەڕێ، ئەنجومەنی یاسادانان لە ٤٤ ئەندام پێك هاتوە، دەستوری کۆماری قەمەر لە مانگی/۱۰/ ۱۹۷۸ دەرچووە.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی کۆمەڵ لە پێناو دیموکراتیەت و نوێکردنەوە، پارتی چەپی ناوەندی، پارتی یەکێتی نیشتمانی بۆ دیموکراتیەتی قەمەر، بزوتنەوەی ئیسلامی، پارتی نەتەوەیی قەمەر.
- جوگرافیای وڵات: دورگەی کۆماری قەمەر پێك هاتەیەکی دورگەی بەناوبانگی ئەرەخەبیلە کە لە بنەڕەتا دورگەیەکی گڕکانیە، ئەو دورگەیە کە دورگەی قەمەڕی گەورەیەو پێك هاتووە لە(نجازیجیا). ئەنجوان(ئەنزوانی) موهیلی(موالی) دەکەوێتە باکوری کەناڵی مۆزەمبیق لە نێوان باکوری ڕۆژئاوای دورگەی مەدەغشقەرو باکوری ڕۆژهەلاتی مۆزەمبیق، مۆزەمبیق دەکەوێتە ڕۆژئاوای، مەدەغشقەر دەکەوێتە ڕۆژهەلات.
- مێژووی کۆماری قەمەر: لە سەدەی پێنجەمی زاینی بۆلینسیونەکانی مەلایۆ رویان لەو ناوچەیە کردو نیشتەجێی بون، لە سەدەی شانزەم دەریاوانەکانی ئەوروپی بۆ یەکەم جار سەردانی ئەو دورگەیان کرد، ئەو وولاتە لە ژێر دەسەلاتی حکومڕانی ئیسلامەکان بوو تاکو فەرەنسادەسەلاتی بە سەردا گرت ، لە سالی ۱۹۱۲ دوورگەی قەمەری گەورەو ئەنجوان وموهیلی بوونە ژێر دەستەی فەڕنساو یەك بە یەکیان بەستراپوەوە بە وولاتی مەدەغشقەر ناسراو بوو، لە سالی ۱۹٤۷ بوە بە شێك لە هەرێمەکانی فەڕنسا لە دواوەی دەریاکان ولە مەدەغشقەر جیابوەوە، لەسالی ۱۹٦۱ مافی ئۆتۆنۆمی وەرگرت، لە ٦/٧/ ۱۹۷۵ سەربەخۆی لە فەرەنسا وەرگرت، لە سالی ۱۹۹۵ کودەتایەکی سەربازی ئەنجام درا بەپشتیوانی چلکاو خۆرەکانی فەرەنساو محمد جواهر لە سەر حوکم لادراو هێزەکانی فەرنسا چونە ناو بارەگای سەرکردەکانی کودەتاکەو ناچاریان کردن بە گەڕانەوەی سەرەك (هارمن) کە لە وولات دوورخرابوەوە لە مانگی /۱/ ۱۹۹٦ ، لە ۱۹۹۷/۸/۳ دوورگەی ئەنجوان لە کۆماری قەمەر وەرگیراوە لەلایەن فەرنسیەکان بەهۆی پەیوەندی نێوانیان و دوای دوورگەی موهیلی گەڕاوە بۆکۆماری قەمەڕ، دوای ئەوە کێشە و ململانێی توندو تیژ سەریهەڵداو بوە هۆی ئەوەی کە کۆدەتای سەربازی ئەنجام بدرێ لە ۱۹۹۹/٤/۳۰ .
- کۆماری قەمەڕ ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتووەکان.

# تەنزانیا

- ناوی رەسمی: کۆماری تەنزانیای یەکگرتوو.
- پایتەختی: دۆدۆما، دار السلام، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۸٦٥ر۱ ملیۆن کەسە.
- رووبەری: ۸۷۹ر۳٦٤ میل چوار گۆشەو ۰۳۷ر۹٥٤ هەزار کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۸۷٥ر۳۱ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ۱۹۹۹.
- چری دانیشتوانی: ۸۸ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر۲٪.
- شارە سەرەکیەکانی: زنزیبار، موانزا، دار السلام، کە لەهەمان کاتدا بەندەرێکی گرنگی وولاتەکەیە.
- نژادەکانی: ئەفریقیەکان ۹۹٪ زیاتر لە ۱۰۰ هۆزن لە هۆزی بانتویەکان.
- ئایینەکانی: مەسیحی ٤٥٪، ئیسلام ۳۰٪، بروای ناوخۆی ۲٥٪،
- زمانەکانی: کەناری وئینگلیزی (هەردوکیان زمانی رسمین) زمانو زاراوەی تریشی تیایە.
- زانینی خوێندن ونووسین: ۷۲٪.
- دابەشی کارگێری: ۲٥ پارێزگایە، هەر پارێزگایەك هەرێمێکی گرتۆتە خۆی،
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۳۰۰ر۱۲ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۵۰۰ر۷ دۆلار.
- دراوی: شلنی تەنزانی.
- بەرگری: ٥ر۳٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٥٠٠ر۳٥ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥,۳٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: قاوە، چای، قەنەفر، یامیش، گەنم وجۆ، تەباق، دەرەزەرد، پەمۆ، بیرسرم داری جوانیە، تەرە، میوەجات،چەوەندەری شەکر، توتن.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٦۰۰ر۱ملیۆن سەر، بزن ٥۰۰ر۸ ملیۆن سەر، چێل وگامێش ٦۰۰ر۱۳ملیۆن سەر، پەرەور۷۰۰ر۲۳ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: نەوت وپالاوتنی نەوت، دروستکردنی بەرهەمەکانی کشتوکاڵی، ئەڵماس، چیمەنتۆ، پەینی کیمیا، رستن وچنین، بەرهەمی داری دارستانەکان.
- بەرهەمی کارەبا: ۸۰۰ر۷۹٥ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: وزەی کارەبا، ئەڵماس، زێڕ، ئاسن، فۆسفات، خەڵوز.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی خواردەمەنی ، نەوت ، کەلوپەلی گواستنەوە ، کەلوپەلی دروستکراو، ماشێن.
- دەرچووەکانی: توتن، چای، قاوە، قەنەفر، سلساڵ، پەمۆ، یامیش، ئاژەڵی زیندوو.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: هۆڵەندا، هۆنگ کۆنگ، ئەلمانیا، یابان، ئیتاڵیا، دانیمارك، چین، ئەمەریکا، بەریتانیا.
- رژێمی دەسەلات: دەسەلاتێکی کۆماریەو سەرۆك کۆمار بە پێشنیاری گشتی هەڵدەبژێردرێت، سەرۆك کۆمار وەزیرەکان دادەمەزرێنێ. بەلام ئەنجومەنی (الامە) کە ژمارەیان ۲٤٤ ئەندامە لە وانە ۱۱۹ ئەندام لە لادێو شارۆچکەکانی هەڵدەبژێرێت و (٥٠) ئەندامیان لە دوورگەی زنزیبار هەڵدەبژێردرێن، ۱۰ ئەندامیش سەرۆك کۆمار دایان دەمەزرێنێ،

پێنج ئەندام ئەنجومەن خۆی هەڵیدەبژێرێ لە دوای پاڵاوتنیان لە لایەن دەزگاکانی نەتەوەیی جۆراو جۆر، ٢٠ ئەندام ئەنجومەنی نوێنەرانی زنزیبار هەڵدەبژێرێ. ١٥ ئەندام بۆ ئافرەتانە کە ئەنجەمەنی ئومە هەڵیان دەبژێرێ، لە ١٩٩٥/١٠/٢٩ هەڵبژاردنی فرە پارتی بڕیاری ئەنجامدانی بۆ درا.

- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی دیموکراتی چەپڕەو، پارتی چەپی ناوەندی، پارتی بەرەی یەکگرتوی زنزیبار، پارتی شۆرشگێری تەنزانیا کە پارتی دەسەڵاتە، پارتی سۆسیالستی ئەفریقی، پارتی گەلی تەنزانی، چەندین پارت وڕێکخراو گروپی نوێی تر هەیە لە بیر بۆچونەکانی رامیاری ونەتەوایەتی وکۆمەڵایەتی وئابوری وديموکارتی وزانستی.
- جوگرافیای وڵات: تەنزانیا دەکەوێتە رۆژهەڵاتی ئەفریقیا لەسەر کەناری زەریای هادی، دورگەکانی زنزیبارو بیجاو مافیا لە رۆژهەڵاتیەتی، بەڵام دورگەی سەرەکی دەشتاییە کە وڵاتەکە دەکەوێتە سەر سنوری ئۆگەنداو گینیا لە باکوور، بۆرندی ورواندا و زائیر لە رۆژئاوای، مۆزەمبیق وزامبیاو ملاوی لە باشوری، تەنزانیا سێ دەریاچەی بەناوبانگی ئەفریقیای تێدایە ئەوانیش (دەریاچەی فیکتۆریا لە باکورو دەریاچەی ئەتنجیتقا لە رۆژئاواو دەریاچەی نیاسا لە باشور، لە باکووری چیای کیلیمنجارە کە بەرزترین چیایە لە ئەفەریقیا) تەنزانیا راستەوخۆ دەکەوێتە سەر هێلی کەمەرەی زەوی.
- مێژووی وڵات: بازرگانە عەرەبەکان لە ساڵی ٧٠٠ی زایینی ناوچەکەیان ئاوەدان کردوە، پورتوگالیەکان لەساڵی ١٥٠٠ سەردانی ئەو ناوچەیان کرد وەمەندی لایەنگیریان هەبوو تاکو ساڵی ١٧٠٠ کە لەو کاتە سوڵتانی عمان دەسەڵاتی لەدەست بوو لە وڵاتەکە، لەساڵی ١٨٨٥ (تنجنیقا) کە ئێستا ناسراوە بە بۆرندیو رواندە بونە سێ ژێر دەستەی رۆژهەڵاتی ئەفریقیای ئەڵمانی، لەدوای شەری جیهانی یەکەم کەوتە ژێر کاریگێری بەریتانیا بە پێی ئینتدابی کۆمەلەی گەلان. لەساڵی ١٨٦١ زنزیبار سەر بەخۆی خۆی لە عومان راگەیاند و بوە وڵاتێکی پارێزراو لەلایەن بەریتانیا لە ساڵی ١٨٩٠. تەنجینقا لە ١٢/٩/ ١٩٦١ سەربەخۆی خۆی راگەیاند. زنزیبار لە ١٠/ ١٢/ ١٩٦٣ سەربەخۆی خۆی راگەیاند، لە ١٩٦٤/٤/٢٦ هەردوو وڵات یەکیان گرت و ناسران بەناوی کۆماری زنزیبار وتەنجنیقای یەکگرتوو. ئیستا ناوی رەسمی تەنزانیای یەکگرتووە، زنزیبار ماف ئۆتۆنومی پاراستوە لەناو ئەو وڵاتە یەکگرتوە.

لەدوای ئەو گۆرانکاریەی کە روویدا لە وڵاتی تەنزانیا لە بوارەکانی ئابووری وکۆمەڵایەتی ورامیاری ونەتەوایەتی بەڵام بەردەوام بوە لە یەکگرتنەکە تاکو مانگی/١١/ ١٩٩٥ کە لە هەڵبژاردنێك (ویلیام ماکای) بوە سەرۆك وڵاتی تەنزانیا. بۆ جاری دوەم لەساڵی ١٩٩٩بەسەرۆك دەوڵەتی تەنزانیا هەڵبژێردراوە.

- *تەنزانیا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لەکۆمەنولسی بەریتانیا. ئەندامە لەرێکخراوی یەکیەتی ئەفەریقیا.

# تشـــــاد

- ناوی ڕەسمی: کۆماری تشاد.
- پایتـــــەختی: نجامینـــــا، ژمـــــارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۹٦٥ هەزار کەسە.
- ڕووبـــەری: ٧٥٢ر٤٩٥ میـل چـوار گۆشـــەو ۰۰۰ر۲۸٤ر۱ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ۰۰۰ر١٦۰ر٨ مليـۆن کەسە، بەپێی ئاماری ۲۰۰۱.
- چڕی دانیشتوانی: ۱۷ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- شارەسەرەکیەکانی: ئەبشیە، بنۆجۆر، سەرح، مۆندۆ.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر۲٪.
- نژادەکانی: عەرەبەکان لە باکور، باجان (کیردی) لە باشوور، گەورەترین نەژادی نژادی سارایە کە (یەك لەسەر چـوار)ی دانیـشتوانە، بـەڵام ئەوروپیەکان کراینە فەڕەنسی و زۆر کەمن.
- ئایینـەکانی: ئیـسلام ٤٩٪، مەسیحی ۲٥٪، بروای تری ناوخۆی ۲٥٪.
- زمانەکانی: عەرەبی و فەڕەنسی (هەردووکیان زمـانی ڕەسمـین) زیـاتر لـە ۱۰۰ زمـانی تـری ئەفریقی تیایە کە ئاخاوتنی پێدەکەن.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٥٣٪.
- دابەشی کارگێڕی: ١٤ پارێزگایە.
- کــۆی دەرئـــەنجامی نـــاوخۆیی: ٥۰۰ر٤ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٧٥۰ دۆلار.
- دراوی: فرنکی سیفا.
- بەرگری: ۳ر٤٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٥۰۰ر۳۰ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٤ر۳٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمـــەکانی کـــشتوکاڵی: گــەنم و جـــۆ، دانەوێڵـەی تـر، پـەمۆ، دەرەزەرد، سـەرجوم (جۆرێکــە لــە دەرەزەرد) تــەڕە، میوەجــات، چەوەندەری شەکر، توتن.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٥۰۰ر۲ ملیۆن سەر، بزن ٥۰٥ر٥ ملیـۆن سـەر، چێڵ و گـامێش ٨٦۰ر٥ ملیۆن سەر، پەلەوەر ۹۰۰ر۱۱ملیۆن سەر.
- پیـــشەسازی: دروســـتکردنی جگـــەرە، ئامادەکردنی خواردەمەنی، دروستکردنی بیرە، ڕستن و چنین.
- بەرهـــەمی کارەبـا: ۸۰۰ر۹۳ ملیـار کیلـۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: یۆرانیۆم، بتول و کاولین.
- داهـــاتی دەرەوەی: ماشـــێن و کەلوپـــەلی گواســـتنەوە، پێداویـــستیەکانی خـــۆراك، سوتەمەنی، کەلوپەلی دروستکراو، دانەوێڵە.
- دەرچـووەکانی: ئـاژەڵی زینـدوو، بەرهـەمی ئاژەڵی، پەمۆ، جگەرە، بیرە.
- هاوبەشەکانی بازرگـانی: کـامیرۆن ، نێجیریـا، فەڕەنـسا، چـین، یابـان، ئەمـەریکا، چـەندین لەوڵاتانی عەرەبی و ئەفریقی.
- ڕژێمی دەسەڵات: وڵاتێکی کۆماریە.
- پارتـە رامیاریـەکان: پـارتی یـەکێتی لـە پێنـاو دیموکراتی و کۆماری، پارتی چەپی ناوەندی، پـارتی کـار لـە پێنـاو یـەکێتی سۆشیالـستی، پـارتی جولانـەوەی ڕزگـارکردنی نیـشتیمان، چەندین پارت و ڕێکخراوی تری تیایە.
- جوگرافیـای وڵات: کۆمـاری تـشاد دەکەوێتـە باکوری ناوەراستی ئەفریقیا، لیبیا دەکەوێتە بـاکوری، نـێجیرو نیجیریـاو کـامیرۆن دەکەوێتـە ڕۆژئـاوای، ئـەفریقیای ناوەنـدی دەکەوێتـە

باشووری، سودان دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی. گەورەترین زێیەکانی زێی شاری و زێی لۆجۆنیە، بەرزترین چیاکانی ئەویش چیای تبیستیە لە باکور.

• مێژووی وڵات: تشاد نیشتیمانی ڕۆشنبیری سەردەمی بەردینی کۆن و نوێ بوە لەنێوان سەدەکانی حەوت و نۆی زاینی کە لەکاتی خۆی ڕەوەندە بەربەرەکان ڕویان لەو ناوچەیە کردوە کە لە باکور بونە چینێکی توانادارو دەسەڵاتدار لەسەر گەلی ساو کە ئەوەکانیان بە کشتوکاڵ خەریك بوون، دوای ئەوە شانشینیان دامەزراند لە بۆرنوی ڕۆژئاواو باشووری دەریاچەی تشاد، دوای ئاینی ئیسلامیان کردە باوەڕی دواڕۆژی دوونیای دووەم لە سەدەی پانزەم. لەسەدەی نۆزدەم لەلایەن فەڕەنسا دەستی بەسەرا گیرا. لە ساڵی ١٩١٠ تشاد بوە ژێر دەستەی فەڕەنسا لە ژێر ئەفریقیای کەمەرەیی ولە کشتوکاڵی پەمۆ بەرەو فراوان و گەشەکردن هەنگاوی دەنا لە باشووری وڵاتەکە. لە ساڵی ١٩٤٤ حکومەتی فیشی فەڕەنسا هاوکاری فاشی ئەڵمانیای دەکرد بەپێی ڕێکەوتنێك کە مافی لیبیای لەسەر باکوری تشاد سەپاند. لە ساڵی ١٩٤٦ تشاد بوە یەکێك لە وڵاتەکانی دواوەی دەریاکانی فەڕەنساو بوە خاوەن ئەنجومەنی یاسادانانی تایبەتی و بووە خاوەنی نوێنەری تایبەت لە پەرلەمانی فەڕەنسا، لە دوای ساڵی ١٩٥٨ بوە خاوەن ئۆتۆنۆمی لەناو یەکێتی فەڕەنسا.

لە ١٩٦٠/٨/١١ تشاد سەربەخۆیی وەرگرت بەسەرکردایەتی فرانسوا تۆمبالیا کە لە جولانەوەی هێنانەدی سەربەخۆیی بوو بوە سەرۆك وڵاتی تشادکە لە پارتی پێشکەوتنی تشاد بوو کەلە مەسیحیەکانی باشوور بوو تۆمبالیا لە کودەتایەکی سەربازی لە ساڵی ١٩٧٥ تیرۆر کرا بەسەرکردایەتی ژەنەراڵ فلیکس مالۆم لە باشوورەوە، بەڵام مالۆمی لە ساڵی ١٩٧٩ ناچار کرا تشاد بەجێ بهێڵێت حکومەتێکی کاتی لەلایەن چۆکۆنی عویدی دامەزرا لەبەرەی ڕزگاری نیشتیمانی کە لیبیا یارمەتی پێشکەش دەکردن.

لەساڵی ١٩٨٢ حکوت لە وڵاتەکە هەڵات و حکومەتێکی دورە وڵاتی ڕاگەیاند، فەڕەنساو ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا دانیان بە ڕژێمی هایری نا، لە ساڵی ١٩٨٧ تشاد و فەڕەنسا و لیبیا ڕازی بوون لەسەر وەستانی شەڕ بە زانیاری و هاوکاری یەکێتی ئەفریقیا بە کۆتایی پێ هێنانی شەڕ لەنێوان عەرەبە ئیسلامیەکان لەباکور و لە نێوان ئەفریقیە پێست ڕەشە مەسیحیەکان و ئەنمینیەکان لە باشووردا، لە ساڵی ١٩٨٩ تشاد و لیبیا ڕێك کەوتن لەسەر ئەو کێشە سنوورییەی کە لەنێوان هەیان بوو، بۆیەکەم جار هەڵبژاردنی دیموکراتی تەواو لە ساڵی ١٩٩٦ ئەنجام درا بەپێی دەستوری بڕیار لەسەر دراو لە ساڵی ١٩٩٦ لە ژێر ڕژێمی فرە پارتی، لە ساڵی ١٩٩٨ هێزەکانی ئەمەریکا بۆ پاراستن و جێگیر کردنی ئارامی لە تشاد کشاوە

• تشاد ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا،
• ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

# گامبیا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری گامبیا.
- پایتـــــەختی: بنگـــــول، ژمـــــارەی دانیشتوانی٠٠٠ر٢٨٦ هەزرا کەسە لە هەمان کاتا بەندەرێکی سەرەکیە.
- ڕووبەری: ٣٦٣ر٤ میل چوار گۆشەو ٣٠٠ر١١ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ٠٠٠ر٦٢٤ر١ ملیـۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- چڕی دانیـشتوانی: ٤٧٥ کـەس لـە یـەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢,١٠٪.
- شـاره سـەرکیەکانی: بـاکۆ، جۆرتـاون، سویکۆندا.
- نژادەکانی: ماندینکا ٤٥٪. فولا ٢٠٪، وئلۆف ١٦٪، ڕەگەزی ئەفریقی تری تیایە.
- ئاینەکانی: ئیسلام ٨٨٪، مەسیحی ١٠٪.
- زمانـــەکانی: ئینگلیـــزی (زمـــانی ڕسمیـــە) ماندینکا، وئلوف.
- زانینی خوێندن ونووسن: ٤٥٪.
- دابەشی کار گێری: پێنج بەشە + پایتەخت.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ٣٥٠ر١ ملیـار دۆلار.
- بەشـی تـاك لـە کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ٢٠٠ر١ دۆلار.
- دراوی: دالاسی.
- بەرگری: ٨ر٣٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر١٢هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ١٨,٦٪ لە خاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، فولی سودان، برنج، تەرە، میوەجات،پەمۆ، کتان،دارخورما.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٠٠٠ر١٨٥ هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر٣٧٢ هەزار سەر، چێل ٠٠٠ر٢٥٤ هەزار سەر، پەرەور ٠٠٠ر٨٩٠ هەزار سەر.
- سامانی سرووشتی: ماسی.
- پیشەسازی: فولی سودان، پێستی چاککراو، ماسی قوتی.
- بەرهـەمی کارەبا: ٥٠٠ر٨٦ ملیـۆن کیلـۆ وات کاتژمێر.
- داهـــاتی دەرەوەی: ســـوتەمەنی، ماشـــێن، کەلوپـــەلی گواســـتنەوە، کەلەپـــەلی خـــاو، پێداویستی بەکار هێنان، پێداویستی خۆراك.
- دەرچـووەکانی: بەرهـەمی دار خورمـا، کتـان، ماسی، پەمۆ، فولی سودان.
- هاوبەشـەکانی بازرگـانی: وڵاتـانی یـەکێتی ئەوروپا، ئەمەریکا، یابان، چینی میللی.
- ڕژێمـــی دەســـەڵات: کۆماریـــەو دەســـەڵاتی گواستنەوەی بـەهۆی کودەتاکـەی ١٩٩٤/٧/٢٢ کە بوە هۆی ڕاگرتنی دەستورو قەدەغەکردنی جموجۆڵی پارتە ڕامیاریەکان.
- پارتـــە ڕامیاریـــەکان: پـــارتی بەڵگەنامـــەی نیشتمانی، پـارتی چـەپی ناوەنـدی، پـارتی پێشکەوتنی گەل.
- جوگرافیـای وڵات: گامبیـا دەکەوێتـە سـەر زەریـای ئەتلەسـی لـەلای ڕۆژئاوای کیشوەری ئەفریقیا، سەنیگال دەکەوێتە سێ لای سنوری لە باکوری ڕۆژهەڵات وباشوور، پێکهاتەکەی لە ڕایەلەیەکی تەنگ پێك هاتوە بەدرێژای لێواری زێـی گامبیـایی خـواروو کـە دێتـە خـوارێ بـە درێژی٣٢٢ کیلۆمەتر. گامبیا بچوکترین وڵاتە لـە کێـشوەری ئـەفریقیا کـە پانیەکـەی ٢٢کیلۆمەتر.
- مێژووی وڵات: لە سەدەی سیانزەم هۆزەکانی (ئـەلوف و مـالینکی) (مانـدینجۆ) (فـولان) لەڕۆژهـەڵاتی بـاکوور هاتنـە ئـەو ناوچـەیە بۆئەوەی ئارام بگرن و لەسەدەی چواردەهەم ئەو وڵاتـە بـوە پارچـەیەك لـە ئیمپراتۆریـەتی مـالی ئیـسلامی مـەزن کـە مەڵبەندەکـەی لـە باکوورو ڕۆژهەڵاتی وڵاتەکە بوو بەرەو فراوانی

درێژ ببوەوە بۆ سەنیگال ومالی وباشووری مۆریتانیا، لە نێوان سەدەکانی پانزەو شانزە بوە بەشێک لە ئیمپراتۆریەتی سونجا کە جێگەی ئیمپراتۆریەتی مالی گرتەوە.

پورتوگالیەکان بۆیەکەم جار چاویان کەوت بە زێی گامبیا لە ساڵی ١٤٥٥. لە سەدەی حەڤدەم بەریتانیەکان و فەرەنسیەکان توانیان چەندین کۆمەڵگای لێ دروست بکەن لەسەر کەناری زێیەکە، کە بەندیەتی سەرچاوەی دەرامەتی وولاتەکە بوو کە لەساڵی ١٨٠٧ هەڵوەشێنرایەوە، لە ساڵی ١٨٤٣ گامبیا بوە ژێر دەستەی تاجی بەریتانیاو بوە شانشینی دەستوری، لە ١٨/٢/ ١٩٦٥ گامبیا سەربەخۆیی وەرگرت لەناو کۆمەنوولسی بەریتانیا کە داودا جاوارا لە پارتی پێشکەوتنی گەڵ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی وەرگرت لە ژێردەسەڵاتی فەرە پارتایەتی، لەساڵی ١٩٧٠ گامبیا بوە وولاتێکی کۆماری کە داودا جاوارا بوە سەرۆک کۆمار.

لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی ساڵی ١٩٩٢ پارتی پێشکەوتنی گەڵ توانی٢٥ کورسی بەدەست بێنێ لە کۆی ٢٦ کورسی و دووبارە سەرۆک داودا جاوارا بوە سەرۆک کۆمار بۆ ماوەی پێنج ساڵ، بەڵام لە ١٩٩٤/٧/٢٢ لە رێگەی کوردەتایەک لەسەر دەسەڵات لابرا کە ماوەی ٢٤ ساڵ حکومرانی دەکرد، لەراپرسی گشتی ساڵی ١٩٩٦ گامبیا توانی دەستوری نوێ رابگەیەنێ، کە (جامع) توانی سەرکەوتن بەدەست بێنێ بۆ پۆستی سەرۆکایەتی، لە مانگی/١/١٩٩٧ هەڵبژاردنی پەرلەمان ئەنجام دراو دەسەڵاتی مەدەنی گەراوە بۆ وولاتو هەر جامع بە سەرۆک کۆمار مایەوە تاکو ساڵی ٢٠٠٢بەجۆرێکی بەهێزتر.

- گامبیا ئەندامە لە نەتەوە یەککگرتووەکان، ئەندامە لەکۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە رێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا.

# جیبۆتی

- ناوی رەسمی: کۆماری جیبۆتی.
- پایتەختی: جیبۆن، ژمارەی دانیشتوانی٤٨٦ر٠٠٠ هەزار کەسە و لەهەمان کاتا بەندەرێکی گرنگە.
- رووبەری: ٨ر٩٥٨ میل چوار گۆشەو ٢٣ر٢٠٠ هەزار کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٧٧٥ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- چری دانیشتوانی: ٨٧ کەس لەیەک میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢ر٥٪.
- شارە سەرەکیەکانی: دیخیل، ئۆبوک، تاجورا.
- زمانەکانی: عەرەبی و فەرەنسی (هەردووکیان زمانی رەسمین) زمانی عەفاری، سۆمالی.
- نژادەکانی: دوو کۆمەڵەی دانیشتوانی سەرەکی تیایە ئەویش هۆزی عیسی (سۆمالی)لە باشووری ٦٠٪، هۆزی عەفار (دناقیل) لە باکورو رۆژ ئاوای ٣٥٪. کەمەنەتەوایەتی تری عەرەب و فەرەنسی وسودانی وهیندی تیایە.
- ئاینەکانی: ئیسلام ٩٤٪. مەسیحی ٦٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٥٠٪.
- دابەشی کارگێری: ٥ هەرێمی پارێزگاریە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٢٥ ملیۆن دۆلار.
- بەشی تاک لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ١ر٥٠٠دۆلار.

- دراوی: فرەنگی جیبۆتیە.
- بەرگری: ٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٥٠٠ر١٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر٠٪ لە خاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: بە هۆی نەبوونی زەوی کشتوکاڵی بەرهەمەکانی نیە ئەوەی هەشە شایەنی باسکردن نیە، پێداویستیەکانی خۆراکو پێداویستی تر لە دەرەوە دەکرێ.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٥١٠ر٠٠٠ هەزار سەر، بزن ٥٢٧ر٠٠٠ هەزار سەر، چیل وگامێش ٢١٦ر٠٠٠ هەزار سەر، پەرەور ٠٠٠ر١٦٠ر٤ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: بەرهەمی شیر، دروستکردنی ئاوی کانزاکان، ئامادەکردنی پێستی ئاژەڵ.
- بەرهەمەکانی کارەبا: ٩٥٠ر١ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: وڵاتی جیبۆتی هیچ سامانێکی سروشتی نیە.
- داهاتی دەرەوەی: پێداویستی خۆراک، کەلوپەلی گواستنەوە، ماشێن و ئۆتۆمبێل، نەوت وبەرهەمەکانی، جل وبەرگ، کەلوپەلی بەکار هێنان.
- دەرچووەکانی: پێستی خۆشکراو، قاوە کە لە ئەسیوبیا دەگواسترێتەوە.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەراست، ئەفریقیا، ئەورووپا، بەحرێن، چینی میللی، یابان.
- رژێمی دەسەڵات: حکومرانی جیبوتی یەکسانێکی وردە لە نێوان دوو کۆمەڵەی دانیشتوان ئەویش (ئەلعیسی وعەفار). لە راپرسی میللی ساڵی ١٩٧٧ کە ئەنجام درا لە مانگی پێنج و٩٨٪ گەلانی جیبۆتی دەنگیان بۆ سەربەخۆیی وڵات دەبری بە جیابوونەوەی لە فەرەنساو رازی بون بەدامەزراندنی کۆمەڵەی دامەزرێنراوی نوێی دەوڵەت لە مانگی (شەش)ی هەمان ساڵ کە لە ٦٥ ئەندام پێکهاتبوو ئەویش بە گواستنەوەی دەسەڵاتی سەربەخۆی لە فەرەنساوە بۆ حکومەتی نوێی، لە هەمان کاتدا بوە ئەندام لە یەکێتی رێکخاوی ئەفریقیا وزانکۆی وڵاتانی عەرەبی. هەسەن جۆلید هەر بە سەرۆک کۆماری جیبۆتی مایەوە لە مانگی/٦/١٩٧٧ تاکو مانگی/٥/١٩٩٩ کە دوای ئەو ئیسماعیل عمر جلەوی حوکمی گرتە دەست تاکو کۆتایی ساڵی/٢٠٠٤.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی نوێ کردنەوەی دیموکراتی، پارتی چەپی ناوەندی، پارتی کۆبونەوەی پێشکەوتوی گەل، پارتی پێشکەوتنی جیبۆتی.
- جوگرافیای وڵات: جیبۆتی دەکەوێتە رۆژهەڵاتی ئەفریقیا لەسەر کەنداوی عەدەن لە تەک دەروازەی باشووری بۆ دەریای سوور کە لە کەناری ئەفریقی نزیک دەبێتەوە لەنیمچە دورگەی عەرەبی لەیەک جیانابێتەوە تەنیا گەروی دەرگای مەندەب نەبێت ئەویش گرنگیەکی ئیستراتیژی مەزنی هەیە، ئەسیوبیا دەکەوێتە رۆژهەئاواو باشووری رۆژئاوای. ئەریتیریا دەکەوێتە باکوری رۆژئاوا، سۆمال دەکەوێتە رۆژهەلاتی، زۆر خاکی جیبۆتی بیابانی بەرداوی و گردایيە وڵاتێکی ووشکانی وبێ بارانیە.
- مێژووی وڵات: هۆزی عەفار کە لەدورگەی عەرەبییەوە لە سەدەی سێیەمی پێش زایینی روویان لە باشووری وڵاتەکە کردبوودوایی هۆزی عیسی جێنشینی باشووری وڵاتەکە بوون کە لەسۆماڵەوە بۆی هاتبوون، لە سەدەی شانزەم پرتوگالیەکان گەیشتنە ناوچەکە بۆ کاروباری بازرگانی، لەساڵی ١٨٦٢ فەرەنسیەکان توانیان گەمارۆی بەندەری ئۆبوک بدەن، فەرەنسا لە ساڵی ١٨٨٨ لکاندی بە خاکی وڵاتەکەی خۆی بەناوی ئەوەی بەشێکە لەخاکی سۆماڵی فەرەنسا، لە ساڵی ١٩٠٠

هێڵی شەمەندەفەری لێ دروستکرا کە بەندەری جیبۆتی بەستاوە بەخاکی ئەسیوبیای ناوەوە، لەساڵی ١٩٤٦ جیبۆتی بوە هەرێمێکی دادوەری دەریاکانی ژێر یەکێتی فەرەنسا وبەبونی نوێنەریان لە پەرلەمانی فەرەنسا، لە ساڵی ١٩٥٨ دانیشتوان دەنگیان دەربڕی بۆ ئەوەی ببنە ئەندامێك لەگەڵی فەرەنسا، لەساڵی ١٩٦٧ ناوی لەسۆماڵی فەرەنسی بوە هەرێمێکی عەفارو عیسی فەرەنسی. لە٢٧/٦/ ١٩٧٧ جیبۆتی سەربەخۆی وەرگرت حەسەن جولیت هەڵبژێردرا بە سەرۆك كۆمار كە سەرۆكی جوڵانەوەی سەربەخۆی بوو.

لەساڵی ١٩٨١ دەستوری نوێ راگەیاندرا و لەهەمان ساڵ هاوپەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ ئەسیوبیا وسۆماڵ وکینیاو سودان مۆرکرد، لەساڵی ١٩٩٢ دووبارە دەستوری نوێ راگەیانرا بە فرە لایەنی دەسەلات وهەڵبژاردن. هەر لەدوای ئەوە بوە هۆی بەرپابونی شەر لەنێوان هێزەکانی حکومەت و بەرهەڵستکارانی هۆزی عەفار بۆ گەرانەوەی یەکێتی دیموکراتی، لەساڵی ١٩٩٤ حکومەتی جیبۆتی لە گەڵ تیرەی عەفار توانیان رێکەوتنی ئاشتی مۆر بکەن و وولاتەکە بەرو ئارامی بگێرنەوە.

- جیبۆتی ئەندامە لە زانكۆی وولاتی عەرەبی، ئەندامە لەرێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتووەکان.

# سوزیلاند

- ناوی رەسمی: شانشینی سوزیلاند.
- پایتەختی: میابین، ژمارەی دانیشتوانی ٥٦ر٥٠٠ هەزار کەسە کە پایتەختی کار گێریە بەڵام لوبمبا پایتەختی یاسادانانیەتی.
- رووبەری: ٦ر٧٠٣ میل چوار گۆشەو ١٧ر٣٦٠ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ١ر١٨٨ر٠٠٠ ملیۆن کەسە، بەپێی بڵاوکراوەی رۆژنامەکانی ٢٠٠١.
- چری دانیشتوانی: ١٦٧ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- شارە سەرکیەکانی: منزینی، بیگبند.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢,٥٪.
- نژادەکانی: ئەفریقی ٩٧٪ (ئەویش هۆزەکانی سوازی، زولۆ، تۆنجا، شنجان) ئەوروپی ٣٪.
- زمانەکانی: سوازی ئینگلیزی (هەردووکیان زمانی رسمین).
- ئایینەکانی: مەسیحی ٦٠٪، بروای ناوخۆی ٤٠٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٨٠٪.
- دابەشی کار گێری: چوار پارێزگای هەرێمیە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٤ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٣ر٨٥٠ دۆلار.
- دراوی: لیلنجیین.
- زەوی کشتوکاڵی: ٣ر١٢٪ لەخاکی وولاتەکە.
- سامانی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، دانەوێڵە، پەمۆ، چەوەندەری شەکر، برنج، ئەنەناس، تەرە، میوەجات، دار.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٤٦٧ر٠٠٠ هەزار سەر، بزن ٤٤٠ر٠٠٠ هەزار سەر، چێڵ ٦٧٣ر٠٠٠ هەزار سەر، پەرەور ١ر١٥٠ر٠٠٠ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: کانزایی، کاکلی دار، شەکر،

دروستکردنی گۆشت، بەرهەمی دار، بنێشت.

• بەرهەمی کارەبا: ٥٦٠ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.

• سامانی سروشتی: ئەسبێستۆ، ئەڵماس، سلسالّ، خەڵوز.

• داهاتی دەرەوەی: بەرهەمەکانی نەوت، ئۆتۆمبێل وماشێن، کەلوپەلی خواردەمەنی، کیمیا، کەلوپەلی گواستنەوە.

• دەرچووەکانی: ئەسبێستۆ، شەکر، کاکلەی دار، سورای.

• هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، بەریتانیا، باشووری ئەفریقیا، وولآتانی یەکێتی ئەورووپا، یابان، چین.

• رژێمی دەسەلآت: شانشینی گواستنەوەیە، لەساڵی ١٩٦٧ دەستوری نوێی وولآت راگەیانرا بەپێی ئەو دەستورە (سوبوزای دوەم) بوە شانشینی وولآت. ئەنجومەنی یاسادانان پێکهاتوە لە ٢٤ ئەندامو هەڵدەبژێردرێت بە پێشنیاری گشتی نهێنی، ئەنجومەنی پیران لە١٢ ئەندام پێکهاتوە کە نیوەی ئەندامانی ئەنجومەنی یاسادانان دای دەمەزرێنی ونیوەکەی تری شانشین دایدەمەزرێنی. لەساڵی ١٩٧٣ شانشین کاری بە دەستور راگرت وماوەی بە پارتە رامیاریەکان نەدا بۆ کاری رامیاریو هەموو کاروباری خستە ژێر دەسەلآتی خۆی ، لەساڵی ١٩٧٧ شانشین ئەندامانی هەردوو ئەنجومەنی گۆری بە ئەنجومەنی سەرۆك هۆزەکان، بەلآم لە ساڵی ١٩٧٩ دووبارە پەرلەمان دەستی کرد بە دانیشتنەکانی خۆی بە بەردەوامی.

• پارتە رامیاریەکان: بزوتنەوەی گەلی دیموکراتی یەککگرتو، پارتی چەپی ناوەندی، پارتی سوزیلاندی پێشکەوتوو، بەرەی سوزیلاندی یەککگرتوو، بزوتنەوەی ئیمۆکۆڤ نیشتمانی، پارتی نیشتمانی لایەنگیری شانشین،

• جوگرافیای وولآت: سوزیلاند دەکەوێتە باشووری وولآتی ئەفریقیا لەنزیك کەناری زەریای هادی، کۆماری باشووری ئەفریقیا دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای‌و باشووری، مۆزەمبیق دەکەوێتە رۆژهەلآت، لە رۆژئاوای چیاکان‌و لەرۆژهەلآت گردو لکەکان ولە ناوەراستیشی دۆڵێکی پان وبەرینە، چوار زێی سەرەکی تیایە ئەویش لە رۆژئاوای بەرەو رۆژهەلآت دێتە خوارێ کە سودمەندن بۆ بەراو کردنی خاکی وولآت‌و زۆری ووزەی کارەبا، کەش‌و هەوایەکی لەبارو گونجاوی هەیە.

• مێژووی ولآت: لە سەدەی شانزەم هۆزەکانی بانتۆ لە رۆژهەلآت روویان تێکردو لەناوچەی باشووری رۆژئاوای مۆزەمبیق جێگیر بوو. لە سەدەی هەژدەم چەندین هۆزی تر رویان لە سوزیلاندە کردو نیشتەجێ بون، لە سەدەی نۆزدەم ئەو هۆزو عەشیرەتانە یەکیان گرت وەك یەك هۆز بەرامبەر هۆزی زولو بە هۆی بونی کێشەی بەردەوام لە نێوانیان، لەنیوەی سەدەی نۆزدەم سوزیلاند کەوتە ژێر حکومی شانشینی جەنگاوەر (مسوانی) کە خاڵێکی ژێر دەسەلآت بوو کە سێ جار ئەوەندەی خاکی ئێستای سوزیلاندە دەبوو. ئەو شانشینە داوای لە بەریتانیاو باشووری ئەفریقیا کرد بۆ یارمەتی دان لە دژی هۆزی زولۆ.

لەساڵی ١٩٠٣ بوە وولآتێکی پاریزراوی بەریتانیا، لە٦/٩/ ١٩٦٨ سەربەخۆی لەناو کۆمەنولسی بەریتانیا وەرگرت‌و بوە شانشینی سوزیلاندکە شانشینەکەی (سوبۆزای دووەم) بوو، لە ساڵی ١٩٨٢ شانشین سوبۆزی کۆچی دوایی کردوو (زلیۆ)ی کە خێزانی گەورەی شانشین سوزیلاندە بووجێگەی گرتەوە بەهۆی ئەوەی کورەکەی تەمەنی بچوك بوو ماوەی شانشینی پێ نەدەرا، لەساڵی ١٩٨٣ (ننوجی) ژنی دووەمی شانشین کۆچی کردوو توانی زلێوی دەربکات وخۆی ببێتە شانشین‌و دەسەلآتی تەواوی گواستراوە بۆ سەرۆك وەزیران ئەمیر

دلامینی، لەساڵی ١٩٨٦ سەرمرای تەواو نەبوونی تەمەنی یاسای بوە شانشینی سوزیلاندە. لە مانگی/١٩٩٣/٩ یەکەم هەڵبژاردنی دیموکراتی ئەنجامدرا دوای کێشەو ململانێی ناوخۆی دژی دەسەلاتداران، بەلام لە دوای ساڵی ١٩٩٧ لە وولات دەستکرا بەچاکسازی ئابووری وبوارەکانی تر هەرچەندە زۆربەمێواشی هەنگاوی دەناو تاکو کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤ وولاتی سوزیلاند هەنگاوی باشی دەنا . لەپێناو بوژانەوەی ئابوری و خۆشگەزەرانی وولاتەکە.

- سوزیلاندە ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا.

# گانا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری گانا.
- پایتەختی: ئەکرا، ژمارەی دانیشتوانی ٧٨٤،٠٠٠ر١ ملیۆن کەسە.
- ڕووبەری: ١٠٠ر٩٢ میل چوارگۆشەو ٥٤٠ر٢٣٨ کلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٥٢٧،٠٠٠ر١٩ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٧.
- چڕی دانیشتوانی: ٢١٢ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٣ر١٪.
- شارە سەرەکیەکانی: تامیل، کۆماس.
- بەندەرە گرنگەکانی: تیما، تاکورادی.
- نەژادەکانی: ئەکان ٤٥٪، مۆشی، داگۆمبا ٥ر١٧٪، یو ٥ر١٣٪، جا ١٠٪، چەندین نەژادی تری بچووکی تیایە.
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی ڕەسمیە) زمانەکانی ئەکان، مۆشی، داگۆمبا، یو، جا.
- ئاینەکانی: بڕوای ناوخۆی جۆراو جۆر ٤٥٪، ئیسلام ٣٠٪، مەسیحی ٢٥٪.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٦٧٪.
- دابەشی کارگێڕی: ١٠ پارێزگای هەرێمیە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر٢٦ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر٢ دۆلار.
- دراوی: سیدی.
- بەرگری: ٥ر٥٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٨٠٠ر٧٥ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٨ر١٢٪ لەخاکی وولاتەکە.
- سامانی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، دانەوێڵەی تر، دەرمزەرد، فولی سودانی، قاوە، برنج، کاکاو، تەرە، میوەجات، چەوەندەری شەکر.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٢٢٠ر٣ ملیۆن سەر، بزن ٢٥٠ر٢ ملیۆن سەر، چێڵ ١٨٠ر١ ملیۆن سەر، پەرەور ٣٠٠ر١٥ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: ئەلەمنیۆم، سروشتی، ئامادەکردنی خۆراك، بەرهەمی دار، پیشەسازی سوك.
- بەرهەمی کارەبا: ٨٧٠ر٥ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: بۆکسیت، زێڕ، موگناتیس، ئەڵماس.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی سەرمایەداری، پێداویستی خۆراك، نەوت و بەرهەمەکانی، کەلوپەلی بەکارهێنان، ماشێن و ئۆتۆمبێل.
- دەرچووەکانی: ئەلەمنیۆم، بۆکسیت، زێڕ، دار، کاکاو.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چین، ئەڵمانیا.

فەرەنسا، ئەمریكا، بەریتانیا، كۆریای باشوور.

- ڕێژەی دەسەڵات: وولاتێكی كۆمارییە، سەرۆكی دەوڵەت خۆی سەرۆكی حكومەتە، پەرلەمان پێك هاتووە لە ٢٠٠ ئەندام و هەڵدەبژێردرێن بەپێشنیاری گشتی بۆ ماوەی پێنج ساڵ.
- پارتە ڕامیارییەكان: پارتی نیشتیمانی نوێ، پارتی كۆنگرەی نیشتیمانی دیموكراتی.
- جوگرافیای ولات: گانا یەكێكە لە وولاتەكانی ڕۆژئاوای ئەفریقیا كە دەكەوێتە سەر كەناری گینیای باشوور. كوت دیفوار لە ڕۆژئاوای، بۆركینافاسۆ لە باكوری. تۆگۆ لە ڕۆژهەلاتی، ڕووی خاكی گانا زۆربەی دەشتایی بەپیتە و زەویەكی گونجاوی هەیە بۆ بوژانەوەی كشتومالّ و دارستانی باشی تیایە. گرنگترین زێ زێی (فۆلتا) یەو دەریاچەی فۆلتای لێ دروستكراوە و زێی فۆلتا لە كەنداوی گینیا دەكاتەوە. لە ڕۆژئاوای تەپۆلكەی (ئاشتییە)، لە ڕۆژهەلاتی چیایە، بەلام پشبێنی درێژی كەنارەكەی ٤٣٥ كیلۆمەتر دەبێت، كەش و هەوایەكی گونجاوی هەیە.
- مێژووی ولات: گانا كاتی خۆی ناوێكی ئیمپراتۆری ئەفریقی بوە كە لەسەر كەرتی زێی نیجیر بوە لە سالّی ٤٠٠ تا ١٢٤٠ زاینی، پرتوگالیەكان بۆ یەكەم جار لە سالّی ١٤٧٠ سەردانی ناوچەكەیان كردو چاویان كەوت بە گانا. دوای ئەوان ئینگلیزەكان لەسالّی ١٥٥٠ سەردانیان كردو دوای ئەوانیش هۆلەندیەكان لە سالی ١٥٩٥سەردانیان كرد، لەدوای ئەوانیش سویدیەكان لە سالّی ١٦٤٠، حوكمڕانی بەریتانیا لە گانا دەستی پێ كرد لە سالّی ١٨٢٠ ئەو دەسەلاتە بەهێز نەبوو تاكو سالّی ١٩٠١. لە سالّی ١٩٥٦ گانا تێكەلاو كرا لەگەلّ تۆگۆلاند لەدوای ئەنجامدانی ڕاپرسی میللی و ئەنجامەكەی هەردوو وولات یەكیان گرت بە ناوی گانا. لە ١٩٥٧/٣/٦گانا سەربەخۆیی وەرگرت و بوە ئەندام لە كۆمەنولسی بەریتانیا و (كوامی نكرۆما) بوە یەكەم سەرۆك كۆمار، لە سالّی ١٩٦٠ دەستوری نوێی گانا ڕاگەیاندرا و كردیە دەولەتی یەك پارتی سوشیالستی. لە سالّی ١٩٦٦ كودەتایەكی ناكاوی سەربازی ئەنجام درا لەلایەن سەربازو پۆلیس و نكرۆ ما لەسەر دەسەلات لابرا . لە سالّی ١٩٦٩ هەلّبژاردن ئەنجام درا بەلام گانا نەیتوانی كارەكانی بەڕێوە ببا بەهۆی ڕودانی كودەتایە یەك لە دوای یەكەكانی سالانی ١٩٧٢ تاكو ١٩٨١ دوا كودەتا لەلایەن (جری ڕولینجس) ئەنجام دراكە ئەفسەرێكی فرۆكەوان بوو، دەستوری لەكار وەستاند و مۆلەتی پارتەڕامیارییەكانی قەدەغەكرد. لەمانگی/٤/ ١٩٩٢ ڕەزامەندی لەسەر دەستوری نوێی وولات كرد بەماوەدانی فرەلایەنی پارتایەتی لە دەسەلاتدا. لە كۆتایی سالّی/ ١٩٩٢ هەلّبژاردن ئەنجام دراو جری ڕولینجس زۆربەی دەنگەكانی بە دەست هێنا بوە سەرۆك كۆمارو لەهەمان كات پارتی كۆنگرەی نیشتیمانی دیموكراتی دەسەلاتدار توانی ١٨٩ كورسی بەدەست بێنێ لەكۆی ٢٠٠ كورسی، دوبارە لینجس لە هەلّبژاردنەكانی ١٩٩٦ سەركەوتنی بەدەست هێناو بوە سەرۆك كۆماری گانا لە ئەنجامی وەرگرتنی یارمەتی لە بەنكی نیودەولەتی بە بڕی دوو ملیار و سەد ملیۆن دۆلار كە بوە هۆی بوژانەوەی ئابووری وولاتەكە. سكرتێری نەتەوە یەكگرتووەكان (كوفی ئەنان) لەدایك بووی گانایە كە دبلوماتكارێكی دان پێ نراو بوو تاكو بوە سكرتێری نەتەوە یەكگرتووەكان لە سالّی ١٩٩٧، گانا بەرەو ئارامی و ئاسودەیی هەنگاو دەنێ. بەتایبەتی لەدوای سالّی ٢٠٠٤ لەگەلّ تەواوبونی ئەو پەرتووكە.
- گانا ئەندامە لە نەتەوە یەكگرتووەكان، ئەندامە لە كۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە ڕێكخراوی یەكێتی ئەفریقیا.

# کینیای ئیستوائی

# "گینیای ئەسپانیای پێشوو"

- ناوی ڕەسمی: کۆماری کینیای ئیستوائی، واتە گینیای کەمەرەیی.
- پایتەختی: مالایۆ، کە دەکەوێتە دورگەی بیوکۆ ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۷۸ هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ۸۳ر۱۰ میل چوارگۆشە و۰۵۱ر۲۸ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۵۷٦ هەزار کەسە.
- چڕی دانیشتوانی: ۵۲۲ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۵ر۲٪.
- شارە سەرەکیەکانی: باتا.
- بەندەرە گرنگەکانی: مەلایۆ، باتا.
- زمانەکانی: ئەسپانی، فەرنسی، (هەردوکیان زمانی ڕەسمین) فانج، بۆبی.
- نژادەکانی: فانج ۸۵٪، بۆبی ۱۰٪.
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی، برۆتستانت، ئەنیمیە.
- زانینی خوێندن و نوسین: ۸۰٪.
- دابەشی کارگێڕی: ۷ ناوچەیە لە شێوەی ناحیە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۵۰۰ر٦٦۵ میلۆن دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٦۰۰ر۱ دۆلار.
- دراوی: فرنگی سیفا.
- بەرگری: ۵ر۲٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر۱۵ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ۲ر۵٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم و جۆ، دانەوێڵەی تر، کاکاو، قاوە، برنج، مۆز، پەتاتە، تەرە، میوەجات، داری دارستانەکان.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ۰۰۰ر۳۵ هەزار سەر، بزن ۵۰۰ر۱٦ هەزار سەر، چێڵ ۰۰۰ر۱۸ هەزار سەر، پەرەوور ۰۰۰ر۵٦۰ هەزار سەر.
- پیشەسازی: نەوت کە ۷۰٪ داهاتیەتی، راوی ماسی، دار.
- بەرهەمی کارەبا: ۲۵ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: نەوت.
- داهاتی دەرەوەی: ماشێن، ئۆتۆمبێل، کەلوپەلی گواستنەوە، بەرهەمەکانی ڕستن و چنین، پێداویستیەکانی خۆراك.
- دەرچووەکانی: نەوت، قاوە، کاکاو، داری دارستانەکان.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، نێجیریا، فەرەنسا، ئەڵمانیا، یابان، چین، ئەسپانیا، کامیرۆن.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی دیموکراتی تازە پێگەیشتوە، ئەنجومەنی نوێنەران پێك هاتوە لە ۸ ئەندام. ئەنجومەنی وەزیران، سەرۆك وەزیران سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران دەکات.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی نەتەوەی ڕاست ڕەوی ناوەندی، پارتی دیموکراتی، پارتی چەپی ناوەندی، یەکێتی سۆشیالستی دیموکراتی گینیای ئیستوائی، پارتی کۆك بونی میللی دیموکراتی.
- جوگرافیای وولات: کینیای ئەسپانی لە وولاتەکانی ڕۆژئاوای ئەفریقیایە ئەویش یەکەم دەوڵەتی ئەفریقیە کە بەزمانی ئەسپانی ئاخاوتن دەکات. وولاتێکی قەبارە بچووکە لە

دوو بەش پێك هاتووە. بەشێکیان دەکەوێتە کیشوەری ئەفریقیا کە پێی دەگوترێ (بۆمۆنی) کە ڕووبەری ١١٧ر٢٦ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە. کە کەنداوی گینیا دەکەوێتە ڕۆژئاوای و کامیرۆن لەباکوریەوە. گابۆن دەکەوێتە ڕۆژهەلات و باشوری، بەلام بەشی دووەمی دەکەوێتە دورگەی کەنداوی گینیا کە گەورەترینیان دورگەی بیوکۆیە کە ڕووبەری ٠٣٣ر٢ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە. ئەو دورگەیە لە دوو چیای گرکانی پێك هاتووە کە کەندێکی قوڵ و پان بە یەکیان دەبەستێتەوە . بەلام ناوچەی ریومۆنی پێك هاتووە لە دەشتایەکی کەناری و گردولکەی نزم، زۆربەی خاکی کینیا بە دارستان داپۆشراوە.

• مێژووی گینیای ئیستوائی: بۆ یەکەم جار لە سالی ١٤٧٢ دۆزینەرەوەکانی پورتوگال سەردانی ناوچەکەیان کرد، لە سالی ١٧٧٨پورتوگالیەکان دورگەی بیوکۆیان بۆ ئەسپانیەکان جێ هێشت (کە پێشوو پێیان دەگوت فرنادۆبۆ) ئەویش بە دامەزراندنی کێڵگەی کاکاو قاوە کە کرێکاریان لە ڕۆژئاوای ئەفریقیا بۆ دەهێنا بۆ کاری کشتوکاڵی. لە سالی ١٨٨٥ ئەسپانیا بەشی دووەمی ولاتەکەی وەرگرت کە کەوتبوە کیشوەری ئەفریقیاو ناسراو بوو بە ریومۆنی (فینی ئێستا) و ئەو بەشەش لکا بە بەشی یەکەم (دورگەی بیوکۆ) لەژێر ناوی گینیای ئەسپانی و پایتەختی مالابۆ بوو لە دورگەی بیوکۆدا، کۆمەڵەی گەلان لەسەرەتای سەدەی بیستەم شاندێکی تایبەتی ڕەوانەی ولاتەکە کرد بۆ لێکۆڵینەوە لە بژێوی کرێکارانی کشتوکاڵی لە کێڵگەکانی کاکاو قاوە لە دوورگەی بیوکۆ کە لەو کاتە گەورەترین کێڵگەی کشتوکاڵی بەرهەم هێنانی کاکاو بوو لە جیهاندا.

لە سالی ١٩٥٩ بوە گینیای ئەسپانی دواوەی دەریاکان، لەدوای سالی ١٩٦٠ هۆزی فانج لەناوچەی (ریومۆنی) جولانەوەی نیشتمانیان ئەنجام دا بە ناوی خاکی دایك دژی ئەسپانیەکان لە دورگەی بیوکۆ لەگەڵ هۆزی یۆبی. لە سالی١٩٦٣ گینیای ئیستوائی توانی مافی ئۆتۆنۆمی وەرگرێت، لە ١٩٦٨/١٠/١٢ سەر بەخۆی لە ئەسپانیا وەرگرت و بوە ماکیاس نجوما)، ئەویش لە هۆزی فانج (بوە یەکەم سەرۆکی ولات . بەلام رامیاریەتی شۆڤێنی و بەرچاو تەنگی نەتەوایەتی بەکار هێنا بەرامبەر هۆزی یۆبی ئەمەش بوەهۆی ئەوەی کە زۆر لە دانیشتوانی ولاتەکە بەجێبێڵن بە هۆی دەسەلاتە دکتاتۆریە بێ وێنەکان تا بوە هۆی داخستنی کەنیسەکان. دوای لە سالی١٩٧٩ لە دەسەلات لادرا دوای لە سێدارە دراو کوری برای جێگەی گرتەوە کە ناوی (میاسۆچۆ بخۆما)بوو. لە سالی ١٩٩٢ هەڵسا بە دامەزراندنی حکومەتی گواستنەوە بەرەو دەسەلاتی فرەلایەنی. بەلام هەر لەسەر رامیاریەتی چەوتی خۆی مایەوە هەتا لە هەڵبژاردنەکانی مانگی/١١/١٩٩٣ دووبارە هەڵبژێردرایەوە سەرەڕای کەمی دەنگدەران، لەسالی ١٩٩٦ هەڵبژێردرایەوەو هەتا لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی یاسا دانان کە لە مانگی/٣/١٩٩٨ ئەمەش نجوما میاسۆجۆ لە سالی ١٩٩٩ تاکو ئێستا دەسەلاتدارە واتە تاکو کۆتایی سالی ٢٠٠٤..

• گینیای ئیستوائی ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفەریقیا، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان.

# گینیا بیساو
## "گینیای پورتوگالی پێشوو"

- ناوی ڕەسمی: گینیا بیساو.
- پاتەختی: بیساو، کە بەندەرێکی سەرەکی وولاتەکەیەو ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۲۸٤ هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ۹٤٦ر۱۳ میل چوار گۆشەو۱۲۰ر۳٦ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۵٦۸ر۱ملیۆن کەسە، بەپێی زاینازی ڕۆژنامەکانی ۲۰۰۰.
- چڕی دانیشتوانی: ۱۱۲ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۸ر۲٪.
- شارە سەرەکیەکانی: مانسوا، ساودۆ مینجۆس.
- زمانەکانی: پورتوگالی(زمانی ڕەسمییە) کریۆلۆ زاراوەی پرتوگالیە ، زمانەکانی ئەفریقی.
- نژادەکانی: زۆربەی دانیشتوانی ئەفریقین، لەگەڵ پێنج کۆمەڵەی نژادی تر وەك (بلنتی لە ناوەڕاست، فولانی لە باکور، مالینکی، یاکۆ لە کەنارەکانی هندییە).
- ئاینەکانی: بڕوای ناوخۆی٦٥٪ ، ئیسلام۳٥٪، مەسیحی٥٪.
- زانینی خوێندن ونوسین: ٥٨٪.
- دابەشی کارگێڕی: ۹ پارێزگای هەرێمیە.
- دراوی: فرنگی سیفا.
- کۆی دەر ئەنجامی ناوخۆی: ۰۰۰ر۲٥۰ر۱ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەر ئەنجامی ناوخۆی: ۲۰۰ر۱ دۆلار.
- بەرگری: ٥ر۲ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر۷٥هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر۱۱٪لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: دارخورما، فولی سودان، گەنم، جۆ، دانەوێڵەی تر، دار، پەمۆ، چەوەندەری شەکر، قاوە، کەکاو، تەڕە، میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ۰۰۰ر٦۷ هەزار سەر، بزن ۰۰۰ر٤۲ هەزار سەر، چێڵ وگامیش ۰۰۰ر۳۲ هەزارسەر، پەرەور۰۰۰ر۸٥۰ هەزار سەر، ماسی.
- پیشەسازی: دروستکردنی شەکر، ئامادەکردنی خۆراك، بیرەو خواردنەوە، پاڵاوتنی نەوت.
- بەرهەمی کارەبا: ٤۸ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: نەوت، غازی سروشتی، فۆسفات، بۆکسیت، کبریت.
- داهاتی دەرەوەی: پێداویستی خۆراك، نەوت، کەلوپەلی سەرمایەداری، کەلوپەلی بەکارهێنان، کەلوپەلی نیوە دروستکراو، جل وبەرگ.
- دەرچوەکانی: خواردنەوە، ماسی، فولی سودانی، فەریکە خورما، گامێش، داری دارستانەکان.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەسپانیا، چین، ئەمەریکا، پرتوگال، سەنیگال، هند، نیجیریا.
- ڕژێمی دەسەڵات: وولاتێکی کۆماریە، ئەنجومەنی یاسادانانی پێك هاتوە لە ۱۰۰ئەندام، سەرۆك دەوڵەتو سەرەك وەزیرانو ئەنجومەنی وەزیرانی هەیە.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی ئەفەریقی لە پێناو سەربەخۆی گینیای پرتوگال و(راس الاخضر). پارتی سوشیالیستی نەتەوەی، پارتی دەست

پێشخەری کۆمەڵایەتی، پارتی چەپی ناوەندی، بزوتنەوەی بافاتای بەرگری.

- جوگرافیای وولاّت: گینیا بسیاو دەکەوێتە کەنارەکانی ئەتلەسی لە ئەفەریقیای ڕۆژئاوا، ئەویش تندس کۆند (یان هۆرەبوان) لە نێوان سەنگال لە باکورو کۆماری گینیا لە ڕۆژهەلاّت و باشور، ئەرخەبیل لە دوورگەی ئەتلەسی (ئەرخەبیل بیجاجۆی) لە سەر دورگەی کەناری.
- مێژووی گینیا بیساو: دۆزینەوەی گینیابیساو لە ساڵی ١٤٤٦ لە لایەن زانای پورتوگالی نۆتۆ تریستاو بوە، دانیشتوانی دوورگەی (راس الآخضر) توانیان بازرگانی بەدەست بهێنن لەودوورگەیەو لە ساڵی ١٨٧٩ پەیوەندی لە نێوان گینیا بیساو (راس الآخضر) پچڕا، لە سەرەتای سەدەی بیستەم پروگالیەکان توانیان هێوری بخەنە نێوان هۆزەکانی دژ بە یەکتری بەلاّم دەسەلاّتی داگیرکەران ڕانەدەوەستان. لە ساڵی ١٩٥٦ پارتی ئەفریقی بۆ سەربەخۆی گینیا بیساو دامەزرا لەگەل (راس الآخضر)، دوای ئەوە شەڕ دەستی پێکرد کە کاریگەری کردە سەر زۆربەی ناوچەکان، لە سەرەتای سالی ١٩٧٤ شۆڕشگێران توانیان زۆربەی خاکی وولات ڕزگار بکەن و حکومەت پێك بێنن بە دمیا دەوڵەت دانی نا بەو دەسەلاّتە. لە ساڵی ١٩٧٤ کودەتای سەربازی لە پورتوگال ئەنجام درا بوە هۆی کردنەوەی دەرگای ئازادی لە گینیا بیساو راس الاخضر، لە مانگی /١٩٧٤/٨ حکومەتی لشبونە توانی ڕێکەوتن لەگەڵ دەسەلاّتدارانی گینا مۆر بکات بەدانی سەربەخۆیی بە گینیا بیساو لە ١٩٧٤/٩/١٠ و ناوی خۆی نا بەناوی گینیا بیساو لویس کابرال پۆستی سەرۆکایەتی سەرۆك کۆماری وەرگرت.

لە مانگی /١٩٨٠/١١ سەرۆك وەزیران توانی کودەتایەك ئەنجام بدات و سەرۆك کابرال لەدەسەلاّت لابەرێت و سەرۆك وەزیران برناردۆ فیرا سەرۆکایەتی ئەنجومەنی شۆڕشگێری بکات لەگەڵ دەسەلاّتی حوکمڕانی. لە کۆنگرەی ناکاوی پارتی دەسەلاّتدار لە مانگی /١٩٩١/١ بڕیاری ڕژێمی فرە پارتایەتی دا. لە هەڵبژاردنەکانی فرەلایەنی لە مانگی/١٩٩٤/٧ پارتی دەسەلاّتدار توانی ٦٤ کورسی بەدەست بێنێ بەلاّم لە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار لەهەمان کاتا برناردۆ فیرانە توانی دەنگی تەواو بێنێ لەخولی یەکەم بەلام لە خولی دووەم توانی ٥٢٪ بەدەست بێنێ ، لەمانگی /١٩٩٨/٦ یاخوبوون لەناو سوپا ئەنجام دراو بوە هۆی بەرپابوونی شەڕی ناوخۆیی و سەنگال یارمەتی دەسەلاتی فیرای داو دوای بە هەرەس هێنانی ڕێکەوتنەکەی ئاشتی مانگی/١٩٩٨/١١، هێزی جەنگاوەر توانیان فیرا لە دەسەلات دەرکەن لە مانگی /١٩٩٩/٥، کە بکال سنما دەسەلاّتی سەرۆك کۆماری وەرگرێت تاکوتایی ٢٠٠٤ لەدەسەلاّت مابوەوە..

- گینیا بیساو ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا.

# گــــينيـــا

## "گينياى فەرەنسى پێشوو"

• ناوى ڕەسمى: كۆمارى گينيا.
• پايتــەختى: كۆنــاكرى، ژمــارەى دانيــشتوانى ٠٠٠ر٦٧٤ر١ مليــۆن كەســە لــە هــەمان كــات بەندەرێكى سەرەكيە.
• ڕووبــــەرى: ٩٢٧ر٩٤ ميــــل چوارگۆشـــــەو ٨٦٠ر٢٤٥ كيلۆمەتر چوارگۆشەيە.
• ژمــارەى دانيــشتوانى: ٠٠٠ر٤٦٥ر٨ مليــۆن كەسە، بەپێى ئامارى ١٩٩٩.
• چــڕى دانيــشتوانى: ٨٩ كــەس لەيــەك ميــل چوارگۆشەدا.
• بوژانەوەى دانيشتوانى: ٦ر٢٪.
• شارە سەرەكيەكانى: كان كان، نزيرى كوريە، لابيە.
• نژادەكانى: سوسو، ماليكنى، بول، ٢١ نژادى جۆراو جۆرى ترى تيايە.
• زمانەكانى: فەرەنسى (زمانى ڕەسميە) بولى، ماليكنى، سوسى.
• ئاينەكانى: ئيسلام ٩٠٪، بـرواى نـاوخۆيى و مەسيحى ١٠٪.
• زانينى خوێندن و نوسين: ٤٠٪.
• دابەشى كارگێرى: ٣٣ هەرێمى كارگێريە.
• دراوى: مزنگى گينى.
• كــۆى دەرئــەنجامى نــاوخۆيى: ٥٠٠ر٨ مليــار دۆلار.
• بەشــى تــاك لــەكۆى دەرئــەنجامى نــاوخۆيى: ٢٥٠ر١ دۆلار.
• بەرگرى: ٥ر٦٪ لەكۆى دەرئەنجامى ناوخۆيى.
• سوپاكەى: ٥٠٠ر٦٧ هەزار كەسە.
• زەوى كشتوكاڵى: ٣ر٦٪ لەخاكى وولاتەكە.
• بەرهەمى كشتوكاڵى: گەنم، جۆ، نۆك و نيسك، برنج، مۆز، ئەناناس، قاوە، خورما، نسكافە، تەرە، ميوەجات چەوەندەرى شەكر.
• سامانى ئاژەڵى: مەڕ ٠٠٠ر٦٨٣ هــەزار ســەر، بزن ٠٠٠ر٨٥٠ هەزار سەر، چێڵ ٣٥٠ر٢ مليۆن سەر، پەرەور ٨٠٠ر٨ مليۆن سەر.
• پيشەسازى: ئەلەمنيۆم، دروستكردنى كەلوپەلى سوك، بۆكسيت، ئەلماس، وزەى كارەبا.
• بەرهــــەمى كارەبــا: ٥٦٠ مليــۆن كيلــۆوات كاتژمێر.
• ســامانى سروشــتى: ئاســن، زێــڕ، ئــەلماس، بۆكسيت.
• داهــاتى دەرەوەى: نــەوت و بەرهەمــەكانى، كەلوپــەلى گواســتنەوە، پێداويــستى خــۆراك، ماشێن، بەرهەمى ڕستن و چنين.
• دەرچووەكانى: ئەلماس، ئەناناس، مۆز، قاوە، بۆكسيت.
• هاوبەشەكانى بازرگانى: هۆنك كۆنگ، يابان، چين، ئەمەريكا، فەرەنسا، بەرازيل، بەلجيكا، ئيرلەندا، ئەسپانيا.
• ڕژێمــى دەســەلات: كۆمــارێكى ديموكراتيــە، ئەنجومــەنى وولات هەڵدەبــژێردرێت بــۆ مــاوەى پێــنج ســاڵ كــە پەرلــەمانێكى فــرە لايەنيــە. ســـەرۆك كۆمـــار بـــۆ مـــاوەى پێـــنج ســـاڵ هەڵدەبـژێردرێت و ناتوانـێ لـە دوو جـار زيـاتر خــۆى هەڵبـژێرێتــەوە. ئەنجومــەنى قــەزائى سەربەخۆى تەواوى هەيە.
• پارتــە ڕاميارىــەكان: پــارتى نــوێ كردنــەوەو پێــشكەوتن، پــارتى چــەپى ناوەنــد، پــارتى يــەكێتى و پێشكەوتن، پارتى كۆمەڵەى گينى، پارتى يەكێتى كۆمارى نوێ.

- جوگرافیای وولات: گینیا دەکەوێتە سەر کەناری ئەتلەسی لە ڕۆژئاوای ئەفریقیا، گینیا بیساو سەنگال و مالی لە باکوری، کوت دیفوار لە ڕۆژهەلاتی، لیبیر لە باشوری. خاکی گینیا بە پژێنێکی کەناری تەنگ دەست پێ دەکات بۆ ناوچەی چیایی لە ناوەڕاست کە سەرچاوەکانی زێی گامبیاو سەنگالو تیری تیایە لە باشوری ڕۆژهەلاتی دارستانێکی چڕی بەسودی تیایە
- مێژووی ولات: خێڵی سوس کە دەگەڕێتەوە سەر ڕەچەلەکی هۆزی مالبتسك لە بکوری ڕۆژهەلات کۆچیان کرد بەرەو گینیا لەدوای سالی ٩٠٠ زاینی. لەسەدەی سیانزەهەم شانشینی سوس دامەزرا لە کەنارەکە کە لەوکات باکوری ڕۆژهەلاتی گینیا بەشێك بوو لە ئیمپراتۆریەتی مالی ئیسلامی، لە ناوەڕاستی سەدەی پانزەم بازرگانە پورتوگالیەکان سەردانی ناوچە کەنارەکەیان کرد. لە سالی ١٨٤٩ لەسەر لێواری زێی نۆنیز فەڕەنسیەکان ناوچەیەکی پارێزراویان دامەزراند. لە سالی ١٨٩٠ ژێر دەستەیەکیان لەسەر زێ یەکانی باشور دامەزراند. لە سالی ١٨٩٥ دوبارە ناوی ناوچەکەیان گۆڕی بۆ گینیای فەڕەنسی و بوە بەشێك لە ئەفریقیای ڕۆژئاوای فەڕەنسی، لە سالی ١٩٤٦ گینیای فەڕەنسی بوە بەشێکی لکاو بە خاکی فەڕەنسای دواوەی دەریاکان. لە ١٩٥٨/١٠/٢ گینیا سەربەخۆی تەواوی وەرگرت لە ئەنجامی ڕاپرسی گەلی گینیا بە جیابوونەوەیان لە فەڕەنساو سیکتۆ بوە سەرۆك کۆماری ولاتەکە کە بەرەو یەکەم دەولەتی مارکسی هەنگاوی نا لەئەفریقیاو دەولەتی یەك پارتی ڕاگەیاند، لە شەستەکان و حەفتاکان ئابوری وولات بەرەو تەنگەژەیەکی خراپ ڕۆیشت کە بوە هۆی ئەوەی کە زیاتر لەسەد هەزار کەس لەو وولات دەرچێت، لە سالی ١٩٦٥ پەیوەندی دیبلۆماسی لەگەل فەڕەنسا ڕاگرت وڕووی کردە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو پەیوەندی دیبلۆماسی کردەوە کە بوە سەرچاوەی یارمەتیەکانی گینیا لە بوارەکانی ئابووری وڕۆشنبیری و هونەری. لە سالی ١٩٧٤ دووبارە توری بە سەرۆك کۆمار هەلبژێردرا بۆ ماوەی حەوت سال. دووبارە لە سالی ١٩٨١ هەلبژێردراوە ، لە سالی ١٩٨٤ سیکتۆری لە ئەمەریکا کۆچی دوایی کرد لەدوای حوکمڕانی ٢٦ سال لە سەر وولاتی گینیا، لەدوای ئەوە لە ڕێگەی کودەتایەکی ئاشتیانە عەقید لانسال کۆنتیە دەسەلاتی وەرگرت و بەندە ڕامیاریەکانی ئازاد کردو چەند چاکسازی ئابووری ئەنجامدا. بەلام تراوری دۆستی کونتیە لە کودەتایەکی سەربازی دەسەلاتی گرتە دەستو کونتیە بوە وەزیری کشتوکالی. لە ئەنجامی کێشەو ململانێ و خۆپیشاندان و ئاژاوە حکومەت ناچار بوو دەستوری نوێ ڕاگەیەنێ بە حوکمی فرەلایەنی دیموکراتی. لە هەلبژاردنەکانی مانگی/١٢/١٩٩١ پارتی یەکێتی و پێشکەوتن ٥١٪ دەنگی بەدەست هێنا بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری، کونتیە سەرکەوت بە سەرۆك کۆمار هەرچەندە هەلبژاردنەکە بە ناڕاست درا قەلەم. لە سالی ١٩٩٦ کودەتایەك ئەنجام درا بەلام لەلایەن کونتیە لەناوبراو لە هەلبژاردنی مانگی /١٢/١٩٩٨ دووبارە بە سەرۆك وولات هەلبژێردراوە وتاکو ئێستاش لەدەسەلات بەردەوامە واتە تا کۆتایی ٢٠٠٤.
- گینیا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا.

# سیرالیۆن

- ناوی ڕەسمی: کۆماری سیرالیۆن.
- پایتەختی: فری تاون ، ژمارەی دانیشتوانی ۷۳۵ر۰۰۰ هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ۲۷ر٦٦۹ میل چوارگۆشەو ۷۱ر۷٤۰ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٥ر۸٦٤ر۰۰۰ ملیۆن کەسە، بەپێی زانیاریەکانی ۲۰۰۰.
- چڕی دانیشتوانی: ۲۱۱ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۲ر۷٪.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: فری تاون، برنزی.
- نژادەکانی: تمنی ۳۷٪، مندی ۳٥٪، خێڵەکانی تر ۲۸٪.
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی ڕەسمیە) مەندی، تمنی، کریۆ.
- ئاینەکانی: ئیسلام ٦۰٪، مەسیحی ۱۰٪، بیرو ڕای تری ناوخۆیی ۳۰٪.
- زانینی خوێندن و نوسین: ۳٦٪.
- دابەشی کارگێڕی: دوو پارێزگایە لەگەڵ هەرێمێك.
- دراوی: لیۆن.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۲ر۷۰۰ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٦٥۰ دۆلار.
- بەرگری: ۷٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۳٥ر۷۰۰ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ۷ر۲٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم و جۆ، دارخورما، برنج، قاوە، کاکاو، تەرە، میوەجات، چەوەندەری شەکر، توتن.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ۳٦٥ر۰۰۰ هەزار سەر، بزن ۲۱۷ر۰۰۰ هەزار سەر، چێڵ ٤٥۰ر۰۰۰ هەزار سەر، پەرەوەر ٤ر۷۰۰ هەزار سەر.
- پیشەسازی: مەنجەم، خواردنەوە، جگەرە،ڕستن و چنین، پێڵاو.
- بەرهەمی کارەبا: ۲٥۰ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: ئاسن، ئەڵماس، بۆکسیت، تیتنیۆم.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی سەرمایەداری، سوتەمەنی، کەلوپەلی خۆراك، پێداویستی داو دەرمان.
- دەرچوەکانی: کاکاو، قاوە، ئەڵماس، ئاسن، بۆکسیت، جگەرە.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، ئەورووپای ڕۆژئاوا، بەریتانیا، چینی میللی.
- ڕژێمی دەسەڵات: وولاتێکی کۆماریە لە ساڵی ۱۹۹۸، لەوکاتەی کە ئەحمەد کویە دەسەڵاتی وەرگرت لە دوای لەناوبردنی گروپی سەربازی کە دەسەڵاتداریەتی وولاتیان دەرکرد.
- جوگرافیای وولات: سیرالیۆن دەکەوێتە سەر کەناری ڕۆژئاوای ئەفریقیا کە درێژبۆتەوە لەسەر زەریای ئەتڵەسی. کۆماری گینیا لە باکورو ڕۆژهەڵاتی، کۆماری لیبیریا لە باشوری، ڕووی خاکی سیرالیۆن بڵندو نەویە کە درێژی ۲۱۰ میل دەبێت، لە زەلکاوەکانی داری مانجووفی هەیە، لەدوای کەنارەکانی گردەکانی دارستانە ئەو گردۆلکانەش بەرزدەبێتەوە تاکو دەبێتە تەپۆلکە لە ناوەوەی وولاتەکە، لە ڕۆژهەڵاتی چیایە، زێیە سەرەکیەکانی زێی سکارسیزۆ، ڕۆکال، جۆنگ، سیوا.
- مێژووی ولات: دانیشتوانی بنەڕەتی سیرالیۆن

خێڵەکانی تمنی بوە لەوکاتەی پورتوگالیەکان لە ساڵی ١٤٦٠ سەردانی ئەو ناوچەیەیان کرد. لەسەدەی شانزەم بەریتانیەکان سەردانی ئەو ناوچەیان کردوە. ئەوروپیەکان (کۆیلە)کانیان دەبردە ئەمەریکا تا ئەوکاتەی بەریتانیا ڕژێمی کۆیلەیان هەڵوەشاندەوە. لە ساڵی ١٧٨٧ گرانفیل شاریی ئینگلیزی زیاتر لە ٤٠٠ کۆیلەی بردە ئەمەریکای ئازاد بەناوی کۆیلە ئازادکراوەکانی ئەمەریکا کە ئێستا ناسراوە بە شاری (فری تاون) (شاری ئازاد، یان شاری ئازادکراوەکان) ، دوایی ناوچەی کە نارەکە بوە جێنشینی پێست ڕەشەکان کە لەهێزی سەربازی بەریتانیا ئازاد کرابون، لە ساڵی ١٨٠٨ بەریتانیا ڕایگەیاند کە سیرالیۆن ژێر دەستەیەکی خۆیەتی و لە ساڵی ١٨٩٦ بوە ناوچەیەکی پارێزراوی بەریتانیا، لە٢٧/٤/ ١٩٦١ سیرالیۆن سەبەخۆی وەرگرت‌و بوە خاوەن دەستورو پەرلەمان لەناو کۆمەنولسی بەریتانیا لە ژێرسایەی تاجی بەریتانی. لەدوای هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٦٧ دادوەری گشتی بەریتانی هەڵسا بە دامەزراندنی سەرۆکی پارتی کۆنگرەی هەموو گەل (ستیفنن) بە سەرۆك وەزیران، دوای سەربازەکان دەسەڵاتیان وەرگرت بە هۆی کودەتایەکی سەربازی، لە ساڵی ١٩٦٨ دەسەڵاتی مەدەنی گەڕاوە و سەربازەکانیان خستە بەندیخانە. لە ساڵی ١٩٧١ کۆماری سیرالیۆن ڕاگەیاندرا لەلایەن ستیفنز و لە بەریتانیا دەرچوو بوە یەکەم سەرۆك کۆماری سیرالیۆن. لە ڕاپرسی ساڵی ١٩٧١ وولات ڕازی بوو لەسەر ئەوەی کە یەك پارت دەسەڵاتی هەبێت، لەدوای هەڵبژاردنی لیواد سیدۆ بە سەرەك کۆمار لە ساڵی ١٩٨٥ سیرالیۆن ئارامی رامیاری بەخۆوە دیت. لە ساڵی ١٩٩٢ تاکو ساڵی ١٩٩٨ وولاتی سیرالیۆن چەندین گوڕانکاری دەسەڵاتی بەخۆوە دیت لە دەسەڵاتی سەربازی بۆ مەدەنی بە پێچەوانەوە تا ئەوکاتەی ئەحمەد تیچیان کۆیە بوە سەرۆك کۆمار، لە ساڵی ١٩٩٩ ئەحمەد کۆیە لەگەل بەرەی شۆڕشگێری یەککرتوو ڕێکەوتن لەسەر دابەش کردنی دەسەڵات‌و تاکو کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤ لەدەسەڵات بەردەوام بوو.

- سیرالیۆن ئەندامە لە نەتەوە یەککرتوەکان، ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا.

# کوت دیڤوار

- ناوی ڕەسمی: ساحل العاج.
- پایتەختی: ئەبیدجان، کە پایتەختی کرداریە ژمارەی دانیشتوانی ٣٫١٨٦٫٠٠٠ ملیۆن کەسە) بەڵام پایتەختی ڕەسمی (یامۆسۆکرۆ)ە.
- ڕووبەری: ١٢٤٫٥٠٠ میل چوارگۆشەو ٣٢٢٫٤٦٢ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی ردانیشتوانی: ١٦٫٨٦٠٫٠٠٠ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- چڕی دانیشتوانی: ١٣٥٤ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢٫٨٪.
- شارە سەرەکیەکانی: ئەبیدجان، دالوا، بدرۆ، بواکیە.
- بەندەرە گرنگەکانی: ئەبیدجان، سان بدرۆ.
- زمانەکانی: فەرەنسی (زمانی ڕەسمییە) زمانی تری نیشتیمانی، بەناوبانگترینیان زاراوەی دیولایە.
- نژادەکانی: زیاتر لە ٦٠ کۆمەڵەی جیا جیایە. کۆمەڵە سەرەکیەکان، باول، بیت، سنبۆفۆ، مالینکی، ئەجنی، نزیکەی ٨٥ هەزار ئەورووپی تیایە لەگەڵ زیاتر لە ٢٫٣٠٠ ملیۆن ئەفریقی کە لە وڵاتانی دراوسێ بۆی هاتون بەتایبەتی لەوڵاتی (بۆرکینا فاسۆ).
- ئاینەکانی: ئیسلام ٥٥٪، بڕوای ناوخۆیی ٣٠٪، مەسیحی ١٥٪.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٤٨٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٥٠ بەشی جۆراوجۆری دابەشکراوەی کارگێڕیە بەپێی دانیشتوانەکە.
- دراوی: فرنکی سیفا.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٢٦٫١٥٠ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١٨٫٥٠٠ دۆلار.
- بەرگری: ٤٫١٠٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٩٠٫٠٠٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٨٫٥٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- سامانی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، دانەوێڵەی تر، قاوە، داری بەر، پەتاتە، کاکاو، چەوەندەری شەکر، تەرە، میوەجاتو مۆز.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ١٫٤٠٠ ملیۆن سەر، بزن ١٫٠٣٥ ملیۆن سەر، چێڵ ١٫٤٥٠ ملیۆن سەر، بەراز ٢٧٥٫٠٠٠ هەزار سەر، پەلەوەر ٣٥ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: گالیسکە، ڕستن و چنین، ئامادەکردنی خۆراك، بەرهەمی دار.
- بەرهەمی کارەبا: ٢٫١٥٠ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: نەوت، ئەڵماس، موگناتیس، بۆکسیت، کبریت، نوحاس، ئاسن، کیمیا.
- سەرخۆشکەرەکانی قەدەغەکراو: قنبی هیندی لێ دەچێنرێت و زۆربەی لەناوخۆ بەکار دەهێنرێت، بازرگانی نێودەوڵەتی پێوە دەکرێ، خاڵێکی پەڕینەوەی گرنگە لە باشوری ڕۆژئاوای ئاسیا بەرەو ئەورووپا.
- داهاتی دەرەوەی: سوتەمەنی، کەلوپەلی بەکارهێنان، کەلوپەلی سەرمایەداری، پێداویستی خۆراك.
- دەرچووەکانی: نەوت، مۆز، ئەناناس، ڕۆنی دارە بەردارەکان، کاکاو، قاوە، داری کەمەرەیی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چین، نێجیریا، هۆڵەندا، بەلجیکا، ئەڵمانیا، فەرەنسا،

ئەسپانیا، ئەمەریکا.

- رژێمی دەسەڵات: کۆماریە، سەرۆک کۆمار هەڵدەبژێردرێت لەرێگەی پێشنیاری میللی هەر پێنج ساڵ جارێک، ئەنجومەنی ئومە پێک هاتوە لە ١٧٥ ئەندام کە بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێت.
- پارتە رامیاریەکان: کۆبونەی کۆماریەکان، پارتی بەرەی میللی عاجیە، پارتی چەپی ناوەندی، پارتی ساحل عاجی دیموکراتی، پارتی نەتەوەی لایەنگیری ئابووری ئازادەکان.
- جوگرافیای وولات: کوت دیفوار کە (بە ساحل العاج ناسراوە) دەکەوێتە سەر کەناری باکوری کەنداوی گینیا لە رۆژئاوای ئەفریقیا. لیبیریا و گینیا دەکەوێتە رۆژئاوای. مالی و بۆرکینافاسۆ دەکەوێتە باکوری. گانا دەکەوێتە رۆژهەلاتی. کوت دیفوار لە مێژووی کون ناسراو بوە بە کۆمارێکی ئاسودەی لە بژێوی ژیان و پەرەسەندن و پێشکەوتن. ساحل عاج پێک هاتوە لە زنجیرە کەنارێک لە باشوری. لە ناوەوەی دارستانێکی چری تیایە، رووەک و گژو گیای سافانا لە باکوری. کەنالی فریدس و سدکوسو. چیاکانی تورا. چیاکانی دەکەوێتە باکوری رۆژئاوای وولاتەکە.
- مێژووی ساحل العاج: کوت دیفوار سەرنج راکێشەری بازرگانەکانی فەرەنسی و پرتوگالیەکان بوە لەسەدەی پانزەم، بازرگانە فەرەنسیەکان چەندین دەزگای بازرگانیان لێ دامەزراند لە سەدەی نۆزدەم. فەرەنسیەکان توانیان زەوی زۆر بکرن و بیکەنە مولکی خۆیان، لە ساڵی ١٨٤٢ فەرەنسیەکان توانیان رۆڵی خۆیان ببینن لەپەرە پێبدان لەکەنارەکانی ناوخۆی. لە دوای جەنگی دووەمی جیهان مافی ئۆتۆنۆمی وەرگرت لەناو یەکێتی فەرەنسا. لە ١٩٦٠/٨/٧ سەربەخۆیی وەرگرت و توانی یەکێتی گومرگی لە داهۆمی (بنینی ئێستا) مۆر بکات، هەروەها لەگەڵ نێجیرو بۆرکینافاسۆ. یەکەم سەرۆک کۆماری (فیەبوانیە) بوو کە لە کاسۆلیکی رۆمانی بوو کە. بریاریدا بە دامەزراندنی گەورەترین کەنیسەی مەسیحی لە جیهاندا ئەویش (کنیسەی تۆتردام دی لایا)بوو لە پایتەخت. بەهۆی دابەزینی نرخی کاکاو بوە قەرزارترین دەوڵەت بەپێی ژمارەی دانیشتوانی لەسەر هەموو کێشوەری ئەفریقیا و بوە هۆی ئەوەی کە نارەزایی گەلانی وولاتەکەو سەرۆک کۆمار ناچاربوو ماوە بە پارتە بەرهەڵستکارەکان بدات و هەڵبژاردن ئەنجام بدا لە مانگی/١٠/١٩٩٠ و بونیە بۆ جاری حەوتەم بەسەرۆک کۆمار هەلبژێردرێتەوە. لەهەمان ساڵ بۆ یەکەم جار هەڵبژاردنی فرە پارتی ئەنجام درا بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی یاسادانان و پارتی سەرۆک کۆمار سەرکەوتنی بەدەست هێنا ئەویش (پارتی دیموکراتی) بە زۆرینەی کورسیەکان. لە مانگی /١٢/١٩٩٣ بۆنیەی سەرۆک کۆمار کۆچی دوایی کرد و هینەدی برییە جێگەی گرتەوەو لە مانگی/١٠/١٩٩٥ دوبارە هەڵبژاردراوە، لە مانگی /١٠/ ٢٠٠٠ هەڵبژاردراوە بە سەرۆک کۆمارو تا کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤ هەر لە دەسەلات بەردەوام بوو.
- ساحل العاج ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە یەکێتی ئەفریقیا، پایتەختی ئەبیدجان بارەگای یەکێتی پەرلەمانەکانی ئەفریقیایە.

# لیسۆتۆ
## "باسوتۆلاندی پێشوو"

- ناوی ڕەسمی: شانشینی لیسۆتۆ.
- پایتەختی: مازرۆ، ژمارەی دانیشتوانی ٤٨٠ر٠٠٥ هەزار کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: مابۆتسوَل، تیاتیانگ، مافەتنگ، هلۆتسە.
- ڕووبەری: ١١ر٧١٨ میل چوارگۆشەو٣٠ر٣٥٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٢ر٧٢٥ر٠٠٠ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ٢٠٠٠.
- چڕی دانیشتوانی: ٢٣٦ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٠ر١٪.
- نژادەکانی: سۆتۆ ٩٩٪ ئەورووپی ٢٪ ئەسپانی ١٪.
- زمانەکانی: سۆتۆ و ئینگلیزی (هەردوکیان زمانی ڕەسمین).
- ئاینەکانی: مەسیحی ٨٠٪ بڕوای نیشتیمانی ٢٨٪.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٧٥٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٤ پارێزگایە +١٠ گەرەکی کارگێڕی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥ر١٥٠ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٢ر٦٥٠ دۆلار.
- بەرگری: ٤ر٥٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٢٠ر٥٠٠ هەزار کەسە.
- دراوی: مالۆتی (ئۆلۆتی).
- زەوی کشتوکاڵی: ١٠ر٣٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم و جۆ، دەرمزەرد، سورجوم (جۆرێکە لە دانەوێڵەی کەمەرەی و بۆ ئالیکی ئاژەڵ بەکار دێت) فاسولیا، تەڕە، میوەجات، چەوەندەری شەکر.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ١ر٣٠٠ ملیۆن سەر، بزن ٧٥٠ر٠٠٠ هەزار سەر، چێڵ ٩٠٠ر٠٠٠ هەزار سەر، پەرەور ١ر٨٥٠ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: ئەڵماس.
- پیشەسازی: ڕستن و چنین، ئامادەکردنی خۆراك، خوشکردنی پێست.
- بەرهەمی کارەبا: ٨٦٥ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: پێداویستی خۆراك، کەلوپەلی بیناسازی، جل و بەرگ، دانەوێڵە، داو دەرمان، لۆری و ماشێن.
- دەرچووەکانی: دانەوێڵە، فاسولیا، پێست، ئاژەڵی زیندو، خوری، چەندین شتی تری جۆراوجۆر.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یەکێتی ئەورووپا، باشوری ئەفریقیا، ئەمەریکای باکور و باشور، ئاسیا، چین، یابان.
- ڕژێمی دەسەڵات: شانشینی دەستوریە دەسەڵات بەدەست سەرۆك وەزیرانە، شانشین سەرۆك دەوڵەتەو سەرچاوەی کاروباری وڵاتەکەیە.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی کۆنگرەی باسۆتۆ کە ئەویش پارتی سەرەکیە، چەندین بیرو بۆچوونی جۆراو جۆری تری ڕامیاری و

ئابووری و دیموکراتی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی تیایە.

- جوگرافیای وولات: لیسۆتۆ دەکەوێتە ئەفریقیای باشور. وولاتێکی ناوخۆییەو کۆماری باشوری ئەفریقیا دەوری سنورەکەی لە هەموو لایەکی داوە. ڕووبەرەکەی پێك هاتوە لە بەشێك لە تەپۆلکەی باشوری ئەفریقیای مەزن. لە ڕۆژهەلات و لە باکوری زنجیرە چیای دراکسبیرگە. زێیە سەرەکیەکەی زێی ئورانگ و لقەکانییەتی.
- مێژووی ولات: لیسۆتۆ جێگەی خۆشاردنەوەی مرۆڤە هەلاتوەکانی شەڕی نێوان هۆزەکانی ئەفریقیای باشور بوە لەماوەی سەدەی شانزەم تاکو سەدەی نۆزدەم. لە سالی ۱۸۸۸ سەرۆك هۆزی موسوشۆی یەکەم هەڵسا بە ڕێکخستنی هۆزەکانی سۆتۆو سەرکردایەتی کردنی لە شەڕەکانی دژ بەجوو بو کە لە ڕەچەلەکدا دەگەڕانەوە سەر هۆڵەندیەکان کە بەرەو وولاتەکە هاتبوون بۆ نیشتەجێ بونیان لە لیسۆتۆو لەوکاتە ناوی دورگەکە باسوتولاند بوو لە ژێر پارێزگاری بەریتانیا، لە سالی ۱۸٦۸ لەسەر داوای دەسەلاتدارەکەی مۆسۆشۆ بۆ پارێزگاری لێکردنی لەدژی دوژمنەکانی. لەسالی ۱۸۷۱ لیسۆتۆ لکێنرا بە ژێر دەستەی (کاب) بەلام دوایی ڕاستەوخۆ گەڕاوە ژێر دەسەلاتی تاجی بەریتانی لە سالی ۱۸۸٤. لە٤/۱۰/۱۹٦٦ ژێر دەستەی باسوتولاند بوە دەولەتێکی لیسۆتۆی سەربەخۆ، لە سالی ۱۹۸٥ کۆماری باشوری ئەفریقیا گەمارۆی خستە سەر بەهۆی یارمەتی دانی شۆڕشگێرەکانی دژ بە حکومەتی باشوری ئەفریقیا، ئەم گەمارۆ ئابوریە بوە هۆی بەرپابوونی کودەتای سەربازی و بوە هۆی دەرکردنی شۆڕشگێرەکان،دەسەلاتدارانی ئەم وولاتە تا کۆتایی سالی ۲۰۰٤ بەردەوام بوونە لەبەرەو پێش بردنی باری ئابوری ولاتەکەو بژێوەی ژیانی گەلانی کۆمەڵگاکەیان..
- لیسۆتۆ ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە چەندین ڕێکخراوی تر وەك خەزنەی نێو دەولەتی و ڕێکخراوی خۆراك و کشتوکالی و بانکی نێو دەولەتی .

# مۆریتانیا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری مۆریتانیای ئیسلامی.
- پایتەختی: نواکشوت، ژمارەی دانیشتوانی ۸٦۰ر۰۰۰ هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ۳۹٥ر۹٥۳ میل چوارگۆشەو ۱ر۰۲٥ر۲۲۰ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۳ر۲۷۰ر۰۰۰ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری بلاوکراوەی لەرۆژنامەکانی۲۰۰۱.
- چڕی دانیشتوانی: ۸ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر۱٪.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: نواد هیبۆ، نواکشوت.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٤۳٪.
- نەژادەکانی: عەرەب ۸۰٪، پێست ڕەشی ئەفریقی ۲۰٪.
- زمانەکانی: عەرەبی (زمانی ڕەسمیە) فەڕەنسی، زمانی تری ناوخۆیی.
- ئاینەکانی:ئیسلام.
- دابەشی کارگێری: ۱۲ هەرێمە+ گەڕەکی پایتەخت.

• دراوی: ئۆجویا.
• کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ۲۰۰ر٤ ملیـار دۆلار.
• بەشـی تـاك لـەکۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ۹۰۰ر۱ دۆلار.
• بەرگری: ۳ر۵٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
• سوپاکەی: ۷۵۰ر٦٦ هەزار کەسە.
• زەوی کشتوکاڵی: ۸ر۳۵٪ لەخاکی وولاتەکە.
• سامانی ئاژەڵی: مەڕ ۲۳۸ر٦ ملیۆن سەر، بزن ۵۰۰ر٤ ملیـۆن سـەر، چێڵ و گـامێش ٦٤٠ر۱ ملیۆن سەر، پەرەور ۰ ٤۸ر٤ ملیۆن سەر.
• سامانی کشتوکاڵی:گەنم، جۆ، نیسك، پەمۆ، فەریکـە خورمـا، پەتاتـە، چـەوەندەری شـەکر، تەرە، میوەجات.
• پیشەسازی: دەرهێنـانی ئاسـن، ئامـادەکردنی ماسـی، دروسـتکردنی شـەکر، خۆشـکردنی پێست،ئامادەکردنی گۆشت.
• بەرهەمی کارەبا: ۳۵۰ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
• سامانی سروشتی: گەچ، ئاسنی خاو.
• داهـــاتی دەرەوەی: نـــەوت، کەلویـــەلی سەرمایەداری، پێداویستی خۆراك.
• دەرچووەکانی: ئاسنی خاو، بۆیە، گەچ، ماسی ئامــادەکراو ، پێـستی خۆشـکراو، ئـاژەڵی زیندوو.
• هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چین، یـەکێتی ئـەوروپا، جـەزائیر، ئەمـەریکا، بـەریتانیا، کـوت دیفوار.
• ڕژێمــی دەســەڵات: کۆمــارێکی ئیــسلامیە، دەسەڵاتی یاسادانانی پێك هاتوە لە ئەنجومەنی پیران و ئەنجومـەنی نیشتیمانی، لـە دەستوری مۆریتانیـا مۆڵـەتی ڕۆژنامەنوسـی و بـیروڕای کۆمەڵـیی هەیە بۆ هـەموو هاووڵاتیـان و پارتـە ڕامیاریەکانو بەکاری خۆیان هەڵدەستن.
• پارتە ڕامیاریەکان: پارتی کۆبوونـەوە لـە پێنـاو دیموکراتی و یـەکێتی نیشتیمانی، پارتی نوێ کردنەوەی مۆریتانیا، پارتی ئوسولی ئیسلامی، پـارتی ئومـە، پـارتی کۆمـاری دیمـوکراتی کۆمەلایـەتی، پارتی چەپی ناوەندی، چەندین بیرو بۆچوونی تـری ڕامیـاری و کۆمەلایـەتی و نیشتیمانی و ئابووری و دیموکراتی.
• جوگرافیای وولات: مۆریتانیا دەکەوێتە باکوری ڕۆژئـاوای ئـەفریقیا، کەنارەکـەی درێژدەبێتـەوە بـە درێـژایی ۵۹۲ کیلۆمـەتر لەسـەر دەریـای ئەتڵەسـی، ولاتـی مـەغرب دەکەوێتـە بـاکوری، مالی و جەزائیر دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی، سەنیگال دەکەوێتـە باشـوری. مۆریتانیـا زۆربـەی زۆری بیابانـە تـەنیا کەنـدو دۆڵـەکانی زێـی سـەنیگال نـەبێت ئـەویش دەشـتایەکی پـان و بـەرینی بەپیت و بەرەکەتە لە بوارەکانی کشتوکاڵ. لە ناوەراسـت دەشـتایەکی لمـی و داری لێیـە. لـە بـاکوری وشـکانیەو درێـژ دەبێتـەوە بۆ بیابـانی گەورە.
• مێـژووی ولات: عەرەبـە بەربـەرەکان توانیـان لـە ساڵی ۲۰۰ زاینی بیکەنە نیشتەجێی خۆیان لە هەندێ بەشی وولاتەکەو چەندین تۆڕی دیکـەی بازرگانیان لێ دروستکرد تاکو سەدەی شانزەم بەردەوام بوو. بەلام چەند بەشێکی لە باشوری کـەوتبوە ژێـر دەسـەلاتی ئیمپراتۆریـەتی گانـاو مالیو سەنیگال لەگەڵ ئەوەشدا ئاینی ئیسلام لەســەدەی ســیانزەم گەیــشتە مۆریتانیــا و دەوروبەری، لەنێوان سەدەی هـەژدەم و نۆزدەم پەیوەنـدی ئـەو ناوچـەیە بـەهێزتر بـوو لەگـەڵ وولاتانی ئەوروپا بەهۆی دۆزینەوەی هەرێمەکە لەلایـەن پورتوگالیـەکان بـۆ یەکـەم جـار و دوای ئـەوانیش فەرەنسیەکان، لـە سـاڵی ۱۹۰۳ بـوە ناوچــەیەکی پــارێزراوی فەرەنــسی. دوای فەرەنسیەکان مۆریتانیای جێهێشت، مۆریتانیا لە ۱۹٦۰/۱۱/۲۸ سەربەخۆیی تەواوی وەرگرت، سـەرەڕای بەرهەڵـستکاری لەلایـەن وولاتـانی ڕۆژئـاوا بـەلام مۆریتانیـا لـە سـاڵی ۱۹٦۱ بـوە

ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان، وولاتانی ڕۆژئاوا تاکو ساڵی ١٩٧٠ دانیان بە مۆریتانیا نەنابوو. بەهۆی کێشەو ململانێ ی نێوان مەراکشییەکان و عەرەبە بەربەرەکان و زنجییەکان، حکومەتی مۆریتانیا لەدوای شەستەکان ڕۆشنبیری عەرەبی کردە ڕۆشنبیری سەرەکی بۆ ئەوەی یەکێتی مۆریتانیا بپارێزێت. بەلام کۆمەڵەی پۆلیساریۆ کە دانیشتوانی زۆربەی بیابانی گەورە بوونو توشی شەرکردن هاتن لەگەڵ بەرەی پۆلیساریۆ، مەغرب و فەرەنسا یارمەتی مۆریتانیای دەدا تابوە هۆی ڕوخانی دەسەلاتی ولدادە لە ساڵی ١٩٧٥ و پیاوانی سەربازی دەسەلاتیان وەرگرت. لە ساڵی ١٩٨٠ مۆریتانیاو بەرەی پۆلیساریۆ پەیمانی ئاشتیان مۆر کرد و وازی لە بیابانی ڕۆژئاوا هێناو پەیوەندی دیبلوماسی لەگەڵ جەزائیر نوێ کردەوە. لە ساڵی ١٩٨٩ توشی شەڕی سنوری بوون لەگەڵ سەنیگال.

لە مانگی/٤/١٩٩١ حکومەتی مۆریتانیا ڕایگەیاند بە گواستنەوەی حکومەتی تاکڕەو بۆ ڕژێمی فرە پارتی لەمانگی پێنجی هەمان ساڵ گەل لە ڕاپرسێك بڕیاری چاکسازی گشتی دەستوری دا.

- مۆریتانیا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە زانکۆی وولاتانی عەرەبی، ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە ڕێکخراوی خۆراکی کشتوکاڵی و بەنکی دووەلی و خەزنەی دراوی دوەلی و ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی و ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی.

# مۆریشیۆس

- ناوی ڕەسمی: کۆماری مۆریشیۆس.
- پایتەختی: مۆرت لیۆس، ژمارەی دانیشتوانی ١٦٥ر٠٠٠هەزار کەسە لەهەمان کاتا بەندەرێکی سەرەکی وولاتەکەیە.
- ڕووبەری: ٧١٨ میل چوارگۆشەو ١ر٨٦٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ١ر٥٣٥ر٠٠٠ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- چڕی دانیشتوانی: ٢١٣٧ کەس لە یەك میل چوارگۆشەدا.
- بووژانەوەی دانیشتوانی: ١ر٣٪.
- نژادەکانی: هندە موریتانیەکان ٦٨٪ ، کریۆل ٢٨٪، ئەوی تریش ئەوروپی و ئەفریقی، چینی.
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی ڕەسمیە)، فەرنسی، کریۆلی، هندی.
- ئایینەکانی: هندۆسی ٥٢٪، مەسیحی ٢٨٪، ئیسلام ١٧٪.
- زانینی خوێندن ونوسین: ٨٥٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٩ گەڕەك، لەگەڵ ٣ دەڤەری بچوك.
- دراوی: ڕوپیە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ١١ر٨٠٠ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ١٠ر٥٠٠دۆلار.

- سوپاکەی: ۰۰۰ر۱٥ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥۰٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: چایە، پەتاتە، چەوەندەری شەکر، گەنم وجۆ، دانەوێڵە، گەنمەشامی، تەرە، میوەجات.
- پیشەسازی: گەمشتوگوزار، رستن وچنین، دروستکردنی شەکر،بەرهەمی کیمیای، ئامادەکردنی خۆراك، سامانی ماسی.
- داهاتی دەرەوەی: پێداویستی خۆراك، کەلوپەلی پیشەسازی .
- دەرچوەکانی: شەکر، پیشەسازی سوك، بەرهەمی رستن وچنین.
- بەرهەمی کارەبا: ۳٤۰ر۱ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، وولاتانی یەکێتی ئەوروپا، باشوری ئەفەریقا،یابان، چین.
- رژێمی دەسەلات: وولاتێکی کۆمارییە ، دەسەلاتی یاسا دانانی لەیەك ئەنجومەن پێك هاتوە کە٦۲ ئەندام وهەڵدەبژێردرێت بە پێشنیاری راستەوخۆ.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی راستبونەوەی خەبات، پارتی بزوتنەوەی سۆشیالیستی، چەندین پارت وگروپی تری تیایە.
- جوگرافیای وولات: مۆریشیۆس دەکەوێتە سەر زەریای هندی بە دووری ٥۰۰ میل لە رۆژهەلاتی دوورگەی مەدەغشقەرو دەکەوێتە رۆژئاوای، رووی وولاتەکە چیای گرکانیە.
- مێژووی ولات: ئەم دورگەیە لە بیر کەس نەبوو لەو کاتەی هۆلەندیەکان لە ساڵی ۱٦۳۸ نیشتەجێی بوون و کشتوکاڵی چەوەندەری شەکریان لێ ئەنجام دەدا، دوای ئەوان فەرنسیەکان لە ساڵی ۱۷۱٥ رووبان تێکردو ناویان نا دورگەی فەرەنسی یەکەمو رێگای دەشتاییان لێ دروستکردو بەندەریان لێی دامەزراندو گرنگیاندا بە کشتوکاڵی چەوەندەری شەکرو پیشەسازی شەکر، دوای ئەوە کردیانە بنکەیەکی سەربازی و کێڵگەیەکی کشتوکاڵی، لەساڵی ۱۸۱۰ بەریتانیا دورگەکەی خستە ژێر دەسەلاتی خۆی، لەدوای بەزینی ناپلیۆن لە ساڵی ۱۸۱٤ دوورگەکەی بە تەواوی بەجێهێشت بۆ بەریتانیا بە پێی پەیمانی پاریس.

لە ۱۹٦۰/۳/۱۲ مۆریشیۆس سەربەخۆی وەرگرت و پارتی کار دەسەلاتداری دەکرد تاکو هەڵبژاردنی ساڵی ۱۹۸۲ کەپارتی بزوتنەوەی مۆریشیۆس سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

لە ناوەڕاستی ساڵی ۱۹۹۰ هەوڵێکی زۆری دا بەراگەیاندنی رژێمی کۆماریو جیابونەوەی لە تاجی بەریتانی بەلام هەوڵەکە نە گەیشتە ئەنجام تا مانگی/۳/۱۹۹۲ بوە وولاتێکی کۆماری لە ۱۹۹۲/٦/۳۰ و ئەنجومەنی یاسادانان سەرەك کۆماری هەڵبژارد، تاکو ئێستا ئەو دوورگەیە رۆژ لەدوای رۆژ پەرە دەسێنێ لە بواری ئابوری. لەساڵی ۱۹۹٥ حکومەت توانی قەرز بداتە جەماوەرەکەی خۆی بەبێ سوود وەرگرتن بۆ بوژانەوەی بازاری ناوخۆیی و بوە هۆی کارێکی سەرکەوتوانە لەبوژانەوەی ئابووری، ئەویش بە بەهێزکردنی کشتوکاڵی چەوەندەری شەکر

- مۆریشیۆس ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە کۆمەنولوسی بەریتانیا، ئەندامە لە رێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا.

# ليبيريا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری لیبریا.
- پایتەختی: مۆنرۆڤیا، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٠٣٦ر١ ملیۆن کەسە.
- ڕووبەری: ٠٠٠ر٤٣ میل چوارگۆشەو ٣٧٠ر١١١ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٦٧٥ر٢ ملیۆن کەسە، بەپێی زانیاریەکانی ساڵی ٢٠٠٠.
- چڕی دانیشتوانی: ٨٥ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢ر٢٪.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: بیبوکتان، گرینفیل.
- نژادەکانی: هۆزەکانی ناوخۆی ٩٣٪، هندی ئەمەریکی، لیبیری ٥٪.
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی ڕەسمیە) زمانەکانی ناوخۆی.
- ئاینەکانی: بڕوایناوخۆی ٧٠٪، ئیسلام ٢٠٪، مەسیحی ١٠٪.
- زانینی خوێندن ونوسین: ٤٣٪.
- دابەشی کارگێڕی: ١٢ پارێزگایە.
- دراوی: دۆلاری لیبیری.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٨٠٠ر٢ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە دەرئەنجامی ناوخۆی: ٢٠٠ر١ دۆلار.
- بەرگری: ٥ر٣٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر٢٥ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر١٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمەکانی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، دانەوێڵەی تر، چەوەندەری شەکر، برنج، کەکاو، قاوە، نسکافە، تەرە، میوەجات، مەتات، دار.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٠٠٠ر٢٥٠هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر٢٤٥ هەزار سەر، چێڵ ٠٠٠ر١٢٥ هەزارسەر، بەراز ٠٠٠ر١٣٨ هەزار سەر، پەرەور١٦٠ر٧ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: مەنجەم، ئامادەکردنی خۆراك، مەتات، کەلوپەلی بیناسازی، شتی تر.
- بەرهەمی کارەبا: ٥١٥ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: زێڕ، ئەڵماس، ئاسن، فۆسفات.
- داهاتی دەرەوەی: ماشێن و کەلوپەلەکەی، بەرهەمی نەوت، کەلوپەلی گواستنەوە، پێداویستی خۆراك.
- دەرچووەکانی: ئاسنی خاو، مەتات، دار، قاوە، کاکاو.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چین، وولاتانی یەکێتی ئەوروپا، ئەمەریکا، هۆڵەندە.
- ڕژێمی دەسەلات: لیبیریا کۆنترین کۆماری ڕەشە لە ئەفەریقیا.
- پارتە ڕامیاریەکان: بزوتنەوەی دیموکراتی لیبیریای یەکگرتوو لە پێناو دیموکراتیەت، پارتی چەپی ناوەند، بەرەی نیشتمانی لیبیریا، پارتی نیشتمانی دیموکراتی لیبیریا، چەندین بیرو بۆچونی تر.
- جوگرافیای وولات: لیبیریا دەکەوێتە سەر زەریای ئەتڵەسی لە بەشی باشووری ئەفریقیای

ڕۆژئاوا، سیرالیۆن دەکەوێتە ڕۆژئاوای، گینیا دەکەوێتە باکوری، کوت دیفوار دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی، ڕایەلەکی کەناریە لەسەر زەریای ئەتلەسی و زۆری زەلکاوە، بەرزدەبێتەوە تاکو چیاو زنجیرە تەپۆلکەکانی لەناوەوەی کە دارستانێکی چڕ دای پۆشیوەو شەش ڕووباری سەرەکی تیایە کە هەموو بەناوخاکی وولاتەکەدا تێ دەپەڕێ بەرەو زەریای ئەتلەسی دەچێتە خوارێ.

- مێژووی ولات: دامەزراندنی لیبیریا لەلایەن کۆمەلەی ئاوەدان کردنەوەی ئەمەریکی بوو لەسالی ١٨٣٢ ئەویش بۆ جێنشین کردنی کۆیلەکانی ئەمەریکی، لە١٨٤٧/٧/٢٦ لیبیریا پێشوازی لە کۆماری سەربەخۆی ئازاد کرد بە دامەزراندنی حکومەت لەسەر شێوازی ئەمەریکی و جۆزیف رۆبرتس هەلبژێردرا بە سەرەك کۆمار کە ئەمەریکی بوو یەکەم سەرەك کۆماری لیبیریاودامودەزگای لەسەر بنەمای نوێ دامەزراندو هەولیدا دانیشتوانە ڕەسەنەکان بەرەو زیادی ببات لەسەر کۆچبەرەکان، لە دوای سالی١٩٢٠ لیبیریا پێشکەوتنی بە خۆوە دیت بەکردنەوەی بەشەکانی ناوخۆی‌و دروستکردنی هێلی شەمەندەفەر لەسەر مۆترۆفیابۆو گردەکانی بۆمبی بە درێژی ٧٠ کیلۆمەتر. لەمانگی /١٩٧١/٧ ویلیام تویمانی سەرەك کۆمار کۆچی دوای کرد کە دەسەلاتداریەکەی لەماوەی خولی شەشەمی دەسەلاتی بوو ، ویلیام تولبرت جێگەی گرتەوە بەلام بەهۆی کودەتای سەربازی لەدەسەلات نەما لەلایەن سمۆل دو لەمانگی/٤/١٩٨٠.

لەمانگی/١٩٨٩/١٢ شۆڕش دەستی پێکرد بەسەرکردایەتی تشارلز مایلۆر کە یاریدەدەری ڕەقیب دوبوو، لە ناوەڕاستی مانگی/١٩٩٠/٧ توانی زۆربەی ناوچەکانی وولات داگیربکات‌و پایتەختیش گەمارۆ بدات.

لە دوای ئەوە هێزەکانی پارێزگاری ئاشتی چووە ناوەوە کە لە پێنج وولاتی ئەفەریقیای ڕۆژئاوا پێك هاتبوو لیبیریایان کرد  بە دوو هەرێم یە کەمیان پایتەخت کە سویری سەرەك کۆمار سەرکردایەتی کرد کە هەموو وولاتانی ئەفەریقیای ڕۆژئاوا پشتگیریان لێ دەکرد، دووەمیان بەسەرکردایەتی تایلۆر کە ٩٠٪ خاکی لیبیریا گرتبوەخۆ، لە مانگی /٣/ ١٩٩١ کۆنگرەی نیشتمانی بەسترا بەلام هەرەسی هێناو دوبارە (شویر) هەلبژێردرایەوە بە سەرەك کۆماری کاتی. لە مانگی/٧/ ١٩٩١ شەڕکەران گەیشتنە ڕێکەوتن بە ڕاگرتنی شەڕو پێك هێنانی حکومەتی کاتی و هەلبژاردنی دیموکراتی بەلام رێکەوتنەکە سەر نەکەوت. لە مانگی/١٩٩٦/٩ (روپ بری) یەکەم ئافرەتی ئەفریقی بوو دەسەلاتی سەرۆکایەتی گرتە دەست کە لەوکاتە وولاتەکە لەو پەڕی ناخۆشی‌و ئالۆزیدابوو بەهۆی شەڕو پێك دادان لە نێوان راوەستان وناراوەستان کە بۆماوەی دوو خوول سەرۆکایەتی گرتە دەست سەرەڕای ئەوە شەڕی ناوخۆ هەر بەردەوام بوو کەئەنجامەکەی زیاتر لە ١٥٠٫٠٠٠ هەزار کەس کوژران . لە ١٩٩٧/٧/١٨ سەرۆکی بەرەی نیشتمانی (تشارلز تایلۆر) لە هەلبژاردنی دیموکراتی سەرکەوتنی بە دەست هێنا بە سەرەك کۆمار.

- لیبریا ئەندامە لە نەتەوەیەککگرتوەکان،ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە چەندین ڕێکخراوی تری جیهانی.

# مالاوی- نیاسالاندی پێشوو

- ناوی ڕەسمی: کۆماری مالاوی.
- پایتەختی لونجویە، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٢٤٨ هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ٧٤٥ر٤٥ میل چوارگۆشەو ٤٨٤ر١١١٨ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٨٩٥ر١١ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- چڕی دانیشتوانی: ٢٦٠ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- شارە سەرەکیەکانی: بلانتیر، زۆمبا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر١٪.
- نژادەکانی: هۆزەکانی بانتۆ زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی وولاتەکەن.
- زمانەکانی: ئینگلیزی، شیشیۆن (هەردووکیان زمانی ڕەسمین).
- ئایینەکانی: پرۆتستانت ٥٥٪، کاسۆلیکی ڕۆمانی ٢٠٪، ئیسلام ٢٠٪.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٦٠٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٢٤ پارێزگای هەرێمیە.
- دراوی: کوانتشا.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٦٥٠ر٨ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١٠٠ر١ دۆلار.
- بەرگری: ٢ر١٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٥٠٠ر٦٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢٠٪ لەخاکی وولاتەکە.
- داهاتی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، دانەوێڵەی تر، پەمۆ، گەنمەشامی، چەوەندەری شەکر، پەتاتە، چایە، تەرە، میوەجات، قاوە، فولی سودانی.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٠٠٠ر١٢٥ هەزار سەر، بزن ٤٠٠ر١ ملیۆن سەر، چێڵ ٠٠٠ر٨٥٠ هەزار سەر، بەراز ٠٠٠ر٢٥٠ هەزار سەر، پەرەور ١٥ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: ئامادەکردنی خۆراك، چیمەنتۆ، دروستکردنی بەرهەمی دار، کەلوپەلی بەکارهێنان.
- بەرهەمی کارەبا: ٩٨٠ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: بۆکیست، خەڵوز، یۆرانیۆم، بەردی چەوی.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی گواستنەوە، پێداویستی خۆراك، سوتەمەنی، کەلوپەلی بەکارهێنان.
- دەرچووەکانی: قاوە، شەکر، چایە، تەباق، بیبەری سودانی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چین، ئەڵمانیا، ئەمەریکا، بەریتانیا، باشوری ئەفریقیا، زامبیا، زمبابۆی، فەرەنسا.
- ڕژێمی دەسەلات: کۆمارێکی دیموکراتی فرەلایەنیە، بەپێی دەستوری ١٩٩٤/٥/١٧ سەرۆك کۆمار سەرۆك دەوڵەت و حکومەتە،ئەنجومەنی دایك (پەرلەمان) لە ١٧٧ ئەندام پێك هاتووە. هەشت پارتی ڕامیاری هاوبەشن لەدەسەلاتداری وولاتەکە.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی بەرەی دیموکراتی یەکگرتوو کە چەپ ڕەوەو سەرۆك کۆمار سەرۆکایەتی دەکات، پارتی کۆنگرەی مالاوی، پارتی یەکگرتوو لەپێناوی دیموکراتی، پارتی چەپی ناوەند.
- جوگرافیای وڵات: مالاوی دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی ئەفریقیا و وولاتێکی ناوخۆییە. زامبیا لە ڕۆژئاوای، مۆزەمبیق لەباشوری ڕۆژهەلاتی، تەنزانیا لە باکوری، مالاوی درێژ دەبێتە لەباکور بۆ باشور بەدرێژایی ٨٩٦ کیلۆمەتر لەسەر دەریاچەی مالاوی (دەریاچەی نیاسای پێشوو) کە زۆربەی ئەو دەریاچەیە سەر بە مالاویە ٢٠٪ ڕووبەری دەکەوێتە ئەو

سەر ئەو دەریاچەیە، ڕووبەرەکەی تری تەپۆلکەی بەرزن.

- مێژووی وڵات: ئەو گەلانەی کە بەزمانی بانتۆ ئاخاوتنیان دەکرد کۆچیان کرد بەرەو ئەو ناوچەیە لە سەدەکانی چوارەمی زایینی، لە ساڵی ٤٨٠ زایینی یەکێتی ماراف (مالاوی) دامەزرا کە زۆر لە خاکی ناوەڕاست و باشووری مالاوی گرتەخۆی و بەردەوام بوو تاکو سەدەی حەڤدەم. لەساڵی١٥٢٠ پورتوگالیەکان بۆ یەکەم جار سەردانیان کرد. لە ساڵی ١٦٠٠ شانشینی نگۆندی لە باکوری مالاوی دامەزرا لەلایەن ئەو کۆچبەرانەی کە لە تەنزانیاوە ڕوویان تێکردبوو. لە سەدەی هەژدەم دەوڵەتی شیکۆمایمبی لێ دامەزرا لەلایەن ئەوکۆچبەرانەی کە لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی نیاسا ڕویان تێکردبوو دوای ئەوە ئاینی ئیسلام گەیشتە هەندێك لەو ناوچەیە، لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم گەلانی نگۆندی کە بەزمانی کەناری ئاخاوتنیان دەکرد گەیشتنە ناوچەکە کە لەناوچەکانی باشوری ئەفریقیا ڕویان تێکردبوون و کاری کشتوکاڵیان ئەنجام دەدا لەهەمان کات ئایینی مەسیحی تیا بڵاو ببوەوە کە (لدیفید لیفیجستۆن) ڕۆڵی گرنگی هەبوو لە بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی، لە ساڵی ١٩٨٤ کۆمپانیای باشوری ئەفریقیای بەریتانی لێدامەزرا کە خاوەندیەتی بۆ (لسیل رودس) دەگەڕاوە بە ڕەزامەندی وەرگرتن، بەپلەی باش بۆ بوژاندنەوەی وڵاتەکە و کۆمپانیاکە کەوتە ململانێی لەگەڵ ئەو عەرەبانەی رویان لەو ناوچەیە کردبوو.

لە ساڵی ١٨٩١ بەریتانیا هەرێمی نیاسلاندی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی کردیە پارێزراوی وڵاتەکەی و هاری جۆنسۆن بووە یەکەم ڕاوێژکاری بەریتانیا لە وڵاتەکە لە ساڵی ١٨٩٢ ، لە ساڵی ١٩١٥ شۆڕشێکی دژوار بەسەرۆکایەتی ئەلقس یۆحەنا شیلمبۆی ئەنجام درا دژی سپی پێستەکان کە ڕوویان لەباشووی بەپیتی زەویەکە کردبوو. لە ساڵی ١٩٥٣ بوە پارچەیەك لە یەکێتی ناوەڕاستی ئەفریقیا کە لەژێر دەسەڵاتی سپی پێستەکان بوو کە ڕودیسیا (زیمبابۆی) و رودیسیای باکوری (زامبیا) دەگرتە خۆی. لە ساڵی ١٩٦٣ یەکێتی ناوەندی ئەفریقیا هەڵوەشایەوە، لە٦/٧/١٩٦٤ مالاوی سەربەخۆی بەدەست هێنا بەناوی دەوڵەتی مالاوی لەناو رایەلەی کۆمەنولسی بەریتانیا و باندا پۆستی سەرۆك وەزیرانی وەرگرت، لە ساڵی ١٩٦٦ بوە دەسەڵاتی یەك پارت و باندا بوە سەرۆك کۆمار، لە ساڵی ١٩٦٧ باندا بوە سەرۆکێکی دڕندە بەهۆی دان نانی بە ئەفریقیای باشوری ڕەگەز پەرست، لە ساڵی ١٩٧١ بوە سەرۆك کۆماری هەتا هەتایە بەڵام لەدوای ئەوە لەلایەن بەرهەڵستکاران کوژرا. دوای هەشتاکان باری ئابوری بەرەو تێکچوون هەنگاوی نا تاکو ساڵی ١٩٨٩ کە زیاتر لە یەك ملیۆن مۆزەمبیقی ڕویان تێکرد، لە ئەنجامی خۆپیشاندانی کرێکاران و جەماوەری وڵاتەکە بوە هۆی ئەوەی کەلە ساڵی ١٩٩٣ ڕاپرس ئەنجام بدرێ و دەوڵەتی یەك پارتی هەڵوەشێنرایەوەو داوای فرەلایەنی کرا. لە ساڵی ١٩٩٤ دەستوری نوێ بڕیار درا کە بڕیاری فرەلایەنی تێدا مسۆگەر کرا، بالیکی مۆلۆزی هەڵبژێردرا کە سەرکردەی پارتی بەرەی دیموکراتی یەکگرتوو بوو بە سەرۆك کۆمار لە یەکەم هەڵبژاردنی دیموکراتی.

- مالاوی ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان ، ئەندامە لە کۆمەنو لسی بەریتانیا، ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە ڕێکخراوی خۆراك و بەنکی نێو دەوڵەتی،ئەندامە لە ڕێکخراوی کاری نێودەوڵەتی و خەزنەی دراوی نێو دەوڵەتی و ڕێکخراوی دەریای نێودەوڵەتی و ڕێکخراوی تەندروستی نێودەوڵەتی و ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی.

# مــــالــی

• ناوی ڕەسمی: کۆماری مالی.
• پایتــەختی: بامــاکۆ، ژمــارەی دانیــشتوانی ۷۸٥ر۰۰۰ هەزار کەسە.
• ڕووبـــەری: ٤٧٨ر٨٣٧ میــل چوارگۆشـــەو ١ر٢٤٠ر١٩٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
• ژمــارەی دانیــشتوانی: ۱۱ر٥٨٦ر۰۰۰ ملیــۆن کەسە، بەپێی زانیاریەکانی ۱۹۹۸.
• چــڕی دانیــشتوانی: ٢٤ کــەس لەیــەك میــل چوارگۆشەدا.
• بوژانەوەی دانیشتوانی: ٦ر٢٪.
• شــارە گرنگــەکانی: سیکسۆ، کــابس، مۆپتی، تمیکتۆ.
• نژادەکانی: نزیکەی ٥٠٪ دانیشتوانی دەچنەوە ســەر ڕەچــەلەکی مانــدی کــە لــە هۆزەکــانی (بمباراو مالینکی و ساراکول) پێك هــاتوون. لــە کۆمەڵــەکانی تــری وەك فــولاف و منینکــا و سینۆتۆ و سونگای و تەدارق پێك هاتوون.
• زمانـــەکانی: فەڕەنـــسی (زمـــانی ڕەسمیـــە) زمانــەکانی ئــەفریقی و چــەندین زمــانی تــری ناوخۆی تیایە.
• ئاینەکانی: ئیسلام ۹۰٪.
• زانینی خوێندن و نوسین: ۳٥٪.
• دابەشی کــارگێڕی: ۸ هەرێمــە لەگــەڵ گــەرکی پایتەخت.
• دراوی: فرنگ سیفا.
• کــۆی دەرئــەنجامی نــاوخۆیی: ٦ر٠٣٠ر۰۰۰ ملیار دۆلار.
• بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۷٥٠ دۆلار.
• بەرگری: ٥ر٥٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
• سوپاکەی: ٨ر٥٠٠ ٦هەزار کەسە.
• زەوی کشتوکاڵی: ۰۹ر٢٪ لەخاکی وولاتەکە.
• بەرهــەمی کشتوکاڵی: گــەنم، جــۆ، پــەمۆ، فــولی ســودانی، گەنمەشــامی، چــەوەندەری شــەکر، تەڕە ، میوەجات.
• سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٥ر۹۰۰ ملیۆن ســەر، بــزن ٨ر٦٠٠ ملیۆن سەر، چێڵ ٥ر٥٠٠ ملیۆن سـەر، پەرەوەر ٢٥ ملیۆن سەر.
• پیــشەسازی: کەلوپــەلی بیناســازی، کەلوپــەلی بــەکارهێنان، دەرهێنــانی بەرهــەمی سروشــتی، ڕستن و چنین، ئامادەکردنی خۆراك.
• بەرهەمی کارەبا: ٣٥٠ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
• سامانی سروشتی: زێڕ، موگناتیس، بۆکسیت، ئاسن، فۆسفات، بەردی جیری، (چەو) کاولیراد.
• داهـــاتی دەرەوەی: کەلوپـــەلی بیناســـازی، سوتەمەنی، بەرهەمی ڕستن و چنین، پێداوستی خۆراك، کەلوپەلی ماشێن و گواستنەوە.
• دەرچــووەکانی: پــەمۆ، ئــاژەڵی زینــدو، زێــڕ، خوری.
• هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چین، ئەمەریکا، ئەڵمانیا، فەڕەنسا، چەندین وولاتانی عەرەبی.
• ڕژێمــی دەســەڵات: وولاتێکــی دیمــوکراتی فرەلایەنییــە. پەرلــەمانی لــە ۱۲۹ ئەنــدام پێــك هاتووەو ۱۳ ئەندام لە مالیە ڕەسەنەکانە کە لە دەرەوەی مالی دەژین.
• پارتــە ڕامیاریــەکان: پــارتی هاوکــاری لەپێناو دیموکراتی مالی، پارتی لیژنەی نیشتیمانی بۆ دەستپێــشخەری دیمــوکراتی، پــارتی یــەکێتی دیمــوکراتی گــەلی مــالی، پــارتی سۆشیالــستی نەتــەوەی مــالی، پــارتی چــەپی ناوەنــدی مــالی. چـــەندین بـــیرو بۆچـــوونی تـــری نەتـــەوەیی و دیموکراتی و ڕامیاری و کۆمەڵایەتی تیایە.
• جوگرافیـــای وولات: مــالی وولاتێکــی ناوخۆیــە دەکەوێتــە ناوەڕاســتی ڕۆژئــاوای ئــەفریقیا، زۆربــەی خاکەکــەی کەوتۆتــە هــەرێمی بیابــانی گەورە. بەلام زێی نیجیری مەزن دێتە خواری لە باشــوری کــە چــەندین لــق و دەریاچــەی لێ دروستکراوە، خاکی دەڵتای ناوخۆی گونجاوە

بۆ كاری كشتوكاڵی پەمۆو برنج و دانەوێڵە بەڵام هەرێمی باكوری ڕۆژهەڵات و باشوری ڕۆژئاوای چیاییە. جیكارتەو مۆریتانیا و سەنیگال دەكەوێتە ڕۆژئاوای، گینیا و كوت دیڤوار و بۆركینافاسۆ دەكەوێتە باشووری، نیجیر دەكەوێتە ڕۆژهەڵاتی، جەزائیر دەكەوێتە باكوری.

- مێژووی وڵات: لەسەدەی پێنج تا سەدەی یانزەمی زاینی گەلانی (سونینكای) كشتوكاڵكەر ئیمپراتۆریەتی گانایان دامەزراند كە سەرچاوەی بەرهەمەكانیان بازرگانی كردنیان بەزێر بوو لە بیابانی گەورەو مەڵبەندەكەی شاری تمبۆكتو بوو، پایتەختەكەی شاری كۆمبی بوو بەدووری ٢٠٠ كیلۆمەتر لە باكوری بامەكۆ كە چەند پارچەیەكی لە وڵاتانی مالی و سەنگال و مۆریتانیای گرتبووە خۆ. سەرەڕای ئەوە چەندین جەنگ لەنێوان هۆزەكانی بەربەری ئیسلامی ڕوویدا كە بەرلەوە ڕوویان لە وڵاتەكە كردبوو لەگەڵ دانیشتوانی مالی ئەنجامیاندا كە لەئەنجام سەركەوتن بەسەر ئیمپراتۆریەتی گانا. ئیمپراتۆریەتی مالی ئیسلامی لەسەدەی یانزە لەسەر دەستی گەلی مالینكی كە لە باشوری ڕۆژئاوا بۆی هاتبوون دامەزرا، لەسەدەی پانزەم ئیمپراتۆریەتی سونگا دامەزرا ئەویش سەركەوت بەسەر ئیمپراتۆریەتی مالی ئیسلامی كە حوكمڕانیان تێدا كرد لەنێوان ساڵەكانی ١٤٦٤ تا ١٤٩٢ كە زۆربەی خاكی مالی گرتبوەوە لەگەڵ خاكی سەنگال و گامبیاو چەند پارچەیەك لەخاكی مۆریتانیا و نیجیریا و سوپایەكی ڕێك و بەهێزی هەبوو لەگەڵ ئەوەشدا دام و دەزگاكانی لەلایەن فەرمان بەران دەبرا بەڕێوەو خوێندنی باڵای ئیسلامی گرنگی پێدرابوو، لەساڵی ١٥٩١ بەرەبەرە مەراكیشەكان بەسەركردایەتی احمد منصور توانیان ئیمپراتۆریەتی سەنگا لەناو ببەن و بازرگانی زێڕیان كۆنتڕۆڵ كرد و سەركەوتنیان بەدەست هێنا لە سودانی ڕۆژئاواو تمبكتو، لە سەدەی هەژدەم هەرێمەكە دابەش كرا كەهۆزەكانی نەدایف باكوری ڕۆژهەڵاتیان وەرگرت و مۆلاتی و بیمارا ناوچەكانی ناوەڕاست و باشوری ڕۆژئاوایان وەرگرت، لەدوای كێشەو ململانێی زۆری نێوان هۆزەكانی ئەم وڵاتە لەئەنجامدا لە ساڵی ١٩٠٤ بوە ژێر دەستەی فەرەنسی و ناوی نرا سودانی فەرەنسا لە ساڵی ١٩٢٠. لە ساڵی ١٩٤٦ بوە پارچەیەك لە یەكێتی فەرەنسا. لە ١٩٦٠/٦/٢٠ مالی سەربەخۆیی وەرگرت بەناوی كۆماری سودان و یەكیان گرت لەگەڵ كۆماری سەنیگال كە ناسراو بوو بەناوی یەكێتی مالی. بەڵام سەنیگال لەو یەكێتیە كشاوە لە ١٩٢٠/٨/٢٠ لەدوایی ناوی گۆڕا لەكۆماری سودان بۆ كۆماری مالی لە ١٩٦٠/٩/٢٢، لەدوای شەستەكانی سەدەی بیستەم سەرچاوەی بوژانەوەی ئابووری لەسەر یارمەتیەكانی سۆڤیەت و وڵاتانی ڕۆژئاوا بوو، لەو بارو دۆخەدا سەرۆك مودیبۆكیتا هەڵسا بە لەناو بردنی بەرهەڵستكاران و بوە هۆی بەهێزبوونی ڕۆڵی چینی میللی، لەوانەی كە یارمەتی سەرۆك كۆماریان دەدا تا ساڵی ١٩٦٨ دوای ئەوە سوپا هەڵسابە ئەنجام دانی كودەتایەكی سەربازی بە سەرۆكایەتی ملازم موسا تراوری كە لەوكاتە تەنگەژەی ئابووری بەرەو خراپی هەنگاوی دەناو دەستوری لەكار وەستاند و كاری ڕامیاری پارتەكانی قەدەغەكرد. لە ساڵی ١٩٧٤ بڕیاری دەستوری نوێ دراو لەهەمان كات بڕیاری دەوڵەتی یەك پارتی ڕاگەیاند، یەكێتی گەلی مالی دیموكراتی سۆشیالستی نەتەوەی ڕاگەیاند لە ساڵی ١٩٧٥ بەپێی پەیمانی لاگۆی كۆمەڵەی ئابووری لەلایەن ڕۆژئاوای ئەفریقیا كە مالی و مۆریتانیا و ساحل العاج و سەنگال و بنین و نیجیر و بۆركینافاسۆ و راس الآخضر و كوت دیڤوارو گامبیاو گاناو گینیاو گینیا بیساو سیرالیۆن و تۆگۆ و نیجیریا چونە ناو ئەو كۆمەڵەیە كە بارەگای لە

پایتەختی نیجیریا (ئەبوجا)بوو، لەساڵی ١٩٨٥ شەڕی سنوری لە نێوان مالی و بۆرکینافاسۆ هەڵگیرسا لەدوای پێنج ڕۆژ کێشەکە بەرز کراوە بۆ دادگای دادی نێو دەوڵەتی. دوای ئەوە کۆماری مالی لەدوای هەشتاکان پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاوا بەهێز کرد و ڕامیاریەتی ئابووری بازاڕی ئازادی گرتەبەر، لەدوای ساڵی ١٩٩١ خۆپیشاندان ئەنجام درا دژی دەسەڵاتی یەك پارت و موسا تراوری لە دەسەڵات لابرا لە ئەنجامی کودەتای سەربازی لەلایەن ئەمارۆ تۆریە. لە ساڵی ١٩٩٢ لە ڕاپرسی گەلی مالی دەستوری نوێی دیموکراتی بڕیاری لەسەر دراو هەڵبژاردنی فرەلایەن ئەنجام دراو پارتی هاوپەیمان لە پێناو دیموکراتی سەرکەوتنی بەدەست هێنا کە عمر کوناری هەڵبژێردرا بە سەرۆك کۆمار و حکومەتی ئیئتلافی پێك هێنرا و پەیمانی ئاشتی مۆرکرا لەگەل تەوابقەکان بە دانی مافی ئۆتۆنۆمی و فراوانتر کردنی، لەنێوان لەساڵەکانی ١٩٩٣تا ١٩٩٤دووجار سەرەك وەزیران گۆڕدرا بەهۆی خۆپیشاندانی قوتابیان و بڕیاری سێدارە بۆ سەرۆکی پێشوو تر دەرکرا، بەلام جێبەجێ نەکرا، تاکو دوای ساڵەکانی ٢٠٠٢دەسەڵات لەڕێگەی هەلبژاردن بوو.

- مالی ئەندامە لە نەتەوە یەککگرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا. ئەندامە لە چەندین بریکاری تایبەتمەندی نێو دەوڵەتی.

# لیبیا

- ناوی ڕەسمی: جەماهیری عەرەبی لیبی میللی سۆشیالستی.
- پایتەختی: تەرابلس، ژمارەی دانیشتوانی ١ر٧٦٥ر٠٠٠ ملیۆن کەسە.
- ڕووبەری: ٦٧٩ر٣٥٨ میل چوارگۆشەو ١ر٥٧٩ر٥٤٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٥ر٨٩٥ر٠٠٠ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ٢٠٠٠.
- چڕی دانیشتوانی: ٩ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢ر٥٪.
- شارە سەرەکیەکانی: بەنگازی.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: بەنگازی، تەبرق، مسرانا.
- نژادەکانی: عەرەبی بەربەر. ٩٧٪.
- زمانەکانی: عەرەبی (زمانی ڕەسمیە) ئیتاڵی، ئینگلیزی.
- ئاینەکانی: ئسلام.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٨٠٪.
- دابەشی کارگێڕی: ١٣ پارێزگایە و دابەشی ١٥٠٠ کارگێڕی ناوخۆیی کرایە.
- دراوی: دیناری لیبی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٣٨ر٥٠٠ ملیار دۆلار سەرەڕای گەماڕۆی ئابووری کە لە سەریەتی بەلام ئەو گەمارۆ ئابوریە لەگەڵ چەك و تەقەمەنی لە کۆتاییەکانی ساڵی٢٠٠٤وردە وردە بڕیاری لابردنی بۆ درا لە دوای ڕێکەوتنی لەگەڵ ئەمەریکا.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٦ر٨٠٠ دۆلار.
- سوپاکەی: ٧٥ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- بەرگری: ٧ر٥٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.

- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر١٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، دانەوێڵەی تر، فەریکە خورما، زەیتون، چەوەندەری شەکر، تەرە، میوەجات، فولی سودانی.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٧٥٠ر٥ ملیۆن سەر، بزن ٥٠٠ر١ ملیۆن سەر، چێڵ و گامێش ٠٠٠ر٢٥٠ هەزار سەر،پەرەوەر ٥٠٠ر٣٥ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: پالاوتنی نەوت، ڕستن و چنین، ئامادەکردنی خۆراک، خۆشکردنی پێست.
- بەرهەمی کارەبا: ٨٠٠ر١٧ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: نەوت، غازی سروشتی، گەچ، چیمەنتۆ، کبریت.
- داهاتی دەرەوەی: پێداویستی خۆراک، کەلوپەلی دروستکراو، ماشێن و ئۆتۆمبێل، کەلوپەلی ئەلیکترۆنی، کەلو پەلی بیناسازی.
- دەرچووەکانی: پێست، نەوت، غازی سروشتی، فولی سودانی، زەیتون.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەڵمانیا، یابان، چین، ئیتاڵیا، بەریتانیا، فەرەنسا، ئەسپانیا، تورکیا، کۆریا، بەلجیکا، چەندین وولاتانی عەرەبی، وولاتانی ئەفریقی.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆماری مللی سۆشیالستی ئیسلامی عەرەبییە. دەسەڵاتی گەل لە ڕێگەی ڕێکخراوەکانی مللی دەبرێ بە ڕێوە لە ڕێگەی ئەنجومەنی ناوخۆیی. بەڵام ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش کە دەسەڵاتدار بوو لە ١٩٦٩/٩/١ لە ئەنجامی کودەتای سەربازی کە سەرهەنگ محمد قزاق ئەنجامی داو لەلایەن گەلی لیبیا پشتگیری لێکرا. لەدوای ئەوە ئەمانەتی گشتی کۆنگرەی میللی گشتی جێگەی گرتەوە.
- جوگرافیای وولات: لیبیا دەکەوێتە سەر کەناری دەریای سپی ناوەڕاست لە باکوری ئەفریقیا. توونس و جەزائیر دەکەوێتە ڕۆژئاوای. نیجیر و تشاد دەکەوێتە باشوری. سودان و میسر دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی، زۆربەی خاکی لیبیا دەکەوێتە بیابانی گەورە کە ٩٢٪ لە کۆی گشتی خاکی لیبیا دەگرێتەوە، زنجیرە کەنارێکی دەریای باش و بەپیتی هەیە کە ٩٠٪ دانیشتوانی تێیدا نیشتەجێنە.
- مێژووی وڵات: بەربەرەکان یەکەم گەل بون لە نیشتەجێی وولاتی لیبیا بەهۆی شوێنە جوگرافیە گرنگەکەی کە کەوتوتە سەر دەریای سپی ناوەڕاست هەر بەوهۆیەوە بۆتە وولاتێکی پەلامار دراوی وولاتە بیانیەکان بە درێژایی مێژوو کە لەلایەن یۆنان ودوایی لەلایەن میسر و ڕومانیەکان، لەسەدەی حەوتی زاینی عەرەبە ئیسلامیەکان گەیشتنە ناوچەکەو بوە هۆی گۆڕینی ئایینەکەیان‌و ڕۆشنبیر بونیان بە ئاینی ئیسلام. لەسەدەی شانزەم لەلایەن ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تورك داگیر کرا. لەگەڵ ئەوەشدا دانیشتوانی ناوخۆی لیبیا مافی ئۆتۆنۆمیان هەبوو لە بەڕێوەبردنی کاروباری وولاتەکەیان تاکو ساڵی ١٩١١. لەدوای هەڵگیرسانی شەڕی نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئیتاڵیاو لەهەمان ساڵ ئیتاڵیەکان شاری تەرابلسیان داگیر کرد، لە ساڵی ١٩١٢ تەواوی لیبیا کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئیتاڵیا بەڵام نەیان دەتوانی بە تەواوی بەرگری لەخۆیان بکەن بەهۆی هێزی شۆڕشگێڕانی لیبیا بەسەرکردایەتی عومەر موختار تاکو ساڵی ١٩٣٢، لەکاتی جەنگی دووەمی جیهان لیبیا بنکەیەکی سەربازی وولاتانی ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و یابان بوو، لە ١٩٤٣/١/٢١ تەرابلس کەوتە ژێر دەستی هاوپەیمانانی بەریتانیا و فەرەنساو ئەمەریکا کە بەریتانیا و فەرەنسا دەسەلاتیان تێدا دەگێڕا. لە ١٩٥٢/١/٢ لیبیا سەربەخۆی تەواوی وەرگرت و بوە شانشینی دەستوری سەربەخۆو شانشین ئیدریس یەکەم دەسەڵاتی وەرگرت. لە ١٩٦٩/٩/١ شانشین ئیدریسی یەکەم لەسەر

کورسی شانشینی هێنرا خواری لەڕێگەی کودەتای سەربازی لەلایەن سەرهەنگ معمەر قەزافی. لە ساڵی ١٩٧٣معمر قەزافی هەڵسابە دارشتنی پڕۆگرامی شۆڕشی ڕۆشنبیری بەپێی بیر و بۆچوونەکانی سۆشیالستی و کەرتەکانی تایبەتی خۆماڵی کرد، لیبیا هەوڵی دا بە یەککگرتنی لەگەڵ میسر و سوریا و سودان توونس و تشاد و مەغرب و جەزائیر بەلام هەوڵەکە سەرکەوتنی نەهێنا، لەدوای ئەوە دۆزینەوەی کانزاکانی نەوت بوە هۆی ئارامی ئابووری و سەقامگیری داهاتی وولاتەکە لە بوژانەوەو پەرەسەندن لە بوارەکانی هەمە لایەن و بژێوی ژیانی گەلی لیبیا. لە ١٩٨١/٨/١٩ دوو فڕۆکەی جەنگی توانیان دوو فڕۆکەی لیبیا بخەنە خوارەوە لەسەر کەنداوی سیرت. ئەمەش لە ئەنجامی شالاوی فڕۆکە جەنگیەکانی لیبیا بوو بۆ سەر فڕۆکەکانی ئەمەریکا. دوای ئەوە هێزەکانی ئەمەریکا لە کۆتایی مانگی/٣/١٩٨٦لە کەنداوەکە کشانەوە و ئەمەریکا لە مانگی/١/ ١٩٨٦ ئابلوقەی ئابوری خستە سەر لیبیا هەر چەند دراوی لە بانکەکان هەبوونەمەریکا داگیری کرد. لە ساڵی ١٩٨٦ فڕۆکە جەکیەکانی ئەمەریکا بۆردومانی شارەکانی تەرابلس و بەنگازی کرد تا مانگی/ ١٢/ ١٩٩٠ هەموو هەوڵەکانی ئەمەریکا هەرەسی هێنا بۆ شێواندنی بارودۆخی لیبیا لەڕێگەی لیبیە ڕاهێنەرەکان لە ئەمەریکا کە بنکەکانی لە تشاد بوو، لە ١٩٩٢/٤/١٥ نەتەوە یەککگرتووەکان سزای سنورداری دیاری کراوی لەسەر لیبیا دانا بە قەدەغەکردنی سەفەرەکانی ئاسمانی و فڕۆشتنی چەك بۆ لیبیا بەهۆی نەدانە دەستی ئەو دووکەسەی کە بەناو تیرۆرکردنی فڕۆکەی کۆمپانیای ئەمەریکا لە شاری لوکەربی لە سکۆتلەندە، لە ساڵی ١٩٩٨ بوە هۆی کاردانەوەیەکی حراپ بۆسەر ئابووری لیبیا و لە ١٩٩٣/١٢/١ ئەو سزایانە توندتر کران. لە ١٩٩٩/٤/٥ لیبیا ئەو دوو کەسەی کە بەناو فڕۆکەکەیان تیرۆر کردبوو درانە داداگا لە هۆڵەندا و دادگای کردنیان بەپێی یاسای ئەسکەتلەندی بوو کە بوە هۆی لابردنی ئەو نیمچە گەمارۆیانەی بەسەر لیبیا سپاندرابوون. هەر چەندە ئەو گەمارۆیە لە دوای دادگایی کردنی ئەو دوو تیرۆریستە بەرەو لابردن بریاری بۆ دەدراله ئەنجامی گۆڕینی ڕامیاریەتی دەسەلاتی لیبیاو قەرەبو کردنەوەی بنەماڵەی کوژراوەکانی ناو فڕۆکەکەو باش کردنی باری پەیوەندی لەگەڵ وولاتانی خاوەن ڕوداوەکە، لە ناوەڕاستی سالی ٢٠٠٣دەسەلاتی لیبیا ڕامیاریەتی گۆڕی بە هۆی بارو دۆخی نێو دەوڵەتی بەتایبەتی لە ناوچەکە لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام حوسێن لە عێراق و ئاشکرا کردنی بنکەی چەکە کۆکوژیەکان و سەردانی محەمەد بەرادعی ئەمینداری گشتی ئەتۆمی سەر بە نەتەوە یەککگرتوەکان و لیژنەی پشکنین و هەلوەشاندنەوەی چەکە کۆکوژیەکان ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی کە پەیوەندی نوێ بکاتەوە لەگەڵ وولاتانی جیهان بەتایبەتی ئەمەریکا، لەساڵی ٢٠٠٤ بوژانەوەی ئابوری لیبیاو سڕینەوەی لیبیا لە لیستی وولاتانی دیاریکراو لە هاوکاریکردنی لەگەڵ تیرۆریستان لە جیهانداو گەڕانەوەی بۆناو ڕیزەکانی رامیاریەتی نوێی جیهان، لیبیا رۆژ لە دوای ڕۆژ هەنگاوی بەرەو باش کردنی پەیوەندی نێو دەوڵەتی دەنێ لە هەموو بوارەکانی ئابوری و ڕامیاری و سەربازی و ڕۆشنبیری بە تایبەتی لە دوای نیوەی ساڵی ٢٠٠٤.

- لیبیا ئەندامە لە نەتەوە یەککگرتووەکان، ئەندامە لە یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە وولاتانی هەڵێنجانی نەوت"ئۆپێك"، ئەندامە لە زانکۆی وولاتانی عەرەبی.

# مەدەغەشقەر

## کۆماری ملاجاسی پێشوو

- ناوی ڕەسمی: کۆماری مەدەغەشقەر.
- پایتەختی: ئەنتاناریفۆ، ژمارەی دانیشتوانی ٩٨٨ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ٢٢٦ر٦٦٠ میل چوارگۆشەو ٥٨٧ر٠٤٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ١٥ر٩٧٥ر٠٠٠ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- چڕی دانیشتوانی: ٧٠ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢٪.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: تۆماسینا، ئسیرانانا، ماهاجینما، تۆلیارا.
- زمانەکانی: مەلا جاسیە، فەرەنسی (هەردووکیان زمانی ڕسمین).
- نژادەکانی: ١٨ هۆزی تێدایە لەڕەچەلەك مەلایۆو ئەندۆنوسین کە پێیان دەگوترێ مریناس و لەناوچە شاخاویەکان نیشتەجێن. بەلاّم ئەفریقیە ڕەش پێستەکان کە پێیان دەگوترێ کوتییر لە هەرێمی کەنارەکانی نیشتەجێن، لە نێوان ئەو دوو گروپە کێشەو گیرو گرفت هەیە، نژادەکانی تری عەرەبی و ئەفریقی هەنە.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٤٩٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٦ پارێزگایە.
- دراوی: فرنکی مالاجاسی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١٠ر٥٠٠ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٨٠٠ دۆلار.
- بەرگری: ١٠ر٣٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٢٥ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٤ر٥٪ لەخاکی وولاّتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، برنج، چەوەندەری شەکر، قاوە، نسکافە، فولی فانیلا، تەرە، میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ١ر٣٥٠ ملیۆن سەر، بزن ١ر٤٠٠ ملیۆن سەر، چێڵ ١٠ر٣٥٠ ملیۆن سەر. بەراز ١ر٦٥٠ ملیۆن سەر، پەڕەوەر ٢٠ر٠٠٠ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: پاڵاوتنی نەوت، لێکدانی ئۆتۆمبێل، دروستکردنی سابون، چیمەنتۆ، ئامادەکردنی خۆراك، دروستکردنی شەکر، خۆشکردنی پێست.
- بەرهەمی کارەبا: ٦١٠ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: نەوت، غازی سروشتی، کرۆمیت، گرافیت، خەڵوز، بۆکسیت.
- داهاتی دەرەوەی: پێداویستی خۆراك، نەوتی خاو، کەلوپەلی بەکارهێنان.
- دەرچووەکانی: شەکر، قاوە، بەرهەمەکانی نەوت، بیبەر، ئاژەڵی زیندوو.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چین، ئەڵمانیا، فەرەنسا، ئەمەریکا، بەریتانیا، ئیتالیا، وولاّتانی ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا.
- ڕژێمی دەسەلاّت: وولاّتێکی کۆماریە، سەرۆك کۆماری بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێت، کۆمەڵەی نیشتیمانی کە ئەنجومەنی یاسادانانە لە وولاّت و سەرۆك وەزیران هەڵدەبژێردرێ بەپێی دەستوری سێیەمی دەرچووی ساڵی ١٩٩٢.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی یەککگرتووی چەپڕەوی ئاوەندی، بەرەی نیشتیمانی لەپێناو بەرگری لە شۆڕشی مالا جاسی سۆشیالستی، لیژنەی هێزی زیندی.
- جوگرافیای وولاّت: کۆماری مەدەغەشقەر

دەکەوێتە سەر زەریای هیندی پێش کەناری باشوری ڕۆژهەلاتی ئەفریقیا. چەندین دورگەی بچووکی تێدایە لەگەل دورگەی گەورەی مەدەغەشقەر. دورگەی مەدەغەشقەر لە ڕۆژهەلاتی لێوارێکی کەناری شێدارە، لە ناوەراستی تەپۆلکەی شاخاویە و چەندین دۆل و کەندی بەپیتی تیایە، بەلام لێواری کەناری ڕۆژئاوای زۆر فراوانە، درێژی خاکەکەی کێشەیەکی گەورەی بۆ ولاتەکە دروستکردووە. دورگەی مەدەغەشقەر گەورەترین دورگەیە لە جیهاندا.

دورگەی فانگ (جزر قمر) دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای، مۆزەمبیق دەکەوێتە لای ڕۆژئاوای و لەهەمان کاتا کەنالی مۆزەمبیق لێکیان جیادەکاتەوە.

• مێژووی ولات: خەلکانی مەلایۆو ئەندۆنیسیا پێش دوو هەزار سال ڕوویان لەو ناوچەیە کردوەو کردیانە وێستگەی تایبەتی خۆیان کە تاکوو ئێستا ئەوەکانی ئەوان زۆربەی دانیشتوان پێك دێنن لە ولاتەکە. لە سەدەی حەوتی زاینی بازرگانە عەرەبەکان ڕوویان تێکردو لە کەنارەکان نیشتەجێ بوون. لە سەدەی شانزەم پرتوگالیەکان ڕوویان لەناوچەکە کردو لە دوای ئەوانیش ئەورووپیەکان. لە سەدەی هەژدەم شانشینی یەکگرتوو پێك هێنرا کە شانشین ماریتا بوو کە لە ئەیلوولەکانی ناوەراست کردیانە بنکەی خۆیان ولە زۆربەی دوورگەکە دەسەلاتیان دەرۆیشت تاکو سالی ١٨٨٥ زاینو تاکو مەدەغەشقەر بوە ناوچەیەکی پارێزراوی فەرەنسی و شانشین ماریتا لەناو براو بووە ژێردەستەی فەرەنسا لەسالی ١٨٩٦ شانشینیان دەرکرد بەرەو ولاتی جەزائیر، لە سالی ١٩١٨ فەرەنسیەکان دوورگەی قەمەریان لکاند بەو ژێر دەستەیە لەگەل چەندین هەرێمی تر لە ناوچەکەو دوای لە جەنگی دووەمی جیهان بەریتانیا داگیری کرد لەگەل ئەوەشدا پەیوەندی مەدەغەشقەر لەگەل حکومەتی ڤیشی لە فەرەنسا هەر مایەوە تاکو سالی ١٩٤٧ شۆرشی چەکداری هەلگیرسا دژی فەرەنسا، لە سالی ١٩٥٨ مەدەغەشقەر مافی ئۆتۆنۆمی وەرگرت لە ناو پارێزراوی فەرەنساو لە ١٩٦٠/٦/٢٦ سەربەخۆی وەرگرت. لەسالی ١٩٧٢ کودەتای سەربازی ئەنجام درا دژی ئەو دەسەلاتەی کە زیاتر لە دوانزە سال حوکمرانی کردو دەسەلاتی نوێ هەلسا بە خۆمالی کردنی کۆمپانیاکانی فەرەنساو بنکەکانی فەرەنسی داخست لەگەل بنکەی ئاسمانی ئەمەریکی و ڕووی ڕامیاریەتی لە چینی میللی کرد. لە سالی ١٩٧٥ دەستوری نوێ ڕاگەیانرا بە کۆماری مەدەغەشقەری دیموکراتی، لە دوای سالی ١٩٧٩ دانیشتوانە بیانیەکانی لە ولات دەرکرد لەگەل بەرهەلستکاران. لە سالی ١٩٩٠ حکومەت ئەو قەدەغە کردنەی کە لە سەر پارتەکان هەبوو لای بردو دوای لەسالی ١٩٩١ بەرهەلستکاران حکومەتیان دامەزراند لەجیاتی ئەو دەسەلاتەو دوای پانزە ڕۆژ سەرەك کۆمار ڕاپرسی گەلی ئەنجامدا بۆ دەستوری نوێی فرە پارتی و سەرەك وەزیرانی نوێی دامەزراند.

لە مانگی /٧/ ١٩٩٢ حکومەتی کاتی دامەزرا لە ئەندامانی بەرهەلستکار، لە هەلبژاردنەکانی سەرۆکایەتی(برتزا) لە خولی دووەم سەرکەوتنی بە دەست هێنا لە مانگی/٤/١٩٩٣ ئەمەش بە کۆتای هێنانی دەسەلاتی ئەدمیرال دیدییەرا تسیراکا کە زیاتر لە حەڤدە سال حوکمرانی دەکرد. لەهەمان کاتدا سەرەك وەزیران بووە سەرەك کۆماری کاتی. لە هەلبژاردنەکانی ١٩٩٦ (ئەدمیرال دیدیە راتسیراکا)بۆ جاری دووەم لە هەلبژاردنەکانی ١٩٩٧/١/٣١ بوە سەرەك کۆمار.

• مەدەغەشقەر ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەندامە لە ڕێکخراوی ئازوقەو کشتوکال وبەنکی نێودەولەتی و کاری نێودەولەتی و خەزنەی نێودەولەتی و دەریای نێودەولەتی و تەندروستی جیهانی وبازرگانی نێودەولەتی.

# نێجیریا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری نێجیریای یەکگرتوو.
- پایەتەختی: ئەبوجا، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٤٧٠ هەزارکەسە.
- رووبەری: ٧٠٠ر٣٥٦میل چوارگۆشەو ٩٢٣٫٨٥٢ر کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەیدانیشتوانی: ٠٠٠ر٩٦٠ر١١٨ملیۆن کەسە، بەپێی زانیاری رۆژنامەکانی ٢٠٠٢.
- چڕی دانیشتوانی: ٣٢٤کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- شارەگرنگەکانی: ئیبدات، لاجوی.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: واری، بۆرت هارکۆت، لاجوی.
- نژادەکانی: باروبا، لایبۆ، هۆسا، فولاتی، گەلێ نژادی تر.
- ئایینەکانی: ئیسلام٥٠٪، مەسیحی ٤٠٪، ئایینەکانی تر١٠٪.
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی ڕەسمیە) هۆسا، یاروبا، لابیۆ، فلأنی.
- زانینی خوێندن ونوسین: ٦٢٪.
- دابەشی کارگێری: ٢٦پارێزگایە، لەگەڵ هەرێمی پایتەختی فیدڕالی.
- دراوی: نیرا.
- بەرگری: ٥ر٨٪لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر١٣٤ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٦٠٠ر١دۆلار.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر١٧٥هەزارکەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر٣٣٪ لەخاکی ولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: کاکاو، بەرهەمی دارخورما، دەرە زەرد ((گەنمەشامی))،برنج،یام (جۆرێکە لەپەتاتە)، مەتات، تەڕە، میوەجات، گەنم وجۆ، دانەوێڵەی تر.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ١٠٠ر١٤ملیۆن سەر، بزن١٠٠ر٢٥ملۆن سەر، چێڵ٧٠٠ر١٩ملیۆن سەر، بەراز٥٨٠ر٧ملیۆن سەر، پەرەور٥٠٠ر١٢٦ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: نەوت، غاز، قوڕقوشم، زەنگ((توتیا))، خەڵوز، ئاسن، بەردی جێری"چەو".
- پیشەسازی: نەوت لە ٩٨٪ لەدەرچوەکانی ولاتەو گەورەترین ولاتی ئەفەریقیایە لەهەڵێنجانی نەوت، ئامادەکردنی خۆراك، ڕستن وچنین، خۆشکردنی پێست.
- بەرهەمی کارەبا: ٨٥٠ر١٢ملیار کیلۆوات کاژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: کەل وپەلی بەکار هێنان، کەل وپەلی سەرمایەداری، کەل وپەلی خاوی کیمیایی.
- دەرچووەکانی: نەوت، غاز، کاکاو، بەرهەمی خورما، مەتات، پێست، ئاژەڵی زیندوو، گۆشتی ئاژەڵ.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چین، ولاتانی ڕۆژئاوای ئەروپا، ولاتانی ئەفەریقیا.
- ڕژێمی دەسەلات: ڕژێمێکی کۆماریە، لەساڵی١٩٨٣ لەژێر دەسەلاتی سەربازی بوە تاکو ١٩٩٩/٤/٢٧کە ئۆبسنجۆ لەهەڵبژاردن سەرکەوتنی بەدەست هێناو بوە یەکەم سەرۆك کۆماری مەدەنی.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی هاوکاری نیشتمانی کۆماری، ڕاسترەوی ناوەندی، چەپەرەوی ناوەندی، پارتی کۆمەلأیەتی دیموکراتی.
- جوگرافیای ولات: نێجیریا دەکەوێتە ڕۆژئاوای ئەفەریقیا، بەهێزترین ولاتی کیشوەرەکەیەو ڕۆڵی سەرەکی لە کاروباری نێودەولەتی هەیە، خاکی نێجیریا درێژ دەبێتەوە لەسەر کەنداوی گینیا لەباکور، بەنین دەکەوێتە ڕۆژئاوای، نێجیر دەکەوێتە باکوری، تشادو کامیرۆن دەکەوێتە

ڕۆژهەڵاتی.

- مێژووی وڵات: مێژووی ڕۆشنبیری نێجیریا دەگەڕێتەوە بۆ ١٠ساڵی پێش زایین. لەسەدەکانی دووانزەم وچواردەم شارستانیەتی نێجیریا بوژانەوەی بەخۆوە بینیەوە لەناوچەکانی یۆربائیف، بەڵام لە باکوری ئاینی ئیسلام پەرەی سەند ئەویش لە ڕێگەی بازرگانە ئیسلامەکان، ئیمپڕاتۆیەتی بنین گەیشتە دوا پلەی پەرەسەندن و بەهێزبوونی لەباشوری وڵات ئەویش لەسەدەی پانزەهەم، یەکەم پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ ئەوروپیەکان دەستی پێکرد لەساڵی١٨٠٤ تاکو١٨١٧ ئیمپڕاتۆریەتی فولانی ئیسلامی لە باکوری دامەزرا، بازرگانە ئەورووپیەکان لەساڵی ١٨٦١ شاری لاجوییان کەوتەژێر دەست و دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی لەباشور، دوای ئەوە ئینگلیزەکان وردە وردە توانیان زۆربەی خاکی نێجیریا داگیربکەن لەساڵی ١٩٠٤، لە ساڵی١٩١٤ هەردوو پارێزراوی باکورو باشور یەکیان گرت وتۆڕی هێللی شەمەندەفەر پەرەی سەند لە بواری کاری بازرگانی. لەساڵی١٩٤١ نێجیریەکان توانیان ڕوڵی سنوردار بنوێنن لەدروستکردنی بڕیار لە سێ ئەنجوومەنی هەرێمی ئەویش لە باکورو ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات کە بوە هۆی بەکارهێنانی ڕژێمی نوێنەری لەهەڵبژاردن بۆ پێکهێنانی سێ پارتی ڕامیاری هەرێمی. لە ساڵی١٩٥٤ دەستوری نوێ ڕاگەیەنرا. لەساڵی ١٩٥٨ توانرا نەوت بدۆزرێتەوە لە باشوری ڕۆژهەڵات. له٣/٨/١٩٦٠نێجیریا سەربەخۆی وەرگرت لەناو کۆمەنولسی بەریتانیا. بەڵام بە هۆی زیاتر لە ٢٥٠ نژادی جیا جیا یاسا بەرەو لەناوچون دەچوو بەهۆی ململانێی نەژادیو هەرێمی و نەمانی یەکگرتوویی لەنێوان هەرێمەکانی خاوەن ئۆتۆنۆمی. لەساڵی١٩٦٣ نێجیریا ڕژێمی کۆماری ڕاکەیاند. لەساڵی١٩٦٦ عەقید یەعقووبی جۆن توانی ڕژێمی یەکیەتی بگەڕێنێتەوە وڵاتەکە، لەساڵی١٩٦٧ کێشەی دابەشی نەوت بەسەر هەرێمەکان سەریهەڵداو بوە هۆی جیابوونەوەی هەرێمی ڕۆژهەڵات بەناوی (بیافرا) کە وڵاتێکی سەربەخۆو هۆزی ئبیۆی کە بوە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆی، لەئەنجام زیاتر لە یەك ملیۆن کەس کوژران، لە دوای ٢١مانگ لە شەری دژواری ناوخۆ لە مانگی ١٩٧٠/٤/(بیافرا) خۆی دا بەدەست حکومەتی فیدڕاڵی. لەساڵی ١٩٧٥ تاکو ساڵی ١٩٩٩ وڵاتی نێجیریا بە بارێکی ئاڵوزو دژواردا تێپەڕی بە هۆی ململانێی لەپێناو دەسەڵات لەلایەن ئەفسەرەکانی سەربازی و کودەتا یەك لەدوای یەکەکانی تاکو٢٧/٤/١٩٩٩کە ئۆبسیجۆ دادوەری سەربازی پێشو بوو لەڕێگەی هەڵبژاردن بوە یەکەم سەرەك کۆماری مەدەنی نێجیریا وتاکو کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤ وڵاتەکە بەرەو ئارامی هەنگاوی دەنا.
- نێجیریا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوەکانی خۆراكو کشتوکاڵی جیهان، بانکی نێو دەوڵەتیو کاری نێو دەوڵەتی، ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لەڕێکخراوی هەڵێنجانی نەوت "ئۆپێك" چەندین ڕێکخراوی تری جیهانیو ئەفریقی.

# کیشوەری ئەمەریکای باکوور

# سانت فینسنت وجراینا دینز

- پایتەختی: کنجیتۆن، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۵۷ هەزار کەسە.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: کنجیتۆن.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۱۵۸ هەزار کەسە.
- رووبەری: ۱۵۰ میل چوار گۆشەو ۳۸۸ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چری دانیشتوانی: ۱۰۵۳ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- نـژادەکانی: رەش پێست ۸۲٪، تێکەڵاو ۱٤٪ هندی رۆژ هەڵات ۲٪، سپی پێست ۱٪.
- ئایینەکانی: مەسیحی ئنجیلیکانی و کاسۆلیك.
- زمانەکانی: ئینگلیزی+ فەرەنسی هەردوکیان (زمانی رەسمین).
- زانینی خوێندن ونووسین: ۹۸٪ .
- دابەشی کارگێری: ٥ ناوچەی بچوکەلە شێوەی قەزاو ناحیە .
- دراوی: دۆلاری رۆژهەلاتی کاریبی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۲٦۳ ملیۆن دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۲۵۰ر۲ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ۳۹٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: دانەوێڵەی هەمەجۆرە، تەرە ، میوەجات، گیزی هیندی.
- پیشەسازی: ئامادەکردنی خۆراك.
- بەرهەمی کارەبا: ۷۳ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: سوتەمەنی، کەلوپەلی کانزای، ماشێن وکەلوپەلی، کیمیاوی ، خۆراك.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: وولاتانی کاریبی، ئەمەریکا، بەریتانیا، وولاتانی یەکێتی ئەوروپا.
- رژێمی دەسەڵات: دادوەری گشتی دەسەلاتدارەونوێنەرایەتی شانشینی بەریتانیا دەکات، سەرۆك وەزیرانی هەیە کە پەرلەمان هەڵیدەبژێرێت، ئەنجومەنی یاسادانان لە ۱٥ ئەندام پێك هاتووە.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی یەکێتی کرێکاری، پارتی دیموکراتی نوێ.
- جوگرافیای وولات: کۆمەڵە دورگەیەکەکە دەکەوێتە رۆژهەلاتی دەریای کاریبی. لە باکوری سانت لۆشا، لە رۆژهەلات بریادۆس، لە باشووری گرینیدا، وولاتێکی شاخاوی پر لە گرکانە.
- مێژووی وولات: کۆچ بەرانی ناوچەی کاریبی لە ساڵەکانی ۱۳۰۰ روویان لەم ناوچەیە کردو بوونە نیشتەجێی ناوچەکە کە بوە هۆی جێهشتنی دانیشتوانە رەسەنەکانی ناوچە، لە۱۹۷۹/۹/۱۹ ولاتەکە سەربەخۆی وەرگرت لەپێشوودا سانت فینسنت پێی وتراوە سانت کریستۆفەر نیفس. لەسالی ۱۹۹۰ سەرەك وەزیران بەیەك پارچەیی دورگەی نیفیسی لەگەڵ وولاتەکە ڕاگەیاند، لەسالی ۱۹۹٥هەڵبژاردنی پەرلەمان ئەنجام دراو پارتی کاری بەرهەلستکار سەرکەوتنی بەدەست هێنا.
- سانت فینسنت وجراینا دینز ئەندامە لە کۆمەنوۆلسی بەریتانیا، ئەندامە لە رێکخراوی نێو دەولی ئەمەریکا، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان.

# کـــــەنـەدا

- ناوی رەسمی: کەنەدا
- پایتــەختی: ئۆتــاوە، ژمــارەی دانیــشتوانی ۰۰۰ر۱۳۰ر۱ ملیۆن کەسە.
- شارە گرنگەکانی: مۆنتریال، ڤالکۆڤر، تۆرنتۆ، ئەدمۆنتین، کالجیاری، کۆبك.
- بەنـدەرەکانی: سـان جـۆن، تۆرنتـۆ، ڤـانکۆڤر، هالیفاکس، مۆنتریال، کۆبك
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ۰۰۰ر۷۰۰ر۳۲ ملیـۆن کەسە، بەپێی ئاماری ۲۰۰۰.
- رووبــەری: ۸۰۹ر۸۵۱ر۳ میـل چـوار گۆشـەو ۱۸٦ر۹۷٦ر۹ کیلومەتر چوار گۆشەیە.
- چری دانیشتوانی: ۸ کـەس لـە یـەك میل چوار گۆشەدا.
- نـژادەکانی: بـەریتانی ٤۰٪ فەرەنـسی ٢٦,٥٪، رەگـەزەکانی تـری ئـەوروپی ۲۰٪، ئاسـیایەکان ۱۱٪، دانیشتوانی رەسەنی ۲٪.
- زمانـەکانی: ئینگلیـزی، فەرەنـسی (هـەردوکیان زمانی رەسمین).
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی رۆمانی ٥٢٪، کنیسەی یـەکگرتوو ۱۲٪، کەنیـسەی ئینگلیـزی ۸٪، بروای تری جۆراو جۆری تێدایە.
- زانینی خوێندن ونووسین: ۹۸٪.
- دابەشی کارگێری: ١٥ پارێزگایە.
- دراوی: دۆلاری کەنەدی.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ۵۰۰ر٦٥٨ ملیـار دۆلارە.
- بەشـی تـاك لـە کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ۰۰۰ر۲۸ هەزار دۆلارە.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر٦٥هەزار کەسە.
- بەرگری: ٥ر۲٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- زەوی کشتوکاڵی: ٤ر٥٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهــەمی کــشتوکاڵی: گــەنم وجــۆ، تــەرە، میوەجات، چەوەندەری شەکر، برنج.
- سـامانی ئـاژەڵی: مـەرو بـزن ۰۰۰ر۷٦۷ هـەزار سـەر، چـێل ۲٥۰ر۱۳ ملیـۆن سـەر، بـەراز ۱۲ ملیـۆن سـەر، گـامێش ۳۰۰ر۱ ملیـۆن سـەر، پەرەور ٥۰۰ر١٤۰ ملیۆن سەر.
- سـامانی سروشـتی: نیکـل (دووەم وولاتــە لـە بەرهـەم هێنـانی لـە جیهانـدا) نـەوت، غـازی سروشـتی، خـەلوز، نوحـاس، قورقوشـم، زێـر، ئاسن، یۆرانیۆم، داری دارستانەکان.
- پیـــشەسازی: دروســـتکردنی کەلوپـــەلی گواستنەوە. ئامادەکردنی خۆراك لە ناویانەوە گۆشــت، پــەرو بەرهەمــەکانی لــە دەفــتر. ئامــادەکردنی داری دراســتانەکان بــۆ بــەکار هێنانی ، ماشێن، کیمیاوی، داودەرمان.
- بەرهــــەمی کارەبـــا: ٥٤۸ ملیـــار کیلــۆ وات کاتژمێر.
- داهــاتی دەرەوەی:ئۆتوموبێــلو پارچــەکانی، ئۆتـومبیلی بارهـەڵگرو گواسـتنەوەی نەفـەرات، کەلوپــەلی خــۆراك، کــەلو پــەلی پەیوەنـدی و ژمێریاری.
- دەرچـوەکانی: ئۆتۆمبێـلو کەرسـتەکانی، دار، پەری رۆژنامە، نـەوتی خـاو، غـازی سروشـتی، ئەلـەمنیۆم، بەرهـەمی نـەوت، خـەلوز، گـەلیٚ جــۆری تــر لەبەرهەمــە جــۆراو جۆرەکــانی پیەشسازی.
- هاوبەشــەکانی بازرگــانی: یابــان، ئەمــەریکا ، بــەریتانیا، وولاتــانی کۆمەنولـسی سـەربەخۆ،

ئـەڵمانیا، کۆریـا ، مەکسیك، تـایوان، چـینی میللی، ئیتاڵیا، وڵاتانی عەرەبیو ئەفەریقی.

- رژێمی دەسەڵات: کەنەدا یەکییەتیەکی فیدرالیە و ١٠ هەرێمـە لـە گـەڵ دوو هـەرێمی زەوی لـە باکووری رۆژئاواو هەرێمی یۆکۆن. ئەندامە لە کۆمەنولـسی بـەریتانیا، دادوەری گـشتی بـەریتانیا راوێـژکاری کەنەدایـە بـەڵام بـەبێ ئەنجومـەنی وەزیـران ناتوانـێ هـیچ بریارێـك ئـەنجام بـدات بـە پێـی دەسـتوری کەنـەدا، پەرلەمان لەدووئەنجومەن پێك هاتووە ئەویش ئەنجومەنی پیران کە لە ١٠٤ ئەندام پێك هاتوەو بـە درێـژایی ژیـان دادەمـەزرێن تـاکو مـردن، ئەنجومـەنی گـشتی کـە لـە ٢٩٥ ئەنـدام پێـك هاتوەو دابەشی سەر هەرێمەکان کراون، بەڵام دوو هەرێمەکـەی بـاکووری رۆژئـاواو هـەرێمی یۆکۆنی لەلایەن دادوەری گشتی دادەمەزرێنو دەسـەڵاتدارە بـە پێـی دەستوری کەنـەدی کـار دەکات، ماوەی ئەنجومـەنی هەرێمـەکان چوار ساڵە ئەویش لەرێگەی هەڵبژاردن.
- پارتـە رامیاریـەکان: پـارتی دیمـوکراتی نـوێ، پـارتی لیبرالـی کەنـەدا، پـارتی پێـشکەوتنی پارێزگـاران لـەپێناوی ئـابووری ئـازاد، پـارتی راسـت رەوی ناوەنـد، پـارتی بنکـەی کبیـك، چـەندین گـروپ وپـارتی تـری نیـشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تێدایە.
- جوگرافیای وڵات: زۆربـەی زۆری خـاکی کەنەدا دەکەوێتـە بەشـی بـاکووری کیـشوەری ئەمـەریکای بـاکور کـە گـەورەترین وڵاتـە لـە رووی رووبەری لە نێوەی خرۆکـەی رۆژئاوا کە ماوەی ٢٤٢٦ میل درێژ دەبێتـەوە لـە رۆژهـەڵات بۆ رۆژئاواو دریژ دەبێتەوە لە قوتبی باکوور بۆ سنووری ئەمەریکاو خاکەکە زۆری وەك یەکە.

کەنـەدا وڵاتێکـی چـیایو ئـاوی زۆرە و دراسـتانی چـری هەیـەو ٩ دەریاچـەی تیایـە درێژیەکـەی زیـاترە لـە ١٦١ کیلومـەتر، ٣٥ دەریاچەی تری تیایە کە درێژی زیاترە لە ٨٠ کیلومەتر، دوو تۆری زێی سـەرەکی تیایـە کە تۆری زێی ماکنزیو زێـی سانت لۆرنس کە سوودمەندن بۆ کاری دەریاوانی، درێژیەکەی ٣٠٥٨ کیلۆمەترە.

کەش و هـەوای کەنـەدا بەشێوەیەکی گشتی مام ناوەندیـە، بـەڵام جیـاوازە لەزسـتان زۆر سـاردو بەستەنیە، بەڵام لەکەنارەکانی رۆژئاواو باشووری رۆژئاوا مام ناوەندیە، باشووری لـەهاوین فێنکە، بـاران زۆرە لـەرۆژئاواو بـەفریش لەرۆژهـەڵات بەزۆری دەبارێ، کەنەدا وڵاتێکی گوزاری خۆشە لەوەرزەکانی.

- مێـژووی وڵات: لایـڤ ئریـسکۆن خـەڵکی ئەسکەندیناڤی بوو کە یەکەم کەس بوو گەیشتە کـەنارەکانی کەنـەدا لەناوچـەکانی (لابـرادو نۆفاسکۆشیا) لەساڵی ١٠٠٠ زایینی، دوای ئەو لەساڵی ١٤٩٧ جۆن کابۆت گەیشتە ناوچەکە کەخەڵکی ئیتالیا بوو لەپێناو خزمەتی هنری حەوتـەمی شانـشینی ئینـگلترا بـوو چـوە ناوچەکانی نیۆفۆنـد نۆنافاسکۆشیا، لەساڵی ١٥٣٤ جـاك کاریـە کەنـەدای داگیرکـرد بـۆ بەرژەوەنـدی فەرەنـسا ودەسـتی کـرد بەدروسـتکردنی کۆمـەڵگای گـەورەو خـەڵکی فەرنـسای دەهـاوردە ناوچـەکان تـاوای لێهـات دانیـشتوانی کەنـدا زۆربـەی زۆری فەرەنـسی بـوونو بوەهـەرێمی نـوێی فەرەنـسا. لەساڵی ١٦٠٨ کۆیـك دامـەزرا. چـاوتێبرینی فەرەنـسا لەکەنـەدا سـەرکەوتنی بەدەسـت نـەهێنا بـەڵام دۆزینـەرەوەکانی فەرەنـسا توانیـان پاشـان دەریاکان بدۆزنەوە کە بوە هۆی ئەوەی فەرەنسا بتوانێ سودەکانی خۆی لێ وەربگرێت.

لەساڵی ١٦٧٠ کۆمپانیـای کەنداوی هرسـۆنی ئینگلیـزی لـێ دامـەزراو بـوە هـۆی دروسـتبوونی

کێشەو ململانێ لەنێوان فەرەنساو ئینگلیز بەهۆی راوی ماسی کەرۆڵی گرنگی بازرگانی هەبوو، لەساڵی ١٧١٣ فەرەنسا ناوچەکانی نیو فوندلاندۆ هەسۆن بای ونۆفاسکوشیا لەدەست بدات و بۆ ئینگلترا بەجێ بهێلێ.

ئینگلترا توانی لەجەنگی حەوت ساڵەی ١٧٥٦تا ١٧٦٣ دەسەڵاتی خۆی فراوان بکات لەناوچەکە بەتایبەتی لەدوای ساڵی ١٧٥٩ کە جیمس وۆلف توانی سەرکەوتنی باش بەدەست بێنێ لەناوچەکانی کۆبێک، پەیمانی پاریس لە١٧٦٣ تەواوی کەنەدای دادەست دەسەڵاتی ئینگلترا. لەساڵی ١٨٤٩ ، لە١٨٦٧/٧/١ دان نرا بەمافی کەنەدا لە یەککرتنەوەی کەنەدای باڵاو کەندای خواروو، نۆفاسکۆشیاو نیو برۆنزدیک چونە ناو دۆمینیۆن لەدورگەی برنیس ئەردوارد لەساڵی ١٨٧٣. لەساڵی ١٨٧١ کۆلۆمبیای بەریتانی چوەناو دۆمینیۆن وهەموو لایەکی بەهێلی ئاسنی بەیەك بەستاوە.

لەساڵەکانی ١٨٦٦ تا ١٨٩٦ لەوکاتە کە کەنەدا بەرەو پێکهاتەیەکی باش هەنگاوی دەناو پارتی پارێزگاران بەسەرۆکایەتی سیرجۆن ماکدونالد دەسەڵاتی حوکمرانی گرتە دەست. بەڵام پێش ئەوپارتە بۆ ماوەیەکی کەم پارتی ئازاد دەسەڵاتدار بوو.

لەمانگی/١٩٤٩/٣ نیوفۆندلاند بوە هەرێمێکی کەنەدی لەدوای راپرس و دوای ئەویش هەرێمەکانی بۆکیش کە دەکەوێتە باکوری کۆلۆمبیای بەریتانی و رۆژهەڵاتی ئەلەسکا. هەرێمی باکوری رۆژئاوای کەهەموو خاکی کەنەدا دەگرێتەوە کە کەوتۆتە باکوری هێلی پانی ٦٠ تەنیا بۆکۆن نەبێت، لەساڵی ١٩٧٤ حکومەتی کۆبێك دەنگی دا بۆ لایەنگیرانی زمانی فەرەنسی لەوهەرێمەو کەنەدا لەمێژووی پەرەسەندن و پێشکەوتن و رووداو ململانێی نێوان دانیشتوانەکانی فەرەنسی و ئینگلیزی لەسەر جیابوونەوە یاخود بەشداری کردن رۆڵی گرنگی هەبووە لەرامیاریەتی نێودەوڵەتی هەمەلایەن، لەمانگی ١٩٩٧/٦پارتی ئازاد لەدەسەڵات مایەوە لەئەنجامی سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنەکان، لەمانگی ٨/ ١٩٩٨لەراپرسی رای جیابونەوە لەکەنەدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا دوای ئەوە لەمانگی /١٩٩٨/٩حکومەت داوای لێبوردنی لەگەلانی رەسەنی کەنەدا کرد بەهۆی ئێش و ئازاری رابردوی. لەمانگی/١٩٩٩/٤هەڵسا بەجێبەجێکردنی رێکەوتنە تایبەتیەکە بە دامەزراندنی نیشتمانی نەتەوەیی بۆ لاسکیمۆو مافی ئۆتۆنۆمیان هەیە بەناوی" نۆنافوت" کە لەماوەی ١٥٠ ساڵی رابردوو زۆر چەوسانەوەی هاوڵاتیانی بەخۆ بینی گەرچی کەنەدا رۆڵی گرنگی هەیە لەرامیاریەتی نێودەوڵەتی و بەشداری کردنی لەرزگارکردنی گەلانی عێراق لەساڵی ٢٠٠٣ لەگەڵ هاوپەیمانانی ئەمەریکاو بەریتانیا.

- کەنەدا ئەندامە لەنەتەوەیەکگرتووەکان، ئەندامە لەرێکخراوی هاوکاری ئابووری ئاسیا، ئەندامە لەکۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لەرێکخراوی هاوکاریی و بوژانەوەی ئابوری، ئەندامە لەرێکخراوی ئاسایش وهاوکاری ئەورووپی و چەندین رێکخراوی تری نێودەوڵەتی.

# کـــــووبـــا

• ناوی ڕەسمی:کۆماری کووبا.
• پایتــەختی: هاڤانــا، ژمــارەی دانیــشتوانی ۲٫۳٦٥٫۰۰۰ ملیۆن کەسە.
• شـاره سـەرەکیەکانی: کامـابوای، هۆلجـوین، گوانتانامۆ، سانتیا جودی کۆبا.
• بەنـدەرەکانی: مـاتنخلس. سـانتیاگۆدی کوبـا، هاڤانا.
• ژمارەی دانیشتوانی: ۱۱٫۸٤۰ ملیـۆن کەسـە، بەپێی ئاماری ۱۹۹۹.
• ڕووبـــەری: ٤۲٫۸۰۳ میــل چـــوار گۆشـــەو ۱۱۰٫۸٦۰ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
• چـری دانیـشتوانی: ۲۷۸ کـەس لـە یـەك میـل چوار گۆشەدا.
• نـژادەکانی: مولتــۆ ٥۲٪، سـپی پێـست ۳٥٪، ڕەش پێست ۱۱٪.
• زمانەکانی: ئەسپانی (زەمانی ڕەسمیە).
• ئایینەکانی: مەسیحی، کاسۆلیکی، ڕۆمانی.
• زانینی خوێندن ونوسین: ۹۷٪.
• دابەشــی کــارگێری: ١٤ پارێزگایــە، لەگــەڵ ئەنجومەنی شارەوانی تایبەت.
• دراوی: بیزۆی کوبی.
• کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی:۱۷٫۰۱۰ ملیــار دۆلارە.
• بەشـی تـاك لـە کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ۱٫٥٥۰ دۆلارە.
• بەرگری: ۳٫٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
• سوپایەکەی: ٦٥٫۰۰۰ هەزار کەسە.
• زەوی کشتوکاڵی: ۲٤٫۳٪ لەخاکی وڵاتەکە.
• بەرهــەمی کــشتوکاڵی: قــاوە، گــەنم وجــۆ، چـەوەندەری شـەکر، بـرنج، سـوریی، تـەرە، میوەجات، توتن.
• سامانی ئـاژەڵی:مـەر ۳۳۰٫۰۰۰ هـەزار سـەر، بزن ۱۲٥٫۰۰۰ هەزار سەر، چێل ٤٫٥۰۰ ملیۆن سەر، بەراز ۱٫٥٥۰ ملیۆن سەر، پەرەور ۱۲٫٥ ملیۆن سەر.
• سـامانی سروشـتی: نیکـل، ئاسـن، نوحـاس، خوێ، موگناتیس.
• پیـشەسازی: پـالاوتنی نـەوت، ئامـادەکردنی خـۆراك، دروسـتکردنی شـەکر، رسـتن وچـنین، بـەرو بـومی دار، کەلوپـەلی بـەکار هێنـانی، داو دەرمان. دروستکردنی جگەرە.
• بەرهـــەمی کارەبـــا: ۱۳٫٥ ملیـــار کیلـــۆ وات کاتژمێر.
• داهـاتی دەرەوەی: نـەوت، ماشـێنو ئوتومبیـل، کیمیاوی، پێداویستی خۆراك.
• دەرچوەکانی: شـەکر، قـاوە، نیکـل، کەلوپـەلی پزیشکی، خوی، جگەرە.
• هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، کەنـەدا، چینی میللـــی، ئیتاڵیـــا، ئەســـپانیا، ئەرجـــەنتین، مەکـسیك، ڕووسـیا، وڵاتـانی کۆمەنولـسی وڵاتانی سەربەخۆی سۆڤیەتی پێشوو، عێراق.
• ڕژێمی دەسـەڵات: وڵاتێکی شیوعیە و فیـدل کاســترۆ ســەرۆك دەوڵەتــە لــە ســاڵی ۱۹۷٦ تاکۆتـایی سـاڵی ۲۰۰٤. ئەنجومـەنی ئومـە هـەر پێـنج سـاڵ جارێـك هەڵدەبـژێردرێت کـە لـە۳۱ ئەنـدام پێـك هـاتووە سـەرۆك ئەنجومــەنو یاریدەدەرکـــەی هەڵدەبـــژێردرێن، کاســـترۆ ســـەرۆکی هەرێمەکانــە وســەرۆك دەوڵــەتو سکرتێری حزبی شیوعیەو هیچ حیزبێکی تر نیە لە کۆماری کوبای سۆشیالیستی.
• جوگرافیای وڵات: کوبا گەورەترین دورگەیە لە ناوچـەی دەریــای کــاریبی کــە دەکەوێتــە دەروازەی کەنداوی مەکسیك بەدوری ۹۰ میل لە باشووری زنجیرەی دورگەی فلوریدا کیز کە یەکێکە لە دورگەی هندی ڕۆژئاواو دەکەوێتە دوراییی ڕۆژئاوا، لە باکووری باهامز وئەمەریکا، لە ڕۆژئاوای مەکسیك، لە باشووری جامایکا، لە ڕۆژهەلاتی هایتی.

- مێژووی وڵات: دانیشتوانی ڕەسەنی کوبا (هندوئاراواك) بونە لەو کاتەی کۆلۆمبوس لە ساڵی ١٤٩٢ سەردانی ناوچەکەی کرد بەڵام ئەو نژادە مرۆڤە بەهۆی جۆرە نەخۆشی ترسناك توانەوەبەپێی زانیاریەکانی کە لە لایەن دەریاوانەکان رویان لە ناوچەکەکردبوو.

لە سەرەتای ساڵی ١٥١١ ئەسپانەکان رویان لەو ناوچەیە کرد بۆ بازرگانی کردن‌و بنکەی سەرەکی کۆکردنەوەی کەلوپەلی جۆراو جۆری بازرگانیان لێ دەمەزراند

دوای ئەوە ئیسپانەکان عەبیدو کریکاری رەش پێستیان هێنا بۆ کارپێکردن لە بەرهەم هێنانی چەوەندەری شەکر. دوای ئەوە کێشەو مل ملانێ لە نێوان دەسەڵاتدارانی ئیسپانیاو راپەڕینی کرێکاران بەرپابور کە بوە هۆی شەرێکی ناوخۆ، لەنێوان ساڵەکانی ١٨٦٧ تا ١٨٩٥ کە شاعیری بەناوبانگ (خۆزێ مارتێ) سەرکردایەتی دەکرد لەپێناو کۆتای پێکهێنانی دەسەڵاتی ئیسپانی لە دورگەکەو ئەمەریکا لایەنگری تێکۆشەرانی دەکرد ئەمەش لەدوای نقوم بوونی دوو باریجەی دەریایی ئەمەریکی لە بەندەری هاڤانابوو.

لە ١٩٠٢/٥/٢٠ کوربا بوە وڵاتێکی سەربەخۆ لە ژێر پارێزراوی ئەمەریکا سەرەرای ئەوە تێکۆشان بەردەوام بو لە پیناو سەربەخۆی تەواو، دوو جار ئەمەریکا خۆپیشاندەرانی کرێکاران‌و جەماوەری لەناو برد لە ساڵەکانی ١٩١٢ تا ١٩١٧، لەساڵی ١٩٢٤ ئەمەریکا ماف دەست تێوەردانی نەما لەکاورباری کوبا، دوای ئەوە لە ڕێگەی چەند کودەتایەکی سەربازی دەسەڵات وەرگیراو رژێمێکی دکتاتۆری لە کوبا دامەزرا بەپشتگیری لێکردنی ئەمەریکا، لە ساڵی ١٩٤٢ باتیستا کە سەرۆکی کوبا بوو خانەنشین کرا (هۆسان مارتین)، جێگەی گرتەوە بەڵام باتێستا دوبارە لە ساڵی ١٩٥٢ گەراوە سەر دەسەڵات. لە ساڵی ١٩٥٣ کاسترو هەولی کودەتایەکی سەربازی ئەنجامدا دژی باتێستا بەڵام سەرنەکەوت، دوای بەهاوکاری لەگەڵ هاورێی دڵسۆزەکەی گیڤارا دەستیان کرد بە شۆرش دژی دەسەڵاتی باتێستا تاکو ساڵی ١٩٥٩ باتێستا هەڵات وکاسترۆ ئەو بۆشایەی وەرگرت‌و سەرۆکایەتی وەزیرانی گرتە دەست‌و کاسترۆ دەستیکرد بەرامیاریەتی خۆماڵی کردنی دامودەزگا تایبەتیەکان بەدروستکردنی کۆمەڵەی هەرەوەزی حکومی وجوتیاری‌و بانکەکان‌و سامان‌و خاوەندێتی ئەمەریکا.

ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٦٢ گەماروی ئابووری لە سەر کوبا دانا، کێشەی نێوان سۆڤیەت وئەمەریکا دەستی پێکرد لە بارو دۆخێکی دژوار تاکو پێش کۆتای هاتنی جەنگی سارد لە نێوان هەردوو بلوکی سوشیالستی و سەرمایەداری بەڵام بەر لەوە بەنهێنی دەستکرا بەدامەزراندنی جێگەی موشەك هاوێشتن لە خاکی کوبا رووبەرووی ئەمەریکا، لەدوای سەردانی وەزیری بەرگری بۆ مۆسکۆ. لە١٢/٢/ ١٩٦٢سەرۆکی ئەمریکی جۆن کەنەدی نارەزایی خۆی بەرامبەر سۆڤیەت دەربڕی‌و دوای هەولی زۆری دبلۆماسی لەنێوان هەردوو وڵاتی زلهێزو دورکەوتنەوەیان لەجەنگی سێیەمی جیهان بەهەڵوەشانەوەی بنکەی موشەکی سۆڤیەت لەکوبا. لەسالی ١٩٧٧کوباو ئەمەریکا ڕێکەوتنیان مۆر کرد بەگەڕاندنەوەی پەیوەندی دبلۆماسی نەك پەیوەندی دەوڵەتی، دوای ئەوە بەندە ڕامیاریەکان ئازادکران دوای ئەوە ڕێکەوتن لەنێوان ئەمەریکاو کوبا مۆر کرا بۆ وەرگرتنی پەنابەرانی کوبا لەئەمەریکا بەڵام ئەمەریکا ئەو داوایەی ڕەتکردەوە. لەمانگی ٤/١٩٩٨/پاپا یوحنا سەردانی کوبای کرد، دوای ئەوە لەسالی ١٩٩٩ ناکوکی نێوان کوباو ئەمەریکا دەستی پێ کرد تا کو ئێستاش بەردەوامەو رۆژ لە دوای رۆژ بەرەو ساردبونەوە دەروات.

- کوبا ئەندامە لەنەتەوە یەکگروەکان ، ئەندامە لە رێکخراوی کاری نێو دەولەتی ، ئەندامە لە رێکخراوی تەندروستی جیهانی . ئەندامە لە رێکخراوی بازرگانی جیهانی، ئەندامە لە رێکخراوی دەریاوانی نێو دەولەتی.

# هـــايـيـتـى

- ناوی رەسمی : کۆماری هاییتی.
- پایتـــەختی: بـــۆرت ئـــۆبرکینس، ژمـــارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۱٫۳٦۰ هەزار کەسە.
- شارە گرنگـەکانی: جۆنـایف، هایتیـا، کـایی، بۆرت ئۆبرکینس، دلابیە.
- بەنـدەرەکانی: لینکـا، کـابی، هایڤیـا، بـۆرت ئۆبرکینس.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ۰۰۰ر۷٫۹٦٥ ملیـۆن کەسە، بەپێی ئاماری ۲۰۰۰.
- رووبەری: ۱۰ر۷۱٤ میل چوار گۆشەو ۷۵۰ر۲۷ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چری دانیشتوانی: ۷٤۳ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- نژادەکانی: رەش پێستەکان ۹۵٪.
- زمانـــەکانی: هایتیـــا کریـــۆل، فەرەنـــسی (هەردووکیان زمانی رەسمین).
- ئایینـــەکانی: کاســـۆلیکی رۆمـــانی ۸۲٪ ، برۆتستنت ۱۷٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ۵۲٪.
- دابەشی کـارگێری: ۹ ناوچـەی پارێزگاییـە لـە دوو هەرێمی یەکگرتوو.
- دراوی: جۆرد.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ۱۵۰ر۷ مليـار دۆلارە.
- بەشـی تـاك لـە کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ۱۵۰ر۱ دۆلارە.
- بەرگری: ۵ر٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر٤۵ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکالّی: ۳ر۲۰٪ لە خاکی وولاّتەکە.
- بەرهـەمی کشتوکالّی: گـەنم وجۆ، چـەوەندەری شـەکر، تـەرەومیوەجات ، قـاوە، گەنمـە شـامی، برنج.
- سـامانی ئـاژەڵی: مـەر ۰۰۰ر۱٤۰ هـەزار سـەر، بزن ۱٫٦۵۰ ملیـۆن سـەر، چێل ۲۰۰ر۱ ملیـۆن سـەر، بـەراز ۰۰۰ر۸۱۵ هـەزار سـەر، پـەرەوەر ۵ر۱٦۰ ملیۆن سەر
- داهـاتی دەرەوەی: سـوتەمەنی، رۆن وگـریس، کیمیـــاوی، ماشـــێن و ئوتومۆبێـــل، خـــۆراك، خواردنەوە.
- پیـشەسازی: دروسـتکردنی شـەکر، رسـتن وچنین، ئامادەکردنی داری دارستانەکان.
- بەرهـــەمی کارەبـــا: ۷٦۰ ملیـــار کیلـــۆ وات کاتژمێر.
- دەرچـوەکانی: قـاوە، بەرهـەمی کـشتوکالّی، بەرهەمی پیشەسازی سووك.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: فەرەنسا، یابان، چینی میللی، ئەمەریکا، ئیتاّلیا.
- رژێمی دەسەلاّت: هایتی کۆمارێکی پەرلەمانیە، دوو ئەنجومـەنی هەیـە یەکـەمیان ئەنجومـەنی پـیران کەلـە ۲۷ ئەنـدام پێـك هـاتووە، دووەم ئەنجومـەنی نوێنـەران کـە لـە ۸۳ ئەنـدام پێـك هاتووە، لەگەڵ ئەنجومەنی وەزیران.
- پارتـە رامیاریـەکان: رێکخـراوی لامـالای میللـی رامیـاری، بـەرەی نیـشتمانی بـۆ گـۆرینی دیموکراتی، پارتی چەپی ناوەندی.
- جوگرافیـای ولاّت: کۆمـارێکی سـەربەخۆیە لـە دەریای کـاریبی، سیّ بەشـی رۆژئاوای دورگـەی هیـسپا نیـولا دەگرێتـەوە، بەشـەکەی تـری دورگـەی کۆمـاری دۆمینیکـان دەگرێتـەوە، لـە رۆژهەلات کۆماری دۆمینیکا، لەرۆژئاوا کوبا.
- مێـژووی ولاّت: لەسـاڵی ۱٤۹۲ کۆلۆمبـۆس هـایتی دۆزیـەوە لـەو کاتـەی بـەرەو سـانت نیکۆلاس رۆیشت. هاییتی لە ساڵی ۱٦۹۷ بوە خاوەندیـەتی فەرەنسی ناسـراو بـەناوی سانت دۆمـیج، لەسـاڵی ۱۷۹۱ راپـەرین لـە لایـەن دانیشتوانەکەی ئەنجام درا لەپێناو باش کردنی باری ژیانیـان کە ژمارەی لە ۵۰۰ هـەزار کـەس زیـاتر دەبـوو، ئـەو راپەرینـە کۆتـای هـات بـە

ڕاگەیاندنی سەربەخۆی وولاتەکە لە ساڵی ١٨٠١ لە لایەن دۆمینك لۆفرۆتو، بەڵام ناپلیۆن هەڵسا بە لەناو بردنی ئەو جولانەوە سەربەخۆیە بەڵام لە کۆتایی هەر سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە ١/١/ ١٨٠٤ بە سەرۆکایەتی جاك دیسالین کە ناوی وولاتەکەی گەراندەوە سەر ناوی رەسمی خۆی ئەویش هاییتی بوو، لە نێوان ساڵەکانی ١٩١٥ تا ١٩٣٤ دەسەڵاتی ئەمەریکا لە سەر وولاتەکە بوو تا رادەیەك ئارامی بەخۆیەوە گرتبوو چونکە کێشەو مل ملانێی زۆری تیا نەبوو، لە ساڵی ١٩٤٩ دکتاتۆریەت گەراوە وولاتەکە کە پێشتر وولاتێکی دیموکراتی گەشاوەبوو، هاییتی بەچەندین گۆڕانکاری دەسەڵاتدا تێپەر بوەبەتایبەتی لەدوای سالەکانی ١٩٩٠و ١٩٩١ تا١٩٩٣ بەهۆی کودەتا یەك لەدوای یەکەکان تاکو مانگی /٧/١٩٩٤کە ئەنجومەنی نەتەوە یەکگرتوەکان هێزی فرە رەگەزی رەوانەی هایتی کرد بۆ ئارام کردنەوەی بارو دۆخەکەو دوای لە ٢١/٥/ ١٩٩٥هێزەکانی نێو دەوڵەتی دەستیان بەسەر هایتی داگرتو سەرۆکی دورخراوە ئەرستیدیان گەراندەوە سەر دەسەڵات، دوای ئەوە لە مانگی /١٩٩٦/٤ئەرستید دەسەڵاتی دا دەست رینیە رینیە پریفالی هەلبژێردراو. لە١٧/٤/١٩٩٦هێزەکانی ئەمەریکا هایتیان بەجێ هێشت. تاکو ئێستاش هاییتی لەبارودۆخێکی نا لەبار پەرە دەسەنێ بە هۆی کێشەی دەسەڵاتی نێوان سەرکردەو پارتەکانو دوای ئەوە سەرۆك وەزیارن بە مەرسومی کۆماری دامزرا لە دوای ساڵی ١٩٩٩.

- هاییتی ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لەرێکخراوی نێو دەوڵەتی ئەمەریکی، ئەندامە لە زۆربەی رێکخراوە نێودەوڵەتی.

# نیکارگوا

- ناوی رەسمی: کۆماری نیکارگوا.
- پایتەختی: ماناگوا، ژمارەی دانیشتوانی٠٠٠ر٢٨٠ر١ ملیۆن کەسە.
- بەندەرەکانی: کۆرینتۆ، برۆتوسندیتۆ، شاری لیۆن و شاری گرانادای تیایە کەبەناوبانگن.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٩٤٧ر٤ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- رووبەری: ١٩٣ر٥٠ میل چوار گۆشەو ٠٠٠ر١٣٠ هەزار کیلومەتر چوار گۆشەیە.
- چری دانیشتوانی: ٩٧ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- نژادەکانی: مستیزۆ ٧٠٪، سپی پێستەکان ١٥٪، پێست رەشەکان ٩٪، هندی ٥٪.
- زمانەکانی: ئەسپانی (زمانی رەسمیە).
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی رۆمانی ٩٦٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٧٠٪.
- دابەشی کارگێری: ١٥ پارێزگایە + دوو هەرێمی خاوەن مافی ئۆتونومی .
- دراوی: قرتبەی زێر.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٢٥٠ر٩ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٢٥٠ر٢ دۆلارە.
- بەرگری: ٥ر٣ ٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر٥٥ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٤ر٩٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، تەرەو میوەجات، پەمۆ، مۆز، خوێ، قاوە، چەوەندەری

شەکر، برنج، چەندین جۆری دانەوێڵەی تر.

- سامانی ئاژەڵی: مەروبزن ٠٠٠ر٧٦٧ هەزار سەر، چێڵ ٦٠٠ر١ ملیۆن سەر، بەراز ٠٠٠ر٤٥٠ هەزار سەر، پەرەور ٨٠٠ر٩ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: نوحاس، زیوو، زێڕ، ماسی دەریا، داری دارستانەکان.
- پیشەسازی: دروستکردنی شەکر، ئامادەکردنی خۆراک، خۆشکردنی پێست، رستن وچنین، دروستکردنی رۆن، دروستکردنی پێڵاو.
- بەرهەمی کارەبا: ٥٠٠ر٢ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: خۆراک، جل وبەرگ، کیمیاوی، نەوتی خاو، ماشێن وئۆتۆمبێل.
- دەرەچوەکانی: قاوە، شەکر، گۆشت، پەمۆ، ماسی ئامادەکراو، مۆز.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یەکێتی ئەوروپا، یابان ، چین، ئەمەریکا، مەکسیک سلفادۆر، فنزویلا، گواتیمالا،
- رژێمی دەسەلات: وولاتێکی کۆماریەو سەرۆک کۆمار هەر ئەویش سەرەک حکومەتە، کۆمەڵەی نیشتمانی دەسەلاتی یاسادانانی هەیە، لەبوارە جیاجیاکانی ولات.
- پارتە رامیاریەکان: بەرەی رزگاری ساندینستای نیشتمانی، پارتی مارکسی لینینی، هاوپەیمانی بەرهەڵستکار، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری بچوکی تیایە.
- جوگرافیای ولات: نیکارگوا گەورەترین کۆمارە لە ئەمەریکای ناوەندی بەلام لەرووی دانیشتوانی ژمارەی کەمە، لەباکوری هیندۆراس، لە باشووری کۆستەریکا، لە رۆژهەلاتی دەریای کاریبی، لە رۆژئاوای زریایی هادی. نیکارگوا وولاتێکی بورکانیە، دەریاچەودارستانی زۆری تیایە، لە رۆژئاوا چیای بەرزی تیایە، دوو دەریاچەی گەورەی تیایە کە دەریاچەی نیکار گوا ١٦١ کیلومەتر درێژیەتی و دەریاچەی مانگوا ٦١ کیلومەتر درێژیەتی..
- مێژووی ولات: لە دوای سەدەی نۆی زایینی هیندیەکان لە مەکسیک و میزۆیەکان لە ئەمەریکا کۆچیان بەرەو نیکارگوا کرد بە درێژای کەنارەکانی زەریای هادی، لە دوای سالی ١٥٢٢ هۆزە هیندیەکان بونە دەسەلاتدار لە ولاتەکە لەو کاتەی کە جۆنزالیزۆی ئەفیلای ئەسپانی سەردانی ولاتەکەی کرد، دوای لەسالی ١٩٢٤ ئەسپانیەکان دەستیان بەسەر داگرت بە سەرکردایەتی فرانسمکوادی کوردویا بەهۆی بوونی سامانی زێڕ لە ناوچەکە وشاری گراناداو لیۆنی لێ دامەزراند.

لە سەدەی هەڤدەم وهەژدەم بەریتانیەکان بە هێزترین دەسەلات بوون لە لایەنی کاریبی و نیکار گواو ئەسپانیەکان لەسەر زەمیەکانی کەناری زەریای هادی.

لە ١٨٢١/٩/١٥ نیکارگوا سەربەخۆی لەئەسپانیا وەرگرت بۆ ماوەیەکی کورت و دوایی لەگەڵ مەکسیک یەکیان گرت، دوای لەگەڵ ئەمەریکای ناوەندی، نیکاراگوا بوە کۆمارێکی سەربەخۆ لە سالی ١٨٣٨، لە دوای سالی ١٨٩٣ تاکو ١٩٣٧ نیکارگوا بە باروددۆخێکی دەسەلاتی توندوتیژ هەنگاوی دەنا بەهۆی دەسەلاتی دیکتاتۆری یەکلایەنی و کێشە وململانێی نێوان بیرو بۆچونی جیاجیاو دەست تێوەردانی ئەمەریکا لە کاروباری ناوخۆ، لەگەڵ ئەوەشدا سۆمۆزا بوە سەرۆک کۆمار کە هەمان رامیاریەتی نیمچە دکتاتۆری گرتەبەر ئەویش بەبەمێز کردنی ئابووری بنەماڵەکەی لە کۆکردنەوەی سامانی زۆر، لە سالی ١٩٧٩ بەرەی رزگاری ساندینستا توانی حکومەتی سۆمۆزا لەناوبات لە رێگەی پەلاماری

سەربازی بۆ سەر دەسەڵاتەکەی، لەساڵی ١٩٨٠ بەرەی رزگاری ساندینستا دەسەڵاتی وەرگرت لە دوای تیرۆرکردنی سۆمۆزا.

لە ساڵی ١٩٨٤ سوپای پیادەی دەریای ئەمەریکا بەندەرەکانی نیکارگوای مین رێژکرد، دادگای نێو دەوڵەتی ئەوکارەی بەتاوان لەقەڵەمداو داوای پاککردنەوەی وڵاتەکەی لێکرد. لە دوای ساڵی ١٩٩٠ ئەمەریکا توانی لایەنگرانی خۆی سەکەوێنێت لە دەسەڵاتو بوە هۆی لێک ترازانی بارودۆخی وڵاتەکەو دروست بونی کیشەو ململانێی توندی نێوان دەسەڵاتداران و بەرهەڵستکاران تاکو مانگی/١٠/ ١٩٩٦ کە بوە هۆی هەلاتنی ئەرنۆلد، لاکۆیۆد ئۆرتێگا لەهەڵبژاردنەکان سەرکەوت و پۆستی سەرۆکایەتی وڵاتی وەرگرت و بڕیاری دەستوری نوێی دا کە لە دەستوری نوێی وڵات کێشەکان تا رادەیەک چارەسەر کران.

- نیکارا گوا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، لەچەندین رێکخراوی تری گرنگی نیو دەوڵەتی کە سوودی بۆ پەرەسەندن و پێشکەوتنی وڵاتەکە هەیە.

## بەهاما "دوورگەی بەهاما"

- ناوی رەسمی: یەکێتی بەهامز.
- پایتەختی: ناساو، ژمارەی دانیشتوانی ١٩٥ر٠٠٠ هەزار کەسە لەسەر دورگەی نیوبرۆفیدنسییە.
- شارە گرنگەکانی: ففری بۆرت کە لە دورگەی باهامای گەورەیە.
- رووبەری: ٣٨٠ر٥ میل چوارگۆشە و١٣ر٩٢٩ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٢٨٧ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- چڕی دانیشتوانی: ٧١ کەس لەیەک میل چوارگۆشەدا.
- رەگەزەکانی: پێست رەشەکان کە لەرەسەنی ئەفریقین ٨٥٪ ، پێست سپیەکانی بەریتانی و کەنەدی و ئەمەریکی ١٥٪.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ١ر٦٪.
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی رەسمیە)، کریبیۆلیەکان.
- ئاینەکانی: محەمەدانی ٣٤٪، ئینگلیزەکان سەر بەکەنیسەی ئینگلیزی ٣٢٪، کاسۆلیکی رۆمانی ١٩٪، مەسیحیەکانی تری سەر بە مەزهەبەکان ٢٤٪.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٩٥٪.
- رژێمی دەسەڵات: شانشینی دەستوریە، شانشین (ئەلیزابیت)ی دووەمی شانشینی بەریتانیا سەرۆکی وڵاتەو دادوەرێکی گشتی نوێنەرایەتی دەکات، یەکێکە لە وڵاتە کۆمەنولسەکانی لقی سەربەخۆ بوو لە١٠/٧/١٩٧٣. لەدوای ١٩٦٨ وڵاتی بەهامز هەنگاوی بەرەو زیاتر بەهێزکردنی مافی ئۆتۆنۆمی، لیندن بیترلینج سەرۆکی پێست رەشەکان بوو لە پارتی ئازادی پێشکەوتنێکی باشی بەخۆوە بینی و لەهەڵبژاردنەکان سەرکەوت بە ٢٩ کورسی لە ئەنجومەنی یاسا دانان بەرامبەر حەوت کورسی بۆ پارتی بەهامیەکانی یەکگرتوو، پارتی پێست سپیەکان لە دەسەڵاتداران بون لەلایەن دادوەری وڵات. لە١٠/٧/١٩٧٣ دورگەی بەهامز بووە وڵاتێکی سەربەخۆ و پەیوەندی دیبلۆماسی لەگەڵ کوبا گرێ دا لە ساڵی ١٩٧٤ .
- دابەشی کارگێری: ١٨ بەشەو بنەڕەتەکەی

کۆمەڵێکی سروشتین لە دورگەکە.

- پارتە رامیاریەکان: پارتی ئازادی پێشکەوتوو، پارتی مام ناوەندی، پارتی جوڵانەوەی نەتەوەیی ئازاد، چەپی ناوەندی.
- بەرگری: ٧ر١٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- هێزی ئاسایش: ٥٠٠ر٩ هەزار کەسە.
- دراوی: دۆلاری بەهام.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٣٨ر٠٠٠ ملیۆن دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١٩ر٥٠٠ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: میوەجات، تەرە بەهەموو جۆرەکانی، دانەوێلە، چەندین بەرهەمی کشتوکاڵی تر .
- داهاتی سروشتی: خوێ، دار، ماسی، ئەراجۆنێل.
- بەرهەمی کارەبا: ١ر٥ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازی: گەشت و گوزار (زیاتر لە ٥٠٪ی کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیە) کاری بانکی، مەی بەهەموو جۆرەکانی، دار، داو دەرمانی پزیشکی، بەرهەمی پاك کردنەوەی نەوت، ماسی.
- دەرچووەکانی: تریاك بەهەموو جۆرەکانی، دار، داو دەرمانی پزیشکی، ماسی، چیمەنتۆ. تریاکی قەدەغەکراو: ئەویش خاڵێکی پەرینەوەی بازرگانیە لەکۆکاین.
- داهاتەکانی دەرەوەی: پێداویستیەکانی خواردەمەنی، کەلوپەلی دروستکراو، نەوت و غاز و بەنزین و گازوایل و رۆن، دانەوێلە، جل و بەرگ، بەرهەمەکانی رستن و چنین، ماشێن و ئۆتۆمبێل ..
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، بەریتانیا، نێجیریا، کەنەدا، ئێران.
- جوگرافیای وولات: دورگەی بەهامز لەدورگەی ئەرخەبیلە نزیکەی ٧٠٠ مێرگی کەمەرەیی گرتۆتە خۆی و دورگەیەکی بچوکی بێ دانیشتوانە و ٢٤٠٠ دورگەی تیایە، دەکەوێتە زەریای ئەتڵەسی بە درێژی ٥٠ میل لە رۆژهەڵاتی کەناری فلۆریدای ئەمەریکا، دورگەی فلۆریدا درێژ دەبێتەوە لە رۆژهەڵاتی بۆ رۆژئاوای هایتی و باشووری رۆژهەڵاتی لەماوەی نزیکەی ٧٦٠ میل، کە ١٢٢٣ کیلۆمەتر، دورگەیەکی هێمنە و ٢٣ دروگەی لەخۆ گرتیە، گرنگترینیان دورگەی نیۆبردفیدنسە کە ٢٠٧ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە کەناسۆی پایتەختی تیایە. لەگەڵ دورگەی تریش، وەك بەهامای مەزن و ئەباکۆ، ئەلیۆترا، ئەندرۆز، کان ئیلند، سان سلفادۆر، ئکزیما، لونج ئیلند، کرۆکر، ئیلند، ئکلینز ئیلند، سایا جوانا، ئیتاجوا دورگەکان ژمارەی کەمیان بەرزدەبنەوە بەبەرزی ٦١ مەترلەسەر ئاستی دەریا، لە دورگەکان ئاوەڕۆی ئاوی ئاسازی نییە، زۆر دەریاچەی خوێاوی تیایە، ئۆندرۆزی شین کە ئەشکەوتێکی گەورەیە کە دوروو درێژترین ئەشکەوتە لە ژێر ئاو لەجیهان، نزیکترین وولات لەبەهاما، بەریتانیا لە رۆژئاوا، کوبا لەرۆژهەڵات، کەش و هەوای گەرم و ساردە، لە ٢١ تاکو ٣٠ پلەی سەدیە، وەرزی باران بارین لە مانگی پێنج تاکو مانگی دەیە لە ساڵدا.
- مێژووی بەهامز: هندیەکانی ئاراواك لەسەدەی هەشت و نۆیی زاینی گەیشتنە دورگەی بەهامزو لێی نیشتەجێ بوون، لەدوای ئەوە هیندیەکانی دورگەی هیندی رۆژئاوا دەریان کردن، کریستوفر کۆلمبۆس لە ساڵی ١٤٩٢ بۆ یەکەم جار سەردانی ئەو دورگەیەی کرد کە لەوکاتە هیندیەکانی ئاراواك بەرەو ناوچەکە دەگوازرانەوە بۆ کاری دەرهێنانی زێڕو زیوو لە کوباو هیسنیولاك و (هایتی). نفشالزی یەکەمی شانشینی ئینگلترا ئەو دورگەی پێشکەش بە رۆبرت هیپ کردو بوە ئیستیعماریەتی و دورگەی (نیۆبرۆفیدنس) کە گەورەترین

دورگەی ئەرخەبیلە، لە سالی ١٦٦٦ تا ١٧٨٢ لە ژێر دەسەلاتی ئەسپانیەکان وەرگیراوە، لەدوای ماوەیەکی کەم داگیرکراو بوە ژێر دەستەیەکی بەریتانیا کە ئەمەریکیەکان تێیدا نیشتەجێ بوون و لایەنگیری تاجی بەریتانیان دەکرد لە کاتی جەنگی سەربەخۆی ئەمەریکا، لە سالی ١٨٣٨ کۆیلایەتی ڕزگار کرا. لەماوەی سالەکانی ١٩٤٠ تا ١٩٤٥ دوک و ندسۆر کە شانشینی پێشووی بەریتانیا بوو، بەناوی (ئەدواردی دووەم) لەسەر کورسی شانشینی هاتە خوارێ بەهۆی مارەکردنی بێوەژنێکی ئەمریکی کە ئەمەش لەگەڵ داب و نەریتی کورسی شانشینی بەریتانیا نەدەگونجا کە دادوەرێکی بەریتانیا بوو لەبەهامز، لە سالی ١٩٦٤ دورگەی بەهامز ئۆتۆنۆمی ناوخۆی وەرگرت، لە سالی ١٩٦٧ سەرکردەی پێست ڕەش (لیندن بزلینج پلەی سەرۆک وەزیرانی وەرگرت لەدوای سەرکەوتنی پارتەکەی (پارتی ئازادی پێشکەوتوو) لەیەکەم هەڵبژاردنی نوێنەری)، لە ١٠/٧/ ١٩٧٣ وولاتی بەهامز سەربەخۆی تەواوی وەرگت لەناو وولاتانی کۆمەنولسی بەریتانیا، لەسالی ١٩٩٣ کۆتایی بەدەسەلاتی یەك پارت هات کە پارتی ئازادی پێشکەوتن بوو بە سەرۆکایەتی بیند لینجلە دوای حوکمڕانی ٢٥ساڵ و دوای ئەویش پارتی جولانەوەی نەتەوەیی ئازاد سەرۆکایەتی وولاتی گرتە دەست بەسەرۆکایەتی هیوبرت ئندهام لەدوای سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنەکان ئیتر بەرەو پێش کەوتن و پەرەسەندن هەنگاوی نا تائەو دورگەیە بووە مەڵبەندێکی سەرەکی بۆ کاری بازرگانی گشتی و بانکی نێودەوڵەتی.

- بەهامز ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە ڕێکخراوی وولاتانی ئەمەریکا، ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

## دۆمەنیکا

- ناوی ڕەسمی: دەوڵەتی دۆمەنیکا.
- پایتەختی: رۆزۆ، ژمارەی دانیشتوانی ١٧٦٥٠ هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ٢٩٠ میل چوارگۆشەو ٧٥١ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٨٦٥ر٦٥ هەزار کەسە.
- چڕی دانیشتوانی: ٢٢٧ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- نژادەکانی: زۆربەی دانیشتوانی ئەفریقیەو هەندێ لەکاریبی تیایە.
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی ٧٧٪. برۆتستنت ١٥٪ ڕێژەکەی تر ئاینی هەمە جۆری تیایە.
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی ڕەسمیە) زاراوەی فەرەنسی و ناوخۆیی تیایە.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٩٩٪.
- ڕژێمی دەسەلات: پەرلەمانی دیموکراتی کۆماریە، سەرۆك کۆمار لەلایەن ئەنجومەنی یاسادانان هەڵدەبژێردرێ . سەرەك وەزیران لەلایەن سەرۆك کۆمار دەستنیشان دەکرێت بە ڕاوێژکردن لەگەڵ ئەنجومەنی یاسادانان.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی ئازادی کە داوای ئابووری بازاڕ ی ئازاد دەکات، پارتی یەکگرتووی کارگەران، پارتی کاری دۆمنیکانی یەکگرتوو.
- دابەشی کارگێری: ١٠ ناوچەیە لەسەر شێوازی فەزاکانی کوردستان.
- دراوی: دۆلاری ڕۆژهەلاتی کاریبی.

- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۲٫۳۵۰ ملیۆن دۆلار.
- بەشی تاك لەكۆی دەرئەنجامی ناوخۆی : ۲٫٦٥۰ دۆلارە
- زەوی کشتوکاڵی: ١٠٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: مۆز، خوێ، مانجۆ، گوێزی هیندی، دانەویلە، تەڕەو میوەجات.
- سامانی سروشتی: بۆمبس، شوشە، دار.
- بەرهەمی کارەبا: ۳٥ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.
- پیشەسازی: سابون، بەرهەمی دروستکراوی کشتوکاڵی، گەشت و گوزار.
- دەهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی دروستکراو، ئامێرو ماشێن، خواردەمەنی، کیمیاوی، داهاتەکانی هەمان شت.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: بەریتانیا، وولاتانی کاریبی، ئەمەریکا، ئیتالیا، کەنەدا، ئەڵمانیا، یابان.
- جوگرافیای وولات: وولاتی دۆمنیکا یەکێکە لەدوورگەی ئەنتلیزی بچوك لە دەریای کاریبی کە دەکەوێتە باشووری دورگەی چوار لوب و باکوری مارتینیك، خاکەکەی چیایەو لەناوەڕاستی زنجیرە چیایەکە کە درێژ دەبێتەوە لەباکور بۆ باشوور. ئەویش لە رەسەنا گڕکانیە زۆر چاوگەی ئاوی گەرمی تیایە، زەوی کەنارەکان گڵی سۆراویە لە کەناری تر زەویەکانی بەپیتە.
- مێژووی ولات: لە ساڵی ١٤٩٣ کۆلمبۆس سەردانی دورگەی دۆمەنیکای کردو داوای لە بەریتانیاو فەرەنسا کرد کە خاوەندیەتی دورگەکە بۆ خۆیان ئەنجام بدەن، بەلام بەریتانیا ڕایگەیاند کە ئەو دورگەیە ژێردەستەی خۆیەتی، لە ساڵی ١٨١٥ دۆمەنیکاو دورگەی ویندورد بونە ئەندامی (رایەلی وولاتانی دورگەی هیندی ڕۆژئاوا کە مافی ئۆتۆنۆمی بەدەست هێنابوو، بەلام دۆمەنیکا بەسترابووەوە بە بەریتانیا. بەلام لە ١٩٧٨ /١١/٣ سەربەخۆیی ڕاگەیاند لە دۆمەنیکا بەشداری داگیرکردنی دورگەی گرینادای کرد لەگەڵ ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٨٣، لە ساڵی ١٩٩٣ ڕامیاریەتی حکومەتی دۆمەنیکا بەردەوام بوو لە هەوڵەکانی لەپێناو رزگاربوون لەژێرکۆمپانیە خۆماڵیەکان.
- دۆمەنیکا ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە ڕێکخراوی وولاتانی ئەمەریکا، ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان.

# دۆمینیکان

- ناوی ڕەسمی: کۆماری دۆمینیکان.
- پایتەختی: سانتۆ دۆمینگۆ، ژمارەی دانیشتوانی ٢٧٥ر٢ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکییەکانی: سانتیاکۆدی لۆس، کابالیرۆس.
- بەندەرە سەرەکییەکانی: سانتۆ دۆمینگۆ.
- ڕووبەری: ٨١٥ر١٨ میل چوارگۆشە و ٧٣٠ر٤٨ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٧٩٨ر٨ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٨.
- چڕی دانیشتوانی: ٤٦٨ کەس لەیەک میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢ر٢٪.
- نەژادەکانی: مولاتە ٧٣٪ کە لەبنەڕەتا تێکەڵاوی ئەورووپی و ئەفریقیە، ئەورووپی ١٦٪ ئەفریقی ١١٪.
- زمانەکانی: ئەسپانی (زمانی ڕەسمییە) ئینگلیزی، فەرەنسی.
- ئاینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٨٥٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٢٩ پارێزگایە + پایتەختی سانتۆ دۆمینگۆ.
- بێکاری: ٥ر٦٪ لەکۆی دەر ئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر٧٥هەزار کەسە.
- دراوی :بیزۆ.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٦٠٠ر٢٨ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاک لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٧٥٠ر٤ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢٤٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: کاکاو، پەمۆ، برنج، بۆن، چەوەندەری شەکر گەنم، جۆ، تەڕەو میوەجات، توتن.
- سامانی ئاژەڵی: چێڵو گامێش٥٠٠ر٢ ملیۆن سەر، بەراز ٠٠٠ر٩٥٠ هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر٥٩٠ هەزار سەر، پەرەور ٢٠٠ر٣٨ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی کارەبا: ٢٣٠ر٧ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- داهاتی سروشتی: نیکل، زێڕ، زیوو، بۆکسیت.
- پیشەسازی: دروستکردنی شەکر، دەرهێنانی زێڕ، ڕستن و چنین، چیمەنتۆ، توتن، ئاسن.
- دەرچووەکانی: شەکر، بۆن، کاکاو، زێڕ، نیکل، ئاسن.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی خواردەمەنی، نەوت، پەمۆی کوتاڵ، کیمیا، داودەرمان.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، وولاتانی یەکێتی ئەورووپا، یابان.
- ڕژێمی دەسەلات: سەرۆک کۆمار بە پێشنیاری ڕاستەوخۆ هەڵدەبژێردرێ بۆ ماوەی چوار ساڵ، بەڵام دەسەڵاتی یاسادانان بەستراوەتەوە بە ئەنجومەنی پیران و ئەنجومەنی نوێنەران، ئەندامەکان بەپێشنیاری ڕاستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن بۆ ماوەی چوا ر ساڵ، هەر کەسێک تەمەنی لە هەژدە ساڵ بێت مافی دەنگ دانی هەیە بەڵام گەر خێزاندار بێت گەر تەمەنیشی بچوکتر بێت دەشێ دەنگ بدات.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی شۆڕشگێڕی دۆمینیکان، چەپی ناوەندی، پارتی چاکسازی کۆمەڵایەتی مەسیحی، پارتی سۆشیالستی سەربەخۆ، پارتی ڕزگاری دۆمینیکان، پارتی نەتەوەیی.
- جوگرافیای وولات: کۆماری دۆمینیکان

دەکەوێتە سەر سێ یەکی بیابانی هیسپانیۆلا لەلایەنی ڕۆژهەڵات، سێ یەکەکەی تری وولآت هایتیە، بیابانی هیسپانیۆلا یەکێکە لە دورگەی هندی ڕۆژئاوا، هایتی دەکەوێتە ڕۆژئاوای، دورگەی بۆروتۆریکۆ لەڕۆژهەڵاتی دورگەی بۆروتۆریکۆ لەگەڵ چەندین دورگەی تری تەنیشتی کۆمەنولس بە ئەمەریکا بەستراوە دۆمینیکان زنجیرە چیای تیایە کە درێژ دەبێتەوە لە باکوری ڕۆژئاوای بۆ باشووری ڕۆژهەڵاتی، بەرزیەکەی ٣١٤٨ مترە، لە باکورو ڕۆژهەڵات زەوی بەپیتەو باشەو ئاودێرەو سێیەکی دانیشتوانی لێ نیشتەجێن. بەڵام بەشی باشووری ڕۆژئاوای زەویەکەی خراپەو تەنیا دەوراوپشتی سانتۆ دۆمینگۆ نەبێت، لەچیاکان سەرچاوەی زێی سەرەکی لێ هەڵدەقوڵێ کەئەویش لە(باکوری دیرنۆرتی، یاکۆدیل سور، یۆشا، کەش و هەوای نیستیوائیەو گێژەلولکەی زۆری تیایە).

- مێژووی وڵات: لەساڵی ١٤٩٢ کولۆمبۆس لەدوای هەوڵی زۆر کۆماری دۆمینیکانی دۆزیەوە. ناوی نابە ئیسپانیۆلا، بەڵام پایتەختەکەی (سانتۆ دۆمینگۆ) کە لە ساڵی ١٤٩٦ دامەزراوەو کۆنترین جێنشینگەی ئەورووپیەکان بوە لە نیوەی خرۆکەی ڕۆژئاوا، لە ساڵی ١٧٩٥ لەدوای ڕێکەوتن ئەسپانیا بۆ فەرەنسای جێهێشت، دوای زەنجیەکانی هایتی دۆمینیکانیان داگیرکرد لە ساڵی ١٨٠١ زایینی، بەڵام گەلی دۆمینیکان سانتۆ دۆمینگۆیان ڕزگار کرد لەدەستی زنجیەکان لەساڵی ١٨٠٨ زایینی، لەساڵی ١٨٠٩ یەکەم کۆماریان لێ دامەزراند، بەڵام ئیسپانیا دووبارە خستیەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی لەساڵی ١٨١٤، لە ساڵی ١٨٢١ گەلی دۆمنیکان توانی دووبارە لەدەست ئەسپانەکان ڕزگار بێت بەڵام دووبارە هایتیەکان داگیریان کردەوە، بۆ جاری دووەم گەل توانی تۆڵە وەربگرێتەوە بە دەرکردنی هایتیەکان لە ١٨٤٤/٢/٢٧ بە دامەزراندی کۆماری دۆمینیکان بە سەرۆکایەتی (بدرۆ سانتانا)، لەو ماوەیەدا گێروگرفت و ئاژاوەو پەلاماری هایتیەکان بۆسەر وولآت وای کرد کە دۆمینیکان داوا لە ئەسپانیا بکات پارێزگاری لێ بکات بەبوونی بە هەرێمێکی ئەسپانی. لەماوەی ساڵەکانی ١٩٣٠ تاکو ساڵی ١٩٩٩ ئەم وڵاتە خۆشی بەخۆیەوە نەدیت چ لەڕووی کودەتاو داگیرکردن و وێران کردن و دەربەدەری و دەسەڵاتی تاك ڕەوی و خۆپەرستی، چ لەلایەنی لافاو زریان و باو باران، چ لەرووی دەستتێوەردانی لەلایەن ئەمەریکاو هاوپەیمانان، کە بۆتە وڵاتێکی نائارام.
- دۆمینیکان ئەندامە لە ڕێکخراوی وڵاتانی ئەمەریکا، ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەککرتووەکان.

# سلڤادۆر

- ناوی ڕەسمی: کۆماری سلڤادۆر.
- پایتەختی: سان سلڤادۆر، ژمارەی دانیشتوانی ۱٫۸۱۵٫۰۰۰ملیۆن کەسە.
- شارەسەرەکییەکانی: سانتا ئانا، سان میگل، زاکاتیکا لۆکا.
- بەندەرە گرنگەکانی: لابۆنیۆ، ئاکاگۆتیا.
- ڕووبەری: ۸٫۱۲٤ میل چوارگۆشەو ۲۱٫۰٤۰ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٦٫۱٦۰ ملیۆن کەسە، بەپێی زانیاریەکانی ۲۰۰۱.
- چڕی دانیشتوانی: ۷٥۸ کەس لەیەک میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۲٫۳٪.
- نەژادەکانی: مستیزۆ ۹٤٪ هندی ٥٪ سپی پێست ۱٪، مستیزۆ دایک و باوکیان لەیەک ڕەگەز نین چونکە هەیە دایکی هندیە و باوکی ئەمریکیە یان باوکی ئەسپانیە دایکی ئەمریکیە ئەمانەش زۆرن لە ڕۆژئاوای بەریتانیاو ئەمەریکای لاتینی کە نەژادی زۆریان پێک هێناوە لە جیاوازی دایک و باوک.
- زمانەکانی: ئەسپانیا (زمانی ڕەسمیە).
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی ۷٥٪ ئەوانیترو چەندین کۆمەڵی پرۆتستنتیە.
- زانینی نوسین و خوێندن: ۷۳٪.
- دابەشی کارگێڕی: ۱٤ بەشە لەشێوەی پارێزگا.
- بەرگری: ۲٫۱۰٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۲۸٫٥۸۰هەزار کەسە.
- دراوی: کۆلۆنی سلڤادۆری.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۱۸٫٥۰۰ ملیار دۆلار.
- بەشی تاک لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۳٫۱۰۰ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ۲۷٫٥٪ لەخاکی وڵاتەکە..
- داهاتەکانی کشتوکاڵی: قاوە، گەنمو جۆ، چەوەندەری شەکر، برنج، پەمۆ، تەڕەو میوەجات، چەند جۆری تر لەبەرهەمی کشتوکاڵی.
- سامانی ئاژەڵی: چێڵ گامێش۱٫٤۰۰ ملیۆن سەر، بەراز ٤٥۰٫۰۰۰ هەزار سەر، پەرەور ٥٫۸ ملیۆن سەر، مەڕو بزن هەیە بەڵام ڕێژەیەکەی دیار نییە.
- بەرهەمی کارەبا: ٤٫۱۰۰ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- داهاتی سروشتی: کارەبای ئاوی، وزەی پلەی زەوی، نەوت.
- پیشەسازی: خواردەمەنی، جل و بەرگ، ڕستن و چنین، بەرهەمی نەوتی.
- دەرچووەکانی: قاوە، پەمۆ، شەکر، ماسی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: بەریتانیا، گواتیمالا، یابان، ئەڵمانیا، مکسیک، ڤنزویلا، لەساڵی ۱۹٦۱ سلڤادۆر ئەندامە لە بازرگانی هاوبەشی وڵاتانی ئەمەریکای ناوەندی.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی خاو، کەلوپەلی بەکارهێنان، کەلوپەلی سەرمایەداری، خاڵی پەرینەوەی بارمکانی کۆکاینە واتە تریاک کە ئەویش سودێکی بازرگانی باشی هەیە بۆ داهاتی وڵاتەکەو هاوڵاتیانی.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی دیموکراتی تازەیە، سەرۆک کۆمار بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێت و ناتوانێ دوبارە خۆی هەڵبێژدرێتەوە، یەک ئەنجومەنی یاسادانانی هەیە بەناوی ئەنجومەنی نەتەوەیی (مجلس الامە). کە ژمارەی کورسیەکانی ۸٤ کورسیە بە ڕژێمی ڕێژەیی نوێنەری هەڵبژاردنی بۆ ئەنجام دەدرێت.

- پارتە رامیاریەکان: دیموکراتی مەسیحی: بەرهەڵستی ئیستعمار، بەرەی مارانیدۆ مارتی لەپێناو رزگاری، راست رەوی دارایی، پارتی چاکبونەوەی نیشتیمانی، راست رەو، هاوکاری کۆماری نیشتیمانی.
- جوگرافیای وڵات: وولاتی سلڤادۆر دەکەوێتە ئەمەریکای ناوەندی، لەباشوری رۆژئاوای هندۆراسە لەسەر کەناری زەریای هادیە، سلڤادۆر بچوکترین وڵاتە لە ئەمەریکای ناوەندی، هیچ کەنارێکی لەسەر زەریای ئەتلەسی نییە، لە رۆژئاوای گواتیمالا، هندۆراس لە باکوری رۆژهەڵات، باشووری دەشتایەکانی کەناری هادیە کە بەرز دەبێتەوە بە تەپۆلکەی گرکانی بەپیتو دۆڵەکانی پرە لەدانیشتوان، بەڵام لە باکوری زەویەکەی چیاییە کە ئەویش گرکانی زۆری تیایە لەگەڵ دەریاچەی گرکانی، پرۆژەکانی لە رۆژئاوا درێژ دەبێتەوە لەسەر زۆی لیمپا، لە رۆژهەڵات دەشتایی تەنگو کەنداوی فۆنیسکای تیایە کە بەندەرێکی کەشتیوانییە،

کەش و هەوای گەرمەلە کەنارەکانی، پلەی کەش کەم دەبێتەوە لەسەر تەپۆلکەکانی ناوخۆیی.

- مێژووی وولات: لەسەدەی پانزە هندیەکان لەناوچەکە نیشتەجێ بوون ئەوانەی لە مەکسیکەوە بۆی هاتبوون و تاکو ئەوکاتەی (بدرۆدی ئەلفارادۆ) توانی لە ساڵی ١٥٢٤ داگیریکرد بکات و کردیە ژێر دەستەیەکی ئەسپانی کە بەرگری هندیەکانی لە ساڵی ١٥٤٠ ی زایینی تێک شکاند، لە ١٨٢١/٩/١٥ سلڤادۆرو وڵاتانی تری ئەمەریکای ناوەندی سەربەخۆیی خۆیان راگەیاند بە جیابوونەوە یان لە ئەسپانیا و چونە ناو مەکسیک بۆ ماوەیەکی کورت. لە ساڵی ١٨٢٣ بوە پارچەیەك لە ئەمەریکای ناوەندی، دوای کوستاریکاو گواتیمالا و هندۆراس و نیاگارگواش چوە ناو ئەو رێکەوتنە، لەدوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی وڵاتانی ئەمەریکای ناوەندی لە ساڵی ١٨٣٨، لە ساڵی ١٨٤١سلڤادۆر بوە وولاتێکی سەربەخۆ، هەر لەسەرەتای سەربەخۆ بوونی کێشە و ململانێی رامیاری و پێشبرکێی سەربازی دەستی پێکرد بە کودەتاو گۆرینی دەسەڵات. هەر لەو ماوەیە تاکو دوای ساڵی ١٩٣٢ زیاتر لە ٣٠٠ هەزار جوتیار لەناوچون لەلایەن هێزی سەربازی بەهۆی راپەرینەکانی جوتیاران دژی دەسەڵاتداران، لە ئەنجامی کودەتای سەربازی ساڵی ١٩٦١ پارتی ئاشتبونەوەی نیشتیمانی دامەزرا کە پارتێکی راست رەو بوو دەسەڵاتی وەرگرت، شەری نێوان یاریزانان رووی دا بەهۆی دەرکردنی کوچبەرانی هندۆرسی نائاسایی کە رویان لە سلڤادۆر کردبوو. لە ساڵی ١٩٨٠ ئەسقف سان سلڤادۆر پاڵەوانی ماف مرۆڤو ئۆسکار رومیرۆ تیرۆرکران کە بوە هۆی هەڵگیرسانی شەری ناوخۆیی، بەڵام بەهۆی دامەزراندنی یەکەم سەرۆکی مەدەنی لە وولات لە ساڵی ١٩٣١ بارودۆخەکە بەرەو ئاژاوە هەنگاوی نا، لە ١٩٩٢/٢/١٦ پەیمانی ئاشتی لەگەڵ پیاوانی یاخی بوو مۆرکراو بوە هۆی کۆتایی هێنان بە شەری ناوخۆیی کە دوانزە ساڵی خایاندو بوە هۆی کوژرانی ٧٥٫٠٠٠ هەزار کەس، لە ساڵی ١٩٩٢ چارەسەری کێشەی سنور کرا لەگەڵ هیندۆارس بەیەکجارەکی کە ئەو کێشەیە دەگەراوە بۆ ساڵی ١٨٦١، لەدوای ساڵی ١٩٩٣ لیژنەیەکی چاودێری لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکان پێك هات بۆ لێکۆڵینەوەی کارەساتەکانی شەرو دەستکرا بە لێبوردنی گشتی و لابردنی پیاوە گەورانی سەربازی. لەساڵی١٩٩٩ فرانیسیسکۆ لۆرس لەهەڵبژارن سەرکەوتنی بەدەست هێنا کە سەرۆکی پارتی ئارینای راستڕەوە.
- سلڤادۆر ئەندامە لە رێکخراوی وولاتانی ئەمەریکا، ئەندامە لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

# ئەمەریکا

- ناوی ڕەسمی: ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا.
- پایتەختی: واشنتۆن، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۸۵۰ر٤ ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکییەکانی: نیۆرۆك، لۆس ئەنجلۆس، شیکاگۆ، هیۆستون، فلادلفیا، سان دیگۆ، دیترۆیت، سان فرانسیسکۆ، بۆستن، هۆنولۆ، دالاس، فینکس.
- ڕووبەری: هەموو کارگێری کۆلومبیا پەنجا وولایەتەکانە،٧٦٥ر٦١٨ر٣میل چوارگۆشەو٦١٠ر٢٧٢ر٩ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە لەوانە ٠٠٤ر٥٩١ میل چوارگۆشە ڕوبەری ئەلاسکا ٤٧١ر٦ میل چوارگۆشە ڕوبەریانە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٧٥٩ر٢٧٥ ملیۆن کەسە، بەپێی زانیاریەکانی ٢٠٠٣.
- چڕی دانیشتوانی: ٧٦ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ١٪.
- نژادەکانی: نزیکەی سێ چارەگی دانیشتوانی ولایەتەکانی ئەمەریکا لە بنەڕەتا ئەوروپین. بەریتانیاو ئیرلندی ٢٩٪، ئەڵمانی ٨٪، ئیتاڵی ٥٪، ئەسکەندەنافی ٣٪، ئەفریقیە ئەمریکیەکان ١٢٪، ئەمریکی و ئەسپانی و پروتوگالی ٨٪، ئاسیەیکان‌و دورگەی زەریای هادی ٣٪، ئەباماو جۆرجی و لۆیزیانا هیتر ٣٢٪.
- زمانەکانی: ئینگلیزی و ئەسپانی وعەرەبی‌و بەدەیا زمانی تر هەموی ڕەسمین.
- ئایینەکانی: مەسیحی ٥ر٨٦٪، ئیسلام ٥ر٠٪، میسۆدیەکان، لوتەریەکان، کاسۆلیکی ڕۆمانی ٢٦٪، جولەکە ٨ر١٪، بوزی ٥ر٠٪، هیندی.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٩٨٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٥٠ ولایەتی یەکگرتووە.
- بەرگری: ٥ر١٣٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر٤٥٨ر١ ملیۆن کەسەو، سوپاکەی هەمووی بەرەزامەندییە.
- دراوی: دۆلار ١٠٠ سنت.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٠٢٥ر٨ ترلیۆن.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر٣٠ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢٠٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: پەتاتە، گەنمەشامی، گەنم، جۆ، چەوەندەری شەکر، فولی سویا، خوێ، میوەجات، پەمۆ، شوفان، چەندین تەڕەو میوەجاتی تری هەمە جۆری هەیە.
- سامانی ئاژەڵی: چێڵ‌و گامێش ٥٠٠ر١٠٥ ملیۆن سەر، بەراز ٣٠٠ر٥٨ ملیۆن سەر، مەڕ ٦٥٠ر٨ ملیۆن سەر، بزن ١٥٠ر٢ ملیۆن سەر، پەرەور ٧٥٠ ١ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی کارەبا: ٦٦٥ر٣ ترلیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: خەڵوز، نوحاس (کە دووەم وولاتە لە بەرهەم هێنانی)، ئاسن، بۆکسیت، جیوە، زیوو، زێڕ، نیکل، زەنگ، (توتیا)، (پێنجەم وولاتە لە بەرهەم هێنانی) یۆرانیۆم،
- فۆسفات، نەوت و غازی سروشتی، دار.
- پیشەسازی: ماشێن، پالاوتنی نەوت، دروستکردنی خۆراك، ئۆتۆمبێل، ئاسن و پۆلا، بەرهەمی کیمیاوی، کەلوپەلی کارەبایی، پەینی کیمیاوی، چیمەنتۆ، پلاستیك، پەڕی ڕۆژنامە، فرۆکە، چەك و تەقەمەنی، کەشتی‌و پاپۆڕو غەواسە، چەندین بەرهەمی تری پیشەسازی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: کەنەدا، یابان،

ئەوروپا، چین، فەرەنسا، وولاتانی عەرەبی و ئەفریقی، (رژێمی ئابووری ئەمەریکا لەسەر بنەمای بازاڕی ئازادە و بڕیاری کاروباری ئابووری بازاڕ بڕیار دەدات بێ ئەوەی میری دەست تێوەردانی تیا بکات، ئەمەریکا لەبەرهەمی ئابووری کاردانەوی بەهێزی هەیە لە پێناوی قازانج بەهۆی دواپلەی پەرەسەندن لە بواری تەکنەلۆژیای سەردەمی).

• رژێمی دەسەلات: کۆمارێکی فیدراڵیە، نەریتی دیموکراتی لە ئەمەریکا سەرکەوتوە لە دەسەلاتی حوکمڕان، کە دەستور دەست نیشانی کردووە بە یەکێتی فیدراڵی وولایەتەکان، هەر ولایەتێك دەستوری تایبەت بەحکومەتەکەی خۆی هەیە، بەلام حکومەتی فیدراڵی بەر پرسیارە لە کاروباری ناوخۆیی، سێ لقی دەسەلاتی هەیە ئەویش، دەسەلاتی جێبەجێ کردن، دەسەلاتی یاسادانان، دەسەلاتی قەزائی لە ولایەتەکان، لەهەر یەکێك لەوانە ئەنجومەنی سەربەخۆی هەیە، بەلام جیانییە بەشێوەیەکی تەواو لەگەڵ یەکتری. سەرۆك و جێگری سەرۆك بۆ ماوەی چوار ساڵ هەڵدەبژێردرێن و نابێ سەرۆك لەدوو خولی هەڵبژاردن زیاتر خۆی هەڵبژێردرێ، سەرۆك دەوڵەت و سەرۆك حکومەتەو هەروەها سەرۆکی حزبەکەیەتی کە گەورەترین سەرکردەیە لەماوەی دانانی، سەرۆکی دەسەلاتی جێبەجێکردنە لەهەمان کاتدا، دەست لەکار ناکێشێتەوە هەتا زۆربەی ئەندامانی کۆنگریس دژی نەوەستن، بەلام دەسەلاتی یاسادانانی بەندنیە بە کۆنگریسی وولایەتەکانی یەکگرتوو (پەرلەمان) کە پێك دێت لە دوو ئەنجومەن، ئەنجومەنی پیران کە ژمارەی ١٠٠ ئەندامە، ئەنجومەنی نوێنەران کە ژمارەی ٤٣٥ ئەندامە کە هەڵدەبژێردرێن لەلایەن ولایەتە جۆراو جۆرەکان، دەستنیشان کردنی ئەندامان بەپێی رێژەی دانیشتوانی ولایەتەکان دیاری دەکرێت لەدوا ئامارەکانی ولایەتەکانی ئەمەریکا، ماوەی ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران دوو ساڵەو سێیەکی ئەندامانی ئەنجومەنی پیران بۆ نوێ کردنەوە هەڵدەبژێردرێن، دەسەلاتی قەزائی پێك دێت لە دادگای تایبەتی وەك دادگای باج و دادگای گومرگی.

• پارتە رامیاریەکان: پارتی دیموکراتی لیبڕالی، پارتی ناوەندی، پارتی کۆماری، پارتی کۆمەنیست، راست رەوی ناوەندی، چەندین پارت و گروپ وبیروڕای جیاجیای تیایە.

• جوگرافیای ولات: چوارەم وولاتە لە جیهان لەدوای ڕوسیا و کەنداو چینی میللی کە ٥٠ وولایەت دەگەرێتە خۆی، لەوانەش ٤٨ ولایەتی هاوبەشی سنورن کە درێژ دەبێتەوە لەسەر پارچەی ناوەڕاست لە کێشوەری ئەمەریکای باکوری کەنارەکانی ڕۆژهەلاتی(ئەتلەسی)، بۆ کەنارەکانی ڕۆژئاوای (هادی)، ئەو ٤٨ ولایەتە تێپەریون و دەسوڕێتەوە لە باکوری کەنەدا، لە باشووری کەنداوی مەکسیك و مەکسیك، بەلام ٤٩ ولایەتەکەی تری ئەویش ولایەتی ئەلاسکایە کە ئەویش دەکەوێتە کێشوەری ئەمەریکای باکور (لەباکوری ڕۆژئاوا) بەلام لەو ٤٨ ولایەتە جیای دەکاتەوە لە وولاتی کەنەدا تێپەریوە، ٥٠ ولایەتەکەش، هاوای کە پێك هاتووە لە چەند دورگەیەك و کەوتۆتە ناوەندی زەریای هادی بە دوری ٢٤٠٠ میل لە ڕۆژئاوای کالیفۆرنیا.

• مێژووی وولات: لە ساڵی ١٥١٢ زاینی بۆنس دی لیۆنی دۆزینەرەوەی ئەسپانی گەرا لەدوای کانی گەنجان، فرنسیسکۆ کۆردنادۆ هەرێمی باشووری ڕۆژئاوای ئەمەریکای باکوری دۆزیەوە لەساڵەکانی ١٥٤٠و١٥٤٢، ئەسپانیەکان لە ساڵی ١٥٦٥ یەکەم دانیشتگای ئەوروپیان لێ دامەزراند لە ئەمەریکای باکور و

ناوی نا (سانت ئۆجستینا) لە فلۆریدا.

سیرۆلتراڵ هەوڵی دا بە دامەزراندنی ژێر دەستەیەکی ئینگلیزی لە دورگەی رنۆك و ناوی ئەو ژێر دەستەیەی نا (ڤیرجینیا) ئەویش لە ساڵی ١٥٨٥ بوو، ژێر دەستە ئینگلیزەکان هەڵسان بە دروستکردنی شاری جیمس لتۆن لە ڤیرجینیا و دەستیان کرد بە بەرهەم هێنانی کشتوکاڵی توتن.

لە ساڵی ١٦٢٤ ژێر دەستەی نوێی هۆڵەندە (نیوزلاند) سویدییەکان هەڵسان بە دروستکردنی سویدی نوێ، بەڵام ئینگلترا هەردوو ژێر دەستەی داگیر کرد لە ساڵی ١٦٦٤. لەسەدەی حەڤدەم و هەژدەم بە ملیۆنا کەسیان لەئەفریقیەکانیان دەفرۆشتە ئەمەریکیەکان بۆ کاری کشتوکاڵی پەمۆو توتن، لە ساڵی ١٧٣٣ ژمارەی ژێر دەستەی بەریتانیا لە کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەمەریکای باکور گەیشتە سیانزە ژێر دەستەو دواترینیان ژێر دەستەی جۆرجیا بوو، بەریتانیا بەرەو فراوان بوون هەنگاوی نا لەدوای سەرکەوتنی شەڕی حەوت ساڵەی لەگەڵ فەرەنسا، بەرەو ڕۆژئاوا تاکو گەیشتە زێی (مسسپی) ، لە ساڵی ١٧٦٥ بەریتانیا هەوڵی دا بۆ یەکەم جار کە باجی دەرامەت دانێ لەسەر ژێر دەستەکانی ئەمەریکا بەیاسای (دەمغە) بەڵام بەهۆی ناڕەزایی ئەمریکیەکان ئەو یاسایە هەڵوەشایەوە لە ساڵی ١٧٦٧.

بەریتانیەکان لە ساڵی ١٧٧٤ هەڵسان بە پێوەدانی بەندەری بۆستن و کردیە جێنشینی سوپاکەی لە مساشۆیس لەوکاتەدا ژێر دەستەکان یەکەم کۆنگرەیان بەستا لە کێشوەری ئەمەریکای باکور، شۆڕشی ئەمەریکی لە ساڵی ١٧٧٥ دەستی پێکردو سوپایان کۆکردەوە بۆ شەڕ کردن دژی ڕژێمی بەریتانیا، لە ٢-٤/٧/ ١٧٧٦ ژێر دەستەکانی ئەمەریکا سەربەخۆیان ڕاگەیاند، فەرەنسا و ئەسپانیا پشتگیریان لێکردن دژی بەریتانیا، لە ساڵی ١٧٨١ بەریتانیەکان بەهۆی خۆرانەگرتنیان هەڵاتن لەژێر دەستی ئەمەریکیەکان لە پێکدادانی (یۆرك تۆنا) ولایەتی یەککگرتووی شۆڕشگێڕی فیدراڵی پێك هات. لەپەیمانی ١٧٨٣ بەریتانیا ڕەزامەندی کرد لەسەرلە دەست دانی ژێر دەستەکانی، لە ساڵی ١٧٨٧ دەستورێکی نوی ڕاگەیاندرا بۆ ولایەتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا، لە ساڵی ١٧٨٩ جۆرج واشنتۆن هەڵبژێردرا بە یەکەم سەرۆکی ئەمەریکا، لە ساڵی ١٧٩١ بەڵگەنامەی مافی مرۆڤ دەرچوو کە یەکەم گۆڕانکاری بوو لەو دەستورە کە کرا بە مافی ئازادی تاكو ئازادی پەرست و قسەکردن و کۆبوونەوەوڕاگەیاندن و نوسین.

لە ساڵی ١٨١٢تا ١٨١٤ ئەمەریکا شەڕی بەرپاکرد دژی بەریتانیا بەهۆی گەمارۆ دانی بەندەرەکان، ئەمەریکا لەساڵی١٨١٩ ولایەتی فلۆریدای کڕی لە ئیسپانیا، دوای ئەوە کۆچبەر لەئەوروپا بەزۆری ڕوویان لە بەریتانیا کردو لەکۆتایی سەدەی نۆزدەم ژمارەی ولایەتەکانی ئەمەریکا لە ١٧ ولایەت گەیشتە ٤٥ وڵات، لەساڵەکانی ١٨٤٦ تا ١٨٤٨ ڕوودانی شەڕی مەکسیك بوە هۆی ئەوەی کە مەکسیك واز لە زەویەکی فراوان بێنی بۆ ولایەتە یەککگرتووەکان، لە ساڵی ١٨٥٤ یاسای دامەزراندنی ولایەتی کانساس و نیراسکا دەرچوو بە پێی یاساکە هەریەك لە ولایەتەکان دەتوانی کوێلایەتی بخاتە ناو ولاتەکە یاخود قەدەغەی بکات، لەدوای کێشەو ململانێیەکی زۆر کوێلایەتی لەئەمەریکا هەڵوەشێنرایەوە، بەپێکهێنانی پارتی کۆماری لەهەمان ساڵدا، لە ساڵی ١٨٦٠ ئەبراهام لنکۆلن لە پارتی کۆماری هەڵبژاردرا بەسەرۆکی ولایەتە یەککگرتوەکان و سەرکردایەتی شەڕی ناوخۆی ولایەتەکانی باکوری کرد لەگەڵ ئەوەشدا یەکێتی ولایەتەکانی پاراست بەناوی سەرچاوەی دیموکراتیەت، لە ساڵی ١٨٦١ شەڕی ناوخۆیی

هەڵگیرسا لە نێوان ولایەتەکانی باشوور کە پێی دەگوترا ولایەتی فیدرالی ئەمریکی ولایەتەکانی باکور (کە پێی دەگوترا ولایەتی یەککگرتوو، کە ولایەتەکانی باشوور داوای مانەوەی هەندێ مافی ولایەتەکەی کرد بە مانەوەی کوێلایەتی، دوای ئەوەش داوای دەکرد کەمافی جیابوونەوەی هەبێ لە ولایەتی یەککگرتوو، بەڵام وولایەتەکانی باکور، بەرگری لە یەککگرتنەکە دەکرد بە جیابوونەوە لەگەڵ ولایەتەکانی باکور، ئەو پانزە ولایەتەی باشوور جیابوونەوە لە ولایەتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکاو ناوی نرا وولایەتەکانی یەککگرتووی فیدڕالی ئەمەریکی بە سەرۆکایەتی (جیفۆسۆن دیفس) ولایەتەکانی باکور داوای دان پێ نانیان ڕەت کردەوە بە هەر ولایەتێك کە جیادەبێتەوە بە یەککگرتنەکە ئەمەش بەهۆی باری ئابووری، چونکە ولایەتەکانی باشوور کشتوکاڵی بوون واتە شەری ناوخۆی بێ پچڕان بوو بۆ نموونە ٢٤٠٠ شەڕ لەنێوانیان ئەنجامدرا بوو کە زیاتر لە ملیۆن ونیوێك لە داواکاریەکانی یەککگرتوو بوو، نزیکەی ملیۆنێك لە داواکاری فیدڕالیەکان بەشداری ئەو شەڕە ناو خۆیانە یان دەکرد کە بوە هۆی مردنی ٦٠٠ هەزار کەس و زامداربوونی زیاتر لە ملیۆنێك کە شەڕەکە بۆ ماوەی چوار ساڵ بەردەوام بوو، لە ساڵی ١٨٦٧ ئەمەریکا ولایەتی ئەلاسکای لە ڕوسیا کڕی و لە ساڵی ١٨٦٩ هێڵی شەمەندەفەری لێ دامەزراند بە بەستنەوەی لەگەڵ کەناری ڕۆژهەڵات بەکەناری ڕۆژئاوا کە بوە هۆی پەرەسەندنی کشتوکاڵ و بەستنەوەی گەلێ کاری پیشەسازی تر لەماوەی پەنجا ساڵ، لە دوای ساڵی ١٨٧٦ لەناوچەی داکۆتای باشوور و تێراسکا زێڕ دۆزرایەوە و دوایی یۆڕانیۆم و خەڵوز و نەوت و غازی سروشتی دۆزرایەوەو بوە هۆی کێشە لە نێوان هیندی سورو دەسەڵاتی ئەمەریکا لە ئەنجام ئەمەریکا نەیتوانی کاریان لێ بکات و لەناوچەکە دەریان بکات و بوە هۆی ئەوەی کە لە ساڵی ١٨٨٠ (١٩٠) ملیۆن دۆلاریان بدرێتی، لە ساڵی ١٨٩٨ شەڕی نێوان ئەمەریکا و ئەسپانیا ڕووی دا بە هەڵاتنی ئەسپانیا و جێ هێشتنی یۆنۆیکۆو جوام، هەروەها ئەسپانیا وازی لە کوبا هێنا بۆ ئەمەریکا لەگەڵ فلیپین کەلە ژێر دەسەڵات مایەوە و فلیپین تا ساڵی ١٩٤٦ و کوبا تا ساڵی ١٩٠١، هەروەها زەوی هاوای لکاند بە ئەمەریکا لە ساڵی ١٨٩٨ تاکو ساڵی ١٩٥٩ کە بوە وولایەتی ٥٠ لە وولایەتەکانی ئەمەریکا.

لە ساڵی ١٩١٤تا١٩١٨ بەشداری شەڕی یەکەمی جیهانی کرد لەگەڵ فەڕەنسا و ڕوسیاو بەریتانیا دژی ئەڵمانیاو نەمسا و مەجەڕ، لە مانگی /١٩١٨/٤ سەرۆکی ئەمەریکا ولسۆن بانگەوازە بەناوبانگەکەی لە ١٩١٨ ڕاگەیاند کە چواردە خاڵ بوو کە بوە بنەمای ئاشتی و چارەسەری کێشەکان لەجیهان، هەروەها بنەمای کۆنگرەی ئاشتی بوو کە لەساڵی ١٩١٩ لە پاریسی پایتەختی فەڕەنسا بەستراو نوێنەری کوردیش بەشداری تێداکرد و بوە هۆی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی فرسای، بەپێدانی ئۆتۆنۆمی سەربەخۆی ئەو نەتەوانەی کە کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی یەك لەوانە گەلی کورد و نیشمانەکەی کە ئەمەریکا ڕۆڵی گرنگی هەبوە لەدارشتنی بەندەکانی پەیمانی (سایکس بیکۆی ١٩١٦)و پەیمانی (لۆزانی ١٩٢٣) بەتایبەتی لەپەیمانی لۆزان کە بوە هۆی دابەشکردنی کوردو کوردستان لەسەر چوار دەوڵەتی دامەزرێنراوی نوێی دژ بەکتر لەبوارەکانی نەتەوەیی زمانو کەلتوورو مێژوو جگە لەگەلی کوردو بزووتنەوە رزگاریخوازەکەی کە بەشێوەیەکی رەسەنانە لەو نەتەوانە دوورن لەهەموو بوارەکان، هەروەها لەپەیمانی (سەعد ئابادی) ساڵی ١٩٣٧ دوایی لەناوبردنی کۆماری کوردستان لەمەهاباد ١٩٤٦و

هەرەس پێ هێنانی شۆڕشی ئەیلول بەهۆی پەیمانی جەزائیر، هەروەها ڕۆڵی هەبووە لەیارمەتیدانی ڕژێمی بەعس لەعێراق بۆ پەلاماردنی کوردو بەشەلکێنراوەکانی بەولاتی عێراق و سوریاو ئێران و تورکیا، لەچەندین لایەنی تری ئێش و ئازاردانی کورد بەهاوکاری بەریتانیاو هاوپەیمانیانی. . . بەڵام دوایی ڕاپەرینی کورد لەبەهاری ساڵی ١٩٩١ ڕۆڵی لایەنگیری کوردو دەسەڵاتی کوردی هەبووە لەگەڵ بەریتانیاو هاوپەیمانان، بەپێی باروودۆخی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆی نەلاوچەکە، کە کورد ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەنگاو بەرەو پێشەوە دەنێت. لە ساڵی ١٩٢٠ ئافرەتی ئەمەریکا توانی مافی خۆ هەڵبژاردن و دەنگدانی هەبێت، لەدوای ساڵی ١٩٢٩ بەوە هۆی ڕووخانی ئابووری ئەمەریکی و بڵاوبوونەوەی برسیەتی بەهۆی نەبوونی هێزی کرینی بازو کە زیاتر لە ١٣ ملیۆن بێکاری تیا بڵاوبووەوەو هەوڵ و تەقەلای زۆر کرا بۆ بوژانەوەی ئابووری ئەمەریکا بە دامەزراندنی چەندین پڕۆگرامی کشتوکاڵی و پیشەسازی و پڕۆگرامی گونجاو کەم کردنەوەی بێکاری، لە ئەنجام توانی لە ساڵی ١٩٣٥ ڕژێمی دابینی کۆمەڵایەتی دابمەزرێنێت. لە ساڵی ١٩٤١ یابان پەلاماری کەشتی ئەمەریکای دا لە بەندەری بیرل هاربر لە دورگەی هاوای ئەمەریکی بەوە هۆی ئەوەی کە ئەمەریکا جەنگ دژی یابان ڕاگەیەنێ و ئەڵمانیاش شەڕی دژی ئەمەریکا ڕاگەیاند لە دورگەی میدوای باکوری ڕۆژئاوای هاوای و توانی بەیەك ڕۆژ هێزی ئاسمانی یابان تێك بشکێنێ، لە ساڵی ١٩٤٢ ئەنجامدانی کۆبوونەوەی نێوان تشرشل سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا و ڕوز ڤلت سەرۆکی ئەمەریکا لە(دار البیضاء) وولاتی مەغریب کە داوایان کرد ئەڵمانیا و یابان خۆبەدەستەوە بەبێ مەرج .. لە کۆتایی ١٩٤٣ کۆنگرەی تاران بەسترا لەنێوان ستالین و ڕوز ڤلت و تشرشل بۆ هەماهەنگی هێزەکانیان و پەلاماردانی ئەڵمانیا لە ڕۆژهەڵات و ڕوسیاش شەڕی دژی یابان بکات بەپێی خاڵەکانی کۆنگرەی تاران و لەهەمان کاتا سەربەخۆی ئێران.. ئەوە بوو لە ١٩٤٤/٦/٦ هێزی هاوپەیمانان پەلاماری نۆرمەندی دا لە باکوری ڕۆژئاوای فەرەنسا کە بنکەی هێزە پەلامار دەرانی ئەڵمانیای فاشی بوو کە بوە خالی سەرەکی لە پەلاماردانی ئەوروپا لەلایەن هاوپەیمانان لەدوای داگیری کردنی نورمەندی کە ٥٠٠٠ هەزار کەشتی جەنگی لێ بەکارهات و لە ئەنجامدا فەرەنسا ڕزگاری کرا لەگەڵ بروکسل، لە ساڵی ١٩٤٥ لە کۆنگرەی یاڵتا لە قرمی ئیران لەنێوانی ستالین و روز ڤلت و تشرشل نەخشەی بەزاندنی ئەڵمانیایان دارشت لەگەڵ دامەزراندنی نەتەوە یەکگرتوەکان. لە مانگی/٨/ ١٩٤٥ لەماوەی سێ ڕۆژ ئەمەریکا دوو بۆمبی ئەتۆمی لە شارەکانی ناکازاکی و هیرۆشیمای یابانی داو بەوە هۆی خۆ بەدەستەوەدانی یابان و کۆتایی هاتن بەجەنگی دووەمی جیهان بە هەڵاتنی ئەڵمانیاو ڕوخانی ڕژێمی ئەڵمانیای فاشی.

لە ساڵی ١٩٤٧ (میدەنی نرومان) ڕایگەیاند بە بەڵێندانی بەئەمەریکا بەو ووڵاتانەی دەکەوێتە ژێر هەڕەشەی دەسەڵاتی کۆمۆنیستی و بەوە هۆی دەست پێ کردنی شەڕی سارد لەنێوان جەمسەری سۆشیالستی و سەرمایەداری . دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٥٠تا ١٩٥٣ ئەمەریکا خۆی توشی شەڕی نێوان کوریای باکور و باشوور کرد..

لە ساڵی ١٩٦٢ کێشەی موشەکەکانی سۆڤیەت لە کوبا سەری هەڵداو ئەمەریکا داوای لە سۆڤیەت کرد کە موشەکە ئەتۆمیەکانی لە کوبا لابات چونکە ڕووەو ئەمەریکا دامەزرابوون، لە مانگی ١٩٦٣/١١/ سەرۆك کۆماری ئەمەریکا (جۆن کەنەدی) تیرۆرکرا کە بە پاڵەوانی تەنگەژەی کوبا ناو نرابوو، جۆنسن سەرۆکایەتی ئەمەریکای

وەرگرت و پرۆگرامی ئەمەریکای مەزنی پێشکەش کرد بە مافی مەدەنی و ئاسودەیی و دادپەروەری لە ژیانـدا. هـەروەها خـۆ تووشـکردن لەشـەڕی ڤێتنام کە لەسـاڵی ١٩٦١تا١٩٧٥ شەڕ پێکدادان بەردەوان بوو، کە بوە هـۆی هـەڵاتنی ئەمەریکا بە بـوونی دوو ڤێتنـامی بـاکوری کۆمەنیـستی و ڤێتانـامی باشـوور دژ بـە کۆمەنیـستی. بـەناوی ئـەوەی کـە ڤێتنـامی باشـوور بەرژێنێکە بۆ ڕێگـە گـرتن لـە بڵاوبوونـەوەی کۆمەنیستی و زیـاتر لـە ١٤١ ملیار دۆلاری یارمەتی ڤێتنامی باشووردا بۆ وەسـتان دژی سینـشای بـاکور، کـە بـوە هـۆی کـوژرانی دوو سـەد هـەزار سـەربازی ڤێتنـامی باشوور و کوژرانی یەك ملیۆن سەربازی ڤیتنامی بـاکور سـەرەڕای کـوژرانی نیـو ملیـۆن خـەڵکی مەدەنی ٥٥٥ر٥٦ سەربازی ئـەمریکی کوژران، لە سـاڵی ١٩٧٣ پـەیمانی ئاشـتی لەگـەڵ ڤێتنـامی بـاکور مـۆرکراو بـوە هـۆی هـەڵاتنی هێزەکـانی ئەمەریکا. لەگەڵ ئەوەشدا خۆی خزاندە شەڕی ڕوس و کـەمبۆدیا لـە ئەنجامـدا سـەرکەوتنی بەدەست نـەهێنا چونکە گـەر گـەلانی شۆڕشـگێر یەکگرتنیان هەبێت هێزی چەك و تەقەمەنی باوی نامێنی و هەڵاتن چاوەڕوانی دەکات..

بۆ یەکەم جار (نایل ئەرمستۆنگ) یەکەم مرۆڤ بوو لە ئەمەریکا چوە سەر هەسارەی مانگ.. لە ساڵی ١٩٧٤ ڕووبەڕەشی (وۆترگیت) ڕووی دا. لە سـاڵی ١٩٧٩ ئێـران بارمگـای باڵوێزخانـەی ئەمـەریکای داگیر کرد بۆ ماوەی ٤٤٤ ڕۆژ لەگەڵ فەرمانبەرەکان و لەدوای ئەوە ئەمـەریکا بـەڵێنی دا کە دەست تێ وەردان لە کاروباری ئێران نەکات ئینجـا فەرمانبـەرەکانی ئەمـەریکا ئـازاد کـران، لـە ساڵی ١٩٩٠ سـەرۆك بۆشـی بـاوك ڕایگەیانـد کـە شـەڕی سارد کۆتـایی پێ هـات بـەکۆتایی هـاتنی بلـوکی سۆشیالـستی لـە یـەکێتی سـۆڤیەت و هەڵوەشاندنەوەی. لە ساڵی ١٩٩١ شەڕی کەنداوی دووەم هەڵگیرسـا بـەداگیرکردنی کوێـت لەلایـەن ڕژێمی بەعسی عێراق و لە ١٩٩١/١/١٧ بۆردومانی شـاری بەغـداو شـارەکانی موسـڵ و کـەرکوك و بەسـرای کـرد بـە ناچـارکردنی ڕژێمـی عیراقـی بەچوونەوە دەرەوەی لەکوێت و بوە هۆی کوژرانی ١٠٠ر٠٠٠ هەزار سەربازو مەدەنی و وێران کردنی ژێـر خـانی ئـابووری و سـەربازی ڕژێمـی عـیراق، لەسـاڵی ١٩٩٢ بیـل کلنتـۆن لـە هەڵبژاردنـەکان سـەرکەوت لـە مـاوەی دوو خـولی هەڵبـژاردن. لـە هەڵبژاردنـەکانی کۆتـایی سـەدەی بیستەم بۆشی کوڕ سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە ڕێگەی دادگای دەسـتوری ئەمـەریکا و خـۆزاڵ کردنـی بەسـەر جیهانگـەری و کارەسـاتی بـێ وێنـە لەمێـژووی دەسـەڵاتداران کـە لـە ٢٠٠١/٩/١١ تەقینـەوەی تاوەرەکـانی مەڵبەنـدی ئـابووری جیهـان بـە فرۆکەکانی ئەمەریکا لەلایەن چەند کەسانێکی دڵ ئاسـنین ئـەنجام درا، بـەهۆی کارەسـاتی ٩/١١/ ٢٠٠١ ئەمـەریکا شـەڕی دژ بـە تـیرۆری ڕاگەیانـد لـەجیهان و بـۆ لـەناوبردنیان ئـەوەبوو لـە ١٠/٧/ ٢٠٠١ پـەلاماری دەسەڵاتی تالـەبان و بنلادنـی دا لەئەفغانـستان لەئـەنجام بـوە هـۆی ڕوخانـدنی دەسـەڵاتەکەو دامەزرانـدنی حکومـەتی کـاتی ئەفغانستان بەسـەرۆکایەتی حامید کـارازای بوە هـۆی ئـەوەی بورهانـەدین ڕەبـانی ئەفغانـستان بەجێ بهێڵێ.

دوای ئەوە لە ٢٠/٣/ ٢٠٠٣ لەهێرشێکی بێ وێنـە پـەلاماری ڕژێمـی بەعـسی لەعێراقـدا بەسـەرۆکایەتی سـەدام بـەهاوکاری هێـزی هاوپەیمانان بوە هۆی ڕوخانی ڕژێمی سەدام لە ٢٠٠٣/٤/٩ دوای ئـەوە لـە ٦/٥/ ٢٠٠٣ بـوڵ بریمـەری کـردە دادوەری گشتی دەسەڵاتی کاتی هاوپـەیمانان لـە عێـراق تـاکو دامەزرانـدنی حکومەتی کاتی عێراق لە ٢٠٠٤/٦/١، سەرەڕای ئـەوە سوپای هاوپـەیمانان لـەژێر نـاوی (ڕەگـەزە هەمـە جۆرەکـان) لـەعێراق مانـەوەو ڕووبـەڕوی شـەڕی تیرۆریـستانی ئیسلامی بـوەوە بەتایبـەت

لایەنگرانی مقتەدا سەدری شیعەو پاشماوەی ڕژێمی سەدام .لە هەلبژاردنەکانی ئەمەریکا لەئەنجامی پڕوپاگەندەی توندی نێوان بۆش و کێری و ململانێی نێوان دەنگدەرانی هەردوو پارتی دیموکراتی و کۆماری لەئەنجام جۆرج بۆش لە٢/١١/٢٠٠٤بۆ جاری دووەم سەرکەوتنی بەدەست هێناو بەردەوام بوونی لە پۆستی سەرۆکایەتی ئەمەریکاو بەردەوام بوونی لە بەریەرەکانێ کردنی تیرۆرو جێبەجێکردنی ڕامیاریەتی ڕۆژهەلاتی گەورە لە وەدی هێنانی خواست و ویستی دەسەلاتی ئەمەریکا لە هەموو بوارە جیاجیاکانی لەپێشەوەی کارە مرۆڤایەتیەکاندایە .

- ئەمەریکا ئەندامە لەڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان، ئەندامە لەڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، ئەندامە لەپەیمانی باکوری ئەتلەسی ،ئەندامە لەڕێکخراوی دوەلی ئەمەریکی، ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاری و ئابوری و بوژانەوە، ئەندامە لەڕێکخراوی هاوکاری ئابوری ئاسیای باسیفیك، ئەندامە لەڕێکخراوی ئاسایسش و هاوکاری ئەورووپی.

## ئەنتیگوا و بربۆدا

- پایتەختی: سانت جۆنز، ژمارەی دانیشتوانی (٨٥٥ر٤٠ هەزار کەسە). بەندەرێکی سەرەکیە دەکەوێتە دورگەی ئەنتیگوا.
- شارە سەرەکیەکانی: کۆدرینگتۆن دەکەوێتە دەرگەی بربۆدا، ڕووبەری ١٧١ میل چوار گۆشەو ٤٤٢ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- ڕووبەری: ئەنتیگوا ١٠٨ میل چوار گۆشەیە، ڕووبەری بربودا ٦٣ میل چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٦٥٠ر٧٥ هەزار کەسە.
- چڕی دانیشتوانی: ٧٠٠ کەس لەیەك میل چوارگۆشە دا.
- بووژانەوەی دانیشتوانی: ٠٨٪.
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی ڕەسمیە).
- نژادەکانی: زۆربەیان ئەفەریقی ڕەش پێستن.
- ئایینەکانی: ئینجلیکانی سەر بەکەنیسەی ئینگلیزیە لەگەڵ کاسۆلیکی ڕۆمانی.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٩٢٪.
- دابەشی کارگێڕی: حەوت ئەبریشەیە کەلەشێوەی قەزایە.
- بەرگری: ٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٥٠٠ر٢٠ هەزار کەسە.
- دراوی: دۆلاری ڕۆژهەلاتی کاریبی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٤٨٠ ملیۆن دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجانی ناوخۆیی: ٥٠٠ر٧ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢٠٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: پەمۆ، مۆز، گیزی هیندی، مانجۆ، دانەوێڵە، تەڕەو میوەجات.
- پیشەسازیەکانی: گەشت و گوزار کە لە ٦٠٪ لە جموجوڵی ئابووری لەنیوەی زیاتر لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیەتی.
- بەرهەمی کارەبا: ١٠٠ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
- دەرچووەکانی: بەرهەمەکانی نەوت، ماشێن و کەلوپەل و گواستنەوە.
- داهاتی دەرەوەی: سوتەمەنی، خواردەمەنی، ماشێن.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: بەریتانیا، ئەمەریکا، کەنەدا، وولاتانی کاریبی، وولاتانی یەکێتی

ئەوروپا، چین، یابان.

- ڕژێمی دەسەڵات: لیبراڵی دیموکراتیە، شانشینی وولاتەکە (ئەلیزابیتی دووەم) داد وەرێك نوێنەرایەتی دەکات، بەلام دەسەلاتەکە بە دەست ئەنجومەنی وەزیرانە کە سەرۆك وەزیران سەرۆکایەتی دەکا، پەرلەمانەکە لە١٧ ئەندام پێکهاتیە، بە پێشنیاری گشتی هەڵدەبژێردرێن، هەموو ڕژێمێکی لەڕژێمی بەریتانیا دەردەچێت. هەر پارتێك لە هەڵبژاردن زۆرینە بە دەست بێنێ رامیاری حکومەتەکە بەپێی رامیاری پارتەکە دەبێ.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی کاری ئینتیگۆی، پارتی مام ناوەندی، چەپ ڕەوی ناوندی، پارتی یەکێتی پێشکەوتن، پارتی بزووتنەوەی گەلی بربۆدا.
- جوگرافیای وولات: ئەنتیگاو بربۆدا نەتەوەیەکی سەربەخۆیەو دوکەوێتە دوورگەی هیندی ڕۆژئاوا. گەورەترین دورگەیە و بوژانەوەیەکی مەزنی تیایە، ئەنتیگوا دوو دورگەی گەورەیە کەدەکەوێتە سەر دووری ٤٢٠ کیلۆمەتر لە ڕۆژهەلاتی دەریای کاریبی. دورگەی ئیستوائی (کەمەرەیی) فیری مێرگیە، زێی تیانییەو بارانی کەمە کە ئەمەش دەبێتە هۆی دروست بوونی وشکانی و نەبوونی باران وشکی دارستانەکانی.
- مێژووی وولات: دانیشتوانی ئەنتیگوا هیندیە لەگەڵ ئەمەریکای کاریبی، لە ساڵەکانی ١٤٩٣ (کریستۆفەر کۆلۆمبس) سەردانی ناوچەی کردو ناوی نابە ناوی تابلۆی ئینگوای کنیسەی سانت ماریا لە شاری سیفیل لە باشووری ڕۆژئاوای ئەسپانیا، لە ساڵی ١٦٣٢ بەریتانیەکان ڕویان لەناوچەکە کردو کردنیانە ژێر دەستیەکی ئاوەدانو پەرەپێدان، کردنەوەی دانیشتوان لە سانت کیتس بەپێی پەیمانی بریدا بوو، لەساڵی ١٦٦٧ ئینتیگوا بەرەسمی درایە بەریتانیاو داوا کاری فەرەنسا لەسەر وڵاتەکە کۆتایی پێهات.

لە ساڵی ١٦٧٤ کریستۆفەر کوردینگتۆن کێڵگەی چەوەندەری شەکری لێ دامەزراند لە بربادۆس لەوپەڕی دووری لە ڕۆژهەلاتی دورگەی هیندی ڕۆژئاوا، دورگەکە لەبەریتانیا بەکرێ گیرا بۆ کاری کشتوکاڵی چەوەندەری شەکر، لەساڵی ١٦٨٥ ئەفریقیەکانی هێنا بۆ کاری کشتوکاڵی. لەساڵی ١٨٣٤ کوێلە ئینگوایەکان ڕزگار کران، لەساڵی ١٨٦٠ بربوداش لکێندرا بە ئەنتیگوا، لەساڵەکانی ١٩٥٨و١٩٦٢ هەردوو دورگەکە پارچەیەك بوون لە یەکێتی دورگەی هیندی ڕۆژئاوا.

لە ساڵی ١٩٦٧ ئەنتیگواو بربۆدا سەربەخۆییان وەرگرت بەمەرجێك بەریتانیا کاروباری بەرگری و کاروباری دەرەوەی بەدەست بێت، لە ساڵی ١٩٦٩ جولانەوە لەپێناو جیابوونەوە لەدورگەی بربۆدا دروستبوو لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧١ پارتی کاری پێشکەوتوو سەرکەوتنی بەدەست هێنا، لە ساڵی ١٩٧٦ پارتی کاری پێشکەوتن داوای سەربەخۆیی زۆری کرد بەلام بەهۆی هەڵبژاردنەکانی پارتی کاری ئەنتیگوا بە سەرکردایەتی بیرد بوە هۆی دواخستنی داواکە. لە ١٩٨١/١١/١ سەربەخۆی تەواویان وەرگرت لە بەریتانیا، ئەنتیگوا لەدوای سەربەخۆیی هاوکاری ئەمەریکای کرد دژی گرینادا سەرەڕای گرتنە بەری ڕامیاریەتی بێ لایەن ... بەهۆی شالاوەکانی بەرهەڵستکاران دژی سەرەك وەزیرانو یەکگرتنی پارتەکان بووە هۆی پێشکەوتنی لەهەلبژاردنەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێناکە لیستر بیرد بەسەرەك وەزیران هەلبژێردرا. •

- ئەنتیگواو بربۆدا ئەندامی لە کۆمەنولسی بەریتانیا، لە ڕێکخراوی وولاتانی ئەمەریکا، لەڕێکخراوی وولاتانی ڕۆژهەلاتی کاریبی، ئەندامە لە ڕێکخراوی بازاڕی هاوبەش، ئەندامە لە کۆمەڵەی کاریبی، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

# بـربـادۆس

- بربـادۆس یەكێكـە لـەو وڵاتانـەی كۆمەنولـسی بـەریتانی و دورگەیەكە لـە دەریـای كـاریبی كـە زۆربـەی دورگــەكانی هینــدی ڕۆژئــاوا لــەخۆ دەگرێ، ژیانیان لە ئینگلیزەكان دەچێ لە داب و نـەریت لـە بەرئـەوە ناسـراون بـە ئینگلترای بچووك.
- پایتـــــەختی: بــــریگ تــــۆن، ژمـــــارەی دانیشتوەانی٠٠٠ر١١٥ هەزار كەسە.
- شارە گرنگەكانی: سپانیس تۆن، هۆل تۆن.
- رووبـــــەری: ١٦٦ میـــل چوارگۆشـــــەو ٤٣٠ كیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٥٠٠ر٣١٥ هەزار كەسە.
- چـڕی دانیـشتوانی: ١٩٠١ كـەس لەیـەك میـل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر١٠٪.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٩٨٪.
- نـــژادەكانی: ئـــەفریقی ٨٠٪، ئـــەورووپی ٤٪، تێكەڵاو ١٦٪.
- زمانەكانی: ئینگلیزی (زمانی ڕەسمیە) باجانی زاراوەیـەكی ئینگلیزییـە، بریسا زاراوەیـەكی روسیە.
- ئایینـــەكانی: برۆتـــستنتیە ٦٧٪، كاســۆلیكی رۆمانی ٤٪، چەندین بیرو رای ئاینی تر تیایە.
- دابەشـی كـارگێڕی: ١١ ئەبرێشەیە لـە شـێوەی كارگێڕی قەزا.
- بەرگری و هێزی سوپای: ٠٠٠ر١٠هەزار كەسە.
- دراوی: دۆلاری بربادۆسی.
- كـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٨٥٠ر٢ ملیـار دۆلار.
- بەشـی تـاك لـەكۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٩٥٠ر١٠ دۆلار.
- زەوی كشتوكاڵی: ٥ر٧٧٪ لە خاكی وڵاتەكە.
- بەرهەمی كشتوكاڵی: چەوەندەری شەكر، پەمۆ، دانەوێڵــــە، تــــەرەو میوەجــــاتی هەمــــە جۆر،هەنگوین.
- سامانی سروشتی: نەوت، غاز، ماسی.
- بەرهـــــەمی كارەبـــا: ٦٧٥ ملیـــۆن كیلـــۆوات كاتژمێر.
- پیشەسازی: پیشەسازی سوك، دروستكردنی شەكر، ماسی لە قتونان.
- گەشـــت و گـــوزار: گەشـــت و گـــوزار دووەم بەرهەمیـــەتی لـــەدوای بەرهـــەمی كـــشتوكاڵی بـەهۆی بـەپیتی خـاك و لـەباری كـەش و هـەوا و ناوچە گوزاریەكەی.
- داهـــاتی دەرەوەی: كـــەلو پـــەلی گواســـتنەوە، كەلوپـەلی خواردەمـەنی، كەلوپـەلی بـەكارهێنان، كەلوپـــەلی خـــاو، نـــەوت، ماشـــێن ، كەلوپـــەلی بیناسازی.
- دەرچووەكانی: شەكر، هەنگوینی ڕەش، كیمیا، پێك هاتەكانی كارەبا، جل و بەرگ، خواردنەوە،
- هاوبەشـەكانی بازرگـانی: ئەمـەریكا، وڵاتـی كاریبی، بەریتانیا، كەنەدا، یابان، چین.
- ڕژێمـی دەسـەڵات: دیمـوكراتی پەرلەمانییـە، مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەكانی ١٦٢٠ زاینی كە دەسەڵاتی یاسادانانی تیا دامەزراوە، دوو ئەنجومـەنی هەیـە یەكـەمیان ئەنجومـەنی پیران ئەندامـــەكانی دادەمـــەزرێن و ئەنجومـــەنی نوێنـــەران هەڵدەبـــژێردرێن، ســـەرۆكی وڵات شانـشین (ئـەلیزابیتی دووەمـە) و دادوەرێـك نوێنەرایەتی دەكات لەكاروباری وڵاتەكە.
- پارتـە رامیاریـەكان: پـارتی كـاری بربادۆسـی، پـــارتی مـــام ناوەنـــدی، پـــارتی چـــەپ ڕەوی ناوەنـدی، پـارتی كـاری دیمـوكراتی، پـارتی نیشتیمانی دیموكراتی.
- جوگرافیـــــای وڵات: بربـــــارۆس دەكەوێتـــــە سەرزەریای ئەتڵەسی لەلای ڕۆژهەڵاتی دورگەی

هیندی ڕۆژئاوا، نزیکەی ٤٨٣ کیلۆمەتر دوورە لە باکوری فنزویلا، نزیکترین دراوسێی ئەویش سانت لۆسیاو سانت مینسنت، دورگەی گرنادینز لە ڕۆژئاوای کە دورگەکە ٢٤ کیلۆمەتر درێژەو پانی ٢١ کیلۆمەترەو لادراوەو دەوری بەگیاو ڕوەك و مێرگ گیراوە لەهەموو لایەك، کەنارەکانی زۆر جوان و دڵ ڕفێنن و خۆشترین کەش و هەوای هەیە لە وەرزەکانی ساڵدا.

- مێژووی بریادۆس: لە ساڵی ١٥٣٦ (بدرۆئیەکامبۆس) سەردانی دورگەکەی کردوە، ناوی دورگەکەی نا(لۆس بریادۆس) بەهۆی زۆری درەختی زەیتون، دانیشتوانی لەناوچوون بەهۆی نەخۆشی (الادك) لەدوای تێکەڵاو بونیان لەگەڵ ئەوروپیەکان، لە ساڵی ١٦٠٥ یەکەم جار گەیشتە بریادۆس بۆ نیشتەجێ کردنی ئینگلیزەکان ، لە ساڵی ١٦٢٧ ژێر دەستەیەکی بەریتانی لێ دروستکراو دەستکرا بەچاندنی چەوەندەری شەکرو پەرەی سەند تا بوە کێڵگەیەکی بەرهەم هێنەری شەکر بەهۆی هێنانی کرێکارە ئەفریقیە کۆیلەکان و کارپێ کردنیان لەو کێڵگەیەدا. لە ساڵی ١٦٣٩ یەکەم پەرلەمان دامەزرا بەناوی ئەنجومەنی کۆمەڵگە، لە ساڵی ١٨١٦ شۆڕشی یەکەمی کۆتایی کۆیلەکان بەرپابوو بە سەرکردایەتی (بۆسا) کە بووە هۆی ڕزگارو ئازاد کردنی کۆیلە ئەفریقیەکان، لە هەمان کاتا بوە یەکەم ژێر دەستەی تاجی بەریتانیا لە ساڵی ١٨٨٥، بوە ئەندام لە یەکێتی دورگەی هیندی ڕۆژئاوا لە ساڵی ١٩٥٨ تا ١٩٦٢، لەساڵی ١٩٣٧ خۆپیشاندان و نارەزایی سەری هەڵدا لەوکاتەی کە پارتی کاری بریادۆس دامەزرا لەلایەن گوانتلی ئادمز، ئەمەش داوایکرد کە بەرەو بەدەست هێنانی سەربەخۆی زیاتر هەنگاوی بنێن. لە ساڵی ١٩٥١ ماوەدان بۆ خۆهەڵبژاردنی پەرلەمان بەکەس نەدرا کە تەمەنی لە هەژدە ساڵ زیاتر بوو، پارتی کاری بریادۆس مافی خۆهەڵبژاردنی بەدەست هێنا ئەوەی تەمەنیان گونجاو بوو. لە ساڵی ١٩٥٤ یەکەم حکومەت دامەزرا و یەکەم سەرۆك وەزیران (مستر ئادمز بوو) لە پارتی کاری بریادۆسی. لە ساڵی ١٩٦١ مافی ئۆتۆنۆمی تەواوی ناوخۆیی وەرگرتو، پارتی کاری دیموکراتی حکومەتی پێك هێنا، لە ١٩٦٦/١١/٢٠ بریادۆس سەربەخۆیی تەواوی وەرگرت لەلایەن بەریتانیا لەناو کۆمەنولس، لە ساڵی ١٩٦٧ چوە ناو نەتەوە یەکگرتووەکان، لە ساڵی ١٩٧٢ پەیوەندی لەگەڵ کوبا بەست، لە ساڵی ١٩٨٢ بریادۆس لایەنگیری ئەمەریکای کرد لە داگیرکردنی وڵاتی گرینادا، لەکاتی وەرگرتنی سەربەخۆیی پارتەکان بە نۆبە دەسەڵات دەگرنە دەست هەتا لە پەرلەمانیش، داب و نەریتی بەریتانیا خۆی زاڵ کردوە بەسەر وڵاتەکە، بریادۆس تاکۆتایی ساڵی ٢٠٠٤ گیرو گرفتی نیەو ژیان بە ئاسودەیی دەبەن بەڕێوە لە کاری بوژانەوە بەردەوامە لەژێر چاودێری شانشینی بەریتانیا.
- بریادۆس ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە ڕێکخراوی وڵاتانی ئەمریکی، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

# پەنەما

- ناوی ڕەسمی: کۆماری پەنەما.
- پایتەختی: پەنەما سیتی، ژمارەی دانیشتوانی ٦٣٥ر٠٠٠هەزار کەسە.
- بەندەرە سەرکیەکانی: بلیوا، کریستۆبال.
- ڕووبەری: ٢٩ر٧٦١میل چار گۆشەو ٧٧ر٠٨٢ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٢ر١٢٥ر٠٠٠ ملیۆن کەسە، بەپێی بڵاوکراوەی ئەنتەرنێتی ٢٠٠١.
- چڕی دانیشتوانی: ١٠٥کەس لە یەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢ر٢٪.
- زمانەکانی: ئەسپانی (زمانی ڕسمیە) ئینگلیزی.
- نژادەکانی: مستیزۆ ٧٠٪، هیندی ڕۆژئاوا ١٤٪، سپی پێستەکان ١٠٪، هیندی ٦٪.
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی: ٨٥٪. پرۆتستانت ١٥٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٠٪.
- دابەشی کارگێری: ٩ پارێزگایە. لەگەڵ سێ ماف ئۆتۆنۆمی کە پارێزراوی هیندیە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ١٨ر١١٥ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٦ر٨٥٠دۆلار.
- بەرگری: ٥ر٧٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ١٠٢ر٠٠٠هەزار کەسە.
- دراوی: بلیوا.
- زەوی کشوکاڵی: ٦,٥٪ لە خاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمەکانی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، مۆز، چەوەندەری شەکر، برنج ، تەرە، میوەجات، قاوە.
- سامانی ئاژەڵی: ١ر٣٠٠ ملیۆن سەر، بزن ٨٥٠ر٠٠٠ هەزار سەر، بەراز ٣ر١٠٠ ملیۆن سەر، چێڵ ٦٠٠ ر١ ملیۆن سەر، پەرەور ١٩ر٨٠٠ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: چیمەنتۆ، بەرهەمی پەر، پاڵاوتنی نەوت، گۆڕینەوەی دراو.
- بەرهەمی سرووشتی: داری دارستانەکان.
- بەرهەمی کارەبا: ٣ر٨٥٠ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەروەی: سووتەمەنی، کەلوپەلی دروستکراو، ماشین وکەلەپەلی گواستنەوە، کەلوپەلی خۆراك، داودەرمانی پزیشکی.
- دەرچووەکانی: قاوە، مۆز، شەکر، جل وبەرگ.
- هاو بەشەکانی بازرگانی: مەکسیك، وڵاتانی کاریبی، یابان، ئەمەریکا، بەریتانیا، چین. ئەلمانیا، ئەمەریکای ناوەندی.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی دەستوورییە، دەسەڵاتی جێبەجێکردن بەندە بە سەرۆك کۆمار، جێگرەکەی وبەکارهێنانی دەسەڵات بە هاوبەشی لەگەڵ ئەنجومەنی وەزیران کە لە ١٢وەزیر پێك هاتوە و سەرۆك کۆمار دایان دەمەزرێنێت.

ماوەی دەسەڵاتی سەرۆك‌و جێگرەکەی پێنج ساڵەو نابێ دوو جار لەدوای یەکتری خۆیان هەڵبژێرن. ئەنجومەنی یاسادانان ماوەی هەڵبژاردنی پێنج ساڵە بە پێشنیاری ڕاستەوخۆ.

- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی ئازادی نەتەوەی کۆماری، بزوتنەوەی بابانیگۆ، مام ناوەندی چەپ، پارتی شۆڕشگێری دیموکراتی، پارتی ئەرنۆل فیسنا، چەندین بیرو بۆچونی تری ڕامیاری وکۆمەڵایەتی ونەتەوەی دیموکراتی.
- جوگرافیای وڵات: پەنەما دەکەێتە ئەمەریکای ناوەندی لە دەوری لای باشووری، کۆستەریکا

دەكەوێتە ڕۆژئاوای، كۆلۆمبیا دەكەوێتە ڕۆژهەڵات، لەڕۆژئاوای چەند زنجیرە چیایەك هەن بەڵام لە ناوەڕاسیتی گردو دۆڵی تیایە، لەناوچەی كاریبی دارستانی ئیستوائی تیایە كە ناوچەیەكی بارانلویە، كەناڵی پەنەمای برزخ كە كەوتۆتە نێوان دەریای كاریبی لە ڕۆژهەڵات ودەریای هادی لەڕۆژئاوا لێكیان جیا دەكاتەوە، لە گەروی خاڵێكی گرنگە، لەزۆربەی ئەو ناوچەیە هەڵگری كەشتیەكانە لە نێوان دەریاو زەریادا، لەكەنداو دورگەی بیرلی تێدایە.

مێـژووی وڵات: لەساڵی ١٥٠٠ گەڕۆكی ئەسپانی (ڕودریگۆدی) سەردانی كەنارەكانی پەنەمای كرد لەو كاتەش كۆلۆمبس لەساڵی ١٥٠٢ سەردانی كرد،دوای ئەوە دادوەرێكی ئیسپانیان دانا بۆ سەرپەرشتی كردنی ناوچەكە بەڵام دوایی لەسێدارە درا بە هۆی خیانەتی مەزنی دژی ئیسپانیا. دوای ئەوە لە ئەنجامی كێشە وململانێی داگیركەرانی ناوچەكە لەوانە وێران كردنی شاری پەنەمای كۆن كە لەساڵی ١٥١٩ دروستكرابوو.

دوای ئەوە پەنەما ڕزگاری بوو لەژێر داگیركەری ئیسپانیا، لەساڵی ١٨٢١چووە ڕیزی كۆلۆمبیا كە لەوكاتەی ئەمەریكای ناوەندی دژی ئیسپانیا جەنگی دەكردو كۆلۆمبیا سەربەخۆی خۆی ڕاگەیاند وزیاتر لە هەشتاو دووساڵ هەوڵی پەنەما بۆ جیابونەوەی لە كۆلۆمبیا بەردەوام بوو بەڵام لەو كارەی سەرنەكەوت. لە دوای داواكاریەكانی ئەمەریكا لە كۆلۆمبیاو ماوەدانی بۆیەكار هێنانی بەندەرەكان و پشتگیریكردنی پەنەما، پەنەما سەربەخۆیی ڕاگەیاند لە ١١/٣/ ١٩٠٣.

لەساڵی ١٩٧٤ پەنەما وئەمەریكا ڕێكەوتن لەسەر ئەوەی كە كەناری پەنەما بگەڕێتەوە بۆ پەنەما ئەمەش لەدوای چەندین ڕێكەوتن لە نێوان چیمی كارتەری سەرۆكی ئەمەریكاو سەرۆكی پەنەما عمر هیراری بەخاوەندیەتی بوون لە كەناڵەكە بە ناوی پەنەما بكرێتەوە. دوای ئەوە هێزەكانی ئەمەریكا لە ١٩٩١/١٢/٣١ لە پەنەما كشانەوەو ئەمەریكا یارمەتیەكانی پەنەمای وردە وردە زیاد دەكرد، بەڵام لەساڵی١٩٩٤ بۆ یەكەم جار سەرۆك كۆمار لە پەنەما لەڕێگەی هەڵبژاردن بڕیاری بۆ دراو لە دوای شانزەساڵ بەهۆی سەرنەكەوتن دەستی لە كار كێشایەوە وجێگرەكەی جێگەی گرتەوە، تاكو كۆتایی ساڵی ٢٠٠٢پەنەما بەئالوگۆڕی دەسەڵات دا تێپەڕی بەشێوەیەكی ڕێك.

- پەنەما ئەندامە لەنەتەوە یەككرتووەكان، ئەندامە لەڕێكخراوی وڵاتانی ئەمەریكا.

# گرینادا

- ناوی رەسمی: دەوڵەتی گرینادا.
- پایتەختی: گۆرجس، ژمارەی دانیشتوانی ٥٠٠ر١٠ هەزار کەسە.
- رووبەری: ١٣٣ میل چوار گۆشەو ٣٤٤ کیلۆمەتر چوار گۆشە یە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر١٢٥ هەزار کەسە.
- چڕی دانیشتوانی: ٩٤٠ کەس لە یەک میل چوار گۆشە دا.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: سان گۆرجس، گرانفیل.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ١,٢٪.
- زمانەکانی: ئینگلیزی، فەرەنسی( هەردووکیان زمانی رەسمین.
- نژادەکانی: پێست رەشی ئەفریقی.
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی رۆمانی.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٨٥٪.
- دابەشی کارگێری: شەش کارگێری ئیبریشەیە لە شێوەی ناحیە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٢١٥ ملیۆن دۆلار.
- بەشی تاک لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر١٢ دۆلار.
- دراوی: دۆلاری کاریبی.
- زەوی کشتوکاڵی: ٣ر١٥٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: دانەوێڵە، مۆز، کاکاو، قاوە،تەرمو میوە جات.
- بەرهەمی کارەبا: ٨٥٠ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازی: بەرهەمی رستن وچنین، گەشت وگوزار.
- داهاتی دەرەوەی: پێداویستیەکانی خواردەمەنی، سوتەمەنی، کیمیا، ماشێن، کەلوپەلی دروستکراو.
- دەرچووەکانی: گیز، کاکاو، مۆز، بەرهەمی رستن وچنین.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، ترینیداد، تۆباگۆ، ئەمەریکا، چینی میللی، بەریتانیا.
- رژێمی دەسەڵات: وولاتێکی پەرلەمانی دیموکراتیە، (ئیلیزابیتی دووەمی) شانشینی بەریتانیا سەرۆکایەتی دەکات لە رێگەی نوێنەری تایبەتی خۆی، سەرۆک وەزیران سەرۆکی حکومەتەو بە دەست نیشانکردنی پەرلەمان هەڵدەبژێرێ ، پەرلەمان لە ١٥ ئەندام پێک هاتوە بە پێشنیاری گشتیو نهێنی هەڵدەبژێردرێن بۆ ماوەی هەر پێنج ساڵ جارێک.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی کۆنگرەی دیموکراتی نیشتمانی، پارتی چەپی نەتەوەیی، پارتی نیشتمانی ناوەندی، پارتی کاری گرینادای یەکگرتوو.
- جوگرافیای وولات: گرینادا دەکەوێتە سەر دەریای کاریبی بە دوری ٩٠ میل لە باکووری فنزویلا، فنزویلا ترینیداد وتۆباگۆ دەکەوێتە باشووری، سانت مینسنت وگرینیدینز دەکەوێتە باکووری، ئەم وولاتە پێک هاتوە لە دورگەیەک وکۆمەڵێک دورگەی گرینەدینزی باشوور، دورگەی سەرەکی چیاییەو وگرکانیە، تافگەی جوان ومەزنی بەپیتی لێیە کە پێی دەوترێت (ئندیل گرینیدا) یەکێکە لەبچوکترین وولاتە سەربەخۆیەکانی سەر نیوەی خرۆکەی زەوی لە جیهانا.
- مێژووی گرینادا: لە ساڵی١٤٩٨ کۆلۆمبس گرینیدای ئەسپانی دۆزیەوە، ئەسپانەکان ناویان نا گرینیدا، سەرەرای بەرگری لە خاکی گرینادا لە لایەن دانیشتوانەکەی بەلام فەرەنسیەکان بەزۆر کردیانە دانیشنگەی خۆیان

که لەدورگەی مرتینکی فەرەنسی کۆچی بەرەو ناوچەکە کردبوو، بەڵام دوایی لەساڵی ١٧٦٣ فەرەنسیەکان بۆ بەریتانیا جێیان هێشت بە پێی پەیمانی فرسای، لەساڵی ١٧٩٥ یاخی بونێکی هەرەس پێهێنراو ئەنجام درا لە دژی بەریتانیەکان بەسەرکردایەتی یەکێك لە سەرکردە رەش پێستە جوتیارەکان لەسەر شێوازی بیری شۆرشی فرەنسا،لە ساڵی ١٨٢٤رژێمی کۆیلە"رق" هەلوەشێنرایەوە، لە ساڵی ١٩٥٠ (ئریک گیری) سەرۆکی سەندیکا پارتی کاری گرینادی یەکگرتوی دەمەزراند، لەساڵەکانی ١٩٦٢ تا ١٩٦٧ گریندا پارچەیەك بوو لە دەوڵەتی دورگەی هندی رۆژئاوای یەکگرتوو، لە ساڵی ١٩٦٧ مافی ئۆتۆنۆمی بەدەست هێنا، لە ٢/٢٧/ ١٩٧٤ سەربەخۆی وەگرت لە ناوکۆمەنولسی بەریتانیا، لەساڵی ١٩٨٢ کێشە کەوتە نێوان گرینادا لە گەل ئەمەریکاو بەریتانیا بە هۆی بەستنی پەوەندی لەگەڵ کوبا ویەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو.

لەساڵی ١٩٨٣ هەوڵی چاك کردنەوەی پەیوەندی درا لەگەڵ ئەمەریکا و قەشەیان لەسەر دەسەڵات لابرد لە رێگەی بەرهەڵستکارە چەپ رەوەکان کە بوە هۆی ئەنجامدانی کودەتای سەربازی بەسەرکردایەتی (ژەنەراڵ ئۆستیتی ) وقەشە لەگەڵ سێ هاورێی تری لە سێدارەدران، ئەمەریکا لەمانگی ١٠/١٩٨٣/ گرینادای داگیرکردو ئۆستیتی دەستگیر کردودەستوری ١٩٧٤ خستەوە کار.

لەساڵی ١٩٩٠ پارتی کۆنگرەی نیشتمانی دیموکراتی لەگەڵ چەندین ئەندامانی پارەتەکانی تر حکومە تیان پێك هێنا بەهۆی دەرنەچونی هیچ پارتێك بەرێژەی تەواو لە هەڵبژاردنەکە، لەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٥ پارتی نوێی نیشتمانی سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

- گرینادا ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لەرێکخراوی وولاتانی ئەمەریکا.

# سانت لۆشا

- ناوی رەسمی: سانت لوشا.
- پایتەختی: کاستریز، ژمارەی دانیشتوانی٠٠٠ر١١٥هەزار کەسە.
- رووبەری: ٢٤٠میل چوارگۆشەو ٦٢٢ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر١٩٥هەزار کەسە.
- چری دانیشتوانی: ٨١٢ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر١٪.
- بەندەرە گرنگەکانی: کاستریز، فیبەفۆر.
- نژادەکانی: پێست رەشەکان ٩٠٪، تێکەڵاو ٦٪، هیندی رۆژهەلات ٤٪.
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی رەسمیە) پانۆی، فەرەنسی.
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی رۆمانی ٩٠٪، پرۆتستانت ٧٪، ئینجلکانی ٣٪.
- زانینی نوسین و خوێندن: ٨٥٪.
- دابەشی کارگێری: ١١ بەشی کارگێریە.
- کۆی دەرئەنجانی ناوخۆیی: ٦٢٥ ملیۆن دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٥٠ر٣ دۆلار.
- دراوی: دۆلاری رۆژهەلاتی کاریبی.

- زەوی کشتوکاڵی: ٣ر٨٪ لە خاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: کاکاو، گیزی هیندی، مۆز، چەوەندەری شەکر، سوورایی، تەڕە، میوەجات، داری دارستانەکان.
- پیشەسازی: جل وبەرگ، خواردنەوە، گەشت و گوزار، لێك دانی ئامێری ئەلیکترۆنی.
- بەرهەمی کارەبا: ١٢٥ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: پەینی کیمیاوی، بەرهەمەکانی نەوت، کەلوپەلی خۆراك، کەلوپەلی گواستنەوە، ئۆتۆمبێل.
- دەرچووەکانی: ڕۆنی گیزی هیندی، مۆز، کاکاو، جل و بەرگ، تەڕەو میوەجات، بەرهەمی داری دارستانەکان.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، کەنەدا، چینی میللی، ئەمەریکا، بەریتانیا، وڵاتی کاریبی.
- ڕژێمی دەسەڵات: وڵاتێکی پەرلەمانیە. سەرۆکی دەوڵەت شانشین ئەلیزابیتی دووەمی شانشینی بەریتانیا و داوەرێك نوێنەرایەتی دەکات، سەرۆك وەزیران سەرۆکایەتی وڵات دەکات کە بە ئامۆژگاری ئەنجومەنی یاسادانان دەست نیشان دەکرێ، ئەنجومەن لە ١٧ ئەندام پێك هاتوو هەڵدەبژێردرێت بە پێشنیاری گشتی نهێنی بۆ ماوەی پێنج ساڵ.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی کاری یەکگرتوو، پارتی کاری سانت لوشا.
- جوگرافیای سانت لۆشا: دورگەکە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی کاریبی لەباشوری دورگەی مارتینك ڕاستەوخۆ، دورگەی مارتینك دەکەوێتە باشوری، دورگەی سانت فنسلت دەکەوێتە باشوری، ڕووی دورگەکە لە بنەڕەتا گرکانیە، لە باشوری دارستانی چڕی تیایە، ڕوبارەکانی لە ناوەڕاستی دێتە خوارێ، زەویەکی بە پیتی هەیە لە دۆڵە فراوانەکان.
- مێژووی دورگەکە: ئەسپانیەکان لە ساڵی ١٥٠٣ حکومڕانیان لەو ناوچەیە کردووە لە دوای دۆزینەوەی. لەدوای ئەوان فەڕەنسیەکان دەسەڵاتدارەتیان دەکرد بەڵام دوای ئەوە سانت لوشابوە خاڵێکی گرنگی بەریتانیا لەساڵی ١٨٠٣. لە ساڵی ١٩٦٧ حوکمێکی ناوخۆیی لەبەریتانیا وەرگرت و یەکێك بوو لە وڵاتەکانی دورگەی هیندی ڕۆژئاوا. لە ١٩٧٩/٢/٢٢/ سانت لۆشا سەربەخۆیی تەواوی وەرگرت. لە ساڵی ١٩٨٢ کۆمنۆن و لایەنگیرەکانی لە هەڵبژاردنەکەی مانگی ١٩٩٣/٥/ سەرکەوتنیان بە دەست هێناو دەسەڵاتیان گرتە دەست بەدامەزراندن حکومەت و لەهەڵبژاردنەکانی ١٩٩٧ (کۆمنۆن) دوبارە بەسەرۆك وڵات هەڵبژێردراوە
- سانت لوشا: ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە ڕێکخراوی وڵاتانی ئەمەریکا، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

# سانت کیتس و نیفیس

- ناوی ڕەسمی: یەکێتی سانت کیتس و نیفیس.
- پایتـــــەختی: باســـــتر، ژمـــــارەی دانیشتوانی ۸٠٠ر۲۳ هەزار کەسە.
- ڕووبـەری: ۲٦۲ کیلۆمـەتر چوارگۆشـە. لەوانـە ســانت کیــتس ۱٦۹ کیلۆمــەتر چوارگۆشــەو درگەی نیفیس ۹۳ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- چڕی دانیشتوانی: ۲٥۸ کەس لە یەك کیلۆمەتر چوارگۆشەدا.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٥٠٠ر٦۷ هەزار کەسە.
- شــارە ســەرەکیەکانی: ســانت کریــستۆفر، تشارلزتۆن، هەردوکیان بەندەری سەرەکین لە وولاتەکە.
- نژادەکانی: پێست ڕەشەکان ۹۳٪، تێکەڵاو ۲٪، سپی پێست ۲٪.
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی ڕەسمیە).
- ئاینەکانی: ئینجلیکانی، کاسۆلیکی ڕۆمانی.
- زانینی نوسین و خوێندن: ۹٥٪.
- دابەشـی کــارگێڕی: ۱٤ ئەبریــشیەیە،واتە لــە شێوەی کارگێڕی ناحیە.
- دراوی: دۆلاری ڕۆژهەڵاتی کاریبی.
- کۆی دەرئەنجانی ناوخۆیی: ۲٤٠ ملیۆن دۆلار.
- بەشـی تـاك لـە کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ۷٥٠ر٥ دۆلار.
- بــەرگری و ســوپاکەی: لەلایــەنی بــەریتانیاوە پارێزگاری لێ دەکرێت.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر۲۲٪ لە خاکی دورگەکە.
- بەرهـــەمی کـــشتوکاڵی: بــرنج ، چــەوەندەری شــەکر، تــەرە، میوەجــات، پــەمۆ، گــەنم و جــۆو دانەوێڵــە. کــشتوکاڵ و گەشــت و گــوزار دوو بەرهـەمی سـەرەکین لـە وولاتەکـە کـە دورگـەی سانت کیتس بە زۆری چەوەندەری شەکری لێ دەچـێنرێ و دورگـەی نفـیس پـەمۆ و تـەرەو میوەجاتی لێ دەچێنرێت.
- پیــشەسازی: دروســتکردنی شــەکر، پــاك کردنەوەی خوێ، گەشت و گوزار.
- داهــاتی دەرەوەی: کەلوپــەلی دروســـتکراو، ماشـێن و کەلوپـەلی گواسـتنەوە، سـوتەمەنی، پێداویستی خۆراك.
- دەرچووەکانی: کەلوپـەلی دروسـتکراو، شـەکر، پولی پۆستە.
- هاوبەشـەکانی بازرگــانی: یابــان، ترینیــداد، تۆباگۆ، ئەمەریکا، بەریتانیا.
- ڕژێمــی دەســەلات: وولاتێکــی پەرلەمانییــە، دادوەرێکی گشتی لەلایەنی شانشینی بەریتانیا نوێنەرایــەتی دەکـــات، ســـەرۆك وەزیـــران ســەرۆکایەتی حکومــەت دەکــات، پەرلــەمانی پێکهاتوە لـە ۱۱ ئەنـدامو بەپێشنیاری گشتی هەڵدەبژردرێن.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی کار، پارتی نفیس بۆ چاکسازی، پـارتی بزوتنـەوەی کـاری میللـی، بزوتنـەوەی هاوڵاتیـان گرنگـی بـە کاروبـاری وولاتەکە دەدات لەپێناو بەرەو پێشچوونی.
- جوگرافیــای وولات: ســانت کیــتس و نیفــیس دەکەوێتــە بەشــی بــاکوری دورگــەی ئــەنتیلی بچووك، لەڕۆژهەڵاتی دەریای کاریبی، ئەنتیگۆو بربوودا دەکەوێتە ڕۆژهـەلاتی، دورگـەی کیتس پێــشوو نــاوی دورگــەی کریــستۆفەر بــوە. دورگەکە لە بنەڕەتا گرکانی بوەو زنجیرە چیای گرنگـی تیایـە، کـەش و هـەوای بێ وێنەیـە بۆ گەشت و گوزار.
- مێـژووی دورگەکـە: پێکهاتـەی ئیراواك یەکـەم کەس بوو نیشتەجێی ئەو دورگەیە بونە بەلام لەدوایی ئەوان کاریبیەکان جێگەیان گرتنەوە، کۆلۆمبس لە دوای سەردانی بۆ ناوچەکە ساڵی

١٤٩٣ چاوی بریبوه ئەو دورگەیە. بەڵام دوایی بەریتانیا هەردوو دورگەکەی لە ساڵی ١٧٠٠ کردە کۆمەڵگای نیشتەجێی هاوڵاتیانی خۆی. لەهەمان کات فەرەنسییەکانیش ناوچەی کریستۆفەریان داگیرکردو کردیانە نیشتەجێی خۆیان، بەپێی پەیمانی پاریسی ساڵی ١٧٨٣ درا بەریتانیا و بوە بەشێك لە دورگەی لیۆرد لە١٨٧١ تاکو ١٩٥٦، دوایی ئەوە بوە بەشێك لە دورگەی هیندی رۆژئاوا لە ساڵی ١٩٥٨ تاکو ١٩٦٢. مافی ئۆتۆنۆمی لە ساڵی ١٩٦٧ وەرگرت. لە ١٩٨٣/٩/١٩ سەربەخۆی تەواوی وەرگرت، لە ساڵی ١٩٩٥ هەڵبژاردنی پەرلەمان ئەنجام دراو پارتی کاری بەرهەڵستکار سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

- سانت کیتس و نفیس ئەندامە لە کۆمەنولوسی بەریتانیا، ئەندامە لە ڕێکخراوی وولاتانی ئەمەریکا، ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

# کۆستاریکا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری کۆستاریکا.
- پایتەختی: سان جۆزی، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٩٨٧ هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ٧٣٠ر١٩ میل چوارگۆشەو١٠٠ر٥١ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٥٦٨ر٤ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ٢٠٠٠.
- چڕی دانیشتوانی: ٢٣٢ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٦ر١٪.
- شارە سەرەکییەکانی: لاجۆیلا، کارتاجۆ.
- بەندەرە سەرەکییەکانی: جولفینۆ، لیمۆن، بۆنتاریناس.
- نەژادەکانی: پێست سپییەکان ٩٥٪، پێست ڕەشەکان ٣٪.
- زمانەکانی: ئەسپانی (زمانی ڕەسمییە).
- ئاینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٩٠٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٧ ناوچەی پارێزگاییە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٦٥٠ر١٩ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٦٥٠ر٥ دۆلار.
- دراوی: کۆلۆن کوستاریکا.
- بەرگری: ٢ر١٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٥٠٠ر١٠ هەزار کەس کە بە ئارەزووی مەندییە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢ر٦٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، دانەوێڵە، قاوە، برنج، مۆز، چەوەندەری شەکر، پەتاتە، تەڕە، میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ٠٠٠ر ٢٣٢ هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر١٦٥ هەزار سەر، چێڵ ٥٥٠ر١ ملیۆن سەر، پەڕەوور ٥٠٠ر١٨ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: کەلوپەلی بیناسازی، پەینی کیمیاوی، کەلوپەلی پلاستیکی، ڕستن و چنین، دروستکردنی خۆراك.
- بەرهەمی کارەبا: ٠١٢ر٥ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: داری دارستانەکان، ڕاوی ماسی، وزەی کارەبا.
- داهاتی دەرەوی: سوتەمەنی، کەلوپەلی

سەرمایەداری، کەلوپەلی خاو، پێداویستی بەکارهێنان.

- دەرچووەکانی: شەکر، بەرهەمی ڕستن و چنین، قاوە، کاکاو، مۆز.
- ڕژێمی دەسەلات: کۆمارێکی دیموکراتیە، بەپێی دەستوری سالی ١٩٤٩ سەرۆك کۆمار بۆ ماوەی پێنج سال هەلدەبژێردرێت، ئەنجومەنی یاسادانان پێك هاتووە لە ٥٧ ئەندام و بۆماوەی چوار سال هەلدەبژێردریت.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی یەکێتی سۆشیالستی مەسیحی، پارتی ڕزگاری نیشتیمانی، پارتی چەپی ناوەندی، چەندین پارت و ڕێکخراوی تری هەمە جۆر تیایە کە هەموو لە پێناوی ولاتەکەیان خەبات دەکەن بە پێی بیرو بۆچوونیان.
- جوگرافیای ولات: کۆستاریکا دەکەوێتە ئەمەریکای ناوەندی لەنێوان دەریای کاریبی و ڕۆژهەلاتی زەریای هادی لە ڕۆژئاوا دا. کۆماری نیکاراگوا لە باکوری، پەنەما لە باشوری. زەویە نزمەکانی کەوتوونەتە سەر کەناری کاریبی کە نیستوائیە، لە ناوەراستی تەپۆلکەی مامناوەندیە. پاوانەکانی ٤٥٪ی خاکی ولاتەکە دەگرێتە خۆی. دارستانەکانی ٣٥٪، دوورگەی کۆکس پێکدێنێ، سەوزایەکی چڕی تیایە کە ٢٦ کیلۆمەتر چوارگۆشە دەبێت و کەوتۆتە سەر زەریای هادی بە درێژایی ٤٨٣ کیلۆمەتر لە کەناری کۆستاریکا.
- مێژووی ولات: لەوکاتەی کۆلۆمبۆس لەسالی ١٥٠٢ کۆستاریکای دۆزیەوە دانیشتوانەکەی هیندی بوون، لە سالی ١٥٦٣ ئەسپانیەکان داگیریان کرد کە هیندیەکان لەو کاتە لەژیان نەمابوون بەهۆی شالاوی دڕندانەی فەرەنسیەکان تەنیا ژمارەیەکی کەم نەبێت بە هۆی کوشتن و وێران کردن و دەربەدەربەدەرکردنیان.. لە ١٨٢١/٩/١٥کۆستاریکا سەربە خۆیی خۆی وەرگرت، لە سالی ١٨٤٨بنەماکانی دەسەلاتی کۆماری لە کۆستاریکا دامەزرا تەنیا ئەوکاتە نەبێت کە دەسەلاتی سەربازی دیکتاتۆری نەبێت لە سالی ١٨٧٠ تاکو ١٨٨٢بەردەوام بوو بە سەرکردایەتی تۆماس جاردریا دیکتاتۆری کۆستاریکا کە لە خۆشترین ژیان دا دەژیا لەئەمەریکای لاتینی. ئەوروپیەکان لەسەدەی نۆزدەم بەرەو کۆستاریکا کۆچیان کردو لەوێ خەریکی کشتوکالی قاوەو کاکاو بوون. لەماوەی سالەکانی ١٩٤٠ تا ١٩٤٤ چاکسازی لیبرالی خرا ناو ولات لەلایەن سەرۆك کالدرۆن جۆردیا دوای ئەوە پارتی سۆشیالستی یەکگرتووی مەسیحی پێك هێنا یەك لەوانە دانی نا بە مافی کرێکارو دیاریکردنی کاری ڕۆژو کرێی ڕۆژانە. لە سالی ١٩٤٩ دەستور بریاری بەدانان بەمافی بۆچوونە ناو هەلبژاردن لەگەل پێست ڕەشەکان. سوپای هەلوەشاندەوەو لەجێگەی سوپا پاسەوانی نیشتیمانی پێك هێنا. میجۆری فریە هەلبژێردرا بەسەرۆك کۆمار کە بەشداری پێك هێنانی پارتی ڕزگاری نیشتیمانی کردبوو، دوای ئەوە دەستکرا بە جێبەجێکردنی پرۆگرامی سۆشیالستی و بنکەکانی خۆمالی کردو ڕژێمی دابینکردنی بیمەی کۆمەلایەتی دانا. لەنێوان سالەکانی ١٩٥٨ تا ١٩٧٣ پارێزگاران حوکمڕانی ولاتەکەیان کرد. لە سالی ١٩٧٨ رودیجۆ کرازو لەهەلبژاردنەکان سەرکەوتنی بەدەستهێنا بۆ پۆستی سەرۆك کۆمارو لەکاتی ئەو تەنگژەی ئابووری سەریهەلدا لە ولاتەکە.

لە سالی ١٩٨٦ (ئۆسکار ئاریاس) خاوەنی پاداشتی نۆبل بوە سەرۆك کۆمار بەهۆی دارشتنی پرۆگرامە ئاشتیانەی لەئەمەریکای ناوەندی کە سەرکردەکانی نیکاراگواو سلفادۆرو

گواتیمالاو هندۆراس مۆریانکرد. له ساڵی ١٩٩٤ فیمۆرلس ئۆلسن به سەرۆك كۆمار هەڵبژێردراو دوای لە ساڵی ١٩٩٨ ڕوودریجۆز ئیشیفریا بەسەرۆك كۆمار هەڵبژێردرا، هەرچەندە كۆستاریكا وڵاتێكی كشتوكاڵیە بەلام تا ڕادەیەك بژێوی ژیانی لەمام ناوەندی باشترەو ئارامی و ئاسوودەی بەخۆدەبینێ.

- كۆستاریكا ئەندامە لە نەتەوە یەكگرتووەكان، ئەندامە لە ڕێكخراوی وڵاتانی ئەمەریكا.

# جامایكا

- پایتەختی: كینجستن، ژمارەی دانیشتوانی ٦٥٨ر٠٠٠هەزار كەسە.
- ڕووبەری: ٢٤٣ر٤میل چوار گۆشەو ٩٩٠ر١٠كیلۆ مەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٢ر٩٧٥ر٠٠٠ ملیۆن كەسە، بەپێی زانیاریەكانی ١٩٩٩.
- چڕی دانیشتوانی: ٧٠كەس لە یەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتووانی: ١٠ر٠٪
- شارەسەرەكیەكانی: سان ئەندرۆ، سینیشتۆن، مۆنتیجۆبای.
- بەندەرە سەرەكیەكانی: كینجستن، مونتیجۆبای.
- نژادەكانی: ئەفەریقی٧٦٪، ئەفرۆ ئەورووپی ١٥٪، سپی پێست و چینی٩٪.
- زمانەكانی: ئینگلیزی (زمانی ڕەسمییە) كریۆلی، جامایكا كە ئەمانە لە ڕەسەندا ئەگەڕێنەوە سەر ڕەچەڵەكی ئەورووپی.
- ئاینەكانی: پرۆتستانت٥٦٪، كاسۆلیكی ڕۆمانی٥٪، پەرستی گیان و هی تر٣٩٪.
- زانینی خوێندن ونوسین: ٨٨٪.
- دابەشی كارگێڕی: ١٤ ئەبریشەیەلە شێوەی كار گێڕی ناحیە.
- دراوی: دۆلاری جامایكا.
- كۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٩ر٥٥٠ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە كۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٣ر٧٠٠ دۆلار.
- بەرگری: ٨ر٠٪ لە كۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاكەی: ٣٥ر٠٠٠ هەزار كەسە.
- زەوی كشتوكاڵی: ١٤ر٥٪ لەخاكی وڵاتەكە.
- بەرهەمی كشتوكاڵی: گەنم، جۆ، قاوە، مۆز، پەتاتە، سورایی، چەوەندەری شەكر، تەڕە، میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ٤٠٠ر٠٠٠هەزار سەر، بزن ٤٥٠ر٠٠٠ هەزار سەر، چێڵ ٤٢٥ر٠٠٠ هەزار سەر، بەراز ١٨٥ر٠٠٠ هەزار سەر، پەرەور١٠ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: گەشت وگوزار، بۆكسیت، ئامادە كردنی خۆراك، پیشەسازی سوك، ڕستن وچنین، دروستكردنی شەكر.
- بەرهەمی كارەبای: ٤ر٩٥٠ملیار كیلۆ وات كاتژمێر.
- سامانی سروشتی: بورك و گەچ ،بەردی چەوی، بۆكسیت، ئەلەمنیۆم.
- داهاتەكانی دەرەوەی: سوتەمەنی، ماشێن، كەلوپەلی بەكار هێنانی هەمەجۆر، كەل وپەلی بیناسازی، پێداویستی خۆراك.
- دەرچووەكان: بۆكسیت، شەكر، مۆز، ئەلەمنیۆم.
- هاوبەشەكانی بازرگانی: یابان، چین، فەنزویلا، تۆباگۆ، نەرویج، كەنەدا، ئەمەریكا، بەریتانیا.
- ڕژێمی دەسەڵات: شانشینی دەستووریە، دەسەلاتی یاسادانان پێكهاتوە لە ئەنجومەنی

نوێنەران لە٦٠ئەندام بە پێشنیاری گشتی هەڵدەبژێردرێت، ئەنجومەنی پیران پێك هاتوە لە ٢١ ئەندام کە ئەوانیش دادەمەزرێن. سەرۆکی دەوڵەت شانشین ئەلیزابیتی دووەمی شانشینی بەریتانیا دادوەرێك نوێنەرایەتی دەکات کە ئەو سەرەك وەزیران دادەمەزرێنێ لە دوای ڕازی بونی ئەنجومەنی نوێنەران.

- پارتەڕامیاریەکان: پارتی یەکێتی نیشتمانی دیموکراتی، پارتی نیشتمانی گەل، پارتی کاری جامایکا، پارتی چەپی ناوەند.
- جوگرافیای وولآت: جامایکا دورگەیەکە دەکەوێتە بەشی هندی ڕۆژ ئاوا بەدوری ١٤٥ کیلۆمەتر لەباشووری کوباو بەدوری١٦میل لە ڕۆژئاوای هایتی. ئەودورگەیە پێك هاتوە لە کۆمەڵێ تەپولکەکە لەگردە گڕکانیەکانی ڕۆژهەلآت چواریەکی خاکی وولآتەکە بە دارستان داپۆشراوە، چیاکان ناوزەندن بە چیا شینەکان و بەتەم و مژی ناسك سەری دادەپۆشێ و جێگەی سەرسوڕمانە..
- مێژووی وڵات: دانیشتوانی جامایکا لە هندیە ئاراواك پێکهاتبون تائەو کاتەی کە کۆلۆمبس لە ساڵی١٤٩٤ سەردانی ناوچەی کردو ناوی نا سانتیاگۆ کە هەر لە ژێر دەسەلآتی ئەسپانیا مایەوە تاکو ساڵی١٦٥٥، دوای ئەوە بوە دوورگەیەکی خاوەندیەتی بەریتانیا، ئەودورگەیە بوژانەوەیەکی باشی بە خۆوە دی بەهۆی داهاتی بنکەکانی دەریاوانی لە (پورت رویال) کە ئەو کاتە پایەتەختی دوورگەکە بوو. ئەو پایتەختە لە ساڵی ١٦٩٢ ژێر ئاو کەوت بەهۆی زریانی بەفرو باران بوە هۆی کارەساتی بومەلەرزەی زەوی لەدوای ئەوە هندیە ئاراکان لەناو چون بەهۆی نەخۆشی، کرێکارە ڕەش پێستەکانیان هێنا بۆ کارپێکردن کە ئەو کاتە لەسیستەمی کۆیلایەتیدا بون و لە کاری کشتوکاڵی چەوەندەر کاریان پێدەکردن، دوای ئەوە بارودۆخی جامایکا گۆڕا بەرەو دوورگەیەکی ژێر دەستەیی .لەساڵی ١٩٣٨ خۆپیشاندان و ئاژاوە سەریهەڵدا بەهۆی نالەباری باری ئابووری و بەرزبوونەوەی هۆشی ڕامیاری جەماوەری و دامەزراندنی پارتی نیشتمانی گەلی جامایکا لەلایەن (نۆرمان مانلی)، لەساڵی١٩٤٤ دەستووری وولآت ڕاگەیەنرا، لەمانگی /١٩٥٢/٥ جامایکا مافی ئۆتۆنۆمی ناوخۆی وەرگرت، لەساڵی١٩٥٩ جامایکا مافی تەواوی ئۆتۆنۆمی وەرگرت، لە١٩٦٢/٨/٦ مافی سەربەخۆی تەواوی ڕاگەیاند لەناو کۆمەنولسی بەریتانیا و ئەلکسندەر بۆستامنت سەرکردەی پارتی کاری جامایکا پۆستی سەرەك وەزیرانی وەرگرت، لەساڵی١٩٧٢ میکل مانلی سەرکردەی پارتی گەلی نیشتمانی پۆستی سەرەك وەزیرانی گرتە دەست و پرۆگرامی سوشیالیستی جێبەجێکرد، پارتی کار لەهەڵبژاردنەکانی١٩٨٠ سەرکەوتنی بەدەستهێناو ئەدوارد سیگا بوە سەرەك وەزیران وڕامیاریەتی سەرمایەداری پەیڕەوکرد. لەساڵی ١٩٩٢ پارتی گەل لە هەڵبژاردنەکان زۆربەی زۆری کورسیەکانی پەرلەمانی بەدەست هێنا لەئەنجامی بەپابونی ئاژاوەو خۆپیشاندان

- جامایکا: ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لەڕێکخراوی وولآتانی ئەمەریکا.

# هنـــدۆراس

- ناوی ڕەسمی: کۆماری هندۆراس.
- پایتـــەختی: تێگـــوس گلـــب، ژمـــارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۰۳۵ر۱ملۆن کەسە.
- ڕووبەری: ۸۷۲ر٤٥میل چوارگۆشەو ٤٩٢ر١١٢ کیۆمەتر چوار گۆشەیە.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ۰۰۰ر۷٥۰ر٦ملیـۆن کەسە، بەپێی ئاماری ۱۹۹۸.
- چـڕی دانیـشتوانی: ۱٤۹کـەس لەیـەك میـل چوارگۆشەدا.
- شارە سەرەکیەکانی: شولۆتیکا،سان بدرۆسولا، برۆگریۆ.
- بەندەرە سەرەکیەکانی:لاسیبا، بۆرتۆکۆرتێز.
- نژادەکانی: مستیزۆ۹۰٪، هندی ئەمەریکی۷٪.
- زمانـەکانی:ئەسـپانی (زمـانی ڕەسمییـــە)، ئینگلیزی، هندی.
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی۹۷٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ۷٥٪.
- دابەشـی کـارگێڕی: ۱۸پارێزگایــە، زۆربـەی دانیشتووانی لە لادێکان نیشتەجێن‌و بەکاری کشتوکاڵی خەریکن.
- دراوی: لیمبیرا.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ۷٥۰ر۱۲ملیـار دۆلار.
- بەشـی تـاك لـەکۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ۳۰۰ر۲دۆلار.
- بەرگری: ۲٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی .
- سوپاکەی: ۵۰۰ر۳٥هەزار کەسە .
- زەوی کشتوکاڵی: ۰٥ر۱۵٪ لەخاکی وولاتەکە .
- بەرهـەمی کشتوکاڵی : گـەنمو جۆ، چەوەندەری شەکر، مۆز، قاوە، سورایی.
- سـامانی ئـاژەڵ: چیڵ‌و گـامێش۱٥۰ر۱ ملیۆن سەر، بەراز ۰۰۰ر۷٥۰ هـەزار سەر، مـەڕو بزن، ۳۰۰ر۱ ملیـۆن سـەر، پـەرەور۸۰۰ر۱۸ملیـۆن سەر.
- سـامانی سروشـتی: زێـڕ، زیـوو، نوحـاس، قورقوشم، زەنگ "توتیا"، ئاسن، خەلوز.
- بەرهـەمی کارەبـا: ۷۸۰ر۲ ملیـار کیلـۆ وات کاتژمێر.
- پیـشەسازی: دروسـتکردنی شەکر،ڕسـتن‌و چـنین، بەرهـــەمی داری دارســـتانەکان، ئامادەکردنی کەڵ‌و پەلی ئاسن.
- داهـاتی دەرەوەی: کـەلو پـەلی دروسـتکراو، کیمیاوی، سوتەمەنی، کەل‌و پەلی گواستنەوە، ماشێن‌و ئۆتۆمبێل.
- دەرچـــوەکانی:کـــەل‌و پـــەلی ئاســـنی ئامادەکراو،مۆز، قاوە، ماسی ئامادەکراو.
- هاوبەشـەکانی بازرگـانی: ئەمـەریکا، وولاتـانی ناوچـەی کـاریبی، ئـەورووپای ڕۆژئـاوا، یابـان، چینی میللی،ئەمەریکای لاتینی.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی دیموکراتیە، یەك ئەنجومەنی هەیە بە ناوەی ئەنجومەنی "ئومە" کە لە ۱۳٤ ئەندام پێك هاتوە، ماوەی دەسەلاتی سەرەك کۆمار چوار ساڵە
- پارتـە ڕامیاریـەکان: پـارتی ڕزگاری،چەپڕەوی ناوەنـدی، بزوتنـــەوەی ڕاســـتڕەو، پـــارتی هندۆراسی نیشتمانی.
- جوگرافیـای وولات، هنـدۆراس دووەم وولاتـی ئەمەریکای ناوەندیە، خاکی هندۆراس زۆربەی زۆری شـاخاویەو دەکەوێتـە بـاکوری ناوەنـدی ئەمـەریکای ناوەندی،درێـژ دەبێتـەوە لەسـەر کەنارەکانی دەریای کاریبی بەدرێژی کەنارەکان کـە درێـژی ۸۰۰ کیلۆمـەترەو لەسـەر زەریـای هادییـە، لەمـەمان کاتـا لەسـەر کەنـداوی فۆنـسیکایە بەدرێـژایی کەنارەکـە کـە ١٤

کیلۆمەترە. گواتیمالا دەکەوێتە ڕۆژئاوای، سلفادۆر دەکەوێتە باشوری، نیکاراگوا دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی.

- مێژوی وڵات: هندۆراس پارچەیەك بوە لە شارستانیەتی مایا لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی زاینی، لە ساڵی ١٥٠٠زاینی کریستۆفەر کۆلۆمبس سەردانی هەرێمەکەی کردو ناوی نا هندۆراس "یانی قوڵایی"چونکە کەوتبوە سەر کەنارە قولەکانی باکور، لەسالی ١٥٢٥ ئەسپانیا خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆیو شاری ترۆجیللۆی دروستکرد سەرەڕای ئەوەی بەربەرەکانی دەکرا لەلایەن دانیشتوانی ناوچەکە کە هیندیە نیشتمان پەروەرەکان بوون. لە سەدەی هەڤدەم کەناری باکوری کەوتە ژێر دەسەلاتی بەریتانیاو لەگەڵ ئەوەشدا ئەسپانیەکان لە ناوەڕاست دا کۆمەلیان کردبوو، بەریتانیەکان تاکو ساڵی ١٨٦٠پارێزگاریان لەکەنارەکەیان کرد.

هندۆراس سەربەخۆیی لە ١٨٢١/٩/١٥ بەدەست هێناو لە ئەسپانیاو بوە پارچەیەك لە مەکسیك. بەڵام لە دوای ساڵی ١٨٢٣بوە پارچەیەك لە یەکیەتی هەرێمی ئەمەریکای ناوەندیو لە هەمان کاتا کۆستاریکاو سلڤادۆرو گواتیمالاو نیکاراگوا چونە ناو ئەو یەکیەتیەو سەرۆکایەتی یەکیەتیەکە لە ساڵی ١٨٣٠ وەرگیرا لە لایەن ژەنەراڵ فرانسسکۆ مۆرازان لە هندۆراس. لە ساڵی ١٨٣٨ ئەو یەکیەتیە هەلوەشایەوەو هندۆراس سەربەخۆیی تەواوی وەرگرت.لە ساڵی ١٨٨٠پایتەختی لەشاری کومایاجوا گوازرایەوە بۆ تیگۆس گلب، لە ساڵی ١٩١٣بە هۆی لێك ترازانی ئارامی ڕامیاریو گۆڕینی دەستورکە ئەویش بوە هۆی کودەتای سەربازی، لە ساڵی ١٩٣٥شەڕی ناوخۆیی بۆ ماوەیەکی کەم هەلگیرسا. لە سالەکانی ١٩٣٢تاکو ١٩٤٩هندۆراس کەوتە ژێر دەسەڵاتی دیکتاتۆریو دوایبوە هۆی زنجیرەیەك لە کودەتا یەك لە دوای یەکەکان، ژەنەراڵ ئوزوالدوئورلانۆ لە ساڵی ١٩٣٦ دەسەلاتی وەرگرت تاکو ١٩٧٤.لەساڵی ١٩٨٠ یەکەم حکومەتی مەدەنی هەلبژێردرا لە ئەنجامی هەلبژاردن لە دوای زیاتر لە سەدەیەك لە دەسەڵاتی دکتاتۆری . دکتۆر ڕۆبرتۆ سوازو لە پارتی لیبرالی پۆستی سەرەك کۆماری وەرگرت.لە ساڵی ١٩٨٩ حکومەتی هندۆراس ڕایگەیاند بە ڕازی بونی لەسەر پرۆگرامی ئاشتی لە ئەمەریکای ناوەندی بە دەرکردنی چەتەکانی کومەترای نیکاراجویە کە لە هندۆراس کۆ ببونەوەو ژمارەیان ٥٥ هەزارکەس دەبوو، لە ساڵی ١٩٩٢ کێشەی سنوری نێوان هندۆراسو سلڤادۆر چارەسەر کرا کەئەو کێشەیە دەگەڕاوە بۆ ساڵەکانی ١٨٦١.لە ساڵی ١٩٩٣ پالێوراوی پارتی لیبرالی سەرکەوتنی بە دەست هێنا لە هەلبژاردنی گشتیوکارلۆس ڕایناپۆستی سەرەك کۆماری وەرگرتو بەربەرەکانی کاری ناهەمواریو داموو دەزگاکانی حکومەتی دەکردو هەولی بەرەو باش بردنی باری ڕامیاریو ئابوریو کۆمەلایەتی هندۆراسی دەدا.

- هندۆراس ئەندامە لەنەتەوە یەککرتوەکان، ئەندامە لە زۆربەی ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان وەك ڕێکخراوی فاوبەنکی نێو دەولەتیو ڕێکخراوی کاری نێو دەوڵەتیو خەزنەی نێو دەولەتی ڕێکخراوی تەندروستی نێو دەولەتیو ڕێکخراوی بازرگانی .

# بیلز

- بیلز: تاکو ساڵی ۱۹۷۳ ناوی هندۆراس بوە (هندۆراسی بەریتانی).
- پایتەختی: بلمۆبان، ژمارە دانیشتوانی ۰۰۰ر۳۰هەزار کەسە.
- ڕووبەری : ۸۶۷ر۸ میل چوارگۆشەو ۹۶۵ر۲۲ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی : ۰۰۰ر۳۰۰ هەزار کەسە.
- شارە سەرەکیەکانی: کۆرۆزاك، ول، ئۆرانج.
- بەندەرە گرنگەکانی: بیلیز سیتی، دانگریجا، بۆنتا کوردا.
- چڕی دانیشتوانی:۳۳ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- نـژادەکانی : تێکەڵاوی نـژادەکان زۆرە چونکە لەدایکبوونیان لەیەك نژاد نییە بۆ نمونە دایکی ئەمـەریکی و بـاوکی هیندیـە هـەروەها بـاوکی ئەسپانی و دایکی هیندیە لەبەرئەوە، تریبۆل، مستیزۆ، ئەسپان، کاریبی، کندین، بەریتانی، هیندی، ..... هتد تیایە.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر٢ ٪ .
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی ڕەسمییە) ئەسپان، مایا ، جاریفۆنا، کاریبی.
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی ٦٥٪ پرۆتستانت ۳۰٪ ئایینەکانی تر ٥٪ .
- زانینی نوسین و خوێندن: ۹٥٪ .
- دابەشی کارگێڕی: ٦ بەشە لە شێوەی ناحیە.
- سوپای: ۰۰۰ر۱۱ هەزار کەسە.
- بەرگری :٥ر١ ٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٦٥٠ ملیۆن دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی نـاوخۆیی : ۰۰۰ر۳ دۆلار.
- دراوی: دۆلاری بیلزی.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر٢ ٪ لەخاکی هەرێمەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، هەنگوین، برنج، مۆز، چەوەندەری شەکر، تەڕە، میوەجات،
- سامانی ئاژەڵی: بەهۆی نەبونی ڕێژەی بونی ئاژەڵ نەتوانرا بنوسرێت سەرەڕای ئەوە مەڕو گامێش و چێڵ و بزن و بەرازی تیایە.
- پیشەسازی: خواردنەوە، سابون، خۆراکی دروستکراو، دار.
- سامانی سروشتی: دار، ماسی.
- بەرهەمی کارەبا: ٥٠٠ر٢ کیلۆوات کاتژمێر.
- دەرچووەکانی: شەکر، هەنگوین، جلوبەرگ، میوەجات، ماسی.
- داهاتی دەرەوەی: ماشێن، ئۆتۆمۆبێل، دانەوێڵە، کەلوپەلی گواستنەوە.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: مەکسیك، یەکێتی ئەورووپا، بەریتانیا، ئەمەریکا.
- ڕژێمی دەسەڵات: پەرلەمانی دیموکراتییە، شانشینی دەستوریە، شانشین ئەلیزابیتی دووەم شانشینی بەریتانیا سەرۆکایەتی دەکات لەڕێگەی دادوەری گشتی تایبەتی خۆی کە هەریەناوە، بەڵام دەسەڵاتی تەواو بەدەست سەرۆك وەزیرانە کە بەرپرسیارە بەرامبەر بە پەرلەمان کەپێك هاتوە لە ۲۹ ئەندام کە بەپێشنیاری گشتی هەڵدەبژێردرێن.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی گەلی یەکگرتوو، پارتی دیموکراتی یەکگرتوو، پارتی پارێزگاران، پارتی چەپی ناوەندی .
- جوگرافیای وڵات: بیلز دەکەوێتە سەر دەریای کاریبی لەسەر کەناری ڕۆژهەڵاتی ئەمەریکای ناوەڕاست، مەکسیك لەباکور دەوری داوە، گواتیمالا لەڕۆژئاواو باشووری، لەڕۆژهەڵات دەریای کاریبی (کەنداوی هندۆراسە )

دەشتایەکی درێژی تیایە، زەلکاوی زۆری تیایە لەباکور، بەڵام زەوییە بەپیتەکەی کەوتۆتە باشووری، چیاکانی مایا درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە کەناری ڕۆژهەڵات و بەرزی ١١٢٠ مەترە لەلای لوتکەی ڤیکتۆریا، زێی بیلز دێتە خواری لەڕۆژئاوا بەرەو ڕۆژهەڵاتی، کەش و هەواو بارانی لە نێوان کەموو زۆری دایەو زۆر جار زریانی لێ ڕوودەدات بەڵام بەشێوەی گشتی کەش و هەوای کەمەرمییە.

- مێژووی وڵات: دانیشتوانی ڕەسەنی هەرێمی بیلزلە هۆزەکانی مایای هیندی ئەمەریکییە. لەدوای سەدمی هەڤدەم دەریاوانەکانی ئینگلیز بە هۆی هاتوچۆی کەشتیەکان بەلەباری ناوچەکە خستیانە ژێر دەسەڵاتی خۆیان بەهۆی بونی داری پتەو بەهێز کە گونجاو بوو بۆ دروستکردنی کەشتی‌و کەلوپەلی دەریایی، ئەسپانەکان هەوڵی زۆریاندا داگیری بکەن لە سالی ١٧٩٨بەڵام بەهۆی بەرگری بەریتانیەکان نەیانتوانی داگیری بکەن لەڕێگەی دەریاوە بۆ ئەو دوورگەیە ، لەساڵی ١٨٦٢ هەرێمی بیلز ڕایگەیاند کەژێر دەستەی بەریتانیابێت و دادوەر ( جاڤیکا ) حوکمرانی بکات تا گەیشتە ساڵی ١٨٨٤. لەساڵی ١٩٥٤ بڕیاری دەستوری نوێ درا کە مافی ئۆتۆنۆمی پێ دراو پارتی گەلی بیلز سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە هەلبژاردنەکان.

لەساڵی ١٩٦٤ هەرێمی بیلز توانی مافی ئۆتۆنۆمی تەواو لەووڵاتە یەککگرتووکان وەربگرێت لەگەڵ مافی دەنگدان بۆهەموو ئەوکەسانەی تەمەنیان بەپێی یاسا ڕێگەی پێ دەدات لەرژێمی پەرلەمانی دوولایەنە، لەساڵی ١٩٧٠ پایتەخت لەبیلز گواستراوە بۆ بلمیۆپان، لەساڵی ١٩٧٢ ناوی وڵاتەکە لەناوی هندۆڕاس گۆڕا بۆ ناوی بیلزو بوە هۆی بەرپابوونی کێشەی دوورو درێژی نێوان هەردوو وڵاتی بیلز و گواتیمالا کە گواتیمالا داوای خاوەندیەتی خاکی بیلزی دەکرد. لەساڵی ١٩٨١ نەتەوە یەککگرتووکان داوایکرد کە بیلز پێویستە سەربەخۆیی پێ بدرێ ئەوەبوو لە ١٩٨١/٩/٢١ بیلز سەربەخۆی تەواوی وەرگرت و بوە یەکێك لەووڵاتانی کۆمەنولسی بەریتانیا، لە مانگی/٣/١٩٨٠ بەریتانیاو بیلز و گواتیمالا ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە گواتیمالا ڕێگەی پێ بدرێت بە پەڕینەوە بۆ دەریای کاریبی بەخاکی بیلزدا. بەڵام ئەو ڕێککەوتنە هەرەسی هێنا، لەساڵی ١٩٩٣ بەریتانیا هێزەکانی لە بیلز کشاندەوە لەدوای ڕێکەوتنی لەگەڵ گواتیمالا لەسەر سنوور، پارتی گەلی یەککگرتوو سەرۆکایەتی وڵات دەکا بەنۆبە لەگەڵ پارتی دیموکراتی یەککگرتوو بەشێوەیەکی دیموکراتی و بەپەرلەمانێکی ڕێك و پێك تاکو کۆتایی ٢٠٠٤ لە وڵاتەکە.

- بیلز ئەندامە لەکۆمەنولسی بەریتانیا ، ئەندامە لەڕێکخراوی وڵاتانی ئەمەریکا، ئەندامە لە نەتەوە یەککگرتووەکان.

# گـواتيمــالا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری گواتیمالا
- پایتــەختی: گواتیمــالا، ژمــارەی دانیــشتوانی ۰۰۰ر۳۲۵ر۲ ملیــۆن کەســـە، گواتیمـــالا گەورەترین شارە لە ئەمەریکای ناوەندی.
- ڕووبــــەری: ۰۴۲ر۴۲ میـــل چوارگۆشـــەو ۸۹۰ر۱۰۸ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە.
- ژمــارەی دانیــشتوانی: ۰۰۰ر۵۶۸ر۱۲ ملیــۆن کەسە. بەپێی بڵاوکراوەی ڕۆژنامەکانی ۲۰۰۰.
- چـڕی دانیــشتوانی: ۲۹۹ کــەس لەیــەك میـل چوارگۆشەدا.
- شــارە ســەرەکیەکانی: بورتوبــاریۆس، کیــژال تیتجۆ.
- بەنـدەرە سـەرەکیەکانی: ســان چــۆزی، بۆرتــۆ باریۆس
- بوژانەوەی دانیشوانی: ۸ر۲٪
- نـژادەکانی،: مــستیزۆ ٥٦٪ هنـدی ئەمــەریکی ٤٤٪ .
- زمانەکانی: ئەسپانی (زمانی ڕەسمیە) مایانی.
- ئاینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی، پورتستانتی، مایــــانی، کاســـۆلیکی ڕۆمـــانی زۆربـــەی دانیشتوانی گواتیمالا پێکدێنێ.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٦٠٪
- دابەشی کارگێڕی: ۲۲ پارێزگایە.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ۱۱۰ر٤٦ ملیـار دۆلار.
- بەشـی تـاك لـە کـۆی دەرەئـەنجامی نـاوخۆیی: ۱۰۰ر٤ دۆلار
- بەرگری: ٥ر٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر٥٨هەزار کەسە.
- دراوی: کیتسال
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر١٢٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهــەمی کــشتوکاڵی: گــەنم، جــۆ، ســۆز، چەوەندەری شەکر، قاوە، تەڕە، میوەجات . بەرهەمی دار.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ۰۰۰ر٦٣٠ هـەزار سـەر، بزن ۰۰۰ر١٦٠ هەزار سەر، چێڵ ۳۰۰ر۲ ملیۆن سـەر، بـەراز ۰۰۰ر۸٥۰ هـەزار سـەر، پـەرەور ۵۰۰ر۲٥ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: ئەساسـی نـاو مـاڵ ، بەرهـەمی ڕستن‌وچـنین، دروسـتکردنی شـەکر، مـەتات، کیماوی .
- بەرهــەمی کارەبــا: ٥٠٠ر٣ ملیــار کیلـۆ وات کاتژمێر .
- سامانی سروشتی: نەوت، نیکڵ، غاز .
- دەرچوەکانی: گۆشتی چێڵ و جۆرەکانی تـر، ماسی، مۆز، شەکر، قاوە.
- داهاتـــــەکانی دەرەوەی: ســـــوتەمەنی ، بەرهەمــــەکانی نــەوت، ماشـێن، دانەوێڵــە، ئۆتۆمۆبێل، چیمەنتۆ.
- هاوبەشـــەکانی بازرگـــانی: ئــەڵمانیا، چــین، ئەمەریکا، مەکسیك، کاریبی.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی دیموکراتیە، یەك ئەنجومــەنی یاســادانانی هەیــە کــە ئــەویش ئەنجومەنی کۆماریە.
- پارتـە رامیاریـەکان: مەسیحی چەپی ناوەنـد، پــارتی شۆڕشــگێڕ، ڕادیکــاڵی، جوڵانــەوەی ڕزگاری نیشتمانی، پارتی گواتیمالای مەسیحی دیمــوکراتی، پــارتی دەزگــا دیموکراتیــەکان، پارێزگاران، بەرەی کۆماری گواتیمالا،چەندین پــارت‌و گرووپــی تــری نەتــەوەی‌و ڕامیــاری‌و کۆمەلایەتی تیایە.
- جوگرافیــای وڵات: گواتیمــالا دەکەوێتــە دوری باکوری ئەمەریکای ناوەندی، هیندۆراس و بیلز دەکەوێتــە ڕۆژهــەڵاتی، ســلڤادۆر دەکەوێتــە

باشـــووری ، مەكـــسیك دەكەوێتـــە بـــاكورو ڕۆژئاوای . گواتیمـالا لەسێ هەرێم پێكهاتوە . بەرزاییـــەكانی دانیـــشتوانی چـــڕی تیایـــەو هـەرێمێكی ساردە، ناوچەی كەمەرەیی لەسەر كەناری زەریای هادی و كەناری دەریای كاریبی پێـك هـاتووە لەكەنـدودۆڵ و زەوی بـەپیت، ناوچەی كەمەرەیی خواروو لە باكوورە، لوتكە چیای بەرزی تیایە و گڕكانی زۆری هەیە لە باشـوورو زۆرجـار دەبێتـە هـۆی گومڵـەرزەی زەوی، شـــوێنەواری شارســـتانی گرنگـــی مایانیەكانی تیایە.

- مێـژووی وولات: گواتیمـالا پارچـەیەك بـوە لەشارستانیەتی مایا لە ئەمەریكای ناوەندی و بوژانەوەیەكی بەرچاوی هەبوە ئەویش لەماوەی ساڵەكانی ٢٥٠ تـا ٨٩٥ زانینـی، مایـا نـاوی هندیە ئەمریكیـەكان بـوە، دوای ئـەوە بـەهۆی داگیركردنـی گواتیمـالا لـە لایـەن ئەسپانەكان بەسـەركردایەتی بـدوردی ئـەنگارادو لەسـاڵی ١٥٢٤ بـــوە ژێـــر دەســـتەیەكی ئەســـپانی و شارستانیەكەی بـەرەو توانـەوە هـەنگاوی نـا، بەڵام لـەدوای هـەرس هێنـانی ژێـر دەستەكانی ئەسپانیای نوێ لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم گواتیمـالا تـوانی لـە١٨٢١/٩/١٥ سـەربەخۆیی بەدەسـت بهێنـێ. لەسـاڵی ١٨٢٣ بـوە بەشـێك لەیـەكێتی ئەمـەریكای ناوەنـدی كـە سلڤادۆرو كۆستاریكاو هندۆراس و نیكاراگوای گرتـەوەو ئـەو یەكێتیـە تـاكو سـاڵی ١٨٢٩ بـەردەوام بـوو تـاكو ئەوكاتـەی گواتیمـالا سـەربەخۆی تـەواوی وەرگـرت، لەسـاڵەكانی ١٨٤٤ تـا ١٨٦٥ (رافیـل كـورا) پۆسـتی سـەرۆكایەتی وولاتـی گرتـە دەسـتو بـوە هـۆی بوژانـەوەی بـەردەوام لەبوارەكانی ڕامیاری و ئابووری و كۆمەڵایـەتی و ڕۆشـــنبیری بەتایبـــەتی لەســـەردەمی (جـسكۆیاریۆی) لەسـاڵەكانی ١٨٧٣تـا١٨٨٥ كەتوانی سوپایەكی بەهێز پێك بێنێو بواری كشتوكاڵی ببوژێنێتەوە لەبواری قاوە، لەساڵی ١٩٤٤ (جۆزی ئرفالۆ) پۆستی سەرۆك كۆماری وەرگـرت كەبەدەسـەڵاتی دكتـاتۆری دەژمێـردرا لەگـەڵ ئەوەشـدا پرۆگرامـی سۆشیالیـستی ئەنجامدا لـەدوای ئـەو ئربنـز جۆزمـان لەسـاڵی ١٩٥١ دەســـەڵاتی وەرگـــرت و وڵاتـــی بـــەرەو پەرەسەندن برد بەدابەش كردنی زەوی بەسەر جوتیـــاران، لەســـاڵی ١٩٥٤ لەئـــەنجامی كودەتایـەكی سـەربازی بەپـشتیوانی ئەمـەریكا كۆلۆنێل كاستللۆ دەسەڵاتی وەرگرت بوە هۆی پرۆگرامـە چاكـسازیەكانو كاسـتللۆ لەسـاڵی ١٩٦٣ تیرۆركرا لەلایەن كۆلۆنیل ئیزك بیرلناد، دووبـاره دەسـەڵاتی مـەدەنی گـەڕاوە وڵات لەسـاڵی ١٩٦٦، بـەڵام لـەدوای ئـەم ڕووداوانـە گواتیمـالا ئـاژاوەو خۆپیـشاندان و پێكـدادانی بەخۆوە بینـی كـەبوە هـۆی كـوژرانی ٥٠٫٠٠٠ هـەزار كـەس لەلایـەن دەسەڵاتە دكتاتۆریە یەك لـەدوای یەكـەكان تـاكو سـاڵی ١٩٩٣ ، لەسـاڵی ١٩٩٦ (ئـــەلفاردۆ و ریربجویـــان) پۆســـتی سـەرۆكایەتی وولاتـی وەرگـرت كـە پیـاوێكی بازرگانی پارێزگار بوو، لەمانگی ٩ هەمان ساڵ لەگـەڵ شۆڕشـگێڕەكان ڕێكەوتنامەیـەكیان مۆر كـرد و بـوە هـۆی كوتـایی هێنـانی كێـشەو ململانێ كە زیاتر لە ٣٦ ساڵ بەردەوام بوو، كە بوە هۆی كوژرانی ٢٠٠٫٠٠٠ هەزار كەس ، لە ١٩٩٩/٥/١٦ دەنگدەران چاكسازای دەستوریان ڕەتكردەوە كە سەرۆك كۆمار لایەنگیری دەكرد كـــە ئەوچاكـــسازیە مـــافی یەكـــسانی بـــۆ هەموولایەك مسۆگەر نەدەكرد بەڵام تاكو ئێستا گواتیمالا كێشەو ململانێی تیایە.

- گواتیمـــالا ئەندامـــە لـــەڕێكخراوی وولاتـــانی ئەمـــەریكا، ئەندامـــە لـــەڕێكخراوی نەتـــەوە یەكگرتووەكان.

# کێشوەری ئەمەریکای باشوور

# کۆلۆمبیا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری کۆلۆمبیا.
- پایتــەختی: بۆگۆتــا، ژمــارەی دانیــشتوانی ٠٠٠ر٣٥٠ر٦ ملیۆن کەسە.
- شارو بەنـدەرە گرنگەکانی: بارانکویلا، کارتا جانا، کالی، میدلینی، جۆنا فنتۆرا.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ٠٠٠ر٦٦٥ر٤٠ ملیـۆن کەسە، بەپێی ئاماری١٩٩٩.
- ڕووبــەری: ٧٢٥ر ٤٣٩میـل چـوار گۆشــەو ٩١٠ر١٣٨ر١ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چڕی دانیشتوانی: ٩١ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا .
- نـژادەکانی: مستیزۆ ٥٩٪، سپی پێست ٢١٪، مۆلتو ١٥٪، ڕەش پێست ٤٪..
- زمانەکانی: ئەسپانی (زمانی ڕەسمییە).
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی ٩٥٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٣٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٣٢ پارێزگایە.
- دراوی: بیزۆی کۆلۆمبی.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ٨٠٠ر٢٣١ ملیـار دۆلارە.
- بەشــی تــاك لــە کــۆی دەرئــەنجامی نــاوخۆی: ٢٥٠ر٦ دۆلارە.
- بەرگری:٥ر٨٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی .
- سوپاکەی: ٥٠٠ر١٤٧ هەزارکەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢ر٤٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهــەمی کــشتوکاڵی: گــەنم وجــۆ، قــاوە، چەوەندەرەی شەکر، پەمۆ، گەنمە شامی، برنج، مـۆز، کۆکـاینی تیـا بەرهـەم دەهێنـرێ ، تـەرەو میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٤٥٠ر٢ ملیۆن سەر، بزن ٠٠٠ر٩٤٠ هـەزار سـەر، چێل ٥٠٠ر٢٨ ملیـۆن سـەر، بـەراز ٦٠٠ر٢ ملیـۆن سـەر، پـەرەور ٥٠٠ر٨٦ ملیۆن سەر.
- سامانی سروشتی: نەوت ، غاز ، نوحاس ، زێر ، خەلوزی ئاسن، نیکل، داری دارستانەکان.
- پیــشەسازی: دروســتکردنی چــیمەنتۆ، کیمیاوی، ڕستن وچنین، ئامادەکردنی خۆراك، دروستکرنی جل وبەرگ، خۆشکردنی پێست، دروستکردنی پێڵاو، ئامادە کردنی گۆشت..
- بەرهــەمی کارەبــا: ٥٠٠ر٤٤ ملیــار کیلــۆ وات کاتژمێر.
- داهــاتی دەرەوەی: ئــامێر، بەرهـــەمی پــەر، کیمیــاوی، ماشــێن وئۆتۆمبێــل ، بەرهـــەمی مەعدەنی.
- دەرچووەکانی: نەوت، قاوە، خەلوز، مۆز، گول، نیکل، زێر، گۆشت، ئاژەڵی زیندو ، پێست.
- هاوبەشــەکانی بازرگــانی: یــەکێتی ئــەوروپا ، ئەمـەریکا ، یابـان ، چـینی میللـی ، هۆڵنـدە ، سوید ، بەرازیل.
- ڕژێمــی دەســەڵات: وولاتێکـی کۆماریـە، دوو ئەنجومـەنێ هەیـە یەکـەمیان کـۆنگرێس کـە لـە ١٠٢ ئەندام پێك هاتووە، دووەمیان ئەنجومەنی نوێنەران کە لە ١٦٢ ئەندام پێکهاتووە. هەردوو ئەنجومەن بۆ ماوەی چوار ساڵ هەڵدەبژێردرێن، سـەرۆك کۆمـار سـەرۆکی وولاتـەو هـەر ئـەویش ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیـران دادەمەزرێنێـت، ماوەی سەرۆك کۆمار چوار ساڵە
- پارتـە رامیاریـەکان: پـارتی پارێزگـاران، پـارتی

ئـــازاد، پـــارتی هاوپـــەیمانانی دیمـــوکراتی ، بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانی ، چەندین گروپ وپـارتی تـری نیـشتمانی ونەتـەوەی ورامیـاری تێدایە

- جوگرافیـای وڵات: کۆلۆمبیـا دەکەوێتـە بەشـی بـاکووری رۆژئـاوای کیـشوەری ئەمـەریکای باشـوور، یەکـەم وڵاتــە لــە کیـشوەرە کــە سنورەکەی درێژدەبێتەوە لە زەریای ئەتلەسی وزەریای هادی. لە باکووری رۆژئاوای پەنەما، لە باشـووری ئـەکوادۆرو پـیرۆ، لـە رۆژهـەڵاتی فنزویلاو بەرازیل.
- مێـژووی وڵات: ئەسـپانیەکان لـە سـاڵی ١٥١٠ کۆمەڵگای دارینیان لە ناوچەکە دروستکرد. کە یەکـەم کۆمـەڵگای ئـەوروپی بـوو لەسـەر خـاکی ئەمەریکا، لـە سـاڵی ١٥٣٨ هـەر ئەسپانیەکان ژێـر دەسـتەی جیراندایان دروسـتکرد، بۆلیفـار هەڵـسابە دامەزرانـدنی پـارتی پارێزگـاران و جێگرەکـەی دی بـاولا هەڵـسا بـە دامەزرانـدنی پارتی رزگار بوون.

لـــە ســـاڵی ١٨٨٥ پـــارتی پارێزگـــاران دەسەڵاتیان گرتە دەست کە لایەنگیری دەسەڵاتی ناوەندی بوون لـە گـەڵ کنێـسەو لایـەنگیریان زۆر بوو، لە٢٠/٧/١٨١٠ کۆلۆمبیا سەربەخۆی تەواوی وەرگـرت لەئەسـپانیا. بـەڵام لـە نێـوان ساڵەکانی ١٨٩٩ تا ١٩٠٣ شـەری نـاوخۆ بـەرپابوو لـە نێوان پارتی رزگاربون و پارێزگاران کە ئەنجامەکەی بوە هۆی جیابوونـەوەی پەنـەما لـە وڵاتەکـەو شـەرەکە کۆتای پێهات، پارتی پارێزگاران بەردەوام بوون لەدەسەڵاتیان تاکو ساڵی ١٩٣٠ دوای ئەوە پارتی رزگابوون دەسەڵاتی گرتەدەست.

لـە سـاڵی ١٩٥٧ پـارتی پارێزگـاران‌و پـارتی رزگـار بـوون بـەرەی نیـشتمانیان پێکهێنـا بـۆ هاوبەشـی کـردن لـە دەسـەڵاتی سـەرۆکایەتی‌و کۆتـای هێنـان بـە شـەرو مـل ملانێـی نـاوخۆ، لەساڵی ١٩٧٤ ئەو بەرەیە کۆتای هات، لەدوایی ساڵی ١٩٧٨ دووبارە شەر لە نێوان ئەو دوو پارتە دەسـتی پێکـردەوە لەسـەر بازرگـانی کۆکـاین، بەردەوام بوونی کێشەو ململانێ لە نێوان پارتی رزگـار بـوون‌و پـارتی پارێزگـاران لەلایـەك و دەسـەڵاتدارو بەرهەڵـستکاران لـە لایـەکی تـرو دەسەڵاتی یەك لە دوای یەکیان هەر جارەو پارتێك تـاکو سـاڵی ١٩٩٨ کـە هەڵبـژاردن ئـەنجام دراو (ئەندریە باسترانا بە سەرۆکی وڵات هەڵبژێردرا).

- کۆلۆمبیـا ئەندامـە لـە نەتـەوە یـەکگرتووەکان، ئەندامە لە رێکخراوی وڵاتانی ئەمەریکا.

# ئیکوادۆر

- ناوی ڕەسمی: کۆماری ئیکوادۆر.
- پایتەختی: کیتۆ، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۵۳٤ر۱ ملیۆن کەسە.
- کۆنکا شارێکی سەرەکیە.
- ڕووبەری: ٤٨٣ر١٠٩ میل چوارگۆشەو ٥٦٠ر٢٨٣ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۵۷۵ر۱۱ ملیۆن کەسە، بەپێی زانیاری ۲۰۰۱.
- چڕی دانیشتوان: ۱۰۵ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۳ر۲ ٪ .
- نژادەکانی: مستیزۆ نزیکەی ٥٥٪ دەگەڕێتەوە سەر ڕەسەنی ئەسپانی و ئەمریکی و هندی، هندی ٢٥٪ ، ئەسپان ١٠٪، ئەفریقی ١٠٪.
- زمانەکانی: ئەسپانی (زمانی ڕەسمیە) زمانی کیشۆ، زمانی گیڤار، زمانی تری هیندی.
- ئاینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی ٩٥٪ .
- زانینی نوسین و خوێندن: ٩٣٪ .
- ڕژێمی دەسەلات: دیموکراتی پێگەیشتووە، لەدوای هەشت ساڵ لە دەسەلاتی سەربازی دەستورکاری پێکراوە لە ١٩٧٨ ، سەرۆك کۆمار بۆ ماوەی چوار ساڵ هەڵدەبژێردرێ، میللەت ئەنجومەنی نوێنەران هەڵدەبژێرین بۆ ماوەی چوار ساڵ کە ئەنجومەن لە ٧١ ئەندام پێك هاتیە.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی مەسیحی کۆمەلایەتی، ڕاست ڕەو، پارتی ڕۆل دۆسیستا ئیکوادۆری میللی، چەپی ناوەندی، پارتی کۆماری یەکگرتوو، یەکگرتنی ڕاست ڕەو، پارتی چەپی دیمکراتی، سۆشیالستی مام ناوەندی، پارتی پارێزگاران.
- دابەشی کارگێڕی: ٢١ پارێزگایە.
- بەرگری: ٥ر٣ ٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر٥٥٧هەزار کەسە.
- دراوی: سۆکر.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۰۰۵ر۵۳ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۱۰۰ر٤دۆلار
- زەوی کشتوکاڵی: ٧٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: مۆز (یەکەم وڵاتە لەجیهان لە بەرهەم هێنانی مۆز)، شیر، برنج، چەوەندەری شەکر، پەتاتە، گەنمو جۆ، تەرەو میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: چێڵو گامێش ٤٠٠ر٥ ملیۆن سەر ، بەراز ٩٠٠ر٢ ملیۆن سەر، مەڕ ٧٠٠ر٢ ملیۆن سەر، بزن ۰۰۰ر۳۲۰ هەزار سەر، پەرەوەر ۹۰۰ر٦٤ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی سروشتی: نەوت، غاز، نوحاس، زەنگ، زیوو، زێڕ، داری دارستان، (وڵاتێکی سەرەکیە لە بەرهەمی داری بۆلسا) کە بۆ دروستکردنی کەشتی و فڕۆکە بەکاردێت.
- بەرهەمی کارەبا: ۷۰۰ر۱۰ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازی: نەوت، ئامادەکردنی خواردەمەنی، کاری ئاسنی، ڕستن و چنین، خۆشکردنی پێست،
- دەرچووەکانی: نەوت، شیر، مۆز، کاکاو، ماسی دەریا،داری دارستانەکان.
- داهاتەکانی دەرەوەی: پێداویستیەکانی گواستنەوە، گالیسکە، ماشێن، کیمیاوی، دووەم وڵاتە لەبەرهەمی کۆکاین هەر چەندە بەتوندی بەرهەڵستکاری لێ دەکرێ. بەلام بەهۆی دراوسێکانی پەڕینەوەی ئاسانەو بازرگانی باشی پێوە دەکرێت گەرچی زیانێکی

گیانی و ماڵی هەیە.

- جوگرافیــای وولاَت: کۆمــاری ئیکــوادۆر دەکەوێتــە بــاکوری ڕۆژئــاوای کیــشوەری ئەمــەریکای باشــوور لەســەر لێــواری زەریــای هادی.. ، دراوسێکانی کۆلۆمبیا لە باکور، پیرۆ لە ڕۆژهەلاَتی و باشووری .

دوو زنجیرە چیای ئەندیزی تیایە کە درێــژ دەبنــەوە لە باکور بۆ باشوور و وولاَت دەکا بە سیّ ناوچە، ئــەوی زەویەکــەو گــەرمی و شــێی کەنارەکان، تەپۆلکەی مام ناوەندی هەیە لەنێوان زنجیرە چیاکان، زەویــەکانی هێلــی کەمــەرەی ناوچەکەی بۆتە هۆی کەمی باران لە ڕۆژهەلاَت، بەلاَم لەگردۆلکەکانی زیاتر ناوچەی دانیشتوانەو هەروەها کەنارەکانیش جێگەی دانیشتوانە، بەلاَم دارســتانەکانی ڕۆژهــەلاَتی هێلــی کەمــەرەی ناوچــەکەی دانیــشتوانی لــێ نییــە.ئــەو زەویانــە کەســەر بــەئیکوادۆرن، دورگــەی جالایــابۆ نــاو زەنــدە بــە ئەرخــەبیلی کۆلــۆن کــە (ڕوبەرەکــەی ٣٠٢٩ میــل چوارگۆشــە و ٧٨٤٥ کیلــۆ مــەتر چوارگۆشـەیە) لـەڕۆژئاوای لێـواری ئەمـەریکای باشوور ، کە بۆتە پارچەیەك لە کۆماری ئیکوادۆر لە ساڵی ١٨٣٢ ی زاینی بۆتە نیشتگەی تیمساح و گەلێ جۆری ئاژەڵی تر. کەش و هەوای ناوچەی ناوەندی ئەندیز کەش و هەوایەکی مام ناوەندی خۆشی هەیە بە درێـژایی سـاڵ، بـەلاَم لەزەویـە نزمەکانی گەرمن.

- مێــژووی ولاَت: کــاتی خــۆی ئیکــوادۆر پارچــەیەك بــوە لــە بــاکووری ئیمپراتۆریــەتی ئیتنکــا کــە ئازنــاوی بــەناوی دادوەرێکــی ئیمپراتۆری ڕۆژئاوای ئەمەریکای باشوور بوو. ئەسپانیا لە ساڵی ١٥٣٣ داگیری کردو کردیە پارچــــەیەك لــــە ئیمپراتۆریــــەتی ئەســــپانی، لەســـەدەی حەڤدەهـــەم بـــوە ژێـــر دەســـتەیەکی بوژانــــەوەی ئەســــپانیا بــــە چەوســــانەوەی هیندیــەکان، یەکــەم شــۆڕش دژی ئەسـپانیا لــە ساڵی ١٨٠٩ هەڵگیرسا، لەوکاتە ئیکوادۆر چوە نــاو یــەکێتی کۆنفیــدرالی کــە فــەنزویلاو کۆلۆمبیای دەگرتە خۆی، دوایی ناسرا بە ناوی کۆلۆمبیــای مــەزن. لــەدوای ڕوخــانی ئــەو یەکێتیــە لــە ســاڵی ١٨٣٠ ئیکــوادۆر بــوە دەوڵــەتێکی ســەربەخۆ. بــەلاَم مێــژووی یــەك لەدوای یەکەکانی پڕبوو لە شۆڕش و دەسەلاَتی دکتــاتۆری و ســەرۆکایەتی یــەك لــەدوای یــەك لــەماوەی ١٢١ لەســاڵەکانی یەکــەم بــون بــە کۆمــاری کــە ٤٨ ســەرۆکی بــەخۆوە دیــت، پارێزگارەکــان دەســەلاَتیان گرتــە دەســت تــاکو شۆڕشی ساڵی ١٨٩٥ کە دەسەلاَتێکی لیبراڵی ڕادیکــاڵی بــەردەوام بــوو بــۆ مــاوەی نیــو ســەدە بەدوور خستنەوەی ئاینی مەسیحی لە دەوڵەت و ئــازادی بیرو ڕاو وتــەو ڕۆژنامــەی بــەرفراوان کردبــوو. لــەدوای ئــەوە ئیکــوادۆر زۆر کێــشەو گیروگرفتــی تیــا پەیــدابوو لــەڕووی زۆرە ملێــی دەســەلاَت و کودەتــایی ســەربازی و تەنگــەژەی ئابووری، بەلاَم لەدوای حەفتکان بوە هۆی بەرز بوونەوەی کۆماری ئیکوادۆر بە گرنگی بەرهەم هێنــانی نــەوت، لــەدوای ساڵی ١٩٧٩ ئیکوادۆر دەستورێکی دیموکراتی بۆ وولاَت دانا لەدوای ئەوە لە ساڵی ١٩٨١ کێشەی نێوان سنور پەیدا بوو لەگەڵ پیرۆ کە بوە هۆی نزمی ئابووری و کێشەو ململانێ و خۆپیشاندان لە وولاَت. لە ساڵی ١٩٩٥ کێشەی سنور لەگەڵ پیرۆ کۆتــایی پــێ هێنــرا. لــەدوای ئــەوە لــە هەلبژاردنــەکانی ٢٠٠٣ لۆسیۆگۆتیریز پۆستی سەرەك کۆمــاری وەرگرت کە ئەفسەرێکی کۆنی سوپا بوو کە بۆ جــاری ســێیەم هەلبژێردرایــەوەو ڕامیاریــەتی تــاکرەوی گرتــە بــەر کــە بــوە هــۆی بــەرەو لێــك ترازانــی بــاری ڕامیاری وئابوری و کۆمەلایــەتی بەتایبــەتی لــەنێوان پــارت و گروپــە جــۆراو جۆرەکان وولاَتی ئەکوادۆر.

- ئیکــوادۆر ئەندامــە لــە ڕێکخــراوی ولاَتــانی ئەمــەریکا، ئەندامــە لــە ڕێکخــراوی نەتــەوە یەکگرتوەکان.

# ئەرجەنتین

- ناوی ڕەسمی: کۆماری ئەرجەنتین.
- پایتەختی: بیونس ئایرس، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۹۰۰ر۱۱ ملیۆن کەسە. ئەنجومەنی پیران ڕەزامەندی لەسەر گواستنەوەی پایتەخت کرد بۆ فیدما لە ناوچەی پاتاجونیای باشوور.
- شارە گرنگەکانی: کوردۆبا، لامانتزا، جنرالسرمنتۆ، موروۆن، ڕۆزاریۆ.
- بەندەرە گرنگەکانی: لابلاتا، باهیا، بلتکا.
- ڕووبەری: ۲۹٦ر۰٦۸ر۱ میل چوارگۆشەو ۸۹۰ر۷٦٦ر۲ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۹۳۵ر۳٦ ملیۆن کەسە بەپێی ئاماری ۲۰۰۲.
- چڕی دانیشتوانی: ۳۵ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- نژادەکانی: سپی پێست ۸۵٪ (زۆربەیان ئەسپانی و ئیتاڵین) کە هیندی ڕەنگاو ڕەنگ و مستیزۆ تیایە (تێکەڵاو بوون لەگەڵ باوکی ئەسپانو ئەویتر هندی ئەمەریکی).
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۳ر۱٪ .
- زانینی نوسین و خوێندن: ۹۵٪ .
- زمانەکانی: ئەسپانی (زمانی ڕەسمییە) ئینگلیزی، ئیتالی، ئەڵمانی.
- ئاینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی لەباوە.
- ڕژێمی دەسەڵات: لە ژێر سایەی دەستوری ساڵی ۱۸۵۳ دا هەڵبژاردن ئەنجام دەدرێت بە هەڵبژاردنی سەرۆك و جێگرەکەی بۆ ماوەی شەش ساڵ. بە پێشنیاری میللی لەرێگەی هەڵبژاردنی کۆمەڵگای هەڵبژاردن. سەرۆك کۆمار وەزیرەکان دەست نیشان دەکات و جێگری سەرۆك سەرپەرشتی ئەنجومەنی پیران دەکات و هیچ دەسەڵاتی تری نییە، کۆنگرێس لە دوو ئەنجومەن پێك دێت. یەکەم ئەنجومەنی پیران کە لە ٤٦ ئەندام پێك هاتووە، دووەم ئەنجومەنی نوێنەران کە لە ۲٥٤ ئەندام پێك هاتووە.
- دابەشی کارگێری: ۲۳ پارێزگایە + هەرێمێکی فیدرال.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی یەکگرتووی مەدەنی رادیکالی (UCR)، ناوەندی مام ناوەندی ، پارتی دار (PJ) بیرۆنی ڕاست ڕەو. بەرە لەپێناوی دەوڵەتێکی یەکگرتوو، چەپی ناوەندی.
- بەرگری : ۸ر٥ ٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۵۰۰ر۲٤۸ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی ۷۰۰ر۹ دۆلار.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر۱۲۵هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ۱۰ ٪ لە خاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: زەیتون، چەوەندەر شەکر، دانەوێڵە، تەڕو میوەجات.
- بەرهەمی پیشەسازی: خواردەمەنی ئامادەکراو، ئۆتۆمۆبێل، کەلوپەلی پرکراو، مافورو کوتاڵ، کیمیا، داو دەرمان، پێڵاو.
- بەرهەمی سروشتی: خامی ئاسن، قوڕقوشم، زەنگ، نوحاس، ئاسن، موگناتیس، نەوت، یۆرانیۆم، قەسدیر.
- دەرچووەکانی: گۆشت، گەنم، گەنمەشامی، زەیتون، پێست، خوری، ئاژەڵی زیندوو.
- داهاتەکانی دەرەوەی: ماشێن و پێداویستیەکانی، کیمیا، سوتەمەنی و ڕۆن و گریزی ماشێنی هەمە جۆر، بەرهەمی کشتوکاڵی.
- سامانی ئاژەڵی: چێڵ۰۰۰ر۰۰۰ر٥٤ ملیۆن سەر، مەڕ ۰۰۰ر۲۰۰ر۱۸ ملیۆن سەر، بزن

۰۰۰ر۱۰۰ر٤ مليۆن سەر، بەراز ۰۰۰ر۵۰۰ر۲ مليۆن سەر، پەرەوور ۳۰۰ر۵۵ مليۆن سەر.

- بەرهەمی کارەبا: ۵ر٦٦ مليار کيلۆ وات کاتژمێر.
- جوگرافيای وڵات: ئەرجەنتين دووەم وڵاتە لە فراوانی رووبەری لە کيشوەری ئەمەريکای باشوور دوای بەرازيل لە رووی قەبارەو دانيشتوانی. سنووری درێژ دەبێتەوە کەنارەکانی ئەتلەسی بۆ سنووری شيلی و چيای ئەندێز، باکوری بۆليفياو باراگوای، لەرۆژهەڵاتی ئۆرگوای، لەباشووری ناوچەی (ئستيس) کە وشکانيە، لە باکوری رۆژهەڵاتی (خۆر ديودی لايلاتا) هەيە کە رووبەرەکەی ۱۷۰ × ۱٤۰ ميلەو زۆربەی ئاوەکەی ناسازە. ئەو جێگايە کە زێی باراناوو زێی ئۆرگوا تێی دەکاتەوە، دورگەی فوکلاند دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی ئەرژنتين داوای خاوەنديەتی بەشێك لە ئاوی زەريای ئەتلەسی دەکات، کەش و هەوای نيمچە کەمەرەيی زەويە، شێی مام ناوەنديە، پلەی گەرمی ١٦ ٪ لە ساڵدا، ئەوە لە باکوری رۆژهەڵات، بەڵام لەدەشتايی بامياس و لەناوچەی ناوەندی نيمچە وشکانيە، لەباشوور کەش و هەوای بەهێزو کاردانەوەی هەيە لەسەر ناوچەکە لە زۆربەی رۆژەکانی ساڵ.
- مێژوی وڵات: ئەرجەنتين لەلايەن گەرۆك جوان ديازدی سوليس لە ساڵی ۱۵۱٦ ی زاينی دۆزرايەوە، بوژانەوەو پەرە سەندنی زۆر کزبوو لە ژێر سايەی دەسەڵاتی ئيستيعماری ئەسپانی، ئەسپانيەکان نيشتەجێی بيۆنس ئايرس بوونە لە ساڵی ۱۵۸۰، بەڵام لەدوای ئەوە ئەرجەنتين بوە وڵاتێکی کشتوکاڵی بە تايبەت لە رووی بەخێوکردنی ئاژەڵ تاکو ساڵی ۱٦۰۰. هێزەکانی بەريتانيا هەوڵی داگيرکردنی ئەرجەنتينيان دا لە ساڵی ۱۸۰٦ بەڵام لە وڵات دەرکران لەوکاتەی ناپليۆن چووە ناوئەسپانياو بووە هۆی ئەوەی کە ئەرجەنتينيەکان حکومەتيان دامەزراند لە ژێر ناوی شانشينی ئەسپانی لە ساڵی ۱۸۱۰، لە ۱۸۱٦/۷/۹ ئەرجەنتين سەربەخۆيی راگەياند. ئەرجەنتين لە هەردوو جەنگی يەکەم و دووەمی جيهانی خۆی بێلايەن گرت و دور کەوتەوە لەمەرگەساتەکە. بەڵام لەکاتی هەڵگيرسانی جەنگی دووەمی جيهان ئەرجەنتين هەڵسابە شەرکردن لەگەڵ وڵاتەکانی دەوروپشتی، لە ۱۹٤۵/۳/۲۷ بوە يەکێك لە دامەزرێنەری رێکخراوی نەتەوە يەکگرتووەکان. لەگەڵ ئەوەشدا ئەرجەنتين لەژێر سايە دەسەڵاتدارە دکتاتۆرەکان ئيش و ئازارو ئەشکەنجەی زۆری ديوە بەهۆی شەرە کورسی. لە ۱۹۸۲/٤/۲ جالفيری سەرۆکی وڵات بە هێزی سوپا دورگەی مۆکلاندی داگيرکردو خستيەوە ژێر خاوەنديەتی وڵاتی ئەرجەنتين. بەڵام لە ۱۹۸۲/۵/۲۱ هێزی کۆماندۆزی بەريتانی دورگەی مۆکلاندی گيراوە بەردەستی خۆی. لەدوای ساڵی ۱۹۸۲ چەندين گيروگرفتی دەسەڵات و جەماوەری رويدا لە پێناو دەسەڵات و تاکو ئێستاش هەر بەردەوامە.لەدوای ئەوە ئەرجەنتين توشی دوو کێشەی گەورە بوويەکەميان بڵاو بونەوەی زۆری بێکاری و کۆمەڵ بوونی بەرێژەی ٤۰۰٪ کە بوە هۆی سەرکەوتنی پارتی بيرۆنی لەهەڵبژاردنەکانی مانگی /۱۹۸۹/۵، دوای ئەوە چەند کارێکی سوپاو لايەنگرانی هەڵسان بەياخی بوون لە ۱۹۹۱/۹/۳بەڵام زۆربەی سەرکردەکان پاڵپشتی حکومەتيان کردو لەماوەی ۲٤کاتژمێر ياخی بومکانيان لەناو برد. لە هەڵبژاردنەکانی ۱۹۹۳ پارتی بيرۆنی سەرکەوتنی بەدەست هێنا، هەروەها لە هەڵبژاردنەکانی ۱۹۹۵دوبارە ليکارلۆس بەسەرۆك کۆمار هەلبژێردرايەوە تاکو ساڵی۲۰۰۲.
- ئەرجەنتين ئەندامە لە رێکخراوی وڵاتانی ئەمەريکا، ئەندامە لەرێکخراوی نەتەوە يەکگرتووەکان.

# بەڕازیـــــل

- ناوی ڕەسمی: کۆماری بەڕازیلی یەکگرتوو.
- پایتـەختی: بـەڕازیلیا، ژمـارەی دانیـشتوانی ۱٫۷۷۸٫۰۰۰ ملیۆن کەسە.
- شارە گرنگـەکانی: ساوباولۆ (۱٦٫۷۰۰٫۰۰۰ ملیـۆن کەسـە) ریـۆدی جـانیرۆ (۱۰٫۲۵۰٫۰۰۰ ملیـۆن کەسـە) بیلـۆ هـوریزۆنتی (۳٫۸۵۰٫۰۰۰ ملیـــــۆن کەســــــە)، بـــــەپێی زاینـــــاری ڕۆژنامەکانی۲۰۰۲.
- بەنـدەرە گرنگـەکانی: ریـۆدی جـانیرو، بیلـیم، دیـسیف، بۆرتـوجیرو، سلفادور، نزیکـەی سـێ بەشی دانیشتوانی لە شارەکان دەژی.
- ڕوبـــەری: ۳۲۸٦٤۷۰ میـــل چوارگۆشـــەو (۸۵۱۱۹۵۷ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە).
- ژمارەی دانیشتوانی: ۱۷۲٫۸۵۰٫۰۰۰ ملیۆن کەسە.
- چـڕی دانیـشتوانی: ۵۳ کـەس لەیـەک میـل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۱٫۸ ٪ .
- نژادەکانی: سپی پێست (پورتوگالی و ئەڵمانی و ئیتاڵی و ئەسپانی و پۆڵەندینە) کە ۵۵٪ پێك دێـنن، ئەفریقیـەکان لەگـەڵ ئەورووپیـەکان تێکەڵاون ۳۸٪ ئەفریقیەکان ٦ ٪ .
- زمانــەکانی: پورتوگــاڵی (زمــانی ڕەسمیــە) ئەسپانی، ئینگلیزی، فەرەنسی.
- ئاینـــەکانی: کاســـۆلیکی ڕۆمـــانی ۹۸٪ بیروباوەڕی هیندی.
- زانینـی نوسـین و خوێنـدن: ۸۲٪. بـەڕازیل جیـاوازە لەگـەڵ جیرانـەکانی کەبـەزمانی ئەسپانی ئاخاوتن دەکەن و دانیشتوانی بەڕازیل یەکگرتون لە ڕەگەزەکان.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆمارێکی فیدڕالیە، سەرۆك و جێگرەکـەی بـۆ مـاوەی پێـنج سـاڵ هەڵدەبـژێردرێن و دوبـارە ئـابێ خۆیـان هەڵبژێرنـــەوە. پەرلـــەمان (کۆنگرێـــسی نیـــشتیمانیە)، دوو ئەنجومـــەنی هەیـــە، ئەنجومـەنی پیران کە ئەندامیـەتی بـۆ مـاوەی هەشت ساڵە، ئەنجەمەنی نوێنـەران بۆ ماوەی چوار ساڵە.
- پارتـە ڕامیاریـەکان: پـارتی کرێکـاران، چەپی ناوەنـدی، پـارتی کۆمەڵایـەتی دیموکراتی، مام ناوەنـدی، پـارتی جوڵانـەوەی دیمـوکراتی بـەڕازیلی، پـارتی بـەرەی لیبڕاڵـی، پـارتی ڕاستڕەو، پارتی ئاوەدانکردنەوەی نیشتیمانی، پارتی ڕاستڕەوی ناوەند.
- دابەشی کارگێڕی: ۲٦ پارێزگایە، یەك بەشی فیدڕاڵی تیایە ئەویش بەڕازیلیا.
- بـەرگری: ۲۰۰٫۸٪ لـە کـۆی دەرئـەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۱۳۵٫۰۰۰هەزار کەسە.
- دراوی: کروزیرۆ.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ۱٫۰۰۵ ملیـۆن دۆلار.
- بەشـی تـاك لـەکۆی دەرئـەنجامی نـاخۆیی: ٦٫۳۰۰ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ۸٪ لەخاکی وولاَـەکە.
- بەرهەمـــەکانی کـــشتوکاڵی: بـــۆن یەکـــەم بەرهەمیـەتی لـەجیهان بیبـەر، چـەوەندەری شـەکر، کاکـاو، تـوتن، بـرنج، گـەنم، تـەرەو میوەجات، پەمۆ.
- سـامانی ئـاژەڵی: چـێڵ و گـامێش۱٦۵٫۰۰۰ ملیۆن سەر، بەراز ۳٦٫۷۰۰ ملیۆن سەر، مەڕ ۱۸٫۵۰۰ ملیـۆن سـەر، بـزن ۱۰٫٦۰۰ ملیـۆن سەر، پەرەور ۹۵۰ ملیۆن سەر.
- بەرهـەمی کارەبـا: ۳۰۳٫۷ ملیـار کیلـۆوات کاتژمێر.
- سـامانی سروشـتی: ئاسـن، موگنـاتیس،

فۆسفات، یۆرانیۆم، زێڕ، نیکل، نەوت، بۆکسیت، هێزی کارەبا، داری دارستانەکان، داری زۆرو ماش و بەناوبانگی تیایە.

- پیشەسازی: ڕەقی (صلب) کیمیا، پترۆکیمیاوی، ماشێن، ئۆتۆمۆبێل، چیمەنتۆ، دارو خەڵوزی دار (ڕەژوو) دروستکردنی شەکر، دروستکردنی پێڵاو، ئامادەکردنی خۆراك، خۆشکردنی پێست، ئامادەکردنی گۆشت، ئامادەکردنی دار.
- دەرچووەکانی: قاوە، خامی ئاسن، فول، شەکر، گۆشت، پێداویستیەکانی گواستنەوە، پێڵاو، شەربەتی پرتەقاڵ، دار، ئاژەڵی زیندوو، پێست، خوری.
- بەرازیل بەرهەمی کۆکاین و ترياکی هەیە و لەناوخۆی بەکاری دەهێنێ و بازرگانی بەکۆکاین دەکات لەنێوان پۆلیڤیا و کۆلۆمبیاو دەینێرێتە وولاتانی ئەوروپا و ئەمەریکاش.
- داهاتەکانی دەرەوەی: نەوتی خاو، کەلوپەلی سەرمایەداری، بەرهەمەکانی کیمیا، کەلوپەلی خواردەمەنی، خەڵوز.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، یەکێتی ئەوروپا، یابان، ئەمەریکای لاتینی، وولاتانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، چینی میللی.
- جوگرافیای وولات: بەرازیل نزیکەی نیوەی ڕووبەری کیشوەری ئەمەریکای باشوور دەگەرێتەوە هەروەها درێژ دەبێتەوە بە درێژایی ٤٧٧٢ کیلۆمەترە لەباکور بۆ باشوور، بە درێژی ٤٢٣١ کیلۆمەتر لەڕۆژهەلات بۆ ڕۆژئاوا، سنوری هاوبەشی هەیە لەگەڵ وولاتانی کیشوەرەکە جگە لە شیلی و ئیکوادۆر، لە باکوری جۆیانای فەرەنسی و سۆرینام، جۆیاناو فنزویلا، لەڕۆژئاوای کۆلۆمبیا، پیرۆ و پۆلیڤیا، برۆگوای و ئەرجەنتین، لەباشووری ئۆرگوای، لە ڕۆژهەلاتی زەریای ئەتلەسی، لەگەڵ ئەوەشدا کەنارەکانی بەرازیل لەوێ درێژ دەبێتەوە بە درێژی ٤٦٠٢ میل لە باکوری وڵات، دەریاچەی زێی ئەمازۆن بە دارستانە چڕەکانی بەناوبانگە کە نیوەی خاکی وولات دادەپۆشێ. زێی ئامازۆن نزیکەی سەد ڕوباری تێکەرەوەی هەیە و زێی ئەمازۆن بەسودە بۆ پەرینەوەی کەشتیەکانی زەریا تاکو شاری ئیکیوس لە پیرۆ ماوەی ٣٧٠٠ کیلۆمەترە و ناوچەی باکوری ڕۆژهەلاتی زەویەکی نیمچە بێ بارانییەو چڕە لەدانیشتوانی زۆری ، بەلام ناوچەی باشووری ناوەندی کەش و هەواکەی مام ناوەندیە، بەرهەمی سروشتی باشی تیایەو نزیکەی نیوەی دانیشتوانی لێ یەو بەرهەمی ٧٦٪ی کشتوکاڵیەو ٨٠٪ بەرهەمی پیشەسازیە، بەلام پشدێنی کەنارەکانی تەنگ و زۆربەی شارە گەورەکان دەگرێتە خۆی، لەباشووری بەرازیل زنیەکانی پارگواو ئۆروگوای و دیارانە، لەناوەڕۆی ئاوی گرنگەو زێی ساو مارنسیسکۆ کە دەڕژێتە زەریای ئەتلەسی و بەکەلکە بۆ دەریاوانی و درێژی ١٩٠٣ کیلۆمەترەو دەریاوانی تیا ناوەستێ تەنیا لەنزیك بونەوەی کە دەگەنە یەکترو چەندین تاڤگەی تیایە وەك تاڤگەی باولۆ ئەلونسۆ کە بەرز دەبێتەوە بە بەرزی ٨٤ مەتر، لەباشووری وولات زەویەکی بەپیتی تیایە، کەشوهەوایەکی کەمەرەی زەوی هەیە و یان نیمچە کەمەرەی لە هەموو ولاتەکە.
- مێژووی ولات: لەبنەڕەتا هیندیەکانی ئەمەریکای باشوور لێی نیشتەجێ بوون، لە ساڵی ١٥٠٠ی زاینی زەوی ناسی پورتوگالی پدرو فاریس کابرال لە دوای دۆزینەوەی داوای کرد کە پرتوگال خاوەندیەتی زەویەکە بکات لەدوای گەشتەکەی کە بارێکی مەزنی لەداری بەرازیل لەگەڵ خۆی هێناوە ولاتەکەی کە دارەکە لە جۆری سمغی بوو، لە دارستانە چڕو بەسوودەکەی کەناوی لاتینی بە(بور بەرازیل) ناوزەندە.لەبەر ئەوەش ناوی ولاتەکەی لێ نراوە. لە ساڵی ١٥٣٠ سەرمایەداری پورتوگال

دەستی پێ کرد لە وڵات، بەزۆرەدەست خستنی بازرگانی هەرچەندە ئەم کارە لە ناوەندیەوە نەبوو. بەڵام دوای پورتوگال و بەرازیل هەردوکیان کەوتنە ژێر دەسەڵاتی ئەسپانیا لەنێوان ساڵەکانی ١٥٨٠ تاکو ١٦٤٠ زاینی. لەسەدەی حەفدەهەم لە بواری کشتوکاڵی پەرەی پێدرا بە دامەزراندنی کێڵگەی کشتوکاڵی بەتایبەتی چەوەندەری شەکر کە بەرازیلی کردە یەکەم دەوڵەتی جیهان لەبەرهەم هێنانی شەکر و پەروەردەکردنی ئاژەڵی هەمە جۆر، لەسەدەی نۆزدەم زێڕ دۆزرایەوە لەبەرزایەکانی ناوەندی، لە ساڵی ١٧٦٣ پایتەختی سەرمایەدارەکان گۆزراوە لە باهیا بۆ ریۆدی جانیرۆ، یەکەم کێڵگەی بۆنی لێ دامەزرا لە ( ریۆدی جاینرۆ)، لە ساڵی ١٧٧٠ ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٣٠٠ر٣ ملیۆن کەس بوو لەسەدەی هەژدەهەم نزیکەی ٩٠٠ر١ ملیۆن کەس لە دیلایەتی بوون (عەبید) کە لەسەرەتا دەگەڕانەوە سەر ڕەچەڵەکی ئەفریقیەکان. بە پیشەسازی دەرهێنانی زێرو بۆن بوە هۆی پەرەسەندن و بوژانەوەو پێشکەوتنی پیشەسازی و کشتوکاڵ لە وولات، لە ساڵی ١٨١٥ شانشینی بەرازیل و پورتوگال و جرف پێکهێنرا و پورتوگال و بەرازیل یەکسان بون و ریۆدی جانیرۆ یان کردە پایتەخت، بەهۆی تێکچوونی بارودۆخ لە پورتوگال شانشین ناچار بوو بگەڕێتەوە پورتوگال و بەرازیل جێ بهێڵێ، بەرازیل سەربەخۆیی خۆی لە١٨٢٢/٩/٧ ڕاگەیاند، لەساڵی ١٨٢٥ شانشین یۆحنای شەشەمی شانشینی پورتوگال دانی نا بەکورەکەی (بدوری یەکەم)بە ئیمپراتۆریەت لەسەر بەرازیل، لە ساڵی ١٨٨٨ کۆیلایەتی هەڵوەشێنرایەوە لە بەرازیل. لە ساڵی ١٨٨٩ ی زاینی (بدوری دووەم) لەسەر کورسی ئیمپراتۆریەت هێنرا خوارەوەو رژێمی کۆماری بەرازیلی یەککگرتووی ڕاگەیەنرا، حکومەتی ناوەندی دەسەڵاتی بەسەر خاوەن کشتوکاڵیە یۆنانیەکان و بەسەر هەموو وڵاتدا ڕۆیشت. لە ساڵی ١٩٠٢ بەرازیل لە ٦٥٪ بەرهەم هێنەری بۆنە لەجیهان، لە ساڵی ١٩٣٠ ئەفسەرە سەربازەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست و یەك لەدوای یەك حکومڕانی وڵاتیان دەکرد تا ئەوکاتەی سەربازەکان لە دەسەڵات لابران لە ساڵی ١٩٤٥ و بەرازیل هاوکاری هاوپەیمانی کرد لە جەنگی دووەمی جیهان و خۆشحاڵبوون بەدامەزراندنی بنکەی سەربازی و ئاسمانی لەوڵاتەکەو بەشداری داگیرکردنی ئیتاڵیای کرد، لەدوای ڕاگەیاندنی شەڕ دژی دەوراوپشتی. لە ڕاستیدا ئەو حکومەتانەی کە یەك لەدوای یەك دەسەڵاتیان گرتە دەست هەرچەندە دکتاتۆری و سەربازی بوون بەڵام توانیان بەوپەڕی توانا پەرە بە ولاتەکەیان بدەن لەبوارەکانی پیشەسازی و کشتوکاڵ و بازرگانی لە ساڵی ١٩٣٠ تاکو ١٩٦٧ کە بەرازیل ببێتە هێزێکی پیشەسازی سەرەکی لە ئەمەریکای باشوور و بەرزکردنەوەی پلەی بەرهەمی کشتوکاڵی لە ساڵی ١٩٦٧ دووبارە ناوی وڵاتیان گۆڕی و بووبە کۆماری بەرازیلی یەککگرتوو.. بەڵام گواستنەوەی پایتەخت لە (ریۆدی جانیرۆ) بۆ بەرازیلیا لە ١٩٦٠ ئەنجام درابوو. شەشەم وڵاتی دیموکراتی بوو لە ساڵی ١٩٤٥ تاکو ١٩٦٤ لەوکاتەی کودەتای ئاشتی ئەنجام درا.. تا ساڵی ١٩٩٨ وڵاتی بەرازیل چەندین گۆڕانکاری بەخۆوە دیت لەڕووی دەسەڵات.

- بەرازیل ئەندامە لە ڕێکخراوی وولاتانی ئەمەریکا، ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

# مەکسیك

- ناوی ڕەسمی: ولایەتەکانی مەکسیکی یەکگرتوو.
- پایتەختی: مەکسیکۆ سیتی، ژمارەی دانیشتوانی ۰۰۰ر۶۷۵ر۱۸ ملیۆن کەسە.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: کۆتزا کۆلکۆس، مازاتلان، تمبیکۆ، فیراکۆن. .
- شارە گرنگەکانی: جوادلاجارا، مۆنتری، جویلا، لیۆن.
- ڕووبەری: ۰۶۱ر۷۵۶ میل چوارگۆشەو ۲۰۰ر۹۵۸ر۱ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۷۶۵ر۱۰۱ ملیۆن کەسە بەپێی ئاماری ۲۰۰۰.
- چڕی دانیشتوانی: ۱۳۵ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۲ر۲٪.
- نژادەکانی: مستیزۆ ۶۰٪ تێکەڵاون لە دایك و باوکی ئەورووپی و هندی ئەمەریکی، واتە دایکی یا باوکی ئەمریکیە و بە پێچەوانە ڕاستە، هندی ئەمەریکی ۳۰٪ ، قەوقازیەکان ۱۰٪.
- زمانەکانی: ئەسپانی (زمانی ڕەسمیە) زمانی تری هندیو ئەمەریکی تیایە.
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی ۸۹٪، پرۆتستنت ۶٪، ئایینی تری تیایە.
- زانینی خوێندن و نوسین: ۹۲٪.
- دابەشی کارگێڕی: ۳۱ پارێزگایە، هەرێمێکی یەکگرتووە کە هەر پارێزگایەك مافی ئۆتۆنۆمی مەزنی خۆی هەیە. دادوەرەکانی بە پێشنیاری گشتی میللی هەڵدەبژێردرێن، ئەنجومەنی یاسادانانی هەیە لەگەڵ دەسەڵاتی قەزائی ناوخۆیی، بەڵام بەرپرسی هەرێمەکە لەلایەن سەرۆك کۆمار دادەمەزرێت.
- بەرگری: ۱۰٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۰۰۰ر۱۸۰هەزار کەسە.
- دراوی: بیزۆی نوێ.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۰۰۰ر۶۹٤ر۵۰۰ میلار دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ۷۵۰ر۷ دۆلار.
- زەوی کشتوکاڵی: ۵ر۱۲٪ لەخاکی ولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: پەمۆ، قاوە، گەنم، جۆ. برنج، فول، تەرە بەهەموو جۆرەکانیەوە، گەنمەشامی (دەرەزەرد) میوەجات، چەوەندەری شەکر، چەندین دانەوێڵەی تر..
- سامانی ئاژەڵی: چێڵو گامێش ۱۵۰ر۲۸ ملیۆن سەر، بەراز ۰۵۰ر۱۸ ملیۆن سەر، بزن ۶۰۰ر۱۰ ملیۆن سەر، مەڕ ۱۵۰ر۶ ملیۆن سەر،پەرەور ۰۰۰ر٤۱۰ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی کارەبا: ۳۵۰ر۱۶۵ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: زیوو، نوحاس، قوڕقوشم، تۆتیا، زێڕ، نەوت، غازی سروشتی.
- پیشەسازی: پۆڵا، کیمیا، کەلوپەلی بارکراو، ڕستن و چنین، مەتات، نەوت، گەشت و گوزار، ئامادە کردنی گۆشت، خۆشکردنی پێست. دروستکردنی پێڵاو.
- دەرچووەکانی: ئۆتۆمبێل، ئەلکترۆنی، پەمۆ، قاوە، نەوت و بەرهەمەکانی، ئامێرو کەلوپەلەکانی. گۆشتی ئامادەکراو، پێڵاو، خوێ، ئاژەڵی زیندوو.
- داهاتەکانی دەرەوەی: دانەوێڵە، بەرهەمی ئاسنی، کەلوپەلی کشتوکاڵی، کەلوپەلی

کارەبایی، پارچەکانی ئۆتۆمبێل بۆ لێکدان، فرۆکەو پێداویستی کەلوپەلەکانی.

- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمەریکا، بەریتانیا، یابان، وولاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا، چین، ئەڵمانیا.
- ڕژێمی دەسەلات: سەرۆك کۆمار هەڵدەبژێردرێ بە پێشنیاری گشتی میللی و نابێ بۆ جاری دووەم خۆی هەڵبژێرێت و ماوەی هەڵبژاردنەکەش بۆ شەش ساڵە. ئەنجومەنی وەزیران دەسەلاتداریەتی وولات دەکات، کۆنگرێس لەدوو ئەنجومەنی پیران و نوێنەران پێك هاتووە، ئەنجومەنی نوێنەرانی لە ٥٠٠ ئەندام پێك هاتوە و بۆ ماوەی سێ ساڵ هەڵدەبژێردرێت، ئەنجومەنی پیران لە ٦٤ ئەندام پێك هاتوە و بۆ ماوەی شەش ساڵ هەڵدەبژێردرێت و بۆ ماوەی سێ ساڵ نوێ دەکرێتەوە گەر پێویستی کرد.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی دەزگاکانی شۆڕشگێڕی، مام ناوەندی، پارتی چەپی ناوەندی، پارتی کاری نیشتیمانی، پارتی مەسیحی، پارتی شۆڕشگێڕی دیموکراتی، چەندین پارت و بزووتنەوەی بچوکی تری تیایە.
- جوگرافیای ولات: مەکسیك دەکەوێتە باشووری کێشوەری ئەمەریکای باکور، لە باکوری ئەمەریکا، لەباشووری گواتیمالا وبیلز، لەسەر کەنارەکانی ڕۆژئاوای چیای سیبرامادە، لە نزیك کەنارەکە کەنداوی مەکسیکە لە ڕۆژهەلاتی، چیاکانی سیبرامادری دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی، لە ڕۆژئاوای نیمچە دوورگەی باجاکالیفۆرنیا تیایە کە جیای دەکاتەوە لە خاکی دایكو کە کەنداوی کالیفۆرنیایە، لەڕۆژهەلاتی نیمچە دورگەی (بۆکاتا)ن هەیە کە دەوری دراوە بەشانەی (کامبیتشی و کەنداوی مەکسیك)، گەروی بۆکاتان ( لەنێوانیان کوبا بۆ ڕۆژهەلاتی)و دەریای کاریبی.
- مێژووی وولات: مەکسیك نیشتیمانێکی شارستانیەتی هیندی پێشکەوتوە. گەلی (مایان) نیشتەجێی هەرێمەکەن ، کە گەلێکی کشتوکالی کۆنە لە نیمچە دورگەی بوکاتانەو کەوتۆتە باشووری ڕۆژهەلاتی مەکسیك، ئەهراماتی بەردینی مەزنیان دروستکردووە و پێشنیاری سالنامەی ڕۆژ ژمێریان داوە بۆ ڕۆژەکان. لەدوای ئەوان گەلی (تۆلتکس) بەرەو ناوچەکە هاتن و دوای ئەوانیش ئیمپراتۆریەتی (ئەزتیکس)ی لێ دامەزرا بەدروستکردنی شاری (تینۆ شتیتیان) لە ساڵی ١٣٢٥ کە ئێستا بۆتە (مەکسیکۆ سیتی) پایتەخت، لەساڵی ١٥٢١ داگیرکەرە ئەسپانەکان گەیشتنە وولاتی مەکسیك و زاڵ بوون بەسەر ئیمپراتۆریەتی (ئیزتیکس) ودوایی مەکسیك کەوتە ژێر دەسەلاتی ئەسپانیا بۆ ماوەی سێ سەد ساڵ تاکو ساڵی ١٨١٠، لە ١٨١٠/٩/١٦ مەکسیکیەکان بۆ تۆلە سەندنەوە ڕووبەڕوی داگیرکەری ئەسپانیا بوونەوەو ئەوڕۆژە بەسەر بەخۆیی مەکسیك دانراو تاکو ئێستاش یادی دەکەنەوە، شۆڕشگێڕەکانی مەکسیك بەردەوام لەبەریگردن لەولاتەکەیان بوون بەسەرکردایەتی کۆستیلا لە ساڵی ١٩١٠ و یابۆن لە ساڵی ١٨١٢، ژەنەرال ئۆجۆستین ئیتۆرید توانی سەربەخۆی تەواوی مەکسیك بەدەست بێنێ لەساڵی١٨٢١ خۆی کردە ئیمپراتۆریەتی ئەمسا بەناوی خۆی (ئجوسنیتی یەکەم بەلام لەساڵی ١٨٢٣ ڕژێمی کۆماری ڕاگەیاند. تا ١٨٧٧ دەسەلاتە یەك لەدوای یەکەکان لە وولاتی مەکسیك دەتوانین بڵێین لەماوەی هەر(٩) مانگ جارێك سەرۆکی گۆڕاوە. خاکی مەکسیك درێژ دەبێتەوە بەرەو باکورو باشووری ڕۆژئاوای ئەمەریکاو کالیفۆرنیا دەگرێتە خۆی، بەلام تکساس لە ساڵی ١٨٣٦ لە مەکسیك

جیاکراوە بوە هۆی دروستبوونی شەر لەنێوان ئەمەریکاو مەکسیك هەروەها لە ساڵی ١٨٤٦ دووبارە شەڕ لەنێوانیان هەڵگیرساوەو بووە هۆی ئەوەی کە مەکسیك زۆر لە ناوچەکانی کالیفۆرنیاو ئەفاداو ئۆتاوە لەدەست بدات لەگەڵ زۆربەی ناوچەکانی پارێزگای ئۆبزۆناو نیو مکسیکۆو چەندین پارچەی تر لە پارێزگای وابۆ (منیج) و کۆلۆراد. بەهۆی نەدانەوەی قەرزەکانی و فەرەنسا توانی شاری مەکسیکۆ سیتی داگیر بکات (ئەرشیدۆفی نەمساوی) (مەکسیلیان) بکاتە ئیمپراتۆری مەکسیك لە ساڵی ١٨٦٤، بەڵام گەلی مەکسیك بەرگریان لە وڵاتەکەیان کرد بە سەرکردایەتی (گوارێز) تاکو لەناوبردنی دەسەڵاتی (ماکسمیلیان) لە ساڵی ١٨٦٧ دوای لە سێدارەدرا، گوارێز گەڕاوە پایتەخت و هەڵبژێردراوە بەسەرۆك کۆمار، دەستوری مەکسیك لە ١٩١٧/٢/٥ دانراو بووە هۆی چاکسازی لەبوارەکانی ئابووری و رامیاری ڕۆشنبیری، بوژانەوەی مەکسیك لەبوارەکانی کشتوکاڵ و پیشەسازیو کۆمەڵایەتی و رامیاری، لەگەڵ ئەمەریکا هەردەم ململانێ و کێشەیان هەبووە تا ئەو کاتەی هەموو بیرە نەوتیەکانی بیانی خۆماڵی کرد، بەڵام لەدوایی توانی لەگەڵ خاوەن زەویەکان ڕێك بێت بە پێدانی پارە لە ساڵی ١٩٤١. لەدوای ئەوە پارتی شۆڕشگێری دەسەڵات چەندین دەستکەوتی بەدەست هێنا لەبواری کشتوکاڵو پیشەسازیو خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی بەڵام بەهۆی کەمی کرێکارو نەبوونی باران ووشکانیو چاك نەکردنی زەوی، بەڵام دوای بەهۆی دۆزینەوەی نەوت مەکسیك باری ئابوری بەرەوباشی دەڕۆیشت، لەساڵەکانی ١٩٨٣تا ١٩٨٤ توشی گەورەترین باری ئاڵۆزی ئابوری بوو... سەرەڕای ئەو تەنگژە ئابوریە و بێکاریە پارتی شۆڕشگێر بەسەرۆکایەتی کارلۆس سالیناس لەساڵی ١٩٨٨ لەهەڵبژاردنەکان سەرکەوتنی بەدەستهێنا، لە١٩٩٤/١/٢ یاخیبوەکان شالاویان بردە سەر حکومەت کە سەر بە سوپای زاپاتیستای ڕزگاری نیشتمانی بوون، لە١٩٩٤/٣/٢ ڕێکەوتنی ئاشتیان لەنێوان حکومەتو یاخیبووەکان مۆر کرا، لەهەلبژاردنی ١٩٩٧/٧/٦پارتی شۆڕشگێر سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا لەگەڵ ئەمەشدا پارتی دەسەڵاتدار هەر لەدەسەڵات مایەوە.

وڵاتی مەکسیك بە زۆر کێشەو ململانێی ناوخۆ تێپەڕیوە بەهۆی لێك ترازانی بیروبۆچوونی خۆپەرستی چ لەسەر کورسیو دەسەلات و چ لەسەر دژایەتی کردنی شالآوی دەرەوەی سنور بە هەرحاڵ مەکسیك ڕۆڵی خۆی هەیە لە گۆڕەپانی نێو دەوڵەتی، دوا مەرگەساتیشیان بەفرو بارانە وێرانکارییەکە بوو کە بوە هۆی لافاوێکی مەزن لەمانگی ١٩٩٩/١٠/ بەدەربەدەر بوونی بە دەیا هەزار خێزان لەسەر ماڵ و سامانی خۆیان

- مەکسیك ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری و بوژانەوە، ئەندامە لە ڕێکخراوی وڵاتانی ئەمەریکا.

# ئۆرگـــــواى

- ناوى ڕەسمى: كۆمارى ئۆرگواى ڕۆژهەڵات.
- پايتـــــەختى: مۆنتفيـــــديۆ، ژمــــارەى دانيشتوانى ٠٠٠ر٧٩٥ر١ مليۆن كەسە.
- شارە سەرەكيەكانى: سەلتۆ، باباسندۆ.
- بەندەرە سەرەكيەكانى: مۆنتفيديۆ.
- ڕووبـــــەرى: ٠٤٠ر٦٨ ميـــل چوارگۆشــــەو ٢٢٤ر١٧٦ كيلۆمەتر چوارگۆشەيە.
- ژمـارەى دانيـشتوانى: ٠٠٠ر٣٨٠ر٤ مليـۆن كەسە.
- چـڕى دانيـشتوانى: ٦٤ كـەس لەيـەك ميـل چوارگۆشەدا.
- نژادەكانى: سپى پێست (لە بنەڕەتا ئيبرى و ئيتاڵيـە) ٨٨٪، مـستيزۆ (كـە تێكـەڵاون لـە ئـەوروپى و دانيـشتوانى دورگـەى هينـدى ڕۆژئاوا) ٨٪، پێست ڕەش ٤٪.
- زمانەكانى: ئەسپانى (زمانى ڕەسمييە).
- ئايينـــەكانى: كاســـۆليكى ڕۆمـــانى ٦٦٪، پرۆتستانت ٣٤٪.
- زانينى خوێندن و نوسين: ٩٨٪.
- دابەشى كارگێڕى: ١٩ هەرێمى پارێزگايە.
- بەرگرى: ٤ر٢٪ لەكۆى دەرئەنجامى ناوخۆيى.
- سوپاكەى: ٥٠٠ر٢٦ هەزار كەسە.
- كۆى دەرئەنجامى ناوخۆيى: ٣٠ مليار دۆلار.
- بەشـى تـاك لـەكۆى دەرئـەنجامى نـاوخۆيى: ٠٠٠ر٨ دۆلار.
- دراوى: بيزۆى ئۆرگواى.
- زەوى كشتوكاڵى: ٥ر٨٪ لە خاكى وڵاتەكە.
- بەرهەمى كشتوكاڵى: گەنمەشامى، گەنمو جۆ، چەوەندەرى شەكر، برنج، تەرەو ميوەجات.
- سـامانى ئـاژەڵى: مـەڕ ٥٠٠ر١٩ مليـۆن سـەر، چـێڵو گـامێش ٤٥٠ر١١ مليـۆن سـەر، بـزن ٢٠٠ر٣ مليـۆن سـەر، بەرەوور ١٠٠ر١٢ مليـۆن سەر.
- بەرهـەمى كارەبـا: ١٠٠ر٧ مليـار كيلـۆوات كاتژمێر.
- پيـشەسازى: دروسـتكردنى گۆشـتى قـوتى، خـورى، پێـست، بەرهـەمى ڕسـتن و چـنين، پاڵاوتنى نەوت، بەرهەمى ترياك.
- سامانى سروشتى: وزەى كارەباى ئاوى.
- دەرچووەكانى: گۆشت، پێست، خورى، ماسى.
- داهـــاتى دەرەوەى: كەلوپـــەلى گواســـتنەوە، كيميـــاوى، ماشـــێن، پلاســـتيكى، كەلوپـــەلى كانزايى.
- هاوبەشـەكانى بازرگـانى: ئەمـەريكا، بـەرازيل، ئەرجەنتين، ئەڵمانيا، چين، ئيتاڵيا، نێجيريا.
- ڕژێمـى دەسـەڵات: كۆمـارێكى ديموكراتيـە، سـەرۆك كۆمـار يـەك جـار هەڵدەبـژێردرێت بـۆ ماوەى پێنج ساڵ و نوێ ناكرێتەوە، پەرلـەمان پێكهاتوە لـە دوو ئەنجومـەن (ئەنجومـەنى پيران و ئەنجومەنى نوێنەران).
- پارتـە ڕامياريـەكان: پـارتى كۆلـۆرادو، پـارتى پێشكەوتن، چەپى ناوەند، پارتى نيشتيمانى (بلانكۆ) كە پارێزگارى لە داب و نەريت دەكات، پـارتى گـەردونى نـوێ، پـارتى ڕووبـەڕوى پێشكەوتن، چەپەكان، پارتى مام ناوەندى.
- جوگرافيـــاى وڵات: ئۆرگـــواى بـــچووكترين كۆمـارى ئەمـەريكاى باشـوورە. دەكەوێتـە سـەر كەنارى زەرياى ئەتڵەسى باشوور، لەڕۆژئاواى ئەرجەنتينە، بەرازيل لە باكوريەتى، ئۆرگواى لە دەشتايەكى نـزم پێكهاتووەو بڵند و نەوەيـە لـە باشـوورى ، تەپۆلكـەى نـەوين لـە بـاكور، دوو زێى تيايە ئەويش زێى ئۆرگواى و زێى نگرۆ،

دەشتایەکی پڕ لەڕووەك و گژو گیاییەو کەندو دۆڵەکانی پڕ لەدارستانە، درێژی دەشتایەکانی لەسەر ئەتڵەسی ۱۹۳ کیلۆمەترە، زێی ئۆرگوای سنوری ڕۆژئاوایەتی لەگەڵ ئەرجەنتین، کەش و هەوای مام ناوەندیە و بە درێژایی ساڵ بارانی لیٚ دەبارێت بە ڕێژەی ۳۵ ئینج.

- مێژووی وولاٚت: لە ساڵی ۱۵۱٦ زاینی جوگرافی ناسی ئەسپانی (جوان دیازدی سولیس) ئۆرگوای دۆزیەوە بەلاٚم پورتوگالیەکان یەکەم کەس بوون کردیانە نشینگە، لەمانگی ۱۲/۱٦۸۰ لەدوای هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر ئەسپانیەکان توانیان لەساڵی۱۷۷۸ لە ژێر دەستی پورتوگالیەکان دەربهێنن. ئۆرگوایەکان بە تۆڵە وەرگرتنەوە ڕوبەڕوی ئەسپانیەکان بونەوە لە ساڵی ۱۸۱۱ و لە۸/۲۵ ۱۸۲۵ یارمەتی دران لەلایەن ئەرجەنتینیەکان و بۆ جێگیرکردنی سەربەخۆیان، لە ساڵی ۱۸۲۸ ڕژێمی کۆماری لە ئۆرگوای دامەزرا، بەلاٚم لەدوای سەربەخۆی پەلاماری هەڕەشەی لیٚ دەکرا لەلایەن ئەرجەنتین و بەرازیل، بەلاٚم بەهۆی بەرهەمەکانی خوری و پێست ناردنە دەرەوەی بوژایەوەو بوە وولاٚتێکی ئاسوودەو خۆشی ژیان و بەرزبونەوەی ئاستی ژیان، بەلاٚم بەهۆی زۆری کارمەندو کارگە و فەرمانبەرو دورگەوتنەوە لەکاری کشتوکاڵ و پیشەسازی بوە هۆی تەنگەژەی ئابووری لە پەنجاکان کە حکومەتەکانیان هەموو شتێکیان بە ئارەزوو ویستی گەل دەرکرد، لە ساڵی ۱۹۷۳ کودەتای سەربازی ئەنجام دراو بوە هۆی لەناوبردنی دەسەلاٚتی مەدەنی و ترساندنی جەماوەرو گرتن و کوشتن و تێکچونی باری ئابووری و داپلۆسین کە لەمێژوو بیٚ وێنە بوو لە جیهان ئەمەش لە ماوەی دوانزە ساڵ بوو تاکو ساڵی ۱۹۸٤ کە هەڵبژاردن ئەنجام دراو دەسەلاٚتی مەدەنی دووبارە گەڕاوە وولاٚت و وازی لە دەسەلاٚتی دوور لەخواست و ویستی گەل هێنا، لەمانگی لەمانگی/۳/ ۱۹۸۵،لە مانگی /۳/ ۱۹۹۰ لویس لاکال سەرۆکایەتی کۆماری وولاٚتی گرتەدەست کە بوە یەکەم پلە لەلایەن پارتی بلانکۆ، لەمانگی/۳/ ۱۹۹۵ کابرۆلۆ هەڵبژێردرا بە سەرۆك کۆمارو بەرەو ڕژێمی سۆشیالیستی هەنگاوی ناو بەرەو بوژانەوەی بیٚ وێنە لە هەموو ڕویەکەوە لە بوارەکانی رامیاری و دیموکراتی بە تایبەتی ئابووری کە ئێستا گەلی ئۆرگوای بەرزترین بژێوی ژیانی هەیە لە هەموو ئەمەریکای باشوور، دووبارە کاربرۆلۆ بلانکۆ لەساڵی ۱۹۹۹بەسەرۆکی وولاٚتەکە هەلبژێردرا بەهۆی ڕاگرتنی هاوسەنگی هەمەلایەنە لەدەسەلاٚت.
- ئۆرگوای ئەندامە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی وولاٚتانی ئەمەریکا.

# پارگـــــواى

- ناوى ڕەسمى: کۆمارى پارگواى.
- پایتـــــەختى: ئاسونـــــسیۆن، ژمـــــارەى دانیشتوانى،٠٠٠ر٥١٤٥ر١ملیۆن کەسە.
- شارە سەرەکیەکانى: سبۆداد دل ئیستى، سان لۆرنزۆ.
- بەندەرە سەرەکیەکانى: ئەنسسبۆس.
- ڕوبـــــەرى: ٠٤٧ر١٥٧ میـــل چوارگۆشـــەو ٧٥٢ر٤٠٦ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمـــارەى دانیـــشتوانى: ٠٠٠ر٦٨٩ر٥ملیـــۆن کەسە، بەپێى زانیارى ڕۆژنامەکانى ٢٠٠١.
- چـڕى دانیـــشتوانى: ٣٦ کـــەس لەیـــەک میـــل چوارگۆشەدا.
- نـــژادەکانى: مـــستیزۆ٧٥٪ ســـپى پێـــست، هیندى، ئەمەریکى.
- زمانەکانى: ئەسپانى (زمانى ڕەسمییە) لەگەڵ زمانى گواران .
- ئاینەکانى: کاسۆلیکى ڕۆمانى ٩٠٪ ئاینەکانى تر ١٠٪.
- زانینى خوێندن و نوسین: ٩٥٪.
- دابەشـــى کـــارگێڕى: ١٩ بەشـــە لەشـــێوەى پارێزگاو قەزا.
- بەرگرى ٧٪ لەکۆى دەرئەنجامە ناوخۆیى.
- سوپاکەى: ٠٠٠ر٤٥هەزار کەسە.
- دراوى :گوارانى.
- کۆى دەرئـەنجامى نـاوخۆیى: ٠٠٠ر٢٢ ملیـار دۆلار.
- بەشـــى تـــاک لـــەکۆى دەرئەنجامـــە نـــاوخۆیى: ٠٠٠ر٣ دۆلار.
- زەوى کشتوکاڵى: ٢٠٪ لەخاکى وولاتەکە.
- بەرهەمى کشتوکاڵى: گەنمەشامى، پەمۆ، فولى ســـــودانى، چـــەوەندەرى شـــەکر، تـــەرە، میوەجات،دانەوێلە.
- سامانى ئاژەڵى: چێڵوگامێش ١٥٠ر٨ ملیۆن سـەر، بـەراز ٦٥٠ر٢ ملیـۆن سـەر، مـەڕو بزنـى هەیە بەڕێژەیـەکى مام ناوەندى،لەگـەڵ پـەلەور کە ٦٠٠ر١٨ ملیۆن سەرە.
- بەرهـــەمى کارەبـا: ٢٥٠ر٤٠ ملیـار کیلـۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازى: ئامـادە کردنـى خـۆراک، ڕسـتن و چنین، چیمەنتۆ.
- سامانى سروشتى: ئاسن، موگناتیس، بەردى جیرى(چەو) دارستان زۆر تیایە لەگەڵ وزەى کارەباى ئاوى.
- دەرچووەکانى: پـەمۆ، فولى سودانى، بەرهـەمى گۆشت، دار، قاوە، ڕۆنى ڕوەکى.
- داهـاتى دەرەوەى: سـوتەمەنى، گریـز، ڕۆن، خواردنـەوە، کـەل و پـەلى خواردەمـەنى، کـەل و پەلى سەرمایەدارى، کەل و پەلى بەکارهێنان.
- هاوبەشەکانى بازرگانى: ئەرجەنتین، بەرازیل، ئەمـەریکا، یـەکێتى ئـەوروپى، یابـان، چـینى میللى.
- ڕژێمـى دەسـەلات: وڵاتێکـى کۆماریـە سـەرۆک کۆمـار هەڵدەبـژێردرێت لەرێگـەى پێـشنیارى گشتى بۆماوەى پێنج ساڵ ، ئەنجومەنى یاسا دانان لەدوو ئەنجومەن پێک هـاتوە، ئەنجومـەنى پیران پێک هـاتووە لـە٤٥ ئەنـدام . ئەنجومـەنى نوێنەران لە٨٠ ئەندام پێک هـاتوە، ئەنجومـەنى دەولـەتیش هەیـە کـە ئـەویش ئەندامـەکانى لەلایـــەن حکومـــەت هەڵدەبـــژێردرێن کـــە ئەنجومەنى وەزیرانە.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتى ڕابیتەى نیشتیمانى کۆمارى ، ڕاست ڕەوى ناوەندى، پارتى ئازادى ڕایـــدیکالى ، ناوەنـــدى بەیـــەک گەیـــشتنى نیـــشتیمانى، پـــارتى ڕزگـــارى، چـــەندین بیروبۆچوونى نەتەوەیو ڕامیارى و دیموکراتى و کۆمەلایەتى تیایە.

- جوگرافیـــای وولات: پـــارگوای وولاتێکـــە لەناوەراستی کێشوەری ئەمەریکای باشوور، پۆلیفیا دەکەوێتە باکور، ئەرجەنتین دەکەوێتە باشووری، بەرازیل دەکەوێتە رۆژهەلاتی، زێی برگوای ولات دەکاتە دووبەش ئەویش بەرەو رۆژهەلاتی دەشتایی بەپیت و بلندو نەوی پڕ لەدارســتان و رووەك و گژوگیایــە کەچــڕی دانیشتوانی کەوتۆتە ئەوناوچەیە، بەلام بۆ رۆژئاوای دەشـتایی شـاکوڕی گرانـی تیایـە لەگـەل زەلکـاوێکی زۆرو داروەوەنـی زۆری تیایە، لەرۆژئاوای دوری دەشتایەکی بەسودو بێ بارانی هەیە.
- مێـــژووی ولات: هیندیـــە گوارانیونـــە (ئەمەریکیەکان) کە خەلکێکی کشتوکالی بون نیشتەجێی ولاتەکە بون کە بەزمانی هاوبەش ئاخاوتنیـــان دەکـــرد پـــێش گەیـــشتنی ئەوروپیـەکان بـۆ وولات، هـەر هیندیـەکان بـون ئەو ناوەیـان لـەو وولاتـە نـا کـەماناى خاکێکـە بەزێیـەکی گـرنگ دادەنرێـت، لەسـالی ١٥٢٦ (بیستیان کـابوت) دەریـاوانی ئیتـالی برگـوای دۆزیـەوە لـەکاتی گەشتەکەی بۆ بەرزاییـەکانی زێـی بارانـاو زێـی پـارگوای. لەسـالی ١٥٣٧ ئەسپانیەکان هەلسان بەهاوکاری کردن لەگەل هیندیـە گوارینـەکان دژی هینـدە شـاکوبەکان کەلەژیان بوون، توانیان ئەو ناوچەیە ژێردەستە بکـــەن، ئەســـپانیەکان توانیـــان شـــاری ئاسۆنسیۆنی (پایتەخت) دروستبکەن . لەدوای ئەوە (جزوین) توانی لەگەل ئەسپانەکان بگەنە ئەو وولاتەو ئاینی کاسۆلیکی رۆمانی تیابلاو بکەنەوە و کاروباری وولات ببـەن بەرێوە، بەلام لـــە دوایـــی ســـالی ١٧٦٧ دەریـــان کـــردن لەناوچـەکە، لەسـالی ١٨٠٨ نـاپلیۆن تـوانی رژێمـی شانـشینی لـە ئەسـپانیا لەناوبـەرێت. لـە١٤/٥/ ١٨١١ برگوایـەکان توانیـان تۆلـەی خۆیان بەجیابوونەوە لەئەسپانەکان بکەنەوە و سـەربەخۆی خۆیـان لـە ئەسـپانیا وەربگـرن، دوایـی پـارگوای بـوە وولاتێکـی دورەپـەرێز بـەهۆی تـاکرەوی تونـدی دەسـەلاتی ژەنـەرالی دکتاتۆر (جۆبرۆدور بگۆزفرانکا).

لەسـالی ١٨٤٠ لـەدوای فرانکـا کـوڕی براکـەی جێگەی گرتەوە کەناوی (ئەنیۆنیولۆبین) بوو کە تـوانی دەرگـای بازرگـانی لـەوولاتان بکاتـەوە، لـەدوایی ئـەو یـەکێ لـەکوڕەکانی سولانۆ لـۆبیز پۆسـتی سـەرۆکایەتی ولاتـی بگرێتـە دەسـت لەسالی ١٨٦٣ بە دامەزراندنی سوپایەکی بەهێز، لە ماوەی سالەکانی ١٨٦٥تا١٨٧٠ شەڕ لەگەل ئەرجـەنتینی و بـەرازیل و ئورگـوای هەلگیرسـا کەداوای کردنەوەی دەرگایەکیان دەکرد بۆ ئەوەی بگەنە دەریا ، کەئەمەش بوە هۆی کوژرانی نیوەی دانیشتوانی وولات و لەدەست دانی زیاتر لە ١٥٠ (١٠٠٠) کیلۆمـەتر لەخاکەکـەو لـۆبیزی سـەرۆك کۆمـار کـوژرا، تـاکو سـالی ١٩٨٩ ئـەم وولاتـە خۆشی لـەخۆ نـەدیت بـەهۆی کێشەو ململانێو شەڕوپێکدادانو، کودەتایەك لەدوای یەکەکان و نەبونی ئارامی و ئاسایشو تەنگەژەی ئابووری و شـەڕوململانێی نـاوخۆیی و دەرەوەی. لەسـالی ١٩٨٩ کودەتایەکی سەربازی ئەنجام درا لەلایەن (ئەندریە رۆدریگۆن) کە دوایی بەسەرۆك کۆمار هەلبـژێردرا، دوای هەلبـژاردن ئەنجام دراو پارتی لـۆرادۆی راسـتڕەو سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنـا بەلایـەنگیری هێـزی سـەربازی. لەسـالی ١٩٩٢ دەسـتوری دیمـوکراتی نـوێ بڕیـاردرا، لەسـالی ١٩٩٣ یەکەم هەلبـژاردنی دیموکراتی ئەنجام درا لەســـەر بنـــەمای فرەلایـــەنو پـــارتی لـــۆرادۆ ســـەرکەوتنی بەدەســـت هێنـــا بەزۆرینـــەی کورســـیەکان و دوای یەکـــەم هەلبـــژاردنی سـەرۆکایەتی ئـازاد ئـەنجام دراو کـە پـالێوراو (کارلۆس وازموزی) سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

- برگوای ئەندامە لەرێکخراوی ولاتانی ئەمەریکا، ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتووەکان.

# ترینیدادو تۆباگۆ

- ناوی ڕەسمی: کۆماری ترینیدادو تۆباگۆ.
- پایتەختی: بۆرت ئۆف سبینی، ژمارەی دانیشتوانی ٤٦٫٧٠٠ هەزار کەسەو لەهەمان کات بەندەرێکی ئەسپانیە.
- ڕووبەری: ١٫٩٨٠میل چوار گۆشەو ٥٫١٢٨ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ١٫٣٦٧ ملیۆن کەسە.
- چڕی دانیشتوانی: ٦٩٠ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر١٪.
- نـژادەکانی: ٤٥٪ ڕەش پێستەکان، هیندی دورگەی هیندی ڕۆژهەلات ٤٠٪، تێکەلاوەکان ١٥٪.
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی ٣٥٪، پرۆتستانتی ٣٠٪، هندۆسی ٢٥٪، ئەویتر لە بیروڕای جیاوازن.
- زانینی خویندن و نوسین: ٩٥٪.
- زمانەکانی: ئینگلیزی(زمانی ڕەسمییە)، هندی، ئەسپانی، فەرەنسی.
- دابەشی کارگێری: ١٢ پارێزگایە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر١٣ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر١٢ دۆلار.
- دراوی: دۆلاری ترینیدادو توباگۆ.
- بەرگری: ٥ر١٪ لە کۆی دەر ئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٠٠٠ر٢٥ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکالی: ٥ر١٥٪لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکالی: کاکاو، قاوە، سورای، برنج، چەوەندەری شەکر، دانەوێلە.
- سامانی ئاژەلی: مەڕ ٠٠٠ر٨٦٥ هەزار سەر، بزن ٠٠٠ر٥٣٨ هەزار سەر، چێل و گامێش ٠٠٠ر٧٥٠هەزار سەر ، پەرەوەر ٦٠٠ر١ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: چیمەنتۆ، گەشتوگوزار، بەرهەمەکانی نەوت، کیمیاوی.
- سامانی سروشتی: نەوت، غاز، ئیسفلت.
- بەرهەمی کارەبا: ٧٦٠ر٤ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی خاو، کەلوپەلی سەرمایەداری، پێداویستەکانی بەکارهێنان.
- دەرچووەکانی: نەوت وبەرهەمەکانی، بەرهەمی ڕەقی، چیمەنتۆ، شەکر، کەکاو، قاوە.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: کەنەدا، وولاتانی کاریبی، ئەمەریکا، ئەمەریکای لاتینی، چینی میللی، یابان، فەرەنسا، ئەلمانیا.
- ڕژێمی دەسەلات: پەرلەمانی دیموکراتییە، دەسەلاتی یاسادانان پێك هاتیە لەئەنجومەنی پیران وئەنجومەنی نوینەران. ئەنجومەنی پیران پێك هاتوە لە٢٤ ئەندام. ئەنجومەنی نوێنەران پێك هاتوە لە ٣٦ئەندام.
- پارتە ڕامیارییەکان: پارتی هاوکاری نەتەوەی ئاوەدانکردنەوە. پارتی کۆنگرەی نەتەوەی یەککرتوو. بزوتنەوەی نەتەوەی میللی؛ چەندین بیرو بۆچونی تری بوژانەوەی وولاتەکە لەڕووی ئابووریو ڕامیاریو کۆمەلایەتی وشارستانیەتی لە سەر هەلدان دایە وکاری هاوبەش دەکەن لەپێناو بەرەو پێش بردنی وولاتەکەیان.
- جوگرافیای ولات: دەکەوێتە سەر دەریای کاریبی بەرامبەر کە ناری ڕۆژهەلاتی کۆماری ڤەنزویلا، ڤەنزویلا دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای، وولاتەکەلە دوو دوورگەی گەورە پێکهاتوە گەورەترینیان دورگەی ترینیداد کە سێ زنجیرە چیای تیایە لە ڕۆژهەلاتەوە بۆ ڕۆژئاواو کەرتی دەکات بۆ دوبەش ، زنجیرەیەك

له باكورو زنجيرەكەی تر لەناوەراست وزنجيرەی سێيەمی لە باشووردا، لەنێوان زنجيرە چياكانی باكوروناوەراست دەشتايەكی بە پيتی فراوانی كشتوكاڵی تيايە ، زێيەكانی كارونی و ئۆرتوارو ئۆرويپۆتشی تيايە ، رووبەری دورگەی ترينيداد ٤٨٢٨ كيلۆمەتر چوار گۆشەيەو دورگەی توباگۆ رووبەرەكەی٣٠٠ كيلۆمەتر چوار گۆشەيە كە دەكەوێتە دووری ٣٢ كيلۆ مەتر لەدوورگەی ترينيداد وئەو دوورگە بچوكە دارستانی چرو بە سودی تيايە.

- مێژووی ترينيداد وتۆباگۆ: كۆلۆمبسی ئەسپانی دورگەی ترينيدادی لەساڵی ١٤٩٨دۆزييەوەو دوای ئەوە كەوتە ناو باوەشی ئەسپانيا سەرەرای چەندين شالاوی وولاتانی ئەوروپا بۆ سەر ئەو وولاتەو دوای درا بە بەريتانياله ساڵی ١٧٩٧لەكاتی شەری نێوان بەريتانياو ئەسپانيا، لە ساڵی١٨٠٢ ئەسپانيا دەستی لەولاتەكە كێشاوە، بۆ بەريتانيا بە تەواوی، لە ساڵی ١٨٩٩ ترينيداد يەكيان گرت لەگەڵ تۆباگۆو يەك ژێر دەستەيان پێكهێنا، لە ساڵی ١٩٥٨ ترينيدادو تۆباگۆ بونە بەشێك لە يەكێتی دوورگەی هندی رۆژئاوا تاكو ١٩٧٦/٨/٢١، لە١/٨/١٩٧٦ ترينيدادو تۆباگۆ سەربەخۆييان لە بەريتانيا بەدەستهێناو بوە كۆمارێكی سەربەخۆی ناو كۆمەنولسی بەريتانيا، لە ساڵی ١٩٩٣ئەم وولاتە ووردە ووردە بەرەو كەرتی تايبەتی هەنگاوی نا كە بوە يەكێك لە وولاتەكانی كاريبی و ژيانێكی پر لە ئاسودەی بەخۆدی بەهۆی بەرهەمی نەوت لە دەرياكەو دەسەلاتی بەشێوەيەكی رێكوپێك بەرەو پێشەوە هەنگاوی ناوە تاكو كۆتايی ساڵی ٢٠٠٤.
- ترينيدادو تۆباگۆ ئەندامە لە كۆمەنولسی بەريتانيا، ئەندامە لە نەتەوە يەكگرتووەكان، ئەندامە لە ووتانی ئەمەريكا.

# پيــــرۆ

- ناوی رەسمی: كۆماری پيرۆ.
- پايتەختی: ليما، ژمارەی دانيشتوانی ٧ر١٧٥ر٠٠٠ مليۆن كەسە.
- رووبەری: ٤٩٦ر٢٢٢ ميل چوار گۆشەو ١ر٢٨٥ر٢٢٠ كيلۆمەتر چوار گۆشەيە.
- ژمارەی دانيشتوانی: ٢٥ر٦٥٠ر٠٠٠ مليۆن كەسە، بەپێی ئاماری ١٩٩٩.
- چری دانيشتوانی: ٥١٦ كەس لە يەك ميل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانيشتوانی: ١ر٥٪.
- شارە سەرەكيەكانی: ئەركيبا، ئيكيتۆس، شيكلايۆ.
- بەندەرە سەرەكيەكانی: سالافری، كالاو.
- زمانەكانی: ئەسپانی و كيشوا (هەردووكيان زمانی رەسمين) ئايمارا.
- نژادەكانی: هيندی ئەمەريكی باشوور ٤٥٪، مستيزۆ ٣٧٪، ئەوروپی ١٥٪، نژادەكانی تريش ٣٪.
- ئاينەكانی: كاسۆليكی رۆمانی.
- زانينی خوێندن و نوسين: ٩١٪.
- دابەشی كارگێری: ٢٤ پارێزگاو هەرێمێكی دەستوری.
- كۆی دەرئەنجامی ناوخۆيی: ١١٠ر٥٠٠ مليار دۆلار.

- بەشی تاك لەكۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٧٥٠ر٤دۆلار.
- دراوی: سلی نوی پیرۆ.
- سوپاكەی: ٣٠٠ر١٣٠ هەزار كەسە.
- بەرگری: ٥ر٧٪ لەكۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- زەوی كشتوكاڵی: ٤ر٣٪ لەخاكی وولاتەكە.
- بەرهەمەكانی كشتوكاڵی: قاوە، برنج، پەمۆ، چەوەندەری شەكر، گەنم و جۆ، دانەوێڵەی تر،تەرە، میوەجات، دار ، خوری، سەردین.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٧٥٠ر١٢ ملیۆن سەر، بزن ٣٠٠ر٢ ملیۆن سەر، بەراز ٥٠٠ر٢ ملیۆن سەر، گامێش ٦٧٠ر٤ ملیۆن سەر، پەرەور٨٠٠ر٢٤ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: پاڵاوتنی نەوت، بەرهەمەكانی ماسی، بەرهەمی ڕستن و چنین، خۆشكردنی پێست، دروستكردنی شەكر.
- سامانی سروشتی: زێڕ، ئاسن، نەوت، زیوو، نوحاس، جیوە، فۆسفات، كبیرت.
- بەرهەمی كارەبا: ٨٠٠ر١٦ ملیار كیلۆوات كاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: كەلوپەلی خواردەمەنی، داو دەرمانی پزیشكی، ماشێن و كەلوپەلی گواستنەوە، ئۆتۆمبێل، كیمیا، ئامێرەكانی ئەلیكترۆنی.
- دەرچووەكانی: نەوت، قورقوشم، زیوو، نوحاس، بەرهەمی ماسی، پەمۆ، خوری، گۆشتی ئاژەڵ، زەنگ (تۆتیا)، قاوە، شەكر.
- هاوبەشەكانی بازرگانی: یابان، چین، ئەمەریكا، وولاتانی ئەوروپا، ئەورووپای ڕۆژئاوا، ئەمەریكای لاتینی، وولاتانی ئەفریقیا.
- ڕژێمی دەسەلات: وولاتێكی كۆمارییە، ئەنجومەنی یاسادانان هەڵدەبژێردرێ بۆماوەی پێنج ساڵ كە لە ١٢٠ ئەندام پێك هاتوە، سەرۆك كۆمار بە پێشنیاری گشتی نهێنی هەڵدەبژێردرێت بۆ ماوەی پێنج ساڵ، ئەنجومەنی وەزیران لەڕێكخستنێكی لەباردایە.
- پارتە ڕامیاریەكان: پارتی مەسیحی میللی، پارتی ئازادی پیرۆ، پارتی هاوپەیمانی شۆڕشگێڕی میللی ئەمریكی، پارتی چەپی یەكگرتوو، چەندین گروپ و پارت و بزووتنەوەی تری تیایە كە زیاتر لە حەوت پارت و ڕێكخراوە دەبن.
- جوگرافیای ولات: پیرۆ دەكەوێتە ڕۆژئاوای كیشوەری ئەمەریكای باشوور لەسەر كەناری زەریای هادی بە درێژایی ٢٤١٤ كیلۆمەتر، ئیكوادۆرو كۆلۆمبیا دەكەوێتە باكور، بەرازیل و بۆلیڤیا دەكەوێتە ڕۆژهەلات، شیلی دەكەوێتە باشووری. لە ڕۆژئاوای دەشتایەكی فراوان و پانی تیایە بە درێژی ١٦٠ كیلۆمەتر. لەگەڵ بیابانی ئاكاملی ، چیاكانی ئەندیز دەكەوێتە ناوەراستی پیرۆو زیاتر لە ٢٧٪ ڕووبەری وولاتەكە دەگرێتەوەو تەپۆلكەو كەندو دۆلی بەرزو قولی تیایە، لە ڕۆژهەلاتی چیایەكان كە پرە لەدارستان و گژو گیاو ڕووەك زۆری تیایە لەگەڵ گۆمە ئاوی ئەمازۆن كە نیوەی ڕووبەری پیرۆ دەگرێتەوەو ناوچەی ئەمازۆرن باشترین و بە پیتترین خاكی سودمەندی و ولاتەكە پێك دێنێ.
- مێژووی ولات: ئیمپراتۆریەتی (واری) یەكەم ئیمپراتۆریەتی دەسەلاتداری سەربازی بوە لە نێوان ساڵەكانی ٧٠٠-١١٠٠زاینی لەئیندیز ناوچەی ئێستای ئیمپراتۆریەتی ئەلینكا كە لەساڵی ١٢٠٠ دامەزراو پیرۆ شاری كۆزكۆ لە چیاكانی ئەندیز بارەگای سەرەكیان بووە كە ئیمپراتۆریەتێكی بەهێزو پێشكەوتوو بوەو دەسەلاتی لەسەر زۆربەی زۆری وولاتی پیرۆ و بۆلیڤیاو ئیكوادۆر و هەروەها بەشێك لە كۆلۆمبیاش هەبوە، شیلی و ئەرجەنتین و دوای بوە ئیمپراتۆریەتی ئەلینكاو پەرەی سەند لە بوارەكانی ئابووری و سەربازی وشارستانیەتی

نوێی ئەوکاتەکە ئەندێز گەیشتە ئاستێکی بەرز لە ئەندازیاری بیناسازی و ڕستن و چنین و ڕێکخستنی کۆمەڵ، بەڵام بەرەو لاوازی هەنگاوی نا بەهۆی بونی شەڕی ناوخۆیی بە پشتیوانی داگیر کەری ئیسپانی (فرانسیسکۆ بێزار) لە ساڵی ١٥٣٢ بەهۆی چاو تێبڕینی لە سامانەکان، لە ساڵی ١٥٣٣ دادوەری ئەنیکای گرت و لە سێدارەی داو بوە هۆی چەوساندنەوەی گەلانی ئیمپراتۆریەتەکە لە دوایی بوە ژێر دەستەی دەسەڵاتی ئیسپانیا، شاری لیما کە لە ساڵی ١٥٣٥ دروستکرابوو بوە بارەگای شاڵاو بردنی هێزەکانی ئیسپانیا. لە ساڵی ١٧٨٠ شۆڕشێکی نیشتیمانی بەرپا بوو لە پیرۆ دژی ئیسپانەکان، لە ساڵی ١٨١٠ بارەگای حکومەتی ئیسپانیا گوازراوە بۆ پیرۆ. لەدوای ساڵی ١٨٢٠ بەهۆی خیانەت لەجوڵانەوەی ڕزگاری بەسەرکردایەتی ژەنەراڵ جۆزیە دی سارماتین لە دژی ئیسپانەکان بوە هۆی ڕزگار کردنی ئەرجەنتین و شیلی لە ژێر دەستی ئیسپانەکان و سیمۆن و پۆلیفار ڕزگار کەری ئەمەریکا و سوپاکەی شاڵاوی بردە سەر ئیسپانەکان لە باشوور داو لەژێر دەسەلاتی ئیسپانەکان ڕزگاری کردوو دوا ژێر دەستەی پیرۆ بوو ئەویش سەربەخۆیی وەرگرت لە ئەمەریکای باشوور لە ١٨٢١/٧/٢٨.

لە ئەنجامی شەڕەکانی پیرۆ لەگەڵ شیلی سێ ناوچەی لەدەست داو دوایی بەهۆی کێشەی سنوریان لەگەڵ پۆلیڤیا توانیان بارو دۆخەکە ئارام بکەنەوە بە ڕێکوتنی ساڵی ١٩٠٢، لەنێوان ساڵەکانی ١٩٢٧ تاکو ١٩٤١ پیرۆ توانی هەموو ئەو ناوچانەی کە پێشوو لەدەستی دابو بیگەڕێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی وڵاتەکە. لەنێوان ساڵەکانی ١٩٤٥ تا ١٩٨٥ چەندین کودەتای سەربازی و کێشەو ململانێی ناوخۆی رویداو بوە هۆی گۆڕینی دەسەڵات و کێشەی سنوری لەگەڵ ئیکوادۆر کە ئەو کێشانەش لە گورج و شۆڕی چارەسەرکردندا بوون.

لە ساڵی ١٩٨٥ جارسیا بیریز دەسەڵاتی وەرگرت کە خاوەن بیرو بۆچوونی دیموکراتی بوو هەڵسا بە خۆماڵی کردنی بانکەکانی کەرتە تایبەتیەکان و دەست پێکردن بە چاکسازی لە سوپاو دام و دەزگای میری، لەساڵی ١٩٩٠ برتۆمیموالی راسترەو دەسەڵاتی گرتە دەست لە هەڵبژاردنەکان وبەرو بەهێز کردنی کەرتی تایبەتی داو کەرتی گشتی هەڵوەشاندەوە بوە هۆی تەنگەژەی ئابووری کە ڕێژەی گەیشتە لە ٣٥٠٪ لە ساڵی ١٩٩٢. لەساڵی ١٩٩٣ بریاری دەستوری نوێ درا، لەساڵی ١٩٩٤ بزوتنەوەی ڕێگای گەشاوە دەسەڵاتی وەرگرت.

- پیرۆ ئەندامە لە یەکێتی ڕێکخراوی ئەفریقیا، ئەندامە لەنەتەوە یەککرتووەکان.

# پـۆلیڤـیا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری پۆلیڤیا.
- پایتەختی: لاباز، پایتەختی کار گێڕیە ژمارەی دانیـــشتوانی٠٠٠ر٢٧٥ر١ کەســـە. شـــوکر پایتەختی (قەزائیە).
- رووبـــەری: ١٦٢ر٤٢٤ میـــل چـــوار گۆشـــەو ٥٨٠ر٠٩٨ر١ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە.
- ژمـــارەی دانیـــشتوان: ٠٠٠ر٣٤٠ر٨ ملیـــۆن کەسە، بەپێی زانیاری رۆژنامەکانی ٢٠٠١.
- چڕی دانیشتوانی: ٢٠کەس لە یەک میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٦ر١٪.
- شارە سەرەکییەکانی: سانتا کرۆز، کۆشابمبا، ئەلتۆ. شوکر.
- نژادەکانی: کوشوا ٣٥٪ .مستیزۆ ٢٨٪. هندی ئایمارا ٢٥٪. ئەورووپی ١٥٪.
- زمانـــەکانی: ئیمـــارا، کوشـــوا، ئەســـپانی، (هەرسێکیان زمانی رسمین).
- ئایینـــەکانی: کاســـۆلیکی رۆمـــانی ٩٥٪. پرۆتستانتی ٥٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٨٧٪.
- دابەشـی کـارگێری: ٩ بەشـە (واتـە لەشـێوەی پارێزگا).
- دراوی: پۆلیفانۆ.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ٢٠٠ر٢٢ملیـــار دۆلار.
- بەشـی تـاک: لـە کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٢٠٠ر٣ دۆلار.
- بەرگری ١٠ر٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٤٠٠ر٦٥ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢ر٣٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمـــەکانی کـــشتوکاڵی: کاکـــاو، قـــاوە، گـەنموجۆ، برنج، پەتاتـە، چەوەندەری شەکر، مۆز، تەرە، میوەجات.
- پیشە سـازی: پـالاوتنی نـەوت، جـل وبـەرگ، رسـتن وچـنین. دروسـتکردنی خواردەمـەنی، دروستکردنی ئاسن، دروستکردنی شەکر.
- بەرهـــەمی کاربـــا: ١٨٠ر٣ ملیـــار کیلـــۆوات کاتژمێر.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ١٠٠ر٨ ملیۆن سەر، بزن ٦٠٠ر١ ملیۆن سەر، بەراز ٧٠٠ر٢ ملیۆن سەر، چـێڵ گـامێش ٢٥٠ر٦ ملیـۆن سـەر، پـەرەوەر ٦٠٠ر٣٥ ملیۆن سەر.
- سـامانی سروشـتی: نـەوت، غـازی سروشـتی، قورقۆشم، زەنگ، نوحاس، زێر، زیوو، ئاسـنی خـاو، کبریـت (تەنجستین، بزمـوت ئـەنتیمۆنیا ئەمانـە مـادەی ئاسـنینو بـۆ چـەندین کـاری پیشەسازی بەکاردەهێنرێت).
- بـێ هۆشـکەری قەدەغـەکراو: پۆلیفیـا دووەم وولاتـی جیهانـە لـە دوای پیرۆ لەبەرهـەمهێنانی کۆکاین کە رووبەری ٩٠٠ر٤٧ هکتار لـە خـاکی پۆلیفیا بۆ چاندنی کۆکاین بەکار دێت.
- داهـــاتی دەرەوەی: خـــۆراک، ســـوتەمەنی، کەلوپـــەلی ســـەرمایەداری، کەلوپـــەلی بـــەکار هێنان.
- دەرچـووەکانی: هیـدرۆکربونات، کـانزا، قـاوە، فولی سویا، شەکر، پەمۆ، خوری، پێست، داری دارستانەکان.
- هاوبەشـەکانی بازرگـانی: ئەرجـەنتین، یـەکێتی ئەورویا، ئەمەریکا، یابان.

- رژێمی دەسەڵات: پۆلیفیا کۆمارێکی دیموکراتی یەکگرتوی نوێنەریە، حکومەتی لە سێ لق پێکهاتووە، ئەنجومەنی یاسادانان وئەنجومەنی جێبەجێکردن وئەنجومەنی قەزائی، دەسەڵاتی یاسادانان بەندە بە ئەنجومەنی کۆنگرێسی نیشتمانی کە پێك هاتوە لە ئەنجومەنی پیران وئەنجومەنی نوێنەران، ئەنجومەنی جێبەجێکردن لەدەست سەرۆك کۆماردایە کە بەدەنگی راستەوخۆ هەڵدەبژێردرێت بۆ ماوەی چوار ساڵ ودەسەڵاتی قەزائی بەدەست دادگای باڵایە.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی یەکگرتن‌و تێکۆشانی مەدەنی، پارتی مللی، پارتی بازاری ئازاد، بزوتنەوەی چەپی شۆرشگێر، پارتی کاری دیموکراتی، پارتی جوڵانەوەی شۆرشگێری نشتمانی، پارتی راسترەوی ناوەندی، پارتی چەپی ناوەندی، چەندین بزوتنەوەو رێکخراوی تری هەمە جۆری تێدایە.
- جوگرافیای وڵات: پۆلیفیا دەکەوێتە ناوەراستی رۆژئاوای ئەمەریکای باشوور، لە تەنافەکانی چیای ئەندێزە کە دوو دەوڵەتی ناوخۆی ئەمەرکای باشوورن، پرۆگوای‌و ئەرجەنتین دەکەوێتە باشوورە، پیرۆ وشیلی دەکەوێتە رۆژئاوای، بەرازیل دەکەوێتە رۆژهەڵاتی باکوری، زێیەکانی ئەمازۆن وبلاتانی پێدادەروات، بەشی رۆژئاوای تەپلۆلکەبەلە نێوان هەردوو زنجیرە چیاکانیەتی کە ۸۰٪ دانیشتوانی وڵاتەکەی تیایە لابازی پایتەخت دەکەوێتە بەرزی ۳۶۳۰ مەتر کە بەرزترین پایتەختە لە جیهان. هەروەها دەریاچەی (تین کاکا) ئەویش بەرزترین دەریاچەیە لە جیهان کە بەرزیەکەی ۳۸۱۲ مەترە لەسەر سنووری پۆلیفیا لەگەڵ پیرۆدا، بەڵام بەشی رۆژهەڵاتی ناوەراستی بە دراستانی چر داپۆشراوە.
- مێژووی وڵات: لە ساڵی ٦۰۰ زایینی شارستانیەتێکی بەرزی پرشنگدار پەرەی سەند لە باشووری دەریاچەی تین کاکاو دوای ئەویش لەساڵی ۱۲۰۰ چەندین شانشینی بچوك بچوك پەیدابوون کە زمانەکانیان لە (ئالای مارا) بوو، دوای پۆلیفیا بوە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی ئەکلینازی کۆن کە مەڵبەندەکەی لەپیرۆ بوو، لەدوای هەوڵێکی زۆر لەساڵی ۱۵۳۸ ئیسپانیەکان داگیریان کرد، لەو کاتە بوە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی پیرۆ لە دوای داگیرکردنی ئیسپانیەکان کە هیندیەکان زۆربەی دانیشتوانی بون‌و گۆران بۆ بەندایەتی بەهۆی نالەباری بارودۆخی ئابووری‌و چەوسانەوە ، لەساڵی ۱٥٤٥ لەباشووری رۆژئاوای پۆلیفیا زیوو دۆزرایەوە لە شاری بۆتوتسی کە بوە شارێکی کانزایی زیوو کە گرینگترین شار بوە لە ئەمەریکای باشوور لە ماوەی سەدەکانی حەڤدەم‌و هەژدەم.

لەساڵی ۱۸۲٥ وڵاتی پۆلیفیا رزگاری بوو لەژێر دەسەڵاتی ئیسپانیا ئەویش لەسەر دەستی تێکۆشەری فەنزویلی (سیمۆن پۆلیفار) کە ناوی وڵاتەکەی بەناوی ئەو کرا لەگەڵ ئەنتۆنیۆ جۆزین کە دوایی بوە یەکەم سەرۆك کۆماری پۆلیفیا. لەماوەی ساڵەکانی ۱۸۲٦- ۱۸۳۹، پۆلیفیا بەشێك بوو لە یەکێتی فیدراڵی لەگەڵ بیرۆ بە سەرۆکایەتی سەرۆك پۆلیفیا ئەندری سانتاکرۆز، بەڵام ئەو فیدراڵیەتیە هەرەسی هێنا لەدوای بەرپا بوونی شەر لەگەڵ وڵاتی شیلی و کێشەو ململانێی ناوخۆ بوە هۆی تێکشکاندنی بەهۆی لاوازی‌و بێ هێزی سەرکردایەتی کردن بەرامبەر بە شیلی کە بە هەزار کیلۆمەتری لە خاکی پولیفیای داگیر کرد کە پربوو لەسامانی سروشتی وەك زێرو زیوو ئاسن وبەندەرەکەی

لەدەست بوو کە کەوتبووە سەر زەریای هادیو هەروەها لێوارەکانی دەریای باسفیك ئەویش کەوتە ژێر دەسەڵاتی بەرازیل بەهۆی شەڕی نێوانیان، لە ساڵی ١٩٠٣ پۆلیفیا دەستی لە بەشێکی ناوچەی ئیکر کێشاوە بۆ بەرازیل کە دوڵەمەند بوو بەمەتات، هەروەها لەشەری سێیەم لەگەڵ پاروگوای لەئەنجام ناوچەی شاکۆی لەدەست دا کە ئەویش دەوڵەمەند بوو بەنەوتو رووبەرەکەی زیاتر لە ١٠٠ر٠٠٠ میل چوار گۆشەدە بوو کە ئەویش ناسرابوو بەپاروگوای بەردی.

لە ساڵی ١٩٥٢ شۆرشی نیشتمانی پۆلیفیا بەرپابوو بەسەر کردایەتی ڤیکتۆر بازئیتسۆف بە هاوکاری کرێکارانی کشتوکاڵ ومەنجەمەکان کە بوە هۆی لەناو بردنی دەسەڵاتی سەربازیو بوە سەرۆك وولاتی پۆلیفیاو چاکسازی خستە ناو پۆلیفیا لە بوارەکانی ئابوری وکۆمەڵایەتی وخۆمالی کردنی مەنجەمەکان ودابەشکردنی زەوی بەسەر جوتیاران، لەساڵی ١٩٦٧ جوتیارانی پۆلیفیا دەستیان کرد بەشۆرش بەسەرکردایەتی شۆرش گێری جیهانی (شی گیڤارا) بەلام بە پشتیوانی ئەمەریکا توانرا شۆرشەکە لەناو بەرن وگیڤارا لەئەنجام شەهید کرا، گیڤارا ئەو شۆرشگێرە بووکە هاورێی خەباتی فیدل کاسترۆی سەرۆکی کوبا بوو بەشداری شۆرشی کوباو سەرکەوتنەکەی کردو گەراوە وولاتەکەی خۆی دەستی بە شۆرش کرد. شی گیڤارا لە خێزانێکی زۆر دەوڵەمەند بوو هەر لە منداڵیەوە خولیای هەژارو لێقەوماوان بوو بڕوای بە ژیانی خێزانی نەبوو کە لەسەر بەرژەوەنی هەژاران پەیدای دەکات، لە دوای وەرگرتنی بڕوانامەی دکتۆری ڕووی لە تێکۆشان کرد لەگەڵ جوتیارو کرێکاران بۆ وەدی هێنانی ئامانجەکانیانو دوای شەهید کردنیشی دوژمنانی نەیان توانی بچنە سەر تەرمەکەی ئەوەك تەرمەکەش ڕووبەڕوی دوژمنەکانی ببێتەوە، لەماوەی ساڵەکانی ١٩٦٩ تاکو کۆتای ساڵی ١٩٩٣ پۆلیفیا ئارامی بەخۆیەوە نەدیت بە هۆی کودەتا یەك لەدوای یەکەکانو دەمێك سەربازی ودەمێك مەدەنیو دەمێك دکتاتۆری ودەمێك مام ناوەندی بوو کە ئەمەش بوە هۆی تەنگەژەی ئابووریو لێك ترازانی باری کۆمەلایەتی وچەوسانەوەی چینەکانی مام ناوەندیو هەژارەکان بەهۆی بەرز بونەوەی باری ناهەمواری ئابووریو خاوەن کۆمپانیە تایبەتەکانی کەرتی تایبەتی، هەر ئەمەش بوە هۆی ئەوەی دووبارە لە مانگی /٥/ ١٩٩٧ کۆنگرێسی پۆلیفیا ژەنەراڵ پانزروسواریژی هەڵبژارد بە سەرۆك کۆمار کە دکتاتۆرێکی کۆن بور لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٧١تا ١٩٧٨،لەلایەکی تریشەوە پاڵەپەستۆی ئەمەریکا لەسەر پولیفیا سەکەم کردنەوەی بازرگانی کردن بە کۆکاین.

- پۆلیفیا: ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لەرێکخراوی وولاتانی ئەمەریکا.

# سۆرینام

- ناوی ڕەسمی: کۆماری سۆرینام.
- پایتەختیتی: پاراماریۆ، ژمارەی دانیشتوانی ٣٢٥ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ٦٣ر٢٥١ میل چوار گۆشەو ١٦٣ر٨٢٠ کیلۆمەتر چوار گۆشە یە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٦٤٥ر٥٠٠هەزار کەسە.
- چڕی دانیشتوانی: ١٠ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢ر٥٪.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: ئەلبیتا، نیونیکری، پاراماریۆ، لەهەمان کاتا شارە سەرەکیەکانیەتی
- نژادەکانی: هندی ٣٧٪، کریۆل ٣١٪، جاوانی ١٥٪. نژادەکانی تر ١٧٪.
- زمانەکانی: هۆلەندی (زمانی ڕەسمییە) سرتانگ تۆنگە، ئینگلیزی، هندی.
- ئایینەکانی: مەسیحی ٤٨٪، هندۆس ٢٧٪، ئیسلام ٢٠٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٥٪.
- دابەشی کارگێری: ١٠ هەرێمی کارگێڕیە
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ١ر٥٠٠ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٣ر٥٠٠ دۆلار.
- دراوی: جیلدۆری سۆرینام.
- بەرگری: ٤ر٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ١٢ر٥٠٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ١٥ر٥٪ لە خاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، دانەوێڵە، برنج، مۆز، فەریکە خورما، تەرە، میوەجات، داری دارستانەکان، چەوەندەری شەکر.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ١٥٠ر٠٠٠ هەزار سەر، بزن ٨٥ر٠٠٠ هەزار سەر، چێل ٣٥ر٠٠٠ هەزار سەر، پەلەوەر ٢ر١٠٠ ملیۆن سەر، ماسی.
- سامانی سروشتی: کۆلین، بۆکسیت، زێڕ، ئاسنی خاو.
- پیشەسازی: ئامادەکردنی خۆراك، ئەلەمنیۆم، ماسی قوتی.
- بەرهەمی کارەبا: ١ر٨٠٠ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی سەرمایەداری، کەلوپەلی بەکار هێنان، نەوت، پەمۆ، خواردەمەنی.
- دەرچووەکانی: ئەلەمنیۆم، برنج، ماسی، مۆز، بۆکسیت، ئەلۆمینا.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چین، بەرازیل، بەریتانیا، هۆڵەندا، نەرویج، ترینیداد، ئەڵمانیا.
- ڕژێمی دەسەڵات: وڵاتێکی کۆماریە، ئەنجومەنی یاسادانان بەناوی (ئەنجومەنی ئومە)یە کە پێك هاتوە لە ٥١ ئەندام، ئەنجومەنی جێبەجێکردن پێکهاتوە لە سەرۆك کۆمارو سەرۆك وەزیران. ئەنجومەنی وەزیران و ئەنجومەنی دەوڵەتیش تیایە. کۆماری سۆرینام پێشتر ناسرابوو بە ناوی جویانای هۆڵەندی.
- پارتە ڕامیاریەکان: بەرەی نوێ کە پێك هاتوە لە چوار پارتی یەکگرتوو لە پارتە چەپڕەوەکان ئەویش (پارتی هاوکاری یەکێتی نەتەوەی، پارتی نیشتمانی سۆرینام، پارتی چاکسازی پێشکەوتن، پارتی کاری سۆرینام)، پارتی دیموکراتی نیشتمانی، پارتی چەپی ناوەندی، پارتی جێگرەوەی دیموکراتی، پارتی چەپی ناوەندی.
- جوگرافیای وڵات: سۆرینام دەکەوێتە سەر کەناری باکووری ڕۆژهەڵاتی کیشوەری ئەمەریکای باشوور، جویانا دەکەوێتە ڕۆژئاوای، بەرازیل دەکەوێتە باشووری،

جویانای فەرەنسی دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی. کەنارێکی سەر زەریای ئەتلەسی و چەندین بەر بەستەی ئاوی تیا دروستکراوە کە بۆ کاری کشتوکاڵی بەسوودەو پردێکی دارستانی ناوخۆی هەیە. لەباشووری ٧٥٪ خاکی سۆرینام گردو تەپۆلکەیە وتاکو ئێستاش ئەو گردۆلکانە بەتەواوی دۆزینەوەی تیا نەکراوە، سێ زنجیرە (زێی) سەرەکی تیایە ئەویش زێی کۆرنتین لەسەر سنووری جوانا، زێی مارووین لە ڕۆژهەڵاتی، زێی سۆرینام کە پاراماریبوی پایتەختی کەوتۆتە سەر، چیاکانی تۆمک، هۆمك کەوتونەتە سەر سنوری بەرازیل.

- مێژووی وڵات: لە ساڵی ١٥٩٣ ئەسپانیەکان سەردانی سۆرینامیان کردوە، سۆرینام بەناوی دانیشتوانی کۆنی کراوە کە پێی دەگوترا (سۆرنینی)، لەساڵی ١٦٥٢ هۆڵەندیەکان چەندین کۆمەڵگای نیشتەجێیان لێدامەزراند، هەروەها لەساڵی ١٦٥٣ بەریتانیەکانیش چەندین کۆمەڵگایان لێ دروستکرد. سۆرینام لەساڵی ١٦٦٧ بوە ژێر دەستەی هۆڵەندیەکان. کە لەبەردەستی بەریتانیەکانیان دەرهێنا بەرامبەر نێو ئەمستردام (نیۆیۆرك) بەپێی پەیمانی بریدا، لەساڵی ١٦٨٢ کشتوکاڵی قاوەو چەوەندەری شەکری لێ ئەنجامدرا لەرێگەی ئەو کوێلانەی کە لەئەفریقیا هێنابویانە ناوچەکە. دوایی سۆرینام کەوتە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا لە ساڵی ١٧٩٥ تاساڵی ١٨١٦، لەساڵی ١٨٦٣ ڕژێمی کوێلایەتی لەوڵاتەکە هەڵوەشێنراوەو کرێکاری چینی وهیندی جاریان هێنا بەگرێ بەستە کاریان پێدەکردن. لە ساڵی ١٩٤٨ ئەو ژێر دەستەیە بوە ژێردەستەی هۆڵەندی و دوای (٢ ساڵ) سۆرینام مافی ئۆتۆنۆمی وەرگرت جگە لەکاروباری دەرەوەو بەگری، لەساڵی ١٩٥٤ ناوی بوە جویانای هۆڵەندی، لەساڵی ١٩٦٩ بومە نابنگ بوە سەرکردەیەکێ ناوداری سۆرینام و سەرکردەی پارتی نیشتمانی سۆرینام بوو، هەوڵی بێوچانی بۆ بەرەو باش بردنی وڵاتەکە.

لە ٢٥/١١/ ١٩٧٥ سۆرینام سەربەخۆی تەواوی بەدەست هێنا سەرەرای بەرهەڵستی کردنی دانیشتوان کە لەباشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا روویان تێ کردبوو پێش سەربەخۆی وڵاتەکە بوە هۆی ئەوەی کە نزیکەی ٤٠٪ دانیشتوانی وڵاتەکە بەرەو هۆڵەندا کۆچیان کرد.

لە کودەتای سەربازی ساڵی ١٩٨٠ دەسەڵاتی مەدەنی لابرا، ساڵی ١٩٨٢ بەرەی میللی شۆرشگێری دامەزرا. لەساڵی ١٩٨٨ دەستوری نوێ بریاری بۆ درا لە ژێر هەڵبژاردنی (رامزواك شنكار) سەرۆکی یەکێتی پارتە بەرهەڵستکارەکان و بوە سەرۆك کۆمار، بەڵام دوایی لەلایەن سەربازەکان لە دەسەڵات لابرا لەساڵی ١٩٩٠. لەساڵی ١٩٩٢ پەیمانی ئاشتی لە نێوان حکومەت و ئۆپۆزسیۆن مۆرکرا،دوای ئەوە هێزە شۆڕشگێرەکان لەمانگی/٣/١٩٩٤ هێرشێکی بەرفراوانیان ئەنجامداو بوە هۆی داگیر کردنی بەنداوی( ئافوباکان)، بەڵام لەلایەن هێزی سوپا هێرشەکە هەرەسی پێهێنرا.

- سۆرینام ئەندامە لە رێکخراوی وڵاتانی ئەمەریکا، ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتووەکان.

# جۆیـــانا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری جۆیانای هەرەوەزی.
- پایتـــەختی: جـــۆرج تـــاون، ژمـــارەی دانیشتوانی۰۰۰ر۲۸۸ هەزار کەسە.
- ڕووبـــەری: ۰۰۰ر۸۳ میـــل چـوار گۆشـــەو ۹٦۹ر۲۱٤ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چڕی دانیشتوانی: ۱۱ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۱۳۵ر۱ملیۆن کەسە.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۱۰ر۰٪.
- شارە سەرەکیەکانی: کریفرتن، ڕۆزهول، لیندن.
- بەنـــدەرە ســـەرەکیەکانی: نیـــو ئـــستردام، (ئستردامی نوێ، جۆرج تاون).
- نـژادەکانی: هنـدی دورگـەی هینـدی ڕۆژهـەلات ۵۰٪، پێست ڕەشەکان ۳۲٪،نژادە تێکەڵاوەکان ۱۲٪، هیندی ئەمەریکی ٦٪.
- زمانـــەکانی: ئینگلیـــزی، (زمـــانی ڕەسمیـــە) زاراوەی هیندی ئەمەریکی.
- ئایینـــەکانی: مەســـحی ٦۰٪، هندۆســـی ۳۳٪، ئیسلام ۷٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ۹۵٪.
- دابەشی کارگێری: ۱۰ پارێزگای هەرێمیە.
- کـــۆی دەرئـــەنجامی نـــاوخۆی: ۸۵۰ر۱ ملیـــار دۆلار.
- بەشـــی تـــاك لـــە کـــۆی دەرئـــەنجامی نـــاوخۆی: ۷۰۰ر۲ دۆلار.
- دراوی: دۆلاری جویانا.
- بەگری: ۳ر۲٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ۵۰۰ر۱۷ هەزارکەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ۱ر۲٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، دانوێڵە، برنج، چـــەوەندەری شـــەکر، داری دارســـتانەکان، هەنگوین.
- سـامانی ئـاژەڵی: مـەر ۰۰۰ر۱٤٤ هـەزار سـەر، بـزن ۰۰۰ر۱۷۵ هـەزار سـەر، چێڵ ۰۰۰ر۲۳۳ هەزار سەر، پەرەوەر ۳۰۰ر۱۲ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: دەرهێنـانی بەرهـەمی سروشتی، دروســتکردنی شــەکر، پــالاوتنی هــەنگوین، بەرهەمی ڕستن وچنین،
- بەرهـــەمی کارەبـــا: ۳۵۰ ملیـــۆن کیلـــۆ وات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: ئەڵماس، زیـوو، بۆکسیت، کبریـت، بەرهـــەمی تـــر، دار، بەرهـــەمی شـــیر، ماسی، ئەرپیان.
- دەهـــاتی دەرەوەی: نـــەوت، خواردەمـــەنی، بەرهەمی پیشەسازی، ماشێن و ئۆتۆمبێل.
- دەرچـووەکانی: زێـر، ڕوم، هـەنگوین، شـەکر، برنج، ماسی، دار، بۆکسیت.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چین ، ئەڵمانیا، کەنەدا، ئەمەریکا، ترینیداد، چینی میللی.
- ڕژێمـــی دەســـەڵات: وولاتێکـــی کۆماریـــە، ئەنجومـــەنی یاســـادانانی بـــەناوی (کۆمەڵـــەی نیشتمانی) کە پێکهاتیە لە ۵۲ ئەندام بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێن. ئەنجومەنی وەزیران لـە ۱۳ وەزیـر پێـك هـاتوە و سـەرۆك کۆمـار سەرۆکایەتی دەکات.
- پارتە ڕایمیاریەکان: مەبدەئەکانی شۆشیالستی نەتـەوەی، پـارتی میللـی پێـشکەوتن، پـارتی بنکەی هینـدی، پـارتی چەپ، پـارتی کۆنگرەی نیشتمانی گەل.
- جوگرافیـای وولات. جویانـا دەکەوێتـە باکوری ڕۆژهـەڵاتی ئەمـەریکای باشـوور، فـەنزویلا دەکەوێتـــە ڕۆژئـــاوای، بـــەرازیل دەکەوێتـــە ڕۆژئـــاواو باشـــووری، ســـۆرینام دەکەوێتـــە ڕۆژهـەلات، جویانـا گـەورەترین وولاتـە لـە سـێ جویانـــای بـــەریتانی و جویانـــای فەرەنـــسی جویانـــای هۆڵەنـدی(ســۆرینام)، لــە جویانـا

تۆرێکی زێی باشی تیایە کە لە باکور دێتە خوارێ بەرەو باشوور. خاکی وڵاتەکە زۆربەی دارستانی کەمەرەییە. هێلیکی کەناری بەپیتی هەیە کە پانیەکەی ٤٠ میل درێژەو بۆ کشتوکاڵ زۆر سوودمەندە کەلە ٩٠٪ دانیشتوانی لەو هێلە دەژین، ئەویش کە لەناوچە دارستانەکانی جیادەکاتەوە لەگەڵ ناوچەی کەناری وناوچەی سافتای پڕ لەگژو گیاو مێرگ، کەش و هەوایەکی مام ناوەندی هەیە لەوەرزەکان .

• مێژووی وڵات: جۆیانا مانای خاڵیکی شاوی زۆربێ کەشەم وشەیەش لە زاری دانیشتوانی رەسەنی کۆنی ناوچەکە بەکار هێنراوە کەهندی ئەمەریکی بوونە.

(کریستۆفەر کۆلۆمبس) لە ساڵی ١٤٩٨ سەردانی ئەوناوچەیەی کردوە. لەساڵی ١٦٢٠ کارمەندانی کۆمپانیای رۆژئاوای هیندی هۆڵەندی جێنشینی بووینەو بنکەی چەکداری لێدامەزراندوەو زۆر لە ئەفریقیەکانی بۆ لایەنی خۆ راکێشاوە. لەدوای ماوەی دەسەڵاتی فەرنسا بەریتانیا داگیری کرد لە دوای شەری ناپلیۆنیەکان لە ساڵی ١٨١٤ هەڵسا بەکرینی (میرارا وبربیکاو ئەسکیبۆ) ، لەساڵی ١٨٣١ جویانا بوە ژێر دەستەی بەریتانیا بەناوی جۆیانای بەریتانیا، لەساڵی ١٨٣٤ رژێمی کۆیلەی لێ هەڵوەشاندەوەو کرێکارانی چینی وهیندی روویان تێکرد بە گرێ بەستە کاریان دەکرد. لە شەستەکانی سەدەی نۆزدەم زێر دۆزرایەوە.

بە دروست بوونی کێشەی نێوان جۆیانای بەریتانی و فەنزویلا لەسەر زەویەکانی کە کەوتبوونە رۆژئاوای زێی ئەسکیبۆ بەڵام لەرێگەی دادگای نێو دەولەتی ئەوناوچەیە بۆ ناو جۆیانا گەراوە لەساڵی ١٨٩٩.

جۆیانا لەساڵی ١٩٥٢ مافی ئۆتۆنۆمی ناوخۆی لە بەریتانیا وەرگرت، لە ساڵی ١٩٥٣ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی یاسادانان ئەنجام درا ئەویش بەسەرکەوتنی پارتی پێشکەوتنی گەلی جەلیرە کە کۆچبەرە هیندیەکان دەنگیان پێدان. بەڵام لەدوایی بەریتانیا دەستوری راگرت وحکومەتی کاتی پێک هێنا لە ترسی وەرگرتنی دەسەڵات لەلایەن کۆمەنیستەکان، لەساڵی ١٩٦١دکتۆر شارس جاجانکە دکتۆری ددان بوو بوە سەرۆک وەزیران کە سەرۆکی پارتی پێشکەوتنی گەڵ بوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٦٤ لە دەسەڵات لابراو فوربس بونهام سەرۆکی پارتی کۆنگرەی نیشتمانی گەڵ بوە سەرۆکی کاتی پارتەکەی و پارتی پێشکەوتنی گەڵ. لە ١٩٦٦/٥/٢٦ جۆیانا سەربەخۆی تەواوی وەرگرت لە بەریتانیا وناوی گوردرا لە جۆیانای بەریتانی بۆ کۆماری جۆیانای سەربەخۆ، بەڵام هەر بەئەندامی کۆمەنولسی بەریتانیا مایەوە.

لەساڵی ١٩٨٩ رێکەوتنی ئاشتبونەوەی لەگەڵ فەنزویلا مۆرکرد بەڵام دوای ئەوە کێشە دروست بوو لەسەر سنور لەگەڵ سورینام. لەهەڵبژاردنەکانی پەرلەمان لەساڵی ١٩٩٢ سەرۆکی پارتی شادی جاجان بوە سەرۆک کۆمارو دەستی کرد بەگۆرینی کەرتی گشتی بۆ کەرتی تایبەتی ئابووری، لەمانگی/٥/١٩٩٧ جاجان کۆچی دوای کرد سموئیل هیندی جێگەی گرتەوە، لەمانگی/ ١٢/١٩٩٨ هاوسەرەکەی جاجان بە سەرۆک کۆمار هەڵبژێردرا بەڵام بەهۆی بەربەرچ دانەوەی دەستی لەکار کێشاوە لە مانگی/٨/١٩٩٩بەهارات جدیۆ جێگەی گرتەوە کە بچوکترین سەرۆک دەوڵەت و تاکو کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤هەر لە دەسەڵات بوو.

• جۆیانا ئەندامە لەنەتەوە یەکگرتووەکان، ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە رێکخراوی وڵاتانی ئەمەریکا.

# فەنزویلا

- ناوی ڕەسمی: کۆماری فەنزویلا.
- پایتەختی: کاراکاس، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٨٩٥ر٣ ملیۆن کەسە.
- ڕووبەری: ١٤٣ر٣٥٢ میل چوار گۆشەو ٠٥٠ر٩١٢ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٧٦٥ر٢٤ملیۆن کەسە، بەپێی بلاوکراوەی ڕۆژنامەکانی ٢٠٠٢.
- چڕی دانیشتوانی: ٧٠ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٣ر٢٪.
- شارە سەرکیەکانی: فالینسیا، فزکیبۆ.
- بەندەرە سەرەکیەکانی: بۆرتوکابیلۆ، لاگۆیرا، مرکیبۆا.
- دابەشی کارگێری: ٢٢ پارێزگایە + هەرێمی کاراکاسی فیدراڵی + ٧٢ دورگەی سەربە کاراکاسی فیدراڵی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٣٢٠ر١٨٥ ملیار دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٥٠٠ر٨ دۆلار.
- دراوی: بۆلیفر.
- بەرگری: ٢ر٥٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٥٠٠ر٩٠ هەزار کەسە.
- نـژادەکانی: مستیزۆ ٦٨٪، ئەسپانی و پورتوگالی و ئیتالی ٢٠٪، پێست سپیەکان ١٠٪، هیندیە ئەمریکیەکان ٢٪.
- زمانەکانی: ئەسپانی (زمانی ڕەسمییە) بەلام زمانەکانی تریش قەدەغە نییە هەر نەتەوەیەك کاروباری پێ هەڵدەسوڕێنێ.
- ئاینەکانی: کاسۆلیکی ڕۆمانی.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٩٠٪.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر٤٪ لەخاکی وولاتەکە.
- بەرهەمەکانی کشتوکاڵی: گەنم و جۆ، دانەوێڵە، برنج، مۆز، گەنمەشامی، چەوەندەری شەکر، تەرە، میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٠٠٠ر٨٤٥ هەزار سەر، بزن ١٥٠ر٣ ملیۆن سەر، چێڵ و گامێش ٧٦٠ر١٥ ملیۆن سەر، بەراز ١٥٠ر٤ ملیۆن سەر، پەرەور ١٢٥ ملیۆن سەر.
- پیشەسازی: دەرهێنانی ئاسن، پۆلا، بەرهەمی نەوت، ڕستن و چنین، دروستکردنی شەکر.
- بەرهەمی کارەبا: ٥٠٠ر٧٥ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- سامانی سروشتی: نەوت، گازی سروشتی، ئاسن، زێڕ، بۆکسیت، کبریت، فۆسفات.
- داهاتی دەرەوەی: ماشێن و کەلوپەلی پیشەسازی، کیمیا، پێداویستی خۆراك.
- دەرچووەکانی: نەوت، ئاسنی خاو، بۆکسیت، شەکر، پێست، گۆشتی ئاژەڵ.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چین، ئەڵمانیا، کوبا ، بەرازیل، ئیتالیا، ئەمەریکا، چەندین وڵاتی عەرەبی و ئەفریقی.
- ڕژێمی دەسەلات: کۆمارێکی فیدرالییە. پەرلەمانی (کۆنگرێس) پێك هاتوە لە دوو ئەنجومەن (ئەنجومەنی پیران کە لە ٥٠ ئەندام پێك هاتوە و ئەنجومەنی نوێنەران کە لە ١٩٩ ئەندام پێك هاتوە)، بە پێشنیاری گشتی هەڵدەبژێردرێن بۆ ماوەی پێنج ساڵ. هەروەها سەرۆك کۆمار بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێ. سەرۆك کۆمار نابێ بۆ جاری دووەم خۆی هەڵبژێرێت تەنیا لەدوای دە ساڵ بەسەر هەڵبژاردنی یەکەمیدا تێنەپەرێ.

- پارتە رامیاریەکان: پارتی بزوتنەوەی رووەو سوشیالستی، پارتی کێشەی رادیکاڵی، لابالی چەپ رەوی، کۆمەڵەی فراوانی هاوکاری، پارتی کۆمەڵایەتی مەسیحی، پارتی کاری دیموکراتی، پارتی چەپی ناوەندی، چەندین پارت و گروپ و بزوتنەوەی تری تیایە بەپێی بیرو بۆچوونەکانیان خەبات دەکەن بۆ بوژانەوەی وولاتەکەیان.
- جوگرافیای ولات: فنزویلا زۆربەی کەناری باکوری ئەمەریکای باشور دەگرێتەوە لەسەر دەریای کاریبی، کۆلۆمبیا لە رۆژئاوای، بەرازیل لە باشوری، جۆیانا لە رۆژهەلاتی. زنجیرە چیاکان فنزویلا دابەش دەکات بۆ چوار ناوچەی جیاواز. یەکەمیان نزمایەکانی مرکیبۆ، دووەمیان ناوچەی چیایە لە باکورو باکوری رۆژئاوا، سێیەم گۆمەکانی زێی ئۆرینوکۆ، لە باکوری دەشتایەکانی ئیلتاری فروانە کە گژوگیاو روەک دای پۆشیوە، لە باشورو باشوری رۆژهەلاتی ناوچە دارستانەکە کە زەویەکی زۆری داگیر کردوە، چوارەم بەرزایەکانی جۆیانای باشوری ئۆرینکۆ. رووبەری ئەو بەرزاییانە نزیکەی نیوەی رووبەری فنزویلا دەگرێتەوە. زێی ئۆروینۆکۆو لقەکانی نزیکەی ٨٠٪ زەوی فنزویلا ئاو دێر دەکات . لە باشور و رۆژئاوای چیای ئەندیزو دەریاچەی مراکبۆی تیایە کەش و هەوای بەپێی هەڵکەوتەی جوگرافی وولاتەکەیە.
- مێژووی ولات: لە ساڵی ١٤٩٨ کۆلۆمبس فنزویلای لە سەفەری سێیەمی دەریایی فەنزویلای دۆزیەوە، بۆ ساڵی دووەم (ئەلۆن سودی ئەجیدا)ی ئەسپانی سەردانی دەریاچەی مراکیبۆی کرد و ناوی نا فنزویلا (یان فینیسیای بچووک) لەبەر ئەوەی دانیشتوانەکە کە پردیان بەستوونی داردروستکردبوو لەسەر ئاو لەشێوەی خانووی بچووک. لەو ولاتە کۆمەڵگای نیشتەجێی لێدروست نەکرابوو بەشێوەیەکی بەرچاو تاکو دروستکردنی شاری کاراکاس لە ساڵی ١٥٦٧. ئەو شارە کە سیمۆن بۆلیڤار لێی لە دایك بوە، لەساڵی ١٧٨٣ بۆلیفار ئەو سەرکردە شۆرشگێرە بوە کە زۆربەی خاکی فنزویلای رزگار کرد لە ژێر دەسەلاتی ئەسپانیەکان، بۆلیفار توانی ئەمەریکای باشور لەداگیرکەری ئەسپانی رزگار کات و یەکەم نیشتەجێی هەمەجۆری لێدروست بکات ئەمەش لە ساڵی ١٨١٠ دابوو، بەلام ئەوکات نەیتوانی سەربەخۆی وولاتەکە وەربگرێت، بەلام دوایی توانی لە١٨١١/٧/٥سەربەخۆیی فەنزویلا رابگەیەنێ، لە ساڵی ١٨٢١ لە سەرەتا فنزویلا پەیمانی یەکێتی فیدرالی لەگەڵ کۆلۆمبیا مۆرکرد بەلام لەو یەکگرتنە جیابوەوە کۆماری فنزویلای لە ساڵی ١٨٣٠ راگەیاندن، دوای ئەوە نوقوم بوو لە نێوان دوو بیرو بۆچوونی شۆرشگێری و دکتاتۆری کە بوە هۆی بلاوبوونەوەی بێ ئابووری و داپلوسین و تالان و کوشتن و وێران کردن. لەدوای ئەوە پیاوانی سەربازی بە درێژایی ساڵەکانی سەدەی بیستەم دەسەلاتدار بوون و توانیان گرنگی بدەن بە دەرهێنانی نەوت بە پەرەپێدان و جێبەجێکردنی چەندین کاری چاکسازی کۆمەلایەتی. لەماوەی ساڵی ١٩٠٨ تا ساڵی١٩٣٥ ژەنەرال جۆمیز دەسەلاتی گرتە دەست. لەساڵی ١٩٤٦ یەکەم کۆمەڵەی دامەزرێنەر هەڵبژێردرا بۆ نووسینەوەی دەستوری وولاتەکە.

لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٤٧ رۆمولۆ جالیگۆس سەرکەوتنی بەدەست هێنا کە پارتی کاری دیموکراتی پالاوتبووی زۆربەی کورسیەکانی کۆمەڵەی بەدەستهێنا، بەلام لەکودەتایەکی سەربازی لەسەر دەسەلات لابرا

وپڕژێمێکی سەربازی دامەزرا، دوای ساڵی ١٩٥٨ ڕژێمی دیکتاتۆری لەناوبرا، لە ساڵی ١٩٥٩حکومەتەکان لەڕێگەی هەڵبژاردن دەسەڵاتیان وەرگرت، راخابیل رۆدریگوز دەسەڵاتی وەرگرتو ماوەی دا بەپارتی کۆمەنیست کە دابمەزرێتو پەیوەندی لەگەڵ موسکۆ بەهێز کرد. لەدوای وەرگرتنی دەسەلات لەلایەن کارلۆس ئەندریس لە ساڵی ١٩٧٦ توانی چەندین کۆمپانیای نەوت بکاتەوە کە کۆمپانیەکانی ئەمەریکا هاوکاری کردو وڵاتەکە بەرەو بوژانەوەو پەرەسەندن هەنگاوی ناو بوە هۆی بەدەست هێنانی ٩٠٠ر٩ ملیار دۆلار لە بەرهەمی زێر و بەرەو ئاسودەیی کۆمەڵایەتی و بەرەو دیموکراتی و گۆڕینەوەی دەسەلات لە ڕێگەی هەڵبژاردنە دیموکراتیەکان تاکو ساڵی ١٩٩٢ کە کودەتایەکی سەربازی ئەنجام درا، لە ساڵی ١٩٩٣ بیریز دەستی لە کار کێشاوە و فیلاسکۆیز بوە سەرۆکی کاتی وولاتەکە، رفایل کالدیرا لە ساڵی ١٩٩٣ هەڵبژاردرا بەسەرۆك کۆماری فنزویلا بەڵام لە مانگی/٦/١٩٩٤ نیوەی بانکەکان بەهۆی نالەباری بارودۆخە هەڵاتنو لەهەمان کات بەهۆی تەنگەژەی ئابووری، دوای سالێك توانرا مافی دەستوری جێبەجێبکرێت لەزۆربەی هەرێمەکان. لە ساڵی ١٩٩٩ بە یارمەتی لایەنگیرانی شافیز لە هەڵبژاردنەکان سەرکەوتنی بەدەستهێنا، لە دوای سەرکەوتنی شافێز بۆ پۆستی سەرەك کۆمار کە سەرکردەیەکی هەژار پەرست بوو لە هەموو بوارەکانی ژیانو کارو بەرەو پێش بردنی ژیانی گەڵانی فەنزویلا وپشت گویێ خستنی داواکاریو ئامانجەکانی خاوەن خاوەندیەتی سامانی گەورەی هەمەجۆرو بەهێز کردنی پەیوەندی لەگەڵ وولاتانی تازە پێگەیشتوو ودیموکرات بەتایبەتی کوباو وڵاتانی هاو دۆستی کوبا لەئەمەریکای لاتینی ئەمانە هەمووی بوە هۆکاری سەرەکی دژی دەسەلاتی شافێزو ڕوبەروو بوونەوەی لەگەڵ بەرهەلستاکارانی بە پشتیوانی ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانی بە بەربەرەکانێ کردنی دەسەلاتی شافێزو حکومەتەکەی هەتا بەئەنجام دانی کودەتا بەلام نەتوانرا شافێز لە دەسە لات لابەرن بە هۆی لایەنگری بەهێزی لەلایەن گەلانی هەژاری فەنزویلاو تاکو دوا بەرهەلستکار لە دژی شافێز بە ئەنجام دانی ڕاپرسی بۆ مانەوەو نەمانەوەی شافێز لە دەسەلات ئەوەبوو لەسەرەتای مانگی /٩/٢٠٠٤ڕاپرسی ئەنجام درا لەنێوان لایەنگرانی شافێزو بەرهەلستکارانی بەپشتیوانی ئەمەریکاو بەئامادە بونی چەندین لیژنەی تایبەتو چاودێرو ڕۆژنامە نوس لەوانەش جیمی کارتەری سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا ئەنجام دانی ڕاپرسیەکە کە لە بەرژەوەندی شافێز بوو بۆ مانەوەی لە دەسەڵاتو هەلاتنی بەرهەلستکارانی لە خاوەن خاوەنداریەتی سامانی زۆری زەوییو کەلوپەلو کۆمپانیە هەمە جۆرەکان .

- فنزویلا ئەندامە لە نەتەوە یەککگرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی دەرهێنانی نەوت
- (ئۆپیك)، ئەندامە لە ڕێکخراوی وولاتانی ئەمەریکا.

# شـیلی

- ناوی ڕەسمی: کۆماری شیلی.
- پایتـەختی: سـانتیاگۆ، ژمـارەی دانیـشتوانی ۰۰۰ر۷۸۵ر٤ ملیۆن کەسە.
- ڕووبـــەری ۱۳۲ر۲۹۳ میـــل چوارگۆشـــەو ۷۵٦ر٦۲۲ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمـارەی دانیـشتوانی: ۰۰۰ر٥۳٤ر۱٥ ملیـۆن کەسە، بەپێی زانیاری ۲۰۰۱.
- چـڕی دانیـشتوانی: ٥۳ کـەس لەیـەك میـل چوارگۆشە.
- بەنـدەرە گرنگـەکانی: ئـەریکا، ئنتۆفاجـسکا، فلیاریزۆ.
- شارە سەرەکیەکانی: بۆنتی ئالتۆ، تلکا هوانۆ، کۆنسبیون، فیندال مار.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر۱٪.
- زمانەکانی: ئەسپانی (زمانی ڕەسمیە).
- نژادەکانی: سپی پێست، تێکەڵاوی سپیەکان و هیندیـــەکان و ئەمـــەریکا ۹٥٪. هنـــدی ئەمەریکی ۳٪. نژادەکانی تر ۲٪.
- ئایینـــەکانی: کاســـۆلیکی ڕۆمـــانی ۸۹٪. پرۆتستانت ۱۱٪.
- زانینی نوسین وخوێندن:۹٥٪.
- دابەشی کارگێری: ۱۳ هەرێمە واتە پارێزگایە.
- کۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی:۰۰۰ر۱۷۰ ملیـار دۆلار.
- بەشـی تـاك لـەکۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ۷٥۰ر۱۱ دۆلار.
- بەرگری: ٥ر۲ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ۱٥۰ر۹٥ هەزار کەسە.
- دراوی: بیزۆی شیلی..
- زەوی کشتوکالی: ۲ر٥٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ۰۰٦ر۳ ملیۆن سەر، بزن ۰۰۰ر۸۱۰ هەزار سەر، چێڵ و گامێش ۰۰٥ر۳ ملیـۆن سـەر ، بـەراز۸۰۰ر۱ ملیـۆن سـەر، پەرەورر۷۲ ملیۆن سەر.
- بەرهەمـەکانی کشتوکاڵی: گـەنم، جـۆ، پەتاتـە، چەوەندەری شەکر، تەڕە، میوەجات، نۆك، دار.
- سامانی سروشتی: مۆلبیـدینم، ئاسن، نترات، نوحـاس، گـەورەترین وڵاتـە لەبەرهـەم هێنـانی نوحاس کە سەرچاوەیەکی گرنگـە لـە داهـاتی وڵاتەکە.
- پیـشەسازی : بەرهـەمی داری دارسـتانەکان، ئامادەکردنی ماسی، ئاسن، پۆڵا.
- بەرهـەمی کارەبـا: ۰۰٥ر۲۳ ملیـار کیلـۆوات کاتژمێر.
- داهـاتی دەرەوەی: کەلوپـەلی خـاو، کەلوپـەلی سـەرمایەداری، نـەوت، ماشـێن و ئۆتۆمۆبێـل، دانەوێڵە.
- دەرچـــووەکانی:نوحـــاس، ئاســـنی خـــاو، بەرهەمەکانی دار، تەڕەو میوەجات.
- هاوبەشـەکانی بازرگـانی: یـەکێتی ئـەوروپا، بەڕازیل، یابان، چین، ئەمەریکا، بەریتانیا.
- ڕژێمـی دەسـەڵات: وڵاتێکـی کۆماریـە، سـەرۆك کۆمـار بۆمـاوەی هەشـت ساڵ هەڵدەبژێردرێت، کۆنگرێـــسی نیـــشتیمانی کـــە دەســـەڵاتی یاسـادانان لـەدوو ئەنجومـەن پێکهـاتوە ئـەویش ئەنجومەنی پیران و ئەنجومەنی نوێنەران.
- پارتـە ڕامیاریـەکان: پـارتی نوێکردنـەوەی نیشتیمانی، پارتی سۆشیالستی شیلی، پارتی دیمـوکراتی مەسـیحی، پـارتی مـام ناوەنـدی، پـارتی یەکیـەتی دیمـوکراتی، پـارتی چـەپی ناوەنـــدی، پـــارتی دیمـــوکراتی، چـــەندین بیروبۆچـــونی نەتـــەوەی و نیـــشتیمانی و دیموکراتی و کۆمەڵایەتی تری تیایە.
- جوگرافیـای وڵات: شـیلی دەکەوێتـە کـەناری ڕۆژئاوای باشوری ئەمەریکای باشور کە درێژ دەبێتـەوە لەسـەر زەریـای هـادی ، بۆلیڤیـا

دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی ، پیرۆ دەکەوێتە باکووری، ئەرجەنتین دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی. شیلی وڵاتێکی لاکێشی باریکی درێژە بەدرێژایی ٤٠٠٠ کیلۆمەتر لە باکورەوە بۆباشوور. لەگەڵ ئەوەشدا پانیەکەی لەزۆر جێگا دەگاتە ٤٠٠ کیلۆمەترو ١٦٠ کیلۆ مەتر لەزۆر جێگای تر تەسک دەبێتەوە، چیاکانی ئەندیز بەدرێژایی سنوری ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوەو چەندین لوتکەی بەرزی تیایە لەجیهاندا. شیلی سێ هەرێمی سروشتی جیاوازی باشی تیایە، بیابانی ئەتکا لەباکوور کەزۆر دەوڵەمەندە بە بەرهەمەکانی سروشتی لەدۆڵە وشکانیە ناوخۆیەکانی، لەناوەڕاست دۆڵو کەندی کشتوکاڵی بەپیتی تیایە، بەکەش و هەوای دەریای سپی ناوەڕاست و زۆربەی دانیشتوانی تیایە. بەڵام لەباشووردا زۆربەی بارانەو دارستانی چڕو بەسوودی تیایە، دانیشتوانەکەی بەبەخێوکردنی مەڕو ماڵات خەریکن، لەڕۆژهەڵات، لەلایەنی باشووری خاکی شیلی شارەکانی بۆنتا ئەریناس، دوورترین شارەکانی جیهانە لەباشوور، لەدواوەی گەروی ماجەلان و دورگەی تیرا لە دلفۆگۆ کە خاوەنیەتی شیلی و ئەرجەنتین لێك جیا دەکاتەوە. بەڵام دوورترین خاکی لەباشوور لەئەمەریکای باشوورە ئەویش کیب هۆستە.

- مێژووی وڵات: لەبنەڕەتا شیلی ژێردەستەی دەسەڵاتی ئەلنکاس بوە لەبەشی باکووری وڵات. بەڵام بەشی باشووری ژێردەستەی هیندیە ئۆرکانیەکان بوەو بەردەوام دژی داگیر کەرانی بێگانە بوونە تاکو سەدەی نۆزدەهەم، لەساڵی ١٥٤١ (بدوردی ڤالیدیڤیا) توانی بەشێك لەشیلی داگیر بکات و شاری سانتیاگۆ دامەزرێنێ سەرەڕای ئەوەی دانیشتوانە ڕەسەنەکان بەرگریان لە وڵاتەکەیان دەکردو تا ساڵی ١٥٥٣ لەلایەن ئاراکۆنیەکان تیرۆرکرا، لەساڵی ١٧٧٨ شانشینی ئەسپانیا دادوەرێکی دامەزراند بۆ حوکمڕانی کردنی شیلی. لەساڵی ١٨١٠ شیلی مافی ئۆتۆنۆمی وەرگرت لەوکاتە ناپلیۆن توانی شانشینی ئەسپانیا لەناوبەریت بەڵام دوای ئەوەلە ساڵی١٨١٤ ئەسپانیا توانی دەسەڵات بگەڕێنێتەوە شیلی. شیلیەکان توانیان لە ١٨١٨/٩/١٨ سەربەخۆیی لەئیسپانیا وەرگرن بەسەرکردایەتی (هیجینز) بەدادوەری باڵای وڵات و توانی بنەماکانی دەوڵەت دابمەزرێنێ بەڕژێمی دوو پارتایەتی و حکومەتی ناوەندی تا ساڵی ١٨٢٣ تائەوکاتەی ناچارکرا دەست لەکار بکێشێتەوەو بوە هۆی بەرپابونی شەڕی ناوخۆ لەنێوان پارێزگاران و لیبرالیەکان؛ دوای دەسەلاتی یەکێتی فیدرالیان دامەزراند بەڵام ئەویش دوایی کۆتایی هات بەسەرکەوتنی پارێزگاران. لەساڵی ١٨٣٣ دەستوری دکتاتۆری دەرچوو بە یەکیەتی وڵاتو ئایینی کاسۆلیکی ڕۆمانی کردە ئاینی ڕەسمی وسەرەك کۆمار دەسەلاتی بەزۆری وەرگرت بەرامبەر بە مافی هەڵبژاردن و مافی پیاوانی ئایینی و خاوەن زەویەکانی مسۆگەرکردبوو، چەوسانەوەی جەماوەر بەرەو توندو تیژی هەنگاوی دەنا، لە شەڕی باسفیکی ١٨٧٩ شیلی توانی پیرۆو بۆلیڤیا ببەزێنێو سنوری خاکی خۆی فراوان بکات بەخاکی بۆلیڤیا لەناوچەی ئنتۆ ماجستا کە یەکەم دەرگای بۆلیڤیا بوو بۆ سەر دەریا. لەساڵی ١٩٢٠ (سندری یلما) هەڵبژێردرا بەسەرۆك کۆمار کە پیاوێکی لیبرالی بوو دەستی کرد بەچاکسازی کۆمەڵایەتی، لەساڵی ١٩٢٥ دەستوری نوێ ڕاگەیاندراو دەسەڵاتی سەرۆك کۆمار زیادکراو دەوڵەت و ئاینی لێك جیا کردەوە، کودەتای سەربازی لە ١٩٢٧ ئەنجام دراو وڵاتی شیلی بەرەو دکتاتۆریەت هەنگاوی نا تابوە هۆی دابەزینی نرخی دەرچوەکان وبوە هۆی تەنگەژەی ئابووری و

ڕوخانی ئابووری ، لە ساڵی ١٩٣٢ دوبارە (ئەلسندریلما) هەڵبژێردراوە بەسەرۆك کۆمار ، لەساڵی ١٩٣٨ بەرەی میللی شیلی دەسەڵاتی وەرگرت کە پێك هاتبون لەڕادیکالی و سۆشیاستەکان و کۆمۆنیستەکان، لە دوای ساڵی ١٩٤٧ کۆمۆنیستەکان دەستیان کرد بەخۆپیشاندان و خەبات کردن دژی دەسەڵاتداران تا جموجوڵی ڕاگیرا لە ساڵی ١٩٥٨. لەساڵی ١٩٧٠ (سلڤادور ئەلندی) کە مارکسی بوو هەڵبژێردرا بەسەرۆك کۆمار کە یەکەم مارکسی بوو لەجیهان لەڕێگەی هەڵبژاردن دەسەڵات وەرگرێ و دەستی کرد بە پرۆگرامێکی رادیکالی فراوان بۆ بەرەوپێش بردنی وولات لەهەموو بوارە جۆراوجۆرەکانی ، بەڵام سەرۆك سلڤادور ئەلندی تیرۆر کرا لەلایەن کودەتاکەرەکان کە سیخوڕەکانی ناوەندی ئەمەریکا پشتیوانی لێ دەکردن ، لەدوای وەگرتنی دەسەڵات لەلایەن (ئۆجستۆ بینۆشیە) بە پشتیوانی ئەمەریکا شیلی بەرەو ئاڵۆزترین بارودۆخ هەنگاوی نا لەدەسەڵاتی دکتاتۆری و تەنگەژەی ئابووری و گرتن و کوشتن و داپلۆسین بەردەوام بوو تاکو ساڵەکانی ١٩٩٤ کە ئەدوارد فری جێگەی گرتەوە، لە ١٦/١٠/١٩٩٨ پۆلیسی بەریتانیا بینۆشەیان دەستگیرکردو وەك تاوانباری دژبە مرۆڤایەتی لەماوەی دەسەڵاتەکەی کە نزیکەی ٣٥٠ر٠٠٠ هەزار کەس کوژران لە گەڵی شیلی خەباتگێڕ،هەرچەندە وولاتی شیلی بەرەو بوژانەوە هەنگاو دەنێ بەلام ئاسەورای ناهەمواری بینۆشیە کاردانەوەی خۆی کردیە هەرچەند تاکو کۆتایی ساڵی٢٠٠٤دادگا بەردەوامە لە لێکۆڵینەوەی کردەوەکانی کەچی لەبەر نەخۆشی و گەورەیی تەمەنی بینۆشیە نەتوانراوە دادگاییەکە کۆتایی بێت.

- شیلی ئەندامە لەنەتەوە یەککگرتووەکان، ئەندامە لە ڕێکخراوی وولاتانی ئەمەریکا.

# کیشوەری ئوسترالیا

# ســـــاموا

- ناوی ڕەسمی: وڵاتی ساموای سەربەخۆ
- پایتەختی: ئابیا، ژمارەی دانیشوانی ٧٠٠ر٣٥ هەزار کەسە.
- بەندەرەکانی: ئاسۆ، ئابیا
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٢٣٥ هەزار کەسە
- ڕووبەری: ٠٢٩ر١ میل چوار گۆشەو ٨٣١ر٢ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چڕی دانیشتوانی: ٢٢٦ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا
- بوژانەوی دانیشتوانی: ٢ر١٪ .
- نــــژادەکانی: ســـــاموانی ٩٤٪ نەتـــــەوەی تێکەڵاو ٦٪.
- زمانـەکانی: سوانی وئینگلیـزی (هـەردووکیان زمانی ڕەسمین).
- ئاینیەکانی: مەسیحی ٩٩٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٩٪.
- دابەشی کارگێری: ١١ هەرێمی کارگێڕیە.
- دراوی: قالا.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥١٠ ملیۆن دۆلارە.
- بەشـی تـاك لـە کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ٦٥٠ر٢ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢ر١٩٪ لە خاکی وڵاتەکە.
- بەرهـەمی کـشتوکاڵی: دانەوێڵـەی جۆراوجـۆر، مۆز، کاکاو،گیزی هیندی، تەرە، میوەجات.
- سـامانی ئـاژەڵی: سـامانی ئـاژەڵی هەیـە بـەڵام بـەهۆی بـچوکی وڵاتەکـەو کـەمی ژمـارەی دانیشتوانی نا توانرێت ڕێژەی ئاژەڵ لـە هـەموو جۆرەکانی دیاری بکریت بە هۆی کەمیەوە.
- پیـشەسازی: ئامـادەکردنی گۆشـتی ماسـی، ئامادەکردنی خۆراك، گەشت وگوزار.
- داهـاتی دەرەوەی: کـەلو پـەلی خـۆراك، کـەلو پەلی دروستکراو، ماشێن.
- دەرچوەکانی: کاکاو، زیتە، گیزی هیندی، داری دارستانەکان.
- هاوبەشـەکانی بازرگـانی: یـەکێتی ئـەوروپا، ئەمریکا، فیجی، یابان، ئوسترالیا
- ڕژێمـی دەسـەڵات: شانـشینی دەسـتوریەو سـەرۆکی وولات شانشینە نـاوی (تانوما فیلـی دووەمـە) دەسـەڵاتدارە لـە سـاڵی ١٩٦٢ تـاکو ئێستا، ئەنجومەنی یاسادانان لە٤٩ ئەندام پێك هاتووە کە زۆریان لەسەرۆك هۆزو تیرەکان.
- پارتــە رامیاریــەکان: پــارتی بوژانـــەوەی نیشتمانی، پارتی پاراستنی ماف مرۆڤ.
- جوگرافیـای وڵات: سـاموا کۆمەڵـە دورگەیەکـە دەکەوێتـە زەریـای هـادی لەباشـوور بەدرێـژایی ٢٦٠٠ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژهەڵاتی شـاری ئۆکلانـدە، لـە بـاکوری نیوزیلەنـدە، لەباشـووری ڕۆژئاوای فیجیە، لەباشووری تۆنگایە.
- مێژووی وڵات: زیـاتر لـە دوو هـەزار سـاڵ پێش ئێـستا گـەلی بـۆلینجن نیـشتەجێی ناوچـەکە بـوون، لـە کۆتـای سـەدەی نـۆزدەم کێشەو مـل ملانێ پەرەی سەند لەنێوان ئەمریکاو بـەریتانیا بەهۆی بەرژەوەنـدی تایبـەتیان لەسـەر ناوچـەکە بــەڵام لـــە پـــەیمانی ســـاڵی ١٨٩٩ ئـــەو کێشەوململانێیە کۆتایی پێ هات وبەرژەوەندی ئەمریکا زیـاتر گرنگـی پێـدرا لـە ناوچـەکە. لـە سـاڵی ١٩٤٧ سـاموا کەوتـە ژێـر ئامۆژگـاری نەتـەوە یـەکگرتوەکان بـەهۆی کێـشەی نێـوان ئەڵمانیاو نیوزیلەنـدە لـەدوای جـەنگی یەکـەمی جیهان،لە ١٩٦٢/١/١ ساموا سـەربەخۆی خـۆی بەتـەواوی وەرگـرت، لـە سـاڵی ١٩٩٧ حکومـەت ناوی وولاتەکەی لە ساموای ڕۆژ ئاوا گوری بۆ ساموا.
- سـاموا ئەندامـە لـە کۆمەنوڵـسی بـەریتانیا، ئەندامە لە نەتەوەیەکگرتوەکان.

# ڤـانواتـــۆ

- ناوی رەسمی: کۆماری ڤانواتۆ.
- پایتـەختی: بـۆرن فـیلا، ژمـارەی دانیـشتوانی ۰۰۰ر۳۵ هەزار کەسە.
- بەندەرەکانی: فوران، بۆرن فیلا.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۰۰۰ر۱۵۰ هەزار کەسە
- رووبەری: ۷۰۰ر۵ میل چوار گۆشەو ۱٤ر۷٦۳ کیلومەتر چوار گۆشەیە.
- چری دانیشتوانی: ۲۷۷ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- نژادەکانی: میلانیزیا ۹٥٪، فەرەنسیەکان ٤٪ .
- زمانــەکانی: فەرەنــسی، ئینگلیــزی، بیلامـــا، هەموویان زمانی رەسمین.
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی رۆمانی، برۆتستنتیە، ئینجلیکان، لەگەڵ بیروڕای ناوخۆی.
- زانینی خوێندن ونووسین: ۳۰٪.
- دابەشی کارگێری: ٦ پارێزگایە.
- دراوی: ڤاتۆ.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۲۳۲ ملیۆن دۆلارە.
- بەشــی تــاك لــە کــۆی دەرئــەنجامی نــاوخۆی: ۳٥۰ر۱ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ۳ر۲٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهــەمی کــشتوکاڵی: قــاوە، گیــزی هنــدی، دانەوێڵە، تەرەو میوەجات، کاکاو، چەوەندەری شەکر.
- سامانی ئـاژەڵی: چێڵ ۰۰۰ر۱٥٥ هـەزار سـەر، پەرەور ۰۰۰ر۳۲٥ هـەزار سەر ، مەروبزن هەیە بەڵام بەهۆی کەمی رێژەی بەراستی نازاندرێت.
- پیشەسازی: دروستکردنی دار، ئامـادەکردنی ماسی، ئامادەکردنی گۆشت.
- بەرهــەمی کارەبـا: ۰۰۰ر۲۲ر٥ ملیـۆن کیلـۆوات کاتژمێر.
- داهـاتی دەرەوەی: کەلوپـەلی خـاو، سوتەمەنی، ماشـێن و ئۆتۆمۆبێـــل، خــۆراك، کیمیـــاوی، دانەوێڵە.
- دەرچوەکانی: ماسی ئامـادەکراو، کاکـاو، قـاوە، دار، گوشتی چێل.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چینی میللی، بــەلجیکا، ئوســـترالیا، هۆلنـــدا، فەرەنـــسا، نیوزیلەندە، چەندین وولاتی تر لەجیهان.
- رژێـمی دەســەلات: ڤـانواتۆ وڵاتێکـی کۆمـاری پەرلەمانیە، لەیەك ئەنجومەنی یاسا دانان پێك هـاتووە کە ٤٦ ئەندامە، ئەنجومـەنی وەزیـران و سەرەك وەزیرانی هەیە.
- پارتــە رامیاریـــەکان: پـــارتی میلانیزمـــی پێشکەوتوو، یـەکێتی پارتە مام ناوەندیـەکان، پـارتی نیشتمانی یـەککرتوو، چەندین گـروپ و پـارتی تـری نیـشتمانی ونەتـەوەی ورامیـاری تێدایە .
- جوگرافیـای وڵات: پێکهـاتوە لـە ۸۰ دورگـەی بچوك کە دەکەوێتەباشووری رۆژ ئاوای زەریـای هـادی، لـە بـاکووری رۆژهــەڵاتی ئوســترالیایە بـەدوری ۱۲۰۰ میـل لـە بـاکووری رۆژهــەڵاتی بریـسبین، ، لـەرۆژئاوای فیجییـە، لـە بـاکووری رۆژئاوای دورگەی سلێمان.
- مێژووی وڵات: فراندیزدی کیرۆسی پورتوگاڵی لـە سـاڵی ۱٦۰٦ تـوانی سـەردانی ئـەو وولاتـە بکات بـەڵام جیمس کۆك تـوانی نـاو نەخشەی وولاتەکە بکێشێت لـە سـاڵی ۱۷۷٤ دوای ئـەو بەریتانیەکان وفەرەنسیەکان کێشەو ململانێی نێوانیان دەستی پێکرد لەسەر ناوچەکە، لە ساڵی ۱۹۰٦ حکومـەتێکی هاوبـەش لـەنێوان فەرەنساو بەریتانیا لەوولاٌت دامەزرا.
- لە دوای ساڵی ۱۹٦۳ بزوتنەوەی رامیاری پێك هــات دژی خاوەندیــەتی ئەوروپیــەکان لەســەر وولاتەکــە. بــەڵام لــە ۱۹۸۰/۷/۳۰ ئاهــەنگی سەربەخۆیان راگەیاند، لە هەڵبژاردنی ساڵی ۱۹۹۱ پارتە مام ناوەندیەکان سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، لە ساڵی ۱۹۹۹ جۆن بۆنی پۆستی سەرۆکایەتی وولاتەکەی گرتە دەست.

# فیجی

- ناوی ڕەسمی: کۆماری دورگەی فیجی
- پایتەختی: سۆڤا، ژمارەی دانیشتوانی ٢١٥ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- شارە گرنگەکانی: سۆڤا، لۆتوکا.
- ژمارەی دایشتوانی: ٨٥٠ر٠٠٠ هەزار کەسە.
- ڕووبەری: ٧ر٠٧٨ میل چوار گۆشەو ١٨ر٣٣٣ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- چری دانیشتوانی: ١١٨ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٢ر٥٪.
- نژادەکانی: فیجیەکان ٥٠٪. هندی ٤٦٪.
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی ڕەسمیە)، فیجی، هندی.
- ئایینەکانی: مەسیحی ٥٣٪، هندۆس ٣٨٪ ئیسلام ٨٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٤٪.
- دابەشی کار گێری: ٤ بەشی کارگێریە.
- دراوی: دۆلاری فیجی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥ر٢٠٠ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٦ر٧٥٠ دۆلارە.
- بەرگری: ٢ر٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ١٢ر٦٥٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ١٠ر٥٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، تەرە، میوەجات، چەوەندەری شەکر، گیزی هیندی
- سامانی ئاژەڵی: مەر ١٥٠ر٠٠٠ هەزار سەر، بزن ٢٢٥ر٠٠٠ هەزار سەر، چێڵ ٢٦٥ر٠٠٠ هەزار سەر، بەراز ١٥٠ر٠٠٠ هەزار سەر. پەرەور ٤ر٥ ملیۆن سەر.
- سامانی سورشتی: نوحاس،زێر.
- پیشەسازی: شەکر، پیشەسازی سوك، گەشت وگوزار، ئامادەکردنی دار، ئامادەکردنی ماسی
- بەرهەمی کارەبا: ٥٦٠ ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی گواستنەوە، کەلوپەلی خۆراك، بەرهەمی نەوت، کەلوپەلی بەکارهێنان، کیمیاوی.
- دەرچوەکانی: ماسی ئامادەکراو، زێر، دار، جل وبەرگ، شەکر.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، ئەمریکا، یەکێتی ئەروپا، ئوسترالیا، چەندین وولاتی تر لەجیهان.
- ڕژێمی دەسەلات: وولاتێکی کۆماریە، دوو ئەنجومەنی تیایە یەکەمیان ئەنجومەنی پیران کە لە ٢٤٢ ئەندام پێك هاتوە، دووەم ئەنجومەنی نوێنەران کە لە ٧٠ ئەندام پێك هاتوە.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی کاری فیجی، پارتی چەپی ناوەند، پارتی بەرەی یەککگرتوی فیجی، پارتی یەکێتی نیشتمانی، چەندین گروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری تێدایە .
- جوگرافیای ولآت: کۆمەڵە دورگەیەکە لە ڕۆژئاوای باشوری زەریای هادی کە ٢١٥٢ کیلۆمەتر دوورە لە باکوری ڕۆژهەلاتی سیدنی، لە ڕۆژئاوایی فانواتۆ، لە ڕۆژهەلاتی تۆنگا
- مێژووی وڵات: وولاتی فیجی پێش زایین دانیشتوانەکەی بۆلنسیونەکان بوونەودوای ئەوان میلانیزیەکان، لە ساڵی ١٦٤٣ بۆ یەکەم جار (ئایل نسمات) سەردانی ناوچەکەی کرد کە لە ڕەسەنا هۆلەندی بوو، سەرەتای سەدەی نۆزدەم ئایینی مەسیحی بووە ئایینی ڕەسمیان، لە ناوەراستی هەمان سەدە لەڕۆژئاوا شانشینی فیجی پێك هاتو لەڕۆژهەلاتی ئیماراتی مەسیحی دامەزرا، لە ساڵی ١٨٥٧ قۆنسلی بەریتانی لێ دامەزرا وهانی کۆچ

بەرانی ئوسترالی ونیوزیلەندی دەداو هاندەدران ڕوویان ئەناوچە کە کرد بۆ پەرەسەندنی کشتوکاڵ بە تایبەتی لایەنی پەمۆ.

لە ساڵی ١٨٧٤ فیجی بوە ژێر دەستەی بەریتانیا لە دوای مل کەچ کردنی شانشینی فیجی، لە ساڵی ١٨٧٧ فیجی بوە بارەگای مەندوبی سامی بەریتانیا لە ڕۆژئاوای زەریایی هادی، لە ساڵی ١٩٠٤ ئەنجومەنی یاسادانان پێك هێنرا بەئامۆژگاری نوێنەری بەریتانیا، لە ١٠/١٠/ ١٩٧٠ فیجی سەربەخۆی ڕاگەیاند لە بەریتانیا و (مارا) لە پارتی هاوکاری بوە یەکەم سەرۆك وەزیران، لە ساڵی ١٩٩٠ دەستوری نوێ ڕاگەیانرا کە مافی هەڵبژاردنی بەهەموو چین وتوێژەکاندالە هەڵبژاردنەکان.

لە ساڵی ١٩٩٩ بۆ جاری یەکەم سەرۆك وەزیرانی هیندی داوای گۆڕینی چەندین بەندی لە دەستوری فیجی ساڵی ١٩٩٠ کرد.

- فیجی ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە خەزنەی نێو دەوڵەتی، ئەندامە لە ڕێکخراوی فوراتی کشتوکاڵی، ئەندامە لە بازرگانی جیهان، ئەندامە لە بانکی نێو دەوڵەتی، ئەندامە لە ڕێکخراوی تەندروستی جیهان.

# نیوزیلەندە

- ناوی ڕەسمی: نیوزیلەندە.
- پایتەختی: ولینگتۆن، ژمارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٤٢٥ هەزار کەسە.
- شارە گرنگەکانی: بالمرستۆن نوری، هامیلتۆن.
- بەندەرەکانی: ئۆکلاند، لینگتۆن، کرایست، تشرتشر دۆندین.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٩٩٥ر٣ ملیۆن کەسە، بەپێی ئاماری ٢٠٠٠.
- ڕووبەری: ٨٨٤ر١٠٣ میل چوار گۆشەو ٥٣٤ر٢٧٠ کیلومەتر چوار گۆشەیە.
- چڕی دانیشتوانی: ٣٦ کەس لەیەك میل چوار گۆشەدا.
- نژادەکانی: ئەورووپی ٨٠٪، ماوری١٧٪.
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی ڕەسمییە) ماوریەکان
- ئاینەکانی: مەسیحی ئینجلیکانی ٣٥٪، مەشیخیەکان ١٨٪، کاسۆلیکی ڕۆمانی ١٥٪، چەندین براوی تری ئایینی تیایە وەك بوزی وهیندی وئیسلام ، کەسانی بێ بڕوای تیایە.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٨٪.
- دابەشی کارگێڕی: ١٦ هەرێمە کە دابەشی ١٥ شارو ٥٩ گەرەك کراوە بە شێوەیەکی ڕێك.
- دراوی: دۆلاری نیوزیلەندی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٥٠٠ر٦٣ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٠٠٠ر١٨هەزار دۆلارە.
- بەرگری: ٣,٥٪ لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی.
- سوپاکەی: ٥٠٠ر٦٠ هەزار کەسە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢ر٩٪ لە خاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، پەتاتە، تەرەو میوەجات، چەوەندەری شەکر، چەندین جۆری تری دانەوێڵە.
- سامانی ئاژەڵی: مەر ٩٠٠ر٢٧ ملیۆن سەر، بزن ٠٠٠ر٢٧٠ هەزار سەر، چێڵ ٨,٧٥٠ ملیۆن سەر، بەراز ٠٠٠ر٣٥٠ هەزار سەر، پەرەور ١٢,٢٠٠ ملیۆن سەر
- سامانی سروشتی: ئاسن، زێڕ، غاز، خەلوز.
- پیشەسازی: ئامادەکردنی خۆراك، بەرهەمی دار، ئامادەکردنی گۆشت، خۆشکردنی پێست،

ئامێر، ئامادەکردنی ماسی، رستن وچنین.

- بەرهـەمی کارەبا: ٣٤٫٨٥٠ ملیـار کیلـۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: کەلوپەلی بەکارهێنان، نەوت وبەرهەمـــەکانی، ئۆتۆمبێـــل، کەلوپـــەلی پیشەسازی.
- دەرچوەکانی: بەرهەمی شیری، خوری، پێست، گۆشتی ئامادەکراو، ئاژەڵی زیندوو.
- هاوبەشـەکانی بازرگـانی: یـەکێتی ئـەوروپا، یابـان، چـینی میللـی، ئوسـترالیا، ئـەمریکا، کۆریای باشوور، تایوان.
- رژێمـــی دەســـەڵات: نیوزیلەنـــدە وڵاتێکـــی پەرلـــەمانی دیموکراتیـــە، ســـەرۆکی وولات شانـــشین (ئـــەلیزابیتی دووەم)ی شانـــشینی بـەریتانیا کـە دادوەرێکـی گشتی نوێنەرایـەتی دەکـات، ئەنجومـەنی یاسـادانان لـە ٩٩ ئەنـدام پێـک هـاتوە، ئەنجومـەنی وەزیـران و سـەرەك وەزیرانی دەسەلاتی جێبەجێکردنن.
- پارتـــە رامیاریـــەکان: پـــارتی نیوزیلەنـــدی نیـشتمانی، پـارتی ئـابووری ئـازاد، پـارتی هاوپەیمانان، پارتی نیوزیلەندی یەکەم، پارتی کـاری نیوزیلەنـدی، پـارتی چـەپی ناوەنـدی، پـارتی نیوزیلەنـدی یـەککرتوو، چەندین گـروپ وپارتی تری نیشتمانی ونەتەوەی ورامیاری و چەپ وراست رەوی تێدایە.
- جوگرافیـای وڵات: نیوزیلەنـدە وڵاتێکـی خـاوەن ســـــەربەخۆیە لـــــەناو کۆمەنولــــــسی بەریتانیا،باشوری دەکەوێتە سەر زەریای هادی بـەدوری ١٢٠٠ میـل لـە باشـووری رۆژهـەلاتی ئوستراليا، نیوزیلەندە لە دوو دوگەری سەرەکی پێـك هـاتوە ئـەویش دورگـەی باکورو دورگـەی باشوور، دورگەی کۆك هەردوو دورگەی باکورو باشـوور لێـك جیادەکاتـەوە، فراوانـی ئـەو دورگەیــە ٢٩٦ کیلۆمـــەترە، دورگـــەی بـــاکور رووبـــەری ١٥٧٧٧ کیلۆمـــەترە ودورگـــەی باشـــووری رووبـــەری ١٥١٢١٥ کیلۆمـــەترە، چەندین کانیاوی نەخۆشی تیایە جار جاریش بورەکانی لێ روودەدات، نزیکترین دراوسێکانی ئوســـترالیا لـــە رۆژئـــاوا، فیجیـــی وتۆنگـــا لـــە باکوریەتی.
- مێژووی وڵات: لە ناوەراستی سەدی سیانزەم هۆزەکانی ماوری بەرەو دوورگە کۆچیان کرد، دورگەکانی نیوزیلەندە کە کۆمەڵەی بۆلینسیەی پێ دەگوترا کە لە بنەرەتا لە رۆژهەڵاتی زەریای هـــادی بوونـــە، ماوریـــەکان داواکاریـــەکانی وڵاتـــانی هۆڵەنـــداو ئیـــسپانیاو بولگاریـــان رەتکـــردەوە بـــۆ دەریاوانـــە کەناریـــەکان کـــە ویـــستویانە رووی تێبکـــەن، نیوزیلەنـــدە لـــە ١٨١١/٧/٥ سـەربەخۆی لەئەسـپانیا وەرگـرت، لە ساڵی ١٨١٥ شاندە بلاوکەرەکانی بەریتانیا سەردانی نیوزیلەندەیان کرد، لە ساڵی ١٨٢٦ کۆمپانیای نیوزیلەندە دامەزرا بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگای نیشتەجێ بوون، بە پێی پەیمانی نێوان نیوزیلەنـدەو بـەرتیانیا، لەسـالی ١٨٤٠ نیوزیلەنـــدە رازی بـــوو لەســـەر ئـــەوەی کـــە بـەریتانیا سـەربەخۆی هـەبێت لەسـەر وڵاتـی نیوزیلەندە.

لـە نێـوان سـاڵەکانی ١٨٤٥تـا ١٨٤٧ شۆرشـە ماوریـــەکان بـــوە هـــۆی ئـــەوەی کـــە زۆر لـــە نیشتمانەکەیان لەدەست بدەن، لە ساڵی ١٨٥١ دەســـتوری ژێـــر دەســـتەی پێـــدرا لـــە دوای هەڵوەشاندنەوەی کۆمپانیای نیوزیلەندی دوای ئەوە مافی ئۆتونومی پێدرا بە تەواوی لە ساڵی ١٨٥٦.

لـــەدوای ســـاڵی ١٨٦٠ دووبـــار شۆرشـــی ماوریەکان نوێ بوەوەو ئەنجامەکەشی بەدەست هێنـانی زۆر لـە دەستکەوت بـوو لەوانـە بـوونی نوێنـەر یـان لـە پەرلـەمان، نیوزیلەنـدە یەکـەم وڵات بووکەمافی ئافرەتی دا بە خۆ هەڵبژاردن لە پەرلەمان وخاوەن دەنگو خۆپاڵاوتنی هەبێت، زۆر کـاری تـری وەك موچە برینەوە بۆ بێکـاران ویارمەتی دانی دایکە منداڵ بوەکان ومنداڵان وبـەخێوکردنی هـەتیوەکان و دیـاری کردنـی کاتـژمێر بۆکـار کـردن کـە ٤٠ کاتـژمێر لـە

هەفتەیەکا.

لە ساڵی ١٩٠٧ نیوزیلەندە مافی پایەی دۆمینوی لە ژێر دەستەی سەربەخۆی لە ناو کۆمەنولسی بەریتانی وەرگرت، لە ساڵی ١٩١٦ پارتی کاری نیوزیلەندی دامەزرا.

لە ساڵی ١٩٤٧ پەرلەمانی بەریتانیا دانی نا بەسەربەخۆی نیوزیلەندە تا لە ناو کۆمەنولسی بەریتانیا، لە ساڵی ١٩٥١ نیوزیلەندە چوە ناو ئوستراليا وئەمریکا بەپێی پەیمانی ئەنزۆس کە تایبەت بوو بەئاسایشی زەریای هادی، لەساڵەکانی ١٩٦٥ تا ١٩٧٣هاوکاری ئەمریکای کرد لە شەری نێوان ئەمریکاو ڤێتنام ، پارتی کاری نیوزیلەندی و پارتی نیشتمانی لەسەر دەسەلاتی بەنۆبە بەرێکەوتن لەدوای ساڵەکانی ١٩٨٥ نیوزیلەندە رامیاریەتی سەربازی گرتە بەر کە بوە هۆی دروست بوونی جیاوازی لەگەڵ فەرەنساو ئەمریکا. لەساڵی ١٩٨٨رێکەوتنی بازرگانی ئازادی لەگەڵ ئوستراليا مۆر کرد، لەساڵی ١٩٩٢ئابلوقەی لەسەر کەشتیە جەنگیەکانی ئەمریکا هەڵگرت لە دەریا. لەنێوان ساڵەکانی ١٩٩٠ تا ١٩٩٣پارتی کارو پارتی نیشتمانی دەسەلاتی بەنۆبەیان دەست پێکرد، لەهەڵبژاردنەکانی١٩٩٦هیچ لایەك سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا کە بولجەر هەر بەسەرەك وەزیران مایەوە. دوای ئەوە (جکی) شیلی یەکەم ئافرەتی نیوزیلەندی بوو لەساڵی ١٩٩٧پۆستی سەرەك وەزیرانی گرتە دەست .

- نیوزیلەندە ئەندامە لە نەتەوەیەکگرتوەکان، ئەندامە لە زۆربەی زۆری رێکخراوە جیهانیەکان کە بەندە لەنێوان وولاتانی ئەوروپای رۆژئاواو وولاتانی تر لەجیهان.

# ئوستراليا

- ناوی رەسمی : یەکێتی وولایەتەکانی ئوستراليا، کێشوەرێکی بیابانیە کەیەك نەتەوە تیای نیشتەجێیە.
- پایتەختی: کانبیرا، ژمارەی دانیشتوانی ٤٢٥ر٠٠٠ هەزار کەسە .
- شارە سەرەکیەکانی: سیدنی، ملیۆن، بریبی، ئەدلید ، فریمانتل، لەهەمان کاتا گرنگترین بەندەرن.
- رووبەری: ٢ر٩٦٧ر١٥٠میل چوارگۆشە و٧ر٦٨٦ر٣٠٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٢٠ر٩٨٧ر٠٠٠ ملیۆن کەسە بەپێی ئاماری ٢٠٠٠.
- چڕی دانیشتوانی: ٧ کەس لەیەك میل چوارگۆشە.
- نژادەکانی: قەوقازیەکان ٩٣٪ ، ئاسیایەکان ٣٪ دانیشتوانی رەسەنی ولات ١٪.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ٥ر٣٪.
- زمانەکانی ئینگلیزی (زمانی رەسمیە) زمانەکانی تری رەسەنی دانیشتوانن.
- ئاینەکانی: ئینجیلکانیەکان کەلایەنگیری کەنیسەی ئینگلیزیە ٢٦٪، کاسۆلیکی رۆمانی ٢٦٪ مەسیحیەکان مەزهەبی تر٢٤٪.
- زانینی خوێندنو نووسین ٩٨٪
- رژێمی دەسەلات: وولاتێکی فیدرالی دیموکراتیە. سەرۆکی دەولەت: شانشین مەلیکە ئەلیزا بیتی دووەمی شانشینی بەریتانیایە. کەدادوەرێکی تایبەت نوێنەرایەتی دەکات.... پەرلەمانی یەککگرتوو لە دوو ئەنجومەن پێك

هاتیە (ئەنجومەنی نوێنەران لە ١٤٦ ئەندام کە بۆ ماوەی سێ ساڵ هەڵدەبژێردرێن بە پێشنیاری گشتی. ئەنجومەنی پیران پێک هاتووە لە ٧٦ ئەندام کەهەڵدەبژێردرێن بۆ ماوەی شەش ساڵ بە پێشنیاری گشتی) بەڵام نیوەی ئەندامانی ئەنجومەنی پیران لەماوەی سێ ساڵ هەڵدەبژێردرێن تەمەنی لە ١٨ ساڵ نابێ کەمتر بێت.

- دابەشی کارگێڕی: ٦ ولایەتە، نیوسوێت ویلز، ڤیکتۆریا، کوینزلاند، سۆن ئوستراليا ، وسترن ئوستراليا ، ، تسامنیا، دووبەشە (بەشی باکوور و بەشی پایتەختی ئوستراليا) بەڵام لەهەر ولایەتێک دەسەڵاتی قەزایی تایبەت بەخۆی هەیە.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی کاری ئوسترالی،مام ناوەندی، چەپی مام ناوەندی، پارتی رزگاری ئوسترالی، پارتی ئوسترالی نەتەوەیی.
- بەرگری: ٢ر٢٪ لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی.
- سوپاکەی: ٤٠٠ر٥٧ هەزار کەسە.
- دراوی: دۆلاری ئوسترالی.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ٠٠٠ر٣٩٤ ملیار دۆلارە.
- بەشی تاک لەکۆی دەرئەنجامی ناخۆیی: ٤٠٠ر٢١ دۆلارە.
- زەوی کشتوکاڵی: ٧٪ .
- بەرهەمەکانی کشتوکاڵی :وولاتێکی سەرەکیە لەناردنە دەرەوەی گەنم ، پەمۆ، میوەجات، چەوەندەری شەکر، برنج، جۆ، تەرە بە هەموو جۆرەکانی.
- بەرهەمی سروشتی: ئاسن کە سێیەم وولاتە لەدەرهێنانی) بۆکسیت، ئۆکسید، ئەلەمنیۆم، زەنگ، قوڕقوشم، خەڵوز، نەوت، غاز، نوحاس، نیکل، یۆرانیۆم.
- سامانی ئاژەڵی: مەڕ ٠٠٠ر١٢٦ ملیۆن سەر، چێڵ و گامێش ٠٠٠ر٢٧ملیۆن سەر، بەراز ٧٠٠ر٢ ملیۆن سەر، پەرەور ٨٣ ملیۆن سەر.
- بەرهەمی کارەبا: ٥ر١٧٥ ملیار کیلۆوات کاتژمێر.
- پیشەسازی: ڕستن و چنین، کەلوپەلی کارەبا، کیمیاوی، ئۆتۆمۆبێل، فڕۆکە، کەشتی، ماشێن، داو دەرمان، جلو بەرگ.
- دەرچووەکانی: لەو وڵاتە گەورانەیە کە دەینێرێتە دەرەوە لە گۆشتی بتلۆو گۆشتی چێل، یەکەم بەرهەم هێنەری خوریە لەجیهان کە ٢٥٪ لەبەرهەمی جیهان پێکدێنێت، زێڕ، خەڵوز، ئەلەمنیۆم، گەنم، ماشێن، کەلوپەلی گواستنەوە، جلو بەرگ، داو دەرمان.
- داهاتی دەرەوەی: بەرهەمی پیشەسازی، کەلوپەلی گواستنەوە، گالیسکە، بەرهەمی پزیشکی و دەرمانخانەیەکان، کیمیای ئەندامی ، کەلوپەلی بەکار هێنان.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: ئەمریکا، یابان، بەریتانیا، کۆریا، نیوزیلەندە، چین، تریاکی قەدەغە کراو لەشاری (تەسمانیا) بەرهەم دێت کەیەکێکە لە پارێزگاکانی ئوستراليا گەورەترین بەرهەمهێنەری تریاکی داوو دەرمانی یاسایی و لەژێر چاودێریەکی توند دایە.
- جوگرافیای وڵات: ئوستراليا دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، هند لەڕۆژئاواو باشووری، زەریای هادی لە ڕۆژهەڵات، زەریای باکووری ئوستراليا دەگەنە یەکتری لەگەڵ دەریای تیمۆرو ئارافورا، نزیکترین دراوسێی ئەندەنوسیایە، بوانیوگینیا لەباکوور، دورگەی سلێمان، فیجی، نیوزیلندا لە زنجیرە چیاکان درێژ دەبنەوە لە باکور بۆ باشوور بە درێژایی کەناری ڕۆژهەڵات، بەشی ڕۆژئاوای کێشوەرەکە تەپولکەو دەشتایی و بەرز دەبێتەوەو دەست پێدەکا بە گردۆلکەی بەرز لەنزیک کەناری ڕۆژئاواو بیابانی فیکتۆریای مەزن دەگرێتە خۆی لە باشوور، بیابانێکی لماوی مەزنی تیایە لەباکور. پەرژینێکی مێرگی تیایە کەدەکەوێتە سەر درێژایی کەنارەکە لەباکوری ڕۆژهەڵات (کەناری کوینولاتی) کە

درێژ دەبێتەوە بەدووری ١٢٤٥ میل کە گەورەترین زنجیرە مێرگە لە جیهان. درێژ بوونەوەی دەشتایەکانی لە کەنداوی کرینتاریا لە باکور بۆ کەناری باشوور. زێی مەری لێ هەڵدەقوڵێ کە بەگەورەترین زێکانی ئوسترالیا دا دەنرێت کەلە نیوسوث و ویلز دێنە خوارێ بە دوری ١٦٠٠ میلو دەرژێتە ناو زەریای هادی، زێیە سەرەکیەکانی تر (زێی دار لینگ و زێی مەرەم بیدجی و لاشلاند)ە، کەش و هەوای گەرم و وشکەو ڕۆژ لەدەرە لە زۆربەی کاتەکان. پلەی گەرمی لەماوین لەزۆربەی ناوچەکان ١٠٠ پلەی هەرمی بەرزە، باکوری ناوچەیەکی وەرزیەو زستانی وشکەو هاوینی باراناویە .

- مێژووی وڵات: کەشتیەکانی هۆڵەندی و پورتگالی و ئەسپانی سەرنجیان ڕاکێشرا بوو بۆ کێشوەری ئوسترالیا لەسەدەی هەڤدەم. هۆڵەندیەکان بەرەو خوارو هەنگاویان تا بۆ کەنداوی کاریفتاریای باکوری کێشوەرەکە لە ساڵی ١٦٠٦ ی زاینی ، گەرۆکی ئینگلیزی جیمس کۆك لە ساڵی ١٧٧٠ کەناری ڕۆژهەڵاتی ئوسترالیای دۆزیەوە لەوکاتەی کە کێشوەرەکە چەندین تیرەی جیاوازی تیادا نیشتەجێ بوو. ئەوناوچەیە ناو نرا بە (ویڵزی نوێ) بە بڕوای ئەو گەرۆکە کەلە کەناری ویڵزی بەریتانیا دەچێت ، دانیشتوانە سەرەتاکان دەستیان کرد بەکۆچ کردن بەرەو لای ئەوانەی کە تاوان باربوون لە سەربازو فەرمانبەری میری کەکرانە ژێر دەسەتەی بەریتانیا بۆ تەمبێ کردنی تاوانباران کە ئێستا ناسراوە بە شاری (سیدنی) بەڵام لەوکاتە ناوی بۆرت جاکسۆن بوو کەزیاتر لە ١٦٠ر٠٠٠ هەزار تاوانباریان جێنشین کرد بوو لە سەدەی هەژدەم تاکو سەدەی نۆزدەهەم کە سەردەمی دۆزینەوەی مەزن دەستی پێکرد لەوانە جۆرج باس وماسیۆ میلندرز هەڵسان بەدۆزینەوەی کەنارەکان ، جگە لە دانیشتنی کەسانی تر هەڵسان بە پەڕینەوە لە چیای شینی (بلۆمونتێن) بە لابردنی ئەو بەربەستە سەرەکیە کە دەوەستا لە پێناو دۆزینەوەی کێشوەری ناوەوە، لە ساڵی ١٨٢٩ ی زاینی ڕۆژئاوای ئوسترالیای خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیو دوایی لە ساڵی ١٨٣٦ باشووری ئوسترالیاشی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

لە ساڵی ١٧٧٠ ی زاینی کۆك نیۆسۆس وێلزی کردە ژێر دەستەو داوای لە بەریتانیا کرد کە مافی خاوەندیەتی ئەنجام بدات، لە ساڵی ١٨٠٤ ی زاینی تاوان بارە ئیرلەندیەکان هەڵسان بە شۆڕش لە ساڵی ١٨٣٩بە گواستنەوەی ئەو تاوانبارانە بۆ وڵات ڕاوەستێنرا، بەریتانیا لە ساڵی ١٨٣٠ مافی خاوەندیەتی بە خۆدا لەسەر کێشوەرەکە بەتەواوی بە دەست پێ کردنی کۆچ لە لایەن پیاوە لیهاتوەکان بۆ وڵات و سەرهەڵدانی کێشەو ململانێی کۆچکردن دەستی پێ کرد، لە ساڵی ١٨١٥ ی زاینی بەریتانیا ماوەی بە ئیسرائلیەکان دابە دانانی دەستور لەناوچە ژێر دەستەکانو ئاوەدان کردنەوەو دان بە مافی ئۆتۆنۆمیان، لەماوەی ١٨٥١ تاکو ١٨٦١ خەڵکی بەرگریان لە خاکی ئوسترالیا دەکرد تاکو ئەوکاتەی زێڕیان دۆزیەوە وبووە هۆی دۆزینەوەی زیاتر لە کاری پشکنین و بوژانەوەی ئابووری. لەماوەی ساڵی ١٨٩٠ هەموو ژێر دەستەکان لە فکتۆریاو نیۆسوس و ویلزی ئوسترالی، تسمانیا و کوینزلاندو وستۆنی ئوسترالیا توانیان مافی ئۆتۆنۆمی بەدەست بێنن، ئەو شەش ناوچە ژێر دەستانە توانیان ببنە ولایەتو دوای ئەوە لە ساڵی ١٨٩١ ولایەتی یەکگرتوی ئوسترالیا دابمەزرێنێ لەنێوانیاندا،ئەو یەکگرتنە توانی دەستور بۆ وڵات دابنێ و کوببنەوە لە داب ونەریتی پەرلەمانی بەریتانیا و تاقی کردنەوەی ئەمریکا لە پێك هێنانی یەکێتی فیدراڵی. لە جەنگی یەکەمی جیهانی ساڵی ١٩١٤ تا ١٩١٨

زیاتر لە ٣٠٠ هەزار ئوسترالی بە ئارەزووی خۆیان چەك هەڵگرن و بچنە گۆڕەپانی شەڕ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بەرەی ڕۆژئاوا بکەنەوە . لە ساڵی ١٩٢٧ بارەگای حکومەت گواستراوە بۆ شاری کانبیرا. لەجەنگی دووەمی جیهان لە سالەکانی ١٩٣٩ تا ١٩٤٥ سوپای ئوستراليا بەشداری بەرگری کردنی کرد لەتەك هاوپەیمانان لە یۆنان و باکوری ئەفریقیا و باشووری ڕۆژئاوای زەریای هادی . لە ساڵی ١٩٤١ ئوستراليا داوای یارمەتی سەربازی کرد لە ولایەتە یەككگرتوەكان کە ئەمەش سەرەتایەك بوو لە گۆڕینی پەیوەندی لەگەڵ بەریتانیا بەتەنیا. لە ساڵی ١٩٤٤ سیاسەت مەداری ئوسترالی (منزیس) پارتی ئازادی پێك هێناو لەماوەی ساڵەکانی ١٩٤٨ تاکو ١٩٧٥ زیاتر لە ملیۆنێك کۆچبەر ڕویان لە ئوستراليا کرد کە زۆربەیان لە کێشومری ئەورووپا روویان تێکردبوو، ئوسترالیاش وازی لە ڕامیاریەتی رەگەز پەرستی هێنا لە ساڵی ١٩٧٣ لە مامەلە کردن لەگەڵ کۆچبەرەکانی کە ڕویان لەئوستراليا کردبوو. لە شەڕی کۆریای ١٩٥٠ تا ١٩٥٣ ئوستراليا بەشداری شەڕی کرد لەگەڵ هێزی ولایەتە یەككگرتوەكان بۆ یارەمەتی دانی کۆریای باشوور دژی کۆریای باکورکە هێزەکانی خاکی کۆریای باشووری داگیر کردبوو، ئوستراليا لەگەڵ ولایەتە یەككگرتوەكان و نیوزیلندە بەشداری پەیمانی ئاسایشی باسیفیکی زانراو بەناوی ئنزوسی کرد کە ئەوەش لە ساڵی ١٩٥١ ، هەروەها هێزەکانی ئوستراليا بەشداری شەڕی ڤێتنامیان کرد لە ساڵەکانی ١٩٦٥ تا ١٩٧٣ لەتەك ولایەتە یەككگرتووەكان دژی ڤێتنامیەکان . لە ساڵی ١٩٦٧ ئوستراليا بووە ئەندام لەبەستنەوەی (الرابتە)ی ولاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا (Asean) لەوکاتەی بەریتانیا چووە ناو کۆمەڵەی ئابووری ئەورووپی لە ساڵی ١٩٧٣ ، یابان بووە هاوبەشی بازرگانی سەرەکی ئوستراليا لە ماوەی حەفتاکان. لە ساڵەکانی ١٩٩٠ تاکو ١٩٩٣ ئوستراليا توشی گەورەترین نزمە تەنگەژەی ئابووری بوو بەلام دوای بەرەو بوژانەوە گەڕایەوە. لەمانگی/٩/١٩٩٩ ئوستراليا سەرکردایەتی ئاشتی پارێزی کرد لە ناوهێزی نێو دەولەتی لە پاراستنی ئاشتی لە تەیموری ڕۆژهەلات. زانیمان کە دادوەرێکی بەریتانی سەرپەرشتی ڕژێمی ئوسترالی دەکرد بەلام لە ٢/١٢/ ١٩٩٨ ڕێككەوتنی لە دەنگدانی دەستور کرد لەبەرژەوەندی ئەوەی کە ئوستراليا سەرۆکەکەی لەخۆی بێت بەلام دوای ئەوەی لە دەنگدانی مانگی/١١/ ١٩٩٩ ڕازی بوون بەوەی کە ئوستراليا بمێنێتەوە لە ژێر تاجی ئامۆژگاری بەریتانیاو ئوستراليا هاوکاری ئەمریکاو بەریتانیاو هاوپەیمانی کرد لە لێدانی عێراق لەساڵی ٢٠٠٣ بۆ لابردنی دەسەلاتی سەدام حوسێنو بەردەوامی لە بەرەو باش بردنی ئارامیو ئاسایش بۆ گەلانی عێراق، لە٩/١٠/٢٠٠٤ پارتی دەسەلاتدار دووبارە لەهەڵبژاردنەکان سەرکەوتنی بەدەست هێناو جۆن هاواردی بەسەرك وەزیران هەڵبژێردراوە بۆجاری دووەم شایانی باسەکە ئوستراليا شێوازێکی بەرچاوی هەیە لەرژێمی دیموکراتی..

- ئوستراليا ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا، ئەندامە لە ڕێکخراوی هاوکاری بوژانەوەی ئابووری، ئەندامە لە ڕێکخراوزی نەتەوە یەككگرتوەكان.

# کریباس

- ناوی رسمی: کۆماری کریباس.
- پایتەختی: تاراوا، (ژمارەی دانیشتوانی ۲۷۸۰۰۰ هەزار کەسە، لە هەمان کات تاراوا بەندەرێکی سەرەکیە.
- رووبەری: ۲۸۰ میل چوار گۆشەو ۷۲٦ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ۱۳۵٫۰۰۰ هەزار کەسە.
- چڕی دانیشتوانی: ٤۱۲ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۱٫٥٪.
- نژادەکانی: مکرۆنیزیانەکان.
- زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی رسمیە) زمانی جیلیرز.
- ئایینەکانی: کاسۆلیکی رۆمانی ٥٥٪ برۆتستانت ٤٥٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ۹۳٪.
- دابەشی کار گێری: ۳ کەرتی کارگێریە، لەشێوەی پارێزگا.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٦٥ ملیۆن دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۹٥۰ دۆلار.
- دراوی: دۆلاری ئوسترالی.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥٫۳٪ لە خاکی وولاتەکە.
- بەرهەمەکانی کشتوکاڵی: پەتاتە، گەنم، جۆ، تەرە، میوەجات، داری نان، کۆبرا، قلقاس.
- پیشەسازی: راوی ماسی، کاری دەستی.
- بەرهەمی کارەبا: ۸٫٦۰۰ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.
- سامانی ئاژەڵی: بەشی دانیشتوانی دەکات بەلام رێژەیەکی وام نەزانی کە بتوانم بینووسم بەلام ئەوی کەدیار بوو بەرهەمی پەروەرە ئەویش ٦٥۰٫۰۰۰ هەزار سەرە.
- داهاتەکانی دەرەوەی: پێداویستیەکانی خۆراك، سوتەمەنی، کەلوپەلی گواستنەوە، ئۆتۆمبێل وماشێن.
- دەر چووەکانی: کۆبرا، ماسی.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: نیوزیلەندە، یابان، ئەمریکا، بەریتانیا، ئوستڕالیا، چینی میللی، فیجی.
- رژێمی دەسەلات: کۆمارێکی پەرلەمانی دیموکراتیە، سەرۆك کۆمار سەرۆك دەسەلاتی جێبەجێ کردنە، ئەنجومەنی یاسادانانی لە ۲۹ ئەندام پێك هاتووە.
- پارتە رامیاریەکان: پارتی دەسەلات، پارتی پێشکەوتنی نیشتمانیە کە لەساڵی ۱۹۷۹ تاکو ۱۹۹٤ دەسەلاتداربوو، پارتی ماینیانتی موری.
- جوگرافیای وولات: کۆماری کریباس دەکەوێتە ناوەراستی زەریای هادی کەلە سێ کۆمەلە پێك هاتووە لە دورگەی مێرگی ئەویش کۆمەڵەی جیلیرت لەسەر هێلی کەمەرە، کۆمەڵەی فیتکس لە رۆژهەلاتیەتی، کۆمەلەی لاین دەکەوێتە رۆژهەلاتی کۆمەلەی فینکس، چەندین دەریاچەی تیایە لەناو زۆربەی کۆمەڵەکان. نورو دەکەوێتە باکوری رۆژ ئاوای، دورگەی تۆفالۆو تۆکیلۆ دەکەوێتە باشووری، پلەی گەرمی بەرزەو بارانی پچرپچرە.
- مێژووی کریباس: دورگەی جیلیرت وئیلس پارێزراوی بەریتانیا بوە لە ساڵی ۱۸۹۲، لەساڵی ۱۹۱٦ بوە ژێر دەستەی بەریتانیا، لە ساڵی ۱۹۷٥ کۆمەلەی دورگەی جیلیرت جیابوە وە لەکۆمەڵەی ئیلیس کەهەریەك لەوانە ماف ئۆتۆنۆمی ناوخۆیی وەرگرت، بەلام دورگەی ئلیس بوە دەوڵەتی تۆفالۆو سەر بەخۆی لە ۱/۱۰/ ۱۹۷۸ بەدەست هێنا بەلام کریباس سەربەخۆی لە ۱۹۷۹/۷/۱۲ لەناو کۆمەنولسی بەریتانیا وەرگرت . لەساڵی ۱۹۸٥ یەکەم پارتی رامیاری دامەزرا لەکریباس، ئەویش پارتی دیموکراتی مەسیحی بوو.
- کریباس لە ۱۹۹۹/۹/۱٤ بوە ئەندام لە نەتەوە یەکگرتوەکان.

# تـۆفـالـۆ

- ناوی رسمی: دەوڵەتی توفالۆ.
- پایتــــەختی: فونــــاقوتی، ژمـــارەی دانیشتوانی٥٠٠ر١٠هەزار کەسە،و بەندەرێکی سەرەکیە.
- رووبــەری: ١٠میـل چـوار گۆشــەیە ٦ر٢٥ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- ژمارەی دانیشوانی: ٠٠٠ر٢٣ هەزار کەسە.
- چری دانیـشتوانی: ٢٣٠٠ کـەس لـە یـەك میـل چوارگۆشەدا.
- نژادەکانی: بۆلنسیۆن ٩٥٪.
- زمانەکانی: تۆفالی، ئینگلیزی.
- ئایینەکانی: کنیسەی تۆفالۆ ٩٧٪.
- زانینی خوێندن ونووسین: ٩٥٪.
- کـۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆی: ٢٠٠ ر٨ میلـۆن دۆلار.
- بەشــی تــاك لــەکۆی دەرئـەنجامی نــاوخۆی: ١٠٠ر١ دۆلار.
- دراوی: دۆلاری توفالۆ و دۆلاری ئوسترالی.
- زەوی کشتوکاڵی: ٢،٥٪ لە خاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: چەوەندەری شەکر، گیزی هینــدی، گــەنم وجــۆ، هەنــدێك جــۆری تــر لەدانەوێڵە، تەرە، میوەجات.
- پیـشە سـازی: راوی ماسـی، گەشـت وگـوزار، کاکلی گیزی هیندی.
- بەرهــەمی کارەبـا: ٩٥٠ر٦ ملیـۆن کیلـۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: سوتەمەنی، خۆراك، ماشێن، ئاژەڵ، کەلوپەلی پیشەسازی.
- دەرچووەکانی: کاکلـەی گیـزی هینـدی، شـکر، ماسی.
- هاوبەشـــەکانی بازرگـــانی: نیوزیلەنـــدە، ئوسـترالیا، فیجـی، وڵاتـانی یـەکێتی ئـەوروپا، ئەمریکا، چینی میللی.
- رژێمی دەسەڵات: تۆفالۆ وڵاتێکـی سـەربەخۆی نـاو کۆمەنولـسی بەریتانیـە، سـەرۆك دەوڵـەتی شانـــشین ئیلیزابیتـــی دووەمـــی بەریتانیـــەو دادوەرێکـــی خـــۆی نوێنـەرایـــەتی دەکـات کـە ژمنـەراڵی بوابوایـە لـە سـاڵی ١٩٩٨، سـەرۆك وەزیرانی ئەویش لوناتانا سەرۆکایەتی دەکات، لەســاڵی ١٩٩٩ دەســـەڵاتی جێبــەجێکردنی بەشێوەیەکی رسمـی بەنـدە بـەدادوەری گشتی کــە شانـــشین دایدەمـــەزرێنێ لەســـەر داوای حکومەتی تۆفالۆ، ئەنجومەنی یاسادانان پێك هاتوە لە هەشت ئەندامی هەڵبژێردراو.
- جوگرافیـای وڵات: تـۆ فالۆ لـە نـۆ دورگـە پێك هـاتوە بەدرێـژی ٢٦٠ میـل لـەباکوری رۆژئاوای باشـووری رۆژ هــەڵات، لەباشـووری رۆژئـاوای زەریـای هنـدی کەباشـووری هێڵـی کەمـەرەیی راسـتەوخۆیە، کیریـانی دەکەوێتـە بـاکووری، فیجی دەکەوێتە باشووری، دورگە کەزەویەکەی نزمـەو بەبـەرزای ١٥ پـێ لەسـەر ئاسـتی دەریـا، پێك هـاتووە لـە مێرگێکـی روەك و گـژوگیا کـە پێشو پێی دەوترا دەورگەی ئیلیس.
- مێـژووی تۆفـالۆ:تۆفـالۆ بـوە پـارێزراوی ژێـر دەسەڵاتی بـەریتانیا لـە سـاڵی ١٨٩٢، لەسـاڵی ١٩١٥ کردیـە ژێـر دەسـتەیەکی تـەواوی خـۆی و بـوە بەشـێك لــە دورگــەی جـیلبرت ولـیکس، لەساڵی ١٩٧٥ لە دورگەی ئیلیس جیا بۆوەوە بە وەرگتنی دەسەڵاتی ناوخۆی بەناوی تۆفالۆ، لـە١/١٠/١٩٧٨ تۆفـالۆ سـەربەخۆی تـەواوی وەرگـرت. ئـەم وڵاتــە شانـــشنی بــەریتانیا (ئیلیزابتی دووەم بە ئارەزوی خۆی کاروباری وڵاتەکە هەڵدەسورێنی) لەساڵی ١٩٩٤ سەرۆك وەزیــران لادراو ژمێریــارەکی کــۆن جێگــەی گرتەوە وتاکو کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤ لەدەسەڵات بەردەوام بوو.
- تۆفالۆ ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا.

# دورگەی سلیمان

• پایتەختی: هۆنیارا، ژمارەی دانیشتوانی٥٥٫٠٠٠ هەزار کەس لە دورگەی گوادال کاناله.

• رووبەری: ١١٫٥٠٠میل چوار گۆشەو ٢٩٫٧٨٥ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.

• ژمارەی دانیشتوانی: ٦٦٥٫٠٠٠ هەزار کەسە.

• چڕی دانیشتوانی: ٥٢ کەس لە یەك میل چوارگۆشەدا.

• شارەگرنگەکانی: جیزۆ.

• بوژانەوەی دانیشتوانی: ٣٫٥٪.

• نژادەکانی: میلانیزیا ٩٣٪ بۆلینزیا ٥٪. لەگەل کەمایەتی تری ئەوروپی.

• زمانەکانی: ئینگلیزی (زمانی رەسمیە) میلانیزی، بابوانی، بۆلینزی.

• ئاینەکانی: ئینجلیکانی(سەر بە کەنیسەی ئنجلیزیە) ٣٤٪. کاسۆلیکی رۆمانی ١٩٪، محەمەدیەکان ١٧٪، مەسیحی تر ٢٦٪.

• زانینی خوێندن ونوسین: ٦٥٪.

• دابەشی کارگێری: ٩ بەشی کارگێریە لەگەڵ پایتەختی هونیارا.

• کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ١٫٣٠٠ملیار دۆلار.

• بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٣٫٢٠٠ دۆلار.

• دراوی: دۆلاری دورگەی سلیمان.

• زەوی کشتوکاڵی: ١٫٣٪ لەخاکی دوورگەکە.

• بەرهەمەکانی کشتوکاڵی: دانەوێڵە، گەنم و جۆ، گیزی هندی، کاکاو، تەرە، میوەجات، چەوەندەری شەکر.

• سامانی ئاژەڵی: مەروبزن ٦٣٠٫٠٠٠ هەزار سەر، چێل وگامێش ٥٠٠٫٠٠٠ هەزار سەر،پەرەور١١٥٫٠٠٠ هەزار سەر.

• پیشەسازی: کاکڵی گیزی هندی، ماسی، دروستکردنی شەکر.

• بەرهەمی کارەبا: ٣٨٫٠٠٠ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.

• سامانی سروشتی: بۆکسیت ، زێڕ، داری دارستانەکان.

• داهاتی دەرەوەی: ماشێن، کەلوپەلی گواستنەوە، پێداویستی خۆراك، سوتەمەنی.

• دەرچووەکانی: ڕۆنی دار، ماسی، دار.

• هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان. تایلاند، سنگافورا، هۆلەندا، هۆنکۆنگ، چین، یەکێتی ئەوروپا، ئوسترالیا، بەریتانیا.

• ڕژێمی دەسەڵات: وڵاتێکی دیموکراتی پەرلەمانیە، لەناوچوار چیوەی کۆمەنولسی بەریتانیە، سەرەك دەوڵەت شانشینی بەریتانی(ئەلیزابتی دووەم) کە دادوەرێکی گشتی نوێنەرایەتی دەکات،بەڵام دەسەڵاتی یاسا دانان بەندە بە ئەنجومەنی یاسا دانان کە لە ٤٧ ئەندام پێکهاتووەو سەرۆك وەزیران سەرۆکایەتی دەکات.

• پارتە رامیاریەکان: پارتی هاوبەشی هاوکاری نیشتمانی، پارتی یەکێتی کۆمەڵەی ئاشتبونەوە، چەندین بیرو بۆچونی جۆراو جۆرو بۆچونی تری تیایە کەهەموو لەپێناو بەرژەوەندی دورگە کە خەبات دەکەن.

• جوگرافیای دورگەکە: دورگەی سلێمان دەوڵەتێکی سەربەخۆیە لەناو کۆمەنولسی بەریتانیا ودەکەوێتە رۆژهەڵاتی گینیای نوێ لە باشووری رۆژئاوای زەریای هادی وئەویش پێکهاتەیەکە لە کۆمەڵە دورگەیەك کە ناسراوە بەئەرخەبیلی بەناو بانگی میلانیزی وبڵاو

بۆتەوە لەسەر ناوچەکە کەدرێژیەکەی ١٥٠٠ کیلۆمەتر دەبێت، دورگەیەکی چیاییە نزیکەی ٢١ دورگەی گەورەی تێدایە لەگەڵ چەند دورگەیەکی بچوك، لەدورگە گەورەکان وەك (جوادال، کانال، مالینا، سانتا، ئیزایل، کریستۆبال، نیوگۆریکا، شوازل، سانتا کرۆز، کە دورگەکە لە بنەرەتا دورگەی گرکانین، چوار دورگەی گرکانی جولێنەری تیایە، دورگەیەکی دارستانی چری تیایە) بابوانیۆ گینیا دەکەوێتە رۆژئاوای .

- مێژووی وڵات: قسەوقسەلوك وابڵاوبۆتەوە کە لە ساڵی ١٥٦٠ لەئەمریکای باشوور کە دورگەی سلێمان ئەو دورگەیەیە کە چیرۆکەکانی دەوڵەمەندە بەزێڕ، ئەسپانیەکان رویان لەو ناوچەیە کردوە لەرێگەی زانای جوگراف ناسی ئەسپانی (فارۆدی میندانا) کەلە وڵاتی پیرۆوە بەرەو دوورگەکە هاتبوون، لە کۆتایەکانی سەدەی شانزەو سەرەتای سەدەی حەڤدەم ئەسپانیەکان هەوڵیان دا بیکەنە نیشتەجێی خۆیان کەلەو دورگەیە میلانزییەکان تێیدا نیشتەجێ بوون لە پێش ساڵەکانی زایینیەوە . بەڵام هەوڵەکانیان سەر نەکەوت بەهۆی بەرپەرچدانەوەیان لەلایەن دانیشتوانەکە.

لە ساڵی ١٨٨٦ بەریتانیاو ئەڵمانیا ئەو دورگەیان دابەش کرد لە نێوان خۆیان کە دوورگەی باشوور کەوتە ژێر چاودری بەریتانیا، دورگەی باکووریش کەوتە ژێر چاودێری ئەڵمانیا. لەساڵی ١٨٩٩ ئەڵمانیا دەستی لەو دورگەیە کێشاوە بۆ بەریتانیا بەپێی ئەو رێکەوتنەی کە بەریتانیا دان بەئەڵمانیا بنێ لەسەر ناوچەی ساموای رۆژئاوا، لەساڵی ١٩٠٠ ئەو دورگەیە بوە پارێزراوی بەریتاینا.

لە ساڵی ١٩٢٠ دورگەی سلێمان بوە ئینتدابی ئوسترالی، لەجەنگی دووەمی جیهان یابان ئەو دورگەی داگیر کرد، لەساڵی ١٩٤٣ بووە هۆی هەڵگیرسانی شەر لەناوچەکە لەنێوان یابان وئەمریکا، لە ساڵی ١٩٦٠ ئەنجومەنی یاسادانان دامەزرا بەپێی دەستور لەگەڵ ئەنجومەنی جێبەجێکردن. لەساڵی ١٩٧٤ چەند مافێکی ئۆتۆنومی وەرگرت، لە ١٩٧٨/٧/٧ دورگەی سلێمان سەربەخۆی خۆی راگەیاند لە دوای ٨٥ ساڵ لە داگیر کردن لە لایەن بەریتانیاو وڵاتانی تر، لەساڵی ١٩٩٠ حکومەتی یەکێتی نیشتمانی پێکهێنرا، لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٣ پارتی مالۆنی ئەسلاف زۆریەی کورسیەکانی بەدەست هێناو لەساڵی ١٩٩٤ دووبارە پارتی مالۆنی گەراوە بۆ سەر دەسەلات تاکو ٢٠٠١.

- دورگەی سلێمان ئەندامە لە نەتەوە یەککرتوومکان، ئەندامە لە کۆمەنولسی بەریتانیا.

# دورگەی مارشاڵ

- ناوی ڕسمی: کۆماری دورگەی مارشاڵ.
- پایتەختی: ماگور، ژمارەی دانیشتوانی ۲۵،۰۰۰ هەزار کەسە، کەبەندەرێکی سەرەکیە.
- ڕووبەری: ۷۰ میل چوار گۆشەو ۱۸۱ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی ۹۵،۰۰۰هەزار کەسە.
- چڕی دانیشتوانی: ۱۲۳٦ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوانی: ۲,۱۰٪.
- زمانەکانی: زمانی مارشاڵیەکان، ئینگلیز (هەردووکیان زمانی ڕسمین).
- نژادەکانی: مارشاڵی ۹۷٪. کە لەبنەرەتا دەگەڕێتەوە سەر ڕەچەلەکی میکرۆنیزی.
- ئاینەکانی: مەسیحی (زۆربەی زۆری پرۆتستانتن) لەگەڵ بەهائیەکان.
- زانینی خوێندن ونووسین: ۹۵٪.
- دابەشی کار گێری: ۲٤ مەڵبەندی کارگێڕیە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۱۱۰،۵۰۰ ملیۆن دۆلار.
- بەشی تاك لە کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ۱۷،۰۰۰دۆلار.
- دراوی: دۆلاری ئەمەریکی.
- زەوی کشتوکاڵی: ۳۰,٦٪ لەخاکی وڵاتەکە.
- بەرهەمی کشتوکاڵی: لە دورگەی مارشاڵ کشتوکاڵ وگەشت وگوزار سەرچاوەی بەرهەمی ئابووری وڵاتەکەیە. گیزی هیندی، گیز، تەرە، میوەجات.
- سامانی ئاژەڵی: بەخێو کردنی بەرازو مەڕو بزنو چێل کە بەشی دانیشتوانی بەتەواوی ناکا، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاوی ماسی بە زۆری دەکرێت.
- بەرهەمی کارەبا: ۸۳،۳۰۰ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.
- داهاتی دەرەوەی: پێداویستیەکانی خۆراك، کەلوپەلی ماشێن، خواردنەوە، سوتەمەنی، ئۆتۆمبێل، چەندین پێداویستی تر.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، ئوستراليا، ئەمریکا، چین، یەکیتی ئەوروپا.
- ڕژێمی دەسەڵات: دورگەی مارشاڵ کۆمارێکی دیموکراتی لیبرالیە، سەرۆك کۆمار (ئیماتا کابوا)، لەساڵی ۱۹۹۷ ئەنجەمنی یاسادانان سەرۆك کۆمار هەلدەبژێردرێت.
- پارتە ڕامیاریەکان: لە دوای ساڵی ۱۹۹۱ ماوەی دروست بوونی پارتی ڕادیکاڵی دیموکراتی درا ئەویش لە لایەن دەسەڵاتداران دامەزرا بۆ ئەنجام دانی کارو باری وڵات لە بەرژەوەندی خۆیان و دارو دەستەکەیان.
- یارمەتیەکانی ئابووری: لە لایەن ئەمریکایە ئەویش بەپێی بەڵگە نامەی ڕابیتەی ئازادە کەئەمریکاو دورگەی مارشاڵ بەیەك دەبەستێتەوە کە ئەمریکا ساڵانە ٤۰ملیۆن دۆلار یارمەتی بەدورگەی مارشاڵ دەدات.
- جوگرافیای وڵات:مارشاڵ دەکەوێتە باکووری زەریای هادیو باکوری ڕۆژهەڵاتی فلپین، پێك هاتوە لەزنجیرە دورگەیەکی بازنەیی (لەسەر دەستەیەکی ناوخۆییو دەریاچەیەکی تیایە) کە مێرگیەو درێژیەکی ۸۰۰میلە ئەویش دوو زنجیرەی ڕاتاك وڕالیکیە، میکرۆنیزیا دەکەوێتە ڕۆژئاوای، ئۆروکیریباتی دەکەوێتە باشووری.
- مێژووی دورگەی مارشاڵ: میکرۆنزنیەکان بەر لەهەزار ساڵ پێش زایین نیشتەجێی ئەو دورگە

بوونە، لە ساڵی ١٥٢٩ دەریاوانی ئەسپانی (میگل دی سافرا) سەردانی ئەو دوورگەی کردووەو دوای ئەوە کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئیسپانیەکان. لەساڵی ١٨٨٥ بووە پارێزراوی ئەڵمانیا، لەساڵی ١٩١٤ یابان دوورگەکەی داگیر کرد لە کاتی هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهان، تا کۆتایی جەنگی دووەمی جیهان هەر لە ژێر دەستی یابان مایەوە لەو کاتەی ئەمریکا ئەڵمانیای دەرکرد لە دوورگەکە لەدوای جەنگێکی سەخت لەنێوانیان.

لەدوای ساڵی ١٩٤٧ کەوتە ژێر ئامۆژگاری ئەمریکا، لە ساڵی ١٩٧٩ مافی ئۆتۆنۆمی ناوخۆی وەرگرت، لەساڵی ١٩٨٦ دوورگەی مارشاڵ سەربەخۆیی وەرگرت، بەڵام کاروباری بەرگری هەر بەدەست ئەمریکا بوو، دوورگەی مارشاڵ لە١٩٩١/٩/١٧ سەربەخۆیی بەدەست هێنا لەئەمریکا کەبووە وڵاتێکی سەربەخۆ لەوکاتە ماوەی پێدراو بووە ئەندام لەنەتەوە یەکگرتووەکان.

# نـــــۆرۆ

- ناوی ڕەسمی: کۆماری نۆرۆ.
- پایتەختی: بارەگای حکومەتی لە گەرەکی یارینە. لەهەمان کاتا بەندەرێکی سەرەکی گرنگە.
- ڕووبەری: ٢٠٠ر٨ میل چوارگۆشەو ٢١ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٠٠٠ر٣٠ هەزار کەسە.
- چڕی دانیشتوانی: ١٩١٥ کەس لەیەك میل چوارگۆشەدا.
- نەژادەکانی: نورانیەکان ٦٠٪ نەژادی باسیفیکی و هی تر ٢٦٪، چینی ٨٪، ئەورووپی ٨٪.
- زمانەکانی: نورانی (زمانی ڕەسمیە) ئینگلیزی.
- ئاینەکانی: مەسیحی.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٩٥٪.
- دابەشی کارگێڕی: ١٤ گەڕەکە.
- دراوی: دۆلاری ئوسترالیە.
- کۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١١٥ ملیۆن دۆلار.
- بەشی تاك لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی: ١٥٠ر١٠ دۆلار.
- سامانی سروشتی: فۆسفات، ئەویش بەداهاتی سەرەکی وڵات دادەنرێت.
- داهاتی دەرەوەی: پێداویستیەکانی خواردەمەنی، سوتەمەنی، ماشێن و ئۆتۆمبێل، کەلوپەلی گواستنەوە.
- دەرچووەکانی: فۆسفات.
- هاوبەشەکانی بازرگانی: یابان، چین، نیوزیلەندە، بەریتانیا، ئوسترالیا.
- ڕژێمی دەسەڵات: کۆماریە، دەسەڵاتی یاسادانان سەربە پەرلەمانە کە پێك هاتوە لە ١٨ ئەندام. پەرلەمان سەرۆك کۆمار هەڵدەبژێردرێ و ئەنجومەنی وەزیران پێك هاتووە لە پێنج وەزیر.
- پارتە ڕامیاریەکان: پارتی نۆرۆی دیموکراتی کە بەرهەڵستکاری حکومەتە.
- جوگرافیای وڵات: نۆرۆ دوورگەیەکە لە ڕۆژئاوای زەریای هادیە، ٤٢ کیلۆمەتر دورە لە باشوری هێلی کەمەرەیی، دوری لە باشوری ڕۆژئاوای هۆنۆلۆ بە ٤٠٢٣ کیلۆمەترە. کیربیاتی دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی، زۆربەی خاکی

گردۆلکەیەو دەوڵەمەندە بە فۆسفات. دەوری دورگەکەبە لێوارێکی لمی بەردی دیاریکراوەو مێرگیە لەسەر شێوەی بازنەیی یەکگرتوو.

• مێژووی نۆرۆ: لە ساڵی ١٧٩٨ڕاوچی نەهەنگی ئینگلیزی جۆن فین سەردانی دورگەی نۆرۆی کرد و ناوی دورگەکەی نا (بەمیجە)، لەماوەی ساڵەکانی ١٨٣٠ تا ١٨٨٠ دورگەکە ببوە جێگەی خۆشاردنەوەی هاووڵاتیە هەڵاتووەکانی سپی پێستەکان بەرامبەر بەدادگا. لە ساڵی ١٨٨٨ ئەڵمانیا نۆرۆی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی لە سەر داوای دانیشتوانە ئەڵمانیەکان لە ترسی دانیشتوانی هۆزە رەسەنەکانی دورگەکە، لە ساڵی ١٨٩٩ فۆسفاتی لێ دۆزرایەوە و لەلایەنی بەکرێگرانی چینی دەردەهێنراو لەلایەنی بەکارهێنراوەکانی ئینگلیز و ئوستڕالیا دەبردرا دەرەوەی ناوچەکە لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان، لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهان لە ساڵی ١٩١٤ ئوستڕالیا دورگەکەی داگرکرد و دوای کۆتایی هاتنی جەنگ کەوتە ژێر ئینتدابی بەریتانیا و ئوستڕالیا و نیوزیلەندە ئەویش بە پێی بڕیاری کۆمەڵەی گەلان. لەکاتی جەنگی دووەمی جیهان یابان داگیری کرد، لە ساڵی ١٩٤٧ بوە ژێر پاریزگاری لێ کراوی ئوستڕالیا. لە ١٩٦٨/١/٣١ نۆرۆ بووە وولاتێکی سەربەخۆیی تەواو. لەدوای وەرگرتنی سەربەخۆیی بەهۆی دەرهێنانی فۆسفات بژێوی ژیانی دانیشتوانی دورگەکە لەوپەڕی خۆشی دەژیان کە بەشی تاکی کەس لەکۆی دەرئەنجامی ناوخۆیی لەهەموو وولاتانی جیهانی سێیەم باشتربوو بەتایبەتی لەدوای ساڵی ٢٠٠٢ کە ڕۆژلەدوای ڕۆژ باری ئابووریان پەرە دەسێنێ لە بوارەکانی تری رامیاری دیموکراتی و ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی. بەهۆی دەریهێنانی فۆسفات و وەرگرتنی قەرەبو لە ئوستڕالیا بە ٢٫٥ ملیۆن دۆلار و لە بەریتانیا و نیوزلاندە ١٢ ملیۆن دینار بۆ ماوەی ٢٠ ساڵ کە بدرێتە نۆرۆ.

• نۆرۆ ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە کۆمەنولوسی بەریتانیا.

# میکرۆ نیگا

• ناوی رەسمی: وولایەتە یەکگرتووەکانی میکرۆ نیگا.

• پایتەختی: بالیکیر. ژمارەی دانیشتوانی ٣٨٫٨٠٠ هەزار کەسە و کەوتۆتە سەر دوورگەی بۆفنیی.

• رووبەری: ٢٧١ میل چوار گۆشەو ٧٠٢ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە.

• ژمارەی دانیشتوانی: ١٥٠٫٠٠ هەزار کەسە.

• چڕی دانیشتوانی: ٥٥٤ کەس لەیەک میل چوار گۆشەدا.

• زمانەکانی: ئینگلیزی(زمانی رەسمیە) ترۆکیزیە، بۆفنیە.

• نژادەکانی: نۆ کۆمەڵەی نژادی میکرۆنیجیەو بۆلنسیە تیایە .

• ئاینەکانی: کاسۆلیکی رومانی ٥٠٪، پرۆتستانت ٤٧٪.

• زانینی خوێندن ونوسین: ٩٣٪.

• دابەشی کارگێڕی: چوار ولایەتە.

• دراوی: دۆلاری ئەمەریکی.

• کۆی دەرئەنجامی ناوخۆی: ٢٢٥ ملیۆن دۆلار.

• بەشی تاك لەكۆی دەر ئەنجامی ناوخۆی: ۸۰۰ر۱ دۆلار.
• زەوی کشتوکاڵی: ۱۸٪ لەخاکی وولاتەکە.
• داهاتی کشتوکاڵی: گەنم وجۆ، تەرە، میوەجات، چەوەندەری شەکر، بیبەری ڕەش، گیزی هندی.
• پیشەسازی: ئامادەکردنی ماسی، گەشت وگوزار، ئامادەکردنی گیزی هندی.
• بەرهەمی کارەبای: ۱٤۸ ملیۆن کیلۆ وات کاتژمێر.
• داهاتی دەرەوەی: داهاتی ۱٦۸ ملیۆن دۆلارە لەو کاتەی دەرچووی ۷۳ ملیۆن دۆلارە، بەلام بەپێی ڕێکەتنی هاوبەشی ئازاد لە نێوان هەردوو وولات سالانە ۳۰۰ر۱ ملیار دۆلار وەك یارمەتی لە ئەمریکا وەر دەگرێت و ٥۰۰ر٤ ملیۆن کرێی ڕاوەستانی کەشتیەکانی ڕاوی ماسی وەردەگرێت.
• دەرچووەکانی: ماسی، گیزی هندی، ماسی وشك کراو، بیبەری ڕەش.
• ڕژێمی دەسەلات: ولایەتێکی یەکگرتووی دەستوری کۆماریە و پەیوەندیەکی بەهێزی هەیە لە پاراستن و یارمەتی دان.
• جوگرافیای ولات: میکرونیگا پێك هاتوە لە چوار ولایەت ئەویش، ولایەتی یاب ، ولایەتی تشوك یان تروك، ولایەتی پۆنایی، ولایەتی کۆسرای، هەر ولایەتێك لە بە شێکی بچوك پێك هاتوە کەزۆربەی دانیشتوانی تیا نیيە، دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای زەریای هادی بەدووری ٥١٥۰ کیلۆ مەتر لە ڕۆژئاوای باشوری ڕۆژئاوای هۆنۆلۆ، لەسەر دوری سێ چارەکی ڕێگەی نێوان هاوای و ئەندۆنوسیا، ئەویش لە سەر باکوری ڕاستەوخۆی هیلی کەمەرەیی، ژمارەی دورگەکانی ٦۰۷ دورگەیە. دورگەی پۆنابی (پۆقنی) کە گەورەترین دورگەیە، دورگەی کورسای کە بەشێکی گرنگی خاکی بە پیتی وولاتەکەیە لە دارستان و ڕوباری زۆری ئاودێرکردن.
• مێژووی ولات: هەندێ بەشی ئەم وولاتە زیاتر لە دووهەزار سال کراونە جێنشین، ئەوروپیەکان لە چ کاتێکا ئاوڕیان لەو ناوچەیە نەداوەتەوە تەنیا لە دوای سەدەی هەژدەم دا نەبێ کەلەوکاتە ئەسپانیەکان خستیانە ژێر دەسەلاتی خۆیان و دوایی لە سالی ۱۸۹۸ فرۆشتیانە ئەلمانیا، لە سالی ۱۹۱٤ یابان داگیری کرد، لە سالی ۱۹٤٥ کەوتە ژێر دەسەلاتی ئەمریکا. لە سالی ۱۹٤۷ بوە پارچەیەك لەخاکی زەریای هادی کە ملکەچی ڕاوێژکاری ئەمریکا بوو. لە سالی ۱۹۷۸ هەر چوار ولایەتەکە دەنگیان دابە ڕێکخستن لەیەك وولاتدا لەدەستورێکی یەکگرتوو. بەناوی وولایەتی یەکگرتووی میکرۆنیگا. لە سالی ۱۹۷۹ ئەمریکا دانی نابە دەستوری میکرۆنیك، لە سالی ۱۹۸۲ هەردوو وولات واتە ئەمریکا و میکرۆنیگا پەیمانی هاوبەشی ئازادیان مۆر کرد. لە سالی ۱۹۸٦ مافی ئۆتۆنۆمی وەرگرت. لە۲۲/۱۲/۱۹۹۰ مکرۆنیکا سەربەخۆی تەواوی وەرگرت لەلایەن وولاتانی جیهان دانی پێنرا. لە مانگی/ ٥/۱۹۹۹ (لیۆفلکام) بوە سەرۆکی وولاتەکەو تاکۆتایی ۲۰۰٤ لەدەسەلات. بەردەوام •بوو
• میکرۆنیگا ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەندامە لە بانکی نیو دەولەتی، ئەندامە لە خەزنەی دراوی نێودەولەتی، ئەندامە لە ڕێکخراوی تەندروستی جیهان.

# تـونگـــا

- ناوی ڕەسمی : شانشینی تونگا.
- پایـــەختی: نوکـــۆ ئـــەلوفا، ژمــــارەی دانیشتوانی ٠٠٠ر٢٥ هـەزار کەسـە لـە هـەمان کات بەندەرێکی سەرەکیە.
- ڕووبـــەری: ٢٩٠ میـــل چوارگۆشـــە، ٧٥١ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
- ژمارەی دانیشتوانی: ٥٠٠ر١١٥هەزار کەسە.
- چڕی دانیـشتوانی: ٣٩٨ کـەس لەیـەك میـل چوارگۆشەدا.
- بوژانەوەی دانیشتوان: ٥ر١٪.
- نژادەکانی: بۆلنسیۆن، ئەوروپی.
- ئاینەکانی: مەسیحی ٩٥٪ ئاینەکانی تر ٥٪.
- زمانــەکانی: تونگـــا، ئینگلیـــزی، هــەردوکیان زمانی ڕەسمین.
- زانینی خوێندن و نوسین: ٩٢٪.
- دابەشی کارگێڕی: ٣ بەشی کارگێڕی سەرەکیە.
- کۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٥٠٠ر٢٤٠ ملیۆن دۆلار.
- بەشـی تـاك لـەکۆی دەرئـەنجامی نـاوخۆیی: ٣٠٠ر٢ دۆلار.
- دراوی: بائنجا.
- بەرهــەمی کارەبـای: ٧٥٠ر٣ ملیـار کیلـۆوات کاتژمێر.
- زەوی کشتوکاڵی: ٥ر٢٥٪ لەخاکی وولاتەکە.
- پیشەسازی: ڕاوی ماسی، گەشت و گوزار.
- بەرهــەمی کـشتوکاڵی: گیــزی هینــدی، قــاوە، بیبەری ڕەش، زەنجەفیل،مۆز، تەرە، میوەجات.
- داهــاتی دەرەوەی: کەلوپــەلی خـۆراك، کەلوپــەلی پیشەسازی، سوتەمەنی، کەلوپـەلی گواستنەوە، کیمیا.
- دەرچووەکانی: گیزی هیندی ،`میوەجات، مۆز، تەرە، ماسی، ڤانیلیا.
- هاوبەشـەکانی بازرگـانی: یـەکێتی ئـەوروپا، یابــان، ئــەمریکا، ئۆســترالیا، چـــین،فیجی، بەریتانیا.
- ڕژێمـــی دەســـەڵات: شانـــشینی دەســـتوریە، دەســەڵاتی جێبــەجێکردن بەنــدە بەشانــشین، ئەنجومـــەنی شانـــشینی وولات، ئەنجومـــەنی وەزیـــران کەســـەرۆك وەزیـــران ســـەرۆکایەتی دەکـــات، بـــەڵام دەســـەڵاتی یاســـادانان بەستراوەتەوە بە ئەنجومەنی یاسادانان.
- جوگرافیـای وولات: تونگـا دەکەوێتـە ڕۆژئـاوای زەریای هادی، لە باشوورو ڕۆژهـەڵاتی دورگـەی فیجییـە بـە دووری ٢٢٥٠ کیلۆمـەتر لـەباکوری ڕۆژهــەڵاتی نیوزیلنــدە، نــزیکترین دراوســێی لـەرۆژئاوای وولاتـی فیجیـە، سـاموا لـە باکوری ڕۆژهەڵاتـە، تونگـا پێکهـاتوە لـە ١٧٠ دورگـەی گرکـانی و مێرگـی کـە ٢٦ دورگـە دانیـشتوانی تێدایـە، دابەشـی سـێ کۆمەڵـە بـووە ئـەویش، هایا، تونگا، تابۆفایۆ، تونگا تایو گـەورەترین دوورگەیە کە سێ یەکی دانیشتوانی تیایە.
- مێـژووی تونگـــا: ١٠٠٠ ســاڵ پـــێش زایـــین کۆچبەرانی بولنسیوی جێنشینی ئەو ناوچەیە بونـە لـەفیجی و لەدورگـەی تونگـا، لـە سـاڵی ٩٥٠ی زاینـی (شانـشین ئـاهۆ ئیتـۆی یەکـەم) بووە شانـشینی میراتـی، لەسـاڵی ١٦٤٣ (ئایـل تیـسمان) دەریـاوانی هۆڵەنـدی سـەردانی ئـەو ناوچــەی کــردوەو دوای ئــەویش دەریـــاوانی بــەریتانی ســەردانی ناوچــەکەی کــرد لەســاڵی ١٧٧٣ ، لەســاڵی ١٨٣١ ســەرۆك هــۆزی هایــا هەلسا بە دامەزراندنی وولاتی تونگای ئێستاو ئـاینی مەسـیحیان کـردە بیروبـاوەڕی خۆیـان

لەهەمان كات بووە شانشین لەدوای شەڕی ١٤ سالە، لەسالّ ١٨٧٥ دەستووری وولات بڕیار دراو ئاینی مەسیحی تیا بلاّو بوەوە، لەسالّی ١٩١٠ بەپێی پەیمانی دوستانە لەگەلّ بەریتانیا بوە هەرێمێكی پارێزراو لەلایەن بەریتانیا كە بەریتانیا كاروباری سوپاو دەرەوەی گرتە دەست و كاروباری رامیاری ناوخۆی شانشین ئەنجامی دەدا. لە سالّی ١٩٥٩ دەستكاری لە دەستور كرا، لە ١٩٧٠/٦/٥ تونگا سەربەخۆیی وەرگرت لە بەریتانیا، بەلاّم هەر بە ئەندام مایەوە لەكۆمەنولسی بەریتانیا، لە سالّی ١٩٩٠ تونگا چووە ناو نەتەوە یەككگرتووەكان. لەهەلبژاردەكانی مانگی ١٩٩٣/٢/ دیموكراتی خوازەكان سەركەوتنیان بەدەست هینا. دوای ئەوە پەرلەمانتاران هەلسان بەپێك هێنانی پارتی تونگاو لەهەلّبژاردنەكانی ١٩٩٩ سەركەوتنیان بەدەست هێنا بەدامەزراندنی حكومەت تا كۆتایی سالّی ٢٠٠٤.

- تونگا : ئەندامە لە ڕێكخراوی نەتەوە یەككگرتووەكان.

## سەرچاوەکان


١ ـ وولآتانی جیهان: دانانی هادی رەشید چاوشلی ، چاپی ١٩٧٦ چاپخانەی (دار الجاحظ) بەغدا.

٢ـ دەنگی کلدان : گۆڤارێکی وەرزی ڕۆشنبیرییە، مەڵبەندی ڕۆشنبیری کلدانە لەدهۆك دەری دەکات ، ژمارەکانی١١ ، ١٢ ، ١٣، ١٤.

٣- ئەتلەسی کامل گلیتاشناسی : ئامادەکردنی : سەعید بەختیاری ، فارسی، ساڵی١٣٨١هەتاوی.

٤- فەرهەنگی وولاتان: ئامادەکردنی : محمد عەتریس، چاپی یەکەم ٢٠٠١، دار النشر للطباعة قاهرة، بەزمانی عەرەبی.

٥- مێژووی میسری ئیسلامی، دانانی محمد عبدالرحمن مصطفی - ابراهیم سیف الدین ، بە زمانی عەرەبی .

٦- کەناڵی ئاسمانی جەزیرە، دەوحە، لە پرۆگرامی (فی مثل هذا الیوم) وە ڕوداوەکانی جەنگی جیهانی دووەم.

٧- وولآتانی جیهان ، دەوڵەت ، احمد صادق، چاپخانەی ئەنگلۆی میسری ١٩٥٩.

٨- کمال مظهر ، کوردستان فی سنوات الحرب العالمیة الاولی.

٩- لازاریف، کورتیەك لە مێژووی کورد.

١٠- احداث من التاریخ المعاصر، نهرو، دار الافاق.

١١- الاشتراکیة والبلدان المتحررة ، اولیا نوفسکی ، دار التقدم ، مۆسکۆ.

١٢- ئاسیا تختار اولیانۆفسکی بافلۆف ، دار التقدم مۆسکۆ.

١٣- سنتان فی کوردستان ، دانانی هی ، وەرگێڕانی فوئاد جمیل ، لوبنان- بیروت.

١٤- اطلس العالم ، المؤسسة العلمیة للوسائل التعلیمیة ، دارالنشر العربي للطباعة والنشر والتوزیع، سوریا - حلب.

١٥- ساڵنامەی کوردستان ، دانانی عەلی کەندی ، چاپی ٢٠٠٥.

١٦- Philips Encyclopedic World Atlas 3rd Edition .

١٧- ڕۆژنامەی (الحیاة) لەژمارە ١٤٣٠٠ تاکو ١٥٢٥٠ لەلاپەڕەی ڕوداوەکانی ڕامیاری وڵآتانی جیهان.